# التاج
# الجامع للأصول
## في أحاديث الرسول ﷺ


دانراوی: مامۆستا شێخ مەنصور عەلی ناصف

وەرگێڕانی: نوری فارس حەمە خان

محمود أحمد محمد

پێیدا چۆتەوەو سەرپەرشتی لە چاپدانی کردووە



دار المعرفة

بيروت - لبنان

بسم الله الرحمن الرحيم

# التاج الجامع للأصول


📖 **وەرگێڕانی: نوری فارس حمه خان**

📖 **پێداچونەوەو سەرپەرشتی لەچاپدانی: محمود أحمد محمد**

📖 **چاپ: چوارەم**

📖 **ساڵی چاپ : ٢٠٠٨**

📖 **تایپو دیزاین: کەژاڵ حسین/کۆمپیوتەری شانیا**

📖 **تیراژ: ٢٠٠٠ دانه**

📖 **ژمارەی سپاردن:**

📖 **هەڵەگری: لاڤە هۆشیار محمد علی - کچەزای م.نوری فارس**





📖 ژمارە سپاردنی (٢٣٩٦) ی ساڵی ٢٠٠٨ی پێدراوە

ئـەم پـەڕاوە پـیرۆزە لەسـەر فەرمایشتی دانەرەکـەی پوختـەی حەدیثەکانی ئەم پەڕاوە پیرۆزانەیە :

١ ) صحيح البخاري

٢ ) صحيح مسلم

٣ ) سنن أبي دَاوُدَ

٤ ) جامعِ الترمذي

٥ ) الُمجْتَبى لِلنَّسَائِيَ

بسم الله الرحمن الرحيم

# نامەی گەورەیی قورئانی پیرۆز

(چوار باس و دوا وتاریکە)

## ٧٦) باسی یەکەم: گەورەیی قورئان و قورئان خوێنەکان و مامۆستای فێرکردنی قورئانی پیرۆز

## كتاب فضائل القرآن. (وفيه أربعة أبواب وخاتمة)

## الباب الأول: في فضائل القرآن وحامليه ومعلميه

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {إِنَّه لقرآنٌ كريمٌ فِي كِتَابٍ مَّكْنُونٍ لَّا يَمَسُّهُ إِلَّا الْمُطَهَّرُونَ، تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ الْعَالَمِينَ (٥٦/ ٧٧-٨٠} .

واتە: خودای گەورە دەفەرموێ: ئەم قورئانە قورئانێکی گەلێ بەرێزو پیرۆزو نازدارە، وا لەناو نامەیەکی نوسراوی بەرێزو قەدر دایە کە لەوحولمەحفووظە، دەستی ناپاکانی پێ ناگا، چونکە خودای گەورە لە جێگەیەکی وادا دایناوە کە قەدەغەیە لە دەستەڵاتی پیسان، تەنیا فریشتەکان ئاگاداری دەکەن و ئاگایان لێیەتی چونکە ئەوان پاك و نازدارو بێگەردن لە تەڵخی دەروونی، دەی نابێ لە ئەویشدا کەسێ دەستی لێ بدا تەنیا ئەو موسوڵمانانە نەبێ کە پاکن و دوورن لە لەشپیسی و بێ دەسنوێژیی، ئەم نامە پیرۆزەیە لەو شوێنە بە قەدرەوە لە لایەنی پەروەردگاری جیهانەوە نێرراوەتە خوارەوە بۆ موحەممەد پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ).

وقَالَ تَعالَى: { يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءَكُم بُرْهَانٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَأَنزَلْنَا إِلَيْكُمْ نُورًا مُّبِينًا -٤/١٧٤}.

واتە: ئەی نەوەی ئادەم! ئەی ئادەمیزادینە! وا زاتێکی وا هات بۆلای ئێوە، ئەوەندە رەفتارو کردارو گفتاری بەرزو شیرین و بێ گەردە خۆی بۆ خۆی بووە بە بەڵگەی رۆشن و نیشانەی راست و دروست لەسەر راستی و پاکی و رەهبەری خۆی، زاتێ ئاوابێ دیارە کە لە لایەنی پەروەردگاری ئێوەوە

دێ، لەگەڵ ئەم بەڵگە رۆشنەدا کە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵایە، نامەیەکی پیرۆزمان ناردووە، کە قورئانی نازدارە، چرایەکی رووناکە بۆ خۆی.

وقَالَ تَعالَى: { وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ وَلَكِن جَعَلْنَاهُ نُورًا نَّهْدِي بِهِ مَنْ نَّشَاء مِنْ عِبَادِنَا وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ صِرَاطِ اللَّهِ الَّذِي لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ أَلَا إِلَى اللَّهِ تَصِيرُ الأُمُورُ – صدق الله العظيم –٤٢/٥٢–٥٣}.

واتە: ئاوا بەم شێوەیە کە لە پێشەوە باسمان کرد ئەم قورئانەمان بە سرووش نارد بۆ تۆ، کە گیانی دڵی رۆشنەو مایەی ژینو بوونەو زاخاوی مێشكو دەروونە، چ بۆ خۆت چ بۆ یەکێکی تر، ئەمەش لەسەر فەرمانی چاکە خوایی خۆمو بە مهرو حوسنو رەزای خۆم ئەی موحەممەد تۆ لەمەوبەر نەتدەزانی نامەی خوداییو کتێبی ئاسمانی چییەو چی نییە، هەروا نەتدەزانی باوەڕی راستو دروستو بێ گەرد بە خودا لەسەر شێوەیەکی شەرعیو راست دەبێ چۆن بێ، تا ئێمە بە رێژەنەی میهرەبانی خۆمان ئەم چراگەشەی قورئانمان کرد بە نووری دڵانو سۆمای چاوانو هێزی هەناوان، کێ ئارەزوو بکەین لە بەندەکانی خۆمان دەستی قەدری لێ دەنێینو بەهۆی ئەم قورئانەوە رێگەی راستی نیشان دەدەینو شارەزای شاڕێگەی ئایینی راستی ئیسلامی دەکەین، کە لەمڕۆ بەدواوە تاقە رێگەی راستی خودایە، دیارە کە خودا خاوەنی هەموو شتێکە، ئاسمانەکانو هەرچییان تیادایەو زەویو ئەوەی وا لە زەویدا هەموو هی خودایە، ئەوەش بزانن کە ئەم جیهانە بێ حیکمەت نییەو ئەم ژیانە هەوانتە نییە سەرەنجام دەچنەوە بەردەستی خودا خۆیو خوداش هیچی لێ وون نابێ.

٣٥٩٠– عَنْ عُثمان (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ النبيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ. رَوَاهُ البخارى وأبو داود والترمذى[1]:

---

[1] تجريد بخارى بە كوردى / ٤ ل – ٥٣٩ ذ: ١٧٣٣ = فهتح: ٥٠٢٧ ، ٥٠٢٨.

**عوسمان** (رەزای خودای لێ بێ) **لە پێغەمبەرەوە** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: باشترین کەستان ئەو کەسەیە کە خۆی فێری قورئان دەبێ و خەڵکی تریش فێری قورئان دەکا (ب/د/ت). واتە: ئەم پێشەوا فەرمووده زانانە ئەم فەرمووده (حەدیث)ەیان گێڕاوەتەوە، بوخاری لە کتێبی صەحیحی بوخاریداو ئەبو داوود لە سوونەتی ئەبو داوودو تیرمیذی لە جامیعو تیرمیذیدا،** (رەزای خودایان لێ بێ).

**٣٥٩١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) عَنْ النبيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **قَالَ: الْمَاهِرُ بِالْقُرْآنِ مَعَ السَّفَرَةِ الْكِرَامِ الْبَرَرَةِ وَالَّذِي يَقْرَأُ وَهُوَ يَشْتَدُّ عَلَيْهِ لَهُ أَجْرَانِ. رَوَاهُ الآربعة[٢]:**

**لە عائیشەوە** (خۆشنوودی خودای لێ بێ) **لە پێغەمبەرەوە** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: ئەو قورئانخوێنەی کە بە رەوانی قورئانی لە بەرەو رەفتاری پێ دەکا ئەوە لە پایەی ئەو فریشتە بەڕێزە خێر خوایانە دایە کە لە جیهانی بالاداو لە عالەمی مەلەکووتدا سەرپەرشتی قورئان دەکەن و خودا لەم دوو ئایەتەدا باسی کردوون کە دەفەرموێ:**

**{بِأَيْدِي سَفَرَةٍ. كِرَامٍ بَرَرَةٍ – ٨٠/١٥-١٦}.**

**واتە: ئەم قورئانە لە جیهانی بالادا وا بە دەستی چەن فریشتەیەکی بەڕێزی خێرۆمەندی فەرمانبەری خوداوە. ئەو کەسەشی کە خەریکە دەیخوێنێ و بەگران بۆی لەبەر دەکرێ لەباتی پاداشێ دوو پاداشی بۆ هەیە (ش/د/ت= شەیخان و ئەبو داوودو تیرمیذی، شەیخان: واتە: شێخی بوخاری و شێخی موسلیم.** خۆشنوودی خودایان لێ بێ).

**٣٥٩٢- عَنْ أَبِي مُوسَى** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **عَنْ النَبِي** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **قالَ: مَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِى يَقْرَأُ الْقُرْآنَ مَثَلُ الأُتْرُجَّةِ رِيحُهَا طَيِّبٌ وَطَعْمُهَا طَيِّبٌ وَمَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِى لاَ يَقْرَأُ**

---

[٢] بخاري. التفسير (تجريد / ٤ / ٥١١ رقم: ١١٣ / ٤٩٣ فتح).مسلم. فضائل القرآن وما يقلق به صلاة المسافرين: ١٨٥٩. أبو داود. أدب: ٤٨٣٠. نسائي. إيمان: ٥٠٥٣.

الْقُرْآنَ مَثَلُ التَّمْرَةِ لاَ رِيحَ لَهَا وَطَعْمُهَا حُلْوٌ وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ الَّذِى يَقْرَأُ الْقُرْآنَ مَثَلُ الرَّيْحَانَةِ رِيحُهَا طَيِّبٌ وَطَعْمُهَا مُرٌّ وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ الَّذِى لاَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ الْحَنْظَلَةِ لَيْسَ لَهَا رِيحٌ وَطَعْمُهَا مُرٌّ. رَوَاهُ الخمسة[٣]:

**ئەبو مووسا** (رەزای خودایان لێ بێ) **لە پێغەمبەرەوە** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: وێنەی ئەو موسوڵمانەی کە قورئان دەخوێنێ و لەهەمان کاتا کاری پێدەکا وەك لیمۆ وایە هەم بۆنی خۆشەو هەم تامی خۆشە، وێنەی ئەو موسوڵمانەی کە قورئان زۆر نەخوێنێ، بەڵام کاری پێ بکا، وەك خورما وایە هەرچەند بۆنی نییە بەڵام تامی خۆشە، وێنەی پیاوی دوو رووی قورئانخوێن وەك رێحانە وایە هەرچەند بۆنی خۆشە بەڵام تامی تاڵە! وێنەی دوو رووی قورئان نەخوێنیش وەك گوو ژاڵك وایە، بۆنی خۆشی نییەو تامیشی تاڵو ناخۆشە (ش/د/ت/ن= بوخاری و موسلیمو ئەبو داوودو تیرمیذی و نەسائی).**

**٣٥٩٣-** عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: خَرَجَ عَلَينا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَنَحْنُ فِي الصُّفَّةِ فَقَالَ: أَيُّكُمْ يُحِبُّ أَنْ يَغْدُوَ كُلَّ يَوْمٍ إِلَى بُطْحَانَ أَوْ الْعَقِيقِ فَيَأْتِيَ مِنْهُ بِنَاقَتَيْنِ كَوْمَاوَيْنِ فِي غَيْرِ إِثْمٍ وَلاَ قَطْعِ رَحِمٍ؟ فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ كُلُّنا نُحِبُّ ذَلِكَ، قَالَ: فَلأنْ يَغْدُو أَحَدُكُمْ كُلَّ يوم إِلَى الْمَسْجِدِ فَيَتَعَلَّمَ آيَتَيْنِ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ خَيْرٌ لَهُ مِنْ نَاقَتَيْنِ، وَثَلاَثٌ خَيْرٌ لَهُ مِنْ ثَلاَثٍ وَأَرْبَعٌ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَرْبَعٍ، وَمِنْ أَعْدَادِهِنَّ مِنَ الإِبِلِ. رواه الخمسة[٤]:

**➡ (ب- ١ز- ٧٨ رقم: ٥٠١/١) گێڕانەوەی ئێرە ئاوایە:**

**عوقبەی کوڕی عامیر** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: لە صوففە بووین (کە سەکۆیێ بوو لە بن ساباتێکا، لە مزگەوتەکەی مەدینەدا بوو، میوانخانەی هەژاران بوو) پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **هات بۆ ناومان، فەرمووی: کامتان**

---

[٣] تجريد بخاری / ٤ / ٥٤٧ رقم: ١٧٤١ = ٥٠٥٩ ، ٥٠٢٠ ، ٥٤٢٧ ، ٧٥٦٠ فتح البارى. مسلم. صلاة المسافرين: ١٨٥٧. أبو داود. أدب: ٤٨٣٠. ترمذي. أمثال: ٢٨٦٥. نسائى. إيمان: ٥٠٥٣.

[٤] مسلم. صلاة المسافرين: ١٨٦٩ ، ١٨٧٠. راجع رقم: ٥٠١/١ مجلد أول تسلسل/ ٧٨.

حەز دەکەن کە هەموو ڕۆژێ بچن بۆ شیوی بوطحان، یا بڕۆن بۆ شیوی عەقیق، وە لەوێ دوو ووشتری مێنگەی دووگ قەوی بێننەوە بۆ خۆتان، بەبێ ئەوەی کە بەهۆی ئەوەوە تووشی تاوانێ ببن لەلای خودا، یا تووشی دڵڕەنجاندنی کەسوکارتان ببن؟ گوتمان: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! هەموومان حەز دەکەین، فەرمووی: دەسا هەر یەکێ لە ئێوە، هەر ڕۆژێ بچێت بۆ مزگەوت، لەوێ دوو ئایەت لە قورئان فێر ببێ، کە نامەی خودای تەواناو مەزن و شکۆمەندە، ئەوە لە دوو ووشتر باشترە بۆی، وە سێ ئایەت لە سێ ووشتر باشترە بۆی، هەروا چوار ئایەت لە چوار ووشتر باشترە بۆی، ئیتر هەروا بژمێرە زیاتری لە زیاتری باشترە! (م/د).

٣٥٩٤- ➡ «ب- ١ز- ١٤ل- ٧٩ رقم: ٢/١٠٠»[٥].

٣٥٩٥- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ النبيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: يُقَالُ لِصَاحِبِ الْقُرْآنِ اقْرَأْ وَارْتَقِ وَرَتِّلْ كَمَا كُنْتَ تُرَتِّلُ فِي الدُّنْيَا فَإِنَّ مَنْزِلَكَ عِنْدَ آخِرِ آيَةٍ تَقْرَؤُهَا. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذى وَصَحَّحَهُ[٦]:

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خودایان لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: لە بەهەشتا بە قورئانخوێن دەڵێن: قورئانت چەندە لەبەرە بیخوێنەو بە پایەکانی بەهەشتا سەرکەوە، وە چۆن لە جیهاندا قورئانت بە تەرتیل دەخوێند لێرەش هەروەها بە ئارامی و مۆڵەت و لەسەرخۆ بیخوێنە تا بەهەشتییەکان گوێی لێ بگرن چونکە پایەی تۆ لەو شوێنە دایە، کە دوا ئایەت دەخوێنێ! (د/ت:ص. واتە: ئەبو داوودو تیرمیذی ئەم فەرموودەیەیان گێڕاوەتەوە، تیرمیذی بە صەحیحی داناوە).

٣٥٩٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: يَجِيءُ الْقُرْآنُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيَقُولُ يَا رَبِّ حَلِّهِ فَيُلْبَسُ تَاجَ الْكَرَامَةِ ثُمَّ يَقُولُ يَا رَبِّ زِدْهُ فَيُلْبَسُ حُلَّةَ

---

[٥] تقدم فى المجلد الأول. تسلسل/ ١٤ برقم: ٢/١٠٠.

[٦] صحيح عند الترمذي.

الْكَرَامَةِ ثُمَّ يَقُولُ يَا رَبِّ ارْضَ عَنْهُ فَيَرْضَى عَنْهُ فَيُقَالُ لَهُ اقْرَأْ وَارْقَ وَتُزَادُ بِكُلِّ آيَةٍ حَسَنَةً. رَوَاهُ الترمذي بسند صَحِيحٌ[٧]:

ئەبو هورەیرە (ڕەزاو خۆشنوودی خودای گەورەی لەسەر بێ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: لە ڕۆژی قیامەتدا قورئان دێ لەگەڵ قورئانخوێنا بۆ لای خودا، دەفەرموێ: ئەی پەروەردگارم! بیرازێنەوەو خشڵی لەبەرکەو خەڵاتی بکە ئیتر تاجی سەربەرزی لەسەر دەکرێ، دیسان قورئان دەفەرموێ: ئەی پەروەردگارم! زیاتری بدەرێ، ئەوجا قاتی سەربەرزی لەبەر دەکرێ، ئینجا قورئان دەفەرموێ: ئەی پەروەردگارم لێی خۆش نوود بە، جا خودا لێی خۆش نوود دەبێ، وە پێی دەفەرمون: قورئان بخوێنەو بە پایەکانی بەهەشتا سەرکەوە، لەباتی هەموو ئایەتێکیش (سەرەڕای ئەوە کە پایەو مەقامت لەلای دوائایەتە کە دەیخوێنی) خەڵاتێ وەردەگرێ! (ت- س/ص= تیرمیذی بە سەنەدێکی صەحیح ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە).

٣٥٩٧- ولأبي داود: مَنْ قَرَأَ الْقُرْآنَ وَعَمِلَ بِمَا فِيهِ أُلْبِسَ وَالِدَاهُ تَاجًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ ضَوْؤُهُ أَحْسَنُ مِنْ ضَوْءِ الشَّمْسِ فِي بُيُوتِ الدُّنْيَا لَوْ كَانَتْ فِيكُمْ فَمَا ظَنُّكُمْ بِالَّذِي عَمِلَ بِهَذَا[٨]:

حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەر کەسێ قورئان بخوێنێ و ڕەفتاری پێ بکا لە ڕۆژی قیامەتا باوك و دایکی تاجێکی وایان لەسەر دەکرێ، شەوقەکەی لە شەوقی ئەو خۆرە جوانترە کە لە جیهانا لەناو ماڵەکانتان دەدات، دەی کەوابێ دەشێ ئەوەی کە بیخوێنی و کاری پێ بکا پلەو پایەی خۆی چۆن بێ و چی بێ! (د).

٣٥٩٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِنَّ الَّذِي لَيْسَ فِي جَوْفِهِ شَيْءٌ مِنَ الْقُرْآنِ كَالْبَيْتِ الْخَرِبِ[٩]:

---

[٧] سنده صحيح.

[٨] سكت عن درجته الشارح.

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) لە حەزرەتەوە (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەر دڵێ كە قورئانی تیا نەبێ و خاڵی بێ لە یادو زیكری خودا، وەك كەلاوە كۆن وایە! (ت-س/ص).

٣٥٩٩- عَنْ عَبْدَ اللّٰهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ قَرَأَ حَرْفًا مِنْ كِتَابِ اللّٰهِ فَلَهُ بِهِ حَسَنَةٌ وَالْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا لاَ أَقُولُ الم حَرْفٌ وَلَكِنْ أَلِفٌ حَرْفٌ وَلاَمٌ حَرْفٌ وَمِيمٌ حَرْفٌ[١٠]:

عەبدوڵلا (خۆشنوودی خودای لێ بێ) لە حەزرەتەوە (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: خودای گەورە دەفەرموێ: هەر كەسێ پیتێ لە قورئان بخوێنێ بەو پیتە چاكەیەكی بۆ هەیە چەن ووشە بخوێنێ یا چەن ئایەت و سووڕەت بخوێنێ، لە باتی گشت پیتێ لە پیتەكانی یەك چاكەی بۆ هەیە، پاداشی چاكەش یەك بە دەیە، بگرە زیاتریش، وەك خوا دەفەرموێ:

{مَن جَاء بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا - ٦/١٦٠}.

واتە: هەر كەسێ چاكەیێ بكا، دە قاتی ئەوە یا بە بێ شومار پاداشی باشی هەیە. دەی من ناڵێم (الم) یەك پیتە، بەڵكوو ئەوە سێ پیتە، چونكە ئەلیف پیتێكە، وە لام پیتێكە، وە میم پیتێكە، بەم پێیە هەر كەسێ تەنیا ووشەی (الم) بخوێنێ سێ چاكەی بۆ دەنووسرێ (ت-س/ص).

٣٦٠٠- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: يَقُولُ اللهُ تَعَالَى مَنْ شَغَلَهُ الْقُرْآنُ وَذِكْرِي عَنْ مَسْأَلَتِي أَعْطَيْتُهُ أَفْضَلَ مَا أُعْطِي السَّائِلِينَ وَفَضْلُ كَلاَمِ اللّٰهِ عَلَى سَائِرِ الْكَلاَمِ كَفَضْلِ اللّٰهِ عَلَى خَلْقِهِ[١١]:

ئەبو سەعید (خۆشنوودی خودای لێ بێ) لە حەزرەتەوە (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: خودای گەورە دەفەرموێ: هەر كەسێ خەریكی قورئان و یادی

---

[٩] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[١٠] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[١١] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

خوا بێ و لەبەر ئەوە نەیپەرژێ داوای شت لە من بکا، ئەوە نائومێدی ناکەم بەڵکوو باشترین شت کە دەیدەم بە داواکاران و ئومێدەواران دەشی دەم بەویش! وە فەزڵ و گەورەیی قورئان (کە کەلامو فەرمایشتی خودای گەورەیە) لە چاو ووتارو قسەی تری درووسکراوان (مەخلووقات)دا وەك فەزڵ و گەورەیی خودا خۆی وایە لە چاو درووستکراوانی خۆیدا (ت-س/ح. واتە: تیرمیذی بە سەنەدێکی حەسەن، واتە: بە رشتەیەکی جوان، ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە).

٣٦٠١- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ قَرَأَ الْقُرْآنَ وَاسْتَظْهَرَهُ فَأَحَلَّ حَلاَلَهُ وَحَرَّمَ حَرَامَهُ أَدْخَلَهُ اللَّهُ بِهِ الْجَنَّةَ وَشَفَّعَهُ فِي عَشَرَةٍ مِنْ أَهْلِ بَيْتِهِ كُلُّهُمْ وَجَبَتْ لَهُ النَّارُ[١٢]:

عەلی (خۆشنوودی خودای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەر کەسێ قورئان بخوێنێ و لەبەری بکاو حەڵاڵی بە حەڵاڵ بزانێ و حەرامی بە حەرام بزانێ، خودا بەوە دەیباتە بەهەشت وە تکا (شەفاعەت)یشی گیرا دەکا بۆ دەکەس لە کەسوکاری خۆی، کە هەر دەیان ئاگریان بۆ بڕیاردرابێ (ت-س/غ: واتە: تیرمیذی ئەم فەرموودەیەی بە سەنەدێکی غەریب گێڕاوەتەوە).

٣٦٠٢- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَا أَذِنَ اللَّهُ لِعَبْدٍ فِي شَيْءٍ أَفْضَلَ مِنْ رَكْعَتَيْنِ يُصَلِّيهِمَا وَإِنَّ الْبِرَّ لَيُذَرُّ عَلَى رَأْسِ الْعَبْدِ مَا دَامَ فِي صَلاَتِهِ وَمَا تَقَرَّبَ الْعِبَادُ إِلَى اللَّهِ بِمِثْلِ مَا خَرَجَ مِنْهُ بعني القرآن[١٣]:

➡ «ب- ١ز- ٤٣ل- ١٨٨ف- ١٥مجلد أول تسلسل/ ٤٣ رقم: ١٥ / ٣٣٦».

ئەبو ئومامە (خودای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: خودا هیچی وەك ئەوە پێ خۆش نیە، کە بەندە دوو رکات نوێژ

---

[١٢] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

[١٣] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

بۆ خوا بكا ئەمە لەلایێ، لە لایەكی تریشەوە بەندە هەتا لە ناو نوێژا بێ خێرو چاكە دادەبارێ بە سەریا بەندەكانی خودایش بە هیچ شتێ وەك ئەوە لە خودا نزیك نابنەوە وەك بەو شتەی كە لەلای خودا خۆیەوە هاتووە واتە: بە قورئان (ت-س/غ).

٣٦٠٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا) قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ أَيُّ الْعَمَلِ أَحَبُّ إِلَى اللّٰهِ؟ قَالَ: الْحَالُّ الْمُرْتَحِلُ ». قَالَ وَمَا الْحَالُّ الْمُرْتَحِلُ؟ قَالَ: الَّذِى يَضْرِبُ مِنْ أَوَّلِ الْقُرْآنِ إِلَى آخِرِهِ كُلَّمَا حَلَّ ارْتَحَلَ[١٤]:

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! كام كردەوەیە زۆر خۆشەویستە لەلای خودا! فەرمووی: ئەو كەسەی كە تەواوی دەكاو تێ هەڵ دەچێتەوە! عەرزی كرد: قوربان! ئەوە كێیە؟ فەرمووی: ئەو كەسەیە كە لە سەرەتای قورئانەوە ریزی لێ دەگرێو دەیهێنێ تا خەتمی دەكا، گشت جارێ كە خەتمەیێ تەواو دەكا سەر لە نوێ لە سەرەتاوە دەست پێ دەكاتەوە! (ت-س/غ).

٣٦٠٤- عَنِ الْحَارِثِ الأَعْوَرِ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: مَرَرْتُ فِي الْمَسْجِدِ فَإِذَا النَّاسُ يَخُوضُونَ فِي الأَحَادِيثِ فَدَخَلْتُ عَلَى عَلِيٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) فَقُلْتُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ أَلاَ تَرَى أَنَّ النَّاسَ قَدْ خَاضُوا فِي الأَحَادِيثِ، قَالَ: وَقَدْ فَعَلُوهَا؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: أَمَا إِنِّى قَدْ سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَقُولُ: أَلاَ إِنَّهَا سَتَكُونُ فِتْنَةٌ، فَقُلْتُ: مَا الْمَخْرَجُ مِنْهَا يَا رَسُولَ اللّٰهِ؟ قَالَ: كِتَابُ اللّٰهِ فِيهِ نَبَأُ مَا كَانَ قَبْلَكُمْ وَخَبَرُ مَا بَعْدَكُمْ وَحُكْمُ مَا بَيْنَكُمْ، هُوَ الْفَصْلُ لَيْسَ بِالْهَزْلِ مَنْ تَرَكَهُ مِنْ جَبَّارٍ قَصَمَهُ اللّٰهُ وَمَنِ ابْتَغَى الْهُدَى فِي غَيْرِهِ أَضَلَّهُ اللّٰهُ وَهُوَ حَبْلُ اللّٰهِ الْمَتِينُ وَهُوَ الذِّكْرُ الْحَكِيمُ وَهُوَ الصِّرَاطُ الْمُسْتَقِيمُ هُوَ الَّذِى لاَ تَزِيغُ بِهِ الأَهْوَاءُ وَلاَ تَلْتَبِسُ بِهِ الأَلْسِنَةُ وَلاَ يَشْبَعُ مِنْهُ الْعُلَمَاءُ وَلاَ يَخْلَقُ عَلَى كَثْرَةِ الرَّدِّ، وَلاَ تَنْقَضِى عَجَائِبُهُ هُوَ الَّذِى لَمْ تَنْتَهِ الْجِنُّ إِذْ سَمِعَتْهُ حَتَّى قَالُوا: (إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا

---

[١٤] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ) مَنْ قَالَ بِهِ صَدَقَ وَمَنْ عَمِلَ بِهِ أُجِرَ وَمَنْ حَكَمَ بِهِ عَدَلَ، وَمَنْ دَعَا إِلَيْهِ هُدِيَ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ. خُذْهَا إِلَيْكَ يَا أَعْوَرُ. رَوى هذه السبعة الترمذى[١٥]:

حاریثی ئەعوەر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: چووم بۆ مزگەوت، روانیم وا خەڵکەکە وورووژاونەتە باسو خواس‌و قسەو باس، منیش چووم بۆ لای عەلی (خودای لێ رازی بێ) عەرزم کرد: ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان! تەماشای ئەو خەڵکە ناکەی چۆن سەریان کردۆتە قسەو باس‌و حیکایەتخوانی! گوتی: ئەمەشیان کرد؟ گوتم: ئەدیی، گوتی: ئەدیی سا من بۆ خۆم لە پێغەمبەر خۆیم ژنەوت دەیفەرموو: هۆشیاربن! پشێویی‌و فەرتەنە بەرپا دەبێ عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! جا چار چییە؟ چۆن سەر دەرکەین لێی؟ فەرمووی: نامەی خودا کە قورئانی پیرۆزە باسو خواسی پێش خۆتان‌و دەنگوباسی پاش خۆتانی تیایە، هەروا بڕیارو حوکمی ناو خۆتانی تیایە، خاس‌و خراپ لە یەك جیا دەکاتەوە، بە راستی فەرمایشتە نەوەك گاڵتەو هەوانتە، جا ئەوەی (لەبەر زۆرداریی‌و مل هوڕی خۆی) رەفتاری پێ نەکاو پشتی تێ بکا خودا پشتی دەشکێنێ، وە ئەوەی منەیی هیدایەت‌و رێنموونی لە شتێکی تردا بکا خودا سەری لێ دەشێوێنێ، سەرەڕای ئەمەش ئەوە کە هەم کەمەندی قایمی بتەوی خودایەو هەم یادگاری سەربەرزی‌و گەوهەری شەو چرایەو هەم شاڕێی راستی خودایە، هەر ئەوە کە دڵ‌و دەروون‌و ئارەزووەکان بەهۆی تیشکی ئەوە وە لە هەق لانادەن‌و لە خشتە نابرێن، وە زمان نایپڕسکێنێ‌و لێی ناشێوێ‌و لەسەر دەم‌و زمان سووك‌و خۆش‌و رەوانە، وە زاناکان هەرگیز لێی تێر نابن، وەهەتا زیاتر دەوری بکەیتەوەو هەتا پتر دووبارەی بکەیتەوە تاسووقتر دەبێ، هەمیشە تازەو نوێیەو تاسووقەو کۆن نابێ‌و نابێزرێ، وە هەتا هەتایە شتە سەیرو عەنتیکەکانی لە بن نایەن، بەردەوام رۆژ بە رۆژ زانستی نوێ‌و شتی سەیری نوێی لێ دەردەکەوێ، ئەوە ئەوبوو کە جنۆکەکان لەگەڵ بەر گوێیان کەوت گورج کارێکی سەیری

---

[١٥] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

تێکردن و بێ پەروا گوتیان (وەکوو خوا لە قورئانا باسی دەکاو قسەکەیان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ:

{إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا، يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ - ٧٢/ ١-٢}.

واتە: ئێمە قورئانێکمان بیستووە، کە قورئانێکی وایە کە ئادەمیزادو پەری بە شێوەیەکی شیاو بانگ دەکا بۆ سەر رێگەی راستو دروست. هەر کەسێ قسە بە پێی قورئان بکا قسەی راست دەردەچێ، وە هەر کەسێ رەفتاری پێ بکا پاداشی باش وەردەگرێ، وە هەر کەسێ بڕیارو حوکمو کاری بە پێی ئەو بێ عادڵو دادپەروەر خۆیەتی، وە هەرکەسێ خەڵك بانگ بکا بۆ پەیڕەوی قورئان و رەفت کردن پێی ئەوە بە راستی ملی رێی راستی گرتووەو خودا شارەزای شەقامەڕێی راستو دروستی دەکا جا ئەی حاریثی ئەعوەر! ئەم پەندو قسە جوان و نەستەقانە لە گوێ بگرە (ت-س/غ).

٣٦٠٥- عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى قَرَأَ طه وَيس قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ بِأَلْفِ عَامٍ، فَلَمَّا سَمِعَتِ الْمَلاَئِكَةُ الْقُرْآنَ قَالَتْ: طُوبَى لأُمَّةٍ يَنْزِلُ هَذَا عَلَيْهَا، وَطُوبَى لأَجْوَافٍ تَحْمِلُ هَذَا، وَطُوبَى لأَلْسِنَةٍ تَتَكَلَّمُ بِهَذَا. رَوَاهُ البغوى فى المصابيح[١٦]:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: خودای گەورە (بە هەزار ساڵ بەر لە دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی) سوورەتی (طه)و سوورەتی (يس) دەخوێنێ، کاتێ فریشتەکان قورئان دەبیستن دەڵێن: طووبا (ناوی درەختێکە لە بەهەشتا) بۆ ئەو گەلە بەختەوەرەی کە ئەم قورئانە بە پیتو فەڕەی بۆ دەچێ، وە درەختی طووبا بۆ ئەو سینگەی ئەم قورئانەی تیایە، وە طووباو خێرو خۆشی بۆ ئەو زمانە شیرینەی کە ئەمە دەخوێنێ (بەغەوی).

٣٦٠٦- ورد في الشَّرح: وحُكي عن الإمام أحمد (رضي الله عنه) أنَّه رأى رَبَّهُ في المنام عدَّة مرّاتٍ فقال: والله إن رأيته مرَّةً أخرى لأسألنه أيُّ شيءٍ يُقرِّب العبد إلى

(١٦) سكت عن درجته الشارح.

ربَّه. فرأى ربَّه جلَّ شأنه فقال: يا ربِّ بأيِّ شيءٍ يتقرَّب العبد إليك؟ قال: بتلاوة كلامي يا أحمد. قال: فهم المعنى أم لم يفهم يار ربِّ؟ قال: فهم المعنى أو لم يفهم[١٧]:

دانەر (خودای لێ رازی بێ) لە شەرحەکەیدا دەڵێ: هەقایەتێ لە ئیمامی ئەحمەدەوە (خودای لێ رازی بێ) دەگێڕنەوە کە گەلێ جار لە خەودا بە خزمەت خودا دەگا، جارێ دەڵێ: بە خودا ئەگەر ئەم جارە ببینم عەرزی دەکەم کەچی شتێ زۆر باش بەندە لە خودای خۆی نزیك دەکاتەوە، کاتێ پەروەردگاری بە خەو دەبینێ پرسیارەکەی لێ دەکا، دەفەرموێ: ئەی ئەحمەد! بە خوێندن و دەورکردنەوەی قورئان کە فەرمایشت و کەلامی خۆمە، دەڵێ: خودایە! تێی بگاو تێی نەگا؟ دەفەرموێ: بەڵێ لە مەعنای تێ بگاو تێ نەگا. کەواتە:

بـرا! مـژدە بـێ نـەوەی رەشـخوێنە
شـیری نـاپوختی نـاو خـوڕو خوێنـە!
وەلێ بـە زوویـی دەردەچـێ لـە کـڵ
دەبـێ بـە گـوڵی زادەی داکـی گـڵ!
کـوردە! بـە راسـتی نەشـقی قورئـانی
قورئـان دەخـوێنی و مانـای نـازانی!

## ٧٧) هەڕەشەکردن لە فەرامۆشکردنی قورئان : (التحذير من نسيان القرآن)

٣٦٠٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّمَا مَثَلُ صَاحِبِ الْقُرْآنِ كَمَثَلِ صَاحِبِ الإِبِلِ الْمُعَقَّلَةِ إِنْ عَاهَدَ عَلَيْهَا أَمْسَكَهَا وَإِنْ أَطْلَقَهَا ذَهَبَتْ[١]:

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: قورئان خوێن وەك خاوەن ووشتری مەڕبەندکراو وایە، چۆن ئەو

---

[١٧] اثر وروٰيا يستأنس به

[١] بخاری. فضائل القرآن: ٥٠٣١ = ١٧٣٤ تجريد/ ٤ / ٥٤٠. مسلم. صلاة المسافرين: ١٨٣٦.

ئەگەر سەرپەرشتی ووشترەکانی بکا ئەوە لە دەستی ناچن‌و بە دەستیەوە دەمێنن، ئەمیش هەروەها ئەگەر دەوری قورئانەکەی بکاتەوە لە بیری ناچێتەوە (ش).

٣٦٠٨- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: تَعَاهَدُوا الْقُرْآنَ فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَهُوَ أَشَدُّ تَفَصِّيًا مِنَ الإِبِلِ فِي عُقُلِهَا. رواهما الشيخان[٢]:

ئەبو مووسا (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: سەرەوکاری قورئان بکەن‌و هەمیشە دەوری بکەنەوە، دەسا بەوکەسە کە گیانی منی بە دەسە قورئان زووتر لە بیردەچێتەوە کاتێ دەوری نەکرێتەوە، هەتا ووشتر کاتێ لە پەت بەر دەبێ‌و بەلەسە دەبێ!! (ش).

٣٦٠٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: بِئْسَمَا لأَحَدِكُمْ أَوْ بِئْسَمَا لأَحَدِهِمْ أَنْ يَقُولَ نَسِيتُ آيَةَ كَيْتَ وَكَيْتَ بَلْ هُوَ نُسِّيَ اسْتَذْكِرُوا الْقُرْآنَ فَلَهُوَ أَشَدُّ تَفَصِّياً مِنْ صُدُورِ الرِّجَالِ مِنَ النَّعَمِ. رَوَاهُ الشيخان والترمذي[٣]:

عەبدوڵلا (خودای لێ رازی بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: چەندە خراپ‌و ناشیرینە بۆ ئادەمیزاد کە بڵێ من ئایەتێکی واوام لە بیرچۆتەوە بەڵکوو ئەوە چارەنووسی خودایی لە بیری بردۆتەوە کەوابوو بابڵێ: فیسارە ئایەتم لە بیر براوەتەوە! دەی هەمیشە دەوری قورئان بکەنەوەو بیکەن بە پیشەی هەمیشەییتان ئەگینا وەك چۆن ووشترو ماڵات کە لە پەت بەربوو ئەگەر چاوێری نەکرێ بەلەسە دەبێ قورئانیش ئاوا (بگرە خێراتریش) لە سینگی پیاو نائاشنا دەبێ ئەگەر سەرومڕ دەوری نەکرێتەوە (ش/ت).

---

[٢] بخاری. فضائل القرآن: ٥٠٣٣ = تجرید / ٤ / ٥٤١ ذ: ١٧٣٦. مسلم. صلاة المسافرین: ١٨٤١.

[٣] بخاری. فضائل القرآن: ٥٠٣٢ ، ٥٠٣٩ مسلم. صلاة: المسافرین، ١٨٣٨. ترمذي. قراءات: ٢٩٤٢. نسائی. إفتتاح: ٩٤٢.

٣٦١٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَتْ: سَمِعَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) رَجُلاً يَقْرَأُ بِاللَّيْلِ فَقَالَ: يَرْحَمُهُ اللَّهُ قَدْ أَذْكَرَنِي آيةً كَذَا وَكَذَا كُنْتُ أُنْسِيتُهَا مِنْ سُورَةِ كَذَا وَكَذَا. رَوَاهُ الثلاثة[٤]:

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: شەوێ پیاوێ لە مزگەوت قورئانی دەخوێند، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) گوێی لێی بوو، فەرمووی: رەحمەتی خودای لێ بێ، ئەم پیاوە فیسارە ئایەتی لە فیسارە سوورەت یاد خستمەوە، کە ئەو ئایەتەم لە یاد برابۆوە (ش/د).

٣٦١١- ➡ «ب- ١ز- ١١٨- ٣٥٩ف- ١١ تقدم برقم: ٧١٦/١١»[٥].

٣٦١٢- ورد في الشرح: ولأبي داود: ما من امرىءٍ يقرأ القرآن ثمَّ ينساه إلا لقي الله يوم القيامة أجذم[٦]:

دانەر (پڕ گۆڕی لە نووری قورئان بێ و لە گەردی گۆڕی بە سوورەی چاومان بێ) لە شەرحەکەدا دەڵێ: لەسەر گێڕانەوەی ئیمامی ئەبو داوود (خودای لێ رازی بێ) پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی: کەسێ قورئانی لەبەر بێ و بیخوێنێ و لەپاشا لەبەر کەمتەرخەمی خۆی لەبیری بچێ ئەوە رۆژی قیامەت بە گولی دەچێتەوە دیوانی خودا! خواپەنامان بدا.

## ٧٨) باسی دووەم: باسی ئاداب و دەستوورەکانی قورئان خوێندن و دەورکردنەوەی

## الباب الثاني: في آداب القراءة

قَالَ اللهُ تَعَالَى:- {وَرَتِّلِ الْقُرْآنَ تَرْتِيلًا – ٧٣ / ٤}.

---

[٤] بخاری. فضائل القرآن: ٥٠٣٨. مسلم. صلاة المسافرين: ١٨٣٤.

[٥] تقدم برقم: ٧١٦/١١ مجلد أول. تسلسل/ ١١٨.

[٦] سكت الشارح عن درجته.

واتـە: بـە هێـدی‌و شـێنەیی‌و مۆڵـەت‌و لەسـەرخۆ قورئـان بخوێنـە، وەك چـۆن دەنكـی قوبـووڵی برنجـی سـەیری دانـار دانـار دەوەسـتێ ئـاوا پیـت‌و حـەرف‌و وەقـف‌و مـەددەو شـەددەو سـەری ئایـەت‌و كۆتـایی بابـەت لـە یـەك جیابكـەرەوەو بـە جـوانی ئـەم صـیفەتانە لەسـەر شـێوەیەكی رەسـا ئـەدا بكـە، پەلەپـەل مەكـەو تێكـەڵ‌و پێكـەڵیان مەكـە بەسـەر یـەكا، كـە ئـاوا بـە ووردی نەوری قورئانت كردەوە دەچێتە ناو دڵتەوە!

٣٦١٣- عَنْ أنس (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ سُئِلَ كَيْفَ كَانَتْ قِرَاءَةُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: كَانَتْ مَدًّا، ثُمَّ قَرَأَ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، يَمُدُّ بِبِسْمِ اللَّـهِ، وَيَمُـدُّ بِـالرَّحْمَنِ، وَيَمُدُّ بِالرَّحِيمِ. رَوَاهُ البخاري[1]:

پرسـیار كـرا لـە ئەنـەس (خودای لێ رازی بێ): پێغەمبـەر (درووودی خودای لەسەر بێ) قورئـانی چـۆن دەخوێنـد؟ گـوتی: بـە مـەددەوە دەیخوێنـد، هەڵكـشاویی‌و داكشاوی رەچاو دەكرد، ئینجا ئەنەس بۆ نموونە (بسم الله الرحمن الرحيم)ی خوێند، لامی ئەڵلاو میمی رەحمان‌و حێی رەحیمی درێژكردەوە (ب/د).

٣٦١٤- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يُقَطِّعُ قِرَاءَتَهُ يَقُولُ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ثُمَّ يَقِفُ، الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ثُـمَّ يَقِـفُ، وَكَـانَ يَقْرَؤُهَا مَلِكِ يَوْمِ الدِّينِ. رَوَاهُ الترمذي[2]:

ئوممو سەلەمە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبـەر (درووودی خودای لەسەر بێ) كـە قورئانی دەخوێنـد بڕبڕی دەكردو لەسـەری ئایەتـەكاناو لـە شـوێنی پێویستا پـشووی دەداو لەسـەری دەوەسـتا، بـەم شـێوەیە: دەیفـەرموو: (الحمـد لله رب العالمين)و دەوەستا لە سـەری (الرحمن الـرحيم)و دەوەسـتا لەسـەری. پێغەمبـەر (درووودی خودای لەسەر بێ) ئەم ئایەتەی بەم شێوەیە دەخوێنـدەوە: (ملك يوم الـدين) (ت-س/غ).

---

[1] تجريد / ٤ ل - ٥٤١ رقم: ١٧٣٧ / ٥٠٤٦ ، ٥٠٤٥.

[2] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

٣٦١٥- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ له: لَوْ رَأَيْتَنِي وَأَنَا أَسْتَمِعُ لِقِرَاءَتِكَ الْبَارِحَةَ لَقَدْ أُوتِيتَ مِزْمَارًا مِنْ مَزَامِيرِ آلِ دَاوُدَ. رَوَاهُ الشيخان والترمذى[٣]:

➡ ب- ٥ز- ٦٣ل- ف- ٥= رقم: ٥ / ٣٥٣١ مجلد / ٥ تسلسل / ٦٣.

واتە: ئەم فەرموودەیە لە پێشەوە لە بەرگی پێنجەمدا ڕۆیشت، لە زنجیرە- ٦٣- لە لاپەڕە- ژمارەی فەرموودەکە لەوێ پێنجە.

گێڕانەوەی ئێرە پتریی هەیە ئاوایە: ئەبو مووسا (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: ئەگەر ئەمشەو چاوت لێم دەبوو، کە چۆن بەدڵو بە کوڵ گوێم لە دەوری قورئانی تۆ گرتبوو شادمان دەبووی، بە ڕاستی خودا دەنگو ئاوازێکی خۆشی پێت داوە، دەڵێی دەنگو ئاوازە خۆشەکەی داوودە (ش/ت).

٣٦١٦- عَنْ عَبْدَ اللّٰهِ بْنَ مُغَفَّلٍ (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُ) قَالَ: قَرَأَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عَامَ الْفَتْحِ فِي سِيرٍ لَهُ عَلَى رَاحِلَتِهِ سُورَةَ الْفَتْحِ فَرَجَّعَ فِي قِرَاءَتِهِ، قَالَ مُعَاوِيَةُ: لَوْلاَ خَوفى مَنْ إجتِماعَ الْنَّاسِ عَلَيَّ لَحَكَيْتُ لَكُمْ قِرَاءَتَهُ[٤]:

موعاوییەی کوڕی قوڕە دەڵێ: عەبدوڵلای کوڕی موغەففەل (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: ساڵی گرتن (فەتح)ی مەککە، لە سەفەرێکا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەسەر وولاخەکەیەوە بە دەم ڕۆیشتنەوە سوورەتی فەتحی خوێند، لەکاتی خوێندنەکەدا دەنگی خۆیی دەلەرانەوەو بە تێرو تەسەلی کرکی بە پیتەکان دەکرد، موعاوییە گوتی: دەترسم خەڵك کەڵەکەم لێ بکەن ئەگینا ئێستا بە جوانی لاسایی شێوەی قورئان خوێندنەکەی عەبدوڵلام بۆ دەکردنەوە (ش/د).

---

[٣] تقدم فى المجلد الخامس تسلسل / ٦٣ رقم: ٥/ ٣٥٣١.

[٤] بخاری. مغازی: ٤٢٨١ ، ٤٨٣٥ ، ٥٠٣٤ ، ٧٥٤٠ = تجريد / ٤ ل — ٣٢٩ ز: ١٥٨٦. مسلم. صلاة المسافرين: ١٨٥٠ ، ١٨٥١. أبو داود. صلاة: ١٤٦٧.

**٣٦١٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَا أَذِنَ اللَّهُ لِشَيْءٍ مَا أَذِنَ لِنَبِيٍّ حَسَنِ الصَّوْتِ بِالْقُرْآنِ يَجْهَرُ بِهِ. رواهما الثلاثة[٥]:**

**ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ: خودا لە هیچ شتێ وا بە حوسنی رەزا گوێ ناگرێ وەك گوێ دەگرێ لە پێغەمبەرێکی دەنگ خۆش یا لە قورئانخوێنێکی دەنگ خۆش کە بە ئاوازەی خۆش‌و بە مەقامی جوان قورئان بخوێنێ‌و بە شەوقەوە دەنگی لێ هەڵبڕێ! (ش/د).**

**٣٦١٨- ولأبي داود والبخاري تعليقاً: زَيِّنُوا الْقُرْآنَ بِأَصْوَاتِكُمْ لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَمْ يَتَغَنَّ بِالْقُرْآنِ[٦]:**

**حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: کاتێ قورئان دەخوێنن بە دەنگی خۆش بیخوێنن، ئەوەی بە سۆزکردن‌و دەنگی خۆش‌و نقام‌و مقام قورئان نەخوێنێ لە ئێمە نییە! (د/ب. بەڵام بوخاری بە تەعلیق ریوایەتی کردووە).**

**٣٦١٩- عن جُندب بن عبدالله (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عن النبي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قال اقرأوا القرآن ما ائتلفت عليه قلوبكم فإذا اختلفتم فقوموا عنه. رواه الشيخان[٧]:**

**جوندوبی کوڕی عەبدوڵلا (خودای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەوەندە قورئان بخوێنن کە دڵتان لە سەریەتی، بەڵام کە بێ تاقەت بوون یا قورئان خوێندنەکەتان سەری کێشا بۆ ناکۆکی‌و دووبەرەکی ئیتر هەڵسن‌و ئەو کۆڕە چۆڵ کەن‌و وازی لێ بێنن (ش).**

**٣٦٢٠- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: يَخْرُجُ فِيكُمْ قَوْمٌ تَحْقِرُونَ صَلاَتَكُمْ مَعَ صَلاَتِهِمْ، وَصِيَامَكُمْ مَعَ صِيَامِهِمْ، وَعَمَلَكُمْ مَعَ عَمَلِهِمْ، وَيَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لاَ يُجَاوِزُ حَنَاجِرَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينَ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ،**

---

[٥] بخاری. توحيد: ٧٥٤٤. مسلم. صلاة المسافرين: ١٨٤٤. أبو داود. صلاة: ١٤٧٣.

[٦] رواه البخاری تعليقا بين الرقمين ٥٠٢٣ و ٥٠٢٤. مسلم. صلاة المسافرين: ١٨٤٢. نسائی. إفتتاح: ١٠١٧.

[٧] بخاری. فضائل القرآن: ٥٠٦١ ، ٥٠٦٠.

يَنْظُرُ فِي النَّصْلِ فَلاَ يَرَى شَيْئًا، وَيَنْظُرُ فِي الْقِدْحِ فَلاَ يَرَى شَيْئًا، وَيَنْظُرُ فِي الرِّيشِ فَلاَ يَرَى شَيْئًا، وَيَتَمَارَى فِي الْفُوقِ[٨]:

**ئەبو سەعید** (خودای لێ رازی بێ) **لە پێغەمبەرەوە** (درودی خودای لەسەر بێ) **دەگێڕێتەوە، دەفەرموێ: هۆزێ (لە ناوتانا) پەیدا دەبن، نوێژو ڕۆژوو کردەوەی خۆتان لە چاو هی ئەوانا بە هیچ دادەنێن، بەڵام ئەو هۆزە کە قورئان دەخوێنن لە گەروویان ڕەت نابێ و ناچێتە ناو دڵیان، ئەوانە وا لە دین بەلەسە دەبن و لە ئایین دەردەچن وەك تیرێ بدا لە نێچیرێ و گورج بیسمێ و لێی دەرچێ ئاوا، تیر هاوێژەکە سەیری پەیکانەکە دەکا هیچ خوێن و ئەسەری پێکانی پێوە نابینێ تەماشای کلکی تیرەکە دەکا هیچی پێوە نابینێ، سەیری پەڕەی تیرەکە دەکا هیچی پێوە نابینێ، لە لەلەی شوێنی ژێیەکەشا بەشکە، کە خوێن و ئەسەری نێچیرەکەی پێوەیە یا نا واتە: چۆن ئەو تیرە ئەوەندە خێرا نەچیرەکە دەسمێ هیچ ناگرێتە خۆی لێی، ئەم هۆزەش ئاوا فڕیان بەسەر ئاییندارییەوە نامێنێ (ش/د/ت).**

٣٦٢١– عَنْ عَلِيٌّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: يَأْتِي فِي آخِرِ الزَّمَانِ قَوْمٌ حُدَثَاءُ الأَسْنَانِ، سُفَهَاءُ الأَحْلاَمِ، يقرأون القرآن لا يجاوز تراقيهم يَقُولُونَ مِنْ خَيْرِ قَوْلِ الْبَرِيَّةِ، يَمْرُقُونَ مِنَ الإِسْلاَمِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ، لاَ يُجَاوِزُ إِيمَانُهُمْ حَنَاجِرَهُمْ، فَأَيْنَمَا لَقِيتُمُوهُمْ فَاقْتُلُوهُمْ، فَإِنَّ قَتْلَهُمْ أَجْرٌ لِمَنْ قَتَلَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. رواهما الأربعة[٩]:

**عەلی** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: بە گوێی خۆم ژنەوتم لە زاری پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **دەیفەرموو، لە ئاخر زەمانا تاقمێکی دەمڕووتی منداڵکاری بێ دەماخی هەرزەی نەفام پەیدا دەبن، قورئان دەخوێنن بەڵام لە گەروویان**

---

[٨] بخاری. فضائل القرآن: ٥٠٥٧ ، ٥٠٥٨. مسلم. زکاة: ٢٤٥٢ — ٢٤٥٨ (تجرید/ ٤ / ١١٨رقم: ١٤٣٦ ، ٣٦١١).

[٩] تجرید/ ٤ ل — ١١٨ رقم: ١٤٣٦ / ٣٦١١ ، ٥٠٥٧ ، ٦٩٣٠. مسلم. زکاة: ٢٤٤٦ — ٢٤٥٨ ، ٢٤٥٩ — ٢٤٦٨. ابو داود. سنة: ٤٧٦٧. نسائی. تحریم الدم: ٤١١٣.

تێ ناپەڕێ، فەرموودەی سەروەری هەر دوو جیهانیش بە دەم دەڵێن‌و قورئانو حەدیث دەخوێنن‌و بە دیمەن باشترین قسە دەکەن، بەڵام ئەم تاقمە فڕیان بەسەر ئیسلامەتییەوە نییەو وەك تیرێ لە نێچیر دەرپەڕێ ئاوا بە خێرایی لە ئیسلام دەردەپەڕن، ئەمانە باوەڕیان لە گەروویان تێپەڕ ناکا، هەر بە دەم موسوڵمانن‌و رەفتارو کرداریان لە رەفتارو کرداری موسوڵمانان ناکا، جا لە هەرلایێ تووشی ئەمانە بوون بیان کوژن: چونکە بە راستی ئەوەی یەکێ لەمانە بکوژێ لە رۆژی قیامەتا پاداشی باشی بۆ هەیە!(ش/د/ت–رەمزای خوایان لێ‌بێ).

٣٦٢٢– عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ مَرَّ عَلَى قَاصٍّ يَقْرَأُ ثُمَّ سَأَلَ فَاسْتَرْجَعَ، ثُمَّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَقُولُ: مَنْ قَرَأَ الْقُرْآنَ فَلْيَسْأَلِ اللَّهَ بِهِ فَإِنَّهُ سَيَجِيءُ أَقْوَامٌ يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ يَسْأَلُونَ بِهِ النَّاسَ. رَوَاهُ الترمذى وحسنه[١٠]

عیمرانی کوڕی حوصەین (خودای لێ رازی بێ) قورئان خوێنێکی دی، قورئانی دەخوێندو لەپاشا سواڵی دەکرد وەك ئەمانەی ئێستا لەسەر شەقامەکان، دادەنیشن‌و قورئان دەخوێننو لەپ پان دەکەنەوە لە خەڵك بۆ سواڵ! جا عیمران گوتی: (إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعونَ!)، لەپاشا گوتی: ژنەوتم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: ئەوەی قورئان دەخوێنێ بارێزی نەشکێنێ‌و هەر لە خودا داوای شتی پێ بکا، چونکە کۆمەڵێ پەیدا دەبن، قورئان دەخوێنن‌و سواڵی لەم‌و لەو پێ دەکەن (ت:ح. واتە: تیرمیذی ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوەو بە حەدیثێکی حەسەنی داناوە) عیمران (خودای لێ رازی بێ) بۆیە ئیننالیلای کردووە چونکە سواڵکردن بە قورئانی بەوەی‌و موصیبەت داناوە.

٣٦٢٣– عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنِ عَمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): اقْرَإِ الْقُرْآنَ فِي شَهْرٍ قُلْتُ: إِنِّي أَجِدُ قُوَّةً حَتَّى قَالَ: فَاقْرَأْهُ فِي سَبْعٍ وَلاَ تَزِدْ عَلَى ذَلِكَ. رواه البخارى[١١]:

---

[١٠] حسن عند الترمذي:

**عەبدوڵڵای کوڕی عەمر** (خودایان لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی پێم: مانگی دەورێکی قورئان بکەرەوە عەرزم کرد: بە خۆمدا رادەپەرمووم کە بتوانم بە کەمتر خەتمەیێ تەواو بکەم تا فەرمووی: دەی بە حەفتەیێ خەتمەیێ بکەو لەوە زیاتری مەکە! (ب).**

**٣٦٢٤– وَعَنْهُ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ فِي كَمْ أَقْرَأُ الْقُرْآنَ؟ قَالَ: اخْتِمْهُ فِي شَهْرٍ قُلْتُ: إِنِّي أُطِيقُ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ قَالَ: اخْتِمْهُ فِي عِشْرِينَ قُلْتُ: إِنِّي أُطِيقُ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ قَالَ: اخْتِمْهُ فِي خَمْسَةَ عَشَرَ قُلْتُ: إِنِّي أُطِيقُ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ قَالَ: اخْتِمْهُ فِي عَشْرٍ قُلْتُ: إِنِّي أُطِيقُ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ قَالَ: اخْتِمْهُ فِي خَمْسٍ قُلْتُ: إِنِّي أُطِيقُ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ قَالَ: فَمَا رَخَّصَ لِي:[١٢]**

**دیسان ئەو گوتی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! بە چەند رۆژ خەتمێکی قورئان بکەم؟ فەرمووی: بەمانگی خەتمێ بکە. عەرزم کرد: دەتوانم بە کەمتریش خەتمێ بکەم، فەرمووی: دە بە بیست شەو خەتمێ بکە گوتم: دەتوانم بە کەمتریش بیکەم، فەرمووی: دە بە پازدە شەو خەتمەیێ بکە گوتم: دەتوانم: بە کەمتریش بیکەم، فەرمووی: دە بەدە شەو خەتمەیەکی بکە گوتم: دەتوانم بە کەمتریش تەواوی بکەم، فەرمووی: دە بە پێنج شەو خەتمەیەکی بکە گوتم: دەتوانم بە کەمتریش خەتمەیێ بکەم بەڵام ئیتر حەزرەت رێگەی کەمتری نەدام. (د/ت–س/ص).**

**٣٦٢٥– وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **قَالَ: لَمْ يَفْقَهْ مَنْ قَرَأَ الْقُرْآنَ فِي أَقَلَّ مِنْ ثَلاَثٍ. رواهما أَبُو دَاوُدَ والترمذي بسندين صحيحين[١٣]:**

**دیسان گوتی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئەوی بە سێ شەو کەمتر خەتمەیەکی قورئان بکا ئەوە لە دەستووری خوێندنی قورئان تێ نەگەیوە (د/ت–س/ص).**

---

[١١] بخاری. فضائل القرآن: ٥٠٥٤.

[١٢] بسند صحيح عند أبی داود والترمذي.

[١٣] بسند صحيح عند أبی داود والترمذي.

## ٧٩) دەشێ بە هۆش و گۆشەوە گوێ بۆ خوێندنی قورئان شل بکرێ:
## ینبغی إستماع القرآن بتدبر وخشوع

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُواْ لَهُ وَأَنصِتُواْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ – ٢٠٤}.

**خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی: هەر کاتێ و لەهەر شوێنێ قورئانی پیرۆز خوێنرایەوە پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانێ کە بێ دەنگبێ و گوێ بۆ قورئانەکە رابگرێ هەتا تەواو دەبێ.**

٣٦٢٦– عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): اقْرَأْ عَلَيَّ. قُلْتُ: أَقْرَأُ عَلَيْكَ وَعَلَيْكَ أُنْزِلَ قَالَ: إِنِّي أَشْتَهِي أَنْ أَسْمَعَهُ مِنْ غَيْرِي. قَالَ: فَقَرَأْتُ النِّسَاءَ حَتَّى إِذَا بَلَغْتُ (فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِنْ كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَؤُلاَءِ شَهِيدًا). قَالَ: كُفَّ أَوْ أَمْسِكْ فَرَأَيْتُ عَيْنَيْهِ تَذْرِفَانِ. رواه الشيخان[1]:

**عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: هەندێ قورئانم بۆ بخوێنە گوتم: قوربان! قورئان بۆ تۆ هاتووەو من بۆتی بخوێنم؟ فەرمووی: حەزدەکەم کەسێکی تر بیخوێنێ و من گوێی لێ بگرم جا منیش سوورەتی نیسائم بۆ خوێند تا گەیشتمە ئەم ئایەتە:**

{فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَؤُلاء شَهِيدًا – ٤/٤١}.

**واتە: جا ئەوە دەبێ حاڵی ئەو کافرو بێ بڕوایانە لە رۆژی قیامەتا چۆن بێ، لەو کاتەدا کە لە هەموو ملەتێ شایەتێ بێنن بۆ شایەتی بدا لەسەر بێ بڕوایی و نامەردی ئەوان، وە تۆیش بێنین بۆ شایەتی دان لەسەریان ئیتر کە گەیشتمە ئێرە فەرمووی: بەس یا فەرمووی: بەسە کە تەماشای حەزرەتم کرد ئەسر هۆن هۆن بە چاوەکانیا دەهاتە خوارەوە (ش).**

---

[1] بخاری. فضائل القرآن: ٥٠٥٠ ، ٤٩٦٠ ، ٤٩٥٩ ، ٤٩٦١. مسلم. صلاة المسافرين: ١٨٦٢ — ١٨٦٣ + ٦٢٩٣. (تجريد/ ٤ / ١٩ رقم: ١٤٩٣ = ٣٨٠٩ فتح).

٣٦٢٧- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لأُبَيِّ بن كعبٍ: إِنَّ اللَّهَ أَمَرَنِي أَنْ أَقْرَأَ عَلَيْكَ (لَمْ يَكُنِ الَّذِينَ كَفَرُوا). قَالَ: وَسَمَّانِي لَكَ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: فَبَكَى. رواه مسلم والترمذي والله أعلم[٢]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودو سڵاوی خودای گەورەی لەسەر بێ) بە ئوبەییەی کوڕی کەعبی فەرموو: خودا فەرمانی پێ کردووم کە سوورەتی: لم یکن الذین کفروا لە لای تۆ بخوێنم گوتی: ئوبەییە گوتی: بە ناوی خۆم ناوی هێنام بۆت؟ فەرمووی: بەڵێ ئەنەس گوتی: جا لە خۆشیانا ئوبەییە دەستی کرد بە گریان (ت/ب/ت) ئیمامی نەوەوی‌و عەللامەی عەینی (رەزای خودایان لێ بێ) دەڵێن: بە پێی دەقی ئەم فەرموودەیە ئوبەییە تەنیا کەسێ بووەلە هاوڕێیان، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) قورئانی لەلای خوێندووە. منیش دەڵێم:

مامۆستا لەلای فەقێی بخوێنێ

بەهرەی وا هەموو دنیا دەهێنێ!

## ٨٠) لەکاتی خوێندنی قورئانا سەکینە (واتە: مایەی ئارام: ئارام بەخش)و فریشتەی رەحمەت دێنەخوارەوە

## تنزل السكينة لقراءة القرآن

## باسی سێیەم: باسی گەورەیی چەن سوورەتێ

٣٦٢٨- عَنِ الْبَرَاءِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَجُلٌ يَقْرَأُ سُورَةَ الْكَهْفِ وَعِنْدَهُ فَرَسٌ مَرْبُوطٌ بِشَطَنَيْنِ فَتَغَشَّتْهُ سَحَابَةٌ فَجَعَلَتْ تَدُورُ وَتَدْنُو وَجَعَلَ فَرَسُهُ يَنْفِرُ مِنْهَا فَلَمَّا أَصْبَحَ أَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ فَقَالَ: تِلْكَ السَّكِينَةُ تَنَزَّلَتْ لِلْقُرْآنِ. رواه الشيخان والترمذي نسأل الله السَّكينة والهداية آمين[١]:

---

[٢] بخاری. تفسیر: ٤٩٦٠. مسلم. صلاة المسافر: ١٨٦٢ ، ٦٢٩٣. راجع الرقم السابق عليه.

[١] بخاری. فضائل القرآن: ٥٠١١. مسلم. صلاة المسافرين: ١٨٥٣.

بەراء (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ پیاوێ، کە ئوسەیدی کوڕی حوضەیر بوو سوورەتی کەهف دەخوێنێ، لەوکاتەدا ماینەکەی لە لایەوە بە دوو گوریس بەسرابۆوە، لەکاتی قورئان خوێندنەکەدا پەڵە هەورێ دەدا بەسەریاو دەیگرێتە ناوو دەست دەکا بە گڕ خواردن بە دەوریاو لێی نزیك دەبێتەوە، ماینەکەشی کە ئەمە دەبینێ سڵی لێ دەکاو هەڵ دەسڵەمێتەوە، جا بۆ بەیانی هاتە لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئەمەی بۆ گێڕایەوە، فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): ئەوە ئارامی و فریشتەی ئاسایش بوون لەبەر خاتری قورئانەکە داباریون! (ش/ت).

## ٨١) باسی گەورەیی سوورەتی فاتیحاو سوورەتی بەقەرەو سوورەتی ئالی عیمران : (الباب الثالث: في فضائل السور فضل الفاتحة والبقرة وآل عمران)

٣٦٢٩- عَنْ أَبِي سَعِيدِ بْنِ الْمُعَلَّى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنْتُ أُصَلِّي فَدَعَانِي النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَلَمْ أُجِبْهُ قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي كُنْتُ أُصَلِّي. قَالَ: أَلَمْ يَقُلِ اللَّهُ (اسْتَجِيبُوا لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ) ثُمَّ قَالَ أَلاَ أُعَلِّمُكَ أَعْظَمَ سُورَةٍ فِي الْقُرْآنِ قَبْلَ أَنْ تَخْرُجَ مِنَ الْمَسْجِدِ. فَأَخَذَ بِيَدِي فَلَمَّا أَرَدْنَا أَنْ نَخْرُجَ قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّكَ قُلْتَ لأُعَلِّمَنَّكَ أَعْظَمَ سُورَةٍ مِنَ الْقُرْآنِ. قَالَ (الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ) هِيَ السَّبْعُ الْمَثَانِي وَالْقُرْآنُ الْعَظِيمُ الَّذِي أُوتِيتُهُ. رواه البخاري وابو داود والترمذي وزاد: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مَا أُنْزِلَتْ فِي التَّوْرَاةِ وَلاَ فِي الإِنْجِيلِ وَلاَ فِي الزَّبُورِ وَلاَ فِي الْفُرْقَانِ مِثْلُهَا وَإِنَّهَا سَبْعٌ مِنَ الْمَثَانِي وَالْقُرْآنُ الْعَظِيمُ الَّذِي أُعْطِيتُهُ[١]:

ئەبو سەعیدی کوڕی موعەللا (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ لە مزگەوت نوێژم دەکرد، لە ناو نوێژەکەدا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بانگی کردم، وەرامم نەدایەوە، کە نوێژەکەم تەواو کرد چوومە خزمەتی، فەرمووی: بۆچی بانگم کردی و نەهاتی؟ عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەو کاتەی کە تۆ

[١] بخاري. فضائل القرآن: ٥٠٠٦.

بانگت كردم نوێژم دەكرد، بۆیە وەرامم نەدایتەوە، فەرمووی: بۆچی ئەی خودا نافەرمویٚ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اسْتَجِيبُواْ لِلّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُم لِمَا يُحْيِيكُمْ – ٨٢٤}.

واتە: ئەی كەسانێ كە باوەڕتان هێناوە بە ئایینی ئیسلام! بەپەلە وەلاّمی خوداو پێغەمبەری خودا بدەنەوەو بە زوویی بچن بە دەنگیانەوە هەر كاتێ پێغەمبەری من بانگی كردن بۆ سەر ئەو كارانەی كە دەبن بە مایەی سەربەرزی ژینی جیهانتانو بەهۆی روو سووریو ژیانی جاویدانی خۆشی بێ ئێشو ئازاری ئەو جیهانتان لەپاشا فەرمووی: هۆشیاربە! لە پێش ئەوەدا كە لە مزگەوت بچیتە دەرێ سوورەتێكت نیشان دەدەم كە گەورەترین سوورەتە لەناو قورئاناو خێرو پاداشی زیاترە ئینجا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی گرتم جا كەویستمان لە مزگەوت دەربچین عەرزم كرد: ئەی پێغەمبەری خودا! تۆ فەرمووت: سوورەتێكت پێ نیشان دەدەم گەورەترین سوورەتە لە قورئانا فەرمووی: ئەو سوورەتە (الحمد لله رب العالمين)ە، كە ئەو (سبعا من المثانی)و (والقرآن العظيم)ەیە كە خودا داوێتی بە من كە لەم ئایەتەدا دەفەرموێ:

{وَلَقَدْ آتَيْنَاكَ سَبْعًا مِّنَ الْمَثَانِي وَالْقُرْآنَ الْعَظِيمَ – ١٥/٨٧}.

واتە: بە راستی ئێمە حەوت ئایەتی قورئانمان، داوە بە تۆ كە لە هەموو رۆژو شەوێكا چەن جار لە ناو نوێژدا دوویات دەكرێنەوە" سەرەڕای ئەم حەوتەی دووبارە پاتەیش باقی قورئانم پێ داوی كە گشتی گەورەیەو خاوەن پایەو مایەیە (ب/د/ت) تیرمیذی ئەمەی پترە: بەو كەسە كە گیانی منی بە دەسە نە لە تەورات و نە لە ئینجیلو نە لە زەبوورو نە لە قورئانا مانەندی ئەم سوورەتە نەهاتۆتە خوارەوە، ئەمە ئەو (سبعاً من المثاني والقرآن العظيم)ەیە كە خودا داوێتی پێم.

٣٦٣٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: (الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ) أُمُّ الْقُرْآنِ وَأُمُّ الْكِتَابِ وَالسَّبْعُ الْمَثَانِي. رواه أبو داود والترمذي وصححه[٢]:

---

[٢] صحيح عند الترمذي.

ئـەبو هـورەیرە (خـودای لێ ڕازی بـێ) لـە حەزرەتـەوە (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفەرموێ: سوورەتی (الحمد لله رب العالمين) سەرچاوەی قورئانەو دایکانـەی نامەی خودایەو حەوتەی دووپاتەیە (د/ت:ص).

٣٦٣١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: بَيْنَمَا جِبْرِيلُ قَاعِدٌ عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) سَمِعَ نَقِيضًا مِنْ فَوْقِهِ فَرَفَعَ رَأْسَهُ فَقَالَ هَذَا بَابٌ مِنَ السَّمَاءِ فُتِحَ الْيَوْمَ لَمْ يُفْتَحْ قَطُّ إِلاَّ الْيَوْمَ فَنَزَلَ مِنْهُ مَلَكٌ فَقَالَ هَذَا مَلَكٌ نَزَلَ إِلَى الأَرْضِ لَمْ يَنْزِلْ قَطُّ إِلاَّ الْيَوْمَ فَسَلَّمَ وَقَالَ أَبْشِرْ بِنُورَيْنِ أُوتِيتَهُمَا لَمْ يُؤْتَهُمَا نَبِيٌّ قَبْلَكَ فَاتِحَةُ الْكِتَابِ وَخَوَاتِيمُ سُورَةِ الْبَقَرَةِ لَنْ تَقْرَأَ بِحَرْفٍ مِنْهُمَا إِلاَّ أُعْطِيتَهُ. رواه مسلم[٣].

ئیبنـو عـەبباس (خودایـان لێ ڕازی بـێ) گـوتی: جـارێ جوبرائیـل (دروودی خودای لەسەر بێ) لای پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دانیشتبوو، لەوکاتـەدا وەك دەرگـا بکرێتـەوە جیڕەیـەکی لـە ژوور سـەریەوە بیست، جوبرائیل (دروودی خودای لەسەر بێ) سـەری هـەڵبڕیو فـەرمووی: ئـەوە چرکەی دەرگایـەکی ئاسمـان بوو، ئەوەتی هەیـە نەکراوەتـەوە ئـەمڕۆ نـەبێ فریـشتەیەکی لێ هاتـە خـوارەوە، جوبرائیل (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: ئـەم فریـشتەیەش ئـەمڕۆ نـەبێ قـەت دانەبـەزیوە بـۆ سـەر زەوی جـا فریـشتەکە سـڵاوی کـردو فـەرمووی: ئـەی موحەممەد! موژدە بێ لێت، خودا دوو چرای زۆر ڕووناکی داوە بە تۆ، کە لـە پێش تۆدا شتی وا نایـابی بـە هیچ پێغەمبـەرێکی تـر نەبەخشیوە، یـەکێکیان سوورەتی فاتیحایـە کـە دێباچـەی قورئانـە، یـەکێکیان ئاخرو ئۆخری کلکـەی سـوورەتی بەقەڕەیـە، هـەر پیتـێ لـەم دوو سـوورەتە بخـوێنی پاداشـی باشـی لەسەر وەردەگری (م).

٣٦٣٢- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيُّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: اقْرَءُوا الْقُرْآنَ فَإِنَّهُ يَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ شَفِيعًا لأَصْحَابِهِ اقْرَءُوا الزَّهْرَاوَيْنِ الْبَقَرَةَ وَسُورَةَ آلِ عِمْرَانَ فَإِنَّهُمَا تَأْتِيَانِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَأَنَّهُمَا غَمَامَتَانِ أَوْ كَأَنَّهُمَا غَيَايَتَانِ أَوْ كَأَنَّهُمَا فِرْقَانِ مِنْ طَيْرٍ

---

[٣] مسلم. صلاة المسافرين: ١٨٧٤.

صَوَافٌ تُحَاجَّانِ عَنْ أَصْحَابِهِمَا اقْرَءُوا سُورَةَ الْبَقَرَةِ فَإِنَّ أَخْذَهَا بَرَكَةٌ وَتَرْكَهَا حَسْرَةٌ وَلاَ تَسْتَطِيعُهَا الْبَطَلَةُ. رواه مسلم والترمذي. وفي رواية: يُؤْتَى بِالْقُرْآنِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَأَهْلِهِ الَّذِينَ كَانُوا يَعْمَلُونَ بِهِ تَقْدُمُهُ سُورَةُ الْبَقَرَةِ وَآلُ عِمْرَانَ وَضَرَبَ لَهُمَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ثَلاَثَةَ أَمْثَالٍ مَا نَسِيتُهُنَّ بَعْدُ قَالَ: كَأَنَّهُمَاإِلَى آخِرِهِ[٤]:

ئەبو ئومامەی باهیلی (خودای لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: قورئان بخوێنن، چونكە لە ڕۆژی قیامەتا قورئان دێ، دەبێ بە تكاكار بۆ هاوڕێیانی خۆی! ئەم دوو سوورەتە درەخشانە بخوێنن، واتە: سوورەتی بەقەرەو سوورەتی ئالی عیمران، كە ناوبانگیان زەهراوەینە واتە: دوو چرای درەخشان چونكە ئەو دوو سوورەتە لە ڕۆژی قیامەتا دێن لە دووپەڵە هەور دەچن یا لە دوو سابات دەكەن، یا وەك دوو پۆلەمەل و ڕەوە باڵندە وان كە لە حەوا ریز دەبەستن و باڵیان ڕەپ دەكەن، حاڵیان وایە لەسەر دۆستان و یارانی خۆیان دەكەنەوەو لەسەریان هەڵ دەدەنێ بە تایبەتی سوورەتی بەقەرە بخوێنن، چونكی بە ڕاستی وەرگرتن و خوێندنی پیت و فەڕو بەرەكەتەو لەكیس چوونی جێی داخ و خەفەتە سەرەڕای ئەوەیش جادووگەرانیش دەرەقەتی نایەن و ئەوی لە بەری بێ یا بە نووسراوی هەڵی بگرێ سیحرو جادوو كاری لێ ناكا (م/ت).

لە گێڕانەوەیەكا: ڕۆژی قیامەت قورئان و یارانی قورئان دێنن، مەبەست لە یارانی ئەو كەسانەیە كە لە جیهانا ڕەفت (عەمەل)ی پێ دەكەن، سوورەتی بەقەرەو سوورەتی ئالی عیمران وە پێش قورئانەكە دەكەون. قسە گێڕەوە (ڕاوی) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم دووەی چووان بە سێ شت هێشتا بە باشی ئەو سێ شتەم لە یاد ماون، فەرمووی: چونكە ئەو دوو سوورەتە ڕۆژی قیامەت دێن لە دوو پەڵە هەور دەچن... تاد.

---

[٤] مسلم. صلاة المسافرين: باب فضائل القرآن وما يتعلق به: ١٨٧١.

٣٦٣٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ بَعَثَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بَعْثًا وَهُمْ ذُو عَدَدٍ فَاسْتَقْرَأَهُمْ فَقَرَأَ كُلُّ رَجُلٍ مِنْهُمْ مَا مَعَهُ مِنَ الْقُرْآنِ فَأَتَى عَلَى رَجُلٍ مِنْهُمْ مِنْ أَحْدَثِهِمْ سِنًّا فَقَالَ: مَا مَعَكَ يَا فُلَانُ؟ قَالَ: مَعِي كَذَا وَكَذَا وَسُورَةُ الْبَقَرَةِ. قَالَ: أَمَعَكَ سُورَةُ الْبَقَرَةِ. فَقَالَ نَعَمْ. قَالَ: فَاذْهَبْ فَأَنْتَ أَمِيرُهُمْ. فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ أَشْرَافِهِمْ وَاللّٰهِ يَا رَسُولَ اللّٰهِ مَا مَنَعَنِي أَنْ أَتَعَلَّمَ سُورَةَ الْبَقَرَةِ إِلاَّ خَشْيَةَ أَلاَّ أَقُومَ بِهَا. فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) تَعَلَّمُوا الْقُرْآنَ فَاقْرَءُوهُ وَأَقْرِئُوهُ فَإِنَّ مَثَلَ الْقُرْآنِ لِمَنْ تَعَلَّمَهُ فَقَرَأَهُ وَقَامَ بِهِ كَمَثَلِ جِرَابٍ مَحْشُوٍّ مِسْكًا يَفُوحُ بِرِيحِهِ كُلُّ مَكَانٍ وَمَثَلُ مَنْ تَعَلَّمَهُ فَيَرْقُدُ وَهُوَ فِي جَوْفِهِ كَمَثَلِ جِرَابٍ وُكِئَ عَلَى مِسْكٍ(٥):

**ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: جارێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەشکرێکی گەورەی نارد بۆ شوێنێ، یەکە یەکە داوای لێ دەکردن کە چەندەی قورئان لەبەرە بیخوێنێ، جا هەر پیاوێ چەندی قورئان لەبەر بوو دەیخوێند، تا سەرە هاتە سەر پیاوێ لە گشتیان جەهێڵتر بوو، فەرمووی پێی: ئەی فیسار! تۆ چیت لەبەرە؟ گوتی: ئەوەو ئەوەو سوورەتی بەقەڕەش، فەرمووی: ئەدیی سوورەتی بەقەڕەت لەبەرە؟ گوتی: بەڵێ لەبەرمە، فەرمووی: دەبڕۆ تۆ فەرماندەیانیت! پیاوێ لە خانەدانەکانیان گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من بۆیە سووڕەتی بەقەڕە فێر نەبووم ترسام مەبادا بە باشی سەرپەرشتی ئەوم بۆ نەکرێ، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: قورئان فێر بن، هەم خۆتان بیخوێنن و هەم بە خەڵکی تریشی بخوێنن، چونکی ئەو کەسەی کە فێری قورئان دەبێ و دەیخوێنێ و ئەرکی بەجێ دێنێ وەك هەمانەی پڕ لە میسك وایە، بۆ نەخۆشەکەی دەمار دەمار بە هەموو لایەکا دەڕوا، بەڵام ئەوکەسەی کە فێری دەبێ و لەبەری دەکاو دەخەوێ و قورئانەکە لە سینگیایە ئەوە وەك هەمانەی پڕ لە میسکی دەم دووراو وایە (ت-ح/ح).**

---

(٥) رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

٣٦٣٤- وَعَنْهُ عِنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لاَ تَجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ مَقَابِرَ وَإِنَّ الْبَيْتَ الَّذِى تُقْرَأُ فِيهِ الْبَقَرَةُ لاَ يَدْخُلُهُ الشَّيْطَانُ. رواهما الترمذي[٦]:

دیسان ئەو لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ماڵەكانتان مەكەن بە گۆڕخانەی چۆڵو هۆڵ، ئەو ماڵەشی سوورەتی بەقەڕەی تیا بخوێنرێ شەیتانی تێ ناچێ (ت-ح/ص) ➡ «ب- ١ز- ١٨٦ل- ٨٠٥ف- ٢+ ف - ٣+ ف -٤». تقدم برقم: ٢ / ٩٩٩ و ٣ ١٠٠٠ و ٤ / ١٠٠١ مجلد اول. تسلس: ١٨٦.

## ٨٢) گەورەیی ئایەتەلكورسیو كلكەی بەقەرە
## فضل آية الكرسي وأواخر البقرة

٣٦٣٥- عَنْ أُبَىِّ بْنِ كَعْبٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عِنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: يَا أَبَا الْمُنْذِرِ أَتَدْرِى أَىُّ آيَةٍ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ مَعَكَ أَعْظَمُ ». قَالَ قُلْتُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ « يَا أَبَا الْمُنْذِرِ أَتَدْرِى أَىُّ آيَةٍ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ مَعَكَ أَعْظَمُ ». قَالَ قُلْتُ اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَىُّ الْقَيُّومُ. قَالَ فَضَرَبَ فِى صَدْرِى وَقَالَ: وَاللَّهِ لِيَهْنِكَ الْعِلْمُ أَبَا الْمُنْذِرِ. رواه مسلم وأبو داود[١]:

ئوبەییەی كوڕی كەعب (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرمووم: ئەی باوكی مونزیر! ئایا دەزانی لەو قورئانەی كە لە بەرتە كام ئایەتەی گەورەترە؟ گوتم: خوداو پێغەمبەری خودا باشتر دەزانن، فەرموویەوە: ئەی ئەبو مونزیر! ئایا دەزانی لەو قورئانەی كە لە بەرتە كام ئایەتەی گەورەترە؟ گوتی: گوتم: ئایەتەلكورسی كە دەفەرمووی:

{اللّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ لاَ تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلاَ نَوْمٌ لَّهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ مَن ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلاَّ بِإِذْنِهِ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلاَ

---

[٦] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[١] مسلم. صلاة المسافرين: ١٨٨٢. أبو داود. صلاة: ١٤٦٠.

يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِّنْ عِلْمِهِ إِلاَّ بِمَا شَاء وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَلاَ يَؤُودُهُ حِفْظُهُمَا وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ – ٢ /٢٥٥– سورة البقرة}.

واتە: خودای راستو دروست تەنیا یەزدانی پاکە، خودایەکی زیندووی نەمرە، هەربووەو هەر دەبێ، نە سەرەتای هەیەو نە کۆتایی، خودایەکی پایەدارو راوەستاوو راگری هەردوو جیهانەو مایەی بوونو مانو مانەوەی هەموو شتێکە، خودایەکی بێ چوونەو دوورە لە نیشانەی دروستبوون (سیفەتی حودووث) لەبەر ئەوە نە وەنەوز دەیگرێو نە خەوی لێ دەکەوێ، بەکەمو زۆر فەرامۆشی بەسەردا نایێ، سەرو خوار، ئاسمانو زەوی، بە مانگو خۆرو کاکەشان هەمووی هی ئەوەو موڵكو سامانی خۆیەتیو خۆی پاشای دەستبەرەڵڵایەتیو چی حەزکا لێی دەکاو کەس مافی ئەوەی نییە بڵێ لەل! کێ رادەی ئەوەی هەیە کە بەبێ فەرمانو رەزای خۆی کە بوێرێ تکا بکا لەلای ئەو پاشا بێباكو بەسامو شکۆیە بۆ کەسێکی تر، مەگەر بە فەرمانی خۆیو خۆی رێگە بدا!؟ خودای گەورە هەموو شتێ دەزانێ، هیچی لێ وون نابێ، دووریو نزیکیو رابووردوو ئێستاو داهاتوو بۆ زانستی ئەو چون یەکە، ئاگای لە بەرو دوای دروستکراوانی خۆیەتی وەلێ مەخلووقات پەی بە هیچ شتێ لە عیلمی خودا نابەن، مەگەر خوا خۆی خواستی لەسەر ئەو شتە بێ، تەختی بارەگای خودا (وەندی ئەوەندە مەزنو گەورەو گوشادە بە فەرەحی جێی هەموو ئاسمانەکانو زەوی تیا دەبێتەوە)، واتە ئەم بوونەوەرە سەرو خوارو دنیاو قیامەتی لە چاو عالەمی کورسیدا (کە عالەمێکی تایبەتیەو، هەر خوا خۆی دەزانێ چییەو چۆنە) وەکوو تنۆك بە دەریایە، راگرتنو پاراستنی ئەم دوو جیهانی ئاسمانو زەوییە کەمترین ئەركو شەکەتیو گرانی ناخاتە سەر شانی گەورەیی خودا، لە راستیدا گەورەی بە راستی کە خاوەنی پایە بەرزی راستەکی بێ بەس خودایە، پایە بەرزیو گەورەیی دروستکراوانی هەمووی مەجازییەو بێ شانو بێ نیشانە ئوبەیی گوتی: کە وام گوت دەستی دا بە سینگماو فەرمووی: ئافەریم بۆ

خۆت، بەخودا پێکات، کەواتە عیلمت پیرۆزبێ و زانستت نۆش بێ ئەی باوکی مونزیر! (م/د).

٣٦٣٦- عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) أَنَّهُ كَانَتْ لَهُ سَهْوَةٌ فِيهَا تَمْرٌ فَكَانَتْ تَجِيءُ الْغُولُ فَتَأْخُذُ مِنْهُ قَالَ فَشَكَا ذَلِكَ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: فَاذْهَبْ فَإِذَا رَأَيْتَهَا فَقُلْ بِسْمِ اللَّهِ أَجِيبِي رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ فَأَخَذَهَا فَحَلَفَتْ أَنْ لاَ تَعُودَ فَأَرْسَلَهَا فَجَاءَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: مَا فَعَلَ أَسِيرُكَ. قَالَ حَلَفَتْ أَنْ لاَ تَعُودَ فَقَالَ: كَذَبَتْ وَهِيَ مُعَاوِدَةٌ لِلْكَذِبِ قَالَ فَأَخَذَهَا مَرَّةً أُخْرَى فَحَلَفَتْ أَنْ لاَ تَعُودَ فَأَرْسَلَهَا فَجَاءَ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: مَا فَعَلَ أَسِيرُكَ؟ قَالَ: حَلَفَتْ أَنْ لاَ تَعُودَ. فَقَالَ: كَذَبَتْ وَهِيَ مُعَاوِدَةٌ لِلْكَذِبِ. فَأَخَذَهَا فَقَالَ مَا أَنَا بِتَارِكِكِ حَتَّى أَذْهَبَ بِكِ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَتْ إِنِّي ذَاكِرَةٌ لَكَ شَيْئًا آيَةَ الْكُرْسِيِّ اقْرَأْهَا فِي بَيْتِكَ فَلاَ يَقْرَبُكَ شَيْطَانٌ وَلاَ غَيْرُهُ. قَالَ فَجَاءَ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: مَا فَعَلَ أَسِيرُكَ؟ قَالَ فَأَخْبَرَهُ بِمَا قَالَتْ. قَالَ: صَدَقَتْ وَهِيَ كَذُوبٌ. رواه الترمذي والبخاري[٢]:

ئەبو ئەییوبی ئەنصاری (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: چەرداخێکم هەبوو، خورمای تیابوو، مێردەزمە (کە پێشی دەوترێ حۆلی بیابان) دەهاتن لێیان دەبرد، کە سکاڵای ئەوەم کرد لەلای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: برۆ هەرکاتێ هاتەوە بڵێ: بە ناوی خودا، فەرمانت پێ دەکەم کە دەبێ لە گەڵم بێی بۆ لای پێغەمبەری خودا گوتی: بەلام سوێندی خوارد کە ئیتر نایەتەوە منیش بەرمدا، جا چووم بۆ لای حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: دیلەکەت چی بەسەر هات؟ گوتم: سوێندی خوارد کە ئیتر نایەتەوە، فەرمووی: درۆ دەکات، درۆزنە دێتەوە گوتی: جارێکی تریش گرتمەوە، دیسان سوێندی خواردەوەکە جارێکی دیی نایەتەوە، منیش بەرەڵام کردەوە، دیسان چوومەوە بۆ لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: چیت لە دیلەکەت کرد؟ عەرزیم کرد: سوێندی خواردەوە کە ئیتر

---

[٢] بخاری. زکاة: ٢٣١١ ، ٣٢٧٥ ، ٥٠١٠.

نەیەتەوە، فەرمووی: درۆ دەکات درۆزنە دێتەوە بەڵام لە سەری جاری سێیەما (کە گرتم) گوتم: ئەمە دواجارە بەرت نادەم تا نەتبەم بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) هەتا جەزرەبەت بدا، گوتی: بەرم دەو مەم بە شتێکت پێ دەڵێم، لە ماڵەکەتا ئایەتەلکورسی بخوێنە ئیتر شەیتان و جنۆکەو شتی وا نزیکت ناکەونەوە، دیسانەوە چوومەوە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەوە: دیلەکەتت چی لێکرد؟ منیش قسەی مێردەزمەکەم بۆیگێڕایەوە، فەرمووی: گەرچی خۆی درۆزنە بەڵام بۆ ئەمە قسەی راستی پێ گوتووی یا فەرمووی: ئەم قسەیەی راستە بەڵام خۆی درۆزنە (ت/ب- هەزار رەحمەتیان لێ بێ).

٣٦٣٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لِكُلِّ شَيْءٍ سَنَامٌ وَإِنَّ سَنَامَ الْقُرْآنِ سُورَةُ الْبَقَرَةِ وَفِيهَا آيَةٌ هِيَ سَيِّدَةُ آيِ الْقُرْآنِ هِيَ آيَةُ الْكُرْسِيِّ[٣]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەر بێ): هەموو شتێ چڵە پۆپەیەکی هەیە، چڵە پۆپەی قورئانیش سوورەتی بەقەرەیە، ئایەتێکیشی تیادایە گەورەی ئایەتەکانی قورئانەو خۆی سەر گەورەیانە، ئەوەیش ئایەتی ئایەتەلکورسییە. (ت- سەنەدەکەی ضەعیفە).

٣٦٣٨- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ قَرَأَ حم الْمُؤْمِنِ إِلَى قَوْلِهِ (إِلَيْهِ الْمَصِيرُ) وَ آيَةَ الْكُرْسِيِّ ، حِينَ يصبح، حُفِظَ بِهِمَا لَمْ يَرَ شَيْئاً يَكْرَهُهُ حَتَّى يُمْسِيَ، وَمَنْ قَرَأَهُمَا حِينَ يُمْسِي حُفِظَ بِهِمَا حَتَّى يُصْبِحَ. رواهما الترمذي بسندين ضعيفين[٤]:

دیسان ئەو لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەر بێ): هەر کەسێ سەر لەبەیانی سوورەتی حامیمی موئمین لە سەرەتاوە هەتا ووشەی «الیه المصیر» بخوێنێ، لەگەڵ ئایەتەلکورسی دا، ئەوە ئەو رۆژە هەتا ئێوارێ خودا بەبەرەکەتی خوێندنی ئەو دوو شوێنە دەیپارێزێ، وە هەرکەسێ سەر لە

---

[٣] رواه الترمذي بسند ضعيف (شرحه).

[٤] رواه الترمذي بسند ضعيف (شرحه).

ئێوارە بیانخوێنێ خودا بە پیرۆزیی ئەوان هەتا سبەی بەیانی دەیپارێزێ (ت- بە رشتەیەکی بێ هێز گێڕاویەتەوە) مەبەست لە سەرەتای سوورەتی موئمین ئەم سێ ئایەتەیە:

{حم. تَنزِيلُ الْكِتَابِ مِنَ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ. غَافِرِ الذَّنبِ وَقَابِلِ التَّوْبِ شَدِيدِ الْعِقَابِ ذِي الطَّوْلِ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ إِلَيْهِ الْمَصِيرُ - ٤٠/١-١}.

واتە: ئەمە سوورەتی حامیمە، کە ئایەتەکانی لەو قورئانە پیرۆزەیەن، کە نامەی خودایەو خودا خۆی نووسیویەتی، کە ئەو نامە گەورەو بە قەدرو بەڕێزە لە لایەنی خوداوەندی تەواناو زاناوە بە هۆی فریشتەی تایبەتی سرووشەوە ناردوویەتی بۆ پێغەمبەری خۆی کە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵایە، هەتا ببێ بە چرای هەردوو جیهان بۆ ئێوەی دروستکراوان، راستە کە خودا گوناه پۆش و تاوان بەخشەو تۆبەو پەشیمانی راستەقینەی بەندەی خۆی گیرا دەکا، بەڵام بەوە لە مەکری خودا ئەمین مەبن و دوای هیوای بێ پایەو مایە مەکەون، کەواتە ئەم نامەو ئایەتەکانی زۆر بە گرنگی بگرن و پشت گوێیان مەخەن، چونکە خودا لە هەمان کاتا سەختگیرو خاوەنی تۆڵەی توندو تیژە، وەلێ سەرەڕای هەموو شتێ دیاریو نمایانە کە خودا خاوەنی سایەو فەزڵو بەخششەو خوانی رەحمەتی بێ پایانی سەرێکی لە ئەزەلەو ئەو سەرەکەی لە ئەبەدە خودای راست و دروست و شیاوی بەندەیی و پەرستن تەنیاو تەنیا ئەو زاتەیەو بەس، بزانن خودا بە مۆڵەت و ئارامەو هیچ پەلەی نییە لە هیچ شتێ، چونکە هەموو شتێ زوو یا درەنگ دەچێتەوە بەر دەستی خۆی! (وەرگێڕ):

خوانی رەحمەتی خواوەندی صەمەد

ئەم سەری ئەزەل، ئەو سەری ئەبەد

گەربێتوو نووری لەم خوانە گەورە

جێی نەبێتەوە عەنتیکەو سەیرە!!

ئـەی یـەزدان! ئامـان! تـاوان سـووتانمی

لافـــاوی تـــاوان لـــە تـــۆ تـــارانمی

هەر ئـەز ئـەک دەدەم بـۆ ڕێـزەی خوانـت

دە دەســـتم بگـــرە بم بـــە میوانـــت!!

٣٦٣٩- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: الآيَتَانِ مِنْ آخِرِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ مَنْ قَرَأَهُمَا فِي لَيْلَةٍ كَفَتَاهُ. رواه الاربعة[٥]:

ئـەبو مەسـعوودی بـەدری (خودای لێ ڕازی بێ) گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفـەرموێ: هـەر کەسـێ بە شـەو دوو ئایەتەکـەی کۆتـایی سـوورەتی بەقەرە بخوێنێ ئەو شەوە ئەوەی بەسە (ش/د/ت) ئەمە دوو ئایەتەکەن:

{آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللّهِ وَمَلآئِكَتِـهِ وَكُتُبِـهِ وَرُسُلِهِ لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِ وَقَالُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَـصِيرُ لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لاَ تُؤَاخِذْنَا إِن نَّـسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا رَبَّنَا وَلاَ تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلاَ تُحَمِّلْنَا مَا لاَ طَاقَةَ لَنَا بِهِ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَآ أَنتَ مَوْلاَنَا فَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ}.

٣٦٤٠- عَنِ النُّعْمَان بْنِ بَشِيرٍ (رَضِي اللّٰهُ تَعَالَى عَنْهُمَا) عَنْ النَّبِـيِّ (صَـلَّى اللّٰـهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ اللّٰهَ كَتَبَ كِتَابًا قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ بِأَلْفَيْ عَامٍ أَنْزَلَ مِنْهُ آيَتَيْنِ خَتَمَ بِهِمَا سُورَةَ الْبَقَرَةِ وَلاَ يُقْرَآنِ فِي دَارٍ ثَلاَثَ لَيَـالٍ فَيَقْرَبُهَـا شَـيْطَانٌ. رواه الترمذي بسند حسن. والله أعلم[٦]:

نوعمـانی کـوڕی بەشـیر (ڕەزای خودایان لەسەر بێ) لـە حـەزرەتـەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفـەرموێ: بـە دوو هـەزار سـاڵ لـەپێش دروسـتکردنی ئاسمانـەکان و زەوی دا خـــودا نامەیـــەکی نووســـیوە، دوو ئایـــەتی لێ ناردۆتـــە خـــوارەوە،

---

[٥] بخاری. فضائل القرآن: ٥٠٠٩، ٥٠٠٨، ٥٠٥١. مسلم. صلاة المسافرين: ١٨٧٥.

[٦] حسن عند الترمذي.

سوورەتی بەقەرەی پێ کۆتایی هێناون ئەو دوو ئایەتە، لە هەر ماڵێکا سێ شەو بخوێنرێن، ئیتر شەیتان توخنی ئەو ماڵە ناکەوێ (ت-س/ح).

لە کۆتایی ئەم باسەوە ئاماژە بۆ ئەم چەن فەرموودانە دەکەم کە دانەر (لەشەرحەکەدا) ئاماژەیان بۆ دەکاو دەڵێ (رەحمەتی خودای لێ بێ) گەلێ فەرموودە لە باسی گەورەیی ئایەتەلکوورسیدا هاتووە وەك:

١- کەسێ کە لە ماڵ دەردەچێ بیخوێنێ لە ئەمان‌و زەمانەتی خودادا دەبێ تا دەگەڕێتەوە.

٢- هەر کەسێ لە پاش هەموو نوێژێ بیخوێنێ هەر کە مرد یەك سەر دەچێتە بەهەشت.

٣- لە هەر ماڵێکا بخوێنرێ شەیاتینی تا سیی رۆژ توخنی ئەو ماڵە ناکەون، جادووگەریش (چ پیاو چ ژن) تا چل شەو ناچنە ئەو ماڵە. ئەی عەلی! فێری ماڵ‌و منداڵ‌و خێزان‌و دەرو دراوسێی خۆتی بکە، ئایەت لەوە گەورەتر لەلای خوداوە دانەبەزیوە.

٤- کەسێ بیخوێنێ، کاتێ دەچێتە سەر نوێنی نووستن خودای گەورە ئەمن‌و ئاسایش دەدا بە خۆی‌و هاوسای‌و هاوسای هاوسای‌و چەن ماڵێکی تریش لەدەوروبەری.

٥- قورئان فەرمایشتی خودایە لەبەر ئەوە سەرگوڵ‌و سەر گەورەی هەموو قسەو فەرموودەیەکە، سەر گوڵی قورئانیش سوورەتی بەقەرەیە، سەرگوڵی سوورەتی بەقەرەش ئایەتەلکوورسییە!

٣٦٤١- ومنها: أنه نزل جبريل على موسى (عليهما السلام) وقال له: ربك يقول لك من قرأ عقب كل صلاة: اللهم إني أقدم إليك بين يدي كلّ نفسٍ ولَمْحَةٍ وطرفة يطرف بها أهل السَّماوات وأهل الأرض وكل شيءٍ هو في علمك كائنٌ أو قد كا. أقدّم إليك بين يدي ذلك كلّه: الله لا اله إلا هو الحيُّ القيُّوم إِلى آخرها فإن اللّيل

والنَّهار أربعٌ وعشرون ساعة ليس منها ساعةٌ إلا ويصعد إلى الله منه فيها سبعون الف ألف حسنةٍ حتَّى يُنفح في الصور أه حاشية الصاوي في التفسير[٧]:

وەك ئەمە: دەگێڕنەوە: جارێ جوبرائیل دێتە خوارەوە دەچێ بۆلای پێغەمبەر مووسا (درودی خودایان لەسەر بێ) پێی دەفەرموێ: پەروەردگارت پێت دەفەرموێ: هەر كەسێ لەپاش هەموو نوێژێ ئەمە بخوێنێ لەگەڵ ئایەتەلكوورسیدا، ئەوە لە ماوەی شەوو رۆژێكا كە بیستو چوار سەعاتە، هەموو سەعاتێ حەفتا ملیۆن چاكەی ئەو كەسە سەردەكەوێو بەرز دەبێتەوە بۆلای خودا، هەتا ئەو دەمەی كە پێی دەڵێن نەفخی صوور. ئەمەیش ئەو نزایەیە كە دەیخوێنێ لەسەر ئەم شێوەیە:.. تا كۆتایی ئایەتەلكوورسی. واتە خودایە! لەگەڵ هەموو هەناسەیەكو هەموو سەرنجێكو هەموو چاو تروكانێكا كەروو دەدەن لە خەڵكی ئاسمانەكانو خەڵكی زەویو لە هەموو شتێكی تر كە بە پێی زانستی خۆت تا ئێستا دروست بووە، یا لە مەولا دروست دەبێ لەگەڵ هەموو ئەمانەدا ئەم ووشە پیرۆزەیە پێشكەش بە بارەگای هەرە پیرۆزی تۆ دەكەم كە دەفەرموێ: {اللّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ} هەتا كۆتایی ئایەتەلكوورسی. فەرمایشتی شەرحەكە لێرەدا تەواو كە نەقڵی كردووە لە حاشیەی صاوییەوە.

بەندەیش لێرەدا ئەم قسەیەتان عەرز دەكەم: ئێمە لەم جۆرە بابەتانەدا رووی دەممان لە موسوڵمانانە، هەقمان بەسەر زەنیقو بێ دینانەوە نییە، چی دەڵێن با بیڵێن، وادەی درۆو راستی ئێمەو ئەوان دیوانی خوایە! وەلێ گەلێ جار برادەران دەڵێن: ئەمەواو ئەوە وا، جا بزانن باشترین وەڵام بۆ ئەم جۆرە دڵەڕاوكەیە ئەمەیە:

١- یەكەم نیازی پاكو باشیو چاكیی بەندە دەورێكی باڵا دەبینێ لەم شوێنانەدا، بە تایبەت لە كاركردنی نزادا.

---

[٧] منقول من شرح الصاوى على البيضاوى.

٢- زۆر جار رووی داوە كەسێ شایەتمان دەهێنێ و دوا ئەوە بە بێ ئەوەی هیچ كردەوەیەكی باش بكا یەكسەر دەمرێ، دیارە ئەو وشەی شایەتمانە بۆی دەبێ بە كلیلی بەهەشت، بە خۆی و هەموو نازو بەهرەی ناوی، وە رزگاری دەكا لە دۆزەخ و جرِوجانەوەری، واتە ژیانێكی نەبڕاوەی پڕ خێرو خۆشی بە گوتنی تاقە ووشەیێ مسۆگەر دەكا، ئەگەر لەباتی هەموو پیتێكی ئەو ووشەیە سەد هەزار ملیۆن چەرخ و زەمەن و دەهر لە بەهەشتی بەرینی جاویداندا بێ ئەوە پیتەكان یەك لە دوایەك تەواو دەبن بەلاّم پاداشی باشیان هێشتا سەرەتایەتی و هەرگیزاو هەرگیز تەواو نابێ، كەواتە خێر هەمووی وایە.

٣- وەلێ ئەوەندە هەیە نابێ مرۆ بەم جۆرە شتانە لە خۆی بایی ببێ و خۆی دەستە شكێن بكاو ئیتر خەریكی كاری خێری تر نەبێ و بلێ من ئەوەندەم بەسە، چونكە شتەكە خۆی بۆ ئەوەیە كە ئێمە سەرگەرمی هەموو كارێكی باش بین و لە هەموو خێرێ تا دەتوانین زۆر بكەین، نەك بە پێچەوانەوە خۆمان دەس خەڕۆ كەین و دلّمان لە كردنی كاری باش سارد بێتەوە.

برالە! دلّ بەرە من، قسەی خواو پێغەمبەری راستە، بزانە دین و حەدیث و كتێبە دینییەكان بە گشتی بۆ ئەوەن كە بەرە بەرە من و وێنەی من و تۆ چەژ لە خۆشی و لەزرەتی دین و عیبادەت وەربگرین و لەزرەتی بچێتە بن دیانمانەوە، تا لە ئەنجاما دەگەین بە پایەی یەقین و دلّ دادەهێنین و كلك دەنێینە خەت، ئیتر لەوە بەدوا بۆن و بەرامەو رەنگو رووی گولّ و گولزاری شەریعەت و طەریقەت كاسمان دەكاو لە بەری ئەو باخە دەخۆین و لە خەتەر دەپەرینەوەو مەودای ئەوەمان نامێنێ كە بیر لەو درِك و دالّ و جرِو جانەوەرانە بكەینەوە كە لەبەر حیكمەتێكی خودایی وان لەناو باخو بۆلاخ و گولّ و گولزاری شەریعەت و طەریقەتدا. دەی بە گوێی دلّسۆزی خۆت بكە دلّ بەرە مزگەوت و مەلاو خۆت تەسلیمی دەستی مامۆستای مەلا بكە، با چڵكی دلّت بە ئاوی كەوسەری شەریعەت پاك پاك داشۆرێ و شەرحی صەدرت بۆ

بکاو دڵت پڕ بکا لە نووری قورئانو حەدیثی پێغەمبەر، ئەوجا مەردانەو پیاوانە خۆت بکە بە کۆڕی تەصەووفدا خۆت بگەیەنە مەردێو طەریقەتێکی موافیقی شەریعەتی لێ وەربگرەو کە دەستی ئەو شێخە مەردەت ماچ کرد یادێکی ئێمەیش بکەو دووعایەکی خێرمان تێ بگرە:

نووری! بە قسە چەن زمان لووسی

نای بەکردەوە کە پەرێز پیسی!

## ٨٣) گەورەیی سوورەتی ئیسراو سوورەتی زومەر

٣٦٤٢- قَالَتْ عَائِشَةُ (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لاَ يَنَامُ حَتَّى يَقْرَأَ الزُّمَرَ وَبَنِى إِسْرَائِيلَ. رواه الترمذي والله أعلم. نسأل الله كمال الرفعة واليقين آمين[1]:

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەدەنووست، تا سوورەتی زومەرو سوورەتی بەنی ئیسرائیل (سوورەتی ئیسرا)ی نەخوێندایە (ت).

## ٨٤) گەورەیی سوورەتی کەهف: (فضل سورة الكهف)

٣٦٤٣- عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ حَفِظَ عَشْرَ آيَاتٍ مِنْ أَوَّلِ سُورَةِ الْكَهْفِ عُصِمَ مِنْ فِتْنَةِ الدَّجَّالِ. رواه مسلم وأبو داود والترمذي ولفظه: مَنْ قَرَأَ ثَلاَثَ آيَاتٍ مِنْ أَوَّلِ الْكَهْفِ عُصِمَ مِنْ فِتْنَةِ الدَّجَّالِ. وفي روايةٍ: مَنْ حَفِظَ مِنْ خَوَاتِيم سُورَةِ الْكَهْفِ عُصِمَ مِنْ فِتْنَةِ الدَّجَّالِ[1]:

---

[1] سكت عن درجة الحديث الشارح.

[1] مسلم. صلاة المسافرين، باب. فضائل القرآن وما يتعلق به: ١٨٨٠. أبو داود. ملاحم: ٤٣٢٣. ترمذی فضائل القرآن: ٢٨٨٦

ئـەبو دەرداء (خـوداى لێ رازى بـێ) لــە پێغەمبــەرەوە (دروودى خـوداى لەســەر بـێ) دەفەرموێ: هەر کەسێ دە ئایەت لە سەرەتای سوورەتی کەهفەوە لەبەر بکا خودا لە ئاژاوەی ججاڵ دەیپارێزێ (م/د/ت) گفتەی (ت) ئاوایە: هەر کەسێ سێ ئایەت لە سەرەتای سوورەتی کەهف بخوێنێ لە ئاشووبی ججاڵ قوتار دەبێ. لە گێڕانەوەیەکا: هەر کەسێ چوار ئایەتەکەی کۆتایی سوورەتی کەهف لەبەر بکا لە ججاڵ رزگاری دەبێ.

٣٦٤٤- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ قَرَأَ سُورَةَ الْكَهْفِ فِي يَوْمِ الْجُمُعَةِ أَضَاءَ لَهُ مِنَ النُّورِ مَا بَيْنَ الْجُمُعَتَيْنِ. وفي نسخةٍ: أَضَاءَ لَهُ مِنَ النُّورِ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْبَيْتِ الْعَتِيقِ. رواه الحاكم والبيهقي[٢]:

ئـەبو سـەعيد (خـوداى لێ رازى بـێ) گـوتی: پێغەمبـەر (دروودى خـوداى لەسـەر بـێ) فەرمووی: هەر کەسێ رۆژی هەینی سوورەتی کەهف بخوێنێ لەم هەینی هەتا ئەو هەینی نوورو رووناکی شەوقی بۆ دەداتەوە. لە روو نووسێکا واتە: لە نوسخەیەکا: لەلای خۆیەوە هەتا کابەی خانەی خودا نووری خودایی رووناکی دەکاتەوە بۆی (حاکم/بەیهەقی).

**٨٥) گەورەیی سوورەتی یاسینو سوورەتی دوخان: (فضل سورة يس والدخان)**

٣٦٤٥- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِنَّ لِكُلِّ شَيْءٍ قَلْبًا وَقَلْبُ الْقُرْآنِ يس وَمَنْ قَرَأَ يس كَتَبَ اللَّهُ لَهُ بِقِرَاءَتِهَا قِرَاءَةَ الْقُرْآنِ عَشْرَ مَرَّاتٍ. رواه الترمذي والبيهقي[١]:

ئەنەس (خوداى لێ رازى بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووی: هەموو شتێ دڵێکی هەیە، دڵی قورئانیش سوورەتی یاسینە، هەر کەسێ جارێ دەوری سوورەتی یاسین بکاتەوە خودا لەباتی ئەوە خێری دەخەتمەی

---

[٢] سكت عن درجته الشارح.

[١] رواه الترمذي بسند ضعيف ولكن فى الفضائل.

قورئـانی بـۆ دەنووسـێت، کـە سـوورەتی یاسـینیان لەگـەڵ نـەبێ (ت- سەنەدەکەی بێ هێزە/ بەیهەقی).

٣٦٤٦- عَنْ مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَـالَ: قَلْـبُ الْقُرْآنِ يَس لاَ يَقْرَأُهَا رَجُلٌ يُرِيدُ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى وَالدَّارَ الآخِرَةَ إِلاَّ غُفِرَ لَـهُ وَاقْرَءُوهَـا عَلَى مَوْتَاكُمْ. رواه الإمام أحمد والبيهقي[٢]:

مەعقیلی کوڕی یەسار (خودای لێ ڕازی بێ) لـە پێغەمبـەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: یاسین دڵی قورئانـە، ئـەو پیاوەی ئـەم سوورەتە بـە ئیخلاص و نیازی پاك بخوێنـێ و تـەنیا مەبەستی ڕەزامەنـدیی خـوداو دەردەست کردنـی مـاڵ و خانـەی ئـەو جیهـان بـێ ئـەوە مـسۆگەر کـە خـودا لێـی خـۆش دەبـێ، سوورەتی یاسین لەسەر مردووی خۆتان بخوێنن و لەسـەر ئەوانەشتان کەوان لە حاڵەتی سەرەمەرگا (ئە/بەیهەقی) ⬅ (ب- ١ز- ١٩٢ل- ٥٢٢ف- ٥).

٣٦٤٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ قَرَأَ يس فِي لَيْلَةٍ ابْتِغَاءَ وَجْهِ اللَّهِ أَوْ مَرْضَاةِ اللَّهِ غُفِرَ لَهُ. رواه الإمام مالك والبيهقي[٣]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ): پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفـەرموێ: هەر کەسێ بە شەو بۆ ڕەزای خوا سوورەتی یاسین بخوێنێ خودا لێـی خـۆش دەبێ (مالیك/بەیهەقی).

٣٦٤٨- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ قَرَأَ حم الدُّخَانَ فِي لَيْلَةٍ أَصْبَحَ يَسْتَغْفِرُ لَهُ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ. رواه الترمذي والنسائي[٤]:

دیسان لـەوەوە، لـە پێغەمبـەرەوە (درودی خودای لەسەر بێ) دەفـەرموێ: هـەر کەسـێ لـە شـەودا سـوورەتی دوخـان بخوێنـێ هـەتا بەیانـەکی حـەفتا هـەزار فریشتە بۆی دەپاڕێنەوە (ت/ن).

---

[٢] تقدم بسط الكلام على قراءة القرآن على الأموات فى كتاب الجنائز من كتاب الصلاة.

[٣] سكت عن درجته الشارح.

[٤] سكت عن درجته الشارح.

٣٦٤٩- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ قَرَأَ حم الدُّخَانَ فِي لَيْلَةِ الْجُمُعَةِ غُفِرَ لَهُ. رواه الترمذي[٥]:

دیسان لەوەوە، لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەر کەسێ لە شەوی هەینیدا سوورەتی دوخان بخوێنێ خودا لێی خۆش دەبێ (ت).

٣٦٥٠- وللطبراني: مَنْ قَرَأَ حم الدُّخَانَ فِي لَيْلَةِ الْجُمُعَةِ أَوْ يَوْمِ جُمُعَةٍ بنى الله له بيتاً في الجنة[٦]:

حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەر کەسێ لە شەوو رۆژی هەینیدا سوورەتی دوخان بخوێنێ خودا لە بەهەشتا خانویەکی بۆ دروست دەکا (طەبەرانی).

## ٨٦) گەورەیی سوورەتی فەتح: (فضل سورة الفتح)

٣٦٥١- عَنْ عُمَرُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لَقَدْ أُنْزِلَتْ عَلَيَّ اللَّيْلَةَ سُورَةٌ لَهِيَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا طَلَعَتْ عَلَيْهِ الشَّمْسُ، ثُمَّ قَرَأَ ( إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُبِينًا ). رواه البخارى هنا ومسلم في الحديبية ولفظه: لقد أنزلت عليَّ آيةٌ هي أحب إليَّ من الدُّنيا جميعاً[١]:

عومەر (خودای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەمشەو سوورەتێکم لە خوداوە بۆ هاتووە، ئەو سوورەتەم لە هەمو جیهان پێ خۆشترە لە دوایدا: (انا فتحنا لە فتحا مبینا)ی خوێند (ش) گفتەی (م): ئایەتێکم بۆ هاتووە لە هەموو جیهانم پێ خۆشترە.

---

[٥] سكت عن درجته الشارح.

[٦] سكت عن درجته الشارح.

[١] بخارى. فضائل القرآن: ٥٠١٢. مسلم. جهاد: ٤٦١٢.

## ٨٧) گەورەیی موسەبیحاتەکانو سوورەتی حەشر
## فضل المسبحات وسورة الحشر

٣٦٥٢- عَنْ عِرْبَاضِ بْنِ سَارِيَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) كَانَ يَقْرَأُ الْمُسَبِّحَاتِ قَبْلَ أَنْ يَرْقُدَ وَقَالَ « إِنَّ فِيهِنَّ آيَةً خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ آيَةٍ[1]:

عیربازی کوڕی سارییە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە پێش خەوتندا موسەبیحاتەکانی دەخوێند، دەیفەرموو: ئەم سوورەتانە ئایەتێکیان تیادایە، لە هەزار ئایەت باشترە (ت-س/ح) موسەبیحات پێنج سوورەتن، لە سەرەتایانەوە (سبحان) یا (یسبح لله) هەیە. لە شەرحەکەدا دەڵێ: برێتین لەم پێنج سوورەتانە:

١- حەدید.

٢- حەشر.

٣- صەفف.

٤-جوموعە.

٥- تەغابون.

وەڵێ ئەم دوو سوورەتەی تریش موصەددەرن بە تەسبیح:

١- سوورەتی ئیسرا.

٢- سوورەتی ئەعلا.

٣٦٥٣- عَنْ مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ قَالَ حِينَ يُصْبِحُ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ أَعُوذُ بِاللَّهِ السَّمِيعِ الْعَلِيمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ وَقَرَأَ ثَلَاثَ آيَاتٍ مِنْ آخِرِ سُورَةِ الْحَشْرِ وَكَّلَ اللَّهُ بِهِ سَبْعِينَ أَلْفَ مَلَكٍ يُصَلُّونَ عَلَيْهِ حَتَّى يُمْسِيَ وَإِنْ مَاتَ فِي ذَلِكَ الْيَوْمِ مَاتَ شَهِيدًا وَمَنْ قَالَهَا حِينَ يُمْسِي كَانَ بِتِلْكَ الْمَنْزِلَةِ. رواهما الترمذي. نسال الله رفيع المنزلة آمين. والله أعلم[2]:

---

[1] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[2] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

مەعقیلی کوڕی یەسار (خودای لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەر کەسێ بەیانی سێ جار بڵێ: أَعُوذُ بِاللّٰهِ السَّمِيعِ الْعَلِيمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ: پەنا دەگرم بە خودا لە شەڕی شەیتانی دەرکراو ئینجا سێ ئایەتەکەی کۆتایی سوورەتی حەشریش بخوێنێ، ئەوە خودا دەیسپێرێ بە حفتا هەزار فریشتە هەتا ئێوارە رەحمەتی بۆ دەنێرن، ئەگەر لەو رۆژەشا بمرێ بە شەهیدی دەمرێ، وە هەر کەسێکیش ئێواران ئەمە بڵێ و بیخوێنێ هەمان پایەی بۆ هەیە (ت-س/غ).

٣٦٥٤- عن عبد الله عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ من قرأ سورة الواقعة في كلّ ليلةٍ لَمْ تُصبه فاقةٌ أبداً. رواه البيهقي (منقول من الشرح)[٣]:

دانەر (خودای لێ ڕازی بێ) لە شەرحەکەدا لە کۆتایی زنجیرە یازدەی ئەم بەرگەدا دەڵێ: عەبدوڵلا (خودای لێ ڕازی بێ) لە حەزرەتەوە دەگێڕێتەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەر بێ): کەسێ هەموو شەوێ سوورەتی واقیعە بخوێنێ هەتا هەتایە تووشی هەژاریی و نەبوونی نابێ (بەیهەقی/ غایەتولمەئموول)*.

## ٨٨) گەورەیی سوورەتی تەبارەك: (فضل سورة الملك)

٣٦٥٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: سُورَةٌ مِنَ الْقُرْآنِ ثَلاثُونَ آيَةً تَشْفَعُ لِصَاحِبِهَا حَتَّى يُغْفَرَ لَهُ (تَبَارَكَ الَّذِى بِيَدِهِ الْمُلْكُ). رواه أبو داود والترمذي[١]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: سوورەتی (تَبَارَكَ الَّذِى بِيَدِهِ الْمُلْكُ) کە سوورەتێکە لە

---

[٣] سكت عن درجته الشارح.

* خوێندنی ئەم سوورەتە بەشەو بەم نیازە بە ئەزموون چەسپاوە. ئەگەر حەزدەکەی تەجرەبەی بکە. (وەرگێڕ)

[١] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

سوورەتەکانی قورئان و بڕێتییە لە سیی ئایەت، ئەم سوورەتە تکاو شەفاعەت لەلای خودا دەکا بۆ هاوڕێیانی خۆی کە لەبەری دەکەن و هەمیشە دەیخوێنن هەتا خودا لەبەر خاتری ئەو لێیان خۆش دەبێ (د/ت- س/ح).

٣٦٥٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ ضَرَبَ بَعْضُ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) خِبَاءَهُ عَلَى قَبْرٍ وَهُوَ لاَ يَحْسِبُ أَنَّهُ قَبْرٌ فَإِذَا فِيهِ إِنْسَانٌ يَقْرَأُ سُورَةَ تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ حَتَّى خَتَمَهَا فَأَتَى النَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي ضَرَبْتُ خِبَائِي عَلَى قَبْرٍ وَأَنَا لاَ أَحْسِبُ أَنَّهُ قَبْرٌ فَإِذَا فِيهِ إِنْسَانٌ يَقْرَأُ سُورَةَ تَبَارَكَ الْمُلْكُ حَتَّى خَتَمَهَا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) هِيَ الْمَانِعَةُ هِيَ الْمُنْجِيَةُ تُنْجِيهِ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ[2].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: جارێ، پیاوێ لە یارانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نازانێ چاتۆڵەکەی لەسەر گۆڕێ هەڵ دەدات، کە گوێ دەگرێ وا لە ناو گۆڕەکەدا یەکێ سوورەتی (تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ): دەخوێنێ تا تەواوی دەکا، جا دەچێتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی دەکا: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! نەمزانی، چاتۆڵەکەم لەسەر گۆڕێ هەڵ دابوو، کەچی مرۆڤێکی تیابوو، سوورەتی تەبارەکی خوێند هەتا تەواوی کرد، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەو سوورەتە شوورەو پەرژینەو کەسێ بیخوێنێ دەبێ بە فریارەسی و رزگاری دەکا لە سزاو ئێش و ئازاری گۆڕ. (ت-س/ح).

٣٦٥٧- عَنْ جَابِرٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) كَانَ لاَ يَنَامُ حَتَّى يَقْرَأَ (الم تَنْزِيلُ) وَ (تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ ). رواهما الترمذي. نسأل الله حسن الرواية. آمين[3]:

---

[2] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[3] رواه الترمذي بسند ضعيف (شرحه).

**جابیر** (خودا لێی خۆش نوود بێ) دەڵێ: **پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **دەستووری وابوو نەدەنووست هەتا سوورەتی سەجدەو سوورەتی تەبارەکی دەخوێند (ت-بەرشتەیەکی بۆ هێن).**

## ٨٩) گەورەیی سوورەتی زەلزەلەو سوورەتی کافیروونەو سوورەتی نەصر
## فضل سورة الزلزلة والكافرون والنصر

**٣٦٥٨-** عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ قَرَأَ إِذَا زُلْزِلَتْ عُدِلَتْ لَهُ بِنِصْفِ الْقُرْآنِ وَمَنْ قَرَأَ (قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ) عُدِلَتْ لَهُ بِرُبْعِ الْقُرْآنِ وَمَنْ قَرَأَ (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) عُدِلَتْ لَهُ بِثُلُثِ الْقُرْآنِ[1]:

**ئەنەس** (خودای لێ رازی بێ) **لە پێغەمبەرەوە** (درودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: هەر کەسێ سوورەتی (اذا زلزلت) بخوێنێ خێرو پاداشی نیو خەتمەی قورئانی بۆ هەیە ئەوەی سوورەتی (قل یا ایها الکافرین) بخوێنێ خێرو پاداشی چوار یەکە خەتمەیەکی قورئانی بۆ هەیە، هەر کەسێکیش سوورەتی (قل هو الله احد) بخوێنێ خێرو پاداشی سێ یەکە خەتمەیەکی قورئانی بۆ هەیە (ت-س/غ).**

**٣٦٥٩-** وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لِرَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِهِ. هَلْ تَزَوَّجْتَ يَا فُلاَنُ. قَالَ: لاَ وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَلاَ عِنْدِي مَا أَتَزَوَّجُ بِهِ. قَالَ: أَلَيْسَ مَعَكَ (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ). قَالَ: بَلَى. قَالَ: ثُلُثُ الْقُرْآنِ. قَالَ: أَلَيْسَ مَعَكَ (إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ). قَالَ: بَلَى. قَالَ: رُبُعُ الْقُرْآنِ. قَالَ: أَلَيْسَ مَعَكَ قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ. قَالَ: بَلَى قَالَ: رُبُعُ الْقُرْآنِ. قَالَ: أَلَيْسَ مَعَكَ (إِذَا زُلْزِلَتِ الأَرْضُ). قَالَ: بَلَى. قَالَ: رُبُعُ الْقُرْآنِ. قَالَ: تَزَوَّجْ تَزَوَّجْ. رواهما الترمذي نسأل الله التوفيق آمين[2]:

---

[1] **رواه الترمذي بسند غريب ولكنه مؤيد بالصحاح الآتية في (قل هو الله أحد) (شرحه).**

[2] **رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).**

دیسان ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە پیاوێ لە هاوڕێیانی خۆی فەرموو: ئەی فیسار! ژنت هێناوە؟ گوتی: نە بەخوا، ئەی پێغەمبەری خودا! وە هیچیشم نییە کە ژنی پێ بێنم فەرمووی: ئایا (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ)ت لەبەرە؟ گوتی: ئەرێ فەرمووی: دە ئەوە سێیەکی قورئانە فەرمووی: ئەی (إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ)ت لەبەرە؟ گوتی: بەڵێ ئەویشم لەبەرە فەرمووی: دە ئەویش چواریەکی قورئانە فەرمووی: ئەی (قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ)ت لەبەرە؟ گوتی: بەڵێ، فەرمووی: دە ئەویش دیسان چوار یەکی قورئانە فەرمووی: ئەی (إِذَا زُلْزِلَتِ)ت لەبەرە؟ گوتی: بەڵێ، فەرمووی: دە ئەویش دیسانەوە چواریەکی قورئانە، کەوابوو تۆ زۆر دەوڵەمەندیو هەژار نیت، دەی ژن بێنە، دەی ژن بێنە! (ت-س/ح).

### ٩٠) گەورەیی (قل هو الله أحد) = سوورەتی ئیخلاص (فضل قل هو الله أحد)

٣٦٦٠- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَجُلاً سَمِعَ رَجُلاً يَقْرَأُ (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) يُرَدِّدُهَا فَلَمَّا أَصْبَحَ جَاءَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ وَكَأَنَّ الرَّجُلَ يَتَقَالُّهَا فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّهَا لَتَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ. رواه البخاري وابو داود[1]:

ئەبو سەعید (خودای لێ رازی بێ) گوتی: شەوێ پیاوێ هەر (قل هو الله احد) دەخوێنێ و دیسانەوە دووبارەی دەکاتەوە، پیاوێکی تر گوێی لەم کارە دەبێ، بۆ سبەینێ دەچێتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوەی عەرز دەکا، وەك بڵێی پیاوەکە خوێندنی ئەم سوورەتە بە تەنها خۆی بەکەم دابنێ وابوو، بۆیە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: بەو کەسە کە ڕەوانی منی بە دەسە ئەم سوورەتە لەبەر گەورەیی هاوتای سێیەکی قورئان دەکا! (ب/د).

---

[1] بخاری. فضائل: ٥٠١٣ ، ٦٦٤٣ ، ٧٣٧٤.

٣٦٦١- عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: أَيَعْجِزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَقْرَأَ فِي لَيْلَةٍ ثُلُثَ الْقُرْآنِ؟ قَالُوا: وَكَيْفَ يَقْرَأُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ قَالَ: (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) يَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ. رواه الشيخان والترمذي[٢]:

ئەبو دەردا (خودای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: کەستان دەتوانن کەسێ یەکی قورئان لە شەوێکا بخوێنن؟ گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! لەکوێ دەتوانێ بە شەوێ سێیەکی قورئان دەور بکاتەوە! فەرمووی: دەبزانن سوورەتی (قل هو الله احد) هاوتای سێیەکی قورئان دەکات (ش/ت).

٣٦٦٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: احْشِدُوا فَإِنِّي سَأَقْرَأُ عَلَيْكُمْ ثُلُثَ الْقُرْآنِ. فَحَشَدَ مَنْ حَشَدَ ثُمَّ خَرَجَ نَبِيُّ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَرَأَ (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) ثُمَّ دَخَلَ فَقَالَ بَعْضُنَا لِبَعْضٍ إِنِّي أُرَى هَذَا خَبَرٌ جَاءَهُ مِنَ السَّمَاءِ فَذَاكَ الَّذِي أَدْخَلَهُ. ثُمَّ خَرَجَ نَبِيُّ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: إِنِّي قُلْتُ لَكُمْ سَأَقْرَأُ عَلَيْكُمْ ثُلُثَ الْقُرْآنِ أَلاَ إِنَّهَا تَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ. رواه مسلم والترمذي[٣]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: کۆوەبن" تۆزێ تر سێیەکی قورئانتان بۆ دەخوێنم! جا کۆمەڵێ کۆبوونەوە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لە ماڵ هاتە دەرەوەو هات بۆ ناومان و سوورەتی (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ)ی بۆ خوێندین و ئیتر رۆیشتەوە ژوورەوە بۆ ناو هۆدەکەی خۆی، ئێمە لەناو خۆمانا گوتمان: وا بزانم ئەمە سرووش بوو لە ئاسمانەوە بۆی هات، بۆیە چوویشەوە ژوورەوە، لەپاشا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دیسان هاتەوە دەری، فەرمووی: ئەوە بوو من بە ئێوەم گوت کەسێیەکی قورئانتان بۆ دەخوێنم، بزانن کە ئەم سوورەتە هاوتای سێیەکی قورئان دەکات (م/ت).

---

[٢] بخاری. فضائل القرآن: ٥٠١٥. مسلم. صلاة المسافرين ١٨٨٣.

[٣] مسلم. صلاة المسافرين. باب فضائل القرآن ومايتعلق به:١٨٨٥. ترمذي. فضائل القرآن: ٢٩٠٠.

٣٦٦٣- وَبَعَثَ النَّبِيّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) رَجُلاً عَلَى سَرِيَّةٍ، وَكَانَ يَقْرَأُ لأَصْحَابِهِ فِي صَلاَتِهِ فَيَخْتِمُ بـ( قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ) فَلَمَّا رَجَعُوا ذَكَرُوا ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: سَلُوهُ لأَيِّ شَيْءٍ يَصْنَعُ ذَلِكَ. فَسَأَلُوهُ فَقَالَ لأَنَّهَا صِفَةُ الرَّحْمَنِ، وَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَقْرَأَ بِهَا. فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَخْبِرُوهُ أَنَّ اللَّهَ يُحِبُّهُ. رواه مسلم[٤]:

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) دەگێڕێتەوە دەڵێ: جارێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پیاوێكی كرد بە سەركردەی لقێكو ناردنی بۆ غەزا، پیاوەكە كە بەر نوێژیی دەكرد بۆ هاوڕێكانی لە كۆتایی قورئان خوێندنی ناو بەر نوێژییەكەیدا سوورەتی قولووەڵلای دەخوێند، كە گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئەوەیان بۆیگێڕایەوە، فەرمووی: لێی بپرسن لەبەرچی وا دەكا! كە لێی دەپرسن دەڵێ: چونكە ئەم سوورەتە صیفەتو نیشانەی خودای بەخشندەو میهرەبانە، لەبەر ئەوە حەزدەكەم كە هەمیشە بیخوێنمو لە سەرزارم نەكەوێتە خوارەوە، حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: دەپێی بڵێن كە خوداش ئەوی خۆش دەوێ! (م- پرگۆڕی پەرۆزی لە نووری خودا بێ).

٣٦٦٤- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ يَؤُمُّهُمْ فِي مَسْجِدِ قُبَاءَ، فَكَانَ كُلَّمَا أَمَّهُمْ فِي الصَّلاَةِ قَرَأَ بـ(قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ)، ثُمَّ يَقْرَأُ سُورَةً أُخْرَى مَعَهَا، وَكَانَ يَصْنَعُ ذَلِكَ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ، فَكَلَّمَهُ أَصْحَابُهُ أَنْ تَقْرَأَبِهَا، وَإِمَّا أَنْ تَدَعَهَا وَتَقْرَأَ بِسُورَةٍ أُخْرَى. فَقَالَ لَهُمْ: مَا أَنَا بِتَارِكِهَا، إِنْ أَحْبَبْتُمْ أَنْ أَؤُمَّكُمْ بِذَلِكَ فَعَلْتُ، وَإِنْ كَرِهْتُمْ تَرَكْتُ. وَكَانُوا يَرَوْنَهُ أَفْضَلَهُمْ، فَلَمَّا أَتَاهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَخْبَرُوهُ الْخَبَرَ فَقَالَ:« يَا فُلاَنُ مَا يَمْنَعُكَ مِمَّا يَأْمُرُكَ أَصْحَابُكَ؟ وَمَا يَحْمِلُكَ عَلَى لُزُومِ هَذِهِ السُّورَةِ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ؟ ». فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أُحِبُّهَا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إِنَّ حُبَّهَا يُدْخِلُكَ الْجَنَّةَ[٥]:

---

[٤] بخاری. توحید: ٧٣٧٥ = ٢١٢٥ تجرید. راجع: (رقم/ ١٧٨٢ تجرید = ٥٠١٣ فتح الباری = بەرگی / ٤ ل - ٥٣٠ مختصر صحیح البخاری = تجرید / كوردی). مسلم. صلاة المسافرین: ١٨٨٧.

[٥] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: پیاوێ (لە یاریدەدەران) لە مزگەوتەکەی قوباء بەر نوێژیی دەکرد بۆیان، دەستووری وابوو هەموو جارێ بەر نوێژیی بۆ دەکردن، لە گشت رکاتێکا سوورەتی قولهووەڵلای لە پاش فاتیحاوە دەخوێند، ئینجا سوورەتێکی تریشی دوا بە دوای ئەو دەخوێند، هاوڕێکانی پێی دەڵێن: یان گەرەکە کە هەر ئەو بە تەنیا بخوێنێ لە پاش فاتیحا، یان دەبێ واز لەو بێنێ و سوورەتێکی تر بخوێنێ، دەڵێ: دەستی لێ هەڵناگرم، ئەگەر حەز دەکەن ئەوە هەر بەم شێوەیە بەر نوێژیتان بۆ دەکەم، ئەگینا نایکەم، ئەوانیش لەبەر ئەوە کە ئەویان بە باشترینی خۆیان دادەنا ئیتر زۆریان لێ نەکرد، بەڵام کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی چوو بۆ ناویان ئەم مەسەلەیان عەرزکرد، فەرمووی: ئەی فیسار! بۆچی بە گوێی هاوڕێکانت ناکەی و فەرمانەکەیان بەجێ ناهێنی، وە لەبەر چی لە هەموو رکاتێکا ئەم سوورەتە دەخوێنی؟ گوتی: قوربان! ئەی پێغەمبەری خۆشەویستی خودا! چونکە خۆشم دەوێ! فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): دەی! خۆشەویستیی ئەو سوورەتە دەتباتە بەهەشت (ت-ح).

٣٦٦٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) قَالَ: أَقْبَلْتُ مَعَ رَسُولِ اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) فَسَمِعَ رَجُلاً يَقْرَأُ (قُلْ هُوَ اللّهُ أَحَدٌ اللّهُ الصَّمَدُ) فَقَالَ رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّم): وَجَبَتْ. قُلْتُ: وَمَا وَجَبَتْ؟ قَالَ: الْجَنَّةُ[٦]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لە خزمەتی پێغەمبەردا بووم دەهاتینەوە، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) گوێی لێ بوو پیاوێ سوورەتی (قُلْ هُوَ اللّهُ أَحَدٌ اللّهُ الصَّمَدُ)ی دەخوێند، فەرمووی: پێویست بوو، عەرزیم کرد: قوربان؟ چی پێویست بوو؟ فەرمووی: بەهەشت بوو بەماڵی ئەم پیاوە کە ئەم سوورەتەی خوێند (ت-ح).

---

[٦] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

٣٦٦٦- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ قَرَأَ كُلَّ يَوْمٍ مِائَتَيْ مَرَّةٍ ( قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) مُحِيَ عَنْهُ ذُنُوبُ خَمْسِينَ سَنَةً إِلاَّ أَنْ يَكُونَ عَلَيْهِ دَيْنٌ. روى الترمذي هذه الثلاثة[٧]:

ئەنەس (بچێتە بەهەشتی و نەیتە دەرێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەر کێ هەموو رۆژێ دوو سەد جار سوورەتی قولهووەڵلا بخوێنێ گوناهی پەنجا ساڵی لێ هەڵ دەوەرێ، مەگەر قەرزی لەسەر بێ، ئەوە گوناهی قەرزەکە پاك نابێتەوە (ت- بە سەنەدێکی غەریب).

٣٦٦٧- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ قَرَأَ (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) عَشْرَ مَرَّاتٍ بُنِيَ لَهُ بِهَا قَصْرٌ فِي الْجَنَّةِ. رواه الإمام أحمد بسند حسن[٨]:

دیسان لە ئەنەسەوە لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەر کەسێ دەجار قولهووەڵلا بخوێنێ خودا لە بەهەشتا خانوویەکی بۆ دروست دەکا (ئیمامی ئەحمەد- ئەم حەدیثەی گێڕاوەتەوە).

٣٦٦٨- عَنْ مُعَاذِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ أَبِيهِ قَالَ: أَصَابَنَا طَشٌّ وَظُلْمَةٌ فَانْتَظَرْنَا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لِيُصَلِّيَ بِنَا فَخَرَجَ فَقَالَ: قُلْ. فَقُلْتُ مَا أَقُولُ قَالَ: (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) وَالْمُعَوِّذَتَيْنِ حِينَ تُمْسِي وَحِينَ تُصْبِحُ ثَلاثًا يَكْفِيكَ كُلَّ شَيْءٍ. رواه النسائي في الإستعاذة[٩]:

موعازی کوڕی عەبدوڵلا (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: باوکم گوتی: جارێ کردی بە باران و تەم و مژ، چاوەڕوانی پێغەمبەرمان کرد کە بەر نوێژیمان بۆ بکا، جا کە هاتە دەرەوە فەرمووی: بڵێ گوتم: قوربان! چی بڵێم؟ فەرمووی: کاتی ئێواران و کاتی بەیانیان سێ جار (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) و (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ) و (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ) بخوێنە، ئیتر بۆ هەموو شتێ بەست دەکا (ن):

---

[٧] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

[٨] رواه الامام احمد بسند حسن.

[٩] سكت عن درجته الشارح.

سوورەتی ئیخلاص بەکەم مەزانە
هاوتای سێیەکی خەتمەی قورئانە
گوڵاوی لێوو دەمو زمانە
بۆ دڵو چاوو دەروون دەرمانە
خوێنەری دۆستی زاتی یەزدانە
چونکە سیفەتی خوای میهرەبانە
مەخصووص بۆ کەسێ نەخوێندەوارە
مایەی خۆشنوودی خوای کردگارە!
بیکە بە چراو خۆت بە پەروانە!
جا سەیری دڵ کە گوڵێ چەن جوانە!!
هەر نەزنەک دەدەم بێم بۆ دیوانت!
دە دەستم بگرە بم بە قوربانت

## ٩١) گەورەیی (قل أعوذ)وەکان: (فضل المعوذتين)

٣٦٦٩- ➡ (ب- ٤ز- ٧٥ل- ٢٢٢ف)[1].

٣٦٧٠- وَعَنهَا قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ كُلَّ لَيْلَةٍ جَمَعَ كَفَّيْهِ ثُمَّ نَفَثَ فِيهِمَا فَقَرَأَ فِيهِمَا ( قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ) وَ ( قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ ) وَ ( قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ ) ثُمَّ يَمْسَحُ بِهِمَا مَا اسْتَطَاعَ مِنْ جَسَدِهِ يَبْدَأُ بِهِمَا عَلَى رَأْسِهِ وَوَجْهِهِ وَمَا أَقْبَلَ مِنْ جَسَدِهِ يَفْعَلُ ذَلِكَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ. رواه البخاري[2]:

---

[1] سبق فی مجلد رابع. تسلسل/ ٧٥ برقم:١/٣٠٣٧.

[2] بخاری. فضائل القرآن: ٥٠١٧ ، ٥٧٤٨ ، ٦٣١٩.

**دیسان عائیشە** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: جاران پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **هەموو شەوێ کە دەچووە ناو جێگەوە هەردوو لەپی خۆی دەنا بەیەکەوەو کوفوی پیادەکردن‌و ئینجا (قل هو الله)و (قل أعوذ برب الفلق)و (قل أعوذ برب الناس)ی بەناو هەردوو دەستیدا دەخوێند، ئینجا دەیهێنان بەسەر جەستەی خۆیدا سەرتاپا ئەوەندەی دەستی پێی دەگەیشت، ئینجا بە بەری لەشیا، ئینجا بە بەری پشتیا سێ جار ئاوای دەکرد (ب).**

**٣٦٧١- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ** (رَضِي اللّهُ عَنهُ) **قَالَ: قَالَ رَسُولَ اللهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)**: ألم تر آيَاتٌ أُنْزِلَتْ عَلَيَّ اللَّيْلَةَ لَمْ يُرَ مِثْلُهُنَّ قَطٌّ (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ) وَ (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ). رواه مسلم والترمذي[٣]:**

**عوقبەی کوڕی عامیر** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی پێم: دەزانیت کە ئەمشەو چەن ئایەتێکم بۆ هاتوون، کە هەرگیز شتی وا گەورەو نایاب نەبینراوە، کە ئەم دوو سوورەتەن: سوورەتی (قل أعوذ برب الفلق)و (قل أعوذ برب الناس).** (م/ت- رەحمەتی خوایان لێ بێ).

**٣٦٧٢- وَعَنْهُ قَالَ: كُنْتُ أَقُودُ بِرَسُولِ اللّهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **نَاقَتَهُ فِي السَّفَرِ فَقَالَ لِي. يَا عُقْبَةُ أَلاَ أُعَلِّمُكَ خَيْرَ سُورَتَيْنِ قُرِئَتَا. فَعَلَّمَنِي (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ) وَ (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ)[٤]:**

**دیسان ئەو گوتی: جاران لە سەفەردا جڵەوی ووشترەکەی پێغەمبەرم رادەکێشا، پێی فەرمووم: ئەی عوقبە! هۆشیاربە، دوو سوورەتت فێر دەکەم، باشترین سوورەتن کە بخوێنرێن ئینجا (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ)و (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ) فێر کردم** (د/ن- خوایان لێ رازی بێ).

---

[٣] مسلم. صلاة المسافرين. باب فضائل القرآن وما يتعلق به: ١٨٨٨ ، ١٨٨٩. ترمذي. فضائل القرآن: ٢٩٠٢. نسائي. إفتتاح: ٩٥٣.

[٤] سكت عن درجته اشارح.

٣٦٧٣- وَعَنْهُ قَالَ: بَيْنَا أَنَا أَسِيرُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بَيْنَ الْجُحْفَةِ وَالأَبْوَاءِ إِذْ غَشِيَتْنَا رِيحٌ وَظُلْمَةٌ شَدِيدَةٌ فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَتَعَوَّذُ بِ (أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ) وَ (أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ) وَيَقُولُ: يَا عُقْبَةُ تَعَوَّذْ بِهِمَا فَمَا تَعَوَّذَ مُتَعَوِّذٌ بِمِثْلِهِمَا. قَالَ وَسَمِعْتُهُ يَؤُمُّنَا بِهِمَا فِي الصَّلاَةِ. رواهما أبو داود والنسائي[٥]:

**دیسان گوتی: جارێ لە خزمەتی پێغەمبەردا بەدەم رێگەوە دەرۆیشتین، لەنێوانی جوحفەو ئەبوادا، لە پڕ كردی بە باو دنیا بوو بە تاریك و نووتەك، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی كرد بە خوێندنی (قُلْ أَعُوذُ)وەكان وە دەیفەرموو: ئەی عوقبە! ئەم دووە بخوێنە بە نیازی ئەوە كە ببن بە پەناو پاسار بۆت لە ئێش و دەردو ئازار بە راستی ئەمانە باشترین قەڵاو پشت و پەنان بۆ كەسێ پەنایان بۆ ببا گوتی: وە گوێشم لێ بوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كە بەر نوێژیی بۆ دەكردین ئەم دوو سوورەتەیشی تیا دەخوێند (د/ن).**

٣٦٧٤- وَعَنْهُ قَالَ: أمرني رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَنْ اقْرَأْ بِالْمُعَوِّذَتَيْنِ فِي دبر كلّ صَلاَةٍ. رواه الترمذي بسند حسن[٦]:

**دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێ فەرموم كە لە پاش گشت نوێژێ دوو (قل أعوذ)وەكان بخوێنم (ت-س/ح).**

٣٦٧٥- قَالَ المؤلف(رضوان الله عليه) في الشرح (تنبيه) هَذَا مَا فِي أُصولنا الخمسة مِن فَضْلِ بَعْضِ سُورِ القرآنِ الكريم، وَإِلاَّ فَكُلُّ سُورَةٍ بَلْ كلُّ آيَةٍ وَكُلُّ كَلِمَةٍ مَن كِتابِ الله العزيز، فَضَائِلَهَا لاَ تُحْصى وَلاَ تُعَدُّ وَأَسْرَارُهَا جَلَّتْ عَنِ الحَصْرِ[٧]:

**دانەری بەهەشتی لە شەرحەكەدا دەڵێ: بێداریی یەك ئەمەی كە رۆیی لە بارەی گەورەیی هەندێ لە سوورەتەكانی قورئانی پیرۆزەوە بوو، بە پێی**

---

[٥] سكت عن درجته اشارح.

[٦] حسن عند الترمذ.

[٧] كلام للمؤلف.

ئەوەی کەوا لە پێنج نامە سەرچاوەکانی ئێمەدا (کە بوخاریی و موسلیم و ئەبو داودو ترمزیی و نەسائین). دەنا هەموو سوورەتێك و هەموو ئایەتێك و هەموو ووشەیەکی قورئانی پیرۆز کە نامەی خودای تەوانایە، دارای چەندین بەهرەو پاکژیی و قەدرو ڕێزی زۆر زۆرە، کە لە ژمارە نایەن و رازو پەنهانییەکانیان ئێجگار بێ شومارن. بەندەیش عەرزتان دەکەم:

قورئـــان ســـەرا ســـەر گـــوڵ و گـــوڵزارە
لــــە نــــەلفی تـــا یـــای رازو نەســـــارە
بـۆ هەرچـی، کامـەی دەگـری بـەکارە
گشت نایـەتێکی بـۆ گـشت شـت چارە!
بـە پـشتی خـودا، بـە دەمێکـی پـاک
بیخوێنـــە دەگـــەی بـــە مـــرازی چـــاک
بە سینەی پڕ سۆز، بـە گـەرووی ساف
بـــە دەنگـــی زوڵاڵ وەک تـــاوی ســـۆلاف
لــــە زارت بـــــڕژێ نایـــــەتی قورئـــــان
دەبـــێ بـــە مایـــەی خۆشـــی دوو جیهـــان

**٩٢) باسی چوارەم: باسی پیاوانی قورئان و شێوەکانی خوێندنەوەی قورئان**

**الباب الرابع: في رجال القرآن ورواياته**

٣٦٧٦- ⬅ (ب- ٥ باســـی گـــەورەیی موعـــاز- ف- ٢ = بـــەرگی / ٥ زنجیرە/ ٤٨. ژمارە ٢ / ٣٤٧٤)[1].

---

[1] تقدم في مجلد رابع. تسلسل/٤٨ برقم: ٣٤٧٤/٢.

٣٦٧٧- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنـهُ) قَالَ: مَاتَ النَّبِيُّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّم) وَلَـمْ يَجْمَـعِ الْقُرْآنَ غَيْرُ أَرْبَعَةٍ أَبُو الدَّرْدَاءِ وَمُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ وَزَيْدُ بْـنُ ثَابِـتٍ وَأَبُـو زَيْـدٍ. قَـالَ وَنَحْـنُ وَرِثْنَاهُ. رواه البخاری[٢]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: بە سەرینیی پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) چوار کەس لە یاریدەدەران هەموو قورئانیان لەبەر بوو: ئەبو دەرداءو موعازی کوڕی جەبەل و زەیدی کوڕی ثابیتو ئەبو زەید بوون. ئەنەس گوتی: ئەم ئەبو زەیدە ئامۆزای ئێمە بوو، کە مرد کەسی تری نەبوو جگە لە ئێمە، کە لە پوورەکەی بڕا بە ئێمە (ب).

قورئان پەروەران کۆڵەکەی دینن

بۆ ئێمە مایەی خۆشیی دوو ژینن!

٣٦٧٨ ⟵(ب- ٥باسی گەورەیی عبدالله بن مسعود- ف-٧)[٣].

٣٦٧٩- ⟵ (ب-٥ باسی گەورەیی عبدالله بن مسعود-ف-٨)[٤].

## ٩٣) قورئان بە حەوت شێوە خوێندنەوەی جوان هاتۆتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)

## نزل القرآن على سبعة أحرف

٣٦٨٠- عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنهُمَا) عَنْ النَّبِيِّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَـالَ: أَقْرَأَنِـي جِبْرِيلُ عَلَى حَرْفٍ فَرَاجَعْتُهُ، فَلَمْ أَزَلْ أَسْتَزِيدُهُ وَيَزِيدُنِي حَتَّى انْتَهَى إِلَـى سَـبْعَةِ أَحْـرُفٍ. رواه الشيخان[١]:

---

[٢] بخاری. فضائل القرآن: ٥٠٠٤.

[٣] راجع المجلد الخامس. تسلسل/ ٢٨ برقم: ٣٤٠٧/٧.

[٤] راجع المجلد الخامس. تسلسل/ ٢٨ برقم: ٨/ ٣٤٠٨.

[١] بخاری. فضائل القرآن:٤٩٩١. راجع تجريد البخاری/٤ ل-٥٢٤ رقم:١٧٢٤ =٤٩٩٢، ٢٤١٩، ١٨٩٩- ١٩٠٤.

**ئیبنو عەبباس** (ڕەزای خودایان لێ بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: جوبرائیل لەسەر یەك شێوە (شێوە: حەرف: قیرائەت) قورئانی پێ دەخوێندم، منیش هەموو جارێ هەر داوام لێ دەکرد کە شێوەکان زیاد کا ئەویش بۆی زیاد دەکردم هەتا لە ئەنجاما ژمارەی شێوەکانی خوێندن (قیرائات)ی قورئان لەسەر حەوت شێوەی جوان کۆتاییان هات (ش).**

٣٦٨١- عَنْ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ هِشَامَ بْنَ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ يَقْرَأُ سُورَةَ الْفُرْقَانِ عَلَى غَيْرِ مَا أَقْرَؤُهَا، وَكَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَقْرَأَنِيهَا، وَكِدْتُ أَنْ أَعْجَلَ عَلَيْهِ، ثُمَّ أَمْهَلْتُهُ حَتَّى انْصَرَفَ، ثُمَّ لَبَّبْتُهُ بِرِدَائِهِ فَجِئْتُ بِهِ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللّٰهِ إِنِّي سَمِعْتُ هَذَا يَقْرَأُ سورَةِ الفُرْقَانِ عَلَى غَيْرِ مَا أَقْرَأْتَنِيهَا، فَقَالَ لِي: أَرْسِلْهُ. ثُمَّ قَالَ لَهُ يَا هِشَام: فَقَرَأَ. القِرَاءَةَ التي سَمِعْتُهَا فَقَالَ: رَسُولِ اللهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): هَكَذَا أُنْزِلَتْ. ثُمَّ قَالَ لِي: اقْرَأْ. فَقَرَأْتُ فَقَالَ « هَكَذَا أُنْزِلَتْ. إِنَّ الْقُرْآنَ أُنْزِلَ عَلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ فَاقْرَءُوا مِنْهُ مَا تَيَسَّرَ. رواه الاربعة[٢]:

**عومەری کوڕی خەططاب** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: گوێم لە هیشامی کوڕی حەکیم بوو، سوورەتی فورقانی دەخوێند، شێوەی خوێندنەکەی ئەو جیا بوو لەگەڵ شێوەی خوێندنەکەی مندا، منیش قورئانەکەم لەلای پێغەمبەر خۆی خوێندبوو، جا خەریك بووم هەر لە ناو نوێژەکەیدا پەلاماری بدەم، بەڵام مۆڵەتیم دا هەتا سڵاوی دایەوە، ئەوسا توند یەخەیم گرتو بەرۆکی پۆشاکەکەیم لوول دا بە ملیەوەو بەو شێوەیە بە ڕاکێشان بردم بۆ لای پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **گوتم: قوربان! ئەمە سوورەتی فورقانی دەخوێند، بە شێوەیێ دەیخوێنێ جیایە لەگەڵ ئەوەدا کە من لەلای تۆ خوێندوومە! فەرمووی** (دروودی خودای لەسەر بێ)**: جارێ یەخەی بەردە، ئەی هیشام! ئادەی بخوێنە جا ئەویش لەسەر ئەو شێوەیەی پێشوو کە من گوێم**

---

[٢] بخاری. خصومات (تجرید/ ٤ ل – ٥٢٤ ذ: ١٧٢٤ = ٤٩٩٢ ، ٢٤١٩ ، ٥٠٤١ ، ٦٩٣٦ ، ٧٥٥٠. مسلم. صلاة المسافرين. فضائل القرآن وما يتعلق بها: ١٨٩٦ – ١٨٩٧. أبو داود. صلاة: ١٤٥. نسائی. إفتتاح: ٩٣٥ ، ٩٣٦ ، ٩٣٧.

لێ بوو خوێندی، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموی: ئاوەهاش هاتۆتە خوارەوە ئینجا فەرمووی بە منیش: ئادەی تۆیش بخوێنە منیش لەسەر شێوەکەی خۆم کە لە پێغەمبەرم وەرگرتبوو خوێندم، فەرمووی: ئاوەهاش هاتۆتە خوارەوە، ئەمەیش قەیدی نییە، چونکە ئەم قورئانە بە حەوت شێوە نێرراوەتە خوارەوە جا ئێوە بە کام شێوەیە بە ئاسانی بۆتان دەخوێنرێ بەو شێوەیە بیخوێنن! (ش/د/ت= بوخاری، موسلیم، ئەبو داوود، تیرمیذی).

٣٦٨٢- عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ عِنْدَ أَضَاةِ بَنِي غِفَارٍ – قَالَ – فَأَتَاهُ جِبْرِيلُ – عَلَيْهِ السَّلاَمُ – فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكَ أَنْ تَقْرَأَ أُمَّتُكَ الْقُرْآنَ عَلَى حَرْفٍ. فَقَالَ: أَسْأَلُ اللَّهَ مُعَافَاتَهُ وَمَغْفِرَتَهُ وَإِنَّ أُمَّتِي لاَ تُطِيقُ ذَلِكَ. ثُمَّ أَتَاهُ الثَّانِيَةَ فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكَ أَنْ تَقْرَأَ أُمَّتُكَ الْقُرْآنَ عَلَى حَرْفَيْنِ فَقَالَ: أَسْأَلُ اللَّهَ مُعَافَاتَهُ وَمَغْفِرَتَهُ وَإِنَّ أُمَّتِي لاَ تُطِيقُ ذَلِكَ. ثُمَّ جَاءَهُ الثَّالِثَةَ فَقَالَ إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكَ أَنْ تَقْرَأَ أُمَّتُكَ الْقُرْآنَ عَلَى ثَلاَثَةِ أَحْرُفٍ. فَقَالَ: أَسْأَلُ اللَّهَ مُعَافَاتَهُ وَمَغْفِرَتَهُ وَإِنَّ أُمَّتِي لاَ تُطِيقُ ذَلِكَ. ثُمَّ جَاءَهُ الرَّابِعَةَ فَقَالَ إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكَ أَنْ تَقْرَأَ أُمَّتُكَ الْقُرْآنَ عَلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ فَأَيُّمَا حَرْفٍ قَرَءُوا عَلَيْهِ فَقَدْ أَصَابُوا. رواه مسلم وأبو داود والترمذي ولفظه: يَا جِبْرِيلُ إِنِّي بُعِثْتُ إِلَى أُمَّةٍ أُمِّيِّينَ مِنْهُمُ الْعَجُوزُ وَالشَّيْخُ الْكَبِيرُ وَالْغُلاَمُ وَالْجَارِيَةُ وَالرَّجُلُ الَّذِى لَمْ يَقْرَأْ كِتَابًا قَطٌّ. قَالَ: يَا مُحَمَّدُ إِنَّ الْقُرْآنَ أُنْزِلَ عَلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ[٣]:

ئوبەییەی کوڕی کەعب (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەلای گۆلاوەکەی بەنی غیفار بوو، جوبرائیل (دروودی خودای لەسەر بێ) هات بۆ لای، فەرمووی: کە خودا فەرمانت پێ دەکا کە لەسەر یەك شێوە قورئان بە گەلی خۆت بخوێنە پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: لە خودا داوا دەکەم کە بە گەورەیی خۆی بێ نیازو سەرفرازو بێ وەیمان بکاو چاوپۆشی لە گوناهمان بکا، وەلێ بە راستی گەلەکەم تەوانای ئەوەی نییە لەپاشا دووبارە جوبرائیل هاتەوە بۆ لای و فەرمووی: خودا پێت دەفەرموێ

[٣] مسلم. فضائل القرآن: ١٩٠٣، ١٩٠١ – ١٩٠٤. أبو داود. صلاة: ١٤٧٨. نسائي. إفتتاح: ٩٣٨.

کە لەسەر دوو شێوە قورئان بە گەلی خۆت بخوێنە پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمویێتەوە: داوا دەکەم لە خودا کە بە گەورەیی خۆی بێ نیازو سەرفرازو بێ وەیمان بکاو چاوپۆشی لە گوناهمان بکا، بەلاّم بە راستی گەلەکەم تاقەتی ئەوەی نییە چونکە زاراوەو شێوەی زمانو قسەکردنیان جوێ جوێ یەو بە گران دەتوانن کە بە غەیری شێوەی خۆیان بخوێنن لەپاشا جاری سێیەم هاتەوە بۆ لایو فەرمووی: خودا پێت دەفەرموێ کە لەسەر سێ شێوە قورئان بە گەلەکەت بخوێنە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دیسان فەرمووی: داوا دەکەم لە خودا کە بە گەورەیی خۆی بێ نیازو سەرفرازو بێ وەیمان بکاو چاو پۆشی لە تاوانو گوناهمان بکا، بەلاّم بە راستی گەلی من تەواناى ئەوەشیان نییە ئینجا لە سەرەی جاری چوارەما جوبرائیل کە دێتەوە بۆلای دەفەرموێ: خودا فەرمانت پێ دەکا کە گەلەکەت بە حەوت شێوە قورئان بخوێنن، ئیتر بە هەرکامێ لەو حەوت شێوە قورئان بخوێنن دەی پێکەنو لە نیشانە دەدەن (م/ت) گفتەی (ت) ئاوایە: ئەی جوبرائیل! من خودا کردوومی بە پێغەمبەری نەتەوەیەکی بێ سەوادی نەخوێندەواری وا کە پیرێژنو پیرەمێردو هەرزەکارو گەورە کچو پیاوی وایان تیادایە کە هەرگیز کتێبو پەڕتووکی نەخوێندووە! جوبرائیل (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی موحەممەد! ئەم قورئانە بە حەوت شێوە هاتۆتە خوارەوە.

٣٦٨٣- وَعَنْهُ قَالَ: كُنْتُ فِي الْمَسْجِدِ فَدَخَلَ رَجُلٌ يُصَلِّي فَقَرَأَ قِرَاءَةً أَنْكَرْتُهَا عَلَيْهِ ثُمَّ دَخَلَ آخَرُ فَقَرَأَ قِرَاءَةً سِوَى قِرَاءَةِ صَاحِبِهِ فَلَمَّا قَضَيْنَا الصَّلاَةَ دَخَلْنَا جَمِيعًا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقُلْتُ إِنَّ هَذَا قَرَأَ قِرَاءَةً أَنْكَرْتُهَا عَلَيْهِ وَدَخَلَ آخَرُ فَقَرَأَ سِوَى قِرَاءَةِ صَاحِبِهِ فَأَمَرَهُمَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَرَءَا فَحَسَّنَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) شَأْنَهُمَا فَسُقِطَ فِي نَفْسِي مِنَ التَّكْذِيبِ وَلاَ إِذْ كُنْتُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ فَلَمَّا رَأَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مَا قَدْ غَشِيَنِي ضَرَبَ فِي صَدْرِي فَفِضْتُ عَرَقًا وَكَأَنَّمَا أَنْظُرُ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ فَرَقًا فَقَالَ لِي « يَا أُبَيُّ أُرْسِلَ إِلَيَّ أَنِ اقْرَإِ الْقُرْآنَ عَلَى حَرْفٍ فَرَدَدْتُ إِلَيْهِ أَنْ هَوِّنْ عَلَى أُمَّتِي. فَرَدَّ إِلَيَّ الثَّانِيَةَ اقْرَأْهُ عَلَى حَرْفَيْنِ. فَرَدَدْتُ إِلَيْهِ أَنْ هَوِّنْ عَلَى أُمَّتِي. فَرَدَّ إِلَيَّ

الثَّالِثَةَ اقْرَأْهُ عَلَى سَبْعَةِ أَحْرُفٍ فَلَكَ بِكُلِّ رَدَّةٍ رَدَدْتُكَهَا مَسْأَلَةٌ تَسْأَلُنِيهَا. فَقُلْتُ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لأُمَّتِي. اللَّهُمَّ اغْفِرْ لأُمَّتِي. وَأَخَّرْتُ الثَّالِثَةَ لِيَوْمٍ يَرْغَبُ إِلَىَّ الْخَلْقُ كُلُّهُمْ حَتَّى إِبْرَاهِيمُ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم). رواه مسلم[٤]:

دیسان ئوبەیی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ لە مزگەوت بووم، پیاوێ هاتە ژوورەوە، دەستی کرد بە نوێژکردن، قورئانی خوێند، کەچی لەسەر شێوەیەکی وای خوێند کە من بە دڵم نەبوو، رەخنەم لێی هەبوو، لە پاشا پیاوێکی تر هات، بە شێوەیەکی تر خوێندی، کە لە نوێژەکەیان بوونەوە پێکەوە چووینە خزمەت حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) گوتم: ئەمەیان قورئانەکەی بە شێوەیەکی وا خوێند کە بە دڵی من نییە، کەچی ئەمەش هات ئەویش بە جۆرێکی تر خوێندی! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێ کردن و بەرو دوا دەوری قورئانەکەیان کردەوە بۆی، لە پاشا ئافەرینی هەردووکی کردن، جا منیش ئەم جیاوازییەم لەلا سەیر بوو، وە لە دڵما جێگەی نەبۆوە بۆیە بێ بڕواییەکی وا هات بە دڵما کە لە سەردەمی نەزانی پێش ئیسلامیش دا ئاوا بێ بڕوا نەبووم لە دڵی خۆم دا پەشیمانی و خەم و خەفەتم پەیداکردو گوتم: ئەمە چەنی بەچەنە؟! جا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چاوی بەم حاڵە کەوت و تەماشای کرد من وەها بزرکاوم دەستێکی دا بەسینگما، ئیتر لەشم نیشتە سەر ئارەق و ترسێکی وەهام لێ نیشت دەتگوت بە چاوی سەر تەماشای خودای گەورەو سەروەر دەکەم و ئارەقی شەرمم دەردا، ئەوجا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی ئوبەیی! خودا سرووشی بۆ ناردم کە قورئان بە شێوەیێ بخوێنە، منیش وەرامم بۆ ناردەوەو عەرزیم کرد: کە باری گەلی من سووك بکە جا دووبارە خودا سرووشی بۆم ناردەوە، ئەمجارە فەرمووی: دەی لەسەر دوو شێوە بیخوێنە،

---

[٤] مسلم. فضائل القرآن: ١٩٠١ — ١٩٠٤ تقدم تخريجه بمثل الحديث الذى قبله.

بەڵام دیسان عەرزیم کردەوە: کە بارو کاری خوێندن لە سەر گەلەکەم سووکتر بکە، تا خودا لە جاری سێیەما سرووشی بۆ ناردمەوەو ئەمجا فەرمووی: دەی لەسەر حەوت شێوە بیخوێنە، وە لەباتی ئەم سێ جارەش کە تۆ بۆ پترکردنی ئەم شێوەیانە موراجەعەی منت کردەوە سێ دڵخوازی خۆتت بۆ جێ بەجێ دەکەم، کە خۆت هەڵیان بژێریو لە منیان داوا بکەی منیش دوانیانم بەم شێوەیە لە خودا داوا کردو گوتم: ئەی خودایە! لە ئوممەتم خۆش بە – ئەی خودایە! لە ئوممەتم خۆش بە، وە داوای سێیەمیشم هەڵ گرتووە بۆ ئەو رۆژەی کە سەرجەم دروست کراوانی خودا کاریان تێم دەکەوێ، تەنانەت لەو رۆژە تووشو سەختەدا هەڵوێست وا شلۆق دەبێ ئیبراهیم پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) هاوارم بۆ دێنێ! (م) لێرەدا بە ئومێدی ئەوەی کە منو خوێنەری هێژا بەر ئەم نزا پیرۆزەی ئەم پیاوە پیرۆزو موبارەکە بکەوین، کە لە تەرجەمەی ئەم حەدیثەدا لە بەرگی یەکەمی (اقتران النیرین)ە کەیدا، لە لاپەڕە (٩٨)دا کردوویەتی، ئەم دوعا جوانەی کە بەهەشتی خواڵێ خۆشبوو جەنابی مامۆستا مەلا رەشید بەگی بابان کردوویەتی لەو شوێنەدا رادەگوێزمەوە بۆ ئێرەو بەندەیش ئامینم لەسەر ئامینێتی، ئەمەش دەقی نزاکەیەتی کە دەڵێ:

(یا رەببی! خوایە! بۆ خاتری ئەو پێغەمبەرە عەزیزە (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) منیشو مەلا حسنیش لەو وەختەوە کە دەستم کردووە بە (یا الله)و (یا فتاح)و (یا رزاق) تا سەر مەلا عبدالرحمانی پێنجوێنی هەر مامۆستایەكو هەر کەسێ کە ئستیفادەی یەك حەرفم لێ کردبێو کەلیمەیەکی خێرم لێ بیستبێو فائیدەیەکی دیینی یا دونیایی بۆم بووبێ (کەم یا زۆر) یا چوبمە ماڵی یا هاتبێتە ماڵم بە جاهی ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستە عەفوومان بکەی، لە مسیبەتی دونیاو ئاخیرەت موحافەزەمان بفەرمووی: آمین برحمتك یا ارحم الراحمین).

## ٩٤) پاشەکی (باسی کۆکردنەوەی قورئان لە سەردەمی خولەفای راشیدیندا) (خودایان لێ رازی بێ)

## خاتمة في جمع القرآن في عهد الخلفاء الراشدين (رضى الله تَعَالَى عنهم)

٣٦٨٤- عَنْ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: أَرْسَلَ إِلَيَّ أَبُو بَكْرٍ مَقْتَلَ أَهْلِ الْيَمَامَةِ فَإِذَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ عِنْدَهُ قَالَ أَبُو بَكْرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) إِنَّ عُمَرَ أَتَانِي فَقَالَ إِنَّ الْقَتْلَ قَدِ اسْتَحَرَّ يَوْمَ الْيَمَامَةِ بِقُرَّاءِ الْقُرْآنِ وَإِنِّي أَخْشَى أَنْ يَسْتَحِرَّ الْقَتْلُ بِالْقُرَّاءِ بِالْمَوَاطِنِ، فَيَذْهَبَ كَثِيرٌ مِنَ الْقُرْآنِ وَإِنِّي أَرَى أَنْ تَأْمُرَ بِجَمْعِ الْقُرْآنِ. قُلْتُ لِعُمَرَ كَيْفَ تَفْعَلُ شَيْئًا لَمْ يَفْعَلْهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ قَالَ عُمَرُ: هَذَا وَاللَّهِ خَيْرٌ. فَلَمْ يَزَلْ عُمَرُ يُرَاجِعُنِي حَتَّى شَرَحَ اللَّهُ صَدْرِي لِذَلِكَ، وَرَأَيْتُ فِي ذَلِكَ الَّذِي رَأَى عُمَرُ. قَالَ زَيْدٌ قَالَ أَبُو بَكْرٍ إِنَّكَ رَجُلٌ شَابٌّ عَاقِلٌ لاَ نَتَّهِمُكَ، وَقَدْ كُنْتَ تَكْتُبُ الْوَحْيَ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَتَتَبَّعِ الْقُرْآنَ فَاجْمَعْهُ فَوَاللَّهِ لَوْ كَلَّفُونِي نَقْلَ جَبَلٍ مِنَ الْجِبَالِ مَا كَانَ أَثْقَلَ عَلَيَّ مِمَّا أَمَرَنِي بِهِ مِنْ جَمْعِ الْقُرْآنِ قُلْتُ كَيْفَ تَفْعَلُونَ شَيْئًا لَمْ يَفْعَلْهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ قَالَ: هُوَ وَاللَّهِ خَيْرٌ فَلَمْ يَزَلْ أَبُو بَكْرٍ يُرَاجِعُنِي حَتَّى شَرَحَ اللَّهُ صَدْرِي لِلَّذِي شَرَحَ لَهُ صَدْرَ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ - رضى الله عنهما - فَتَتَبَّعْتُ الْقُرْآنَ أَجْمَعُهُ مِنَ الْعُسُبِ وَاللِّخَافِ وَصُدُورِ الرِّجَالِ حَتَّى وَجَدْتُ آخِرَ سُورَةِ التَّوْبَةِ مَعَ أَبِي خُزَيْمَةَ الأَنْصَارِيِّ لَمْ أَجِدْهَا مَعَ أَحَدٍ غَيْرَهُ ( لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِنْ أَنْفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ ) حَتَّى خَاتِمَةِ بَرَاءَةَ، فَكَانَتِ الصُّحُفُ عِنْدَ أَبِي بَكْرٍ حَتَّى تَوَفَّاهُ اللَّهُ ثُمَّ عِنْدَ عُمَرَ حَيَاتَهُ ثُمَّ عِنْدَ حَفْصَةَ بِنْتِ عُمَرَ - رضى الله تعالى عنهم -[1].

زەیدی کوڕی ثابیت (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: لە دوا جەنگەی کوشتارەکەی رۆژانی شەڕی یەمامە کە لەپاش مەرگی پێغەمبەر رووی دا ئەبو بەکر (خودای لێ رازی بێ) ناردی بە شوێنما، کە چوومە لای عومەری کوڕی خەتتابی لە لابوو. ئەبو بەکر گوتی: عومەر هاتووە بۆ لام دەڵێ: لە رۆژی جەنگی یەمامەدا کوشتارێکی بێداد لە قورئان خوێنەکان کراوە، دەترسم کە لەمەو لاش لە

---

[1] بخاری. فضائل القرآن: ٤٩٨٦ — ٤٩٨٨.

شەڕگەكانا كوشتاری زۆری تریان لێ بكرێو زۆر لە قورئان زانەكان شەهید بن‌و شەهیدبوونیان ببێ بە هۆی ئەوەی كە زۆر لە قورئان لە ناو بچێ، جا من رام وایە: كە فەرمان بدەی قورئان كۆ بكرێتەوە، منیش گوتم بە عومەر: شتێ كە پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) نەیكردبێ چۆن تۆ دەیكەی؟ بەڵام عومەر گوتی: بە خوا ئەم ئیشە زۆر باشە وە هەروازی لێ نەهێنام هەتا دەبینم خودا دڵی منیشی روون كردۆتەوە بۆ ئەم كارەو منیش وەك عومەر لەو باوەڕەدام كە ئەمە كارێكی زۆر پیرۆزو باشە. زەید گوتی: ئەبو بەكر گوتی: دەی تۆ پیاوێكی گەنجی هۆشیاری‌و لاوێكی زرنگ‌و زیرەكی‌و جێگەی باوەڕی ئێمەیت‌و گومانی خراپت لێ ناكەین‌و سەرەڕای ئەمەش لە كاتی خۆی دا میرزای حەزرەت بوویت‌و سرووشت دەنووسییەوە بۆی، جا كەوابوو شانی تۆ ئەم ئەركە جوانە هەڵ دەگرێ، دەی بەم‌و بەوەوە بگەڕێ‌و هەموو كەرت‌و پارچەكانی قورئان پەیداكەو گشتیان كۆ بكەرەوەو قورئان سەرانسەر لە یەك بەرگ دا بنووسەرەوە. زەید گوتی: سابەو خودایە ئەگەر روویان لێ بنامایە كە كێوێ بە كۆڵ بگوێزمەوە هەر ئەوەندەم لەلا قورس‌و گران بوو. گوتم: شتێ كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی نەیكردبێ چۆن ئێوە دەیكەن؟ ئەبو بەكر گوتی: بە خودا ئەمە كارێكی زۆر باشە، ئیتر ئەبو بەكر هەروازی لێ نەهێنام‌و هەر رووی لێ دەنام هەتا خودا دڵی منیشی رووناك كردەوە بۆ ئەم كاری خێرە، وەك دڵی ئەبو بەكرو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) ئینجا دەستم كرد بە گەڕان بە شوێن پارچەو كەرت‌و بەشەكانی قورئان دا، هەندێكیم لە داركی پەلكە خورما كۆكردەوەو هەندێكی تری لە تەلە بەردو تەختە دارو لە تەسواڵەت‌و پارچە چەرم‌و شتی وا كۆكردەوە، یا لە دەفەی شانە حوشترو ئێسكی پانی تەنك، كە كاتی خۆی لەو شتانە بە پەڕا گەندەیی‌و جیا جیا لەبەر هۆی تایبەتی نووسرابوون، وە هەندێكی تریم لە سینگی پیاوان كۆ كردەوە كە بەرەوانی لە بەریان بوو، لەپاشا كۆتایی سوورەتی تەوبەم بەسەر گرتەوە كە لەلای ئەبو خوزەیمەی ئەنصاری بوو، لەلای كەسی تر دەستم نەكەوت، كە برێتییە لەم دوو ئایەتە:

{لَقَدْ جَاءكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ}، {فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُلْ حَسْبِيَ اللّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ}.

**ئیتر ئەو تۆمارو نامانەی کە بە فەرمانی ئەبو بەکر هەموو قورئانم تیادا نووسینەوە لەلای ئەبو بەکر خۆی مانەوە، تا خودا ئەبو بەکری بردەوە بۆ لای خۆی، ئەوجا کەوتنە لای عومەرو هەتا خۆی لە ژیانا مابوو هەر لەلای خۆی بوون، دوای ئەولای حەفصەی کچی عومەر مانەوە** (خودا لێیان رازی بێ) **هەتا لە سەردەمی جێنشینی عوسماندا داوای کردن و چەن روو نووسێکی لێ گرتنەوەو بلاوی کردنەوە بە ناو وولاتانی ئیسلام دا** (رەزای خوای لێ بێ)**(ب/ت).**

**٣٦٨٥-** عَنْ أَنَسَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ حُذَيْفَةَ بْنَ الْيَمَانِ قَدِمَ عَلَى عُثْمَانَ وَكَانَ يُغَازِي أَهْلَ الشَّأْمِ فِي فَتْحِ إِرْمِينِيَةَ وَأَذْرَبِيجَانَ مَعَ أَهْلِ الْعِرَاقِ فَأَفْزَعَ حُذَيْفَةَ اخْتِلَافُهُمْ فِي الْقِرَاءَةِ فَقَالَ حُذَيْفَةُ لِعُثْمَانَ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ أَدْرِكْ هَذِهِ الأُمَّةَ قَبْلَ أَنْ يَخْتَلِفُوا فِي الْكِتَابِ اخْتِلَافَ الْيَهُودِ وَالنَّصَارَى فَأَرْسَلَ عُثْمَانُ إِلَى حَفْصَةَ أَنْ أَرْسِلِي إِلَيْنَا بِالصُّحُفِ نَنْسَخُهَا فِي الْمَصَاحِفِ ثُمَّ نَرُدُّهَا إِلَيْكِ فَأَرْسَلَتْ بِهَا حَفْصَةُ إِلَى عُثْمَانَ فَأَمَرَ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ وَعَبْدَ اللَّهِ بْنَ الزُّبَيْرِ وَسَعِيدَ بْنَ الْعَاصِ وَعَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الْحَارِثِ بْنِ هِشَامٍ فَنَسَخُوهَا فِي الْمَصَاحِفِ وَقَالَ عُثْمَانُ لِلرَّهْطِ الْقُرَشِيِّينَ الثَّلَاثَةِ إِذَا اخْتَلَفْتُمْ أَنْتُمْ وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ فِي شَيْءٍ مِنَ الْقُرْآنِ فَاكْتُبُوهُ بِلِسَانِ قُرَيْشٍ فَإِنَّمَا نَزَلَ بِلِسَانِهِمْ فَفَعَلُوا حَتَّى إِذَا نَسَخُوا الصُّحُفَ فِي الْمَصَاحِفِ رَدَّ عُثْمَانُ الصُّحُفَ إِلَى حَفْصَةَ وَأَرْسَلَ إِلَى كُلِّ أُفُقٍ بِمُصْحَفٍ مِمَّا نَسَخُوا وَأَمَرَ بِمَا سِوَاهُ مِنَ الْقُرْآنِ فِي كُلِّ صَحِيفَةٍ أَوْ مُصْحَفٍ أَنْ يُحْرَقَ. وَقَالَ: زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) فَقَدْتُ آيَةً مِنَ الأَحْزَابِ حِينَ نَسَخْنَا الْمُصْحَفَ، قَدْ كُنْتُ أَسْمَعُ رَسُولَ اللَّهِ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) يَقْرَأُ بِهَا، فَالْتَمَسْنَاهَا فَوَجَدْنَاهَا مَعَ خُزَيْمَةَ بْنِ ثَابِتٍ الأَنْصَارِيِّ ( مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ فَمِنْهُمْ مَنْ قَضَى نَحْبَهُ وَمِنْهُمْ مَنْ يَنْتَظِرُ ) فَأَلْحَقْنَاهَا فِي سُورَتِهَا فِي الْمُصْحَفِ. رواهما البخاري والترمذي وزاد: فَاخْتَلَفُوا فِي التَّابُوتِ وَالتَّابُوهِ فَقَالَ الْقُرَشِيُّونَ التَّابُوتُ. وَقَالَ زَيْدٌ التَّابُوهُ. فَرُفِعَ اخْتِلَافُهُمْ إِلَى عُثْمَانَ فَقَالَ اكْتُبُوهُ التَّابُوتُ فَإِنَّهُ نَزَلَ بِلِسَانِ قُرَيْشٍ. والله تعالى أعلى واعلم. نسأل الله أن ينفعنا بالقرآن آمين[٢]:

---

[٢] بخاری. فضائل القرآن: ٤٩٨٧.

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: حوزەیفەی كوڕی یەمان هات بۆ لای عوسمان، عوسمان لەوكاتەدا خەریك بوو لەشكری رێك دەخست لە خەڵكی شام و لە خەڵكی عێراق بۆ گرتن (فەتح)ی وولاتی ئازەربیجان و شاری ئەرمینیە، حوزەیفە تۆقی و ترسی لێ نیشت لەو جیایی و جیاوازییەی كە پەیدا بوو لە نێو قورئان خوێنەكاندا لە هەندێ شێوەی قورئان خوێندندا چونكە خەڵكی شام بە قیرائەت (شێوە)ی ئوبەییەی كوڕی كەعب دەیان خوێند و خەڵكی عێراق بە شێوەی ئیبنو مەسعوود دەیان خوێند، تەنانەت وەختبوو فەرتەنە لە نێوانیاندا بەرپا ببێ، جا حوزەیفە لەپاش گرتنەكە كە گەڕانەوە نەچووە ماڵی خۆی تا چووە خزمەتی عوسمان، گوتی پێی: ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان! فریای ئەم ئۆمەتە بكەوە و بیگەرێ تا وەك جوولەكەو گاور لەناو خۆیانا لە نامەی خوادا كە قورئانی پیرۆزە دووبەرەكی و جیاوازییان تێ نەكەوتووە، عوسمان (خودای لێ رازی بێ) ناردیە لای حەفصەی كچی عومەر (خودایان لێ رازی بێ): كە ئەو قورئانەی لاتە بۆمان بنێرە، تا چەند دانەیێ قورئانی لێ دەگرینەوە ئەوسا دەینێرینەوە بۆت، حەفصەش بۆی نارد، جا عوسمان دەستووری دا بە زەیدی كوڕی ثابیت و عەبدوڵڵای كوڕی زوبەیرو سەعیدی كوڕی عاص و رەحمانی كوڕی حاریثی كوڕی هیشام چەن قورئانێكیان لەبەر ئەو بەرگە قورئانەی حەفصە نووسییەوە و حەوت دانەیان لەبەری روو نووس كرد ئەم دەستەی قورئان نووسینەوەیە كە بە سەرۆكایەتی زەید، وە بە چاودێری عوسمان خۆی بوو سێ كەسیان قوڕەیشی بوون، عوسمان بەو سێ كەسەی گوت: ئەگەر رێكەوت ئێوەو زەیدی كوڕی ثابیت كە قوڕەیشی نییە لەسەر ووشەیێ یا شتێ لە قورئانەكە رێك نەكەوتن كە چۆنی بنووسن، ئەوە لەم كاتەدا بە زمانی قوڕەیش بینووسن، چونكە خۆی زوربەی بە شێوەی زمانی قوڕەیش هاتۆتە خوارێ، ئەوانیش وایان كرد، جا كە ئەو قورئانەیان روو نووس كرد لە ناوچەند دەفتەرێكی تر داو چەن وێنەیەكی تریان لێ گرتەوە ئەوجا عوسمان قورئانەكەی حەفصەی ناردەوە بۆی، لە پاشا لەو قورئانانەی كە روو

نووسیان کردن عوسمان سەرو دانەی نارد بۆ هەموولایێ واتە: سەرو دانەی نارد بۆ مەککەو کووفەو بەصرەو شامو یەمەنو بەحرەین، وە دانەیەکیشی لای خۆی گل دایەوەو دوا ئەوە عوسمان فەرمانی دا کە هەرچی تر نووسراوە، چ پارچەو تۆمار، چ قورئانی تەواو کە بسووتێنرێ. زەیدی کوڕی ثابیت (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ئەوکاتە کە قورئانمان دەنووسییەوە، لە سوورەتی ئەحزاب ئایەتێکم لێ بزربوو، گەلێ جار لە پێغەمبەرم دەبیست کە لە ژانیدا دەیخوێند، جا کەبۆی گەڕاین لە لای خوزەیمەی کوڕی ثابیتی ئەنصاری دۆزیمانەوە، ئەو ئایەتە ئەمەیە:

{مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ ٣٣/ ٢٣}.

ئیتر لە شوێنی خۆیدا لە سوورەتەکەی خۆیدا لەناو قورئاندا دامان نا (ب/ت) (ت) ئەمەی پترە: جا لەسەر ووشەی (التابوت) رێك نەکەوتن قوڕەیشییەکان دەیان گوت: بە (التابوت) دەینووسین، زەیدیش دەیگوت: بە (التابوە) دەینووسین، تا مەسەلەکەیان گەیاندە لای عوسمان خۆی، کە عەرزیان کرد گوتی: بە (التابوت) بینووسن، چونکە قورئان بە زمانی قوڕەیش هاتۆتە خوارێ خودای گەورە بۆ خۆی زۆر باشی لێ دەزانێ. داوا لە لە خودای مەزن دەکەین کە قورئان بکا بە مایەی خێرو خۆشی هەردوو جیهانمان ئامین.

يقول المؤلف (طيَّب الله ثراه): عدد أحاديث كتاب فضائل القرآن خمسةٌ وتسعون حديثاً فقط:

دانەر (بچێتە بەهەشتێ و نەیەتە دەرێ) دەڵێ: ژمارەی فەرموودەکانی نامەی گەورەیی قورئان تەنیا نەوەدو پێنج فەرموودەنو بەس. لێرەدا ئەم چەن سەرنجە تۆمار دەکەم، کە نیشانەی ئەوپەڕی قەدرو رێزو پەیوەندی جوانی ئەم میللەتی کوردی موسوڵمانەیە بۆ قورئانی پیرۆز، کە کەمەندی بتەوی نێوانی گەلە موسوڵمانەکانە:

١- مەلاییّ رۆژیّ دەیگوت بە مەلاییّ: لەم چەرخەدا ئەوەی هاموشۆی مزگەوت بکا (جگە لە مەلا) بە راستی ئازایە!! دەزانی بۆ؟ چونکە ئەو خەڵکە وا پەلاماری دنیایان داوە ئەوەی سوودی ماددی لیّ وەرنەگرن توخنی ناکەون، ئەمڕۆکەیش (بە ناشوکری نەبیّ) دین وا غەریب بووە خەریکە ببیّ بە عەیبە تۆ سەیری ئەو ناو کوردەوارییەی خۆمان مەکە، کە بەهۆی مەلاو مزگەوتەوە لە دینا، ریّ بەدیّی دەکەن، سەیری ئەم لاو لا بکە دەزانی دنیا چی بەسەر هاتووە. مامۆستا گوتی: ئەی بۆ جگە لە مەلا گوایە مەلا چییەتی؟ گوتی: پەلە مەکە، بە هەڵە تیّ مەگە" مەبەستم ئەوەیە: مەلا دەروێشی قورئانە، مەلا قورئانی بەسە، مەلاو شێخ و دەسگیری خۆی هەیە، سەرەڕای ئەوەیش مزگەوت بەهەشتی مامۆستای مەلایە، کەسێکیش هاتوچۆی بەهەشت بکا ئازایەتی چی تیا دایە!!

٢- ئێمە خەڵکی دێی برایماوەی قەرەداخین، کە دەکەوێتە ناوەندی ئەم گوندانەوە: سەرزەل و تەنگی سەرو هەرگێنەو قەڵا سوورە، زۆر منالّ بووم، زمانم پاك نەبوو بۆوە کە دەستم کرد بە خوێندن لای مامۆستا تازەکەی گوندەکەمان کە ناوی مەلا موحەممەدی تالّ بوو (رەحمەتی خودای لیّ بیّ) هێشتا قورئانم خەتم نەکردبوو کە مامۆستا لە دێکەمان باری کرد، بیّ مەلا ماینەوە، باوکم هەرچەند نەخوێندەوار بوو بەڵام بە دڵ و بە دەم دەروێشی مەلا بوو گوتی: وەصیەتەکەی رەحمەتی ئامەی خێزانم بەجیّ دەهێنم" خوا یار بیّ، نەمرم مێزەری سپی بە نووریی کوڕی دەبەستمەوە! ئیتر من کەوتمە ناو گێژاوی (قل یا أیها الکافرون) وە هەر دەرسێکم لەلای یەکیّ دەخوێن! بەڵام بەزۆری دەچووم بۆ لای مامۆستا مەلا عەلی سەرزەل (رەحمەتی خودای لیّ بیّ) بەڵام لەبەر ئەوەی کە زۆر منال بووم و زۆریش ترسنۆك بووم، گەرچی ئەو کاتە ئازاتر بووم لە ئێستە! لەبەر ئەوە هەموو رۆژیّ بەیانەکی زوو باوکم یا کاکە حەمەم یا خوشکێکم دەستیان دەکرتم و لەسەر ریّی باراشهارو تریّ فرۆش و رێبوار دەوەستاین تا ناسیاویّ دەهات منیان دەدایە دەستی کە بمگەیەنێتە سەرزەل، ئەگەر کەس نەبوایە خۆیان دەیان گەیاندم، خۆ ئەگەر بەختم یار

بوایە ئایشێی خوشکم بی گەیاندمایە ئەوا لەڕێ بە کۆڵ دەیگەیاندم، لەو سەریشەوە هەروەها، ئەگەر کەسیشم دەست نەکەوتایە لە ماڵی مامە گەردەی سەرزەل دەمامەوە! جاری واش دەبوو چەرچی و ترێفرۆش و پۆلیس و فەقێ و میوانی خوێنەوار دەهاتن، ئەوا رێی دوورم نزیك دەبۆوەو دەرسەکەم لەلای ئەو دەخوێند! چەن جارێ شێخ مەحموودی گەورە یا شێخ قادری برای (رەحمەتی خودایان لێ بێ) دەهاتن بۆ سەردانی دێکەمان ئیتر کوێخای دێکە یا باوکم یا خوشکێکم دەستی دەگرتم و قورئانەکەم دەنایە بن دەستم و دەیبردم بۆ لای شێخ و عەرزی دەکردن: قوربان! ئەم منالە دەرسی نەخوێندووە، بفەرموو دەرسەکەی پێ بلێ! ئەویش خۆی و پیاو ماقوولەکانی مەجلیسەکەی بەرزەپێ لەبەر قورئانەکە هەڵ دەسان و ئینجا شێخ سەری من و بەرگی قوئانەکەی ماچ دەکردو دەرسەکەی زۆر بە جوانی پێ دەگوتم و دوعای خێری بۆ دەکردم، خەڵکی دێکەش (جگە لە من) لەگەڵ پیاوەکانی شێخدا لە خزمەتی شێخدا دەوەستان، سەرنجی ئەم دیمەنە شیرینەیان دەدا، جارێ من و دوو سێ فەقێی وردیلەی تر لە خزمەتی مامۆستا مەلا عەلی سەرزەلدا چووین بۆ خزمەتی شێخ مەحموودی حەفید (خودای لێ رازی بێ) مامۆستا بە شێخی فەرموو: یا شێخ! من بۆ ئەوە دێم بۆ دێنی تۆ تا نەڵێن مەلا عەلی دەعیەی زلە، شێخ مەحموود لە داریکەلی لە پەنایایەتی کەچی سەری لێ نەدا، دەنا من بۆ ئیش و شتی وا نایەم، شێخ فەرمووی: مامۆستا بە راستی منیش هاتنی تۆم (لە هاتنی وەفدی دەوڵەتی) پێ خۆشترە، چونکە دەڵێن شێخ مەحموود رێبازی باو باپیری تەرك نەکردووە، چونکە پیاوی وەك مەلا عەلی دێنی دەکا کە خادیمی قورئانە! هەر بە فەقێیەتی لە بیارەش تەریقەتی نەقش بەندیم لای حەزرەتی شێخی عەلائەددین (رەزای خودایان لێ بێ) وەرگرتووە، شێخ ئەوەندە قەدرو رێزی ئەهلی قورئانی دەگرت خۆی بە نەفسی خۆی دەستی دەنایە ناو دەستی فەقێ و مەلا لەکاتی تەریقەت وەرگرتندا، وەلێ داخەکەم خۆم خوێری بووم لەو تەریقەتە (غەیری خۆشەویستی بنەماڵەی شێخی بیارە) بەهرەم لێ وەرنەگرت، شێخ بابە عەلی کوڕی شێخ عومەری قەرەداخیش،

لە مزگەوتی حاجیحان لە خزمەتی مامۆستا مەلا کەریمی بیارەدا (کە فەقێی باوکی بووە) دەرسی کیفایەی دەخوێند منیش سەماعەیم دەکردو دەرسەکانی خۆشمم لەلای مامۆستا فاتیح و مامۆستا موحەممەد دەخوێند، کە ئەم دوو زاتە کوڕی مامۆستا مەلا کەریمن (خودا دەست بە تەمەنی پیرۆزی بگریّ و رەحم بە خۆیّ و ماڵ و منالی بکا) جا جاریّ لە مەجلیسی مامۆستا مەلا خەلیل سەعید لە مزگەوتی حاجی ئیبراهیم بەگی تەکریتی لە کەرکووك لە کلکەی مەجلیسەوە دانیشتبووم مامۆستا کە خۆی هات زۆر بە نەزاکەتەوە بردمیە لای سەرەوەو گوتی: برادەرینە! ئەمە جێی خۆیەتی، چونکە مامۆستا فەقێی شێخ مەحموودی گەورەیەو مەنسووبی شێخ عەلائەددینی بیارەیەو ئامادەی کۆڕی زانستی مامۆستا مەلا کەریمی بیارە بووە، ئەم زاتانەش (لەبەر ئەوەی خادیمی قورئانی پیرۆزن) نووری چاوی هەموو موسوڵمانێکی پاك و کوردێکی مەردن! بە راستی کە خۆشم بەم حاڵەمم زانی لە حاڵی خۆم تەریق بوومەوە، هەرچەند مامۆستا قسەکەی لە کانی دڵیەوە بوو بەڵام پەیوەندی من بەو دلێر مەردانەوە رەنگ بیّ بۆ ئەدنا مولابەسە بیّ! بەهەر حال خودا لە هەموویان خۆش بیّ و منیش لە خاکو پای ئەم زاتانە دا پەنا بدا. ئامین.

٣- باس باسی گەورەیی قورئانی پیرۆزە، کە لە سایەی خوداوە تا ئێستا بووە بە قەڵایەکی پۆڵایین بۆ پاراستنی گەلی کورد، وەمن لێم روونە ئەگەر ئەم پەنا جوانە نەبوایە ئێستە گەلی کورد بوو بوو بە پۆڕی خوراو، قولاخیشی نەمابوو، جا بە نیازێکی پاکی دڵسۆزانە، بۆ پتەو کردنی بەردی بنچینەی بنیاتی برایەتی لە نێوانی موسوڵمانانا، بە تایبەت لە نێوانی دوو گەلی برای عەرەب و کورددا کە وەکوو رەنگ و بۆی شاگوڵی قورئان وان ئەم چامەیەتان پێش کەش دەکەم، بە سەرباسی (گەلی پەروانە):

بسم الله الرحمن الرحيم

ئــــازیز! نـــــەورۆزە، وەرزی بـــــەهارە

دڵ لــــە چـــڵپاوی چـــلە، دڵـــزارە!!

بولبــول بــە تــەمای گــوڵی بۆنــدارە

خونــچەی گــوڵ بــەدەم شــەونم لــە زارە

گــوێ زەوی تینــووی شــیرەی گــوڵزارە

گــوێی لــە قــیڕەی بــت تــەواو بێــزارە!!

شــەوی نــەفامیو ســوپای تــارو مــار

شــیری ئیــسلامیان لێ کەوتۆتــە کــار

قڕەبـــت داکـــەوت لـــە لادێو لەشـــار

هەر بـوت بـوو دەکـرا بـە قوڕی دیـوار!!

بـــتو بتخانـــە چـــۆڵو ســـیسو پـــیس

شــەیتان نائومێــد، بتپەرســت نــەگریس

لـــە چـــیای ســـەورو نەشـــکەوتی حـــیرا

لـــە ســـایەی خـــواوە هـــەڵکرا چـــرا!!

گزنگـــی تیـــشکی شۆڕشـــێکی پـــاک

دەشـــتو دەری کـــرد بـــە ڕۆژی ڕوونـــاک

بلێـــسەی نـــووری قورئـــانی پـــیرۆز

دەوەزیو دڵـــی پڕدەکـــرد لـــە ســـۆز

گــوێی دڵ یەخــسیری ئــاوازەی قورئــان

بە نەوای دەردی دڵ دەبوو دەرمان

شەســـــتە بـــــارانی بـــــەهارە بـــــاران

لــە هــەوری ڕەحمــەت چــاتر لــە جــاران

دەبـــاری لەســـەر مەدینـــەی پـــیرۆز

لەســەر دانیــشتووی دروودی پــڕ ســۆز!!

بە بۆی ئەو گوڵەو تیشكی ئەو خۆرە

كە بۆن و وورشەی بە سەدان جۆرە

پۆل پۆل پیاوی مەرد خۆی و خێزانی

بوون بە پەروانەی تا هاو قورئانی!!

كۆچ و باریان كرد بەرەو مەدینە

حاشا لە گشت شت جگە لەو دینە

كە خوا ناردوویە بە موحەممەدا (د)

تاقە رەهبەری رێی راستی خودا

بوو بە مەشخەڵێ رەوگەی مەدینە

مانەندی نەبێ لەم سەر زەمینە

لەوساوە ئیتر گومەزی ئیسلام

بۆ خوا ئاس بووە بە چەتری سەلام

لە زانكۆی قورئان هەزاران زانا

دەرچوون و بوونە باشترین دانا!!

شۆڕشی ئیسلام پەلو پۆی هاویشت

تەرزی شارەو شار بەرەو پێش رۆیشت

شەمشەمە كوێرە گشت شەوارە بوون

خودای نا خودا پارە پارە بوون!!

گوڵاڵە سوورە دەشەكینەوە

بە شنەی باوەڕ دەلەرینەوە

بۆ ناو دڵی خاك دەوەرینەوە

بە سینەی ناڵی پڕ برینەوە!!

تۆوی ئازادی لە ناو دوو تۆیی خاك

دەبوو بە گەرا بۆ چینی نوێی چاك

تا لە ئەنجاما لە سایەی خواوە

کــوردیش چــوونە ژێــر سایەی هومــاوە!!

گــەلی خــوا پێــداو کــاژی بێــدادی

فــڕە داو چــووە ســێبەری شــادی

لــە سایەی خــواوە کوردســتانی جــوان

سەرانــسەر چــۆتە باوەشــی قورئــان!

کــوردان بوونەتــە پەروانــەی قورئــان

قورئــانیش بۆتــە پــەناگای کــوردان!

ئــەوەی ناهــەقی کــردووە لــەم گەلــە

بــەر شــەقی قورئــان کــەوتوە بــە پەلــە

گــەڕو گــول بــووە، یــا بــە پەنــد بــووە

ســەری بــە گــۆڕی بــابی دا چــووە!! (*)

ئــەم گــەلی کــوردە گــەلێ بــە دینــە

هــەر شــاری دەگــری وێنــەی مەدینــە

شــەپۆلی عیلمــی مــەلا لــە نــاوی

دەق دەڵێــی گــۆمی پــڕ لــە مــراوی!!

خــودا! بــەم کــوردە ئــەم نەختــە عــەردە

بــە زۆر نــەزانی لــەم نــاو چــوار بــەردە

بــۆ ســەرو مــاڵو نــامووسو دینیــان

بیکــەی بــە ســەنگەر تــا ئــاخر زەمــان!!

خــاکی پــیرۆزی کوردســتانی خــوا

---

(*) مەبەست سەدامو شای ئێرانو هامانەکەی جەزائیر بوو، کە گەلەکۆمەیەکی نامەردانەیان کرد، لەشۆڕشی گەلی کورد، لە ١٩٧٥دا. وە خودا هەرسێکیانی کرد بە پەندی بسات. نوخشە بی لە هەموو زۆردارێکی تر کە گەلی کورد دەچەوسێنێتەوە، لەهەر کوێبێ. ئامین.

(وەرگێڕ) - ٢٠٠٧/١٠/٢٢

بست بە بست پڕە لە دۆستانی خوا!!

هەر لایێ دەچی، شاخە یا دەشتە

لەبەر پیرو شەخص دەڵێی بەهەشتە

ئەوانەی ماون، هێزو هەناون

بۆ کوردەواری، هەم لەجێی چاون

ئەوانەی مردوون تاجی سەرمانن

خاکی سەر گۆڕیان خاکی بەرمانن!!

کەواتە حەفید، عەلا، شێخ عومەر

سۆمای چاوی من، تاجی گوڵی سەر!!

ئەوەن دڵسۆزم بۆ ئەم ئیسلامە

موسوڵمان هەمووی لە جێی برامە

ئەوەن ئاشقم بەم گەلی کوردە

کیسرایە لەلام کامەی زۆر وردە!!

دەی ئێوە کوردی مەردی ناودارن

لەلای خوداوەن گەلێ نازدارن

چەن جوانە گڵگۆی ئەو پیاو خاسانە

یاخۆ نەزرگەی ئەو خوا ناسانە

کە پەخش و پڕشن لەسەر گردو شاخ

دەشەکێتەوە لە سەریان بەیداخ!

کە لە بن دارو ناو گۆڕستانن

گوڵی نێژراوی ناو کوردستانن

خزنی سەر بەرزی، بەیداخی سەر پیر

لە مەردێ دەچێ پڕچەک بێ لەتیر

خەفەر بێ لە دیار ڕۆڵەی نازیزی

مەبادا نامەرد بشکێنێ ڕێزی!!

ئەمەی من دەیڵێم بڕوای کوردانە

دەربارەی خەوگەی ئەو پیر مەردانە

ئیتر ئەمو ئەو چی دەڵێن بیڵێن

ئەوان داویانە بە یەکتر بەڵێن!

نووری! بەقسە زمان شیرینی

نای بە کردەوە کە ناشیرینی!

وەلێ بەخودا دۆستی دێرینی

گشت شێخو مەلاو پیری نوورینی!

نووری نا مەلاو مەلا بەزێنە

کۆنە فەقێیە، جیرەی بۆ بێنە!

بە دەقنەو راتوو مەیخەڵەتێنە

دووعای بۆ بکەو وازی لێ بێنە!

بسم الله الرحمن الرحيم

# نامەی تەفسیرو ڕاڤەکردنی قورئانی پیرۆز

## ١) خۆپاراستنو کۆکردنەوە لە ڕاڤەکردنو واتالێکدانەوەی قورئان بەڕای خۆیی (ڕەئیی شەخصی)

## كتاب التفسير : ١) الحذر من التفسير بالرأي

٣٦٨٦- عَنْ جُنْدُبِ بِنْ عبد الله (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَـنْ قال: فِي كِتَابِ اللّٰهِ بِرَأْيِهِ فَأَصَابَ فَقَدْ أَخطَأَ. رواه أصحاب السنن بسند حسن[1].

جوندوبی کوڕی عەبدوڵلا (خودای لێڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: هەرکەسێ بەبیرو ڕای خۆی قسە لە ڕاڤەی قوڕئان بکاو بەبێ ئەوەی گوێ بە دەستووری ڕاڤەکردنی قوڕئانی پیرۆز بدات دەم لە ڕاڤەو تەفسیرکردنی بکوتێ ئەوە گریمان ڕاڤەو تەفسیرەکەشی ڕاست بێ هەربەهەڵەدا چووە! (د/ت/ن-س/ح).

٣٦٨٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) عَنْ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ قَـال: فِي الْقُرْآنِ بِغَيْرِ عِلْمٍ فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ. رواه الترمذي بسند صحيح[2].

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودای لێ بێ) لەپێغەمبەرەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەر بێ): ئەوەی بەبێ ئاگاداری تەواو بەنەزانی قسە لە ڕاڤەی قوڕئان بکا ئەوە با جێگەی خۆی لە ئاگردا بگرێو خۆی ئامادە بکا بۆ ناو دۆزەخ! (ت-س/ص).

## ٢) ئەوەی لەڕاڤەی سوورەتی فاتیحا هاتووە : (ما ورد في تفسير الفاتحة)

٣٦٨٨- ⇨ (ب/١ ز/٧٢ ل/٢٤٧ ف/٤)[1].

---

[1] رواه أصحاب السنن بسند حسن.

[2] رواه الترمذي بسند صحيح.

[1] تقدم في المجلد الأول. تسلسل: ٧٢ رقم: ٤ / ٤٧٢.

٣٦٨٩- عَنْ عديٍّ بن حاتم (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِنَّ الْمَغْضُوبَ عَلَيْهِمُ الْيَهُودُ وَإِنَّ الضَّالِّينَ النَّصَارَى. رواه أحمد وابن حبان والترمذي ولفظه: اليهود مغضوبٌ عليم والنَّصاري ضُلاَّلٌ[٢].

عەدی کوڕی حاتەم (خودای لێڕازی بێت) لەحەزرەتەوە (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: مەبەست لە (المغضوب عليهم) واتە: ئەوانەی کە خودا ڕقی لێ گرتوون مەبەست لێیان جوولەکەیە کە پێشیان دەگوترێ یەهوود بەناوی کوڕە نۆبەرەکەی حەزرەتی یەعقووبەوە (درودی لەسەر بێ) وەمەبەست لە (الضالين) واتە: ئەوانەی کە ڕێگەی ڕاستیان وون کردووە گاوورەکانە، کە پێشیان دەگوترێ نەصاری، بەناوی ناصیرەوە چونکە لەوێوە دینەکەیان سەری هەڵداوە (ئە/ئیبنو حەببان/ت) گفتەی (ت): جوولەکە غەضەببارن و گاوور گومڕاو سەر لێ شێواون!.

## ٣) ئەوەی لەبارەی سوورەتی بەقەرەوە هاتووە : (ما ورد في سورة البقرة)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَإِذْ قال: رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً – صدق الله العظيم – ٢/٣٠}.

واتە: خودای گەورە دەفەرموێ: ئەی موحەممەد! باسی ئەوکاتە پڕ لەسامو حیکمەتە بکە بۆ نەوەی ئادەم کە پەروەردگاری تۆ خودای گەورەی کردگار بە فریشتەکانی فەرموو: دەمەوێ جێنشینێ بۆ خۆم دروست بکەم و لەسەر زەوی دای بنێم، دەی ئێوە دەڵێن چی و ڕاتان چۆنە؟

٣٦٩٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَخَذَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بِيَدِي فَقَالَ: خَلَقَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ التُّرْبَةَ يَوْمَ السَّبْتِ وَخَلَقَ فِيهَا الْجِبَالَ يَوْمَ الأَحَدِ وَخَلَقَ الشَّجَرَ يَوْمَ الاِثْنَيْنِ وَخَلَقَ الْمَكْرُوهَ يَوْمَ الثُّلاَثَاءِ وَخَلَقَ النُّورَ يَوْمَ الأَرْبِعَاءِ وَبَثَّ فِيهَا الدَّوَابَّ يَوْمَ

---

[٢] سكت عن درجة هذا الحديث الشارح.

الْخَمِيسِ، وَخَلَقَ آدَمَ عَلَيْهِ السَّلاَمُ بَعْدَ الْعَصْرِ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ فِي آخِرِ الْخَلْقِ وَفِي آخِرِ سَاعَةٍ مِنْ سَاعَاتِ الْجُمُعَةِ. رواه مسلم وأحمد (رَضِيَ اللهُ عَنهُما)[1].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی گرتم‌و فەرمووی: خودای گەورەو مەزن لە ڕۆژی شەممەدا زەوی دروست کردو لە ڕۆژی یەك شەممەدا چیاكانی لەزەویدا دروست کردو لە ڕۆژی دوو شەممەدا دارو درەختی دروست کردو لە ڕۆژی سێ شەممەدا بەدیی‌و ناخۆشیی دروست کردو لەرۆژی چوار شەممەدا نوورو ڕووناکیی دروست کردو لە ڕۆژی پێنج شەممەدا زیندەوەرانی دروست کردو پەخش‌و بڵاوی کردنەوە بەناو زەوی دا وەلە دوا دوایی دروستکراوانا ئادەمی دروست کرد، لەپاش عەصری ڕۆژی هەینی، لە دواکاتژێردا، لە کاژێرەکانی ڕۆژی هەینی (م/ئە– (ڕەزای خودایان لێ بێ)).

٣٦٩١– وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: خَلَقَ اللَّهُ آدَمَ وَطُولُهُ سِتُّونَ ذِرَاعًا، ثُمَّ قَالَ: اذْهَبْ فَسَلِّمْ عَلَى أُولَئِكَ مِنَ الْمَلاَئِكَةِ، فَاسْتَمِعْ مَا يُحَيُّونَكَ، وهي تَحِيَّتُكَ وَتَحِيَّةُ ذُرِّيَّتِكَ. فقال: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ. فَقَالُوا السَّلاَمُ عَلَيْكَ وَرَحْمَةُ اللَّهِ. فَزَادُوهُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ. فَكُلُّ مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ عَلَى صُورَةِ آدَمَ، فَلَمْ يَزَلِ الْخَلْقُ يَنْقُصُ حَتَّى الآنَ. رواه الشيخان والترمذي. ولفظه: لَمَّا خَلَقَ اللَّهُ آدَمَ وَنَفَخَ فِيهِ الرُّوحَ عَطَسَ فَقَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ فَقال: لَهُ رَبُّهُ رَحِمَكَ اللَّهُ يَا آدَمُ اذْهَبْ إِلَى أُولَئِكَ الْمَلاَئِكَةِ فَقُلِ السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ. قَالُوا وَعَلَيْكَ السَّلاَمُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ. ثُمَّ رَجَعَ إِلَى رَبِّهِ فَقال: إِنَّ هَذِهِ تَحِيَّتُكَ وَتَحِيَّةُ بَنِيكَ بَيْنَهُمْ. فَقال: اللَّهُ لَهُ وَيَدَاهُ مَقْبُوضَتَانِ اخْتَرْ أَيَّهُمَا شِئْتَ قال: اخْتَرْتُ يَمِينَ رَبِّي وَكِلْتَا يَدَيه يَمِينٌ مُبَارَكَةٌ. ثُمَّ بَسَطَهَا فَإِذَا فِيهَا آدَمُ وَذُرِّيَّتُهُ قال: يَا رَبِّ مَا هَؤُلاَءِ؟ فَقَالَ: هَؤُلاَءِ ذُرِّيَّتُكَ فَإِذَا كُلُّ إِنْسَانٍ مَكْتُوبٌ عُمْرُهُ بَيْنَ عَيْنَيْهِ[2].

---

[1] مسلم. صفات المنافقين: ٦٩٨٥.

[2] بخاري. أحاديث الأنبياء: ٣٣٢٦ ، ٦٢٢٧. تجريد: ١٣٣٦ = ٦٢٢٧ فتح.

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: خودا کە ئادەمی دروست کرد، شەست باڵ بەباڵی خۆی، یا بەباڵی ئێمە درێژ بوو وە حەوت باڵیش پان بوو پاشان پێی فەرموو: بڕۆ سڵاو لەو فریشتانە بکە کە لەوێ دا دانیشتوون، وە باش گوێ بگرە کە چۆن سڵاوت لێ دەکەن و ڕۆژ باشیت لەگەڵ دەکەن، ئیتر ئەوە سڵاوو ڕۆژباشی خۆت و نەوەتە لەناو خۆتانا، ئەویش چوو گوتی: السلام علیکم: سڵاوتان لێ بێ. ئەوانیش سڵاویان سەندەوەو گوتیان: السلام علیك ورحمة الله: سڵاوو ڕەحمەتی خودا لە تۆیش. فریشتەکان ووشەی ڕەحمەتی خودایان بۆ ئادەم زیادکرد، ئیتر هەموو کەسێ کە دەچێتە بەهەشت لەسەر شێوەی ئادەمە باڵای شەست گەز بەرزە شێوەی وەك ئەو شیرین و جوان و ڕێك و پێکە نەك وەك شێوەی شێواوی دنیای خۆی! بەڵام ئیتر لەوساکەوە بەرەبەرە ئەم خەڵکە هەر بچووك دەبنەوەو کورت و ناشیرینتر دەبن و هەتا ئێستاش هەر لەکەمی و کورتی بوون. (ش/ت)

گفتەی (ت): کاتێ خودا ئادەمی دروست کردو گیانی کرد بە بەریا، ئادەم پژمی و فەرمووی: الحمد لله: سوپاس بۆ خودا، خودایش پێی فەرموو: رحمك الله: بەر ڕەحمەتی خودا بکەویت، ئەی ئادەم! بچۆ بۆلای ئەو فریشتانە کەلەوێ دانیشتوون پێیان بڵێ: السلام علیکم: ئاشتی خواتان لەسەر بێ. فریشتەکان لەوەڵام دا گوتیان: وعلیك السلام ورحمة الله، لەپاشا کە گەڕایەوە بۆلای خودا پێی فەروو: ئەمە سڵاوو ڕۆژباشی خۆت و وەچەکانتە لەناو خۆیان دا هەتا هەتایە، جا خودا هەردوو دەستی خۆی بە نووقاوی نیشانی ئادەم داو فەرمووی پێ ی: بە ئارەزووی خۆت کامیان هەڵ دەبژێریت هەڵی بگرە بۆ خۆت! ئادەم (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: دەستی ڕاستی پەروەردگاری خۆم بەبەش هەڵ دەگرم بۆ خۆم، وە هەردوو دەستەکانی خودا هەر دەستە ڕاستن و موبارەك و پیرۆزن، ئەوسا خودا دەستی ڕاستی خۆی کردەوە، تەماشای کرد ئادەم خۆی و نەوەکەی لەناوی دایە، ئادەم فەرمووی: ئەی پەروەردگارم! ئەمانە چین؟ فەرمووی: ئەمانە نەوەو وەچەی تۆن، وەهەر

ئەوکاتە هەموو کەسێ تەمەنی خۆی چەندە لە نێوانی هەردوو چاوی نوسرابوو:

دەریای بێ پەیە ئەم جۆرە جێیە
دەم لێ کوتانی زۆر نابەجێ یە
پەی پێ بردنی پڕ سەڕاسێ یە
ئەسپێ غار مەدە لەوڕا لاپێ یە!
ئەوەی گوتراوە لەسەر سەرمانە
گوتەی پێغەمبەر گشتی دەرمانە
بۆ تۆ، یا بۆ من، یا برایێ تر
گەر ئەم ڕاش نەبێ، بەڵکوو رایێ تر!!

٣٦٩٢- عَنْ أَبِي موسى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى خَلَقَ آدَمَ مِنْ قَبْضَةٍ قَبَضَهَا مِنْ جَمِيعِ الأَرْضِ فَجَاءَ بَنُو آدَمَ عَلَى قَدْرِ الأَرْضِ فَجَاءَ مِنْهُمُ الأَحْمَرُ وَالأَبْيَضُ وَالأَسْوَدُ وَبَيْنَ ذَلِكَ وَالسَّهْلُ وَالْحَزْنُ وَالْخَبِيثُ وَالطَّيِّبُ. رواه الترمذي بسند صحيح[٣].

ئەبو مووسا (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: خودای گەورە کە ویستی ئادەم دروست بکا، چنگێکی گرت لە هەموو خۆڵی زەوی‌و لەوچنگە خاکە ئادەمی دروست کرد، ئەوە بۆیە ئادەمیزادەکان لەسەر شێوەی جیاجیای خاك هاتوون دەق وەك ڕەنگ‌و شێوەی خاك، هی وایان هەیە سوورە، یا سپی یە، یا ڕەشە، یا ڕەنگێکی ترە، ڕەفتاریشیان دیسان هەر وایە وەك سرووشتی خاك: هەیانە نەرم‌و نیانە، یا ڕەق‌و وشکە، هەیانە پیسە یا پاکە. (ت-س/ص).

---

[٣] رواه الترمذي بسند صحيح.

قَالَ اللهُ تَعَالَى:{وَظَلَّلْنَا عَلَيْكُمُ الْغَمَامَ وَأَنزَلْنَا عَلَيْكُمُ الْمَنَّ وَالسَّلْوَى كُلُواْ مِن طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَكِن كَانُواْ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ - صَدَقَ اللهُ العَظِيم - ٢/٥٧}.

٣٦٩٣- (ب/٣ ز/٤٧ ل/١١٧ ف/٣) [٤].

قال الله تعالى: {وَإِذْ قُلْنَا ادْخُلُواْ هَذِهِ الْقَرْيَةَ فَكُلُواْ مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ رَغَداً وَادْخُلُواْ الْبَابَ سُجَّداً وَقُولُواْ حِطَّةٌ نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطَايَاكُمْ وَسَنَزِيدُ الْمُحْسِنِينَ} (٢/٥٨).

**واتە: خودای گەورە دەفەرموێ: یادی ئەو بەسەرهاتەی خۆتان بکەنەوە، کە فەرمانمان کرد بە پێغەمبەری ئەو چەرخەی خۆمان کە پێتان بڵێ: خودا فەرمانتان پێ دەکا کە بێن بڕۆنە ناو شارە دێی قودسەوە، وەلە خواردن و مێوەی ئەوێ بخۆن بە تێرو تەسەلی لەهەر لایەکەوە کە ئارەزوو دەکەن، وەلە دەرگاوە بچنە ژوورەوە بەملکەچی و کڕنووش بردنەوە بۆ خودای پەروەردگار، وەلە هەمان کاتا هەستی دانیشتووەکانی زامار مەکەن و ڕەفتارتان شیرین بێ لەکاتی چوونە ناوی، دەم بە دووعاوە بڵێن: پەروەردگارا! ئەی خودای بەخشندە، ئێمە وا هاتووینەتە پەنای تۆ، لە پەنای تۆدا هەواری خۆمان هەڵ داوە، دەی وەك میوانێکی ئازیز دامان بکەو لە گوناهەکانمان خۆش ببە، ئەو حەلە ئێمەش لە گوناهەکانتان خۆش دەبین، وەپاداشی چاکەکاران بەزیادەوە دەدەینەوە.**

٣٦٩٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: قِيلَ لِبَنِي إِسْرَائِيلَ ادْخُلُوا الْبَابَ سُجَّدًا وَقُولُوا حِطَّةٌ. فَدَخَلُوا يَزْحَفُونَ عَلَى أَسْتَاهِهِمْ، فَبَدَّلُوا وَقَالُوا حِطَّةٌ حَبَّةٌ فِي شَعْرَةٍ. رواه الشيخان والترمذي[٥].

---

[٤] تقدم في المجلد الثالث. تسلسل / ٤٧ رقم ٣/٢١٦١.

[٥] بخاري. أحاديث الأنبياء: ٣٤٠٣ ، ٤٦٤١. مسلم. تفسير: ٧٤٣٩. بخاري تفسير سورة البقرة: ٤٤٧٩ = تجريد / ٤ ل-٤١٢ رقم: ١٦٣٣ = ٣٤٠٣ ، ٤٦٤١. فتح الباري.

ئـەبو هــورەیرە (خـودای لــێ ڕازی بــێ) لەحەزرەتــەوە (دروودی خــودای لەســەر بــێ) دەفەرموێ: گوترا بە بەنی ئیسرائیل: {وَادْخُلُواْ الْبَابَ سُجَّداً وَقُولُواْ حِطَّةٌ} کەچی ئەوان بە پێچەوانەوە، لەباتی ئەوەی بەملکەچی و کڕنووشەوە بچنە ژوورەوە بە قنگە خشکێ چوونە ژوورەوەو لەباتی ئەوەی بڵێن حیططە زمانیان گۆڕی و گوتیان: حیطظە، حەببە فی شەعەرە کە قسەیەکی بێ مەعنایە، لەسەر گوتەی عەللامەی عەینی، (خودای لێ ڕازی بێ) وەمەبەستیان لێی دەمەوەریی و شکانی فەرمانی خودا بووە. (ش/ت).

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ يَكْتُبُونَ الْكِتَابَ بِأَيْدِيهِمْ ثُمَّ يَقُولُونَ هَذَا مِنْ عِندِ اللّهِ لِيَشْتَرُواْ بِهِ ثَمَناً قَلِيلاً فَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتْ أَيْدِيهِمْ وَوَيْلٌ لَّهُمْ مِّمَّا يَكْسِبُونَ – صَدَقَ اللهُ العَظِيم – ٢/٧٩}.

ماڵ وێرانی و هاوار بۆ ئەو زانا نامەردانە کەبەدەستی خۆیان نامەو کتێب دەنووسن، یا تەوراتە تێکدراوەکەیان دەنووسنەوە، لەپاشا دەڵێن بە نەخوێندەوارەکان: ئەم نامەیە لەخوداوە هاتووە، تاکوو بەو تێکدراوە بەهایەکی کەمی بێ نرخی دنیایی وەربگرن، یا بکڕن، دیسان خانە خراپی و ماڵ وێرانی بۆ ئەو مەلانامەلایانەیە کەبەدەستو خەتی خۆیان گزی و ناپاکی لەنامەی خودا دەکەن، وە ئەو نانەیش بەسندان و زەقنەبێ کەبەو حاڵە پەیدا بکرێ.

٣٦٩٥– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قال: كَيْفَ تَسْأَلُونَ أَهْلَ الْكِتَابِ عن شيءٍ وَكِتَابُكُمُ الَّذِى أُنْزِلَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَحْدَثُ تَقْرَءُونَهُ محضاً لَمْ يُشَبْ، وَقَدْ حَدَّثَكُمْ أَنَّ أَهْلَ الْكِتَابِ بَدَّلُوا مَا كَتَبَ اللَّهُ وَغَيَّرُوا وَكَتَبُوا بِأَيْدِيهِمُ، وَقَالُوا هُوَ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ، لِيَشْتَرُوا بِهِ ثَمَنًا قَلِيلاً أَلا يَنْهَاكُمْ مَا جَاءَكُمْ مِنَ الْعِلْمِ عَنْ مُسَاءَلَتِهِمْ، لاَ وَاللَّهِ مَا رَأَيْنَا مِنْهُمْ رَجُلاً يَسْأَلُكُمْ عَنِ الَّذِى أُنْزِلَ عَلَيْكُمْ. رواه البخاري في كتاب الاعتصام[٦].

---

[٦] بخاری. الإعتصام بالكتاب والسنة: ٧٣٦٣.

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: چۆن پرسیاری شت لەخاوەن نامەکان دەکەن، لەکاتێکا کە نامەکەی خۆتان (کە قورئانی پیرۆزە کە خودا بەسرووش ناردوویەتییە خوارەوە بۆ پێغەمبەرەکەتان) هێشتا تەڕو تازەو نوێیەو گەردی نەگرتووەو هەمیشە بەزمانی خۆتان دەوری دەکەنەوە، چۆن شتی وا دەکەن وەلحاڵ قورئانەکەتان پێتان دەفەرموێ: کەخاوەن نامەکان نامەی خودایان گۆڕیوەو دەست کارییان کردووە، سەرەڕای ئەوەیش شت بە دەستی خۆیان دەنووسنەوەو بەدرۆ دەڵێن: ئەمە لەلایەنی خوداوە هاتووە، بۆیەش ئەمە دەکەن تا شتێکی کەمی پێ بسێنن، ئەدیی لەسەر ئەم هەموو زانستو زانیارییەدا کە بۆ خۆتان هاتووە چ هەوەجێیەکتان بە پرسیار کردن لەوانە! شتی وامەکەن بەخودا هێشتا نەمان دیوە کە پیاوێ لەوان دەعیەی بێنێ کەشتێ لەئێوە بپرسێتەوە لەبارەی قورئانەوە! (ب —خودای لێ ڕازی بێ).

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَى قَلْبِكَ بِإِذْنِ اللّهِ مُصَدِّقاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَى لِلْمُؤْمِنِينَ - ٩٧/٢}.

واتە: ئەی خۆشەویست! تۆ بڵێ: هەر کەسێ دوژمنی جوبرەئیلە ئەوە دوژمنایەتی لەگەڵ خوا دەکاو خودایش دوژمنی ئەو کەسەیە، چونکە ئەو بەفەرمانی خوا ئەم قورئانەی هێناوە بۆ سەر دڵی تۆ، حاڵی وایە ڕێكو موافیقی نامەو قورئانەکانی پێش خۆیەتی کەلە کاتی خۆیا هاتونەتە خوارەوە بۆ سەر دڵی پێغەمبەرە پێشینەکان، وەکوو تەوراتو زەبوورو ئینجیل بێ، لەهەمان کاتا دەبێ بە پشتیوان بۆیان، سەرەڕای ئەوەش چرایەکی بێ هاوتایەو شاڕێگەی ڕاستیو دروستی ڕۆشن دەکاتەوە بۆ دەستەی خاوەن باوەڕەکان.

٣٦٩٦- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قال: سمع عَبْدَ اللَّهِ بْنَ سَلَامٍ بِقْدُوم رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وهُوَ فِي أرضٍ يخترف فأتى النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فقال: إِنِّي سَائِلُكَ عَنْ ثَلَاثٍ لاَ يَعْلَمُهُنَّ إلاَّ نَبِيٌّ، فما أَوَّلُ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ؟ وَمَا أَوَّلُ طَعَامٍ يَأْكُلُهُ أَهْلُ الْجَنَّةِ؟ وَمَا يَنْزِعُ الْوَلَدُ إِلَى أَبِيهِ أو أُمِّهِ؟ قال: أَخَبَّرَنِي بِهِنَّ جبرَيل آنِفًا قال: جِبْرِيلُ؟ قَالَ: نعم، قَالَ:

ذَاكَ عَدُوُّ الْيَهُودِ مِنَ الْمَلاَئِكَةِ. فَقَرَأَ هذه الآية: { مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَى قَلْبِكَ} أَمَّا أَوَّلُ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ فَنَارٌ تَحْشُرُ النَّاسَ مِنَ الْمَشْرِقِ إِلَى الْمَغْرِبِ. وَأَمَّا أَوَّلُ طَعَامٍ يَأْكُلُهُ أَهْلُ الْجَنَّةِ فَزِيَادَةُ كَبِدِ الحُوتِ. وإذا سبق ماء الرَّجُلَ ماء المرأة نَزَعَ الوَلَدُ وَإِذَا سبق ماء الْمَرْأَةَ نَزَعَتْ، قال: أَشْهَدُ أن لا إله إلاَّ الله وأشهد أَنَّكَ رَسُولُ اللَّهِ. يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ الْيَهُودَ قَوْمٌ بُهتٌ، وإِنَهُمْ إِنْ يَعَلِمُوا بِإسْلاَمِي قَبْلَ أَنْ تَسْأَلَهُمْ بَهَتُونِي، فَجَاءَتِ فقال: النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَيُّ رَجُلٍ عَبْدُ اللَّهِ فِيكُمْ؟. فَقَالُوا خيرنا وابن خيرنا وسيدنا وابن سيدنا، قَالَ: أَرَأَيْتُمْ إِنْ أَسْلَمَ عَبْدُ اللَّهِ. فَقَالُوا أَعَاذَهُ اللَّهُ ذَلِكَ. فَخَرَجَ عَبْدُ اللَّهِ فَقال: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ. فَقَالُوا شَرُّنَا وَابْنُ شَرِّنَا وانْتَقَصُوهُ، قال: فهذا الَّذي كنت أخاف يا رَسُولُ اللَّهِ. رواه البخاري وتقدم لمسلم بعضه في الغسل[٧].

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: عەبدوڵڵای کوڕی سەلام لەناو باخا باخ دەڕنێ لەو کاتەدا دەبیستێ کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کۆچی کردووە بۆ مەدینەو تەشریفی هێناوە، جادێ بۆ خزمەتی و عەرزی دەکا: من سێ شتت لێ دەپرسم کەسێ پێغەمبەر نەبێ نایزانێ: یەکەم نیشانەی گەورەی قیامەت چییە؟ وەیەکەم خۆراکێ بەهەشتی دەیخوا چییە؟ وەهۆی چییە کە منداڵ لەباوکی دەچێ، یا لەدایکی دەچێ؟ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئا ئێستا کوونێ زۆر نییە کە جوبرائیل ئەمانەی پێ گوتم: عەبدوڵڵا دەڵێ: کێ؟ جوبرائیل؟ دەفەرموێ: بەڵێ، ئەو، عەبدوڵڵا دەڵێ: دەسا جوولەکە لەناو خۆیانا لەناو هەموو فریشتەکانا جوبرائیل بە دوژمنی خۆیان دادەنێن، کەوا دەڵێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئەم ئایەتە دەخوێنێتەوە:

{مَنْ كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَى قَلْبِكَ}.

ئینجا حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: یەکەم نیشانەی گەورەی قیامەت ئاگرێکە خەڵك لە خۆرهەڵاتەوە گلێر دەکاتەوەو دەیان بات بۆ

---

[٧] بخاري. تفسير سورة البقرة: ٤٤٨٠.

خۆرئاوا، یەکەم خۆراکی بەهەشتییەکانیش پارچە زیادە گۆشتەکەی جگەری نەهەنگە، ئاوی پیاویش ئەگەر وەپێش ئاوی ژن کەوت منداڵەکە دەکێشێتە سەر خۆی، بەڵام ئەگەر بەپێچەوانەوە بوو ئاوی ژن وەپێش کەوت ئەوا منداڵەکە دەکێشێتە سەر خۆی عەبدوڵلا (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: شایەتی دەدەم کە بێجگە لە یەزدانی پاك خودای هەقی تر نییە وەشایەتی دەدەم کەتۆ پێغەمبەری خودای، ئەی پێغەمبەری خودا! بێگومان جوولەکە هۆزێکی بوختیانکەرو درۆزنو هەلاتبازن، لەپێش ئەمەدا کە بزانن من موسوڵمان بووم پرسیاری حاڵی منیان لێ بکە، دەنا لەداخاناو لەڕقانا بوختیانم بۆ دەکەن، کە جوولەکەکان هاتن عەبدوڵلا لە ژوورەوە خۆی شاردەوە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: عەبدوڵلا چۆن پیاوێکە لەناوتانا؟ گوتیان: چاترینی ئێمەیەو کوڕی چاترینمانە، خۆی بەگو بەگزادەیەو گەورەی ئێمەیەو کوڕی گەورەشمانە، حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: باشە پێم بڵێن ئەگەر عەبدوڵلا موسوڵمان ببێ ئێوە دەڵێن چی؟ موسوڵمان دەبن یانا؟ گوتیان: خوا ئەوە نەکا خودا پەنای بدا لەشتی وا!! حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) ئەم پرسیارەی چەن جارێ بۆ دووبارە کردنەوە، وەلێ ئەوان لەکەلی شەیتان نەهاتنە خوارەوە هەر ئەو وەڵامەیان دایەوە ئەو وەختە لەپڕ عەبدوڵلا (خودای لێ ڕازی بێ) هاتە دەرەوەو بەدەنگی بەرز گوتی: گەواهو شایەتی دەدەم کەهەر یەزدانی پاك خوایەو موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلا پێغەمبەری خودایە. ئەوکاتە جوولەکەکان گوتیان: خراپترینی ئێمەیەو کوڕی خراپترینمانە، ئیتر بەوەشەوە نەوەستان بەقسەی ناشیرین دایان شۆرد، عەبدوڵلا گوتی: قوربان! خۆ دیت!؟ من عەرزم نەکردی؟! دەی من لەم زمانە پیسەیان دەترسام (ب) ⇨ (ب/١ ز/٣٠ ل/١٤٦ ف/٦) ⇨ (ب/١ ز/٥٣ ل/٢١٣ ف/٧) بەڵام لێرەدا ئایەتەکە بەتەواوی نوسراوە وەك ئەم فەرموودەیەی لەدواوە دێ.

٣٦٩٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) قال: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يُصَلِّى عَلَى رَاحِلَتِهِ تَطَوُّعًا أينما تَوَجَّهَتْ بِهِ وَهُوَ جَاءٍ مِنْ مَكَّةَ إِلَى الْمَدِينَةِ ثُمَّ قَرَأَ ابْنُ عُمَرَ هَذِهِ الآيَةَ: (وَلِلَّهِ الْمَشْرِقُ وَالْمَغْرِبُ) الآيَةَ. وَقال: أُنْزِلَتْ فِي هَذا[٨].

**ئیبنو عومەر** (خودایان لێ ڕازی بێ) **گوتی: جارێ پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **لەمەککەوە دەهات بۆ مەدینە، لەڕێ بەسواری ووڵاخەکەی نوێژی سوننەتی دەکرد، بەمەرجێ ووڵاخەکە لەژێریا ڕووی لەشوێنی مەبەست بوایە، ئیتر ڕووی لەهەرلا بوایە دەربەستی ئەوە نەبوو. ئینجا ئیبنو عومەر بۆ پشتیوانیو ڕاستو دروستی ئەم فەرمایشتە ئەم ئایەتەی خوێندەوە: {وَلِلَّهِ الْمَشْرِقُ وَالْمَغْرِبُ فَأَيْنَمَا تُوَلُّواْ فَثَمَّ وَجْهُ اللّهِ إِنَّ اللّهَ وَاسِعٌ عَلِيمٌ} وە فەرمووی: (ئەم ئایەتە بۆ ئەم جۆرە نوێژەیە هاتووە). (ت-س/ص).**

٣٦٩٨- ⇨ (ب/١ ز/٥٣ ل/٢١٣ ف/٧)[٩].

{وَقَالُواْ اتَّخَذَ اللّهُ وَلَدًا سُبْحَانَهُ بَل لَّهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ كُلٌّ لَّهُ قَانِتُونَ} (٢/١١٦).

**دەڵێن خودا منداڵی هەیە، کوڕو کچی لێ بووە، سوبحانەڵڵا! شتی واو خودا کوجا مەرحەبا، خودا لەشتی وا پاکو بەدوورە، بەڵکوو هەرچی هەیە لەئاسمانانو زەویدا هی ئەوە، هەموو بەندەو فەرمانبەری ئەوونو خۆی خاوەنیانە.**

٣٦٩٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: قال: اللَّهُ تعالى: كَذَّبَنِي ابْنُ آدَمَ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ ذَلِكَ. وَشَتَمَنِي وَلَمْ يَكُنْ لَهُ ذَلِكَ، فَأَمَّا تَكْذِيبُهُ إِيَّايَ فَزَعَمَ أَنِّي لاَ أَقْدِرُ أَنْ أُعِيدَهُ كَمَا كَانَ، وَأَمَّا شَتْمُهُ إِيَّايَ فَقَوْلُهُ لِي وَلَدٌ، فَسُبْحَانِي أَنْ أَتَّخِذَ وَلَدًا، رواه البخاري[١٠].

---

[٨] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[٩] رواه الترمذي بسند غريب تقدم في المجلد الأول تسلسل / ٥٣ رقم: ٧ / ٣٩٢.

[١٠] بخاري. تفسير: ٤٤٨٢ = تجريد / ٤ / ٤١٤ رقم: ١٦٣٥.

**ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: خودای گەورە دەفەرموێ: ئادەمیزاد ڕادەی ئەوەی نییە کەمن بە درۆ بخاتەوە یا جنێوم پێ بدا، کەچی دەچێ شتی وادەکا، ئەوەیان کەمن بەدرۆ دەخاتەوە ئەو قسەیەتی کە دەڵێ: گوایە من ناتوانم کەلەپاش مردن وەك جاران سەر لەنوێ دروستی بکەمەوە، جنێوەکەشی بە من ئەو قسەیەتی کە دەڵێ: گوایە من منالم هەیە! شتی وا نەبووەو نابێ من گەلێ پاكو بە دوورم لەوە کە منالم هەبێ (ب).**

**٣٧٠٠- ⇦ (ب/١ ز/٥٣ ل/٢١١ ف/٥)**[11].

**ئایەتەکە لەم شوێنەدا ڕۆیشت: ⇦ (ب/٢ ز/١٣٤ ل/٢٦٨ ئایەتی دووەم).**

**٣٧٠١-** عَنْ ابْنُ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) أَوَّلَ مَا اتَّخَذَ النِّسَاءُ الْمِنْطَقَ مِنْ قِبَلِ أُمِّ إِسْمَاعِيلَ، اتَّخَذَتْ مِنْطَقًا لَتُعَفِّيَ أَثَرَهَا عَلَى سَارَةَ، ثُمَّ جَاءَ بِهَا إِبْرَاهِيمُ، وَبِابْنِهَا إِسْمَاعِيلَ تُرْضِعُهُ حَتَّى وَضَعَهُمَا عِنْدَ الْبَيْتِ عِنْدَ دَوْحَةٍ، فَوْقَ زَمْزَمَ فِي أَعْلَى الْمَسْجِدِ، وَلَيْسَ بِمَكَّةَ يَوْمَئِذٍ أَحَدٌ، وَلَيْسَ بِهَا مَاءٌ، وَوَضَعَ عِنْدَهُمَا جِرَابًا فِيهِ تَمْرٌ وَسِقَاءً فِيهِ مَاءٌ، ثُمَّ قَفَّى إِبْرَاهِيمُ مُنْطَلِقًا فَتَبِعَتْهُ أُمُّ إِسْمَاعِيلَ فَقالت: يَا إِبْرَاهِيمُ أَيْنَ تَذْهَبُ وَتَتْرُكُنَا بِهَذَا الْوَادِي الَّذِي لَيْسَ فِيهِ إِنْسٌ وَلاَ شَيْءٌ فَقالت: لَهُ ذَلِكَ مِرَارًا وهو لاَ يَلْتَفِتُ إِلَيْهَا فَقالت: لَهُ آللَّهُ الَّذِي أَمَرَكَ بِهَذَا؟ قال: نَعَمْ. قالت: إِذًا لاَ يُضَيِّعُنَا. ثُمَّ رَجَعَتْ، فَانْطَلَقَ إِبْرَاهِيمُ حَتَّى إِذَا كَانَ عِنْدَ الثَّنِيَّةِ لاَ يَرَوْنَهُ اسْتَقْبَلَ بِوَجْهِهِ الْبَيْتَ، ثُمَّ دَعَا بِهَؤُلاَءِ الْكَلِمَاتِ وَرَفَعَ يَدَيْهِ، (رَبَّنَا إِنِّي أَسْكَنْتُ مِنْ ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ عند بيتك المُحرَّم) حَتَّى بَلَغَ (يَشْكُرُونَ). وَجَعَلَتْ أُمُّ إِسْمَاعِيلَ تُرْضِعُ إِسْمَاعِيلَ، وَتَشْرَبُ مِنْ ذَلِكَ الْمَاءِ، حَتَّى إِذَا نَفِدَ مَا فِي السِّقَاءِ عَطِشَتْ وَعَطِشَ ابْنُهَا، وَجَعَلَتْ تَنْظُرُ إِلَيْهِ يَتَلَوَّى فَانْطَلَقَتْ كَرَاهِيَةَ أَنْ تَنْظُرَ إِلَيْهِ، فَوَجَدَتِ الصَّفَا، أَقْرَبَ جَبَلٍ فِي الأَرْضِ يَلِيهَا، فَقَامَتْ عَلَيْهِ ثُمَّ اسْتَقْبَلَتِ الْوَادِيَ تَنْظُرُ هَلْ تَرَى أَحَدًا فَلَمْ تَرَ أَحَدًا، فَهَبَطَتْ مِنَ، الصَّفَا حَتَّى إِذَا بَلَغَتِ الْوَادِيَ رَفَعَتْ طَرَفَ دِرْعِهَا،

---

[11] تقدم برقم: ٥ / ٣٩٩. مجلد أول. تسلسل / ٥٣.

ثُمَّ سَعَتْ سَعْيَ الإِنْسَانِ الْمَجْهُودِ، حَتَّى جَاوَزَتِ الْوَادِيَ، ثُمَّ أَتَتِ الْمَرْوَةَ، فَقَامَتْ عَلَيْهَا فَنَظَرَتْ هَلْ تَرَى أَحَدًا، فَلَمْ تَرَ أَحَدًا، فَفَعَلَتْ ذَلِكَ سَبْعَ مَرَّاتٍ. قال: ابْنُ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) قال النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): فَذَلِكَ سَعْيُ النَّاسِ بَيْنَهُمَا. (فَلَمَّا أَشْرَفَتْ عَلَى الْمَرْوَةِ سَمِعَتْ صَوْتًا، فَقالت: صَهٍ. تُرِيدَ نَفْسَهَا، ثُمَّ تَسَمَّعَتْ، فَسَمِعَتْ أَيْضًا، فَقالت: قَدْ أَسْمَعْتَ، إِنْ كَانَ عِنْدَكَ غِوَاثٌ. فَإِذَا هِيَ بِالْمَلَكِ، عِنْدَ مَوْضِعِ زَمْزَمَ، فَبَحَثَ بِعَقِبِهِ) (أَوْ قال: بِجَنَاحِهِ) حَتَّى ظَهَرَ الْمَاءُ، فَجَعَلَتْ تُحَوِّضُهُ وَتَقُولُ بِيَدِهَا هَكَذَا، وَجَعَلَتْ تَغْرِفُ مِنَ الْمَاءِ فِي سِقَائِهَا، وَهْوَ يَفُورُ بَعْدَ مَا تَغْرِفُ قال: النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَرْحَمُ اللَّهُ أُمَّ إِسْمَاعِيلَ لَوْ تَرَكَتْ زَمْزَمَ (أَوْ قال: لَوْ لَمْ تَغْرِفْ مِنَ الْمَاءِ) لَكَانَتْ زَمْزَمُ عَيْنًا مَعِينًا. فَشَرِبَتْ وَأَرْضَعَتْ وَلَدَهَا، فَقال: لَهَا الْمَلَكُ: لاَ تَخَافُوا الضَّيْعَةَ، فَإِنَّ هَهُنَا بَيْتَ اللَّهِ، يَبْنِي هَذَا الْغُلاَمُ، وَأَبُوهُ، وَإِنَّ اللَّهَ لاَ يُضِيعُ أَهْلَهُ. وَكَانَ الْبَيْتُ مُرْتَفِعًا مِنَ الأَرْضِ كَالرَّابِيَةِ، تَأْتِيهِ السُّيُولُ فَتَأْخُذُ عَنْ يَمِينِهِ وَشِمَالِهِ، فَكَانَتْ كَذَلِكَ، حَتَّى مَرَّتْ بِهِمْ رُفْقَةٌ مِنْ جُرْهُمَ (أَوْ أَهْلُ بَيْتٍ مِنْ جُرْهُمَ) مُقْبِلِينَ مِنْ طَرِيقِ كَدَاءٍ فَنَزَلُوا فِي أَسْفَلِ مَكَّةَ، فَرَأَوْا طَائِرًا عَائِفًا. فَقَالُوا إِنَّ هَذَا الطَّائِرَ لَيَدُورُ عَلَى مَاءٍ، لَعَهْدُنَا بِهَذَا الْوَادِي وَمَا فِيهِ مَاءٌ، فَأَرْسَلُوا جَرِيًّا أَوْ جَرِيَّيْنِ، فَرَجَعُوا فَأَخْبَرُوهُمْ بِالْمَاءِ، فَأَقْبَلُوا، وَأُمُّ إِسْمَاعِيلَ عِنْدَ الْمَاءِ فَقَالُوا أَتَأْذَنِينَ لَنَا أَنْ نَنْزِلَ عِنْدَكِ؟ فَقالت: نَعَمْ، وَلَكِنْ لاَ حَقَّ لَكُمْ فِي الْمَاءِ. قَالُوا نَعَمْ. قال: النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَأَلْفَى ذَلِكَ أُمَّ إِسْمَاعِيلَ، وَهْيَ تُحِبُّ الإِنْسَ فَنَزَلُوا إِلَى أَهْلِيهِمْ، فَنَزَلُوا مَعَهُمْ حَتَّى إِذَا كَانَ بِهَا أَهْلُ أَبْيَاتٍ مِنْهُمْ، وَشَبَّ الْغُلاَمُ، وَتَعَلَّمَ الْعَرَبِيَّةَ مِنْهُمْ، وَأَنْفَسَهُمْ وَأَعْجَبَهُمْ حِينَ شَبَّ، فَلَمَّا أَدْرَكَ زَوَّجُوهُ امْرَأَةً مِنْهُمْ، وَمَاتَتْ أُمُّ إِسْمَاعِيلَ، فَجَاءَ إِبْرَاهِيمُ، يُطَالِعُ تَرِكَتَهُ، فَلَمْ يَجِدْ إِسْمَاعِيلَ، فَسَأَلَ امْرَأَتَهُ عَنْهُ فَقالت: خَرَجَ يَبْتَغِي لَنَا. ثُمَّ سَأَلَهَا عَنْ عَيْشِهِمْ وَهَيْئَتِهِمْ فَقالت: نَحْنُ بِشَرٍّ، نَحْنُ فِي ضِيقٍ وَشِدَّةٍ. فَشَكَتْ إِلَيْهِ. قال: فَإِذَا جَاءَ زَوْجُكِ فَاقْرَئِي عَلَيْهِ السَّلاَمَ، وَقُولِي لَهُ يُغَيِّرْ عَتَبَةَ بَابِهِ. فَلَمَّا جَاءَ إِسْمَاعِيلُ، كَأَنَّهُ آنَسَ شَيْئًا، فَقال: هَلْ جَاءَكُمْ مِنْ أَحَدٍ قالت: نَعَمْ، جَاءَنَا شَيْخٌ كَذَا وَكَذَا، فَسَأَلَنَا عَنْكَ فَأَخْبَرْتُهُ، وَسَأَلَنِي كَيْفَ عَيْشُنَا فَأَخْبَرْتُهُ أَنَّا فِي جَهْدٍ وَشِدَّةٍ. قال: فَهَلْ أَوْصَاكِ بِشَيْءٍ قالت: نَعَمْ، أَمَرَنِي أَنْ أَقْرَأَ عَلَيْكَ السَّلاَمَ، وَيقول: غَيِّرْ عَتَبَةَ بَابِكَ. قال: ذَاكِ أَبِي وَقَدْ أَمَرَنِي أَنْ أُفَارِقَكِ الْحَقِي بِأَهْلِكِ. فَطَلَّقَهَا، وَتَزَوَّجَ مِنْهُمْ أُخْرَى، فَلَبِثَ

عَنْهُمْ إِبْرَاهِيمُ مَا شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ أَتَاهُمْ بَعْدُ، فَلَمْ يَجِدْهُ، فَدَخَلَ عَلَى امْرَأَتِهِ، فَسَأَلَهَا عَنْهُ. فَقالت: خَرَجَ يَبْتَغِي لَنَا. قال: كَيْفَ أَنْتُمْ وَسَأَلَهَا عَنْ عَيْشِهِمْ، وَهَيْئَتِهِمْ. فَقالت: نَحْنُ بِخَيْرٍ وَسَعَةٍ. وَأَثْنَتْ عَلَى اللَّهِ. فَقال: مَا طَعَامُكُمْ قالت: اللَّحْمُ. قال: فَمَا شَرَابُكُمْ قالت: الْمَاءُ. فَقال: اللَّهُمَّ بَارِكْ لَهُمْ فِي اللَّحْمِ وَالْمَاءِ. قال: النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ يَوْمَئِذٍ حَبٌّ، وَلَوْ كَانَ لَهُمْ دَعَا لَهُمْ فِيهِ. قال: فَهُمَا لاَ يَخْلُو عَلَيْهِمَا أَحَدٌ بِغَيْرِ مَكَّةَ إِلاَّ لَمْ يُوَافِقَاهُ. قال: فَإِذَا جَاءَ زَوْجُكِ فَاقْرَئِي عَلَيْهِ السَّلاَمَ، وَمُرِيهِ يُثْبِتُ عَتَبَةَ بَابِهِ، فَلَمَّا جَاءَ إِسْمَاعِيلُ قال: هَلْ أَتَاكُمْ مِنْ أَحَدٍ قالت: نَعَمْ أَتَانَا شَيْخٌ حَسَنُ الْهَيْئَةِ، وَأَثْنَتْ عَلَيْهِ، فَسَأَلَنِي عَنْكَ فَأَخْبَرْتُهُ، فَسَأَلَنِي كَيْفَ عَيْشُنَا فَأَخْبَرْتُهُ أَنَّا بِخَيْرٍ. قال: فَأَوْصَاكِ بِشَيْءٍ قالت: نَعَمْ، هُوَ يَقْرَأُ عَلَيْكَ السَّلاَمَ، وَيَأْمُرُكَ أَنْ تُثْبِتَ عَتَبَةَ بَابِكَ. قال: ذَاكِ أَبِي، وَأَنْتِ الْعَتَبَةُ، أَمَرَنِي أَنْ أُمْسِكَكِ. ثُمَّ لَبِثَ عَنْهُمْ مَا شَاءَ اللَّهُ، ثُمَّ جَاءَ بَعْدَ ذَلِكَ، وَإِسْمَاعِيلُ يَبْرِي نَبْلاً لَهُ تَحْتَ دَوْحَةٍ قَرِيبًا مِنْ زَمْزَمَ، فَلَمَّا رَآهُ قَامَ إِلَيْهِ، فَصَنَعَا كَمَا يَصْنَعُ الْوَالِدُ بِالْوَلَدِ وَالْوَلَدُ بِالْوَالِدِ، ثُمَّ قال: يَا إِسْمَاعِيلُ، إِنَّ اللَّهَ أَمَرَنِي بِأَمْرٍ. قال: فَاصْنَعْ مَا أَمَرَكَ رَبُّكَ. قال: وَتُعِينُنِي قال: وَأُعِينُكَ. قال: فَإِنَّ اللَّهَ أَمَرَنِي أَنْ أَبْنِيَ هَا هُنَا بَيْتًا. وَأَشَارَ إِلَى أَكَمَةٍ مُرْتَفِعَةٍ عَلَى مَا حَوْلَهَا. قال: فَعِنْدَ ذَلِكَ رَفَعَا الْقَوَاعِدَ مِنَ الْبَيْتِ، فَجَعَلَ إِسْمَاعِيلُ يَأْتِي بِالْحِجَارَةِ، وَإِبْرَاهِيمُ يَبْنِي، حَتَّى إِذَا ارْتَفَعَ الْبِنَاءُ جَاءَ بِهَذَا الْحَجَرِ فَوَضَعَهُ لَهُ، فَقَامَ عَلَيْهِ وَهُوَ يَبْنِي، وَإِسْمَاعِيلُ يُنَاوِلُهُ الْحِجَارَةَ، وَهُمَا يَقُولاَنِ (رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا إِنَّكَ أَنْتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ) رواه البُخاريّ فِي بَدْءِ الخَلْقِ[١٢].

**ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ ڕازی بێ) **گوتی: بۆ یەکەمجار کە ژنان پشتێنیان داهێنا لەلایەنی دایکی ئیسماعیلەوە بوو چونکە خاتوو هاجەرە کە سکی پڕ بوو بەحەزرەتی ئیسماعیل، خاتوو سارە کە ئاغاژنی بوو ڕقی لێ هەڵگرتو هەوێباری لێ کێشا، دایکی ئیسماعیل پشتێنی لەقەدی خۆی بەستو لەناو ماڵا دەستی کرد بە خزمەت کردنو خۆی وا نیشان دا کە کارەکەری خاتوو سارەیەو هەوێی نییە هەتا بەوە ڕقی خاتوو سارەی خانمی پێ**

---

[١٢] تجريد البخاري / ٤ / ٣٠ رقم: ١٣٥١ = ٣٣٦٤ فتح الباري.

بنیشێنێتەوە، بەڵام سوودی نەبوو، لەپاشا ئیبراهیم هاجەرەو ئیسماعیلی کوڕی هاجەرەی لەبەیتولمەقدیسەوە برد بۆ مەککەو لەوێ لەلای شوێنی ئێستای بەیتا لەبن شێخەڵێکی گەورەدا لەژوور زەمزەمەوە، لەسەرووی شوێنی مەسجیدولحەرامەوە داینان، ئەوکاتە ئیسماعیل ساوابوو بەبەردایکیەوە بوو، کۆرپەیەکی مەمکەخۆرەبوو، دایکی خۆی مەمکی پێ دەدا، وە ئەو سەردەمەش مەککە ئاوەدان نەبوو، نە ئاوو نە ئاوەدانیو نەکەسی لێ نەبوو، لەوێ دایناناو هەمانەیەك خورماو کوندەیەك ئاوی بۆ داناناو ئیتر خۆی بەرەو دوا گەڕایەوە بۆ شام، دایکی ئیسماعیل شوێنی کەوتو پێی فەرموو: ئەی ئیبراهیم! تۆ بۆکوێ دەچیتو ئێمە لەم شیوە چۆڵو هۆڵەدا بەتەنیا بەجێ دەهێڵی؟! کە نەهاو دەنگیو نەشتێکی لێ نییە! چەن جارێ هاجەرە ئەم قسەیەی عەرزی ئیبراهیم کرد، بەڵام ئیبراهیم ئاوڕی لێ نەدایەوە، هەتا پێی گوت: توخوا! ئایا خودا فەرمانی پێ کردووی کەوا بکەی؟ فەرمووی: بەڵێ. هاجەرە فەرمووی: کەوابێ خودا پەکمان ناخات، ئیتر هاجەرە خاتوون گەڕایەوە، ئیبراهیمیش ڕۆیشت تا گەیشتە سەرکەلو لەدانەی سەرو ئاوابوو کەلەوانەوە دیار نەبوو، ئەوجا ڕووی کردە بەیتو بەم ووشە پیرۆزانەی کەلەقورئانی پیرۆزدا باس کراون نزای کرد، هەردوو دەستی هەڵبڕیو فەرمووی:

{رَّبَّنَا إِنِّي أَسْكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ عِندَ بَيْتِكَ الْمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ الصَّلاَةَ فَاجْعَلْ أَفْئِدَةً مِّنَ النَّاسِ تَهْوِي إِلَيْهِمْ وَارْزُقْهُم مِّنَ الثَّمَرَاتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ – ١٤/٣٧}.

واتە: ئەی خودایە! ئەی کەسی بێ کەسان! وامن بازێ لەوەچەو نەوەی خۆمم جێگەنشین کرد لە ناو ئەم شیوە چۆڵو هۆڵەدا، کە دۆڵی مەککەیەو شیوێکی ووشکی بێ کشتوکاڵە، لەپەنای ئەم خانەی خۆتەدا، کە ڕێزت گرتووەو قەدەغەت کردووە کە کەسێ ڕێزی بشکێنیو قەدری نەزانێ، دیارە ئەرکی بەندە ئەوەیە کە نوێژو بەندەیی بکا منیش بۆ ئەوەم لێرەدا داناون،

پەروەردگاری ئێمە! ڕووی دڵی موسوڵمانانیان تێکە، کەبە تاسەو شەوقەوە بڕۆن بۆلایان و بچن بۆ دینی کابەی پیرۆز خودایە! خۆت ڕۆزیدەری و بەس! دەی بەمیهری خۆت هۆو مایەی ڕۆزیو بەش و بارەی باش و زۆری هەردوو جیهانیان بۆ فەراهەم بێنە، میوەو سەوزەوات و بەری دارو درەختیان پێ بدە، بەڵکوو ئەوانیش سوپاسی تۆ بکەن ئیتر دایکی ئیسماعیل لەو ئاوەی دەخواردەوەو مەمکی دەدا بە ئیسماعیل، کە ئاوەکە بڕایەوە ئەوسا خۆی و کوڕەکەی توونییان بوو، دایکی ئیسماعیل تەماشای کرد ئیسماعیل لەتاو تویێتی گینگڵە دەداو تەپاو تل دەکا، ئیتر ئۆقرەی پێ نەگیراو چاوی بەرایی نەدەدا کە لەسەر ئەو حاڵە تەماشای جگەر گۆشە نۆبەرەکەی بکا! لەبەر ئەوە ڕۆیشت، ڕوانی کەوا کێوی صەفا نزیکترین کێوە لێیەوە لەوشوێنەدا، سەرکەوتە سەری و لەسەری وەستاو ڕووی کردە ناو شیوەکە، سەیری دەکرد تا بزانێ کەسێك دەبینێ، بەڵام کەسی نەدی، لەصەفا هاتە خوارەوە، تا گەیشتە ناو شیوەکە، لەوێ داوێنی کراسەکەی خۆی هەڵکردو خۆی گورج کردەوەو چاکی کرد بەلادا، ئینجا وەك مرۆڤێکی شەکەت و ماندوو، بەڵام کۆڵ نەدەر تا ئاخر هەناسە دەستی کرد بە لۆقە کردن تا لەشیوەکە پەڕییەوە، ئەمجا سەرکەوتە سەرمەروەو لەسەری ڕاوەستاو تەماشای ئەم لاو لای کرد ئایا کەسێ دەبینێ، وەلێ دیسان کەسی نەدی وە حەوت جار وای کرد[*].
ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)

---

[*] چارەی تۆ خوشکێ! کاتێ تەنگانە
هەوڵو تەقەڵای بەبێ ووچانە
گریان و ڕۆ ڕۆ پیشەی نەزانە
تەنیا کۆششە بۆ دەرد دەرمانە
دایکی ئیسماعیل ئەو مەردە کوردە
سەرمەشق و دایکی گشت ژنی کوردە!

فەرمووی: لەبەر ئەمەیەو بۆ یادگاری ڕووداوو داستانی ئەم ئافرەتە مەردە نەبەردەیە کە ئێستا لەکاتی حەجو عەمرەدا حەوت جار خەڵکی هەڕادەکەن لەنێوانی ئەم دوو گردەدا کەلەسەرەی جاری حەوتەما هاجەرە کە سەرکەوتە سەر تەپۆڵکەی مەڕوە دەنگێ بەر گوێی کەوت، خۆی بە خۆی گوت: ئا ووس! کە گوێی بەباشی هەڵخست، دەنگەکەی بەباشی بیست، گوتی: گوێم لەدەنگتە، لێقەوماوم، ئەگەر بەهاواری ئێمەوە هاتووی تازووە فریامان بکەوە! کە سەرنجی دا وا فریشتەکە لەلای شوێنی زەمزەم دایە، لەپەنا ئیسماعیل دا، بە پاژنەی پێی (یا گوتی: بە باڵێ) خەریك بوو زەوییەکەی دەکۆڵییەوە، هەڵی کۆڵی تا ئاوی لێ دەرکەوت، ئیتر دایکە هاجەرە لەخۆشییاندا بەخۆڵ کردی بە گۆمیلکەو بەدەستی ئا ئاوای لێ دەکرد، تا ئاوەکەی بڵاو نەبێتەوە، وە خۆش خۆش بەمشت ئاوەکەی هەڵ دەهێنجاو دەیکردە کوندەکەیەوە، ئاوەکەش لەدوا مستەکەی ئەوەوە خۆش خۆش هەڵ دەقوڵایەوە! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: دایکی ئیسماعیل، (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) ئەگەر لەکاتی خۆیدا دەست کاری زەمزەمی نەکردایە، یا فەرمووی: ئەگەر بە لالەوێچ هەڵی نەگۆزیایە هەتا هەتایە زەمزەم دەبوو بە کانیاو بەخوڕ لەبەری دەڕۆیشت ئیتر دایکی ئیسماعیل هەم خۆی ئاوی خواردەوەو هەم شیری دا بە کوڕەکەی، جوبرائیل پێی فەرموو: مەترسن پەکتان ناکەوێ، چونکە خانەی خودا ئالێرەدا هەیە، ئەم کوڕەو باوکی دروستی دەکەن، وەخودا ئەهلو کەسی ئەوخانەی خۆیە زایە ناکاو داڵدەیان دەدا. بەیتیش ئەو سەردەمە پارچەیێ زەوی قۆقز بوو، وەك تەپۆڵکە وابوو لافاو لێی دەداو لەڕاستو لە چەپیەوە لێی دەبرد، ئیتر دایکی ئیسماعیل هەروا بەو شێوەیە لەوێ مایەوەو ئاوی زەمزەمی دەخواردەوەو برێتیی نانو ئاو دەکەوت بۆیو مەمکی دەدا بە ئیسماعیل هەتا کاروانێکی جورهومی، یا خێزانێکی جورهومی لەرێگەی کەلی کەدا ئەوە هاتن، لەخوار مەککەوە خستیان، کەچی باڵندەیەکیان دی گڕی دەخوارد بەسەر ئاوەکەوە، گوتیان: ببێو نەبێ ئەم مەلە بەسەر ئاوەوە دەگەڕێ، ئەم دۆڵەش ئێمە شك بەرین

شیوێکی ووشك‌و برینی بێ ئاوە، دەی دەبێ ئەمە چی بێ؟ جا نوێنەرێ، دوو نوێنەریان نارد، کەچوون ئاوەکەیان دۆزییەوەو گەڕانەوەو هەواڵی ئاوەکەیان بۆ بردنەوە ئەوانیش چوون بۆلای ئاوەکە، دایکی ئیسماعیل لەسەرئاوەکە بوو، گوتیان پێی: ڕێگەمان دەدەی کەلەلای تۆ هەوار هەڵ دەین؟ گوتی: بەڵێ، بەڵام ئاوەکە هی منەو مافی ئێوەی پێوە نییە مەگەر بە ڕەزای من سوودی لێ وەربگرن گوتیان: بەڵێ باشە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: جا ئاوا ئەوخێڵە لەسەر ئەو حاڵە دایکی ئیسماعیلیان دۆزییەوەو تووشی بوون، لەکاتێکی وادا کە خۆشی حەزی لەئاوەدانی و هاودەم‌و ئاو دەنگ هەبوو! ئیتر خۆیان لەوێ بەزین‌و ناردیان بەشوێن کەس‌و کاریانا، ئەوانیش هاتن‌و لەگەڵ ئەوانا لەوێ کۆچ‌و باریان خست‌و مەککەیان ئاوەدان کردەوە! هەتا بەرەبەرە لەوێ بوون بەچەن ماڵێ‌و زۆر بوون لەولاشەوە کوڕەکەیش گەورە بوو، تا بوو بە هەرزەکارو هەر لەوانەوە فێری زمانی عەرەبی بوو، کە گەورە بوو دڵیان گرتی‌و کەرەسیدە بوو ژنێکیان لەخۆیان بۆ هێنا، ئەوجا هاجەرە خاتوونی دایکی ئیسماعیل مردو فەرمانی هەقی بەجێ هێنا، تەمەنی نەوەد ساڵ بوو، ئیسماعیلی کوڕی (دروودی خودایان لەسەر بێ) لە حیجرا ناشتی پاش ژنهێنانی ئیسماعیل ئیبراهیم هات سەر لە خێزانە جێماوەکەی بدات، وا ڕێ دەکەوێ ئیسماعیل لەماڵ نابێ، لەژنەکەی ئیسماعیل دەپرسێ: لەکوێیە؟ دەڵێ: چووە شتێکمان بۆ پەیدا بکا، لە گوزەران‌و حاڵ‌و بارو دۆخی ژیانیشیانی پرسی، ژنەکە گوتی: حاڵمان شڕەو زۆر خراپەو لەتەنگانەو سەخڵەتداین! وەشکات‌و سکاڵایەکی زۆری لای ئیبراهیم کرد، ئیبراهیم (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: کە مێردەکەت هاتەوە سڵاوی لێ بکەو پێێ بڵێ: ئاسانەی دەرگاکەی بگۆڕێ، کە ئیسماعیل دێتەوە وەك سووسەو بۆنی شتێ بکا، دەفەرموێ: کەسێ هاتووە بۆ لاتان؟ ژنەکەی دەڵێ: بەڵێ پیرەمێردێ لەم ڕەنگە لەم حاڵە هاتبوو، پرسیاری تۆیشی لێ کردین منیش پێیم گوت: پرسیشی کە گوزەرانمان چۆنە، گوتم: حاڵمان شڕە زۆر پەرۆش‌و سەخڵەتین! فەرمووی: ئایا هیچ ئامۆژگاریەکی نەکردیت؟

دەڵێ: با، فەرمووی: سڵاوت لێ بکەمو دەشی فەرموو: ئاسانەی دەرگاکەت بگۆڕە، فەرمووی: ئەو پیاوە باوکمەو فەرمانی پێ کردووم کەلەتۆ جیاببمەوەو دەستت لێ بەردەم بڕۆرەوە بۆلای کەسو کاری خۆت، تەڵاقی داو ژنێکی تری لێ مارەکردن. جا چەندەی کە خودا حەزکا ئەوەندە ئیبراهیم مایەوەو نەهاتەوە بۆلایان، لەپاشا کەهاتەوە بۆلایان دیسان ئیسماعیلی نەبینی، چوو بۆ ماڵەوە بۆلای ژنە تازەکەیو هەواڵی ئیسماعیلی لێ پرسی، گوتی: دەرچووە پێبژێوییەکمان بۆ پەیدا بکا، دەفەرموێ: ئێوە چۆننو حاڵو گوزەرانتان چۆنە؟ دەڵێ: زۆرباشینو لەخودا بەزیاد بێ گوزەرانمان زۆر باشە عەرزی کرد: قوربان بفەرموو دابەزە، پشوویێ بدە، نانێ، ئاوێ بخۆ. دەفەرموێ: خۆراکتان چییە؟ دەڵێ: گۆشتە، دەفەرموێ: ئەی خواردنەوتان چییە؟ دەڵێ: ئاوە، دەفەرموێ: خودایە؟ پیتو فەڕو بەرەکەت بخەرە گۆشتو ئاویانەوە بۆیان، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەو سەردەمە دانەویڵەیان نەبوو، ئەگینا بۆ ئەویش نزای پیتو فەڕی بۆ دەکردن. گوتی: هەرکەسێ لەشوێنێکی تر، جگە لە مەککە، خۆراكو خواردنەوەی تەنیا ئاوو گۆشت بێ، پێی ناکەوێ، بەڵام لەمەککە پێی دەکەوێ، فەرمووی: کە مێردەکەت هاتەوە سڵاوی لێ بکەو پێی بڵێ: ئاسانەی دەرگاکەی (داری ژێردەرگاکەی) لەجێی خۆی چەسپ بکاو بیهێڵێتەوە، کە ئیسماعیل دێتەوە دەفەرموێ: کەس هاتووە بۆلاتان؟ دەڵێ: بەڵێ، پیرەمێردێکی نوورانی شێوە شیرین هاتە ماڵمان، گەلێ وەسفی باشی کرد، پرسیاری تۆی لێ کردم، هەواڵی تۆم بۆی باس کرد، لەگوزەرانی پرسین، پێیم گوت: کە زۆر باشین، فەرمووی: راسپێری کردیت؟ گوتی: بەڵێ، سڵاوی لێ دەکردیتو دەیفەرموو: کە ئاستانەی دەرگاکەت مەحکەمتربکەی، فەرمووی: ئەوە باوکمە، ئاستانەی دەرگاکەیشم مەبەست تۆیە ژن بەردی بنچینەی ماڵە، باشیو خراپی خانوو بەندە لەسەر بەردی بناغەکەی جا بۆیە کە فەرمانی پێ کردووم کەلەلای خۆم بتهێڵمەوەو بەرەڵات نەکەم، جا چەندەی کە خودا حەز بکات ئیبراهیم مایەوەو نەهاتەوە بۆلایان، کە هاتەوە ئیسماعیل لەبن ئەو

شـێخەڵە گـەورەدا کـەخۆی یەکـەمجار لـەوێ داینـان، کـە لـەنزیکی بـیری زەمزەمـەوە بوو، خـەریك بـوو تیرێکـی دادەداو دەیتاشـی، کەچـاوی بـەباوکی کەوت بەرزە پێ لەبەری هەڵساو چوو بە پیریـەوەو لەسـەر شێوەی بابو کوڕ دەستو مۆچانو ئەمانەیان کردو لەپاشا ئیبراهیم فەرمووی: ئەی ئیسماعیل! خودا فەرمانێکی داوە بەسەرما ئایا تۆ دەتوانی کۆمەکیم بکەی؟ فـەرمووی: فەرمانی پەروەردگارت بەجێ بێنە، فەرمووی: تۆ یارمەتیم دەدەی؟ فەرمووی: منیش یارمەتیت دەدەم، ئیبراهیم تەپۆڵکەیەکی بەئیسماعیل پێنیشان دا، کە دەیڕوانی بە سەردەورو بەری خۆی داو فەرمووی: خودای گەورە فەرمانی پێ فەرمووم کە ئالێرانەدا خانەیەك دروست بکەم، گوتی: ئیتر ئەو حەلە دەستیان کـرد بـە بناغـەدانانی بـەیتی خانـەی خـوداو بـەرە بـەرە بناغـەی بـەیتیان دوو بـەدوو بـەرز کـردەوە، ئیـسماعیل شـاگرد بـوو بـەردی دەهێنـاو ئیـبراهیمیش وەستا بوو دروستی دەکرد یەك شاگردو یەك وەستا! تا خانووەکە بەرز بۆوە، ئەوجا ئیسماعیل ئـەم بـەردەی بۆ بـاوکی هێنـا، کـە پێـی دەگـوترێ بەردەکـەی ژێر پێی ئیبراهیم، یا حەجەری مەقامی ئیبراهیم، بەردەکـەی بۆدانـاو ئیـبراهیم لەسەری وەستاو خانووەکەی دروست دەکردو ئیسماعیل بەردی بۆ دەهێنـاو دەیدایـە دەسـتیو ئـەویش لـەریزی دیوارەکـە دادای دەنـاو پێکـەوە بەیـەك دەنگو یەك دڵ بەسۆزەوە دەپاڕانەوەو دەیان فەرموو:

{رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا إِنَّكَ أَنتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ - ١٢٧/٢}.

خودایـە! ئـەم کردەوەیـەمان لـێ قووبـوڵ بکـە، چـونکە هـەر خـۆتی کـە گوێت لەدەنگمان بێو ئاگات لەحاڵی دڵمان بێ (بوخاری–(ڕەزای خودای لەسەر بێ)):

کوڕە شاگردەو باوکی وەستایە

خـانووش بـەیتوڵڵای خانـەی خودایـە

شـتی وا نایـاب، بەدەگمـەن وایـە

بــــەهرەی بــــاوانی ڕەســــوڵەڵڵایە !

٣٧٠٢- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنها) عن النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قال: أَلَمْ تَرَيْ أَنَّ قَوْمَكِ بَنَوُا الْكَعْبَةَ اقْتَصَرُوا عَنْ قَوَاعِدِ إِبْرَاهِيمَ. فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، أنَّ تَرُدُّهَا عَلَى قَوَاعِدِ إِبْرَاهِيمَ. قال: لَوْلاَ حِدْثَانُ قَوْمِكِ بِالْكُفْرِ. فَقال: ابْنُ عُمَرَ لَئِنْ كَانَتْ عَائِشَةُ سَمِعَتْ هَذَا مِنْ من النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مَا أُرَاه تَرَكَ اسْتِلاَمَ الرُّكْنَيْنِ اللَّذَيْنِ يَلِيَانِ الْحِجْرَ إِلاَّ أَنَّ الْبَيْتَ لَمْ يُتَمَّمْ عَلَى قَوَاعِدِ إِبْرَاهِيمَ[١٣].

**عائیشە** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئایا دەزانیت ئەوکاتەی کە گەلەکەی تۆ خانووی کابەیان دروست کردەوە، بەتەواوی نەیان گەیاندەوە سەر بناغەکانی ئیبراهیم لەبەر ئەوەی کەئەو چەردە ماڵە حەلاڵەی کۆیان کردبۆوە بەشی نەدەکرد، لەلای سەرروویەوە حیجری ئیسماعیل بەجێما. منیش عەرزیم کرد: ئەی تۆ بۆ نایبەیتەوە سەر بناغەکانی ئیبراهیم؟ فەرمووی: لەبەر ئەوە من نایبەمەوە سەر بناغەکانی ئیبراهیم چونکە گەلەکەی تۆ نۆ موسوڵمانن‌و هێشتا بەباشی دڵیان نەگرتووە بە ئیسلامەتییەوەو دوور نییە ئەگەر من کابە تێك بدەم‌و گەورەتری بکەم ئەوان شتی وا پەسەند نەکەن ئیبنو عومەر دەیگوت: وابزانم بۆیەکا جاران پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **لەکاتی تەواف کردندا دەستی نەدەهێنا بەدوو گۆشەکەی پاڵ حیجری ئیسماعیل دا لەبەر ئائەمەیە کە عائیشە دەڵێ لە پێغەمبەرم ژنەوتووم، کەوابێ دیارە ماڵی کابە بەتەواوی لەسەر بناغەکانی حەزرەتی ئیبراهیم دروست نەکراوەتەوە، بەڵکوو هەنێ لەحیجری ئیسماعیلی لێ دەرکراوە (ب) ⇦ (ب/٢ ز/١٣٥ ل/٢٧٢ ف/٤ +٥ + ب/٢ ز/١٣٦ ل/٢٧٣ ف/١).**

٣٧٠٣- عن أبي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قال: كـان أَهْلُ الْكِتَابِ يَقرَأُون التَّوراة بِالعِبرانِيَّة ويُفَسِّرونَها بالعَرَبِية لأهل الإِسلام، فَقال: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لاَ

[١٣] بخاري. تفسير: ٤٤٨٤.

تُصَدِّقُوا أَهْلَ الْكِتَابِ، وَلاَ تُكَذِّبُوهُمْ. وَقُولُوا (آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنْزِلَ) الآيَةَ. رواهما البخاري[١٤].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: جاران خاوەن نامەکان تەوراتیان بەزمانی عیبری دەخوێندەوەو بەعەرەبی شەرح و ڕاڤەیان دەکرد بۆ موسوڵمانان، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: نەباوەڕ بەم قسانەی خاوەن نامەکان بکەن و نە بە درۆشیان بخەنەوە، بەڵام بڵێن:

{آمَنَّا بِاللّهِ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلُ وَأَنَّ أَكْثَرَكُمْ فَاسِقُونَ - ١٣٦/٢}.

واتە: باوەڕمان هێنا بە خودا باوەڕمان هێنا بە قورئان، کەبەهۆی موحەممەدەوە بۆ ئێمە هاتووە، باوەڕمان هێنا بەکتێب و شەریعەتی ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقووب و نەتەوەکانی یەعقووب، وە باوەڕمان هەیە بە تەورات کە هاتووە بۆ مووساو بە ئینجیل کە هاتووە بۆ عیسا وە بەو کتێبانە کە دراون بە پێغەمبەران بەخەڵاتی لەلایەن خودای خۆیانەوە، ئێمە جیاوازیخوازنین و جیایی ناکەین لەناو ئەوانا هەموویان بە پێغەمبەرو خۆشەویست و ڕەهبەری خودای گەورە دەزانین، ئێمە کە گەلی ئیسلامین هەرچی فەرمانی خودای لەسەر بێ لەسەر سەرو چاومانەو مل کەچ و فەرمانبەرداری خودای خۆمانین (ب - خودای لێ ڕازی بێ).

٣٧٠٤- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قال: يُدْعَى نُوحٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فيقول: لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ يَا رَبِّ. فيقول: هَلْ بَلَّغْتَ؟ فيقول: نَعَمْ. فَيُقَالُ: لأُمَّتِهِ هَلْ بَلَّغَكُمْ؟ فَيَقُولُونَ مَا أَتَانَا مِنْ نَذِيرٍ. فيقول: مَنْ يَشْهَدُ لَكَ فيقول: مُحَمَّدٌ وَأُمَّتُهُ. فَتَشْهَدُونَ أَنَّهُ قَدْ بَلَّغَ. (وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا) فَذَلِكَ قَوْلُهُ: (وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا) رواه البخاري والترمذي[١٥].

---

[١٤] بخاري. تفسير: ٤٤٨٥ = تجريد / ٤ ل / ٤١٥ رقم: ١٦٣٧ = ٤٤٨٥ ، ٧٣٦٢ ، ٧٥٤٢ فتح الباري.

[١٥] بخاري. تفسير: ٤٤٨٧.

ئەبو سەعیدی خودری (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ڕۆژی قیامەت نووح پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بانگ دەکرێ، کەدێ دەفەرمویٚ: ئەی پەروەردگاری من! بفەرموو، تۆ سەروەرو من فەرمانبەر، فەرمانت بەچییە سەرم لەرێتایە، خودا دەفەرموێ: ئایا تۆ پەیامی منت ڕاگەیاند بەگەلەکەی خۆت؟ نووح دەفەرموێ: بەڵێ پێم ڕاگەیاندن ئینجا دەگوترێ بەگەلی نووح: ئایا نووح وەك خۆی دەڵێ پەیامی خودای بەئێوە ڕاگەیاندووە؟ دەڵێن: کەس نەهاتووە بۆلای ئێمە کە بۆ شتی وا هۆشیارو ئاگادارمان بکاتەوە! ئەوجا خودا بەنووح دەفەرموێ: کێ شایەتیت بۆ دەدا؟ نووح دەفەرموێ: موحەممەدو گەلی موحەممەد شایەتیم بۆ دەدەن، ئەوجالە ئێوە شایەتی بۆ دەدەن کەئەو زاتە پەیامی خودای پێیان ڕاگەیاندووە، پێغەمبەرەکەشتان دەبێ بەشایەت لەسەر ڕاستی ئێوە، مەبەست لەم ئایەتە ئەمەیە، کە دەفەرموێ:

{وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا - ٢/١٤٣}.

هەروەکوو ڕووگەم بۆ گۆڕین بە ڕووگەیەکی وەها کەپێی ڕازی بنو لەهەمان کاتا ڕێگەی ڕاستم نیشان دان، ئێوەشم کرد بە گەلێکی میانەی سەردەستە، نەوەك گەلی مووسا بە تەواوی ماددە خواه بن، وە نەوەکوو گەلی عیسا نەویست (زاهید)و پشت لەجیهان بن، هەتا لەپاشە ڕۆژدا ببن بەشایەت لەسەر نەتەوەکانی پێغەمبەرەکانی تر، وە پێغەمبەری خۆشتان ببێ بە شایەت لەسەر ڕاستیی ئێوە (ب/ت- خودایان لێ ڕازی بێ).

٣٧٠٥- ⇦ (ب/١ ز/٥٣ ل/٢١٠ ف/٢ + ف/٣ + ف/٤)[١٦].

٣٧٠٦- ⇦ (ب/١ ز/٥٣ ل/٢١٠ ف/٣)[١٧].

---

[١٦] تقدم في المجلد الأول. تسلسل/٥٣ رقم:٣٨٧/٢ + رقم:٤/ ٢٨٩ + ٤ / ٣٩٨ + بخاري. تفسير: ٤٤٩٠.

[١٧] سبق تخريجه في الحديث الذي قبله.

**٣٧٠٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قال: لَمَّا وُجِّهَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إِلَى الْكَعْبَةِ قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ بِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ مَاتُوا وَهُمْ يُصَلُّونَ إِلَى بَيْتِ الْمَقْدِسِ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تعالى (وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ إِنَّاللهَ بالنَّاس لرؤفٌ رحيمٌ) الآيَةَ.روى هذه الثلاثة الترمذي والبخاري[١٨].**

**ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) دەڵێ: کاتێ خودا فەرمانی بە پێغەمبەر کرد کە لەنوێژدا ڕووبکاتە کابەی نازدار، یاران عەرزی حەزرەتیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەی ئەو برا موسوڵمانانەمان چۆن کە ئێستا مردوون و جاران بەرەو بەیتولمەقدیس نوێژیان دەکرد؟ جا خودا بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە:**

**{وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ إِنَّ اللَّهَ بِالنَّاسِ لَرَؤُوفٌ رَّحِيمٌ - ٢/١٤٣}.**

**واتە: خودا پایەی ئیمان و باوەڕتان و پاداشی باشی کردەوەی چاکەتان هەرگیز زایە ناکا، بەڕاستی خودا لەگەڵ ئەو خەڵکە زۆر بەبەزەیی و بەڕەحمە (ت/ب).**

**{الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءهُمْ وَإِنَّ فَرِيقاً مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ الْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ - ٢/١٤٦}.**

**دانەر (پڕگۆڕەکەی لە نوورو ڕەحمەت بێ) لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا لەشەرحەکەیدا دەڵێ: خاوەن نامەکان زۆر باش پێغەمبەری خۆمان دەناسن، بەهۆی ئەو ناونیشانەی کەلەتەورات و ئینجیل دا بۆ ناسینی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆیان هەڵدراون، زۆر باش دەزانن کە موحەممەد پێغەمبەری خودایە، وەکوو چۆن کوڕەکانی خۆیان دەناسن ئاوا، بەڵام زوربەیان ئەو ڕاستییە دەشارنەوە لەخەڵك، تەنانەت عومەر (خودای لێ ڕازی بێ) کە پرسیاری لەبارەی حەزرەتەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی سەلام کرد (کەلە پێشا لە زاناکانی جولەکەبوو، وە موسوڵمان بوو بوو) گوتی: من پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)**

---

(١٨) بخاري. تفسير: ٤٤٨٦.

لە کوڕەکانی خۆم باشتر دەناسم، چونکە لە پێغەمبەرێتی موحەممەدا هیچ گومانێکم نییە، بەڵام لە کوڕەکانی خۆما گومانم هەیە، چونکە دەگونجێ دایکیان بەدزی منەوە داوێن پیسیی کردبێ.

٣٧٠٨- ⇦ (ب/٢ ز/٩٧ ل/١٨٩ ف/١ + ف/٢)[١٩].

٣٧٠٩- ⇦ (ب/٢ ز/٩٧ ل/١٩٢ ف/٤)[٢٠].

٣٧١٠- عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ يَزِيدَ (رَضِيَ اللهُ عَنها) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قال: اسْمُ اللَّهِ الأَعْظَمُ فِي هَاتَيْنِ الآيَتَيْنِ (وَإِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ) وَفَاتِحَةُ سُورَةِ آلِ عِمْرَانَ (الم اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ)، رواه الإمام أحمد وأبو داود والترمذي بسند صحيح[٢١].

ئەسمای کچی یەزید (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ناوە هەرە گەورەکەی خودا واتە: ئیسمی ئەعظەم لەم دوو ئایەتەدایە، لە ئایەتی {وَإِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ لاَّ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ} و لەئایەتەکەی سەرەتای سوورەتی ئالی عیمران دا کە دەفەرموێ: {الم، اللَّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ} (ئە/د/ت – س/ص).

٣٧١١- عن أبي أمامة (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عن النَّبِيَّ (صى اله عليه وسلم) قال: اسْمُ اللَّهِ الأَعْظَمُ الَّذِى إِذَا دُعِيَ بِهِ أَجَابَ فِي ثَلاَثِ سُوَرٍ مِنَ القرآنِ في الْبَقَرَةِ وَآلِ عِمْرَانَ وَطَهَ.رواه الطبراني والحاكم بسند حسن[٢٢].

ئەبو ئومامە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەوناوە گەورەیەی خودا، کە حاڵی وایە هەرکاتێ یەکێ بەوناوە هاواری لێ بکا دێ بە دەنگیەوەو مرازەکەیی دەداتێ ئەوناوە پیرۆزەیە لەم

---

[١٩] تقدم في المجلد الثاني تسلسل / ٩٧ برقم: ١و٢.

[٢٠] تقدم في المجلد الثاني تسلسل / ٩٧ برقم: ٤.

[٢١] سنده صحيح.

[٢٢] رواه الطبراني والحاكم بسند حسن.

سێ سوورەتە دایە، کەوان لەقورئان دا: لەبەقەرەو ئالی عیمران و طاهادا. (طەبەرانی/حاکم – س/ح).

{وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللّهِ أَندَاداً يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللّهِ وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَشَدُّ حُبًّا لِّلّهِ وَلَوْ يَرَى الَّذِينَ ظَلَمُواْ إِذْ يَرَوْنَ الْعَذَابَ – ٢/١٦٥}.

واتە: هەندێ کەسی واهەن کەچەن هاو وێنەیێ بۆ خودای مەزنی بێ وێنەی بێ چون لەخۆیانەوە بڕیار دەدەن، بە بیروڕای پووچی گەندەڵی خۆیان وا دەزانن کە ئەو خودا داتاشراوانە دەتوانن شان بدەن لەشانی خوداو نییدداپەتی و دژایەتی و ملەملەی لەگەڵ دا بکەن، ئەوانیش وەکوو بت و ئەستێرەو شتانی لەم بابەتە، لەهەمان کاتا وەکوو خودای گەورە خۆشیان دەوێن، چونکوو بەهاوشانی خوایان دەزانن بەڵام خاوەن بڕوای ساغ خودای گەورەیان لەهەموو شتێ خۆشتر دەوێ.

٣٧١٢– عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قال: قال: النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) كَلِمَةً وَقُلْتُ أُخْرَى. قال: النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مَنْ مَاتَ وَهْوَ يَدْعُو مِنْ دُونِ اللَّهِ نِدًّا دَخَلَ النَّارَ. وَقُلْتُ أَنَا مَنْ مَاتَ وَهْوَ لاَ يَدْعُو لِلَّهِ نِدًّا دَخَلَ الْجَنَّةَ[٢٣].

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەمایشتێکی فەرموو: منیش بەنیشانە (دەلالەت)ی ئەو فەرمایشتەی ئەو قسەیەکم گوتووە، حەزرەت فەرموویەتی: ئەوەی هاوبەش بۆ خودا بڕیاربداو لێی پەشیمان نەبێتەوەو لەسەر ئەو باوەڕە بمرێ دەچێتە دۆزەخ. منیش گوتوومە: ئەوەی بڕوای بەخودا هەبێ و هاوبەشی بۆ بڕیار نەداو لەسەر ئیمان و باوەڕ بمرێ سەرەنجام دەچێتە بەهەشت! (ب).

بەندەیش قسەیەکم هەیە عەرزتانی دەکەم: هەر موسوڵمانێ دەگریت، خوێنەوارو نەخوێنەوار، زۆرباش خودا دەناسێ و خودا بە خودای خۆی دەزانێ و غەیری خودا هەمووی بە عەبدو بەندەی خودا دەزانێ. واتە تێکڕای

[٢٣] بخاري تفسير البقرة: ٤٤٩٧.

موسـولمانان لەسـایەی خـوداوە بـیرو ڕایـان زۆر سـاغو پـاكو دوورە لـە بتپەرستیو شتی وا. بگرە لەسەرەتای ئیسلامیشەوە تا ئێستا، بەبەرچاوی مامۆسـتاو زانـا ئایینییەکانـەوە تەکیـەو خانـەقاو طـەریقـەتو شـێخو پـیرو دەروێـشو صـۆفی هـەر بـوون، وەگەلـێ لـە موسـولمانان (لەبـەر ڕەزای خـودا)پیرێ، یـا مـەلایێ یـا شـێخێ، یـا ڕابـەرو مورشـیدێکی خـۆش دەوێ، لـەحاڵی ژیانیـا دێنـی دەکـاو داوای ڕێنمـوونیو نـزای باشـی لـێ دەکـا، وە لـەحاڵی مردنیـا دێنـی گـۆڕو خـزنو نەزرگـەی دەکـاو فاتیحـای بـۆ دەنێـرێو سڵاوی لێ دەکاو لە خزمەتیا لەخودا دەپاڕێتەوە کەلەبەر خاتری ئەم بەندە باشـەی خـۆیو بەبەرەکـەتی عـیلمو زانـستو عیـادەتی سـاغی ئـەو، ڕەحـم بـەحاڵی ئـەویش بکـاو مـرازی بـدا، وە گـەلێکی تریـان خێـرو نـەزر دەکـەنو دەیدەن بە هەژارانو لێقەوماوانو پاداشی باشی ئەو خێرو چاکەی خۆیانە بەدیاری دەنێرن بۆ گیانی پاکی پێغەمبەرو ئەم شێخو پیرو خواناسانە، وە هەندێکی تریان بەنیازێکی پاك خزمەتی تەکیەو خانەقاو دەروێشو صۆفی ناویـان دەکـەن، هـەروەك خزمـەتی مزگـەوتو فـەقێو مەلادەکـەنو دڵـسۆزیو ئیخلاصـی خۆیـان بەرابـەر بەنـەوەی پێغەمبـەر دەردەبـڕن، ئەمـە هـەمووی دادەنـرێ بەبەشـێکی بـاش لـەکردەوەی چـاکی موسـولمان، وەبـەهیچ کلۆجـێ بەمە ناگوترێ بتپەرستیو شتی وا، وە ئەوەی هەوا خوایەو بـەخوتو خـۆڕایی ئەمـە بـە شـیركو فـرە خـواهی بزانـێ ئـەوە دەبـێ بەقـسەی ئـەو تێکـڕای موسولمانان (لەسەرەتای ئیسلامەوە تا ئێستا) تاك تاکەی لێ دەرچێ هـەموو کافربنو بتپەرست بن. داخەکەم ئەم جۆرە کەسانە (بـەناوی ئیسلامی ساخی پەتییـەوە) شـاتە شـاتێکی زۆر بـێ تـام دەکـەنو قیاسـی کەشـك لـە مەشـك دەکەنو قسەی هەلەق مەلەق دەجوونەوە. من بەش بەحاڵی خۆم نەدەروێشمو نـە صـۆفی بەڕاسـتیم بـەڵام خـوا هەقـە ئـەوەی مـن لەئـەهلی تەکیـەو خانـەقاو تەریقەتەکانم دیوە خووی شیرینو ڕەفتارو کرداری جوانو بەندەیی ساغی خودایەو هیچی تر، دەروێشی ساغی هەژاری بێوەیی دڵگەرمی وام دیوە فوو لە کێو بکا هەڵی دەکەنێ! سوێندم بە خودا سەییدی نعێمی وام بەچاوی خۆم

دیوە وەك تەرزە گوللەباران کراوەو بەپێوە وەك کێوی ئوحود وەستاوەو نووچی نەبردووە هەتا خودا لەبەر حیکمەتێ ڕێگەی نووچدانی داوە. کەواتە توخوا با سۆزێکی دەروێشانە بکەین*:

نووری! چییە وا حاڵی دەروێشی

سەری لێ داوی؟ دەڵێی حەوجۆشی!

هەر قسەی ڕووتی، تەنەکەی بۆشی

بەقسە ساغی، بەدڵ نەخۆشی!!

بێ سرنییە وا پەستو پەرۆشی

بێ مەی و بادە مەستو سەرخۆشی!

٣٧١٣- عن ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) قال: كَانَ فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ الْقِصَاصُ، وَلَمْ تَكُنْ فِيهِمُ الدِّيَةُ فَقَالَ اللهُ تَعَالَى لِهَذِهِ الأُمَّةِ (كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالأُنْثَى بِالأُنْثَى فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ) فَالْعَفْوُ أَنْ يَقْبَلَ الدِّيَةَ فِي الْعَمْدِ (فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ وَأَدَاءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَانٍ) يَتَّبِعُ بِالْمَعْرُوفِ وَيُؤَدِّي لَه بِإِحْسَانٍ، (ذَلِكَ تَخْفِيفٌ مِنْ رَبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ) مِمَّا كُتِبَ عَلَى مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ. (فَمَنِ اعْتَدَى بَعْدَ ذَلِكَ فَلَهُ عَذَابٌ أَلِيمٌ)[٢٤].

---

* لەشەڕی قادسیەدا ، سیدێکی نەعیم ، ناوی سید محمد بوو ، باوکی لە حەوێجە تەکیەو دەروێشی هەبوو ، لەترسی عەسکەری خۆی کردبوو بەحمایەی عزت دووری بەڕوتبەی ملازم لەگەڵ کۆمەڵی عەسکەری ڕاکردوو دا لەخوار کەرکووکەوە إعدامیان کردن ، هەرمعدومێ شەش رامی گوللە بارانیان دەکرد. کە دوکتۆرەکە سید محمدی فحص کرد ، وەك ئەمە عادەتە ، سید محمد ساغ و سەلیم بوو ، خوێن لە لووتی نەهاتبوو مقدمێکی تورکمان گوتی: مامۆستا تۆ بەشایەت بە خودا تۆڵەی ئەم سیدە لەم حکومەتە دەستێنی!. وەرگێڕ - ٢٨ / ٣ / ٢٠٠٨

[٢٤] بخاري. تفسير سورة البقرة: ٤٤٩٨.

**ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ ڕازی بێ) **گوتی: لەناو نەوەی ئیسرائیل دا تۆڵەی کوشتن تەنیا کوشتنەوە بوو، خوێنبایی وەرگرتنیان لەناودا نەبوو، بەڵام خودای گەورە لە قورئانا دەفەرموێ بەگەلی موحەممەد:**

**{كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالأُنثَى بِالأُنثَى فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ وَأَدَاء إِلَيْهِ بِإِحْسَانٍ ذَلِكَ تَخْفِيفٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ فَمَنِ اعْتَدَى بَعْدَ ذَلِكَ فَلَهُ عَذَابٌ أَلِيمٌ -١٧٨/٢}.**

**واتە: ڕاڤەی ئایەتەکە لەسەرەتای بەرگی سێدا لەزنجیرەی (٢)و(٣) ڕۆیشت.**

**ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ ڕازی بێ) **دەڵێ: مەبەست لەعەفو وبەخشین لەم ئایەتەدا ئەوەیە: کەلەکوشتنی قەستی دا خاوەن خوێن بە وەرگرتنی خوێن ڕازی بێ، وە بە پیاوانەو بەپێی باوی جوانی ناو کۆمەڵ داوای خوێنبایی بکاتو بەرێكو پێکی خوێنی پێ بدرێ، دیارە کە دامەزرانی ئەم یاسای لێ خۆشبوونو خوێن وەرگرتنە بارسووکیو ئاسانکارییە لەچاو ئەو حوکمو بڕیاری کوشتنەوەی بێ وەجەڵەدا کەلەسەر نەوەکانی پێش ئێوە دانرابوو (ب).**

**٣٧١٤- ⇦ (ب/٣ ز/٢ ل/ ف/٣ + ف/٢)[٢٥].**

**بۆ ئایەتەکە تەماشای سەرەتای زنجیرە (٥) بەرگی دوو بکە، ئایەتی یەکەم.**

**٣٧١٥- ⇦ (ب/٢ ز/٦٠ ل/١٢٤ ف/١)[٢٦].**

**٣٧١٦- ⇦ (ب/٢ ز/٢٧ ل/٧٨ ف/٢)[٢٧].**

**٣٧١٧- ⇦ (ب/٢ ز/٢٧ ل/٧٦ ف/١)[٢٨].**

---

[٢٥] تقدم برقم: ٣ / ١٩٦٢ ورقم:٢ / ١٩٦١ مجلد ثالث.

[٢٦] تقدم برقم: ١ / ١٤١٧. مجلد / ٢ تسلسل / ٦٠.

[٢٧] تقدم برقم: ٢ / ١٣٠٧ مجلد / ٢ تسلسل / ٢٧.

[٢٨] تقدم برقم: ١ / ١٣٠٦ مجلد / ٢ تسلسل / ٢٧.

لێرەدا ئەم نەختە زیادەی هەیە: کە ڕۆژووی ڕەمەزان داهات، پیاوان لەمانگی ڕەمەزانا چ بەشەو وە چ بە ڕۆژ نەدەچوونە لای ژنان.

٣٧١٨- ⇦ (ب/٢ ز/٢٧ ل/٧٦ ف/١)[٢٩].

٣٧١٩- ⇦ (ب/٢ ز/٢٧ ل/٧٨ ف/٣)[٣٠].

٣٧٢٠- عَنِ الْبَرَاءِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قال: كَانُوا فِي الْجَاهِلِيَّةِ إِذَا أَحْرَمُوا أَتَوُا الْبَيْتَ مِنْ ظَهْرِهِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تعالى: (وَلَيْسَ الْبِرُّ بِأَنْ تَأْتُوا الْبُيُوتَ مِنْ ظُهُورِهَا وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنِ اتَّقَى وَأْتُوا الْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَابِهَا). رواه البخاي ومسلم ولفظه: كَانَتِ الأَنْصَارُ إِذَا حَجُّوا فَرَجَعُوا لَمْ يَدْخُلُوا الْبُيُوتَ إِلاَّ مِنْ ظُهُورِهَا فَجَاءَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ فَدَخَلَ مِنْ بَابِهِ فلاموه فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ (لَيْسَ الْبِرُّ بِأَنْ تَأْتُوا الْبُيُوتَ مِنْ ظُهُورِهَا)[٣١].

بەڕاء (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لەسەردەمی نەزانی دا دەستووریان وابوو کە حەجیان دەکردو لەحەج دەگەڕانەوە بۆ ماڵەوە لەپشتی خانووەکانیانەوە دەچوونە ژوورەوە، تا خودای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە:

{وَلَيْسَ الْبِرُّ بِأَنْ تَأْتُوْا الْبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنِ اتَّقَى وَأْتُوا الْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَابِهَا وَاتَّقُوْا اللّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ -٢/١٨٩}.

واتە: چاکەو کردەوەی باش ئەوە نییە کەهاتنەوە بۆ ماڵەوە لە قنگەبانەوەو لەپشتی خانووەوە بچنە ژوورەوە، بەڵکو چاکە ئەوەیە کەپیاو لە خودای گەورە بترسێو پارێز لەنافەرمانی ئەو بکا، لەدەرگای ئاسایی ماڵەکانتانەوە بچنە ژوورەوەو هاموشۆبکەنو بۆ هەموو مەبەستێ لە دەرگاو ڕێگەی ئاسایی خۆیەوە بڕۆن (ب/م) گفتەی (م) ئاوایە: جاران یاریدەدەران کە حەجیان دەکردو دەگەڕانەوە لە قنگەبانەوە دەلاقەیەکیان دەکردە خانووەکەیانو لەو کونەوە لەپشتەوە دەچوونە ماڵەوە، هەتا جارێ پیاوێ (لە

---

[٢٩] راجع الحديث السابق عليه.

[٣٠] تقدم في المجلد الثاني تسلسل / ٢٧ رقم: ٣ / ١٣٠٨.

[٣١] بخاري. تفسير: ١٨٠٣ ، ٤٥١٢. مسلم. تفسير: ٧٤٦٥.

یاریدەدەران) لەحەج دەگەڕێتەوەو لەدەرگاوە دەچێتەوە ماڵەوە، ئەوانیش لۆمەو سەرزەنشتی دەکەن، جا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە {وَلَيْسَ الْبِرُّ بِأَنْ تَأْتُوا.....} .

٣٧٢١- عَنْ نَافِعٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قال: جاء رَجُلٌ لابْنَ عُمَرَ فَقَال: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ مَا حَمَلَكَ عَلَى أَنْ تَحُجَّ عَامًا وَتَعْتَمِرَ عَامًا، وَتَتْرُكَ الْجِهَادَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، وَقَدْ عَلِمْتَ مَا رَغَّبَ اللَّهُ فِيهِ قال: يَا ابْنَ أَخِي بُنِيَ الإِسْلاَمُ عَلَى خَمْسٍ إِيمَانٍ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ، وَالصَّلاَةِ الْخَمْسِ، وَصِيَامِ رَمَضَانَ، وَأَدَاءِ الزَّكَاةِ، وَحَجِّ الْبَيْتِ. قال: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَلاَ تَسْمَعُ مَا ذَكَرَ اللَّهُ فِي كِتَابِهِ (وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا) (قَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ) قال: فَعَلْنَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَكَانَ الإِسْلاَمُ قَلِيلاً، فَكَانَ الرَّجُلُ يُفْتَنُ فِي دِينِهِ إِمَّا قَتَلُوهُ، وَإِمَّا يُعَذِّبُوهُ، حَتَّى كَثُرَ الإِسْلاَمُ فَلَمْ تَكُنْ فِتْنَةٌ. قال: فما قولك في عليٍّ وعثمان؟ قال: أمَّا عثمان فكأنَّ الله عفا عنه وأمَّا أنتم فكرهتم أن تعفوا عنه، وأمَّا عليٌّ فإبن عمِّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وختنُه وأشار بيده فقال: هذا بيتُه حيث ترون. رواه البخاري[٣٢].

**نافیع** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **گوتی: پیاوێ هاتە لای ئیبنو عومەر گوتی: ئەی باوکی ئەوڕەحمان! لەبەر چی ساڵێ حەج دەکەیتو ساڵێ عەمرە دەکەیت، بەڵام ناچیت بۆ خەباتکێڕانو غەزا لە ڕێگەی خودادا، ئەمە لە کاتێك دا کە خۆت زۆرباش دەزانیت کە خودا چەند بەگەرمی مەدحی غەزاو پەسنی خەبات دەکا؟ ئیبنو عومەر** (خودایان لێ ڕازی بێ) **گوتی: ئەی کوڕی برام! ئاییني ئیسلام لەسەر ئەم پێنج بنیاتە دامەزراوە: باوەڕ بە خوداو پێغەمبەری خودا، کردنی پێنج نوێژەو گرتنی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانو دانی زەکاتو حەجی خانەی خودا، گوتی: ئەی باوکی ئەوڕەحمان! خۆت باش دەزانی کە خودا لەقورئانا، دەفەرموێ:**

{وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا -٩/٤٩}.

---

[٣٢] بخاري. تفسير سورة البقرة / ٤٥١٤.

واتە: ئەگەر دوو تاقم لە موسوڵمانان بوو بەجەنگیان و شەڕیان لەگەڵ یەکدا کرد، ئەوە ناوبژییان بکەن و گرێی ناو بەینیان بکەنەوە وەلە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ:

{وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ لِلّهِ -١٩٣/٢}.

واتە: جەنگیان لەگەڵ بکەن، تا دوژمنایەتی ئایین نامێنێ، وە ئایین و بەندەیی هەر بۆخودا دەبێ ئەی بۆ ئەمە دەڵێی چی؟ ئیبنو عومەریش گوتی: لەسەردەمی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) ئەمەمان بەجێ هێنا، ئەوسا موسوڵمانان کەم بوون، وا دەبوو پیاویان دەهێنایە گیروگازو لەسەر ئایین گەڕیان پێ دەکرد، یا دەبوو وەرگەڕێ لەئایین، دەنا یان دەیانکوشت، یان ئازارو ئەشکەنجەیان دەدا، ئەمە وابوو تا موسوڵمانان زۆر بوون، بەڵام ئێستا ئایینی ئیسلام پەرەی سەندووەو گیروگاز نەماوە. گوتی: ئەی ڕای تۆ چییە دەربارەی عەلی و عوسمان؟ گوتی: هەرچی عوسمانە وا دیارە خودا لێی خۆش بووە، بەڵام ئێوە بەزۆر ناتانەوێ لێی خۆش بن، وە هەرچی عەلیشە ئەوە دیارەو نومایانە کە ئامۆزاو زاوای پێغەمبەری خودایە (درودی خودای لەسەر بێ) وە بەدەستیشی ماڵەکەی عەلی نیشان دان و گوتی: ئەوەش ماڵەکەیەتی بەبەرچاوی خۆتانەوە وا لەناوەڕاستی ماڵەکانی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ)(ب).

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَلاَ تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ وَأَحْسِنُوَاْ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ} (١٩٥/٢).

واتە: ماڵی خۆتان بەخت بکەن لەرێگەی خودادا، وە بەدەستی خۆتان خۆتان مەخەنە ناو نەمان و تیاچوونەوە، وە چاکە بکەن و هەموو شتێ لە سەرشێوەیەکی چاکی شەرعی بکەن، بەڕاستی خودا چاکەکارانی خۆش دەوێ، ئەوەی پیشەی چاکەیە خۆشەویستی خوایە.

٣٧٢٢- قَالَ: حُذيفة: نزلت في النَّفقة. رواه البخاري[٣٣].

---

[٣٣] بخاري. تفسير سورة البقرة: ٤٥١٦.

**حوزەیفە** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: ئەم ئایەتە هاتۆتە خوارەوە، لەبابەتی ماڵ بەخت کردن، لەڕێگەی خودادا بۆ غەزاو خەبات (ب).**

**٣٧٢٣- عَنْ أَسْلَمَ التُّجِيبِيِّ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **قال: كُنَّا بِمَدِينَةِ الرُّومِ فبرز لَنَا صَفٌّ عَظِيمٌ مِنهُم وخَرَجَ لَهُمْ مِنَ الْمُسْلِمِينَ مِثْلُهُمْ أَوْ أَكْثَرُ وَعَلَى أَهْلِ مِصْرَ عُقْبَةُ بْنُ عَامِرٍ وَعَلَى الْجَمَاعَةِ فَضَالَةُ بْنُ عُبَيْدٍ فَحَمَلَ رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ عَلَى صَفِّ الرُّومِ حَتَّى دَخَلَ فِيهِمْ فَصَاحَ النَّاسُ وَقَالُوا سُبْحَانَ اللَّهِ يُلْقِي بِيَدَيْهِ إِلَى التَّهْلُكَةِ؟ فَقَامَ أَبُو أَيُّوبَ فَقال: يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّكُمْ تَتَأَوَّلُونَ هَذِهِ الآيَةَ هَذَا التَّأْوِيلَ وَإِنَّمَا نَزَلَتْ فِينَا مَعْشَرَ الأَنْصَارِ لَمَّا أَعَزَّ اللَّهُ الإِسْلاَمَ وَكَثُرَ نَاصِرُوهُ فَقال: بَعْضُنَا لِبَعْضٍ سِرًّا إِنَّ أَمْوَالَنَا قَدْ ضَاعَتْ وَإِنَّ اللَّهَ قَدْ أَعَزَّ الإِسْلاَمَ وَكَثُرَ نَاصِرُوهُ فَلَوْ أَقَمْنَا فِي أَمْوَالِنَا فَأَصْلَحْنَا مَا ضَاعَ مِنْهَا. فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَلَى نَبِيِّهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **يَرُدُّ عَلَيْنَا مَا قُلْنَا (وَأَنْفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلاَ تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ) فَكَانَتِ التَّهْلُكَةُ الإِقَامَةَ عَلَى الأَمْوَالِ وَإِصْلاَحَهَا وَتَرْكَنَا الْغَزْوَ فَمَا زَالَ أَبُو أَيُّوبَ شَاخِصًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ حَتَّى اسْتُشْهِدَ ودُفِنَ بِأَرْضِ الرُّومِ. رواه أصحاب السنن بسند صحيح[٣٤].**

**ئەسلەمی نەجیبی** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: لە قوستەنتەنییە بووین خەریك بووین فەتحی بکەین، لەوکاتەدا ریزێکی گەورەی ئەوانمان بۆهاتە مەیدان، لە موسوڵمانانیش بەقەد ئەوان (بگرە پتریش) شێرانە دەرچوون و بۆیان چوونە مەیدان، عوقبەی کوڕی عامیر سەرکردەی خەڵکی میصر بوو، سەرکردەی کۆمەڵەکەش فەزاڵەی کوڕی عوبەید بوو، جا پیاوێ (لە موسوڵمانان) هەڵمەتی بردە سەر ئەو ڕیزە لەشکرەی ڕۆم و نەوەستاو لەهیچ کۆی نەکردەوە هەتا خۆی کرد بەناویاناو دڕی پێدان، خەڵکەکەش هاواریان لێ هەڵساو گوتیان: سوبحانەڵلا! شتێکی سەیری کرد! بەدەستی خۆی خۆی دەهاوێتە ناو ئاگری سوورەوە خوداش دەفەرموێ: {وَلاَ تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ} بەدەستی خۆتان خۆتان تووشی چورتم و سەرتیاچوون مەکەن کەچی**

---

(٣٤) حديث صحيح.

ئەبو ئەییوبی ئەنصاری هەڵسایەوەو گوتی: ئەی خەڵکینە! ئێوە لە خۆتانەوە ئەم ئایەتە بەم شێوەیە لێك دەدەنەوە، بەڵام لەڕاستی دا ئەم ئایەتە دەربارەی ئێمە هاتە خوارەوە، کە کۆمەڵی یاریدەدەرانین چونکە کە خودا ئایینی ئیسلامی سەرخست و کاتێ یارمەتی دەرانی ئیسلام زۆر بوون، ئێمە لەناو خۆمانا بەنهێنی بە یەکترمان دەگوت: ماڵ و سامانمان هەموو تیاچوو، ئەوا خودای گەورە ئیسلامی سەرخست و پشتیوانانی ئیسلام زۆر بوون، دەی با ئیتر خەریکی ماڵ و باخەکانی خۆمان بین و ئەوەی ماوە پەروەردەی بکەین، جا خودای گەورە بەرپەرچی قسەکەی ئێمەی دایەوەو ئەم ئایەتەی بە تەواوی ناردە خوارەوە بۆ پێغەمبەری خۆی کە دەفەرموێ:

{وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَلاَ تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ وَأَحْسِنُوَاْ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ}.

کەواتە لەسەر ئەم بنیاتە تیاچوون و لەناوچوون و نەمان ئەوەیە کە بەدیار باخ و ماڵ و سامانەوە کڕکەوین و خەریکی ماڵداریی کردن بین و واز لە غەزاو خەبات بێنین! چونکە لەم حاڵەدا گیانی لە خۆبووردن و خۆبەخت کردن لەپێناوی خوادا نامێنێ، دوژمن باشترین هەلی دەست دەکەوێ و دەتان فەوتێنێ ئیتر ئەبو ئەییوب (خودای لێ ڕازی بێ) شەوقی کەوتە سەر غەزاو بەبێ پەروا بەپێوە ڕاوەستاو دەستی کرد بەشەڕکردن و تێکۆشان لەڕێگەی خودادا هەتا شەهید کرا، وەلە خاکی ڕۆم بەخاك سپێردرا (د/ت/ن – س/ص).

٣٧٢٤- ب/٢ ز/١٢٥ ل/٢٥٣ ف/١) [٣٥].

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {فَمَن تَمَتَّعَ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ....}الآية: انظر: (ب/٢ ز/٩٠ ل/١٧٤) + (ب/٢ ز/١٢٥ ل/٢٥٢).

٣٧٢٥- ⇦ (ب/٢ ز/١٢٥ ل/٢٥٣ ف/١)[٣٦].

---

[٣٥] تقدم في المجلد الثاني ت / ١٢٥ رقم: ١ / ١٦٤٩.

[٣٦] تقدم في المجلد الثاني ت / ١٢٥ رقم: ١ / ١٦٤٩.

٣٧٢٦- ⇦ (ب/٢ ز/٨١ ل/١٥٨ ف/١ + ف/٢)[٣٧].

٣٧٢٧- ⇦ (ب/٢ ز/١٠١ ل/٢٠١ ف/٤)[٣٨].

٣٧٢٨- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قال: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يقول: اللَّهُمَّ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ، رواه البخاري:[٣٩].

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: هەمیشە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو:

{رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ - ٢/٢٠١}.

واتە: خودایە! ئەی پەروەردگاری ئێمە! هەم لەجیهان داو هەم لە ڕۆژی پاشە ڕۆژدا بەشی باشمان بدەرێو لەهەر دوو جیهان دا چاکمان بۆ بکە، وەبمان پارێزە لەسزای ئاگری دۆزەخ (ب).

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَاذْكُرُواْ اللّهَ فِي أَيَّامٍ مَّعْدُودَاتٍ فَمَن تَعَجَّلَ فِي يَوْمَيْنِ فَلاَ إِثْمَ عَلَيْهِ وَمَن تَأَخَّرَ فَلا إِثْمَ عَلَيْهِ لِمَنِ اتَّقَى وَاتَّقُواْ اللّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّكُمْ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ} (٢٠٣) تەماشای ئێرە بکە: ⇦ (ب/٢ ز/١١٤ ل/٢٢٣).

٣٧٢٩- (ب/٢ ز/١٠٣ ل/٢٠٢ ف/١ + ف/٢) [٤٠].

٣٧٣٠- (ب/٣ ز/١٢٢ ل/٣٢٠ ف/١)[٤١].

{أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُواْ الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ الَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلِكُم مَّسَّتْهُمُ الْبَأْسَاء وَالضَّرَّاء وَزُلْزِلُواْ حَتَّى يقول: الرَّسُولُ وَالَّذِينَ آمَنُواْ مَعَهُ مَتَى نَصْرُ اللّهِ أَلا إِنَّ نَصْرَ اللّهِ قَرِيبٌ - ٢/٢١٤}.

---

[٣٧] تقدم في المجلد الثاني ت / ٨١ رقم: ١ / ١٤٩٣ و ٢ / ١٤٩٤.

[٣٨] تقدم في المجلد الثاني ت / ١٠١ = ٤ / ١٥٧١.

[٣٩] بخاري. تفسير سورة البقرة: ٤٥٢٢.

[٤٠] تقدم في المجلد الثاني. تسلسل / ١٠٣ رقم: ٢ / ١٥٧٦.

[٤١] تقدم في المجلد الثالث تسلسل / ١٢٢ رقم: ١ / ٣١٥١.

ڕەنگ بێ ئێوە وا بەتەمابن کە هەروا بەبێ ئارەق و بەئاسانی وەکوو بچی بۆ سەرکانی ئاوا بچنە بەهەشت! بەبێ ئەوەی کە تووشی ساردی و گەرمی ببن و بەبێ فیداکاریی، یا بەبێ ئەوە کە وەك پێغەمبەرە پێشینەکان و پەیڕەوەکانیان تووشی نەبوونی و خۆشی و ناخۆشی و دووچاری ترس و لەرزو کارەسات و بەسەرهات و داستانی سامناك ببن! ئەوان لەڕێی خودادا تووشی هەموو جۆرە سەختی و زەرەرو زیانێ بوون و گەلێ جار لەتاوانا دەکەوتنە لەرزە لەرزو چرکە چرکێکی وا تەنانەت پێغەمبەرەکان و گەلەکانیان وەهاتەنگاو دەبوون دەیانگوت: خۆ ئێمە وا لەژێر باری زۆرو زۆرداریی دا پڕوکاوین و بەرگەی پتر ناگرین، دەی ئەم یارمەتی و یاریدەی خوادیە، کە خودا بەڵێنی ئەوەی بەئێمە داوە، ئەگەر بۆ ئێستا نەبێ بۆ کەیەو سوودی چییە؟ جا کاتێ خاوەنی ئایین ئاوا جانفیداو سەر لەپێناوی دینی خۆیاندا بوون و تا ئەم حاڵە کۆڵیان نەداو بەردەوام بوون لەسەر هەوڵ و تەقەڵلای خۆیان و خۆیان ڕاگرت لەژێر باری خودادا، بێگومان کە ئیتر یاریدەو کۆمەکی خودا نزیکە.

٣٧٣١- ⇦ (ب/٤ ز/١١٢ ل/٣٦٤ ف/٢)[٤٢].

٣٧٣٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) قال: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَقْرَبُوا الصَّلاَةَ وَأَنْتُمْ سُكَارَى) وَ (يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ) نَسَخَتْهُمَا الَّتِي فِي الْمَائِدَةِ {إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ} رواه أبو داود في الأشربة[٤٣].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَقْرَبُواْ الصَّلاَةَ وَأَنتُمْ سُكَارَى -٤٣/٤}.

---

[٤٢] تقدم في المجلد الرابع تسلسل / ١٣٢ رقم: ١ / ٢٤٥٧.

[٤٣] سكت عن درجته الشارح.

واتە: ئەی موسوڵمانینە! ئێوە لەسەر دینی خوداو پێغەمبەری خودان کەوابوو لەقسەی ئەوان دەرمەچن و لەکاتی سەرخۆشی دا نزیکی نوێژمەکەون، هەتا بزانن چی دەڵێن و چی ناڵێن. لەگەڵ ئەم ئایەتەی تردا کە دەفەرموێ:

{يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ - ٢/٢١٩}.

واتە: پرسیارت لێ دەکەن لە حوکمی ئارەقخواردنەوەو مەی نۆشین و قورمارکردن: ئایا دروستن یا دروست نین، تۆ لە وەڵامیانا بفەرموو: خودا دەفەرموێ: لەم دووشتەدا تاوان و گوناهی گەورە هەیە وەچەند قازانج و سوودێکیشیان تیا هەیە بۆ مەردوم ئەم دوو ئایەتە نەسخ بوونەتەوە بەم ئایەتەی تر کەلە سوورەتی مائیدەدایە کە دەفەرموێ:

{إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ - ٥/٩٠}.

واتە: ئەی موسوڵمانینە! بزانن عارەق و مەی و بادەو شەراب و قومارو یاری قورمارو پەرستن و ڕێزگرتنی بتەکان لەکردەوەی شەیتانن، کەوابێ خۆتانی لێ بپارێزن تا ڕزگارو سەرفراز بن لەهەردوو جیهاندا (د).

٣٧٣٣- ⇦ (ب/١ ز/٣٣ ل/١٥٨ ف/١)[٤٤].

٣٧٣٤- ب/٣ ز/٤٣ ل/٩٨ ف/٣)[٤٥].

٣٧٣٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قال: جَاءَ عُمَرُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقال: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَلَكْتُ قال: وَمَا أَهْلَكَكَ. قال: حَوَّلْتُ رَحْلِي اللَّيْلَةَ. قال: فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) شَيْئًا قال: فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ

---

[٤٤] تقدم في المجلد الأول. تسلسل / ٣٣ رقم: ١ / ٢٩٠.

[٤٥] تقدم برقم: ٣ / ٢١٣٢ مجلد / ٣ تسلسل / ٤٣.

وَسَلَّم) هَذِهِ الآيَةَ (نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ) أَقْبِلْ وَأَدْبِرْ وَاتَّقِ الدُّبُرَ وَالْحِيضَةَ. رواه الترمذي بسند حسن[٤٦].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: عومەر هاتەلای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! بەفەتارەت چووم! فەرمووی: چۆن و بۆچی؟ گوتی: ئەمشەو زینەکەمم هەڵسوڕان واتە: لە پشتەوە بەپێش چوومە لای ژنەکەم و جوولەکەش دەڵێن: کەسێ شتی وابکا منالی خێلی دەبێ. پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هیچ دەنگی نەکرد، تا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە کە دەفەرموێ:

{نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ - ٢/٢٢٣}.

ئەوجا حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: چ لەلای بەرەوە، چ لەلای پشتەوە ئیشی شەرعی خۆت بکە، بەڵام بەمەرجێ بەکۆم (بەپاش) نەبێ و لەکاتی بێنوێژیدا نەبێ (ت-س/ح).

٣٧٣٦- عَنْ مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ زَوَّجَ أُخْتَهُ رَجُلاً مِنَ الْمُسْلِمِينَ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَكَانَتْ عِنْدَهُ مَا كَانَتْ ثُمَّ طَلَّقَهَا تَطْلِيقَةً لَمْ يُرَاجِعْهَا حَتَّى انْقَضَتِ الْعِدَّةُ فَهَوِيَهَا وَهَوِيَتْهُ ثُمَّ خَطَبَهَا مَعَ الْخُطَّابِ فَقال لَهُ: يَا لُكَعُ أَكْرَمْتُكَ بِهَا وَزَوَّجْتُكَهَا فَطَلَّقْتَهَا وَاللَّهِ لاَ تَرْجِعُ إِلَيْكَ أَبَدًا قال: فَعَلِمَ اللَّهُ حَاجَتَهُ إِلَيْهَا وَحَاجَتَهَا إِلَى بَعْلِهَا فَأَنْزَلَ اللَّهُ (وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ) إِلَى قَوْلِهِ (وَأَنْتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ) فَلَمَّا سَمِعَهَا مَعْقِلٌ قال: سَمْعًا لِرَبِّي وَطَاعَةً ثُمَّ دَعَاهُ فَقال: أُزَوِّجُكَ وَأُكْرِمُكَ. رواه الترمذي والبخاري[٤٧].

مەعقیلی کوڕی یەسار (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لەسەردەمی حەزرەت دا (درودی خودای لەسەر بێ) خوشکێکم هەبوو، دام بە شوو بەپیاوێکی موسوڵمان، تا ماوەیێ لەلای بوو، لەپاشا یەك تەڵاقی داو نەیگەڕانەوە بۆلای خۆی تا

---

[٤٦] حسن عند الترمذي.

[٤٧] بخاري. تفسير: ٤٥٢٩.

عیددەی بەسەر چوو، لەپاشا حەزیان لەیەکتری کردەوە، جا ئەویش (وەك خوازبێنی کەرانی تر) سەر لەنوێ هاتەوە بۆ خوازبێنی، منیش پێیم گوت: ئەی سپڵە! ئەی نامەرد! من لەلای خۆی پیاوەتیم لەگەڵ کردیتو ژنم دایتێو ڕێزم لێ گرتیت کەچی تۆ سپڵە دەرچوویتو لەباتی هەموو شتێ چوویت تەڵاقت دا بەخودا بڕای بڕای جارێکی تر نایەتەوە لاتو نابێتەوە بەژنی تۆ! گوتی: بەڵام خودا زانی کەئەم کاری بەوەو ئەویش کاری بەمێردەکەیەتی، ئیتر ئەم ئایەتەی لەم بارەیەوە تا کۆتایی نارده خوارەوە کەدەفەرموێ:

{وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاء فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ... – ٢/٢٣٢}.

واتە: کاتێ ژنتان تەڵاق داو عیددەیان تەواو بوو، ئیتر ڕێیان لێ مەگرن (ئەی هەقدارەکانی ئەو ژنانە!) کە بۆ خۆیان شوویەکی تر بکەنەوە، خوا بەمێردە کۆنەکانیان بێ، یا بەمێردێکی نوێ بێ بەمەرجی ئەوە کەلەناو خۆیانا بەپێی یاساو دەستوورەکانی دین لەسەر شێوەیەکی ڕەوا ڕێك بکەون! کەئەم ئایەتەم ژنەوت گوتم: بەگوێی پەروەردگاری خۆم دەکەمو فەرمانی لەسەر سەرمە، ئەنجا بانگی پیاوەکەیم کردو گوتم: لەتۆی مارە دەکەمەوەو ڕێزت دەگرم لەبەر فەرمانی خودا (ت/ب).

قَالَ اللّٰهُ تَعَالَى: {وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا} ⇦ (ب/٣ ز/٧٩ ل/١٨٤).

٣٧٣٧– عن عبدالله بن الزُّبير (رَضيَ اللهُ عَنهُ) قال: قُلتُ لعُثمان (رَضيَ اللهُ عَنهُ) (وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا وَصِيَّةً لأَزْوَاجِهِمْ مَتَاعًا إِلَى الْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ) قد نسختها الآية الأخرى فلم تكتُبُهَا أو تدعُها؟ قال: يا ابن أخِي لا أغير شيئاً منه عن مكانه. رواه البخاري:[٤٨].

عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: عەرزی عوسمانم کرد: خۆ ئایەتی {وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا وَصِيَّةً لِّأَزْوَاجِهِم مَّتَاعًا إِلَى الْحَوْلِ

---

[٤٨] بخاری. تفسیر: ٤٥٣١ ، ٤٥٣٠.

غَيْرَ إِخْرَاجٍ} بە ئایەتەکەی تر نەسخ بۆتەوە، کەواتە ئیتر بۆ لەناو قورئاندا دەینووسیتەوە؟ یا گوتی: گوتم: بۆ دەیخەینە ناو قورئانەوە؟ عوسمان (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەی کوڕی برام! من لە خۆمەوە هیچ شتێ لەم قورئانە لەشوێنی خۆی لانابەمو بەهیچ جۆرێ دەسکاری ئایەتەکانی ناکەم (بوخاری - ڕەزای خودای لێبێت).

٣٧٣٨- قال: ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) (وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنْكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا وَصِيَّةً لأَزْوَاجِهِمْ مَتَاعًا إِلَى الْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ) فَنُسِخَ بِآيَةِ الْمِيرَاثِ وَنُسِخَ أَجَلُ الْحَوْلِ بِأَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا. رواه أبو داود في الطلاق[٤٩].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێت) گوتی: ئەم ئایەتە:

(وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا وَصِيَّةً لأَزْوَاجِهِمْ مَتَاعًا إِلَى الْحَوْلِ غَيْرَ إِخْرَاجٍ - ٢/٢٤٠).

بەئایەتی میرات بەش کردن نەسخ بۆتەوە کەدەفەرموێ:

{وَلَهُنَّ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّكُمْ وَلَدٌ فَإِن كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ الثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُم -٤/١٢}.

⇨ (ب/٣ ز/٦) گوتی: عیددەی ساڵەکەش بەم ئایەتە نەسخ بۆتەوە کەدەفەرموێ: {يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا} (٢/٢٣٤) (د).

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {حَافِظُواْ عَلَى الصَّلَوَاتِ والصَّلاَةِ الْوُسْطَى وَقُومُواْ لِلّهِ قَانِتِينَ} (٢/٢٣٨) ⇨ (ب/١ ز/٤٤).

٣٧٣٩- ⇨ (ب/١ ز/٤٥ ل/١٩١ ف/١)[٥٠].

٣٧٤٠- (ب/١ ز/٤٥ ل/١٩٢ ف/٣)[٥١].

---

[٤٩] سكت عن درجته الشارح.

[٥٠] تقدم في مجلد أول تسلسل / ٤٥ رقم: ١ / ٣٤٢.

[٥١] تقدم في مجلد أول تسلسل / ٤٥ رقم: ٣٤٤/٣.

٣٧٤١- عَنْ أَبِي يُونُسَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) مَوْلَى عَائِشَةَ أَنَّهُ قَالَ: أَمَرَتْنِي عَائِشَةُ أَنْ أَكْتُبَ لَهَا مُصْحَفًا فَقالت: إِذَا بَلَغْتَ هَذِهِ الآيَةَ فَآذِنِّي (حَافِظُوا عَلَى الصَّلَوَاتِ وَالصَّلاَةِ الْوُسْطَى) فَلَمَّا بَلَغْتُهَا آذَنْتُهَا فَأَمْلَتْ عَلَيَّ حَافِظُوا عَلَى الصَّلَوَاتِ وَالصَّلاَةِ الْوُسْطَى وَصَلاَةِ الْعَصْرِ. وَقالت: سَمِعْتُهَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). واهما الترمذي بسندين صحيحين[٥٢].

ئەبو یونس (خودای لێ ڕازی بێ) (کەبەندەی ئازادکراوی عائیشە بوو) گوتی: عائیشە پێی فەرمووم کە قورئانێکی بۆ بنووسمەوە، وەپێی گوتم: کاتێ گەشتیتە سەر ئەم ئایەتە {حَافِظُواْ عَلَى الصَّلَوَاتِ والصَّلاَةِ الْوُسْطَى} ئاگادارم بکەرەوە، جا کە گەیشتمە سەری عائیشەم ئاگادار کردەوە، ئەویش گوتی: بنووسە: {حَافِظُواْ عَلَى الصَّلَوَاتِ والصَّلاَةِ الْوُسْطَى وَصَلاَةِ الْعَصْرِ) عائیشە گوتیشی: ئاوام لەپێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بیستووە (ت-س/ص).

٣٧٤٢- ⇦ (ب/١ ز/٥٨ ل/٢١٩ ف/١)[٥٣].

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {فَإنْ خِفْتُمْ فَرِجَالاً أَوْ رُكْبَانًا فَإِذَا أَمِنتُمْ فَاذْكُرُواْ اللّهَ كَمَا عَلَّمَكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ تَعْلَمُونَ - ٢/٢٣٩}.

واتە: خودای گەورە دەفەرموێ: ئەگەر ترستان لێ پەیدا بوو، بەهۆی دوژمنو دڕندەو لافاوو شتی واوە، ئەوە هەر چۆنێکتان بۆ دەست دەدات نوێژەکانتان بکەن، بەپیادەیی بێ یا بە سواریی، بەرەو کابەی پیرۆز بێ یا پشتەو کابە، کاتێ لەوترسو بیمە هێمن بوونەوەو گەیشتنە حاڵی ئاسایی خۆتان ئەوسا نوێژەکانتان بکەن بەپێی یاسای ئایین وەك جاری جاران، یادو سوپاسی خودا بکەن لەسەر ئەوە کە فێری ئەم شتە جوانانەی کردوون کەلەمەوپێش نەتانزانیوە.

---

[٥٢] رواه الترمذي بسند صحيح.

[٥٣] تقدم في المجلد الأول. تسلسل / ٥٨ رقم: ١ / ٤٠٩.

٣٧٤٣- كَانَ ابْنَ عُمَرَ (رضى الله عنهما) إِذَا سُئِلَ عَنْ صَلاَةِ الْخَوْفِ قَالَ: يَتَقَدَّمُ الإِمَامُ وَطَائِفَةٌ مِنَ النَّاسِ فَيُصَلِّي بِهِمِ الإِمَامُ رَكْعَةً، وَتَكُونُ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ الْعَدُوِّ لَمْ يُصَلُّوا، فَإِذَا صَلَّى الَّذِينَ مَعَهُ رَكْعَةً اسْتَأْخَرُوا مَكَانَ الَّذِينَ لَمْ يُصَلُّوا وَلاَ يُسَلِّمُونَ، وَيَتَقَدَّمُ الَّذِينَ لَمْ يُصَلُّوا فَيُصَلُّونَ مَعَهُ رَكْعَةً، ثُمَّ يَنْصَرِفُ الإِمَامُ وَقَدْ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، فَيَقُومُ كُلُّ وَاحِدٍ مِنَ الطَّائِفَتَيْنِ فَيُصَلُّونَ لأَنْفُسِهِمْ رَكْعَةً بَعْدَ أَنْ يَنْصَرِفَ الإِمَامُ، فَيَكُونُ كُلُّ وَاحِدٍ مِنَ الطَّائِفَتَيْنِ قَدْ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، فَإِنْ كَانَ خَوْفٌ هُوَ أَشَدَّ مِنْ ذَلِكَ صَلُّوا رِجَالاً، قِيَامًا عَلَى أَقْدَامِهِمْ، أَوْ رُكْبَانًا مُسْتَقْبِلِي الْقِبْلَةِ أَوْ غَيْرَ مُسْتَقْبِلِيهَا. رواه البخاري[٥٤].

نافیع (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: جاران کەلەبارەی نوێژی ترسەوە لەعەبدوڵلای کوڕی عومەریان دەپرسی، دەیگوت: لەپێش دا پێشنوێژ پێش دەستەیی لەموسوڵمانان دەکەوێ، یەك ڕکات نوێژیان پێ دەکا، لەم کاتەدا دەستەیەکی تریان نوێژ ناکەن، بەڵکوو ئێشکی دەستەی یەکەم دەگرن و دەکەونە نێوانی ئەوان و نێوانی دوژمنەوە، جا هەرکاتێ دەستەی یەکەم لەپشتی پێشنوێژەوە ڕکاتێکیان تەواو کرد ئەوجا بەبێ ئەوەی کە سلاو بدەنەوە ئەوان لادەچن و دەچنە شوێنی ئەو دەستەیەی کە هێشتا دەستیان نەکردووە بەنوێژو لەشوێنی ئەوان دەست دەکەن بە ئێشك گرتن، ئەنجا دەستەی دووهەم دێن و ئەوانیش لەگەڵ پێشنوێژدا یەك ڕکات دەکەن، ئیتر پێشنوێژ بەتەنیا خۆی سلاو دەداتەوە، چونکە ئەو دوو ڕکاتی خۆی تەواو کردووە، جاکاتێ پێشنوێژ سلاوی نوێژی دایەوە، ئەوسا هەریەکێ لەو دوو دەستەیە هەڵ دەسنەوەو هەر کەسەی سەرو ڕکاتی تر بەتەنیا بۆ خۆیان دەکەن، ئیتر بەم شێوەیە هەردوو دەستەکە سەرو دوو ڕکات دەکەن، جا ئەگەر ترسەکە لەمەش زۆرتر بوو بەڕەنگێکی وا کەڕێگەی نوێژی لەسەر ئەم شێوەیەشی نەدەدا ئەوە بە پیادەیی بوو یا بەدەم ڕۆیشتنەوە بوو، یا

---

[٥٤] بخاري. تفسير: ٤٥٣٥.

بەسـواریی بـوو، بـەرەو کابـەی پـیرۆز بـوو یـا بـەرەو کابـە نـەبوو، لەسـەر هەرحاڵەتێ بێ نوێژەکەیان دەکەن (ب– ڕەزای خودای لەسەر بێ).

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {اللّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ لاَ تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلاَ نَوْمٌ لَّهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ مَن ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلاَّ بِإِذْنِهِ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلاَ يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِّنْ عِلْمِهِ إِلاَّ بِمَا شَاء وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَلاَ يَؤُودُهُ حِفْظُهُمَا وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ}.

⇨ (ب/٥ ز/٨٢ ل/٢٩٨ رقم: ٣٥٩٦/١ ف/١).

٣٧٤٤– عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قال: قَامَ فِينَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بِخَمْسِ كَلِمَاتٍ فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ لاَ يَنَامُ وَلاَ يَنْبَغِي لَهُ أَنْ يَنَامَ يَخْفِضُ الْقِسْطَ وَيَرْفَعُهُ، يُرْفَعُ إِلَيْهِ عَمَلُ اللَّيْلِ قَبْلَ عَمَلِ النَّهَارِ وَعَمَلُ النَّهَارِ قَبْلَ عَمَلِ اللَّيْلِ حِجَابُهُ النُّورُ لَوْ كَشَفَهُ لأَحْرَقَتْ سُبُحَاتُ وَجْهِهِ مَا انْتَهَى إِلَيْهِ بَصَرُهُ مِنْ خَلْقِهِ. رواه مسلم في الإيمان وابن ماجه:[55].

ئەبو مووسا (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵسایەوە ووتاری دا بۆمان، پێنج ووشەی پێمان فەرموو، فەرمووی: خودای گەورەو مەزن نانوێ‌و شایستەی زاتی ئەو نییە کە بنوێ، ئەو زاتە مەزنە ترا زووی دادو عەدلی بەدەستەوەیە، تاوتووی پێ دەکا، بەرزو نزمو سەرەو ژێرو سەرەو ژووری پێ دەکا، بەموو سەرناکا، کردەوەی شەوی بەندەگان بەرز دەکرێتەوە بۆلای، لەپاش نوێژی بەیانی بەر لە کردەوەی ڕۆژی دوایی، وەکردەوەی ڕۆژی بەندەگان بەرز دەکرێتەوە بۆلای لەپاش نوێژی عەصر بەر لەکردەوەی شەوی دوایی، ئەو پەردەیەی کەوا لەنێوانیئەوو بەندەگانیا، کە نایەڵێ بەندەگان خودا ببینن، ئەو پەردەیە لەنوورە، ئەگەر ئەو پەردەیە لابیا لەنێوانا یا ئەگەر ئەو نوورە دەربخا وەکوو بۆ مووساو کێوەکەی دەرخست ورشە ورش‌و تریفەو شەوقی ڕووی هەتا

---

[55] مسلم. لإيمان: ٤٤٤. ابن ماجه في المقدمة: ١٩٥ ، ١٩٦.

چاوی کار دەکا مەخلووقاتو دروستکراوانی خۆی دەسووتێنێ، واتە: خودا ئەگەر خۆی دەربخا بوونەوەر هیچی نامێنێ (م: ئیبنو ماجە).

٣٧٤٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قال: قال: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) نَحْنُ أَحَقُّ بِالشَّكِّ مِنْ إِبْرَاهِيمَ إِذْ قال: (رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِي الْمَوْتَى قال: أَوَلَمْ تُؤْمِنْ قال: بَلَى وَلَكِنْ لِيَطْمَئِنَّ قَلْبِي) رواه البخاري هنا ومسلم في الإيمان[٥٦].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: گریمان ئەگەر من لەفەڕزی مەحاڵ دا گومانو دوو دڵیم هەبێ لە زیندوو بوونەوەدا ئیبراهیم شتی وای نەبووە، بەڵام ئەو گوفتوگۆی ئیبراهیمە کە لەم ئایەتەدا باس کراوە تەنیا بۆ ئەوە بووە کە بەهۆی دیتن بەچاوی سەرەوە، تەواو دڵ ئەستوورو دڵنیابێ وەکوو چۆن ئێمە بە بیستن بۆمان دەرکەوتووە کەدەریای گەورە گەورە هەیە بەڵام کاتێ بەچاو ئەو دەریایانە دەبینین هەرچەند زانستو عیلمە کۆنەکەمان (کەلە ڕێگەی ژنەوتنەوە بووە هیچ پتر نابێ) بەڵام پتەوترو دامەزراو تر دەبێ، تەنانەت ئەگەر یەکێ لەوەدوا بڵێ دەریا ووجودی نییە ئێمە بڕوای پێ ناکەین. ئایەتی گوفتوگۆ کە ئەمەیە:

{رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِي الْمَوْتَى قال: أَوَلَمْ تُؤْمِن قال: بَلَى وَلَكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِي - ٢٦٠/٢.

واتە: ئیبراهیم فەرمووی: پەروەردگاری من! ئەی خودای خاوەنی من! ئەی خاوەنی هەردوو جیهان! نیشانم بدە ئەم خەڵکە کە دەمرنو ساڵەهای ساڵ دەبنەوە بەخاكو ئەندامەکانی لەشیان دەڕزێنو دەبن بە خۆڵو خاشاكو بای ڕۆژگار بە ئارەزووی خۆی شەنو کەویان دەکاو پەخشو پرشیان دەکا لە وڵاتا چۆن چۆنی تۆ لە قیامەتا زیندوویان دەکەیتەوەو بەچی شێوەیێ ئەو پارچە پەرتو بڵاوانە یەك دەخەیتەوە؟ خودا (لەوەڵامی ئیبراهیمدا) فەرمووی: ئەی ئیبراهیم! ئایا تۆ هێشتا باوەڕت نەهێناوە بەوە کە من دەتوانم

---

[٥٦] بخاري. تفسير: ٤٥٣٧ ، ٤٦٩٤ ، مسلم. إيمان: ٣٨٠ ، ٦٠٩٤.

مردوو زیندوو بکەمەوە؟ عەرزی کرد: با، بە خودا زۆر باش ئەوە دەزانم و باوەڕم هەیە بەوە، بەڵام دەمەوێ کە دڵم ئاو بخواتەوەو وەها دابمەزرێ کە ئیتر ڕێگەی سووسەی سووسەبای وەسواس و ڕارایی و دوو دڵی نەفس و دەروون لەدڵ و ناخی مندا نەمێنێ و ئەوەی بەدڵ باوەڕم پێ کردووە بەچاوی سەر بیبینم!! خودای مەزن بۆخۆی دەیزانی کە ئیبراهیم ئەمە دەزانێ، وەلێ بۆیە ئەم پرسیارەی لێ کرد تا بیسەران وەڵامەکەی ئیبراهیم ببیستن! (ب/م).

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ لَهُ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ لَهُ فِيهَا مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ وَأَصَابَهُ الْكِبَرُ وَلَهُ ذُرِّيَّةٌ ضُعَفَاء فَأَصَابَهَا إِعْصَارٌ فِيهِ نَارٌ فَاحْتَرَقَتْ كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللّهُ لَكُمُ الآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ - ٢/٢٦٦}.

واتە: خودای مەزن دەفەرموێ: ئەی موسوڵمانەکان! ئایا کێ لەئێوە حەز دەکا بەوە کە باخێکی باشی ببێ، پڕ بێ لەداری خورماو لەداری مێو، وەچەن جۆبار بەناویا بڕوا، لەهەمان کاتا پڕ بێ لەهەموو جۆرە دارێکی تری بەردار، وەك پرتەقاڵ و گوێزو قەزوان و مۆزو هەنجیرو سێوو هەرمێ و قۆخ و بەرو میوەی تر، ئەمەیش لەتەمەنێکدا بێ کە کابرا خۆی پیر بووبێ و لەبەر پیری پەکی کەوتبێ و ئیش و کاری تری بۆ نەکرێ و لەهەمان کاتا کۆشێ منالی ووردی زۆری بەسەردا کەوتبێ و جگە لەو باخەیش هۆیەکی تری نەبێ بۆ ژیان و گوزەرانی ئەو منداڵە وردانە جا لە ناکاوێکا، کوتوپڕ گێژەڵووکەیەکی پڕ لە ئاگر بدا لە باخەکەی و سەرتاپا بیسوتێنێ و شەراو گڕە بەرهەمی باخی ئاواتی ببا؟ دیارە کەستان حەز بەم کارەساتە سامناکە دڵتەزێنە ناکەن بگرە شێت و منالیش ئەمەی پێ خۆش نییە. دەی ئێوە وەرن بەراوەردی حاڵی خۆتان و کردەوە باشەکانتان و پێویستیی ئێوە بەو کردەوە باشانەو بێ دەستەڵاتی و دەستە وسانی خۆتان بەرابەر بەلافاوو هەرەسی مەرگ و مردن بکەن لەگەڵ حاڵی ئەم پیرەو باخەکەی و خێزانە وردەکەی و گەردەلوولەکەو پێداویستی خێزانەکەی و کەوتنە سواڵیان لەپاش ئەم کارەساتە، ئێوە لە قیامەتاو ئەوان لە جیهان دا دەی کام لاتان ڕەنجەڕۆترو

ماڵ ویرانترن؟! بزانن ئەگەر خەرمانی هیواتان بەگێژەڵووکەی ئاگرینی دیمەنکاری‌و ڕواڵتکاری ئاووری تێ بەربوو ئەوە سووچ سووچی خۆتانەو بەدەستی خۆتان ئاگرتان ناوە بەماڵی خۆتانەوەو پاشە ڕۆژی خۆتان سوتاندووە بزانن خودا کە بەم شێوە دڵگیرە پەندو ئامۆژگاریتان دەکاو دەتان لاوێنێتەوەو ئایەتەکانی خۆیتان بۆ ڕووناك دەکاتەوە بۆ ئەوەیە کە ئێوە لەشت ووردببنەوەو لەهەر شتێ شتێ فێر ببن‌و خاس‌و خراپی خۆتان بزانن!.

٣٧٤٦- قال: عُمَرُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) يَوْمًا لأَصْحَابِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فِيمَ تَرَوْنَ هَذِهِ الآيَةَ نَزَلَتْ (أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَنْ تَكُونَ لَهُ جَنَّةٌ) قَالُوا اللَّهُ أَعْلَمُ. فَغَضِبَ عُمَرُ فَقَالَ: قُولُوا نَعْلَمُ أَوْ لاَ نَعْلَمُ. فَقَالَ: ابْنُ عَبَّاسٍ فِي نَفْسِي مِنْهَا شَيْءٌ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ. قال: عُمَرُ يَا ابْنَ أَخِي قُلْ وَلاَ تَحْقِرْ نَفْسَكَ. قال: ابْنُ عَبَّاسٍ ضُرِبَتْ مَثَلاً لِعَمَلٍ. قال: عُمَرُ أَيُّ عَمَلٍ؟ قال: ابْنُ عَبَّاسٍ لِعَمَلٍ. قال: عُمَرُ لِرَجُلٍ غَنِيٍّ يَعْمَلُ بِطَاعَةِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، ثُمَّ بَعَثَ اللَّهُ لَهُ الشَّيْطَانَ فَعَمِلَ بِالْمَعَاصِي حَتَّى أَغْرَقَ أَعْمَالَهُ، رواه البخاري[٥٧].

ڕۆژێ عومەر (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: بەهاوڕێکانی پێغەمبەر (دروودی خودا لەخۆی‌و خۆشنوودی خودا لەهاوڕێیانی) گوتی پێیان: ئەم ئایەتە کەدەفەرموێ: {أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ لَهُ جَنَّةٌ}، بەباوەڕی ئێوە لە شانی کێدا هاتووەتە خوارەوە؟ گوتیان: خودا بۆ خۆی باشتری دەزانێ! عومەر تووڕە بوو و گوتی: بڵێن دەزانین یا نازانین. ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) کەلەوێ بوو گوتی: ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمان! لەدڵی مندا شتێ هەیە لەم بابەتەوە، گوتی: ئەی برازام! دەبیلێ‌و خۆت بە بچووك مەزانە بڵێیت من ڕادەی ئەوەم نییە کە قسە بکەم لەڕاڤەی ئایەت جا ئیبنو عەبباس گوتی: ئەم ئایەتە کراوە بە نموونەو وێنە بۆ کردەوەیێ. عومەر گوتی: بۆ کام کردەوە؟ ئەویش گوتی: بۆ کردەوەیێ! جا عومەر (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەم ئایەتە سەرگوروشتەو

---

[٥٧] بخاري. تفسير: ٤٥٣٨.

نموونەی پیاوێکی دەوڵەمەندە کەلە پێشا ڕەفت دەکا بە فەرمانەکانی خوداو زۆر کردەوەی باش دەکا، تا لە پاشا شەیتان دێتە سەری‌و لەخشتەی دەباو دەست دەداتە نافەرمانی خوداو تاوان کردن، ئیتر ئەوەندە خراپە دەکا کردەوە باشەکانی بەفیڕۆ دەدا وەك بەردی بن گۆم (ب).

٣٧٤٧- عَنِ الْبَرَاءِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قال: كُنَّا مَعْشَرَ الأَنْصَارِ أَصْحَابَ نَخْلٍ فَكَانَ الرَّجُلُ يَأْتِي مِنْ نَخْلِهِ عَلَى قَدْرِ كَثْرَتِهِ وَقِلَّتِهِ وَكَانَ الرَّجُلُ يَأْتِي بِالْقِنْوِ وَالْقِنْوَيْنِ فَيُعَلِّقُهُ بِالْمَسْجِدِ وَكَانَ أَهْلُ الصُّفَّةِ لَيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ فَكَانَ أَحَدُهُمْ إِذَا جَاعَ أَتَى الْقِنْوَ فَضَرَبَهُ بِعَصَاهُ فَيَسْقُطُ مِنَ الْبُسْرِ وَالتَّمْرِ فَيَأْكُلُ وَكَانَ نَاسٌ مِمَّنْ لاَ يَرْغَبُ فِي الْخَيْرِ يَأْتِي الرَّجُلُ بِالْقِنْوِ فِيهِ الشِّيصُ وَالْحَشَفُ وَبِالْقِنْوِ قَدِ انْكَسَرَ فَيُعَلِّقُهُ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَنْفِقُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّا أَخْرَجْنَا لَكُمْ مِنَ الأَرْضِ وَلاَ تَيَمَّمُوا الْخَبِيثَ مِنْهُ تُنْفِقُونَ وَلَسْتُمْ بِآخِذِيهِ إِلاَّ أَنْ تُغْمِضُوا فِيهِ) قَالَ: لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ أُهْدِيَ إِلَيْهِ مِثْلُ مَا أَعْطَى لَمْ يَأْخُذْهُ إِلاَّ عَلَى إِغْمَاضٍ وَحَيَاءٍ قال: فَكُنَّا بَعْدَ ذَلِكَ يَأْتِي أَحَدُنَا بِصَالِحِ مَا عِنْدَهُ. رواه الترمذي بسند صحيح[٥٨].

بەراء (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: جاران ئێمە (کە کۆمەڵی یاریدەدەرانین) باخە خورمای زۆرمان هەبوو، جاهەر پیاوێ (بەپێی کەم‌و زۆری دارەخورماکانی) هێشوویێ خورما یا دوو هێشووی دەهێنا، وەلە مزگەوتا هەڵی دەواسی، بۆ خواردنی خەڵکی مزگەوت، دانیشتوانی صوففەش (کە میوانخانەی هەژاران بوو) نان‌و مووچەو بەراتیان نەبوو، لەسەر خێری خێرەومەندان دەژیان، کە یەکێکیان برسی دەبوو دەچوو بۆلای ئەو هێشووەو بە داردەستەکەی دەیتەکاند، ئیتر خورمای کاڵ‌و خورمای تەڕ دەوەری‌و ئەوەی دەخوارد، بەڵام بازێ کەس کەزۆر حەزیان لەخێرکردن نەبوو دەچوون هێشوویەکی پووچەڵ‌و خراپیان دەهێنا، وە یا ئەو هێشوانەیان دەهێنا کەبەکاڵی‌و کرچی شکابوون‌و ئەوانەیان دەکرد بەخێرو لەمزگەوت هەڵیان

---

[٥٨] حديث صحيح.

دەواسین، جا خودای گەورە ئەم ئایەتەی لەم بابەتەوە ناردە خوارەوە کە دەفەرمویٚ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَنفِقُواْ مِن طَيِّبَاتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّا أَخْرَجْنَا لَكُم مِّنَ الأَرْضِ وَلاَ تَيَمَّمُواْ الْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ وَلَسْتُم بِآخِذِيهِ إِلاَّ أَن تُغْمِضُواْ فِيهِ – ٢٦٧/٢}.

واتە: ئەی کەسانیٚ کە باوەڕتان هێناوە بەخودا! باوەڕ بەخودا سەرچاوەی ڕووباری خێرو چاکەیەو قەدەغەکەرە لەهەموو خراپەییٚ، کەوابوو بەشێکی باش لەدەستکەوتی خۆتان سەرف بکەن لەخێرو خێراتدا، گرنگ ئەوەیە ئەوشتەی دەیکەن بەخێرو چاکە پاك‌و حەلاڵ بیٚ‌و پیس‌و خراپ‌و حەرام نەبیٚ، ئیتر خواه بەری کەسابەتی حەلاڵ بیٚ یا بەرو بوومی زەوی‌و زارو بەری گیاو داربیٚ، کەم بیٚ یا زۆربیٚ مادەم نیازتان پاك بیٚ‌و بە پێی تەوانا بیٚ قەیناکا، بەڵام هەرگیزاو هەرگیز نیازی ئەوەتان نەبیٚ کە بچن شتی پیس بکەن بە خێرو گوایە ئەوە لەڕێگەی خوادا خەرجی دەکەن! باشە ئەگەر کەسیٚ لەوشتە پیسە بدا بە ئێوە، ئێوە وەری دەگرن؟ نەخەیر، مەگەر بە نابەدڵی‌و چاوی لیٚ بقونجێنن، کەوابوو خۆتان چۆن ئەوە دەکەن! حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بیٚ) فەرمووی: ئەگەر ئەوەی بازیٚ کەستان دەیدەن بەخەڵك ئەوە یەکێکی تر بە خێر بیدا بە خۆی لەبەر خراپی وەری ناگریٚ، مەگەر لەڕوو دابمێنیٚ‌و شەرم بکا. بەراء گوتی: ئیتر لەپاش ئەمە کامەی باش بوو ئەوەمان دەکرد بەخێرو دەمان برد (ت – س/ص).

٣٧٤٨– عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عن النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَال: إِنَّ لِلشَّيْطَانِ لَمَّةً بِابْنِ آدَمَ وَلِلْمَلَكِ لَمَّةً فَأَمَّا لَمَّةُ الشَّيْطَانِ فَإِيعَادٌ بِالشَّرِّ وَتَكْذِيبٌ بِالْحَقِّ وَأَمَّا لَمَّةُ الْمَلَكِ فَإِيعَادٌ بِالْخَيْرِ وَتَصْدِيقٌ بِالْحَقِّ فَمَنْ وَجَدَ ذَلِكَ فَلْيَعْلَمْ أَنَّهُ مِنَ اللَّهِ فَلْيَحْمَدِ اللَّهَ وَمَنْ وَجَدَ الأُخْرَى فَلْيَتَعَوَّذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ثُمَّ قَرَأَ (الشَّيْطَانُ يَعِدُكُمُ الْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِالْفَحْشَاء وَاللّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلاً وَاللّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ). رواه الترمذي بسند حسن[٥٩].

---

[٥٩] حديث حسن.

**عەبدوڵلا** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: شەیتان ختەختەی ئادەمیزاد دەدات و خوتوورەو خەیاڵاتی خراپ دەخاتە ناو دڵیەوە، هەروەها فریشتەش ختەختەی دەدات و شتی خێر دەخاتە ناو دڵیەوە، جا ختە ختەو خوتورەکەی شەیتان ئەمەیە کەشتی خراپ دەهاوێتە ناو دڵی و گاڵی دەدا کە باوەڕ بەشتی هەق نەکا وەبەشتی درۆو دەلەسەو هیچ و پوچ و بە گفت و بەڵێنی درۆ دەستە شکێنی دەکا، ختەختەی فریشتەش ئەمەیە کەشتی باش دەهاوێتە ناو دڵی و هانە هانەی دەدات کە باوەڕ بەشتی باش و ڕاست و دروست بکا، جا هەر کەسێ شتی باش کەوتە ناو دڵیەوەو خەتەرەی خێر هات بەدڵیا با بزانێ کە ئەوە لەلایەنی خوداوەیە، با سوپاس و ستایشی خودای لەسەر بکا، وە هەرکەسێ خەیاڵاتی خراپی کەوتە ناو دڵەوە بابڵێ: (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم): پەنا دەگرم بەپەنای خودا لەشەڕو زیانی شەیتانی دوور لە ڕەحمەتی خودا جا بۆ پشتیوانی ئەم فەرموودەیە حەزرەت** (درودی خودای لەسەر بێ) **خوێندیەوە:**

**{الشَّيْطَانُ يَعِدُكُمُ الْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِالْفَحْشَاء وَاللّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلاً وَاللّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ -٢/٢٦٨}.**

**واتە: دیارە کەئێوە شتی خراپ خەرج دەکەن یا هەر لەبنەڕەتەوە هیچ خێرو چاکە ناکەن، ئەمەش لەبەر ئەوەیە بەگوێی شەیتان دەکەن کەوادەی گەداییتنا پێ دەداو پێتان دەڵێ: ماڵی خۆتان بەخۆڕایی بۆ دەدەن بەم و بەو، بۆ بیری لە سوودی خۆتان ناکەنەوە، لەهەژاری بترس، کۆیکەنەوە بۆ ڕۆژی خۆی، پوولی سپی بۆ ڕۆژی ڕەش، بەڵام دوژمن کەی ئامۆژگاری دەکا؟! وەلێ خودای گەورە بەڵێنتان دەداتێ کەلەسەر بەخت کردنی ماڵ لەڕێگەی خودادا لێتان خۆش دەبێ و زیاتر دەوڵەمەندو داراتان دەکا، چونکە بەڕاستی خودای گەورە کەرەمی زۆرەو بەهرەی گەورەو بەشی چاکی لەلایە، وەلە هەموو شت ئاگادارەو دەزانێ چۆن تۆڵەتان بۆ دەکاتەوە (ت – س/ح).**

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {إِن تُبْدُواْ الصَّدَقَاتِ فَنِعِمَّا هِيَ وَإِن تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا الْفُقَرَاء فَهُوَ خَيْرٌ لُّكُمْ وَيُكَفِّرُ عَنكُم مِّن سَيِّئَاتِكُمْ وَاللّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ – ٢٧١/٢}.

واتە: ئەگەر ئەو خێرو سەدەقەیە دەیکەن دەری بخەن و بە ئاشکرا بیدەن بە داماوان، ئەوە باشە وەئەگەر بیشارنەوەو بەنهێنی بیدەن بە هەژاران ئەوە زۆر باشترەو دەبێ بەهۆی داپۆشینی تاوان بۆتان، بەهەر حاڵ خودا ئاگادارە بەحاڵی ئێوە، خواە کردەوەتان، خواە نیازی دڵتان.

٣٧٤٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لَمَّا خَلَقَ اللَّهُ الأَرْضَ جَعَلَتْ تَمِيدُ فَخَلَقَ الْجِبَالَ فَعَادَ بِهَا عَلَيْهَا فَاسْتَقَرَّتْ فَعَجِبَتِ الْمَلاَئِكَةُ مِنْ شِدَّةِ الْجِبَالِ قَالُوا يَا رَبِّ هَلْ مِنْ خَلْقِكَ شَيْءٌ أَشَدُّ مِنَ الْجِبَالِ؟ قَالَ: نَعَمِ الْحَدِيدُ. قَالُوا يَا رَبِّ فَهَلْ مِنْ خَلْقِكَ شَيْءٌ أَشَدُّ مِنَ الْحَدِيدِ؟ قَالَ: نَعَمِ النَّارُ. فَقَالُوا يَا رَبِّ فَهَلْ مِنْ خَلْقِكَ شَيْءٌ أَشَدُّ مِنَ النَّارِ؟ قَالَ: نَعَمِ الْمَاءُ. قَالُوا يَا رَبِّ فَهَلْ مِنْ خَلْقِكَ شَيْءٌ أَشَدُّ مِنَ الْمَاءِ؟ قَالَ: نَعَمْ الرِّيحُ قَالُوا يَا رَبِّ فَهَلْ مِنْ خَلْقِكَ شَيْءٌ أَشَدُّ مِنَ الرِّيحِ؟ قَالَ: نَعَمِ ابْنُ آدَمَ تَصَدَّقَ بِصَدَقَةٍ بِيَمِينِهِ يُخْفِيهَا مِنْ شِمَالِهِ. رواه الترمذي في آخر التفسير[٦٠].

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: کاتێ کەخودا زەوی دروست کرد، دەستی کرد بە جموجووڵ و لەرینەوەو لەرەلەر کردن، ئیتر خودا چیاکانی دروست کردو داینان لەسەری، ئەوجا زەوی دامرکا، فریشتەکان سەیریان هات لەزەبرو شیددەتی چیاکان، گوتیان: ئەی خودایە! ئایا لەناو دروست کراوانی تۆدا هیچ شتێ هەیە لەچیا بەزەبر تربێ؟ فەرمووی: ئا، ئاسن لەچیاش بەزەبر ترە، گوتیان: ئەی پەروەردگارم! ئایا لەناو دروست کراوانی تۆدا هیچ شتێ هەیە کەلە ئاسن بەزەبرتر بێ؟ فەرمووی: بەڵێ ئاگر، گوتیان: ئەی پەروەردگارم! ئایا لە ناو دروستکراوانی تۆدا هیچ شتێ هەیە کەلەئاگر بە شیددەت تربێ؟ فەرمووی: ئا، ئاو، گوتیان: ئەی پەروەردگارم! ئایا لەناو دروستکراوانی تۆدا هیچ شتێ هەیە کەلەئاو

---

[٦٠] سكت عن درجته الشارح.

بەزەبرتر بێ؟ فەرمووی: بەڵێ با، گوتیان: ئەی پەروەردگارم! ئایا لەناو دروستکراوانی تۆدا هیچ شتێ هەیە کەلە با بە زەبرتر بێ؟ فەرمووی: بەڵێ، ئەو ئادەمیزادەی کە خێرێ دەکا بە دەستی ڕاستی وە نایەڵێ کە دەستی چەپی پێی بزانێ! (ت).

گەر مەبەس لەخێر ڕەزای خودایە

جوونەوەی ڕەوشێ زۆر بێ ڕەزایە!!

خوا خۆی لەڕازی دڵ بە ئاگایە

خەڵاتی گەورەی بۆ خودا خوایە!

ڕیاو ڕووالەت ئاگری بن کایە

خەرمانی هیوات دەدا بەبایە

چەن دڵ تەزێنە هەوارێ خالّی

لەگۆڕا کاتێ کە تۆ نۆ ماڵێ

بەتەمای چاکەی چەکی دەستت بێ

بەدیهێنەری گشت مەبەستت بێ!

کەچی خەرمانی هیوات سووتا بێ

گڕەی ڕەشەبای چاوەی لێ دابێ

٣٧٥٠- عن أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) يقول: قال: النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لَيْسَ الْمِسْكِينُ الَّذِى تَرُدُّهُ التَّمْرَةُ وَالتَّمْرَتَانِ وَلاَ اللُّقْمَةُ وَلاَ اللُّقْمَتَانِ. إِنَّمَا الْمِسْكِينُ الَّذِى يَتَعَفَّفُ وَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ يَعْنِي قَوْلَهُ (لاَ يَسْأَلُونَ النَّاسَ إِلْحَافًا). رواه البخاري[٦١].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: هەژاری بەڕاستی ئەو کەسە نییە کەلەم دەرگاو لەو دەرگا دەستی

(٦١) بخاري. تفسير سورة البقرة: ٤٥٣٩.

پێوە دەنێن و بەدەنکێ یا دوو دەنك خورما، یاخود بە پاروویێ یا دوو پاروو بەرێی دەکەن و دەستی پێوە دەنێن چونکە ڕێی تێ دەچێ کەئەم دەرووزەکەرانە زۆریان دەوڵەمەند بن و خوویان بە سواڵەوە گرتبێ بەڵام هەژار ئەو کەسەیە کە خۆی بەدوور دەگرێ لە ڕیسوایی سواڵ و بێزی نایە کە سواڵ بکا پیاوی حاڵ نەزانیش وادەزانێ کەئەوە لەبەر دەوڵەمەندییەتی جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەگەر حەزیش دەکەن ئەم ئایەتە بخوێننەوە کە دەفەرموێ:

{لاَ يَسْأَلُونَ النَّاسَ إِلْحَافًا -٢/٢٧٣}.

واتە: بە تووتڕکی داوای بەش لەخەڵك ناکەن (ب) ⇦ (ب/٢ ز/١٨ ل/٤٢ ف/٣ رقم: ١٢٤٦/٣ + ز/٢٠ ئایەتی یەکەم).

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {يَمْحَقُ اللّهُ الْرِّبَا وَيُرْبِي الصَّدَقَاتِ وَاللّهُ لاَ يُحِبُّ كُلَّ كَفَّارٍ أَثِيمٍ} (٢٧٦/٢) ⇦ (ب/٢ ز/١٥٤ ل/٣٢٥).

٣٧٥١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنها) قالت: لَمَّا نَزَلَتِ الآيَاتُ مِنْ آخِرِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ فِي الرِّبَا قَرَأَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عَلَى النَّاسِ، ثُمَّ حَرَّمَ التِّجَارَةَ فِي الْخَمْرِ. رواه البخاري[٦٢].

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: کە ئایەتەکانی کۆتایی سوورەتی بەقەرە هاتنە خوارەوە، کەلەبابەتی سوودەوەن، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خوێندنیەوە بۆ مەردوم، ئیتر بازرگانی و سەودای مەی و ئارەقی حەرامکرد (ب).

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَاتَّقُواْ يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللّهِ ثُمَّ تُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ - ٢/٢٨١}.

واتە: خۆتان بپارێزن لەئێش و ئازاری ڕۆژێ کەلەو ڕۆژەدا دەبرێنەوە بۆلای خوداو بەبێ دەستەڵاتی دەچنەوە بەر دیوانی خوداو دەستان بەکەسدا

---

[٦٢] بخاري. تفسير سورة البقرة: ٤٥٤٠ ، ٤٥٤١.

ناگاو کەس بە کەڵکتان نایێ، کردەوەی باشی خۆتان نەبێ، وەهەموو کەسێ پاداشی کردەوەی خۆی بە تەواوی وەردەگرێ، بە قەی نووکی دەرزیێ زۆرو ستەم لەکەس ناکرێ.

**٣٧٥٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قال: آخِرُ آيَةٍ نَزَلَتْ عَلَى النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) آيَةُ الرِّبَا. رواه البخاري[٦٢].**

**ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) دەڵێ: دواهەمین ئایەت کەهاتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئایەتی سوود بوو واتە: ئایەتی: {يَمْحَقُ اللَّهُ الرِّبَا وَيُرْبِي الصَّدَقَاتِ...}، بەڵام تەبەری لە ئیبنو عەبباسەوە گوتەیەکی تر دەگێڕێتەوە دەڵێ: دواهەمین ئایەتی قورئان کەهاتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئایەتی: {وَاتَّقُواْ يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللَّهِ....} بوو (ب).**

**٣٧٥٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قال: لَمَّا نَزَلَتْ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) (لِلَّهِ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ وَإِنْ تُبْدُوا مَا فِي أَنْفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُمْ بِهِ اللَّهُ فَيَغْفِرُ لِمَنْ يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) اشْتَدَّ ذَلِكَ عَلَى أَصْحَابِ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) فَأَتَوْهُ ثُمَّ بَرَكُوا عَلَى الرُّكَبِ فَقَالُوا أَىْ رَسُولَ اللَّهِ كُلِّفْنَا مِنَ الأَعْمَالِ مَا نُطِيقُ الصَّلاَةُ وَالصِّيَامُ وَالْجِهَادُ وَالصَّدَقَةُ وَقَدْ أُنْزِلَتْ عَلَيْكَ هَذِهِ الآيَةُ وَلاَ نُطِيقُهَا. فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) أَتُرِيدُونَ أَنْ تَقُولُوا كَمَا قَالَ: أَهْلُ الْكِتَابَيْنِ مِنْ قَبْلِكُمْ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا بَلْ قُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ. قالها مرّتين فَلَمَّا اقْتَرَأَهَا الْقَوْمُ ذَلَّتْ بِهَا أَلْسِنَتُهُمْ أَنْزَلَ اللَّهُ فِي إِثْرِهَا (آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّهِ وَمَلاَئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْ رُسُلِهِ وَقَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ) فَلَمَّا فَعَلُوا ذَلِكَ نَسَخَهَا اللَّهُ تَعَالَى فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ (لاَ يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لاَ تُؤَاخِذْنَا إِنْ نَسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا) قال: نَعَمْ (رَبَّنَا وَلاَ تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِنَا) قال: نَعَمْ (رَبَّنَا وَلاَ تُحَمِّلْنَا مَا لاَ طَاقَةَ لَنَا بِهِ) قال: نَعَمْ (وَاعْفُ عَنَّا**

---

[٦٢] بخاري. تفسير: ٤٥٤٤.

وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا أَنْتَ مَوْلاَنَا فَانْصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ) قال: نَعَمْ. رواه مسلم في الإيمان والبخاري والترمذي هنا والله أعلم[٦٤].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) گوتی: کەئەم ئایەتە هاتە خوارەوە:

{لِّلَّهِ ما فِي السَّمَاواتِ وَمَا فِي الأَرْضِ وَإِن تُبْدُواْ مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ اللّهُ فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَاء وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاء وَاللّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ – ٢٨٤}.

واتە: هەرچی وا لە ئاسمانو زەوی دا هەمووی هی خودایەو موڵكو دروستكراوی خۆیەتی، وەهەرچی وا لە ناو دڵو دەروونتانا، چ ئاشكرای بكەنو چ بیشارنەوە خودا لە ڕۆژی قیامەتدا موحاسەبەی ئەوەتان دەكاو پێتانی دەور دەكاتەوە، ئەوسا بە ئارەزووی خۆیەتی هەركەسێ خواستی لەسەر بێ چاوپۆشی لێ دەكا، هەركەسێ خواستی لەسەر بێ ئەشكەنجەی دەدا چونكە خودا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێكا دەشكێ. گوتی: كەئەمە هاتە خوارەوە یارانی پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر خۆیو ڕەزای خودا لەیارانی بێ) تەواو سەخڵەت بوون، چوون بۆ خزمەتیو بەچۆك داهاتنو عەرزیان كرد: ئەی ڕەوانەكراوی خودا! هەتا ئێستا خودای گەورە ئەم ئەركانەی داوە بەسەرماناو ئەم كردارانەی كردووە بەئەركی سەرشانمان، وەك نوێژو ڕۆژووو خەباتو زەكات وە بۆ ئەمانە سەرمان پێوە نەبووە، چونكە تەوانای ئەوەمان هەبوو وە لەووزەمانا هەبوو، بەڵام ئەوەتانێ ئەم ئایەتەت بۆ هاتووە، بەڕاستی تەوانای ئەمەمان نییە! ئەویش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: هەی هەی!! وادیارە ئێوەش دەتانەوێ كەوەك میللەتی ئەو دوونامەیە كەلەپێش ئێوەوە بوون، كە تەوراتو ئینجیلن، وەك ئەوان بڵێن:

{سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا – ٢/٩٣}.

واتە: كەچی ئەوان لەپاش فەرمانەكەی خودا گوتیان: خودایە! فەرمانەكەتمان وەرگرتو بەگوێی خۆمان گوێمان لێ بوو، بەڵام نافەرمانیت

---

[٦٤] بخاري. تفسير: ٤٥٤٥ ، ٤٥٤٦. مسلم. إيمان: ٣٢٥. ترمذي. تفسير: ٢٩٩٢.

دەکەین و گوێی پێ نادەین، واتە بەکوردی و کورتی: گوێم لێتە بەڵام بەگوێت ناکەم حەزرەت فەرمووی: نەکەن شتێ وابکەن، بەڵکوو بڵێن:

{سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ -٢/٢٨٥}.

واتە: ئیمان و باوەڕی هەیە پێغەمبەری خۆشەویست، بەو نامەیە کە پەروەردگاری لەلایەنی خۆیەوە بۆی ناردووە، کە قورئانی پیرۆزە، هەورەها موسوڵمانەکانیش باوەڕو ئیمانیان پێی هەیە، هەموویان باوەڕیان هێناوە بەخوداو بەفریشتەکانی و بە نامەکانی و بە پێغەمبەرەکانی، کە خۆی ناردوونی بۆ تەمێ و ئامۆژگاری هۆشیاران، گشتیان دەڵێن: ئێمە جیاوازی ناکەین لەنێوانی هیچ یەکێ لە پێغەمبەرەکانی خودادا لەوەدا کە یەك بەیەك بە پێغەمبەری خودایان دەزانین، هەم دەڵێن: ئەی خودای پەروەردگار! فەرمانەکانی تۆمان بیست، بەهۆی پێغەمبەرمانەوە، گەردن کەچ بووین بۆ ئەو فەرمانانەو داوای ئەوە ئەکەین لە تۆ کە بەکەرەمی خۆت چاوپۆشی بکەی لە تاوانەکانمان، ئەگەر داوای چاوپۆشی لەتۆنەکەین ئەی لەکێی بکەین! لەپاشە ڕۆژدا لە قیامەتدا مەصیرو سەرئەنجاممان هەر بۆ لای تۆیەو بە بێ دەستەلاتی و بەدەستەوسانی، دەوڵەمەندو گەدامان دێینەوە بەردەستی خۆت. جا کە ئەمەیان بەجێ هێنا خودا حوکمی ئەو ئایەتەی لابردو ئەم ئایەتەی تری ناردە خوارەوە کە دەفەرموێ:

{لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لاَ تُؤَاخِذْنَا إِن نَّسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا رَبَّنَا وَلاَ تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلاَ تُحَمِّلْنَا مَا لاَ طَاقَةَ لَنَا بِهِ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَآ أَنتَ مَوْلاَنَا فَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ - ٢/٢٨٦}.

واتە: خودا ئەرکێکی وا نادا بەسەرشانی کەسێکا کەشانی هەڵی نەگرێ و داوایێ لەیەکێ ناکا کە لەتاقەتیا نەبێ، ئەوەی چاکە بکا دەبێ بە چەکی دەستی و سوودی چاکەکەی هەر بۆ خۆیەتی، هەروا ئەوەی خراپە بکا دەبێ بە ملۆزمی گیانی و زیانی خراپەکەی هەر بۆ خۆیەتی ئەی

موسوڵمانینە! ئێوەش وەك یاران بکەن و کردارو گفتاری ئەوان بکەن بەسەر مەشق و پەیڕەو بۆ خۆتان، ئەو نزاو پاڕانەوەی ئەوان کردیان ئێوەش بیکەن، ئەوان کەئەرکی لە ووزە بەدەر (تەکلیفی مالا یوطاق)یان لەسەر هەڵگیرا، لەسوپاسی خودا دا لەسەر پاڕانەوەکەی خۆیان ڕۆیشتن و گوتیان: ئەی خودایە! ئەگەر هەنێ لەئەرکی سەرشانی خۆمان لەبیرچوو، یا بەهەڵە کردمان تۆ لێمان مەگرەو لەسەر ئەوە سزاو ئازارمان مەدە ئەی پەروەردگاری ئێمە! باری قورس مەهاوێرە سەرشانمان وەکوو خۆ کوشتن بۆ گیرابوونی پەشیمانی و بڕینی پارچە بەرگێ کەپیس بووبێ، وەك ئەم بارە قورسەت دابوو بەسەر شانی گەلی جوولەکەدا کەلەپێش ئێمە بوون، ئەی پەروەردگاری ئێمە! دەردو بەڵاو ئاژاوەو ئاشووبێکی وامان بەسەردا مەدە کەلە بارمانا نەبێ، شوێنەواری تاوان و گوناهەکانمان کوێر کەرەوەو ئازارمان مەدە، وە عەیب و نەنگەکانمان بپۆشەو کردەوەی باشمان دەربخە، وە بە لوتف و کەرەمی خۆت ڕەحممان پێ بکەو نازو بەهرەو ڕەحمەت بڕێژە بەسەرمان دا هەر تۆی سەرداری ئێمەو جگە لە تۆ پشت و پەنای ترمان نییە سەرەڕای ئەمانەیش یارمەتیمان بدە بۆ خەبات و تێکۆشان و زاڵمان بکە بەسەر کۆمەڵەی کافرو بێ بڕواکانا یاران کاتێ ئەم دووعایانەیان دەکرد خودای گەورەو مەزن لەم چوار شوێنەدا دەیفەرموو: بەڵێ باشە دووعاکەتان قەبووڵ دەکەم.

یەکەم لەپاش ووشەی: (إِن نَّسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا).

دووەم: لەپاش ووشەی: (عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِنَا).

سێیەم: لەپاش ووشەی: (مَا لاَ طَاقَةَ لَنَا بِهِ).

چوارەم: لەپاش ووشەی: (فَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ) (م/ب/ت).

**ســـــوورەی بەقـــــەرە چـــرای مەحـــــشەرە**

**شـــــوورەی مەحکـــــەمی دەوری ســـــەقەرە**

بـــۆ خـــاوەنی خـــۆی ســـەر پـــارێزەرە

تریـــاقی ســـیحری گـــشت جـــادوو گـــەرە!

لەبـــەر کردنـــی کلیلـــی گەنجـــە

زایـــەکردنی جێـــی داخو ڕەنجـــە

شـــەیتان پـــارێزە لـــە ماڵـــێ کـــەوا

ســـوورەی بەقـــەرەی خێنـــرا لـــەناوا!!

سەر ڕای گـشت شتێ پریاسـکەی میسکە

شـــەوقی بـــۆ دڵو دەروون تریـــسکە!

بیکـــە بـــەگوڵو چـــاوو دڵ بـــە هـــەنگ

بمـــژە هـــەڵاڵو هـــەنگوینی بـــێ نـــەنگ!

جـا سـەیری ڕووت کـە چـۆن دەبـێ بـەمانگ

فەرمانـــەدەدا بـــە ئـــاوازەی بـــانگ

جـا سـەیری ڕووت کـە چـۆن دەبـێ بـەخۆر

پەلکـە ڕەنگینـەی وورشـەی لەحـەو جـۆر!!

بـــرا، لـــەم دنیـــا کـــردم بـــەراوورد

خۆشـــیو ناخۆشـــی، لـــە درشـــتو وورد

زوربـــەی دوور کـــوژەو نزیـــک خنکێنـــە

ناخۆشـــی بەخـــشەو خۆشـــی پـــسێنە!

ئـــەوەی بـــەفراوی کەللـــە تەزێنـــە

بـــۆ پنـــری دڵ وەکـــوو هەوێنـــە:

حـــوببی خودایـــە، بـــە ڕۆح بیـــسێنە

بەســـــەرو بـــــەماڵ بەدەســـــتی بێنــــە !

لەگـــــــەڵ خـــــودادا دڵ دابهێنــــــە

دنیـــاش جـــار جـــارە بـــەدەم بدوێنــــە !!

بەســــەر براتـــــا قـــــەت خـــۆ مەنوێنــــە

بـــۆ یـــــەکتر ببنــــە وێنــــەو ناوێنــــە

ســـــوورەی بەقــــــەرە بـــــەدڵ بخوێنــــە

ســـــیدری حــــــەڵاڵی بەنـــــدە لاوێنــــە

## ٤) سوورەتی ئالی عیمران

**(بەناوی یەزدانی بەخشندەی میهرەبان سورة آل عمران)**

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {هُوَ الَّذِيَ أَنزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُّحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ فَأَمَّا الَّذِينَ في قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاء الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاء تَأْوِيلِهِ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلاَّ اللّهُ وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلاَّ أُوْلُواْ الأَلْبَابِ - ٣/٧}.

واتە: خودا ئەو خودایەتە کە ناردوویەتە خوارەوە بۆ سەر دڵی تۆ قورئانی پیرۆز کە نامەی نووسراوی خودایە، هەندێ لە ئایەتەکانی واتاو مانایان دیارەو ووشەکانی دیاریو ناسراون، لەبەر ئەوە ئەم جۆرە ئایەتانە دادەنرێن بە سەرچاوەو دایکانە لەناو قورئانەکەدا، وە ئایەتەکانی تر لەبەر ڕووناکی ئەوانو لەسەر خەتو هێڵی ڕەنگرێژی ئەوان واتایان دەردەکەوێ، وە هەندێ تر لە ئایەتەکانی چەن واتایێ هەڵ دەگرنو فامی واتایان پێویستی هەیە بە لێکۆڵینەوەیەکی وورد، جا ئەو کەسانە کە دڵیان پڕە لە مەیلی ڕێی چەوتو لەڕێی ڕاست لادەدەنو هەمیشە منەیی کوێرەڕێو لاڕێ دەکەنو لەشارێ دەردەچن ئەوە ئەو بەدبەختانە دەکەونە شوێنی ئەم

ئایەتانە کەچەن واتایێ هەڵ دەگرن‌و هەوڵ نادەن کەلە بەر ڕووناکی ئایەتە موحکەمەکان واتای ئایەتە موتەشابیهەکان لێ بدەنەوە ئەمەش کەدەکەن بە نامەردی دەیکەن‌و لەبەر ئەوەیە کەحەز دەکەن کە بەگومان‌و خەیاڵاتی هیچ‌و پووچ موسوڵمانان لەڕێ دەربکەن‌و تووشی پشێویی ئایینی یان بکەن، هەروەك دەیانەوێ لەسەر هەوای نەفس‌و ئارەزووی دەروونی خۆیان تەئویلیان بکەن، وەلحاڵ تەئویلی ڕاستی ئەو ئایەتە موتەشابیهە چەن واتایانە بەس خودا بەباشی دەیزانێ لەگەڵ زانا بەرزەکانا کە پایەیەکی دامەزراویان هەیە لەعیلم‌و زانستا. دەڵێن: ئیمان‌و باوەڕمان هەیە بەم موتەشابیهانە لەسەر ئەو تەرزە کە خودا قەصدی کردوون، خودا دەفەرموێ: ئەمانە خاوەن بیرو هۆشی ساغن بۆیە وەها بەجوانی تەصەووری حەقیقەت دەکەن.

٣٧٥٤- قالت: عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنها) تَلاَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) هَـٰذِهِ الآيَـةَ (هُوَ الَّذِى أَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ فَأَمَّا الَّذِينَ فِى قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاءَ تَأْوِيلِهِ) إِلَى قَوْلِـهِ (أُولُـو الأَلْبَابِ) قالت: ثُمَّ قال: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَإِذَا رَأَيْتَ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ، فَأُولَئِكَ الَّذِينَ سَمَّى اللَّهُ، فَاحْذَرُوهُمْ [1].

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئەم ئایەتەی خوێندەوەو لە پاشا فەرمووی: کاتێ ئەو کەسانەت دی کە شوێنی ئەو ئایەتانە دەکەون کەچەن واتایێ هەڵ دەگرن‌و پێیان دەگوترێ: ئایەتە موتەشابیهەکان‌و ڕواڵەتی ئەو ئایەتانە دەکەن بە بیانووو بەهانەو چاوڕاوی لەمەردوم پێ دەکەن‌و خەڵکی پێ لەخشتە دەبەن، ئەی گوێدار! بزانە کەئەوانە ئەو کەسانەن کەخودا ناوی بردوون‌و دەربارەیان لە قورئانا فەرموویەتی: {فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاء الْفِتْنَـةِ} دڵ

---

[1] بخاري. تفسير: ٤٥٤٧. مسلم. علم: ٦٧١٧. أبوداود. سنة: ٤٥٩٨. ترمذي. تفسير القرآن: ٢٩٩٣ ، ٢٩٩٤.

دەغەزارەکان لە دووی ئایەتە چەن واتا هەڵگرەکان دەگەڕێن، بەنیازی ئەوەی کەئاژاوە بەرپابکەن حەزرەت فەرمووی: جا کەواتە ئەی گەلی ئیسلام! خۆتانیان لێ بپارێزن و مەترسیتان لێیان هەبێ (ش/د/ت- (خودای لێ ڕازی بێ)).

٣٧٥٥- وَسَمِعَ النَّبِيٍّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) رَجُلَيْنِ اخْتَلَفَا فِي آيَةٍ فَعُرِفَ فِي وَجْهِهِ الْغَضَبُ وَقال: إِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ بِاخْتِلاَفِهِمْ فِي الْكِتَابِ. رواه مسلم في الإيمان[٢].

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جارێ بەر گوێی کەوت، دوو پیاو ناکۆکییان بوو لەسەر واتای ئایەتێ، تووڕەیی بەڕووی پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دیاربوو، فەرمووی: میللەتەکانی پێش ئێوە بۆیە لەناو چوون و فەوتان چونکە لە سەرنامەی خۆیان دەبوو بە ناکۆکییان و دوو بەرەکییان تێ دەکەوت! (م).

٣٧٥٦- عن ابن عبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إسم الله الأعظم الَّذي إذا دعيَ به أجاب في هذه الآية: {قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَن تَشَاء وَتَنزِعُ الْمُلْكَ مِمَّن تَشَاء وَتُعِزُّ مَن تَشَاء وَتُذِلُّ مَن تَشَاء بِيَدِكَ الْخَيْرُ إِنَّكَ عَلَىَ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ}. رواه الطبراني[٣].

لێرەدا دەڵێ: لە ئیبنو عەبباسەوە (خودایان لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەر بێ): ئەو ناوە هەرە گەورەیەی خودا کە حاڵی وایە هەرکاتێ یەکێ بەو ناوەی هاواری لێ بکا دێ بە دەنگیەوەو مرازەکەیی دەداتێ، ئەو ناوە پیرۆزەیە لەم ئایەتە دایە:

{قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَن تَشَاء وَتَنزِعُ الْمُلْكَ مِمَّن تَشَاء وَتُعِزُّ مَن تَشَاء وَتُذِلُّ مَن تَشَاء بِيَدِكَ الْخَيْرُ إِنَّكَ عَلَىَ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ}. (تەبەرانی).

---

[٢] مسلم. علم: ٦٧١٨.

[٣] سكت عن درجته الشارح.

٣٧٥٧- ⇦ (ب/٤ ز/١١٧ ل/٣٨٥ ف/٣)[٤].

٣٧٥٨- وَعَنْهُ أي (عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ) (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عن النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: كُلُّ بَنِي آدَمَ يَطْعُنُ الشَّيْطَانُ فِي جَنْبَيْهِ بِإِصْبَعِهِ حِينَ يُولَدُ، غَيْرَ عِيسَى بْنِ مَرْيَمَ، ذَهَبَ يَطْعُنُ فَطَعَنَ فِي الْحِجَابِ. رواه البخاري في بدء الخلق[٥].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) لەحەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەر بێ): هەموو ئادەمیزادێ (لەکاتی لەدایکبوونی دا) شەیتان بەسەرە پەنجەی دەژەنێ بەهەردوو تەنشتی دا، تەنیا عیسای کوڕی مەریەم نەبێ، شەیتان چوو کەتێی سرەوێنێ، بەڵام بۆینەکراو لەجیاتی بسرەوێنەتە عیسا خۆی، سرەواندیە کیسەکەی! (ب).

٣٧٥٩- ⇦ (ب/٥ ز/٩ ل/٦٥ ف/٦)[٦].

٣٧٦٠- عن ابْنُ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو سُفْيَانَ مِنْ فِيهِ إِلَى فِيَّ قال: انْطَلَقْتُ فِي الْمُدَّةِ الَّتِي كَانَتْ بَيْنِي وَبَيْنَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: فَبَيْنَمَا أَنَا بِالشَّأْمِ إِذْ جِيءَ بِكِتَابٍ مِنَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إِلَى هِرَقْلَ جَاءَ بِهِ دِحْيَةُ الْكَلْبِيُّ فَدَفَعَهُ إِلَى عَظِيمِ بُصْرَى، فَدَفَعَهُ عَظِيمُ بُصْرَى إِلَى (هِرَقْلَ) فقال: هِرَقْلُ هَلْ هُنَا أَحَدٌ مِنْ قَوْمِ هَذَا الرَّجُلِ الَّذِي يَزْعُمُ أَنَّهُ نَبِيٌّ؟ فَقَالُوا نَعَمْ. فَدُعِيتُ فِي نَفَرٍ مِنْ قُرَيْشٍ فَدَخَلْنَا عَلَى هِرَقْلَ، فَأُجْلِسْنَا بَيْنَ يَدَيْهِ فقال: أَيُّكُمْ أَقْرَبُ نَسَبًا مِنْ هَذَا الرَّجُلِ الَّذِي يَزْعُمُ أَنَّهُ نَبِيٌّ؟ فقال: أَبُو سُفْيَانَ: أَنَا. فَأَجْلَسُونِي بَيْنَ يَدَيْهِ، وَأَجْلَسُوا أَصْحَابِي خَلْفِي، ثُمَّ دَعَا بِتُرْجُمَانِهِ فَقَالَ: قُلْ لَهُمْ إِنِّي سَائِلٌ هَذَا عَنْ هَذَا الرَّجُلِ الَّذِي يَزْعُمُ أَنَّهُ نَبِيٌّ، فَإِنْ كَذَبَنِي فَكَذِّبُوهُ. قال: أَبُو سُفْيَانَ وَايْمُ اللَّهِ، لَوْلاَ أَنْ يُؤْثِرُوا عَلَيَّ الْكَذِبَ لَكَذَبْتُ. ثُمَّ قال: لِتَرْجُمَانِهِ سَلْهُ كَيْفَ حَسَبُهُ فِيكُمْ؟ قُلْتُ هُوَ فِينَا ذُو حَسَبٍ. قال: فَهَلْ كَانَ مِنْ آبَائِهِ مَلِكٌ؟ قُلْتُ لاَ. قال: فَهَلْ كُنْتُمْ تَتَّهِمُونَهُ بِالْكَذِبِ قَبْلَ أَنْ يقول: مَاقالَ؟ قُلْتُ لاَ. قَالَ: أَيَتَّبِعُهُ أَشْرَافُ

---

[٤] تقدم في المجلد الرابع. تسلسل / ١١٧ رقم: ٣٢١١/٣.

[٥] بخاري. تفسير: ٤٥٤٨.

[٦] تقدم في المجلد الخامس. تسلسل: ٩ رقم: ٦ / ٣٢٩٣.

النَّاسِ أَمْ ضُعَفَاؤُهُمْ؟ قُلْتُ بَلْ ضُعَفَاؤُهُمْ. قال: يَزِيدُونَ أَوْ يَنْقُصُونَ؟ قُلْتُ لاَ بَلْ يَزِيدُونَ. قال: هَلْ يَرْتَدُّ أَحَدٌ مِنْهُمْ عَنْ دِينِهِ، بَعْدَ أَنْ يَدْخُلَ فِيهِ، سَخْطَةً لَهُ؟ قُلْتُ لاَ. قال: فَهَلْ قَاتَلْتُمُوهُ؟ قُلْتُ نَعَمْ. قال: فَكَيْفَ كَانَ قِتَالُكُمْ إِيَّاهُ؟ قُلْتُ تَكُونُ الْحَرْبُ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُ سِجَالاً، يُصِيبُ مِنَّا وَنُصِيبُ مِنْهُ. قال: فَهَلْ يَغْدِرُ؟ قُلْتُ لاَ وَنَحْنُ مِنْهُ فِي هَذِهِ الْمُدَّةِ لاَ نَدْرِي مَا هُوَ صَانِعٌ فِيهَا. قال: وَاللَّهِ مَا أَمْكَنَنِي مِنْ كَلِمَةٍ أُدْخِلُ فِيهَا شَيْئًا غَيْرَ هَذِهِ. قال: فَهَلْ قال: هَذَا الْقَوْلَ أَحَدٌ قَبْلَهُ؟ قُلْتُ لاَ. ثُمَّ قال: لِتُرْجُمَانِهِ قُلْ لَهُ إِنِّي سَأَلْتُكَ عَنْ حَسَبِهِ فِيكُمْ، فَزَعَمْتَ أَنَّهُ فِيكُمْ ذُو حَسَبٍ، وَكَذَلِكَ الرُّسُلُ تُبْعَثُ فِي أَحْسَابِ قَوْمِهَا، وَسَأَلْتُكَ هَلْ كَانَ فِي آبَائِهِ مَلِكٌ فَزَعَمْتَ أَنْ لاَ فَقُلْتُ لَوْ كَانَ مِنْ آبَائِهِ مَلِكٌ قُلْتُ رَجُلٌ يَطْلُبُ مُلْكَ آبَائِهِ، وَسَأَلْتُكَ عَنْ أَتْبَاعِهِ أَضُعَفَاؤُهُمْ أَمْ أَشْرَافُهُمْ فَقُلْتَ بَلْ ضُعَفَاؤُهُمْ، وَهُمْ أَتْبَاعُ الرُّسُلِ، وَسَأَلْتُكَ هَلْ كُنْتُمْ تَتَّهِمُونَهُ بِالْكَذِبِ قَبْلَ أَنْ يقول: مَا قال: فَزَعَمْتَ أَنْ لاَ، فَعَرَفْتُ أَنَّهُ لَمْ يَكُنْ لِيَدَعَ الْكَذِبَ عَلَى النَّاسِ ثُمَّ يَذْهَبَ فَيَكْذِبَ عَلَى اللَّهِ، وَسَأَلْتُكَ هَلْ يَرْتَدُّ أَحَدٌ مِنْهُمْ عَنْ دِينِهِ بَعْدَ أَنْ يَدْخُلَ فِيهِ سَخْطَةً لَهُ فَزَعَمْتَ أَنْ لاَ، وَكَذَلِكَ الإِيمَانُ إِذَا خَالَطَ بَشَاشَةَ الْقُلُوبِ، وَسَأَلْتُكَ هَلْ يَزِيدُونَ أَمْ يَنْقُصُونَ فَزَعَمْتَ أَنَّهُمْ يَزِيدُونَ، وَكَذَلِكَ الإِيمَانُ حَتَّى يَتِمَّ، وَسَأَلْتُكَ هَلْ قَاتَلْتُمُوهُ فَزَعَمْتَ أَنَّكُمْ قَاتَلْتُمُوهُ فَتَكُونُ الْحَرْبُ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُ سِجَالاً، يَنَالُ مِنْكُمْ وَتَنَالُونَ مِنْهُ، وَكَذَلِكَ الرُّسُلُ تُبْتَلَى، ثُمَّ تَكُونُ لَهُمُ الْعَاقِبَةُ، وَسَأَلْتُكَ هَلْ يَغْدِرُ فَزَعَمْتَ أَنَّهُ لاَ يَغْدِرُ، وَكَذَلِكَ الرُّسُلُ لاَ تَغْدِرُ، وَسَأَلْتُكَ هَلْ قال: أَحَدٌ هَذَا الْقَوْلَ قَبْلَهُ فَزَعَمْتَ أَنْ لاَ، فَقُلْتُ لَوْ كَانَ قال: هَذَا الْقَوْلَ أَحَدٌ قَبْلَهُ قُلْتُ رَجُلٌ ائْتَمَّ بِقَوْلٍ قِيلَ قَبْلَهُ. قال: ثُمَّ قال: بِمَ يَأْمُرُكُمْ قُلْتُ يَأْمُرُنَا بِالصَّلاَةِ وَالزَّكَاةِ وَالصِّلَةِ وَالْعَفَافِ. قال: إِنْ يَكُ مَا تَقُولُ فِيهِ حَقًّا فَإِنَّهُ نَبِيٌّ، وَقَدْ كُنْتُ أَعْلَمُ أَنَّهُ خَارِجٌ، وَلَمْ أَكُن أَظُنُّهُ مِنْكُمْ، وَلَوْ أَنِّي أَعْلَمُ أَنِّي أَخْلُصُ إِلَيْهِ لأَحْبَبْتُ لِقَاءَهُ، وَلَوْ كُنْتُ عِنْدَهُ لَغَسَلْتُ عَنْ قَدَمَيْهِ، وَلَيَبْلُغَنَّ مُلْكُهُ مَا تَحْتَ قَدَمَيَّ. قال: ثُمَّ دَعَا بِكِتَابِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)فَقَرَأَهُ، فَإِذَا فِيهِ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ مِنْ مُحَمَّدٍ رَسُولِ اللَّهِ، إِلَى هِرَقْلَ عَظِيمِ الرُّومِ، سَلاَمٌ عَلَى مَنِ اتَّبَعَ الْهُدَى، أَمَّا بَعْدُ، فَإِنِّي أَدْعُوكَ بِدِعَايَةِ الإِسْلاَمِ، أَسْلِمْ تَسْلَمْ، وَأَسْلِمْ يُؤْتِكَ اللَّهُ أَجْرَكَ مَرَّتَيْنِ، فَإِنْ تَوَلَّيْتَ فَإِنَّ عَلَيْكَ إِثْمَ الأَرِيسِيِّينَ، و(قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَابًا

مِّن دُونِ اللّهِ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ اشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ). فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ قِرَاءَةِ الْكِتَابِ ارْتَفَعَتِ الأَصْوَاتُ عِنْدَهُ، وَكَثُرَ اللَّغَطُ، وَأُمِرَ بِنَا فَأُخْرِجْنَا قَالَ: فَقُلْتُ لأَصْحَابِى حِينَ خَرَجْنَا لَقَدْ أَمِرَ أَمْرُ ابْنِ أَبِى كَبْشَةَ، أَنَّهُ لَيَخَافُهُ مَلِكُ بَنِى الأَصْفَرِ فَمَا زِلْتُ مُوقِنًا بِأَمْرِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)أَنَّهُ سَيَظْهَرُ حَتَّى أَدْخَلَ اللَّهُ عَلَىَّ الإِسْلاَمَ. قال: الزُّهْرِىُّ فَدَعَا هِرَقْلُ عُظَمَاءَ الرُّومِ فَجَمَعَهُمْ فِى دَارٍ لَهُ فَقال: يَا مَعْشَرَ الرُّومِ، هَلْ لَكُمْ فِى الْفَلاَحِ وَالرَّشَدِ آخِرَ الأَبَدِ، وَأَنْ يَثْبُتَ لَكُمْ مُلْكُكُمْ قال: فَحَاصُوا حَيْصَةَ حُمُرِ الْوَحْشِ إِلَى الأَبْوَابِ، فَوَجَدُوهَا قَدْ غُلِقَتْ، فَقال: عَلَىَّ بِهِمْ. فَدَعَا بِهِمْ فَقَالَ: إِنِّى إِنَّمَا اخْتَبَرْتُ شِدَّتَكُمْ عَلَى دِينِكُمْ، فَقَدْ رَأَيْتُ مِنْكُمُ الَّذِى أَحْبَبْتُ. فَسَجَدُوا لَهُ وَرَضُوا عَنْهُ. رواه البخاري هنا ومسلم في الجهاد[٧].

**ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ ڕازی بێ) **گوتی: ئەبو سوفیان بەزمانی خۆی بۆیگێڕامەوە گوتی: لەکاتی ڕێکەوتن (صولحی)ی حودەیبییەدا کەلە نێوانی من و پێغەمبەردا کرابوو چووم بۆ شام لەوکاتەدا کەمن لەشام بووم لەکۆتایی ساڵی شەشەمی کۆچی دا دیحیەی کەلبی نامەیەکی هێنا، لە پێغەمبەرەوە** (دروودی خودای لەسەر بێ) **نووسرابوو بۆ قەیصەری ڕۆم کە هەرقلە، دیحیە کاغەزەکەی پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەداتە دەست سەرداری بوصرا، سەرداری بوصرایش دەیداتە دەستی هیرەقل خۆی، هیرقل لەشکری فارس دابووی بەسەریاو تەنگی پێ هەڵچنی بوو، شام‌و هەموو دەورو بەری شام تا جزیرەو گەلێ وولاتی تری لێ داگیر کرد بوو، خۆی پەنای برد بوو بۆ قوستەنتەنییە، لەوێشا ماوەیەکی دوورو درێژ گەمارۆی دابوو، کەخوا لەشکری فارسی لەکۆڵ کردەوە بۆ سوپاسی ئەو بەهرە گەورەیە لە حیمصەوە بەپێیان چوو بۆ قودس کەنامەکەی پێ دەگا دەڵێ: ئادەی بگەڕێن بزانن لێرەدا کەسێ هەیە کە لەهۆزی ئەم پیاوە بێ کە ئەم کاغەزەی بۆ من**

---

[٧] بخاري. بدء الوحي: ٧ ، ٥١ ، ٢٦٨١ ، ٢٨٠٤ ، ٢٩٤١ ، ٢٩٧٨ ، ٣١٧٤ ، ٤٥٥٣ ، ٥٩٨٠ ، ٦٢٦٠ ، ٧١٩٦ ، ٧٥٤١. مسلم. جهاد: ٤٥٨٣ ، ٤٥٨٤. أبوداوود. أدب: ٥١٣٦. ترمذي. استئذان: ٢٧١٨.

نووسیوەو خۆی بە پێغەمبەر دەزانێ؟ دەڵێن: بەڵێ، گوتی: جا منو چەن کەسێکی تری قوڕەیشییان بانگ کرد، کە دەوری سیی کەسێ دەبووین، بردینیان هەتا چووینە لای هیرەقل لە قودس، لەبەر دەمیا دایان نیشاندین قەیسەر لەسەر تەختی پاشایی دانیشتبوو، تاجی لەسەرابوو، گەورە گەورەی ڕۆمو پەتریقو قەشەو ڕاهیبی زۆری لەدەورا بوو گوتی: کامتان بە خزمایەتی نزیکترە بەم پیاوە کە گوایە خۆی بە پێغەمبەر دەزانێ؟ ئەبو سوفیان گوتی: گوتم: من ئیتر منیان لەبەردەم خۆیا دانیشانو هاوڕێکانمیان لە پشتمەوە دانشان، ئینجا زبانزان (تەرجمان)ەکەی خۆی بانگ کردو گوتی: پێیان بڵێ: ئەوا من لەم پیاوە پرسیار دەکەمو هەواڵی ئەو پیاوەی لێ دەپرسم کەدەڵێ من پێغەمبەرم، جا ئەگەر ئەم لەو بارەیەوە بەدرۆ وەڵامی منی دایەوە ئێوە بەدرۆی بخەنەوە ئەبو سوفیان گوتی: بەخودا لەبەر ئەوە نەبوایە کەپێم شەرم بوو درۆم لێ دەرکەوێ، ئەگینا ئەو ڕۆژە درۆم دەکردو قەیسەرم چەواشە دەکرد لەبارەی هەواڵی پێغەمبەرەوە، چونکە ئەو سەردەمە منو حەزرەت هاوداوای یەکتری بووین ئەنجا هیرقەل بەز بانزانەکەی گوت: لێی بپرسە: بنەچەو ڕەسەنی چۆنە لەناوتانا خانەدانە یانا؟ گوتم: تا بڵێیت خانەدانو وەجاخزادەیە، گوتی: ئایا لە ناو باوو باپیریا شایان تیا هەڵکەوتووە؟ گوتم: خەیر، گوتی: باشە ئەم پیاوە لەپێش ئەوەدا کەبڵێ من پێغەمبەرەم درۆتان لێ دیوە؟ گوتم: نەء، گوتی: باشە ئەوانەی کە پەیڕەوی دەکەنو دەچنە سەر ئایینی ئەو لە خانەدانەکانی خەڵکن یا لە لازەبوونو بێ نەواکانیانن؟ گوتم: نەء، هەر لازەبوونەکانیان پەیڕەوی دەکەن، گوتی: بەرەبەرە زۆر دەبن یا کەم دەکەن؟ گوتم: خەیر، بەڵکوو ڕۆژ بە ڕۆژ زۆر دەبن، گوتی: باشە کەس هەیە لەوانەی کە دەچنە سەر ئەو ئایینە لەپاشا لێی بێزار بێو پاش گەزببێتەوەو وەرگەڕێو وازی لێ بێنێ؟ گوتم: نەء، گوتی: ئەی شەڕو شۆڕو جەنگتان لەگەڵ دا کردووە؟ گوتم: بەڵێ: گوتی: شەڕکردنو جەنگینتان لەگەڵیا چۆنە؟

گوتم: تا ئێستا جەنگ لەنێوانی ئێمەو ئەودا دوو بەختی بووە: بە نۆرەو سەرە بوو، جاری واهەیە ئەو زاڵ دەبێ بەسەر ئێمەداو جاری واش هەیە ئێمە زاڵ دەبین بەسەر ئەودا* گوتی: باشە، ئەی پەیمان دەشکێنێ یانا؟ گوتم: تا ئێستا نەیشکاندووە، بەڵام ئێستاکە پەیمانێکمان لەنێواندا هەیە، ڕێکەوتووین لەسەر شەڕ نەکردن، بۆ ماوەیەکی ناوبراو، جا نازانین دەیباتە سەر یانا، ئەبو سوفیان گوتی: بەخودا تەنیا ئەم ووشەیە نەبێ مەودای تری نەدام، کە تێچێنێکی تێ چێنمو نەنگێ لە پێغەمبەر بگرم. گوتی: باشە ئەی کەسی تر لە پێش ئەمەوە قسەی وایکردووە لەناوتانا؟ گوتم: نەء، ئەنجا بەزوبانزانەکەی خۆیی گوت: پێی بڵێ: من لێم پرسیت لەلایەنی بنەچەو ڕەسەنی ئەم پیاوەوە، تۆ وەڵامت دایەوە گوتت: کەتا بڵێی خانەدانو وەجاخزادەیە لەناومانا، ئەوەش ئادابو نەرێتی هەموو پێغەمبەرێ بووە، هەموویان وانە، هەموو کاتێ خودا کەسێکی خانەدانو وەجاخزادەی هەڵبژاردووەو کردوویەتی بە پێغەمبەرو ناردوویەتی بۆسەر هۆزەکەی خۆی، لێشم پرسیت کەئایا باوو باپیری ئەم پیاوە شایان تیا بووە یانا، تۆ گوتت نەء، منیش لەدڵی خۆما گوتم: ئەگەر لەباوکو باپیریا پادشا ببوایە دەم گوت پیاوێکە داوای موڵکو دەوڵەتی باوکو باپیری دەکا، پرسیاریشم لێت کرد ئایا پەیڕەوانی ئەم پیاوە ڕەشە خەڵکو کۆمەڵەی مسکێنەکانن، یا ئاغاو بەگزادەکانن، ئەوەبوو تۆ گوتت زەبوونو مسکێنەکان پەیڕەوی دەکەن، لە ڕاستی دا هەمیشە زوربەی پەیڕەوانی هەموو پێغەمبەرێ ئەوانەن لێشتم

---

* ئەم زۆرانبازی خێرو شەڕ تاکەی!

خۆ ئێمە سووتاین بە سۆی پەتاکەی

خوایە! سەردەمی مەهدی بەرپاکەی

لە چڵکی ستەم ڕووی زەوی پاک کەی!!

پرسی ئایا لەپێش ئەوەدا کە بڵێ من پێغەمبەرم درۆتان لێ دیبوو، تۆ گوتت نەء، منیش گوتم: چۆن دەبێ پیاوێ لەگەڵ خەڵکا درۆ نەکا، بەڵام لەپاشا بچێ درۆ لەگەڵ خوادا بکا شتی وانابێ، من لەتۆم پرسی ئایا کەس هەیە لەشوێنکەوتوانی کە بچێتە سەر دینەکەی و کە شارەزایی لێ پەیداکرد وازی لێ بێنێ و بەدڵی نەبێ، تۆ گوتت نەء، لەڕاستی دا هەر کاتێ دڵ کە خۆشیی باوەڕو ئیمان بچێژێ و تام و چێژی لێ وەربگرێ ئیتر هەتا هەتایە ئەو فێنکی باوەڕە لەو دڵە ئارامە دەرناچێ و دەبن بە گوڵ و بوڵبوڵ! دڵ کە ئاودرا بەشەرابی نوور. پێویستی نابێ بەسەرابی دوور. من لەتۆم پرسی کەئایا پەیڕەوانی ئەو لەزۆرین یا لەکەمین، تۆ گوتت تا دێ زۆرتر دەبن! هەموو ئایین و بیرو باوەڕێکی دروست ئاوایە، هەر لە زیادبوونە هەتا لەئەنجاما سەر دەگرێ و تەواو دەبێ، من لەتۆم پرسی ئایا شەڕو شۆڕو جەنگتان لەگەڵ دا کردووە، تۆ گوتت جەنگ و شەڕمان لەگەڵ دا کردووەو تا ئێستا جەنگی نێوانمان دوو بەختی بووە، جارێ ئەو دەیباتەوەو جارێ ئێمە دەیبەینەوە، لەڕاستی دا ئەمە ڕەوشی هەموو پێغەمبەرێ بووە، لەسەرەتاوە تاقی دەکرێنەوەو دووچاری سەراسێ و ئێش و ئازار دەبن، بەڵام لەئەنجام دا ئەوان سەردەکەون، کە خۆرهەڵهات بەرە بەرە سوپای زۆرو ستەم و ناهەقی ئاو دەکرێتە ژێری و گوڵۆڵەی دەکەوێتە لێژی من لە تۆم پرسی ئایا پەیمان و عەهد دەشکێنێ یانا، تۆ گوتت: خاوەن پەیمانەو پەیمان ناشکێنێ، ئەمەش شێوەو ڕەفتاری گشت پێغەمبەرانە، پێغەمبەران قەت پەیمان ناشکێنن و بەڵێن دەبەنە سەر، من لەتۆم پرسی ئایا کەسێکی تر لەپێش ئەم دا ئەم داوایەی ئەمی کردووە لەناوتاناو گووتویەتی من پێغەمبەرم! تۆ گوتت نەء، منیش لەدڵی خۆما گوتم ئەگەر کەسێکی تر لە پێش ئەم دا ئەم قسەیەی بکردایە دەمگوت: ئەم پیاوەش لاسکایی ئەو قسەکۆنەیە دەکاتەوە!! ئەبو سوفیان گوتی: ئەنجا هیرقەل گوتی: فەرمانتان بەچی پێدەکاو دەڵێ چی

بکەن‌و چی مەکەن؟ گوتم: پێمان دەڵێ: نوێژ بکەن، زەکات بدەن، خزم دۆست بن‌و بۆ خزم باش بن‌و مافی خزمایەتی بەجێ بێنن، دەست پاك بن، داوێن پاك بن، دەم‌و دڵ پاك بن بەندەیی ساغ بەس بۆ خودای گەورە بکەین، هیچ شتێ نەکەین بە هاوەڵ بۆ خودا، واز لەو بت‌و خودا درۆینانە بێنین کە باوك‌و باپیرمان لەکۆنا دەیانپەرستن هیرقەل گوتی: ئەمەی تۆ دەیڵێیت لەبارەی ئەو پیاوەوە ئەگەر ڕاست‌و دروست بێ ئەوە پێغەمبەرە، من دەمزانی کەئەم پێغەمبەرە بەزوویی پەیدا دەبێ‌و دێ، بەڵام نەم دەزانی کەلە ئێوەیە ئەی کۆمەڵەی عەرەب! وەمن بەش بەحاڵی خۆم ئەگەر بزانم قوتار دەبم‌و دەگەمە لای حەز دەکەم بچم بۆ خزمەتی، ئەگەر لەلای دەبووم قاچەکانیم دەشۆرد، بەخودا قەڵەمڕەوو دەستەڵاتی ئەو دەگاتە ئەم شوێن پایانەی منیش وەخاکی بەیتولمەقدیس‌و هەموو وڵاتی شام‌و ڕۆم داگیر دەکا ئەبو سوفیان گوتی: لەپاشا داوای نامەکەی پێغەمبەری کردو خوێندیەوە، ناوەرۆکەکەی ئەمە بوو: بەناوی یەزدانی بەخشندەی میهرەبان، لە موحەممەدەوە کە پێغەمبەری خودایە، بۆ لای هیرقەلی مەزنی ڕۆم، سڵاوو درورد لە پەیڕەوانی ڕێگەی ڕاستی، سڵاو لەڕاستی خوازان! لەپاش ئەمە من داوات لێ دەکەم کە ئیسلام بیت، ئیسلام ببە لەهەردوو جیهاندا سەلامەت دەبیت، ئیسلام ببە خودا لەباتی جارێ دوو جار ئەجرو پاداشتت دەداتێ چونکە هەموو خاوەن نامەیەکی نۆ موسوڵمان دوو پاداشی بۆ هەیە، سەرەڕای ئەوەش کەدەبی بە مامۆستای نیشاندەری خێر بۆ هەموو دەست‌و پەیوەندەکەی خۆت‌و دەبی بەسەر مەشق بۆیان ئەگەر سەرپێچیش دەکەی‌و گەردن کەچ ناکەی بۆ ئیسلام ئەوە بزانە کەهەم ئۆباڵ‌و گوناهی خۆت‌و هەم ئۆباڵ‌و گوناهی مسکێن‌و وەرزێرەکانیش لەئەستۆی تۆیە چونکە ئەوان ژێر دەستی تۆن‌و چاویان لەدەمی تۆیە. هەروەها داوات لێ دەکەم بەهۆی ئەم ئایەتەشەوە کە دەفەرموێ:

{قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ اشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ -٣/٦٤}.

واتە: ئەی ئەهلی کیتاب! ئەی خاوەن نامەکان! ئەی کۆمەڵەیێ کە خودا نامەی خۆیی بەهۆی پێغەمبەرێ لە پێغەمبەرەکانیەوە بۆ ناردوون! وەرن بۆسەر وەرگرتنی تاقە فەرموودەیێ، کە بۆ ئێمەو بۆ ئێوە یەکسانەو چون یەکە بەبێ جیاوازیی، کە بریتییە لە نیازپاکیی و ساغی لەگەڵ خودادا وەئەم مەبەستەش بەم چەن یاسایە دێتەجێ، یەکەم عیبادەت و پەرستن و خودا پەرستی بۆ کەسی تر نەکەین بۆ خودای گەورە نەبێ، دووەم هاوەڵ و هاوبەش و ژن و کوڕو کچ و باوك و دایکی بۆ بڕیار نەدەین، سێیەم لەناو خۆمانا یەکتری نەکەین بەخوداو وەك خودا بیکەین بە خاوەن فەرمان و شت حەڵاڵ و حەرام بکا بۆمان بەبێ وەرگرتنی فەرمان لەخوداوە، جا ئەگەر ئەو خاوەن نامانە پشتییان هەڵکرد لەم پەندو ئامۆژگاریی و فەرمایشتە ڕاست و دروستەو ڕووپێچیان لەیەکتایی پەرستی کرد ئەوا تۆ ئەی پێغەمبەر! هەم خۆت هەم پەیڕەوەکانت پێیان بڵێن: هەق دیارە، ئاشکرایەو بەڵگە نەویستە، کە ئێوە قەبووڵی ناکەن ئەوا ئاگاداربن و بەشایەت بن ئێمە فەرمانبەرداری خوداین و موسوڵمانین. ئەبو سوفیان گوتی: کە هیرقەل لە خوێندنەوەی نامەکە بووە، لەدەوری بوو بەزڵە زڵ و قاوو قیژ، ئیتر دەستور درا ئێمە کراینە دەرەوە، کە چووینە دەرەوە بەهاوڕێکانی خۆمم گوت: بەڕاستی کاری کوڕەکەی ئەبو کەبشە گەورە بووە، خۆ ئەوەتە شای ڕۆمیش لێی دەترسێ ئەبو کەبشە باوکی شیریی پێغەمبەر بووە، مێردی حەلیمەیە کە دایەنی حەزرەت بووە ئیتر هەر لەو کاتەوە من زانیم کە کارو باری پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) سەردەکەوێ و گومانم لەوەدا نەبوو، تا ئەو ڕۆژەی خودا کردمی بە موسوڵمان و چوومە سەر ئایینی ئیسلام زوهری کە ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە لە عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عوتبەوە لە ئیبنو عەبباسەوە دەڵێ: ئەنجا هیرقەل پیاوە گەورەکانی وڵاتی ڕووم بانگ دەکات و

لەماڵی خۆی کۆیان دەکاتەوەو پێیان دەڵێ: ئەی کۆمەڵەی ڕووم! ئەگەر دەتانەوێ سەربەرزو سەر فراز بن هەتا هەتایە وە ملك‌و دەوڵەتیشتان بەردەوام بێ‌و بمێنێ وەرن زووکەن موسوڵمان ببن. گوتی: بەڵام ئەوان وەك کەرە کێوی دەشەڵەژێن‌و بەرەو دەرگاکان هەڵ دەتیزێنن، دەڕوانن دەرگاکان داخراون جا هیرقەل دەڵێ: بانگیان کەنەوە بۆلای خۆم، کە بانگی کردنەوە پێیانی گوت: ئەوە من تاقیم کردنەوە، ویستم بزانم تا چ ڕادەیێ ئایینی خۆتان بەتوندی گرتووە، باش بوو کردارەکەتان بەدڵی من بوو. ئیتر ئەوانیش کوڕنووشی بۆدەبەن‌و گلەییان لێی نامێنێ (ب/م — (خودایان لێ ڕازی بێ)).

٣٧٦١- ونزل – لَّما قالت: اليهود نحن على دين إبراهيم وقالت: النَّصارى نحن على دين إبراهيم: (مَا كَانَ إِبْرَاهِيمُ يَهُودِيًّا وَلاَ نَصْرَانِيًّا وَلَكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ)[٨].

کاتێ جوولەکەکان گوتیان: ئێمە لەسەر دینی ئیبراهیمین، وە گاورەکانیش گوتیان: ئێمە لەسەر دینی ئیبراهیمین، ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە:

{مَا كَانَ إِبْرَاهِيمُ يَهُودِيًّا وَلاَ نَصْرَانِيًّا وَلَكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ - ٦٧/٣}.

واتە: بەهیچ جۆرێ ئیبراهیم لەسەر ئایینی جوولەکە نەبوو، کە عوزەیر بە کوڕی خودا دەزانن، وەلە سەر ئایینی گاور نەبوو، کە عیسا بە کوڕی خودا دادەنێن، بەڵام مەردێکی لەپڕو پووچ لادەرو موسوڵمان بووەو ڕووی لەڕاستی کردووە، وەلەو کەسانە نەبووە کەهاوبەش دادەنێن بۆ خوداو بتپەرستی دەکەن.

٣٧٦٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عن النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قال: إِنَّ لِكُلِّ نَبِيّ وُلاَةً مِنَ النَّبِيِّينَ وَإِنَّ وَلِيِّيَ أَبِي وَخَلِيلِي وَخَيل رَبِّي. ثُمَّ قَرَأَ (إِنَّ أَوْلَى النَّاسِ بِإِبْرَاهِيمَ

---

[٨] لم ينسب إلى أيِّ كتاب من قبل المؤلف.

لِلَّذِينَ اتَّبَعُوهُ وَهَذَا النَّبِيُّ وَالَّـذِينَ آمَنُـوا وَاللَّـهُ وَلِـيُّ الْمُـؤْمِنِينَ). رواه الترمـذي بـسند صحيح[٩].

عەبـدوڵڵا (خـودای لـێ ڕازی بـێ) گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: هـەموو پێغەمبـەرێ لـەناو پێغەمبـەرەکانا ئاشـنایەکی هـەبووە، ئاشـنای منـیش ئیبراهیمـە، کەهـەم باوکمـەو هـەم دۆسـتو خۆشەویـستمە هەروەك دۆستو خۆشەویستی خودایە ئینجا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) خوێندیەوە:

{إِنَّ أَوْلَى النَّاسِ بِإِبْرَاهِيمَ لَلَّذِينَ اتَّبَعُوهُ وَهَـذَا النَّبِـيُّ وَالَّـذِينَ آمَنُـواْ وَاللّـهُ وَلِـيُّ الْمُؤْمِنِينَ - ٣/٦٨}.

واتـە: بەڕاسـتی نـزیکترینو لەبـەرترین کـەس بـە ئیـبراهیم ئـەو کەسـانە بـوون کـە لـەوەختی خۆیـا پـەیڕەوی ئـەویان کـردووە، وەئـەم پێغەمبەرەیـە کەناوی موحەممەدەو ناوە جوانەکەی خۆی پڕ بەبەریـەتی، وە ئـەو کەسـانەیە کـە باوەڕیـان هێنـاوە بـە موحەممـەد، خـودای گـەورەش خـۆی دۆسـتو یارمەتیدەری موسوڵمانانە لەهەردوو جیهانا (ت-س/ص).

٣٧٦٣- ⇦ (ب/٢ ز- ١٤٧ ل- ٣٠١ چاپی/١ ف - ٢ +٤)[١٠].

٣٧٦٤- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عن النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قال: مَنِ اقْتَطَعَ حَقَّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ بِيَمِينِهِ فَقَدْ أَوْجَبَ اللَّهُ لَهُ النَّارَ وَحَرَّمَ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ. فَقَال: لَهُ رَجُلٌ وَإِنْ كَـانَ شَيْئًا يَسِيرًا يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قال: وَإِنْ قَضِيبًا مِنْ أَرَاكٍ. رواه مسلم في الإيمان[١١].

ئـەبو ئومامـە (خـودای لـێ ڕازی بـێ) گـوتی: حـەزرەت (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فەرمووی: ئەوەی بە سوێندو سوێندکاری هەقی پیاوێکی موسوڵمان بەناڕەوا بیچڕێ بۆ خۆی خودا ئاگری بۆ دەبڕێـتەوەو دەیکا بە مووچەو جیرە بۆیو

---

[٩] صحيح عند الترمذي.

[١٠] تقدم في مجلد / ٢ تسلسل: ١٧٣ رقم: ٥ / ١٩١٧.

[١١] مسلم. إيمان: ٣٥١. نسائي: آداب القضاء: ٥٤٣٤.

بەهەشتی لێ قەدەغە دەکا. پیاوێکیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! باشتێکی کەمیش بێ؟ فەرمووی: با چڵێ دار سیواکیش بێ! (م — (مەزار ڕەحمەتی لێ بێ)). (ف/٢) + (ب/٢ ز/١٤٧ ل/٣٠١ ف/٤).

٣٧٦٥- ⇦ (ب/٢ ز/١٤٧ ل/٣٠١ ف/٤)[١٢].

٣٧٦٦- عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ امْرَأَتَيْنِ كَانَتَا تَخْرِزَانِ فِي بَيْتٍ – أَوْ فِي الْحُجْرَةِ – فَخَرَجَتْ إِحْدَاهُمَا وَقَدْ أُنْفِذَ بِإِشْفًى فِي كَفِّهَا، فَادَّعَتْ عَلَى الأُخْرَى، فَرُفِعَ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُما)، فَقَالَ: قال: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لَوْ يُعْطَى النَّاسُ بِدَعْوَاهُمْ لَذَهَبَ دِمَاءُ قَوْمٍ وَأَمْوَالُهُمْ. ذَكِّرُوهَا بِاللَّهِ وَاقْرَءُوا عَلَيْهَا (إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ). فَذَكَّرُوهَا فَاعْتَرَفَتْ، فَقَالَ: ابْنُ عَبَّاسٍ قال: النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) الْيَمِينُ عَلَى الْمُدَّعَى عَلَيْهِ. رواهما البخاري[١٣].

ئیبنو ئەبی مولەیکە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: دوو ژن لەچاوەیەکا، لەماڵێکا درەوشەکاریی دەکەن، یەکێکیان بریندار دەبێ، درەوشەیێ چوو بوو بەناو لەپیا، داوای ئەوەبوو کە گوایە ژنەکەی تر وای لێی کردووە، داواکەیان برد بۆلای ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەگەر ئەو خەڵکە لەسەر داوای خۆیان بەبێ پێنیشاندانی بەڵگەو ڕاست کردنەوەی شایەت هەرچی داوا بکەن بدرێ پێیان ئەوا دەبێ بەتێکەو لێکەو هەرکەسەیە بۆ خۆیو سەرەنجام گەلێ سەرو ماڵو خوێنو سامانی زۆرکەس بەفیڕۆ دەڕوا ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: تەمێو ئامۆژگاری ژنە گومانبارەکە بکەنو ڕێزی خودای یاد بخەنەوەو ترسی خودای بخەنە بەر، بەتایبەتی ئەم ئایەتەی بۆ بخوێننەوە:

{إِنَّ الَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ وَأَيْمَانِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلاً – ٣/٧٧}.

---

[١٢] تقدم في مجلد / ٢ تسلسل: ١٤٧ رقم: ٤ / ١٧٧١.

[١٣] تجريد البخاري: ٤ ل / ٤٢٠ رقم: ١٦٤٤ = ٤٥٥٢ ، ٢٥١٤ ، ٢٦٦٨. فتح الباري مجلد / ٣ ل / ١٧٥ رقم: ١٠٨٢. تجريد. مسلم. أقضية: ٤٤٤٥.

واتــە: کەســانێ کــە عەهــدو پــەیمانو بــەڵێن بــەخودا دەدەنو ســوێند دەخــۆنو لەپاشــا پەیمانەکــەیان دەشــکێننو ســوێندەکانیان نابەنــە ســەرو بەبەهایــەکی دنیــایی دەیانگۆڕنــەوە کەئــەو بەهاجیهانییــە ئەگــەر زۆریــش بــێ هەرکەمە، ئا ئەوانە ئەگەر تەوبەی بەڕاستی نەکەنو لەسەر ئەو ڕەوشە پیسە بمرن دەبن بە ڕوو ڕەشی لای خوداو لەودنیا هیچ بەشو بارەیەکیان بۆ نییە، وە خودای گەورە لـەڕۆژی پاشە ڕۆژدا نـەنازیان دەگرێو نـە قسەی خۆشیان لەگەڵ دەکاو نەڕوویان دەداتــێو نـە بەچاوی ڕێـزو میهرەبانییەوە تەماشایان دەکاو نە پاکیان دەکاتەوە لەتاوانەکانیانو نە تاریفی چاکیو باشییان دەکا، سەرەڕای ئەوەیش سزایەکی زۆر سەختو بەئێشو بە سۆیان بۆهەیە. گوتی: کەوایان کرد ژنەکە چووە ژێریو ددانی پیانا کە ئەو وای لێی کردووە، ئیبنو عـەبباس (خودایـان لـێ ڕازی بێ) گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفـەرموێ: لـەداواو داواکـاری دا سـوێند خـواردن لـە سـەرداوا لــێ کـراوە (ب — مـەزار مـەزار ڕەحمەتی لەگۆڕی پیرۆزی بێ).

٣٧٦٧- ⇨ (ب/٢ ز/١٨٢ ل/٣٧٤ ف/١) زاد هنا: زاد في رواية: فجعلها لحسّان وأبيّ[١٤].

لێرەدا لەدواوە ئەمەی پترە: دای بە حەسسانو بە ئوبەیی.

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {كُلُّ الطَّعَامِ كَانَ حِلاًّ لِّبَنِي إِسْرَائِيلَ إِلاَّ مَا حَرَّمَ إِسْرَائِيلُ عَلَى نَفْسِهِ مِن قَبْلِ أَن تُنَزَّلَ التَّوْرَاةُ قُلْ فَأْتُواْ بِالتَّوْرَاةِ فَاتْلُوهَا إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ - ٩٣/٣}.

واتــە: هــەموو خواردەمەنییــەك حــەڵاڵ بــوو، بــۆ نــەوەی یــەعقووب پێغەمبــەر، مەگــەر ئــەوە نــەبێ کــە یــەعقووب حــەرامی کردبــوو لەســەر خــۆی، لەپێش ئەوەدا کەئەم تەوڕاتە بێتە خوارەوە بۆ مووسا، ئەی پێغەمبەر! تۆ بڵێ بـەو جوولەکـە درۆزنانـە: ئێـوە ئەگـەر ڕاسـت دەکـەن لـەم داوایـەتانا کـە گوایـە ئەمەی ئەمڕۆ لـەوان حەرامـە لـەکۆن کۆنیـشا لـەنووحو لـە ئیبراهیمیش حـەرام

---

[١٤] تقدم في مجلد ثاني. تسلسل: ١٨٢ رقم: ١ / ١٩٤٢.

بووه، بفەرموو ئەگەر ڕاست دەکەن‌و درۆ ناکەن تەورات بێنن‌و بیخوێننەوە تا ڕاستی‌و ناڕاستی دەربکەوێ.

٣٧٦٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) قال: أَقْبَلَتْ يَهُودُ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)فَقَالُوا يَا أَبَا الْقَاسِمِ أَخْبِرْنَا عَمَّا حَرَّمَ إِسْرَائِيلُ عَلَى نَفْسِهِ؟ قال: اشْتَكَى عِرْقَ النَّسَا فَلَمْ يَجِدْ شَيْئًا يُلاَئِمُهُ إِلاَّ لُحُومَ الإِبِلِ وَأَلْبَانَهَا فَلِذَلِكَ حَرَّمَهَا. قَالُوا صَدَقْتَ. رواه الترمذي في الزهد بسند حسن[١٥].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: جوولەکەکان هاتنە لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) گوتیان: ئەی باوکی قاسم! پێمان بڵێ یەعقووب پێغەمبەر (کە نازناوی ئیسرائیلە، کەبەمەعنا بەندەی هەڵبژاردەی خوایە) چی لە خۆی حەڕام کردبوو؟ فەرمووی: یەعقووب تووشی نەخۆشی کەژۆک (عیرقولنەسا) بوو ئاهی کرد ئەگەر خودا چاکی بکاتەوە لە خۆشترین شت نەخوا، جا خودا چاکی کردەوە، ئەویش هیچی وەك گۆشت‌و شیری ووشتر پێ نەدەکەوت، جا لەبەر ئەوە ئەو دوو شتەی لەخۆی قەدەغە کرد گوتیان: ڕاست دەکەی (ت-س/ح).

٣٧٦٩- ⇦ (ب/٣ ز/٩٢ ل/٢٤٣ ف/٨)[١٦].

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَالَمِينَ - ٩٦/٣}.

تەفسیری ئەم ئایەتە لەپێشەوە لەم شوێنەدا ڕۆیشت: ⇦ (ب/١ ز/١١٥ ل/٣٤٩).

٣٧٧٠- ⇦ (ب/١ ز/١١٥ ل/٣٤٩ ف/١)[١٧].

---

[١٥] حسن عند الترمذي.

[١٦] تقدم في مجلد ثالث. تسلسل / ٩٢ رقم: ٨ / ٢٣٥٨.

[١٧] تقدم في مجلد أول. تسلسل: ١١٥ رقم: ١ / ٦٩١.

قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: {فِيهِ آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ مَّقَامُ إِبْرَاهِيمَ وَمَن دَخَلَهُ كَانَ آمِنًا وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً - ٩٧/٣}. ⇨ (ب/٢ ز/٧٩ ل/١٥٢).

٣٧٧١- ⇨ (ب/٢ ز/٧٩ ل/١٥٤ ف/٥ + ب/٢ ز/٨٨ ل/١٧٢ ف/٣)[١٨].

لێرەدا لەسەرەتاوە ئەم پترییەی هەیە: قام رجل فقال: يا رسول الله من الحاج؟ قَالَ: الشعث الثفل: پیاوێ هەڵسا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! کێ حاجیی بەڕاستییە؟ فەرمووی: کۆڵکن و بۆرکەڵەکانن کە لەبەر ئەوەی سەرگەرمی جێ بەجێ کردنی کردارەکانی حەجن نایانپەرژێتە سەر پەروەردەکردنی قژو لەش و جل و بەرگی خۆیان.

قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: {كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ - ١١٠/٣} ⇨ (ب/٥ ز/٧٥ ل/٢٦١).

٣٧٧٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) (كُنْتُمْ خَيْرَ النَّاسِ لِلنَّاسِ، تَأْتُونَ بِهِمْ فِي السَّلاَسِلِ فِي أَعْنَاقِهِمْ حَتَّى يَدْخُلُوا فِي الإِسْلاَمِ. رواه البخاري [١٩].

ئەبو هورەیرە (خۆشنوودی خودای مەزنی لەسەر بێ) گوتی: ئێوە چاکترین کەسن بۆئەم خەڵکە، چونکە دیلیان دەکەن و کۆت و زنجیر دەخەنە گەردنیان و لەسەر ئەو حاڵە دەیانهێنن هەتا موسوڵمان دەبن کەوابوو ئێوە بۆ ئەوان دەبن بە مایەی بەختیاری و کلیلی بەهەشت کە فەرموودەی (لا الـه الا الله)یە دەدەنە دەستیان (ب).

٣٧٧٣- عَنْ بَهْزِ بْنِ حَكِيمٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ (رضي الله عنهم) أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يقول: فِي قَوْلِهِ (كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ) قال: تُتِمُّونَ سَبْعِينَ أُمَّةً أَنْتُمْ خَيْرُهَا وَأَكْرَمُهَا عَلَى اللَّهِ تعالى. رواه الترمذي بسند حسن[٢٠].

---

[١٨] تقدم في مجلد ثاني. تسلسل / ٧٩ رقم: ٥ / ١٤٨٣ + ٣/ ١٥٢١.

[١٩] بخاري. تفسير: ٤٥٥٧.

[٢٠] حديث حسن.

بەهزی کوڕی حەکیم لەباوکیەوە لە باپیریەوە (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: گوێم لێ بوو پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) خوێندیەوە: (كنتم خير أمة أخرجت للناس) ئینجا فەرمووی: ئێوە ئەی گەلی موحەممەد! حەفتاهەمین گەلی خاوەن ئیمانن، کە هەموویان لەپێش ئێوەوە بوون و ئێوە بەدوایانا هاتوون، ئێوە لەوانە لەهەموویان گەورەترو چاکترن (ت-س/ص).

٣٧٧٤- عن جَابِرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) يقول: فِينَا نَزَلَتْ (إِذْ هَمَّتْ طَائِفَتَانِ مِنْكُمْ أَنْ تَفْشَلاَ وَاللَّهُ وَلِيُّهُمَا) قال: نَحْنُ الطَّائِفَتَانِ بَنُو حَارِثَةَ وَبَنُو سَلِمَةَ، وَمَا يَسُرُّنِي أَنَّهَا لَمْ تُنْزَلْ لِقَوْلِ اللَّهِ (وَاللَّهُ وَلِيُّهُمَا). رواه الشيخان[٢١].

جابیر (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: ئەم ئایەتە لەشانی ئێمەدا دابەزیوە، کە دەفەرموێ:

{إِذْ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمْ أَن تَفْشَلاَ وَاللّهُ وَلِيُّهُمَا وَعَلَى اللّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ - ١٢٢/٣}

واتە: خودای گەورە خۆی زانابوو بە قسەی دەم و نیازی دڵتان لەوکاتەدا کە دوو تاقم لەئێوە ویستیان بگەڕێنەوە بۆ مەدینەو خۆیان بدۆڕێنن بەڵام خودا پاراستنی لەو خەیاڵە ناهەموارەو لەو بیرە بەدە لایان داو پشتی سوپای ئیسلامیان چۆڵ نەکرد، لەبەر ئەوە خودا پاراستنی، چونکە خودا دۆستی ئەو دوو تاقمەیەو خۆشی دەوێن. جابیر دەیگوت: ئەو دوو تاقمەیە ئێمە بووین، تاقمەی بەنی حاریسەو تاقمەی بەنی سەلەمە، وەمن بەش بەحاڵی خۆم هاتنی ئەم ئایەتەم زۆر پێ خۆشە لەبەر ئەوەی کە خودا دەفەرموێ لەشانی ئەو دوو تاقمەیە دا: والله وليهما: خودا دۆستی ئەو دوو تاقمەیەو خۆشی دەوێن! (ش - (خودایان لێ ڕازی بێ)).

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {لَيْسَ لَكَ مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذَّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَالِمُونَ} (١٢٨/٣).

---

[٢١] بخاري. مغازي. ٤٠٥١. مسلم. فضائل الصحابة: ٦٣٦٢.

واتـە: ئـەی پێغەمبـەری خۆشەویسـتو نـازدار! حـوكمی قـەزاو قـەدەرو بڕیاری سەرنفیست بەدەستی منـەو بەدەسـتی تـۆ نییـە، دەی زۆر بـاش بزانـە ئەمانـە خـودا تەوبـەو پەشـیمانییان گیـرا بكـا، یـا گیـرای نـەكا، وەلـە هـەردوو جیهانـا، یـا لەیـەكێكیانا سـزایان بـدا یـا سـزایان نـەدا ئـەم شـتانە كـەمو زۆر بەدەستی تۆ نییە، چونكی بەڕاستی ئـەم بێبـاوەڕو خـودا نەناسـانە شـوولێیان لـێ هەڵكێشاوەو زۆر ستەمكارو لە ڕادە بەدەر ستەمكارن.

٣٧٧٥- ⇦ (ب/١ ز/٩٢ ل/٢٨٨ ف/٤)[٢٢].

لە گێڕانەوەی ئێرەدا ئەم پتریی (زیادە)یەی هەیە:

ولفظ الترمذي: قال: قال: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)يَوْمَ أُحُـدٍ اللَّهُـمَّ الْعَـنْ أَبَـا سُفْيَانَ اللَّهُمَّ الْعَنِ الْحَارِثَ بْنَ هِشَامٍ اللَّهُمَّ الْعَنْ صَفْوَانَ بْنَ أُمَيَّةَ. قال: فَنَزَلَتْ (لَيْسَ لَكَ مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ) فَتَابَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ فَأَسْلَمُوا فَحَسُنَ إِسْلاَمُهُمْ.

گفتـەی (ت) ئاوایـە: لـەڕۆژی ئوحـددا پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فەرمووی: خودایـە! نـەفرینو لەعنـەت بكـە لەئـەبو سوفیان، خودایـە! لەعنـەت بكـە لـە حاریسـی كـوڕی هیـشام، خودایـە! نـەفرین بكـە لـە صـەفوانی كـوڕی ئومەییە ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە:

{لَـيْسَ لَـكَ مِـنَ الأَمْـرِ شَـيْءٌ أَوْ يَتُـوبَ عَلَـيْهِمْ أَوْ يُعَـذِّبَهُمْ فَـإِنَّهُمْ ظَـالِمُونَ – ١٢٨/٣}.

لـەپاش دا خـودا تەوبـەی ئەوانـەی قـەبووڵ كـردو هـەموویان موسـوڵمان بوونو سەرو موسوڵمانی جوانیان لـێ دەرچوو.

٣٧٧٦- ⇦ (ب/١ ز/٩٢ ل/٢٨٨ ف/٤)[٢٣].

٣٧٧٧- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) كُسِرَتْ رَبَاعِيَتُهُ يَوْمَ أُحُدٍ وَشُجَّ وَجْهُهُ شَجَّةً فِي جَبْهَتِهِ حَتَّى سَالَ الدَّمُ عَلَى وَجْهِهِ فَقَال: كَيْفَ يُفْلِحُ قَوْمٌ فَعَلُوا هَذَا

---

[٢٢] تقدم في مجلد أول. تسلسل / ٩٢ رقم: ٤ / ٥٦٢.

[٢٣] تقدم في مجلد أول. تسلسل / ٩٢ رقم: ٤ / ٥٦٢.

بِنَبِيِّهِمْ وَهُوَ يَدْعُوهُمْ إِلَى اللَّهِ. فَنَزَلَتْ (لَيْسَ لَكَ مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَالِمُونَ). رواه الترمذي بسند صحيح[٢٤].

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لەڕۆژی هەرای ئوحوددا دندانی پێشینی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) شکا، لەڕیزی لای ڕاستی لە خوارەوە دانی چوارین (رەباعییە)ی شکا◆ وەناو چاوانی شکاو خوێن بە دەموچاویا هاتە خوارەوە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: هۆزێ کە ناهەقی ئاوا لە پێغەمبەری خۆیان بکەن چۆن سەردەکەون ئەوەش لەکاتێکا کە ئەو دڵسۆزانە خەریك بێ بانگیان بکا بۆ لای خوداو ڕێگەی ڕاستیان پێ نیشان بدا جا (لیس لك من الأمر شیئ) هاتە خوارەوە (ت – س/ص).

٣٧٧٨- (ب/١ ز/١٨٩ ل/٥١٣ ف/١)[٢٥].

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {إِذْ تُصْعِدُونَ وَلاَ تَلْوُونَ عَلَى أحَدٍ وَالرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ فِي أُخْرَاكُمْ فَأَثَابَكُمْ غُمَّاً بِغَمٍّ لِّكَيْلاَ تَحْزَنُواْ عَلَى مَا فَاتَكُمْ وَلاَ مَا أَصَابَكُمْ وَاللّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ} (١٥٣/٣).

واتە: خودا دەستی ئێوەی لابرد لەسەر دوژمنەکانو ئەوانی زاڵ کرد بە سەرتانا، لەوکاتەدا کە ئێوە بەپەلەپڕووزە هەڵدەزنین بەقەد کێوەکەداو سوپاگای خۆتان بەجێ هێشتو ئەوەندە پەرێشانو بێ وورە بوون ئاوڕتان نەدەدایەوە لەکەسو لەسەری نەدەوەستانو هەرکەسەتان دەیویست سەری خۆی قوتار بکا، بەڵام پێغەمبەری خودا حەزرەتی موحەممەد، کەلەگەڵ تاقمی

---

[٢٤] صحيح عند الترمذي.

◆ ١- ثەنییە ، ٢- رەباعیە ، ٣- ناب ، ٤- ضەواحیك ، ٤ ، ٥ ، ٦ – أضراس ، ٦- سن العقل ، لەچوار تا چوار لەسەرو لەخوار = ضەواحیك. ددان لەشەویلەی سەرەوەو لەشەویلەی خوارەوە یەك ناوی هەیە ، ثەنییە = دوانینە ، رەباعییە = چوارینە ، ناب – كەڵپ ، ضەواحیك = زمردەدان ، ضیرس = خرێ ، کاکیلە ، سن العقل = ددانی ئەقڵ.

(٢٥) تقدم في المجلد الأول. تسلسل: ١٨٩ رقم: ١ / ١٠٠٦ .

دواییتانا بوو، حاڵی وابوو بانگی دەکردنەوەو دەیفەرموو: ئەی بەندەگانی خودا! وورە بەرمەدەن، بگەڕێنەوە بۆ مەیدانی جەنگ و بگەڕێنەوە بۆلای من، ئەوەی هەڵمەت بێنێتەوەو پەلاماری دوژمن بداتەوە ئەو بەهەشتییە! جا خودای گەورە پاداشی دانەوە لەسەر ئەم حاڵە نابارەتان و تووشی خەم و خەفەتێکی زۆری کردن، ئەوەش بۆئەوەی خووبگرن بەم جۆرە کارەساتانەوەو بەزوویی وورە بەرنەدەن و جارێکی تر ئەگەر شتی وا ڕووی دا لێتان دڵگران و زویر نەبن لەسەر زیانی ماڵی و گیانی، وەخودا خۆی ئاگای لەنیازی دڵتان و لەکارو کردەوەتان هەیە.

٣٧٧٩- عن الْبَرَاءَ بْنَ عَازِبٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قال: جَعَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عَلَى الرَّجَّالَةِ يَوْمَ أُحُدٍ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ جُبَيْرٍ، وَأَقْبَلُوا مُنْهَزِمِينَ، فَذَاكَ إِذْ يَدْعُوهُمُ الرَّسُولُ فِي أُخْرَاهُمْ، وَلَمْ يَبْقَ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) غَيْرُ اثْنَيْ عَشَرَ رَجُلاً. رواه البخاري[٢٦].

بەڕائی کوڕی عازیب (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لەڕۆژی ڕووداوی ئوحددا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) عەبدوڵڵای کوڕی جوبەیری کرد بە سەرکردەی پیادەکان کەپەنجا پیاوی تیر هاوێژ بوون، پێی فەرموون: ئەگەر بەچاوی خۆتان ئێمەتان دی لەوناوەدا کوژراوین و لاشەمان کەوتووەو مەل و مۆرو جانەوەر دەمان خۆن ئێوە لەم شوێنەی خۆتان مەجووڵێن و پشتمان چۆڵ مەکەن، بەڵام جەنگاوەرە پیادەکان فەرمانەکەی پێغەمبەریان شکاند، کە دییان ئەوا لەشکری ئیسلام سەرکەوت بەسەر لەشکری کوفردا، لەسەرەتای شەڕەکەوە، ئیتر سەنگەرەکانی خۆیان بەجێهێشت و چوون بۆتالان کۆکردنەوە، وەلەم کاتەدا خالیدی کوڕی وەلید هەلی دەست کەوتوو هێرشی بردو بوو بەهۆی شکانی سوپای ئیسلام جالە پاشا ئەوانیش شکان و بەرەو دوا هەڵهاتن، ئەمە ئەو ڕووداوەیە کە خودا لەقورئان دا بەم ئایەتە باسی دەکات و دەفەرموێ: {وَالرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ فِي أُخْرَاكُمْ}. وەئەو ڕۆژە دوانزە پیاو نەبێ کەس لەگەڵ پێغەمبەردا نەمایەوەو هەموو هەڵهاتن! (ب).

---

[٢٦] بخاري. تفسير: ٤٥٦١.

٣٧٨٠- عن أَبِي طَلْحَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قال: غَشِيَنَا النُّعَاسُ وَنَحْنُ فِي مَصَافِّنَا يَوْمَ أُحُدٍ فَجَعَلَ سَيْفِي يَسْقُطُ مِنْ يَدِي وَآخُذُهُ. وَيَسْقُطُ وَآخُذُهُ. رواه البخاري والترمذي وزاد: والطَّائِفة الأُخرى المُنافقُون ليسَ لَهُم همٌّ إِلاَّ أنفُسِهِمْ أجبن قومٍ وأرغبه وأخذله للحقِّ[٢٧].

ئەبو طەلحە (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: لە ڕۆژی ئوحوددا، لەڕیزی شەڕدا، لەناو سەنگەرەكانی خۆماندا خەو دایگرتین، خەوێكی قورسی وا كە خۆش خۆش بەدەم وەنەوزبردنەوە شمشێرەكەم لەدەستم دەكەوتە خوارەوەو هەڵم دەگرتەوە (ب/ت) تیرمزی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) ئەمەی پترە: تاقمەكەی تریش برێتی بوون لە ناپاكەكان، ئەوانە هەر خەمی سوودو قازانجی خۆیانە، ترسنۆكترین هۆزن‌و چاوچنۆكترین تاقمن‌و گەورەترین دوژمنی هەق‌و ڕاستین. بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم حەدیسە تەفسیری ئەم ئایەتە دەكەین:

{ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّن بَعْدِ الْغَمِّ أَمَنَةً نُّعَاسًا يَغْشَى طَآئِفَةً مِّنكُمْ وَطَآئِفَةٌ قَدْ أَهَمَّتْهُمْ أَنفُسُهُمْ - ٣/١٥٤}.

واتە: پاش ئەو ترس‌و بیمە خودای گەورەو مەزن بە میهرەبانی خۆی ئارامی‌و ئاسایشی نارد بۆتان، بەڕەنگێ سەرەوە نەوزگرتنێ تاقمێكتانی داگیر كرد، وەلحاڵ تاقمێكی تریشتان (كەناپاك‌و مونافیقەكانن) هەرخەمی سەردەركردن‌و بەرژەوەندی خۆیان بوو، هیچ دەربەستێ بەرژەوەندی ئیسلامیان نەبوو.

٣٧٨١- وعنه قال: رَفَعْتُ رَأْسِي يَوْمَ أُحُدٍ فَجَعَلْتُ أَنْظُرُ وَمَا مِنْهُمْ يَوْمَئِذٍ أَحَدٌ إِلاَّ يَمِيدُ تَحْتَ حَجَفَتِهِ مِنَ النُّعَاسِ فَذَلِكَ قَوْلُهُ عَزَّ وَجَلَّ (ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّن بَعْدِ الْغَمِّ أَمَنَةً نُّعَاسًا يَغْشَى طَآئِفَةً مِّنكُمْ). رواه الترمذي بسند صحيح[٢٨].

دیسان دەڵێ: لەڕۆژی ئوحوددا لەوكاتەدا كە خودا بەبەخشش (كەرەم)ی خۆی دڵنیایی‌و ئاسایش‌و ئارامی دڵی بۆمان ناردو سەرەوەنەوز

---

[٢٧] بخاري. تفسير: ٤٥٦٢.

[٢٨] حديث صحيح.

دایگرتین‌و کەوتینە خەوە نووچکێ‌و وەنەوزەکوتێ، کاتێ کە سەرم هەڵبڕی‌و تەماشای سوپاکەی خۆمانم کرد سەرەنجم دا وا هەموویان نووچ دەبەن‌و لەژێر قەڵغانەکانیانا خەوەنووچکە یانە، ئەمەی من دیم ئەو حاڵەیە کە خودا لەبارەیەوە دەفەرموێ:

{ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّن بَعْدِ الْغَمِّ أَمَنَةً نُّعَاسًا يَغْشَى طَآئِفَةً مِّنكُمْ} (ت-س/ص).

٣٧٨٢- عن ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قال: افتُقدت قَطِيفَةٌ حَمْرَاءُ يَوْمَ بَدْرٍ فَقَالَ: بَعْضُ النَّاسِ لَعَلَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)أَخَذَهَا فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ (وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّ وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ثُمَّ تُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ) رواه أبو داود والترمذي بسند حسن[٢٩].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: لەڕۆژی بەدرا پارچەیەك قەیفەی سوور لەتالانییەکە بزر بوو، جا هەندێ کەس گوتیان: ڕەنگ بێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بردبێتی! جا خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ:

{وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّ وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ثُمَّ تُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ - ٣/١٦١}.

واتە: شایستەی شانی پێغەمبەران نییە، کە دەستپیسی بکەن لەماڵی تالانی، گەندە دزی دوورە لەشانی پێغەمبەران، بەتایبەتی ئەم پێغەمبەرە نازدارە قەت شتی وا ناشایستە ناکا، وەهەر کەسێ بە نارەوا شتێ قول بداو بیبا بۆخۆی لەڕۆژی قیامەتا، بەبەر چاوی دۆست‌و دوژمنەوە، دەینێ بەنەڕەی شانیەوەو دەیهێنێ بۆ مەیدانی لێ پرسینەوەو شەرمەزار دەبێ، لەپاشا، هەموو کەسێ تۆڵەو پاداشی خۆی لەسەر چاکەو خراپەی خۆی بەتەواوی وەردەگرێ، بەقەی سەری دەرزییەك زۆرو ستەمی لێ ناکرێ (د/ت - س/ح).

٣٧٨٣- عن جَابِرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قال: لَقِيَنِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)فَقَالَ: لِي يَا جَابِرُ مَا لِي أَرَاكَ مُنْكَسِرًا. قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ اسْتُشْهِدَ أَبِي قُتِلَ يَوْمَ أُحُدٍ وَتَرَكَ عِيَالاً

---

[٢٩] حديث حسن.

وَدَيْنًا. قال: أَفَلاَ أُبَشِّرُكَ بِمَا لَقِيَ اللَّهُ بِهِ أَبَاكَ؟. قُلْتُ بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: مَا كَلَّمَ اللَّهُ أَحَدًا قَطٌّ إِلاَّ مِنْ وَرَاءِ حِجَابٍ وَأَحْيَا أَبَاكَ فَكَلَّمَهُ كِفَاحًا فَقَال: يَا عَبْدِي تَمَنَّ عَلَيَّ أُعْطِكَ. قال: يَا رَبِّ تُحْيِينِي فَأُقْتَلَ فِيكَ ثَانِيَةً. قال: الرَّبُّ عَزَّ وَجَلَّ إِنَّهُ قَدْ سَبَقَ مِنِّي أَنَّهُمْ إِلَيْهَا لاَ يُرْجَعُونَ. قال: وَأُنْزِلَتْ هَذِهِ الآيَةُ (وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتًا بَلْ أَحْيَاء عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ)[٣٠].

جابیر (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەرم پێ گەیشت (درودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرمووم: ئەی جابیر! دەتبینم قوپاویت، چ خێرتە؟ عەرزم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! کە ڕۆژی ئوحود باوکم شەهید بوو، خێزانو قەرزێکی زۆری بەسەردا بەجێ هێشتووم بیر لەوە دەکەمەوە فەرمووی: حەزدەکەی باسی ئەوەت بۆبکەم کە خودا چەند بەخۆشی پێشوازی لەباوکت کرد؟ گوتم: فەرموو، ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: هەرگیز خودای گەورە (لەپشتی پەردەوە نەبێ) قسەی لەگەڵ کەسێ نەکردووە بەڵام باوکتی زیندوو کردەوەو بەبێ پەردەو ڕوو بەڕوو، قسەو گوفتوگۆی لەگەڵ داکرد، فەرمووی پێی: ئەی بەندەی خۆم دڵت چی دەخوازێت داوای بکە لێم دەیدەم پێت ئەویش گوتی: ئەی پەروەردگارم! زیندووم بکەرەوە، هەتا دیسانەوە لەپێناوی تۆدا دەکوژرێمەوە! پەروەردگاری گەورەو سەروەریش فەرمووی: لەمێژەوە بڕیارەو داومە ئەوەی لەم دنیایە دەرچوو جارێکی تر ناگەڕێتەوە بۆ جیهان جابیر گوتی: جا خودا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە:

{وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ أَمْوَاتًا بَلْ أَحْيَاء عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ – ١٦٩/٣}.

واتە: گومان مەبەن بەوکەسانە کوژراوون لەڕێگەی خودادا، کەئەوانە مردوون، بەڵکوو ئەوانە نەرمردوونو زیندوونو لەخزمەتی خودادان، وە زۆر بەقەدرو ڕێزەوە خودا رزقو ڕۆژی یان بۆ دەنێرێ، لە حەیاتێکی حەقیقیو

[٣٠] حديث حسن عند الترمذي.

ژیـانێکی ڕاسـتدا، لەجەسـتەیەکی بـەرزەخیی ناسـك، وەك جیـسمی لـەتیفی فریـشتە هـەتا ڕۆژی قیامـەت ئـاوا دەژیـن‌و دەمێـنن، تـا کـاتی حەشـر ئەوسـا دەڕۆنـەوە بـەرگ‌و لەشـە پێـشووەکەیان‌و شـادمان‌و دڵخۆشـن بـەو بـەهرەو بەخشـشەی کـەخودا بـەهۆی سـەربەرزیی شـەهید بوونـەوە، بەفـەزڵی خـۆی داویەتی پێیان، وە موژدە دەدەن بەو کەسانە کە هێشتا لـە ژیانـان‌و شـەهید نـەبوون کەخـەمی مـردن‌و شـەهید بوونیـان نـەبێ، چـونکە شـەهیدان‌و پیـاو باشان لەودنیادا نەترسیان لەسەرەو نەخەمیان لەبەرە، کەوتوون بەسەر خێرو خۆشـی داو خـودا ڕووی خێـری لێیانـەو زۆر زۆر بـەم حاڵـەی خۆیـان کەیفخۆش‌و دڵشادن، بەتایبەت لەسەر ئەوەی کەدەرکەوتووە بۆیان کە خودا پاداش‌و مزی موسوڵمانان بە زیادەوە دەداتەوە. (ت–ح/ح).

٣٧٨٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ سُئِلَ عَنْ هذه الآية: (وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتًا بَلْ أَحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ) فَقَالَ: إِنَّا سَأَلْنَا عَنْ ذَلِكَ فَأُخْبِرْنَا أَنَّ أَرْوَاحَهُمْ فِي طَيْرٍ خُضْرٍ تَسْرَحُ فِي الْجَنَّةِ حَيْثُ شَاءَتْ وَتَأْوِي إِلَى قَنَادِيلَ مُعَلَّقَةٍ بِالْعَرْشِ فَاطَّلَعَ إِلَيْهِمْ رَبُّكَ اطِّلاَعَةً فقال: هَلْ تَسْتَزِيدُونَ شَيْئًا فَأَزِيدُكُمْ؟ قَالُوا رَبَّنَا وَمَا نَسْتَزِيدُ وَنَحْنُ فِي الْجَنَّةِ نَسْرَحُ حَيْثُ شِئْنَا ثُمَّ اطَّلَعَ إِلَيْهِمُ الثَّانِيَةَ فقال: هَلْ تَسْتَزِيدُونَ شَيْئًا فَأَزِيدُكُمْ فَلَمَّا رَأَوْا أَنَّهُمْ لَمْ يُتْرَكُوا قَالُوا تُعِيدُ أَرْوَاحَنَا فِي أَجْسَادِنَا حَتَّى نَرْجِعَ إِلَى الدُّنْيَا فَنُقْتَلَ فِي سَبِيلِكَ مَرَّةً أُخْرَى. وزاد في رواية: وتقرئ نبيَّنا السَّلام وتُخبره عنَّا أنَّا قد رضينا ورضي عنَّا. رواهما الترمذي[٣١].

لەبارەی هۆی هاتنی ئەم ئایەتەوە پرسیار کرا لە عەبدوڵڵا (خودای لـێ ڕازی بێ) گوتی: لەم بارەیەوە ئێمەیش پرسیارمان کرد، لـە وەڵاما پێمـان گـوتراوە: کـە گیـانی شـەهیدان وان لـەناو چـەن مـەلێکی سـەوزدا وە ئـەو مەلانـە لـەناو بەهەشتا بەئارەزووی خۆیان گەشت دەکەن‌و حەزیان لەچی بێ دەیخۆن، جا دەگەڕێنەوە بۆ ناو چەن چرایێ، کە هەڵاوەسراون لەسێبەری تەخت‌و بارەگا

---

[٣١] مسلم. إمارة: ٤٨٦٢. ترمذي. تفسير القرآن: ٣٠١١. إبن ماجه. جهاد: ٢٨٠١.

(عەرش)دا. جا جارێ پەروەردگاری تۆ سەردەکێشێتە ناویان و دەفەرموێ: حەزتان لەچی ترە هەتا بیدەم پێتان؟ دەڵێن: ئەی پەروەردگاری ئێمە! لەمە زیاتر چی ترمان بوێ، کەوا بۆ خۆمان لەناو بەهەشتا بەئارەزووی خۆمان دەخوین و ڕادەبوێرین! بەڵام دیسانەوە خودا سەردەکێشێتەوە بۆناویان و دەفەرموێ: حەزتان لەچی ترە هەتا بیدەم بەئێوە؟ جا کاتێ شەهیدەکان دەبینن خودا وازیان لێ ناهێنێ تا داوای شتێ تر نەکەن عەرزی دەکەن: گیانمان بکەرەوە بەبەرمان دا، هەتا بگەڕێینەوە بۆ جیهان، هەتا جارێکی تریش دیسانەوە لەپێناوی تۆدا بکوژرێینەوە (م/ت) لەگێڕانەوەیەکی تیرمیزیدا ئەمەی پترە: وە سڵاومان بگەیەنە بە پێغەمبەرمان هەواڵی خۆش گوزەرانی ئێمەی پێ بفەرموو، کەوا ئێمە لەخودای گەورە خۆش نوودین و خوداش لەئێمە خۆش نوودە.

قَالَ اللّٰهُ تَعَالَى: {الَّذِينَ اسْتَجَابُواْ لِلّهِ وَالرَّسُولِ مِن بَعْدِ مَآ أَصَابَهُمُ الْقَرْحُ لِلَّذِينَ أَحْسَنُواْ مِنْهُمْ وَاتَّقَواْ أَجْرٌ عَظِيمٌ - ٣/١٧٢}.

واتە: ئەو کەسانەی کە گوێیان شل کرد بۆ فەرمانی خوداو پێغەمبەری خوداو لەسەر فەرمانی ئەوان کەوتنە ڕێ بەشوێنی دوژمن دا، لەپاش ئەو هەموو کوشت و کوشتارەی کە لێیان کرابوو لەغەزای ئوحوددا، وە بەوە چاویان نەشکاو وورەیان بەرنەدا، بۆ ئەوانە (کە خاوەنی ئەو چاکەو مەردایەتی و لەخۆ بوردن و لەخودا ترسان و تەقوایەن) پاداشی باش و بەش و بارەیەکی گەورە هەیە.

٣٧٨٥- قالت عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنها): لِعُرْوَةَ بن الزُّوبيرِ يَا ابْنَ أُخْتِي لَمَّا أَصَابَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)مَا أَصَابَ يَوْمَ أُحُدٍ، وَانْصَرَفَ عَنْهُ الْمُشْرِكُونَ خَافَ أَنْ يَرْجِعُوا فَقَال: مَنْ يَذْهَبُ فِي إِثْرِهِمْ؟. فَانْتَدَبَ مِنْهُمْ سَبْعُونَ رَجُلاً، كَانَ فِيهِمْ أَبُو بَكْرٍ وَالزُّبَيْرُ. رواه البخاري في غزوة أحد[٣٢].

[٣٢] تقدم في مجلد خامس. تسلسل / ٨١ رقم: ٤ / ٣٢٧٨.

عائیشە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) بەعورووەی کوڕی زوبەیری گوت: ئەی خوشکەزام! کاتێ کەلەڕۆژی غەزای ئوحوددا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تووشی ئەو دەردی سەرییە بوو، کە گەلێ لەیارانی کوژران و زاماربوون، کەلەشکری بتپەرستەکان گەڕانەوە بۆ مەککەی پیرۆز، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مەترسی ئەوەی کرد کە دیسان لەناکاو دوژمن بگەڕێتەوە بۆ سەریان، جا لە بەرئەوەو لەبەر ئەوەیش کە وورەی موسوڵمانان بەرزبێ و بەوزیان و کوشت و کوشتارە چاوە ترسێن نەبن و دڵیان نەترسێ فەرمووی: کێ دەڕوا بەشوێنیانا؟ جا حەفتا پیاوی لێ هەڵبژاردن و ناردنی، ئەبو بەکرو زوبەیریشیان تیابوو (ب) ⇦ (ب/٥ ز/١٠ ل/٨١).

٣٧٨٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) قال: (حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ) قَالَهَا إِبْرَاهِيمُ (عَلَيْهِ السَّلَامُ) حِينَ أُلْقِيَ فِي النَّارِ، وَقَالَهَا مُحَمَّدٌ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) حِينَ قَالُوا (إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُوا لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَانًا وَقَالُوا حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ)[٣٣].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەوکاتە کە ئیبراهیم فڕەدرایە ناو مەنجەنیقەکەوە فەرمووی: {حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ}وە موحەممەدیش (دروودی خودای لەسەر بێ) دیسان هەر وایفەرموو، ئەوکاتەی دەیان گوت پێی:

{إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَاناً وَقَالُواْ حَسْبُنَا اللّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ - ١٧٣/٣}.

واتە: ئەو مەردانە مەردایەتییەکی تریشیان هەیە، کاتێ کەهەندێ کەس (بۆ ئەوەی دڵیان سارد بکەنەوەو زەندەقیان بەرن، تا نەچن بۆ ڕوو بەڕوویی دوژمن) پێیان دەگوتن: کە سوپایەکی گەورەی بتپەرستەکانی مەککە، بە سەرۆکایەتی ئەبو سوفیان، گردبوونەوەو گەلەکۆمەیەکی گەلێ گەورەیان لێ کردوون و دەیانەوێ بدەن بە سەرتاناو ڕیشە کەنتان بکەن، کەوابوو، دەرمەچن و مەڕۆن بۆ شەڕ لەگەڵیانا و شەڕی خۆ ترێن مەکەن و خەمی خۆتان

---

[٣٣] بخاري. تفسیر: ٤٥٦٣.

هەبێو ترسی ماڵو منداڵی خۆتان هەبێو سەری خۆتان بەلایەکا دەرکەن، کەچی ئەوان مەردانەو شێرانە ئەوقسە نابارەو ئەو هەڕەشەو گوڕەشە ناهەموارەو ئەو پیلانە زەهرداره ئەوەندەی تر شێری کردنو ئیمانو باوەڕی پترکردنو دڵی ئەستوور تر کردنو وورەی بەرزتر کردنو لەکانی دڵیانەوە بەزمانێکی پاراو دەیانگوت: {حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ} ئێمە خودامان بەسە، خودا کەسی ئێمەیە، هەر خودایە پشتو پەنامان دیارە کەباشترین پشتو پەنایش خودای گەورەو تەوانایە (بوخاری — پرگزیی پیرۆزی لەنووری خودا بێ).

٣٧٨٧- وعَنْهُ قال: كَانَ آخِرَ قَوْلِ إِبْرَاهِيمَ حِينَ أُلْقِيَ فِي النَّارِ حَسْبِيَ اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ. رواهما البخاري[٣٤].

دیسان ئەو گوتی: کاتێ ئیبراهیم فڕێ درایە ناو مەنجەنیقەکەوە دوا ووتەی کە گوتی ئەوە بوو فەرمووی: {حَسْبِيَّ اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ} من خودام بەسەو باشترین پشتو پەنا هەر خودایەو بەس (ب):

هەرکەسێ کەسە یەزدانی بەسە

خودا بۆ خواناس لەجێی گشت کەسە!

فەرموودەی خوایە خولاسەی قسە:

خودا بۆ دۆستی لەجێی پاو دەسە!!

٣٧٨٨- (ب/٢ ز/٢ ل/١١ ف/٣)[٣٥].

٣٧٨٩- وَعَنْهُ أي (عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ) عن النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قال: إِنَّ مَوْضِعَ سَوْطٍ فِي الْجَنَّةِ لَخَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا اقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ (فَمَنْ زُحْزِحَ عَنِ النَّارِ وَأُدْخِلَ الْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلاَّ مَتَاعُ الْغُرُورِ). رواه الترمذي بسند صحيح[٣٦].

---

[٣٤] بخاري. تفسير: ٤٥٦٤.

[٣٥] تقدم في مجلد ثاني. تسلسل / ٢ رقم: ٣ / ١١٨٤.

[٣٦] حديث صحيح عند الترمذي.

**دیسان ئەبوهورەیرە** (خودای لێ ڕازی بێ) **لە حەزرەتەوە** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: بەقەد شوێنی یەك قەمچی لەبەهەشتا باشترە لەجیهان و لەهەرچی لەجیهان دا هەیە، جا ئەگەر حەز دەکەن بۆ ڕاست و دروستی ئەم قسەیە ئەم ئایەتە بخوێننەوە:**

{فَمَن زُحْزِحَ عَنِ النَّارِ وَأُدْخِلَ الْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ وَما الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلاَّ مَتَاعُ الْغُرُورِ – ٣/١٨٥}.

**واتە: هەموو گیانداری پیاڵەی مەرگ دەنوشێ، کەس نییە (غەیری خودا خۆی) کە تامی مەرگ نەچێژێ، زیندەوەران هەموو گیای مردنن، وەگەلێ هەڵوێست و قۆناغی سەخت و ناخۆشتان لەپێشەوەیە، پاداش و تۆڵەی هەرە تەواویش تەنیا ئەو ڕۆژە وەردەگرنەوە کەلە گۆڕ هەڵ دەسنەوەو بەرەو دەشتی مەحشەر دەکشێن و خێزی بۆ دەکەن، هەڵوێست وا شلۆق دەبێ و ڕۆژ وا ئاڵۆز دەبێ ئەوەی بەپەلەپرووزەو بە چنگە کرێش سەری خۆی دەرکاو لەدەس دۆزەخ خۆی قوتار کاو بەهەر حاڵێ و بە هەر جۆرێ بێ خۆی بگەیەنێتە ناو بەهەشت ئەوە بەڕاستی بەئاواتی گەورەی خۆی دەگاو مایەی ڕزگاری خۆی مسۆگەر دەکا، ئەوەش (باش باش) بزانن ژیانی دنیاو خۆشی و ڕابواردنی ئەم جیهانە لەچاو ئەو جیهانا دەرزی بەدەریایە، لەگەڵ ئەوەشا گەلێ جار دەبێ بەهۆی لەخۆبایی بوونی پیاو خراپان (ت-س/ص).**

**٣٧٩٠**- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رِجَالاً مِنَ الْمُنَافِقِينَ كَانُوا إِذَا خَرَجَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إِلَى الْغَزْوِ تَخَلَّفُوا عَنْهُ وَفَرِحُوا بِمَقْعَدِهِمْ خِلاَفَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَإِذَا قَدِمَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) اعْتَذَرُوا إِلَيْهِ وَحَلَفُوا وَأَحَبُّوا أَنْ يُحْمَدُوا بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا فَنَزَلَتْ (لاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَا أَتَواْ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُواْ بِمَا لَمْ يَفْعَلُواْ فَلاَ تَحْسَبَنَّهُمْ بِمَفَازَةٍ مِّنَ الْعَذَابِ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ) رواه البخاري هنا ومسلم في صفة المنافقين[٣٧].

---

[٣٧] بخاري. تفسير: ٤٥٦٧.

ئەبو سەعید (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: لەکاتی پێغەمبەر خۆیدا (دروودی خودای لەسەر بێ) چەن پیاوێ هەبوون، مونافق و ناپاك بوون، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەچوو بۆ غەزا ئەوان بەفێڵ و فەرەج خۆیان دەدزییەوەو لەگەڵیا نەدەچوون بۆ ئەو غەزایە، وەبەمەی کەلەماڵەوە دادەنیشتن و دەمانەوە، بە پێچەوانەی حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) کەیف خۆش بوون، وە کاتێکیش پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەهاتەوە لەو غەزایە دەچوونە خزمەتی و بەهانەی درۆیان دەهێنایەوەو سوێندیان لەسەر دەخواردو کەیفیان بەوە دەهات کە بەبەلاش لەسەر شتێ کەنەیانکردووە سوپاس و تاریف بکرێن! ئیتر ئەم ئایەتە دابەزی:

{لاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَا أَتَواْ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُواْ بِمَا لَمْ يَفْعَلُواْ فَلاَ تَحْسَبَنَّهُمْ بِمَفَازَةٍ مِّنَ الْعَذَابِ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ - ١٨٨/٣}.

واتە: ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! تۆیش ئەی پیاوی موسوڵمان! وا مەزانە ئەوانە کە دڵشادو شادمان دەبن بەکردەوەی ناشیرینی خۆیان و حەز دەکەن کەلەسەر شتێکی باش کە بەدرۆ دەڵێن کردوومانە بەڵام نەیانکردووە بەبەلاش سوپاس و وەسپ بکرێن، قەت وامەزانە کە ئەوانەو وێنەی ئەم ساختەکارانە لەدەست تۆڵەو سزاو قاری خودا قوتار دەبن و لەپەنایەکدا ئاسوودەو سەرفراز ستار دەگرن، شتی وانییە، بەڵکوو بۆ ئەوانە هەیە سزای بەسوێ و ئازاری ئێش بەناو دڵ گەیێن! (ش- (خودای لێ ڕازی بێ)).

٣٧٩١- قال: مَرْوَانُ لِبَوَّابِهِ اذْهَبْ يَا رَافِعُ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فَقُلْ لَئِنْ كَانَ كُلُّ امْرِئٍ فَرِحَ بِمَا أُوتِيَ، وَأَحَبَّ أَنْ يُحْمَدَ بِمَا لَمْ يَفْعَلْ، مُعَذَّبًا، لَنُعَذَّبَنَّ أَجْمَعُونَ. فَقَالَ: ابْنُ عَبَّاسٍ وَمَا لَكُمْ وَلِهَذِهِ وإِنَّمَا دَعَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)يَهُودَ فَسَأَلَهُمْ عَنْ شَيْءٍ، فَكَتَمُوهُ إِيَّاهُ، وَأَخْبَرُوهُ بِغَيْرِهِ، فَأَرَوْهُ أَنْ قَدِ اسْتَحْمَدُوا إِلَيْهِ بِمَا أَخْبَرُوهُ عَنْهُ فِيمَا سَأَلَهُمْ، وَفَرِحُوا بِمَا أُوتُوا مِنْ كِتْمَانِهِمْ، ثُمَّ قَرَأَ ابْنُ عَبَّاسٍ (وَإِذَ أَخَذَ اللّهُ مِيثَاقَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ لَتُبَيِّنُنَّهُ

لِلنَّاسِ وَلاَ تَكْتُمُونَهُ) وتلا: (لاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَا أَتَوْا وَيُحِبُّونَ أَنْ يُحْمَدُوا بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا فَلاَ تَحْسَبَنَّهُمْ بِمَفَازَةٍ مِّنَ الْعَذَابِ). رواه البخاري والترمذي[٣٨].

کاتێ کە مەڕوان سەرداری سەر شاری مەدینە بوو، گوتی بەدەرکەوانەکەی خۆی: ئەی ڕافیع! ئادەی بڕۆ بۆلای ئیبنو عەبباس پێی بڵێ: خۆ ئەگەر هەموو کەسێ سزاو ئازار بدرێ لەسەر ئەوە کە شادمان ببێ بەوەی کەدەستی دەکەوێو حەز بکا بە خۆڕایی سوپاس بکرێ لەسەر شتێ کە خۆی نەیکردبێ، خۆ ئەگەر ئەمە وابێ ئەوا کەسمان لەقیامەتا ڕزگارمان نابێو هەموومان سەرجەم سزاو ئازار دەدرێین چونکە کێ هەیە (مەگەر بەدەگمەن) کەماڵو منداڵو مایەو پایەو وەسپی ڕاستو درۆی پێ خۆش نەبێ؟ ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: ئێوە چیتانە بەسەر ئەم باسەوە؟! ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە لەشانی جوولەکەکانا، جارێ حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) بانگی کردنو پرسیاری شتێکی لێیان کرد، ئەوان شتەکەیان شاردەوەو حەشاری وەڵامە ڕاستەکەیان داو بە پێچەوانەی ئەوەوە شتێکی تریان پێی گوت ئەنجا وایان نیشانی حەزرەت دەدا کە وەڵامی پرسیارەکەی ئەویان بەڕاستی داوەتەوەو کەوا بێ دەبێ حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) سوپاسو تاریفیان بکا، وە شادمان بوونو دڵشاد بەوەی کە ڕاستییەکەیان شاردبۆوەو کەتمی حەقیقەتەکەیان کردووە، ئینجا ئیبنو عەبباس ئەم دوو ئایەتەی خوێندەوە ئایەتی:

{وَإِذَ أَخَذَ اللّهُ مِيثَاقَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ لَتُبَيِّنُنَّهُ لِلنَّاسِ وَلاَ تَكْتُمُونَهُ - ١٨٧/٣}.

کە ئەم ئایەتەیان لەم شوێنەدا لەپێشەوە ڕۆیشت ⇦ (ب/١ ز/١٥ ل/٨٣) وە ئەم ئایەتەشی خوێندەوە:

---

[٣٨] بخاري. تفسير: ٤٥٦٨ ، ١٦٤٨ ، تجريد. مسلم: صفات المنافقين: ٦٩٦٥. ترمذي: تفسير القرآن: ٣٠١٤.

{لاَ تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَا أَتَواْ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُواْ بِمَا لَمْ يَفْعَلُواْ فَلاَ تَحْسَبَنَّهُمْ بِمَفَازَةٍ مِّنَ الْعَذَابِ - ٣/١٨٨}. ⇦ (ب/ت -خودای لێ ڕازی بێ).

٣٧٩٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قال: بِتُّ عِنْدَ خَالَتِي مَيْمُونَةَ، فَتَحَدَّثَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مَعَ أَهْلِهِ سَاعَةً ثُمَّ رَقَدَ، فَلَمَّا كَانَ ثُلُثُ اللَّيْلِ الآخِرُ قَعَدَ فَنَظَرَ إِلَى السَّمَاءِ فَقَال: (إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لآيَاتٍ لأُولِي الأَلْبَابِ)، إلى آخر سورة آل عمران. ثُمَّ قَامَ فَتَوَضَّأَ وَاسْتَنَّ، فَصَلَّى إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً، ثُمَّ أَذَّنَ بِلاَلٌ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى الصُّبْحَ. رواه البخاري[٣٩].

⇦ (ب/١ ز/١٨٤ ل/٥٠٣ ف/٢) لێرەدا چەن زیادەبێ هەیە: ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) دەڵێ: شەوێ لەلای مەیموونەی میمکم (کە هاوسەری پێغەمبەر بوو) مامەوە تاوێ حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵ خێزانی گوفتوگۆی کردو لەپاشا ڕاکشاو نووست، کە دوو بەشی شەو ڕۆیشتو بەشی سێهەمی شەو داهات حەزرەت لەخەو هەڵساو دانیشتو تەماشایەکی ئاسمانی کردو ئەم ئایەتانەی خوێندەوە هەتا کۆتایی سوورەتی ئالی عیمران لەوێوە کە دەفەرموێ:

{إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لآيَاتٍ لِّأُوْلِي الألْبَابِ -٣/١٩٠}.

ئەنجا هەڵساو دەسنوێژی گرتو سیواکی کردو ئەوجا یازدە ڕکات نوێژی شەو نوێژی کرد، لەپاشا بیلال بانگی دا بۆ نوێژی بەیانی، ئەنجا حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) دوو ڕکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانی کرد، ئەنجا ڕۆیشت بۆ مزگەوتو لەوێ نوێژی بەیانی بە کۆمەڵ کرد (ب).

٣٧٩٣- عن أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنها) قالت: يَا رَسُولَ اللَّهِ لاَ أَسْمَعُ اللَّهَ ذَكَرَ النِّسَاءَ فِي الْهِجْرَةِ. وكانت أمُّ سلمة أوَّل ظعينةٍ هاجرت الى المدينة فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى:

---

[٣٩] بخاري. تفسير: ٤٥٦٩.

(فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لاَ أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى بَعْضُكُم مِّن بَعْضٍ)(٣/١٩٥). رواه الترمذي. نسأل الله حُسْنَ الرواية آمين.[٤٠]

ئوم سەلەمە (ڕەزای خودای لێبێت) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا، بەرگوێمان ناکەوێ کە خودا لەقورئانا باسی ژنان لەبارەی کۆچکردنەوە بکات؟ ئوم سەلەمە خۆی یەکەم ئافرەتی کەژاوەنشین بوو، کە کۆچی کدبوو بۆ مەدینە، جا خودا ئەم ئایەتەی نادە خوارەوە بۆ پێغەمبەر، کەواتای وایە:

جا خودای گەورە داواکەیانی بەجێ هێناو فەرمووی: بەڕاستی من کردەوەی هیچ خاوەن کارێ لەئێوە زایە ناکەمو ڕەنجی بەبا نادەم، نێر بێ یا مێ، چونکە ئێوە لەناو خۆتانا تێهەڵکێشو سەرو قنگی یەکترین، کەواتە ژنیش وەك پیاو لەلای خودا کردەوەی بەزایە ناچێ:

ئالی عیمرانو سوورەی بەقەرە
پێشەنگن لەبۆ قورئانی گەورە!
ڕۆژی قیامەت کە تەشریف دێنێ
لەدۆستی، دەستی قەدرو ڕێز دەنێ!
قورئان سەراسەر خوانی مەولایە
ووشە بە ووشە فەرموودەی خوایە
پڕە لەمیوەی خۆشی جیا جیایە
هەموو پیتێکی ڕازێکی تیایە
دوێنێ خۆمم دی بە چاوی دڵم
خۆم لەبەرچاو کەو نەوەی سەرچڵم
دڵ بەردی ڕەقە، ڕوو ساجی ڕەشە
چۆن مەلایەکم خۆزکەی بەقەشە*!

[٤٠] سکت عن درجته الشارح.

ئای ئەوە منم، یا خۆ بەڕازە!

خۆی مەلاس داوە لەو بێشە تازە

قەت باوەڕ ناکەم من بەم ئەندازە

دڵم بۆتاوان بێ بە دەروازە!

ئەوەن نالەبار، ئەوەن خوارو لار

ئەوەن بەدڕەفتار، ئەوەن بەدکردار

ئەوەن بێ شوعوور، ئەوەن لەخوا دوور

ئەوەن گوێلەمشت بۆ نەفسی شوروور!

یاران دوورکەون ئەک لەناکاوا

پرشنگی ڕەشیم بکا بە ناوا،

گورگەل ناسایی تێتان بکەوێ

ڕۆژی ڕووناکتان لێ بکا بە شەوێ!!

نووری! گەر درۆناکەی هەتاکەی

بەم هاشو هووشە خۆت بەپەن ئەکەی

وەرە تازووە ڕوو لە خوداکە

ملت لەداوی دنیا جوداکە!!❁

لەدیوەخانێ خودا خۆت داکە

چەشو نمەکی سفرەی خوداکە

وەرگێڕ

---

• قەش: ئەگبەت (فەرهەنگی خاڵ).

❁ خوداکردن ، خۆجێکردنەوە ، دەڵێن: ئاژەڵەکان داکەن ، واتە: بیانکەنە جێگەی حەوانەوەی شەویانەوە. وەرگێڕ

## ٥) سوورەتی نیساء

## بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان (سورة النساء)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

**٣٧٩٤- قال: عُرْوَةُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) سَأَلَتُ عَائِشَةَ عَنْ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى (وَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تُقْسِطُواْ فِي الْيَتَامَى فَانكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاء مَثْنَى وَثُلاَثَ وَرُبَاعَ). فَقَالَتْ: يَا ابْنَ أُخْتِي، هَذِهِ الْيَتِيمَةُ تَكُونُ فِي حَجْرِ وَلِيِّهَا، تَشْرَكُهُ فِي مَالِهِ وَيُعْجِبُهُ مَالُهَا وَجَمَالُهَا، فَيُرِيدُ وَلِيُّهَا أَنْ يَتَزَوَّجَهَا، بِغَيْرِ أَنْ يُقْسِطَ فِي صَدَاقِهَا، فَنُهُوا عَنْ ذلك، إِلاَّ أَنْ يَبْلُغُوا لَهُنَّ أَعْلَى سُنَّتِهِنَّ فِي الصَّدَاقِ، فَأُمِرُوا أَنْ يَنْكِحُوا مَا طَابَ لَهُمْ مِنَ النِّسَاءِ سِوَاهُنَّ[1].**

**عوروە** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پرسیارم کرد لە عائیشە** (خودای لێ ڕازی بێ) **لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە کە دەفەرموێ:**

**{وَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تُقْسِطُواْ فِي الْيَتَامَى فَانكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاء مَثْنَى وَثُلاَثَ وَرُبَاعَ -٣/٤}.**

**کەواتاکەی وایە: ئەگەر ترستان لەوە هەبوو کە عەداڵەت و دادپەروەری نەکەن لەگەڵ ئەوکچە هەتیوانەدا کەوان لەژێر چاودێری ئێوەدا، لە کاتێکا کە خۆتان مارەیان بکەن بۆخۆتان، یا مارەیان ببڕن لە کەسێکی خۆتان ئەگەر لەم حاڵەدا ئەم ترسەتان هەبوو ئەوا بچن ژنێکی تر مارە ببڕن بۆ خۆتان کە بەدڵتان بێ و لەباربێ و واز لەو هەتیوانە بێنن، وە دەتوانن ژنێ یا دوو ژن یا سێ ژن، یا چوار ژن، بەپێی یاسای شەرع بێنن بەمەرجێ کە بەمەرجی سەرەکی دادەنرێ کە ئەوەیە بتوانن عەدالەت و دادپەروەریی بەجێ بێنن لەنێوانیانا. عائیشە** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: ئەی خوارزای خۆم! ئەم ئایەتە**

---

[1] بخاري. تفسير: ٤٥٧٤ ، ٢٤٩٤ ، ٥٠٦٤. مسلم. تفسير: ٧٤٤٤ ، أبو داوود. نكاح: ٢٠٦٨. نسائي: نكاح / ٣٣٤٦ = تجريد البخاري = مختصر صحيح البخاري / ٤ ل / ٤٢٩ رقم: ١٦٤٩ = ٢٧٦٣ ، ٤٥٧٣ ، ٤٦٠٠ ، ٥٠٦٤ ، ٥٠٩٢ ، ٥٠٩٨ ، ٥١٢٨ ، ٥١٣١ ، ٥١٤٠ ، ٦٩٦٥. مسلم. تفسير: ٧٤٤٤. أبوداود. نكاح: ٢٠٦٨. نسائي. نكاح: ٣٣٤٦.

**هاتە خوارەوە لەشانی کچانی بێ باوکدا کە لەلای حەقداریان بن‌و ئەو حەقدارە بچێ لەبەر سامان‌و ماڵی کچەکە یا لەبەرجوانییەکەی مارەی بکا لەخۆی، بەڵام ئەوەندە کەباوبێ مارەیی بۆ دانەنێ، جا خودا نەهی لێ کردن لەکردنی شتی وا، مەگەر بەمەرجێ کەوەك ژنانی تر مارەیی‌و مافیان بۆ دابنێن ئەوە دەبێ، دەنا خودا فەرموویەتی پێیان بڕۆن لەژنانی تر بەدڵی خۆتان ژن بهێنن‌و واز بێنن لەوان (ب – هەزار ڕەحمەتی لێ بێ).**

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَمَن كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِالْمَعْرُوفِ فَإِذَا دَفَعْتُمْ إِلَيْهِمْ أَمْوَالَهُمْ فَأَشْهِدُواْ عَلَيْهِمْ وَكَفَى بِاللّهِ حَسِيبًا} (٦/٤). ⇦ (ب/٣ ز/٣٠ ف/١).

٣٧٩٥- ⇦ (ب/٣ ز/١٤ ل/٣٠ ف/١)[٢].

٣٧٩٦- ⇦ (ب/٣ ز/٣ ل/٦ ف/١) + (ب/١ ز/٢١ ل/١٠٧ ف/١٣)[٣].

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ} (١٢/٤).

٣٧٩٧- ⇦ (ب/٣ ز/٦ ل/١٤)[٤].

٣٧٩٨- وعنه قال: كَانُوا إِذَا مَاتَ الرَّجُلُ كَانَ أَوْلِيَاؤُهُ أَحَقَّ بِامْرَأَتِهِ، إِنْ شَاءَ بَعْضُهُمْ تَزَوَّجَهَا، وَإِنْ شَاءُوا زَوَّجُوهَا، وَإِنْ شَاءُوا لَمْ يُزَوِّجُوهَا، فَهُمْ أَحَقُّ بِهَا مِنْ أَهْلِهَا، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ فِي ذَلِكَ (لاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُواْ النِّسَاء كَرْهًا وَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُواْ بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ)[٥].

**دیسان ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: لەپێش دا دەستووریان وابوو کە پیاوێ دەمرد ژنەکەشی وەکی ماڵەکەی دەبوو بەمیرات‌و کەلەپوور بۆ هەقدارەکانی، ئیتر یا یەکێ لە کەسوکاری مێردە مردووەکەی ئەو ژنەی**

---

[٢] تقدم في مجلد / ٣ تسلسل / ١٤ رقم: ١ / ٢٠٠٣.

[٣] تقدم في مجلد / ٣ تسلسل / ٣ رقم: ١ / ١٩٧١.

[٤] تقدم في مجلد / ٣ تسلسل / ٤ رقم: ١ / ١٩٣٦.

[٥] بخاری. تفسیر: ٤٥٧٩ ، ٦٩٤٨.

مارە دەکرد بۆ خۆی، وەیا مارەیان دەکرد لەکەسێکی تر، وەیا هەر نەیان دەدا بەشوو وە خۆیان لەپێشترو شیاو تر بوون بەو ژنە لەماڵی باوانی جا ئەم ئایەتە هاتە خوارێ:

{لاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُواْ النِّسَاء كَرْهًا وَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُواْ بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ – ١٩/٤}.

واتە: ئەی کەسانێ کە باوەڕتان هێناوە بەخوداو پێغەمبەری خودا! بۆ ئێوە ڕەوا نییە کە ژنان وەکوو میرات وەربگرن، لەپاش مردنی خاوەنەکانیان بەزۆر، وەڕێگەی شووی تازەیان لێ مەگرن، بۆئەوەی بازێ لەو ماڵو مارەییەی کەدەیان کەوێ بەم شێوە ناڕەوایە پێتان بدەنەوە (ب).

٣٧٩٩- و عنه قال: كَانَ الْمُهَاجِرُونَ لَمَّا قَدِمُوا الْمَدِينَةَ يَرِثُ الْمُهَاجِرُ الأَنْصَارِيَّ دُونَ ذَوِي رَحِمِهِ لِلأُخُوَّةِ الَّتِي آخَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)بَيْنَهُمْ، فَلَمَّا نَزَلَتْ (وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَالِيَ) نَسَخَتْ. رواهما البخاري[٦].

دیسانەوە گوتی: لەپێش دا کاتێ کۆچەرییەکان هاتن بۆ مەدینە، یاسای یاران وابوو، کۆچەری کەلەپووری وەردەگرت لەیاریدەدەر، نەوەك کەسو کاری خۆی، بەپێی ئەو پەیمانی برایەتیە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەنێوانیان بەستبووی، ئەم یاسایە هەروا مایەوە، تا کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە:

{وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَالِيَ... – ٣٣/٤}.

واتە: بۆ هەموو کەسێ بڕیاری چەن خزمو کەسو کارێکمان داوە، لەپاش مردنی کەلەپوورەکەی دەگرن ئیتر ئەو یاسایە هەڵوەشایەوە (ب).

٣٨٠٠- ⇦ (ب/٣ ز/٤٥ ل/١١٠ ف/١)[٧].

---

[٦] بخاري. تفسير: ٤٥٨٠.

[٧] تقدم في مجلد / ٣ تسلسل / ٤٥ رقم: ١ / ٢١٤٧.

٣٨٠١- ⇦ (ب/٣ ز/٨١ ل/٢٠٣ ف/٨) + (ب/٣ ز/١٢٥ ل/٣٢٦ ف/١)[٨].

٣٨٠٢- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنها) أَنَّهَا قالت: يَغْزُو الرِّجَالُ وَلاَ يَغْزُو النِّسَاءُ وَإِنَّمَا لَنَا نِصْفُ الْمِيرَاثِ. فَأَنْزَلَ اللَّهُ (وَلاَ تَتَمَنَّوْا مَا فَضَّلَ اللَّهُ بِهِ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبُواْ وَلِلنِّسَاء نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبْنَ). رواه الترمذي[٩].

ئوممو سەلەمە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) گوتی: عەرزی حەزرەتم کرد: قوربان! ئەوەتانێ پیاوان بۆ خۆیان خەبات دەگێڕن‌و دیارە کەپاداشی گەورەی لەسەر وەردەگرن، وە دوو ئەوەندەی ئێمەیش بەشە کەلەپوور لەمیراتی دەبەن بۆ خۆیان! جا خودای مەزن ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە:

{وَلاَ تَتَمَنَّوْاْ مَا فَضَّلَ اللّهُ بِهِ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبُواْ وَلِلنِّسَاء نَصِيبٌ مِّمَّا اكْتَسَبْنَ -٤/٣٢}.

واتە: بەخیلی‌و حەسوودی بەبەشی یەکتری مەبەن، بەش‌و بارەیەك کە خودا بەمەحزی فەزڵ‌و گەورەیی‌و بەخشندەیی خۆی داوێتی بەبازێکتان‌و نەیداوە بەبازێکی ترتان‌و کردوویەتی بەمایەی سەربەرزی‌و پایە بڵندیی بۆیان ئەو بەش‌و بارەیەتان پێ خۆش بێ‌و خۆزگەی بەلاشی بۆ مەخوازن نەبادا سەر بکێشێ بۆ حەسوودی بەیەکتری بردن، وەسەر بۆ بەش‌و چارەنووسی خودایی دانەوێنن‌و هەرکەسە بەبەشی خۆی ڕازی بێ‌و چاو نەبڕێتە بەش‌و بەهرەی کەسێکی تر! ئەمە لەلایێ، لەلایەکی تریشەوە ژن‌و پیاو بەبەری کۆششی خۆیان دەگەن‌و بۆئەمە ژن‌و پیاو وەك یەکن‌و ئەوەی پەیوەندی هەیە بەکۆشش‌و هەوڵدانی بەندەوە، بە سیفەتی ئەوەی کۆشش‌و کەسبە فەرق‌و جیاوازی پیاوو ژن نییە (ت- خودای لێ ڕازی بێ).

٣٨٠٣- ⇦ (ب/٤ ز/٧٩ ل/٢٩٠ ف/١)[١٠].

---

[٨] تقدم في مجلد / ٣ تسلسل: ٨١ رقم: ٨ / ٢٢٩٤.

[٩] سكت عن درجته الشارح.

٣٨٠٤- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قال: صَنَعَ لَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ طَعَامًا فَدَعَانَا وَسَقَانَا مِنَ الْخَمْرِ فَأَخَذَتِ الْخَمْرُ مِنَّا وَحَضَرَتِ الصَّلاَةُ فَقَدَّمُونِي فَقَرَأْتُ (قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ) لاَ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ وَنَحْنُ نَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ. قال: فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَقْرَبُوا الصَّلاَةَ وَأَنْتُمْ سُكَارَى حَتَّى تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ). رواه أبو داود والترمذي بسند صحيح[11].

عەلی (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەوڕەحمانی کوڕی عەوف نانی دروست کردبوو بۆمان‌و بانگی کردین‌و بادەی دەرخوارد داین، جا بەرەبەرە شەراب‌و مەیەکە کاری تێ کردین‌و مەستی کردین، کە نوێژ بوو منیان کرد بە بەرنوێژی خۆیان‌و لەنوێژەکەدا خوێندنی قورئانەکەم لێ تێك چوو، وە لەجیاتی:

{قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ، لَا أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ، وَلَا أَنتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ - ١٠٩/١-٣}.

کە واتای وایە: ئەی موحەممەد! بڵێ بەو ناموسوڵمانانە: ئەی کۆمەڵەی بێ بڕوا! هەرگیز من ئەوە ناپەرستم کە ئێوە دەیپەرستن، وە ئێوەش عیبادەت‌و پەرستیاری ئەو خودا ڕاست‌و دروستەیە ناکەن کە لەسایەی خوداوە من دەیپەرستم. لەجیاتی ئەمە خوێندمەوە: قل يا أيها الكافرون لا أعبد ما تعبدون ونحن نعبد ما تعبدون: بڵێ: ئەی بێ بڕوایینە! من ئەوە ناپەرستم کە ئێوە دەیپەرستن، وە ئێمە ئەوە دەپەرستین کە ئێوە دەیپەرستن. ئیتر خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە.

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَقْرَبُواْ الصَّلاَةَ وَأَنتُمْ سُكَارَى حَتَّىَ تَعْلَمُواْ مَا تَقُولُونَ - ٤/٤٣}.

---

[10] تقدم في المجلد الخامس. تسلسل: ٧٩ رقم: ١ / ٣٦٢٧.

[11] صحيح عند الترمذي.

واتــە: ئــەی موســوڵمانینە! کــاری نابــەجێ مەکــەن، کەواتــە لــەکاتی مەستیو سەرخۆشی دا نزیکی نوێـژ مەکەون، نوێـژ کۆڵەکەی دینە کورۆکی خوداناسـینە، کەواتـە نوێـژو سـەر خۆشـییان نـەگوتووە، چـونکە نوێـژ دڵـی هۆشــیاری دەوێ، هــەتا بــزانن چــی دەڵــێنو لەخزمــەتی خــودای خۆتانــا ڕاوەستاون (د/ت – س/ص).

٣٨٠٥- ⇨ (ب/١ ز/٣٩ ل/١٧١ ف/١)[١٢].

قَالَ اللّٰهُ تَعَالَى: {إِنَّ اللّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاء وَمَن يُشْرِكْ بِاللّهِ فَقَدِ افْتَرَى إِثْمًا عَظِيمًا} (٤/٤٨).

یـەزدانی گـەورە دەفـەرموێ: خـودا خـۆی فـەرمانڕەوای هـەرە گەورەیـە، باڵادەسـتی نییـە، چـی بکـا دەیکـا، کـەس مـافی ڕەخنـەی نییـە، خـۆی لەسـەر خۆی بڕیاری داوە کە خۆش دەبێ (ئەگەر مەیل بکا) لەهەر کەسێ کە هاوەڵو هاوبەشی بۆ بڕیار نەدا، گەرچی گوناهی گەورەش بکـا، باتـەو بـەش نـەکا لـەو گوناهـە، وەلــێ لــەو کەســەیە قــەت خــۆش نابــێ کەلەســەر فرەخــواهیو شیرك بمـرێ، چـونکی ئـەوە تـاوانێکی گەلـێ گـەورەی هەڵبەسـتووەو هـەلاتێکی بـێ سەرو بەری کردووە.

٣٨٠٦- ⇨ (ب/١ ز/٤ ل/٣٤ ف/٩)[١٣].

٣٨٠٧- ⇨ (ب/٢ ز/١٧٣ ل/٣٦٣ ف/٣)[١٤].

٣٨٠٨- ⇨ (ب/٥ ز/١١٤ ل/٣٧٣ ف/٢+٣)[١٥].

٣٨٠٩- عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قال: (فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ) رَجَعَ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مِنْ أُحُدٍ، وَكَانَ النَّاسُ فِيهِمْ فِرْقَتَيْنِ فَرِيقٌ يقول:

---

[١٢] تقدم في مجلد أول تسلسل / ٣٩ رقم: ١ / ٣١١.

[١٣] تقدم في مجلد أول تسلسل / ٤ رقم: ٩ / ٣١.

[١٤] تقدم في مجلد ثاني تسلسل / ١٧٣ رقم: ٣ / ١٩١٥.

[١٥] تقدم ابعز تسلسل / ١١٤ رقم: ٢ / ٣١٩٩ ، ٣ / ٣٢٠٠.

اقْتُلْهُمْ. وَفَرِيقٌ يقول: لاَ فَنَزَلَتْ (فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ) وَقَـال: إِنَّهَـا طَيْبَـةُ تَنفِـي الْخَبَثَ كَمَا تَنفِي النَّارُ خَبَثَ الْفِـضَّةِ. رواه البخـاري والترمـذي هنـا ومـسلم في صـفة المنافقين[١٦].

زەیدی کوڕی ثـابیـت (خودای لـێ ڕازی بێ) دەڵـێ: لەغـەزای ئوحـددا، لـەپێش ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ سوپای دوژمندا، کۆمەڵەیێ (کەبەناو لە هاوڕێیانی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) حلێب دەکران) لەسوپای حـەزرەت (درودی خودای لەسـەر بـێ) جیابوونــەوەو کـشانەوەو پــشتی حــەزرەتیان چــۆڵ کــرد، جــا موسـوڵمانان لـەناو خۆیانـا لـەبارەی ئەمانــەوە کـە مەیـدانی مەردایـەتی و ئازایـەتییان چـۆڵ کردبـوو، بـوون بـە دووبـەرەوە، بەرەیـەکیان دەیـانگوت بەحـەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) کەبیانکوژێ، بەرەیەکیشیان عـەرزیان دەکرد کە نەیانکوژێ، تا ئەم ئایەتە دابەزی:

{فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ - ٤/٨٨}.

واتە: ئەوە ئێوە چیتانە کەوا لەشتێکی زۆر ئاشکراو ڕووندا (کە کوفرو ناپاکی ئەو مونافق و ناپاکانەیە) بوون بە دوو بەرەوەو قسەتان یەك ناکەوێ. حـەزرەت (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فـەرمووی: ئـەوە مەدینەیـەو نـاوی خـۆی بـە خۆیەوەیە کە مەشهوورو ناودارە بە طەیبە، کە بەمەعنا پاك و سازو سازگارو خـۆش و بۆنخـۆش و فـەڕدارە، لەبـەر ئەوەیـە کـە چـەپەڵ و پیـسایی و ژەنـگ لادەباو سەرپۆش لەسەر ناپاکان هەڵ دەماڵـێ و مۆری ناپاکییان پێوە دەنـێ، هــەروەك چــۆن ئــاگری مووشــەدەمە چـڵك و ژەنگـاری زیـیــو لادەبــاو ڕووە ڕاستییەکەی دەردەخا کە زیوەکەی باشە یا خراپە! (ب/ت/م).

قَالَ اللّٰهُ تَعَالَى: {وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ اللّـهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَابًا عَظِيمًا - ٤/٩٣} ⇦ ب/٣ ز/٨١ ل/١٩٩.

---

[١٦] بخاري. فضائل المدينة: ١٨٨٤ ، ٤٠٥٠ ، ٤٥٨٩ ، مسلم. حج: ٣٣٤٣ ، ٦٩٦٢ ، ٦٩٦٣. ترمـذي. تفـسير القرآن: ٣٠٢٨.

٣٨١٠- قالَ سَعِيدَ بْنَ جُبَيْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): اخْتَلَفَ فِيهَا أَهْلُ الْكُوفَةِ، فَرَحَلْتُ فِيهَا إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فَسَأَلْتُهُ عَنْهَا فَقال: نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ (وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ) آخِرُ مَا نَزَلَ وَمَا نَسَخَهَا شَيْءٌ. رواه الشيخان وأبو داود في الفتن ولفظه قال: لَمَّا نَزَلَتِ الَّتِي فِي الْفُرْقَانِ (وَالَّذِينَ لاَ يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلاَ يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ وَلاَيَزْنُونَ) قال: مُشْرِكُو أَهْلِ مَكَّةَ نحن فعلنا ذلك كله فَأَنْزَلَ اللَّهُ (إِلاَّ مَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلاً صَالِحًا فَأُولَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ) فَهَذِهِ لأُولَئِكَ قال: وَأَمَّا الَّتِي فِي النِّسَاءِ (وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ) الآيَةُ فَالرَّجُلُ إِذَا عَرَفَ شَرَائِعَ الإِسْلاَمِ ثُمَّ قَتَلَ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ لاَ تَوْبَةَ لَهُ. فَذَكَرْتُ هَذَا لِمُجَاهِدٍ فَقال: إِلاَّ مَنْ نَدِمَ[١٧].

سەعیدی کوڕی جوبەیر (ڕەزای خودای لەسەر بێ) دەڵێ: لە شانی ئەم ئایەتەدا خەڵکی کووفە قسەیان جیاجیا بوو، منیش سواربووم چووم بۆلای ئیبنو عەبباس، کەلەم بارەیەوە لێم پرسی گوتی: ئەم ئایەتە {وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا} دواشتە کە لەم بارەیەوە هاتە خوارەوە، وەهیچیش هەڵی نەوەشاندۆتەوەو حوکمو بڕیارەکەی وەك خۆی ماوە (ش/د). گفتەی ئەبو داوود (کەلەباسی فیتنەدا ئەم فەرمودەیە دەگێڕێتەوە) ئاوایە: کاتێ ئەم ئایەتە دابەزی، کە لە سوورەتی فورقان دایە، کە دەفەرموێ:

{وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَامًا - ٢٥/٦٨}.

کەواتەی وایە: بەندە باشەکانی خودای میهرەبان ڕەوشێکی بەرزی تریشیان هەیە کەئەوەیە: بەس خودای گەورەو مەزن دەپەرستن و داوای هەموو شتێ هەر لەخودا دەکەن، وەکەسێ کە خودا کوشتنی ئەوی قەدەغە کردبێ نایکوژن مەگەر لەبەر هۆیەکی ڕەوای هەق بە پێی شەرع، وە لەهەمان

[١٧] بخاري. تفسير: ٤٥٩٠ ، ٤٧٦٣. مسلم. تفسير: ٧٤٥٧ ، ٧٤٥٨ ، ٧٤٥٩ ، ٧٤٦١. أبوداود. ملاحم وفتن: ٤٢٧٥. نسائي. تحريم الدم: ٤٠١١.

کاتا داوێنپیسی ناکەن‌و داوێنپاك‌و ڕووپاك‌و ڕووسورن کاتێ کەئەم ئایەتە هات هاوبەشپەیداکەرەکانی مەککە گوتیان: ئێمە ئەم تاوانانەمان هەموو کردووە، کەواتە ئیسلام بوونمان چ سوود، جا خودای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە:

{إِلَّا مَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَالِحًا فَأُوْلَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا - ٢٥/٧٠}.

کە مەعنای وایە: هەرکەسێ یەکێ لەم تاوانانە بکا دەگا بە تۆڵەی سەختی تاوانی خۆی، مەگەر ئەوکەسە نەبێ کەلەپاش کردنی ئەم گوناهانە تەوبەبکاو وازیان لێ بێنێ‌و موسوڵمان ببێ‌و چڵکی کوفر بەنووری ئیسلام بشۆرێ‌و دەست بکا بە کردنی کردەوەی باش‌و کرداروڕەفتاری خۆی باش بکا، ئەوە ئەمانە خودای مەزن گوناهەکانیان دەپۆشێ‌و خراپەکانیان بۆدەکا بەچاکەو خودای میهرەبان‌و گەورە هەمیشە میهرەبان‌و تاوان بەخش بووەو هەروایش دەبێ‌و دەرگای ڕەحمەتی لەئەزەلەوە هەتا ئەبەد هەروازە! ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: دەی ئەم ئایەتەیە بۆ شەرحی حاڵی ئەمانە بوو، هەتا ڕێگەی ئیسلامبوونیان بۆ خۆش بکا، بەڵام ئەو ئایەتەیەی کە لەسوورەتی (نیساء)دایە، کە دەفەرموێ:

{وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ اللّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَابًا عَظِيمًا -٤/٩٣}.

هەرکەسێ موسوڵمانێ بە ناڕەوا بەقەستی بکوژێ ئەوە پاداشی ئەو بکوژە سزای دۆزەخە، هەتا هەتایە لەو سزا سەختەدا دەمێنێتەوە سەرەڕای ئەوەیشە خودا ڕق‌و قاری لێ دەگرێ‌و پەیتاپەیتا نەفرینی لێ دەکاو تابێ دوورتری دەخاتەوە لە میهری خۆی، وە بەدەستی خۆی سزایەکی پڕ ئێش‌و ئازاری بۆ ئامادەکردووە بەڵام ئەم ئایەتەیە جیایە لەوەی پێشوو، ئەمە بۆ کەسێکی وایە کەلەپاش ئەوە شارەزای شەریعەتی ئیسلام ببێ، بچێ بەئارەزوو، بەقەستی، بەناڕەوا، موسوڵمانێ بکوژێ دەی ئەم بکوژە (بەلای

منەوە) سزای ئاگری دۆزەخە، تەوبەو پەشیمانی بۆ نییە، ڕاوی دەڵێ: بەڵام کەئەم قسەیەم باس کرد بۆ موجاهیدو پێیم گوت کە ئیبنو عەبباس ڕای وایە، موجاهید گوتی: هەرکەسێ تەوبە بکا تەوبەی گیرایە.

٣٨١١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: يَجِيءُ الْمَقْتُولُ بِالْقَاتِلِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ نَاصِيَتُهُ وَرَأْسُهُ بِيَدِهِ وَأَوْدَاجُهُ تَشْخُبُ دَمًا يَقُولُ: يَا رَبِّ هَذَا قَتَلَنِي حَتَّى يُدْنِيَهُ مِنَ الْعَرْشِ. فَذَكَرُوا لابْنِ عَبَّاسٍ التَّوْبَةَ فَتَلاَ: (وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا) فَقَالَ: وَمَا نُسِخَتْ هَذِهِ الآيَةُ وَلاَ بُدِّلَتْ وَأَنَّى لَهُ التَّوْبَةُ. رواه الترمذي بسند حسن[١٨].

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) لە حەزرەتەوە دەگێڕێتەوە، دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەر بێ): ڕۆژی قیامەت، شا ڕەگەکانی ملی کوژراو کفارەی خوێنیان دێ، وەك تازە کوژرابێ ئاوا، لەسەر ئەو حاڵە گودلەی بکوژەکەی دەگرێ‌و بەقژە سەری بەکێشی دەکاو دەیهێنێ بۆ بەردەستی خودا هەتا لە تەخت‌و بارەگای خوداوە نزیکی دەکاتەوە عەرزی دەکا: ئەی خودای من! ئەمە منی کوشت! جا عەرزی ئیبنو عەبباسیان کرد: کە حاڵ وابێ ئایا بکوژ (قاتیل) پەشیمانیی بۆ هەیەو ئەگەر تەوبە بکا خودا تەوبەی قەبووڵ دەکا؟ ئەویش {وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا}ی خوێندەوەو گوتی: ئەم ئایەتە نە نەسخ کراوەتەوەو نە حوکمەکەی گۆڕدراوە، کەوابێ لەکوێ تەوبەی بۆهەیە (ت-س/ح) ⇦ (ب/٣ ز/٨١ ف/١١ ل/٢٠٦).

ژین بووە بە چۆم، نێمەش گشت ماسین

لەجێی نۆکسجین خوێناو هەڵ دەمژین

٣٨١٢- وَعَنْهُ قَالَ: مَرَّ رَجُلٌ مِنْ بَنِي سُلَيْمٍ عَلَى نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَمَعَهُ غَنَمٌ لَهُ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ قَالُوا مَا سَلَّمَ عَلَيْكُمْ إِلاَّ لِيَتَعَوَّذَ مِنْكُمْ فَقَامُوا فَقَتَلُوهُ وَأَخَذُوا غَنَمَهُ فَأَتَوْا بِهَا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم). فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى (يَا أَيُّهَا

---

[١٨] حسن عند الترمذي.

الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا ضَرَبْتُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَتَبَيَّنُوا وَلاَ تَقُولُوا لِمَنْ أَلْقَى إِلَيْكُمُ السَّلاَمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا). رواه الأربعة[١٩].

دیسان گوتی: پیاوێکی بەنی سەلەمەیی، ڕانەمەڕێکی خۆیی پێ دەبێ، لەلای دەستەیێ لەیارانی پێغەمبەرەوە ڕادەبووری (دروودی خوا لەسەر خۆی و ڕەزای خودا لە یارانی) سلاویان لێ دەکا، کەچی دەڵێن: ئەم سلاوەی بۆیەکا لێ کردین، تا خۆی پێ بپەڕێنێتەوە لە ئێمە، جا هەڵ دەستن بۆی و دەیکوژن و ڕانە مەڕەکەی دەبەن و دەیهێنن بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جا بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتە دابەزی:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا ضَرَبْتُمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ فَتَبَيَّنُواْ وَلاَ تَقُولُواْ لِمَنْ أَلْقَى إِلَيْكُمُ السَّلاَمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا -٤/٩٤}.

واتە: ئەی موسوڵمانینە! کاتێ سەفەر دەکەن و دەچن بۆ خەباتگێڕان ئاگاتان لەخۆتان بێ و بچنە بنج و بنەوانی کارو بارو ئەوسا بڕیار بدەن، نەکا بەهەڵەو ناهەق تووشی ناڕەوایی ببن، وە مەڵێن بەوکەسە کە بەسلاوی ئیسلام سلاوتان لێ دەکا: تۆ موسوڵمان نیت (ش/د/ت).

٣٨١٣- عن زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَمْلَى عَلَيْهِ لاَ يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَجَاءَهُ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ وَهُوَ يُمْلِيهَا عَلَيَّ فَقَال: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَاللَّهِ لَوْ أَسْتَطِيعُ الْجِهَادَ لَجَاهَدْتُ وَكَانَ رَجُلاً أَعْمَى. فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)وَفَخِذُهُ عَلَى فَخِذِي فَثَقُلَتْ حَتَّى خفت تَرُضَّ فَخِذِي ثُمَّ سُرِّيَ عَنْهُ فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَلَيْهِ (غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ). رواه البخاري والترمذي[٢٠].

زەیدی کوڕی ثابیت (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خەریك بوو کە {لاَّ يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُوْلِي الضَّرَرِ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ}ی بۆ دەخوێندمەوە تا بینووسمەوە، لەم کاتەدا ئیبنو ئوممی

---

[١٩] بخاري. تفسير: ٤٥٩١. مسلم. تفسير: ٧٤٦٤. أبوداود. الحروف والقرءات: ٣٩٧٤.

[٢٠] بخاري. تفسير: ٤٥٩٢.

مەکتووم (خودای لێ ڕازی بێ) هاتە خزمەتی گوتی: یا ڕەسولەڵلا! ئەی ڕەوانەکراوی خوا! بەخودا، بە یەزدانی پاك، ئەگەر تەوانای غەزاو تێکۆشانو خەباتگێڕانم دەبوو منیش درێغیم نە دەکردو تێدەکۆشام! ئیبنو ئوممی مەکتووم پیاوێکی کوێر بوو. زەید گوتی: لەوکاتەدا ڕانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر ڕانی من بوو، دەست بەجێ خودا لەم بارەیەوە سرووشی بۆ ناردەخوارێ، لەکاتی هاتنی سرووشەکەدا ڕانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر ڕانم وا قورسو گران بوو، وەختە بوو ڕانم ووردو خاش بێ، لەپاش دا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرامۆشی بۆهات خودا ئەم ووشەیەی بە سرووش بۆنارد: (غَيْرُ أُوْلِي الضَّرَرِ) (ب/ت). واتە: لەپاش هاتنی ئەم ووشەیە ئایەتەکە هەم حوکمەکەیو هەم شێوەکەی گۆڕاو ئاوای لێ هات:

{لاَّ يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُوْلِي الضَّرَرِ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ - ٤/٩٥}.

کەواتاو ڕاڤەکەی ئاوایە: وەکوو یەك نین (لەپاداشو تۆڵەی باش دا) ئەو موسوڵمانانە کە دانیشتوونو (بەبێ بەهانەیەکی ڕەوا، وەکوو شەلیو کویرریو نەخۆشی) تەرکی غەزاو خەباتیان کردووە لەگەڵ ئەو موسوڵمانانەدا کەخەبات دەگێڕنو تێدەکۆشن لەڕێگەی خودادا. دیارە کە ئەم ووشەیە وەڵامی پرسیارەکەی عەبدوڵلای کوڕی ئوممو مەکتووم ڕۆشن دەکاتەوە، ئەویش ئەمەیە: ئەوانەی کەبەهۆی بەهانەی ڕەواوە ناچن بۆ غەزاو خەباتو شەڕکردن لەگەڵ دوژمن دا، وەلەهەمان کاتا خاوەنی نیازی پاکنو دۆستو دڵسۆزی ئیسلامن ئەوانەیش خودا بەبەخششی خۆی لەسەر نیازی پاکیان پاداشی تێکۆشەریان دەداتێ!.

٣٨١٤- قال: ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) أَنَّ نَاسًا مِنَ الْمُسْلِمِينَ كَانُوا مَعَ الْمُشْرِكِينَ يُكَثِّرُونَ سَوَادَهم عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَيَأْتِي السَّهْمُ أَحَدَهُمْ فَيَقْتُلُهُ أَوْ يُضْرَبُ فَيُقْتَلُ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى ذِكْرُهُ فِيهِمْ (إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلاَئِكَةُ ظَالِمِي أَنْفُسِهِمْ

قَالُوا فِيمَ كُنْتُمْ قَالُوا كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الأَرْضِ قَالُوا أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُوا فِيهَا فَأُولَئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَسَاءَتْ مَصِيرًا) رواه البخاري[٢١].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) دەڵێ: هەندێ لە موسوڵمانان لەناو بتپەرستەکانی مەککەدا بوون، هێشتا کۆچیان نەکردبوو بۆ مەدینە ڕەشایی و قەرەباڵغی ئەوانیان زۆر دەکردو دەبوون بەهۆی ئەوە کەلە کاتی جەنگ و پێکهەڵپرژاندا تارمایی لەشکری کوفر لەبەر چاوی سوپای ئیسلام زۆرتر بنوێنێ، جا وارێ دەکەوت جارو بار تیرێ دەهات دەیدا لەیەکێکیان، یا دەیکوشت یان زاماری دەکرد موسوڵمانەکانیش دەیانگوت: ئەمانە بەزۆر هێنراون، لەبەر ئەوە بۆیان دەپاڕانەوە، بەڵام خودا ڕێگەی ئەوەی نەدان جا بۆیە خودا تەواوی ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە:

{الَّذِينَ تَتَوَفَّاهُمُ الْمَلائِكَةُ ظَالِمِي أَنفُسِهِمْ - ٩٧/٤}.

واتە: بەڕاستی ئەوکەسانەی کە ستەمیان لەخۆیان کردووە، چونکی بەبێ بەهانەی ڕەوا تەرکی کۆچ کردنیان کردووەو لەباتی ببن بە مایەی خێرو خۆشی بۆ ئیسلام بوون بەهۆی پشت گرتنی بێ بڕواکان و پڕو پاگەندە بۆیان، بەڕاستی ئەو کۆمەڵەیە مەڵبەندی پاشە ڕۆژیان ناو ئاگری دۆزەخە، کە دیارە سەرەنجامێکی زۆر زۆر خراپە، ئەمە حاڵیانە بۆیە فریشتەی گیانکێشان تانەو تەشەریان لێ دەدەن و بە تەوسەوە پێیان دەڵێن: ئەرێ ئێوە لەکوێ بوون و خەریکی چی بوون؟ لەگوێی گادا نوستبوون؟ بۆ ئێوەش مەردانەو پیاوانە بەلایەکا سەرتان دەرنەکردو بەرەو وڵاتێکی باش ڕەوتان نەکرد وەکوو ئەو خەڵکەی تر؟! ئەوانیش گوتیان: ئاخر ئێمە مسکێن و بێ دەستەڵات بووین و دەستەڵاتی هیچمان نییە لەوڵاتا، لەبەر دەستەوسانی خۆمان و زۆر داری ئاغاکانمان یارایی ڕەوکردنمان نەبوو! فریشتەکانیش بەرپەرچی ئەم بیانووە پووچەیان دەدەنەوەو دەڵێن: وڵاتی خودا بەو بەرگوشادییەی خۆی، سەر ڕووی زەوی بەو گەورەییەی خۆی جێی ئێوەی لێ نەدەبۆوە، کە بەلایەکا سەر دەرکەن و ڕەوبکەن بۆ شوێنێکی باش (ب).

---

[٢١] بخاري. تفسير: ٤٥٩٦ ، ٧٠٨٥ = تجريد البخاري / ٤ ل / ٤٣٦ رقم: ١٦٥٣.

٣٨١٥- ثمَّ خفَّف الله تعالى عن الضُّعفاءِ الَّذين مع المشركين فقال: (إِلاَّ الْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَال وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَان لاَ يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةَ وَلاَ يَهْتَدُونَ سَبِيلاً، فَأُوْلَئِكَ عَسَى اللَّهُ أَن يَعْفُوَ عَنْهُمْ وَكَانَ اللَّهُ عَفُوًّا غَفُورًا) قال: ابن عبَّاس (رَضِيَ اللهُ عَنهُما): كُنْتُ أَنَا وَأُمِّي مِمَّنْ عَذَرَ اللَّهُ. رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ[٢٢].

گوتی: لەپاش دا خودای گەورەو مەزن، میهرەبانی خۆی نواند لەگەڵ ئەو موسوڵمانە لازەبوون‌و بێ چارەو کەساسانەدا کەمابوونەوە لەمەککە، لەناو بتپەرستەکاندا، وەلەشانی ئەوانەدا فەرمووی:

{إِلاَّ الْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاء وَالْوِلْدَانِ لاَ يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلاَ يَهْتَدُونَ سَبِيلاً - ٩٨/٤}.

واتە: مەگەر ئەو پیاوو ژن‌و منداڵانە نەبێ کە لازەبوون‌و بێ چارەو کەساس‌و داماون وەکافرەکان زاڵ بوون بە سەریان دا، ئیتر نەخۆیان دەتوانن کە بەفێڵ‌و فەرەج‌و مەهانەیە بەلایەکا سەر دەکەن‌و خۆیان دەرباز کەن، وەنەبێ بڕواکان مەیدانی دەرچوون‌و مەودای ڕەوکردن‌و کۆچ کردنیان پێ دەدەن، بەڵێ ئەمانە کە ئەمە حاڵیانە، دوور نییە لەو خودا بەدادو میهرەبانە، کە لێبوردن‌و چاوپۆشی هەر لەخۆی جوانە، چاوپۆشی بکا لە حاڵی ئەم بەسە زمانانە. ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: مەن‌و دایکم لەم موسوڵمانە لازەبوون‌و بێ چارانە بووین، کە خودا لەم ئایەتەدا باسی کردوون. لەگێڕانەوەیەکا: مەن‌و دایکم لەو موسڵمانانە بووین کە لەمەککە، لەناو بێ بڕواکانا بەجێ مابووین، وەخوا بەهانەی ڕەوای ئەوانی قەبووڵ کردووەو لەم ئایەتەدا باسی کردووە (ب).

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي الأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُواْ مِنَ الصَّلاَةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُواْ إِنَّ الْكَافِرِينَ كَانُواْ لَكُمْ عَدُوًّا مُّبِينًا - ١٠١/٤} ⇨ (ب/١ ز/١٥٥ ل/٤٤٦).

---

[٢٢] بخاري. تفسير: ٤٥٩٧.

٣٨١٦- ⇦ (ب/١ ز/١٥٥ ل/٤٤٦ ف/١)[٢٣].

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلاَةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُواْ أَسْلِحَتَهُمْ فَإِذَا سَجَدُواْ فَلْيَكُونُواْ مِن وَرَآئِكُمْ وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَى لَمْ يُصَلُّواْ فَلْيُصَلُّواْ مَعَكَ وَلْيَأْخُذُواْ حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ وَدَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَاحِدَةً وَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَى أَن تَضَعُواْ أَسْلِحَتَكُمْ وَخُذُواْ حِذْرَكُمْ إِنَّ اللّهَ أَعَدَّ لِلْكَافِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا - ٤/١٠٢}.

واتە: یەزدانی پاك دەفەرموێ: کاتێ تۆ لەناویانا بوویو پێشنوێژیت بۆ کردن، ئەوە با تاقمێکیان بەرەو ڕووی دوژمن ڕاوەستێو، تاقمەکەی تریان ڕاست ببنەوەو دەس بکەن بە نوێژ لەگەڵ تۆداو باھەر کەسێ چەکی خۆی پێ بێو ئامادەگیو ئیحتیاط وەربگرێ نەبادا دوژمن بەھەلی بزانێو ھێرش بێنێ! جا کاتێ ئەم تاقمەیە، سەجدەکانی ڕکاتی یەکەمیان برد لە پشتی تۆوە ئیتر با تۆ بەجێ بھێڵنو بڕۆن لەدواوە بەرەو ڕووی دوشمن ڕاوەستن لەجێگەی تاقمەکەی ترداو ئاگاداربن لەدوژمن، پاش ئەوە تاقمی یەکەم چوونە دواوە با تاقمێ تر کە لەپاشەوە ڕاوەستابوونو، نوێژیان نەکردووە با ئەوانە بێن لەپشت تۆوە نوێژ دابەستنو ڕکاتێ نوێژ بکەن لەگەڵ تۆدا، بەڵام لەبەر ئەوەی لا بۆ دوژمن شل نەبێ با ئەوانیش وەك براکانی پێشوویان ئامادەگی وەربگرنو زیتو ووریاو ھۆشیار بنو گوێ قولاخ بن بۆ جموجووڵی ناحەزانو چەکەکانیان ھەڵبگرنو واتێنەگەن کەئەم ھۆشیاریو لەسەر پێیبیەتان دژی خوشوعو خوضوعی ناو نوێژە، چونکە دوژمن بۆھەل دەگەڕێ خوا خوایەتی کە ئێوە بێ ئاگابن لەچەكو تفاقی خۆتانو لەناکاوێکا، لە ھەلێکا بەیەك ھەڵمەت دابارێن بەسەرتاناو بەیەك جارو بەئێجگاری بنەبڕتان بکەن، کەواتە شەڕەکە شەڕی سەروماڵو ناموسو نیشتمانو ئایینو بوونو مانو نەمانتانە.

---

[٢٣] تقدم في مجلد أول. تسلسل / ١٥٥ رقم: ١ / ٨٩٧.

٣٨١٧- عن أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) نَزَلَ بَيْنَ ضَجْنَانَ وَعُسْفَانَ فَقال: الْمُشْرِكُونَ إِنَّ لِهَؤُلاَءِ صَلاَةً هِيَ أَحَبُّ إِلَيْهِمْ مِنْ آبَائِهِمْ وَأَبْنَائِهِمْ وَهِيَ الْعَصْرُ فَأَجْمِعُوا أَمْرَكُمْ فَمِيلُوا عَلَيْهِمْ مَيْلَةً وَاحِدَةً وَإِنَّ جِبْرِيلَ أَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)فَأَمَرَهُ أَنْ يَقْسِمَ أَصْحَابَهُ شَطْرَيْنِ فَيُصَلِّيَ بِهِمْ وَتَقُومَ طَائِفَةٌ أُخْرَى وَرَاءَهُمْ وَلْيَأْخُذُوا حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ ثُمَّ يَأْتِي الآخَرُونَ وَيُصَلُّونَ مَعَهُ رَكْعَةً وَاحِدَةً ثُمَّ يَأْخُذُ هَؤُلاَءِ حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ فَتَكُونُ لَهُمْ رَكْعَةً رَكْعَةً وَلِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)رَكْعَتَانِ. رواه الترمذي بسند حسن[٢٤].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: لە سەفەرێکا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەنێوانی ضەجنانو عوسفاندا دابەزیو لای دا، بتپەرستەکان گوتیان: ئەمانە نوێژێکیان هەیە کە نوێژی عەصرە لەباوكو دایكو ماڵو منالی خۆیان خۆشەویستترە لە لایان، جاکەوابوو ئادەی خۆتان ئامادەکەنو لەکاتی کردنی ئەو نوێژەدا بەسەریانا بدەنو بەئێجگاری بیانفەوتێنن، جا جوبرائیل (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستووری دایە کە: هاوڕێکانی بکا بە دوو تاقمەوە، لەپێشدا ڕکاتێ نوێژ بەتاقمێکیان بکا، وە لەوکاتەدا تاقمەکەی تر بەڕابەر، دوژمن ڕاوەستنو لەپاشەوە ئاگاداری ئێوە بکەن، لەپاش دا کە تاقمی یەکەم ڕکاتێکیان تەواو کرد ئینجا تاقمەکەی تربێنو ڕکاتێ لەگەڵ پێغەمبەردا بکەنو تاقمی یەکەم بچنە شوێنی ئەوانو ئاگادارییان بکەن، وەدەبێ لەکاتی نوێژەکەدا هەر دوو تاقمەکە چەکی خۆیان پێبێو ئامادەیی تەواو وەربگرنو، بەتایبەتی تاقمی پاسەوان، جا بەم پێیە هەر تاقمەی یەك ڕکات نوێژ دەکەن، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی دوو ڕکات دەکات (ت-س/ح).

٣٨١٧م- عَنْ قَتَادَةَ بْنِ النُّعْمَانِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قال: سُرِقَ طعامٌ وسلاحٌ لعمِّي رفاعة بن زيدٍ فأخبرني بِذَلِكَ فسألنا وتحسَّسنا في الدَّار فقيل لَنا إِنَّهُمْ بنوا بيرقٍ وهُمْ بشيرٌ

[٢٤] حسن عند الترمذي.

وبشرٌ ومُبشّرٌ وكانَ بشيرٌ مُنافقاً يهجُو أصحاب النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بالشِّعر وينسبُه لغيره، وكانوُا أهل بيت حاجةٍ وفاقةٍ في الجاهلية والإسلام فَأتيتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَأَخبَرتُهُ والتمست منه ردَّ السِّلاح فقط، فَقَال: (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) سَآمُرُ فِي ذَلِكَ. فَسَمِعَ بَنُو أُبَيْرِق بهذا فأوفدوا للنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أسيد بْنُ عُرْوَةَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ بَنُو أُبَيْرِق مِنَّا أَهْلِ صَلاَحٍ وَإِسْلاَمٍ يَرْمُونَ بِالسَّرِقَةِ مِنْ غَيْرِ بَيِّنَةٍ وَلاَ ثَبْتٍ، فَرَجَعْتُ وتمنَّيت أنِّي خَرَجْتُ مِنْ بَعْضِ مَالِي وَلَمْ أُكَلِّمْ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فجاءني عَمِّي فَأَخْبَرْتُهُ بِمَا قال: لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)فَقَال: اللَّهُ الْمُسْتَعَانُ فَلَمْ يَلْبَثْ أَنْ نَزَلَ الْقُرْآنُ (إِنَّا أَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ بِمَا أَرَاكَ اللَّهُ وَلاَ تَكُنْ لِلْخَائِنِينَ خَصِيمًا) بَنِي أُبَيْرِق (وَاسْتَغْفِرِ اللَّهَ) أَىْ مِمَّا قُلْتَ لِقَتَادَةَ (إِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَحِيمًا لاَ تُجَادِلْ عَنِ الَّذِينَ يَخْتَانُونَ أَنْفُسَهُمْ إِنَّ اللَّهَ لاَ يُحِبُّ مَنْ كَانَ خَوَّانًا أَثِيمًا. يَسْتَخْفُونَ مِنَ النَّاسِ وَلاَ يَسْتَخْفُونَ مِنَ اللَّهِ وَهُوَ مَعَهُمْ إِذْ يُبَيِّتُونَ مَا لاَ يَرْضَى مِنَ الْقَوْلِ وَكَانَ اللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطًا. هَاأَنْتُمْ هَؤُلاء جَادَلْتُمْ عَنْهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا فَمَن يُجَادِلُ اللّهَ عَنْهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَم مَّن يَكُونُ عَلَيْهِمْ وَكِيلاً) فَلَمَّا نزلت هذه الآيات أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بِالسِّلاَحِ. قال: قَتَادَةُ وكنت أشُكُّ في إسلام عَمِّي رفاعة لأَنَّهُ كَانَ شَيْخًا قَدْ عصى فِي الْجَاهِلِيَّةِ فَلَمَّا أَتَيْتُهُ بِالسِّلاَحِ قال: يَا ابْنَ أَخِي هُوَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَعَرَفْتُ أَنَّ إِسْلاَمَهُ كَانَ صَحِيحًا. فَلَمَّا نَزَلَت هذه الآيات لَحِقَ بَشِيرٌ بِالْمُشْرِكِينَ فَنَزَلَ عَلَى سُلاَفَةَ بِنْتِ سَعْدِ ابْنِ سُمَيَّةَ فَنزلت: (وَمَنْ يُشَاقِقِ الرَّسُولَ مِنْ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَى وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِ مَا تَوَلَّى وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ وَسَاءَتْ مَصِيرًا إِنَّ اللَّهَ لاَ يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلاَلاً بَعِيدًا) فرَمَى حَسَّانُ بْنُ ثَابِتٍ سُلاَفَةَ هذه بِأَبْيَاتٍ مِنْ شِعْر، فَأَخَذَتْ رَحْلَ بشيرٍ عَلَى رَأْسِهَا وَرَمَتْ بِهِ فِي الأَبْطَحِ وَقالت: أَهْدَيْتَ لِي شِعْرَ حَسَّانَ مَا كُنْتَ تَأْتِينِي بِخَيْرٍ. [٢٥م].

**قەتادەی کوڕی نوعمان (ڕەزای خودای لەسەر بێ) دەڵێ: هەنێ خواردەمەنی و بازێ چەکی ریفاعەی کوڕی زەید، کە مامەی من بوو، دزرابوو، مامەم هات**

---

[٢٥م] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

هەواڵی ئەوەی داپێم، کە پرسمان کردو لەم لاولا هەستمان هەڵخست پێمان گوترا: دزەکان بەشیرو بیشرو موبەشیرن، کە هەرسێکیان کوڕی ئوبەیریقن، بەشیریان ناپاك بوو، دەچوو خۆی هەڵبەستی دادەناو دەیکرد بەهی یەکێکی ترو خوسپ (هەجو)ی یارانی پێغەمبەری پێ دەکرد، ئەمانە خۆشیان (چ لەسەردەمی نەزانی داو چ لەسەردەمی ئیسلامەتی دا) خێزانێکی نەداراو ئاتاج و هەژار بوون، جا خۆم چوومە خزمەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) وە مەسەلەکەم عەرزی کرد، وە عەرزم کرد: کە هیچ نەبێ چەکەکانمان بۆ بسەنێتەوە، ئەویش فەرمووی: با بزانم چۆنە بێ، کوڕانی ئوبەیریق، کە ئەمە دەبیستنەوە دەچن ئوسەیدی کوڕی عوروە دەنێرن بۆلای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! کوڕانی ئوبەیریق لە خۆمانن و خێزانێکی باش و موسوڵمانن، بەبێ بەڵگەو شایەت تۆمەتی دزێتییان پیادا دەکەن، کەی شتی وا ڕەوایە. قەتادە گوتی: لەپاشا کەلەم بارەیەوە قسەم لەگەڵ پێغەمبەردا کردەوە فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): بەبێ بەڵگەو نیشان شەڵتاخی دزێتی دەدەیت لە خێزانێکی باشی موسوڵمان! ئیتر منیش بە پەشیمانی گەڕامەوەو لە دڵەوە حەزم دەکرد زیانێکی ماڵی گەورەم لێ بکەوتایە بەڵام لەم بارەیەوە ئەو قسەیەم عەرزی حەزرەت نەکردایە، جاکە مامەم هات بۆلام پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) چی بە من فەرموو بوو بۆم گێڕایەوە، ئەویش گوتی: کەوای لێ هات بیدەرە دەستی خودا، بە پشتی خودا هەموو شت ڕوون دەبێتەوە، ئیتر زۆری پێ نەچوو قورئان لەم بارەیەوە هاتە خوارەوەو فەرمووی:

{إِنَّا أَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ بِمَا أَرَاكَ اللّهُ وَلاَ تَكُن لِّلْخَآئِنِينَ خَصِيمًا، وَاسْتَغْفِرِ اللّهِ إِنَّ اللّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا} هەتا {يكون عليكم وكيلا – ١٠٥-١٠٩}.

واتە: ئێمە قورئانمان ناردووە بۆ تۆ، تا ببێ بە سەرچاوەی هەق و ڕاستی و کانگای هەق پەروەری، هەتا تۆ لەبەر ڕووناکی ئەم چرا درەخشانەو

بەپێی ئەو یاساو دەستوورانەی کە خودا نیشانی داویت حوکمو بڕیار بدەیت لەنێوانی ئەو خەڵکەدا، وە تۆ قەت مەبە بە پارێزەرو کۆمەکی پیاوی گزیکارو ناپاك، وەکوو کوڕەکانی ئوبەریق، وە داوای چاوپۆشی بکە لە خودا، لەهۆی ئەو قسەیە وە کە گوتت بە قەتادە، بەڕاستی خودا چاوپۆشی کەرو میهرەبانە وەبەڕای بەڕای لەسەر ئەوکەسانە مەکەرەوە کە گزیکارو ناپاکی لەخۆیان دەکەن، شتی وا لەتۆوە دوورەو لایەنگیریی ناهەقیو ناڕەوایی لەپایەی پێغەمبەرانەوە دوورە، وەلێ مەبەست ئەوەیە کە تۆ هەمیشە هۆشیارو ئاگاداربیو لەخۆتەوە تا دەستورو سرووشت بۆنەیەو نەچیتە بنجو بنەوانی شتەکە بڕیار نەدەیو تا چاکتر وەستابێ چاك نەکەی! ئەوانە چەن نەفامو بەدن، شەرم لە خەڵك دەکەن، لەبەر ئەوە کاری شەرم ئاوەری حەیابەری خۆیان دەشارنەوەو حاشای لێ دەکەنو لەبەرچاوی خەڵك نایکەنو کە کاتێکیش تاوانەکەیان ئاشکرابوو حاشای لێ دەکەنو بەهەزارو یەك فێڵو فەرەج حەشاری دەدەن، کەچی شەرم لەخودا ناکەنو بەبەرچاوی خوداوە تاوانو گوناە دەکەنو دەربەست نین، خودا ئاگای لەهەموو شتێ، لەهەموو قسەیێ، لەهەموو کردەوەیێ هەیە، باش بێ خراپ بێ، بەشەو بێ بە ڕۆژ بێ، قسەی ناشیرینی ئەوان بێ، یاهی یەکێکی تربێ، لەوون نابێ، خودا ئەگەر وانەبێ خوا نابێ، باشە ئەوا ئێوە لەم ژیانی دنیایەدا (کە ژیانێکی کەمو کورتو بێ بەقایەو پێنجو دوو ڕۆژێکەو دەبڕێتەوە) ئەم بەرگرییەیان لێ دەکەنو لەسەریان دەکەنەوەو قسەیان بۆدەکەن، ئەی کێ سبەینێ لەڕۆژی ڕەستا خێزدا، کەهەموو شتێ پاكو پیس دەکرێ، کێ لەوێ لەلای خودا دەتوانێ لەسەریان بکاتەوەو ببێ بە پارێزەرو دەمڕاستیان؟! دیارە کەس. گوتی: جاکە ئەم چەن ئایەتە هاتن چەکەکەیان هێنایەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ).

قەتادە گوتی: هەتا ئەوکاتە هەر بۆرەگومانێکم هەبوو لە چۆنێتیی موسوڵمانەتیی ڕیفاعەی مامەمدا، چونکە پیاوێکی پیر بوو، لەسەردەمی نەزانی دا گەلێ لەخودا یاخی بوو، بەڵام کە چەکەکەیم بردەوە بۆی گوتی:

ئەی برازای خۆم! ئەوچەکە خێرو وەقفی ڕێگەی خودا بێ، ئیتر زانیم کە موسوڵمانەتییەکەی بەڕاستییەو موسوڵمانی تەواوە. لەپاش ئەوە کەئەم ئایاتانە هاتن بەشیر ڕیسوا بوو، لەبەر ئەوە هەڵهات و ڕۆیشت بۆناو بتپەرستەکان و چوو لەلای سولافەی کچی سەعدی کوڕی سومەییە دابەزی، جائەم دوو ئایەتە هاتنە خوارەوە کە دەفەرموێ:

{وَمَن يُشَاقِقِ الرَّسُولَ مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَى وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِ مَا تَوَلَّى وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ وَسَاءتْ مَصِيرًا، إِنَّ اللّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاء وَمَن يُشْرِكْ بِاللّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلاَلاً بَعِيدًا - ٤/١١٥-١١٦}.

واتە: هەرکەسێ (لەپاش ئەوە کەهەقی بۆدەرکەوت) گەڕو تەشقەڵە بە پێغەمبەری خودا بکاو لەدژی بوەستێ و لەهەق لابداو شوێن ڕێ و شوێنی ناموسوڵمانان بکەوێ و ڕێگەی ڕاستی موسوڵمانان نەگرێ و گۆهەر بگۆڕێتەوە بە خەرموور، ئەوە ئەو ڕێگە پیسەی لێ پیرۆزبێ، تا بەفەرمانی ئێمە دەیباتە ناو نێرینەی ئاگری دۆزەخەوە، دۆزەخیش (لەهەموان) دیارو نومایانە کە جێگەیەکی زۆر خراپ و ناهەموارە، بەڕاستی خودای گەورە (ئەگەر خواستی هەبێ) لەهەموو کەسێ خۆش دەبێ، بەڵام هەرگیز لەوکەسە خۆش نابێ کەهاوەڵ و هاوبەش و شتی وا بۆ خودا بڕیار بدا، وەهەر کەسێ هاوڕێ و هاوبەش قەراربدا بۆ خودا ئەوە بەڕاستی لەڕێگە دەرچووەو ڕێگەی ڕاستی گوم کردووەو لەخودا زۆر دوورکەوتۆتەوە. گوتی: جا حەسسانی کوڕی ثابیت (خودای لێ ڕازی بێ) بەپارچەیێ هۆنراوە زەمێکی خەستی ئەم سولافە ناوەی کردو ڕیسوای کرد، سولافەش لەتاواندا کەل و پەلەکەی بەشیر دەخاتە سەر سەری و هەڵی دەگرێ و دەیبا لەو دوورە، لەشێوی ئەبطەح تووڕی دەدا، دەڵێ: بەخێر نەیەیت و بەملی شکاو بێیت، بۆئەم دەست و دیارییە بۆت هێناوم! هۆنراوەی هەجوی حەسسانت بەدیاریی بۆهێناوم، قەت نەبوو جارێ خێرت پێوە بێ! (ت — سەنەد غەریب).

٣٨١٨- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قال: مَا فِي الْقُرْآن آيَةٌ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ هَـذِهِ الآيَـةِ (إِنَّ اللَّهَ لاَ يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ)[٢٦].

عەلی (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: هیچ ئایەتێکی ترم لە قورئاندا وەك ئەم ئایەتە پێ خۆش نییە کە دەفەرموێ:

{إِنَّ اللّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاء وَمَن يُشْرِكْ بِاللّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلاَلاً بَعِيدًا - ١١٦/٤}. ⇨ (ت-س/ح).

٣٨١٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قال: لَمَّا نَزَلَ (مَنْ يَعْمَلْ سُوءًا يُجْزَ بِهِ) شَقَّ ذَلِكَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ فَشَكَوْا ذَلِكَ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَال: قَارِبُوا وَسَدِّدُوا وَفِي كُلِّ مَا يُصِيبُ الْمُؤْمِنَ كَفَّارَةٌ حَتَّى الشَّوْكَةِ يُشَاكُهَا أَوِ النَّكْبَةِ يُنْكَبُهَا. وفي الرواية: هَـذِهِ مُعَاتَبَةُ اللَّهِ الْعَبْدَ فِيمَا يُصِيبُهُ مِنَ الْحُمَّى وَالنَّكْبَةِ حَتَّى الْبِضَاعَةُ يَضَعُهَا فِي كُمِّ قَمِيصِهِ فَيَفْقِدُهَا فَيَفْزَعُ لَهَا حَتَّى إِنَّ الْعَبْدَ لَيَخْرُجُ مِنْ ذُنُوبِهِ كَمَا يَخْرُجُ التِّبْرُ الأَحْمَرُ مِنَ الْكِيرِ. روى هذه الثلاثة الترمذي[٢٧].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) کە {وَمَن يَعْمَلْ سُوءًا يجز بِهِ} واتە: هەرکەسێ هەر خراپەیێ بکا دێتەوە ڕێیو بەهۆی ئەوەوە جەزرەبە دەدرێ، دەڵێ کە ئەمەهات موسوڵمانەکان پێی سەخڵەت بوونو ترسیان لێ نیشت، چونکە کێ هەیە کەکەم یا زۆر گوناهو خراپەی نەبێ، جا چوونە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) شەکوای حاڵیان لە خزمەتیا کرد، فەرمووی: ئەوەندەی بۆتان دەلوێ درێغی لەکردنی چاکە مەکەنو هەمیشە کاری باش بکەن بە پیشەو ئامانجی خۆتان، هەرچیش دێتە ڕێگەی موسوڵمان دەبێ بە کەففارەتی گوناه بۆی، تەنانەت ئەگەر درکێکیش لە شوێنێکی هەڵچەقێ هەروا، یا هەر چورتمو ناخۆشییەکی تووش دەبێ ئەوانەش برێتیی تاوان دەکەونو پاکی دەکەنەوە. لە گێڕانەوەیەکا: ئەم وورده دەردو بەڵایانە کە

---

[٢٦] سنده حسن عند الترمذي.

[٢٧] سنده حسن عند الترمذي.

دێنە ڕێگەی بەندە ڕازو گلەیی خودایە، لەگەڵ بەندەی خۆیدا دەیکا، بۆ ئەوەی کەبەندە هۆش بکاتەوەو با بداتەوەو بگەڕێتەوە، ئەوەش وەك ئەوە جارو بار بەندە گەندەتایەکی لێ دێ، یاخود تووشی نەگبەتی و سەخڵەتی دەبێ، بگرە ئەو شمەکەش کەبەندە بۆ هەڵگرتن دەیخاتە سەر قۆڵی کراسەکەیەوە، یالە فەقیانەکەی دا گرێی دەدا لەبەر کەم بایەخی وەلەپاش دا بزر دەبێ، جاکاتێ کەبۆی دەگەڕێ دەڕوانێ نەماوەو نایدۆزێتەوەو ئیتر شپرزە دەبێ بۆی، بگرە ئائەم حاڵەتەش کە گرنگییەکی ئەوتۆی نییە بەرگوناە دەکەوێ، هەتا بەرەبەرە بەم ووردە ئازارانە بەندە والە گوناە پاك دەبێتەوە وەك چۆن شووشی زێڕی سوور کەلە کوورە دێتە دەرەوە پاك و بێ گەردەو مشتومالّ کراوەو ژەنگ و چڵکی پێوە نەماوە، ئەویش ئاوا لەگوناە پاك دەبێتەوە! (ت–س/ح).

٣٨٢٠- ⇨ (ب/٣ ز/٥٢ ل/١٣٠ ف/١ + ٢)[٢٨].

لێرەدا دەڵێ: گفتەی تیرمیزی ئاوایە: سەودە کە هاوسەری حەزرەت بوو، مەترسی هەبوو کە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) تەلاّقی بدا عەرزی حەزرەتی کرد: تەلاّقم مەدەو بمهێڵەرەوە لەخزمەت خۆتا تا لەدنیاو قیامەتا هاوسەرت بم، نۆرە شەوەکەشم بدە بە عائیشە، حەزرەتیش ئاوایکرد، جا ئایەتەکە هاتە خوارەوە، کەدەفەرموێ: {وَإِنِ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِن بَعْلِهَا نُشُوزًا} عائیشە دەڵێ: ژن و مێرد لەم بارەیەوە لەسەرچی ڕێك بکەون دروستە.

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلاَلَةِ إِنِ امْرُؤٌ هَلَكَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ وَلَهُ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن لَّمْ يَكُن لَّهَا وَلَدٌ فَإِن كَانَتَا اثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا الثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ وَإِن كَانُواْ إِخْوَةً رِّجَالاً وَنِسَاء فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ يُبَيِّنُ اللّهُ لَكُمْ أَن تَضِلُّواْ وَاللّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ - ١٧٦/٤}. ⇨ (ب/٣ ز/٤ ل/٨ ل/١ + ٢+٣).

---

[٢٨] تقدم في مجلد ثالث. تسلسل / ٥٠ رقم: ٥ / ٢١٤٠ ء ٤ / ٢١٣٩ + مجلد / ثالث. تسلسل / ٥٢ رقم: ١ / ٢١٤٥ و ٢ / ٢١٤٦.

٣٨٢١- ⇦ (ب/٤ ز/٢٥ ل/٨٥ ف/٢)[٢٩].

٣٨٢٢م- عن الْبَرَاءَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قال: آخِرُ سُورَةٍ نَزَلَتْ بَرَاءَةَ، وَآخِرُ آيَةٍ نَزَلَتْ (يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلاَلَةِ). رواه الشيخان والترمذي[٣٠].

بەراء خوای دەڵێ: دوا سوورەت کەهات سوورەتی بەرائەت بوو، دوائایەتیش کەهات ئایەتی: {يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلاَلَةِ} بوو (ش/ت — خوایان لێ ڕازی بێت).

٣٨٢٣- عن عبدالله بن عَمْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) قال: آخر سُورةٍ أنزلت المائدة:[٣١].

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەڵێ: دوا سوورەت کەهاتە خوارەوە سوورەتی مائیدە بوو. (ت-س/ح).

٣٨٢٤- وقال: ابن عبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) آخر سورةٍ أنزلت (إِذَا جَاء نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ). رواهما الترمذي والأول بسند صحيح[٣٢].

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسیش کە مەشهوورە بە ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) دەڵێ: دوا سورەت کەهاتە خوارەوە سوورەتی: {إِذَا جَاء نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ} بوو. (ت).

## ٦) سوورەتی مائیدە

### بەناوی یەزدانی بەخشندەی میهرەبان : (سورة المائدة)

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٣٨٢٥- ⇦ (ب/١ ز/٤ ل/٣٣ ف/٨)[١].

---

[٢٩] تقدم في المجلد الرابع. تسلسل / ٢٥ رقم: ٢ / ٢٧٠١.

[٣٠] بخاري. مرضى: ٥٦٥١ ، ٦٧٢٣ ، ٧٣٠٩ ، ٤٦٠٥. مسلم. فرائض: ٤١٢١. أبوداود. فرائض: ٢٨٨٦. ترمذي. فرائض: ٢٠٩٢.

[٣١] رواه الترمذي بسند صحيح.

[٣٢] سكت عن درجته الشارح.

٣٨٢٦- ⇦ (ب/١ ز/٤١ ل/١٧٦ + ب/١ ز/٣٩ ل/١٧١ ف/١)[٢].

٣٨٢٧- عن الْمِقْدَادُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قال: يَوْمَ بَدْرٍ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا لاَ نَقُولُ لَكَ كَمَا قالت: بَنُو إِسْرَائِيلَ لِمُوسَى (فَاذْهَبْ أَنْتَ وَرَبُّكَ فَقَاتِلاَ إِنَّا هَا هُنَا قَاعِدُونَ) وَلَكِنِ امْضِ وَنَحْنُ مَعَكَ. فَكَأَنَّهُ سُرِّيَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) رواه البخاري[٣].

میقداد (خودای لێ ڕازی بێ) عەرزی حەزرەتی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە بەسەرو بەماڵ لەگەڵتاین‌و سەرمان لە بەرپێتایە، فەرموو بۆ پێشەوە ئێمە لە خزمەتتاین‌و پشتت دەگرین‌و پشتت بەرنادەین، ئەوە لەئێمەوە دوورە کەوەك هۆزی جوولەکە گوتیان بەمووسا ئێمەش بەتۆ بڵێین:

{يَا مُوسَى إِنَّا لَن نَّدْخُلَهَا أَبَدًا مَّا دَامُواْ فِيهَا فَاذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَاتِلا إِنَّا هَاهُنَا قَاعِدُونَ - ٥/٢٤}.

واتە: ئەی مووسا! ئێمە ئەمەی ئێوە دەیڵێن نایکەین دەی خۆت‌و خوداکەت بڕۆن لەگەڵ دوژمندا شەڕ بکەن، ئێمە وا لێرەدا دانیشتووین، چاوەڕوانی ئەنجامی جەنگی نێوانی ئێوە دەکەین! حاشا ئێمە قسەی وا رەق‌و نامە قووڵی وا لە ڕووی تۆدا ناکەین. ئیتر کەوای گوت ڕووی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) گەشایەوەو لەوسەخڵەتییەدا فەرامۆشی بۆهات (ب - ڕەزای خودای لەسەر بێ).

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {إِنَّمَا جَزَاء الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُواْ أَوْ يُصَلَّبُواْ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلافٍ أَوْ يُنفَوْاْ مِنَ الأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ} ⇦ (ب/٣ ز/٨٨ ل/٢٢٨).

لێرەدا ئەم پترییەی هەیە:

---

[١] تقدم في المجلد الأول. تسلسل / ٤ رقم: ٨ / ٣٠.

[٢] تقدم في المجلد الأول. تسلسل / ٤١ رقم: ١ / ٣١٧ + مجلد أول. تسلسل: ٣٩ رقم: ١ / ٣١١.

[٣] بخاري. تفسير: ٤٦٠٩.

قَالَ أَبُو قِلاَبَةَ: فَهَؤُلاَءِ سَرَقُوا وَقَتَلُوا وَكَفَرُوا بَعْدَ إِيمَانِهِمْ، وَحَارَبُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ. رواه الْبُخَارِيُّ فِي الطهارة:

**ئەبو قیلابە دەڵێ: ئەمانە هەم دزییان کرد بوو، هەم پیاویان کوشتبوو، هەم پاش ئیسلامبوونیان وەرگەڕابوونو بوو بوونەوە بە بێ بڕوا، سەرەڕای ئەوەیشە چوو بوون بەگژ خوداو پێغەمبەری خودادا (ب).**

**٣٨٢٨-** ⇦ (ب/٣ ز/٨٨ ل/٢٣٠ ف/٣ + ب/٤ ز/٦٩ ل/٢١٠ ف/١)..[٤]

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِي الأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُ مَعَهُ لِيَفْتَدُواْ بِهِ مِنْ عَذَابِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَا تُقُبِّلَ مِنْهُمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ - ٥/٣٦}.

**واتە: بێگومان کافران ئەوانەن کەلەسەر کوفر دەمرن، جا ئەمانە ئەگەر هەرچی والەم زەوییەدا هەمووی هی ئەوان بێو ئەوەندەی تریشی لەگەڵ دابێ وەبیدەن لەتۆڵەی ڕزگاری سەری خۆیانا تا لەدەست ئێشو ئازاری ڕۆژی بووژانەوە خۆیان ڕزگار بکەن لێیان قەبووڵ ناکرێ، وە ئەو سزا سەختە کەبۆیان براوەتەوە لەکۆڵیان ناکەوێ.**

**٣٨٢٩-** عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) عن النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قال: يقول: اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى لأَهْوَنِ أَهْلِ النَّارِ عَذَابًا لَوْ كَانَتْ لَكَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا أَكُنْتَ مُفْتَدِيًا بِهَا فَيقول: نَعَمْ فَيقول: الله: قَدْ أَرَدْتُ مِنْكَ أَهْوَنَ مِنْ هَذَا وَأَنْتَ فِي صُلْبِ آدَمَ أَنْ لاَ تُشْرِكَ بِي وَلاَ أُدْخِلَكَ النَّارَ فَأَبَيْتَ إِلاَّ الشِّرْكَ. رواه الشيخان[٥].

**ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: لە ڕۆژی قیامەتدا خودای گەورە (بەوکەسەی کەلەناو ئاگری دۆزەخدا سزاوئێشو ئازاری لەهەموو دۆزەخییەکانی تر سووکترە) پێی دەفەرموێ: ئەگەر ئێستا جیهانو هەرچی لەجیهان دا بوو هی تۆ بوایە ئایا**

---

[٤] تقدم في المجلد الثالث. تسلسل / ٨٨ رقم: ٣ / ٢٣٣٧.

[٥] بخاري. أحاديث الأنبياء: ٣٣٣٤ ، ٦٥٥٧ ، ٦٥٣٨ = تجريد / ١٣٣٩ بەرطى / ٤ ل / ١٦. مسلم. صفات المنافقين: ٧٠١٣ ، ٧٠١٤.

نەیدەویت لەتۆڵەی خۆتدا کەلەم ئێش و ئازارە ڕزگار ببێت یا نا؟ دەڵێ: بەڵێ نەیدەم. جا خودا پێی دەفەرموێ: تۆ هێشتا لەپشتی ئادەم دا بووی، من شتێکم لێ داواکردیت کە گەلێ لەمە ئاسانتر بوو، کە ئەوەبوو داوام لێ کردیت: کە تۆ هاوبەشم بۆ بڕیار نەدەیت و منیش نەتخەمە ناو ئاگرەوە، کەچی تۆهەر حەزت لەوە بوو کە هاوبەشم بۆ بڕیار بدەی (ش = شەیخەین = بوخاری و موسلیم).

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَقالت: الْيَهُودُ يَدُ اللّهِ مَغْلُولَةٌ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُواْ بِمَا قَالُواْ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيْفَ يَشَاء وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَانًا وَكُفْرًا وَأَلْقَيْنَا بَيْنَهُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاء إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ كُلَّمَا أَوْقَدُواْ نَارًا لِّلْحَرْبِ أَطْفَأَهَا اللّهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَادًا وَاللّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُفْسِدِينَ -٥/٦٤}.

واتە: یەزدانی پاکی مەزن دەفەرموێ: جوولەکە نەفامەکان نامەقووڵییەك دەکەن دەڵێن: دەستی خودا زنجیرکراوەو بەکۆت شەتەك دراوە، بۆیە ئەوەندە دارایی و ماڵ و سامان دابەش ناکا هەتا هەموو کەسێ دەوڵەمەند ببێ! یاخوا دەستی خۆیان زنجیر بکرێ و دوور بخرێنەوە لە ڕەحمەتی خوداو لە جەوامێریی و سەخێتی لەسەر ئەم قسە قۆڕەیان، عەمریان نەمێنێ و گوزەرانیان لێ تاڵ بێ ئەو نەگبەتانە بۆخۆیان و قسەی کاڵ و تاڵیان، با ئەوانە بۆخۆیان هەر بڵێن، هەموو هۆشیاران و دانایان و زانایان باش باش دەزانن کە خودا نەك بە تاقە دەستێ، بەڵکوو بەهەر دوو دەستی، وەنەك لەیەك جیهاندا بەڵکوو لەهەر دوو جیهاندا سفرەی ڕەحمەت و خوانی کەرەم و بەخشش و سەخاوەتی ڕاخستووە، بەپێی دانایی و حیکمەتێ کەخۆی لەهەموو کەسێ باشتری لێ دەزانێ کەرەم و سەخاوەت و بەخشش دەنوێنێ و دارایی سەرف دەکا هەر چۆنێ خواستی هەبێ*.

---

* ووشەی قورئانی هەمووی هەڵبژاردەو پڕواتایە ، فرەمەعنا دەگەیەنێ ئەوەی کە قورئان بە تاقە ووشەیێ ، یا بە ئیزافەیێ ، یا بە پیتێ ، یا بە تەچمینێ ، یا بەدەلالەتی پەیوەندی نێوانی ووشەو ئایەتەکان لەسەراسەری قورئاندا ، یا بەهەر شێوەیەکی تر ، ئەوەی کە قورئان

بەمانە ، یا بەیەکێ لەم شتانە دەیگەیەنێ ئێمە بە کتێبێ بۆمان ڕوون ناکرێتەوە ، جائەگەر کەسێ لێزانانە لەم شوێنەدا موتالای تەفسیری بەیزاوی پیرۆزو تەفسیری مەواهیبی ڕەحمانو تەفسیری نامی زێڕین بکا دەزانێ کەبەندە لە تەفسیرو ڕاڤەی ئایەتەکاندا زیادەڕەویم نەکردووە ، وەلێ بەپێی تەواناى نا تەواوی خۆم هەوڵم داوە کە بەکوردییەکی پەتی قسەکان دارێژم ، چونکە ڕاڤەی پیت بەپیت بەهەم لەنرخی کوردییەکە هەم لەڕەونەقو وورشەی ئایەتەکان کەم دەکاتەوە. گەرچی من نامەوێ بە پەراوێزی شڕو پڕی خۆم رووپەڕەی ئەم کتێبە پیرۆزە مەزنە لکەدار بکەم ، یاخود باری چاپکردنو پەخشبوونەوەی گران بکەم ، وەئەوەی کەلەخودا داوای دەکەم ئەوەیە کەلەچاپ بدرێو لەفەوتان ڕزگاری ببێ ، بەڵام هەندێ پەراوێزیش پێویستە وەك ئەمەی کە عەرزتانی دەکەم:

قسەی ڕەوانو ڕێكو پێك ، ووشەی ناسكو نازدار ، سووك لەسەر زمانو ڕەوان لەسەر زار ، خۆش لەکن هەستو لەگوێدا ئاوازەدار ، پڕمەعناو واتە ڕوونو ئاشکرا ، وەك گوڵی ڕەنگینی بەر رووناکی چرا ، ڕستەی بەپێزو بەهێزو بەچێژ ، دوور لە ئاڵۆزی خۆیو ووشەکانی ، نزیك لەبیری ئادەمیزادو شارەزا بەناخی دەروونو گیانی ، قسەی وانەستەقو ووتاری وا بەشەوقو بەرەونەق بەرگو کاڵاو والایەکی قەشەنگە ، وەك بووکە تازە واتاو مەعنا دەڕازێنێتەوە، بە ئاهیستە لەرێی هەستەوە، وەك مامزێ بە خەمزە بچێ بۆ سەرکانیاو ، بەرەو ساختمانی مێشك دەکشێو گوڵاو پرژێنی دەکاو زاخاوی دەداو لەوێوە ڕووەو پانایی ناخو دەروونو دڵ شۆڕ دەبێتەوەو بەئاستەم لە دەرگا دەداو وەك میوانێکی ئازیز جێی خۆی دەکاتەوەو سیحری حەڵاڵی خۆی دەپرژێنێ ، جا هۆش چەشی دەکاو گۆش پێی گۆش دەبێو دەروون تامو چەژو خۆشیی لێ دەمژێ ، تا سەرەنجام دڵ ئارام دەبێو گیان دەحەسێتەوە!

خودای گەورە ئادەمیزادی لەسەر ئەم ڕەوشو سروشتە دروست کردووە ، بۆیە قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی حەزرەتو نامە پیرۆزە ئاسمانییەکانی ترو فەرمایشتی پێغەمبەرانو گەورە پیاوانو زانایانو داناپانو بوێژان ئەوەندە گرنگییان داوە بە فەرمایشتی بەرزی جوانو ، بە ئاخاوتنی بێ گرێو قورتو ، بە گوتاری ڕەوانی پاكو پوختو ڕەوانبێژو جوانو ، بەڕستەی سفتی سازی بێ پێچو پەنا ، زمانی کوردی (لەخودا بەزیاد بێ) لەم لایەنەوە بێ کەلێنەو زۆر پێشکەوتووە ، بگرە کوردەکان خۆیان ئەمڕۆ پێ بە پێی بەهێزیو بەپێزیو تەڕو پاراویی زمانەکەیان دەرناچنو لەو دلگیریو شەوقو ڕەونەقو ووشە ئاراییو ڕەوانبێژیو سفتو

---

سۆلییەی کەلەدەق و بڕبڕەو کورۆکی زمانەکەیاندا هەیە دواکەوتوون گەلێ بەجێماون ، جار جارەش ڕۆشنبیرە بەناو ڕۆشنبیرەکانیشیان قێزو بیزی لێ دەکەنەوە ، چونکە وەك منالێ بە شیری قوتوو گۆش و پەروەردە کرابێ ئاوا لەزمانی زگماکی خۆیان نامۆبوون و ئالوودەی شیری نارەسەن بوون! تەنانەت شانازی بەوەوە ، دەکەن کە کوردی نازانن ، بەڵام ئەوەندەو ئەوەندە زمانی تردەزانن!

پشت بە لوتفی خوداو بەبەرەکەتی قورئانی پیرۆز (کە ئەمڕۆ میللەتی کورد خۆی هاویشتۆتە باوەشی گەرمی) ئێمە ناگەینە ئەو ڕادەیە کە بۆزانینی زمانەکەی خۆمان لەم و لەو بپرسین ، وەك چۆن خواجە شەلەموو لەمەلای خۆمانی دەپرسی کەی جەژنی کەپرەشینەیە ، کەی شەمەیە!!

من بەش بەحاڵی خۆم لاف و گەزافی ئەوە لێ نادەم کە شاسواری ئەم مەیدانەم ، بگرە لەم گۆڕەپانە بەرینەدا من شاگردو کەرسواریش نیم ، ئەوە پسپۆڕانی خۆی هەیە ، بەڵام هەوڵ و تەقەلا بەپێی حاڵ و تاقەت هەر باشە خوا یاربێ بەرەبەرە گیانی بووژانەوە دێتەوە بەبەرگەلەکەماناو زمانە شیرینەکەمان ، کە لەبەرناسکی و نازداری ووشەکانی و جوانیی گوزارەکانی ، دەڵێی زمانی فریشتەو پەرییانە ، پتر گەشەو نەشە دەکا ، ئەوەی نوێی سەردەمی نوێ چەژی لێ وەردەگرێ و مەمکە فەرەنگی بەردەداو بەمژینی گۆی مەمەی دایە ئاشنا دەبێتەوەو ئەوکاتە تاقە وشەیەکی کوردی پەتی بە هەموو سامانی سەرزەوی ناداو لە بیلبیلەی چاوی خۆی زیاتر ئاگاداریی دەکا. هەر گەلێ خۆی خۆی نەخوا قەت نامرێ ، تا کوردێ دەمرێ دەی تر لەدایك دەبێ ، گەلی کوردیش (بەتایبەتی لەبەر ئەوەی کە گەلێکی موسوڵمانی پاکەو لەژێر ئاڵای موحەممەد دایە (درووودی خودای لەسەر بێ) کە گەورەو سەروەری دوو گەلی کوردو عەرەبی برایە) لەسایەی بەخششی خوداوە هەر لەزیاد بوونە ، نامەخوا وەك گەنمە قەندەهاری بە برشتە ، یەکی بە سەتە ، ڕۆژ بە ڕۆژیش سووری خولی چەرخیش لەسوودی گەلانەو ئەم ڕۆ ڕۆژ ڕۆژی گەلە ، وەك حەزرەت (درووودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لا کسری.... ولا قیصر.....). ڕۆژ ڕۆژی جەماوەرو مەردومەو ڕۆژی ملهووڕی و زۆرو زۆرداری و ئەژدەهاکی بەسەر چوو ، ئەمڕۆ حەفیان خۆی مێشکی بۆ دەرمان دەشێ ، هاکا وەك پێغەمبەرەکان فەرموویانە ، گورگ و مەڕ پێکەوە ئاو بخۆنەوە! وەبوو بەشایی لۆغانی جەژنی برایەتی گەلانی ڕووی جیهان!.

دەڵێی وا بەبەرچاومەوە ، لەسەرانسەری عێراقی نیشتمانی نازاری خۆشەویستماندا ، دەمەو بەیان کەڵەباب لەگوندو دێو شارەکان بەدەنگە زوڵاڵەکەی دەخوێنێو مامۆستای مەلای گوند یا گەڕەك لەخەو هەڵدەستێنێو بەرەو مزگەوتی گوندو گەڕەك بەسەلاری دەچمێو لەسەر بانێژەی مزگەوت دەنگی (الله أكبر)ی بانگو سەلا دارو بەردو زیندوو مردوو لەخەو هەڵدەستێنێ ، دەشتودەرو شاخو چیا بۆی دەستێنێتەوەو دەنگ دەداتەوە ، بە کفلە کوونێ کۆمەڵی نوێژکەران وەك ڕیزی فریشتەی ئاسمان لەپشت مامۆستاوە ڕیز دەبەستنو نوێژدا دەبەستن!

لەگرەدا جێگەی خۆیەتی کە ئەم سەرنجەشتان عەرز بکەم: لە ئاخاوتنی کوردی نووسراودا ، بۆئەوەی ڕەوانو گەواراو سفتوسۆڵو جوان بێ ، دەبێ هەتا دەتوانین بەشەکانی ڕستەو ووشەکانیو راناوو زەمیرو پیتی چەسپو بەستنەوەو حەرفی رەبتو ئەم جۆرەشتانەی ، کە دەبن بەهۆی ڕەسایی ڕستەو گوستاخیو بەهێزی گوفتار ، دەبێ ئەم جۆرە شتانە هەتا دەتوانین لەسەر دەستووری ڕەساو سازو خۆشو ئاسانو ڕەوان دایان بمەزرێنین ، هەموو بەهێزو دیارو ئاشکرا بن ، زۆر کرتاوو پچڕ پچڕو تێهەڵکێشو ئاڵۆز نەبن ، گەلێ لەگەلە پێشکەوتووەکان دەسکاری ڕێزمانی خۆیان کردووە کەلەمێژەوە دانراوە ، بەرەو ئاسانیو پاسای باشتر بردوویانە ، دەی ئێمە کە ڕێزمانی زمانەکەمان هێشتا ساوایە بۆچی سوودو بەهرە لە بەهرەکانی زمانەکانی دەرو دراوسێکانمان وەرنەگرین!.

زمانێ ئەگەر لە سامانی زمانی گەلی دراوسێ سوودو بەهرە وەربگرێ بەوە نابێ بەژێرماڵەی ئەو هاوسایە! ئەوەتا ئێمە ئاگامان لە بنجو بنەوانی کارەکە نییە ، دەنا چی زمانێ هەیە کە ووشەی بیانی تیا نەبێ ، یا ڕێزمانێکی سەربەخۆی وای هەبێ کەلەهیچ ریزمانێکی تر نەچێ! لەو بڕاوایەدام کەلە ناو گیانلەبەرەکانی تریش دا شتی وانییە!

کەواتە: ئەگەر ئێمەی کورد برایانەو دۆستانە بەهرە لەبەهرەکانی زمانی عەرەبی وەربگرین ئەوە جێی خۆیەتیو هیچ ئەنگو زیانی نییە ، چونکە یەکەم زمانی برا عەرەبەکانمانەو دووەم زمانی دینەکەمانەو سێیەم بووە بەزمانی دووەمی هەموو دەرو دراوسێکانمان ، چوارەم زمانێکی خزمەتکراویشە ، وە ئەمەی من دەیڵێم باوو باپیرانمان کردوویانەو شەقڵی بە زمانەکەمانەوە دیارەو ئاشکرایە ، ئیتر ئەو بەهرە لێوەرگرتنە چ هی ووشە سازی بێ ، چ هی ڕێزمانی بێ چ هی هەرلایەکی تری زمانەوانی بێ قەی ناکا. لێرەدا بۆ نموونەی ڕستەی ڕەسای

کوردی پەتی ئەم وێنەیە دەهێنمەوە: پێغەمبەر فەرمووی پێی لەم ڕستەیەدا هەرچەن فیعلەکە پێشکەوتووە لەچارو مەجرورەکە ، لەنەحوی کوردیشدا شتی وا ناپەسەندە ، مەگەر لەبەر مەبەستێکی ڕەوا ، بەڵام ئەم ڕستەیە ڕەساترو دامەزراوترە لەڕستەی (پێغەمبەر پێی فەرموو) چونکە بەشەکانی رستە هەموو دیارو ئاشکرانو قوتدراویان تیا نییە. وە بەمەش ناگوترێ لاسکایی کوێرانەی زمانی عەرەبی ، چونکە ئەمە بەپێی ڕێزمانەکەی خۆمانە کە مەبەستی ڕەوا بووە بەهۆی لادان لە یاسا سەرەکییەکە. ئەم باسە توێژینەوەو لێکۆڵینەوەیەکی زۆر قووڵو چڕو خەستی گەرەکە ، بۆ ئێرە دەست نادا.

ئەوەی کە بۆ ئەگرە دەست دەدا ئەم چەن شیعرە عەرەبییە یە ، کە لەپەسنی ئەم نامە پیرۆزەدا گوتوومە ، کە بۆنی برایەتی کوردو عەرەبی لێ دێ ، خودا هەردوو لایان لەچەپۆڵەی زاڵم بپارێزێو لەژێر ئاڵا سەربەرزەکەی حەزرەتی موحەممەد دا (دروودی خودای لەسەر بێ) پەنایان بداو چاك بکا بۆ چاکیانو بەڵابدا لەهەرە بەدیان!

فەرموون ئەمە ئێوەو ئەوە شیعرەکان ، دیارە دیاری میروو لە قاچەکوللە یەکە:

ذي بـــردة مـــن طينـــة عربيـــة
ملدوســـة بلحمـــة كرديـــة ،
هديـــة مـــن مـــسلم لمـــسلم
كأنهـــا بـــدر بليـــل مظلـــم
يـــا مُـــصْطفى! أنـــت الـــصفا أنـــت الوفـــا
أنـــت الـــبريء المنتفـــى مـــن ذا الجفـــا
أنـــت الـــشفا لكردنـــا وعربنـــا
يـــا نورنـــا لعيننـــا وقلبنـــا!
أنـــت الحـــلا لعربنـــا وكردنـــا
يـــا ضـــوءنا لقربنـــا وبعـــدنا!
صـــلى الهنـــا عليـــك دائمـــا
مـــادام ذكـــر الله حقـــا قائمـــا ،
شمـــس الـــضحى بـــدر الـــدجى أقـــوالكم
يـــا مـــن جـــلا أبـــصارنا أكحـــالكم ،

٣٨٣٠- (ب/٢ ز/٢٣ ل/٦٠ ف/٣)[٦].

٣٨٣١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنها) قالت: مَنْ حَدَّثَكَ أَنَّ مُحَمَّدًا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) كَتَمَ شَيْئًا مِمَّا أُنْزِلَ عَلَيْهِ، فَقَدْ كَذَبَ، وَاللّهُ يقول: (يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ). رواه الشيخان والترمذي[٧].

---

كتابــــك المجيـــــد حبـــــذا الهـــــدى
نعـــــم الخـــــبر نحـــــن لـــــنعم المبتـــــدأ

شـــــعبان تابعـــــان للقـــــرآن
كـــــرد وعـــــرب نخلتـــــا صـــــنوان!

مـــــن نخـــــلات في زروع زاننـــــة
لاصـــــلها ، وفرعهـــــا ، لاشـــــاننه!

أعنـــــى بهـــــا شـــــعوب أمـــــة الهـــــدى
التـــــابعين رايـــــة لاحمـــــدا

صـــــلى الهنـــــا عليـــــه دائمـــــا
مـــــادام عبـــــدالله لـــــيلا قائمـــــا!

والعـــــن (خـــــدا!) مـــــن دســـــهم أحقـــــادا
وركـــــزن في عينـــــه أوتـــــادا

وشـــــتتن شمـــــل عـــــدوهم (خـــــدا)
مفرقـــــا مـــــشتتا مبـــــددا

وأفـــــشين بَيْنَهمـــــو ســـــلاما
وودـــــدن قلبهمـــــو تمامـــــا

المترجم / ١٤-٦-١٩٨٩

[٦] تقدم في المجلد الثاني. تسلسل:٢٣ رقم: ٣ / ١٢٨٤.

[٧] بخاري. تفسير: ٤٦١٢ ، ٤٨٥٥ ، ٧٣٨٠ ، ٧٥٣١ = تجريد ٤ / ٤٣٧ رقم: ١٦٥٥ + ١٣٠٦ = ٣٢٣٤ ، ٣٢٣٥. مسلم. إيمان: ٤٣٨. ترمذي. تفسير القرآن: ٣٠٦٨ ، ٣٢٧٨.

**عائیشە** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: ئەوەی بڵێ: موحەممەد** (دروودی خودای لەسەر بێ) **شتێکی حەشارداوە لەو سرووشەی کە خودا ناردوویەتی بۆی ئەوە بێگومان درۆ دەکا، ئەوەتانێ خودای گەورە دەفەرموێ:**

{يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ – ٦٧/٥}.

**واتە: ئەی پێغەمبەری نازدارو خۆشەویست! هەرچی بەسرووش‌و وەحیی من ناردوومە بۆ تۆ دەبێ ڕایبگەیەنی بەو خەڵکەو تەبلیغیان بکەی، ئەگینا بزانە کەتۆ پەیامی خودای خۆتت پێیان نەگەیاندووە (ش/ت).**

**٣٨٣٢– وعنها قالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **يُحْرَسُ حَتَّى نَزَلَتْ: (وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ) فَأَخْرَجَ النَّبِيُّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **رَأْسَهُ مِنَ الْقُبَّةِ فَقَالَ: لَهُمْ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ انْصَرِفُوا فَقَدْ عَصَمَنِي اللَّهُ. رواه الترمذي بسند غريب**[٨].

**دیسان دەڵێ: لەپێش دا ئیشکی پێغەمبەریان دەگرت** (دروودی خودای لەسەر بێ) **هەتا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە:**

{وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ – ٦٧/٥}.

**واتە: وە خودای گەورە تۆ دەپارێزێ لەزیانی ئادەمیزاد جا پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **کەئەو دەمە لەناو گوومەزییەکا بوو، سەری لێوە دەرهێناو بە ئێشکچییەکانی فەرموو: ئەی خەڵکینە! بڕۆنەوە بۆ ماڵی خۆتان‌و بچن بەلای کاری خۆتانەوە، ئیتر من لەسایەی خوداوە کارم بە ئێشك گرتنی ئێوە نەماوە ئیتر من خودا خۆی دەمپارێزێ (ت – س/غەریب).**

**٣٨٣٣– عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **عَنِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **قَالَ: إِنَّ بَنِي إِسْرَائِيلَ لَمَّا وَقَعَ فِيهِمُ النَّقْصُ كَانَ الرَّجُلُ يَرَى أَخَاهُ عَلَى الذَّنْبِ فَيَنْهَاهُ عَنْهُ فَإِذَا كَانَ الْغَدُ لَمْ يَمْنَعْهُ مَا رَأَى مِنْهُ أَنْ يَكُونَ أَكِيلَهُ وَشَرِيبَهُ وَخَلِيطَهُ فَضَرَبَ اللَّهُ قُلُوبَ بَعْضِهِمْ بِبَعْضٍ وَنَزَلَ فِيهِمُ الْقُرْآنُ (لُعِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ عَلَى لِسَانِ دَاوُدَ وَعِيسَى**

---

[٨] رواه الترمذي بسند غريب.

ابْنِ مَرْيَمَ) حَتَّى بَلَغَ (وَلَوْ كَانُوا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالنَّبِيِّ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِ مَا اتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَاءَ وَلَكِنَّ كَثِيرًا مِنْهُمْ فَاسِقُونَ). قال: وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)مُتَّكِئًا فَجَلَسَ وَقَال: لاَ حَتَّى تَأْخُذُوا عَلَى يَدَيِ الظَّالِمِ فَتَأْطِرُوهُ عَلَى الْحَقِّ أَطْرًا. رواه الترمذي وأبو داود[٩].

ئەبو عوبەیدە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: كاتێ باری نەوەی ئیسرائیل كەوتە لێژی، پیاوی وایان هەبوو برادەرێكی خۆی دەدی خەریكی گوناهێ بوو، پێی دەگوت ئیشی وا مەكە ئەوە گوناهە، كەچی بۆ سبەینێ خۆشی دەچوو، دەبوو بەهاو خۆراكو هاو خواردنەوەو هاو نۆشو هاو بەشی! جا خودا كردنی بە فیتنەو ئاژاوە بۆ یەكتری، وە قورئان لەشانی ئەواندا دابەزیو ڕیسوای كردن، وەك دەفەرموێ:

{لُعِنَ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِن بَنِي إِسْرَائِيلَ...} تادەگاتە {...وَلَكِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ - ٥/٧٨-٨١}.

واتە: نەفرینو لەعنەت لە كافرو بێ بڕواكانی نەوەی ئیسرائیل كراوە، لەسەر زمانی داوودو عیسای كوڕی مەریەم، چونكە لەخودا یاخی دەبوونو دەستدرێژی یان لەیاساو لەشەریعەتی ئەو دەكرد، حاڵیان وەها بوو لەناو خۆیان دا خراپەیان دەكردو چاوپۆشییان لە خراپەكەرەكە دەكردو پێیان نەدەگوت ئەوە خراپەیە، مەیكە، بەخودا كارێكی زۆر ناپەسەندو گەندو ناهەمواریان دەكرد، تەماشا دەكەی دەبینی گەلێ كەس لەوان دەبن بە دۆستو برادەری خودانەناسەكان، ئەمەش بوو بەهۆی ئەوە كە خودا ڕقو قاریان لێ بگرێ، وە دەبێ لەوە خراپتر چی بێ كەئەم خانە خراپانە بەدەستی خۆیان بۆخۆیان سازاندووە؟! سەرەڕای ئەوەش لەپاشە ڕۆژدا، لەناو ئاگری دۆزەخ دا دەمێننەوەو هەتا هەتایە هەڵ دەتووتێن، بەڵێ ئەمەی ئەمانە دەیكەن لەڕەفتاری باوەڕدار ناچێ، دەنا ئەگەر ئەوان، كەلەكن خۆیان خاوەن نامەن، باوەڕی تەواویان ببوایە بە خوداو باوەڕو ئیمانیان بەجوانی

[٩] رواه الترمذي هنا وأبوداود في كتاب السنة.

بهێنایــە بــە پێغەمبــەری خــودا، کــە موحەممــەدەو بــەو قورئانــە پــیرۆزەی کەلــەخوداوە ڕەوانــە کــراوە بــۆی ئــەوە ئــەو بتپەرســتو خــودا نەناسـانەیان نــەدەگرت بەدۆســتو بــرادەری خۆیــان، بــەڵام زوربــەی ئــەم هــۆزە لــەڕێ دەرچوونو گوێ بــەدینو ئـایین نـادەن، مەگــەر بـۆ هەنـدێ مەبەسـتو مـرازی جیهـانی خۆیـان!. گـوتی: لـەپێش دا حـەزرەت (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) شـانی دادابوو، ئنجا ڕێك دانیشتو فەرمووی: نەخـەیر ڕزگـار نابنو قوبـووڵ نییـە هـەتا نـەدەن لـەباڵی سـتەمکارو زۆر دارو بـای پـێ نەدەنـەوە بـۆ سـەر ڕێگـەی ڕاستو لووتی پێ دانەژەندن بەسەریداو کلك نەنێتە ناو خەت! (ت/د).

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تُحَرِّمُواْ طَيِّبَـاتِ مَـا أَحَـلَّ اللّـهُ لَكُـمْ وَلاَ تَعْتَدُواْ إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ - ٥/٨٧}.

واتــە: ئــەی کەســانێ کــە باوەڕتــان هێنــاوە بــەخودا، لەیاسـای خـودای گەورە دەرمەچن، ئەوشتە پاكو خۆشانە، چ خۆراك بن، چ چتی تر، کە خـودا ڕەوای دیوە بۆتانو خۆی بۆی حـەڵاڵ کـردوون لـە خۆتانـەوە لەسـەر خۆتـانی حەرام مەکەن، بەڵام لەڕادە دەرمەچن نەوەکا سەر بکێشێ بۆ حـەرامو بکەونـە نـاو بـێ شـەرعییەوە، ئـەوەش بـاش بـاش بزانن خـودا نـەك هـەر ئەوکەسـانەی خۆشناوێ کەلە سنوور دەرچوونو بەس، بەڵکوو ڕقیشی لێیانـە، وەهەمیشـە بیکـەن بـەڕەوشو پیشە ترسـی خوداتـان هـەبێ، خودابـێ باکـە مـەڵێن بـاوەڕو ئیمـان لـەقاری خـودا دەمانپـارێزێ، چونکە ئـەوەکاتێ وایـە کـەئێوە لەیاسـاو دەستووری باوەڕ بەخودا لانەدەن.

٣٨٣٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) كُنَّا نَغْزُو مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَلَيْسَ مَعَنَا نِسَاءٌ فَقُلْنَا أَلاَ نَخْتَصِي فَنَهَانَا عَنْ ذَلِكَ، فَرَخَّصَ لَنَا بَعْدَ ذَلِكَ أَنْ نَتَزَوَّجَ الْمَرْأَةَ بِـالثَّوْبِ، ثُمَّ قَرَأَ (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تُحَرِّمُوا طَيِّبَاتِ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكُمْ). رواه الشيخان[١٠].

---

[١٠] بخاري. تفسير: ٤٦١٥ ، ٥٠٧١ ، ٥٠٧٥ = تجريد ٤ / ٤٣٨ رقم: ١٦٥٦. مسلم: نكاح: ٣٣٩٦ — ٣٣٩٨.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لەسەر بێ) دەڵێ: گەلێ جار وا دەبوو لەخزمەتی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) دەچووین بۆ غەزا، وەژنمان لەگەڵ خۆمان نەدەبرد، جا گوتمان: ئەی پێغەمبەری خودا! ڕێگەمان بدە خۆمان دەخەسێنین؟ ئەویش ڕێگەی ئەوەی نەداین، بەڵام لەوەدوا ڕێگەی دەداین کەژن بە صیغە مارە بکەین لەسەر جل و بەرگ و شتی وا، ئینجا ئیبنو مەسعوود بۆ پشتیوانی ڕای خۆی لەبارەی دروستبوونی ژن صیغە کردنەوە ئەم ئایەتەی خوێندەوە (ش).

٣٨٣٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي إِذَا أَصَبْتُ اللَّحْمَ انْتَشَرْتُ لِلنِّسَاءِ وَأَخَذَتْنِي شَهْوَتِي فَحَرَّمْتُ عَلَيَّ اللَّحْمَ. فَأَنْزَلَ اللَّهُ (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تُحَرِّمُوا طَيِّبَاتِ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكُمْ وَلاَ تَعْتَدُوا إِنَّ اللَّهَ لاَ يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ وَكُلُوا مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ حَلاَلاً طَيِّبًا). رواه الترمذي بسند حسن.[١١]

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێ هاتە لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) گوتی: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! من کە گۆشت دەخۆم هەوەسم هەڵ دەسێ و حەز لەژن دەکەم، لەبەر ئەوە گۆشتم لەخۆم حەرام کردووە، جا خودا بەم بۆنەیەوە ئەم دوو ئایەتەی ناردە خوارەوە:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تُحَرِّمُواْ طَيِّبَاتِ مَا أَحَلَّ اللّهُ لَكُمْ - ٨٧/٥} ⇦ (ت- س/ح).

٣٨٣٦- ⇦ (ب/٣ ز/١٢٧ ل/٣٢٩ ف/١)[١٢].

٣٨٣٧- وَعَنْهَا (أي عَنْ عَائِشَةَ) (رَضِيَ اللهُ عَنها) أَنَّ أَبَاهَا كَانَ لاَ يَحْنَثُ فِي يَمِينٍ حَتَّى أَنْزَلَ اللَّهُ كَفَّارَةَ الْيَمِينِ. قال: أَبُو بَكْرٍ لاَ أَرَى يَمِينًا أُرَى غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا، إِلاَّ قَبِلْتُ رُخْصَةَ اللَّهِ، وَفَعَلْتُ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ. رواهما الْبُخَارِيُّ[١٣].

---

[١١] حسن عند الترمذي.

[١٢] تقدم في مجلد ثالث. تسلسل / ١٢٧ رقم: ١ / ٢٥١٣.

**عائیشە** (خودای لێ ڕازی بێ) **دەڵێ: لەپێشدا باوکم هەرگیز سوێندی خۆی نەدەخست، تا خودا لەقورئاندا بڕیتی (کەففارەت)ی سوێندی بڕیاردا، ئەوجا ئەبوبەکر گوتی: هەر سوێندێ کە بەباشی نەزانم، سوێندەکەم دەشکێنمو ئەو کەففارەتەی کەخودا دایناوە دەیدەمو ئەوەی کەباشترە ئەوە دەکەم (ب).**

**قَالَ اللهُ تَعَالَى: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ - ٥/٩٠}.**

**٣٨٣٨- ⇦ (ب/٤ ز/٢٥) + (ب/٦ ز/٣ ل/٤ ف/٤٣)[١٣م].**

**٣٨٣٩- ⇦ (ب/٤ ز/٢٥ ل/٨٥ ف/١+٢)[١٤].**

**٣٨٤٠- قال: عُمَرَ** (رَضِيَ اللهُ عَنهُ)**: اللَّهُمَّ بَيِّنْ لَنَا فِي الْخَمْرِ بَيَانَ شِفَاءٍ فَنَزَلَتِ آيَة النِّسَاءِ (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَقْرَبُوا الصَّلاَةَ وَأَنْتُمْ سُكَارَى) فَدُعِيَ عُمَرُ فَقُرِئَتْ عَلَيْهِ فَقَالَ: اللَّهُمَّ بَيِّنْ لَنَا فِي الْخَمْرِ بَيَانَ شِفَاءٍ فَنَزَلَتِ آية الْمَائِدَةِ (إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاء فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ اللّهِ وَعَنِ الصَّلاَةِ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ) فَدُعِيَ عُمَرُ فَقُرِئَتْ عَلَيْهِ فَقَال: انْتَهَيْنَا انْتَهَيْنَا. رواه أصحاب السنن[١٥].**

**عومەر** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: ئەی خودایە! مەسەلەی خواردنەوەی ئارەقو مەیمان بەتەواوی بۆ ڕوون بکەرەوە، جا ئایەتەکەی سوورەتی بەقەرە هاتە خوارەوە، کە دەفەرموێ: {يسألُونَكَ عن الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرِ} عومەر بانگ کراو ئەم ئایەتەی بۆ خوێندرایەوە، دیسان عومەر گوتیەوە: ئەی خوایە! مەسەلەی خواردنەوەی ئارەقو مەیمان بەباشی بۆ ڕوون بکەرەوە، جا ئایەتەکەی سوورەتی نیساء هاتە خوارەوە، کە دەفەرموێ:**

**{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَقْرَبُواْ الصَّلاَةَ وَأَنتُمْ سُكَارَى}.**

---

[١٣] بخاري. تفسير: ٤٦١٤ ، ٦٦٢١.

[١٣م] تقدم في المجلد سادس. تسلسل ٣/ رقم: ٣٧٣٢/٤٣

[١٤] تقدم في المجلد الرابع. تسلسل / ٢٥ رقم: ٢ / ٢٧٣٧.

[١٥] الترمذي هنا وصاحباه في الأشربة (شرحه).

دیسان عومەر بانگ کرایەوەو ئەم ئایەتەشی بەسەرا خوێندرایەوە، ئەمجارەیش گوتیەوە: ئەی خودایە! مەسەلەی خواردنەوەی ئارەق و مەی و بادە نۆشیمان بەباشی بۆ ڕوون بکەرەوە، جا ئایەتەکەی سوورەتی مائیدە هاتە خوارەوە کە دەفەرموێ:

{إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاء فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ}.

دیسان عومەر بانگ کراو ئەم ئایەتەش خوێندرایەوە بۆی، ئەوجا گوتی: ئەوا وازمان لەبادە نۆشی هێنا، ئەوا دەسبەردار بووین لەئارەق و مەی. (د/ت/ن – خودایان لێ ڕازی بێ).

٣٨٤١– عن الْبَرَاءُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قال: مَاتَ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)وَهُمْ يَشْرَبُونَ الْخَمْرَ فَلَمَّا نَزَلَ تَحْرِيمُهَا قال: نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): يا رسول الله فَكَيْفَ بِأَصْحَابِنَا الَّذِينَ مَاتُوا وَهُمْ يَشْرَبُونَهَا فَنَزَلَتْ (لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُواْ إِذَا مَا اتَّقَواْ وَّآمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ ثُمَّ اتَّقَواْ وَّآمَنُواْ ثُمَّ اتَّقَواْ وَّأَحْسَنُواْ وَاللّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ) رواه البخاري[١٦].

بەراء (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: لەپێش دا مەی حەرام نەبوو، چەند کەسێ لەیارانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەتا ئەوان لەژیان دا مابوون بادەنۆشی حەلاڵ بوو، لەبەرئەوە بادەیان دەنۆشی جا کاتێ ئایەت هاتە خوارەوەو مەی و ئارەقی حەرام کرد هەندێ کەس لە هاوڕێیان گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! دەبێ حاڵی ئەو برادەرانەمان چۆن بێ کە ئێستا مردوون و لەکاتی خۆی دا شەرابیان نۆشیوە؟ ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە:

{لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُواْ إِذَا مَا اتَّقَواْ وَّآمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ ثُمَّ اتَّقَواْ وَّآمَنُواْ ثُمَّ اتَّقَواْ وَّأَحْسَنُواْ وَاللّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ – ٩٣/٥}

⇨ (ب/٥ ز/٢٦ ل/١٣٦ ف/٦). (ت/ب – ڕەزای خودایان لەسەر بێ)

---

[١٦] بخاري. تفسير: ٤٦٢.

٣٨٤٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قال: كَانَ قَوْمٌ يَسْأَلُونَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) اسْتِهْزَاءً، فَيقول: الرَّجُلُ مَنْ أَبِي؟ وَيقول: الرَّجُلُ تَضِلُّ نَاقَتُهُ أَيْنَ نَاقَتِي؟ فَأَنْزَلَ اللَّهُ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِنْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ) رواه الْبُخَارِيُّ والترمذي[١٧].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) دەڵێ: هەندێ کەس (بۆ گاڵتە پێکردن و تەڵفیسی) پرسیاریان لەحەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەکرد، پیاو هەبوو، دەیگوت: کێ باوکمە؟ پیاوی وا هەبوو کە وشترەکەی بزر دەبوو دەیگوت: وشترەکەم لەکوێیە؟ جا خودا ئەمەی ناردە خوارەوە:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَسْأَلُواْ عَنْ أَشْيَاء إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ - ٥/١٠١}.

واتە: ئەی موسوڵمانینە! پرسیاری وا لە پێغەمبەری خۆتان مەکەن کە بەدرەدتان نەخواو ئەرکی سەرشانتان گرانتر بکا، بەتایبەتی پرسیاری وا ئەگەر وەڵام بدرێتەوە ڕاستی ڕووداوەکەتان بۆ دەردەکەوێ و تووشی تەریقی و شەرمەزاری و ناخۆشی و دڵتەنگی دەبن (ب/ت).

٣٨٤٣- ⇦ (ب/٢ ز/٧٩ ل/١٥٢ ف/١)[١٨].

لەگرەدا لە دواکەیەوە دەڵێ: جا ئەم ئایەتە لەخوداوە هات بۆ حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَسْأَلُواْ عَنْ أَشْيَاء إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ}.

٣٨٤٤- ⇦ (ب/٤ ز/١١٣ ل/٣٦٩ ف/٢)[١٩].

لەگرەدا لە کۆتایی فەرموودەکەدا دەڵێ: جا ئەم ئایەتە دابەزی: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَسْأَلُواْ عَنْ أَشْيَاء إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ}.

---

(١٧) بخاري. تفسير: ٤٦٢٢.

(١٨) تقدم في مجلد ثاني تسلسل / ٧٩ رقم: ١ / ١٤٧٩.

(١٩) تقدم في المجلد الرابع. تسلسل / ١١٣ رقم: ٢ / ٣١٩٥.

**٣٨٤٥- عَنْ سَعْدٍ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **عن النَّبِيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **قال: أَعْظَمُ الْمُسْلِمِينَ فِي الْمُسْلِمِينَ جُرْمًا مَنْ سَأَلَ عَنْ أَمْرٍ لَمْ يُحَرَّمْ فَحُرِّمَ عَلَى النَّاسِ مِنْ أَجْلِ مَسْأَلَتِهِ. رواه مسلم في الفضائل[٢٠].**

**سەعد** (خودای لێ ڕازی بێ) **لەحەزرەتەوە** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: لەناو موسوڵمانا، تاوانبارترین موسوڵمان ئەوکەسەیە کەلەشتێ بەبێ پێویستی زۆر بکۆڵێتەوەو پرسیاری زۆری لەبارەوە بکا، شتەکە خۆی هێشتا حەرام نەکرابێ، بەڵام بەهۆی پرسیارەکەی ئەوەوە حەرام ببێ لەموسوڵمانانی تریش** (م- خودای لێ ڕازی بێ).

**٣٨٤٦- عَنْ أَبِي بَكْرٍ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **أَنَّهُ قَالَ: إِنَّكُمْ تَقْرَءُونَ هَذِهِ الآيَةَ (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا عَلَيْكُمْ أَنْفُسَكُمْ لاَ يَضُرُّكُمْ مَنْ ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ) وَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **يقول: إِنَّ النَّاسَ إِذَا رَأَوْا ظَالِمًا فَلَمْ يَأْخُذُوا عَلَى يَدَيْهِ أَوْشَكَ أَنْ يَعُمَّهُمُ اللَّهُ بِعِقَابٍ مِنْهُ.[٢١]**

**ئەبوبەکر** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: ئێوە ئەم ئایەتە دەخوێننەوەو دەیکەن بە بیانوو دەڵێن: ئێمە ڕێگەی ڕاستی خۆمان دەگرین و هەقمان نییە بەسەر ئامۆژگاری خێری خەڵکی ترەوە واتە: ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ:**

**{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ لاَ يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ - ٥/١٠٥}.**

**واتە: ئەی بڕوادارەکان! ئێوە خەمی خۆتان بخۆن و چارەسەری خۆتان بکەن، ئەگەر ئێوە ڕێگەی ڕاستی خۆتان بگرن و بێگوێیی خودای خۆتان نەکەن ئیتر بەدکاری و گومراهییی خەڵکی تر زیان نادا لەئێوە، هەر کەسێ دەچێتە گۆڕی خۆیەوە ئێوە ئەم ئایەتە دەخوێننەوە بەم نیازە، بەڵام ئەمە هەڵەیە، چونکە من بۆ خۆم لەزاری پێغەمبەر خۆیم بیستووە دەیفەرموو**

---

[٢٠] بخاري. اعتصام: ٧٢٨٩. مسلم. فضائل: ٦٠٦٩ ، ٦٠٧٠ ، ٦٠٧١. أبوداود. سنة: ٤٦١٠.

[٢١] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

(دروودی خودای لەسەر بێ): هەرکاتێ کۆمەڵەی ئادەمیزاد چاویان کەوت بەکەسێکی زۆردارو بەچاوی خۆیان دییان کە واستەمگەرێ ستەم دەکاو وەك گورگی برسی و سەگی هار قولی ئەمو ئەو دەبا بە دەماو ماڵی ئەم دەخواو خوێنی ئەو دەڕێژێ، وەنەدەن لەدەستی و دەستی پێ هەڵنەگرن لەو زوڵمو زۆرە ئەوە زۆر نزیکە کەخودا سزاو ئازاری هەموویان بدات. (ت/د – س/ص).

٣٨٤٧– وَقال: أَبُو أُمَيَّةَ الشَّعْبَانِيُّ سَأَلْتُ أَبَا ثَعْلَبَةَ (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ) الآية. فَقال: أَمَا وَاللَّهِ لَقَدْ سَأَلْتَ عَنْهَا خَبِيرًا سَأَلْتُ عَنْهَا خبيراً، سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)فَقال: بَلِ ائْتَمِرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَتَنَاهَوْا عَنِ الْمُنْكَرِ حَتَّى إِذَا رَأَيْتَ شُحًّا مُطَاعًا وَهَوًى مُتَّبَعًا وَدُنْيَا مُؤْثَرَةً وَإِعْجَابَ كُلِّ ذِي رَأْيٍ بِرَأْيِهِ فَعَلَيْكَ بخاصَّة بِنَفْسِكَ وَدَعْ عَنْكَ الْعَوَامَّ فَإِنَّ مِنْ وَرَائِكُمْ أَيَّامَ الصَّبْرِ الصَّبْرُ فِيهِن مِثْلُ الْقَبْضِ عَلَى الْجَمْرِ لِلْعَامِلِ فِيهِمْ مِثْلُ أَجْرِ خَمْسِينَ رَجُلاً يَعْمَلُونَ مِثْلَ عَمَلِكم. قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَجْرُ خَمْسِينَ مِنَّا، أَوْمِنْهُمْ؟ قَالَ: بَلْ أَجْرُ خَمْسِينَ مِنْكُمْ. رواهما الترمذي وأبو داود[٢٢].

ئەبو ئومەییەی ئەل–شەعبانی (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پرسیارم کرد لە ئەبو ثەعلەبە، لەواتەی {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ لاَ يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ} ئەویش گوتی: ئەدیی بە خودا لەپیاوێکی شارەزاو ئاگادرات پرسی، چونکە من خۆم لەشانی مەبەستو مرازی ئەم ئایەتەدا پرسیارم لەحەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) کرد، فەرمووی: خەیر ئەمە کە بۆنی ئەوەی لێ دێ ئەگەر یەکێ لەگەڵ خوای خۆ یا ڕاست بێ ئیتر واز لەتەمێی خێر بێنێ، ئەم بۆچوونە بۆهەموو کاتێ وانییە بەڵام دەبێ ئێوە فەرمان بکەن بە چاکەو نەهی بکەن لەخراپە، هەتا دەکەونە چەرخو ڕۆژگارێکەوە رژدیی و لەچەریی و چرووکی واپەرە دەسێنێ هەموو کەس دەگرێتەوەو مەردوم شوێن هەواو هەوەسو ئارەزوو بازی دەکەونو پەلاماری دنیا دەدەنو، وەپێش پاشە ڕۆژی دەخەنو، خۆشی جیهان دەبێ بەئاواتی هەرەگەورەیان، تەنانەت

[٢٢] بسند حسن. رواية الترمذي هنا ، وأبي داود في الأمر بالمعروف.

شیرازەی کار وا تێك دەچێ تا بەچاوی خۆت دەبینی هەموو کەسێ ڕای خۆی لەلای پەسەندەو بە گوێی کەسێ تر ناکا، جا ئەوکاتە کەبارو دۆخی ڕۆژگار ئاوا گۆڕا، ئەوکاتە ئاگاداری خودی خۆت بکەو بەس، وە چاوت لە بەرژەوەندی دین و دنیای خۆت بێ و بەس، وەواز لەڕەشە خەڵکەکە بێنە، چونکە لەپاش ئەم ڕۆژەتانەوە چەند ڕۆژێکی وادێت خۆگرتن لەو ڕۆژانەدا وەکوو ئەوەیە پشکۆیێ ئاگر بخەیتە مشتتەوە، وەلەو ڕۆژانەدا هەرکەسێ کردەوەی باش بێ و ئەم کردەوە باشانەی کەئێوە دەیانکەن ئەویش بیانکا ئەوە خێرو پاداشی پەنجا کەس لەئێوەی بۆهەیە. عەرزی کرا: ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووت پاداشی پەنجا کەس لە ئێمە یا مەبەست لەخۆیان بوو؟ فەرمووی: نەء، لەخۆیان نا، بەڵکوو، پاداشی پەنجا کەس لەئێوە (ت/د – س/ح).

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {مَا جَعَلَ اللّهُ مِن بَحِيرَةٍ وَلاَ سَآئِبَةٍ وَلاَ وَصِيلَةٍ وَلاَ حَامٍ وَلَكِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ يَفْتَرُونَ عَلَى اللّهِ الْكَذِبَ وَأَكْثَرُهُمْ لاَ يَعْقِلُونَ} (٥/١٠٣).

واتە: یەزدانی گەورە دەفەرموێ: خودای گەورە (بەحیرە)و (سائیبە)و (وەصیلە)و (حامی)ی دانەناوە، بەڵام کەسانێ بێ بڕواو کۆمەڵەی کافران درۆهەڵ دەبەستن بەدەم خواوەو دەڵێن ئەمانە هەن و خودا بڕیاری داون، زوربەی ئەمانەش کەئەم درۆیانە دروست دەکەن بێ هۆش و بێ ئەقڵن.

٣٨٤٨– عن أبي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عن النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: رَأَيْتُ عَمْرَو بْنَ عَامِرٍ الْخُزَاعِيَّ يَجُرُّ قُصْبَهُ فِي النَّارِ، كَانَ أَوَّلَ مَنْ سَيَّبَ السَّوَائِبَ. قال: سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ: وَالْبَحِيرَةُ الَّتِي يُمْنَعُ دَرُّهَا لِلطَّوَاغِيتِ فَلاَ يَحْلُبُهَا أَحَدٌ وَ السَّائِبَةُ كَانُوا يُسَيِّبُونَهَا لآلهتهم لايُحْمَلُ عَلَيْهَا شَيْءٌ. وَالوصِيلَةُ النَّاقَةُ البِكْرُ تُبكِرُ بأُنْثى ثُمَّ تُثَنِّى بُعْلُ بَأُنْثى لَيْسَ بَيْنَهُمَا ذَكَرٌ وَكَانُوا يُسَيِّبُونَهَا لِلطَّوَاغِيتِهِم وَالْحَامَ فحل الإبل يضرب الضِّراب المعدود فإذا قضاه ودعوه لِلطَّوَاغِيتِ وأعفوه من الحمل. رواه الشيخان[٢٣].

---

[٢٣] بخاري. تفسير: ٤٦٢٣. مسلم. جنة ونعيمها: ٧١٢٢.

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە لەحەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: عەمری کوڕی عامیری خوزاعیم دی، لەناو ئاگری دۆزەخ دا بوو، (حاڵی زۆر شڕ بوو) ریخۆڵەی خۆی بەناو ئاگرەکەدا بەکێش دەکرد چونکە ئەو یەکەم کەسێ بوو کە سائیبەی داهێناوە. سەعیدی کوڕی موسەییب (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: بەحیرە بەو ووشترە دەڵێن کە شیرەکەیان قەدەغە دەکرد بۆ بتەسەرکەشەکانیان لەبەر ئەوە کەپێنج سك لە سەریەك زاوەو دواسکەکەی نێربووە، ئیتر بەرەڵایان دەکردو نەسواری دەبوونو نە هیچیان پێ دەکرد وە بۆ نیشانەش گوێیان شەق دەکردو ناویان دەنا بەحیرە واتە: گوێ هەڵدڕاو، سائیبەش بەو ووشترە دەڵێن کە هەندێ کەس نەخۆش دەکەوت دەیگوت: ئەگەر خودا لەم نەخۆشینە چاکی کردمەوە فیسارە، ووشتر سائیبە بێ، واتە: مەرەخەسو بەرەڵابێ بۆ خوداوەندە کانیان، ئیتر نە سواری دەبوونو نەباریان لێ دەنا، وەصیلەش ئەو ووشترە مێنگەیەیە بوو کە نۆبەرەکەیو سکی دووەمی لەسەر یەك مێچکە بوونو نێرەیان لەنێواندا نەبوو، بۆیەش پێیان دەگوت وەصیلە بەکوردی واتە: گەیێنەر چونکە دوو مێی بەیەك دەگەیاند، جا ئەویشیان بەرەڵا دەکردو تەرخانیان دەکرد بۆ خودا درۆینەکانیان، حامیش ووشترە نێرەیەکە دەیکەن بەکەڵ، ئەندازەیەکی دیاری کراو دەپەڕێو ووشترە مێنگەی بەکەڵ کەڵ دەدا، ئیتر لەپاش ئەوە ئازادیان دەکرد لەبارکێشانو سەربڕینو تەرخانیان دەکرد بۆ خودا درۆینەکانیان (ش).

٣٨٤٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) قال: خَرَجَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي سَهْمٍ مَعَ تَمِيمٍ الدَّارِيِّ وَعَدِيِّ بْنِ بَدَاءٍ فَمَاتَ السَّهْمِيُّ بِأَرْضٍ لَيْسَ فِيهَا مُسْلِمٌ فَلَمَّا قَدِمَا بِتَرِكَتِهِ فَقَدُوا جَامًا مِنْ فِضَّةٍ مُخَوَّصًا بِالذَّهَبِ فَأَحْلَفَهُمَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)ثُمَّ وُجِدَ الْجَامُ بِمَكَّةَ فَقِيلَ اشْتَرَيْنَاهُ مِنْ عَدِيٍّ وَتَمِيمٍ فَقَامَ رَجُلَانِ مِنْ أَوْلِيَاءِ السَّهْمِيِّ فَحَلَفَا بِاللَّهِ لَشَهَادَتُنَا أَحَقُّ مِنْ شَهَادَتِهِمَا وَأَنَّ الْجَامَ لِصَاحِبِهِمْ. قال: وَفِيهِمْ نَزَلَتْ (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا شَهَادَةُ بَيْنِكُمْ) الآية. رواه الترمذي والبخاري.

**ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ ڕازی بێ) **دەڵێ: پیاوێکی بەنی سەهمی، لەگەڵ تەمیمی داریو عەدی کوڕی بەددائدا، دەچن بۆ سەفەر، بۆ بازرگانی بۆشام، کابرای بەنی سەهمی لەڕێ دەمرێ، لەشوێنێ دەمرێ موسوڵمانی تیا نابێ، کاتێ دوو پیاوەکەی هاوڕێی کەلەپوورەکەی یان هێنایەوە، جامێکی زیو (کە مێخی زێڕی تیا بوو) دیار نەبوو، پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **سوێندی دان، دوایی جامەکە لەمەکە بەسەر گیرایەوە ئەوانەی جامەکەیان لەلا دۆزرایەوە گوتیان: لەعەدیی و تەمیمان کڕیوە، جا لەوێدا دوو پیاو لەخزمانی یارۆی سەهمی هەڵسان سوێندیان خواردو گوتیان: بەخودا شایەتییەکەی ئێمە ڕاستترە لە شایەتیی ئەو دوانە. وە جامەکە جامی خزمەکەمانە. ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ ڕازی بێ) **گوتی: ئەم ئایەتە لەشانی ئەوانا دابەزی کە دەفەرموێ:**

**{يا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ شَهَادَةُ بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ - ٥/١٠٦}.** **(ت/ب).**

**٣٨٥٠- عَنْ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) **عن النَّبِيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **قال: أُنْزِلَتِ الْمَائِدَةُ مِنَ السَّمَاءِ خُبْزًا وَلَحْمًا وَأُمِرُوا أَنْ لاَ يَخُونُوا وَلاَ يَدَّخِرُوا لِغَدٍ فَخَانُوا وَادَّخَرُوا وَرَفَعُوا لِغَدٍ فَمُسِخُوا قِرَدَةً وَخَنَازِيرَ. رواه الترمذي[٢٥].**

**عەمماری کوڕی یاسر** (خودایان لێ ڕازی بێ) **لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: خوانێ لە ئاسمانەوە لەسەر داوای عیسا** (دروودی خودای لەسەر بێ) **هاتە خوارەوە، نانو گۆشتی لەسەر بوو (عیسا: لەسەر داخوازیی حەوارییەکانی خۆیو پێشنیاری کۆمەڵی بەنی ئیسرائیل داوای ئەم خوانو سفرەیەی کرد) خودا فەرمانی پێ کردن کەدەست پیسیی لێ نەکەنو لێی هەڵنەگرن بۆ سبەی، کەچی ئەوان هەم دەست پیسییان لێی**

---

[٢٥] سكت عن درجته الشارح.

کردو هەم لێیان پاشەکەوت کردو هەم لێشیان هەڵگرت بۆ سبەینێ! جالەبەر ئەوە خودا کردنی بە مەیموون و بەراز! (ت).

٣٨٥١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قال: خَطَبَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقال: يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّكُمْ مَحْشُورُونَ إِلَى اللَّهِ حُفَاةً عُرَاةً غُرْلاً. ثُمَّ قَالَ: (كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُعِيدُهُ وَعْدًا عَلَيْنَا إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ) إِلَى آخِرِ الآيَةِ - ثُمَّ قال: - أَلاَ وَإِنَّ أَوَّلَ الْخَلاَئِقِ يُكْسَى يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِبْرَاهِيمُ، أَلاَ وَإِنَّهُ يُجَاءُ بِرِجَالٍ مِنْ أُمَّتِي فَيُؤْخَذُ بِهِمْ ذَاتَ الشِّمَالِ، فَأَقُولُ يَا رَبِّ أُصَيْحَابِي. فَيُقَالُ: إِنَّكَ لاَ تَدْرِي مَا أَحْدَثُوا بَعْدَكَ. فَأَقُولُ كَمَا قَالَ: الْعَبْدُ الصَّالِحُ (وَكُنْتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَا دُمْتُ فِيهِمْ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِي كُنْتَ أَنْتَ الرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ وَأَنْتَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ) فَيُقَالُ: إِنَّ هَؤُلاَءِ لَمْ يَزَالُوا مُرْتَدِّينَ عَلَى أَعْقَابِهِمْ مُنْذُ فَارَقْتَهُمْ. رواه الشيخان. نسأل الله الموت على الإيمان. آمين[٢٦].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) دوانێکی دا فەرمووی: ئەی کۆمەڵەی ئادەمیزاد! بێگومان کەئێوە بەپێخاووسی و بەڕووت و قووتی و بەخەتەنە نەکراوی کۆدەکردێنەوە بۆ لێپرسینەوە بۆلای خودا ئینجا خوێندیەوە.

{كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُعِيدُهُ وَعْدًا عَلَيْنَا إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ -٢١/١٠٤}.

ئینجا فەرمووی: بزانن! ڕۆژی ژینەوە یەکەم کەسێ کە پۆشتە دەکرێتەوەو بەرگی لە بەردەکرێتەوە ئیبراهیمە، هۆشیار بن! چەن پیاوێ لەئۆمەتی من دێنن و بەرەولای چەپ بۆناو ئاگری دۆزەخ بەکێشیان دەکەن لەتاقمەی ئەم ئایەتەن کە دەفەرموێ:

{وَأَصْحَابُ الشِّمَالِ مَا أَصْحَابُ الشِّمَالِ - ٥٦/٤١}.

منیش بەسەرسامی دەڵێم: ئەی پەروەردگارم! خۆ ئەمانە لەکن خۆیان هاوڕێی من بوون ئەوە بۆ کوێیان دەبەن؟ دەفەرموێ: تۆ ئاگات لێ نییە،

---

[٢٦] بخاري. أحاديث الأنبياء: ٣٣٤٩، ٣٤٤٧، ٤٦٢٥، ٤٦٢٦، ٤٧٤٠، ٦٥٢٤، ٦٥٢٥، ٦٥٢٦. مسلم. جنة ونعيمها: ٧١٣٠.

کەئەمانە لەپاش مەرگی تۆ چی فەرتەنەیەکیان بەرپاکردبوو، ئەوجا منیش وەك بەندەی فرەباش عیسای کوڕی مەریەم دەڵێم:

{وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِي كُنتَ أَنتَ الرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ وَأَنتَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ – ١١٧/٥}.

واتە: وەمن هەتا لەناویانا بووم ئاگام لێیان بوو چاودێریم دەکردن، بەپێی تەوانا نەم دەهێشت لەڕێ دەربچن، وەلێ لەوکاتەوە کەمن لە جیهان دەرچووم کە تۆمنت بردەوە بۆلای خۆت و مەرگ بوو بە میوانم، ئیتر خۆت بەتەنیا چاوێری سەریان بووی، چونکە تۆ ئاگات لەهەموو حاڵێکەو کەتۆمنت بردەوە بۆلای خۆت و لەجیهان دەرچووم ئیتر تۆ هەر خۆت شایەتی لەسەر هەموو شتێ. دیسان خودا دەفەرموێ ئەمانە لەپاش مردنی تۆ یەکسەر پاش گەزبوونەتەوەو لەئیسلامەتی هەڵگەڕاونەتەوە (ش).

سوورەی مانیدە سفرەی ڕەحمەتە
خوانێکی گەورەی بەبێ زەحمەتە
پڕ سەر لەمیوەی پڕ لە نیعمەتە
چی موسوڵمانە لەوێ دەعوەتە!
خوا بە ڕەحمی خۆی لەنانی سەری
لەبادەی بەهەشت، لەرەزو بەری
دەممان شیرین کاو چاوو دڵ ڕۆشن
بیکا بە جێمان کام جێگەی خۆشن
گۆڕمان گوشادکاو باخی بەهەشت بێ
هەشت دەرگای لەسەر چەقی هەر هەشت بێ!
دوور لەهاڵاوی حەو درەگای دۆزەخ
نەبێ بەچاڵمان لەژینی بەرزەخ!
خۆمان و دۆسمان لەگەڵ کەس و کار
لەگەڵ خوێنەری نازیزی نازار

لەژێر سێبەری سوورەی مانیدە

خودا تۆ قورئان! پەنا مان بدە!

ئەم گەلی کوردەش لەسایەی تۆوە

سەرپاک ئیسلامە لەکۆن و نۆوە

لەتۆڵەی ئەوە چاکەی بەرەوە

بەختی ژێر کەوتووی بخەسەرەوە

لەسەر سفرەی خۆت جێی بکەرەوە

بەدەستی ڕەحمەت پێی بکەرەوە!

خۆت ئاگات لێیە تۆی هەر لەبیرە

گەرچی دەست و پێی لەناو زنجیرە

لەسەر زمانی دەنگی تەکبیرە!

موسوڵمانی پاک وەک چۆڕی شیرە!

هەر کوردێ دەگری لاوە یا پیرە

حوسەین بابیەتی و حەسەن باپیرە!

خۆشی دەروێشی تاهای دەسگیرە

چاوی لەقاپی خوای بێ وەزیرە

کوردە! لەناو تۆ ژیانم تاڵە

بەشەوو بەرۆژ تۆم لەخەیاڵە

هەرچی دەنووسم بۆیە واکاڵە

لەبەر بێ کەسیت حاڵم بێ حاڵە

بووی بەگۆی مەیدان ڕۆژگاری نامەرد

پێت دەکا شەقێن بەدار شەقی بەرد

ڕۆژێ ئینگلیز، ڕۆژێ ئەمریکا

ڕۆژێ کوردی خۆت، یاریت پێدەکا

کەسێ شک نابەم بتدەمە دەستی

جگـــــە لــــەو خوایــــە تــــۆ دەیپەرســـتی

کـــوردە! صـــەبرکە بــــاری خودایـــە

خـــــوا یاربـــــێ ڕۆژان ڕۆژی لەدوایـــــە!

وەرگێڕ / ١٩٨٩/٦/٢١

## ٧٩) سوورەتی ئەنعام

### بەناوی یەزدانی بەخشندەو میهرەبان : (سورة الأنعام)

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُ لَيَحْزُنُكَ الَّذِي يَقُولُـونَ فَـإِنَّهُمْ لاَ يُكَـذِّبُونَكَ وَلَكِـنَّ الظَّالِمِينَ بِآيَاتِ اللّهِ يَجْحَدُونَ} (٦/٣٣).

واتە: زۆرباش دەزانین کەئەو قسەی ئەو بێ بڕوایانە دەیکەن دڵگرانت دەکا، دەربەستی ئەو قسانە مەبە، چونکی ئەو قسانە هەرچەن بەناو لەڕووی تۆی دەدەن و بەدیمەن بەگژ تۆدا دەچن بەڵام لە ڕاستی دا ئەو ستەمکارانە ئایەت و، فەرمایشت و بەڵگەکانی خودای گەورە بەدرۆ دەخەنەوە!

٣٨٥٢- عَنْ عَلِيّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قال: أَنَّ أَبَا جَهْلٍ قال: لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إِنَّا لاَ نُكَذِّبُكَ وَلَكِنْ نُكَذِّبُ بِمَا جِئْتَ بِهِ فَأَنْزَلَ الآية: (فَـإِنَّهُمْ لاَ يُكَـذِّبُونَكَ وَلَكِـنَّ الظَّـالِمِينَ بِآيَاتِ اللّهِ يَجْحَدُونَ). رواه الترمذي[1].

لــە عەلییــەوە (خـودای لـێ ڕازی بـێ) دەگێڕنــەوە دەڵــێ: ئـەبو جـەهل گـوتی بـە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئەو مەلعوونە گوتی بەو پێغەمبەرە نازدارە: ئێمە باوەڕ بەتۆ دەکەین کەپیاوێکی ڕاستگۆی درۆزن نیت، بەڵام باوەڕ بە قوڕئانەکەت ناکەین! ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، لەلایەنی خودای گەورەوە (ت).

٣٨٥٣- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قال: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ (قُلْ هُوَ الْقَادِرُ عَلَى أَنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِنْ فَوْقِكُمْ) قال: رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَعُوذُ بِوَجْهِـكَ. قـال:

---

[1] سكت عن درجته الشارح.

(أَوْ مِنْ تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ) قال: أَعُوذُ بِوَجْهِكَ (أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا وَيُذِيقَ بَعْضَكُمْ بَأْسَ بَعْضٍ) قَالَ: هَذَا أَهْوَنُ. أَوْ هَذَا أَيْسَرُ. رواه الْبُخَارِيُّ والترمذي[٢].

جابیر (ڕەزای خودای لەسەر بێ) دەڵێ: کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارێ: {قُلْ هُوَ الْقَادِرُ عَلَى أَن يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِّن فَوْقِكُمْ} تۆ ئەی خۆشەویست! پێیان بفەرموو: هەر خودایە کەبەتەوانایە لەژوور سەرتانەوە سزاو ئازارو ئەشکەنجەتان بەسەردا داببارێنێ وەکوو گڕەو شەراو گەردەلوولو بارانو تۆفو گەرماو سەرماو تەرزەو برووسکەو بۆق بارانو خوێن بارانو بەردەبارانی ئاسمانیو بۆمبا بارانو شتی وا. لێرەدا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پەنا دەگرم بەزاتی تۆ! وەلە وێدا کە دەفەرموێ: {أَوْ مِن تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ} یاخود ئازارو سزاتان بۆ بنێرێ لەژێر پێتانەوە، وەك بورکانو بوومە لەرزەو تەقینەوەی لوغمو هێرشی مشكو مارو گازندەی زەویو شتی تری وا دیسان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەوە: پەنا دەگرم بەزاتی تۆ. وە لەوێدا کە دەفەرموێ: {أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعاً وَيُذِيقَ بَعْضَكُم بَأْسَ بَعْضٍ} یاخود دەستە دەستەو تاقمە تاقمە تێکەڵو پێکەڵو جیاجیا تان بکاو تێکتان بەربدا لەیەکتریی هەرکام چەقۆ لەوی تر بسوێو تاڵاوی دووبەرەکیو خۆ خۆری لەدەستی یەکتر بچێژن لێرەدا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: هەرچۆنێ بێ ئەمەیان سووکترە یا فەرمووی: ئەمەیان ئاسانترە (ب/ت).

٣٨٥٤- عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) فِي هَذِهِ الآيَةِ: (قُلْ هُوَ الْقَادِرُ عَلَى أَنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِنْ فَوْقِكُمْ أَوْ مِنْ تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ) فَقال: النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَمَا إِنَّهَا كَائِنَةٌ وَلَمْ يَأْتِ تَأْوِيلُهَا بَعْدُ. رواه الترمذي بسند حسن[٣].

سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص (خودای لێ ڕازی بێ) لەبارەی ئایەتی {قُلْ هُوَ الْقَادِرُ عَلَى أَن يَبْعَثَ}ەوە دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەدیی

---

[٢] بخاري. تفسير سورة الأنعام: ٤٦٢٨ ، ٧٣١٣ ، ٧٤٠٦. تجريد بخاري: ٤ / ٤٤٢ رقم: ١٦٦٠.

[٣] حديث حسن عند الترمذي.

ئەو هەڕەشەو گوڕەشەیەی کەلەدەقی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا هەیە دێتە دی، بەڵام هێشتا کاتی ماوەو ڕووی نەداوە (ت–س/ح).

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَإِذْ قال: إِبْرَاهِيمُ لأَبِيهِ آزَرَ أَتَتَّخِذُ أَصْنَامًا آلِهَةً إِنِّي أَرَاكَ وَقَوْمَكَ فِي ضَلاَلٍ مُّبِينٍ – ٦/٧٤}.

واتە: ئەی پێغەمبەری خۆشەویستو نازدار! بیربکەرەوە لەوکاتو چەرخەدا کە تاریکی بتپەرستی جیهانی داگیر کردبوو، کە ئیبراهیم فەرمووی بەئازەری باوکی: ئەمە چۆن حاڵێکە؟ تۆ پیاوێکی زیرەکی، چۆن چۆنی ئەم بتەدەستکردە تاشراوانە بەخودا دەزانی؟ وەلەهەمان کاتا وەکوو خودای کردگار بەناهەق دەیان پەرستی، بەڕاستی تا ئێوە لەسەر ئەم بیرو باوەڕە چەوتە بن من باوەڕم وایە خۆتو کۆمەڵەکەت وان لەوپەڕی سەر لێشێواویو ڕێ وون کردندا.

٣٨٥٥– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قال: يَلْقَى إِبْرَاهِيمُ أَبَاهُ آزَرَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَعَلَى وَجْهِ آزَرَ قَتَرَةٌ وَغَبَرَةٌ، فيقول: لَهُ إِبْرَاهِيمُ أَلَمْ أَقُلْ لَكَ لاَ تَعْصِنِي فيقول: أَبُوهُ فَالْيَوْمَ لاَ أَعْصِيكَ. فَيقول: إِبْرَاهِيمُ يَا رَبِّ، إِنَّكَ وَعَدْتَنِي أَنْ لاَ تُخْزِيَنِي يَوْمَ يُبْعَثُونَ، فَأَيُّ خِزْيٍ أَخْزَى مِنْ أَبِي الأَبْعَدِ فَيقول: اللَّهُ تَعَالَى إِنِّي حَرَّمْتُ الْجَنَّةَ عَلَى الْكَافِرِينَ، ثُمَّ يُقال: يَا إِبْرَاهِيمُ مَا تَحْتَ رِجْلَيْكَ؟ فَيَنْظُرُ فَإِذَا هُوَ بِذِيخٍ مُلْتَطِخٍ، فَيُؤْخَذُ بِقَوَائِمِهِ فَيُلْقَى فِي النَّارِ. رواه الْبُخَارِيُّ في بدء الخلق[٤].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) لەحەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ڕۆژی زیندوبوونەوە ئیبراهیم (دروودی خودای لەسەر بێ) تووشی ئازەری بابی دەبێ، دەڕوانێ وا ڕووی ئازەر دۆرنجو تۆزو خۆڵی لێ نیشتووەو لێو بەبارو دڵ خەفەتبار داماوە، جا ئیبراهیم پێی دەفەرموێ: ئەدی پێم نەگوتیت بەگوێم بکەو لەقسەم دەرمەچۆ، کەچی هەر قسە قسەی خۆت بوو؟ بابیشی دەڵێ: ئەمڕۆ چی بڵێیت بەگوێت دەکەمو لە فەرمانت دەرناچم، تازە ئەوە

[٤] بخاري. حديث الأنبياء: ٣٣٥٠ ، ٤٧٦٨ ، ٤٧٦٩. تجريد / ٤ ل / ٢٢ رقم: ١٣٤٤.

لەدەستم چوو، جا ئیبراهیم دەفەرموێ: ئەی خودایە! خۆ تۆ گفتت داومەتێ کە لەڕۆژی زیندوو بوونەوەدا ریسوام نەکەیو تەریقیم بەسەر نەهێنێ، ئەدی چی ریسواییو ڕوو زەردییەك ریسوایی ترە لەم ریسواییو شەرمەزاریو ئابڕوو چوونەی بەسەر ئەم باوکە نەگبەتە دوور لەڕەحمەتەم هاتووە؟ لەمە ریسوایی تر دەبێ چی بێ؟ خودای گەورە دەفەرموێ: من بەهەشتم قەدەغە کردووە لەناموسسوڵمانەکانو لەکافران، لەپاشا دەگوترێ: ئەی ئیبراهیم تەماشای بەر پێی خۆت کە، ئەوە چییە لەبەر پێتا؟ کە تەماشا دەکا دەڕوانێ وا باوکی بووە بە گۆڵە کەمتیارێکی تیسکنو لە پیسایی خۆی دا گەوزاوە، ئەنجا هەر چوار پەلی دەگرنو تووڕی دەدەنە ناو ئاگری دۆزەخ! (بوخاری – رەزای خودای لەسەر بێ).

٣٨٥٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قال: لَمَّا نَزَلَتِ (الَّذِينَ آمَنُواْ وَلَمْ يَلْبِسُواْ إِيمَانَهُم بِظُلْمٍ أُوْلَئِكَ لَهُمُ الأَمْنُ وَهُم مُّهْتَدُونَ) شَقَّ ذَلِكَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ، فَقَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ، وأَيُّنَا لاَ يَظْلِمُ نَفْسَهُ؟ قال: لَيْسَ ذَلِكَ، إِنَّمَا هُوَ الشِّرْكُ، أَلَمْ تَسْمَعُوا مَا قال: لُقْمَانُ لاِبْنِهِ وَهُوَ يَعِظُهُ (يَا بُنَيَّ لاَ تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ). رواه الترمذي والشيخان[٥].

عەبدوڵڵا (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: کەئەم ئایەتە هاتە خوارەوە:
{الَّذِينَ آمَنُواْ وَلَمْ يَلْبِسُواْ إِيمَانَهُم بِظُلْمٍ أُوْلَئِكَ لَهُمُ الأَمْنُ وَهُم مُّهْتَدُونَ – ٨٢/٦}.

واتە: موسوڵمانی ڕاستو دروست بەپێی دەستوورەکانی دەینو ئایین ئەو بڕوادارانەن کە باوەڕێکی ساخی ڕەسای بێ گەردو باشیان هەیە بە خودای خۆیانو بەهەموو پێغەمبەرانی پێش چەرخی خۆیانو بە پێغەمبەری

---

[٥] بخاري. إيمان: ٣٢ ، ٣١٨١ ، ٣٢٤٥ ، ٣٢٤٦ ، ٤٣٥٣ ، ٤٤٩٨ ، ٦٥٢٠ ، ٦٥٣٨ = تجريد بخاري / ١ ل / ٥١ رقم / ٣٠ = ٣٢ ، ٣٣٦٠ ، ٣٤٢٨ ، ٣٤٢٩ ، ٤٦٢٩ ، ٤٧٧٦ ، ٦٩١٨ ، ٦٣٣٧. مسلم. إيمان: ٣٢٣ ، ٣٢٤ ، ترمذي. تفسير: ٣٠٦٧.

سەردەمی خۆیان، باوەڕێکی پەتی ڕووتی وا کە تێکەڵی ستەمو زۆرو ستەم نەبێ، ئەوانە ئاسایشو ئارامو هێمنی دادەبارێ بەسەریانا، خۆشیان شارەزای ڕێگەی ڕاستنو مرازیان هاتۆتە دی.

دەڵێ: کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە بوو بەهۆی نیگەران بوونی موسوڵمانەکانو ئازاری دڵیان، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! دەبێ کێ بێ لەئێمە کە زۆرو ستەمی نەکردبێ لەخودی خۆی؟ ئەویش فەرمووی: مەبەست ئەوە نییە کە ئێوە تێی گەیشتوون، بەڵکوو مەبەست لەو زوڵمو زۆرو ستەمگەرییە شیرکە، واتە: هاوبەش دانان بۆ خودا! ئایا نەتان بیستووە فەرمودەی لوقمان بەکوڕی خۆی کە قورئانی پیرۆز دەیگێڕێتەوە دەفەرموێ:

{يَا بُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ - ١٣/١}.

واتە: ڕۆڵەی خۆشەویستم! نەکەی هەڵەی وا گەورە بکەی، هاوبەشو هاوڕێ بۆ خودا بڕیار بدەی، چونکی زوڵمو زۆرو ستەمو ناهەقی پیشەی ملهوڕو خوادانەناسەکانە، هاوبەش دانانیش بۆخودا گەلێ خراپەو بەزۆرو ستەمێکی گەلێ گەورە دادەنرێ (ت/ش).

ڕەحمەت لەو کەسەی گوتوویەتی:

چاومان قلیچ بوو، گوێمان خێلو خوار
مەسیحو مەهدی هەر نەهاتنە خوار
سوێندم بەخودا شیرکی ناهەموار!
هەر بکا هاوتای زۆرداری زۆردار!
مەبەس ناشکوری نییە لەم قسە
بەڵکوو بەیانی حاڵم مەبەستە!
هەرچەن میهرەبان ناکای لەحاڵە
دەرگای بەخشش هەمیشە واڵە
بەندەی زەبوونیش چەشنی مناڵە
سکاڵای خۆشە! چون گڕو گاڵە!

نـــــووری! دەزانم حاڵـــــت بـــــێ حاڵـــــە
دەروونـــــت ســــیخناخ لـــــەدڕکو داڵـــــە
خـــــودای میهرەبـــــان ناکـــــای لەحاڵـــــە
نـــیتر چ پێویـــــست بـــــەم کاڵـــــە کاڵـــــە

١٩٨٧/٦/٢٤

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَإِسْمَاعِيلَ وَالْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطًا وَكُلاًّ فضَّلْنَا عَلَى الْعَالَمِينَ – ٨٦/٦}.

واتە: وە ئەم پێغەمبەرە پایە دارانەیش لەنەتەوەی پێغەمبەر نووحن کە خودا ڕێگەی هەقی پێ نیشان داون، کە ناویان ئیسماعیلو ئەلیەسەعو یوونسو لووطە (دروودی خودایان لەسەر بێ)، هەموو یەکێ لەم زاتە پایە بەرزانەمان فەزڵو باوداوە بەسەر خەڵکی سەردەمو ڕۆژگاری خۆیاندا.

٣٨٥٧- ⇨ (ب/٤ ز/١١٨ ل/٣٨٦ ف/١ + ٢)◆[٦].

---

◆ هەرکـــەس نـــاو دێـــنین لـــەدۆسو یـــاران
یـــا وا لەجێـــدا یـــا وا لەقـــەبران!
ئێمـــە کیـــای ســـەرکین ، پیاڵـــەی دەنۆشـــین
هاکـــا شـــایی ژیـــن بـــوو بـــە زاریو شـــین
بۆیـــــە بەپەلــــەم لـــــە نووســـــینەوە
بـــەڵکوو پـــێش نـــەوەی ســـەر بنێینـــەوە
کتێـــب لەفـــەوتان ڕزگاربـــێ قوربـــان!
لەســـەر تـــەوفیقی خـــودای میهرەبـــان
دەنـــا لەســـەر پـــشت کـــەر نووســـیتەوە
دەقـــی بنووســـە ، خێـــر بەریتـــەوە!!
چـــاو لەدانەرکـــە ، دانـــاو زانایـــە
نـــووری فەقێیـــە ، لای نـــەو مەلایـــە!

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {أُوْلَئِكَ الَّذِينَ هَدَى اللّهُ فَبِهُدَاهُمُ اقْتَدِهْ - ٦/٩٠}.

واتە: ئەو کۆمەڵە کەڵەمێردانە ئەوانە مەردی خوداو دەستەی هەڵبژاردەی یەزدانن بۆ وەرگرتنی خەڵاتی ڕێنموونی خودایی، کە یەزدانی مەزن بۆخۆی شارەزای ڕاستی کردوون، دەی تۆیش کە دواترین پێغەمبەری چاو لە ڕەفتارو کرداری جوانی ئەو مەردانەی مەیدانی خودایە بکە.

٣٨٥٨- عن ابن عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) قال: نَبِيُّكُمْ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مِمَّنْ أُمِرَ أَنْ يَقْتَدِيَ بِهِمْ. رواهما البخاري[٧].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری ئێوە کە موحەممەدە یەکێکە لەو زاتانە کە خودا فەرمانی کردووە کە بکرێن بە پێشەواو سەرمەشق و چاویان لێ بکرێ (ب).

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {لاَّ تُدْرِكُهُ الأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الأَبْصَارَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ - ٦/١٠٣}.

واتە: لەبەر ناسکی و نازداری و وورشە ووورشی ڕووی نازداری چاوی سەر، وەهەروەها چاوی تری دنیایی کەبەس ماددە دەبینێ، ئەو نابینێ و نایگاتێ، وەلێ خودا خۆی دەرکی چاوان و خاوەن چاوان دەکا، چونکە خۆی ناسک و نازدارەو بەئاگاو ئاگادارە.

٣٨٥٩- قال: مَسْرُوق (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قال: كُنْتُ مُتَّكِئًا عِنْدَ عَائِشَةَ فَقَالَتْ: ثَلاَثٌ مَنْ تَكَلَّمَ بِوَاحِدَةٍ مِنْهُنَّ فَقَدْ أَعْظَمَ عَلَى اللَّهِ الْفِرْيَةَ مَنْ زَعَمَ أَنَّ مُحَمَّدًا رَأَى رَبَّهُ فَقَدْ أَعْظَمَ الْفِرْيَةَ عَلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يقول: (لاَ تُدْرِكُهُ الأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الأَبْصَارَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ) (وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَنْ يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلاَّ وَحْيًا أَوْ مِنْ وَرَاءِ حِجَابٍ) وَكُنْتُ مُتَّكِئًا فَجَلَسْتُ فَقُلْتُ يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ أَنْظِرِينِي وَلاَ تُعْجِلِينِي أَلَيْسَ يقول: اللَّهُ (وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً

---

٢٥ / ٦ / ١٩٨٩

[٦] تقدم في مجلد رابع. تسلسل / ١١٨ رقم: ١ / ٣١٧٧ و ٢ / ٣١٧٨.

[٧] بخاري. تفسير: ٤٦٣٢ ، ٣٤٢١ ، ٤٨٠٦ ، ٤٨٠٧ = تجريد / ٤ ل / ٤٤٦ رقم: ١٦٦١.

أُخْرَى) (وَلَقَدْ رَآهُ بِالأُفُقِ الْمُبِينِ) قالت: أَنَا وَاللّٰهِ أَوَّلُ مَنْ سَأَلَ عَنْ هَذَا رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قال: إِنَّمَا ذَاكَ جِبْرِيلُ مَا رَأَيْتُهُ فِي الصُّورَةِ الَّتِي خُلِقَ فِيهَا غَيْرَ هَاتَيْنِ الْمَرَّتَيْنِ رَأَيْتُهُ مُنْهَبِطًا مِنَ السَّمَاءِ سَادًّا عِظَمُ خَلْقِهِ مَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ. وَمَنْ زَعَمَ أَنَّ مُحَمَّدًا كَتَمَ شَيْئًا مِمَّا أَنْزَلَ اللّٰهُ عَلَيْهِ فَقَدْ أَعْظَمَ الْفِرْيَةَ عَلَى اللّٰهِ والله يقول: (يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ) وَمَنْ زَعَمَ أَنَّ محمداً يَعْلَمُ مَا فِي غَدٍ فَقَدْ أَعْظَمَ الْفِرْيَةَ عَلَى اللّٰهِ وَاللّٰهُ يقول: (قُلْ لاَ يَعْلَمُ مَنْ فِي السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ الْغَيْبَ إِلاَّ اللّٰهُ). رواه الترمذي والشيخان[٨].

مەسرووق (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: جارێ لەلای عائیشە بووم، پاڵم دادابوو، عائیشە گوتی: هەرکەسێ یەکێ لەم سێ قسەیە بکا، ئەوە بەڕاستی هەلاتێکی گەلێ گەورەو زل هەڵ دەبەستێ بۆ خودا، ئەوەی بڵێ: موحەممەد (سەرو ماڵو منالْ هەمووی بەقوربانی بێ) خودای خۆی بەچاوی سەر دیوە ئەوە بە ڕاستی درۆیەکی گەلێ زلی هەڵبەستووە بەدەم خوداوە، چونکە خودا بۆخۆی دەفەرموێ: {لاَّ تُدْرِكُهُ الأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الأَبْصَارَ} چاوانی سەر خودا نابینن و دەرکی کونهو چییەتی ئەوناکەن، بەلاّم خودا زۆر باش دەرکی چاوان و خاوەن چاوان دەکا هەروەك دەفەرموێ لەم لایەنەوە:

{وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ اللّٰهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَاء حِجَابٍ - ٤٢/٥١}.

واتە: نەبووە بۆ ئادەمیزاد کە خودا قسەی لەگەلاّ بفەرموێ بەیەکێ لەسێ جۆر نەبێ:

یەکەم: بەشێوەی سرووشی ڕاستەو خۆ لەخوداوە بۆ بەندەی خۆی بەبێ ئەوەی کەسێ لەنێواندا بێ.

دووەم: دوو بە دوو بەبێ میانەگەریی کەسێکی تر بەلاّم لەپشتی پەردەوە نەك ڕوو بەڕوو. مەسرووق گوتی: کە عائیشە وای گوت منیش ڕێك

---

[٨] بخاري. تفسير: ٤٦١٢ ، ٤٨٥٥ ، ٧٣٨٠ ، ٧٥٣١ = تجريد / ٤ ل / ٤٣٧ رقم: ١٦٥٥ ورقم: ١٣٠٦ بەرگی / ٣ ل / ٤٣٧ = ٣٢٣٤ فتح. مسلم. إيمان: ٤٣٨. ترمذي. تفسير القرآن: ٣٠٦٨ ، ٣٢٧٨.

دانیشتمو گوتم: ئەی دایکی موسوڵمانان! مۆڵەتم بدەو پەلەم لێ مەکە، ئەی ئەوە نییە خودا فەرموویەتی:

{وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى - ٥٣/١٣}.

واتە: لەگەڵ ئەوەدا کە جارێکی دیکەیش لەداپەرینێکی دیکەدا لەلای درەختی سیدرەتولمونتەهادا حەزرەت ئەوی بینی لەژووری ئاسمانی حەوتەمەوە، ئەی نەیفەرمووە:

{وَلَقَدْ رَآهُ بِالْأُفُقِ الْمُبِينِ -٨١/٢٣}.

واتە: موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) بەچاوی سەر لەکەناری ئاسماندا بە ڕوونی ئەوی بینیو چاوی پێی کەوت کەواتە تۆ چۆن وادەڵێیت؟ عائیشەش گوتی: من خۆم یەکەم کەس بووم کەئەم پرسیارەی تۆم لە حەزرەت کرد، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): ئەوەی کەمن چاوم پێکەوتووە جوبرەئیل بوو، تەنیا ئەم دوو جارە لەسەر شێوەی خۆی دیومە، واتە: لەسەر ئەو صوڕەتو شێوەیەی کەخودا لەسەرەتاوە لەسەری دروستی کردووە! وەلێ لەسەر شێوەی تر زۆری دیوە، وەك ئەوەی گەلێ جار لەسەر شێوەو شەکڵی دیحیەی ئەل-کەلبی دەیبینی، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: جوبرەئیلم دی لەئاسمانەوە داپەڕی، قەڵافەتی ئەوەندە گەورەبوو، وەلەشو لاری ئەوەندە زل بوو ناوەندی ئاسمانو زەوی داگرتبوو! دووەم ئەوەی بڵێ موحەممەد شتێکی حەشارداوە لەو سرووشەی کەخودا ناردوویەتی بۆی، ئەوە بێگومان درۆیەکی زلی هەڵبەستووە بەدەم خوداوە، چونکە خودای گەورە فەرموویەتی:

{يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ} ⇦ (ب/٦ ز/٨ ل/١٣٥ ف/٧).

سێیەم: هەر کەسێ باوەڕی وابێ کە موحەممەد عیلمی غەیبی بووەو لەخۆیەوە بەبێ سرووشی خودایی دەیزانی سبەینێ چی دەبێ ئەوە دیارە درۆیەکی زلی هەڵبەستووە بەدەم خوداوە، چونکە دەفەرموێ:

{قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ - ٦٥/٢٧}.

**واتە: بفەرموو ئەوەی لەئاسمانو زەویدا عیلمی غەیبی هەبێ هەر خودایەو کەسی تر نییە لەم دووەدا غەیب زان بێ (ت/ش = تیرمیزیو بوخاریو موسلیم گێڕاویانەتەوە)◆.**

**٣٨٦٠- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قال: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) هَلْ رَأَيْتَ رَبَّكَ. قَالَ: نُورٌ أَنَّى أَرَاهُ. رواه مسلم في الإسراء والترمذي في النجم[٩].**

---

◆ لەمەوە وادیارە کە حەزرەتی عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) کەیەکێکە لە زانا هەرە گەورەکانی ئیسلام ڕای وایە: کەهەر قسەو باسێ نەگونجێ لەگەڵ دەقی ڕۆشن (نەصصی صەریح)ی ئایەتی قورئاندا ئەوە درۆیەکی رووتی پەتییە ، تەنانەت ئەگەر کەسێ نیسبەتی ئەو قسەیە لە ڕاستگۆییەکی وەك پێغەمبەریش بدا هەر بڕوابەوکەسە ناکرێ ، چونکی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) قسەو فەرمایشتی سرووشەو ڕێکی دەقی قورئانەو هەمووی ڕاستەو هەڵە هەڵنەگرە ، بەلاّم دوو ئایەت یا دوو حەدیس ، یا ئایەتو حەدیث لەناو خۆیانا، ئەگەر جۆرە جیاوازییەك بوو دەبێ مەبەست ڕوون بکرێتەوەو تەئویل بکرێن ، وەکی ئەوەی عائیشە وەلاّمی پرسیارەکەی مەسرووقی دایەوە ، من بەش بەحاڵێ خۆم ئەم ڕایەی حەزرەتی عائیشەیە پەسەند دەکەم ، چونکە ئەمە بۆ ئەم سەردەمە زۆرباشو لەبارە کە دوژمنان دەمیانژەندۆتە زامەکانی ئۆمەتەکەمانو بەهەقو ناهەق دەڵێن: دین واودین وا. مەبەستم لەمە ئەمەیە کە تەعنو قەدح لەڕاوی ، نەك لەخوداو پێغەمبەرو ئایەتو مەتنی حەدیسی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ ئەم ڕۆژگارەی ئێمە چاری گەلێ ناچاری دەکاو دەرمانی گەلێ دەردە ، دیارە تەعنیش جۆری زۆرە ، مەرج نییە بە درۆزنی دەرکەین ، لەوانەیە هەڵەبێ ، لێی تێکچووبێ لەبیری نەمابێ ، بەمەعنا ڕیوایەتی کردبێ ، مەنسووخ بێ ، تەفسیر بێ... هتد. ئەوەندە هەیە مەبەستم لەمە ئەوەنییە کە بڵێم دیتنی خودا دروست نییە ، ئەوە مەسەلەیەکی تری سەربەخۆیە. -وەرگێڕ-

[٩] مسلم. إيمان: ٤٤٢. ترمذي. تفسير القرآن: ٣٢٨٢.

**ئەبو زەڕ** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: لەپێغەمبەرم پرسی: ئایا خودای خۆتت دیوە؟ فەرمووی: لەبەر نوور چۆن بیبینم؟** (م/ت).

**٣٨٦١- عن ابْنِ عَبَّاسٍ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) **قال: أَتَـى أُنَـاسٌ النَّبِـيَّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **فَقَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا نَأْكُلُ مَا نَقْتُلُ وَلاَ نَأْكُلُ مَا يَقْتُلُ اللَّهُ فَأَنْزَلَ اللَّهُ (فَكُلُوا مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ إِنْ كُنْتُمْ بِآيَاتِهِ مُؤْمِنِينَ). رواه الترمذي بسند حسن**[١٠].

**ئیبنـو عـەبباس** (خودایـان لـێ ڕازی بـێ) **دەڵـێ: دەسـتەیێ هاتنـە خزمـەتی حەزرەت** (دروودی خودای لەسەر بێ) **عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆچی ئەو ئاژەڵەی کە خۆمان دەیکوژین واتە: سەری دەبڕین، حەڵاڵـە بۆمـان و دەیخـۆین کەچی ئەو ئاژەڵـەی خـودا دەیکـوژێ واتـە: بـەدەردی خـودا دەمرێ، حەرامـەو نایخۆین؟ جا ئەمە دابەزی:**

**{فَكُلُواْ مِمَّا ذُكِرَ اسْـمُ اللّـهِ عَلَيْـهِ إِن كُنـتُمْ بِآيَاتِـهِ مُـؤْمِنِينَ}** ⇨ **(ب/٤ ز/١٠ ل/٢٩) (ت-س/ح).**

**قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَعَلَى الَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمْنَا كُلَّ ذِي ظُفُرٍ وَمِنَ الْبَقَرِ وَالْغَنَمِ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ شُحُومَهُمَا إِلاَّ مَا حَمَلَتْ ظُهُورُهُمَا أَوِ الْحَوَايَا أَوْ مَا اخْتَلَطَ بِعَظْمٍ ذَلِكَ جَزَيْنَـاهُم بِبَغْيِهِمْ وِإِنَّا لَصَادِقُونَ - ١٤٦/٦}.**

**واتــە: یــەزدانی مــەزن دەفــەرموێ: وەلــە وەختــی خۆیــدا، لەســەر جوولەکـەکان خـواردنی گۆشـتی هـەر گیانلەبـەرێ کەپەنجـەی پێـی لکابـێ بەیەکەوە، وەکوو وشترو وشترمرغ و سۆنەو قاز، وە هەروەها پیوو بەزی ڕەشە وڵاخ و مـەڕو بـزن، جگـە لـەوەی پەیوەنـدی هـەبێ بـە پـشتیانەوە، یـا بـەناو سکیانەوە، یا تێکەڵی ئێسقان بوو بێ.**

**٣٨٦٢-** ⇨ **(ب/٢ ز/١٤٨ ل/٣٠٥ ف/١)**[١١].

---

[١٠] حديث حسن عند الترمذي.

[١١] تقدم في المجلد الثاني. تسلسل / ١٤٨ رقم: ١ / ١٧٨٠.

٣٨٦٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قال: مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى الصَّحِيفَةِ الَّتِي عَلَيْهَا خَاتَمُ مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَلْيَقْرَأْ هَذِهِ الآيَاتِ (قُلْ تَعَالَوْا أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ) الآيَةَ إِلَى قَوْلِهِ (لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ). رواه الترمذي بسند حسن[١٢].

عەبدوڵڵا (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: هەرکەسێ حەزدەکا تەماشای لاپەڕەی ئەو تۆمارە بکا کە مۆری موحەممەدی پێوەنرابوو، با ئەم ئایەتانە بخوێنێتەوە، چونکی لەبەر گرنگییان لەو لاپەڕە مۆرکراوە تۆمار کرابوون، واتە:

{قُلْ تَعَالَوْاْ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ أَلاَّ تُشْرِكُواْ بِهِ شَيْئًا وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا وَلاَ تَقْتُلُواْ أَوْلاَدَكُم مِّنْ إمْلاَقٍ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ وَلاَ تَقْرَبُواْ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَلاَ تَقْتُلُواْ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ ذَلِكُمْ وَصَّاكُمْ بِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ، وَلاَ تَقْرَبُواْ مَالَ الْيَتِيمِ إِلاَّ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ حَتَّى يَبْلُغَ أَشُدَّهُ وَأَوْفُواْ الْكَيْلَ وَالْمِيزَانَ بِالْقِسْطِ لاَ نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُواْ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى وَبِعَهْدِ اللّهِ أَوْفُواْ ذَلِكُمْ وَصَّاكُم بِهِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ، وَأَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلاَ تَتَّبِعُواْ السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِ ذَلِكُمْ وَصَّاكُم بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ - ٦/١٥١-١٥٣}.

واتە:

ڕەهبەر! بفەرموو بە پەیڕەوانت

هەروا بەو خەڵکەی وان لەزەمانت

وەرن گوێگرن لەدەقی قوڕئان

لەفەرمایشتی خودای میهرەبان:

هەرگیز دامەنێن هاوڕێ بۆ خودا

باش بن بۆ باوەو دایە بێ جودا

جگەر گۆشەتان میوەی دڵتانە

نەکەن بیکوژن بەبێ نەقڵانە!

---

[١٢] حديث حسن عند الترمذي.

لەترسی ڕۆزیی یا خۆ لەبەر عار

ڕۆژیدەر خوایە، نەک نێوەی هەژار!

خوێنی بەندەی خوا قەت بەناڕەوا

مەڕێژن، ژێربن مەکەن شتی وا،

چاک بەبۆ هەتیو، باش بە بۆ مالی

دەڵێم: بەباشی لەحاڵ بووی حالی،

تەرازوو بازی، فێڵ لەپێوانە

ڕەفتاری دەسبڕ، پیشەی دێوانە،

پتر لەتاقەت خوا تەکلیف ناکا

حەزیش لە قسەی ناڕەوا ناکا،

لەگەڵ هەموو کەس خزمو بیانی

بەدادبە، دەڵێم تۆ موسوڵمانی،

وەفا لەگەڵ خوا مایەی ڕەزایە

دۆستی بەنەمەک چەشنی برایە،

مەبەس لەتەمێو ئامۆژگاری خوا

دڵتان نەخەوێ لەیادگاریی خوا!

دڵتان نینجانە، نەشقی خودا گوڵ

بەنەشک ناوی دەن، بەدڵی بولبوڵ!

لەدزیو حیزیو لەبەد ڕەفتاری

لەکاری خراپ، دیارو نادیاری

دوور بن، تا دووربن لەئاگری سوور

خوا نزیکی کا بۆمان ڕێگەی دوور!

لەگەڵ میهرەبان مەبە بێ نەمەک

شووشی زێڕ مەدە بە شیشی تەنەک

ڕێی خودا یەکە وەکی دووخ ڕاسە

ڕێگــەکانی تــر وەک دەمــە داســە،
لارو خـــوارو خـــێچ لــەڕێ دەرتەکـــەن
پــەیمانی دۆســتی کــەرت و پەرتەکــەن،
ئەمانـــەی گـــوترا نـــامۆژی خوایـــە
مەبــەس گرتنـــی ڕێگـــەی تەقوایــە،
بریــا بــــرای مـــەرگ مـــەودای دابایــە
تەفـــــسیری نـــــاوام بنووســـــیبایە!

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {يَوْمَ يَأْتِي بَعْضُ آيَاتِ رَبِّكَ لاَ يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْرًا قُلِ انتَظِرُواْ إِنَّا مُنتَظِرُونَ - ٦/١٥٨}.

واتـە: لـەو ڕۆژەدا کەئـەو بـازە نیشانەی هەڵسانی ڕۆژی قیامەتـە دێت، باوەڕ هێنان و موسوڵمان بوونی ئەوکەسانە سوودی نییە کەلەوەپێش ئیمان و باوەڕی نەهێنابێ، بەڵام لەوەپێش ئەگەر تەنیا باوەڕی ڕووتی هێنابێ، باهیچ کردەوەیـەکی چاکەیـشی نـەبێ ئەوەلـەو ڕۆژەدا سـوودی دەبـێ بـۆی، وەلـێ ئیمـان و کـردەوەی چـاکە کەلـەپاش هـاتنی ئـەو ڕۆژە ڕووبـدەن دادنـا خـواو سوودی نییە بۆکەسێ کە لەپێشانا موسوڵمان بووبێ.

٣٨٦٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِـيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَـالَ: لاَ تَقُـومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا، فَإِذَا رَآهَا النَّاسُ آمَنَ مَنْ عَلَيْهَا، فَـذَاكَ حِـينَ لاَ يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا. رواه الْبُخَارِيُّ[١٣].

ئـەبو هـورەیرە (خودای لـێ ڕازی بـێ) گـوتی: حـەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فـــەرمویوەتی: ڕۆژی قیامـــەت هەڵناســـێ هـــەتا ڕۆژ نەگەڕێتـــەوەو خـــۆر لـەخۆرئاواوە هەڵنـەیێ، جـا کـەخۆر لـەخۆرئاواوە هـەڵهات و خـەڵك بەچـاوی خۆیان دییان ئەوسا هەموو ئیمان و باوەڕ دێنن، بـەڵام ئەوکاتـە ئـەو ئیمـان و

---

[١٣] بخاري. تفسير: ٤٦٣٦.

باوەڕە هیچ سوودێ نابەخشێ، وەك لەم ئایەتەدا دەفەرموێ: {لاَ يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا ⇦} (ب).

٣٨٦٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: ثَلاَثٌ إِذَا خَرَجْنَ (لَمْ يَنفَعْ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِنْ قَبْلُ) الدَّجَّالُ وَالدَّابَّةُ وَطُلُوعُ الشَّمْسِ مِنَ الْمَغْرِبِ أَوْ مِنْ مَغْرِبِهَا [١٤]:

دیسان لەئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە: حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەم سێ شتەکە ڕوویان داو پەیدا بوون ئیتر باوەڕهێنان و موسوڵمان بوون سوودیان نییە، مەگەر بۆکەسێ کەلەپێش ڕوودانی ئەمانەدا باوەڕو ئیمانی بووبێ:

یەکەم: هەڵسانی ججاڵ.

دووەم: پەیدابوونی دابەتولئەرض.

سێیەم: هەڵهاتنی خۆر لە خۆرنشینەوە یا فەرمووی: گەڕانەوەی ڕۆژ لەخۆرئاواوە بۆ خۆرهەلات (ت-س/ص).

٣٨٦٦- ⇦ (ب/١ ز/١١ ل/ ف/٢ + ب/١ ز/١٥٩ ل/ ف/١٠)[١٥].

## سوورەتی ئەعراف (سورة الأعراف)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٣٨٦٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ كَانَتِ الْمَرْأَةُ تَطُوفُ بِالْبَيْتِ وَهِيَ عُرْيَانَةٌ فَتَقُولُ مَنْ يُعِيرُنِي تِطْوَافًا تَجْعَلُهُ عَلَى فَرْجِهَا وَتَقُولُ:

الْيَوْمَ يَبْدُو بَعْضُهُ أَوْ كُلُّهُ فَمَا بَدَا مِنْهُ فَلاَ أُحِلُّهُ

فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةَ (خُذُوا زِينَتَكُمْ عِنْدَ كُلِّ مَسْجِدٍ) [١].

---

[١٤] حديث صحيح عند الترمذي.

[١٥] تقدم في المجلد الأول. تسلسل / ١١ ل / ٦٥ رقم: ٢ / ٨٤.

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) دەڵێ: جاران ئافرەت بەڕووتی تەوافی بەیتیان دەکرد چونکی نەدەبوو بەجلەکانی خۆیەوە تەواف بکا، لەبەر ئەوەی گوناهی پێیەوە کردووە، جا یادەبوو دەستێ بەرگی تەواف لە قورەیش بەکرێ بگرێ، یا بەڕووتی هەڵ دەسووڕا بەگردی بەیتاو دەیگوت: کێ دەستێ جلکی تەوافم بەخواستەمەنی دەداتێ جا جلکەکەی دەدا بەسەر شەرمگای‌داو دەیگوت:

الْيَوْمَ يَبْدُو بَعْضُهُ أَوْ كُلُّهُ      فَمَا بَدَا مِنْهُ فَلاَ أُحِلُّهُ

ئەمڕۆ لەجەستەم هەرچی دەرکەوێ ئیتر      حەڵاڵی ناکەم بۆکەسێ جارێکی تر!

بەپەخشانیش واتە: ئەمڕۆکە لەشم بازێکی یا هەمووی دەردەکەوێ، جا ئەوەی لەلەشم ئەمڕۆ دەرکەوێ ئیتر بۆکەسێ حەڵاڵی ناکەم ئەم ئایەتە هات،

{خُذُواْ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ – ٣٣/٧}.

واتە: یەزدانی مەزن دەفەرموێ: ئەی ڕەهبەر! بفەرموو: خودای من کەپەروەردەی کردووم لەسەر ڕەفتاری جوانی بەرز ئەوەی کاری ناپەسەندو ناشایستەو شەرم ئاوەر بێ حەرامی کردووە، ئیتر خواه بە ئاشکرا بکرێ، وەکوو هەنێ شتی بێ شەرعی کە بە پێی باوی ڕۆژو دابو نەریتی کۆمەڵایەتی مەودایان داوە بە خەڵك‌و مرۆڤی کەم دین بە بەرچاوی خەڵکی ترەوە دەیکا، وە خوا پە نامەکی بێ، وەکوو ئەو ئارەزوو بازی‌و ناشەرعییانەی کە خەڵك بەدزییەوە لەناو خۆیانا دەیانکەن، وە هەروەها هەموو تاوانێکی تری قەدەغە کردووە وەك قومارو بادەنۆشین‌و شتی وا، وەهەروەها دەستدرێژی‌و زوڵم‌و زۆرو ستەمی حەرام کردووە بۆسەر خەڵکی بێ‌تاوان بەناڕەوا، وەئەوەشی قەدەغە کردووە کە هاوەڵ بۆ خودا بڕیار بدەن، چونکی خودا ڕێگەی شتی وا نادا، بەپێچەوانەوە سەلماندوویەتی بەبەڵگەی

---

(١) مسلم. تفسير: ٧٤٦٧. نسائي. مناسك: ٢٩٥٦.

ڕەسای ڕۆشن کەخودا بێ هاوەڵە، وە ئەوەیشی یاساخ کردووە کەلە خۆتانەوە بەبێ بەڵگەیەکی ڕەوا درۆ بەدەم خواوە بکەن، لەخۆتانەوە هەنێ نیشانەو صیفەتی بۆ داتاشن، یاخود بڵێن: ئەمەی ڕەوا دیوەو ئەوەی ڕەوا نەدیوە.

٣٨٦٧- ⇦ (ب/٣ ز/٥٧ ل/١٤٢ ف/١+٢+٣)[٢].

٣٨٦٨- عن أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ يُنَادِي مُنَادٍ إِنَّ لَكُمْ أَنْ تَصِحُّوا فَلاَ تَسْقَمُوا أَبَدًا وَإِنَّ لَكُمْ أَنْ تَحْيَوْا فَلاَ تَمُوتُوا أَبَدًا وَإِنَّ لَكُمْ أَنْ تَشِبُّوا فَلاَ تَهْرَمُوا أَبَدًا وَإِنَّ لَكُمْ أَنْ تَنْعَمُوا فَلاَ تَبْتَئِسُوا أَبَدًا. فَذَلِكَ قَوْلُهُ عَزَّ وَجَلَّ (وَنُودُوا أَنْ تِلْكُمُ الْجَنَّةُ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ). رواه مسلم في صفة الجنة[٣].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموی: لەبەهەشتا جارچی جاڕ دەدا: ئەی دانیشتوانی بەهەشت! خەڵاتی خودایە بۆئێوە: هەتا هەتایە ساخڵەم دەبن و لەشتان ساخ دەبێ و قەت نەخۆش ناکەون، مژدە بێ لێتان کە هەتا هەتایە بەشادیو خۆشی دەژین و قەت نامرن، وەهەتا هەتایە هەر جەهێڵ دەبن و قەت پیر نابن، وەهەتا هەتایە لەخۆشیو نازو نیعمەتا دەبن و قەت هەژارو کەساس ناکەون، ئەمە ئەوەیە کەخودای گەورە فەرموویەتی:

{وَنُودُواْ أَن تِلْكُمُ الْجَنَّةُ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ - ٧/٤٣}.

واتە: فریشتەی بەهەشت بانگی بەهەشتییەکان دەکەن: ئەوا ئەم بەهەشتی بەرینە بوو بەماڵی هەتا هەتاییتان، بەهۆی کردەوە باشەکانتانەوە وەك ماڵە میراتی بوو بەهی ئێوە (م — خودای لێ ڕازی بێ).

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَلَمَّا جَاء مُوسَى لِمِيقَاتِنَا وَكَلَّمَهُ رَبُّهُ قَالَ رَبِّ أَرِنِي أَنظُرْ إِلَيْكَ قَالَ لَن تَرَانِي وَلَكِنِ انظُرْ إِلَى الْجَبَلِ فَإِنِ اسْتَقَرَّ مَكَانَهُ فَسَوْفَ تَرَانِي فَلَمَّا تَجَلَّى رَبُّهُ

---

[٢] تقدم في المجلد الثالث. تسلسل / ٥٧ رقم: ١ / ٢٢٠٢.

[٣] مسلم. الجنة ونعيمها: ٧٠٨٦. ترمذي. تفسير القرآن: ٣٢٤٦.

لِلْجَبَلِ جَعَلَهُ دَكًّا وَخَرَّ موسَى صَعِقًا فَلَمَّا أَفَاقَ قَالَ سُبْحَانَكَ تُبْتُ إِلَيْكَ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُؤْمِنِينَ} (١٤٣/٧).

كاتێ مووسا (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕۆیشت و گەیشتە ئەو شوێنە خودا بۆی دیاری کردبوو، خودا گوفتوگۆی لەگەڵ دا کرد جا مووسا عەرزی بارەگای بێ نیازی کرد: پەروەردگارا! خۆتم نیشان بدە، با بە چاوی سەر بۆت بڕوانم! خودای گەورە فەرمووی: تۆ لەم جیهانەدا من بەچاوی سەر نابینی، بەڵام تاتێ بگەی هۆی چییە کەتۆ لەم جیهانی ماددەدا من نابینی بڕوانە بۆئەو کێوە، جا کاتێ خودا جیلوەی نووری خۆی دا بۆ کێوەکە کردی بە گەردو تۆزو ئارد وەکوو سورمەی چاو، وەلەحاڵی بوونی ئەم ڕووداوە پڕسام و بەسامە مووسا بێ هۆش کەوت، وەکاتێ هاتەوە سەر خۆی گوتی: پەروەردگارا! گەورەو بێ باکی و گەلێ پاکی و بێ نەنگ و بێ وێنەی.

٣٨٦٩- ⇦ (ب/٤ ز/١١٦ ل/٣٧٩ ف/١)[٤].

٣٨٧٠- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قال: قَرَأَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) هَـذِهِ الآيَـةَ (فَلَمَّا تَجَلَّى رَبُّهُ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُ دَكًّا) قَالَ حَمَّادٌ هَكَذَا وَأَمْسَكَ سُلَيْمَانُ بِطَرَفِ إِبْهَامِهِ عَلَى أَنْمُلَةِ إِصْبَعِهِ الْيُمْنَى قَالَ فَسَاخَ الْجَبَلُ (وَخَرَّ مُوسَى صَعِقًا ). واه الترمذي والحاكم[٥].

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: {فَلَمَّا تَجَلَّى رَبُّهُ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُ دَكًّا}. سولەیمان نووکی پەنجەکەڵەی خۆی نایەسەر جمگەی پەنجە تووتەی خۆی و گوتی: حەمماد گوتی: ئەو نوورە ئەوەندە بوو، ئیتر کێوەکە تلیسایەوەو بوو بە خاك و خۆڵ و مت بوو، وە مووساش خپ بوورایەوەو بێ هۆش کەوت (ت-س/ص - حاکم -س/ص).

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَالَّذِينَ هُم بِآيَاتِنَا يُؤْمِنُونَ - ١٥٦/٧}.

---

[٤] تقدم في المجلد الرابع تسلسل / ١١٦ رقم: ١ / ٣٢٠٦.

[٥] بسندين صحيحين (شرحه).

واتە: یەزدانی مەزن دەفەرموێ: ڕەحمەتو میهرەبانی من گوشادەو زۆرەو هەموو کەسێ هەموو شتێ دەگرێتەوەو شت نییە کەلەدەریای ڕەحمەتی مندا جێی نەبێتەوە! لە قیامەتیشا ئەو ڕەحمەتە گەورەو بێ سنوورەم بەتایبەتی دەنووسم بۆئەو کەسانەی کەخاوەن تەقواو پارێزنو خۆیان لەکوفرو گوناح دەپارێزنو زەکات دەدەنو باوەڕ دەکەن بەئایەتو بەڵگەو نیشانەکانی من کە نیشانەو بەڵگەی بوونو یەکێتیو تەواناییو تەواویی منن.

٣٨٧١- ⇦ (ب/١ ز/٦ ل/٣٧ ف/١)[٦].

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِن بَنِي آدَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنفُسِهِمْ أَلَسْتَ بِرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَى شَهِدْنَا أَن تَقُولُواْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَذَا غَافِلِينَ - ١٧٢/٧}.

ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! باسی ئەوەبکە کە وەختی خۆی خودای تۆ وەری گرتووە لەپشتی ئادەمیزاد مادەو ماکی نەتەوەکانیان، وە ئەوانی کردووە بەشایەت لەسەر خۆیان لەبەستنی عەهدو پەیمان داو فەرموویەتی پێیان: ئایا من پەروەردگاری ئێوەمو ئێوەم لەنەبوون دروست کردووە یانا؟ ئەوانیش گوتیان: بەڵێ تۆ پەروەردگاری ئێمەیو تۆ خۆت ئێمەت دروست کردووە، مەبادا لەڕۆژی قیامەتا بڵێن: ئێمە لەیاسای ئاینو لەسزاو پاداشی ڕۆژی قیامەت بێئاگا بووینو کەسێکیش ئاگای لەیاسایێ نەبێو پێی ڕانەگەیەندرا بێ ئیتر چۆن سزا دەدرێ شتی وا ستەمە.

٣٨٧٢- سُئِلَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ هَذِهِ الآيَةِ ( وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنْ بَنِي آدَمَ مِنْ ظُهُورِهِمْ) قَالَ قَرَأَ الْقَعْنَبِيُّ الآيَةَ. فَقَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) سُئِلَ عَنْهَا فَقَالَ إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ خَلَقَ آدَمَ ثُمَّ مَسَحَ ظَهْرَهُ بِيَمِينِهِ فَاسْتَخْرَجَ مِنْهُ ذُرِّيَّةً فَقَالَ خَلَقْتُ هَؤُلَاءِ لِلْجَنَّةِ وَبِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ يَعْمَلُونَ ثُمَّ مَسَحَ ظَهْرَهُ فَاسْتَخْرَجَ مِنْهُ ذُرِّيَّةً

---

[٦] تقدم في المجلد الأول. تسلسل / ٦ رقم: ١ / ٢٧.

فَقَالَ خَلَقْتُ هَؤُلاَءِ لِلنَّارِ وَبِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ يَعْمَلُونَ. فَقَالَ رَجُلٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَفِيمَ الْعَمَلُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ إِذَا خَلَقَ الْعَبْدَ لِلْجَنَّةِ اسْتَعْمَلَهُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ حَتَّى يَمُوتَ عَلَى عَمَلٍ مِنْ أَعْمَالِ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَيُدْخِلَهُ بِهِ الْجَنَّةَ وَإِذَا خَلَقَ الْعَبْدَ لِلنَّارِ اسْتَعْمَلَهُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ حَتَّى يَمُوتَ عَلَى عَمَلٍ مِنْ أَعْمَالِ أَهْلِ النَّارِ فَيُدْخِلَهُ اللهُ النَّارَ. رواه الترمذي وأبو داود[٧].

لەبارەی ئەم ئایەتەوە پرسیار کرا لەعومەری کوڕی خەطاب (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: بەگوێی خۆم گوێم لێ بوو، ئەم ئایەتەیان پرسییەوە لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: کاتێ خودا ئادەمی دروست کرد، لەپاشان دەستی ڕاستی هێنا بە پشتیاو نەوەیەکی لێ دەرهێناو فەرمووی: ئەمانەم بۆ بەهەشت دروست کردووەو بەکردەوەی ئەهلی بەهەشت کاردەکەن، لەپاشان دەستی بە پشتیا هێنایەوەو نەوەیەکی تری لێ دەرهێناو فەرمووی: ئەمانەشم بۆ دۆزەخ دروست کردووەو بەکردەوەی ئەهلی دۆزەخ کاردەکەن. جا پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە چۆن کارێکە؟ فەرمووی: کاتێ خودا بەندەیەکی بۆ بەهەشت دروست کرد دەیخاتە سەر ڕێگەی خەڵکی بەهەشت، تالە ئەنجاما لەسەر کردەوەی بەهەشتییان دەمرێ و بەهۆی ئەو کردەوەیەوە خودا ڕەحمی پێ دەکاو دەیخاتە بەهەشت وەکاتێ بەندەیەکی بۆ ئاگر دروست کرد دەیخاتە سەر ڕێگەی خەڵکی دۆزەخ هەتا لەئەنجاما لەسەر ئەو کردەوە دەمرێ و لەو هۆیەوە خودا دەیخاتە ئاگرەوە! (ت-س/ص-د) تا باش لەم فەرموودەیە حاڵی ببی تەماشای ئەم فەرموودانەیەش لەم شوێنانەدا بکە: (ب/١ ز/٦ ل/٤٠ ف/٤ + ٨ + ١٠).

٣٨٧٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عن النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قال: لَمَّا خَلَقَ اللَّهُ آدَمَ مَسَحَ ظَهْرَهُ فَسَقَطَ مِنْ ظَهْرِهِ كُلُّ نَسَمَةٍ هُوَ خَالِقُهَا مِنْ ذُرِّيَّتِهِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَجَعَلَ بَيْنَ عَيْنَيْ كُلِّ إِنْسَانٍ مِنْهُمْ وَبِيصًا مِنْ نُورٍ ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى آدَمَ فَقَالَ أَيْ رَبِّ مَنْ هَؤُلاَءِ

---

[٧] ولكن أبوداود في القدر والترمذي هنا بسند صحيح (شرحه).

قَالَ هَؤُلَاءِ ذُرِّيَّتُكَ فَرَأَى رَجُلاً مِنْهُمْ فَأَعْجَبَهُ وَبِيصُ مَا بَيْنَ عَيْنَيْهِ فَقَالَ أَيْ رَبِّ مَنْ هَذَا فَقَالَ هَذَا رَجُلٌ مِنْ آخِرِ الأُمَمِ مِنْ ذُرِّيَّتِكَ يُقَالُ لَهُ دَاوُدُ. فَقَالَ رَبِّ كَمْ جَعَلْتَ عُمْرَهُ قَالَ سِتِّينَ سَنَةً قَالَ أَيْ رَبِّ زِدْهُ مِنْ عُمْرِي أَرْبَعِينَ سَنَةً. فَلَمَّا انْقَضَى عُمْرُ آدَمَ جَاءَهُ مَلَكُ الْمَوْتِ فَقَالَ أَوَلَمْ يَبْقَ مِنْ عُمْرِي أَرْبَعُونَ سَنَةً قَالَ أَوَلَمْ تُعْطِهَا ابْنَكَ دَاوُدَ قَالَ فَجَحَدَ آدَمُ فَجَحَدَتْ ذُرِّيَّتُهُ وَنَسِيَ آدَمُ فَنَسِيَتْ ذُرِّيَّتُهُ وَخَطِئَ آدَمُ فَخَطِئَتْ ذُرِّيَّتُهُ. رواه الترمذي هنا وفي آخر التفسير وزاد فيه: فَلَمَّا أَتَاهُ مَلَكُ الْمَوْتِ فَقَالَ: إِنَّكَ عَجِلْتَ قَدْ كُتِبَ لِي أَلْفُ سَنَةٍ. قَالَ بَلَى وَلَكِنَّكَ جَعَلْتَ لابْنِكَ دَاوُدَ سِتِّينَ سَنَةً فَجَحَدَ فَجَحَدَتْ ذُرِّيَّتُهُ وَنَسِيَ فَنَسِيَتْ ذُرِّيَّتُهُ. قَالَ فَمِنْ يَوْمِئِذٍ أُمِرَ بِالْكِتَابِ وَالشُّهُودِ.[٨]

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: کاتێ خودا ئادەمی دروست کرد دەستی هێنا بەپشتیا، ئەو ڕەوانانەی کە خودا دروستیان دەکا لەنەوەی ئادەمو لەسەرەتاوە هەتا ڕۆژی قیامەت هەموویان لەپشتی داکەوتن، وەهەرکەسەیان ترووسکە نوورێکی دانا لەنێوانی هەردوو چاویدا، دوایی نیشانی ئادەمی دان، ئادەم فەرمووی: ئەی پەروەردگارم! ئەمانە کێن؟ فەرمووی: ئەمانە نەوەی تۆن! جا ئادەم لەناو نەوەکەی خۆی دا پیاوێکی دی، بریقەکەی ناوچاوانی زۆر جوان بوو بەلایەوە، فەرمووی: خودایە! ئەوەکێیە؟ فەرمووی: ئەوە پیاوێکە لەنەوەی تۆ لەدواترین نەتەوەکان دەبێ، ناوی داوودە، فەرمووی: ئەی خودایە! چەندت تەمەن بۆی داناوە؟ فەرمووی: شەست ساڵ، فەرمووی: خودایە! لەتەمەنی من چل ساڵی بۆ بخەرە سەری، جا کاتێ تەمەنی ئادەم تەواو بوو فریشتەی گیانکێشان چوو بۆلای، ئادەم فەرمووی: خۆ من هێشتا چل ساڵ تەمەنم ماوە! فەرمووی: ئەی لەوەختی خۆیدا تۆ خۆت ئەوچل ساڵەت نەدا بە داوودی کوڕت! فەرمووی: ئاوا ئادەم حاشای کرد، بۆیە نەوەکەشی حاشا دەکەن، وە ئاوا ئادەم هەڵەی کرد بۆیە نەوەکەشی هەڵە دەکەن لەگێڕانەوەیەکا: کاتێ فریشتەی گیانکێشان هاتە لای فەرمووی: زوو

---

[٨] رواه الترمذي في التفسير بسند صحيح (شرحه).

هاتووی! من هەزار ساڵ تەمەنم بۆ نووسراوە، من هەزار ساڵ تەمەنم بۆ نووسراوە، ئەویش فەرمووی: بەڵێ وایە بەڵام تۆ خۆت شەست ساڵت لێی داوە بە داوودی کوڕت، بەڵام ئادەم نەچووە ژێری‌و حاشای کرد، بۆیە ئەوەکەشی ناچنە ژێری‌و حاشا لەگفتی خۆیان دەکەن، وە ئادەم لەبیری چوو، بۆیە نەوەکەیشی لەبیریان دەچێ فەرمووی: ئیتر لەو ڕۆژەوە خودا دەستووری دەرکرد کە سەوداو مامەڵەو پەیمان‌و شتی وا بنوسرێ شایەت‌و شایەتکاریی لەسەریان ڕابگیرێ (ت-س/ح).

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {فَلَمَّا آتَاهُمَا صَالِحاً جَعَلاَ لَهُ شُرَكَاء فِيمَا آتَاهُمَا فَتَعَالَى اللّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ - ٧/١٩٠}.

واتە: خودای گەورە فەرموویەتی: کەچی کاتێ کەخودا بەدڵی خۆیان نەوە باشەکەی دا پێیان، چوون دیسانەوە بەگوێی شەیتانیان کردەوە، وە دووبارە شەیتان لەخشتەی بردنەوەو هەڵەی پێیان کردەوە، ئیشێکی وای پێیان کرد کەلەوان نەوەشێتەوە، چونکە بۆنی فرە خوایی لێ دەهات‌و گەرچی شیرك نەبوو بەڵام لەصوورەتی شیرکدا بوو، لە هەموو ژیرو داناو زانایە دیارو ئاشکرایە کە خودای گەورەو بەرزو بڵند بێ‌وێنەو بێ چوونەو گەلی دوورە لەو وێنەو هاوەڵ‌و هاوتایانەی کەئەو خەڵکانە بۆی بڕیار دەدەن.

٣٨٧٤- عَنْ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنها) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ لَمَّا حَمَلَتْ حَوَّاءُ طَافَ بِهَا إِبْلِيسُ وَكَانَ لاَ يَعِيشُ لَهَا وَلَدٌ فَقَالَ سَمِّيهِ عَبْدَ الْحَارِثِ. فَسَمَّتْهُ عَبْدَ الْحَارِثِ فَعَاشَ ذَلِكَ الولد وَكَانَ ذَلِكَ مِنْ وَحْيِ الشَّيْطَانِ وَأَمْرِهِ. رواه الترمذي والحاكم وصححه[٩].

سەموورە (خودای لێ ڕازی بێ) لەحەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: لەپێشدا دایە حەوا منداڵی بۆ نەدەما، کەسکی پڕ بوو ئیبلیس (نەفرین‌و لەعنەتی خودا لەخۆی‌و هەوا خوایانی) چووە گیانی‌و گری داو پێی گوت: ناوی بنێ

---

[٩] صحيح عند الحاكم.

عەبدولحاریث، ئەویش بە گوێی کردەوەو ناوی نا عەبدولحاریث، ئیتر ئەو منداڵەی بۆما، ئەم کەین و بەینە لەسەر ڕاوتەکبیری شەیتان بوو وە بەهۆی فیت و فەرمانی ئەوەوە بوو (تیرمیزی و حاکم ئەم فەرموودەیەیان گێڕاوەتەوە، تیرمیزی دەڵێ: حەدیسێکی حەسەنی غەریبە، حاکمیش دەڵێ: حەدیسێکی صەحیحە).

لێرەدا ئەمەتان عەرز دەکەم: گەلێ جار ناچار دەبم کە ڕاڤەی قورئانەکە بەشێوەیەکی وا دابڕێژم کەلەگەڵ فەرموودەکە جۆش بخوا، تا ئایەتەکەو حەدیسەکە ببن بەڕاڤەو شەرح و تەفسیر بۆ یەکتری، جا بۆیە لەم شوێنەدا من ڕای تەفسیری جەلالەینم هەڵبژارد، کە بریتییە لە نیسبەتدانی بۆرە فرەخوایی و صوورەتی ئیشراك لەحەزرەتی باوە ئادەم و دایە حەوا، (درودی خودایان لەسەر بێ) مامۆستا مەلا عەبدولکەریمیش (لەهەردوو تەفسیرەکەیدا) وەکوو ئەم ڕاڤەیە پەسەند بکا وایە، دیارە ئێمە مانان کەهەر لەمناڵییەوە، لە حوجرەی قوتابیانەوەو لە حوجرەی فەقێیانەوە تا ئەمڕۆ زمانمان پڕاوە بەکتێب و شیعرو فەرمایشتی ئەم زاتەو گوێمان و دڵمان کراونەتەوە بە ئیقباڵنامەو ئیمان و ئیسلام و بارانی ڕەحمەت و تەفسیری نامی و مەواهیبی ڕەحمان و ئەسەرە موبارەکەکانی تری، دیارە ئێمەمانان کە ئەمەندە سوودمەند بین لەبەهرەی ئەم پیرەمێردەی کەهەم موسوڵمانی پاکەو هەم کوردی مەردی چاکە (لە ئیشارەتی ئەو دەرناچین). مامۆستای دانەریش (پڕ گۆڕی لەنوور بێ) ئەویش وای تەفسیر کردووە، وەلێ گەورەی ڕاڤە نووسەرانی قورئان شێخی بەیضاوی (ڕەزای خودای لەسەر بێ) ئەمە بەقیل دادەنێ و دەڵێ: دەشڵێن: حەوا دووگیان دەبێ، ئیبلیس خۆی لێ دەکا بە پیاوێ و دەچێ بۆلای و پێی دەڵێ: تۆ، چووزانی ئەمە چییە لەسکتا، ڕەنگ بێ جانەوەرێ بێ، یا سەگێ بێ، تۆ چووزانی لەکوێوە دەردەچێ، ئەویش لەوە دەترسێ و دەیگێڕێتەوە بۆئادەم، جا دەکەونە مشوور خواردنی ئەمە، تا کابرا دێتەوە بۆلای حەواو دەڵێ: من لەلای خودا خاوەن پایەم، جائەگەر لەخودا داوا بکەی کەئەم سکەی تۆ ئافەریدەو مەخلووقێ بێ وەك خۆت و بەئاسانی بێتە دەرەوە

ئەوا بەگوێم بکە ناوی بنێ عەبدولحاریث، ئیبلیس کاتی خۆی لەناو فریشتەکانا ناوی حاریث دەبێ، حەواش قسەکەی وەردەگرێو کەمناڵەکەی دەبێ لەگەڵ ئادەما ناوی دەنێن عەبدولحاریث، دیارە کەشتی وا لەشانی پێغەمبەرانەوە دوورەو شتی وا لەوان ناوەشێتەوە.

من بەش بەحاڵی خۆم ئەم قیلەی کە سەرچاوەکەی ئەم فەرموودەیەیە زۆر بەباشتر دەزانم هەتا هەندێ تەکەللوف کەهەندێ ڕاڤەنووس دەیکەن، کە سەرچاوەکەی تەصەننوعی نەحویو شتی وایە! هەرچەن خۆی بەنیازی پاك کراوە.

ئەگەر نەبێ بەبێ وێڵێ لەخزمەتی شێخی بەیزاویدا، کە کوتە فەقێیەکی نیمچە خوێنەواری وەکی من بەرۆکی پێ بگرێ ئەوا لە خزمەتتانا دەڵێم: هەندێ پینەو پەڕۆی ڕاڤەنووسەکان لەڕێرەوی ڕاڤەو تەفسیر دەردەچێو سەردەکێشێ بۆ پێچەوانەی مەبەست، چونکی مەبەستی سەرەکی لەکتێبە دینییەکان، ئەوەیە کەپەیوەندی بەندە بەخوداوە قایمو مەحکەم بێو دامەزراو بێ لەسەر شێوەیەکی جوانی وا کە هۆشو گۆش پەسەندی بکاو ببێ بەمایەی ڕەحم کردنی خودا بەبەندەی خۆیو بەهۆی نزیکبوونەوەی بەندەیش لەخودای خۆی، جالەم حاڵەدا بەندەکان لەناو خۆیانا لەژێر سێبەری ساباتی ئیمانا وەك برای خۆشەویستی دڵسۆزی یەکتری دەژین، بەڵێ مەبەست لەئایەتەکانی نامە پیرۆزەکانو ئەو هەموو قەصەصو داستانو سەرگوزەشتەو ریوایەتانەی کەلەدینو دیانەتدا هەن مەبەست لەمانە ئەمەیە کە مرۆڤ دڵ نەرم بێ، بەڕەحم بێ، لەخودا بترسێ، بەدین بێ، بەداد بێ، ئاگای لەپاشو پێشی خۆی بێ، لەهەڵەت هەڵ نەدێرێو بەرنەبێتەوە ناو هەزاری پێشی! دەنا مەبەست نە تۆمارکردنی ڕووداوە مێژووییەکانە، نە نووسینی تۆمار کردنی حەقائیقی موجەڕەدەیە، لەسەر شێوەیەکی ڕیازی ووشکی پەتی وا کەبەشی دڵو دەروونو هەستو سۆزو هۆشو گۆشی تیادا نەبێ! وەنەبێ بەهۆی گڵو گۆی ویژدانو دەروون!!

پیـاوی زاڵمـی لـەخوا دووری دڵ ڕەقـی خوێنمـژی هـەژار کـوژی نوێژنەکەری ولاتوێرانکەر چ سوودێ لەزانینی حەقائیقی ڕووتو مەسائیلی تـەئریخیو فەلـەکی وەردەگـرێ!! جگـە لـە مەحکـەم کردنـی کورسـییەکەی کەوابوو تەفسیرو شەرحی حەدیس (بەتایبەتی ئەو بەشانەی کە بۆسودی گشتی دادەنرێن) هەتا دڵ هەژێنو هەست بزوێنو دڵ ڕوونکەرەوەبن باشترن، هـەتا مـەنگی دەروونو ویـژدان شـەڵەقێنتربن لـەبارترن، تەنانـەت گەلـێ جـار پێویستە داستانو ئەڵقەو جەمسەرەکانی کەمێ لێڵو تەماوی بنو ئەوەندە سادەو ئاشکرا نەبن کەدڵ سامو شکۆیان لـێ نـەکا، ڕووداوی نائاسایـیو پچڕپـچڕو سـەیر سـەیری کەمەکەمـە گەلـێ جـار بـای بـاڵ بەخـەیاڵ دەداو لـەدەریای بـێ پـەیی ئـەم ژینـە پـڕ لـە تەلەسمـەدا سـەدان گەشـتو گـەردانو دەستاو دەستی پێ دەکا!! تا بەچاوی سەرو بەچاوی دڵ قودرەتی خودای بۆ دەردەکـەوێو ناتـەوانایـیو ناتـەواویی خۆشـی بـۆ روون دەبێتـەوەو دەبـێ بـە هۆی نزیکبوونەوەی لەکردگاری نازار!

تا بەزمانی قاڵو بەزمانی حاڵ دەڵێو دەڵێتەوە: {الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَاطِلًا سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ}.

ئەوەندە هەیە گەلـێ جار لەهەڵوێستی خۆم دەکەومە شکەوەو تۆمـەتو شەڵتاخی دوو ڕوویـیو دوو زمانی دەروونو نـەفس لـەخۆم دەدەمو دەڵێم کە تۆ ئەمە گفتوگۆو قسەتە ئەی ئەم شیعرەت لەکوێ هێناوە کەدەڵێ:

مەبەس لەم قسە ڕاڤەی مەقامە

دەنا ڕایێ تر پەسەندی لامە!

ئەویش خۆیم لـێ دەکا بەمەلاو وەك مەلا بەزێن بەم شیعرانە بـەر پەرچـم دەداتەوەو دەمکوتم دەکاو دەڵـێ:

نـــەنعامو نـــەعراف زۆر لەیـــەك دوورن

نـــەدیی عەجـــەبا وا هـــاو ســـنوورن!!

ئــــەنعام ئاژەڵـــــە، ئـــــەنفال تاڵانــــە

ئەعراف شوورەی کرد بەینی ئەو دوانە!

واتـــە بـــسازێ بـــەپێی شـــەرعی خـــوا

لەگـــەڵ زەمانـــا، ئـــەوە عـــەیبی کـــوا؟

خوایـــە! بەســـیری ئـــەم ســـوورەتانە

ئـــەبین بەئـــەنعام لـــەڕووی زەمانـــە

لـــە ئـــەعراف دوور بـــین لەئـــەنفال دوورتـــر

(تأمـــــل) دەمـــــم دووراوە ئـــــیتر!!

وەرگێڕ – ١٩٨٩/٧/٤

## ٩) سوورەتی ئەنفال : (سورة الأنفال)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٣٨٧٥– عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ لَمَّا كَانَ يَوْمُ بَدْرٍ جِئْتُ بِسَيْفٍ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ قَدْ شَفَى صَدْرِى مِنَ الْمُشْرِكِينَ أَوْ نَحْوَ هَذَا هَبْ لِي هَذَا السَّيْفَ. فَقَالَ هَذَا لَيْسَ لِي وَلاَ لَكَ. فَقُلْتُ عَسَى أَنْ يُعْطَى هَذَا مَنْ لاَ يُبْلِي بَلاَئِي فَجَاءَنِي الرَّسُولُ فَقَالَ إِنَّكَ سَأَلْتَنِي وَلَيْسَ لِي وَقَدْ صَارَ لِي وَهُوَ لَكَ. قَالَ فَنَزَلَتْ (يَسْأَلُونَكَ عَنِ الأَنْفَالِ) الآيَةَ. رواه الترمذي وصححه[1].

موصعەبی کوڕی سەعد (خودایان لێ خۆش نوود بێ) دەڵێ: باوکم گوتی: لەڕۆژی ڕووداوی بەدردا شمشێرێکم لە ماڵی تاڵانییەکە هەڵگرتو بردم بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! لەسایەی خوداوە، لەخودا بەزیاد بێ داخی دڵی خۆمم بە فرەخوایی (موشریك)ەکان ڕشت لەتۆڵەی عومەیری برامدا سەعیدی کوڕی عاصم کوشتو ئەمە شمشێرەکەیەتی واهێناومە بۆلای تۆ ئەم شمشێرەم پێ ببەخشە، فەرمووی:

[1] صحيح عند الترمذي.

ئەمە نەهی منەو نەهی تۆیە! منیش گوتم: دوور نییە کە ئەمە بدرێ بەکەسێ کەوەکوو من تێ نەکۆشابێ، جا لە پاشدا کە تالآنییەکە دابەش کرا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هات بۆلام، فەرمووی: کە تۆ داوای ئەم شمشێرەت لێ کردم ئەوسا هی من نەبوو، بەلآم ئێستا کە بووە بەهی من ئەوا دام بەتۆ گوتی: جا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە:

{يَسْأَلُونَكَ عَنِ الأَنفَالِ قُلِ الأَنفَالُ لِلّهِ وَالرَّسُولِ فَاتَّقُواْ اللّهَ وَأَصْلِحُواْ ذَاتَ بِيْنِكُمْ وَأَطِيعُواْ اللّهَ وَرَسُولَهُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ – ٨/١}.

واتە: پرسیارت لێ دەکەن لە حوکمی ئەو ماڵی تالآنییەی کەبەجەنگ، بەزەبری شیرو گوللەو بەهێزی بازوو، لەناموسوڵمانەکان وەری دەگرن، دەبێ چۆن دابەش بکرێ‌و بدرێ بەکێ، تۆ (بەفەرمانی من) وەلآمیان بدەرەوەو بڵێ: ئەوماڵە ماڵی خوداو پێغەمبەری خودایە، پێغەمبەری خودا بەفەرمانی خودا بەکێی بوێ دەیدا، ئێوە بەردی بناغەی ئیسلامن، هەتا هەتایە دەبن بەسەر مەشق‌و پێشەوا بۆ نەوەی دوای خۆتان، کەواتە چاوتان لەماڵی دنیا نەبێ، چاوتان لە بەرژەوەندی ئیسلام بێ، ئاشووب مەگێڕن‌و لەسەر چڵکی دەست ئاژاوە بەپارمەکەن‌و لەنافەرمانی خودا خۆتان بپارێزن‌و نێوانی خۆتان ڕێک کەن‌و گوێڕایەڵی خوداو پێغەمبەر بن، ئەگەر ئێوە بەڕاستی موسوڵمانی ساغن! (ت:ص).

٣٨٧٦- عَنِ الْبَرَاءِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ كُنَّا نَتَحَدَّثُ أَنَّ أَصْحَابَ بَدْرٍ ثَلاَثُمِائَةٍ وَبِضْعَةَ عَشَرَ، بِعِدَّةِ أَصْحَابِ طَالُوتَ الَّذِينَ جَاوَزُوا مَعَهُ النَّهَرَ، وَمَا جَاوَزَ مَعَهُ إِلاَّ مُؤْمِنٌ[٢].

بەراء (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: جاران لەناو خۆمانا دەماو دەم دەمانگێڕایەوە: کە ژمارەی ئەو هاوڕێیانەی موحەممەد (دروودی خودای لەسەر بێ) کەلەغەزای بەدردا لە گەڵی دا بوون سێ سەدو دەو چەن کەسێ بوون، دەق بەقەد ژمارەی هاوڕێکانی طالووت کە کاتی خۆی لەگەڵیا لە ڕووبارەکە پەڕینەوە، ئەوەیشی موسوڵمان نەبێ لەگەڵیا لە ڕووبارەکە نەپەڕییەوە (ب).

[٢] تجريد البخاري/ ٤ ل/٢٥٠ رقم:١٥٢٥=٣٩٥٧ ، ٣٩٥٨ ، ٣٩٥٩ ، فتح الباري شرحه صحيح بخاري.

٣٨٧٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) أنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قال يوم بدر: اللَّهُمَّ إِنِّي أَنْشُدُكَ عَهْدَكَ وَوَعْدَكَ، اللَّهُمَّ إِنْ شِئْتَ لَمْ تُعْبَدْ بَعْدَ الْيَوْمِ. فَأَخَذَ أَبُو بَكْرٍ بِيَدِهِ فَقَالَ حَسْبُكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَدْ أَلْحَحْتَ عَلَى رَبِّكَ، وَهْوَ فِي الدِّرْعِ، فَخَرَجَ وَهْوَ يَقُولُ ( سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ) رواهما البخاري في غزوة بدر[٣].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەڕۆژی بەدردا دەفەرموێ: ئەی خودای من! تو خوا! ئەو پەیمانو بەڵێنەی کە داوتە پێم، بۆمی بەجێبێنەو بهێنەرەدی بۆمو سەرم بخە بەسەر ئەم دوژمنانەدا، خودایە! خۆت باش باش دەزانی ئەگەر منو ئۆمەتم لەم شەڕی مانو نەمانەدا بەدەستی ناموسوڵانەکان لەناو بچین ئیتر کەسێ نامێنێ لەسەر ڕووی زەوی کەلەسەر شێوەیەکی ڕەوا تۆ بپەرستێ کەوایە ئەگەر خۆت هەوەست هەیە ئەوا ئیتر لەپاش نەمانی ئێمە کەس تۆ ناپەرستێ! تا ئەبو بەکر چوو دەستی گرتو گوتی: قوربان! ئیتر بەستە. پێغەمبەریش لەجێگەکەی دەردەچێو مژدەی سەرکەوتنیان دەداتێو دەفەرموێ:

{سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ - ٥٤/٥٤}.

واتە: بزانن بەم زووانە ئەو کۆمەڵەی کە ئێوە پێیانەوە دەنازن دەشکێنو پشتیان دەشکێو بەشکانێکی وا دەشکێن قوشقنەقەوەت بەرەودوا هەڵ دێنو کونە مشکیان لێ دەبێ بە قەیسەری! (ب).

٣٨٧٨- قال عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) نَظَرَ نَبِيُّ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إِلَى الْمُشْرِكِينَ وَهُمْ أَلْفٌ وَأَصْحَابُهُ ثَلاَثُمِائَةٍ وَبِضْعَةَ عَشَرَ رَجُلاً فَاسْتَقْبَلَ نَبِيُّ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) الْقِبْلَةَ ثُمَّ مَدَّ يَدَيْهِ وَجَعَلَ يَهْتِفُ بِرَبِّهِ اللَّهُمَّ أَنْجِزْ لِي مَا وَعَدْتَنِي اللَّهُمَّ آتِنِي مَا وَعَدْتَنِي اللَّهُمَّ إِنْ تُهْلِكْ هَذِهِ الْعِصَابَةَ مِنْ أَهْلِ الإِسْلاَمِ لاَ تُعْبَدُ فِي الأَرْضِ. فَمَا زَالَ يَهْتِفُ بِرَبِّهِ مَادًّا يَدَيْهِ مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ حَتَّى سَقَطَ رِدَاؤُهُ مِنْ مَنْكِبَيْهِ فَأَتَاهُ أَبُو بَكْرٍ فَأَخَذَ رِدَاءَهُ فَأَلْقَاهُ عَلَى مَنْكِبَيْهِ ثُمَّ الْتَزَمَهُ مِنْ وَرَائِهِ فَقَالَ يَا نَبِيَّ اللَّهِ كَفَاكَ مُنَاشَدَتُكَ رَبَّكَ فَإِنَّهُ

[٣] بخاري. غزوة البدر: ٣٩٥٣.

سَيُنْجِزُ لَكَ مَا وَعَدَكَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ (إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُمْ بِأَلْفٍ مِنَ الْمَلَائِكَةِ مُرْدِفِينَ). رواه الترمذي ومسلم في الجهاد[٤].

**عومەری کوڕی خەتتاب (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: لەڕۆژی بەدردا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کاتێ تەماشای لەشکری ناموسوڵمانەکانی کرد زۆر بوون، هەزار کەس بوون، هاوڕێکانی خۆشی لەچاو ئەوانا کەم بوون دەوری سێ سەدو دەکەس بوون، ڕووی کردە ڕووگەو هەردوو دەستی درێژکردوو دەستی کرد بەهاوارکردن لەخودا: خودایە! ئەو گفتەی کەداوتە پێم جێ بەجێی بکە بۆم، خودایە! خۆت ئاگات لەحاڵەکەیە ئەگەر ئەم تاقمە موسوڵمانە بفەوتێ ئیتر لەسەر پشتی گۆی زەوی کەسێ نامێنێ کە تۆ بپەرستی و بەندەیی ساغت بۆبکا ئیتر لەسەر ئەم شێوەیە سەرگەرمی دووعاو نزاو پاڕانەوە بوو لە خوداو دەستەکانی درێژ دەکردن و هاواری لەخودای خۆی دەکرد، هەتا بەرماڵەکەی لەشانی کەوتە خوارێ، ئەبو بەکر چوو بەرماڵەکەی هەڵگرت و دایەوە بەسەرشانیاو لەپشتەوە باوەشی پیاکردو گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! زۆر لالایتەوە لەخودای خۆت، ئیتر بەستە، بێ گومان کەخودا ئەو بەڵێنەی داویتی پێت بۆتی بەجێ دێنێ، جا خودای گەورە ئەمەی ناردە خوارەوە:**

{إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ الْمَلآئِكَةِ مُرْدِفِينَ - ٩/٨}.

**واتە: ئالای حەق سەرکەوت و سەری ناهەق شۆڕ بوو، ئەمەش لەوکاتەدا بوو کە ئێوە بەکوڵی دڵ و سۆزی سینە لەخودای خۆتان دەلالانەوەو داوای هەناو پەناتان لێی دەکرد، ئەوە بوو خودای گەورەش هات بەدەنگتانەوەو مزگێنی سەرکەوتنی پێدان و فەرمووی: ئەوا بۆ دڵنیایی ئێوە فریشتەی فریا لەپێشتان و لەپشتانەوە کۆمەڵ کۆمەڵ، بەرو دوا هاتن و دێن**

---

[٤] مسلم. جهاد: ٤٥٦٣. أبوداود. جهاد: ٢٦٩٠. ترمذي. تفسير القرآن: ٣١٨١.

بۆ یارمەتیتان، واهەزاریان گەیشتنە جێ و دابەزین! وە دوو هەزاری تریش لەدوا ئەمانەوە وان بەڕێوە (ت/م).

٣٨٧٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ لَمَّا فَرَغَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مِنْ بَدْرٍ قِيلَ لَهُ عَلَيْكَ الْعِيرَ لَيْسَ دُونَهَا شَيْءٌ فَنَادَاهُ الْعَبَّاسُ وَهُوَ فِي وَثَاقِهِ لاَ يَصْلُحُ وَقَالَ لأَنَّ اللَّهَ وَعَدَكَ إِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ وَقَدْ أَعْطَاكَ مَا وَعَدَكَ قَالَ صَدَقْتَ. رواه الترمذي وصححه[٥].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەغەزای بەدر لێبوەوە عەرزیان کرد: ئادەی بابچین بۆ کاروانەکەیش، ئەویش بگرین، ئێستا کاروانەکە بێ پاسەوانەو کەسی لەدەور نییە، عەبباسیش پێی لەکۆتدا بوو، چونکە تازە لەغەزای بەدردا بەدیل گیرابوو، لەوێوە بانگی پێغەمبەری کردو گوتی: شتی وانەکەی، ئەمە دەست نادا، چونکە خودا بەڵێنی سەرخستنی داوە بە تۆ، کەبەسەر یەکێ لەم دوو تاقمەدا سەرت بخا، یا بەسەر کاروانەکەدا، یا بەسەر لەشکرەکەدا، وە ئەوەتانێ خوا بەڵێنەکەی خۆی بەجێ هێناوە بۆت! پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ڕاست دەکەیت (ت/ص).

٣٨٨٠- وَعَنْهُ: ( إِنَّ شَرَّ الدَّوَابِّ عِنْدَ اللَّهِ الصُّمُّ الْبُكْمُ الَّذِينَ لاَ يَعْقِلُونَ) قَالَ هُمْ نَفَرٌ مِنْ بَنِي عَبْدِ الدَّارِ. رواه البخاري[٦].

لەبارەی ئەوکەسانەوە کەلەم ئایەتەدا هەڕەشەیان لێ کراوە دیسان ئەو گوتی: ئەمانە چەن کەسێ بوون لەخێڵی بەنی عەبدولدار خوا لەشانیاندا دەفەرموێ:

{إِنَّ شَرَّ الدَّوَابَّ عِندَ اللّهِ الصُّمُّ الْبُكْمُ الَّذِينَ لاَ يَعْقِلُونَ - ٨/٢٢}.

واتە: بەدترین وڵاخ لەلای خوداوەند ئەو کەڕولاڵەن بەهیچ پەند ناگرن (ب - هەزار ڕەحمەتی لێ بێ).

---

[٥] صحيح عند الترمذي.

[٦] بخاري. تفسير سورة الأنفال: ٤٦٤٦.

**٣٨٨١- ⇦ (ب/٥ ز/٨١ ل/٢٩٣ ف/١)[٧].**

**قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَاتَّقُواْ فِتْنَةً لاَّ تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمْ خَآصَّةً وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ - ٨/٢٥}.**

**یەزدانی مەزن فەرموویەتی: خۆتان بپارێزن لەوەی‌و موصیبەتێ کەتاوانبارو بێ تاوان دەگرێتەوە، بزانن کەخودا سەختگیرە.**

**٣٨٨٢- عن ابن عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) عن النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قال: إِذَا أَنْزَلَ اللَّهُ بِقَوْمٍ عَذَابًا، أَصَابَ الْعَذَابُ مَنْ كَانَ فِيهِمْ، ثُمَّ بُعِثُوا عَلَى أَعْمَالِهِمْ. رواه الشيخان[٨].**

**ئیبنو عومەر (خودایان لێ ڕازی بێ) لەحەزرەتەوە (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: کاتێ خودا خواستی لەسەر ئەوەبوو کە هۆزی تووشی عەزاب‌و سزابکا، سزاکە پاک‌و پیس دەیانگرێتەوە، بەڵام لەپاش دا لە قیامەتدا هەرکەسەیان بەپێی کردەوەی خۆی سزای خۆی یا پاداشتی خۆی وەردەگرێ (ش).**

**٣٨٨٣- عن أَنَسَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ أَبُو جَهْلٍ ( اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ هَذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِنْدِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِنَ السَّمَاءِ أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ) فَنَزَلَتْ (وَمَا كَانَ اللّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ وَمَا كَانَ اللّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ * وَمَا لَهُمْ أَلاَّ يُعَذِّبَهُمُ اللّهُ وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَمَا كَانُواْ أَوْلِيَاءهُ إِنْ أَوْلِيَآؤُهُ إِلاَّ الْمُتَّقُونَ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ). رواه الشيخان[٩].**

**ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەبو جەهل گوتی: خودایە! ئەگەر ئەم قورئانە ڕاستەو نامەی تۆیە، ئەوا بەرد ببارێنە بەسەرماندا، یا سزایەکی**

---

[٧] تقدم في المجلد الخامس. تسلسل / ٨١ رقم: ١ / ٣٦٣٠- ٨١.

[٨] بخاري. فتن: ٧١٠٩ = تجريد / ٥ / ٣٥٧ رقم: ٢٠٩٩ = ٧١٠٨ فتح الباري شرح صحيح البخاري. مسلم. الجنة ونعيمها: ٧١٦٣.

[٩] بخاري. تفسير: ٤٦٤٨ ، ٤٦٤٩. مسلم. صفات المنافقين: ٦٩٩٥. تحفة الأشراف. ٩٧٩.

فرەسەختمان بۆ بنێرە، چونکە ئێمە پەسەندی ناکەین، وەلێمان ڕوونە کەئەمە لەلایەنی تۆوە نییە بۆیە وائەم دووعاو نزای شەڕە لەخۆمان دەکەین، کەئەبو جەهلو کۆمەڵە پیسەکەی ئەم نامەقوولێییەیان کرد خودا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە:

{وَإِذْ قَالُواْ اللَّهُمَّ إِن كَانَ هَذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ السَّمَاء أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ، وَمَا كَانَ اللّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ وَمَا كَانَ اللّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ، وَمَا لَهُمْ أَلاَّ يُعَذِّبَهُمُ اللّهُ وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَمَا كَانُواْ أَوْلِيَاءهُ إِنْ أَوْلِيَآؤُهُ إِلاَّ الْمُتَّقُونَ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ - ٨/٣٢-٣٤}.

واتە: ئەو نامەردانە دەڵێن: خودایە! ئەگەر موحەممەد پێغەمبەری تۆیەو ئەم قورئانە ڕاستەو فەرموودەی تۆیە ئەوا لەئاسمانەوە بەردەبارانمان بکەو تازووە بنەبڕمان بکە، بەهەر سزاو تۆڵەیەکی سەخت کە تۆ بۆمان بنێری پێی قایلین، وەلێ ئەی خۆشەویست! تۆمایەی ڕەحمەتو خێرو خۆشی بۆ عالەم، لەبەر ئەوە خوداشتی واناکاو هەتا تۆماوی‌و تۆ لەناویانا بی بە بەرەکەتی ووجوودی تۆوە خودا سزایان نادا، هەروەها لەبەر ئەوەیش سزاو عەزابیان نادا چونکە لەکاتی تەوافو هەڵسووڕان بەدەوری کابەدا (کەماڵی خودایەو خانەی میهرەبانەو جێگەی ئەمن‌و ئاسایش‌و هێمنییە) لەخودا دەپاڕێنەوەو داوای لێ خۆشبوونی لێ دەکەن، دەنا ئەگەر لەفەڕو بەرەکەتی تۆو لەپیتو فەڕی دووعای ئیستیغفارەوە نەبێ ئەم نەگبەتانە چی چاکەو پیاوەتییەکیان هەیە کەلەبەر ئەوە خودا سزایان نەدا، بە پێچەوانەوە نەك هەرچاکەیان نییە بەڵکوو خراپەشیان زۆرەو بەپێی سەگە، ئەوەتانێ سەرەڕای کوفرو فرە خوایی ڕێگەی هامووشۆو تەوافی تۆو موسوڵمانان قەدەغە دەکەن لەوە کەبەسەر بەستی لەناو مەسجیدولحەراما پەرستشی خۆتان بکەن، لەگەڵ ئەوەشدا کەئەمانە ئەوحەقەیان نییە، چونکە خۆ ئەوان خاوەن کارو کاربەدەستی کەعبە نین، چونکە کاربەدەستی ئەوخانە پیرۆزە دەشێ لەخودا ترسەکان بن‌و ئەوانیش زۆر لە خودای گەورە دوورن! بەڵام

ئەی ڕەهبەری خۆشەویست! زوربەی ئەوانە سەرکەشیو لاساریی گوێری کردوونو ئەم زانستە جوانە نازانن (ش = شەیخان = ب+م = بوخاریو موسلیم).

٣٨٨٤- عن أَبِي مُوسَى عن النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: أَنْزَلَ اللَّهُ عَلَيَّ أَمَانَيْنِ لأُمَّتِي (وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنْتَ فِيهِمْ) (وَمَا كَانَ اللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ) إِذَا مَضَيْتُ تَرَكْتُ فِيهِمْ الاِسْتِغْفَارَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ. رواه الترمذي[١٠].

ئەبو مووسا (خودای لێ ڕازی بێ) لەحەزرەتەوە (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: خودا لەم ئایەتەدا دوو ئەمانی بۆ ئۆمەتم ناردووە بۆم، یەکەم ئەوەیە کە دەفەرموێ: وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ: لەبەرخاتری تۆی خۆشەویست هەتا تۆوای لەناویانا خودا سزایان نادا دووەم ئەمان ئەوەیە کە دەفەرموێ: وَمَا كَانَ اللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ: هەتا ئەوان ترسی خودایان هەبێو لێی بپاڕێنەوەو داوای غوفرانو لێبووردنی لێ بکەنو خودا بەخودای خۆیان بزانن خوداش سزاو تۆڵەی سەختیان ناداو بەچورتمو قورتو بەڵای گەورە قڕیان ناکا. فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): کاتێ خۆشم مردمو بەجەستە نەمام لەناویانا ئەوا لەسایەی خوداوە ئیستیغفارو پاڕانەوە لەپاش منیش هەر دەمێنێو هەتا ڕۆژی قیامەت لەباتی من دەبێ بەمایەی ئاسایشو بەهۆی ئەمان بۆیان! (ت).

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ إِن يَنتَهُواْ يُغَفَرْ لَهُم مَّا قَدْ سَلَفَ وَإِنْ يَعُودُواْ فَقَدْ مَضَتْ سُنَّةُ الأَوَّلِينِ – ٣٨/٨}.

واتە: یەزدانی مەزن بە خۆشەویستی خۆی دەفەرموێ: ئەی ڕەهبەر! بفەرموو بەوانەی کە تائێستا کافر بوون، وەرن ڕێگەی ڕاست بگرنو واز لەسەرکەشیودوژمنایەتی ئیسلام بێنن خودا لەتاوانی لەمەوبەرتان خۆش دەبێو لاپەڕەیێ تازەتان بۆ دەکاتەوە.

---

[١٠] سكت عن درجته الشارح.

٣٨٨٥- عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ قُلنا يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنُؤَاخَذُ بِمَا عَمِلْنَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ قَالَ مَنْ أَحْسَنَ فِي الإِسْلاَمِ لَمْ يُؤَاخَذْ بِمَا عَمِلَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، وَمَنْ أَسَاءَ فِي الإِسْلاَمِ أُخِذَ بِالأَوَّلِ وَالآخِرِ [١١].

عەبدوڵڵا (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: عەرزی پێغەمبەرمان کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوەی لەکاتی نەزانی دا کردوومانە پرسینەوەی هەیە؟ فەرمووی: هەرکەسێ لەئیسلامەتی دا کارو کردەوەی جوان‌و شیرین بێ ئیتر ئەوەی کەلە سەردەمی نەزانی دا کردوویەتی لێپرسینەوەی نییە، بەڵام ئەگەر لەکاتی ئیسلامەتییدا کاری خراپ بێ ئەوە تۆڵەی بەرو دوای لێ دەسێنرێ! (م).

٣٨٨٦- وَقال حَكِيمَ بْنَ حِزَامٍ: أي رَسُولُ اللَّهِ أَرَأَيْتَ أُمُورًا كُنْتُ أَتَحَنَّثُ بِهَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ مِنْ صِلَةٍ وَعَتَاقَةٍ وَصَدَقَةٍ، هَلْ لِي فِيهَا مِنْ أَجْرٍ؟ قَالَ: أَسْلَمْتَ عَلَى مَا سَلَفَ مِنْ خَيْرٍ. رواهما مسلم[١٢].

حەکیمی کوڕی حیزام (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! پێم بفەرموو ئەوچاکەو کاروبارانەی کەلە سەردەمی نەزانی دا کردوومن‌و بەعیبادەتم زانیون ئایا هیچ ئەجرو پاداشتیان بۆم هەیە؟ ئەوانەیش وەکوو خێرکردن‌و بەندە ئازادکردن‌و پەیوەندی خزمایەتی‌و شتی تری وا، فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): لەسەر بناغەیەکی باش‌و چاك ئیسلام بوویت‌و پەرێزت پاکەو بنەتۆوت چاکە (م).

٣٨٨٧- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَرَأَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) هَذِهِ الآيَةَ عَلَى الْمِنْبَرِ ( وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ) قَالَ أَلاَ إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ أَلاَ إِنَّ اللَّهَ سَيَفْتَحُ لَكُمُ الأَرْضَ وَسَتُكْفَوْنَ الْمُؤْنَةَ فَلاَ يَعْجِزَنَّ أَحَدُكُمْ أَنْ يَلْهُوَ بِأَسْهُمِهِ. رواه الترمذي (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) [١٣].

---

[١١] بخاري. استتابة المرتدين: ٦٩٢٣ ، ٦٩٢١ = تجريد / ٥ / ٣٣٩ رقم: ٢٠٨٠. مسلم. إيمان: ٣١٥.

[١٢] بخاري. زكاة: ١٤٣٦ ، ٢١٠٧ ، ٢٤٠١ ، ٥٩٩٢. مسلم. إيمان: ٣١٩.

[١٣] سكت عنه الشارح.

**عوقبەی کوڕی عامیر** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **ئەم ئایەتەی خوێندەوە:**

**{وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ - ٨/٦٠}.**

**واتە: چیتان لەدەست دێو چەندەتان لەباردا هەیە لەبارەی جەنگەوە ئامادەی بکەن، لەچەكو تفاقی تری شەڕو هەموو جۆرە هێزێکی تری وا کەدەبێ بە مایەی سەرکەوتنو ڕووخاندنی وورەی دوژمن ئەمەی خوێندەوەو سێجار لەسەریەك بۆ دووپاتکردنەوە فەرمووی: هۆشیار بن کە خودا زەویتان بۆ فەتح دەکاو لەسایەی خوداوە وڵاتێکی زۆر دەگرنو واتان لێ دێ کەخەمی ئازووقەو ڕۆژیتان نابێ، بەڵام نەکەن بەوە ساردببنەوەو واز لەتیربازیو مەشق کردن بەچەك بێنن! (ت):**

**چەکی دوێنێکە ئەمڕۆ چەقۆیە**

**چەکی ئەمڕۆکەش سبەی پەڕۆیە**

**چەک ئەو چەکەیە ئەمڕۆ لەشانە**

**(نان ئەو نانەیە ئەمڕۆ لەخوانە)**

**گشت شت دەگۆڕێ بەپێی زەمانە**

**حەقایق نەبێ، وەکی خۆمانە**

**نەگۆڕو یەک دین، مەردی مەیدانە**

**پێ لێنەنانیی پیشەی نەزانە!**

**مەبەس لەخۆمان گەلی ئیسلامە**

**دینی ناگۆڕێ تا ڕۆی قیامە**

**٣٨٨٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) **قَالَ لَمَّا نَزَلَتْ ( إِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ عِشْرُونَ صَابِرُونَ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ ) شَقَّ ذَلِكَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ حِينَ فُرِضَ عَلَيْهِمْ أَنْ لاَ يَفِرَّ وَاحِدٌ مِنْ عَشَرَةٍ، فَجَاءَ التَّخْفِيفُ فَقَالَ ( الآنَ خَفَّفَ اللَّهُ عَنْكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضُعْفًا فَإِنْ يَكُنْ**

مِنْكُمْ مِائَةٌ صَابِرَةٌ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ ). قَالَ فَلَمَّا خَفَّفَ اللَّهُ عَنْهُمْ مِنَ الْعِدَّةِ نَقَصَ مِنَ الصَّبْرِ بِقَدْرِ مَا خُفِّفَ عَنْهُمْ. رواه البخاري[١٤].

**ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ ڕازی بێ) **گوتی: کەئەم ئایەتە هاتە خوارەوە:**
{إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَابِرُونَ يَغْلِبُواْ مِئَتَيْنِ – ٦٥/٨}.

**واتە: ئەگەر بیست کەسی خۆگری بەصەبرو بەپشوو ببێ لەئێوە بەفەرمانی خودا کە هەمیشە لەگەڵ موسوڵمانێ خۆگر دایە، ئەوا ئێوە زاڵ دەبن بە سەر دووسەد کەسی کافردا کە ئەمەهات موسوڵمانەکان نیگەران بوونو تەواو سەخڵەتی کردن، چونکە بەپێی ئەم ئایەتە لەسەر موسوڵمانان دانرا بوو: کە تاقەیەك موسوڵمان دەبێ ڕوو بەڕووی دە کافر ڕابوەستێو نابێ لەبەریان ڕابکا، لەپاش دا خودا باری سووك کردنو کاری بۆ ئاسان کردنو ئەم ئایەتەی تری ناردە خوارەوە کە دەفەرموێ:**
{الآنَ خَفَّفَ اللّهُ عَنكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضَعْفًا فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّئَةٌ صَابِرَةٌ يَغْلِبُواْ مِئَتَيْنِ – ٦٦/٨}.

**واتە: ئێستا خودا باری ئێوەی سووك کردو لە ئەرکی سەرشانتانی کەم کردەوە، خودا خۆی دەزانێ کە ئێوەیش هەر ئادەمیزادنو ئادەمیزادیش بەپێی سرووشی خودایی تووشی کزیو زەبوونیو بێ وورەیی دەبێ، لەبەر ئەوە بڕیاری دا: ئەگەر لەئێوە سەد جەنگاوەری خۆگر هەبێ سەردەکەون بەسەر دووسەد کەس لە کافرەکان. بەڵام کاتێ خودا باری سووك کردن بە ئەندازەی ئەو بارسووکییە لەصەبرو خۆگریو ئازایەتیانی کەم کردەوە (ب – خودای لێ ڕازی بێ).**

**٣٨٨٩– عن ابْنُ عَبَّاسٍ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **ان النَّبِيَّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): **يَوْمُ بَدْرٍ قال لأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرُ: مَا تَرَوْنَ فِي هذه الأُسَارَى؟. فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ : يَا نَبِيُّ اللَّهِ هُمْ بَنُو الْعَمِّ وَالْعَشِيرَةِ أَرَى أَنْ تَأْخُذَ مِنْهُمْ فِدْيَةً فَتَكُونُ لَنَا قُوَّةً عَلَى الْكُفَّارِ فَعَسَى اللَّهُ أَنْ يَهْدِيَهُمْ**

---

(١٤) بخاري. تفسير: ٤٦٥٣.

لِلإِسْلَامِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) : مَا تَرَى يَا ابْنَ الْخَطَّابِ ؟. قال: لاَ وَاللَّهِ يَـا رَسُولَ اللَّهِ مَا أَرَى الَّذِى رَأَى أَبُو بَكْرٍ وَلَكِنِّى أَرَى أَنْ تُمَكِّنَّا فَنَضْرِبَ أَعْنَـاقَهُمْ فَـتُمَكِّنَ عَلِيًّا مِنْ عَقِيلٍ فَيَضْرِبَ عُنُقَهُ وَتُمَكِّنِّى مِنْ فُلاَنٍ فَأَضْرِبَ عُنُقَهُ فَإِنَّ هَـؤُلاَءِ أَئِمَّـةُ الْكُفْـرِ وَصَنَادِيدُهَا فَهَوِىَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مَا قَالَ أَبُو بَكْرٍ وَلَمْ يَهْوَ مَا قال عمر. فَلَمَّا كَانَ مِنَ الْغَدِ جِئْتُ فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَأَبُو بَكْرٍ قَاعِدَيْنِ يَبْكِيَان قُلْتُ : يَـا رَسُولَ اللَّهِ أَخْبِرْنِى مِنْ أَى شَىْءٍ تَبْكِى أَنْتَ وَصَاحِبُكَ فَـإِنْ وَجَـدْتُ بُكَـاءً بَكَيْـتُ وَإِلاَّ تَبَاكَيْتُ لِبُكَائِكُمَا فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): أَبْكِى لِلَّذِى عَرَضَ عَلَـىَّ أَصْـحَابُكَ مِنْ أَخْذِهِمُ الْفِدَاءَ لَقَدْ عُرِضَ عَلَىَّ عَذَابُهُمْ أَدْنَى مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ. وَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ (مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُ أَسْرَى حَتَّى يُثْخِنَ فِي الأَرْضِ تُرِيدُونَ عَرَضَ الدُّنْيَا وَاللّهُ يُرِيدُ الآخِرَةَ وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ) الآيات الثلاث. رواه مسلم في الجهاد والترمذي[١٥].

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) کە مەشهوورە بە ئیبنو عەبباس دەڵێ: ڕۆژی غەزای بەدر کە دیلەکانیان گرت حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) بەئەبو بەکرو عومەری فەرموو: بۆ ئەم دیلانە ئێوە ڕاتان چۆنە؟ ئەبو بەکر گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمانە خزمو کەس‌و کاری خۆمانن، هەموو ئامۆزاو هۆزی خۆتن، من وا بەباش دەزانم کە سەرانەیان لێ وەربگری، ئەو فیدیەو سەرەانەیە دەبێ بەهێزو هەناو بۆمان بەرابەر بەکافران، سا بەڵکوو خوداش بیانهێنێتە سەر ڕێی ئیسلامەتی، جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی عومەر! ئەی تۆ ڕات چۆنە، تۆ دەڵێی چی؟ گوتی: نەبە خودا ئەی پێغەمبەری خودا! من ڕام وا نییە، من ئەم ڕایەی ئەبوبەکر بەباش نازانم، بەڵام من ڕام وایە کە تۆ ڕێگەمان بدەیت‌و فەرمان بکەیت کە یەکە یەکە بدەین لەگەردنیان، عەقیل بدەرە دەست عەلی برای کەلە گەردنی بدات، وە فیسارەکەس کە خزمی منە بیدەرە دەست من تا بەدەستی خۆم بدەم لەگەردنی، چونکە ئەمانە سەرۆک‌و پێشەوای میللەتی کوفرن‌و

---

[١٥] مسلم. جهاد: ٤٥٦٣.

گەورە گەورەکانی جیهانی بێ ئاییین ئەگەر ئەمانە سەرەو نگوون بکرێن قەڵای کوفرو بتپەرستی دەتلیسێتەوە! عومەر (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: وەلێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆشی حەزی لەقسەکەی ئەبوبەکر پتر بوو، وە زۆر هەوەسی لە قسەکەی عومەر نەبوو، وە لەئەنجامدا ڕایان هاتە سەر وەرگرتنی سەرانە، کەچی بۆ سبەینێ کە چووم بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕوانیم کەوا پێغەمبەرو ئەبو بەکر پێکەوە دانیشتوون دەگرین گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! پێم بفەرموو خۆت و هاوڕێکەت لەبەرچی دەگرین، ئەگەر بزانم گریان هەڵ دەگرێ ئەوا منیش دەگریم ئەگەرنا هیچ نەبێ منیش لەبەر ئێوە خۆم دەکەمە گریان؟! ئەویش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: بۆ ئەوە دەگریم کە هاوڕێکانی تۆ ڕاویژیان بۆ کردم، کە سەرانە وەربگرین لەدیلەکانی بەدرو نەیانکوژین، ئەوەبوو وامان کرد، بەڵام ئەوەتانێ لەپەنای ئەم درەختەدا کەوا لەپەنامدا ئەو سزایەی کە خودا ناردوویەتی بۆیان لەسەر ئەو ڕاوێژە پێم نیشان درا! جا خودای گەورەو سەروەر ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە:

{مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُ أَسْرَى حَتَّى يُثْخِنَ فِي الأَرْضِ تُرِيدُونَ عَرَضَ الدُّنْيَا وَاللّهُ يُرِيدُ الآخِرَةَ وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ}، هەتا: ان الله غفور الرحيم - ٨/٦٧-٦٩}.

واتە: لەسەرەتای دامەزراندنی ئایینەوە نابێ پێغەمبەران و پەیڕەوانیان چاویان لەماڵی دنیاو پڕو پیتی ئەم کۆنە جیهانە بێ، وە خەریکی دیل ڕاگرتن بن و خۆیان بەشتی واوە خەریك بکەن، هەڵوێست زۆر ناسکە، کەهەل لەکیس چوو لەکیس دەچێ، دەشێ زەبرو زەنگ بنوێنن و خوێنی دوژمنی دینتان برێژن وەك لافاو، وامەزانن کەخودا خوێن ڕشتنی پێ خۆشە نەء، بەڵام خودا بەرژەوەندی ئێوەی دەوێ، خۆی تەواناو دانایە لەهەموو کەس لە شت باشتر دەزانێ، چاوتان لەفەرمایشتی ئەو بێ، گوێ بەلاژگە لاژگی گێرەشێوێن مەدەن، کەدەڵێن: ئاشتی سەرچاوەی بەهەشتی هەردوو جیهانە، لەسەر ئەمەی کە کردتان خەریك بوو خودا تۆڵەیەکی گەورەتان لێ بستێنێ،

بەڵام نامەی ئەزەلی لەوحولمەحفووظ فریاتان کەوت، دەی بخۆن لەدەست کەوتی ئەم جەنگەتان بەحەڵاڵی و بەپاکی، ئەم ڕازوگلەییە بۆ ئەوە نییە کەئەوەتان لێ حەڕام بێ، بەڵام سەر ڕشتەی کار ئەوەیە کەهەمیشە لەخودا بترسن و لەفەرمانی دەرمەچن، بەڕاستی خودای ئێوە گەلێ لێبووردەو میهرەبانە (م/ت).

٣٨٩٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ لَمْ تَحِلَّ الْغَنَائِمُ لأَحَدٍ سُودِ الرُّءُوسِ مِنْ قَبْلِكُمْ كَانَتْ تَنْزِلُ نَارٌ مِنَ السَّمَاءِ فَتَأْكُلُهَا. قَالَ سُلَيْمَانُ الأَعْمَشُ فَمَنْ يَقُولُ هَذَا إِلاَّ أَبُو هُرَيْرَةَ الآنَ فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ بَدْرٍ وَقَعُوا فِي الْغَنَائِمِ قَبْلَ أَنْ تَحِلَّ لَهُمْ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى ( لَوْلاَ كِتَابٌ مِنَ اللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَا أَخَذْتُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ). رواه الترمذي بسند صحيح. نسأل الله صحة القول والفعل آمين[١٦].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: لەپێش ئێوەدا غەنیمەت و تالانی بۆ کەسێ تر ڕەوا نەبووە، جاران لەشوێنێکداماڵی تالانییەکەیان خەرمانە دەکرد، ئینجا لەئاسمانەوە ئاگرێ دەهاتە خوارەوە دەیخوارد! بەڵام کاتێ ڕۆژی بەدر ڕوویدا لەپێش ئەوەدا کە غەنیمەت و تالانییان بۆحەلاڵ بکرێ خود سەر پەلاماریان دا، جا خودای گەورە ئەمەی ناردە خوارەوە:

{لَّوْلاَ كِتَابٌ مِّنَ اللّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَا أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ - ٦٨/٨}. ⇨ (ت-س/ص).

## ١٠) سوورەتی تەوبە مەدەنییە، (سەدوبیست و نۆ ئایەتە)

## سورة التوبة: مدنية وهي مائة وتسع وعشرون آية

٣٨٩١- عن ابْنُ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما) قَالَ قُلْتُ لِعُثْمَانَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) مَا حَمَلَكُمْ أَنْ عَمَدْتُمْ إِلَى الأَنْفَالِ وَهِيَ مِنَ الْمَثَانِي وَإِلَى بَرَاءَةَ وَهِيَ مِنَ الْمِئِينَ فَقَرَنْتُمْ

---

[١٦] صحيح عند الترمذي.

يَتَهُمَا وَلَمْ تَكْتُبُوا بَيْنَهُمَا سَطْرَ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ وَوَضَعْتُمُوهُمَا فِي السَّبْعِ الطُّوَلِ مَا حَمَلَكُمْ عَلَى ذَلِكَ فَقَالَ عُثْمَانُ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مِمَّا يَأْتِي عَلَيْهِ الزَّمَانُ وَهُوَ تَنْزِلُ عَلَيْهِ السُّوَرُ ذَوَاتُ الْعَدَدِ فَكَانَ إِذَا نَزَلَ عَلَيْهِ الشَّيْءُ دَعَا بَعْضَ مَنْ كَانَ يَكْتُبُ فَيَقُولُ ضَعُوا هَؤُلَاءِ الآيَاتِ فِي السُّورَةِ الَّتِي يُذْكَرُ فِيهَا كَذَا وَكَذَا وَإِذَا نَزَلَتْ عَلَيْهِ الآيَةَ فَيَقُولُ ضَعُوا هَذِهِ الآيَةَ فِي السُّورَةِ الَّتِي يُذْكَرُ فِيهَا كَذَا وَكَذَا وَكَانَتِ الأَنْفَالُ مِنْ أَوَائِلِ مَا أُنْزِلَتْ بِالْمَدِينَةِ وَكَانَتْ بَرَاءَةُ مِنْ آخِرِ الْقُرْآنِ وَكَانَتْ قِصَّتُهَا شَبِيهَةً بِقِصَّتِهَا فَظَنَنْتُ أَنَّهَا مِنْهَا فَقُبِضَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَلَمْ يُبَيِّنْ لَنَا أَنَّهَا مِنْهَا فَمِنْ أَجْلِ ذَلِكَ قَرَنْتُ بَيْنَهُمَا وَلَمْ أَكْتُبْ بَيْنَهُمَا سَطْرَ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ فَوَضَعْتُهَا فِي السَّبْعِ الطُّوَلِ. رواه الترمذي[1].

**ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ ڕازی بێ) **دەڵێ: گوتم بە عوسمان: سوورەتی ئەنفال لە سوورەتە کورتەکانەو سوورەتی تەوبە لە سوورەتە درێژەکانەو لەو سوورەتانەیە کەلە سەد ئایەت زیاترن، ئەدی بۆچی بەرو دوا داتان ناون‌و لەنێوانیاندا (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)تان نەنووسیوە؟ سەرەڕای ئەوەیش سوورەتی ئەنفالتان لەناو حەوت سوورەتە درێژەکەدا داناوە، ئەمەتان لەبەرچی وا کردووە؟ ئەویش** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **گوتی: جاران پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **هەموو کات سوورەت لەسەر سوورەت دەهاتە خوارەوە بۆی، کەهەر سوورەتەی برێتی بوو لە ژمارەیێ ئایەت، بەڵام ئەگەر ئایەتێ بهاتەنیا، یا چەن ئایەتێکی بۆ بهاتبایە کەلە سووڕەت کەمتر بوونایە، ئەوا نووسەرێکی بانگ دەکردو دەیفەرموو: ئەم ئایەتە یا دەیفەرموو: ئەم ئایەتانە لەفلانە سووڕەتا دابنێن کەباسی ئەوەو ئەوەی تیادا کراوە بەم پێیە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **خۆی جێگەی سوورەت‌و جێگەی ئایەتی دیاری دەکرد، جاهەر چەند سوورەتی ئەنفال لەسوورەتە پێشینەکان‌و لەمەدینە هاتۆتە خوارێ، وە سوورەتی بەڕائەت لەئاخرو ئۆخری قورئاندا لە مەدینە نازڵ**

---

[1] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

بووە، هەرچەند ئەمە وایە بەڵام لەبەر ئەوەی کە داستانی ئەم دوو سوورەتە لەیەکتر دەچیّ و واتاو ئەحکامەکانیان لەگەڵ یەکتری دەگونجێن من واتیّ گەیشتم کە ئەمیش بەشێکە لەئەنفال، سەرەڕای ئەوەیش پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هەتا کۆچی دوایی کرد جێگەی ئەم سوورەتەی دیاری نەکرد، جا لەبەر ئەوە لەپاڵ یەکدا نووسیمن و دامنان و هەر لەبەر ئەوەیش (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)م لە نێوانیانا نە نووسی، هەر لەبەر ئەوەیش سوورەتی ئەنفالم دانا لەنێوانی حەوت سوورەتە درێژەکەدا، کە برێتین لەم حەوت سوورەتە: بەقەرە، ئالی عیمران، نیساء، مائیدە، ئەنعام، ئەعراف، تەوبە (ت-س/ص).

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَأَذَانٌ مِّنَ اللّهِ وَرَسُولِهِ إِلَى النَّاسِ يَوْمَ الْحَجِّ الأَكْبَرِ أَنَّ اللّهَ بَرِيءٌ مِّنَ الْمُشْرِكِينَ وَرَسُولُهُ فَإِن تُبْتُمْ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَاعْلَمُواْ أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِي اللّهِ وَبَشِّرِ الَّذِينَ كَفَرُواْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ} (٩/٣).

یەزدانی مەزن دەفەرمویّ: ئەمە کە ئێستە بەیانی دەکەین پەیامێکە، لەلایەنی خوداو پێغەمبەری خوداوەیە، لە ڕۆژی حەجی زۆر گەورەدا جاڕی دەدەین بەناو کۆمەڵەی ئادەمیزاددا، کە خوداو پێغەمبەری خودا بەرین و دوورن و بێ پەیوەندن لەگەڵ هۆزی ناموسوڵمان و هاوبەشپەیداکەردا، بەهیچ جۆریّ دانوولەیان بەیەکەوە ناکوڵیّ و میانەیان پێکەوە نییە، ئەی مەردوم! ئەگەر تۆبە بکەن و پەشیمان ببنەوە لەکافرێتی و موسوڵمان بن و ئایینی تاک و تەنیایی بگرنە ئەستۆی خۆتان ئەوە زۆر باشە بۆ هەردوو جیهانتان، بەڵام ئەگەر پشت هەڵ بکەن لەم ئایینە ڕاست و دروستە ئەوە بزانن کە ڕزگار نابن لە دەستمان و ئێوە ئەو کوڕە نین کە بتوانن خۆتان لەهەوێڵی چنگی خودای تەوانا قوتار بکەن، زوو یا درەنگ بەررەتی دەکەون و هەقی بەرو دواتان لیّ دەکاتەوە، ئەی موحەممەد! موژدەی سزایەکی سەخت و بەسویّ بدە بەوانە کەبیّ بڕواو کافرن.

٣٨٩٢- عَنْ عَمْرِو بْنِ الأَحْوَصِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ شَهِدَ حَجَّةَ الْوَدَاعِ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ وَذَكَّرَ وَوَعَظَ ثُمَّ قَالَ أَيُّ يَوْمٍ أَحْرَمُ أَيُّ يَوْمٍ

أَحْرَمُ أَيُّ يَوْمٍ أَحْرَمُ. قَالَ فَقَالَ النَّاسُ يَوْمُ الْحَجِّ الأَكْبَرِ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ فَإِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ وَأَعْرَاضَكُمْ عَلَيْكُمْ حَرَامٌ كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا فِي بَلَدِكُمْ هَذَا فِي شَهْرِكُمْ هَذَا أَلاَ لاَ يَجْنِي جَانٍ إِلاَّ عَلَى نَفْسِهِ وَلاَ يَجْنِي وَالِدٌ عَلَى وَلَدِهِ وَلاَ وَلَدٌ عَلَى وَالِدِهِ أَلاَ إِنَّ الْمُسْلِمَ أَخُو الْمُسْلِمِ فَلَيْسَ يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ إِلاَّ مَا أَحَلَّ مِنْ نَفْسِهِ أَلاَ وَإِنَّ كُلَّ رِبًا فِي الْجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعٌ لَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَالِكُمْ لاَ تَظْلِمُونَ وَلاَ تُظْلَمُونَ غَيْرَ رِبَا الْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ فَإِنَّهُ مَوْضُوعٌ كُلُّهُ أَلاَ وَإِنَّ كُلَّ دَمٍ كَانَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعٌ وَأَوَّلُ دَمٍ أَضَعُ مِنْ دِمَاءِ الْجَاهِلِيَّةِ دَمُ الْحَارِثِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ كَانَ مُسْتَرْضِعًا فِي بَنِي لَيْثٍ فَقَتَلَتْهُ هُذَيْلٌ أَلاَ وَاسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا فَإِنَّمَا هُنَّ عَوَانٌ عِنْدَكُمْ لَيْسَ تَمْلِكُونَ مِنْهُنَّ شَيْئًا غَيْرَ ذَلِكَ إِلاَّ أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ فَإِنْ فَعَلْنَ فَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ ضَرْبًا غَيْرَ مُبَرِّحٍ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً أَلاَ إِنَّ لَكُمْ عَلَى نِسَائِكُمْ حَقًّا وَلِنِسَائِكُمْ عَلَيْكُمْ حَقًّا فَأَمَّا حَقُّكُمْ عَلَى نِسَائِكُمْ فَلاَ يُوطِئْنَ فُرُشَكُمْ مَنْ تَكْرَهُونَ وَلاَ يَأْذَنَّ فِي بُيُوتِكُمْ مَنْ تَكْرَهُونَ أَلاَ وَإِنَّ حَقَّهُنَّ عَلَيْكُمْ أَنْ تُحْسِنُوا إِلَيْهِنَّ فِي كِسْوَتِهِنَّ وَطَعَامِهِنَّ.
رواه الترمذي ومسلم[٢].

ئەم فەرموودە پیرۆزەیە لەم دوو شوێنەدا لە پێشەوە ڕابورد: (ب – ٢ ز – ١١٢ ل – ٢١٩ ف – ٢) + (ب – ٢ ز – ١١٦ ل – ٢٢٨ ف – ١). بەڵام لێرانەدا لە عەمری کوڕی ئەحوەصەوە (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: لەحەجی ماڵئاوایی (حەججەتولویداع)دا لە خزمەتی پێغەمبەردا بووم، حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) لەپاش سوپاس و ستایش کردنی خودای گەورە دەستی کرد بە پەندو ئامۆژگاری کردن و فەرمووی: چ ڕۆژێ زۆر گەورەو بەقەدرە سێ جار ئەم پرسیارەی دووپات کردەوە، خەڵکەکەیش عەرزیان کرد: ڕۆژی حەجی زۆر گەورە واتە: ڕۆژی جەژنی قوربان ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: دەسا خوێن و ماڵ و ناموستان بەیەکتری حەرام و ناڕەوایە، وەك چۆن ئەم ڕۆژەتان گەلێ بەڕێزو بەقەدرەو شکاندنی ڕێزو حورمەتی تاوانێکی گەلێ

---

[٢] مسلم. الحج: ٢٩٤١. تقدم في المجلد الثاني. تسلسل / ١١٢ رقم: ٢ / ١٦١٥.

گەورەیە ئەوانیش ئاوەها، نەخوازەڵڵا شکاندنی ڕێزی ئەم ڕۆژەشتان لەم شارەتانابێ کە شاری مەککەیەو بەستەو لەم مانگەشتانا بێ کەیەکێکی لەمانگە حەرامەکان. هۆشیار بن! تاونێ تاوانکار تەنیا هەر لەسەر خۆیەتی و ناتەنێتەوە بۆ کەس و کاری، کەوابوو تاوانی باوك و دایك پەیوەندی بەسەر منالیانەوە نییە، وە هەروەها بە پێچەوانەشەوە، بزانن کە موسوڵمان برای موسوڵمانە، وە سەرو ماڵی موسوڵمان لەبرای موسوڵمانی ناڕەوایەو حەرامە مەگەر شتێ کەبەڕەزای خۆی بێ و خۆی ڕەوای بدینێ بۆی، بزانن هەموو سوودێ کەلەسەر دەمی نەزانی دابووە هەمووی بەتاڵەو پووچە، وەك خودا دەفەرموێ:

{فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ فَأْذَنُواْ بِحَرْبٍ مِّنَ اللّهِ وَرَسُولِهِ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُؤُوسُ أَمْوَالِكُمْ لاَ تَظْلِمُونَ وَلاَ تُظْلَمُونَ - ٢/٢٧٩}.

سەرمایەی قەرزەکانتان هەرچەنێ بێ ئەوەتان دەکەوێتەوە، بەبێ زیادو کەم وەری بگرنەوە، نەستەم لەخەڵك بکەن و نەکەسیش ستەم لەئێوە بکا بەڵام سوودەکانی عەبباسی کوڕی عەبدولموطەلیب کەمامەی منە هەمووی پووچ و بەتاڵە بەسەرمایەو قازانجەوە! مەندە (بەقییە)ی فەرموودەکە وەك گوتمان لەپێشەوە لەو دوو شوێنەدا ڕابورد (ت/م).

٣٨٩٣- ⇨ (ب/٢ ز/١١٢ ل/٢١٩ ف/٢)[٣].

٣٨٩٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قال: بعثني أَبُو بَكْرٍ فِي الحجَّة الَّتِي أَمَّرَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عَلَيْهَا قَبْلَ حجَّة الوِدَاع فِي رَهطٍ يؤذِّنون في النَّاس بمنىً ألاَّ يَحجَّ بَعْدَ العام مُشرِكٌ وَلا يَطُوف بِالبَيْت عُريانٌ ثُمَّ أردَفَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بعليٍّ يُؤذِّن ببراءة فَأَذَّن مَعَنَا عليٌّ فِي أهل منىً يوم النَّحر ببراءة. رواه البخاري والترمذي ولفظه: بَعَثَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَبَا بَكْرٍ وَأَمَّرَهُ أنْ يُنادِيَ بهؤلاءِ الكَلِمَات، ثمَّ أتبَعَهُ عَلياً فبينا أبو بَكرٍ فِي الطَّرِيقِ سَمِعَ رُغَاءَ نَاقَةِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) الْقَصْوَاءَ فَخَرَجَ

---

[٣] تقدم في المجلد الثاني. تسلسل / ١١٢ رقم: ٢ / ١٦٠٨.

فَزِعًا فَظَنَّ أَنَّهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَإِذَا هُوَ عَلِيٌّ فَدَفَعَ إِلَيْهِ كِتَابَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَأَمَرَ عَلِيًّا أَنْ يُنَادِيَ بِهَؤُلاَءِ الْكَلِمَاتِ فَانْطَلَقَا فَحَجَّا فَقَامَ عَلِيٌّ أَيَّامَ التَّشْرِيقِ فَنَادَى ذِمَّةُ اللَّهِ وَرَسُولِهِ بَرِيئَةٌ مِنْ كُلِّ مُشْرِكٍ فَسِيحُوا فِي الأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَلاَ يَحُجَّنَّ بَعْدَ الْعَامِ مُشْرِكٌ وَلاَ يَطُوفَنَّ بِالْبَيْتِ عُرْيَانٌ وَلاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ إِلاَّ مُؤْمِنٌ وَكَانَ عَلِيٌّ يُنَادِي فَإِذَا عَيِيَ قَامَ أَبُو بَكْرٍ فَنَادَى بِهَا[٤].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: لەو حەجەدا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەبوبەکری کرد بە فەرمانڕەوای حەج، کەبەر لە حەجی ماڵئاوایی بوو ئەبو بەکر منو چەند پیاوێکی تری نارد کە لەمیانە بەناو خەڵکەکەدا بانگەواز هەڵ دەینو جاڕ بدەین: کەلەم ساڵ بەدواوە نابێ بتپەرستو فرەخوا(موشریك)بێن بۆ حەج، وەنابێ کەسیش بەڕووتی تەوافی بەیت بکا، لەپاشدا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) عەلیشی نارد کە بانگەواز هەڵ دا بە خوێندنەوەی سوورەتی بەرائەت بەسەر خەڵکەکەدا، ئیتر لە ڕۆژی جەژن دا عەلی لەگەڵ ئێمەدا لەناو خەڵکی مینادا بە سوورەتی بەرائەت جاڕو بانگەوازمان هەڵ دا (ب/ت) گفتەی (ت) ئاوایە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەبوبەکری کرد بە سەرکردەی حەجو لەگەڵ حاجیان دا ناردی بۆ حەجو فەرمووی پێی بەم ووشانە جاڕ بداو بانگەواز هەڵ بدا، لەپاشدا عەلیشی بەشوێندا نارد، ئەبوبەکر هێشتا لەڕێگە بوو لەپڕ قوڕەی ووشترەکەی پێغەمبەری ژنەوت، کەناوی قەصواء بوو، جا ڕاچەنیو هاتە دەرێ، وایزانی کەئەوە پێغەمبەر خۆیەتی، بەڵام تەماشای کرد ئەو نەبوو، بەڵام عەلی بوو بە سواری قەصواء، عەلی کاغەزەکەی پێغەمبەری دا بەئەبوبەکر، کاغەزەکەی ئەوەی تیادا بوو: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی داوە بەعەلی کەبەم ووشانە جاڕ هەڵ بدا بەناو حاجیان دا، جا هەم ئەبوبەکرو هەم عەلی ڕۆیشتنو حەجیان کرد، وە عەلی لەڕۆژی جەژنو لەسێ ڕۆژەکەی پاش یەکەم ڕۆژی

---

[٤] مسلم. حج: ٣٢٧٤. بخاري. تفسير: ٤٦٥٥ ، ٣٦٩ ، ١٦٢٢ ، ٣١٧٧ ، ٤٣٦٣ ، ٤٦٥٦. أبو داوود. مناسك: ١٩٦٤. نسائي. مناسك الحج: ٢٩٧٥.

جەژن دا کە ناودارن بە أیام التشریق: ڕۆژانی هەڵخستن: ڕۆژانی لەتک گۆشت کردن لەبەر تینی خۆر عەلی لەم ڕۆژانەدا ڕادەوەستاو بانگەوازی هەڵ دەدا: خوداو پێغەمبەری خودا بەرین لەهەموو هاوبەش پەیداکەرێ، وەهیچ عەهدو پەیمانێ نەماوە لەمابەینا، وەك ئەم ئایەتە دەفەرموێ:

{فَسِيحُواْ فِي الأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ - ٢/٩}.

تەنیا ماوەی ئەوەتان هەیە ئەی کۆمەڵەی کافران! کە تاچوار مانگ لەناو وڵاتا بەبێ ترس بگەڕێن، بەڵام لەپاش تەواو بوونی ئەم قەیران و مۆڵەتا لەهەرکوێ بەرەتمان بکەون دەتانکوژین! وەلەم ساڵ بەدواوە فرەخوا نەیێ بۆ حەج، وە مرۆڤی ڕووت و قووتیش تەوافی خانەی خودا نەکا، وە ئەو کەسەشی بڕوادار نەبێ و خاوەنی دین و دیانەت نەبێ قەت ناچێتە بەهەشت لە پێش دا عەلی خۆی ئەم بانگەوازەی هەڵ دەدا، جاکە ئەو شەکەت دەبوو ئنجا ئەبو بەکر هەڵ دەسایەوەو هەمان بانگەوازی هەڵ دەدا.

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {إِلاَّ الَّذِينَ عَاهَدتُّم مِّنَ الْمُشْرِكِينَ ثُمَّ لَمْ يَنقُصُوكُمْ شَيْئًا وَلَمْ يُظَاهِرُواْ عَلَيْكُمْ أَحَدًا فَأَتِمُّواْ إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَى مُدَّتِهِمْ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ - ٤/٩}.

واتە: یەزدانی پاك دەفەرموێ: خوداو پێغەمبەری خودا ئیعلانی بەرائەت و نەمانی پەیمان دەکەن لەگەڵ هاوبەشپەیداکەرەکانا، ئەوانەیان نەبێ کە پەیمانتان لەگەڵیان دا کردووەو لەپاشا هیچ مەرجێ لەمەرجەکانیان نەفەوتان و نەیان دایە پاڵ دوژمنی ئێوە، ئەوە پەیمانەکەیان چەندەی ماوە بۆیان تەواو بکەن و زیانیان لێ مەدەن تاماوەی ئەو پەیمانە تەواو دەبێ، بەڕاستی خودا ئەو کەسانەی خۆش دەوێ کە خۆیان دەپارێزن لەپەیمان شکاندن.

٣٨٩٥- سُئِلَ عليّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) بِأَيِّ شَيْءٍ بُعِثْتَ فِي الْحَجَّةِ قَالَ بُعِثْتُ بِأَرْبَعٍ أَنْ لاَ يَطُوفَ بِالْبَيْتِ عُرْيَانٌ وَمَنْ كَانَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عَهْدٌ فَهُوَ إِلَى مُدَّتِهِ وَمَنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ عَهْدٌ فَأَجَلُهُ أَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ وَلاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ إِلاَّ نَفْسٌ مُؤْمِنَةٌ وَلاَ يَجْتَمِعُ الْمُشْرِكُونَ وَالْمُسْلِمُونَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَذَا[٥].

---

[٥] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

لەعەلی (خودای لێ ڕازی بێ) پرسیار کرا: لەو حەجەدا کە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) تۆی نارد تا یاخە هەڵتەکاندنی خوداو پێغەمبەری خودا لەفرە خواکان جاڕ بدەی چی فەرمانێکت پێ کرابوو؟ گوتی: بەم چوار شتە فەرمانم پێ کرابوو: یەکەم ئادەمیزادی ڕووت تەوافی کابە نەکا، دووەم: ئەوانەی پەیمانیان هەیە لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوەتا ماوەی ئەو پەیمانە تەواو دەبێ مۆڵەت دەدرێن، وەئەوەی پەیمانی نییە چوار مانگ مۆڵەت دەدرێ، سێیەم: ناچێتە بەهەشت مەگەر کەسێ کەئیمانو باوەڕی ببێ. چوارەم: لەم ساڵ بەدواوە نابێ بتپەرستانو موسوڵمانان پێکەوە حەج بکەن. واتە: فرەخواکان نەیەن بۆ حەج (ت–س/ح).

٣٨٩٦- (ب - ١ ز - ٢ ل - ٢٤ ف -١٤)[٦].

٣٨٩٧- عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ أَتَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَفِي عُنُقِي صَلِيبٌ مِنْ ذَهَبٍ. فَقَالَ يَا عَدِيُّ اطْرَحْ عَنْكَ هَذَا الْوَثَنَ. وَسَمِعْتُهُ يَقْرَأُ فِي سُورَةِ بَرَاءَةَ (اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ) قَالَ أَمَا إِنَّهُمْ لَمْ يَكُونُوا يَعْبُدُونَهُمْ وَلَكِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا أَحَلُّوا لَهُمْ شَيْئًا اسْتَحَلُّوهُ وَإِذَا حَرَّمُوا عَلَيْهِمْ شَيْئًا حَرَّمُوهُ. رواه الترمذي[٧].

عەدی کوڕی حاتەم (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: چووم بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) خاچ (صەلیب)ێکی زێڕم لەملدا بوو، فەرمووی: ئەی عەدی! ئەم بتە لەخۆت دووربخەرەوە گوێم لەحەزرەت بوو ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

{اتَّخَذُواْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُواْ إِلاَّ لِيَعْبُدُواْ إِلَهًا وَاحِدًا لاَّ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ - ٣١/٩}.

---

[٦] تقدم في المجلد الأول. تسلس / ٢ رقم: ١٤ / ١٦.

[٧] سكت عن درجته الشارح.

واتە: ئەوانە زاناو مەلاکانی خۆیانو سۆفیلکە لەخودا ترسەکانیانو مەسیح (عیسای کوڕی مەریەم)یان کردووە بە خوداوەندو بەقسەی ئەوان دەکەنو گوێ بەیاساو فەرمانەکانی خودا نادەن منیش گوتم: قوربان! خۆ نەیان دەپەرستن فەرمووی: ئەدی خۆ بە پەرستن نایەن پەرستن بەڵام ئەگەر ئەم مالوومو ڕەبەنو قەشانە لەخۆیانەوە شتێکی حەرامیان بۆ حەڵاڵ بکەن بەحەڵاڵی دەزانن، وە هەروەها ئەگەر حەڵاڵیشیان لێ حەرام بکەن بە حەرامی دەزانن (ت).

قَالَ اللہ تَعَالَی: {وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلاَ يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ} ⇦ (ب/ ز/٢ ل/٩).

٣٨٩٨- ⇦ (ب – ٢ – ز – ٢ ل – ٩ ف – ١ + ٢ + ٣)[٨].

٣٨٩٩- عَنْ زَيْدِ بْنِ وَهْبٍ (رَضِيَ اللہ عَنْهُ) قَالَ مَرَرْتُ عَلَى أَبِي ذَرٍّ بِالرَّبَذَةِ فَقُلْتُ مَا أَنْزَلَكَ بِهَذِهِ الأَرْضِ قَالَ كُنَّا بِالشَّأْمِ فَقَرَأْتُ ( وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلاَ يُنْفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَبَشِّرْهُمْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ) قَالَ مُعَاوِيَةُ مَا هَذِهِ فِينَا، مَا هَذِهِ إِلاَّ فِي أَهْلِ الْكِتَابِ. قُلْتُ إِنَّهَا لَفِينَا وَفِيهِمْ[٩].

زەیدی کوڕی وەهب (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لەرەبەزە چوومە لای ئەبو زەڕ، گوتم: چی تۆی گەیاندۆتە ئەم خاکە؟ گوتی: کاتێ لەشام بووم ئەم ئایەتەم دەخوێندەوە کە دەفەرموێ: {وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ} موعاوییە گوتی: ئەمە بۆ ئێمە نییە، ئەوە بۆ خاوەن نامەکان، بۆ ئەهلی کیتاب وایە، منیش گوتم: با ئەمە بۆ ئێمەیشو بۆ ئەوانیشە ئیتر لەم قسەوە تەنییەوەو کێشەکە گەورە بوو، سەرەنجام من دوور خرامەوە بۆ ئەم شوێنە (کورد ووتەنی: هەر قسەیە دەبێ بەڕاست، واتە: في البدو كانت الكلمه – وەرگێڕ) (ب–ڕەزای خودای لەسەر بێ).

---

[٨] تقدم في المجلد الثاني. تسلسل / ٢ رقم: ١ / ١١٩١ و رقم: ٢ / ١١٩٢ و رقم: ٣ / ١١٨٢ و رقم:١١٨٣/٢و رقم: ١١٨٤/٣..

[٩] بخاري. تفسير: ٤٦٦٠.

٣٩٠٠- وَقَالَ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّهُ عَنهُما) هَذَا قَبْلَ الزَّكَاةُ فَلَمَّا أُنْزِلَتْ جَعَلَهَا اللّهُ طُهْرًا لِلأَمْوَالِ. روى الثلاثة البخاري[10].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ ڕازی بێ) دەڵێ: ئەمە لەپێش دانان (فەرزکردن)ی زەکاتدا وابوو، بەڵام کاتێ خودا زەکاتی فەرز کرد ئیتر زەکاتی کرد بە پاکەوەکەری هەموو جۆرە سامان و ماڵێ (ب = بوخاری).

٣٩٠١- عَنْ ثَوْبَانَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمَّا نَزَلَتِ (الَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ) قَالَ كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ فَقَالَ بَعْضُ أَصْحَابِهِ أُنْزِلَ فِي الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ مَا أُنْزِلَ. لَوْ عَلِمْنَا أَيُّ الْمَالِ خَيْرٌ فَنَتَّخِذَهُ فَقَالَ أَفْضَلُهُ لِسَانٌ ذَاكِرٌ وَقَلْبٌ شَاكِرٌ وَزَوْجَةٌ مُؤْمِنَةٌ تُعِينُهُ عَلَى إِيمَانِهِ. رواه الترمذي بسند حسن[11].

ثەوبان (ڕەزای خودای لەسەر بێ) گوتی: کە ئایەتی: {وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلاَ يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ}: دابەزی، جارێ لە سەفەرێکا، لە خزمەتی جحەزرەتدا بووین، هەندێ کەس لە هاوڕێکانی عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆ خۆت زۆرباش دەزانی کە خودا لەم ئایەتەدا چ هەڕەشەیەکی توندو تیژی لەو کەسانە کردووە کە زێڕو زیو کەڵەکە دەکەن، بریا دەمانزانی کەکام جۆرە ماڵە باشە، تاکوو ماڵی لێ بکەین؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ) بزانن باشترین ماڵ و دەسمایە زمانێکە بەیادو زیکری خودا پاراو بێ و، دڵێکە لەشوکرو سوپاسی غافڵ نەبێ و، هاوسەرێکە، کە موسوڵمان و بڕواداربێ و کۆمەکی مێردەکەی بکا لە سەر بڕواداریی و موسوڵمانەتێ! (ت-س/ح).

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {إِنَّ عِدَّةَ الشُّهُورِ عِندَ اللّهِ اثْنَا عَشَرَ شَهْرًا فِي كِتَابِ اللّهِ يَوْمَ خَلَقَ السَّمَاوَات وَالأَرْضَ مِنْهَا أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ فَلاَ تَظْلِمُواْ فِيهِنَّ أَنفُسَكُمْ وَقَاتِلُواْ الْمُشْرِكِينَ كَآفَّةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَآفَّةً وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ - ٩/٣٦}.

---

[10] بخاري. تفسير: ٤٦٦١.

[11] حديث حسن عند الترمذي.

واتــە: خــودای مــەزن فەرموویــەتی: لەڕاسـتی دا ژمــارەی مانگــەکان لــە بڕیــاری خــوادا دوازدە مــانگن، لــەو ڕۆژەوە کــە خــودا ئاسمانــەکانو زەوی دروست کردووە، چوار مانگ لەو دوازدەیە خاوەن قیمەتو نرخێکی تایبەتین لەبەر ئەوە جەنگو ئاشووبو تاوانی لەواندا زۆرتـر قەدەغـە کـردووە وەئەمـە یاسـای دینــی ڕاسـتە، کەوایــە لــەم مانگانــەدا زۆرو سـتەم لــەخۆتان مەکــەن، وەشەڕو شۆڕو هەراو زەنابەرپا مەکەن.

٣٩٠٢- ⇦ (ب – ٢ ز –١١٢ ل – ٢٢١ ف –٣)[١٢].

قَالَ اللہ تَعَالَی: {إِلاَّ تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ اللّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ الَّذِينَ كَفَرُواْ ثَانِيَ اثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِي الْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِهِ لاَ تَحْزَنْ إِنَّ اللّهَ مَعَنَا فَأَنزَلَ اللّـهُ سَـكِينَتَهُ عَلَيْـهِ وَأَيَّـدَهُ بِجُنُودٍ لَّمْ تَرَوْهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ الَّذِينَ كَفَرُواْ السُّفْلَى وَكَلِمَةُ اللّهِ هِيَ الْعُلْيَـا وَاللّـهُ عَزِيـزٌ حَكِيمٌ} ⇦ (ب –٤ ز – ١٠١ ل – ٣٠٨).

٣٩٠٣- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللہ عَنْهُ) أَنَّ أَبَا بَكْرٍ حَدَّثَهُ قَالَ قُلْتُ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللہ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) وَنَحْنُ فِي الْغَارِ لَوْ أَنَّ أَحَدَهُمْ يَنْظُرُ إِلَى قَدَمَيْهِ لأَبْصَرَنَا تَحْتَ قَدَمَيْهِ. فَقَالَ يَا أَبَا بَكْرٍ مَـا ظَنُّكَ بِاثْنَيْنِ اللَّهُ ثَالِثُهُمَا. رواه الترمذي والبخاري[١٣].

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتـی: ئەبوبەکر بۆمـی گێڕایەوە گوتـی: ئەوکاتـە کەلــەناو ئەشــکەوتەکەی چیای ســەوردا بــووین، عــەرزی حــەزرەتم کــرد: خــۆ ئەگەر یەکێکیان تەماشای ژێر پێی خۆی بکا لەبەر پێی خۆی دا دەمان بینێ، فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): ئەی ئەبوبەکر! گومانت چییە بەو دووکەسە کە خـودا خـۆی کەسـی سێهەمیانە واتــە: خــەمت نــەبێ خــودای گــەورە لەگەڵمانــە (ت/ب).

قَالَ اللہ تَعَالَی: {وَمِنْهُم مَّن يَلْمِزُكَ فِي الصَّدَقَاتِ فَإِنْ أُعْطُواْ مِنْهَا رَضُـواْ وَإِن لَّـمْ يُعْطَوْاْ مِنهَا إِذَا هُمْ يَسْخَطُونَ – ٩/٥٨}.

---

[١٢] تقدم في مجلد ثاني. تسلسل / ١١٢ ل / ٢٢١ رقم: ٣ / ١٦٠٩.

[١٣] بخاري. تفسير: ٤٦٦٣.

واتە: هەندێ لەوان لەکاتی دابەشکردنی صەدەقەو خێراتدا نەنگو ڕەخنە لەتۆ دەگرن، جا ئەگەر بەشیان بدرێ لەو خێراتە ئەوا ڕازی دەبن‌و کڕ دەبن، وەئەگەر بەشیان نەدرێ ئەوا کوتو پڕ هەڵدەچن‌و تووڕە دەبن‌و دەست دەکەن بە بۆڵە بۆڵ.

٣٩٠٤- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ بُعِثَ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بِشَيْءٍ، فَقَسَمَهُ بَيْنَ أَرْبَعَةٍ وَقَالَ أَتَأَلَّفُهُمْ. فَقَالَ رَجُلٌ مَا عَدَلْتَ. فَقَالَ يَخْرُجُ مِنْ ضِئْضِئِ هَذَا قَوْمٌ يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ.رواه البخاري[١٤].

ئەبو سەعید (ڕەزای خودای لەسەر بێ) دەڵێ: عەلی لەیەمەنەوە هەنێ زێڕی نارد بۆ حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دابەشی کرد بەسەر ئەم چوار کەسەدا: ئەقرەعی کوڕی حابیس‌و عویەینەی کوڕی بەدرو زەیدی طائی‌و عەلقەمەی ئەل-عامیری، فەرمووی: دەمەوێ بەم خەڵاتە دڵ نەوایی یان بکەم‌و دڵیان خۆش بکەم هەتا بەرەبەرە هۆگری ئیسلام دەبن زولخووەیسەرەی تەمیمیش گوتی: بە عەدالەت بەشت نەکرد! حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: لەنەوەی ئەمە کۆمەڵێ پەیدا دەبن فڕیان بەسەر ئیسلامەتییەوە نییەو لەئایین بەلەسە دەبن (ب) ⇨ (ب - ٥ ز - ٧٨ ل - ٢٨٧ ف - ٨+٩).

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {الَّذِينَ يَلْمِزُونَ الْمُطَّوِّعِينَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ فِي الصَّدَقَاتِ وَالَّذِينَ لاَ يَجِدُونَ إِلاَّ جُهْدَهُمْ فَيَسْخَرُونَ مِنْهُمْ سَخِرَ اللَّهُ مِنْهُمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ - ٩/٧٩}.

واتە: یەزدانی پاك دەفەرموێ: ئەوکەسانەی کە ڕەخنەو لەقەم دەگرن لەو موسوڵمانە خێرکەرە ساغ‌و ڕاستانەی کە ساغ لەبەر ڕەزای خوا خێرو خێرات دەکەن، یالەو موسوڵمانە کەم دەستانەی کە بەپێی تەوانای خۆیان لەوماڵەکەمەی هەیانە بەزیادەوە خێری لێ دەکەن، تەنانەت لەو ماڵەیش کە بەئارەقی ناوچەوان‌و بەڕەنجی شان پەیدای دەکەن بەشی خودای لێ دەدەن، ئەوکەسانەی کەبەم دوو دەستەیە لاقرتی‌و قەشمەری دەکەن‌و تیروتوانجیان

---

[١٤] بخاري. تفسير: ٤٦٦٧.

تێ دەگرن و دەیانەوێ دڵیان ساردبکەنەوە، ئەوانە بە پێچەوانەوە خودا خۆیان دەکا بەگاڵتە جاڕو دەیانکا بە پەند، لەڕۆژی دوا ڕۆژدا کە هەمووشت بەدەستی خودا خۆیەتی سزایەکی سەختیان بۆ دەبڕێتەوە.

٣٩٠٥- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ لَمَّا أُمِرْنَا بِالصَّدَقَةِ كُنَّا نَتَحَامَلُ فَجَاءَ أَبُو عَقِيلٍ بِنِصْفِ صَاعٍ، وَجَاءَ إِنْسَانٌ بِأَكْثَرَ مِنْهُ، فَقَالَ الْمُنَافِقُونَ إِنَّ اللَّهَ لَغَنِيٌّ عَنْ صَدَقَةِ هَذَا، وَمَا فَعَلَ هَذَا الآخَرُ إِلاَّ رِئَاءً. فَنَزَلَتْ ( الَّذِينَ يَلْمِزُونَ الْمُطَّوِّعِينَ). رواه البخاري[١٥].

ئەبو مەسعوود (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: کاتێ فەرمانمان پێ کرا بەخێرکردن هەمان بوو نەیبوو، دەچوو حەماڵی دەکردو دەیکرد بەخێر، جا ئەبو عەقیل نیومەن خێری هێنا لەسەر فەرمایشتی تەفسیری نامی: تاقەصاع (مەن)ێ خورمای هێنا، وە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئیمشەو بە ولاخ ئاوم کێشاوە بە دوومەن خورما، وا مەنێکیانم هێناوە بۆ خێر، وە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) لێی وەری گرت وە پیاوێکی تریش لەو زیاتری هێنا، جا دوو ڕووو مونافقە ناپاکەکان گوتیان: خودا چ هەوەجییەکی هەیە بەم شتە بێنرخەیە کەئەمە کردوویەتی بەخێر؟ وە ئەم پیاوەی تریش بۆ ڕیاو بەرچاوی وادەکا. جا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە (ب).

٣٩٠٦- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ لَمَّا تُوُفِّيَ عَبْدُ اللَّهِ جَاءَ ابْنُهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَسَأَلَهُ أَنْ يُعْطِيَهُ قَمِيصَهُ يُكَفِّنُ فِيهِ أَبَاهُ فَأَعْطَاهُ، ثُمَّ سَأَلَهُ أَنْ يُصَلِّيَ عَلَيْهِ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لِيُصَلِّيَ فَقَامَ عُمَرُ فَأَخَذَ بِثَوْبِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ تُصَلِّي عَلَيْهِ وَقَدْ نَهَاكَ رَبُّكَ أَنْ تُصَلِّيَ عَلَيْهِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إِنَّمَا خَيَّرَنِي اللَّهُ فَقَالَ (اسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لاَ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِنْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً) وَسَأَزِيدُهُ عَلَى السَّبْعِينَ. قَالَ إِنَّهُ مُنَافِقٌ. قَالَ

---

[١٥] بخاري. تفسير: ٤٨٦٨.

فَصَلَّى عَلَيْهِ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَأَنْزَلَ اللّٰهُ ( وَلاَ تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِنْهُمْ مَاتَ أَبَدًا وَلاَ تَقُمْ عَلَى قَبْرِهِ ). رواه الشيخان والترمذي[١٦].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: کە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوول (سەرۆکی ناپەکەکان) مرد، عەبدوڵڵای کوڕی ئەم عەبدوڵڵایە، کەیەکێ بوو لەهاوڕێ ڕاستو باشەکانی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) هات بۆلای حەزرەت، عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! کراسێکی خۆتم بدەرەیێ، تا بیکەم بەکفن بۆ باوکم ئەویش کراسێکی خۆیی دایە، لەپاشا داواشی لێ کرد کە نوێژی مردووشی لەسەر بکا، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵسا کە نوێژی لەسەر بکا، عومەر هەڵسا جلەکەی پێغەمبەری گرتو عەرزی کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! تۆ خودا ڕێگەی ئەمەی نەداویت، ئیتر نوێژی چی لە سەردەکەی! فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ) خودا منی کردووە بەسەرپشكو خاتر خۆی کردوومو دەفەرموێ:

{اسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لاَ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَن يَغْفِرَ اللّهُ لَهُمْ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ كَفَرُواْ بِاللّهِ وَرَسُولِهِ وَاللّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ – ٩/٨٠}.

واتە: ئارەزووی خۆتە داوای لێ خۆش بوون بکە بۆیان یا مەیکە، ئێمە ڕێگەی ئەوەت لێ ناگرین، بەڵام ئەوە بێ سوودە، ئەگەر نەك جارو دوو جار حەفتا جاریش داوای لێ خۆش بوونیان بۆ بکەی خودا لێیان خۆش نابێ. فەرمووی: دەی من لەحەفتا جار زیاتر داوای لێ خۆشبوونی بۆ دەکەم، عومەر (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئاخر ئەمە ناپاكو مونافیقە. قسەبەر گوتی: جا کاتێ حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی لەسەری کرد خودا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە کە دەفەرموێ:

{وَلاَ تُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلاَ تَقُمْ عَلَىَ قَبْرِهِ – ٩/٨٤}.

---

[١٦] بخاري. تفسير سورة براءة: ٤٦٧٠ ، ٦٩٥٨ ، ٧٨٢٦ ، مسلم. فضائل: ٦١٥٧.

واتە: بە هیچ جۆرێ نوێژ مەکە لەسەر هیچ کامێ لەو دواکەوتوانە کاتێ کە مرد، وەلەسەر گۆڕەکەی ڕامەوەستە بۆ نزاکردن بۆی، چونکە ئەوانە بێ باوەڕ بوون بە خوداو پێغەمبەری، وە بە فاسیقی و لە پەتبەربوویی مردوون! (ش/ت).

قال الله تعالى: {وَآخَرُونَ اعْتَرَفُواْ بِذُنُوبِهِمْ خَلَطُواْ عَمَلاً صَالِحًا وَآخَرَ سَيِّئًا عَسَى اللّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيْهِمْ إِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ -٩/١٠٢}.

واتە: کەسانێکی تر هەن، ئەوانیش لە ئێوەن، بەڵام تووشی تاوان و گوناه بوون، تەنانەت خۆشیان پێ لەوە دەنێن، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا رابووردەیەکی باش و پەرێزێکی پاکیان هەیە واتە: کردەوەی چاك و کردەوەی خراپیان هەیە و لەهەر دوولا تێیان گوشیوە، جا ئەمانە و مانەندی ئەمانە هیوا وایە کە خودا تەوبەو پەشیمانی یان لێ گیرا بکا، چونکە بەڕاستی تا تۆ بڵێی لە ڕادە بەدەر خودا تاوانبەخش و میهرەبانە!

٣٩٠٨- عنْ سَمُرَةُ بْنُ جُنْدُبٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عن النبي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قال: أَتَانِي اللَّيْلَةَ آتِيَانِ فَابْتَعَثَانِي، فَانْتَهَيْنَا إِلَى مَدِينَةٍ مَبْنِيَّةٍ بِلَبِنِ ذَهَبٍ وَلَبِنِ فِضَّةٍ، فَتَلَقَّانَا رِجَالٌ شَطْرٌ مِنْ خَلْقِهِمْ كَأَحْسَنِ مَا أَنْتَ رَاءٍ، وَشَطْرٌ كَأَقْبَحِ مَا أَنْتَ رَاءٍ قَالاَ لَهُمْ: اذْهَبُوا فَقَعُوا فِي ذَلِكَ النَّهْرِ. فَوَقَعُوا فِيهِ ثُمَّ رَجَعُوا إِلَيْنَا قَدْ ذَهَبَ ذَلِكَ السُّوءُ عَنْهُمْ، فَصَارُوا فِي أَحْسَنِ صُورَةٍ قَالَ لِي: هَذِهِ جَنَّةُ عَدْنٍ، وَهَذَاكَ مَنْزِلُكَ قَالاَ أَمَّا الْقَوْمُ الَّذِينَ كَانُوا شَطْرٌ مِنْهُمْ حَسَنٌ وَشَطْرٌ مِنْهُمْ قَبِيحٌ فَإِنَّهُمْ خَلَطُوا عَمَلاً صَالِحًا وَآخَرَ سَيِّئًا تَجَاوَزَ اللَّهُ عَنْهُمْ. رواه البخاري[١٧].

سەموورەی کوڕی جوندوب (ڕەزای خودای لێ بێت) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) فەرمووی: ئەم شەو دوو فریشتە هاتن بۆ لام، لە خەو هەڵیان ساندم و بردمیان لەگەڵ خۆیاندا، ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە شارێ دروست کرابوو، خشتێکی لە زێڕ بوو، خشتێکی لە زیو بوو، پیاو گەلێکمان تووش

---

[١٧] بخاري. تفسير: ٤٦٧٤.

بوون نیوەی لە شیان تابلێیت جوان بوو، ئەو نیوەکەی تابلێیت ناشیرین بوو، دوو فریشتەکەی کە لەگەڵ من بوون پێیان گوتن: بڕۆن خۆتان بخەنە ناو ئەو چۆمەوە، ئەوانیش چوونە ناو چەمەکەوەو لەپاشدا هاتنەوە بۆ لای ئێمە دەنك ناشیرینی یەکەیان نەمابوو، وە تا بڵێیت جوان بوو بوون، گوتیان پێم: ئەمە بەهەشتی ئێجگاری (جەننەتولعەدن)ە، ئا ئەوە جێگەی تۆیە، ئەو پیاوانەش کە نیوەیان جوانو نیوەیان ناشیرین بوو ئەوە بۆیە وابوون چونکە کاری باشو کاری خراپیان ئاوێتە کردبوو، وەلە کرداری چاكو لە کرداری خراپ تێیان گوشی بوو، بەڵام لە ئەنجامدا خودا چاو پۆشی لێ کردن. (ب — ڕەزای خوای لێ بێ).

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْ وَاللّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ - ١٠٨/٩}.

واتە: یەزدانی مەزن دەفەرموێ: ئەو مزگەوتەی کەلە سەفەری کۆچتا، پێش ئەوەی بگەیتە مەدینە لە خاکی قوبا دروستت کرد، کە لە سەرەتاوە بناغەی لەسەر تەقواو ترسی خودا دانراوە، ئەوە شایانی ئەوەیە کە تۆ تاعەتو نوێژی تیا بکەی، ئەم مزگەوتە سەرەڕای ئەوەش چاکەیەکی تری هەیە کۆمەڵێ پیاوی موسوڵمانی ساغی پاكو تەمیزی تیایە، حەز بەپاکی دڵو دەروونو دەستو جلو بەرگو جێو شوێن دەکەن، لە بێ دەسنوێژیو لە شپیسی دوورن، بەسە بۆ سەربەرزی ئەوان کە خودا ئەو کەسانەی خۆش دەوێ کە حەزیان لە پاکیو خاوێنی یەو خۆیان پاكو خاوێن ڕادەگرن.

٣٩٠٩- قال أَبو سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): تَمَارَى رَجُلان فِي الْمَسْجِدِ الَّذِي أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى فَقَالَ رجلٌ هُوَ مَسْجِدُ قُبَاءٍ. وَقَالَ الآخَرُ: هُوَ مَسْجِدُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم). فَقَالَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): هُوَ مسجدی هذا. رواه الترمذي هنا ومسلم في الحج[١٨].

---

[١٨] مسلم. حج: ٣٣٧٣.

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێت) گوتی: دوو پیاو بوو بە دەمە قاڵیان لەسەر ئەو مزگەوتەی کە خودا لەوەسفی دا دەفەرموێ: {لَمَسْجِدٍ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى}: کە ئەم مزگەوتە کامەیە، پیاوێکیان گوتی: مزگەوتی قوبایە، ئەویتریان گوتی: نەء، ئەوە مزگەوتەکەی پێغەمبەرە، جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت) فەرمووی: ئەوە ئەم مزگەوتەی منە (ت/م).

٣٩١٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: نَزَلَتْ هَـذِهِ الآيَةُ فِي أَهْلِ قُبَاءَ كَانُوا يَسْتَنْجُونَ بِالْمَاءِ فَنَزَلَتْ فِيهِمْ. رواه الترمذي والبزار[١٩].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێت) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) فەرمووی: ئەم ئایەتە لە پەسن (مەدح)ی خەڵکی قوبادا هاتە خوارەوە، لەبەر ئەوە کە تاراتیان بەئاو دەگرت! (ت/ بەززار).

قال الله تعالى: {مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُواْ أُوْلِي قُرْبَى مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ - ٩/١٣}.

واتە: خودای گەورە دەفەرموێ: ڕەوا نییە بۆ پێغەمبەرو بۆ موسوڵمانان کە داوای لێخۆشبوون لە خودای گەورە بکەن بۆ کافرو هاوبەش پەیداکەرەکان، بۆ ئەوانەیان کە لەسەر کوفرو بێ ئایینی دەمرن، مادەم بۆیان دەرکەوت کە ئەوانە دۆزەخین، بالە خزمو کەس و کارێ خۆشیان بن.

٢٠- عن سَعِيدُ بْنُ الْمُسَيَّبِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) عَنْ أَبِيهِ قال: لَمَّا حَضَرَتْ أَبَا طَالِبٍ الْوَفَاةُ جَاءَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَوَجَدَ عِنْدَهُ أَبَا جَهْلٍ، وَعَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي أُمَيَّةَ بْنِ الْمُغِيرَةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): يَا عَمِّ، قُلْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، كَلِمَةً أَشْهَدُ لَكَ بِهَا عِنْدَ اللَّهِ. فَقَالَ أَبُو جَهْلٍ وَعَبْدُ اللَّهِ: يَا أَبَا طَالِبٍ، أَتَرْغَبُ عَنْ مِلَّةِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ؟ فَلَمْ يَزَلْ النبي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَعْرِضُهَا عَلَيْهِ، وَيُعِيدَان لَهُ تِلْكَ الْمَقَالَةِ، حَتَّى قَالَ أَبُو طَالِبٍ آخِرَ مَا كَلَّمَهُمْ هُوَ عَلَى مِلَّةِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، وَأَبَى أَنْ يَقُولَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. فَقَالَ

---

[١٩] سكت الشارح عن درجته.

رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى الله عَلَيهِ وَسَلّم) أَمَا وَاللّٰهِ لأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ، مَا لَمْ أُنْـهَ عَنْـكَ. فَـأَنْزَلَ اللّٰـهُ عـزَّ وجلَّ: {مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ} الآية[٢٠]:

سەعیدی کوڕی موسەییب (ڕەزای خودایان لێ بێت) گوتی: باوکم گوتی: کاتێ نیشانەی مردن لە ئەبو طالیب دیاری دا و هاتە سەر مردن پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت) چوو بۆ لای، لەوکاتەدا ئەبو جەهل‌و عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئومەییەی کوڕی موغیرەی لەلا بوون، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت) فەرمووی: ئەی مامە! بڵێ: لااله الا الله، دەیکەم بەبەڵگەی باوەڕو شایەتیت بۆ ئەدەم لەلای خودا لەسەر ئەوە کە تۆ ئەم ووشە پیرۆزەیەت قەبووڵ کردووە، بەڵام ئەبو جەهل‌و عەبدوڵڵا – کەلەو کاتەدا لەوێ بوون – چوونە بن کلێشەیی‌و پێیان گوت: ئەی ئەبو طالیب! دەتەوێ لە ئایینی عەبدولموطەلیب‌و باو باپیری خۆت لابدەیت‌و حاشای لێ بکەیت؟ ئیتر ئەمانە گەلێ قسەیان لەم بارەیەوە لەگەڵ دا کردو دڵیان سارد دەکردەوە، هەموو جارێ کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت) دەی دا بە گوێی دا کە شایەتمان بێنێ ئەوانیش وەك شمڵی شەڕ بەر پەرچیان دەدایەوەو دووبارە ئەیانگوتەوە: ئای حاشا دەکەی لە میللەت‌و ئایینی باوو باپیری خۆت، هەتاکوو دوا قسەی ئەوەبوو گوتی پێیان: کە ئەو لەسەر ئایینی عەبدولموطەلیبی باوکێتی، وە قاییل نەبوو کەبڵێ: لاالــة الا الله. ئیتر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت) فەرمووی: ئەدیی بە خودا هەر بۆت ئەپاڕێمەوەو داوای لێخۆش بوونت لەخودا بۆ دەکەم، بەمەرجێ خودا ئەوە قەدەغە نەکا لێم، جا خودای گەورەو مەزن ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە، کە ئەفەرموێ: ما کان للنبی.. تا کۆتایی ئایەت (ش).

---

[٢٠] بخاري. تفسير: ٤٨٧٥ ، (تةجريد / ٢ ل / ٦٥ ذ / ٦٤٥ ، ٣٨٨٤ ، ٤٦٧٥ ، ٤٧٧٢ ، ٦٦٨١). مسلم. إيمان: ١٣١.

٣٩١٢- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَذُكِرَ عِنْدَهُ عَمُّهُ أبو طالب فَقَالَ: لَعَلَّهُ تَنْفَعُهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيُجْعَلُ فِي ضَحْضَاحٍ مِنَ النَّارِ، يَبْلُغُ كَعْبَيْهِ، يَغْلِي مِنْهُ دِمَاغُهُ[٢١].

ئەبو سەعیدی خودری (خۆشنوودی خودای لێ بێ) گوتی: لە خزمەتی حەزرەتا (درووودی خودای لەسەر بێت) باسی ئەبو طالیبی مامەیان کرد، فەرمووی: هیوام هەیە کەلە ڕۆژی ژینەوە دا تکاو شەفاعەتی من سوودی هەبێ بۆی، سا بەشکوو بخرێتە ناو ئاگرێکی تەنکەوە، دەگاتە قولەپێی، وەلێ مێشکی دەکوڵێ پێی (ش).

٣٩١٣- عن الْعَبَّاسُ بْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أنه قَالَ يا رسول الله هل نفعت أبا طالبٍ بشيءٍ؟ فَإِنَّهُ كَانَ يَحُوطُكَ وَيَغْضَبُ لَكَ. قَالَ: نعم، هُوَ فِي ضَحْضَاحٍ مِنْ نَارٍ، وَلَوْلاَ أَنَا لَكَانَ فِي الدَّرَكِ الأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ. وفي رِوايَةٍ: قال: نعم، وجدته في غمراتٍ من النَّار، فأخرجتُه إلى ضحضاحٍ. روى هذه الثلاثة الشيخان[٢٢].

عەبباسی کوڕی عەبدولموطەلیب (ڕەزای خودای لەسەر بێت) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا هیچ کەڵك و سودێکت هەبوو بۆ ئەبو طالیب؟ چونکە بەڕاستی ئەو زاتە لە کاتی خۆیدا داڵدەی تۆی دەداو لەسەری دەکردیتەوە فەرمووی: بەڵی، وا لە ناو ئاگرێکی تەنکدا، خۆ ئەگەر من نە بوومایە جێگەی چینی بن بنەوەی دۆزەخ دەبوو! لە گێڕانەوەیەکا: بەڵێ خۆی لە ناو گێژاوو نیرینەی ئاگرەکەدا بوو، بەلاّم من لەوێ دەرم هێناو بردمە ناو تەنکایی ئاگرەکەوە! (ش):

نەمەی نووسیمان قسەی کتێبە
کتێبی حل بووش قسەی حلێبە!

---

[٢١] تەجریدي بوخاري بەکوردی / ٤ ل / ٢٠١ ذمارة / ١٥٥١ / ٣٨٨٥ ، ٦٥٦٤. مسلم. إيمان: ٥١٢+٥٠٩-٥١٢.

[٢٢] بخاري (تەجريد) / ٤ ل / ١٩٩ رقم / ١٥١٠ ، ٣٨٨٣ ، ٦٢٠٨ ، ٦٥٧٢. مسلم. إيمان: ٥٠٩-٥١٢.

لێ، دانەر-گۆڕی کەیلی ڕەحمەت بێ-

مەیلی لە وەیە: ئەهلی ڕەحمەت بێ

منیش وەک فەقێی ئەم باش مەلایە

ڕەحمەتم دەوێ بۆ هەموو لایە!!

ڕەزای خـــــودایی ئەوەنـــــدە زۆرە!

نەک بەسەدانە، بەهەزار جۆرە!

مەر لە ژێر خاکا پەی پێ بەرین

ئێمە تا نەمرین زۆر بێ خەبەرین!

بەدنمەکییە بۆ ئێمەی ئوممەت

قسەی خێر نەکەین بۆکەسی حەزرەت

درودو سـەلام لـەخۆی و خزمی

هەر لە بەرزیی بن، نەکەونە نزمی!

ئەی لەنووری خوا دروستکراو تۆ

ئەی لەگوڵ جوانتر شێوەو ڕەنگ و بۆ

لەبەر بێ کەسی لێم هەڵسا بۆ سۆ

گشت لێم تۆراون، قوربان! ئەتۆ بۆ!

تۆ بۆی بۆ گشت لادەچیت و دەڕۆی

بۆ شادی ژینمان مانگی ئۆی ناسۆی

بەرۆژ نێرگسی و بەشەویش شەوبۆی

خۆم هەستم پەستە بۆیە ناکەم بۆی

لەبەر خاتری خزم و خۆیشی تۆی

بۆ جەژنم ببە بە مانگی نۆ بۆی!!

بەڵکوو لەسایەی خودای فەڕدارمان

ڕۆژی ڕووت هەڵ بێ لەگۆڕی تارمان

نووری کۆتایی ژینی پڕ لە ژان

بکا بە شایی جەژنی ڕەمەزان!!

٣٩١٤- عَنْ علي (رضي الله عنه) قال: سمعت رجُلاً يستغفر لأبويه وهُما مُشركان فقُلت له: تَسْتَغْفِرَ لأبويك وهما مشركان فقال: أو ليس أستغفر إبراهيم لأبيه وهو مشركٌ فذكرت ذلك للنبي (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) فنزلت: {مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ}. رواه الترمذي وأحمد والحاكم[٢٣].

عەلی (خودای لێ ڕازی بێت) گوتی: پیاوێ باوكو دایكی بت پەرست بوون، گوێم لێی بوو بۆیان دەپاڕایەوە، منیش پێیم گوت: تۆ باوكو دایكت بتپەرست بوون، چۆن بۆیان دەپاڕێیتەوە، ئەویش گوتی: خۆ باوكی ئیبراهیمیش بت پەرست بووەو كەچی بۆشی پاڕاوەتەوە، جا منیش ئەمەم گێڕایەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێت) ئەوجا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە {مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ} تادوایی كەلە پێشەوە ڕاڤەكەی ڕابورد. (ت – س/ح – س/ص).

٣٩١٥ – عَنْ كَعْبُ بْنُ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قال: لَمْ أَتَخَلَّفْ عَنْ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) فِي غَزْوَةٍ غَزَاهَا قَطُّ إِلاَّ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ غَيْرَ أَنِّي قَدْ تَخَلَّفْتُ فِي غَزْوَةِ بَدْرٍ وَلَمْ يُعَاتِبْ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) أَحَدًا تَخَلَّفَ عَنْهُ إِنَّمَا خَرَجَ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) وَالْمُسْلِمُونَ يُرِيدُونَ عِيرَ قُرَيْشٍ حَتَّى جَمَعَ اللَّهُ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ عَدُوِّهُمْ عَلَى غَيْرِ مِيعَادٍ. وَلَقَدْ شَهِدْتُ مَعَ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) لَيْلَةَ الْعَقَبَةِ حِينَ تَوَاثَقْنَا عَلَى الإِسْلاَمِ وَمَا أُحِبُّ أَنَّ لِي بِهَا مَشْهَدَ بَدْرٍ، وَإِنْ كَانَتْ بَدْرٌ أَذْكَرَ فِي النَّاسِ مِنْهَا، وَكَانَ مِنْ خَبَرِي حِينَ تَخَلَّفْتُ عَنْ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ أَنِّي لَمْ أَكُنْ قَطُّ أَقْوَى وَلاَ أَيْسَرَ مِنِّي حِينَ تَخَلَّفْتُ عَنْهُ فِي تِلْكَ الْغَزْوَةِ وَاللَّهِ مَا جَمَعْتُ قَبْلَهَا رَاحِلَتَيْنِ قَطُّ حَتَّى جَمَعْتُهُمَا فِي تِلْكَ الْغَزْوَةِ. فَغَزَاهَا النَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) فِي حَرٍّ شَدِيدٍ وَاسْتَقْبَلَ سَفَرًا بَعِيدًا وَمَفَازًا وَاسْتَقْبَلَ عدداً كَثِيرًا فَجَلاَ لِلْمُسْلِمِينَ أَمْرَهُمْ لِيَتَأَهَّبُوا أُهْبَةَ غَزْوِهِمْ فَأَخْبَرَهُمْ بِوَجْهِهِمْ الَّذِي يُرِيدُ وَالْمُسْلِمُونَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) كَثِيرٌ وَلاَ يَجْمَعُهُمْ كِتَابُ حَافِظٍ فَقَلَّ رَجُلٌ يُرِيدُ أَنْ يَتَغَيَّبَ يَظُنُّ أَنَّ ذَلِكَ سَيَخْفَى مَا لَمْ يَنْزِلْ فِيهِ وَحْيٌ مِنَ اللَّهِ. وكَانَتْ تِلْكَ الْغَزْوَةَ

---

[٢٣] رواه الترمذي بسند حسن والحاكم بسند صحيح (شرحه).

حِينَ طَابَتِ الثِّمَارُ وَالظِّلاَلُ فَأَنَا إِلَيْهَا أَصْعَرُ، فَتَجَهَّزَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَالْمُسْلِمُونَ مَعَهُ وَطَفِقْتُ أَغْدُو لِكَيْ أَتَجَهَّزَ مَعَهُمْ فَأَرْجِعُ وَلَمْ أَقْضِ شَيْئًا. فَأَقُولُ فِي نَفْسِي أَنَا قَادِرٌ عَلَى ذَلِكَ إِذَا أَرَدْتُ. فَلَمْ يَزَلْ ذَلِكَ يَتَمَادَى بِي حَتَّى اسْتَمَرَّ بِالنَّاسِ الْجِدُّ فَأَصْبَحَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) غَادِيًا وَالْمُسْلِمُونَ مَعَهُ وَلَمْ أَقْضِ مِنْ جَهَازِي شَيْئًا ثُمَّ غَدَوْتُ فَرَجَعْتُ وَلَمْ أَقْضِ شَيْئًا فَلَمْ يَزَلْ ذَلِكَ يَتَمَادَى بِي حَتَّى أَسْرَعُوا وَتَفَارَطَ الْغَزْوُ فَهَمَمْتُ أَنْ أَرْتَحِلَ فَأُدْرِكَهُمْ فَيَا لَيْتَنِي فَعَلْتُ ثُمَّ لَمْ يُقَدَّرْ لِي فَطَفِقْتُ إِذَا خَرَجْتُ فِي النَّاسِ بَعْدَ خُرُوجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَحْزُنُنِي أَنِّي لاَ أَرَى لِي أُسْوَةً إِلاَّ رَجُلاً مَغْمُوصًا عَلَيْهِ فِي النِّفَاقِ أَوْ رَجُلاً مِمَّنْ عَذَرَ اللَّهُ مِنَ الضُّعَفَاءِ وَلَمْ يَذْكُرْنِي النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) حَتَّى بَلَغَ تَبُوكَ فَقَالَ وَهُوَ جَالِسٌ فِي الْقَوْمِ مَا فَعَلَ كَعْبُ بْنُ مَالِكٍ. فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي سَلِمَةَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ حَبَسَهُ بُرْدَاهُ وَالنَّظَرُ فِي عِطْفَيْهِ. فَقَالَ لَهُ مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ بِئْسَ مَا قُلْتَ وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا عَلِمْنَا عَلَيْهِ إِلاَّ خَيْرًا. فَسَكَتَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَبَيْنَمَا هُوَ عَلَى ذَلِكَ رَأَى رَجُلاً مُبَيِّضًا يَزُولُ بِهِ السَّرَابُ فَقَالَ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) كُنْ أَبَا خَيْثَمَةَ. فَإِذَا هُوَ أَبُو خَيْثَمَةَ الأَنْصَارِيُّ الَّذِي تَصَدَّقَ بِصَاعِ التَّمْرِ حِينَ لَمَزَهُ الْمُنَافِقُونَ. فَلَمَّا بَلَغَنِي أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَدْ تَوَجَّهَ قَافِلاً مِنْ تَبُوكَ حَضَرَنِي بَثِّي فَطَفِقْتُ أَتَذَكَّرُ الْكَذِبَ وَأَقُولُ: بِمَ أَخْرُجُ مِنْ سَخَطِهِ غَدًا. وَأَسْتَعِينُ عَلَى ذَلِكَ كُلَّ ذِي رَأْيٍ مِنْ أَهْلِي: فَلَمَّا قِيلَ لِي إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَدْ أَظَلَّ قَادِمًا زَاحَ عَنِّي الْبَاطِلُ حَتَّى عَرَفْتُ أَنِّي لَنْ أَنْجُوَ مِنْهُ بِشَيْءٍ أَبَدًا فَأَجْمَعْتُ صِدْقَهُ وَصَبَّحَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَادِمًا وَكَانَ إِذَا قَدِمَ مِنْ سَفَرٍ بَدَأَ بِالْمَسْجِدِ فَرَكَعَ فِيهِ رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ جَلَسَ لِلنَّاسِ فَجَاءَهُ الْمُخَلَّفُونَ فَطَفِقُوا يَعْتَذِرُونَ إِلَيْهِ وَيَحْلِفُونَ لَهُ وَكَانُوا بِضْعَةً وَثَمَانِينَ رَجُلاً فَقَبِلَ مِنْهُمُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عَلاَنِيَتَهُمْ وَبَايَعَهُمْ وَاسْتَغْفَرَ لَهُمْ وَوَكَلَ سَرَائِرَهُمْ إِلَى اللَّهِ حَتَّى جِئْتُ فَلَمَّا سَلَّمْتُ تَبَسَّمَ تَبَسُّمَ الْمُغْضَبِ ثُمَّ قَالَ تَعَالَ. فَجِئْتُ أَمْشِي حَتَّى جَلَسْتُ بَيْنَ يَدَيْهِ فَقَالَ لِي: مَا خَلَّفَكَ. أَلَمْ تَكُنْ قَدِ ابْتَعْتَ ظَهْرَكَ. قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي وَاللَّهِ لَوْ جَلَسْتُ عِنْدَ غَيْرِكَ مِنْ أَهْلِ الدُّنْيَا لَرَأَيْتُ أَنِّي سَأَخْرُجُ مِنْ سَخَطِهِ بِعُذْرٍ وَلَقَدْ أُعْطِيتُ جَدَلاً وَلَكِنِّي وَاللَّهِ لَقَدْ عَلِمْتُ لَئِنْ حَدَّثْتُكَ الْيَوْمَ حَدِيثَ كَذِبٍ تَرْضَى بِهِ عَنِّي لَيُوشِكَنَّ اللَّهُ أَنْ يُسْخِطَكَ عَلَيَّ وَلَئِنْ حَدَّثْتُكَ حَدِيثَ صِدْقٍ تَجِدُ عَلَيَّ فِيهِ إِنِّي لأَرْجُو فِيهِ عُقْبَى اللَّهِ وَاللَّهِ مَا كَانَ لِي عُذْرٌ

وَاللَّهِ مَا كُنْتُ قَطُّ أَقْوَى وَلاَ أَيْسَرَ مِنِّي حِينَ تَخَلَّفْتُ عَنْكَ. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَمَّا هَذَا فَقَدْ صَدَقَ فَقُمْ حَتَّى يَقْضِيَ اللَّهُ فِيكَ. فَقُمْتُ وَثَارَ رِجَالٌ مِنْ بَنِي سَلِمَةَ فَاتَّبَعُونِي فَقَالُوا: وَاللَّهِ مَا عَلِمْنَاكَ أَذْنَبْتَ ذَنْبًا قَبْلَ هَذَا لَقَدْ عَجَزْتَ فِي أَنْ لاَ تَكُونَ اعْتَذَرْتَ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بِمَا اعْتَذَرَ بِهِ إِلَيْهِ الْمُخَلَّفُونَ فَقَدْ كَانَ كَافِيَكَ ذَنْبَكَ اسْتِغْفَارُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لَكَ. قَالَ: فَوَاللَّهِ مَا زَالُوا يُؤَنِّبُونَنِي حَتَّى أَرَدْتُ أَنْ أَرْجِعَ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَأُكَذِّبَ نَفْسِي ثُمَّ قُلْتُ لَهُمْ: هَلْ لَقِيَ هَذَا مَعِي مِنْ أَحَدٍ؟ قَالُوا: نَعَمْ لَقِيَهُ مَعَكَ رَجُلاَنِ قَالاَ مِثْلَ مَا قُلْتَ فَقِيلَ لَهُمَا مِثْلُ مَا قِيلَ لَكَ، قلت: مَنْ هُمَا؟ قَالُوا: مُرَارَةُ بْنُ الرَّبِيعَةَ الْعَامِرِيُّ وَهِلاَلُ بْنُ أُمَيَّةَ الْوَاقِفِيُّ فَذَكَرُوا لِي رَجُلَيْنِ صَالِحَيْنِ قَدْ شَهِدُوا بَدْرًا فِيهِمَا أُسْوَةٌ فَمَضَيْتُ حِينَ ذَكَرُوهُمَا لِي. وَنَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) الْمُسْلِمِينَ عَنْ كَلاَمِنَا أَيُّهَا الثَّلاَثَةُ مِنْ بَيْنِ مَنْ تَخَلَّفَ عَنْهُ فَاجْتَنَبَنَا النَّاسُ وَتَغَيَّرُوا لَنَا حَتَّى تَنَكَّرَتْ لِي فِي نَفْسِيَ الأَرْضُ فَمَا هِيَ بِالأَرْضِ الَّتِي أَعْرِفُ فَلَبِثْنَا عَلَى ذَلِكَ خَمْسِينَ لَيْلَةً فَأَمَّا صَاحِبَايَ فَاسْتَكَانَا وَقَعَدَا فِي بُيُوتِهِمَا يَبْكِيَانِ وَأَمَّا أَنَا فَكُنْتُ أَشَبَّ الْقَوْمِ وَأَجْلَدَهُمْ فَكُنْتُ أَخْرُجُ فَأَشْهَدُ الصَّلاَةَ وَأَطُوفُ فِي الأَسْوَاقِ، وَلاَ يُكَلِّمُنِي أَحَدٌ وَآتِي رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَأُسَلِّمُ عَلَيْهِ وَهُوَ فِي مَجْلِسِهِ بَعْدَ الصَّلاَةِ فَأَقُولُ فِي نَفْسِي هَلْ حَرَّكَ شَفَتَيْهِ بِرَدِّ السَّلاَمِ أَمْ لاَ ثُمَّ أُصَلِّي قَرِيبًا مِنْهُ وَأُسَارِقُهُ النَّظَرَ فَإِذَا أَقْبَلْتُ عَلَى صَلاَتِي نَظَرَ إِلَيَّ وَإِذَا الْتَفَتُّ نَحْوَهُ أَعْرَضَ عَنِّي حَتَّى إِذَا طَالَ ذَلِكَ عَلَيَّ مِنْ جَفْوَةِ الْمُسْلِمِينَ مَشَيْتُ حَتَّى تَسَوَّرْتُ جِدَارَ حَائِطِ أَبِي قَتَادَةَ وَهُوَ ابْنُ عَمِّي وَأَحَبُّ النَّاسِ إِلَيَّ فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَوَاللَّهِ مَا رَدَّ عَلَيَّ فَقُلْتُ لَهُ: يَا أَبَا قَتَادَةَ أَنْشُدُكَ بِاللَّهِ هَلْ تَعْلَمَنَّ أَنِّي أُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَسَكَتَ فَعُدْتُ فَنَاشَدْتُهُ فَسَكَتَ فَنَاشَدْتُهُ فَقَالَ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. فَفَاضَتْ عَيْنَايَ وعدتُ حَتَّى تَسَوَّرْتُ الْجِدَارَ. فَبَيْنَا أَنَا أَمْشِي فِي سُوقِ الْمَدِينَةِ يقول: مَنْ يَدُلُّ عَلَى كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ فَطَفِقَ النَّاسُ يُشِيرُونَ لَهُ إِلَيَّ حَتَّى جَاءَنِي فَدَفَعَ إِلَيَّ كِتَابًا مِنْ مَلِكِ غَسَّانَ وَكُنْتُ كَاتِبًا فَقَرَأْتُهُ فَإِذَا فِيهِ: أَمَّا بَعْدُ فَإِنَّهُ قَدْ بَلَغَنَا أَنَّ صَاحِبَكَ قَدْ جَفَاكَ وَلَمْ يَجْعَلْكَ اللَّهُ بِدَارِ هَوَانٍ وَلاَ مَضْيَعَةٍ فَالْحَقْ بِنَا نُوَاسِكَ. فَقُلْتُ حِينَ قَرَأْتُهَا: وَهَذِهِ أَيْضًا مِنَ الْبَلاَءِ. فَتَيَامَمْتُ بِهَا التَّنُّورَ فَسَجَرْتُهَا بِهَا حَتَّى إِذَا مَضَتْ أَرْبَعُونَ مِنَ الْخَمْسِينَ وَاسْتَلْبَثَ الْوَحْيُ إِذَا رَسُولُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَأْتِينِي فَقَالَ: النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَأْمُرُكَ

أَنْ تَعْتَزِلَ امْرَأَتَكَ. فَقُلْتُ أُطَلِّقُهَا أَمْ مَاذَا أَفْعَلُ؟ قَالَ: لاَ بَلِ اعْتَزِلْهَا فَلاَ تَقْرَبَنَّهَا وَأَرْسَلَ إِلَى صَاحِبَيَّ بِمِثْلِ ذَلِكَ فَقُلْتُ لاِمْرَأَتِي الْحَقِي بِأَهْلِكِ فَكُونِي عِنْدَهُمْ حَتَّى يَقْضِيَ اللَّهُ فِي هَذَا الأَمْرِ، قَالَ: فَجَاءَتِ امْرَأَةُ هِلاَلِ بْنِ أُمَيَّةَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ هِلاَلَ شَيْخٌ ضَائِعٌ لَيْسَ لَهُ خَادِمٌ فَهَلْ تَكْرَهُ أَنْ أَخْدُمَهُ؟ قَالَ لاَ وَلَكِنْ لاَ يَقْرَبَنَّكِ. فَقَالَتْ: إِنَّهُ وَاللَّهِ مَا بِهِ حَرَكَةٌ إِلَى شَيْءٍ وَوَاللَّهِ مَا زَالَ يَبْكِي مُنْذُ كَانَ مِنْ أَمْرِهِ مَا كَانَ إِلَى يَوْمِهِ هَذَا. قَالَ: فَقَالَ لِي بَعْضُ أَهْلِي لَو اسْتَأْذَنْتَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فِي امْرَأَتِكَ فَقَدْ أَذِنَ لاِمْرَأَةِ هِلاَلٍ أَنْ تَخْدُمَهُ فَقُلْتُ: لاَ أَسْتَأْذِنُ فِيهَا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَمَا يُدْرِينِي مَاذَا يَقُولُ لِي إِذَا اسْتَأْذَنْتُهُ فِيهَا وَأَنَا رَجُلٌ شَابٌّ قَالَ: فَلَبِثْتُ بِذَلِكَ عَشْرَ لَيَالٍ فَكَمُلَ لَنَا خَمْسُونَ لَيْلَةً مِنْ حِينَ نُهِيَ عَنْ كَلاَمِنَا ثُمَّ صَلَّيْتُ صَلاَةَ الْفَجْرِ صَبَاحَ خَمْسِينَ لَيْلَةً عَلَى ظَهْرِ بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِنَا فَبَيْنَا أَنَا جَالِسٌ عَلَى الْحَالِ الَّتِي ذَكَرَ اللَّهُ مِنَّا قَدْ ضَاقَتْ عَلَيَّ نَفْسِي وَضَاقَتْ عَلَيَّ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ سَمِعْتُ صَوْتَ صَارِخٍ أَوْفَى عَلَى سَلْعٍ يَقُولُ بِأَعْلَى صَوْتِهِ: يَا كَعْبَ بْنَ مَالِكٍ أَبْشِرْ فَخَرَرْتُ سَاجِدًا وَعَرَفْتُ أَنْ قَدْ جَاءَ فَرَجٌ. فَآذَنَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) النَّاسَ بِتَوْبَةِ اللَّهِ عَلَيْنَا حِينَ صَلَّى صَلاَةَ الْفَجْرِ فَذَهَبَ النَّاسُ يُبَشِّرُونَنَا فَذَهَبَ قِبَلَ صَاحِبَيَّ مُبَشِّرُونَ وَرَكَضَ رَجُلٌ إِلَيَّ فَرَسًا وَسَعَى سَاعٍ مِنْ أَسْلَمَ قِبَلِي وَأَوْفَى الْجَبَلَ فَكَانَ الصَّوْتُ أَسْرَعَ مِنَ الْفَرَسِ فَلَمَّا جَاءَنِي الَّذِي سَمِعْتُ صَوْتَهُ يُبَشِّرُنِي فَنَزَعْتُ لَهُ ثَوْبَيَّ فَكَسَوْتُهُ إِيَّاهُما بِبِشَارَتِهِ وَاللَّهِ مَا أَمْلِكُ غَيْرَهُمَا يَوْمَئِذٍ وَاسْتَعَرْتُ ثَوْبَيْنِ. فَلَبِسْتُهُمَا فَانْطَلَقْتُ أَتَأَمَّمُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَتَلَقَّانِي النَّاسُ فَوْجًا فَوْجًا يُهَنِّئُونِي بِالتَّوْبَةِ وَيَقُولُونَ لِتَهْنِئْكَ تَوْبَةُ اللَّهِ عَلَيْكَ. حَتَّى دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ فَإِذَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) جَالِسٌ فِي الْمَسْجِدِ وَحَوْلَهُ النَّاسُ فَقَامَ طَلْحَةُ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ يُهَرْوِلُ حَتَّى صَافَحَنِي وَهَنَّأَنِي وَاللَّهِ مَا قَامَ رَجُلٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ غَيْرُهُ. فكنت لاَ أَنْسَاهَا له فَلَمَّا سَلَّمْتُ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ وَهُوَ يَبْرُقُ وَجْهُهُ مِنَ السُّرُورِ قال: أَبْشِرْ بِخَيْرِ يَوْمٍ مَرَّ عَلَيْكَ مُنْذُ وَلَدَتْكَ أُمُّكَ. فَقُلْتُ أَمِنْ عِنْدِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَمْ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ؟ فَقَالَ لاَ بَلْ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ. وَكَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إِذَا سُرَّ اسْتَنَارَ وَجْهُهُ كَأَنَّ وَجْهَهُ قِطْعَةُ قَمَرٍ وَكُنَّا نَعْرِفُ ذَلِكَ. فَلَمَّا جَلَسْتُ بَيْنَ يَدَيْهِ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ مِنْ تَوْبَتِي أَنْ أَنْخَلِعَ مِنْ مَالِي صَدَقَةً إِلَى اللَّهِ وَإِلَى رَسُولِهِ فَقَالَ: أَمْسِكْ بَعْضَ مَالِكَ فَهُوَ

خَيْرٌ لَكَ. فَقُلْتُ: إِنِّي أُمْسِكُ سَهْمِيَ الَّذِي بِخَيْبَرَ. وَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ إِنَّمَا أَنْجَانِي بِالصِّدْقِ وَإِنَّ مِنْ تَوْبَتِي لاَ أُحَدِّثَ إِلاَّ صِدْقًا مَا بَقِيتُ، قَالَ: فَوَاللَّهِ مَا عَلِمْتُ أَنَّ أَحَدًا مِنَ الْمُسْلِمِينَ أَبْلاَهُ اللَّهُ فِي صِدْقِ الْحَدِيثِ مُنْذُ ذَكَرْتُ لِلنَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) إِلَى يَوْمِي هَذَا أَحْسَنَ مِمَّا أَبْلاَنِي اللَّهُ بِهِ. وَاللَّهِ مَا تَعَمَّدْتُ كَذْبَةً مُنْذُ قُلْتُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) إِلَى يَوْمِي هَذَا وَإِنِّي لأَرْجُو أَنْ يَحْفَظَنِيَ اللَّهُ فِيمَا بَقِيَ، قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ (لَقَدْ تَابَ اللَّهُ عَلَى النَّبِيِّ وَالْمُهَاجِرِينَ وَالأَنْصَارِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ الْعُسْرَةِ مِنْ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُ بِهِمْ رَءُوفٌ رَحِيمٌ وَعَلَى الثَّلاَثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُوا حَتَّى إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنْفُسُهُمْ وظنّوا أن لا ملجأ من الله إلاّ إليه ثمّ تاب عليهم ليتوبوا إنّ الله هوَ التّواب الرَّحيم. يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِينَ) قَالَ كَعْبٌ: وَاللَّهِ مَا أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيَّ مِنْ نِعْمَةٍ قَطُّ بَعْدَ إِذْ هَدَانِي اللَّهُ لِلإِسْلاَمِ أَعْظَمَ فِي نَفْسِي مِنْ صِدْقِي رَسُولَ اللَّهُ (صلى الله عليه وسلم) أَلاَ أَكُونَ كَذَبْتُهُ فَأَهْلِكَ كَمَا هَلَكَ الَّذِينَ كَذَبُوا فَإِنَّ اللَّهَ أَنْزَلَ الْوَحْيَ فيهم بِشَرَّ مَا قَالَ لأَحَدٍ، قَالَ: (سَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَكُمْ إِذَا انْقَلَبْتُمْ إِلَيْهِمْ لِتُعْرِضُوا عَنْهُمْ فَأَعْرِضُوا عَنْهُمْ إِنَّهُمْ رِجْسٌ وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ. يَحْلِفُونَ لَكُمْ لِتَرْضَوْا عَنْهُمْ فَإِنْ تَرْضَوْا عَنْهُمْ فَإِنَّ اللَّهَ لاَ يَرْضَى عَنِ الْقَوْمِ الْفَاسِقِينَ). رواه الشيخان والترمذي. وفي رواية: فَاجْتَنَبَ النَّاسُ كَلاَمَنَا، فَلَبِثْتُ كَذَلِكَ حَتَّى طَالَ عَلَيَّ الأَمْرُ، وَمَا مِنْ شَيْءٍ أَهَمُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أَمُوتَ فَلاَ يُصَلِّي عَلَيَّ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) أَوْ يَمُوتَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَأَكُونَ مِنَ النَّاسِ بِتِلْكَ الْمَنْزِلَةِ، فَلاَ يُكَلِّمُنِي أَحَدٌ مِنْهُمْ، وَلاَ يُصَلِّي عَلَيَّ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَوْبَتَنَا عَلَى نَبِيِّهِ (صلى الله عليه وسلم) حِينَ بَقِيَ الثُّلُثُ الآخِرُ مِنَ اللَّيْلِ، وَهُوَ عِنْدَ أُمِّ سَلَمَةَ، وَكَانَتْ مُحْسِنَةً فِي شَأْنِي مَعْنِيَّةً فِي أَمْرِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَا أُمَّ سَلَمَةَ تِيبَ عَلَى كَعْبٍ. قَالَتْ: أَفَلاَ أُرْسِلُ إِلَيْهِ فَأُبَشِّرَهُ قَالَ: إِذًا يَحْطِمَكُمُ النَّاسُ فَيَمْنَعُونَكُمُ النَّوْمَ سَائِرَ اللَّيْلَةِ. حَتَّى إِذَا صَلَّى النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) صَلاَةَ الْفَجْرِ آذَنَ بِتَوْبَةِ اللَّهِ عَلَيْنَا، وَكَانَ إِذَا اسْتَبْشَرَ اسْتَنَارَ وَجْهُهُ حَتَّى كَأَنَّهُ قِطْعَةٌ مِنَ الْقَمَرِ[٢٤].

---

[٢٤] تجريد البخاري: ٤ ل / ٣٧٥ رقم: ١٦١٩ / ٤٤١٨ ، ٢٧٥٧ ، ٢٩٤٧ ، ٢٩٤٩ ، ٢٩٥٠ ، ٣٠٨٨ ، ٣٥٥٦ ، ٣٨٨٩

کەعبی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێبێت) دەڵێ: جگە لە غەزای تەبووك لەهیچ غەزایەکی تردا لەپێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) دوانەکەوتووم و لەهەموو غەزاکانی دا لەخزمەتی دا بووم، وەلێ لەغەزای بەدریشدا لەخزمەتی دا نەبووم بەڵام لەم غەزایەدا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت) گلەیی لەوانە نەکرد کە لەم غەزایە دواکەوتبوون، چونکە پێغەمبەرو موسوڵمانان لەم غەزایەدا کە دەرچوون لەماڵ مەبەستیان کردنی ئەم غەزایە نەبوو، بەڵکوو مەبەستیان گرتنی کاروانەکەی قوڕەیش بوو، کە بەماڵێکی بازرگانی زۆرەوە لەشام گەڕابوونەوە، بەڵام ئەوەبوو کە خودا بەبێ وادە لەگەڵ دوژمنی خۆیاندا بەرەنگاری یەکتری کردن و ئاو قەدی یەك بوون، وەمن لەشەوەکەی عەقەبەدا لە خزمەتی پێغەمبەردا بووم (دروودی خودای لەسەر بێت) لەوکاتەدا کە پەیمانمان لەگەڵی دا بەست لەسەر ئیسلامەتی، وەمن بەش بەحاڵی خۆم لەدڵ و باوەڕی خۆما خێرو گەورەیی ئەم شەوە ناگۆڕمەوە بەفەزڵی حازربوونی غەزای بەدر، هەرچەند لەناو خەڵکا غەزای بەدر بەناوبانگترە لەمشەوی عەقەبەیە، لەراستی دا ئەوکاتە کە لەغەزای تەبووك دواکەوتم و لە پێغەمبەر بەجێمام هەرگیز وەك ئەوکاتە ئاوا بەهێزو تەواناو دەستڕۆییوو بەتفاق نەبووم، بەخودا لەوەپێش هەرگیز دوو وڵاخی سواریم پێکەوە نەبووە، بەڵام لەکاتی ئەو غەزایەدا دوو وڵاخم هەبوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) کەچوو بۆئەم غەزایە کات جەنگەی گەرما بوو، ڕێگەیەکی دوورو درێژی گرتە بەرو ڕووی کردە بیابانێکی وشك و برینگ و بەرەو دوژمنێکی زۆرو بێشومار کەوتە ڕێ، جا لەبەر ئەوە لەپێش دا هەموو شتێکی بەباشی ڕوون کردەوە بۆ موسوڵمانان و پێی گوتن کەدەیەوێ بچێ بۆ کوێ، هەتا تفاقی جەنگ بخەن و کەرەستەی پێویست ئامادە بکەن بۆ غەزاکەیان، سوپای موسوڵمانانیش (کەلەم غەزایەدا لەخزمەتی حەزرەتدا بوون) لەبەر زۆری لەژمارە نەدەهاتن و دەفتەرو تۆمار نەیدەگرتن. لەبەرئەوە ئەگەر کەسێ بیویستایە کەخۆی

---

، ٣٩٥١ ، ٤٦٧٣ ، ٤٦٧٦ ، ٤٦٧٧ ، ٤٦٧٨ ، ٦٢٥٥ ، ٦٦٩٠ ، ٧٢٢٥. مسلم. توبة: ٦٩٤٧.

بشارێتەوەو نەچێ بۆئەو غەزایە وایدەزانی کە کەس پێی نازانێ، مەگەر تاك و تەرا، مەگەر لەحاڵەتێکدا پێی بزانن کەخودا سرووش نازڵ بکا دەربارەی! کە ئەم غەزایە ڕووی دا جەنگەی مێوەبوو، بەرسێبەر تەواو خۆش بوو بوو منیش خۆم لەخۆما حەزم لەشتی وایەو حەز دەکەم کەبەدەستی خۆم بەری باخ و ڕەزبڕنم، جا پێغەمبەرو موسوڵمانان (دروودی خودا لەحەزرەت و ڕەزای خودا لەوان بێ) تفاقیان خست، منیش دەمویست بچم تفاق بخەم لەگەڵیان بەلاّم دەگەڕامەوەو هیچم نەدەکرد، وە لەدڵی خۆم دا دەمگوت: ئاسانە هەرکاتێ بمەوێ دەتوانم تفاق بخەم، ئیتر ئەم دڵەڕاوکێیەم درێژەی کێشا تا خەڵکەکە بەگەرمی پەلاماری تفاق خستنیان دا، وەلێ من هیچم دیار نەبوو تا ڕۆژێ پێغەمبەرو موسوڵمانان سەرلەبەیانەکی کەوتنە ڕێ، منیش لەگەڵیان دەرچووم بەلاّم بەبێ تفاق، وەلە دوایی دا خۆم دزییەوەو گەڕامەوەو نەچووم، ئیتر ئەم ڕاڕاییەم درێژەی کێشا هەتا ئەوان خێرا دوورکەوتنەوەو غەزاکەم لەکیس چوو هەرچەند تاماوەیەکیش نیازم هەبوو کەبڕۆم شوێنیان بکەوم تاپێیان دەگەم بەلاّم ئەوەشم لەچارە نەنوسرابوو خۆزگەم ئەوەم بکردایە، جا (لەپاش ئەوە کەپێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) ڕۆیشت) هەرچەند دەچوومە دەرەوەو دەچوومە ناو خەڵك تەواو پەشیمان دەبوومەوەو خەم دایدەگرتم، چونکە کەتەماشام دەکرد کەسێکی وام نەدەدی کەبیکەم بە سەرمەشق بۆخۆم جگە لە وانە کەتانەی نیفاقیان لێ دەدان و گومانی ناپاکییان لێ دەکراو تانە لەشوێن بوون! تەنیا ئەو بێهێزو لازەبوونانە نەبێ، کە خودای گەورە بەهانەو عوزری ئەوانی قەبووڵ کردووەو هەقی داونەتێ، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) باسی من ناکا هەتا دەگاتە تەبووك، جا لە تەبووك لەودەمەدا کەلەناو کۆڕی موسوڵماناندا دادەنیشت دەفەرموێ: دەبێ کەعبی کوڕی مالیك خەریکی چی بێ واتە: بۆ نەهات بۆئەم غەزایە! پیاوێکی بەنی سەلەمەیی دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە لەخۆی بایی بووەو دەعیەی نایەت بێ بۆ غەزاو هەرسەرنجی جلەکانی دەداو بەپەلە پیتکە خۆی دەتەکێنێ! موعازی کوڕی جەبەلیش پێی دەڵێ: قسەیەکی نابەجات کرد،

بەخودا ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوەی باش نەبێ لەوپیاوەمان نەدیوە، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) بێ دەنگ دەبێ، تا لەوکاتەدا لەدوورەوە تارمایی پیاوێ دەبینێ، لەناو سەراب (بەردەخوێ) دا کەروێشکە دەکا، دەفەرموێ: دەی ئەم زەلامە ئەبو خەیسەمەبێ! جا کە دێتە بەرەوە خۆی دەبێ، ئەم ئەبو خەیسەمەیە ئەو پیاوە ئەنصارییە بوو کەمەنێ خورمای کردبوو بەخێر، وە مونافیق (ناپاك)ەکان تەوسیان پێ کردبوو لەسەر ئەوە لەقەمیان لێی گرتبوو، جا کاتێ کەهەواڵم زانی وا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) خەریکە دەگەڕێتەوەو لە تەبووك دێتەوە خەمو پەژارە دایگرتم، وە دەستم دایە درۆ ڕێکخستن، وە دەمگوت: سبەینێ بەچی خۆم، رزگار بکەم لەعاجز بوونو ڕەنجاندنی دڵی پێغەمبەر، وەبۆئەمە پرسو ڕام بە هەموو کەسێکی خاوەن ڕاو تەگبیر کرد لە کەسو کاری خۆم. جا هەر لەگەڵ گوتیان ئەوا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت) گەیشتە بەرەوە ئەم خەیاڵانە پڕوپووچانە لەدڵم ڕەوینەوەو بەرچاوم ڕۆشن بۆوەو زانیم کەبەدرۆ سازکردن لەدەستی رزگارم نابێ، جالەبەر ئەوە بڕیارم دا چی ڕاستو ڕەوانە ئەوەی عەرز بکەم، جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت) سەر لە بەیانییەك تەشریفی هاتەوە، دەستووری وابوو کەلەسەفەر دەگەڕایەوە لەپێشدا دەچوو بۆ مزگەوت دوو ڕکات نوێژی سوننەتی لێ دەکرد، ئنجا لەوێ دادەنیشت بۆ پێشوازی خەڵك، جا کەئەمەی کرد ئەوکاتە دواکەوتووەکان (واتە ئەوانەی نەچووبوون بۆئەم غەزرایەو خۆیان دزی بۆوە) بەرودوا چوون بۆ خزمەتیو دەستیان کرد بەپاکانە کردن بۆیو کەمو زۆر بیانووو بەهانەیان دەدۆزیەوە بۆی ژمارەی ئەمانە لەهەشتا زەلام پتر بوو، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێت) بەڕواڵەت ئەم بەهانەیەی لێ وەرگرتنو پەیمانی بەست لەگەڵیانداو بۆیان پاڕایەوەو ڕازو نهێنیی دڵیشیانی ڕوو بەڕووی خودای گەورە کردەوە، جامنیش ڕۆیشتم بۆ خزمەتیو سڵاوم لێی کرد وەکوو مرۆڤێکی کەمێ زویرو عاجزو زیز زەردەخەنەیەکی واتاداری کردو فەرمووی: وەرە منیش چوومە بەرەوە تا لە بەردەمیا دانیشتم فەرمووی پێم: لەم سەفەرە بۆچی پاشکەوتی، خۆ تۆ

لای خۆت ولاخت کڕیبوو بۆ خەباتگێڕان! منیش عەرزیم کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! خودا گوساخیو دەمـوپلێکی وای داوە پێم ئەگەر لەخزمەتی تۆدا نەبوومایەو لەلای هەرکەسێکی تر بوومایە لەخەڵکی ئەم سەرزەمینە دەمتوانی بەقاڵەی دەمو بەعوزرو بەهانەو درۆ خۆم قوتار بکەم لەدەستی، بەڵام بەخودا من باش دەزانم ئەگەر ئەمڕۆش لەخزمەتتا قسەیەکی درۆت بۆبکەمو بەوە لەخۆمت ڕازی بکەم دوور نییە کەخودا تووڕەو عاجزت بکا لێمو ئەوەندەی تر باری خۆم گرانتر بکەم، وەئەگەر قسەی ڕاستیشت بۆبکەم (هەرچەند لەوانەیە کەئێستا تۆبەو قسەیە لێم دڵگران ببی) بەڵام لەڕاستی ڕەحمەت دەبارێ، سەرەنجام ئومێد دەکەم کەلەلای خودا بەگوتنی ڕاستیو پێنان لە هەق ڕزگارم ببێ! ئەوی ڕاست بێ بەخودا هیچ بەهانەم نەبوو، بەخودا هەرگیز وەك ئەمجارە ئاوا تەواناو دەوڵمەند نەبووم، بەڵام چارەنووس وابوو کەلەم سەفەرە دا لەتۆ دوابکەوم حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێت) فەرمووی: ئەمە ڕاست دەکا، دەی هەستە بڕۆ هەتا بزانین خودا چی دەفەرموێت جامنیش هەڵسامو کۆمەڵێ لەپیاوانی بەنی سەلەمە شوێنم کەوتنو سەرزەنشتیان کردمو گوتیان: بۆچی تۆیش وەك ئەو دواکەوتووانەی تر عوزرت نەهاوردەوە بۆی، دەستەڵاتی ئەوەندەیشت نەبوو، چونکە ئەم گوناهەی تۆ ئەوەندەی بەس بوو کەپێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت) داوای لێ خۆشبوونت لەخودا بۆبکا، وەگوتیان: بەوخودایە لەپێش ئەمەدا ئاگامان لێت نییە کە گوناهی ترت کردبێ، کەعب گوتی: بەخودا ئەوەندەیان سەرزەنشت کردم تەنانەت خەریك بووم بگەڕێمەوە بۆلای پێغەمبەرو خۆم بەدرۆ بخەمەوە، بەڵام لەپاش دا پێم گوتن: ئایا کەسی تر لەگەڵ مندا ئاوای بەسەر هاتووە؟ گوتیان: بەڵێ دوو پیاوی تریش هەمان شتیان بەسەر هاتووە، تۆچیت گوتووە ئەوانیش هەرئەوەیان گوتووە، وەبەتۆچی گوتراوە بەوانیش هەر ئەوەگوتراوە، گوتم: کێو کێن؟ گوتیان: مەرارەی کوڕی ڕەبیعەی ئەل-عامیریو هیلالی کوڕی ئومەییەی ئەل-واقیفی، کەناوی ئەم دوو پیاوە باشەیان بۆم هێنا کەمێ سەبووریم بۆهاتو ڕوانیم ئەم دووە دەست دەدەن

بۆئەوە کەبیانکەم بەسەرمەشق و پێشەوای خۆم و چاویان لێبکەم، ئیتر ڕۆیشتم و نەگەڕامەوە بۆخزمەتی حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێت) چونکە ئەم دووانە موسوڵمانی ساغ بوون و ئامادەی غەزای بەدر بوو بوون! جا حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێت) موسوڵمانەکانی قەدەغەکرد لەوەی کە قسە بکەن لەگەڵ ئێمەدا کەئەم سێکەسە بووین و بەس، بەڵام قسەو گفتوگۆی لەگەڵ دواکەوتووەکانی تردا قەدەغەنەکرد، ئیتر خەڵکی هەموو دوورەپەرێزیان لێگرتین و لەگەڵمانا، گۆڕان بەجۆرێ دنیام لەلاتاریك و تەنگ بوو لەوجیهانەی لەوەپێشی نەدەکرد! جا لەسەر ئەم حاڵە تاڵە پەنجا شەوی دەق ماینەوە، هەردوو هاوڕێکەم دۆش دامابوون و لەماڵەوەیان دادەنیشتن و کورووشکەیان دەکردو دەگریان، بەڵام من کەلەوان لاوتر بووم چالاکتربووم، دەڕۆیشتم لەگەڵ موسوڵمانانا نوێژم دەکردو بەبازاڕا دەگەڕام، بەڵام کەس قسەی لەگەڵمدا نەدەکرد، لەپاش نوێژ دەڕۆیشتم بۆ کۆڕی دانیشتنی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت) سڵاوم لێی دەکرد، لەدڵی خۆمدا دەمگوت: ئایا لێوی جوڵاند بۆ وەڵامی سڵاوەکەم یانا!! وەجار بەجار لەنزیکی حەزرەتەوە نوێژم دەکردو بەدزییەوە لەژێرەوە سەرنجیم دەدا، کاتێ ڕووم دەکردە سوجدەگاکەم ئەو بەلاچاوی بۆمی دەڕوانی وەکاتێ من بە گۆشەی چاو بۆ ئەوم دەڕوانی ئیتر ئەولای تێدەکردم و بەقنگەچاو تەماشای نەدەکردم، لەسەر ئەم حاڵەماوەیەکی زۆر مامەوەو جەخارێکی زۆرم خورادو جەفایەکی زۆرم کێشا لە لووتەلایی موسوڵمانان هەتا ڕۆژێ گەیشت بەگیانم و ڕۆیشتم بەشوورای باخەکەی ئەبو قەتادەی ئامۆزامدا هەڵزنیم (ڕەنگ بێ بۆیە پیا هەڵزنیبێ دەرگاکەی لێ نەکردبێتەوە -وەرگێڕ) کە ئەم پیاوە خۆشەویسترین کەسم بوو کەسڵاوم لێ کرد بەوخودایە وەڵامی سڵاوەکەمی نەسەندەوە، جاگوتم: ئەی ئەبو قوتادە! توخودا ئایا دەزانیت کەوامن خوداو پێغەمبەری خودام خۆش دەوێ، کەچی نقەی نەکرد، دووبارە سوێندم دایەوە هەر نقەی نەکرد، سێبارە کەسوێندم دایەوە بەس ئەوەندەی گوت: خوداو پێغەمبەری خودا باشتری لێدەزانن! ئیتر ئاو بەچاوەکانمدا هاتە خوارەوەو بەرەو دوا گەڕامەوەو

بەدیواری باخەکەدا هەڵزنیمەوە. ڕۆژێ لەڕۆژان لە بازاڕدا دەسووڕامەوە، تەماشام کرد وا جوتیارێ (لە نەبەتییەکانی خەڵکی شام کەخواردەمەنی و شتی وا دەهێنن بۆشاری مەدینەو لەوێ دەیگۆڕنەوەو دەیفرۆشن) پرسیاری من دەکاو دەڵێ: کێ کەعبی کوڕی مالیکم پێ نیشان دەدا، خەڵکەکەش بەئیشارەت منیان پێی نیشان دا، جاهات بۆلامو کاغەزێکی داپێم، شای غەسسان نوسیبووی بۆم، منیش خۆم خوێندەوارم کەخوێندمەوە ئەمەی تیادا نوسرابوو: "لەپاش ئەمە کەبیستومانەتەوە کەهاوڕێکەت (واتە: پێغەبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) لێت لووتەلایە تۆیش خودا بێلانەو بێ داڵدەی نەکردوویت بفەرموو وەرە بۆلای ئێمە تا دڵنەواییت بکەین و قەدرو ڕێزو نازت بگرین، منیش کەخوێندمەوە گوتم: ئەمەیش سەرەڕای دەردی خۆم بەلاو مەینەتێکی ترە، جا چوومەوە لەماڵەوە نامەکەم خستە ناو تەندوورو سووتاندم، جاکە لەپەنجا شەوەکە چل شەوی ڕۆیشت فرستادەی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت) هات بۆلام گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) فەرمانت پێ دەکا کەلەژنەکەت دوورکەویتەوە، منیش گوتم: واتە تەلاقی بدەم یا چی لێ بکەم؟ گوتی: نەء، تەلاقی مەدە بەس توخنی مەکەوەو نزیکی مەبەرەوە، لەهەمان کاتدا هەمان فەرمایشتی کرد بەهەردوو هاوڕێکانم، منیش ژنەکەمم ناردەوە بۆماڵی باوکی و گوتم: بچۆرەوە بۆماڵی باوانت و لەوێ بە، هەتا بزانین خودا چی دەفەرموێ، کەعب گوتی: بەلام ژنەکەی هیلالی کوڕی ئومەییە چوو بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! هیلال ئیختیارێکی کەفتەکارەو نۆکەریشی نییە کەخزمەتی بکا خۆپێت ناخۆش نییە کەمن خزمەتی بکەم فەرمووی: نەء، بەلام توخنت نەکەوێ ژنەکە گوتی: خۆ بەخوا تاقەتی سەرجێیی و شتی وای نەماوە، وەبەخودا لەو ڕۆژەشەوە ئەم کارەی لێ قەوماوە هەتا ئەمڕۆ سەرو مڕ هەردەگری! جا خێزانەکەی منیش بەمنیان گوت: بۆچی تۆش عەرزی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت) ناکەیت کەژنەکەت پێ بداتەوە، خزمەتت بکا، ئەوەتا ڕێگەی ژنەکەی هیلالی داوە کەخزمەتی بکا، گوتم: داوای شتی واله حەزرەت (دروودی خودای لەسەر

بێت) ناکەم، یەکەم لەبەرئەوەی کێ دەڵێ ئەگەر ڕووی ئەوەی لێ بنێم ژنەکەم دەداتەوە، دووەمیش من پیاوێکی گەنجمو دەتوانم خۆم خزمەتی خۆم بکەمو، دەشترسم کەنەفسو هەوەسی خۆمم پێ زەوت نەکرێو توخنی ژنەکەم بکەومو تووشی گوناح ببم، کەعب (ڕەزای خودای لەسەر بێت) گوتی: لەسەر ئەم حاڵەیش دە شەوی تریش ماینەوە، بەم پێیە لەوکاتەوە کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت) قەدەغەی کرد کەمەردوم قسەمان لەگەڵ بکەن پەنجا شەوی دەقمان تەواو کرد، جا بۆ بەیانی شەوی پەنجاهەم لەسەر سەربانی خانوویەکی خۆمان نوێژی بەیانیم دەکرد، وەلە سەر ئەو حاڵە دانیشتبووم، لەگیانی خۆم وەڕس بوومو گیانی خۆمم لی بوو بوو بە بارو گۆی زەویو سەر ڕووی زەوی بەو هەموو گەورەیی و گوشادیەی خۆیەوە لەبەرچاوم تەنگو تروسك بوو بوو، لەم کاتی سەبای صەڵحانەداو لەم حاڵی دڵتەنگیەدا دەنگی چرپندەیەکم بەرگوێ کەوت لە دوورەوە دەهات، کەسەرکەوتبووە سەرکێوی سەلع وە بە هەموو هێزی خۆی بانگی دەکرد: ئەی کەعبی کوڕی مالیك! موژدەت لێ بێ، ئیتر یەکسەر لەپەو ڕوو کەوتمو سەجدەو کوڕنووشی سوپاسی خودام بردو زانیم کە خودا دەرووی میهرەبانی خۆی کردۆتەوە بۆمان، وە حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێت) لە پاش نوێژی بەیانی ئەو ڕۆژە، ڕادەگەیەنێ کە خودا تەوبەی ئێمەی قەبووڵ کردووە، جا خەڵکی دەستە دەستە دەهاتن موژدەیان پێ دەدایین، وە چەند کەسێ مژدە دەبەن بۆ هەردوو هاوڕێکەم دوو پیاویش مژدەیان دا بە من: پیاوێکیان ماینەکەی غار دەدا بەرەو من، ئەویتریشیان لە ئەسڵەمەوە ڕادەکاو سەر دەکەوێتە سەرچیای سەلعو لەوێوە پڕ بە دەم بانگ دەکا: ئەی کەعب! موژدەت لێ بێ، لەبەر ئەوەی دەنگەکە لە ئەسپەکە خێراتر بوو، دەنگەکە زووتر گەیشت، جا کاتێ کابرای خاوەن دەنگ گەیشتە لام جلەکانی خۆمم بۆ داکەندو لە باتی مژدانە،، دامن بەو، جا دوو جلکم لە برادەرێ خواستو لەبەرم کردنو ڕۆیشتم بۆ خزمەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت) برادەران پۆڵ پۆڵ پێم دەگەیشتنو دەهاتن بە پیرمەوەو پیرۆزبایی ی قەبووڵی

تەوبەیان لێ دەکردم: دەیانگوت: پیرۆزت بێ قەبووڵی تەوبە لەلایەنی خوداوە، کـە چـوومە مزگـەوت حـەزرەت (دروودی خـودای لەسـەر بێـت) دانیـشتبوو، خـەڵك لەدەوریدا خەرمانەیان دابوو،، تەلحەی کوڕی عوبەیدیلاه بەهەڕاکردن هات بە پیرمـەوەو تەوقـەو پیرۆزبایی لەگـەڵ کـردم، بە خـودا لـەو زیـاتر لـە کۆچـکاران کەسی تر هەڵ نەساو نـەهات بەپیرمـەوە! ئـەم پیـاوەتی یـەی تەلحـە فـەرامۆش ناکەم. جا کاتێ سلاوم کرد لە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت) ڕووی موبـارەکی لـە خۆشـی یـانـا شـەوق‌و بـەرقی دەداو دەدرەوشـا یـەوەو فـەرمووی: موژدەبـێ لەتۆ، ئەوەتی لە دایك بوویت ڕۆژی وەك ئەمڕۆ ئاوا باش‌و پیرۆزت بە سـەردا نـەهاتووە منـیش عـەرزیم کـرد: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! لەلایـەنی تۆوەیـە یـا لەلایـەنی خوداوەیـە؟ فـەرمووی: نـەء، بـەڵکوو لەلایـەنی خوداوەیـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێت) عادەتی وابوو کە کەیف خۆش دەبوو ڕووی وەك مـانگی چاردە دەدرەوشایەوە، وە ئێمە ئەوەمان دەزانی کە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت) لە حاڵی خۆشی دا ڕوخساری نووری لێ دەبا ری وەك تریفەی مانگەشەو، جاکـە لـە بـەردەمیا دانیشتم گـوتم: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! لـە تـەواو کردنـی تەوبەکەمە کەلە هەموو دارایی خۆم دەسبەردار ببم بۆ موسوڵمانان‌و هـەمووی ببەخـشم بـە خـوداو پێغەمبـەری خـودا. فـەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێت): نـەء، هەندێ لە ماڵەکەت بێڵەرەوە بۆ خۆت باشترە، گـوتم: باشـە، ئـەو پشکەم کەلـە خەیبەردا هەیە ئەوەگل دەدەمەوە بۆ خۆم، وە گـوتم: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! ڕاسـتی منـی ڕزگـارکرد، وە بەشـێ بـێ لەتـەواوی تەوبەکـەم هـەتا مـاوم قسەی ڕاست نەبێ نەیکەم. کەعب (رەزای خودای لێبێت) گوتی: بە خودا کەس گومان نابەم لە موسوڵمانان کە وەك من خودا وا بە جوانی گوتاری ڕاستی پێ بەخشی بـێ لـەو ڕۆژەوە، دیـسان بـە خـودا لـەو ڕۆژەوە کـە ئـەوەم عـەرزی پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسـەر بێت) کـردووە هـەتا ئـەمڕۆ هێـشتا بـە قەسـتی درۆم نـەکردووە، وە ئومێدم هەیـە کـە تامـاوم خـودا بم پـارێزێ. جـا خـودای گـەورەو سـەروەر ئـەم ئایەتەی نارده خوارەوە:

{لَقَد تَّابَ اللهُ عَلَى النَّبِيِّ وَالْمُهَاجِرِينَ وَالأَنصَارِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ الْعُسْرَةِ مِن بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُ بِهِمْ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ - ٩/١١٧-١١٩}.

واتە: خودای گەورە بارانی ڕەحمەتو تەوبەی داباراند بەسەر پێغەمبەرو کۆچکاران و یاریدەدەراندا، ئەوانەی کەلەو کاتە ناسكو نەهاتەدا شوێن پێغەمبەر کەوتن، پاش ئەوە کە نزیك بوو دڵی تاقمێ لەوان لابدا لە ڕێگەی پەیرەوی، وە پاش ئەوە هەم دیسان خودای گەورە سەرەنجام لە بارەی ئەو ووردە خەیاڵاتەوە ئەوانی بەخشیو بارانی میهرو ڕەحمەتو تەوبەی ڕژاند بە سەریاندا، هەروا تەوبەی قەبووڵ کردو ڕەحمەتی ڕژاند بەسەر ئەو سێ کەسە موسوڵمانەدا کە پاش خران لەلایەنی پێغەمبەرەوەو فەرمووی پێیان: هەستە بڕۆ هەتا بزانین خودا چی دەفەرموێ لەبارەی دواکەوتنی تۆوە، وە ئەم سێ کەسە لەو ماوەیەدا تەواو پەرێشان بوون، هەتا وایان لێ هات کە ئەم زەوی یەیان لەسەر تەنگ بوو بەو هەموو گوشادیەوە کە هەیە، وەلە گیانی خۆیان جاڕس بوون وە باوەڕی ڕاستیان هاتە سەر ئەوە کە پشتو پەنا هەر خودایەو پاسارو پەنا لە قاڕی خودا نییە مەگەر لەلای خودا خۆی! سەرەنجام خودا بەکەرەمو نەوازشی خۆی دەرگای تەوبەو بەخششو عەفوی خۆی پێ نیشان دان، وە ئەوانیش ڕوویان کردە قاپی کەرەمی خوداو تەوبەیان کرد، بەڕاستی خودای گەورە تەوبە قەبووڵ کەرەو میهرەبانو بەڕەحمو بەبەزەیی یە. ئەی کەسانێ کە خاوەنی ئیمانن! ئەی موسوڵمانینە! ئەی بڕوادارینە! تەقوای خودا بکەنو هەمیشە لە خودا بترسن، وە بەدڵو بەگیانو بەگوفتارو بەکردار هەمیشە بیکەن بە پیشە لەگەڵ پیاو ڕاستانو ڕاستاڵو ڕاستگۆیاندابن! کەعب (ڕەزای خودای لێبێت) گوتی: بە خودا بەلامەوە لە ژیانما گەورەترین بەهرەو نازو نیعمەتو خەڵاتو بەخشش کە خودای گەورە بەخشیبێتی بە من یەکەم ئەوەیە کە هیدایەتی داوم بۆ قەبووڵ کردنی ئایینی ئیسلامو دووەمیش ئەوەیە کە ئەو ڕۆژە قسەی ڕاستم عەرزی حەزرەت کرد لە ڕەحمەتی خوداوە بوو کە درۆم لە خزمەتیا نەکرد، ئەگینا خوا نەخواستە

منیش وەك درۆکەرەکان بە فەتارەت دەچووم ئەوەتانێ خودای گەورە لە ئایەتی قورئاندا خراپترین هەڕەشەو گوڕەشەی لێ کردوون، لە شانیاندا دەفەرموێ:

{سَيَحْلِفُونَ بِاللّهِ لَكُمْ إِذَا انقَلَبْتُمْ إِلَيْهِمْ لِتُعْرِضُواْ عَنْهُمْ فَأَعْرِضُواْ عَنْهُمْ إِنَّهُمْ رِجْسٌ وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ جَزَاء بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ - ٩/٩٥-٩٦}.

واتە: کاتێ ئێوە گەڕانەوە بۆ لای ئەو ناپاکانە بە درۆ بەگەرمی سوێندی گەورە گەورەتان بۆ دەخۆن و دەڵێن: ئێمە بۆیە نەهاتین بۆ ئەم غەزای تەبووکە چونکە عوزرمان هەبوو، ئەو سوێندانەش بۆیە دەخۆن کە ئێوە گلەیی یان لێ نەکەن و وازیان لێ بێنن، ئێوە واز لەوانە بێنن و لۆمەیان مەکەن، بەڕاستی ئەوانە ناپاکن لە دڵداو لە بیرو باوەڕا نەسوێندیان ڕاستەو نەبەگلەیی و سەرزەنشت بیر دەکەنەوە وەجێگای پاشە ڕۆژیان دۆزەخە لەسزای کردەوە نابارو ناشیرینەکانیاندا، ئەوانە سوێندی درۆتان بۆ دەخۆن بۆ ئەوە کە ئێوە لێیان ڕازی بن، جا ئەگەر ئێوەش لێیان ڕازی بن بەڕاستی خودا لێیان ڕازی نابێ، چونکی ئەوانە لەڕێ دەرچوون و لە یاسای حەق بەدەرن و خودایش ڕازی نابێ لە کۆمەڵی لە ڕێدەرچوو (ش/ت).

لەگێڕانەوەیەکا: ئیتر لەوە بەدواوە موسوڵمانان دەنگیان دابڕی لە گەڵماندا، وە من ماوەیەکی زۆر لەسەر ئەو حاڵە مامەوە هەتا تەواو سەخڵەتی کردم، وەلە هەموو شتێ گرنگتر بەلامەوە ئەوە بوو کە لەوماوەیەدا خوا نەخواستە بمرم و حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێت) نوێژ لەسەر تەرمەکەم نەکا، یا خود حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێت) بمرێ و من لەسەر ئەو حاڵەتە بمێنمەوە لە ناو خەڵکاو کەس قسەم لەگەڵ نەکاو حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێت) نوێژم لەسەر نەکا، تا خودای گەورە – لەکاتی سێیەکی دوایی ی شەودا گیرابوونی تەوبەی ئێمە بە سرووش دەنێرێ بۆ پێغەمبەری خۆی، لەو دەمەدا حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێت) لەلای ئوممو سەلەمە دەبێ، ئوممو سەلەمە ئافرەتێکی زۆر باش بوو لەم کارەی مندا قسەی خێری زۆر دەکردو گەلێ مەبەستی بوو،

**جا پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێت) **دەفەرموێ: ئەی ئوممو سەلەمە! خودا تەوبەی کەعبی گیرا کرد ئەویش** (رەزای خودای لێبێت) **دەڵێ: بۆ هەواڵی بۆ نەنێرم‌و ئەم مژدە خۆشەی بدەمێ! دەفەرموێ: ئاخر بەم شەوە دەبن بە ژێر پێی خەڵکەوەو خەڵکەکە تابەیانی خەوتان لێ دەزڕێنن! جا کاتێ پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێت) **نوێژی بەیانی دەکا هەواڵی قەبووڵ کردنی تەوبە (لەلایەنی خودای گەورەوە) لەسەر ئێمە بە موسوڵمانان ڕادەگەیەنێ. حەزرەت** (درودی خودای لەسەر بێت) **عادەتی وابوو لەحاڵەتی خۆشی‌و شادی دا ڕووی وەك مانگی چا ردە دەدرەوشایەوەو خەرمانەی دەدا:**

**بەسیرڕی سوورەی تەوبە خودایە!**
**بێ تەوبە نەڕۆین بۆ ئەو دنیایە**
**تەوبەیەکی ساغ دڵ زاخاو بدا**
**پەڕەی گوڵ ئاسا ڕۆح ئاراو بدا**
**سایەی رەحمەتت تاجی سەریان بێ!**
**ئاڵای ئاسایش کاڵای بەریان بێ**
**قەبووڵ کە، خوایە! زوو بەدەست‌و برد!**
**وەک گەلی یوونس تەوبەی گەلی کورد**
**لە گەڵ ئەوانا ئێمەش بە رەحمەت**
**حەشر کە لە گەڵ ئوممەتی حەزرەت**
**(نووری) بەقسە هیچ بەهیچ نا بێ**
**سپیکاری ساف بێ ماڵیچ نا بێ!!،،**
**مەحوی گلەیی لە واعیز زۆرە**
**گوایە قسەی و کاری دوو جۆرە:**
**قسەی شیرینەو رەفتاری شۆرە**
**نە سای سێبەرەو نە خۆری خۆرە**
**ئەم جۆرە رەفتەش پیشەی دوو مۆرە**

کـە دڵـی وەکـوو دوو چـاوی، کـوێرە!

نــوری! لــە تــاوان بــێ ســەرەو نــوێرە

ڕێــزت گـرتــووە وەک گــورگــی بــۆرە!

دەمــیش دەکــوتی لــە تۆبــەو مۆبــە

وەک دەهۆڵکــوتی شــایی نــاو هۆبــە

## ١١) سوورەتی یوونس : (سورة يونس)

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

١- عَنْ صُهَيْبٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فِـي قَوْلِـهِ تعـالى: {لِلَّـذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَى وَزِيَادَةٌ} قَالَ: إِذَا دَخَلَ أَهْلُ الْجَنَّةِ الْجَنَّةَ نَادَى مُنَادٍ إِنَّ لَكُمْ عِنْـدَ اللّٰـهِ مَوْعِدًا. يُرِيدُ أَنْ يُنْجِزَكُمُوهُ. قَالُوا أَلَمْ يُبَيِّضْ وُجُوهَنَا وَيُنَجِّنَا مِنَ النَّـارِ وَيُـدْخِلْنَا الْجَنَّـةَ. قَالُوا بَلَى. قَالَ فَيُكْشَفُ الْحِجَابُ قَالَ فَوَاللّٰهِ مَا أَعْطَاهُمْ شَيْئًا أَحَبَّ إِلَيْهِمْ مِنَ النَّظَرِ إِلَيْهِ. رواه الترمذي ومسلم في الإيمان[1].

لـە صـوهەیبەوە (خوای لـێ رازی بـێ) دەڵـێ: لـەبارەی فـەرموودەی خـودای گەورەوە:

{لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَى وَزِيَادَةٌ -١٠/٢٦}.

واتە: ئەوانەی چاکەیان کردووە بە دەسمایـەی دەستیان سـەرەڕای ئـەو هەموو پاداشتو بەشو بارەی کە خودا بۆ یانی داناوە مەقامو پایەیەکی لـە هەموو نازو نیعمەتێ بەرز تریشیان بۆ بڕاوەتـەوە، کە ئەوەیە لەو دنیا شـاد دەبن بە خزمەتی خودای خۆیانو بێ بەش نابن لـە دیتنـی. دەڵێ: لە بارەی ئەم ئایەتەوە حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێت) فەرمووی: کاتێ بە هەشتی یـەکان لە بەهەشتا سەقامگیربوون، جاڕکێش جاڕدەدا بە ناویانـدا: ئـەی دانیشتوانی

---

[1] مسلم. إيمان: ٤٤٨ ، ٤٤٩. ترمذي. صفة الجنة: ٢٥٥٢.

بەهەشت! بەڵێنێکتان لەسەر خودایە، خودا دەیەوێ بۆ تانی جێ بەجێ بکا. ئەوانیش دەڵێن: ئەی پەروەردگاری ئێمە! چ پاداشێکی ترمان ماوە، ئەی ئەوە نییە کە ڕووت سپی کردووین‌و لە ئاگری دۆزەخ ڕزگارت کردووین‌و لە بەهەشتا داتناوین ئیتر چی ترمان ماوە لەسەر تۆ؟! فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێت): ئەوجا خودا پەردەی شکۆمەندیی لەسەر ڕووی خۆی لادەداو بەهەشتی یەکان بە چاوی سەر تەما شای خودای خۆیان دەکەن، دەسا بەزاتی خودا هەموو ئەو بەخشش‌و خەڵاتانەی کە هەتا ئەو کاتە خودا لەوەو پێش بە خشیوێتی بەوان هیچیان وەکوو ئەوە خۆش‌و خۆشەویست نییە لەلایان کە دەنواڕن بۆ ئەو زاتە! (ت/م):

هەر چاکە چاکە لای خوا وون نابێ

مایەی نەدیینی خوای بێچوون نابێ

قال الله تعالى:- {ألا إنَّ أولياء اللّه لا خوفٌ عليهم ولا هم يحزنون الَّذين آمنوا وكانوا يتَّقون، لَهُمُ الْبُشْرَى فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ لاَ تَبْدِيلَ لِكَلِمَاتِ اللّهِ ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ – ١٠/٦٢-٦٤}.

واتە: ئاگاداربن! دۆستانی خودا، خۆشەویستانی خودا، کە بریتین لەو کەسانەی کە باوەڕی کامڵ‌و تەواویان هەیەو لە خودا دەترسن‌و پارێز دەکەن‌و لە کوفرو بێ دینی‌و شتی خراپ، ئا ئەم بەهرەوەرانە دەگەنە مەقام‌و پایەیەکی وا ترس‌و بیمیان لە غەیری خودا لە هیچ شتێکی تر نامێنێ‌و خەم‌و خەفەت لە هیچ شتێ ناخۆن، چونکە سەروماڵ‌و مناڵ‌و هەست و نەستیان دەدەنە دەست خودا، جا هەر کاتێ بەندە باشەکانی خودا گەیشتنە ئەم پایەی ویلایەت‌و خۆشەویستی‌و دۆستایەتی یە ئیتر مژدەو مزگێنی خۆش لە هەموو لایەکەوە دادەبارێ بە سەریاندا، هەم لەماوەی ژیانی دنیادا بە هۆی ڕۆشن بوونەوەی چاوو دڵ‌و دەروون‌و موکاشەفاتی ڕۆحی یەوە، یا بەهۆی خەوو شتی واوە، هەم لە ڕۆژی قیامەتا بەهۆی فریشتەی ڕەحمەتەوە کە دێن‌و خەبەریان پێ دەدەن کە ئێوە ئیتر بە هەموو جۆرێ ڕزگاربوون‌و

کەوتنە خۆشی و کامەڕانی و بەختیاری ئێجگاری یەوە، ئەوەی کە بڕیا ڕمان داوە بۆ ئەهلی ویلایەت، بۆ دۆستانی خوا گشتی ڕا ستەو هەقەو دێتە جێ و فەرموودەی خودایەو ناگۆڕی گەیشتن بە پایەی موژدە وەرگرتن گەیشتنە بە پلەو پایەیەکی هەرە گەورە لەلای خودا، گەیشتنە بە ئاواتی هەرە گەورە.

٣٩١٧- قال رَجُلٍ مِنْ أَهْلِ مِصْرَ سَأَلْتُ أَبَا الدَّرْدَاءِ عَنْ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى (لَهُمُ الْبُشْرَى فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا) فَقَالَ مَا سَأَلَنِي عَنْهَا أَحَدٌ غَيْرَكَ إِلاَّ رَجُلٌ وَاحِدٌ مُنْذُ سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ مَا سَأَلَنِي عَنْهَا أَحَدٌ غَيْرَكَ مُنْذُ أُنْزِلَتْ هِيَ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ يَرَاهَا الْمُسْلِمُ أَوْ تُرَى لَهُ. رواه الترمذي والحاكم وصححه[٢].

پیاوێکی خەڵکی میصر گوتی: بۆ ئەم ئایەتە ( لهم البشری في الحیاة الدنیا) پرسیارم لە ئەبو دەردا کرد، گوتی: ئەوەتی ئەم ئایەتەم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) پرسیوەتەوە، تۆ نەبێ کەسی تر لە منی نەپرسیوەتەوە، حەزرەتیش (دروودی خودای لەسەر بێت) کە لێیم پرسی فەرمووی: ئەوەتی ئەم ئایەتە دابەزیوە، تۆ نەبێ، کەسی تر لێمی نە پرسیوەتەوە فەرمووی: ئەو موژدەو مزگێنی یەی کە لەم ئایەتەدا باس کراوە برێتی یە لە خەونی باش، کە موسوڵمان خۆی لە خەودا دەیدینێ، یا کەسێکی تر لە خەونا بۆی دەبینێ! (ت/حاکم:ص).

٣٩١٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ لَمَّا أَغْرَقَ اللَّهُ فِرْعَوْنَ قَالَ آمَنْتُ أَنَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ الَّذِى آمَنَتْ بِهِ بَنُو إِسْرَائِيلَ. فَقَالَ جِبْرِيلُ: يَا مُحَمَّدُ فَلَوْ رَأَيْتَنِي وَأَنَا آخُذُ مِنْ حَالِ الْبَحْرِ فَأَدُسُّهُ فِي فِيهِ مَخَافَةَ أَنْ تُدْرِكَهُ الرَّحْمَةُ. رواه الترمذي بسند حسن. نسأل الله حسن الحال آمين[٣].

---

[٢] صحیح عند الحاکم.

[٣] حسن عند الترمذي.

**ئیبنو عەبباس** (رەزای خودای لێبێت) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێت) **فەرمووی: کاتێ خودا فیرعەونی نوقم کرد لە ناو دەریادا، لەو دەمەدا فیرعەون گوتی: آمَنْتُ أَنَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ الَّذِی آمَنَتْ بِهِ بَنُو إِسْرَائِیلَ: واتە: باوەڕم هێنا بەو خودایە کە نەوەی ئیسرائیل ئیمانیان پێی هێناوەو هیچ خودایێ نییە ئەو نەبێ جوبرائیل** (درودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: ئەی موحەممەد! بریا لەو کاتەدا چاوت لێم دەبوو کە چۆن قوڕو لیتەی ناو دەریاکەم دەخنیە ناو دەمی مەبادا بەر ڕەحمەتی خودا بکەوێ بە هۆی گوتنی ووشەی (لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللهُ) وە (ت ـس/ح) داوای گوزەرانێکی خۆش و باش لە خودا دەکەین.**

## ١٢) سوورەتی هوود : (سورة هود)

**بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ**

**قَالَ اللّٰهُ تَعَالَى: {أَلاَ إِنَّهُمْ يُثْنُونَ صُدُرَهُمْ لِيَسْتَخْفُوا مِنْهُ أَلاَ حِينَ يَسْتَغْشُونَ ثِيَـابَهُمْ يَعْلَمُ مَايُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ - ١١/٥}.**

**واتە: ئاگاداربە! ئەی پێغەمبەری خۆم! بەڕاستی ئەو بێبڕوایانە سینەی خۆیان هەڵدە سووڕێنن بۆ ئەوە کە خۆ بشارنەوە لە تۆ یا خودای تۆ، بەڵام ئەوە بێ سوودە، بێدار بن لەوکاتەدا کە خۆیان دادەپۆشن بەبەرگ و نوێنی نووستنیان خودای گەورە ئاگای لە نهێنی و ئاشکرایان هەیە دەزانێ چی لە ناو دڵیاندا هەیەو ئاگای لە چاکەو خراپەیان هەیەو خودا هیچی لێ وون نابێ، قسەی سەر زارو خەیاڵی ناو دڵ بۆ ئەو چون یەکە.**

**٣٩١٩- سُئِلَ ابْنَ عَبَّاسٍ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) **عن هذه الآية فقال: أُنَاسٌ كَانُوا يَسْتَحْيُونَ أَنْ يَتَخَلَّوْا فَيُفْضُوا إِلَى السَّمَاءِ، وَأَنْ يُجَامِعُوا نِسَاءَهُمْ فَيُفْضُوا إِلَى السَّمَاءِ، فَنَزَلَ هذه الآية. رواه البخاري[1].**

---

[1] بخاري. تفسير: ٤٦٨١ ، ٤٦٨٢ ، ٤٦٨٣.

لەبارەی ئەم ئایەتەوە پرسیا ر کرا لە ئیبنو عەبباس (خودایان لىَ ڕازی بێت) گوتی: گەلێ کەس هەبوون کە دەچوون بۆ سەراو پێیان شەرم بوو شەرمگای خۆیان بەرەو ئاسمان ڕووت بکەن، لەبەر ئەوە خۆیان دەکۆماندەوە بە سەر عەورەتی خۆیاندا هەتا دەرنەکەوێ! وە گەلێ کەسی تر هەبوون کە دەچوونە لای ژنو حەلاڵی خۆیان پێیان شەرم بوو شەرمی خۆیان بەرەو ئاسمان ڕووت کەن، لەبەر ئەوە سەری خۆیان دا دەپۆشی گوایە خۆیان لە خودا دەشارنەوە! جا بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتە دابەزی (ب).

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً – (٧/١١)}.

واتە: خودا ئەو خودایەیە کە لە نەبوون ئاسمانەکانو زەمینی دروست کردووە، لە ماوەی شەش ڕۆژدا لە ڕۆژانی خودا، کە ڕۆژی وای هەیە بە قەد هەزارساڵی ئێوە دەبێ، وە لە پێش دروست کردنی ئەماندا عەرش (بارەگا) ی خۆیو ئاوی دروست کردبوو، وە بارەگاکەی لەسەر ئاو بوو، واتە:جگە لەعەرشو ماددەی ئاو هیچی تر نەبوو، خودای گەورە بۆیە ئەمانەی دروست کردووە تا بەراووردتان بکاو تاقیتان بکاتەوە کە کامەتان ڕەفتارو کرداری باشترە لەوی تر.

٣٩٢٠– عَنْ أَبِي رَزِينٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيْنَ كَانَ رَبُّنَا قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ خَلْقَهُ؟ قَالَ كَانَ فِي عَمَاءٍ مَا تَحْتَهُ هَوَاءٌ وَمَا فَوْقَهُ هَوَاءٌ وَخَلَقَ عَرْشَهُ عَلَى الْمَاءِ. رواه الترمذي. بسند حسن[٢].

ئەبو ڕەزین (خودای لىَ ڕازی بێت) گوتی: گوتم: ئەی فرستادەی خودا! خودا لە پێش ئەوەدا کە ئەم دروستکراوانەی خۆی دروست بکا خۆی لە کوێ بووە؟ فەرمووی: خودا هەربووەو هەر خۆی بووەو بەس، لە پاشدا بارەگای خۆی دروست کردووە لەسەر ئاو داینناوە! (ت –س/ح) ئیبنولئەثیر (ڕەزای خودای

[٢] حسن عند الترمذي.

لێ بێ) لە (النهاية في غريب الحديث والأثر)دا دەفەرموێ: (العَمَاءُ السحاب) واتە: عەما هەورە، بە پێی ئەم ڕاڤەیە واتەی فەرموودەکە ئاوای لێ دێ: خودا لە ناو هەوردا بووەو، سەرو ژێری با (هەوا) بووە! وە دەفەرموێ: ئەبو عوبەید (خودای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێ: کەس نازانێ ئەو هەورە چۆن بووە! بۆیە بەندەش دەڵێم:

جێگەی وا جێگەی هەڵخلیسکانە

جێی جلیتبازیی شۆڕە سوارانە،

کە رسوار لەم ڕێیە هەم خۆی و کەری

سەر لە جێی پێیەو پێ لە جێی سەری!

٣٩٢١- عن إبن عمر (رَضيَ اللهُ عَنهُما): سَمِعْتَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَقُولُ يَدْنُو الْمُؤْمِنُ مِنْ رَبِّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يَضَعَ عَلَيْهِ كَنَفَهُ فيقرِّرُهُ بِذُنُوبِهِ: تَعْرِفُ ذَنْبَ كَذَا ثُمَّ يَقُولُ يَا رَبِّ أَعْرِفُ مرتين. فَيَقُولُ أَنَا سَتَرْتُهَا عَلَيْكَ فِي الدُّنْيَا وَأَنَا أَغْفِرُهَا لَكَ الْيَوْمَ ثُمَّ يُعطَى صَحِيفَةَ حَسَنَاتِهِ وَأَمَّا الآخَرُونَ أَوِ الْكُفَّارُ فَيُنَادَى بِهِمْ عَلَى رُءُوسِ الأَشْهَادِ (هَؤُلاَءِ الَّذِينَ كَذَبُوا عَلَى رَبِّهِمْ أَلاَ لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ). رواه الشيخان[٣].

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێبێت) دەڵێ: بە گوێی خۆم ژنەوتم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) دەیفەرموو: لە ڕۆژی قیامەتا، موسوڵمان لە خودای خۆی نزیك دەبێتەوە، بەڕەنگێکی وا خودا لە پەنای خۆیدا داڵدەی دەداو لە پەنای پەردەی میهرەبانی خۆیدا دەیپۆشێ، هەتا خەڵکی دەشتی مەحشەر چاویان لێ نەبێ، ئەوجا خودا یەکە یەکە پێی پێ دەنێ لە گوناهەکانی: پێی دەفەرموێ: ئایا پێ دەنێیت لەم گوناهەو لەو گوناهە کە کردووتن؟ بەندەکەش گشت جارێ لە باتی جارێ دووجار لە سەریەك دەڵێ: بەڵێ ئەی خودای من! پێیان لێ دەنێم و لە دنیادا ئەم تاوانانەم هەموو کردوون، ئیتر بەندەکە دەترسێ و دەحەپەسێ و لە دڵی خۆیا دەڵێ: سەرم تیا دەچێ، جا

[٣] تجريد البُخاريُ / ٣ ل / ١٥٢ رقم:١٠٥٨ / ٢٤٤١ ، ٤٦٨٥ ، ٦٠٧٠ ، ٧٥١٤. مسلم. توبة: ٦٩٤٦.

خودا دەفەرموێ: مەترسە، من لە جیهاندا ئەم گوناهانەم بۆ پۆشیویت ئەوا ئەمڕۆکەش لێت خۆش بووم لەو گوناهانە، لە پا ش ئەمە نامەی کردەوە باشەکانی دەدەنە دەستی ڕا ستی، ئەمە حاڵی موسوڵمانە، بەلاّم ئەوانی تر – واتە: کا فرو بێ بڕواکان – جا ڕکێش لە بەرچاوی شایەتەکانی کردەوەکانیان بانگەواز هەڵ دەداو دەڵێ:–

{هَؤُلاء الَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَى رَبِّهِمْ أَلاَ لَعْنَةُ اللّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ – ١٨/١١}.

واتە: ئا ئەمانە بوون کە درۆیان بەدەم خوداوە دەکرد، بزانن کە نەفرین و لە عنەت و سزای سەختی خودا بۆ ستەمکارانە (ش).

٣٩٢٢– عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عن النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِنَّ اللَّهَ لَيُمْلِي لِلظَّالِمِ حَتَّى إِذَا أَخَذَهُ لَمْ يُفْلِتْهُ. قَالَ ثُمَّ قَرَأَ (وَكَذَلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَا أَخَذَ الْقُرَى وَهْيَ ظَالِمَةٌ إِنَّ أَخْذَهُ أَلِيمٌ شَدِيدٌ ). رواه الشيخان والترمذي[٤].

ئەبو مووسا (ڕەزای خودای لێ بێت) لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەر بێت) دەفەرموێ: لە ڕاستی دا خودا تاماوەیێ مۆڵەتی پیاوی زۆردارو ستەمکار دەدات و تا ماوەیێ جڵەوی بۆ شل دەکات هەتا بزانێ دەگەڕێتەوە یانا، لە وانەکانی ڕۆژگار پەندو ئامۆژگاری وەردەگرێ یانا، بەلاّم کە کاسەپڕبوو ئەوسا قورتمی دەگرێ ئیتر قوتا ری نابێ! ئینجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) ئەم ئا یەتە ی خوێندەوە:–

{وَكَذَلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَا أَخَذَ الْقُرَى وَهِيَ ظَالِمَةٌ إِنَّ أَخْذَهُ أَلِيمٌ شَدِيدٌ – ١٠٢/١١}.

واتە: ئاوەها پاش مۆڵەت و ماوەیێ، خودای تۆ سزای سەخت دەنێرێ و قارو خەشم و غەزەب دەگرێ لە خەڵکی ئەو وولاّت و دێهاتانە کە زۆرو ستەم و ناهەقی و بێ ڕەوایی لە ناویاندا پەرە دەستێنێ و دەڵێ ی گوندو شارەکان سەرجەم بوون بە زۆردارو ستەمکار! وەلێ لە مەکری خودا ئەمین

[٤] تجريد البُخاريّ / ٤ / ٤٥٠ رقم: ١٦٦٧ / ٤٦٨٦. مسلم. بر وصلة: ٦٥٢٤.

مەبن، چونکە بە ڕا ستی کاتێ خودا قورتمی زاڵم دەگرێ پشووی دەبڕێ، ئێشی باشی پێ دەگەیەنێو بڕسی دەبڕێ! (ش/ت):

زوڵمو زۆرو ناهەقی نەوەن بڵاوو باون

دانا لە بێ باکی خوا هەموو واقی وڕمان!

٣٩٢٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عن النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قال: يَرْحَمُ اللَّهُ لُوطًا، لَقَدْ كَانَ يَأْوِي إِلَى رُكْنٍ شَدِيدٍ، وَلَوْ لَبِثْتُ فِي السِّجْنِ مَا لَبِثَ يُوسُفُ ثُمَّ أَتَانِي الدَّاعِي لأَجَبْتُهُ. رواه الشيخان[٥].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێت) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) فەرمووی: ڕەحمەتی خودا لە لووت پێغەمبەر بێ لە سەرچی ئەساسێ فەرموویەتی:

{قَالَ لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً أَوْ آوِي إِلَى رُكْنٍ شَدِيدٍ - ١١/٨٠}.

واتە: حەزرەتی لووت پاش نائومێد بوون لەو نامەردانە فەرمووی: کاشکی من خۆم هێزێکم ببوایە، هەتا چارەی ئەم بێ شەرمیو نامەردیو زیادەڕوی ئێوەمە پێ بکردایە، یاخود لە پەنای زاتێکی تەواناو بە هێزدا، دەبووم!؟ خۆ ئەو لە ڕاستی دا لە پەنای زاتێکی تەواناو بە هێزدا بوو کە خودای گەورەیە، لە لایەکی تریشەوە، ئافەریم بۆ حەزرەتی یووسف، بۆ خۆیو بۆ سەبرو خۆگرتنی، بەڕاستی مەردو یەسەبرو ئازاو بە پشوو بوو، ئەوەبوو کە پاشا ناردی بە شوێنی دا کە بچێ بۆ لای، ئەو مەردانە لە بەندیخانە دەرنەچوو، وە پەلەی نەکرد، وەویستی لە پێشدا بی سەلمێنێ کە ئەو بە ناڕەوا بەندکراوە، بۆیە بەفروستادەکەی پاشای فەرموو: بڕۆ عەرزی پاشا بکە فەرمان بدا ئەو ژنانە کە دەستی خۆیان لەتو پەت کرد لە گەڵ ژنی وەزیردا، لە کاتی دەعوەتەکەدا، کۆیان بکاتەوەو لێیان بپرسێ: حاڵی ئەوان چۆن بوەو حاڵی منیش چۆن بووە؟ تا پاکو پیس دەربکەوێ بۆ هەموو لایێ،

---

[٥] بخاري. تفسير: ٤٥٣٧ ، ٤٦٩٤. مسلم. إيمان: ٥٣٨٠ ، ٣٨١.

ئەوسا من دێم بۆ لای پاشا ئەنجا پێغەمبەر فەرمووی: وەلێ ئەگەر من لە جێگەی ئەو بوومایەو ئەوەندەی ئەو وا زۆر لە بەندیخانە دا بمایەتەوە هەر کە دەهاتن بە دوامدا گورج بە بێ چەندو چوون دەچووم لە گەڵیان بۆ لای پاشا! (ش).

٣٩٢٤- (ب - ١ ز - ٤٣ ل - ١٨٥ ف - ٩)[٦].

٣٩٢٥- عَنْ أَبِي الْيَسَرِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ أَتَتْنِي امْرَأَةٌ تَبْتَاعُ تَمْرًا فَقُلْتُ لَهَا: إِنَّ فِي الْبَيْتِ تَمْرًا أَطْيَبَ مِنْهُ. فَدَخَلَتْ مَعِي فِي الْبَيْتِ فَأَهْوَيْتُ إِلَيْهَا فَقَبَّلْتُهَا فَأَتَيْتُ أَبَا بَكْرٍ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ قَالَ اسْتُرْ عَلَى نَفْسِكَ وَتُبْ وَلاَ تُخْبِرْ أَحَدًا. وَتُبْ إِلَيَ اللهِ فَلَمْ أَصْبِرْ فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ. فَقَالَ: أَخَلَفْتَ غَازِيًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فِي أَهْلِهِ بِمِثْلِ هَذَا. حَتَّى تَمَنَّى أَنَّهُ لَمْ يَكُنْ أَسْلَمَ إِلاَّ تِلْكَ السَّاعَةَ حَتَّى ظَنَّ أَنَّهُ مِنْ أَهْلِ النَّارِ. قَالَ وَأَطْرَقَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) طَوِيلاً حَتَّى أَوْحَى اللَّهُ إِلَيْهِ (أَقِمِ الصَّلاَةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفًا مِنَ اللَّيْلِ) إِلَى قَوْلِهِ (ذِكْرَى لِلذَّاكِرِينَ). قَالَ أَبُو الْيَسَرِ فَأَتَيْتُهُ فَقَرَأَهَا عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ أَصْحَابُهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلِهَذَا خَاصَّةً أَمْ لِلنَّاسِ عَامَّةً؟ قَالَ: بَلْ لِلنَّاسِ عَامَّةً. رواه الترمذي بسند حسن. نسأل الله الستر وحسن الحال والمال آمين[٧].

ئەبولیەسەر (خودای لێ ڕازی بێت) گوتی: ژنی هات بۆ کنم خورما بکڕێ، گوتم: لە ژوورەوە خورمای باشتری لێ یە، ئەویش لە گەڵما هاتە ژوورەوە منیش دەستێکم بۆ یبردو ماچم کرد، لە پاشا پەشیمان بوومەوەو بۆ ئەم مەسەلەیە لە ئەبو بەکرم پرسی، گوتی: ڕازی خۆت بپۆشەو قسە بۆ کەس مەکەو لە لای خودا تەوبە بکە، منیش ئۆقرەم لێ هەڵگیرا هەتا لە پێغەمبەرم پرسی، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێت): ئاوا چاودێریی ناموسی خێزانی جەنگاوەرو تێکۆشەر لە ڕێگەی خودا دا دەکەی! گوتی: ئەوەندە پەشیمان

---

[٦] تقدم برقم: ٩ / ٣٣٩ مجلد أول / ل / ١٨٥.

[٧] حسن عند الترمذي.

بوومەوە بەڕادەیەکی وا خۆزگەم خواست کە لەوەوپێش ئیسلام نەبوومایە و لە پاش ئەو کاتە موسوڵمان ببومایە تەنانەت گومانم وابوو کە بووم بە دۆزەخی! جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت) تاوێ ڕاماو ماتبوو هەتا خودا ئەم ئایەتەی بە سرووش بۆینارد: {وَأَقِمِ الصَّلاَةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ اللَّيْلِ} تا کۆتایی ئایەت، کە ڕاڤەی لەبەرگی یەکەما لە زنجیرە چل و سێدا، لە فەرموودەی نۆهەما رابورد، ئەوجا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت) ئایەتەکەی بۆم خوێندەوە، یارانیشی عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم بڕیارە هەر بۆ ئەم وایە، یا بۆ هەموو کەسێکی تریش وایە؟ فەرمووی: نەء، هەر بۆ ئەم وانی یە، بەڵکوو بۆ گشت کەسێ وایە (ت – س/ح).

## ١٣) سوورەتی یووسف (درودی خودای لەسەربێ)

## سورة یوسف (علیه السلام)

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

قال الله تعالى: {وَكَذَلِكَ يَجْتَبِيكَ رَبُّكَ وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأْوِيلِ الأَحَادِيثِ وَيُتِمُّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكَ وَعَلَى آلِ يَعْقُوبَ كَمَا أَتَمَّهَا عَلَى أَبَوَيْكَ مِن قَبْلُ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْحَاقَ إِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ - ١٢/٦}.

واتە: چۆن خودا تۆی هەڵبژارد بۆ ئەو خەوە جوانە ئاوەهایش هەڵت دەبژێرێ و دەتکا بەزاناو داناو فێری قسەی بەرزو نامە پیرۆزەکانت دەکاو شارەزای توێژینەوەو لێکدانەوەی باشت دەکا، وە بەهرە لەسەر بەهرە دەیڕژێنێ بەسەرتا، وەك پێغەمبەرایەتی و دارایی، هەروەك لە کاتی خۆی دا بەهرەیەکی زۆری دابوو بە باپیرەکانت کە ئیبراهیم و ئیسحاق بوون، خودای تۆ زاناو دانایە، دەزانێ شانی بەندەی خۆی چی هەڵدەگرێ.

**٣٩٢٦- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) قَالَ: الْكَرِيمُ ابْنُ الْكَرِيمِ ابْنِ الْكَرِيمِ ابْنِ الْكَرِيمِ يُوسُفُ ابْنُ يَعْقُوبَ بْنِ إِسْحَاقَ بْنِ إِبْرَاهِيمَ. رواه البخاري والترمذي[1].**

**ئیبنو عومەر (خودایان لێ ڕازی بێت) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەر بێت): مەردی کوڕی مەردی کوڕی مەردی کوڕی مەرد، کە خۆیو باوباپیری مەردو بەڕێز بوون ئەوە یوسفی کوڕی یەعقووبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمە (ب/ت).**

**٣٩٢٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) أَيُّ النَّاسِ أَكْرَمُ قَالَ أَكْرَمُهُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاهُمْ. قَالُوا: لَيْسَ عَنْ هَذَا نَسْأَلُكَ. قَالَ: فَأَكْرَمُ النَّاسِ يُوسُفُ نَبِيُّ اللَّهِ ابْنُ نَبِيِّ اللَّهِ ابْنِ نَبِيِّ اللَّهِ ابْنِ خَلِيلِ اللَّهِ. قَالُوا: لَيْسَ عَنْ هَذَا نَسْأَلُكَ. قَالَ فَعَنْ مَعَادِنِ الْعَرَبِ تَسْأَلُونِي. قَالُوا: نَعَمْ. قَالَ فَخِيَارُكُمْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ خِيَارُكُمْ فِي الإِسْلَامِ إِذَا فَقِهُوا. رواه البخاري[2].**

**ئەبوو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێت) گوتی: لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) پرسیار کرا: کام کەس گەورەترو بەڕێز ترە؟ فەرمووی: گەورەترینیان لەلای خودای گەورە ئەو کەسەیە کە زۆرتر لە خودا بترسێ!. عەرزیان کرد: مەبەستمان ئەوە نییە. فەرمووی: دەی گەورەترینیان بە ڕشتەی نەسەبو بنەچەو ڕەسەن نامە یووسفە، کە خۆی پێغەمبەری خودایە، باوکی پێغەمبەری خودایە، باپیرەشی پێغەمبەری خودایە، با پیرە گەورەیشی دۆستی خودایە! گوتیان: لەمەیش ناپرسین. فەرمووی: دیارە لە بنەچەی بنەماڵەو خانەدانەکانی عەرەب پرسیار دەکەن کە وەك کان وان؟ عەرزیان کرد: بەڵێ مەبەسمان ئەوانە، فەرمووی: دەی ئەو کەسانەتان کە لەسەردەمی پێش هاتنی ئا یینی ئیسلامدا با ش بووبن، هەر ئەوانیش لەسەردەمی**

---

[1] بخاري. تفسير: ٤٦٨٨.

[2] بخاري. تفسير: ٤٦٩٩.

ئیسلامەتی دا باش دەبن، بە مەرجێ شارەزای ئایین بن‌و بە جوانی ڕەفتاری پێ بکەن! (ب).

٣٩٢٨- قالَ الله تعالى: {وَغَلَّقَتِ الأَبْوَابَ وَقَالَتْ هَيْتَ لَكَ. قَالَ مَعَاذَ اللَّهِ}.
قال عكرمة: هيت لَكَ بالحورانيَّة هلُمَّ. وقال ابن جُبيرٍ: تعاله. رواه الْبُخَارِيُّ[٣].

خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دا ستانی حەز لێ کردنی زلێخا لە حەزرەتی یووسف دەگێڕێتەوە دەفەرموێ:

{وَغَلَّقَتِ الأَبْوَابَ وَقَالَتْ هَيْتَ لَكَ. قَالَ مَعَاذَ اللَّهِ - ١٢/٢٣}.

واتە: زلێخا ئاگری ئەشق‌و ئەڤینی زۆری بۆ هێنا، بەرە بەرە بە عیشوەو ناز دڵی ڕادەگرت‌و یوسفی (بە قسەی خۆش‌و بە گفتی شیرین) دەکردە خۆی، تا تەواو مرخی لێ خۆش کردو بریاری دا کە کاتی ئەوە هاتووە لە پەنایەکا، لە کۆڕێکی تایبەتی ئاشقانەدا کوڵوکۆی دڵی خۆیان دامرکێنن، هات دەرگا لەسەر دەرگا دایخست، لەسەر خۆی‌و یووسف‌و پێی گوت: فەرموو دەی زووبە باپێکەوە، بادەی دڵدا ری نۆش کەین! ئەویش مەردانە گوتی: من‌و کاری خراپیان نەگوتووە، پەنادەگرم بە خودا لە شتی واناشیرین عیکرمە (خودای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: ووشەی (هیت لك) بە زمانی حەورانی یانی: زوو وەرە، ئیبنو جوبەیریش دەڵێ: واتە: خێراوەرە (ب).

قال الله تعالى: {ثُمَّ يَأْتِي مِن بَعْدِ ذَلِكَ سَبْعٌ شِدَادٌ يَأْكُلْنَ مَا قَدَّمْتُمْ لَهُنَّ إِلاَّ قَلِيلاً مِّمَّا تُحْصِنُونَ - ١٢/٤٨}.

واتە: پاش ئەو حەوت ساڵە حەوت ساڵی ناهەمواری قاتی دێنە پێشەوە، هەموو ئەو ڕزق‌و ڕۆژیەی هەڵتان گرتووەو داتان ناوە بۆ ئەو ساڵە گرانیانە هەمووی دەخۆن، کەمێ نەبێ لەوەی دەیشارنەوە بۆ تۆوی کشتوکاڵ (یابۆ کاتی قاتەساڵ).

---

[٣] ذكره البُخَارِيُّ تعليقا في التفسير بين الرَّقمين: ٤٦٩١ و ٤٦٩٢. سورة يوسف.

**٣٩٢٩– قال عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ قُرَيْشًا لَمَّا أَبْطَئُوا عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بِالإِسْلاَمِ قَالَ: اللَّهُمَّ اكْفِنِيهِمْ بِسَبْعٍ كَسَبْعِ يُوسُفَ فَأَصَابَتْهُمْ سَنَةٌ حَصَّتْ كُلَّ شَيْءٍ حَتَّى أَكَلُوا الْعِظَامَ حَتَّى جَعَلَ الرَّجُلُ يَنْظُرُ إِلَى السَّمَاءِ فَيَرَى بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا مِثْلَ الدُّخَانِ قَالَ اللَّهُ (فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُبِينٍ) قَالَ اللَّهُ (إِنَّا كَاشِفُو الْعَذَابِ قَلِيلاً إِنَّكُمْ عَائِدُونَ) أَفَيُكْشَفُ عَنْهُمُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَقَدْ مَضَى الدُّخَانُ وَمَضَتِ الْبَطْشَةُ. رواه الشيخان[٤].**

**عەبدوڵڵا** (خودای لێ ڕازی بێت) **گوتی: هۆزی قوڕەیش دڕەنگ ئیسلام بوونو هەتا ماوەیێ ملیان نەدەدا بە پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێت) **ئەویش فەرمووی** (درودی خودای لەسەر بێت)**: خودایە! تۆ لەباتی من چاری ئەمانە بکەو بە حەوت ساڵ قاتو قڕی (وەکوو حەوت ساڵە گرانی یەکەی کاتی یووسف) یارمەتیم بدە بە سەریانا ئیتر تووشی قاتووقڕی یەکی وەهابوون هەر مەپرسە، قڕی خستە هەموو شتێکیان، تەنانەت لە برسانا ئێسقانیان دەخواردو لەبەر بێ هێزیو برسێتی پیاو چاوی ڕێشکەو پێشکەی دەکردو کە تەماشای ئاسمانی دەکرد لە بەرچاوی تەمو دووکەڵی دەکرد، جا خودای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند:**

{فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاء بِدُخَانٍ مُّبِينٍ – ١٠/٤٤}.

**جا تۆ چاوەڕێی ئەو ڕۆژەیە بکە، کە لەبەر بێ بارانی تەمو مژو تەپو تۆزێکی ڕەشی بەد ڕەزا لە چەشنی دوو کەڵ ڕووی ئاسمان دا دەگرێ عەبدوڵڵا دەڵێ: مەبەست لەم دوخانو تەمو دووکەڵە لەم ئایەتەدا ئەمە بوو کە من ڕوونم کردەوە، وە ئەمەیش وەکوو گوتم ڕووی داو لە کاتی خۆیدا ڕۆیشت، چونکە خودا لە پاش ئەم ئایەتەوە ڕوونی دەکاتەوە کە کەمێ ئەو سزاو تۆڵەیان لە سەر لادەبرێ بەڵام دیسان تێ هەڵ دەچنەوەو دەست دەکەنەوە بە لاساریو ناعالی وەکوو دەفەرموێ:**

---

[٤] تجريد البُخَارِيُّ / ١ ل / ٤٩٢ رقم: ٥١٨ تجريد = ١٠٠٧ فتح. أطرافه: ١٠٢٠ ، ٤٦٩٣ ، ٤٧٦٧ ، ٤٧٧٤ ، ٤٨٠٩ ، ٤٨٢٠ ، ٤٨٢١ ، ٤٨٢٢ ، ٤٨٢٣ ، ٤٨٢٤ ، ٤٨٢٥. مسلم. صفات المنافقين: ٦٩٩٧ ، ٧٠٠١.

{إِنَّا كَاشِفُو الْعَذَابِ قَلِيلًا إِنَّكُمْ عَائِدُونَ – ٤٤/١٥}.

واتە: ئێمە لەبەر تۆ بوواڕەمان دان

کەچی چوونەوە سەرخووی نامەردان!

جا ئەمە مەعنای وایە کە ئەو سزاو عەزابەیە کە لەم ئایەتەدا باس کراوە هەتا ماوەیێ لەسەریان لادەچێ‌و دیسان دەگەڕێنەوە سەرباری بەرە بۆریان و هەمدیسان خودا سزاکەیان بۆ دەنێرێتەوە، وەك لە دوا ئەم ئایەتەشەوە دەفەرمووێ:

{يَوْمَ نَبْطِشُ الْبَطْشَةَ الْكُبْرَى إِنَّا مُنتَقِمُونَ – ٤٤/١٦}.

واتە: هەر خۆیان زیان دەکەن وا بڕیارمان دا کە لە ڕۆژی بەدردا تۆڵەی بەرو دوایان لێ بستێنین‌و هەڵمەتی گەورەیان بۆ بەرین‌و جەزرەبەیان بدەین‌و تەمێ خواریان بکەین عەبدوڵڵا گوتی: جا ئەمە مەعنای وایە کە ئەو سزاو عەزابە تاماوەیێ لەسەریان لادەچێ‌و دیسان دەست دەکەنەوە بە خراپەکردن‌و دیسانەوە سزاکە دەگەڕێتەوە سەریان، جا چۆن شتی وا لە قیامەتا ڕوو دەدا، لە قیامەتا سزاکە هات تا تەواو نەبێ لاناچێ، یا هەر لاناچێ، لەسەر ئەم ڕاڤەیە دیارە بەطشەو هەڵمەتە گەورەکەیش وەك مەسەلەی دوخان‌و تەم‌و دووکەڵەکە ڕووی داوەو مەبەست لێی غەزای بەدربووەو ئەویش ڕابووردووە! (ش).

٣٩٣٠- ⇐(ب-٦ ز-١٣ ل-٢٤٥ ف-١ + ف-٢) + (ب-٦ ز-١٢ ل-٢٤٢ ف- ٥)[٥].

لێرەدا ئەم پتری یەی هەیە: فما بعث الله بعده نبيا الا في ذروة من قومه: واتە: ئیتر لە دوا لووت خودا هەر پێغەمبەرێکی دەنارد سەرگوڵی هۆزەکەی خۆی بوو، کە دەبوون بە پشت‌و پەنا بۆی.

---

[٥] تقدم برقم: ١ / ٣٨٩٠ ، ٣٨٩١ ، ٥ / ٣٨٨٨.

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {حَتَّى إِذَا اسْتَيْأَسَ الرُّسُلُ وَظَنُّواْ أَنَّهُمْ قَدْ كُذِبُواْ جَاءهُمْ نَصْرُنَا فَنُجِّيَ مَن نَّشَاء وَلاَ يُرَدُّ بَأْسُنَا عَنِ الْقَوْمِ الْمُجْرِمِينَ - ١٢/١١٠}.

واتە: بابێ بڕواکانی ئەم چەرخە بایی نەبن بەو مۆڵەتەی بەوان دراوە، چونکە کافرەکانی چەرخەکانی پێشوویش تا ماوەیەکی زۆر مۆڵەت یان دراو دوژمنایەتی ی پێغەمبەرەکانیان دەکرد، هەتا ڕادەیێ ئەو ڕەهبەرانە بێ هیوا دەبوون لەوە کە قسەیان کاریان لێ بکا، یاخود بێ ئومێد دەبوون لەوە کە یا رمەتی یان لەلای خوداوە بۆ بێ‌و گومانی کافرەکان هاتە سەر ئەوە ئەو پێغەمبەرانە درۆیان لەگەڵ دا کراوە.. جا لەم تەنگو چەڵەمەیەدا کوتوپڕ لەلای خوداوە، یارمەتی یان بۆ هات‌و ئەوانەی کە خودا خوا ستی لەسەر ڕزگاربوونیان بووبێ ڕزگاربوون‌و باقی مەندەکەیان بە فەتارەت چوون چونکی ئەوانە تاوانبـاربوون، وە سـزای ئێمەش کە ڕووی کـردە تاوانبـا ران ئـیتر ناگەڕێتەوە تا پەڵی خۆی نەوەشێنی.

عوروە (خودای لێ ڕازی بێت) گوتی: بە عائیشەی پوورمم گوت: ئایا ئەم، ووشەیە لەم ئایەتەدا بە (کذبوا) دەخوێنرێتەوە بەبێ گیراویی یا بە (کذبوا) دەخوێنرێتەوە بە شەددەی ذالەکە؟ گوتی (کذبوا) دەخوێندرێتەوە بە شەددە، گوتم: دەی خۆ پێغەمبەرەکان سوور لێیان ڕوون‌و ئاشکرا بووە کە هۆزەکانیان تەکذیبیان دەکەن واتە: باوەڕیان پێ ناکەن‌و بە درۆیان دەخەنەوە کەواتە کەی ئەوە (ظن)و گومانە؟ عائیشە گوتی: بەڵێ، بە گیانی خۆم سوور ئەوەیان دەزانی، پێم گوت: خۆ ئەوەیش ئەقڵ نایگرێ کە بڵێین پێغەمبەرەکان گومانی ئەوەیان بۆ پەیدا بووە کە خودا درۆی لەگەڵدا کردوون!؟ گوتی: پەنا بە خودا لە بەدگومانی وا، پێغەمبەران بە دوورن لە باوەڕی واوە بە خودای خۆیان‌و شتی وا لە پێغەمبەران ناوە شێتەوە، گوتم: ئەی ئایەتە کە مەعنای چییە؟ گوتی: مەبەست لەم گومانە بە پەیڕەوەکانی پێغەمبەرەکانە لە لایەنی پێغەمبەرەکانەوە لەسەر ئەم شێوەیە: لە پێش دا هەنێ لە هۆزی پێغەمبەرەکان باوەڕو ئیمان دەهێنن بە خوداو پێغەمبەرانی،

وەدەبن بە پەیڕەوانی ئەوان، هەتا لە دوایی دا دەردو ئازارو مەینەتیان درێژە دەکێشێ و نەصرەت و سەرکەوتن دوا دەکەوێ، بەرادەیەکی وا کە پێغەمبەرەکان نا ئومێد دەبن لە ئیمانهێنانی ئەو کەسانە کە هەتا ئێستا ئیمانیان نەهێناوە لە هۆزەکانیان، سەرەڕای ئەوەیشە گومانی ئەوەیشیان بۆ پەیدا دەبێ کە پەیڕەوەکانیشیان باوەڕیان پێیان نەماوە، جا لەو کاتە ناسکەداو لەو حاڵی پەرێشانی و جانبازی یەدا خودا سەریان دەخاو یارمەتی یان بۆ دەنێرێ! (ب).

## ١٤) سوورەتی رەعد : (سورة الرعد)

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٣٩٣١- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِىِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فِى قَوْلِهِ تعالى: (وَنُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ فِي الأُكُلِ) قَالَ الدَّقْلُ وَالْفَارِسِيُّ وَالْحُلْوُ وَالْحَامِضُ[1].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێت) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) لە شانی ئەم فەرمایشتەی خوادا کە فەرموویەتی:

{وَنُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ فِي الأُكُلِ - ٤/١٣}.

واتە: ئەم باخ و ڕەزو شینایی و دارو درەختە جۆراو جۆرانە هەر چەندە گشتیان لە یەك ئاو ئاودەدرێن و لە یەك زەویدا دەڕوێن کەچی لە گەڵ ئەوەیشدا بەرەکانیان جیا جیایە لە ڕەنگ و بۆو تام و لەززەت و چێژو شێوەو قەوارەو شەکڵ و کات و گەڵێ شتی تردا، وە بازێکیانمان باشترو خۆشتر کردووە لە بازێکی تریان. گوتی: حەزرەت لەبا رەی ئەم ئایەتەوە فەرمووی: وەك قەسپ و خەستەوی، وەك شیرین و ترش (ت-س/ح).

٣٩٣٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) قَالَ: أَقْبَلَتْ يَهُودُ إِلَى النَّبِىِّ ( صلى الله عليه وسلم) فَقَالُوا يَا أَبَا الْقَاسِمِ أَخْبِرْنَا عَنِ الرَّعْدِ مَا هُوَ؟ قَالَ: مَلَكٌ مِنَ الْمَلاَئِكَةِ مُوَكَّلٌ

---

[1] رواه الترمذي بسند حسن.

بِالسَّحَابِ مَعَهُ مَخَارِيقُ مِنْ نَارٍ يَسُوقُ بِهَا السَّحَابَ حَيْثُ شَاءَ اللَّهُ. فَقَالُوا فَمَا هَذَا الصَّوْتُ الَّذِي نَسْمَعُ؟ قَالَ: زَجْرُهُ بِالسَّحَابِ إِذَا زَجَرَهُ حَتَّى يَنْتَهِيَ إِلَى حَيْثُ أُمِرَ. قَالُوا: صَدَقْتَ. رواهما الترمذي بسندين حسنين. نسأل الله حسن الرواية آمين[٢].

**ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ ڕازی بێت) **گوتی: جوولەکەکان هاتن بۆ لای پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێت) **گوتیان: ئەی ئەبولقاسم! پێمان بڵێ ڕەعد (واتە: هەورەگرمە = هەورەتریشقە) چییە؟ فەرمووی: فریشتەیە کە لە فریشتەکان ناوی رەعدە، هەوری پێ سپێردراوە، گورزێکی ئاگرینی پێیە، هەوری پێ لێ دەخوڕێ، بۆ ئەو شوێنانەی خودا بیەوێ، گوتیان: ئەدی ئەو گرمەیە چییە کە دەیبیستین؟ فەرمووی: ئەوە دەخوڕێتە هەورەکە تا بڕوا بۆ ئەو شوێنەی کە فەرمانی پێ کراوە بچێ بۆ ئەوێ، گوتیان: ڕاست دەکەی (ت-س/ح).**

## ١٥) سوورەتی ئیبراهیم (درودی لێ بێ) : (سورة إبراهيم (عليه السلام))

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

**٣٩٣٣-** عَنْ أَنَسٍ (رضي الله عنه) قَالَ أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بِقِنَاعٍ عَلَيْهِ رُطَبٌ فَقَالَ مَثَلُ كَلِمَةٍ طَيِّبَةٍ كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِي السَّمَاءِ تُؤْتِي أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍ بِإِذْنِ رَبِّهَا. قَالَ هِيَ النَّخْلَةُ (وَمَثَلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ اجْتُثَّتْ مِنْ فَوْقِ الأَرْضِ مَا لَهَا مِنْ قَرَارٍ) قَالَ هِيَ الْحَنْظَلُ. رواه الترمذي[١].

**ئەنەس** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: هەنێ ڕووتاب (واتە: تەڕە خورما)یان لەسەر سەلەیێ بۆ پێغەمبەر هێنا** (درودی خودای لەسەر بێت) **فەرمووی:**

{مَثَلُ كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِي السَّمَاء، تُؤْتِي أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍ بِإِذْنِ رَبِّهَا - ١٤/٢٤-٢٥}.

---

[٢] رواه الترمذي بسند حسن.

[١] سكت عنه الشارح. راجع صحيح مسلم رقم: ٧٠٣٣-٧٠٢٩ وصحيح البخاري رقم:٦١.

واتە: نموونەی ووشەی جوان و ووتاری خێردارو قسەی خێر وەکوو درەختێکی پاکی جوانی بۆشناخی بەرداری سایەدار وایە، کە بنەکەی بەرەگە درێژە ئەستوورەکانیەوە دامەزرا بێ لە بنی عەرزداو لقەکانیشی بەرزەوە بووبن‌و ڕۆیی بن بەئاسماندا، بای سەفای ڕەحمەت هەمیشە دەیان لەرێنێتەوەو دەم بەدەم دەگەشێنەوەو تازە دەبنەوە، وە ئەم درەختە نازدارە بەری خۆی دەدا بەشایستەگان و موستەحەققان، لە هەموو کاتێکا بەفەرمانی خودای خۆی. حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێت) فەرمووی: ئەوە دار خورمایە فەرمووی:

{وَمَثَلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ اجْتُثَّتْ مِن فَوْقِ الأَرْضِ مَا لَهَا مِن قَرَارٍ – ٢٦/١٤}.

وە نموونەی ووشەو ووتاری پیس‌و قسەی خراپیش وەکوو درەختێکی پیسی بی سوود وایە، کە نەبەری هەبی‌و نەسێبەر، هەر کە دەستت بۆیبرد بەئاسانی هەڵ دەکەنرێ، چونکی ڕەگ‌و ڕیشەی دانەکوتاوە بە ناخی زەویدا، بەڵکوو بەحاڵ‌و ناحاڵ خۆی گرتووە بە چینی سەرووی عەردەوە، وە شایستەی ئەوە نییە کە پایەدار بێ لە عەرزدا فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێت) ئەوەیش گووژاڵکەیە (ت).

٣٩٣٤- ⇐ (ب-١ ز- ٢٢٤ ل-٥٨٠ ف-١)[٢].

لەگرەدا ئەمەی پترە: گفتەی (ت) ئاوایە: ئەم تەوفیق‌و تەسبیت‌و دامەزراندن لەسەر ئیمانە لە گۆڕدا دەبێ، لەوکاتەدا کە فریشتەکان پێی دەڵێن: خودای تۆ کێیە؟ دەڵێت: خودای من یەزدانی پاکە دەڵێن: دین‌و ئایینت چییە؟ دەڵێت: دین‌و ئایینم ئیسلامە دەڵێن: پێغەمبەرت کێیە؟ دەڵێت پێغەمبەرم موحەممەدە (درودی خودای لەسەر بێت).

---

[٢] تقدم برقم: ١ / ١١٤٥ مجلد أول / ل-٥٨٠ چاپی یەکەم

قال الله تعالى: {أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ بَدَّلُواْ نِعْمَةَ اللّهِ كُفْرًا وَأَحَلُّواْ قَوْمَهُمْ دَارَ الْبَوَارِ، جَهَنَّمَ يَصْلَوْنَهَا وَبِئْسَ الْقَرَارُ - ١٤/٢٨-٢٩}.

واتە: ئایا تەماشا ناکەی کە چۆن ئەو سپڵەو پێ نەزانو بەدنمەکانە لە جیاتی ئەوەی کە سوپاسی خودا بکەن لەسەر بەهرەو نازو نیعمەتەکانی دەچن ناسوپاسی ئەو دەکەنو بەرابەر بەچاکەو بەهرەکانی خوا خراپەو بەدنمەکیو بێ ئەمەکی دەکەن، هەر بەخۆشیان دەسبەردار نابن، بەڵکوو هۆزو خزمو گەلو کەسوکاری خۆشیان تووشی فەلاکەتو فەرتەنەو ماڵوێرانی دەکەن، وە بەرەو خانەی وێرانی ناو ناخی ئاگری دۆزەخ لەگەڵ خۆیاندا دەیانبەن وە ئەو جێگە خرا پو ناخۆشو بەدە دەکەن بە مۆڵگەی خۆیانو ئەوان!.

٣٩٣٥- قَالَ ابن عبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) هُمْ كُفَّار أهل مكَّة. رواه البخاري[٣].

ئیبنو عەبباس (خۆشنوودی خودا یان لێ بێ) دەیگوت: ئەوانەی لەم ئایەتەدا باس کراون بێ بڕواکانی خەڵکی مەککە بوون (ب).

٣٩٣٦- عَنْ مَسْرُوقٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قال: تَلَتْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنها) هذِهِ الآيَةَ (يَوْمَ تُبَدَّلُ الأَرْضُ غَيْرَ الأَرْضِ وَالسَّمَوَاتُ) قالَتْ: يا رَسُول الله فَأَيْنَ يَكُونُ النَّاسُ يَوْمَئِذٍ يَا رَسُولَ اللّهِ؟ فَقَالَ عَلَى الصِّرَاطِ. رواه الترمذي. نسأل الله كامل الإسلام. آمين[٤].

مەسرووق (خودای لێ ڕازی بێت) گوتی: عائیشە (خودای لێ ڕازی بێت) ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

{يَوْمَ تُبَدَّلُ الأَرْضُ غَيْرَ الأَرْضِ وَالسَّمَاوَاتُ وَبَرَزُواْ للّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ - ١٤/٤٨}.

واتە: ئەو تۆڵە سەندنە وا لەو ڕۆژەدا کە ئەم زەمینەی کەوا ئێستا ئێوە لەسەری دەژین دەگۆڕێو دەکرێ بەزەمینێکی تر، هەروەها ئاسمانیش

---

[٣] بخاري. تفسير: ٤٧٠٠.

[٤] مسلم. صفات المنافقين: ٦٩٨٧. ترمذي. تفسير القرآن: ٣١٢١.

دەگۆڕێ‌و دەبێ بە ئاسمانێکی تر، لەو ڕۆژەدا هەموو سەر لە گۆڕ دەردەهێنن‌و خواە ئادەمیزادو خواە پەری گرد دەبنەوە بۆ حیساب‌و لێپرسینەوەی خودایی مەسروق گوتی: عائیشە کە ئەم ئایەتەی خوێندەوە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! لەکاتی لە حظەی گۆڕینەکەدا ئەم خەڵکە دەچن بۆ کوێ‌و لەکوێ دەبن؟ فەرمووی: لەسەر پردی صیراط دەبن! (ت/م).

## ١٦) سورەتی حیجر : (سورة الحجر)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

**٣٩٣٧-** عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قال فِي تَفْسِيرِ هَذِهِ الآيَةِ (رُبَمَا يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْ كَانُوا مُسْلِمِينَ) قَالَ: إِذَا أُخْرِجَ أَهْلُ التَّوْحِيدِ مِنَ النَّارِ وَأُدْخِلُوا الْجَنَّةَ يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْ كَانُوا مُسْلِمِينَ. رواه الترمذي في الإيمان[1].

ئەبو هوریرە (خودای لێ ڕازی بێت) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) لە ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا:

{رُّبَمَا يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ كَانُواْ مُسْلِمِينَ - ٢/١٥}.

واتە: لە ڕۆژی ژینەوەدا گەلێ جار ئەم ناپیاوو نامەردانەی کە ئێستا بەبێ باکانە کوفری خودا دەکەن زۆر بەکەساسی‌و بەپەرۆشەوە دەڵێن: خۆزگە ئێمەش لە جیهاندا هەست‌و هۆش‌و گۆشمان ببوایەو وەك ئەم خودا پێداوانە موسوڵمان بووینایەو ڕۆژمان نەگەیشتایە بەم ڕۆژە ڕەشە! حەزرەت لە ڕاڤەکەیدا فەرمووی: کاتێ کە دەستەی خودا پەرست (کەناودارن بە دەستەی تاکپەرست‌و ئەهلی تەوحید) لە ئاگر دەردەهێنرێن‌و دەیانبەن بۆ بەهەشت‌و بێباوەڕان خۆیان بەتەنها لە دۆزەخا دەمێننەوە ئەوجا کافران خۆزگە بە موسوڵمانان دەخوازن‌و لەعەزرەتا بەحەسرەتەوە دەڵێن: بریا ئێمەش وەك ئەم خودا ڕەحم پێ کردووانە لە کاتی خۆیدا موسوڵمان دەبووین، ئێستە ڕزگارمان دەبوو (ت).

---

[1] سكت عنه الشارح.

٣٩٣٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) قَالَ: كَانَتِ امْرَأَةٌ حَسْنَاءُ مِنْ أَحْسَنِ النَّاسِ تُصَلِّي خَلْفَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَكَانَ بَعْضُ الْقَوْمِ يَتَقَدَّمُ حَتَّى يَكُونَ فِي الصَّفِّ الأَوَّلِ لِئَلاَّ يَرَاهَا وَيَسْتَأْخِرُ بَعْضُهُمْ حَتَّى يَكُونَ فِي الصَّفِّ الْمُؤَخَّرِ فَإِذَا رَكَعَ نَظَرَ مِنْ تَحْتِ إِبْطَيْهِ فَأَنْزَلَ اللَّهُ (وَلَقَدْ عَلِمْنَا الْمُسْتَقْدِمِينَ مِنْكُمْ وَلَقَدْ عَلِمْنَا الْمُسْتَأْخِرِينَ)[٢].

ئیبنو عەبباس (خوشنوودی خودا لە خۆی و بابی) دەڵێ: ئافرەتێ هەبوو، ئێجگار جوان بوو، ژنێکی گەلێ باش بوو، لە پشتی پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێت) نوێژی جەماعەتی دەکرد، جا هەندێ کەس وە پێش دەکەوتن و دەچوونە ڕیزی یەکەمەوە هەتا ئەو ژنە نەبینن نەبادا تووشی نەزەرو ڕوانینی حەرام و ناڕەوا ببن، هەندێ کەسی تریش وەپاش دەکەوتن و دەچوونە ڕیزەکانی پاشەوە! جا لەکاتی ڕوکووع بردن و چەمینەوەدا لە ژێر بنباڵیانەوە بە گۆشەی چاو تەماشای ژنەکەیان دەکرد، جا خودا بۆ هۆشیاری کردنەوەی ئەم دوو تاقمەیەو بۆ پەسنی پێشینان و سەرکۆنەی پاشینان، ئەم ئایەتەی نارده خوارێ:

{وَلَقَدْ عَلِمْنَا الْمُسْتَقْدِمِينَ مِنكُمْ وَلَقَدْ عَلِمْنَا الْمُسْتَأْخِرِينَ - ١٥/٢٤}.

واتە: بەڕاستی ئێمە ئاگامان لە پێشینان و پاشینانتانە (ت - خودای لێ ڕازی بێ).

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {لَهَا سَبْعَةُ أَبْوَابٍ لِّكُلِّ بَابٍ مِّنْهُمْ جُزْءٌ مَّقْسُومٌ -١٥/٤٤}.

واتە: دۆزەخ حەوت دەرگای هەیە، هەر دەرگایەیان بەشێکی دیاری کراوی هەیە، لەو کافرو لەڕێدەرچوانە، بەپێی بەدبەختی خۆیان لەو دەرگایەوە دەچنە دۆزەخەوە.

٣٩٣٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لِجَهَنَّمَ سَبْعَةُ أَبْوَابٍ بَابٌ مِنْهَا لِمَنْ سَلَّ السَّيْفَ عَلَى أُمَّتِي أَوْ قَالَ عَلَى أُمَّةِ مُحَمَّدٍ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)[٣].

---

[٢] مسكوت عنه عند الترمذي.

[٣] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

ئیبنو عومەر (خودای لێ ڕازی بێت) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) فەرمووی: دۆزەخ حەوت دەرگای هەیە، دەرگایەكیان بۆ ئەو كەسانەیە كە چەك هەڵ دەگرن لە ئۆمەتی من یافەرمووی: كەشیر هەڵ دەكێشن لە ئۆمەتی موحەممەد (ت-س/ غەریب).

٣٩٤٠- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عن النبي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قال: اتَّقُوا فِرَاسَةَ الْمُؤْمِنِ فَإِنَّهُ يَنْظُرُ بِنُورِ اللَّهِ. ثُمَّ قَرَأَ (إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَاتٍ لِلْمُتَوَسِّمِينَ). روى هذه الثلاثة الترمذي[٤].

ئەبو سەعید (خودای لێ ڕازی بێت) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت) فەرمووی: خۆتان بپارێزن لە فیراسەتو تێڕوانینی موسوڵمانی پاك، چونكە ئەو بە نووری خودای گەورە دەنواڕێو لەبەر تیشكو ووڕشەی خودایی سەرنجی شت دەدا، لەبەر ئەوە پەی بە گەلێ شتی ووردو نهێنی دەبا ئینجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

{إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَاتٍ لِّلْمُتَوَسِّمِينَ - ١٥/٧٥}.

واتە: بەڕاستی لەم داستانو كارەساتەدا چەن نیشانەو بەڵگەیێ هەیە لەسەر تەوانایی خوداو لەسەر تۆڵەسەندنی سەختی، بەتایبەت بۆ ئەو كەسانە كەبە ووردی سەرنجی ڕووداوەكانی جیهان دەدەنو بەچاوی دڵو بە نووری ئیمانو بەتیشكی باوەڕ لە ژینو بوونو لە ڕووپەڕەی بوونەوەر تێ دەڕوانن (ت – سەنەد غەریب).

قال الله تعال: {وَلَقَدْ كَذَّبَ أَصْحَابُ الحِجْرِ الْمُرْسَلِينَ - ١٥/٨٠}.

واتە: یەزدانی پاك دەفەرموێ: بەڕاستی ئەو گەلە كەناویان دەبرێ بە ئەصحابو لحیجر، كە هۆزی ثەموودن، كەباوەڕیان بە حەزرەتی صاڵح پێغەمبەر نەكردو بەدرۆیان خستەوە بە مەعنا ئەو نامەردانە هەموو پێغەمبەرەكانیان بەدرۆ خستۆتەوە.

---

[٤] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

**٣٩٤١- عَنْ ابْنِ عُمَرَ** (رضى الله عنهما) **أَنَّ النبي** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **قَالَ لأَصْحَابِهِ: لاَ تَدْخُلُوا عَلَى هَؤُلاَءِ الْقَوْمِ إِلاَّ أَنْ تَكُونُوا بَاكِينَ فَإِنْ لَمْ تَكُونُوا بَاكِينَ فَلاَ تَدْخُلُوا عَلَيْهِمْ أَنْ يُصِيبَكُمْ مِثْلُ مَا أَصَابَهُمْ** [٥].

**ئیبنو عومەر** (خودایان لێ ڕازی بێت) **دەڵێ: لە غەزای تەبووکا پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێت) **بە یارانی خۆی فەرموو: مەڕۆنە ناو شوێنەوارو شوێن هەواری ئەم گەلە دوا بڕاوەوە، مەگەر بەگریانەوە، خۆ ئەگەر گریانتان نەدەهات ئەوا مەڕۆنە ناو وولاتەکەیان، مەبادا بەسەرهاتە ناخۆش و پڕ ناسۆرەکەی ئەوان لە ئێوەش ڕوو بدات! (ش).**

**٣٩٤٢- وعنه أَنَّ النَّبِيَّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **لَمَّا نَزَلَ الْحِجْرَ أَرْضَ ثَمُودَ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ أَمَرَهُمْ أَنْ لاَ يَشْرَبُوا مِنْ بِئْرِهَا، وَلاَ يَسْتَقُوا مِنْهَا فَقَالُوا قَدْ عَجَنَّا مِنْهَا، وَاسْتَقَيْنَا. فَأَمَرَهُمْ أَنْ يَطْرَحُوا ذَلِكَ الْعَجِينَ وَيُهَرِيقُوا ذَلِكَ الْمَاءَ. رواهما البخاري في بدء الخلق ومسلم في الزهد وزاد. وأمرهم أن يستقوا من البئر التي كانت تردها الناقة.**

**دیسان ئەو** (خودای لێ ڕازی بێت) **گوتی: لە غەزای تەبووکدا، کاتێ پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێت) **گەیشتە خاکی حیجر کە وولاتی هۆزی ثەموودە لەوێ دابەزی و لای دا و فەرمانی بەهاوڕێیانی کرد: کە نەلەئاوی بیرەکەی بخۆنەوەو نە ئاوی لێ بگرن، ئەوانیش عەرزیان کرد: ساخۆ هەویریشمان پێ شێلاوەو ئاویشمان لێ هەڵگرتووە! ئەویش فەرمانی پی کردن: کە هەویرەکەفڕێدەنە بەر ووشترەکانیان و ئاوەکەیش بڕێژن (ش = ب + م) گێڕانەوەی (م = موسلیم) ئەم ڕستەیەی پترە: بەڵام فەرمانی پێ کردن کەلەو بیرە ئاوبگرن کە کاتی خۆی ووشترەکەی صالح پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێت) **ئاوی لێ دەخواردەوە.**

**قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَلَقَدْ آتَيْنَاكَ سَبْعًا مِّنَ الْمَثَانِي وَالْقُرْآنَ الْعَظِيمَ}⇐(ب/٥ ز/٨١ ف/١).**

---

[٥] بخاري. أحاديث الأنبياء: ٣٣٨٠. مسلم. زهد: ٧٣٩٠.

٣٩٤٣- ⇐ (ب-١ ز-٧٢ ل-٢٤٧ ف-٤) + (ب-٥ ز-٨١ ل-٢٩٣ ف-١ + ف-٢)[٧].

**٣٩٤٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) ( الَّذِينَ جَعَلُوا الْقُرْآنَ عِضِينَ ) قَالَ: هُمْ أَهْلُ الْكِتَابِ، جَزَّءُوهُ أَجْزَاءً، فَآمَنُوا بِبَعْضِهِ وَكَفَرُوا بِبَعْضِهِ. رواه البخاري[٨].

**ئیبنو عەبباس** (خودای لێ ڕازی بێت) **لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا:**

{الَّذِينَ جَعَلُوا الْقُرْآنَ عِضِينَ - ١٥/٩١}.

**واتە: وەئینزارتان دەکەم بەوێنەی ئەو سزایەی کە ڕەوانەمان کرد بۆ سەر ئەو کافرانەی کە قورئانیان بەش بەش کردبوو گوتی: مەبەس لەم ئایەتە خاوەن نامەکانە،واتە: گاورو جولەکەکانە، ئەمانە قورئانیان بەش بەش کردبوو، هەرچی ڕێكو موافیقی کتێبی خۆیان بوو باوەڕیان پێ دەکرد، وەهەرچی بەدڵیان نەبوایە حاشایان لێ ی دەکرد (ب).**

**٣٩٤٥- عن أنس** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ النبيِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فِي قَوْلِهِ تَعَالَى (لَنَسْأَلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ، عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ ) قال: عَنْ قَوْلِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. رواه الترمذي[٩].

**ئەنەس (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا:**

{فَوَرَبِّكَ لَنَسْأَلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ، عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ -١٥/٩٢-٩٣}.

**واتە: سوێندم بە خودای تۆ کە تۆی پەروەردە کرد هەتا پێ ی گەیاندی، پرسیار دەکەین لەو کافرانە یەك بەیەك لەو کردەوانە کە لە دنیادا دەیکەن گوتی: لە ڕاڤەی ئەمەدا حەزرەت** (دروودی خودای لەسەر بێت) **فەرمووی: لەبارەی ووشەی پیرۆزی (لااله الا الله) وە پرسیاریان لێ دەکرێ (ت).**

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَاعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّى يَأْتِيَكَ الْيَقِينُ - ١٥/٩٩}.

---

[٧] تقدم برقم: ٤ / ٤٧٢ تسلسل / ٧٢ مجلد أول + مجلد خامس / تسلسل / ٨١ رقم: ٣٦٣٠/١.

[٨] بخاري. تفسير: ٤٧٠٥.

[٩] بخاري. تفسير: ٤٧٠٥.

واتە: بەندەیی و عیبادەتی ساخ بکە بۆ پەروەردگاری خۆت بەردەوام هەتا مردن، هەتا کاتی مەرگ و ئاکام، کە شتێکە ئاشکراو دیارییەو هەقەو ڕاستەو بەقەی نووکی دەرزی گومانی تێدا نیە.

١٠- قال سالم بن عبدالله: اليقين الموت. رواه الْبُخَارِيُّ[١٠].

سالمی کوڕی عەبدوڵلا (خودای لێ ڕازی بێت) گوتی: مەبەست لە (اليقين) لەم ئایەتەدا مەرگ و مردنە (ب) بە بۆنەی ئەم ووشترەی هۆزی ئەمووده وە ئەم چەن شیعرەتان پێشکەش دەکەم، وە پێشکەشی دەکەم بەگەلی فەلەستینی برا، خودا دەرووی ڕەحمەتی خۆیمان لێ بکاتەوە:

یا شعب ثورة الحجارة المسومات في
عينيك ما في عين أمتي من التأسف
على قريب خائب قد لاذ بالتأفف
أغرى العدو بالأذى من كثرة التسوف
على عدو غاشم قد داس بالتعجرف
كل القيم، بلا حياء ما، ولا تخوف!
حتى شممت ما يدل أنهم أقارب
بعضهموا لبعضهم، نحن وهم أجانب
كأنكم ونحن في دار معا نحارب
عدونا المشترك الخبيث او نضارب!
فسد في وجهي جميع الدرب غير واحد
هو الرجا لنا كما هو الفنا لحاقد،،،:
يامن ترى النمال في جحورها الدجى كما
ترى الشموس والنجوم الزهر في جو السما

---

[١٠] بخاري. تفسير: ذكره تعليقا في باب (واعبد ربك حتى يأتيك اليقين. سورة الحجر بعد رقم / ٤٧٠٦ مباشرة.

یــامن لاجـل ناقــة دمــرت قومــا كـــاملا
الا ترى الأذى الذي قـد عـم شـعبى شـاملا
اليس فـيهم مـؤمن كلـف فـوق الطاقـة
أو طفلـــة يتيمـــة بريئـــة كالناقـــة !
الـيس فــيهم شـيخة أمـرت بـالبر بهـا
لأنهــا قـــد آمنـــت مـــع قومهـــا بربهـــا !
ياأرحماً من كـل راحمـين رحمـاك المنـى
لكل مظلـوم، وقهـرك المنـى لمـن جنـى

المترجم – كركوك – ١٩٨٩/٨/١٥

## ١٧) سورەتی نەحل : (سورة النحل)

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٣٩٤٧– (ب–١ ز – ١٨٠ ل – ٤٩٠ ف – ٢)[1].

قال الله تعالى: {وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُرِ – ١٦/٧٠}.

واتە: هی واتـان هەیە کە زۆر پیر دەبێ و وەکی منداڵی ووردە ساڵ و پـەتیارەی لێ دێ و بـەرە بـەرە هەرچـی زانیـوە هیـچی لـە بیر نامێنـێ وەبەمـە دەگوترێ: ئەرزەلولعومر، واتە: تەمەنی کەسیفی و کەفتەکاریی.

٣٩٤٨– عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) كَانَ يَدْعُو أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْبُخْلِ وَالْكَسَلِ، وَأَرْذَلِ الْعُمُرِ، وَعَذَابِ الْقَبْرِ، وَفِتْنَةِ الدَّجَّالِ، وَفِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ[2].

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێت) گوتی: هەمیشە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) ئەم نزایەی دەکرد: (أعوذ بك من البخل والكسل وارذل العمر وعذاب القبر وفتنـة

---

[1] سبق في: رقم / ٢ / ٩٦٤ مجلد أول تسلسل / ١٨٠.

[2] بخاري. تفسير: ٤٧٠٧.

الـدجال وفتنـة المحيـا والممـات): خودایـە! پـەنا دەگـرم بـەزاتی تـۆ لـە ڕژدیو چـرووکیو لـە تەمـەڵیو تـەوەزەلیو لەتەمـەنی کەسـیفیو کەفتـەکارییو لـە عەزابی قەبرو سزای گۆڕو لە فیتنەو ئاژاوەی جەجاڵو لە پشێوییو ئاژاوەی ژیانو مردن! (ب).

قال الله تعالى: {إِنَّ إِبْرَاهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِلَّهِ حَنِيفًا - ١٦/١٢٠}.

واتە: بەڕاستی ئیبراهیم باپیرە گەورەی ئێوە بەتەنیا خۆی ئۆمەتێ بوو بـۆ خـۆی! وەملکـەچو فەرمانبـەر داری خـودا بـوو، وەلای دابـوو لـە ئـاییـنی بەتاڵو پووچو بەدڵ ڕووی کرد بووە خودا.

٣٩٤٩- قال عبدالله: الأمَّة مُعلِّم الخير والقانت المُطيع. رواهما الْبُخَارِيُّ[٣].

عەبـدوڵڵا (خودای لێ ڕازی بێت) گـوتی: (أمـە) واتـە: مامۆستای خێرو چاکە (قانت) یش یانی گوێڕایەڵو ملکەچ (ب).

٤- عَنْ أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ لَمَّا كَانَ يَوْمُ أُحُدٍ أُصِيبَ مِنَ الأَنْصَارِ أَرْبَعَةٌ وَسِتُّونَ رَجُلاً وَمِنَ الْمُهَاجِرِينَ سِتَّةٌ فِيهِمْ حَمْزَةُ فَمَثَّلُوا بِهِمْ فَقَالَتِ الأَنْصَارُ لَئِنْ أَصَبْنَا مِنْهُمْ يَوْمًا مِثْلَ هَذَا لَنُرْبِيَنَّ عَلَيْهِمْ قَالَ فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ فَتْحِ مَكَّةَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ (وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُمْ بِهِ وَلَئِنْ صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِلصَّابِرِينَ) فَقَالَ رَجُلٌ لاَ قُرَيْشَ بَعْدَ الْيَوْمِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) كُفُّوا عَنِ الْقَوْمِ إِلاَّ أَرْبَعَةً. رواه الترمذي بسند حسن[٤].

ئوبەیی کوڕی کەعب (خودای لێ ڕازی بێت) گـوتی: لەڕۆژی غـەزای ئوحـوددا لەیاریـدەدەران شەسـتو چـوار پیـاو کـوژران، لـە کۆچـکارانیش (بەحـەمزەی مامەی پێغەمبەرەوە) شەش کەس کوژران کافرەکان لچو لێوی شـەهیدەکانیان کرد بوو، جا یاریـدەدەران گوتیان: ئەگەر دەستمان ڕۆیـی بەسـەریاندا هـەقی

---

[٣] بخاري. تفسير. ذكره البُخارِيُّ تعليقا قبل رقم / ٣٣٤٩ في كتاب الأنساء.

[٤] حسن عند الترمذي.

خۆمانیان بەزیادەوە لێ دەکەینەوە، جا کاتێ فەتحی مەککە ڕووی دا خودای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند:

{وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُواْ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِ وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّابِرينَ – ١٢٦/١٦}.

واتە: لەسەر نەشری ئیسلامو پەخش بوونەوەی، ئێوە تووشی گەلێ بەرهەڵستیو قسەو کاری ناهەموار دەبن، لە کافرانەوە، جا ئەگەر ویستتان هەقی خۆتان بکەنەوەو تۆڵەی خۆتانیان لێ بکەنەوە، ئەوە دەبێ هەق بەهەق بکەنەوەو بەس، گەرچی خۆبگرن و لێ بوردنتان هەبێ ئەوە گەلێ باشترە، دیارە هەمیشە پاداشی باش بۆ خۆگرانو لە خۆبوردووانە. پیاوێ گوتی: ئەمڕۆ قوڕەیش بنەبڕ دەبن! پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێت) فەرمووی:چوار کەسی لێ دەرچێ واز لەوانی تریان بێنن (ت – س/ح).

## ١٨) سوورەتی ئیسراء : (سورة الأسراء)

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

عن عبدالله (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ وَالْكَهْفِ وَمَرْيَمَ إِنَّهُنَّ مِنَ الْعِتَاقِ الأُوَلِ، وَهُنَّ مِنْ تِلاَدِي. رواه البخاري[1].

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (خودای لێ ڕازی بێت) گوتی: سوورەتی بەنی ئیسرائیل (کە پێشی دەڵێن سوورەتی ئیسرا) و سوورەتی کەهفو سوورەتی مەریەم لە سوورەتە دێرینە نایابەکانن، کەلە مەککە دابەزی بوون، وە من لە مێژەوە ئەم گەنجی درەخشانانەم کردوون بەماڵو لە بەرم کردوون! (ب).

قال الله تعالى: {سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِّنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ – الآية ⇐ (ب –٤ ز–١٠٠ ل–٢٩٨).

---

[1] بخاري. تفسير: ٤٧٠٨.

**٣٩٥٢**- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أُتِيَ بِالْبُرَاقِ لَيْلَةَ أُسْرِىَ بِهِ مُلْجَمًا مُسْرَجًا فَاسْتَصْعَبَ عَلَيْهِ فَقَالَ لَهُ جِبْرِيلُ أَبِمُحَمَّدٍ تَفْعَلُ هَذَا فَمَا رَكِبَكَ أَحَدٌ أَكْرَمُ عَلَى اللَّهِ مِنْهُ قَالَ فَارْفَضَّ عَرَقًا [٢].

**ئەنەس** (خودای لێ ڕازی بێت) **گوتی: ئەو شەوەی کە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێت) **دەبرێ بۆ ئیسراو شەوڕەوی پێ دەکەن، بۆ ڕاق لغاوو زین دەکەن و بۆی دەیهێنن، بەڵام بوراق لاملی و لامنجی دەکاو ڕێگە نادا کە حەزرەت** (دروودی خودای لەسەر بێت) **سواربێ، جوبرەئیل** (دروودی خودای لەسەر بێت) **پێ ی دەفەرموێ: ئەوە لەگەڵ موحەممەددا ئەمە دەکەی! ئەوەتی تۆ هەیت هێشتا کەسێکی تری وەکوو ئەم ئاوا خۆشەویست و بەڕێزو نازارو بەقەدرو هێژا لەلای خودا پێی نەناوەتە سەر پشتی تۆ! گوتی: ئیتر بوراق مل دەداو لەتەریقیدا لەشی دەکەوێتە سەر ئارەق (ت – س/ح).**

**٣٩٥٣**- عَنِ بُرَيْدَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ عن النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قال: لَمَّا انْتَهَيْنَا إِلَى بَيْتِ الْمَقْدِسِ قَالَ جِبْرِيلُ بِإِصْبَعِهِ فَخَرَقَ بِهِ الْحَجَرَ وَشَدَّ بِهِ الْبُرَاقَ. رواهما الترمذي بسندين حسنين[٣].

**بورەیدە** (خودای لێ ڕازی بێت) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێت) **فەرمووی: کە گەیشتینە بەیتولمەقدیس لەوێ جوبرەئیل بەپەنجەی ئاماژەی لە بەردی صەخرەتوڵلاکردو بەردەکەی بە پەنجەی کون کردو بۆراقی پێوە بەستەوە! (ت – س/ح).**

**٣٩٥٤- (ب – ٤ ر – ٢٤ ل – ٨٢ ف – ١ + ٢ + ب – ٤ ز – ١١٥ ل – ٣٧٨ ف – ٤ + ب – ٤ ز – ١٦ ف – ٣ + ب – ٤ ز – ١٧ ف – ١ + ٢)[٤].**

---

[٢] عند الترمذي بسند حسن.

[٣] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[٤] تقدم برقم: ١ / ٣٢٠٥ مجلد رابع تسلسل / ٢٤ و ٢ / ٢٧٣١ + مجلد رابع تسلسل / ١١٥ رقم: ٤ / ٣١٦٨ + مجلد رابع تسلسل / ١٦ رقم: ٣ / ٢٦٣٨).

٣٩٥٥- (ب - ٤ ز - ٢٤ ل - ٨٢ ف - ٢)[٥].

٣٩٥٦- (ب - ٤ ز - ١٠٠ ل - ٢٩٩ ف - ٢ + ف - ١)[٦].

قال الله تعالى: {وَما كُنّا مُعذّبين حتّى نُبعث رَسُولاً وَإِذَا أَرَدْنَا أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا الْقَوْلُ فَدَمَّرْنَاهَا تَدْمِيرًا - ١٧/١٥-١٦}.

یەزدانی پاك فەرموویەتی: خودا لە خۆڕایی كەس ئازار نادا، لە پێشا ڕابەر دەنێرێ ڕێگەی چاك‌و خراپ بە خەڵك دەڵێ، وەكاتێ كاتی ئەوە هات كە خودا ئاوەدانی یەك وێران بكا، فەرمان دەدا بە گەورە پیاوان‌و ئاغاو بەگەكان، كە خوویان گرتووە بەرابواردنی خۆشەوەو هەمیشە خەریكی عەیش‌و نۆشن، كەواز لەهەوەس پەرستی و ئارەزوو بازی بێنن‌و لە ڕێی شەرعی خوا دەر نەچن، بەڵام ئەوان زیاتر لە یاسا لادەدەن‌و لە ڕێ دەردەچن، ئیتر لەسەر فەرموودەی خودا سزا دەڕوا بۆ سەریان‌و وولاّتیان وێران دەبێ‌و خاكیان بەتوورەكە دەبێژرێ!

٣٩٢١- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ أَنَّ النَّبِيَّ (صلّى الله عَلَيْهِ وَسَلّم) لَمَّا نَزَلَتْ (يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ) إِلَى قَوْلِهِ ( وَلَكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ) قَالَ أُنْزِلَتْ عَلَيْهِ هَذِهِ وَهُوَ فِي سَفَرٍ فَقَالَ أَتَدْرُونَ أَىُّ يَوْمٍ ذَلِكَ. فَقَالُوا اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ ذَلِكَ يَوْمَ يَقُولُ اللَّهُ لآدَمَ ابْعَثْ بَعْثَ النَّارِ فَقَالَ يَا رَبِّ وَمَا بَعْثُ النَّارِ قَالَ تِسْعُمِائَةٍ وَتِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ إِلَى النَّارِ وَوَاحِدٌ إِلَى الْجَنَّةِ. قَالَ فَأَنْشَأَ الْمُسْلِمُونَ يَبْكُونَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- قَارِبُوا وَسَدِّدُوا فَإِنَّهَا لَمْ تَكُنْ نُبُوَّةٌ قَطُّ إِلاَّ كَانَ بَيْنَ يَدَيْهَا جَاهِلِيَّةٌ قَالَ فَيُؤْخَذُ الْعَدَدُ مِنَ الْجَاهِلِيَّةِ فَإِنْ تَمَّتْ وَإِلاَّ كَمُلَتْ مِنَ الْمُنَافِقِينَ وَمَا مَثَلُكُمْ وَالأُمَمِ إِلاَّ كَمَثَلِ الرَّقْمَةِ فِى ذِرَاعِ الدَّابَّةِ أَوْ كَالشَّامَةِ فِى جَنْبِ الْبَعِيرِ ثُمَّ قَالَ إِنِّى لأَرْجُو أَنْ تَكُونُوا رُبُعَ أَهْلِ الْجَنَّةِ. فَكَبَّرُوا ثُمَّ قَالَ إِنِّى لأَرْجُو أَنْ تَكُونُوا ثُلُثَ أَهْلِ الْجَنَّةِ.

---

[٥] تقدم برقم: برقم: ٢ / ٢٧٣١ مجلد رابع تسلسل / ٢٤.

[٦] تقدم برقم: ١ / ٣١٥٤ مجلد رابع تسلسل / ١٠٠ ورقم ٢ / ٣١٥٥.

فَكَبَّرُوا ثُمَّ قَالَ إِنِّي لأَرْجُو أَنْ تَكُونُوا نِصْفَ أَهْلِ الْجَنَّةِ. فَكَبَّرُوا قَالَ وَلاَ أَدْرِي قَالَ الثُّلُثَيْنِ أَمْ لاَ. رواه الترمذي في الحج والبخاري في بدء الخلق[٧].

**عیمرانی کوڕی حوصەین** (خودای لێ ڕازی بێت) **گوتی: لەسەفەرێکا، ئەم دوو ئایەتە بۆ حەزرەت هاتنە خوارێ** (درودی خودای لەسەر بێت):—

{يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ. يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّا أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَى وَمَا هُم بِسُكَارَى وَلَكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ – ٢٢/١-٢}.

**واتە: ئەی مەردوم! لەپەروەردگاری خۆتان بترسن‌و خۆتان لە بێ ئەمری ئەو بپارێزن، بەڕاستی ڕۆژانی گەلێ سەخت‌و پڕ لە سام‌و ترستان وا لە پێشەوە، یەکێ لە وانە ڕۆژی ژێنەوەیە، کە دەبێ بەفەرتەنەو پشێویی یەکی وا کەس سەرکەسی ناپەرژێ بەتایبەت بوومەلەرزەیەکی گەورە ڕوودەدا، گۆی زەوی وەك لانکی شڕو شەق ڕادەژەنێ، ئەو ڕۆژە کە مەردوم ئەو حالە بە چاوی سەر دەبینن، لە ترساناو لە تاوانا منالێ بەبەرئاگای لە بەچکەی خۆی نامێنێ‌و دووگیان خورپەی لێ دەکەوێ‌و سکەکەی لە باردەچێ، بگرە هەموو بەرداری بەردەخا، وێستاو وا شلۆق‌و ئالۆزو سامناك دەبێ کە تەماشای مەردوم دەکەی لە تۆ وایە مەست‌و سەر خۆشن‌و ئارەق‌و بادە نۆشن‌وئەوەندە حەپەساوو شلەژاوو پەرۆشن، بەلام سەرخۆشی‌و مەستی چی، کێ دەیپەرژێتە سەر شتی وا، نەء نەء مەست‌و سەرخۆش نین بەلام سزای توندی ئەو ڕۆژە وا ووڕو گێژو وێژی کردوون. جا حەزرەت** (درودی خودای لەسەر بێت) **فەرمووی: ئەرێ دەزانن ئەوە کام ڕۆژەیە؟ گوتیان: خوداو پێغەمبەری خودا باشتری دەزانن، فەرمووی: ئەوە ئەو ڕۆژەیە کە خودا بە ئادەم دەفەرموێ: ئەی ئادەم! دەستەی دۆزەخ جیاوەکە بابڕۆن بۆ ناوی! ئادەمیش دەفەرموێ: ئەی پەروەردگارم! دەستەی دۆزەخ چەند لە**

---

[٧] بخاري. تجريد/ ٤ ل/٢٠ رقم/١٣٤٢ = رقم فتح الباري شرح صحيح البُخارِيُ/ ٣٣٤٨. مسلم. إيمان: ٥٣١.

چەندە؟ دەفەرموێ: لە هەموو هەزار کەسێ نۆسەدو نەوەدو نۆی بەشی ئاگری دۆزەخەو تاقە یەکێکی بەشی بەهەشتە! گوتی: کە ئەمەی فەرموو موسوڵمانەکان دەستیان کرد بە گریان، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێت) فەرمووی: لە هەموو کارێکتانا منەیی میانەڕەویی بکەنو ئامانجتان چاکە بێو چاو ببڕنە کاری خێرو لە کاری خێرا کۆتاهیو درێغی مەکەن، هەر چەند ئەمە وەك گوترا وایە ئومێدتان بە بەخششی خودا قەوی بێ چونکە هەموو جارێ کە خودا پێغەمبەری نارد بێ لە پێش هاتنی ئەو پێغەمبەرەوە ماوەیەکی نەزانیو کافری هەبووە. فەرمووی: جا ئەو ژمارەیە (کە نۆسەدو نەوەدو نۆیە) لە خەڵکی ئەو سەردەمی جاهیلییەتو نەزانی یە تەواو دەکرێ، ئەگەر ئەوان بەشیان کرد ئەوا باشە ئەگینا ئەو ژمارەیە لە مونافیقو ناپاکەکانی ئەو ئوممەتە تەواو دەکرێ، سەرەڕای ئەمەیش ئێوە لە چاو نەتەوەو میللەتەکانی تری پێش خۆتاندا وەك ئەو پوولەکە ڕقەڵەیە وان کە وا بە دیوی ناوی ڕەفیسکی وولاخەوە کە دەڵێی پینەیە بەلاقیەوە، یا ئێوە بەقەد خاڵێ دەبن کە بەتەنشتی ووشترێکەوەبێ، لە پاشدا فەرمووی: ئەمن بەتەمای ئەوەم کە ئێوە چواریەکی خەڵکی بەهەشت بن، یارانیش لەخۆشیانا گوتیان: ئەڵڵاهو ئەکبەر. ئەوسا فەرمووی: من بەهیوای ئەوەم کە ئێوە سێ یەکی خەڵکی بە هەشت بن دیسان یاران گوتیان: ئەڵڵاهو ئەکبەر، ئینجا فەرمووی: بگرە من بە هیوای ئەوەم کە ئێوە نیوەی خەڵکی بە هەشت بن دیسان یاران گوتیان: ئەڵڵاهو ئەکبەر! عیمران دەیگوت: ئەدیی نازانم حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێت) فەرمووی: بەڵکوو ئومێد دەکەم کە ئێوە دوو سێ یەکی دانیشتوانی بەهەشت بن یانا (ت/ب).

٣٩٥٨- قال عبدالله (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): كُنَّا نقول للحيِّ إِذا كَثروا في الجاهليَّة أمر بنو فُلانٍ. رواه الْبُخَارِيُّ[٨].

---

[٨] بخاري. تفسير: ٤٧١١.

عەبدوڵلا (خودای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: لە سەردەمی نەزانی دا کە خێل بەرەبەرە نەتەوەیان دەخستەوەو زۆر دەبوون پێمان دەگوتن: أمر بنو فلان: نەوەی فیسار پەرەیان سەند، واتە: زۆربوون واتە: لەسەر ئەم ڕاڤەیە

ووشەی (أمرنا مترفيها) واتەی وایە: کەیفکەرەکانی ئەو وولاّتەمان زۆر دەکردو ئەوانەی کە وەکی ئاژەڵ هەر خەریکی ڕابواردنی دنیایین پەرەیان دەسەند (ب)

قال الله تعالى: {وَآتَيْنَا دَاوُودَ زَبُورًا – ١٧/٥٥}.

واتە: زەبوورمان داوە بە پێغەمبەر داوود (دروودی خودای لەسەربێ).

٣٩٥٩– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ خُفِّفَ عَلَى دَاوُدَ الْقِرَاءَةُ، فَكَانَ يَأْمُرُ بِدَابَّتِهِ لِتُسْرَجَ، فَكَانَ يَقْرَأُ قَبْلَ أَنْ يَفْرُغَ. رواه البخاري[٩].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێت) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەر بێت): خوێندنی زەبوور وا سووك‌و ئاسان کرابوو بۆ داوود، گەلێ جار کە فەرمانی دەکرد وولاّخەکەیی بۆ زین بکرێ خۆی لەو ماوە کەمەدا طەیی زەمانی بۆ دەکرا لە خوێندنی زەبوور دەبۆوە کەچی هێشتا کابرا لە زین کردنی وولاّخەکە نەبوو بۆوە! (ب):

طەیی زەمانیش وەک طەیی مەکان

ثابیتە بە پێی حەدیث‌و قورئان!

ئیسراوۆ میعراج ئەگەر تێ بگەی

ئیسپاتی هەردوو بەهەر دوو دەکەی

چەن کاری گەورەو چەن ساڵە ڕێگە

چۆن چۆنی کردی‌و چۆن گەییە جێگە

---

[٩] بخاري. تفسير: ٤٧١٣.

قال الله تعالى: {أُولَئِكَ الَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَى رَبِّهِمُ الْوَسِيلَةَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحْذُورًا - ٥٧/١٧}.

واتە: ئەوانەی ئەوان بەندەیی یان بۆ دەکەن خۆیان منەیی هۆیی دەکەن و مشووری شتێ دەخۆن کەلە خوداوە نزیکیان بکاتەوە، کامیان کە بە بیری خەڵکی لە خوداوە نزیکترە لە هەموویان زیاتر دەگەڕێ بە شوێن شتێ ببێ بەمایەی ڕەزای خودا و ئومێدی ڕەحمەتی خودای لێ بکرێ، کەواتە ئەوەی نزیك نەبێ دەبێ حاڵی چۆن بێ، ئەوان بە هیوای ڕەحمەتی خودان و لەسزاو ئێش و ئازارو زەحمەتی ئەوزاتە بێ باکە دەترسن، کەواتە چۆن هەڵەی وا گەورە دەکەن خۆیان بکەن بە خوادرۆینە! هەقیشیانە کە لە مەکرو عەزابی خودا ئەمین نەبن، چونکی بەڕاستی ئەوەی تۆزقاڵێ هۆش و گۆشی هەبێ لەسزای خودای تۆ دەترسێ.

٣٩٦٠- قال عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) كَانَ نَاسٌ مِنَ الإِنْسِ يَعْبُدُونَ نَاسًا مِنَ الْجِنِّ، فَأَسْلَمَ الْجِنُّ، وَتَمَسَّكَ هَؤُلاَءِ بِدِينِهِمْ. رواه الشيخان[١٠].

عەبدوڵلا (ڕەزای خوای لێ بێ) گوتی: چەن کەسێ لە کۆمەڵەی ئادەمیزاد چەند کەسێکیان دەپەرست لە کۆمەڵەی جنۆکە، جا جنۆکەکانیان بۆ خۆیان ئیسلام بوون، کەچی ئەوان هەریەخەی ئایینە پووچەکەی خۆیانیان بەرنەدەدا (ش).

قال الله تعالى: {وَمَا جَعَلْنَا الرُّؤْيَا الَّتِي أَرَيْنَاكَ إِلاَّ فِتْنَةً لِّلنَّاسِ - ٦٠/١٧}.

واتە: وە ئەو خەونەی کە نیشانی تۆمان دا کردمان بە فیتنە بۆ بازەکەسێ، کە باوەڕیان لاوازە، هەروا، باسی ئەو درەختە ناهەموارە دوور لە ڕەحمەتی ئێمەیەیش کەلە ناو ئاگری دۆزەخدا دەیڕوێنین ئەویشمان کردووە بە فیتنە بۆ بازێ بێ ئەقڵ و نەفام.

---

[١٠] بخاري. تفسير: ٤٧١٤ ، ٤٧١٥. مسلم. تفسير: ٧٤٧٠ ، ٧٤٧١.

٣٩٦١- قال ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُمَا) ( وَمَا جَعَلْنَا الرُّؤْيَا الَّتِي أَرَيْنَاكَ إِلاَّ فِتْنَةً لِلنَّاسِ ) قَالَ هِيَ رُؤْيَا عَيْنٍ أُرِيَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِهِ ( وَالشَّجَرَةَ الْمَلْعُونَةَ ) هِيَ شَجَرَةُ الزَّقُّومِ. رواه البخاري والترمذي[11].

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خوایان لێ بێ) دەڵێ: ئەم نیشانداندانو ڕوئیایە کە لەم ئایەتەدا هەیە بریێتی بووە لە دیتنی ڕاستی بە چاوی سەر، نەك بە خەونو خەیاڵ، ئەوەیش لەو شەوەدا ڕووی داوە کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت) برابوو بۆ شەو ڕەوی‌و ئیسرا، کە بەچاوی یەقین‌و بیداری گەلێ شتی سەیر سەیری دیبوو لەخوداوە پیشانی درابوو، ئەو درەختەیش کەلەم ئایەتەدا ناوی براوە بە (الشجرة الملعونة) درەختی ژەقنەمووتە. (ب/ت).

٣٩٦٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فِي قَوْلِ اللَّهِ (يَوْمَ نَدْعُو كُلَّ أُنَاسٍ بِإِمَامِهِمْ) قَالَ يُدْعَى أَحَدُهُمْ فَيُعْطَى كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ وَيُمَدُّ لَهُ فِي جِسْمِهِ سِتُّونَ ذِرَاعًا وَيُبَيَّضُ وَجْهُهُ وَيُجْعَلُ عَلَى رَأْسِهِ تَاجٌ مِنْ لُؤْلُؤٍ يَتَلأْلأُ فَيَنْطَلِقُ إِلَى أَصْحَابِهِ فَيَرَوْنَهُ مِنْ بَعِيدٍ فَيَقُولُونَ اللَّهُمَّ ائْتِنَا بِهَذَا وَبَارِكْ لَنَا فِي هَذَا حَتَّى يَأْتِيَهُمْ فَيَقُولُ أَبْشِرُوا لِكُلِّ رَجُلٍ مِنْكُمْ مِثْلُ هَذَا. قَالَ وَأَمَّا الْكَافِرُ فَيُسَوَّدُ وَجْهُهُ وَيُمَدُّ لَهُ فِي جِسْمِهِ سِتُّونَ ذِرَاعًا عَلَى صُورَةِ آدَمَ فَيُلْبَسُ تَاجًا فَيَرَاهُ أَصْحَابُهُ فَيَقُولُونَ نَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شَرِّ هَذَا اللَّهُمَّ لاَ تَأْتِنَا بِهَذَا. قَالَ فَيَأْتِيهِمْ فَيَقُولُونَ اللَّهُمَّ اخْزِهِ. فَيَقُولُ أَبْعَدَكُمُ اللَّهُ فَإِنَّ لِكُلِّ رَجُلٍ مِنْكُمْ مِثْلَ هَذَا. رواه الترمذي بسند حسن[12].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ خۆش نوود بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لێ بێ) لە شانی فەرموودەی خودای گەورەدا (یوم ندعو كُلَّ أُناسٍ بامأمهم): لە ڕۆژی ژینەوەدا، کۆمەڵ‌و دەستە دەستە، بەرەی ئادەمیزاد بەناوی پێشەواکانیانەوە بانگ دەکەین‌و فریشتە بانگ دەکەن: با پەیڕەوانی فلاَن پێغەمبەر یا فیسار ڕەهبەر بێن بۆ مەیدانی لێپرسینەوەو دەفتەری خۆیان

---

[11] بخاري. تفسير: ٤٧١٦.

[12] حسن عند الترمذي.

وەربگرن حەزرەت لە شانی ئەمەدا فەرمووی: پێشەوای وا هەیە کە بانگ دەکرێ، نامەی کردەوەی پێ دەدرێ، بەدەستی ڕاستی وەری دەگرێ، وە قەدو بالآی شەست باڵ کەلەگەت دەکری، وە تاجێکی لە مرواری لەسەر دەکرێ، لە دوور دوورەوە دەدرەوشێتەوە ئەوجا بەشادیو خۆشی دەگەڕێتەوە بۆ لای هاوڕێکانی، هەر کە لە دوورەوە دەیبینن یەکسەر دەڵێن: ئەی خودایە! ئەمبەختەوەرە بهێنە بۆ ناومانو بیکە بەمایەی خێرو بێرو فەڕوبەرەکەت بۆمان، جا کاتێ کە دەگاتە لایان دەڵێ: مژدەبێ لە ئێوەش هەموو پیاوێ لە ئێوە ئەم خەڵاتەی بۆ دانراوە فەرمووی: هەر چێکوپێشە وای کوفروبێ بڕواییشە، ڕووی ڕەش دەکرێو لە شێ شەست باڵ درێژ دەکرێ، لەسەر شێوەی بابە ئادەم لەبازێ ریوایەتدا: کاکیلەی کافر لە ناو ئاگری دۆزەخدا بەقەی کێویکی لێ دێ ئەوجا تاجێکی ئاگرینی لە سەر دەکرێ هەر لەدوورەوە هاوڕێکانی کە دەیبینن دەڵێن: پەنا بە خودا لە وەیو شەڕی ئەم ڕمووزنە، خودایە! لامانده لە هاتنی ئەمە بۆلای ئێمەفەرمووی: جا کە دەگاتە لایان دەڵێن: ئەی خودایە تەریقو ڕیسوای کە، ئەویش پێیان دەڵێ: خودا بەپەندتانکاو لەناو تانبا، هەموو پیاوێ لە ئێوە ئەم سەمەرەو تەڕنەی بۆ دانراوە (ت- س/ح).

٣٩٦٣- وعنه عن النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قال: فَضْلُ صَلاَةِ الْجَمْعِ عَلَى صَلاَةِ الْوَاحِدِ خَمْسَةٌ وَعِشْرِينَ دَرَجَةً وَتَجْتَمِعُ مَلاَئِكَةُ اللَّيْلِ وَمَلاَئِكَةُ النَّهَارِ فِي صَلاَةِ الصُّبْحِ. قَالَ ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ وَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ (وَقُرْآنَ الْفَجْرِ إِنَّ قُرْآنَ الْفَجْرِ كَانَ مَشْهُوداً). رواه البخاري والترمذي[١٣].

دیسان دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) فەرمووی: نوێژ بەکۆمەڵی لەگەڵ کۆمەڵدا بیستو پێنج پلەو دەرەجە خێرترو گەورەترە لە نوێژی کەسێ کەبەتەنها خۆی بێ، ئەو فریشتانەی کەلە شەودا پاسەوانی ئادەمیزادن لەگەڵ ئەو فریشتانەدا کە لە ڕۆژدا نیگابانی ئەون لەکاتی نوێژی

---

[١٣] بخاري. تفسير: إسراء: ٤٧١٧. مسلم. سورة إسراء / ١٤٧١.

بەیانی دا یەك دەگرن ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: ئەگەر حەزیش دەکەن کە بەڵگەی ئەم قسەو باسەیەتان لە قورئاندا پێ نیشان بدەم، فەرموون ئەمە بخوێنن:

{وَقُرْآنَ الْفَجْرِ إِنَّ قُرْآنَ الْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا - ٧٨/١٧}.

واتە: وەنوێژی کاتی دەرکەوتنی سبەینێش بەجێ بێنە، چونکە بەڕاستی نوێژی بەیانی فریشتە پۆل پۆل دێنە دیاری (ب/ت).

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَمِنَ اللَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِ نَافِلَةً لَّكَ عَسَى أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا - ٧٩/١٧}. ⇐ (ب-١ ز-١٨١ ل١٩٤)

٣٩٦٤- ⇐ (ب-١ ز-٦٢ ل-٢٣١ ف-٢)[١٤].

٣٩٦٥- وسُئِلَ النبي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عَنْ هذهِ الآيَة فَقالَ: هِيَ الشَّفاعة[١٥].

لەبارەی ئەم ئایەتەوە پرسیارکرا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) مەبەست لەم پایەو مەقامە مەحموودو پەسەندەیە چیە؟ فەرمووی: مەبەست لەم بارەگا پەسەندەیە مەقامی شەفاعەتی گەورەیە کەلە ڕۆژی قیامەتا دەدرێ بەمن (ت-س/ح).

٣٩٦٦- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عن النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قال: أَنَا سَيِّدُ وَلَدِ آدَمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلاَ فَخْرَ وَبِيَدِي لِوَاءُ الْحَمْدِ وَلاَ فَخْرَ وَمَا مِنْ نَبِيٍّ يَوْمَئِذٍ آدَمُ فَمَنْ سِوَاهُ إِلاَّ تَحْتَ لِوَائِي، فَيَأْتِينِي النَّاسُ فَأَنْطَلِقُ مَعَهُمْ إِلَى أَنْ قَالَ: فَأَخِرُّ سَاجِدًا فَيُلْهِمُنِي اللَّهُ مِنَ الثَّنَاءِ وَالْحَمْدِ فَيُقَالُ لِي ارْفَعْ رَأْسَكَ سَلْ تُعْطَ وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ وَقُلْ يُسْمَعْ لِقَوْلِكَ وَهُوَ الْمَقَامُ الْمَحْمُودُ الَّذِي قَالَ اللَّهُ (عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا)[١٦].

⇐ (ب-٤ ز-٨١ ل-٢٤٦ ف-٢+٨+١٠).

---

[١٤] تقدم برقم: ٢ / ٤٢٨ مجلد أول. تسلسل / ٦٢.

[١٥] حسن عند الترمذي (شرحه).

[١٦] حسن عند الترمذي (شرحه).

لێرەدا ئەمەی پترە: فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێت) خەڵکە کە دێن بۆ تکا بۆلای من تا ئەوێ کەدەفەرموێ: جامنیش لەپەو ڕوو کوڕنووشێ دەبەم بۆ خودا، خودا بۆ خۆی ستایش‌و سوپاسێ کەشایانی ئەو جێو مەقامە بێ دەیخاتە ناو دڵم‌و دەیکەم، جا پێم دەگوترێ: ئەی خۆشەویست! سەرت هەڵبڕە، داوات چییە بیکە، هەرچی داوابکەی دەیدەم پێت، تکا بکە تکات دەگیرێ، فەرموو بفەرموو قسە بکە، گوێمان لەقسەتەو قسەت نادرێتە دواوە، ئەمە ئەو پایەو بارەگایە پەسەندەیە کە خودا لەشانیا فەرموویەتی: {عَسَى أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا}. (ت-س/ح).

٣٩٦٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) قَالَ كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بِمَكَّةَ ثُمَّ أُمِرَ بِالْهِجْرَةِ فَنَزَلَتْ عَلَيْهِ (وَقُلْ رَبِّ أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ وَأَخْرِجْنِي مُخْرَجَ صِدْقٍ وَاجْعَلْ لِي مِنْ لَدُنْكَ سُلْطَانًا نَصِيراً). روى هذه الثلاثة الترمذي[١٧].

ئیبنو عەبباس (خودای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: لەپێشدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) لەمەککە بوو، لەپاشدا کە خودا فەرمانی پێکرد کە کۆچ بکا بۆ مەدینە ئەم ئایەتەی بۆنارد:

{وَقُل رَّبِّ أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ وَأَخْرِجْنِي مُخْرَجَ صِدْقٍ وَاجْعَل لِّي مِن لَّدُنكَ سُلْطَانًا نَّصِيرًا - ١٧-٧٩}.

واتە: ئەی خۆشەویست! ئەی بەندەی بەڕێزی خۆم! لەخودای خۆت بپاڕێرەوە بڵێ: پەروەردگارا! ئەی خودای من! بەمیهرەبانی‌و لوتف‌و کەرەم‌و بەخششی خۆت بە خێرو خۆشی داخڵی شاری مەدینەم بکە، وە هەروەها بە خێرو خۆشی‌و بەبێ وەی لە شاری مەککەی پیرۆز بەرێم بکە، وەلەلایەنی خۆتەوە بە هێزێکی یارمەتیدەر چاودێریم بکەو هەمیشە چاوی خێرت لێم بێ (ت- س/ص).

---

[١٧] صحيح عند لاترمذي (شرحه).

**٣٩٦٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **قَالَ دَخَلَ النَّبِيُّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **مَكَّةَ يَوْمَ الْفَتْحِ وَحَوْلَ الْبَيْتِ سِتُّونَ وَثَلاَثُمِائَةِ نُصُبٍ، فَجَعَلَ يَطْعُنُهَا بِعُودٍ فِي يَدِهِ وَيَقُولُ جَاءَ الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ إِنَّ البَاطِلَ كَانَ زَهُوقاً، جَاءَ الْحَقُّ، وَمَا يُبْدِئُ الْبَاطِلُ وَمَا يُعِيدُ. رواه البخاري والترمذي**[18].

**عەبدوڵڵا** (خودای لێ ڕازی بێت) **گوتی: ڕۆژی گرتنی مەککە کە پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێت) **هاتە ناو شاری مەککەوە، لەوکاتەدا بەگردیماڵی بەیتا سێ سەدو شەست بتی لێ بوو!! پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێت) **دار دەستێکی بە دەستەوەبوو دەیکرد بە (چاوی) بتەکانداو دەیفەرموو:**

{وَقُلْ جَاء الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ إِنَّ الْبَاطِلَ كَانَ زَهُوقًا - ٨١/١٧)}.

**واتە: هەق و ڕاستی واهات، ئایینی پیرۆزی خودا وا هات ئیسلام سەرکەوت، جێگەی بە شتی هیچ و پووچ و ئایینی پڕو پووچی بتپەرستی لەق کرد، لە ڕاستی دا سەردەمی پڕو پووچی بەسەر چوو، شتی وا باوی نەما، ڕۆژ ڕۆژی ئیسلامە کە ڕێکی هۆشی ساغە، ڕۆژی کوفرو بتپەرستیی و شتی وا تەواو. وەهەروەها حەزرەت** (درودی خودای لەسەر بێت) **دوا بەدوای ئەمە ئەم ئایەتەی تریشی دەخوێندەوە:**

{قُلْ جَاء الْحَقُّ وَمَا يُبْدِئُ الْبَاطِلُ وَمَا يُعِيدُ - ٤٩/٣٤}.

**واتە: بفەرموو: وا ڕۆژی حەق هەڵهات و نووری ئیسلام بڵاو بووەوە بە جیهاندا، ئیتر ئایینی بت پەرستی و شتی وا هیچ و پووچ باوی نەماو کاتی بەسەر چوو وە بنەبڕبوو، وە بڕای بڕای جارێکی تر ڕێز پەیدا ناکاتەوەو سەرهەڵ ناداتەوە! (ب/ت) لە ڕاستی دا ئەوەی لەبەر چاوە ئەم فەرمایشتە ڕاست و دروستە، ئەوەتانێ ڕۆژ بەڕۆژ ڕۆشنبیری نوێ و زانستی ڕاست و دروست پەرە دەسێنێ و ئایینی ڕاست سەردەکەوێ و دڵی مەردوم ڕۆشن دەکاتەوەو جێ بەبیرو باوەڕی رزیوی گەندەڵی کۆن لەق دەکا. گەرچی سەر ڕووی زەوی ئەمە حاڵیەتی:**

---

[18] بخاري. تفسير. إسراء: ٤٧٢٠.

**گۆی زەوی یە یا بەلەمە لەناو دەریای ستەما**

**یاقنگلآشکەیە لە ناو گەردەلوولی تۆزو تەما**

**وەلێ خوا هەقە ڕۆژ بە ڕۆژ بیری ڕۆشن‌و چرای زانست‌و ئالآی خودا پەرستی بەرەو پێش دەڕۆن، ئەگەر بێتو فیرعەونانی سەردەم مەودای نووکی خامەی ڕۆشنبیران بدەن‌و بە ڕەشەبای سەبوونی ئەتۆم بلێسەی چراکەیان نەکوژێننەوە، لە ماوەکی کەما بەرەبەرە سەر ڕووی زەوی دەبێ بەباخی بەهەشت. (وەرگێڕ)**

**٣٩٦٩- وعنه كُنتُ أَمْشِي مَعَ النَّبِيِّ (صلّى الله عليه وسلّم) فِي حَرْثِ الْمَدِينَةِ، وَهُوَ يَتَوَكَّأُ عَلَى عَسِيبٍ مَعَهُ، فَمَرَّ بِنَفرٍ مِنَ الْيَهُودِ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ لَوْ سَأَلْتُمُوهُ فَقَالُوا: لاَ تَسْأَلُوهُ فَإِنَّهُ يُسْمِعُكُمْ مَا تَكْرَهُونَهُ. فَقَالَ بَعْضُهُمْ لَنَسْأَلَنَّهُ. فَقَالُوا: يَا أَبَا الْقَاسِمِ، حَدِّثْنَا عَنِ الرُّوحِ، فَقَامَ النَّبِيُّ سَاعَةً وَرَفَعَ رَأسَهُ فَعَرَفتُ أَنَّهُ يُوحى إِلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: (وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أوتيتم مِنَ الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً). رواه الترمذي والشيخان[١٩].**

**دیسان عەبدوڵلآ گوتی: جارێ لە مەدینە لە خزمەتی حەزرەتدا بووم، لەناو باخە خورمایەکا دەرۆیشتین، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) پەلکە دار خورمایەکی پێ بوو، خۆی دەدا بەسەریدا لەکاتی ڕۆیشتنەکەدا، لەلای دەستەیێ جوولەکەوە ڕابورد، بازێکیان گوتیان: بۆ پرسیارێ لە موحەممەد نەکەین، بازێکی تریان گوتیان: پرسیاری لێ مەکەن، نەبادا وەلآمەکەیتان بەدڵ نەبێ، لە پاشدا گوتیان: ئەی باوکی قاسم! قسەی ڕۆحمان بۆ بکە، ڕۆح (کە گیانی گیانلەبەرە) چییە؟ جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) تاوێ ڕاوەستاو ڕاما، ئەوجا سەری بەرزکردەوە، زانیم کە ئەوە سرووشی بۆ هات، ئەوجا فەرمووی:**

**{وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً - ٨٥/١٧}.**

---

[١٩] بخاري. سورة الإسراء. ٤٧٢١، ٧٢٩٧، ٧٤٥٦. مسلم. سورة الإسراء: ٦٩٩٠. ترمذي. تفسير القرآن/٣١٤١.

واتــە: پرسـیارت لێ دەکـەن لـە حەقیقـەتو ڕاسـتەکی ڕۆح، لـە کونـەو ماهییەتو چییەتی ئەو شتە کە پێی دەڵێن گیان کە گیاندار بە بوونی ئەو گیاندارەو زیندووەو بە نەبوونی ئەو بێ گیانەو مردووە، لە وەڵامیانا بڵێ: ڕۆح لەو شتانەیە کە بەهۆی فەرمانی خوداوە پەیدا دەبێ، ئێوە نایزانن و تێی ناگـەن، لـە سـنووری هـۆش و فـامی ئێـوە بـەدەرە، لـە مـەیش سـەرتان سـوڕ نەمێنێ، چونکی ئەوەی ئێوە دەیزانن لە چاو ئەوەی کە خودا دەیزانێ زۆر زۆر کەمە (ت/ش).

قال الله تعالى: {وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى وُجُوهِهِمْ عُمْيًا وَبُكْمًا وَصُمًّا مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ كُلَّمَا خَبَتْ زِدْنَاهُمْ سَعِيرًا - ٩٧/١٧}.

وەلــە ڕۆژی قیامەتیــشدا زینــدوویان دەکەینــەوەو لــە گۆڕهــەڵیان دەستێنین و لەسەر ڕوویان بە کێشیان دەکەین بۆ دەشتی مەحشەر، بەکوێری و لاڵی و کەڕی!! لەوێشەوە هەروا لەسەر ئەو حاڵەو بەو شێوەیە لە سەردەم ڕایان دەکێشین تا دەیانخەینە ناو دۆزەخەوە، حاڵی دۆزەخ وایە هەرکاتێ بڵێسەکەی نیشتەوە دیسانەوە بڵێسەو کڵپەکەی زیاتر دەکەینەوە، هەتا زیاتر ئازاریان بدا، وە ئەمە حاڵیانە هەتا هەتایە.

٣٩٧٠- عن أَنَسُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَجُلاً قَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ يُحْشَرُ الْكَافِرُ عَلَى وَجْهِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ قَالَ أَلَيْسَ الَّذِي أَمْشَاهُ عَلَى رِجْلَيْهِ فِي الدُّنْيَا قَادِرًا عَلَى أَنْ يُمْشِيَهُ عَلَى وَجْهِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. قَالَ قَتَادَةُ: بَلَى وَعِزَّةِ رَبِّنَا. رواه الشيخان[٢٠].

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێت) گوتی: پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! لە ڕۆژی قیامەتدا بێ بڕوا لەسەر ڕوو چۆن حەشر دەکرێ؟ فەرمووی: ئەو خودایەی کەلەم جیهانەدا دەتوانێ کارێکی وا بکا کە ئادەمیزاد لە سەر دووپێ بڕوا ئایا ناتوانێ کەلەو جیهاندا کارێکی وا بکا کەلەسەر ڕوو بڕوا. قەتادە گوتی: با، بەگەورەیی خودا دەتوانێ و زیاتریش (ش).

---

[٢٠] بخاري. تفسير: ٤٧٦٠ ، ٦٥٢٣. مسلم. صفات المنافقين: ٧٠١٨. تجريد / ٤ ل / ٤٦٨ رقم:١٦٧٧ / ٤٦٧٠ ، ٦٥٣٢ فتح الباري شرح صحيح البُخارِيُّ.

٣٩٧١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عن النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ثَلاثَةَ أَصْنَافٍ صِنْفًا مُشَاةً وَصِنْفًا رُكْبَانًا وَصِنْفًا عَلَى وُجُوهِهِمْ. قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَكَيْفَ يَمْشُونَ عَلَى وُجُوهِهِمْ قَالَ إِنَّ الَّذِي أَمْشَاهُمْ عَلَى أَقْدَامِهِمْ قَادِرٌ عَلَى أَنْ يُمْشِيَهُمْ عَلَى وُجُوهِهِمْ أَمَا إِنَّهُمْ يَتَّقُونَ بِوُجُوهِهِمْ كُلَّ حَدَبٍ وَشَوْكٍ. رواه الترمذي بسند حسن[٢١].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێت) لە حەزرەتەوە (درودی خودای لەسەر بێت) دەفەرموێ: کۆمەڵەی ئادەمیزاد، ڕۆژی ژینەوەو هەستانەوە بەسێ تاقم حەشر دەکرێن: دەستەیەکیان بە پیادەیی دەڕۆن بۆ ئیستگای مەحشەر دەستەیەکی تریان بەسواری دەڕۆن، دەستەیەکی تریان لەسەر ڕوو حەشر دەکرێن گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا! جا ئەوە چۆن لەسەر ڕوو دەڕۆن؟ فەرمووی: ئەو کەسەی کە توانیویەتی لەسەر قاچ بیان ڕۆیبنێ هەر ئەو کەسە خۆشی دەتوانێ کەلەسەر ڕوو بیانڕۆێنێ، ئەدی لەو کاتەدا وا قاڵ دەبن لە ڕۆیین ڕووی خۆیان دەپارێزن لە قۆقزاییو گڵمتکو درکو داڵو شتی وا، وەك چۆن ئەگەر لەسەر پێ بڕۆنو ئەوانەیان بێتە ڕێگە خۆیانی لێ لادەدەن ئاوا لەگێڕانەوەیەکا: ئێوە یا بەپیادەیی یابە سواریی یا لەسەر دەموچاو حەشر دەکرێنو دەبرێن بۆ سارای گردەوە بوون!

قال الله تعالى: {وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى تِسْعَ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ فَاسْأَلْ بَنِي إِسْرَائِيلَ إِذْ جَاءَهُمْ فَقَالَ لَهُ فِرْعَوْنُ إِنِّي لَأَظُنُّكَ يَا مُوسَى مَسْحُورًا - ١٧/١٠١}.

لەکاتی مووسای کوڕی عیمراندا (درودی خودای لەسەر بێت) نۆ موعجیزەی گەورە گەورەی ڕووناکی دیاریم بەخشی بە پێغەمبەر مووسا (درودی خودای لەسەر بێت) کەلە هەندێ ڕیوایاتدا دەفەرموێ ئەمانەن:

یەکەم: عەساکەی مووسا، کە دەبوو بە ئەژدەها.

دووەم: دەستی کە وەك چرا دەگەڕا.

---

[٢١] حسن عند الترمذي.

سێیەم: هێرشی کولله بۆ سەر کشتوکاڵیان.

چوارەم: سپێ دایه لەشی خۆیانو مەڕو بزنو ماڵاتیان.

پێنجەم: هێرشی بۆق، کە دەکەوتنە ناو نانو چێشتو شتی تریانەوە.

شەشەم: خوێن، نانو هەویرو ئاوو شتیان پڕ بوو لەخوێن.

حەوتەم: کاتێ لەزێی نیل پەڕینەوە خودا نۆ دەلاقەی لە قەویی یایی ئاوەکەدا وەکوو نۆکۆڵانی ووشك بۆ دروست کردن لەو نۆ کۆڵانەوە بە ئاسایی لە نیل پەڕینەوە.

هەشتەم: دوازدە سەرچاوەی لە گا بەردێ دروست کرد، بۆ دوازدە تیرەکەی نەوەی یەعقووب پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت) کاتێ کە گەیشتنە دەشتی سینا.

نۆهەم: ئەوەبوو گەزۆو شەلاقە لە دەشتی سینادا بەسەریانا دەباری. جگە لە مانەش گەلێ موعجیزەی گەورە گەورەو فەرموودەو فەرمایشتی وەك گەوهەری پێ نیشان دان، یا پێی فەرموون وەك لە حەدیثەکەی ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا باس کراوە، بەڵام دڵ کەمۆیی بوو بە پیسەوە لە پاك نامۆیی دەکا، نابینن جگەرە خۆر جگەری بە دووکەڵی تووتن کەرت کەرتە کەچی سەد گوڵ دەفرۆشێ بۆ دوو کەڵی جگەرە، بۆی دوو کەڵ بەبۆی یاسو نێرگز نادا،، جا تۆ ئەی موحەممەد! پرسیار لە نەوەی ئێستای ئیسرائیل بکە لە حاڵی مووسا، لەگەڵ فیرعەونی زەمانی خۆیدا، کاتێ کە چوو بۆ سەری و داوای لێ کرد کە لەکەلی شەیتان دابەزێو پێ بنێ لە هەقو دان بنێ بەوەدا کە ئەویش (وەك خەڵکی تر) بەندەیەکە لە بەندەکانی خودا، بەڵام فیرعەون لەکەلی شەیتان نەهاتە خوارێ، وەك فیرعەونەکانی هەموو چەرخو سەردەمێ کە ڕابەرێ پێیان بڵێ: شەرمێ لە خودا بکە، دنیا بێستانی بەرەڵڵانییە، بەندەکانی خودا بۆ عیبادەتی تۆو بۆ فیرعەون پەرستی خەلق نەکراون، فیرعەون وەك ئەم فیرعەونانە بێ شەرمانەو نامەردانە گوتی: ئەوە شێت بووی، دەستیان لێ وەشاندووی، بۆیە قسەی وا پڕو پووچ لە ڕووی گەورەیەکی وەك مندا دەکەی

**کەلاف و گەزافی (انا ربکم الاعلی) دەکا؟! دیارە ئەم شیعرانەش وەڵامی هەموو ڕەهبەرێکە بۆ گشت فیرعەونێ:**

**لە ناحەز وایە باخی بەرەڵاین**

**بەڵام بە خودا وەک قەڵای پۆڵاین**

**کەمەندی دەسمان نامەی خودایە**

**دڵمان لەت لەت کەن قورنانی تیایە**

**پیرە مەگروونمان ئەو بەرزە چیایە**

**کە بۆی موحەممەد لە ناو دڵیایە**

**بەفووی جا دووگەر قەت لەبن نایە**

**بەشی جا دووباز لە عنەتی خوایە!**

**٣٩٧٢- عَنْ صَفْوَانَ بْنِ عَسَّالٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ يَهُودِيَّيْنِ قَالَ أَحَدُهُمَا لِصَاحِبِهِ اذْهَبْ بِنَا إِلَى هَذَا النَّبِيِّ نَسْأَلُهُ فَقَالَ لاَ تَقُلْ لَهُ نَبِيٌّ فَإِنَّهُ إِنْ سَمِعَنَا نَقُولُ نَبِيٌّ كَانَتْ لَهُ أَرْبَعَةُ أَعْيُنٍ فَأَتَيَا النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَسَأَلاَهُ عَنْ قَوْلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ ( وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى تِسْعَ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ) فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لاَ تُشْرِكُوا بِاللَّهِ شَيْئًا وَلاَ تَزْنُوا وَلاَ تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ وَلاَ تَسْرِقُوا وَلاَ تَسْحَرُوا وَلاَ تَمْشُوا بِبَرِيءٍ إِلَى سُلْطَانٍ فَيَقْتُلَهُ وَلاَ تَأْكُلُوا الرِّبَا وَلاَ تَقْذِفُوا مُحْصَنَةً وَلاَ تَفِرُّوا مِنَ الزَّحْفِ وَعَلَيْكُمْ يا معشر الْيَهُودَ خَاصَّةً أَنْ لاَ تَعْدُوا فِي السَّبْتِ. فَقَبَّلاَ يَدَيْهِ وَرِجْلَيْهِ وَقَالاَ نَشْهَدُ أَنَّكَ نَبِيٌّ. قَالَ فَمَا يَمْنَعُكُمَا أَنْ تُسْلِمَا. قَالاَ إِنَّ دَاوُدَ دَعَا اللَّهَ أَنْ لاَ يَزَالَ فِي ذُرِّيَّتِهِ نَبِيٌّ وَإِنَّا نَخَافُ إِنْ أَسْلَمْنَا أَنْ تَقْتُلَنَا الْيَهُودُ. رواه الترمزي بسند صحيح[٢٢].**

**صەفوانی کوڕی عەسسال (خودای لێ ڕازی بێت) گوتی: دوو جوولەکە دبن، یەکێکیان دەڵێ بە هاورێکەی: هەستە بابڕۆین بۆ لای ئەو پێغەمبەرە**

---

[٢٢] صحيح عند الترمذي.

پرسیاری لێ بکەین لەو نۆ ئایەتە، ئەویش دەڵێ: مەڵێ پێغەمبەر چونکە ئەگەر گوێی لێ بێ پێی بایی دەبێ و هەر چاوێکی دەکا بە چوار چاو بۆ فیزکردن بەسەرمانا، دوایی هاتنە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) لە مەعناو مەبەستی ئەم ئایەتە پرسیاریان لێ کرد: (ولقد آتینا موسی تسع آیات بینات) حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت) فەرمووی: ئەو نۆ ئایەتانە ئەمانەن: کە هاوبەش و هاوڕێ بۆ خودا بڕیار مەدەن و زیناو داوین پیسی مەکەن و کەس بە ناڕەوا مەکوژن و دزی مەکەن و سیحرو جادوو بازی مەکەن و پیاوی بێ تاوان پێوە مەکەن و بە ناڕەوا مەیدەنە دەستی دەستەڵاتدار کە بەناهەق لەسەر قسەی ئێوە بیکوژێ چونکە قازی تەماشای دەمی ئێوە دەکاو بە پێی قسەو شایەتی ئێوە بڕیار دەردەکا وەسوود مەخۆن و بوختان بۆ ژنی داوێن پاکی بێ ئاگا مەکەن بە تایبەتی لەسەر ئێوە (ئەی کۆمەڵەی جوو!) کەلە ڕۆژی شەمەدا دەست درێژی نەکەن ئیتر هەردوکیان هەستان هەردوو دەست و هەر دوو پێی حەزرەتیان ماچ کردو گوتیان: ئێمە شایەتی دەدەین کە تۆ پێغەمبەری خودای، فەرمووی: ئەی بۆ ئێجگاری موسوڵمان نابن؟ گوتیان: چونکە داوود داوای لە خودا کردووە کە پێغەمبەر لە نەوەی ئەو نەبڕێ سەرەڕای ئەوەیشە دەترسین ئەگەر ئیسلام ببین جوولەکەکان بمانکوژن (ت-س/ح) وەك گوترا ژمارەی ئایەت و موعجیزەکان پترن لە نۆ، گەورەمان مامۆستا مەلا کەریمی بیارە - خودا پایەداری بکاو ئەم چرا ڕۆشنەمان لێ نەستێنێتەوە (لە تەفسیری نامی زێڕیندا) دەفەرموێ: بەقاعیدەی عیلمی ئوصولێ عەدەد مەفهوومی موخالیفی بۆ ئیعتیبار ناکرێ. مەبەست لە فەرمایشتەکەی مامۆستا ئەمەیە: بەپێی زانستی شەرعشناسی و یاسازانی ژمارە مەبەستی جیاوازی بۆ حلێب ناکرێ و هەڵ دەگرێ لە ڕاستیدا ژمارەی ژمێردراو پتر بێ لە ژمارەی دیاریکراو، وەك ئەوە بڵێین: خودا حەوت ئاسمانی دروست کردووە، ئەمە ڕێ لەوە ناگرێ کە خودا زیاتری لە حەوت ئاسمان دروست کردبێ. (وەرگێڕ)

٣٩٧٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) فِي قَوْلِهِ تَعَالَى ( وَلاَ تَجْهَرْ بِصَلاَتِكَ وَلاَ تُخَافِتْ بِهَا ) قَالَ نَزَلَتْ وَرَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مُخْتَفٍ بِمَكَّةَ، كَانَ إِذَا صَلَّى بِأَصْحَابِهِ رَفَعَ صَوْتَهُ بِالْقُرْآنِ فَإِذَا سَمِعَهُ الْمُشْرِكُونَ سَبُّوا الْقُرْآنَ وَمَنْ أَنْزَلَهُ، وَمَنْ جَاءَ بِهِ، فَقَالَ اللَّهُ تَعَالَى لِنَبِيِّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) ( وَلاَ تَجْهَرْ بِصَلاَتِكَ ) أَيْ بِقِرَاءَتِكَ، فَيَسْمَعَ الْمُشْرِكُونَ، فَيَسُبُّوا الْقُرْآنَ، ( وَلاَ تُخَافِتْ بِهَا ) عَنْ أَصْحَابِكَ فَلاَ تُسْمِعُهُمْ ( وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلاً ). رواه البخاري والترمذي(رَضيَ اللهُ تعالى عَنْهُما)[٢٣].

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس، کە مەشهوورە بە ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لە خۆی وبابێ) لەبارەی ڕاڤەی ئەم ئایەتەوە لێیان پرسی کە دەفەرموێ:

{وَلاَ تَجْهَرْ بِصَلاَتِكَ وَلاَ تُخَافِتْ بِهَا - ١٧/١١٠}.

کەمەعنای وایە: لە قورئان خوێندنی ناو نوێژدا نە زۆر دەنگ بەرزکرەوەو نە زۆر نزم، ئەویش لە وەڵامدا گوتی: ئەم ئایەتە لە کاتێکی وادا دابەزی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) لە مەککە لە تاوی فرە خواییەکان خۆی دەشاردەوەو خۆی دەرنەدەخست پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) دەستووری وابوو کە بەر نوێژیی بۆ هاوڕێکانی دەکرد لە کاتی قورئان خوێندندا دەنگی بەرزدەکردەوە، جا کاتێ هاوبەش پەیداکەرەکان دەنگیان دەبیست جنێویان دەدا بە قورئان و بەو کەسەش کە ناردوویەتی و بەو کەسەیش کە هێناویەتی بۆ سەرزەوی (واتە: جمێنیان بە خوداو قورئان و پێغەمبەرو جوبرەئیل دەدا) ئیتر خودای مەزن ئەم ئایەتەی ناردو فەرمووی بە پێغەمبەری خۆی: (ولاتجهر بصلاتك) واتە: بەدەنگی بەرز لە ناو نوێژدا قورئان مەخوێنە، تا کافرەکان نەیبیسن و جنێو نەدەن بە قورئان، وەئەوەندەیش دەنگ نزم مەکەرەوە کە هاوڕێکانت نەیبیستن و سەریان لێ تێك بچێ لە شوێن کەوتنی تۆدا لەناو نوێژەکەدا بەڵکوو بە دەنگێ بیخوێنە کەلە ناوەندی ئەم دوو پایەدا بێ نەزۆر بەرزو نەزۆر نزم (ب/ت. واتە: ئیمامی

---

[٢٣] بخاري. تفسير. سورة الإسراء / ٤٧٢٢ ، ٧٤٩٠ ، ٧٥٢٥ ، ٧٥٤٧ + ٤٧٢٣.

بوخاری و ئیمامی تیرمذی- ڕەزای خودایان لەسەر بێ ئەم فەرمووده پیرۆزەیان گێڕاوەتەوە).

نیسرا: شەوڕەوی، بەخێرو خۆشی

دەماخمان پڕ بوو لە بۆنی خۆشی

ڕوو لە نەشکەوت کە بچۆرە کۆشی

بادەی مەجمەعی بەحرەین بنۆشێ!

ئەگەر یەک کەون باطن و ظاهر

دەبێ بەداناو زانایێ طاهر

ظاهر چرایە، باطن هەتاوە

چرا بۆ شەوە کە دز لەناوە!!

بەڕۆی نیوەڕۆ چرام بۆ چییە؟

من کە خوام هەبێ عەسام بۆ چییە!

عەساکەی مووسا گۆچانی شوان بوو

بۆ لێخوڕین و عاعای مەڕ جوان بوو

زانستی خدر کانیی ژیان بوو

هەتا بۆ مووساش هەنگوینی شان بوو!

برای موسوڵمان! پەیڕەوی قورئان!

موسوڵمانی پاک، کاکەی کورد زمان!

گوێ شل کە لە بۆ برای دڵسۆزت

ڕەحمەت لە خۆت و عەشرەت و هۆزت

بزانە برا! مردن لە پێشە

لەپاش مردنیش چەن گێرەو کێشە

ڕۆژی واوامان لەبەرە نازیز!

بەردار بەردەدا وەک گەڵای پاییز

کێو دەهەژێنێ، گۆی زەوی وەک گۆم

جمەی دێ، وێنەی ئاووکی ئەتۆم!

سوورەی زەلزەلە وێنەی ناوێنە

ڕوون دەکاتەوە ئەم جۆرە شوێنە

جامی جەمنومای (مثقالة ذرة)

دێنێتە سەر بەڕ چی لە بن بەڕە!!

پەردەی سەرتاوان هەڵ دەدرێتەوە

شەرمن لە شەرما دەبوورێتەوە

تاوان فیلمی هەموو گیراوە

هیچی گوم نابێ هەرچی کراوە!!

گەلێ ڕوو دەبن بەساج، ڕەش و پیس

تەپاوو قوپاو، چرچو لۆچو سیس

هەیە دەبێتە کاڵە یا کلاش

لەسەری دەڕۆن بۆ مەحشەر باش باش!!!

دێمەنێ سەیرە لەسەر سەر ڕۆیین

دوو قاچ لە حەوا سەر لەسەر زەمین!!

هەیە تۆزاوی‌و خەماوی‌و کەسیف

ڕووخاو بەوێنەی کەندی ناوی شیف!

کەواتە کاکە! ڕوو لە خودا کە

چونکە بەڕاستی خودا بێ باکە!!

خوایێ بێ باکی، سەرۆکی دادگای!

لەبەربێ باکی دەڵێی بێ ئاگای!!

هەر لەخۆت جوانە شێنەیی‌و ئارام

دەڵێی ئەیبوبی، جەستەی پڕ لەزام!

ئەم هەموو زوڵم‌و زۆرە دەبینی

سەرڕای ناهەقی‌و کوفرو بێ دینی

کەچـــی هێـــشتاکە جـــەبرە نـــانوێنی

بگـــرە وەک منـــداڵ بەنـــدە دەدوێنـــی

بەقـــسەی جوانـــت دەمـــان لاوێنـــی

بەشـــەوو بـــە ڕۆژ دەمـــان حـــەوێنی

بەشـەو نیـوە شـەو درێـژ دەکـەی دەس:

ئەی بەندەم! منم بۆ هەموو کەس کـەس!

وەرە تـــازووە ژێـــر ســـێبەری مـــن

هەتاکـــەی دەکـــەی ڕقەبـــەری مـــن؟!

ئـەمن خـودای تـۆم، ئـەتۆش بەنـدەی مـن

بـۆ بـۆ یـەکتری بـبین بـە دوژمـن؟!!

هـەر ئەزنـەک دەدەم بـۆ دامـەنی گـوڵ

گـوڵاو لـە دڵمـا بـدا قـوڵو کـوڵ!!

بـبم بـە هـاودەم جـەنابی بۆلبـوڵ

لـەدڵ دەریکـەم جـەخاری پـەیکۆڵ!

هـەر ئەزنـەک دەدەم سـەرکەوم لـە کـەل

دەســتم بگاتــە داوێنــی ئەمــەل!

دەســتم بگاتــە داوێنــی مــەردێ

پـەنامان بـدا لـە پـەنا بـەردێ!

بـەری سـاجی ڕووم بـە خۆڵەکـەوە

بگـرێو دڵ ببـێ بەبـەردی شـەوە!

ڕوو بـە کارەبـا، نـەزەردو نـەڕەش

بـەبۆی بـەردەرەش نـورانیو گـەش گـەش

یـەزدانی گـەورە! ئـەی پاشـای بـێ بـاک!

کەم تۆ دەناسـن بـە دەگمـەن تـاک تـاک

ئەوەنـدە گـەورەی نێمـە سـەد چـەندە

بچووکین، وابێ ڕێژەمان چەندە؟!

نیسبەتی ئێمە لە چاوی تۆدا

نیسبەتی گەردە لە چاوی کۆدا!

قەپانی خودا مەربیخوێنێتۆ

مەر عیلمەکەی تۆ بمان دۆزێتۆ!

دەنا وەک گەردێ گوم بێ لە هەردێ

دەبین بە تۆزی لا قەدی بەردێ

سوێندم بە زاتی پاکی بێ گەردت

بەجێ سەرپەنجەی فێنکو سەردت

گەر لە بێ باکیت نەترسم خوایە!

سەرم بەفەرزی تۆدا نەدایە

بەشەوو بەڕۆژ گونام کربایە

لەگەڵ ئەوەشا ترسم نەبوایە

هێوای بەهەشتی تۆشم هەبوایە

ئەوەندە گەورەو بێ باکی خوایە!

نورەکە! کەمێ شەرم لە خواکە

هەتاکەی دڵت وەها بێ باکە؟!

ئەوەن بێ ناگای دەڵێی بی باکی

دەڵێی گای ڕەشی بۆ قوربان چاکی

گەرچی نامەلاو مەلا بەزێنی

بەهاشەو هووشە هۆش دەتەزێنی

قسەی خۆت بکە بۆ دادەمێنی؟!

خۆ کفر نابێ، دەمێ هەڵ بێنی!!

نووری حاڵ گرتی، دەروێش ئاسایی

گوتی: هەتاکەی منی شەیدایی

لــەم چــۆڵی قوڵقــە وەکـــوو فیـــدایی
عـــەودالْ بم لــە شــوێن نـــووری خـــودایی
لەگـــەڵ ئـــەم‌و ئـــەو، یابـــە جـــودایی
کەچـــی لـــێم بگـــرن بـــەری ڕۆشـــنایی!!
بۆیـــە هەمیـــشە واکـــاس‌و پەســـتم
ئـــاخ! نییـــە دەســـتێ دەس باتـــە دەســـتم
لـــەناو چـــڵپاوی لیکـــاوی زینـــدان
تـــەرمی دڵ دەرکـــاو بـــی بـــا بـــۆ گـــەردان
پێ ی بکـا گەشـتی سـەیرانگای مـەردان
بیباتـــە کـــۆڕی ســـەر خەنەبەنـــدان!
ئـــاوی گـــوێی دادا بـــە نەشـــقی یـــاران
فێربـــێ شـــێوازو دەســـتووری ســـەیران!
هـــەواری یـــاران مەولـــەوی‌و خـــانی
شـــارەزا ببـــێ گـــەلێ بـــە جـــوانی
تانەکـــەی گەشـــتی ســـۆڵاف‌و بێخـــاڵ
ئـــازانی مانـــای چـــی ســـیحری حـــەلاڵ!
واتـــە: تـــا شـــەتاو لـــە هـــەردوو چـــاوان
ســەر ئــەکا وێنــەی تانجــەڕۆو ســیروان
ئـــازانی تـــامی دینـــداریی چـــۆنە
چۆن مەلـە دەکـا بـەبێ ئـاو سـۆنە؟!!
واتـــە: لـــەم قـــسە ئەمـــەم مەبەســـتە
بەخـــەیاڵی خـــاو پـــشتت مەبەســـتە
بەهاشـەو هووشـە هـیچ بـە هـیچ نابـێ
ســـپیکاری جـــوان بـــێ مـــاڵیچ نابـــێ
واتـــە: لـــەم واتـــە ئەمـــەم ناواتـــە:

باخــــیَ بـــــەرداربیَ بـــــەری خەباتــــــە

ئــەی کاکــەی واعــیظ! دیــارە تەماتــە

بــــەفوو باینجـــان کـەیتــــە تەماتـــە؟!

وازم لیَ بیێــنن ســـەرکز کــــەم هـــەنیَ

خـــوا خوامـــە دەرم نەکـــەن لـــە کونـــیَ

چـــــونکە هــــــەژارم بـــــەمن دەوێـــــرن

نـــای لــە ڕاســتی مــن هــەمووتان شـێرن!

ئەگــــــەر بەڕاســـــتی داخـــوازی خێـــرن

تــــۆزیَ ترووســــــکەم لــــە بــــۆ بنێــــرن!

ئافـــەریم واعـــیظ! خـــاوەن مەعریفـــەت

قــسەی ئەســتەقت حیکمەتــە حیکمــەت

وا دەزانم بۆ ڕاڤەی ئەم هۆنراوانە ئەم لێکدانەوەیە پێویست بێ:

١. روو لە ئەشکەوت کە، ئیشارەتە بۆ ئایەتی (فآووا الی الکهف) کە بووە بە دروشمی کاتی ئیعتیزال و گۆشەگیری لە کاتی بلاوبونەوەی شەپۆلی بێ ئایینی دا، هەروەك مەبەست ئەوەشە کەلە دوا سوورەتی ئیسرا سەرەی سوورەتی کەهفە. بادەی مەجمەعی بەحرەین: ئیشارەتە بۆ ئەم دوو مەبەستە: یەکەم: بۆ عیلمی باطن و عیلمی ظاهر، کەلە سەر فەرمایشتی گەورەمان شێخی بەیزاوی (ڕەزای خودای لێ بێ) ئایەتی: (حتی أبلغ مجمع البحرین) ئیشارەو ئاماژەیەکی بۆ ئەم فەرمایشت (قول) ە تیایە. دووەم: موسوڵمانێکی پاك و کوردێکی چاك بێ، وەکوو خواناسی باش جەنابی مامۆستا مەلا ڕەشید بەگی بابان کە خاوەنی کتێبی (اقتران النیرن في مجمع البحرین)ە، کە غەریبی و ئاوارەیی کوڵی پێ نەداوەو بەڵکوو موسوڵمانانەو مەردانە بۆ خێری موسوڵمانان و کوردان (کە سەرجەم موسوڵمانن) تێکۆشاوە.

٢. دەڵێی ئەییوبی جەستەی پڕ لە زارم، لە ئایەت و حەدیثا تەشبیهی ناقص زۆرە، هەر وەك تەشبیهی خودا بەبەندەی خۆیەوە بۆ مەبەستەکانی

لێکچوون زۆرە، وەك: (الله نور السماوات والأرض مثل نوره كمشكاة فيها مصباح) وەك (وضرب الله مثلا رجلين أحدهما أبكم) وەك (الله ارحم بعباده من هذه بولدها).

٣. لەبەر بێ باکی دەڵێی بێ ئاگای. ئەم جۆرە تەعبیرە لە قورئانو حەدیثا هاتووە، وەك: (فاليوم ننساهم كما نسوا لقاء يومهم هذا).

٤. هەر ئەز نەك دەدەم بۆ دامەنی گوڵ. مەبەست مزگەوتو پیاوانی مزگەوتە، مەبەست لە بولبول بانگدەرە، کە لەسەر کەمەرەی منارە دەڵێی بوڵبولی ناو هێلانەیەو دەخوێنێ! جەخاری پەیکوڵ: ئەسەرو شوێنەواری پیاوی خراپو بنەمای خراپی ژینی کۆن. مەبەست لە داوێنی مەرد: پیاوانی طەریقەتی ڕاستو دروستە.

٤. شەوە: بەردێکی ڕەشی جوانی بەنرخە، واتە: بەڵکوو یار بیکڕێ کارەبا: شتێکی زەرد یارەشە، زۆر بەنرخە، شت ڕادەکێشێ، واتە: وەك موقناتیس دڵی یار بکاتە خۆی، چەمكو مەبەستەکەی ئەمەیە: ئەسەرو نیشانەی گوناەو تاوان وەك جێ خاڵی سووتاو هەر دەمێنێ چاری نییە، بەڵام قەڵای قەڵەمی لێبووردنی خوایی سپی دەکاتەوەو ڕەقی و ڕەشی دڵو ڕوو دەکا بە شتی بە نرخو باش.

٥. مەبەست لە جێ سەر پەنجەی فێنكو سەردی خودا ناو دڵی پێغەمبەرە. تەماشای بەرگی یەکەمی ئەم کتێبە بکە، لاپەرە (٣٧٢). چاپی یەکەم.یەکسانە بە زنجیرە/ ١٢٢ ژمارە/ ٧٤٨ چاپی دووەم.

٦. بۆ قوربان چاکی. واتە: مەگەر لە غەزادا شەهید ببی ئەوسا لە تاوان پاك ببیتەوە، یا خۆت بەخت بکەی لە ڕێگەی خوادا!

٧. لە ناو چڵپاوی لیکاوی زیندان.. تاد. واتە: دڵ وا نوقم بووە لە ناو خۆشەویستی جیهاندا ئەو زیندانە پیسەی لێ بووە بە باخو بۆلاخ و لیکاوی دەمو فلّقی ئەو کۆنە فلقەی لێ بووە بە شیرەی هەنگوینو دەڵێی مێشی تۆ پیوە جووتە پێ کەوتۆتە ناوی و وەك مریشکە بەکڕ لەسەری کڕ کەوتووە! ئاگای لە خۆی نەماوە، نەقڵی بەباشو خراپی خۆی ناشکێ، مەگەر مەردێ

نـەزەری لێ بکـاو بـە خێـری خـۆی بـە چـوکلێ دەری بێنـێ و وەك دەرویـشی سـەربڕاو کـۆڕی زیکـری لەسـەر بگێرێو بەهیمـمـەتی شێخو مـشایەخان چـاك ببێتـەوەو لـە خـوێنی ئـاڵی زامـی لاملـی خـۆی دەسـتو پێـی لـە خەنـەبگرنو بیکەن بە بووكو بە بووکی بیبەن بۆ مەعشووقەکەی، بەڵام کێ دەڵێ یارەکـەی قـەبووڵی دەکاتـەوە؟ کـێ بـە گـوڵی ژاکـاو ڕازی دەبـێ؟ بـۆ یـەرێ بـۆ خـۆی پـاك دەکاتـەوەو دەڵـێ: مـن لەبـەر بـێ لـوتفی یـار ئـەم هـەموو بـەزمو ڕەزمـە تـووش بووم، کەچی چونکە من هەژارمو ئەو باڵادەستەو کار بەدەستە هەمووتان تانە لەمن دەدەنو مەرایی بۆ ئەو دەکەن!

بـەڵام ئەگـەر ئێـوە ڕاسـت دەکـەن لەگـەڵ منـدا تانـەم لێ مـەدەن بـەڵکوو یارمەتیم بدەن، هیچ نەبێ بەری ڕۆشناییم لێ مەگرنو یارم پتر لێ مـەتۆرێنن با بەدزییـەوە لـە دوورەوە تەماشـای ڕوخـساری بکـەمو بـۆنو بەرامـەی بـێ بەسەرما.

وەرگێڕ (نوری فارس حەمەخان)
١١ /٩/١٩٨٩م

## ١- سورەتی کەهف

ئـەم سـورەتە مەککییـە، واتـە لـە مەککـە هاتووەتـە خـوارەوە بـۆ پێغەمبەر (سەدو یازدە ئایەتە).

**سورة الكهف** (**مكية وهي مائة واحدى عشرة آية**)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٣٩٧٣- ← (ب-١ ز-١٨١ ل-٤٩٥ ف-١٠)[1].

واتـە: دەقـی ئـەم فەرمودەیـە لـەم شـوێنەدا رابـورد: بـەرگی یەکـەم (زنجـیرەی/١٨١ لاپـەڕە/٤٩٥) فـەرمودەی دەیـەم لەباسـی شـەونوێژو گەورەیی شەونوێژدا.

[1] تقدم برقم: ٩٨٤/١٠ مجلد أول / تسلسل/١٨١.

قال اللّٰهُ تَعَالَى: {وَإِذْ قَالَ مُوسَى لِفَتَاهُ لَا أَبْرَحُ حَتَّى أَبْلُغَ مَجْمَعَ الْبَحْرَيْنِ أَوْ أَمْضِيَ حُقُبًا} (١٨/٦٠).

**واتە: ئەی خۆشەویست! باسی ئەو داستانە خۆشە بکە کە حەزرەتی مووسا پێغەمبەری گەورەی نەوەی یەعقووب فەرمووی بەنۆکەرەکەی خۆی، کەناوی یۆشەعی کوڕی نوون بوو، کە خوشکەزای خۆی بوو، کە فەرمووی پێی: من هەر بەردەوام دەڕۆم هەتا ئەگەم بە (مجمع البحرين = دواوانی دوو دەریاکە) کە ئێستا قەناتی سوێسی لێ هەڵکەندراوە بۆ ئەوە بگەم بەو بەندەی خودایە کەلەمن زاناترە، خۆئەگەر لەوشوێنەدا پێی نەگەیشتم ئەوا ماوەی چەن ساڵێ دەڕۆم تا دەیدۆزمەوە.**

٣٩٧٤- عن سَعِيدُ بْنُ جُبَيْرٍ (رضي الله عنه) قَالَ قُلْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ إِنَّ نَوْفًا الْبَكَالِيَّ يَزْعُمُ أَنَّ مُوسَى صَاحِبَ الْخَضِرِ لَيْسَ هُوَ مُوسَى صاحب بَنِي إِسْرَائِيلَ، فَقَالَ: كَذَبَ عَدُوُّ اللّٰهِ حَدَّثَنِي أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ أنه سَمِعَ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم): يَقُولُ: «إِنَّ مُوسَى قَامَ خَطِيبًا فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ، فَسُئِلَ أَيُّ النَّاسِ أَعْلَمُ؟ قَالَ: أَنَا. فَعَتَبَ اللّٰهُ عَلَيْهِ إِذْ لَمْ يَرُدَّ الْعِلْمَ إِلَيْهِ. فَأوحى الله إليه إِنَّ لِي عَبْداً بِمَجْمَعِ الْبَحْرَيْنِ هُوَ أَعْلَمُ مِنْكَ. قَالَ موسى: يا رَبِّ فَكَيْفَ لِي بِهِ؟ قَالَ: تَأْخُذُ مَعَكَ حُوتًا، فَتَجْعَلُهُ فِي مِكْتَلٍ، فَحَيْثُمَا فَقَدْتَ الْحُوتَ فَهْوَ ثَمَّ، فَأَخَذَ حُوتًا فِي مِكْتَلٍ، ثُمَّ انْطَلَقَ وَمَعَهُ فَتَاهُ يُوشَعُ بْنُ نُونٍ، حَتَّى إذا أَتَيَا الصَّخْرَةَ، وَضَعَا رُءُوسَهُمَا فَنَامَا، وَاضْطَرَبَ الْحُوتُ في المكتل فَخَرَجَ منه فَسَقَطَ فِي الْبَحْرِ، فَاتَّخَذَ سَبِيلَهُ فِي الْبَحْرِ سَرَبًا، فَأَمْسَكَ اللّٰهُ عَنِ الْحُوتِ جِرْيَةَ الْمَاءِ، فَصَارَ عليه مِثْلَ الطَّاقِ، وَفِي رِوَايَة: في أَصْلِ الصَّخْرَةِ عَيْنٌ يُقَالُ لَهَا الحَيَاةُ لايُصِيبُ مِنْ مَائِهَا شيئٌ إِلاَّ حَيِيَ، فَأَصَابَ الحُوتَ مِنْ مَائِها، فَتَحرَّكَ وَانْسَلَّ مِنَ المِكتلِ فَدَخَلَ البَحْرَ، فَلَّما اسْتَيْقَظَ مُوسى نَسِيَ صَاحِبُهُ أَنْ يَخبِرَهُ بالحوتِ فَانْطَلَقَا بَقِيَّةَ يَوْمِهِمَا وَليلتِهما حَتَّى إِذَا كَانَ مِنَ الْغَدِ قَالَ مُوسى لِفَتَاهُ آتِنَا غَدَاءَنَا لَقَدْ لَقِينَا مِنْ سَفَرِنَا هَذَا نَصَبًا. قَالَ: وَلَمْ يَجِدْ النَّصَبَ حَتَّى جَاوَزَ المَكَانَ الّذِي أَمَرَ اللّٰهُ به قَالَ لَهُ فَتَاهُ: أَرَأَيْتَ إِذْ أَوَيْنَا إِلَى الصَّخْرَةِ فَإِنِّي نَسِيتُ الْحُوتَ، وَمَا

أَنْسَانِيهِ إلاّ الشَّيْطَانُ أَنْ أَذْكُرَهُ، وَاتَّخَذَ سَبِيلَهُ فِي الْبَحْرِ عَجَبًا، قَالَ: فَكَانَ لِلْحُوتِ سَرَبًا وَلموسى وفتاه عَجَبًا. قَالَ مُوسَى: ذَلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِي، فَارْتَدَّا عَلَى آثَارِهِمَا قَصَصًا، قَالَ: رَجَعَا يَقُصَّان آثَارَهُمَا حَتَّى انْتَهَيَا إِلَى الصَّخْرَةِ، فَإِذَا رَجُلٌ مُسَجًّى بِثَوْبٍ، فَسَلَّمَ عليه مُوسَى. فَقَالَ الخَضَر: وَأَنَّى بِأَرْضِكَ السَّلاَمُ. قَالَ: أَنَا مُوسَى. قَالَ: مُوسَى بَنِي إِسْرَائِيلَ؟ قَالَ نَعَمْ، أَتَيْتُكَ لِتُعَلِّمَنِي مِمَّا عُلِّمْتَ رَشَدًا. قَالَ: إنك لَنْ تستطيع مَعِيَ صَبْراً يَا مُوسَى إِنِّي عَلَى عِلْمٍ مِنْ عِلْمِ اللَّهِ، عَلَّمَنِيهِ اللَّهُ لاَ تَعْلَمُهُ أنت، وَأَنْتَ عَلَى عِلْمٍ مِنْ عِلْمِ اللَّهِ عَلَّمَكَهُ اللَّهُ لاَ أَعْلَمُهُ. فقال موسى: ستجدني إنْ شَاءَ الله صابراً وَلا أعصى لكِ أَمْراً. فقال له الخضر: فَإِن اتَّبَعْتَنِي فَلاَ تَسْأَلْنِي عَنْ شَيْءٍ حتى أحدث لك منه ذكراً، فَانْطَلَقَا يَمْشِيَان عَلَى سَاحِلِ الْبَحْرِ، فَمَرَّتْ سَفِينَةٌ، كَلَّمُوهُمْ أَنْ يَحْمِلُوهُمْ، فَعَرَفُوا الْخَضِرَ، فحَمَلُوهُم بِغَيْرِ نَوْلٍ، فَلَمَّا رَكِبَا فِي السَّفِينَةِ لَمْ يَفْجَأْ إِلاَّ وَالخضر قَدْ قَلَعَ لَوْحًا من ألواح السفينة بِالْقَدُّومِ. فَقَالَ لَهُ مُوسَى قَوْمٌ حَمَلُونَا بِغَيْرِ نَوْلٍ، عَمَدْتَ إِلَى سَفِينَتِهِمْ فَخرَقْتَهَا لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا، لَقَدْ جِئْتَ شَيْئًا إِمْرًا. قَالَ: أَلَمْ أَقُلْ إِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا؟، قَالَ: لاَ تُؤَاخِذْنِي بِمَا نَسِيتُ وَلاَ تُرْهِقْنِي مِنْ أَمْرِي عُسْرًا، قَالَ: وقال رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَكَانَتِ الأُولَى مِنْ مُوسَى نِسْيَانًا. قَالَ: وَجَاءَ عَصْفُورٌ فَوَقَعَ على حَرْفِ السَّفِينَةِ فَنَقَرَ من البحر نَقْرَةً، قَالَ له الخضر: مَا عَلمني وعلمك في علم الله إلا مثل ما نقص هذا العصفور من هذا البحر، ثُمَّ خَرَجَا مِنَ السفينةِ فبينما هما يمشيان عَلَى السَّاحِلِ إِذْ أبصر الخضر غُلاماً يلعب مَعَ الغلمان، فَأَخَذَ الْخَضِرُ رأسَهُ بِيَدِهِ فاقتَلَعَهُ فقَتَلَهُ، فَقَالَ لَهُ مُوسَى: أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةً بِغَيْرِ نَفْسٍ لَقَدْ جِئْتَ شَيْئًا نُكْرًا. قَالَ: أَلَمْ أَقُلْ لَكَ إِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا؟. قَالَ: وَهذِهِ أَشَدُّ مِنَ الأولى. قَالَ: إِنْ سَأَلْتُكَ عَنْ شَيْءٍ بَعْدَهَا فَلاَ تُصَاحِبْنِي، قَدْ بَلَغْتَ مِنْ لَدُنِّي عُذْرًا. فَانْطَلَقَا حَتَّى إِذَا أَتَيَا أَهْلَ قَرْيَةٍ اسْتَطْعَمَا أَهْلَهَا فَأَبَوْا أَنْ يُضَيِّفُوهُمَا فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارًا يُرِيدُ أَنْ يَنْقَضَّ فَقَالَ الخضر بيدِهِ فَأقامه فَقَالَ موسى: قَوْمٌ أَتَيْنَاهُمْ فَلَمْ يُطْعِمُونَا وَلَمْ يُضَيِّفُونَا لَوْ شِئْتَ لاَتَّخَذْتَ عَلَيْهِ أَجْرًا. قَالَ هَذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَبَيْنِكَ، سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِعْ عَلَيْهِ صَبْرًا. فَقَالَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) ((وَدِدْنَا أَنَّ مُوسَى كَانَ صَبَرَ، حَتَّى يَقُصَّ اللَّهُ عَلَيْنَا مِنْ

خَبَرِهِمَا». قَالَ سعيدين جبير: وكَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ يَقْرَأُ: وَكَانَ أَمَامَهُمْ مَلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ صَالِحَةٍ غَصْبًا، وكان يقرأ: وَأَمَّا الْغُلاَمُ فَكَانَ كَافِرًا وَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ. رواه الشيخان والترمذي (رضوان الله عليهما)[٢].

سەعیدی کوڕی جوبەیر (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: بە ئیبنو عەبباسم گوت: کە (نەوف بەککالی) دەڵێ: گوایە ئەو مووسایە کە هاوڕێی خدری زیندە بووەو داستانەکەیان لە قورئاندا باس کراوە ئەو مووسا مەشهوورە نییە کە پێغەمبەری نەوەی ئیسرائیل بووە!.

ئیبنو عەبباس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەو دوشمنی خودایە درۆ دەکا، چونکە من ئوبەییی کوڕی کەعب خۆی قسەی بۆکردم گوتی: بەگوێی خۆم ژنەوتم لەدەمی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: مووسا هەڵسایەوە لەناو نەوەی ئیسرائیل (بنی اسرائیل)دا گوتارێکی دا، لێیان پرسی: کێ لەهەموو کەسێ زاناترە؟ فەرمووی: من! خودای گەورەیش (لەبەرئەوەی کە زانینی ئەم باسەی هەواڵە نەکرد بەعیلمی خودا) گلەیی لەمووسا کردو سرووشو نیگای نارد بۆی: ئەی مووسا! بەندەیەکی من هەیە ئەو لەتۆ زاناترە، ئێستا وا لەمەجمەعولبەحرەین (واتە: لەدواوانی دوو دەریای فارسو ڕۆم، کە ئێستا پێیان دەگوترێ دەریای سوورو دەریای سپی، کە ئێستە ئەو جەمسەرە هەڵکەنراوەو کراوە بە ڕاڕەوی پاپۆڕی گەورە بەناوی قەناتی سوێس). مووسا فەرمووی: ئەی پەروەردگارم! جا ئەوە چۆن خۆمی پێ بگەیەنم؟ فەرمووی: ماسییەك ببرژێنەو لەگەڵ خۆتدا لەزەمیلەیەکا بیبە، جا لەکوێدا ئەو ماسییەت وون کرد ئەوبەندەیە وا لەوێدا، جا لەزەمیلەیەکا ماسییەکی هەڵگرتو خۆیو یۆشەعی کوڕی نوون کەهەم سوختەی بوو،

---

[٢] تجريد البخاري. مجلد أوّل رقم: ١٠١ = ١٢٢ فتح الباري شرح صحيح البخاري أطرافه في: ٧٨، ٧٤، ٢٢٦٧، ٢٧٢٨، ٣٢٧٨، ٣٤٠٠، ٣٤٠١، ٤٧٢٥، ٤٧٢٦، ٤٧٢٧، ٦٦٧٢، ٧٤٧٨. مسلم. فضائل ٦١١٣ — ٦١١٨. ترمذي. تفسير القرآن. ٣١٣٠.

هەم خوشکەزای بوو کەوتنەڕێ هەتا گەیشتنە لای تاوێرەکەی قەراخ دەریاکە، کە خدری زیندە لەوێ بوو، ئیتر لەوێ سەریان نایەوەو خەوتن، ماسییەکەیش لە زەمیلەکەدا ڕاپەڕی و هاتە دەرەوەو کەوتە ناو دەریاکەوە، وە بەناو ئاوی دەریاکەدا خەندەکێکی بۆخۆی دروست کردو ڕێگەی خۆی گرتە بەرو کەوتە ڕێ، خودای گەورەیش شڵپاوی ئاوەکەی کە بەڕۆیشتنی ماسییەکە شەق دەبوو وەك تاقی سەر دەرگاو پەنجەرە کرد بەکون و خەندەك لە ژێر ئاوەکەوە! لەگێڕانەوەیەکا: لەبن ئەو گابەردەدا کانیاوێ هەیە ناوی کانی ژیانەو مەشهوورە بەئاوی حەیات، هەرچی شتێ لەوئاوەی لێبکەوێ زیندوو دەبێتەوە، جا ماسییەکە لەئاوی ئەو کانییەی لێدەکەوێ و دەجوڵێتەوەو ڕادەچەنێ و لەزەمیلەکە دەردەپەڕێ و دەچێتە ناو دەریاکەوە، کە مووسا خەبەری دەبێتەوە یوشەعی هاوڕێی لەبیری نابێ باسی ئەم حاڵەی ماسییەکەی بۆبکا، جا ماوەی ئەو ڕۆژەو شەوێکی تەواو هەتا بەیانی دەڕۆن، تا بۆسبەینێ مووسا بە یووشەع دەفەرموێ: نانی بەیانیمان بۆ بێنە، بەڕاستی لەم سەفەرەمانا تووشی ماندوویی بووین! فەرمووی: هەتا لەو شوێنە ڕەت نەبوون کەخودا کردبووی بەنیشانە بۆی هەستی بەماندوویی و کفتی و شەکەتی نەکرد، خزمەتکارەکەی عەرزی کرد: {أَرَأَيْتَ إِذْ أَوَيْنَا إِلَى الصَّخْرَةِ فَإِنِّي نَسِيتُ الْحُوتَ وَمَا أَنسَانِيهُ إِلَّا الشَّيْطَانُ أَنْ أَذْكُرَهُ وَاتَّخَذَ سَبِيلَهُ فِي الْبَحْرِ عَجَبًا} (٦٣/١٨). قوربان! پێم ناڵێی کە بۆچی من وام بەسەرهات؟ دەزانی کاتێ گەیشتینە لای بەردەکەو تۆ نووستیت، من تەماشام کرد ماسییە برژاوەکەمان لەناو زەمیلەکە دەرپەڕی و خۆی فڕەدا ناو دەریاکەو من لەبیرم چوو ئەم روداوەت بۆ بگێڕمەوە کەسیش لەبیری نەبردمەوە شەیتان نەبێ بەهۆی خەیاڵی دڵەوە، وەکاتێکیش ماسییەکە خۆی فڕەدایە ناو دەریاکەوە زۆر بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر بەناو ئاوەکەدا ڕۆیی فەرمووی: ئەو خەندەکە کە بۆ ماسییەکە لەغەمو قوموش بوو، وەك بۆشایی ناو بۆری وابوو، بەڵام بۆ مووساو شاگردەکەی سەرسوڕهێنەر بوو مووسا بە یوشەعی فەرموو: {ذَٰلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِ فَارْتَدَّا

عَلَى آثَارِهِمَا قَصَصًا} (٦٤) دەی ئێمە بۆ ئەمە دەگەڕێین کەتۆ دیوتە، جا ڕێك بەسەر شوێنی خۆیاندا گەڕانەوە فەرمووی: واتە: بەشوێنی خۆیاندا ڕێك گەڕانەوە شوێنەواری خۆیانیان دەقاو دەق هەڵگرتەوە تا گەیشتنەوە لای تاوێرەکە، تەماشایان کرد وا پیاوێ بەنوێنێ خۆی داپۆشیوە جا مووسا سڵاوی لێ کرد، خضریش فەرمووی: لەکوێ لەم وڵاتی تۆیە ئەم جۆرە سڵاوو ڕۆژباشییە هەیە. فەرمووی: من مووسام، خدری زیندە فەرمووی: مووسای پێغەمبەری بەنی ئیسرائیل؟ فەرمووی: بەڵێ ئەوم، هاتووم بۆلای تۆ کەلەم عیلمو زانستە نایابەی کەلەکن خوداوە فێرکراوی هەندێکم فێربکەی کەببێ بەهۆی گەیشتنم بە ڕەزای خودا، خدر فەرمووی: تۆ ناتوانی لەگەڵ مندا خۆت بگریو صەبر بکەی. ئەی مووسا! من خودا لەعیلمو زانستی خۆی بازە عیلمو زانیارییەکی وای فێرکردووم تۆ بە تەواوی نایزانیتو وەك من شارەزاییەکی تەواوت نییە لەوبابەتەدا کەپێی دەگوترێ: عیلمی حەقیقەت، یا عیلمی لەدوننی، یا زانستی بەهرەیی (علمی لدنی) وەهەروەها تۆش خودای مەزن لە عیلمو زانستی خۆی بازە عیلمو زانیارییەکی فێرکردووی کەبرێتییە لە شەریعەتو عیلمی ظاهر من وەك تۆ نایزانم، کەوابوو وازبێنە تۆ بە ڕێگەی خۆتو من بەڕێگەی خۆم، مووسا فەرمووی: {سَتَجِدُنِي إِن شَاء اللَّهُ صَابِرًا وَلَا أَعْصِي لَكَ أَمْرًا} (٦٩/١٨). خودا یاربێ ئەگەر ڕێگەم بدەی لە خزمەتتا بم، دەبینی بەباشی ئارام دەگرمو سەرپێچی لە فەرمانت ناکەم، خدریش فەرمووی: {فَإِنِ اتَّبَعْتَنِي فَلَا تَسْأَلْنِي عَن شَيْءٍ حَتَّى أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا} (٧٠/١٨). باشە، بەڵام بەمەرجێ لەشت زۆر مەکۆڵەرەوە، هەرچیم کرد قسەمەکەو هەقت بەسەرمەوە نەبێ، هەتا خۆم تێت دەگەیەنم. فەرمووی: پاش ئەوە کەلەسەر ئەم مەرجە ڕێکەوتن هەردوکیان لەقەراخی دەریاکەوە کەوتنەڕێ، تا پاپۆڕێ هات قسەیان لەگەڵدا کردن کەهەڵیان بگرن، خدریان ناسی بەبێ کرێ، بەخۆڕایی هەڵیان گرتن، کەسواری پاپۆڕەکە بوون لەپڕ مووسا چاوی لێ بوو کەوا خدر بەتەشوێ تەختەیەکی لەتەختەکانی پاپۆڕەکە هەڵقەند، مووسا پێی فەرموو: ئەوە

چیت کرد! لای خۆی ئەم پیاوانە پیاوەتییان لەگەڵمان کردو بەبەلاش ئێمەیان هەڵگرتووە کەچی تۆ دەچیت پاپۆڕەکەیان کون دەکەی، تاکوو سەرنشینەکانی نوقم بکەی‌و لەئاودا بخنکێن، بەڕاستی تاوانێ گەورەو ناهەموارت کرد، خدر فەرمووی: ها! ئەدیی من پێم نەگوتیت کەتۆ لەگەڵ من هەڵناکەیت‌و ناتوانی ئۆقرە بگری؟ مووسا فەرمووی: لەبیرم نەبوو، لێم مەگرەو هاوڕێیەکی باش بەو چاو پۆشیم لێبکە، با نەبی بەمایەی باری زەحمەت بۆم فەرمووی: ئەم جاری یەکەمەیان مووسا لە یادی نەبوو فەرمووی: لەوکاتەدا چۆلەکەیێ هات لەسەر لێواری پاپۆڕەکە نیشتەوەو دەندووکێکی ژەند بەئاوی دەریاکەدا، خدر پێیێ فەرموو: زانیاری من‌و زانیاری تۆ لە چاو زانیاری خودادا وەك دەنووك ژەندنی ئەم چۆلەکەیە وایە بەم دەریایەدا. ئینجا لەپاپۆڕەکە هاتنە دەرێ‌و هەردووکیان بەکەناری دەریاکەدا دەستیان کرد بەڕۆیشتن، لەناکاو خدر چاوی کەوت بە کوڕێکی مناڵکار لەناو مندالاًندا یاری دەکرد، یەکسەر پڕی کرد بە سەریاو بەدەست وەك بەچکە چۆلەکە سەری هەڵکەندو ملی هەڵکێشاو بە بێ قسەو پرسیارو چەندو چوون کوشتی! مووسا پێی فەرموو: {أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةً بِغَيْرِ نَفْسٍ لَّقَدْ جِئْتَ شَيْئًا نُّكْرًا} (٧٤/١٨). ئەو منداڵە بێتاوان‌و گیانە پاکەت بەناهەق چۆن کوشت بەبێ ئەوەی کەسێکی‌کوشتبێ لەخۆتەوە کوشتت؟ بەڕاستی کارێکی زۆر ناڕەوات کردو کاری وا ناشیرین کەس پەسەندی ناکا. لەشەرحەکەدا دەڵێ: دەگێڕنەوە: خدر لەم ڕەددەی مووسایە زۆر تووڕە دەبێ، دەچێ دەفەی شانی چەپی منداڵەکە دەر دەهێنێ‌و گۆشتەکەی لێ دادەماڵێ، سەیر دەکەن لێی نووسراوە: ئەم کوڕە کافرە قەت ئیمان‌و باوەڕ ناهێنێ! ئیتر مووسا هێواش دەبێتەوە خدر دەفەرموێ: {أَلَمْ أَقُل لَّكَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا} (٧٥/١٨). کوڕە! من پێم نەگوتی کەتۆ لەگەڵ مندا هەڵناکەی‌و ناتوانی خۆت بگری؟! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ڕەددی ئەم جارەی خدر توندو تیژ تر بوو لەڕەددی جاری یەکەم، مووسا فەرمووی: {إِن سَأَلْتُكَ عَن شَيْءٍ بَعْدَهَا فَلَا تُصَاحِبْنِي قَدْ بَلَغْتَ مِن لَّدُنِّي عُذْرًا} (٧٦/١٨). ئەگەر جارێکی تر

پاش ئەم جارە هەڵەی وام کردو لەمەرجی خۆم دەرچووم ئیتر هاوڕێتیم مەکە ئیتر بیانوو بەهانەت بڕیوم فەرمووی: پاش ئەوە کەوتنەوە ڕێگەو ڕۆیشتن هەتا چوونە ناو ئاوەدانییەك (شاری ئەنطاکییە) لەوێ داوای نان‌و ئاویان لەهەموو خەڵکی ئەو دێیە کرد کە بیخۆن، بەڵام کەسیان قایل نەبوون کە میواندارییان بکەن‌و بەنائومێدی ڕۆیشتن جا دیوارێکیان بینی خەریك بوو هەرەس بێنێ‌و بکەوێ خدر دەستێکی پیادا هێناو ڕاستی کردەوە، مووسا پێی فەرموو: خەڵکی ئەم شارە بێ ویژدان‌و چرووك‌و پیسکەن ئەم هۆزە لای خۆی ئێمە بووین بە میوانیان، کەچی نەنان‌و ئاوێکیان پێمان داو نە میواندارییان پێ کردین ئەگەر هەوەست ببوایە کرێت لێ وەردەگرتن‌و بەکرێ دیوارەکەت ڕاست دەکردەوە، خدر فەرمووی: {هَذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَبَيْنِكَ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا} (١٨/٧٨). ئەمە کاتی جیابوونەوەی من‌و تۆیە لەیەك، بەزوویی ئەو شتانەت بۆ روون دەکەمەوەونهێنییەکەیانت پێ دەڵێم کە تۆخۆت بۆ نەگیرا بەرابەریان. پێغەمبەری خۆمان (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خۆزگا مووسا پتر ددانی بەخۆیدا بگرتبایە هەتا خودا زیاتر داستانی ئەم دوو زاتەی باس بکردبایە بۆمان! سەعیدی کوڕی جوبەیر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ئیبنو عەبباس (خودای لێ رازی بێ) ئەم ئایەتەی بەم قیرائەتە دەخوێند: {وَكَانَ أمامهُم مَّلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ صالحة غَصْبًا}. وەئەم ئایەتەی تریشی بەم قیرائەتە دەخوێند: {وَأَمَّا الْغُلَامُ فَكَانَ كافرا وكان أَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ} (ش/ت).

٣٩٧٥- عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): «إِنَّ الْغُلاَمَ الَّذِى قَتَلَهُ الْخَضِرُ طُبِعَ يَوْمَ طُبِعَ كَافِرًا». رواه الترمذي وصححه وأبو داوود في القدر، وزاد: (لو عاش لأرهَقَ أبويه طُغياناً وكفراً) [٣].

ئوبەیی کوڕی کەعب (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوکوڕەی کە خدری زیندە کوشتی‌و سەری

---

[٣] صحيح عند أبي داود.

هەڵپچڕکان ئەو ڕۆژەی کەخودا دروستی کردو مۆری پیادانا بەکافری دروستی کردو مۆری کافری پیادا نا (ت: ح/ص-د) ئەبو داوود لەسەرباسی قەدەردا گێڕاویەتەوەو ئەمەی زیاترە: ئەگەر ئەو کوڕە بمایە باوكو دایکی خۆی لەخشتە دەبردو لەڕێگە دەری دەکردنو ئەوانیشی وەکوو خۆی بەدکێشو بەدئەندێشو کافر دەکرد!.

٣٩٧٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: «إِنَّمَا سُمِّيَ الْخَضِرُ لِأَنَّهُ جَلَسَ عَلَى فَرْوَةٍ بَيْضَاءَ فَاهتَزَّتْ تَحْتَهُ خَضْرَاءَ». رواه الترمذي بسند صحيح[٤].

ئەبوهورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خضر بۆیە ناونرا خضر چونکە کاتێ دادەنیشت لەسەر زەوی سافی سپی گیای لێ دەڕواو سەوز دەبوو، جا لە بەرئەمەبوو ناوبرا بە خضر (واتە: سەوزاییو شینایی). (ت-س/ص).

قال اللّٰهُ تَعَالَى: {قَالُوا يَا ذَا الْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا عَلَى أَن تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا؟ قَالَ: مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيْرٌ فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ أَجْعَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ رَدْمًا}(١٨/٩٤).

واتە: گوتیان: ئەی زولقەڕنەین! بەڕاستی نەژادی تورکی مەغوول کە مەشهوورن بە یەئجووجو مەئجووج هەمیشە خراپە دەکەن، خوێن دەڕێژن، ماڵ بەتاراج دەبەن، وڵات کاول دەکەن، ئایا تۆ ڕازی دەبی بەوەی کەهەندێ ماڵی خۆمان بدەین بەتۆ لە باتی ئەوە کەدەربەندێ دروستبکەی لەبەینی ئەو دووکێوەداو ڕێگەی هاتوو چۆی ئەو گەلە بەدکارە بگریو ئیتر نەتوانن لەبەینی ئەو دوو کێوەوە بێن بەسەرماندا.

٣٩٧٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فِي السَّدِّ قَالَ: «يَحْفِرُونَهُ كُلَّ يَوْمٍ حَتَّى إِذَا كَادُوا يَخْرِقُونَهُ قَالَ الَّذِي عَلَيْهِمُ ارْجِعُوا فَسَتَخْرِقُونَهُ

---

[٤] رواه الترمذي سند صحيح.

غَدًا فَيُعِيدُهُ اللَّهُ كَأَمْثَلِ مَا كَانَ حَتَّى إِذَا بَلَغَ مُدَّتَهُمْ وَأَرَادَ اللَّهُ أَنْ يَبْعَثَهُمْ عَلَى النَّاسِ قَالَ الَّذِي عَلَيْهِمُ ارْجِعُوا فَسَتَخْرِقُونَهُ غَدًا إِنْ شَاءَ اللَّهُ وَاسْتَثْنَى. قَالَ فَيَرْجِعُونَ فَيَجِدُونَهُ كَهَيْئَتِهِ حِينَ تَرَكُوهُ فَيَخْرِقُونَهُ فَيَخْرُجُونَ عَلَى النَّاسِ فَيَسْتَقُونَ الْمِيَاهَ وَيَفِرُّ النَّاسُ مِنْهُمْ فَيَرْمُونَ بِسِهَامِهِمْ فِي السَّمَاءِ فَتَرْجِعُ مُخَضَّبَةً بِالدِّمَاءِ فَيَقُولُونَ قَهَرْنَا مَنْ فِي الأَرْضِ وَعَلَوْنَا مَنْ فِي السَّمَاءِ قَسْرًا وَعُلُوًّا. فَيَبْعَثُ اللَّهُ عَلَيْهِمْ نَغَفًا فِي أَقْفَائِهِمْ فَيَهْلِكُونَ قَالَ فَوَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ إِنَّ دَوَابَّ الأَرْضِ تَسْمَنُ وَتَبْطَرُ وَتَشْكَرُ شَكْرًا مِنْ لُحُومِهِمْ». رواه الترمذي بسند حسن[٥].

**ئەبو هورەیرە** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **لەبارەی ئەم دەربەند (سەدد: بەست)ەوە فەرمووی: هەموو ڕۆژێ خنەخنیانە بەدەستیەوەو کنەی لێ دەکەن و دەیکۆڵنەوە هەتا بەڕادەیێ هەڵی دەکۆڵن بەس ئەوەندەیان دەمێنێ کە کوناودەری بکەن، ئیتر سەرکارەکەی سەریان دەڵێ: بگەڕێنەوە، ئەمڕۆ کارکردن بەسە ئەوەندەی نەماوە سبەینێ کونی دەکەین! بەڵام بۆ سبەینێ خودا گەلێ لەجاران ئەوبەستە قایمترو مەحکەمتر دەکاتەوە ئەم حاڵە هەروا بەردەوام دەبێ، هەتا ئەوکاتە کەخودا دەیەوێ بەرەڵلایان بکاتە گیانی مەردوم، ئیتر ئەو دەمە سەرکارەکە کەوا بە سەریانەوە پێیان دەڵێ: دەی با بگەڕێینەوە، سبەی خودا یاربێ کوناو دەری دەکەین ئەمجارە وادەبێ سەرکارەکەیان (إن شاء الله: خودا یاربێ: خودا حەزکا) دەکا، ئیتر بۆ سبەینێ کەدێنەوە بۆسەر بەستەکە دەبینن وەك خۆی بەهەڵکەنراویی چۆنیان بەجێ هێشتووە ئاوا ماوەو کون و دەلاقەو لەغەم و قومووشەکەی تێیان کردووە پڕنەبۆتەوە، ئینجا گورج بەستەکە دیواو دەر دەکەن و یەکسەر پەلاماری خەڵکەکە دەدەن، وە دەگەڕێن بەشوێن ئاودا خەڵکەکەیش لەبەریان هەڵدێن، وا لەخۆیان بایی دەبن دەچن تیر دەنێن بەئاسمانەوە، تیرەکان خەڵتانی خوێن دەبن و پاشان دەکەونە خوارەوە، ئیتر دەڵێن: بەزەبرو**

---

[٥] روه الترمذي بسند حسن.

زەنگو زۆرو زۆرداریی ئەوەی لەسەر زەوی بوو بۆژەمان کردو ئەوەی لەئاسمان بوو بەزاندمان!.

جا خودا جۆرە کرمێ دەنێرێ، وەك مافەتەی مەڕ وایە، کرمەکە دەداتە پشت ملیانو دەیان تۆپێنێ، دەی بەو کەسە کەگیانی منی وا لەدەسا، دەعباو جانەوەری سەر زەوی لەگۆشتی ئەمانە تێرو تەسەل دەبنو قەڵەوو زیت دەبنەوە! (ت-س/ح).

قال اللّٰهُ تَعَالَى: {قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُمْ بِالْأَخْسَرِينَ أَعْمَالًا، الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا} (١٨/١٠٣-١٠٤).

ئەی خۆشەویست! بەوکافرانە: بفەرموو ئایا حەزدەکەن پێتان بڵێم کەکێ لەم دنیایەدا لەهەموو کەسێ ماڵوێرانترو ڕەنجەڕۆترە؟ ڕەنجەڕۆترین کەس ئەو خانە خراپو سەر لێشێواوانەن کەهەموو هەوڵو کۆششو تێکۆشانێکیان لەماوەی ژیانی جیهاندا بەزایەچووەو تێشکاون، کەچی عارناگرنو لەکەڵی شەیتان نایەنە خوارێو سەرەڕای ئەوەیش وا دەزانن کەهەر خۆیان باش دەکەنو کردارو ڕەفتاریان گەلێ جوانو شیرینە!.

بەڵێ (لەم چەرخەی ئێمەدا) زۆربەی خەڵك بەم دەردو موصیبەتە ماڵ وێرانو گیرۆدەن، نوقمن لەناوتاوانا، لەناو ئارەق خواردنا، لەناو حەرام خواردنا، لەناو ئازاری خەڵك دانا، لەناو بەرتیلو قومارو لرف لێدانا، دوورن لەکۆڕی زاناو دانا، بەشەوو بە ڕۆژ لەمەلهاو سینەماو شوێنی خراپن، بیستو چوار سەعاتە، مەگەر چۆنەها، لەخوداو دینو ڕۆژی قیامەت بێ ئاگان، لەگەڵ ئەوەشا لەمناڵەوە بیگرە هەتا پیر، لەئۆمییەوە بیگرە هەتا خوێنەوار هەمووی خۆی بەفەیلەسووف دەزانێ، هاوڕێیەکی کاتی فەقێتیم هەبوو ئێستا لەخودا بەزیاد بێ لەڕیزی مەلایان نەماوە، ڕۆژێبەچاوی خۆم دیم تا ئێوارێ دووجار ئارەقی خواردەوە، کەچی ئەو ئامۆژگاری خێری منی دەکردو دەیفەرموو: بۆ خەڵەفاوی؟!! بۆ حەیای

خۆت دەبەی، دەچی تاج تەرجەمە دەکەی!؟ کورد مردو بڕایەوە! دین باری کردو تەواو! گوایە تۆ مردوو زیندوو دەکەیتەوە!؟ سوبحانەڵڵا! پەکوو لەم بێ عەقڵی و نەفامی و گەوجییە! منیش – وەك شێخ ڕەزای تاڵەبانی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەڵێم: ئەگەر ئەفەندی هەموویان وەکوو ئەم جاش ئەفەندییە وابن گەردنی نا ئەفەندی سەد هەزار جار ئازاد بێ⊕ (وەرگێڕ).

٣٩٧٨– قَالَ مُصْعَبِ بن سعد (رضي الله عنهما) سَأَلْتُ أَبِى (قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُمْ بِالأَخْسَرِينَ أَعْمَالاً) أهُمُ الْحَرُورِيَّةُ؟ قَالَ: لاَ، هُمُ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى، أَمَّا الْيَهُودُ فَكَذَّبُوا مُحَمَّدًا (صلى الله عليه وسلم) وَأَمَّا النَّصَارَى فَكَفَرُوا بِالْجَنَّةِ وَقَالُوا لاَ طَعَامَ فِيهَا وَلاَ شَرَابَ، وَالْحَرُورِيَّةُ الَّذِينَ يَنْقُضُونَ عَهْدَ اللَّهِ مِنْ بَعْدِ مِيثَاقِهِ، وَكَانَ سَعْدٌ يُسَمِّيهِمُ الخاسِرِين. رواه البخاري والحاكم[٦].

موسعەبی کوڕی سەعد (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پرسیارم لەباوکم کرد: مەبەست لەم ڕەنجەڕۆیانە، کەلەم ئایەتەدا باس کراون کێیە ئەم حەروورییانەن کەهەن؟ گوتی: نەء، مەبەست لەمانە جوولەکەو گاورەکانن، جوولەکە لەبەرئەوە باوەڕ بە موحەممەد (دروودی خودای لەسەربێ) ناکەن گاورەکانیش سەرەڕای ئەوەیش باوەڕیان بەنازو بەهرەو نیعمەتی بەهەشت نییەو دەڵێن گوایە: بەهەشت خواردن و شت خواردنەوەی تیا نییەو ژیانی ڕۆژی دوایی برێتی‌یە لەژیانێکی گیانی پەتی پووت و بەس! بەڵام ئەم حەروورییانە بەرئەو تاقمانە دەکەون کە پەیمانی مەحکەمی‌خودای گەورە دەشکێنن، گوتی: سەعد بەمانەی دەگوت: ڕەنجەڕۆکان (ب/حاکم).

---

⊕ ئێستا ئەو بەرێزە ماوە کورد چییە، منیش (لەبەر هەمان هۆی پێشوو) لەسەر فەرمایشتی ڕاگەیاندنی چەواشەی ئەمڕۆ عەرەبچێتی دەکەم. پەکوو!! (وەرگێڕ)

[٦] بخاري – تفسير: ٤٧٢٨.

٣٩٧٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ «إِنَّهُ لَيَأْتِي الرَّجُلُ الْعَظِيمُ السَّمِينُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لاَ يَزِنُ عِنْدَ اللَّهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ وَقَالَ اقْرَءُوا (فَلاَ نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْنًا)». رواه الشيخان[٧].

ئەبوهورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: لەڕۆژی قیامەتدا پیاوی زل زلی قەڵەو قەڵەو دەهێنن لەلای خودا سەنگایی باڵی مێشوولەیێ قورس نین و بەقەد تۆسقاڵێ دەگەرو قەدریان بۆ دانانرێ. فەرمووی: فەرموو ئەم ئایەتە بخوێنن، بۆ پشتیوانی ئەم باسە کە دەفەرموێ: {فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْنـا} (١٠٥/١٨). واتە: لەڕۆژی ژینەوەدا نرخ و دەگەرو ڕێز بۆ ئەو سەرلێشێواوە ڕەنجەڕۆیانە بەقەد تۆسقاڵی دانانێن، وەهەتا بلێی بێ سەنگ و بێنرخ و بێ کێش و بێ نموودن (ش- ڕەزای خودایان لێبێ).

قال اللَّهُ تَعَالَى: {إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَانَتْ لَهُمْ جَنَّاتُ الْفِرْدَوْسِ نُزُلًا، خَالِدِينَ فِيهَا لَا يَبْغُونَ عَنْهَا حِوَلًا} (١٠٧/١٨).

واتە: بەڕاستی ئەو خوداناسە مەردانەی کەلەپاڵ ئیمانی ساغی تەواوا دەستی خۆیان وەشاندووەو گەلێ کردەوەی چاکیان کردووەو لەکاری خێرو کردەوەی باش کۆتایی ناکەن و بۆچاکە کردن سەریان پێوە نییە، بەڕاستی ئەم کەڵە مێردانە لەناو بەهەشتی فیردەوس دا دەژین، بە خۆشی و شادی و ئاسودەیی، هەتا هەتایە، ئەوەندە جێگەکەیان بەدڵە قەت خەیاڵی ئەوە ناکەن کەلەوێ بگوێزنەوە بۆ شوێنێکی تر.

٣٩٨٠- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رضي الله عنه) أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ «إِنَّ الرَّجُلَ مِنْ أَهْلِ عِلِّيِّينَ لَيُشْرِفُ عَلَى أَهْلِ الْجَنَّةِ فَتُضِيءُ الْجَنَّةُ بِوَجْهِهِ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّيٌّ وَإِنَّ أَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ لَمِنْهُمْ وَأَنْعَمَا» رواه أبو داوود بسند صحيح[٨].

---

[٧] بخاري. تفسير: ٤٧٢٩. مسلم. صفات المنافقين: ٦٩٧٦، ٣٩٤٥.

[٨] صحيح عند أبي داود.

**ئـەبو سـەعید** (خـودای لێ ڕازی بێ) **دەڵـێ: حـەزرەت** (درووودی خـودای لەسـەربێ) **دەفـەرموێ: پیـاو لـە دانیشتوانی بەهەشتی بـاڵا کـە سەردەکێشێ بۆنـاو خـەڵکی بەهەشتی خـواروو، بەهەشت خـۆی بە شـەوقی ڕووی ئـەو پیـاوە وەك ئەستێرەی گەشی پرشنگداری پرتـەو دار شـەوق دەداتـەوەو ڕوونـاك دەبێتەوە! جا دەبێ ئـەو پیاوە بەختـەوەرە خـۆی لەچـی نـازو نیعمـەتێکدا بـێ؟ ئـەبو بـەکرو عومـەریش لەدانیـشتوانی ئـەم بەهەشـتی باڵایـەن‌و پـتر لەهەموو کەسێ بەهرەدارو نازدارن (د –س/ص) تەماشـای ئـەم باسـە بکـە (مناقب أبی بکر وعمر) فەرموودەی چوارەم.**

**٣٩٨١– قَالَ ابْنِ عَبَّاسٍ** (رضي الله عنـه) **قَالَتْ قُرَيْشٌ لِيَهُودَ اعْطُونَا شَـيْئًا نَـسْأَلُ عَنْهُ هَذَا الرَّجُلَ فَقَالَ: سَـلُوهُ عَـنِ الـرُّوحِ قَـالَ فَـسَأَلُوهُ عَـنِ الـرُّوحِ فَـأَنْزَلَ اللَّـهُ (وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً) قَالُوا: أُوتِينَا عِلْمًا كَثِيرًا التَّوْرَاةُ وَمَنْ أُوتِيَ التَّوْرَاةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا فَأُنْزِلَتْ {قُـلْ لَـوْ كَانَ الْبَحْرُ مِدَادًا لِكَلِمَاتِ رَبِّي لَنَفِدَ الْبَحْرُ قَبْلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَاتُ رَبِّي وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِ مَدَدًا} رواه الترمذي في الإسراء[٩].**

**ئیبنو عەبباس** (خودای لێ ڕازی بێ) **دەڵێ: قوڕەیش گوتیان بەجوولەکـەکان شـتێکمان پـێ بڵـێن کەلـە موحەممـەدی بپرسـینەوە، گوتیـان: لـەبارەی گیانەوە پرسیاری لـێ بکەن، کەلـەم بارەیـەوە لێیـان پرسـی، خـودا ئەمـەی نارد: {وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّـي وَمَـا أُوتِيـتُم مِّـن الْعِلْـمِ إِلاَّ قَلِـيلاً} جوولەکـەکانیش گوتیـان: ئێمـە زانیارییـەکی زۆرمـان پـێدراوە کـە تەوراتە، چونکە لەڕاستی دا ئەوەی کە تـەوراتی پـێدراوە خێرێکـی زۆری پێ دراوە، ئیتر خودا ئەمەی نارد: {قُل لَّوْ كَانَ الْبَحْرُ مِدَادًا لِّكَلِمَاتِ رَبِّي لَنَفِدَ الْبَحْـرُ قَبْـلَ أَن تَنفَـدَ كَلِمَـاتُ رَبِّـي وَلَـوْ جِئْنَـا بِمِثْلِـهِ مَـدَدًا} (١٨/١٠٩) ئـەی پێغەمبەری زاناو دانا! بفەرمووئەگەر ئاوی دەریا هـەمووی مەرەکـەب بـێ**

---

[٩] سكت عن درجته الشارح.

بەشی نووسینەوەو تۆمارکردنی فەرمایشتو زانیاری خوداناکا، بگرە وێنەی ئەو دەریایەی کە ئێستا هەیە ئاوی تریش زیاد بکەین ئاوەکە دیسان تەواو دەبێ بەڵام عیلمی خودا تەواو نابێ! (ت) تەماشای تەفسیری سورەتی ئیسرا، فەرموودەی (١٩) بکە.

قال اللّٰهُ تَعَالَى: {فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاء رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا}. ← (ب-١ ز-١٣ ل-٧٢ چاپی یەکەم).

٣٩٨٢- ← (ب-١ ز-١٣ ل-٧٦ ف-٦)[١٠].

لەناو ئەشکەوتا چاکانی خودا

خەڵوە دەکێشن لەکۆن و نۆدا!!

بەهەمان یاسا حەزرەتی مەریەم

لەبۆ کوڵکردن دوور کەوت لە عالەم

خودا بە سیری سوورەتی کەهفت

کوردستان پڕکە لەمیهرو لوطفت!

## ٢- سوورەتی مەریەم (ڕەزای خودای لێ بێ) : (سورة مريم)

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٣٩٨٣- عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ (رضي الله عنه) قَالَ بَعَثَنِي رَسُولُ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم) إِلَى نَجْرَانَ فَقَالُوا لِي: أَلَسْتُمْ تَقْرَءُونَ (يَا أُخْتَ هَارُونَ) وَقَدْ كَانَ بَيْنَ عِيسَى وَمُوسَى مَا كَانَ فَلَمْ أَدْرِ مَا أُجِيبُهُمْ. فَرَجَعْتُ إِلَى رَسُولِ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم) فَأَخْبَرْتُهُ فَقَالَ: «أَلاَّ أَخْبَرْتَهُمْ أَنَّهُمْ كَانُوا يُسَمُّونَ بِأَنْبِيَائِهِمْ وَالصَّالِحِينَ قَبْلَهُمْ». رواه الترمذي هنا ومسلم في الأدب[١].

---

[١٠] مجلد أول: تسلسل-١٣ تقدم برقم: ٩٧/٦ مسلم. زهد: ٧٤٠٠.

[١] مسلم. آداب. ٥٥٦٣. ترمذي. تفسير: ٣١٥٥.

**موغیرەی کوڕی شوعبە** (خودای لێ ڕازی بێ) **دەڵێ: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **منی نارد بۆ وڵاتی نەجران لەیەمەن، لەوێ گاوورەکان لەم ئایەتە ڕەغنەیان دەگرت و گوتیان بە من: ئێوە لەقورئانی خۆتانا ئەم ئایەتە دەخوێنن کە دەڵێ: (یا أخت هارون) وەبەپێی ئەمە بێ دەبێ مەریەم خوشکی هاروونی برای مووسا بێ وەلحاڵ مووساو عیسای کوڕی مەریەم سەردەمیان زۆر زۆر لە یەکتری دوورە! منیش وەڕامی ئەم ڕەخنەیەم نەزانی، هەتا گەڕامەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **وەئەمەم عەرزی کرد، فەرمووی: دەبوو بتگوتبایە پێیان: کەئەوان مەبەستیان ئەوەبوو کە مەریەم ئەوەندە باش و پاک و پاکیزە خواناس بوو دەتگوت خوشکی ڕاستی هاروونی برای مووسایەو وێنەی ئەوە، وەلەناو هۆزی مەریەمدا ئەم جۆرە بانگ کردنە باو بووە ئێستاش ئەم جۆرە ناوبردنە عادەتە، دەڵێن: ئەی ڕۆڵەکانی خالیدو صەلاحەددین، ئەی کوڕانی ئیسرائیل، ئەی برایانی خانی! ئەی خوشکانی ڕابیعەی عەدەوییە (ت/م).**

**٣٩٨٤- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ** (رضي الله عنه) **قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ** (صلى الله عليه وسلم) **«يُؤْتَى بِالْمَوْتِ كَهَيْئَةِ كَبْشٍ أَمْلَحَ حَتَّى يُوقَفَ عَلَى السُّورِ بَيْنَ الجنَّةِ وَ النَّار فَيُنَادِي مُنَادٍ يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ، فَيَشْرَئِبُّونَ وَيَنْظُرُونَ فَيَقُولُ: هَلْ تَعْرِفُونَ هَذَا؟ فَيَقُولُونَ: نَعَمْ هَذَا الْمَوْتُ، وَكُلُّهُمْ قَدْ رَآهُ، ثُمَّ يُنَادِي يَا أَهْلَ النَّارِ، فَيَشْرَئِبُّونَ وَيَنْظُرُونَ، فَيَقُولُ: هَلْ تَعْرِفُونَ هَذَا؟ فَيَقُولُونَ: نَعَمْ هَذَا الْمَوْتُ، وَكُلُّهُمْ قَدْ رَآهُ، فَيُضجَعُ فَيُذْبَحُ ثُمَّ يَقُولُ: يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ، خُلُودٌ فَلاَ مَوْتَ، وَيَا أَهْلَ النَّارِ، خُلُودٌ فَلاَ مَوْتَ ثُمَّ قَرَأَ (وَأَنْذِرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ إِذْ قُضِيَ الأَمْرُ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ) وَهَؤُلاَءِ فِي غَفْلَةٍ أَهْلُ الدُّنْيَا (وَهُمْ لاَ يُؤْمِنُونَ). رواه الشيخان والترمذي وزاد: فَلَوْلاَ أَنَّ اللَّهَ قَضَى لأَهْلِ الْجَنَّةِ الْحَيَاةَ فِيهَا وَالْبَقَاءَ لَمَاتُوا فَرَحًا وَلَوْلاَ أَنَّ اللَّهَ قَضَى لأَهْلِ النَّارِ الْحَيَاةَ فِيهَا وَالْبَقَاءَ لَمَاتُوا تَرَحًا». أي حُزناً**[٢].

---

[٢] بخاري. تفسير: تەجريد: ٤٧٣٠/١٦٧٤ مسلم. جنة ونعمها: ٧١١٠. ترمذي. تفسير: ٣١٥٦.

ئەبوسەعید (خودای لێ ڕازی بێ) لەحەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): لەرۆژی قیامەتا مردن دێنن (لەشێوەی بەرانێکی تەودا) دەیهێنن تا لەسەر شوورەکەی نێوانی بەهەشتو دۆزەخ کەپێی دەگوترێ ئەعراف ڕایدەگرن، ئەوجا جاڕچی جاڕ هەڵ دەداو بەدەنگی بەرز بانگ دەکا: ئەی خەڵکی بەهەشت! ئەی بەهەشتییەکان! گوێ بگرن، ئەوانیش گوێ قوڵاخ دەکەنو دەنواڕن، جارچییەکە دەڵێ: ئایا ئەمە دەناسن؟ دەڵێن: بەڵێ ئەمە مردنە، هەموویان بەباشی چاویان لێیەتی، ئینجا جاڕچییەکە بانگ دەکا: ئەی دانیشتوانی دۆزەخ! ئەی دۆزەخییەکان! گوێ بگرن، ئەوانیش هەموو گوێ قوڵاخ دەکەنو دەنواڕن بۆی، جاڕچییەکە دەڵێ: ئایا ئەمە دەناسن؟ دەڵێن: ئا، ئەمە مردنە، هەر کەسەشیان لەجێی خۆیەوە بەباشی چاوی لە بەرانەکەیە، کە تەمسیلی مردن دەکا، جا یەحیای کوڕی زەکەریا بەرانەکە پاڵ دەخاو سەری دەبڕێ، ئینجا جاڕکێش بانگەواز هەڵ دەدا: ئەی خەڵکی بەهەشت! خۆشی لەئێوە مژدەتان لێ بێ ئیتر مردن نەما، هەتا هەتایە لەبەهەشتا بەخۆشی دەژین! وەئەی دۆزەخنشینەکان! قوڕ بەبانی چاوتان، دەرگای ئومێدتان لێ داخرا ئیتر مردنیش نەما هەتا هەتایە ئەمە شوێنتانە!. جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) خوێندیەوە: {وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ إِذْ قُضِيَ الْأَمْرُ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ وَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ } (١٩/٣٩) وەئەو کافرانە بترسێنەو هەڕەشەی ئەو ڕۆژەیان لێ بکە کە ڕۆژی داخو خەفەتو ئاهو هەناسەی سەرد هەڵکێشانە، لەو دەمە ناسكو هەڵوێستە ئاڵۆزو شلۆقەدا کە کار لەکار دەتەرازێو ئیش هەموو دەبڕێتەوەو خەڵکی دۆزەخ لەخەڵکی بەهەشت جوێ دەکرێنەوە، بەڵام ئەم بێ بڕوا بێ گوێیانە ئێستا وان لەحاڵەتی کاسیو بێ ئاگاییو نەفامیداو گاڵتەیان بەقسەی هەقی ڕەهبەران دێو، لەبارو دۆخی ئەو ڕۆژە سەختو دیژوارە تێ ناگەن، کەسێ قسەی خێریان بۆ بکا ئەوان بەشێتی دەزانن، لەبەرئەوە بەچاوی دوژمن سەیری ئامۆژگاری دڵسۆزو ناصیحی ئەمین دەکەن! حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوانەی

کە ئێستا وان لەم حاڵەتی بێ ئاگایی و نەفامییەدا ئەوانەی کە بۆ دنیا مردوونو دنیا پەرستن! (ش/ت) تیرمزی (خودای لێ ڕازی بێ) ئەمەی زیاترە: فەرمووی (درودی خودای لەسەربێ): ئەگەر لەبەرئەوە نەبێ کەخودا بڕیاری داوە کەژیانو مانی بەهەشتییەکان لەبەهەشتا هەتا هەتایە، دەنا ئەو ڕۆژە لەخۆشیانا هەموو گەشکەیان دەکردو شادەمەرگ دەبوون! هەروەها ئەگەر لەبەر ئەوەش نەبێ کەخودا بڕیاری داوە کەژیانو مانی دۆزەخییەکان لەدۆزەخدا هەتا هەتایەو بڕانەوەی بۆ نییە، ئەگینا ئەو ڕۆژە لەداخو خەفەتانا هەموو شەقیان دەبردو لەتاوانا دەمرن!!.

قال اللّٰهُ تَعَالَى: {وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِدْرِيسَ إِنَّهُ كَانَ صِدِّيقًا نَّبِيًّا، وَرَفَعْنَاهُ مَكَانًا عَلِيًّا} (١٩/٥٦-٥٧).

واتە: لەقورئانا کەباشترین گەنجینەیە بۆ تۆمارکردنی یادی مەردانو پاراستنی ناوی خواناسان، یادی شایاوی خوداناسی گەورە حەزرەتی ئیدریس بکە، کە پێغەمبەرێکی گەورەی خودایە، تابڵێ ڕاستگۆو ڕاستاڵ بوو، یەکەم ئادەمیزادێ بوو کەبە خامە نامەی نووسی، وەتەماشای ئەحواڵی ئەستێرەکانی کردو حسێبی شەوو ڕۆژو وەرزەکانی ساڵی ڕاگرت، وە بەرزمان کردەوە بۆ پایەیەکی بەرز.

٣٩٨٥- عَنْ أَنَسٍ (رضي الله عنه) عَنْ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: «لَمَّا عُرِجَ بِي رَأَيْتُ إِدْرِيسَ فِي السَّمَاءِ الرَّابِعَةِ». رواه الترمذي[٣].

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کاتێ شەوی میعراج منیان بەرزکردەوە بۆ میعراج لەئاسمانی چوارەم چاوم بەئیدریس پێغەمبەر کەوت (درودی خودا لەسەر پێغەمبەری خۆمانو لەسەر ئەویش بێ) (ت-س/ح).

---

[٣] حسن عند الترمذي.

٣٩٨٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم) لِجِبْرِيلَ «مَا يَمْنَعُكَ أَنْ تَزُورَنَا أَكْثَرَ مِمَّا تَزُورُنَا فَنَزَلَتْ {وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ لَهُ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا وَمَا بَيْنَ ذَلِكَ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا}(١٩/٦٤) رواه البخاري والترمذي[٤].

ئیبنو عەباس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەجوبرائیل دەفەرموێ: بۆچی سەردانەکانت زیاتر ناکەی لەمەی کەئێستا هەیە، پتر نایەیت بۆلامان؟ ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە {وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ لَهُ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا وَمَا بَيْنَ ذَلِكَ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا} واتە: ئەی خۆشەویست! ئێمە بەبێ فەرمانی خودای گەورە نایەینە خوارەوە، هاتنی ئێمەی فریشتە گەل بۆ خزمەتی تۆو پێغەمبەرانی پێش تۆ بەدەست خۆمان نییە، لەسەر فەرمانی خودایە، لەئەزەل هەتا ئەبەد کارو باری هەردوو جیهان لەڕاستیدا لەدەستی خودادایەو خۆی هەموو بەباشی دەزانێو بوونەوەر بەبێ جیاوازی موڵكو دروست کراوی خۆیەتی، ئاگای لەهەمووی هەیە، هیچی لێوون نابێ، گەردێ بەرووی بەردێکی ناو هەردێکی ناو ریزە چیاو شاخو هەڵەتو هەزار بەهەزارەوە لە عیلمی خودادا چون یەکە لەگەڵ کۆمەڵەی ڕۆژیدا لەناو کاکەشانی خۆیدا، ئەی خۆشەویست! کە درەنگ دێین بۆ خزمەتت حیکمەتی خودایی تیادایە، خودا هیچی لەبیر ناچێ، خەم مەخۆ خودا داناو زانایە (ب/ت).

٣٩٨٧- عَنِ السُّدِّيِّ (رحمه الله) قَالَ: سَأَلْتُ مُرَّةَ الْهَمْدَانِيَّ عَنْ قَوْلِ اللّٰهِ عَزَّ وَجَلَّ (وَإِنْ مِنْكُمْ إِلاَّ وَارِدُهَا) فَحَدَّثَنِي أَنَّ عَبْدَ اللّٰهِ بْنَ مَسْعُودٍ حَدَّثَهُمْ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم) يَرِدُ النَّاسُ النَّارَ ثُمَّ يَصْدُرُونَ مِنْهَا بِأَعْمَالِهِمْ فَأَوَّلُهُمْ كَلَمْحِ الْبَرْقِ ثُمَّ كَالرِّيحِ ثُمَّ كَحُضْرِ الْفَرَسِ ثُمَّ كَالرَّاكِبِ فِي رَجلِهِ ثُمَّ كَشَدِّ الرَّجُلِ ثُمَّ كَمَشْيِهِ». رواه الترمذي بسند حسن[٥].

---

[٤] بخاري. تفسير: ٤٧٣١.

[٥] حسن عند الترمذي.

**سوددی** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: لەبارەی مەعنای {وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَى رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا} (١٧/١٩) کە مەعنا دیمەنییەکەی وەهایە کە هەموو کەسێ دەبێ بچێتە ناو دۆزەخەوە. لەموڕرەیهەمەدانیم پرسی، گوتی: عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود فەرمودەیەکی لەم بارەیەوە بۆمان گێڕایەوە، کە حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرموویەتی: مەردوم هەموویان دەڕۆن بۆناو دۆزەخ، لەپاشا هەرکەسە بەپێی کردەوەی خۆی لێی دەردەچێو بەجێی دێڵێ، یەکەمەکانیان وەك بریقەی برووسکە لێی دەردەچنو بەناویدا گزەو گڤڤەی لێدەکەن، دەستەیەکی تر خێرا وەك با تێدەپەڕن دەستەیەکی تر وەك سواری ماین لەتاوی غارا ئاوا، دەستەیەکی تر وەك سوار بەرەوتو نەرمەغار، دەستەیەکی تر وەك سەڵتە زەلام بەهەڕاکردن، دەستەیەکی تر وەك زەلامی پیادە بەڕۆیشتنی ئاسایی (ت-س/ح) لە (مواهب الرحمن) دا دەفەرموێ: حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: چاكو خراپ، کەس نامێنێ کە نەچێتە ناوی، بەڵام وەك چۆن بۆ ئیبراهیم بوو بوو بەمایەی فێنکیو خۆشی هەروا بۆ موسوڵمانیش دەبێ بە فێنکیو خۆشی، تەنانەت ئاگری دۆزەخ لەتاو ساردیو فێنکی جەستەی موسوڵمانان دەست دەکا بە بۆڵە بۆڵو خوتە خوت! لەپاشا خودا خاوەن تەقواکان ڕزگار دەکا.**

**٣٩٨٨- قَالَ خَبَّابٍ** (رضي الله عنه) **كُنْتُ قَيْنًا بِمَكَّةَ، فَعَمِلْتُ لِلْعَاصِي بْنِ وَائِلٍ السَّهْمِيِّ سَيْفًا، فَجِئْتُ أَتَقَاضَاهُ فَقَالَ لاَ أُعْطِيكَ حَتَّى تَكْفُرَ بِمُحَمَّدٍ. قُلْتُ لاَ أَكْفُرُ بِمُحَمَّدٍ** (صلى الله عليه وسلم) **حَتَّى يُمِيتَكَ اللَّهُ، ثُمَّ يَبْعَثُكَ. قَالَ: واللهِ فَذَرْنِي حَتَّى أَمُوتَ ثُمَّ أُبْعَثَ فَسَوْفَ أُوتِيَ مَالاً وَوَلَداً فَأَقْضِيَكَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: (أَفَرَأَيْتَ الَّذِي كَفَرَ بِآيَاتِنَا وَقَالَ لأُوتَيَنَّ مَالاً وَوَلَدًا * أَطَّلَعَ الْغَيْبَ أَمِ اتَّخَذَ عِنْدَ الرَّحْمَنِ عَهْدًا). رواه الشيخان والترمذي**[٦].

---

(٦) بخاری. بیوع: ٢٠٩١، ٢٢٧٥، ٤٧٣٢، ٤٧٣٣، ٤٧٣٤، ٤٧٣٥. تەجریدی بوخاری: ٩٤٩ = ٢٠٩١ فتح الباري. مسلم. صفات المنافقين: ٦٩٩٣. ترمزی. تفسير القرآن: ٣١٦٢.

خەبباب (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: لەسەردەمی نەزانی دا لەمەککە ئاسنگەر بووم، شمشێرێکم بۆ عاصی کوڕی وائیلی سەهمی دروست کرد دوایی چووم داوای هەقدەستەکەیم لێی کرد، گوتی: ناتدەمێ هەتا لە موحەممەد هەڵنەگەڕێیتەوە، منیش گوتم: بەخودا قەت لە دینی موحەممەد هەڵناگەڕێمەوە نە بە زیندویی‌و نە بەمردوویی‌و نە ئەوکاتەیش کەخودا تۆ دەمرێنێ‌و لەپاشدا لەقیامەتدا زیندووت دەکاتەوە!

گوتی: کەوابوو ئێستا وازم لێبێنە هەتا دەمرم‌و زیندوو دەبمەوە، مادام وابێ ئەوکاتەیش ماڵ‌و منداڵم دەبێ، جا ئەو حەلە وەرەوە قەرزەکەت دەدەمەوە!! جا ئەمە دابەزی: {أَفَرَأَيْتَ الَّذِي كَفَرَ بِآيَاتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا، أَاطَّلَعَ الْغَيْبَ أَمِ اتَّخَذَ عِندَ الرَّحْمَنِ عَهْدًا} (١٩/٧٧-٧٨) واتە: دەبێ حاڵی ئەو کابرایە چۆن بێ، کە گاڵتەی بە قەبرو قیامەت دێ‌و بەتەوسەوە بە موسوڵمانان دەڵێ: من لە قیامەتیشا ماڵ‌و منداڵم دەبێ، ئەگەر هەقێکتان لەسەرمە پەلەم لێ مەکەن لەوێ دەتان دەمەوە، دیارە کە ئەم کابرایە غەیبزان نییەو ئەوەندەش پیاوێکی پیرۆزوباش نییە کەعەهدو پەیمانی لەخودا وەرگرتنبێ، کەواتە با گاڵتەی بە ئایەتی ئێمە کردبێ، ڕۆژێ دەبێ خۆی دەبینێتەوە (ش/ت).

قال اللَّهُ تَعَالَى: {وَمَا يَنبَغِي لِلرَّحْمَنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا، إِن كُلُّ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِلَّا آتِي الرَّحْمَنِ عَبْدًا، لَقَدْ أَحْصَاهُمْ وَعَدَّهُمْ عَدًّا} (١٩/٩٢-٩٤).

واتە: خودای میهرەبان زۆر دوورە لەوە کەمناڵ‌و ژن‌و خێزانی هەبێ، زەوی‌و ئاسمانەکان‌و هەرچی لەم دوەدا هەیە هەمووی موڵك‌و سامانی خودایەو عەبدی خۆیەتی‌و هەموویانی سەرژمێری کردوون‌و بە ژماردن ژماردوونی.

٣٩٨٩- تەماشای (ما ورد في سورة البقرة) بکە حەدیثی دەیەم = (ب-٦ ز-٣ ل-١٤ ف-١٠)[٧].

---

[٧] تقدم برقم: ٣٦٩٩/١٠ مجلد سادس تسلسل-٣.

**٣٩٩٠- وعنه عَنْ النبي (صلى الله عليه وسلم) قَالَ «إِذَا أَحَبَّ اللَّهُ عَبْدًا نَادَى جِبْرِيلَ إِنِّي قَدْ أَحْبَبْتُ فُلَانًا فَأَحِبَّهُ قَالَ فَيُنَادِي فِي السَّمَاءِ ثُمَّ تَنْزِلُ لَهُ الْمَحَبَّةُ فِي أَهْلِ الأَرْضِ فَذَلِكَ قَوْلُ اللَّهِ (إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَيَجْعَلُ لَهُمُ الرَّحْمَنُ وُدًّا) وَإِذَا أَبْغَضَ اللَّهُ عَبْدًا نَادَى جِبْرِيلَ إِنِّي قَدْ أَبْغَضْتُ فُلَانًا فَيُنَادِي فِي السَّمَاءِ ثُمَّ تَنْزِلُ لَهُ الْبَغْضَاءُ فِي الأَرْضِ». رواه الترمذي والشيخان[٨].**

**ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کاتێ کە خودا بەندەیەکی خۆشویست بانگی جوبرائیل دەکات، پێی دەفەرموێ: ئەی جوبرائیل! من فیسار کەسم خۆش دەوێت، دەی تۆش خۆشت بوێ فەرمووی: ئیتر جوبرائیل بەناو دانیشتوانی ئاسمانا بانگەواز هەڵ دەداو ئەم هەواڵە پەخش دەکاتەوە، ئیتر خۆشەویستی ئەوکەسە قورس دەبەستێ، لەدڵی دانیشتوانی سەرزەویدا، ئەمە مەبەستە لەم ئایەتە کە دەفەرموێ: {إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَيَجْعَلُ لَهُمُ الرَّحْمَنُ وُدًّا} (١٩/٩٦) ئەوکەسانە کەباوەڕ دەکەن بەخوداو بە پێغەمبەرانی خوداو کردەوە باشەکان دەکەن و بەپێی شەریعەتی خودا ڕەفتار دەکەن، ئەوانە خودای گەورەو میهرەبان ڕەزاشیرینیان دەکاو خۆشەویستییان دەخاتە ناو دڵی هەموو خواناسێکەوە. فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ) کاتێکیش خودا ڕق لە بەندەیێ دەگرێ گازی جوبرائیل دەکا، دەفەرموێ: ئەی جوبرائیل! من ڕقم لە فیسارەکەس گرتووە تۆیش ڕقی لێ بگرە، جا ئەویش بەناو دانیشتوانی ئاسماندا بانگەواز هەڵ دەداو ئەم هەواڵە پەخش دەکاتەوە، ئیتر هەر کەسێ لەلای خۆیەوە، لەسەر ڕووی زەوی، ڕقی لەونەگبەتە دەبێتەوە! (ت/ش — ڕەزای خوایان لێبێ).**

**مەریەم تەواو بوو، علیها السلام**

**بەخۆشی واهات طاهای دڵ نارام!**

**لەبەر خاتری ئەم سوورەتانە:**

**نەبین بەنیشان بۆ تیرو تانە!!**

---

[٨] مسلم.. برٌ وَصلة: ٦٦٤٧.

## ٣- سورەتی طاها (دروودی خوای لێبێ)

## سورة طه (عليه الصلاة والسلام)

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

**٣٩٩١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: لَمَّا قَفَلَ رَسُولُ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم) مِنْ خَيْبَرَ أَسْرَى لَيْلَةً حَتَّى أَدْرَكَهُ الْكَرَى أَنَاخَ فَعَرَّسَ ثُمَّ قَالَ «يَا بِلاَلُ اكْلأْ لَنَا اللَّيْلَةَ». قَالَ فَصَلَّى بِلاَلٌ ثُمَّ تَسَانَدَ إِلَى رَاحِلَتِهِ مُسْتَقْبَلَ الْفَجْرِ فَغَلَبَتْهُ عَيْنَاهُ فَنَامَ فَلَمْ يَسْتَيْقِظْ أَحَدٌ مِنْهُمْ وَكَانَ أَوَّلَهُمُ اسْتِيقَاظًا النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم). فَقَالَ «أَىْ بِلاَلُ». فَقَالَ بِلاَلٌ بِأَبِي أَنْتَ يَا رَسُولَ اللّٰهِ أَخَذَ بِنَفْسِي الَّذِي أَخَذَ بِنَفْسِكَ. فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم) «اقْتَادُوا». ثُمَّ أَنَاخَ فَتَوَضَّأَ فَأَقَامَ الصَّلاَةَ ثُمَّ صَلَّى مِثْلَ صَلاَتِهِ لِلْوَقْتِ فِي تَمَكُّثٍ ثُمَّ قَالَ (أَقِمِ الصَّلاَةَ لِذِكْرِي). رواه الترمذي[1].**

**ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: کاتێ حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) لەغەزای خەیبەر گەڕایەوە شەوێ دەستی کرد بەشەو ڕەوی تاخەو زۆری بۆهێنا، ئیتر فەرمانی کرد لایان دا بۆ ووچان گرتن، لەپاشا فەرمووی: ئەی بیلال! ئاگات لەشەوبێ، کەی بانگ بوو، بۆ نوێژ خەبەرمان بکەرەوە، جا بیلال دەست دەکا بەنوێژکردن، لەپاشا پاڵ دەدا بەوڵاخەکەیەوە، بەڵام چاوی دەچێتە خەوو دەخەوێو کەبەیان دەدا خەبەری نابێتەوە، یەکەم کەس کە ئاگادار دەبێتەوە حەزرەت خۆی دەبێ، دەفەرموێ: ئەی بیلال! بیلال گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! باوکم بە قوربانت بێ، عەفووم کە منیش وەك ئێوە خەو بردمیەوە، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لێخوڕن لەم جێگەیە بگوێزنەوە، ئێرە شەیتانی لێیە لەپاشا وشترەکانیان یەخ داو حەزرەت فەرمانی دا قامەت کرا بۆ نوێژو نوێژی بەیانی بە جەماعەت بۆ کردن، دەق وەك لەکاتی خۆیدا بیکا ئاوا، ئینجا فەرمووی: خودا دەفەرموێ: {أَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي} (ت). ← (ب١ ز-٤٩ ل-٢٠١ ف-١+٢+٣).**

---

[1] سكت عن درجته الشارح.

٣٩٩٢- ← (ب-١ ز-٦ ل-٣٨ ف-٣)(٢).

**طـاهـا سـەرگەورەی ئەنبییاکانـە**

**بۆیـە بۆیـان بـوو بەسـەر دەرگانـە!**

## ٤- سورەتی ئەنبییا (درووودی خودایان لێ بێ) : (سورة الأنبياء)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

قال اللّٰهُ تَعَالَى: {قَالُوا يَا وَيْلَنَا إِنَّا كُنَّا ظَالِمِينَ} (٢١/١٤).

**٣٩٩٣-** عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: «الْوَيْلُ وَادٍ فِي جَهَنَّمَ يَهْوِى فِيهِ الْكَافِرُ أَرْبَعِينَ خَرِيفًا قَبْلَ أَنْ يَبْلُغَ قَعْرَهُ»[١].

**ئـەبو سـەعيد** (خـودای لێ ڕازی بـێ) **دەڵـێ: حـەزرەت** (درووودی خـودای لەسـەربێ) **دەفەرموێ: وەیل ناوی شیوێکە لەدۆزەخدا، کافری تێ دەکەوێ، بەچل ساڵ ناگاتە بنی! (ت-بەسەنەدێکی غەریب).**

**٣٩٩٤-** عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: قَعَدَ رَجُلٌ بَيْنَ يَدَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ يَا رَسُولَ اللّٰهِ إِنَّ لِي مَمْلُوكَيْنِ يُكَذِّبُونَنِي وَيَخُونُونَنِي وَيَعْصُونَنِي وَأَشْتُمُهُمْ وَأَضْرِبُهُمْ فَكَيْفَ أَنَا مِنْهُمْ؟ قَالَ «يُحْسَبُ مَا خَانُوكَ وَعَصَوْكَ وَكَذَبُوكَ وَعِقَابُكَ إِيَّاهُمْ فَإِنْ كَانَ عِقَابُكَ إِيَّاهُمْ بِقَدْرِ ذُنُوبِهِمْ كَانَ كَفَافًا لاَ لَكَ وَلاَ عَلَيْكَ وَإِنْ كَانَ عِقَابُكَ إِيَّاهُمْ دُونَ ذُنُوبِهِمْ كَانَ فَضْلاً لَكَ وَإِنْ كَانَ عِقَابُكَ إِيَّاهُمْ فَوْقَ ذُنُوبِهِمُ اقْتُصَّ لَهُمْ مِنْكَ الْفَضْلُ». قَالَ فَتَنَحَّى الرَّجُلُ فَجَعَلَ يَبْكِي وَيَهْتِفُ فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم) «أَمَا تَقْرَأُ كِتَابَ اللّٰهِ (وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلاَ تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا وَإِنْ كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ وَكَفَى بِنَا حَاسِبِينَ) الآيَةَ. فَقَالَ الرَّجُلُ وَاللّٰهِ يَا رَسُولَ اللّٰهِ مَا أَجِدُ لِي وَلِهَؤُلاَءِ شَيْئًا خَيْرًا مِنْ مُفَارَقَتِهِمْ أُشْهِدُكُمْ أَنَّهُمْ أَحْرَارٌ كُلُّهُمْ». رواهما الترمذي والله أعلى وأعلم[٢].

---

[٢] تقدم برقم: ٣٩/٣ مجلد أول تسلسل٦.

[١] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

[٢] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پیاوێ لەبەردەمی پێغەمبەردا دانیشت عەرزی کرد: ئەی ڕەوانە کراوی یەزدان! ئەی فروستادەی خودا! من چەن بەندەیەکم هەن، ئەوان درۆم لەگەڵ دەکەن و گزیم لێ دەکەن و بەگوێم ناکەن، منیش لەسەر ئەوە جمێنیان پێدەدەم و لێیان دەدەم، جا حاڵم چییە لەگەڵیانا؟ فەرمووی: (دروودی خودای لەسەربێ) گزیو بێ گوێیو درۆکەی ئەوان حلێب دەکرێ لەگەڵ ئەو سزایەی کەتۆ هی ئەوانی دەدەی، جا ئەگەر سزاکەی تۆ رێك بەقەی گوناهەکانی ئەوان بوو ئەوا تۆو ئەوان بەرابەر دەوەستن و هیچتان لەهیچ و پاکتان لەپاك! بەڵام خۆ ئەگەر تۆڵەسەندنەکەی تۆ لەگوناهەکانی ئەوان کەمتر بوو ئەوە پیاوەتییەو بۆ تۆ دەمێنێتەوە، وەلێ ئەگەر زیاتر بوو ئەوە تۆڵەی ئەو زیادەیە لەتۆ دەسێنرێ بۆیان! ئیتر پیاوەکە کلا بوو دەستی کرد بەگریان و هاوار لەخودا. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەدی نامەی خودات نەخوێندۆتەوە کەدەفەرموێ: {وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا وَكَفَى بِنَا حَاسِبِينَ} (٢١/٤٧). واتە: لەڕۆژی ژینەوەدا تەرازووی عەداڵەت دێنین و کردەوەی چاك و کردەوەی خراپیان دەکێشین و زۆرو ستەم (کەم و زۆر) لەهیچ کەس ناکرێ، چاکەو خراپە ئەگەر بەقەد دەنکە خەرتەلەیەکیش بێ دەیهێنین و لە قەپانی دەدەین و لەتەرازووی دادی ئێمەدا هیچ وون نابێ، نە تەرازوو بازی هەیە، نە بەرتیل و ئەرخە هەیە، چونکە هەرشتێ کەخودا خۆی سەرپەرشت و سەر حیسابی بێ ئیتر بەسە بۆ دادپەروەری و کیفایەتە بۆ ئەمینی و سەر ڕاستی! پیاوەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! کەوابێ بەخودا چ بۆ خۆم و چ بۆ ئەوان، لەمە باشتر نابینم کە لێیان جیاببمەوە، ئێوە بەشایەد بن کەوا هەموویانم ساخ بۆ ڕەزای خودا ئازاد کرد. (ت-سند غریب).

## ٥- سورەتی حەج : (سورة الحج)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٣٩٩٥- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ «يَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى يَا آدَمُ. فَيَقُولُ لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ وَالْخَيْرُ فِي يَدَيْكَ. فَيَقُولُ أَخْرِجْ

بَعْثَ النَّارِ. قَالَ: وَمَا بَعْثُ النَّارِ؟ قَالَ: مِنْ كُلِّ أَلْفٍ تِسْعَمِائَةٍ وَتِسْعَةً وَتِسْعِينَ، فَعِنْدَهُ يَشِيبُ الصَّغِيرُ، وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا، وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَى، وَمَا هُمْ بِسُكَارَى، وَلَكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ». قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ وَأَيُّنَا ذَلِكَ الْوَاحِدُ قَالَ «أَبْشِرُوا فَإِنَّ مِنْكُمْ رَجُلاً، وَمِنْ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ أَلْفاً». ثُمَّ قَالَ «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، إِنِّي أَرْجُو أَنْ تَكُونُوا رُبُعَ أَهْلِ الْجَنَّةِ». فَكَبَّرْنَا. فَقَالَ «أَرْجُو أَنْ تَكُونُوا ثُلُثَ أَهْلِ الْجَنَّةِ». فَكَبَّرْنَا. فَقَالَ «أَرْجُو أَنْ تَكُونُوا نِصْفَ أَهْلِ الْجَنَّةِ». فَكَبَّرْنَا. فَقَالَ «مَا أَنْتُمْ فِي النَّاسِ إِلاَّ كَالشَّعَرَةِ السَّوْدَاءِ فِي جِلْدِ ثَوْرٍ أَبْيَضَ، أَوْ كَشَعَرَةٍ بَيْضَاءَ فِي جِلْدِ ثَوْرٍ أَسْوَدَ». رواه الشيخان والترمذي ولفظه: (مِنْ كُلِّ أَلْفٍ تِسْعُمِائَةٍ وَتِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ إِلَى النَّارِ وَوَاحِدٌ فِي الْجَنَّةِ». فَيَئِسَ الْقَوْمُ حَتَّى مَا أَبْدَوْا بِضَاحِكَةٍ فَلَمَّا رَأَى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) الَّذِي بِأَصْحَابِهِ قَالَ «اعْمَلُوا وَأَبْشِرُوا فَوَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ إِنَّكُمْ لَمَعَ خَلِيقَتَيْنِ مَا كَانَتَا مَعَ شَيْءٍ إِلاَّ كَثَّرَتَاهُ يَأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ وَمَنْ مَاتَ مِنْ بَنِي آدَمَ وَبَنِي إِبْلِيسَ». قَالَ فَسُرِّيَ عَنِ الْقَوْمِ بَعْضُ الَّذِي يَجِدُونَ. فَقَالَ «اعْمَلُوا وَأَبْشِرُوا فَوَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ مَا أَنْتُمْ فِي النَّاسِ إِلاَّ كَالشَّامَةِ فِي جَنْبِ الْبَعِيرِ أَوْ كَالرَّقْمَةِ فِي ذِرَاعِ الدَّابَّةِ»[1].

ئەبو سەعیدی خودری (خودای لێ ڕازی بێ) لەگێڕانەوەی خۆیدا لەم فەرموودەیەدا کەلەپێشەوە ڕۆیشت، لەتەفسیری سوورەتی ئیسرادا، لەوێ فەرموودەی ژمارە حەوتە، لەپاش ووشەی: لەهەموو هەزار کەسێ نۆسەدو نەوەدو نۆی بەشی ئاگری دۆزەخە ئاوای دەگێڕێتەوە: ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە منداڵ لەترسا پیر دەبێو سەری سپی دەبێو بەردار بەردەخاتو تەماشا دەکەی ئەو خەڵکە دەڵێی سەرخۆشن ئەوەندە کاسو وورو پەرۆشو شڵەژاون، لەڕاستیدا سەرخۆش نین بەڵام عەزابو سزای خودای گەورە فرەسەختو توندە گوتیان: قوربان! جا ئەو تاقە

[1] تەجریدی بوخاری/٤ ل/٢٠ رقم: ١٣٤٢ = ٣٣٤٨، ٤٧٤١، ٦٥٣٠، ٧٦٨٣. مسلم. إيمان: ٥٣١. ترمذي. صفة الجنة: ٢٥٤٧.

کەسەیە دەبێ کاممان بێ؟! فەرمووی (درودی خودای لەسەربێ): موژدەتان لێ بێ: لەئێوە یەکێ بۆ بەهەشتو لەیەئجووجو مەئجووج نۆصەدو نەوەدو نۆ بۆ دۆزەخ جا فەرمووی: بەوکەسە کەگیانی منی بەدەستە، دیارە کە خودای گەورەیە من ئومێدەکەم کە ئێوە چواریەکی خەڵکی بەهەشت بن هەتا ئەوێ کە دەفەرموێ: نیوەی خەڵکی بەهەشت بن. لێرە دا ئاوایە: لەپاشا فەرمووی: ڕێژەی ئێوە لەچاو خەڵکی تردا وەکوو تاقە موویەکی ڕەش لە پێستی گایەکی سپیدا وایە، یا وەکوو تەڵە موویەکی سپی لە پێستی گایەکی ڕەشداوان (ش/ت) گفتەی (ت) ئاوایە: لەهەموو هەزار کەسێ نۆسەدو نەوەدو نۆی بۆ دۆزەخ دەبێو تاقە یەکێکی بۆ بەهەشت دەبێ جا یاران (خودایان لێ رازی بێ) خەمو پەژارە دایگرتن، بەڕەنگێکی وا پێکەنین نەما، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) کەتەماشای کرد هاوڕێکانی چییان بەسەرهاتووە فەرمووی: دڵتان ساردنەبێتەوە ئێوە کردەوەی باش بکەن کردەوەی باش نیشانەی مزگێنی خودایە، بەوکەسە کەگیانی موحەممەدی وا لەدەستا، ئێوە لەسەر ئەم خاکە دوو جۆر دروستکراوو مەخلووقی ترتان لەگەڵ دایە (کەبریتین لەیەئجووجو مەئجووج) ئەو دوو چەشنە مەخلووقە لەگەڵ هەرشتێکی تردا بن وا زۆری دەکەن ئەبێە (تەنانەت لەبەر زۆری ئەوان ئەو شتە دەرناکەوێ) ئەمە سەرەڕای ئەو کەسانەیش لە نەتەوەکانی تر، کەدەمرن، چ لەنەوەی ئادەم بن، چ لەوەچەی ئیبلیس! ئیتر یاران هەندێ فەرامۆشییان بۆهات، ئەوجا فەرمووی: تێکۆشنو هەوڵو تەقەلاو کۆشش بدەن، بەوخودایە کەگیانی موحەممەدی والەدەستا ئێوە لەچاو خەڵکدا وەك خاڵێ وان کەبەلاقەبرغەی ووشترێکەوەبێ، یا وەك ئەو پوولەکەیە وان کەوا بەدیوی ناوی ڕەفیسکی وڵاخەوە!.

قال اللّٰهُ تَعَالَى: {وَمِنَ النَّاسِ مَن يَعْبُدُ اللّٰهَ عَلَى حَرْفٍ فَإِنْ أَصَابَهُ خَيْرٌ اطْمَأَنَّ بِهِ وَإِنْ أَصَابَتْهُ فِتْنَةٌ انقَلَبَ عَلَى وَجْهِهِ خَسِرَ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةَ ذَلِكَ هُوَ الْخُسْرَانُ الْمُبِينُ} (٢٢/١١).

واتــە: یــەزدانی مــەزن فەرموویــەتی: بــازە کەســێ هــەن بــەپێی بەرژەوەنـدی خۆیـان بەنـدەیی بـۆ خـودا دەکـەن، وەك گوڵـە بـەرۆژە چـۆن لەگـەڵ خـۆردا دەسـووڕێ ئەوانیش ئـاوا بـۆ سـوودی خۆپەرستن‌و لەگـەڵ پارووی چەوردا دەگەڕێن، بۆ سویـچێ دیـن‌و ئابروو نـامووس دەفرۆشـن، ئەگەر خودا کردی تووشی خێرو خۆشی بوون ئەوا عیبادەت‌و بەندەگی‌و دین شتێکی چاك‌و پیرۆزەو ئەوان پێیـان ڕازین‌و دەیانکـەن، وەلـێ ئەگـەر تووشی کارەساتێ یا ناخۆشییەك یا تاقی کردنەوەیـەکی خـودایی بـوون، ئـەوا لەپـەورووو دەکـەون‌و چـاویان بـەرپێی خۆیـان نابینـێ‌و لـەخوداو لەشـوکرو سوپاسـی خـودا، لووتـەلان، بەڕاسـتی ئـەم جـۆرە کەسـانە گەورەترین زیان لەخۆیان دەدەن‌و زیانەو مەندن لەهەر دوو جیهاندا.

٣٩٩٦- قال ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما): كَانَ الرَّجُلُ يَقْدَمُ الْمَدِينَةَ، فَإِنْ وَلَدَتِ امْرَأَتُهُ غُلاَمًا، وَنُتِجَتْ خَيْلُهُ قَالَ هَذَا دِينٌ صَالِحٌ. وَإِنْ لَمْ تَلِدِ امْرَأَتُهُ وَلَمْ تُنْتَجْ خَيْلُهُ قَالَ هَذَا دِينُ سُوءٍ. رواه البخاري[٢].

ئیبنو عەبباس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: بازێ پیاو کە کۆچی دەکرد بۆ مەدینـە سـەیری بەرژەوەنـدی خـۆیی دەکـرد، جا ئەگـەر لـەوە دوا ژنەکـەی کـوڕی ببوایـەو ماینەکـەی بزابایـە بـەدڵی خـۆی، دەیگـوت: بەڕاسـتی ئـەم دینە دینی چاکەو ئەم شـارە پـێ‌و قـەدەمی بەخێرە، بـەڵام ئەگـەر ژنەکـەی سکی نەکردایەو ماینەکەی قسربوایە ئەوا ناسوپاسـی دەکـردو دەیگـوت: بە ڕاستی ئەم ئایینە ئاینێکی خراپ بوو، پێ‌و قەدەمی شەڕ بوو! (ب).

قال اللَّهُ تَعَالَى: {هَذَانِ خَصْمَانِ اخْتَصَمُوا فِي رَبِّهِمْ فَالَّذِينَ كَفَرُوا قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِّن نَّارٍ يُصَبُّ مِن فَوْقِ رُؤُوسِهِمُ الْحَمِيمُ، يُصْهَرُ بِهِ مَا فِي بُطُونِهِمْ وَالْجُلُـودُ، وَلَهُم مَّقَامِعُ مِنْ حَدِيدٍ} (٢٢/١٩-٢٢).

واتە:

---

[٢] بخاري. تفسير: ٤٧٤٢.

موسـوڵمانانو کـافران دوو دوژمنـی راسـتەکی یـەکترین، کەوتونەتـە دوو بەرەکیو شەڕکردن لەسەر دینی راستی خودا، موسوڵمانان دەفەرموون:

دینی موحەممەد دینی خودایە

لەم دینە چەوتەی ئێوە جودایە!

زمــانی حــاڵی کافرەکــانیش دەڵــێ: وەك لەئایەتەکــەی پێــشتر دەردەکەوێ:

دینێکمان دەوێ چەرخو فەلەک بێ

جارێ کەوابێو جارێ کورتەک بێ

وەلــێ ئـەی خۆشەویـست! خـۆتو موسـوڵمانان بـەدڵ سـەرنجی ئـەم دیمەنـە سـامناکە بفـەرموون، کـە چـاوەڕوانی دوژمنـەکانی خودایـە: لـە رۆژی ژینەوەدا کافرەکان کاڵای ئاگرینیـان بـە بەردەبڕێو کـەواو کراسـی تیژاوی قەترانیان بەباڵا دەگیرێ، سەرەڕای ئەوەیش ئـاوی داخـی کوڵاوی لەکوڵ لەناو دۆزەخدا دەکرێ بەسەر سەریاندا، بەو ئاوە لـە کوڵـە هەرچـی وا لــە نــاو سـکیاندا دەتوێتــەوەو چــەرمو پێـستی لەشـیان دادەپڵۆخــێ، سەربارەی ئەمەیشە بەچەکوشـی ئاسـنین سـەرو گوێلاکیـان میـراز دەکـرێ هــەرکاتێ بیانــەوێ لــەئاگری دۆزەخ دەرچــن (لــەتاو خــەمو خەفــەتو پەرێشانی) تەسیان پـێدەکرێو دیـسان دەبرێنـەوە بۆنـاو چـاڵە ئاگرەکـان کەلە بەر پێسیو پۆخڵیو کیمو زووخ دەڵێـی گـەوری ولاخـە! لەهـەمووی خۆشتر ئەوەیە کە فریشتەکان بەتەوسەوە پێیان دەفەرموون: بچێژن تامو چێژی سزای هەڵچزان بەئاگری دۆزەخا.

٣٩٩٧- كَانَ أَبُو ذَرّ (رضى الله عنـه) يُقْـسِمُ إِنَّ هَـذِهِ الآيَـةَ نَزَلَـتْ فِـي حَمْـزَةَ وَصَاحِبَيْهِ، (وهُما علي بن أبي طالبٍ وعبيدة بن الحارث بْنُ عمِّه) وَعُتْبَةَ وَصَـاحِبَيْهِ يَوْمَ بَرَزُوا فِي يَوْمِ بَدْرٍ[٣].

---

[٣] بخاري. تفسير: ٤٧٤٣. مسلم. تفسير: ٧٤٧٨.

جاران ئەبو ذەڕ (خودای لیٚ ڕازی بیٚ) لەسەر ئەمە سویٚندی دەخوارد: کەئەم ئایەتـە لەشـانی حـەمزەو هـەردوو هاوڕیٚکەیـداو عەتبـەو هـەردوو هاوڕیٚکەیدا نازڵ بوو، ئەوکاتە کەلەڕۆژی غەزای بەدردا چوونە مەیدان بۆ یـەکتر، هاوڕیٚکـانی ئیمـامی هـەمزە ئیمـامی عـەلی و عوبەیـدەی کـوڕی حاریثی ئامۆزای بوون (ڕەزای خودایان لەسەر بیٚ) (ش) دیارە کەمەبەستی ئەبو ذەڕ (خودای لیٚ ڕازی بیٚ) سەبەبی نووزوولی ئایەتەکەیە، دەنا بەپیٚی تەفسیرەکان ئایەتەکە عاممەو گشتی یە.

٣٩٩٨- عَنْ عَلِيٍّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ (رضي الله عنه) قَالَ: أَنَا أَوَّلُ مَنْ يَجْثُو بَيْنَ يَدَيِ الرَّحْمَنِ لِلْخُصُومَةِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. قَالَ قَيْسٌ وَفِيهِمْ نَزَلَتْ (هَذَانِ خَصْمَانِ اخْتَصَمُوا فِي رَبِّهِمْ) قَالَ هُمُ الَّذِينَ بَارَزُوا يَوْمَ بَدْرٍ عَلِيٌّ وَحَمْزَةُ وَعُبَيْدَةُ وَشَيْبَةُ بْنُ رَبِيعَةَ وَعُتْبَةُ بْنُ رَبِيعَةَ وَالْوَلِيدُ بْنُ عُتْبَةَ. رواهما الشيخان[٤].

عەلی (خودای لیٚ ڕازی بیٚ) دەڵیٚ: لـە ڕۆژی ژینـەوەدا مـن یەکـەم کـەس دەبم، کەلەبەر دەمی خودای گەورەدا بەچۆکا دیٚم و سکاڵای حاڵی خۆم دەکەم. قەیس دەیگوت: ئەم ئایەتە {هَذَانِ خَصْمَانِ اخْتَصَمُوا فِي رَبِّهِمْ} لەشانی ئـەم دوو دەستەیەدا هاتە خواریٚ، کەلە ڕۆژی غەزای بەدردا چوونە مەیدان بۆ یەکتری، دەستەی موسوڵمانەکان عەلی و حەمزەو عوبەیدە بوون دەستەی کافرەکـانیش شـەیبەی کـوڕی ڕەبیعـەو عوقبـەی کـوڕی ڕەبیعـەو وەلیـدی کوڕی عوتبە بوون (ش).

٣٩٩٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ (رضي الله عنه) عَنْ النبي (صلى الله عليه وسلم) «إِنَّمَا سُمِّيَ الْبَيْتُ الْعَتِيقَ لأَنَّهُ لَمْ يَظْهَرْ عَلَيْهِ جَبَّارٌ»[٥].

عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر (خودای لیٚ ڕازی بیٚ) گوتی: پیٚغەمبـەر (دروودی خودای لەسەربیٚ) فەرمووی: کەعبە بۆیە ناو نراوە بەیتولعەتیق، واتە: خانـەی ئازاد

---

[٤] بخاري. تفسير: ٤٧٤٤، ٣٩٦٦، ٤٩٦٩، ٣٩٦٩، ٤٧٤٣. مسلم. تفسير: ٧٤٧٨، ٧٤٧٩.

[٥] صحيح عند الترمذي (شرحه).

کـراو، چـونکە ئـازادکراوە لەدەسـەڵاتی سـتەمکاران و هـیچ زۆردارو زەبـرداریێ زاڵ نـەبووە بەسـەریا (ت-س/ص) مەبەسـت لـەم فەرموودەیـە ڕاڤەی ئایەتی سیوسێی سوورەتی حەجە کەدەفەرمویێ: {لَكُمْ فِيهَا مَنَافِعُ إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى ثُمَّ مَحِلُّهَا إِلَى الْبَيْتِ الْعَتِيقِ} هەیە بۆ ئێوە لەو ئاژەڵانەدا کە دەیـان بـەن بـۆ حـەرەم (بەسـت)ی مەککـە چـەن بـەهرەییێ، وەکـوو شیرو ماسـتو دۆو ڕۆنو پـەنیرو ژاژیو دۆ ووشـکەو کەشـكو کـەرەو فـرۆو دەڵەمەو قەیماخو سەرتوێژو خەستەو شیرێژو سوێرەکەو لۆرکو سزکو دۆووکو ماسـتاو، وەکـوو کوڵـكو مـوو خـوریو تـووك، وەکـوو گۆشـتو پێستەو شـاخو ریخۆڵـەو ئێـسك، وەکـوو سـواربوونو بارپـیێ هـەڵگرتنو جووت، ئەم هەموو قازانجانەیان بـۆ ئێوە هەیە تاکاتی ناوبراو، واتـە: تـا ئەوکاتـەی دەیانکـەن بەهـەدیو دیـاری مـاڵی خـودا، کـە کۆنـە مـاڵێکی دێرینەی چەن هـەزار ساڵەی خودایە، ئیتر دەبیێ لـەویێ سـەریان ببڕن بۆ شایستەگانیێ کەوان لەویێ (وەرگێڕ).

٤٠٠٠ - قَالَ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) لَمَّا أُخْرِجَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) مِنْ مَكَّةَ قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَخْرَجُوا نَبِيَّهُمْ لَيَهْلِكُنَّ فَأَنْزَلَ اللَّهُ {أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ، الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيَارِهِمْ بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّا أَن يَقُولُوا رَبُّنَا اللَّهُ...}. فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ لَقَدْ عَلِمْتُ أَنَّهُ سَيَكُونُ قِتَالٌ. رواهما الترمذي. والله أعلم[٦].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) دەڵـیێ: کاتـیێ کەپێغەمبـەریان وەدەرنـا لەمەککـە دروودی خـودای لەسـەربێو سـەرو مـاڵو ڕۆحو چـاوو دڵ بەقوربانی خاکی ژێرپای پیرۆزی بێ، بەم بۆنەیەوە ئەبوبەکر گوتی: ئـەم کافرانـە پێغەمبەرەکـەی خۆیانیـان وەدەرنـا، بەڕاسـتی ئەمـە نیـشانەی ئەوەیە کەخودا لـەناویان دەداو دەیـان فـەوتێنیێ، ئیتر خودا ئەم ئایەتـەی

---

[٦] حسن عند الترمذي (شرحه).

نارده خوارێ: {أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا وَإِنَّ اللَّهَ عَلَى نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ، الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيَارِهِمْ بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّا أَن يَقُولُوا رَبُّنَا اللَّهُ} (٢٢/٣٩-٤٠) واتە: ڕێگەدرا بەو موسوڵمانانە کەبە ناحەق و ناڕەوا شەڕیان لەگەڵدا دەکرێ.. کە جەنگ بکەن لەگەڵ دوژمنەکانا، چونکە ستەمیان لێ کراوەو بێگومان خودای گەورە دەتوانێ یارمەتییان بداو هۆی سەرکەوتنیان بۆ بسازێنێ، ئەوانە خانەو لانەیان لێ تێك چووە، پەردەوازەو ئاوارەو دەربەدەر بوون، بەناڕەوا زۆرداری لە ڕەحمەتی خودا دوور لەجێگەو ڕێگەی خۆیان هەڵی کەندوون و پەراگەندی کردوون، لەبەر هیچ نا تەنیا لەبەر ئەوە نەبێ کە دەڵێن: پەروەردگاری ئێمە خودای گەورەو بێ گەردە! چونکە قسەی هەق لەلای ستەمکار گەورەترین جنێوە پێی (ت-س/ح).

## ٦- سوورەتی موئمینون (مەککییە سەدو هەژدە ئایەتە)
## سورة المؤمنون (مكية وهي مائة وثماني عشرة آية)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

قال اللَّهُ تَعَالَى: {قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ، الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ، وَالَّذِينَ هُمْ عَنِ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ، وَالَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَاةِ فَاعِلُونَ، وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ، إِلَّا عَلَى أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ، فَمَنِ ابْتَغَى وَرَاءَ ذَلِكَ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْعَادُونَ، وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ، وَالَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَوَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ، أُوْلَئِكَ هُمُ الْوَارِثُونَ، الَّذِينَ يَرِثُونَ الْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ} (٢٣/١-٢٢).

واتەو مەبەستی ئایەتە پیرۆزەکان بەم شیعرانە دەزانرێ:

ڕێگەی ڕزگاری کۆششی دەوێ
قۆڵی لێ هەڵکەی بەڕۆژو شەوێ
نوێژی ڕێك و پێك لەگەڵ دڵگەرمی
دوور لەناشەرعی و کاری بێ شەرمی

زەکــــاتی ســـامان بـــەبان دوو چـــاوان

بـــدەی بـــۆ خـــودا، بەشایـــستەگان!

دەمپاک، دامەنپاک چون نمـەی باران

تـەماع نەکەیتـە ناموســی خـەڵکان

لەگـــەڵ حـــەڵاڵی خۆتـــا بـــەجوانی

ڕابـــوێرە بـــەپێی یاســـای یـــەزدانی!

ئـــەوە پەســـەندە، نـــەکوو ناشـــیرین

زاڵـــم کەســـێکە لابـــدا لـــەدین

دەسپاکی‌و پـەیمان خووی موسوڵمانە

ئـــەوەی لێـــی لادا دیـــارە نەزانـــە

نامـــان ســـەد نامـــان هـــەتا دەتـــوانی

نوێـــژ نەفـــەوتێنی، بیکـــە بـــەجوانی

کە ئەمانـەت کـرد خۆش موسوڵمانی

ڕزگـــاری، بـــەپێی دەقـــی قورئـــانی

دەبـــی بـــە وارث فـــەیزی ڕەحمـــانی

فەیضـــێ وا بەهەشـت بـێ بـەقوربانی[◆]!

---

[◆] واتاو مەبەستی قورئان بەشیعر روون دەکرێتـەوە مامۆستا مەلاکەریم (خـودا پایـەدار تـری بکا) لەبەرگی پێنجەمی تەفسیری نامی پیرۆزدا لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا: {یعلم مابین أیدیهم وما خلفهم ولا یحیطون به علما} لەلاپەڕە (١٥٣)دا بەشیعر دەفەرموێ: واتە:

زانایـــــــە بەهـــــــەر حاڵـــــــێ بـــــــێ

چ ڕابـــــورد بـــــێ چ لـــــە مـــــەولا بـــــێ

زەڕەیـــــێ ون بـــــێ کـــــاتی ســـــیاهی

نازانـــــــێ حـــــــاڵی (لامتنـــــــاهی)

هـەروا مامۆستا لـە سەرانـسەری تەفـسیرەکەیدا، لـەزۆر شـوێن مەبەسـتەکانی بەشـیعری جـوان لێکداوەتەوە، وەك لەم شیعرەدا دەفەرموێ:

٤٠٠١- قَالَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (رضى الله عنه) كَانَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) إِذَا نَزَلَ عَلَيْهِ الْوَحْيُ سُمِعَ عِنْدَ وَجْهِهِ كَدَوِيِّ النَّحْلِ فَأُنْزِلَ عَلَيْهِ يَوْمًا فَمَكَثْنَا سَاعَةً فَسُرِّىَ عَنْهُ فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ وَرَفَعَ يَدَيْهِ وَقَالَ «اللَّهُمَّ زِدْنَا وَلاَ تَنْقُصْنَا وَأَكْرِمْنَا وَلاَ تُهِنَّا وَأَعْطِنَا وَلاَ تَحْرِمْنَا وَآثِرْنَا وَلاَ تُؤْثِرْ عَلَيْنَا وَأَرْضِنَا وَارْضَ عَنَّا». ثُمَّ قَالَ (صلى الله عليه وسلم) «أُنْزِلَ عَلَيَّ عَشْرُ آيَاتٍ مَنْ أَقَامَهُنَّ دَخَلَ الْجَنَّةَ». ثُمَّ قَرَأَ (قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ) حَتَّى خَتَمَ عَشْرَ آيَاتٍ[1].

**عومەر (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: هەرکاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) سرووشی بۆدەهات لەدەوری سەروچاوی گیزەیێ دەبیسترا وەکی گیزەی هەنگ، ڕۆژێ ئێمە لەخزمەتیا بووین سرووشی بۆهات، لەپاش تاوێ فەرامۆشی بۆ هاتو گرانی هاتنی سرووشەکە بەری دا، ئەوجا ڕووی کردە قیبلەو هەردوو دەستی بەرزەوەکردوو فەرمووی: خودایە! ئەم ڕەحمەتە پتر بکەو کەمی مەکەرەوەو قەدرو ڕێزمان بگرەو سووکمان مەکەو بەشی باشمان پێبدەو نائومێدو بێ بەشمان مەکەو نازمان بگرەو نازی کەس مەدە بەسەرمانداو، ڕازیمان بکەو لێمان ڕازی بە پاش ئەمە فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): دە ئایەتم بۆ هاتوون هەرکەسێ ڕایان بگرێو ڕەفتاریان پێ بکا دەڕواتە بەهەشت لەدواییدا ئەم دەئایەتەی خوێندەوە بەتەواوی: {قد أفلح المؤمنون} (ت-س/ص).**

٤٠٠٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضي الله عنه) قال: أَتَتِ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) الرُّبَيِّعَ بِنْتَ النَّضْرِ وَكَانَ ابْنُهَا حَارِثَةُ بْنُ سُرَاقَةَ أُصِيبَ يَوْمَ بَدْرٍ أَصَابَهُ سَهْمٌ غَرَبٌ فَأَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَتْ أَخْبِرْنِي عَنْ حَارِثَةَ لَئِنْ كَانَ أَصَابَ خَيْرًا

---

**ئەمەیە مەبەس ئەگەر بزانی**

**لە (كل يوم هو في شأن)**

کەواتە بەندە لەڕێڕەوی زانایان دەرنەچووم. لەخودا بەزیاد بێ. (وەرگێڕ)

[1] حديث صحيح عند الترمذي (شرحه).

احْتَسَبْتُ وَصَبَرْتُ وَإِنْ لَمْ يُصِبِ الْخَيْرَ اجْتَهَدْتُ فِي الدُّعَاءِ. فَقَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) «يَا أُمَّ حَارِثَةَ إِنَّهَا جِنَانٌ فِي جَنَّةٍ وَإِنَّ ابْنَكِ أَصَابَ الْفِرْدَوْسَ الأَعْلَى وَالْفِرْدَوْسُ رَبْوَةُ الْجَنَّةِ وَأَوْسَطُهَا وَأَفْضَلُهَا». رواهما الترمذي بسندين صحيحين[٢].

**ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: حاریثی کوڕی ڕوبەیيعی کچی نەضر لە ڕۆژی بەدردا بەتیری وێڵ کوژرا، دایکی هاتە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! هەواڵی حاریثم پێ بفەرموو، حاڵی چۆنە، ئەگەر کەوتووە بەسەر خێرو خۆشیدا ئەوا منیش پاداشی خۆم لەسەر ئەم جەرگ سووتانە لەخودای گەورە داوادەکەمو صەبرو وەقرە دەگرم، ئەگینا هەتا دەتوانم بۆی دەپاڕێمەوە. فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): ئەی دایکی حاریثە! خۆی بەهەشت لەناو بەهەشتەو کوڕەکەی تۆیش فیردەوسی هەرەبالآی وەبەر کەوتووە، ئەو فیردەوسەی کەهەرە پۆپەی بەهەشتەو لەچەقی ناوەڕاستی دایەو خۆشترین جێگەیەتی. (ت/س/ص = تیرمیذی بەسەنەدێکی صەحیح گێڕاویەتەوە).**

٤٠٠٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): «أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ اللَّهَ طَيِّبٌ ولاَ يَقْبَلُ إِلاَّ طَيِّبًا وَإِنَّ اللَّهَ أَمَرَ الْمُؤْمِنِينَ بِمَا أَمَرَ بِهِ الْمُرْسَلِينَ فَقَالَ (يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ) وَقَالَ (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُلُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ)». ثُمَّ ذَكَرَ الرَّجُلَ يُطِيلُ السَّفَرَ أَشْعَثَ أَغْبَرَ يَمُدُّ يَدَيْهِ إِلَى السَّمَاءِ يَا رَبِّ يَا رَبِّ وَمَطْعَمُهُ حَرَامٌ وَمَشْرَبُهُ حَرَامٌ وَمَلْبَسُهُ حَرَامٌ وَغُذِيَ بِالْحَرَامِ فَأَنَّى يُسْتَجَابُ لِذَلِكَ». رواه الترمذي ومسلم[٣].

**لەئەبو هورەیرەوە، لەحەزرەتەوە دەفەرموێ (درودی خودای لەسەربێ): هەی مەردوم! ئەی نەوەی ئادەم! بزانن خودا بۆخۆی پاكو خاوێنە، هەرچیش**

---

[٢] صحيح عند الترمذي.

[٣] مسلم: زكاة: ٢٣٤٣. ترمذي. تفسير القرآن: ٢٩٨٩.

پاك‌و حەلاڵ‌و خاوێن نەبێ وەری ناگرێ‌و قەبووڵی ناکا، بزانن خودا چی فەرمانێکی کردووە بەپێغەمبەران، لەبارەی هەندێ شتەوە هەمان فەرمانیشی کردووە بەموسوڵمان‌و خاوەن باوەڕەکان، ئەوەتانێ بە پێغەمبەرەکان دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ} (٢٣/٥١) وە بەموسوڵمانان‌و خاوەن باوەڕەکانیش دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ}(١٧٢/٢). ئەبو هورەیرە گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) باسی هەندێ کەسی کرد، کە طاعەتێکی جوانی خودا دەکەن بەلام نان‌و ئاوەکەیان حەرامە، فەرمووی: هەندێ کەس دەچن بۆ سەفەری دوورو درێژو قژیان گڤ دەبێ‌و چڵك‌و تۆزیان لێ دەنیشێ‌و سەرگەرمی بەندەیی خوان‌و بەکوڵ‌و بەدڵ دەست درێژ دەکەن بەرەو ئاسمان کە قیبلەگای نزاو پاڕانەوەیەو دەڵێن: خودایە! ئەوەم پێ بدە، خودایە! لەو دەردو بەلایە لام بدە، ئەو خواردنەکەی حەرامە، خواردنەوەکەی حەرامە، بەحەرام گۆش کراوە، ئیتر لەکوێ دووعاو نزای ئەو جۆرە کەسەیە گیرا دەبێ! (ت/م) واتای ئایەتەکان لەسەرەتای (كتاب الطعام والشراب)دا ڕۆیشت.

٤٠٠٤- قَالَتْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَنْ هَذِهِ الآيَةِ (وَالَّذِينَ يُؤْتُونَ مَا آتَوْا وَقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ) قَالَتْ عَائِشَةُ أَهُمُ الَّذِينَ يَشْرَبُونَ الْخَمْرَ وَيَسْرِقُونَ؟ قَالَ «لاَ يَا بِنْتَ الصِّدِّيقِ وَلَكِنَّهُمُ الَّذِينَ يَصُومُونَ وَيُصَلُّونَ وَيَتَصَدَّقُونَ وَهُمْ يَخَافُونَ أَنْ لاَ يُقْبَلَ مِنْهُمْ أُولَئِكَ الَّذِينَ يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَهُمْ لَهَا سَابِقُونَ»[٤].

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لەپێغەمبەرم پرسی بۆ ئەم ئایەتە {وَالَّذِينَ يُؤْتُونَ مَا آتَوا وَّقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ} (٢٣/٦٠). واتە: وە ئەو کەسانە کەخێر دەکەن‌و زەکات دەردەکەن، لەهەمان کاتا بەکردنی خێرو زەکات‌و

---

[٤] صحيح عند الترمذي.

چاکە لەخۆیان بایی نابن‌و ناگۆڕێن، بەڵکوو لەترسی خودا دڵیان دەلەرزێ‌و لەمەکری خودا ئەمین نین‌و مەترسی ئەوەیان هەیە کە ئەوەیان لێ وەرنەگیرێ. گوتم: ئایا ئەمانەی لەم ئایەتەدا باس کراون ئەو کەسانەن کەمەی دەخۆنەوەو دزی دەکەن، بۆیە دەترسن کە طاعەتەکەیان بدرێتەوە بەسەریاندا؟ فەرمووی نەء، ئەی کچی ئەبوبەکری صددیق! بەڵکوو ئەمانە ئەو کەسانەن کەزۆر بەجوانی ڕۆژوو دەگرن‌و نوێژ دەکەن‌و خێرو خێرات دەکەن‌و زەکات دەدەن، لەگەڵ ئەوەیشدا هەر دەترسن لەخوداو مەترسی ئەوەیان هەیە کەخودا بێ باکە، باڵا دەستی نییە، ئەگەر لێیان گیرا نەکا چاریان چییە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوانە خودا دەرهەقیان دەفەرموێ: {أُوْلَئِكَ يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ} (٢٣/٦١) واتە: ئا ئەوانە بۆکاری خێرو بۆ خێرو خێرات‌و بۆچاکە کردن سەریان پێوە نییەو گشت کاتێ لەمەیدانی باشی‌و خوداناسیدا لەپێشەوەن، ئیتر چۆن بادە نووشی دەکەن‌و دزی‌و فزی دەکەن!.

٤٠٠٥- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ (وَهُمْ فِيهَا كَالِحُونَ) قَالَ «تَشْوِيهِ النَّارُ فَتَقَلَّصُ شَفَتُهُ الْعُلْيَا حَتَّى تَبْلُغَ وَسَطَ رَأْسِهِ وَتَسْتَرْخِي شَفَتُهُ السُّفْلَى حَتَّى تَضْرِبَ سُرَّتَهُ». رواهما الترمذي بسند صحيح. نسأل الله الستر والسلامة، آمين[٥].

ئەبو سەعیدی خودری (خودای لێ ڕازی بێ) لەحەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ) ئەم ئایەتە {تَلْفَحُ وُجُوهَهُمُ النَّارُ وَهُمْ فِيهَا كَالِحُونَ} (٢٣/١٠٧) کە مانای وایە: ئەوانەی لەپاش کێشانەی کرداریان دەبرێن بۆ دۆزەخ، حاڵیان زۆر شڕە، هەرجارەی بەجۆرێ جەزرەبە دەدرێن، زمانەو بڵێسەی ئەو ئاگرە هەتا هەتاییە دەم‌و چاویان باوەشێن دەکاو هەڵی دەپرووزێنێ‌و

---

[٥] صحيح عند الترمذي.

لەوێنەی داری سوتەمەرۆ هەڵی دەقرچێنێ‌و لێویان زل دەبێ وەکوو قەراخی کولێرەی سووتاو فەرمووی: ئەم ئایەتە باسی ئەوحاڵەی دۆزەخییە، کە لێوی سەرووی هەڵ دەقرچێ‌و هەڵ دەگەڕێتەوە هەتا دەگاتە ناوەڕاستی سەری وەك چۆن کلاشی پەڕۆیین لووتەکەی هەڵ دەگەڕێتەوە ئاوا وەلێوی خوارووشی شۆڕدەبێەوە هەتا دەدا لەناوکی خودا پەنامان بدا، بەڕاستی دەبێ بە ڕمووزن (ت-س/ص) ڕەحمەت لەوکەسە دەڵێ:

گەر تۆ لە گوتار مەبەستت خوایە
قسەی ڕەوای تۆ جێگەی ڕەزایە
کەواتە دیمەن گەرچی سامناکە
دووری مەزانە، خودا بێ باکە
خودا! لەچارەی نووری دادمین:
دابنێ: مۆری (نووری مونمینین)
هەروا لەچارەی فارسی باوکی
هەروا لەچارەی نامینەی دایکی!
هەروا لەچارەی گشت موسوڵمانێ
لەجێ سەجدەکەی مۆرێ جوان دانێ!

## ٧- سوورەتی نوور

**(ئەم سوورەتە مەدەنییە، شەستو دوو، یا شەستو چوار ئایەتە)**

**سورة النور (مدنية وهي ثنتان أو أربع وستون آية)**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤٠٠٦- عَنْ مَرْثَدُ بْنُ أَبِي مَرْثَدٍ (رضي الله عنه) قَالَ: كَانَتِ امْرَأَةٌ بَغِيٌّ بِمَكَّةَ يُقَالُ لَهَا عَنَاقُ وَكَانَتْ صَدِيقَةً لِي فقابلتني بمكّة ليلةً، فقالَتْ: هَلُمَّ، فَبِتْ عِنْدَنَا اللَّيْلَةَ. فقُلْتُ يَا عَنَاقُ حَرَّمَ اللَّهُ الزِّنَا. فلمَّا قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)

فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنْكِحُ عَنَاقًا، فَأَمْسَكَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَلَمْ يَرُدَّ عَلَيَّ شَيْئًا حَتَّى نَزَلَتِ (الزَّانِي لاَ يَنْكِحُ إِلاَّ زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَالزَّانِيَةُ لاَ يَنْكِحُهَا إِلاَّ زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ وَحُرِّمَ ذَلِكَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ) فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) ((يَا مَرْثَدُ لاَ تَنْكِحْهَا)). رواه الترمذي (أي مطولا بسند حسن).[1]

مەرثەدی کوڕی ئەبو مەرثەد (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لەمەککە ئافرەتێکی خراپ هەبوو، ناوی عەناق بوو، کۆنە دۆستم بوو، شەوێ لەمەککە تووشم بوو، گوتی: ئەی مەرثەد! وەرە ئەم شەو لەلای من ڕابوێرە، گوتم: ئەی عەناق!! خودا داوێنپیسی قەدەغە کردووە، حیزایەتی و موسولْمانەتییان نەگوتووە، جا کە چووم بۆ مەدینە چووم بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) عەرزیم کرد: قوربان! عەناق مارە دەکەم، حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) نە دەنگی کردو نە وەڵامی دامەوە، هەتا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە {الزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَالزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَا إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ} (٣/٢٤) واتە: ستەمە بۆ پیاوی موسوڵمانی لەخودا ترس بتوانێ لەگەڵ ئافرەتی بەدخووی داوێن پیسدا هەڵبکا، لەبەر ئەوە زۆر تر وایە کە پیاوی داوێنپیس ژنی داوێنپیس دێنێ، یا ژنی بتپەرست دەهێنێ هەروەها ژنی داوێنپیس پیاوی بەقەدرو بەڕێزو باش مارەی ناکا، مەگەر پیاوێکی زیناکار مارەی بکا، یا پیاوێکی کافری بێ دین پێی ڕازی بێ و بیخوازێ بۆ خۆی، ئەم دەستوورو باوە وەها قورسی بەستووە لەناو دڵی خەڵکاو واسەری گرتووە دەڵێی حەرامە لەناو موسوڵمانانا). ئەوجا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەی مەرثەد! مارەی مەکە (ت-س/ح) قال المصنف (رحمه الله ورضوانه عليه) في شرحه على تاجه المباركين الميمونين: والواجب التزوج بالعفيفات لحديث: (تخيروا لنطفكم فان العرق دساس) واتە: دانەری تاجی پیرۆز لەشەرحە پیرۆزەکەی سەرتاج دا کە بەخامەی خۆیەتی دەفەرموێ: پێویستە، پیاوی موسوڵمان ژنێکی

---

[1] حسن عند الترمذي.

مەرد بخوازێ لەبەر ئەم فەرموودەیە کە دەفەرموێ: دایکێکی باشی ڕەسەن هەڵبژێرن بۆ نەوەی خۆتان و لەخاکێکی پاکا تۆماوی خۆتان بوەشێنن! چونکە ڕەگ دزەو دەمار دەڕواو ڕەوشی باش و خراپ لە بنەچەی خۆی وەردەگرێ و مناڵ دەچێتەوە سەر ڕەگەزو ڕەسەنی خۆی لەهەردوو سەرەوە، چونکە لەمناڵ دا خوێنی باوان و خاڵوان تێکەڵ دەبێ (لە کوردی دا دەڵێن: گیا لەسەر بنجی خۆی دەڕوێتەوە). (وەرگێڕ)

٤٠٠٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) أَنَّ هِلاَلَ بْنَ أُمَيَّةَ قَذَفَ امْرَأَتَهُ عِنْدَ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) بِشَرِيكِ ابْنِ السَّحْمَاءِ فَقَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) «الْبَيِّنَةُ أَوْ حَدٌّ فِي ظَهْرِكَ». فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِذَا رَأَى أَحَدُنَا الرَّجُلَ عَلَى امْرَأَتِهِ يَنْطَلِقُ يَلْتَمِسُ الْبَيِّنَةَ. قَالَ فَجَعَلَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ «الْبَيِّنَةُ وَإِلاَّ فَحَدٌّ فِي ظَهْرِكَ». قَالَ فَقَالَ هِلاَلُ بْنُ أُمَيَّةَ وَالَّذِى بَعَثَكَ بِالْحَقِّ إِنِّى لَصَادِقٌ وَلَيُنْزِلَنَّ اللَّهُ فِي أَمْرِى مَا يُبَرِّئُ بِهِ ظَهْرِى مِنَ الْحَدِّ قَالَ فَنَزَلَ جِبْرِيلُ - قَالَ - فَأُنْزِلَتْ عَلَيْهِ (وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ) حَتَّى بَلَغَ (وَالْخَامِسَةَ أَنَّ غَضَبَ اللَّهِ عَلَيْهَا إِنْ كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ) قَالَ فَانْصَرَفَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) فَأَرْسَلَ إِلَيْهِمَا قَالَ فَجَاءَ فَقَامَ هِلاَلُ بْنُ أُمَيَّةَ فَشَهِدَ وَالنَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ «إِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ أَنَّ أَحَدَكُمَا كَاذِبٌ فَهَلْ مِنْكُمَا مِنْ تَائِبٍ». فَقَامَتْ فَشَهِدَتْ فَلَمَّا كَانَ عِنْدَ الْخَامِسَةِ قَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) «وَقِّفُوهَا فَإِنَّهَا مُوجِبَةٌ». قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ فَتَلَكَّأَتْ وَنَكَصَتْ حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهَا سَتَرْجِعُ ثُمَّ قَالَتْ لاَ أَفْضَحُ قَوْمِي سَائِرَ الْيَوْمِ. قَالَ فَمَضَتْ فَفَرَّقَ بَيْنَهُمَا قَالَ وَقَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم): أَبْصِرُوهَا فَإِن «وَإِنْ جَاءَتْ بِهِ أَكْحَلَ الْعَيْنَيْنِ سَابِغَ الإِلْيَتَيْنِ خَدَلَّجَ السَّاقَيْنِ فَهُوَ لِشَرِيكِ ابْنِ سَحْمَاءَ». فَجَاءَتْ بِهِ كَذَلِكَ فَقَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) «لَوْلاَ مَا مَضَى مِنْ كِتَابِ اللَّهِ لَكَانَ لِي وَلَهَا شَأْنٌ». زاد في رواية: ثم قضى بالولد للمرأة وفرق بين المتلاعنين ثم جرت السُّنَّة في الميراث أن يرثها وترث منه ما فرض الله لها. روله البخاري والترمذي[٢].

---

[٢] بخاری. تفسیر. ٤٧٤٥، ٤٧٤٦، ٤٧٤٧. تقدم برقم ٢٢٥٠/١ و ٢٢٥١/٢ مجلد ثالث. تسلسل ٦٩ تجرید/٤ ل-٤٦٦ رقم: ١٦٧٦ = ٤٧٤٧ فتح الباري.

← (ب-٣ ز-٦٩ ل-١٦٧ ف-١+ف-٢) ئەم فەرموودەیە لەبەرگی سێدا لەباسی شەڕەنەفریندا ڕابورد والێرەش دەینوسین، چونکە زیادەی بەسوودی زۆری تری تیادایە: ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) دەڵێ: هیلالی کوڕی ئومەییە هاتە لای حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) شەریکی کوڕی سەحمای نا بەقنگی ژنەکەی خۆیەوەو گوتی: بەسەر ژنەکەمەوە گرتوومە، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: شتی وا بەقسەی ڕووت ناسەلمێ، یا بەڵگەو شایەت ڕاست دەکەیتەوە یا داری حەددی بوختیان لەپشتت دەدرێ! گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە چۆن حاڵێکە، کاتێ پیاوێ بەسەر پشتی ژنی خۆمانەوە بگرین بڕۆین بەشوێن، بەڵگەو شایەتدا بگەڕێین! حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەرئەوەیە یا خود بەڵگە پەیدا دەکەی یا خۆت ئامادەکە بۆ داری حەددی بوختان بۆ ژنی مەرد. هیلالیش گوتی: بەو خودایە کەئەم ئایینە ڕاستو دروستەی بەتۆدا بۆ ئێمە ناردووە قسەکەم ڕاستە، کەوابوو لێم ڕوونە کە خودا سرووشت بۆ دەنێرێو پشتی من رزگار دەکا لەداری حەدد، چونکە خودا لەگەڵ هەقە، ئیتر جوبرائیل ئەم ئایەتەی بۆ حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) هێنا: {وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَاء إِلَّا أَنفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ} (٢٤/٦) واتە: ئەو مێردانەی کە بەدەمی خۆیان تۆمەتی حیزێتی دەدەن لە ژنەکانیانو جگە لە خۆیان شایەتو بەڵگەی تریان نییە، ئەوە بۆ ئیسپاتی ئەم داوایە دەبێ خۆی لەلای قازی، لەناو کۆمەڵێکا چوار جار شایەتی بدا: بڵێ: شایەتی دەدەم بە خودا کەمن ڕاست دەڵێم لەوەدا کە دەیڵێم بەژنەکەم، وەکوو داوێنپیسی بێ. وەئەگەر ویستی حاشا لەهاوپشتیو باوکێتیی منداڵەکەیشی بکا ئەوا لەهەموو شایەتییەکانیدا بڵێ: وە ئەو منداڵەیش کەلەلای ژنەکەیە لەمن نییە. وە بۆ جاری پێنجەم بڵێ: لەعنەتو نەفرینی خودام لەسەر بێ ئەگەر درۆ بکەم لەم وەپاڵدان (نسبت)ەدا. ئیتر حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) وازی لەهیلال هێناو ناردی بەشوێن ژنەکەیداو هیلال

هات شایەتییەکەی خۆی لەسەر شێوەی پێشوودا، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) ئامۆژگاری کردن و فەرمووی: خودا بۆخۆی دەزانێ کەئێوە لایەکتان درۆ دەکەن، دەی کەستان دەیەوێ لەقسەی خۆی پەشیمان ببێتەوەو تەوبەی لێ بکا بەڵام ژنەکەش هەڵساو چوار جار شایەتی داو گوتی: شایەتی دەدەم بەخودا بێگومان ئەم مێردەی من درۆزنەو ئەوە شەڵتاخ بوو کردی بەمنا بەڵام کە گەیشتە سەرشایەتی جاری پێنجەم، بەریان لێ بڕییەوەو رایان وەستان و گوتیان: ئەم پێنجەمەیان سزاو تۆڵەی خودا مسۆگەر دەکا، ئەگەر دەتەوێ پێ لە ڕاستی بنێی هێشتا ماوەت ماوە، ژنەکەش هەڵوێستێکی کردو ڕاماو چاش بوو، تەنانەت ئێمە زەینمان بۆ ئەوە چوو کەوا پەشیمان دەبێتەوە لەقسەی خۆی و دەچێتە ژێر تاوانەکەی، کەچی سەرەنجام گوتی: نابم بەمایەی سەرشۆڕی بۆ کەسوکارەکەم و هۆزی خۆم بەدناوناکەم هەتا هەتایە، وەشایەتی پێنجەمیشی دا، جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: چاوی تێبڕن، ئەگەر ئەم ژنە منداڵێکی چاوڕەشی چاو قەویلەی سمت قەوی سمت پانی قۆڵ قەویلەی بوو ئەوە وادەزانم کەمێردەکەی ڕاست دەکاو ژنەکە درۆدەکاو ئەومنداڵە هی شەریکی کوڕی سەحمایە. جاکاتێ کە منداڵەکە لەدایك بوو، حەزرەت چۆنی فەرموو ئاوابوو، بۆیە کەبەم حاڵەی زانی فەرمووی: حوکم و بڕیاری قورئانی فەرموودەو نامەی خودا ڕابورد، وەجێی خۆی گرت و هەڵناوەشێەوە، دەنا ئەگەر لەبەر حوکمی ئایەتی شەڕە نەفرین نەبێ خۆم دەمزانی چیم لەم ژنە دەکرد! لە گێڕانەوەیەکا: ئەمەی پتر کردووە: ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بڕیاری دا کە منداڵەکە هی ژنەکەیەو ژن و مێردەکەیش (کەشەڕەنەفرینیان لەناو خۆیانا کرد) لەیەکی جیاکردنەوە. لەپاشا بۆ کەلەپوریش بوو بە یاساو دەستوور کە منداڵی ژن لە هەل و مەرجی وادا بەپێی پشکی دیاری کراوی خۆی کەلەپوور لەدایکی وەردەگرێ، وە دایکیشی هەروەها بەشە کەلەپووری خۆی لەو منداڵە بەردەکەوێ (ب/ت). لەعەینی دا شێخی

عـەینی (ڕەزای خودای لـێ بـێ) دەفـەرموێ: عیکریمـە (خودای لێ رازی بێ) دەڵـێ: ئـەم مناڵـە لەپاشا بـوو بـە فـەرمانڕەواو ئەمیرلەسـەر میـصر، وەنـاوی بـاوکی نەدەزانرا!. (وەرگێڕ)

قال اللّٰهُ تَعالَى: {إِنَّ الَّذِينَ جَاؤُوا بِالْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَّكُم بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ لِكُلِّ امْرِئٍ مِّنْهُم مَّا اكْتَسَبَ مِنَ الْإِثْمِ وَالَّذِي تَوَلَّى كِبْرَهُ مِنْهُمْ لَهُ عَذَابٌ عَظِيمٌ} (١١/٢٤).

٤٠٠٨- عَنْ عَائِشَةَ (رضى اللّٰهُ تَعالَى عنها) قالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) إِذَا أَرَادَ أَنْ يَخْرُجَ سَفَرًا أَقْرَعَ بَيْنَ أَزْوَاجِهِ، فَأَيَّتُهُنَّ خَرَجَ سَهْمُهَا خَرَجَ بِهَا مَعَهُ، فَأَقْرَعَ بَيْنَنَا فِي غَزْوَةٍ غَزَاهَا فَخَرَجَ سَهْمِي، فَخَرَجْتُ مَعَهُ بَعْدَ مَا نَزَلَ الْحِجَابُ، فَأَنَا أُحْمَلُ فِي هَوْدَجٍ وَأُنْزَلُ فِيهِ، فَسِرْنَا حَتَّى إِذَا فَرَغَ رَسُولُ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم) مِنْ غَزْوَتِهِ تِلْكَ، وَقَفَلَ وَدَنَوْنَا مِنَ الْمَدِينَةِ، آذَنَ لَيْلَةً بِالرَّحِيلِ، فَقُمْتُ حِينَ آذَنُوا بِالرَّحِيلِ، فَمَشَيْتُ حَتَّى جَاوَزْتُ الْجَيْشَ، فَلَمَّا قَضَيْتُ شَأْنِي أَقْبَلْتُ إِلَى رَحْلِي، فإذا عقدٌ لِي مِنْ جَزْعِ أَظْفَارٍ قَدِ انْقَطَعَ، فالتمست عقدي وَحَبسِي ابْتِغَاؤُهُ، فَأَقْبَلَ الرَّهْطُ الَّذِينَ كانوا يَرْحَلُونَ لِي، هَوْدَجِي فَرَحَلُوهُ عَلَى بَعِيرِى وَهُمْ يَحْسِبُونَ أَنِّي فِيهِ، وَكَانَ النِّسَاءُ إِذْ ذَاكَ خِفَافًا لَمْ يَثْقُلْهُنَّ اللَّحْمُ، وَإِنَّمَا يَأْكُلْنَ الْعُلْقَةَ مِنَ الطَّعَامِ، فَلَمْ يَسْتَنْكِرِ الْقَوْمُ خفَّة الْهَوْدَجِ حين رفعوه، وَكُنْتُ جَارِيَةً حَدِيثَةَ السِّنِّ، فَبَعَثُوا الْجَمَلَ وَسَارُوا، فَوَجَدْتُ عِقْدِي بَعْدَ مَا اسْتَمَرَّ الْجَيْشُ، فَجِئْتُ مَنازِلَهُمْ وَلَيْسَ بِها داعٍ ولا مجيبٍ، فَأَمَمْتُ مَنْزِلِي الَّذِى كُنْتُ بِهِ وَظَنَنْتُ أَنَّهُمْ سَيَفْقِدُونِي فَيَرْجِعُونَ إِلَيَّ، فَبَيْنَا أَنَا جَالِسَةٌ في منزلي غَلَبَتْنِي عَيْنَيَ فَنِمْتُ، وَكَانَ صَفْوَانُ بْنُ الْمُعَطَّلِ السُّلَمِيُّ الذَّكْوَانِيُّ مِنْ وَرَاءِ الْجَيْشِ، فَأَصْبَحَ عِنْدَ مَنْزِلِي فَرَأَى سَوَادَ إِنْسَانٍ نَائِمٍ فَأَتَانِي، فعرفني حين رَآنِي وكانَ يراني قَبْلَ الْحِجَابِ فَاسْتَيْقَظْتُ بِاسْتِرْجَاعِهِ حِينَ عرفني. فخمَّرت وجهي بجلبابي والله ماكلّمني كلمةً ولا سمعت منه كلمةً غير استرجاعه حتَّى أَنَاخَ رَاحِلَتَهُ، فَوَطِئَ على يَدَهَا فَرَكِبْتُهَا فَانْطَلَقَ يَقُودُ بِي الرَّاحِلَةَ، حَتَّى أَتَيْنَا الْجَيْشَ بَعْدَ مَا نَزَلُوا مُوغرين في نَحْرِ الظَّهِيرَةِ، فَهَلَكَ مَنْ هَلَكَ، وَكَانَ الَّذِى تَوَلَّى الإِفْكَ عَبْدُ اللّٰهِ بْنُ أُبَيّ ابْنُ سَلُولَ، فَقَدِمْنَا الْمَدِينَةَ فَاشْتَكَيْتُ شَهْرًا والنَّاس يُفِيضُونَ في قَوْلِ أَصْحَابِ

الإِفْكِ، لاَ أَشْعُرُ بِشَيْءٍ مِنْ ذَلِكَ وَيَرِيبُنِي فِي وَجَعِي أَنِّي لاَ أَرَى مِنَ رسول الله (صلى الله عليه وسلم) اللُّطْفَ الَّذِي كُنْتُ أَرَى مِنْهُ حِينَ أشتكي، إِنَّمَا يَدْخُلُ عليَّ فَيُسَلِّمُ ثُمَّ يَقُولُ: كَيْفَ تِيكُمْ ثمَّ ينصرف ولا أشعر بالشَّرِّ. حتَّى خرجت بعدما نقهت، فَخَرَجْت معي أُمُّ مِسْطَحٍ قِبَلَ الْمَنَاصِعِ وهو مُتَبَرَّزُنَا، وكُنَّا لاَ نَخْرُجُ إِلاَّ لَيْلاً إِلَى لَيْلٍ، وَذَلِكَ قَبْلَ أَنْ نَتَّخِذَ الْكُنُفَ قَرِيبًا مِنْ بُيُوتِنَا، وَأَمْرُنَا أَمْرُ الْعَرَبِ الأُوَلِ فِي التَّبرز قبل الغائط، فكُنَّا نتأذَّى بالكنف أن نتَّخذها عند بيوتنا، فانطلق أنا وأمُّ مسطحٍ بن أثاثة وهي بنت أبي رهم بن عبد منافٍ وأمُّها خالة أبي بكرٍ الصِّديق فأقبلت أنا وأمُّ مسطحٍ قبل بيتي، وقد فرغنا من شأننا فعثرت أمُّ مسطحٍ في مِرْطِهَا فَقَالَتْ: تَعِسَ مِسْطَحٌ، فَقُلْتُ لَهَا: بِئْسَ مَا قُلْتِ، أَتَسُبِّينَ رَجُلاً شَهِدَ بَدْرًا، قَالَتْ: أي هَنْتَاهْ أَلَمْ تَسْمَعِي مَا قَال. قلت: وما قَالَ؟ فَأَخْبَرَتْنِي بِقَوْلِ أَهْلِ الإِفْكِ، فَازْدَدْتُ مَرَضًا عَلَى مَرَضِي، فَلَمَّا رَجَعْتُ إِلَى بَيْتِي ودَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) ثم قَالَ: كَيْفَ تِيكُمْ. فَقُلْتُ: أتأذن لِي آتي أَبَوَيَّ. قَالَتْ: وَأَنَا أُرِيدُ أَنْ أَسْتَيْقِنَ الْخَبَرَ مِنْ قِبَلِهِمَا، فَأَذِنَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فجئت أَبَوَيَّ فَقُلْتُ لأُمِّي: يا أمَّتاه مَا يَتَحَدَّثُ قَالَتْ: يَا بُنَيَّةُ هَوِّنِي عَلَيك فَوَاللَّهِ لَقَلَّمَا كَانَتِ امْرَأَةٌ قَطُّ وَضِيئَةٌ عِنْدَ رَجُلٍ يُحِبُّهَا لَهَا ضَرَائِرُ إِلاَّ أَكْثَرْنَ عَلَيْهَا. فَقُلْتُ: سُبْحَانَ اللَّهِ وَلَقَدْ تَحَدَّثُ النَّاسُ بِهَذَا؟ قَالَتْ: فبكيت تِلْكَ اللَّيْلَةَ حَتَّى أَصْبَحْتُ لاَ يَرْقَأُ لِي دَمْعٌ وَلاَ أَكْتَحِلُ بِنَوْمٍ حتَّى أَصْبَحْتُ أبكِي فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ وَأُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ (رضي الله تعالى عنهما) حِينَ اسْتَلْبَثَ الْوَحْيُ، يستأمرهما فِي فِرَاقِ أَهْلِهِ، فَأَمَّا أُسَامَةُ فَأَشَارَ عَلَيْهِ بِالَّذِي يَعْلَمُ من براءة أهله وبالَّذي يعلم لهم فِي نَفْسِهِ مِنَ الْوُدِّ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أهلك وما نَعْلَمُ إِلاَّ خَيْرًا، وَأَمَّا عَلِيٌّ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَمْ يُضَيِّقِ اللَّهُ عَلَيْكَ وَالنِّسَاءُ سِوَاهَا كَثِيرٌ، وإن تسأل الْجَارِيَةَ تَصْدُقْكَ قالت: فَدَعَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بَرِيرَةَ فَقَالَ: أي بَرِيرَةُ هَلْ رَأَيْتِ من شَيْءٍ يَرِيبُكِ. قَالَتْ: لاَ وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ، إِنْ رَأَيْتُ عليها أَمْرًا أَغْمِصُهُ عَلَيْهَا أَكْثَرَ مِنْ أَنَّهَا جَارِيَةٌ حَدِيثَةُ السِّنِّ تَنَامُ عَنِ عَجِينَ أهلها فَتَأْتِي الدَّاجِنُ فَتَأْكُلُهُ. فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَاسْتَعْذَرَ مِنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُبَيّ ابْنِ سَلُولَ فَقَالَ: وهو على المنبر يا معشر المسلمين مَنْ

يَعْذِرُنِي مِنْ رَجُلٍ قد بَلَغَنِي أَذَاهُ فِي أَهْلِي، فَوَاللّٰهِ مَا عَلِمْتُ عَلَى أَهْلِي إلاّ خَيْرًا، وَلَقَدْ ذَكَرُوا رَجُلاً مَا عَلِمْتُ عَلَيْهِ إلاّ خَيْرًا، وَمَا كَانَ يَدْخُلُ عَلَى أَهْلِي إلاّ مَعِي، فَقَامَ سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ أَنَا أَعْذِرُكَ مِنْهُ، إِنْ كَانَ مِنَ الأَوْسِ ضَرَبْت عُنُقَهُ، وَإِنْ كَانَ مِنْ إِخْوَانِنَا مِنَ الْخَزْرَجِ أَمَرْتَنَا فَفَعَلْنَا أَمْرَكَ فَقَامَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ وَكَانَ قَبْلَ ذَلِكَ رَجُلاً صَالِحًا وَلَكِنِ احْتَمَلَتْهُ الْحَمِيَّةُ فَقَالَ لسعدٍ: كَذَبْتَ لَعَمْرُ اللّٰهِ، لاَ تَقْتُلُهُ وَلاَ تَقْدِرُ عَلَى قتله، فَقَامَ أُسَيْدُ بْنُ حُضَيْرٍ فَقَالَ لسعد بن عُبادة: كَذَبْتَ لَعَمْرُ اللّٰهِ لَنَقْتُلَنَّهُ، فَإِنَّكَ مُنَافِقٌ تُجَادِلُ عَنِ الْمُنَافِقِينَ. فتشاور الْحَيَّانِ الأَوْسُ وَالْخَزْرَجُ حَتَّى هَمُّوا أن يقتلوا وَرَسُولُ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم) عَلَى الْمِنْبَرِ فلم يزل يُخَفِّضُهُمْ حَتَّى سَكَتُوا وَسَكَتَ (وانصرف النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إلى بيته) قالت: فَبَكَيْتُ يَوْمِي ذلك لاَ يَرْقَأُ لِي دَمْعٌ وَلاَ أَكْتَحِلُ بِنَوْمٍ، فَأَصْبَحَ عِنْدِي أَبَوَايَ، عندي وقَدْ بَكَيْتُ لَيْلَتَيْنِ وَيَوْمًا وهما يظُنَّان أَنَّ الْبُكَاءَ فَالِقٌ كَبِدِي. فَبَيْنَا هُمَا جَالِسَانِ عِنْدِي وَأَنَا أَبْكِي فَاسْتَأْذَنَتِ عليَّ امْرَأَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ فَأَذِنْتُ لَهَا، فَجَلَسَتْ تَبْكِي مَعِي، قالت: فَبَيْنَا نَحْنُ كَذَلِكَ دَخَلَ علينا رَسُولُ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم) فسلَّمَ ثُمَّ جَلَسَ، وَلَمْ يَجْلِسْ عِنْدِي منذ قِيلَ مَا قِيلَ قَبْلَهَا، وَقَدْ لبث شَهْرًا لاَ يُوحَى إِلَيْهِ فِي شَأْنِي قَالَتْ: فَتَشَهَّدَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) حين جَلَسَ ثُمَّ قَالَ: أَمَّا بعد يَا عَائِشَةُ فَإِنَّهُ قد بَلَغَنِي عَنْكِ كَذَا وَكَذَا، فَإِنْ كُنْتِ بَرِيئَةً فَسَيُبَرِّئُكِ اللّٰهُ، وَإِنْ كُنْتِ أَلْمَمْتِ بذنبٍ فَاسْتَغْفِرِي اللّٰهَ وَتُوبِي إِلَيْهِ، فَإِنَّ الْعَبْدَ إِذَا اعْتَرَفَ بِذَنْبِهِ ثُمَّ تَابَ تَابَ إلى اللّٰهُ تاب عَلَيْهِ. قالت: فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم) مَقَالَتَهُ قَلَصَ دَمْعِي حَتَّى مَا أُحِسُّ مِنْهُ قَطْرَةً فَقُلْتُ لأَبِي أَجِبْ رَسُولَ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم). فيما قَالَ، قَالَ: وَاللّٰهِ مَا أَدْرِي مَا أَقُولُ لِرَسُولِ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم). فَقُلْتُ لأُمِّي: أَجِيبِي رَسُولَ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَتْ: مَا أَدْرِي مَا أَقُولُ لِرَسُولِ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم). قَالَتْ: فقلت وَأَنَا جَارِيَةٌ حَدِيثَةُ السِّنِّ لاَ أَقْرَأُ كَثِيرًا مِنَ الْقُرْآنِ فَقُلْتُ إِنِّي وَاللّٰهِ لَقَدْ عَلِمْتُ لقد سمعتم هذا الحديث حتى استقرَّ فِي أَنْفُسِكُمْ وَصَدَّقْتُمْ بِهِ، فَلَئِنْ قُلْتُ لَكُمْ بأمرٍ، وَاللّٰهُ يَعْلَمُ إِنِّي منه بَرِيئَةٌ لَتُصَدِّقُنِّي وَاللّٰهِ مَا أَجِدُ لَكُمْ مَثَلاً إلاّ قول أبي يوسف قَالَ: ﴿فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَاللّٰهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَى مَا تَصِفُونَ﴾ قالت: ثُمَّ تَحَوَّلْتُ فاضطجعت

عَلَى فِرَاشِي، وَأَنَا أعلم أني بريئةٌ وَلَكِنْ وَاللَّهِ مَا كنتُ أظُنُّ أَنَّ الله مُنزلٌ فِي شَأْنِي وَحْيًا يتلى، ولشأني في نفسي أَحْقَرُ مِنْ أَنْ يُتَكَلَّمَ الله فيَّ بأمرٍ يُتلى ولكن كُنْتُ أَرْجُو أَنْ يَرَى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِي النَّوْمِ رُؤْيَا يُبَرِّئُنِي اللَّهُ بها، قالت: فَوَاللَّهِ مَا رَامَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَلاَ خَرَجَ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ الْبَيْتِ حَتَّى أُنْزِلَ عَلَيْهِ، فَأَخَذَهُ مَا كَانَ يَأْخُذُهُ مِنَ الْبُرَحَاءِ، حَتَّى إِنَّهُ لَيَتَحَدَّرُ مِنْهُ مِثْلُ الْجُمَانِ مِنَ الْعَرَقِ فِي يَوْمٍ شَاتٍ، من ثقل القول الذي ينزل عليه، فَلَمَّا سُرِّيَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَهُوَ يَضْحَكُ، فَكَانَ أَوَّلَ كَلِمَةٍ تَكَلَّمَ بِهَا: يَا عَائِشَةُ أَمَّا الله عزَّ وجلَّ فَقَدْ بَرَّأَكِ فَقَالَتْ أُمِّي: قُومِي إليه (فاجلسي بجواره على بشارته لك) فقلت: وَاللَّهِ، لاَ أَقُومُ إِلَيْهِ، وَلاَ أَحْمَدُ إِلاَّ اللَّهَ عزَّ وجلَّ فَأَنْزَلَ اللَّهُ (إِنَّ الَّذِينَ جَاءُوا بِالإِفْكِ عُصْبَةٌ مِنْكُمْ) العشر الآيَات كُلَّها، فَلَمَّا أَنْزَلَ اللَّهُ تعالى هَذَا فِي بَرَاءَتِي قَالَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ (رضي الله عنه): والله لاَ أُنْفِقُ عَلَى مِسْطَحٍ شَيْئاً أَبَداً بَعْدَ مَا قَالَ فِي عَائِشَةَ وَكَانَ يُنْفِقُ عَلَيه لِقَرَابَتِهِ مِنْهُ وفقره، فأنزل اللَّهُ تَعَالَى: {وَلَا يَأْتَلِ أُوْلُوا الْفَضْلِ مِنكُمْ وَالسَّعَةِ أَن يُؤْتُوا أُوْلِي الْقُرْبَى وَالْمَسَاكِينَ وَالْمُهَاجِرِينَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلْيَعْفُوا وَلْيَصْفَحُوا أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ} قَالَ أَبُو بَكْرٍ: بَلَى، وَاللَّهِ إِنِّي لأُحِبُّ أَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لِي، فَرَجَعَ إِلَى مِسْطَحٍ النفقة التي كَانَ ينفق عَلَيْهِ وقال: والله لا أنزعها منه أبداً. قالت عائشة: وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَسْأَلُ زَيْنَبَ ابنة جَحْشٍ عَنْ أَمْرِي، فَقَالَ: يَا زَيْنَبُ، مَاذا عَلِمْتِ أو رَأَيْتِ، قَالَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَحْمِي سَمْعِي وَبَصَرِي، مَا عَلِمْتُ إِلاَّ خَيْرًا، قَالَتْ: وَهْيَ الَّتِي كَانَتْ تُسَامِينِي، من أزواج النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فعصمها الله بالورع وطفقت أختها حمنة تُحارب لها فهلكت فيمن هلك من أصحاب الإفك. رواه الشيخان والترمذي[٣].

**عائیشه** (خوای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەربێ) **دەستووری وابوو کاتێ دەڕۆیشت بۆ سەفەرێ، لەنێوانی خێزانەکانیدا**

---

[٣] تەجریدی بوخاری/٣ ل-١٩٥ رقم-١١٠٧ = ٢٥٩٣+ ل/٢٠٩ رقم-١١٢١/٢٦٦١. مسلم. توبە: ٦٩٥١. ترمذي. تفسير: ٣١٨٠.

تیرو پشکی دەکرد، ئیتر بەناوی هەرکامێکیانەوە پشك دەربچوایە ئەو ژنەی لەگەڵ خۆیدا دەبرد بۆ ئەو سەفەرە، وە لەسەر ئەم یاسایە جارێ پشکی خست لە ناوماندا، دەیویست بچێ بۆ غەزای بەنی موصطەلەق وا ڕێکەوت پشك بەناوی منەوە دەرچوو، وەمن لە خزمەتیدا چووم بۆ ئەو غەزایە، ئەم سەفەرەیش پاش ئەوەبوو کە ئایەتی حیجابو حیجابگرتنەوە هاتبووە خوارەوە، دەربارەی هاوسەرەکانی حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) لەبەر ئەوە من بە بەرگی حیجابەوە لەناو کەژاوەیەکا هەڵیان دەگرتمو دەیانخستمە سەرپشتی ووشترەکەمو هەر بە کەژاوەکەیشەوە لەوشترەکە دایان دەگرتم، ڕۆیشتین هەتا حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) لەغەزاکەی لێبووەوە گەڕایەوەو گەیشتینە نزیکی مەدینە، لەوێدا لەشەودا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەستووری دا کەبکەونە ڕێو بەرەو مەدینە بجمێن، منیش لەوکاتەدا کە خەڵکەکە خەریکی بارکردن بوون هەستام چووم بۆ سەراوو دوورکەوتمەوە لە قەرەباڵغی سووپاکە[⊕] کاتێ سەراوەکەم تەواو کرد، هاتمەوە بۆلای شوێنەکەی خۆم، تەماشام کرد گەردانەیەکی بەردە شەوەی ظەفارم هەبوو، پسا بوو، وەچەن دانەیەکی لێ داکەوتبوو، منیش بە ڕێگەکەی خۆما گەڕامەوەو گەڕام بۆ ملەوێنکەکەم، جا ئەم گەڕانو خەریکبوونە درەنگی بەسەرهێنامو لەکەژاوەکەم بێ ئاگابووم، تەمەز ئەوانە کە خزمەتی ئێمەیان دەکردو وشترەکەیان بۆم کۆپان دەکرد هاتوون کەژاوەکەی منیان بەخاڵی هەڵگرتووەو ناویانەتە سەر پشتی وشترەکەم، بەبیری خۆیان وایان زانیوە کەمن وام لەناویدا ئەو سەردەمەیش ئافرەتان هێشتا سووکەڵە بوونو قەڵەوو گۆشتنو قورس نەبوو بوون، چونکە خواردنیان کەم بوو، بەقەد بەرکۆڵێ دەبوو نەدەبوو، سەرەڕای ئەمەشە من خۆیشم

---

[⊕] ئەمە دەستوورێکی گەلێ جوانە، ژنان کەدەچن بەلایەکا بەر لەدەرچوون دەچن بۆسەراو، یا دەسنوێژ دەشکێننو دەسنوێژ دەگرنەوە، تا لەملاولا کاری سەراویان نەبێ. (وەرگێڕ)

ئەوحەلە هێشتا کچۆڵە بوومو کەنیشکێکی منداڵکار بوومو تەواو سووکەڵەبووم، ئیتر لەبەر ئەم هۆیانەو دیارە چارەنووسی خودایی وابووە، کاتێ پیاوەکان کەژاوە خاڵییەکە هەڵدەگرنو دەینێن لەوشترەکەی ژێر من هەست بە سووکی و چۆڵییەکەی ناکەنو یەکسەر وشترەکە هەڵدەسێننو دەڕۆن، کاتێ ملەوانەکەمم بەتەواوی دۆزییەوە ڕۆیشتمەوە بۆ شوێن هەواری سوپاکە، تەماشام کرد کەسی لێ نەماوە، ئیتر ڕۆیشتم بۆسەر شوێنە پێشووەکەی خۆمو بەناچاری لەوێ دانیشتم، بەهیوای ئەوە کەهاوڕێکانم درەنگ یا زوو ئاگادار دەبن لەوە کەمن لە کەژاوەکە دا نیمو هەڵەی خۆیان بۆ دەردەکەوێ کە کەژاوەکە بەتاڵەو من لەبەر هەر هۆیێ بێ وون بوومو دەگەڕێنەوە بەشوێنما.

کەمێ مامەوە لەوشوێنەداو خەوم پیاکەوت، کەچاوم کردەوە صەفوانی کوڕی موعەطەلی سولەمی ذەکوانی کەلە پاش سوپاکەوە بوو هات، صەفوان لەبەرەبەیانا سەر خەوێ دەشکێنێو لەپاشا شەو لەناو شەو دەگرێ بەدەمەوەو دەکەوێتە ڕێو لەدەمی بەیاندا گەیشتە لای من صەفوان عادەتی وا دەبێ هەموو جارێ لەسوپاکە دوا دەکەوێ تا دەڕۆن، ئەوجا بەسەر شوێنەواری سوپاکەدا تێ دەپەڕێ ئەگەر شتێ لەسوپاکەدا کەوتبێ هەڵی دەگرێتەوەو شوێنیان دەکەوێ، کەنزیك دەبێتەوە لەمن لەدوورەوە ڕەشایی و تارمایی مرۆڤێکی نووستوو دەبینێ، کە دێتە پێشەوەو دەگاتە سەرم کەتەماشام دەکا دەمناسێتەوە، چونکە لەپێش ئەوەدا کەپەچەو چارشێوگرتنەوە دابێ و بەرگی حیجاب پەیدا ببێ ئەو منی دەدی، کە دەمناسێتەوە دەست دەکا بە گوتنی: (انا لله وإنا اليه راجعون) ئیتر لەدەنگی ئەم ووشەیە خەبەرم بۆوە، کەچاوم کردەوە صەفوان دەیگوت: (انا لله وإنا اليه راجعون). ئیتر من خۆم یەکسەر داپۆشی و گورج چارشێوەکەی خۆمم دا بەڕووی خۆمدا، بەزاتی خودا یەك ووشە چییە، قسەی تری لەگەڵ نەکردم، جگە لەو ئایەتە زیاترم لێ نەبیست، ئەوە نەبێ کە کێشای بەدەستی وشترەکەیداو ییخی داو منیش (بەبێ یاریدەی ئەو

کە باڵم بگرێ یا قاچم هەڵ ببڕێ) سواربووم، جا کەوتە ڕێو جڵەوی وشترەکەی بۆ رادەکێشام، هەتا لەسەر ئەم حاڵەتە گەیشتینەوە بەسوپاکە. کەلەقرچەی گەرمای نیوەڕۆدا بۆ وچان لایان دابوو، جا ئیتر سەبارەت بەمن تیاچوو ئەوەی تیا چوو وەك دەڵێن: باوێڵکە، بایەکی بەسە،داخ لەدڵەکانیش ئەمەیان بەهەل زانی و بەنیازی ئابڕوو بردنی حەزرەت و تانەدان لەخانەوادەی پاك و مەردو داوێن پاکی ویستیان، خەنجەرە کوڵ و کولەکەی خۆیان تا مشتووە رزیوەکەی بدەن لەکۆڵەی ئیسلام بۆ یەکا سەرەکی ناپەکەکان عەبدوڵلای کوڕی ئوبەیی، کە پێشی دەگوترێ عەبدوڵلای کوڕی سەلوول، چونکە دایکی ناوی سەلوولە، ئەو سەرچۆپی گۆبەنی هەلات و بوختانە زلەکەی دەکێشاو خۆش خۆش ئاگری ئاژاوەکەی بەدەستە چیلە خۆش دەکرد، کاتێ گەیشتینەوە مەدینەی نازدار وا ڕێکەوت من یەك مانگی ڕەبەق نەخۆش کەوتم، ئیتر لەبەر ئازاری خۆم ئاگام لەوخەڵکە نەبوو، کەلە ناو خۆیانا باسی ئەو بوختانە دەکەن کەدەستەی هەلاتبازەکان هەڵیان بەستبوو بۆمن، وەکردبوویان بە بنێشتە خۆشەی خۆیان، سەرەڕای ئیش و ئازاری نەخۆشینەکەشم من لەکراسی خۆما پاك بووم* هیچ ئاگام لەم کەین و بەینە نەبوو، بەڵام لەوە دوو دڵ بووم کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ و رەزای خودایش لە گشت هاوسەرەکانی) لەو نەخۆشینەمدا وەك نەخۆشینی جارانم نازی نەدەگرتم و ئەو میهرەبانی جارانەی نەمابوو لەگەڵما** جار جار دەهاتە بەردەرگای هۆدەکەم و سلاوی

---

* من لەلای خودا سەربەرزو پاکم
بۆیە لەتانەی خەڵکی بێ باکم

** بولبول نازدەکا لەگوڵ دەتۆرێ
بۆیە بەنەسری دەسنوێژ دەشۆرێ

واتای ئەم شیعرە: حەزرەت (درووی خودای لەسەر بێ) لەکاتی سەرەمەرگا، لەباوەشی حەزرەتی عائیشەدا گیانی سپارد، دیارە لەودەمەدا عائیشە فرمێسکی بۆ حەزرەت (درووی

لـێ دەکـردین و دەیفـەرموو بـەدایکم کـە بـۆ چـاودێری لـەلام بـوو: نەخۆشـەکەتان چـۆنە؟ ئـیتر دەڕۆیـشت، بـەس لەمـە دوو دڵ بـووم بـەڵام هەستم بەشتی خـراپ نـەدەکرد، تـا ڕۆژێ پـاش ئـەوەی تـۆزێ بووژامـەوەو کـەمێ چـاك بوومـەوە لەگـەڵ دایکـی میسطەحـدا (کـەپورزای بـاوکم بـوو) چـوومە دەرەوە بـۆ مەناصـیع کـە جێگـەی سـەراومان بـوو، شـەواو شـەو نەبوایـە دەر نەدەچـووین ئەوکاتـە هێـشتا ئاودەسـتمان لـەنزیك ماڵەکانمانـەوە دروسـت نـەکردبوو لەسـەر عـادەتی عەرەبـە پێـشینەکان لەچۆڵەوانی سەراومان دەکرد، چونکی ئەوسا ئاودەستی لای مـاڵ ئـازاری دەداین! جاکاتێ لەئیشی خۆمـان بووینـەوەو گەڕاینـەوە بۆ ماڵـەوە دایکـی میسطەح لەڕێگە قاچی لەعەباکەی گیراو پێ ی هەڵکەوت و نزایەکی خراپـی لە میسطەحی کوڕی کردو گوتی: میسطەح سەرنگرێ بێ و لەناو چێ؟ ئـەم دایکی میسطەحە ناوی سەلما بوو، کچی ئەبو ڕەهمی کوڕی مـوطـەلیبـی کـوڕی عەبدولمـەناف بـوو، دایکـی سـەلماش کـچی صـەخری کـوڕی عـامیر بوو، پووری هەقی ئەبوبـەکری صـەدیق بـوو، میسطەحـی کـوڕی سـەلماش کوڕی ئوثاثەی کوڕی عـەببادی کـوڕی مـوطـەلیب بـوو، کەواتـە میسطـەح پورزازای ئەبوبـەکری صـەدیقە. کەئـەو دووعـای شـەڕەی لـە میسطـەح کـرد پێـیم گـوت: بـۆ نـزای لـێ دەکـەی، میسطـەح لەبەشـدارانی جـەنگی بـەدرەو پیاوی باشە قسەی خراپ هەڵناگرێ؟ ئەویش گوتی: ئەی هینە! ئەی گێلە! تـۆ نـازانی ئـەو چـی گوتـووە؟ گـوتم: بۆچـی گوتـووە؟ جـا بـە دووروودرێـژی باسی داستانی بوختانەکەی بۆ گێڕامـەوە. ئیتر نەخۆشیینەکەم لێزینـدوو

---

خـودای لەسـەر بـێ) ڕژانـدووە، حـەزرەتیش لـەم سـەرەمەرگەدا، بـۆ سـڕینەوەی گـەردی ئـەم ڕووداوە، کـە لێـرەدا باسـکراوە، لـەلای عائیـشە ماوەتـەوە، هـەتا گیـانی سـپاردووە، واتـە: چـۆن بولبـول، بەشـەو کـەتاریکی داهـات، خـۆی لـەگوڵ دەدزێتـەوە، بـەڵام بـەیانی زوو دەچـێ خـۆی هەڵدەسوێ لـەبۆن و بەرامـەو شـەونمی سـەر پـەڕەکانی، حـەزرەتیش لەبەرەبـەیانی ژیـانی نـاو بەهەشتا دەسنوێژ بە فرمێسکی عائیشە دەگرێ. (وەرگێڕ)

بویەوە بارم گرانتر بوو، کە چوومەوە بۆ ماڵەوە کاتێ حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) هاتەوە بۆلام و وەك جاران سڵاوی کردو فەرمووی: ئەوەکەتان چۆنە، واتە: نەخۆشەکەتان چۆنە عەرزیم کرد: ڕێگەم دەدەی بڕۆمەوە بۆلای باوك و دایکم؟ عائیشە دەیگوت مەبەستم ئەوە بوو کەئەم دەنگ و باسە لەلای ئەوان ڕوون بکەمەوەو بچمە بنج و بنەوانی، جا حەزرەت ڕێگەی پێدام و منیش ڕۆیشتمەوە بۆلای باوك و دایکم، جا عەرزی دایکمم کرد، دایکە! ئەوقسانە چین، خەڵکی دەیانکەن؟ ئەویش گوتی: کچکەم! لەسەرەخۆ بەو گوێی مەدەرێ، پەتی درۆ کورتە، زوو دەردەکەوێ، بەخودا بەدەگمەن ڕێ دەکەوێ کەژنێ شۆخ و شەنگ و جوان بێ و لەلای مێردەکەی نازدارو خۆشەویست بێ و هەوێباربێ، وەك حاڵی حازری ئێستای تۆ، بەڵام لەپلارو توانج و زمان و دەمی هەوێکانی و کەسانی سەربەهەوێکانی، ڕزگاری بێ و قسەی زۆری بۆهەڵنەبەستن، منیش گوتم: سوبحانەڵڵا لەم سەیرە! ئایا شتی وا ڕێی تێدەچێ کەئەو خەڵکە ئەوەندە دەربەستی ڕەزای خوداو پێغەمبەر نەیەن و قسەی واناڕەوا بکەن؟!

ئیتر شەو کردی و من کردم، ئەوشەوە تا شەبەقی دا هەر گریام و فرمێسکم ووشك نەبۆوەو خەو نەچووە چاوم* وەهەتا سبەینێ سەرو مڕ هەردەگریام. جالەبەر ئەوەی کەلەوکاتەدا سرووش نەدەهات بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەم لایەنەوەو درەنگ هات، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) عەلی کوڕی ئەبو تالیب و ئوسامەی کوڕی زەیدی بانگ کرد، وە بۆ جیابوونەوە لە هاوسەری خۆی کە منم ڕاوێژی پێ کردن، ئوسامە (خودای لێ ڕازی بێ) زۆر بەجوانی ئەوەی کەدەیزانی لەپاکی و پاکیزەیی و مەردایەتی خێزانەکەی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) بەیانی کرد، بەهۆی ئەو دۆستی و

---

* دڵم تەنراوە بەپۆی دڕکەزی
چاو –لەباتی خەو– پڕە لەدەرزی

(وەرگێڕ)

دڵسۆزییەی کەلەناو دەروون‌و ناخی دڵی خۆیدا هەستی پێ دەکرد بەرابەر بەخێزانـەکانی پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەربێ) بـەهۆی ئـەوەوە گـوتی: ئـەی پێغەمبەری خودا! خێزانێ خێزانی تۆ بێ خراپ نابێ‌و هەر قابیل بەخۆتەو دڵت چەکەرە نـەکاو ئێمـە بـەش بـەحاڵی خۆمـان ئـەوەی بـاش نـەبێ لێمـان نـەدیوە. بـەڵام عـەلی (خـودای لێ ڕازی بـێ) گـوتی: قوربـان! خـۆ خـودا دەرووی ژنهێنانی لـێ نەبەستوویت‌و ژنـی تـریش زۆرن لـەدنیادا، ئـەی پێغەمبـەری خـودا! ئەوەنـەبێ لـەم قـسەیە مەبەسـتم ئـەوەبێ خـوا نەخواسـتە مـن دڵـم لەئاسـتی ڕەوشـی بـەرزی عائیـشە گـەردی‌گرتبێ، یاحـەزم لـەوەبێ کـەتۆ دەستبەرداری ببی، نەء مەبەستم ئەمە نییە، بەڵکوو مەبەستم ئەوەیە کەتۆ بەهـەر حاڵـێ خـۆت بەباشـی دەزانـی فەرامۆشـیت بـۆ بـێ، دەنـا ئەگـەر حـەز دەکەی بەباشی لەحاڵەکە حاڵی ببی ئـەوا منیش لـەتۆ باشتری لـێ نـازانم، بۆئەمـە ئەگـەر پرسـیار لەبـەریرە بکـەی کـە کەنیزیـەتی‌و لەگـەڵی هـەڵس‌و کەوت دەکا ئـەو قسەی ڕاسـتت بـۆ دەکـا، دەڵـێ: جـا حـەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) بەریرەی بانگ کردو فەرمووی: ئەی بەریرە! هیچت لە عائیشە دیـوە جێگەی گومان بێ؟ بەریرە گوتی پێی: سوێندم بەوکەسـەی تـۆی بەڕاسـتی ناردووەو کردویتی بە پێغەمبەری ڕاست‌و دروست هیـچی وام لێـی نـەدیوە کە خوانەخواستە مایەی سووکی بێ بۆ پایەو شان‌و شوێن‌و جێگـەی ئـەو، تەنیا ئـەوە نـەبێ کـە کەنیشکێکی منـاڵکارە، هێشتا هەڵسوکەوتی لـەمناڵ دەکا، چونکی جارو بار کە هەویر دەشێلـێ بەسەر هەویرەکـەوە خـەوی لـێ دەکەوێ گەلـێ جار ئاژەڵی ناوماڵ دێن هەویرەکەی دەخۆن! [*].

---

[*] وادەزانم مەبەستی بەریرە (خودای لێ ڕازی بێ) ئەمەیە: ئەم هەژارە هێشتا بۆنی شیری خاو لەدەمی دێ‌و بەرائەتی طوفولەت‌و پاکێتی منداڵی پێوەیەو نەگەیوەتە ڕادەی ژنی کارامەی سڵ لەپیاو شکاو، تاگومانی شتی خراپی لێ‌بکرێ، ئیتر ئەو خەڵکە بۆڵای خودایان بەرداوەو کۆ لـەم بوختانە ناکەنەوە، ئەوکاتە عائیشە (خـودای لێ ڕازی بـێ) پـازدە ساڵی تـەواویش نـەبووە. ئـەم

جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) کە تۆزێ دڵی ئارام بوو، هەر ئەو ڕۆژە ڕۆیشت بۆ مزگەوت و تەشریفی ڕۆیشتە سەرمینبەرو سکاڵای حاڵی کرد لە دەست سەرۆکی ناپاکەکان عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوول و فەرمووی: ئەی گەلی موسوڵمانینە! کێ هەقم دەداتێ و یارمەتیم دەداو لەسەرم دەکاتەوە ئەگەر بچم بەگژ ئەم پیاوە نا پیاوەدا، کە شەرم و شکۆ لەخودا ناکاو بەخوت و خۆڕایی ئازار بەخۆم و خێزانم دەگەیەنێ و بووە بەدڕکی مەم و زین لێمان، دەسا بەزاتی خودا من بەش بەحاڵی خۆم کە پێغەمبەری خودام و لەقسەی ڕاست و لەشایەتی هەق بەموو لانادەم، شایەتی دەدەم بۆ خێزانی خۆم ئەوەی باشەو چاکە نەبێ لەوخێزانی خۆمە نەمدیوە، هەروەها ئەوپیاوەیش کە بەخراپە ناوی دەبەن لەویش ئەوەی باش نەبێ نەمدیوەو لەگەڵ خۆشمدا نەبێ سەری بەماڵی مندا نەکردووە جا سەعدی کوڕی موعاذ مەردانە هەستا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من یارمەتیت دەدەم و هەقت دەدەمێ و لەسەر تۆ دەچم بەگژیدا، ئەگەر ئەو نامەردە گێرە شێوێنە لەهۆزی ئەوسە کەخۆم سەرۆکیانم ئەوا بەس تۆ فەرمان بفەرمووتا بدەم لەملی، خۆ ئەگەر لەبرا خەزرەجییەکانمانە ئەوا چیمان لەبارەیەوە فەرمان پێ بفەرمووی دەیکەین!

کەچی لەوێدا سەعدی کوڕی عوبادەی سەرۆکی خێڵی خەزرەج ڕاستەوە بوو، بەرپەرچی سەعدی کوڕی موعاذی دایەوەو گوتی: درۆت کرد! بەزاتی خودا نایکوژی و ناتوانی بیکوژی! عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: سەعد لەوەبەر پیاوێکی باش بوو، بەڵام لەو کاتەدا دەمارو تەنگە گرتبووی!

جا لەوێدا ئوسەیدی کوڕی حوضەر ڕاستەوە بوو، کە ئامۆزای سەعدی کوڕی موعاذ بوو، گوتی بەسەعدی کوڕی عوبادە: تۆ درۆ دەکەی!

---

پەراوێزە لەناو کەوانەیشدا جێی دەبوۆوە بەڵام دەترسم لەکاتی چاپدا کەوانەکە بپەڕێ و موسوڵمانان وابزانن کەمن بەئارەزووی خۆم قاچ و قووچ لەفەرموودەکان دەکەم. (وەرگێڕ)

سا بە گەورەیی خودا دەیکوژین، بەڕاستی تۆ لە ناپاك و مونافیقانی، ئەوەتانێ بەئاشکرا لەسەر ئەوان دەکەیتەوەو پاسی ناپاکان دەکەی (چۆن موسوڵمان پشتی پێغەمبەر بەردەداو پشتی دژەکەی دەگرێ، تۆ چاو بکەرەوە، ئەی موسوڵمانی خودا! دەزانی قسەکەت کوێ دەگرێتەوە) جا لەوێدا هەر دوو هۆزی ئەوس و خەزرەج هورووژان و نزیك بوو کە بقەومێ وبچن بەگژی یەکاو پەلاماری یەکتر بدەن، حەزرەتیش هەر لە سەرمینبەرەکە راوەستاو لەوێوە بەفەرمایشتی شیرین خەریك بوو هێدی دەکردنەوە، هەتا بەرەبەرە خاوی کردنەوەو بێدەنگ و ئارام بوون و خۆشی خامۆش و ئارام بوو.

عائیشە (سەد هەزار ڕەزای خودای لەسەر بێ)، کە خوا کردوویە بە هۆی ئەم هەموو ئایەت و فەرمایشتە شیرین و بەسوودانە کە بەزمانی پیرۆزی خۆی بۆمان دەگێڕێتەوە، فەرمووی: ئەو ڕۆژەیش کە ئەم هەرایە ڕووی دا دیسانەوە سەرو مڕگریام و خەونەچووە چاوم و فرمێسکم وشك نەکردەوە، وەباوك و دایکم هەر بەلامەوە بوون، وەمن دوو شەوو ڕۆژێ هەر دەگریام، باوك و دایکم لە دڵسۆزی خۆیان لەو باوەڕەدا بوون کەمن لەبەرگریان سوێم دەبێتەوەو گریان جگەرم لەت لەت دەکا جا لەوکاتەدا کەباوك و دایکم لەلام دانیشتبوون و من لەسەر ئەو حاڵە دەگریام ژنێکی ئەنصاری ئیزنی خواست کە بێ بۆلام منیش ڕێگەم پێدا، ئەویش هات دانیشت لەگەڵما دەستی کرد بەگریان!* .

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: لەم کاتەدا کەلەسەر ئەم حاڵە بووین تەماشام کرد پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) هاتەماڵەوە بۆلامان و سڵاوی

---

* بۆیە خوا نەسری هەقی پێ خۆشە
نەشکی نێرگزەو ڕەنگی وەنەوشە
واتە: گوڵاوی دووچاوی پاکە
ناڵای ڕووسوریی دڵی ڕووناکە (وەرگێڕ)

کردو دانیشت، لەو ڕۆژەوە کەئەو قسانە دەربارەی من کرابوون ئەوە یەکەم جار بوو کەلەلام دابنیشێ، ئەوا بووبوو بەمانگێکی ڕەبەقیش کەلەم بارەیەوە نیگای بۆ نەهاتبوو، جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) لەپاش دانیشتن شایەتمانی هێناو فەرمووی: لەپاش سوپاس و ستایشی خودا، ئەی عائیشە! دەربارەی تۆ هەندێ قسەی ناشایستەم بیستۆتەوە، ئەگەر تۆ پاك بی و لەوانە بەدووربی ئەوا خودا بەزوودی پاکیی تۆ ئاشکرا دەکات، ئەگەر قەرەی گوناهیش کەوتووی ئەوا تەوبە بکەو داوای لێخۆشبوون لە خودا بکە، چونکە خودا میهرەبانە لەگەڵ بەندەی خۆی دا، هەرکارتێ بەندەێ گوناهێ بکاو تەوبەی لێ بکا، وە پێ لەگوناهی خۆی بنێ، ئیتر خودای گەورە تەوبەو پەشیمانی لێگیرا دەکا. عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: کاتێ حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمایشتەکەی خۆی تەواو کرد فرمێسك لەچاوما قەتیس ماو وشك بوو هەستم بەتنۆکێ ئەشك نەکرد(چونکی خەم و خەفەت کەزۆری هێنا دەرگای فرمێسك دەبەستێ!) جا بەباوکم گوت: بابا! تۆ لەباتی من وەڵامی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بدەرەوە بۆ ئەم قسەیە کە دەیفەرموێ، باوکم فەرمووی: بەخوا نازانم وەڵامی بدەمەوە، جا گوتم بەدایکم: دەی تۆ وەڵامی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) بدەرەوە، ئەویش فەرمووی: نازانم چی عەرزی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) بکەم. عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: من ئەوکاتە کەنیشکێ منداڵکار بووم و زۆریشم لەقورئان نەخوێندبوو، لەبەرئەوەو لەبەر پەرێشانی دڵی خۆم ناوی حەزرەتی یەعقووبی باوکی حەزرەتی یووسفم لەبیرچوو بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خودای گەورە سەری خستم کە بەگوساخی وەڵامی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) بدەمەوە، بۆیەکا گوتم: بەخودا من باش دەزانم کە ئێوە ئەوەندە ئەم قسەو باسە چووە بەگوێچکەتانا لەدڵتاناچەسپیوەو باوەڕتان پێ کردووە، جا ئەگەر من پێشتان بڵێم: من پاك و بەری و بێ ئاگام لەم بوختانە، ئێوە باوەڕ ناکەن، هەرچەند خودا بەوبانی سەرەوە بۆخۆی دەزانێ و باش باش ئاگادارە کە من لەگوڵ

پاکترمو لەمناڵی ساوا بێ تاوانترم، بەڵام ئەگەر بەدرۆ پێبنێم لەکردنی کارێ کەنەمکردووە، ئەوا ئێوە باوەڕم پێدەکەن، بەڵام سەبووریم بەوەدێ کەخودا بۆخۆی ئاگادارەودەزانێ کەمن وەك دەنکی تەرزە پاكو بێ گەردم، سوێندم بەخودای بانی سەر لەم هەڵوێستە ناسکەدا، کەجەنگەی خەمو خەفەتەو خورپەم لێ کەوتووە لەتاو هێرشی بوختان، سوێندم بەخودا لەئاوا هەڵوێستێکا باشترین داستانێ کەبیکەم بەسەر مەشقو کەبشێ بۆ بەیانی حاڵی منو حاڵی ئێوە فەرمایشتەکەی باوکی حەزرەتی یووسفە، کە کوڕەکانی پیلانیان لە یووسفی برایان کردو بەدرۆ پاکانەیان بۆ باوکیان کردو گوتیان کوڕەکەت گورگ خواردوویەتیو سەرەڕای ئەوەیش ئەوان تانەی ئەوەیان لەباوکیان دەدا: کە گوایە ئێمە قسەی ڕاستت بۆدەکەینو تۆ لەبەرئەوەی دڵت پیسە لەئێمە بڕوامان پێ ناکەی، ئەویش لەم حاڵەدا کەلە دوولاوە جەرگی داخ کرابوو، وەك ئەم حاڵەی من، کاری خۆی سپارد بەخوداو فەرمووی: {فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَاللَّهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَى مَا تَصِفُونَ} (١٢/١٨). واتە: بەشو بارەی من سەبرو ئارامیێکی جوانە لەبەرباری خودای گەورەدا، هەر خودایە داوای یارمەتی لێدەکرێو دەتوانێ کە سەبووری دڵم بداو تەوانایيم پێ بدا بۆ هەڵگرتنی ئەم بارە قورسەی کەئێوە دەیڵێن. گوتی: ئیتر لەوشوێنە هەستامو ڕۆیشتمەوە بۆ سەر نوێنەکەی خۆمو لەسەری پاڵکەوتمەوە!

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: من هەر ئەوکاتە (قەسەم بەخودا) سوور سوور دەمزانی کەمن پاکمو دەمزانی کەخودا پاکیو پاکیزەیی من بەیان دەکا، زوو یا درەنگ ئەو تۆمەتە ناهەقە بەدرۆ دەخاتەوە، من ئەمەم بەباشی دەزانی بەڵام بەخودا زەینم بۆئەوە نەدەچوو کە خودا ئایەتی قورئان لەشانی مندا بنێرێتە خوارەوەو ئەو ئایەتانە لە ناو قورئانی پیرۆزدا بمێننو هەتا هەتایە دەوربکرێنەوە! چونکە لەبیرو باوەڕی خۆمدا خۆم لەوە بەکەمتر دەزانی کەخودای گەورە لەناو ئایەتی قورئاندا باسی من بکاو هەتا هەتایە ئەو ئایەتانە دەوربکرێتەوە لەهەمولایێ!.

وەلێ هیوام هەبوو کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەخەودا خەوێ ببینێو حاڵی بکرێ کەمن بە دوورم لەشتی وا ناشایستە، گوتم: جا سوێندم بەخودا ئیتر هەر لەوێدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەشوێنی خۆی نەبزووت وەکەسی تریش لە دانیشتوانی ناو کۆڕەکە لەماڵ دەرنەچوون هەتا سرووش هاتە خوارەوە، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) سرووش گرتی، وەك هەموو جارێ کە سرووشی بۆدەهات ئەمجارەیش ئاوا قورسی سرووش دایگرت وەك تایەکی گرانو جەستەی پیرۆزی نیشتە سەر ئارەق، تەنانەت دڵۆپی ئارەق، دانە دانە وەگ گۆی مرواری بەڕوخساری پیرۆزو جەستەی نازداریا، بەرو دوا دەهاتە خوارێ! ئەوەیش لەبەر زەبرو قورسیی وەحیو سرووشەکە، لەگەڵ ئەوەیشدا کە ئێمە لەهەرەتی سەرمای زستاندا بووینو ڕۆژەکەشی ڕۆژێکی تۆفی تووشی سارد بوو جا کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرامۆشیی بۆهاتو سرووشەکەی وەرگرتو هاتەوە سەر بارو دۆخی ئاسایی خۆی لەپێش هەموو شتێکا، لە خۆشیاندا پێکەنیو فەرمووی: ئەی عائیشە! موژدەبێ، ئەوا خودای گەورەی خاوەن شکۆ دەری خست کەتۆ پاكو دووری لەوتاوانە!

جا دایکم گوتی: ئەی عائیشە! هەڵسە بچۆ بۆلای حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ و سەرو ماڵو منداڵو ڕۆحو هەستو نەست بەقوربانی خاکی ژێر پای بێ) لەخزمەتیا دانیشە، لەخۆشی ئەم مژدە خۆشەیە، منیش گوتم: بەخودا ناچم بۆلایو سوپاسی خودا نەبێ سوپاسی کەس ناکەم، کە بەمیهرو گەورەیی خۆی ئالای سەربەرزیی بۆمن هەڵکرد. ئیتر خودای گەورەو سەروەر ئەم دە ئایەتەی ناردە خوارەوە: {إِنَّ الَّذِينَ جَاؤُوا بِالْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ....} هەتا {.... وَأَنَّ اللَّهَ رَؤُوفٌ رَحِيمٌ} (٢٤/١١-٢٠) واتە: (ئەو کەسانە کەئەو هەلاتە هەرە گەوەیان هەڵبەست تاقمێ بوون لەخۆتان، وەلێ ئیشی خوا بێ سرنییەو کاری خودا بێ حیکمەتو دانایی نییە، کەواتە بەهەڵەدا مەچنو گومان مەبەن کەئەم درۆو بوختانە شەڕ بوو بۆ ئێوەو زیان لەقەڵای قایمی ئیسلام دەدا، بەڵکوو خودا

کردی بەمایەی خێرو خۆشی بۆ ئێوەو بۆ هەموو گەلی ئیسلام، لەلایەکەوە بوو بە کەففارەتی گوناهو لەلایەکەوە بوو بەهۆی هاتنی هەژدە ئایەتی پیرۆزی قورئان، کەشتی وا قەت خێرو نرخی تەواو نابێ ئەو هەلاتبازانەیش هەر کەسەیان بەپێی بەشداریی خۆی لەدروست کردنی ئەم تاوانە دەستهەڵبەستەدا سزای ڕەوای تاوانی خۆیان وەردەگرن، بەتایبەتی عەبدوڵلای کوڕی سەلوول کە کێشی تاوانەکەی هاویشتە سەرشانی خۆی) ئەی موسوڵمانینە! دەبوو هەرلە سەرەتاوە کەئەم هەلاتە ناهەمووارەتان بیست، گورج پیاوو ژنتان بتانگوتبایە: درۆیێ کەلەکێشانەبێ ئەقڵ نایگرێ ئێمە کە موسڵمانین باوەڕمان وایە کەخودا بێ ڕێزیی نایەنێ بەشانی موحەممەداو ئابڕوو نامووسی خۆی‌و خانەوادەی لەهەموو گەردو لکەیێ دەپارێزێ، کەواتە ئەمە درۆیەکی ئاشکرایە. ئەو درۆ هەڵبەستانە، کوا شایەتیان، کوا بەڵگەو نیشانیان، ئەگە ڕاست دەکەن‌و درۆزن نین با چوار شایەت لەسەرداواکەیان ڕاست بکەنەوە، جا مادام شایەتیان نییە، دیارە مەبەستیان گێرەشێوێنی‌و رووخانی قەڵای ئیسلامە، وە خودا بۆخۆی باش دەزانێ کەئەوانە درۆ دەکەن‌و لەلای خودا بە درۆزن لەقەڵەم دراون. لەفەضڵی خوداوە بوو، بەڕەحمەتی خۆی لەدنیاو دوا ڕۆژدا پاراستنی، دەنا لە تۆڵەی ئەم ووتی ووتییەدا، کە سەرتان تێژەندبوو سزایەکی گەلێ گەورە چزەی لێ‌هەڵدەستاندن! بەتایبەتی لەگەرمەی ئەوکاتەدا کەئەم درۆیەتان کردبوو بە بنێشتە خۆشەی بن ددانتان، واتان دەزانی کەئەمە شتێکی سووک‌و ئاسانە، گەستنی نامووسی موسوڵمانان هەروا بەدەم خۆشە، بەڵام شتی وا لەیاسای خوادا بەتاوانێکی گەلێ گەورە دادەنرێ، دەبوو هەرلە یەکەمجارەوە باوەڕتان نەکردایەو بەدرۆتان بخستایەتەوەو بتانگوتایە: خوانەکا کەئێمە قسەی وا ناڕەوا بەسەر زمانمانا بێ، سوبحانەڵلا لەم درۆ عەنتیکەیە، دەڵێی شاخ‌و گوێی هەیە ئەوەندە هەلاتێکی زل‌و گەورەیە، بەڕاستی درۆ هەروا دەبێ، بوختانی ڕووتی بێ بەڵگەو نیشان‌و شایەت هەروا دەبێ!

خـودا لـەڕووی شـەفەقەت و جەرگـسۆزییەوە تـەمێ و ئامۆژتـان دەکـا، کەجارێکی تر هەڵەی وانەکەن و هەتا هەتایەو بڕای بڕای نـەبن بەکۆمـەکی بۆ بەکرێگیراوانی شەیتان، بۆ بڵاوکردنەوەی تۆوی ئاژاوەنانەوە بەناو گەلی ئیـسلاما، ئەگـەر بەڕاسـتی ئێـوە خـاوەن بـاوەڕو ئیمـانی سـاخن. خـودا هەمیـشە وەك مامۆسـتایەکی میهرەبـانی دڵسۆز گوێ لـەدەرس و دەورتـان دەگرێ و بەنەزاکەت هەڵەتان بۆڕاست دەکاتـەوەو یاساو نیشانەو ئایـەت و حوکمی خۆیتـان بـۆ ڕوون دەکاتـەوە، چونکە خـودا دانایـە بەحاڵ و زانایـە لەکاری خۆیا، دەزانێ شانی بەندەی خۆی چی هەڵدەگرێ.

کەسـانێ کەحـەز دەکـەن قـاوی ناشـیرین دابکـەوێ و ئـابڕووی موسـوڵمانان بـەخوت و خـۆڕایی لکـەدار بکـەن و بـەدرۆو بەڕاسـت شـەن و کـەوی باس و خواسـی ناشـیرین بکـەن، لەهـەر دووجیهانـا سـزای خۆیـان وەردەگرن، خودا خۆی هەموو شتێ بەباشی دەزانێ، بەڵام ئێوە گەلێ شت هەیە لە خۆتانەوە نایزانن، مەگەر کەسێ تر فێرتانی بکا خولاصەی کەلام و پاڵفتـەی فەرمایـشت ئەمەیـە: لەسـایەو فـەضـڵ و ڕەحمـەتی خـوداوەو لەبـەرخاتری بـوونی پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەربێ) لـەناوتانا ئـەمجارە لـەم قـورت و سـەخڵەتییە ڕزگارتـان بـوو وەخـودا لەوانـە خـۆش بـوو کەلەبـەر سـاویلکەیی و کەمتـەر خـەمی، ئـەم دەنگوباسـە پیـسەیان دەمـاو دەم دەقۆستەوە، دەنا کەستان لەتۆڵەی سەختی ئەم تاوانە قوتاری نەدەبوو.

کاتـێ خـودای گـەورە ئـەم ئایەتـەی نـاردە خـوارەوە بـۆ دەربڕینـی پـاکی و بێتاوانی من، باوکم (ئەبوبەکری صەدیق (خودای لێ ڕازی بێ))گوتی: بـەخوا چونکە مەسطەح ئەوەی بەعائیشە گووتوە ئیتر نابێ کەهیچ مەسرەفێکی بۆ بکەم، بۆیە وایگوت چونکە لەوەوبەر مووچانەی دەدا بە مەسطەح، لەبەرئەوە کەهەم خزمی بوو وە هەم هەژار بوو، تا خودای گەورە ئەمەی ناردە خوارەوە: {وَلَا يَأْتَـلِ أُوْلُـوا الْفَضْلِ مِنكُمْ وَالسَّعَةِ أَن يُؤْتُوا أُوْلِي الْقُرْبَـى وَالْمَـسَاكِينَ وَالْمُهَـاجِرِينَ فِـي سَـبِيلِ اللَّـهِ وَلْيَعْفُوا وَلْيَصْفَحُوا أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُـورٌ رَّحِـيمٌ} (٢٢/٢٤) واتـە:

(باخاوەن پایەی ئاییني و خاوەن مایەی جیهانی ئێوە، بەهۆی ئەم ڕووداوەوە، لەخێرکردن و پیاوەتی کردن دڵیان سارد نەبێتەوە، سوێند خواردن و شتی وا نەکەن بەمەهانە بۆئەوەی مووچەو بەراتی خزم و خوێش و هەژاران و ئەوانەی لەمەککەوە لەبەر ڕەزای خوا کۆچیان کردووە بۆ مەدینە، ببڕن، لەناو خۆتانا بەحەوسەڵەو نەرمونیان بن، چاوپۆشیتان هەبێ، لێبوردنتان هەبێ، نابێ لەسەر هەموو شتێ دەست بدەنە شیرو تیر لەیەکتری ساوین، گەلێ شت هەیە لەسەرەتاوە تاڵە، لەژێرەوە شیرینە، ئێوەیێ کەئەوەندە ڕق ئەستووربن نەتانەوێ لەکەسێ خۆش بن کەهەڵەیەکتان لەگەڵ دەکا، ئیتر بەچی ڕوویەکەوە لەخودا داوا دەکەن کەلەتاوانتان خۆش بێ، دەی باش باش بزانن کە خودا هەم تاوانپۆشەو هەم بە ڕەحم‌ومیهرەبانە کەواتە ئێوەش ڕەفتارتان ڕەفتاری ڕەحمان بێ و دوور بن لە هەنگاوەکانی شەیتان).
جا ئەبوبەکر فەرمووی: بەڵێ، بەخوا حەز دەکەم کە خودا لەگوناهم خۆش بێ، ئیتر ئەو خەرجی و مەسرەفەی دەیکرد بۆ میسطەح گەڕاندیەوە بۆی و فەرمووی: بەخودا ئیتر ئەم خەرجی و مەسرەفەی هەتا سەر دەدەمێ و قەت نایبڕم.

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بۆ مەسەلەکەی من پرسیاری لەزەینەبی کچی جەحش کرد، وە فەرمووی: ئەی زەینەب! چی لێ دەزانیت؟ یا چیت دیوە؟ زەینەب دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! من بەگوێی خۆم هیچی خراپم لەم ئافرەتە نەبیستووە، وەبەچاوی خۆم هیچی ناشیرینم لێ نەدیوە، ئیتر لەخۆمەوە درۆی چی بکەم، کەواتە گوێ و چاوی خۆم لەدرۆو بوختان و ئاگری دۆزەخ دەپارێزم! من خێرو چاکە نەبێ هیچم لە عائیشە نەدیوە. عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لەناو خێزانەکانی حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەربێ) هەر زەینەب هەبوو کەهاوتای من بکاو وەك من لەلای خاتری هەبێ و بەجوانی خۆی لەکن حەزرەت ناز بکاو شان لە شانی من بدا، بەلاّم خوا هەقە خودا بەهۆی دینداری و لەخودا ترسیی خۆیەوە پاراستی و باشی گوت و خراپی

نەگوت و قسەی هەقی کرد، بەڵام حەمنەی خوشکی، وەك ئاگری بن کا، لەخۆیەوە لەسەر زەینەب شەڕی بەمن دەگێڕاو ئاگری ئاژاوەکەی خۆش دەکرد، تالەسەر حیسابی من پایەی خوشکەکەی بەرزبکاتەوە، ئەوە بوو ئەویش تیاچوو لەگەڵ ئەوانەدا کەتیا چوون، وەداری حەددی بوختانی لێدرا (ش/ت واتە: ئەم فەرموودە پیرزەیە بوخاری و موسلیم و تیرمیزی گێڕاویانەتەوە. خودا لێیان ڕازی بێ و ئێمەیش لەخاك و پای ئەم مەردە نازادارانە دا پەنا بدا. ئامین).

٤٠٠٩- (ب/٣ ز/٩٥ ل/٢٥٠ ف/٢). واتە: لەبەرگی سێدا، لەباسی حەددی بوختیان و جمین و جادووبازیی دا رابورد. لەلاپەڕە (٢٥٠)دا. فەرموودەی دووەم[٤].

٤٠١٠- وفي روايةٍ: أَخَذْنَ أُزْرَهُنَّ فَشَقَّقْنَهَا مِنْ قِبَلِ الْحَوَاشِي فَاخْتَمَرْنَ بِهَا. رواه البخاري[٥].

لەگێڕانەوەیەکا، کەئیمامی بوخاری (خودای لێ ڕازی بێ) گێڕاویەتەوە دەفەرموێ: کاتێ { وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ...} (٣١/٢٤) هاتە خوارەوە، ژنان دەچوون داوێنی عاباو بەرکۆشەکانی خۆیان دەبڕی، یا پەشتەماڵ و ئاوەڵکراسەکانی خۆیانیان دەهێناو لەقەراخەوە پارچەیەکیان لێ هەڵ دەهێنایەوەو دەیان کرد بە لەچك و دەیان ئاڵاند بەسەرو ملی خۆیانەوە.

٤٠١١- عَنْ جَابِرٍ (رضي الله عنه) قال: كان لعبد الله بْنِ أُبَيِّ سَلُولَ جاريتان، إحداهما تُسمَّى مُسَيْكَةُ وَالأُخْرَى تُسَمَّى أُمَيْمَةُ فَكَانَ يُكْرِهُهُمَا عَلَى الزِّنَى فَشَكَتَا ذَلِكَ إِلَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فَأَنْزَلَ اللَّهُ (وَلاَ تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاءِ) إِلَى قَوْلِهِ (غَفُورٌ رَحِيمٌ). رواه مسلم:[٦].

---

[٤] تقدم برقم: ٣٣٦٩/٢ مجلد ثالث. تسلسل/٩٥.

[٥] تقدم برقم: ٢١٢٣/٢ مجلد ثالث. تسلسل/٤٠.

[٦] مسلم. تفسير: ٧٤٦٨.

**جابیر** (خودای لێ ڕازی بێ) **دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی، کە بەئیبنو سەلوول مەشهوورەو ناوی زڕاوە، چونکە دایکی ناوی سەلوول بوو، ئەم نامەردە دوو کەنیزەکی هەبوو، ناویان موسەیکەو ئومەیمە بوو، دەچوو بەزۆر دەیدان بەکرێ بۆ ئیشی خراپ، واتە: بۆ داوێنپیسی، جا ئەونیش چوون لەلای حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **سکاڵای حاڵیان کرد، عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە موسوڵمانین و ئەم بەدڕەوشتەش، بۆ پوول و پارە بەزۆری زۆرداری زەلاممان دەکاتە پاڵ! جا بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتە دابەزی: {وَلَا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاء إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا لِّتَبْتَغُوا عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ اللَّهَ مِن بَعْدِ إِكْرَاهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ} (٢٤/٣٣) واتە: شەرم و شکۆ لەخودا بکەن و ڕێزی بەندەو دروستکراوانی بگرن و بۆ ریتوپیت و پڕوو پیتی دنیای بێ بەقاو ڕابواردنی چەن ڕۆژێ خودا لەخۆتان مەڕەنجێنن و ژیانی نەبڕاوەی بەهەشت لەکیس خۆتان مەدەن کەواتە ئەو کەنیزەکانەتان کەحەزیان لە مەردی و ڕووسووری و سەربەرزییەو بەدەمی خۆیان هاواردەکەن: یا مردن بەمەردی یا ژین بەسەر بەرزی، بە طەریقی ئەولا شایانی ئەوەن کەناهەقییان لێ نەکەن و قەدرو ڕێزی ئەومەردایەتییەیان بگرن و بەزۆری زۆرداریی ئیشی خراپیان پێ مەکەن و مەیانکەن بەماشەو مەقاش و پەیژە بۆ وەدەستهێنانی ئارەزوو بازی خۆتان، وەکەسێ لەخودا نەترسێ و بەزۆری زۆرداری ئیشی خراپ و داوێنپیسی بە ژنی مەرد بکا، چ کەنیز بێ، چ ئازاد بێ، ئەوە خودا پاشایەکی بەدادە، تەکلیفی مالا یوطاق لەکەس ناکا لەبەر ئەوە چاوپۆشی لەوژنە دەکاو بەڕەحمەت و میهرەبانی خۆشی هەقی ئەو داماوییەیشی بۆدەکاتەوە(م).**

**بەفەڕی سوورەی نوورو فورقانت**

**چاومان ڕۆشنکا: نووری قورئانت!**

## ٨- سورەتی فورقان

**(مەکییە، حەفتاو حەوت ئایەتە)**

## سورة الفرقان (مكية وهي سبع وسبعون آية)

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

قَالَ اللّٰهُ تَعَالَى: {الَّذِينَ يُحْشَرُونَ عَلَى وُجُوهِهِمْ إِلَى جَهَنَّمَ أُوْلَئِكَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضَلُّ سَبِيلًا} (٢٥/٣٤).

**٤٠١٢- ئەم فەرموودەیە لەتەفسیری سوورەتی ئیسرادا ڕابورد، فەرموودەی ژمارە بیست، تەماشای ژمارە بیستو یەکیش بکە[١].**

**٤٠١٣-** عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ (رضي الله عنه) قَالَ: سَأَلْتُ أَوْ سُئِلَ رَسُولُ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم) – أَيُّ الذَّنْبِ عِنْدَ اللّٰهِ أَكْبَرُ؟ قَالَ: أَنْ تَجْعَلَ لِلّٰهِ نِدًّا وَهْوَ خَلَقَكَ. قُلْتُ ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: ثُمَّ أَنْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ خَشْيَةَ أَنْ يَطْعَمَ مَعَكَ. قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: أَنْ تُزَانِيَ بِحَلِيلَةِ جَارِكَ. قَالَ وَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ تَصْدِيقًا لِقَوْلِ رَسُولِ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم) (وَالَّذِينَ لاَ يَدْعُونَ مَعَ اللّٰهِ إِلَهًا آخَرَ وَلاَ يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِى حَرَّمَ اللّٰهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ ولا يزنون). رواه الشيخان والترمذي[٢].

**عەبدوڵڵا (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: خۆم پرسیارم کرد، یا گوتی: یەکێ پرسیاری کرد لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لەلای خودا چ تاوانێ زۆر بە زل دادەنرێ؟ فەرمووی: ئەوە کە هاوبەشو هاوتا بڕیاربدەی بۆ ئەو خودایە کەهەر خۆی تۆی دروست کردووە لەنەبوون! گوتم: لەدوا ئەوە چی گوناهێ دێو بەگەورەترین گوناه دادەنرێ؟ فەرمووی: ئەوە کەلەترسی هەژاری منداڵی خۆت بکوژیت، مەبادا ببێ بەهاوبەشی نانو ئاوت. گوتم: لەپاش ئەمە چی تر؟ فەرمووی: ئەوە کە بەنامەردی داوێنپیسی بکەی لەگەڵ حەڵاڵو هاوسەری هاوسێتاو خووی ژنەکەی خراپ بکەی ئیتر بۆ پشتیوانیو مۆڕکردنی ئەم فەرمایشتە حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) ئەم ئایەتە دابەزی:**

---

[١] تقدم تخريجه برقم: ٣٥٥٢/٢ مجلد السادس تسلسل/١٨.

[٢] بخاري. تفسير: ٤٧٦١. مسلم: إيمان: ٣١٨.

{وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ} (٦٨/٢٥) ← (تەفسیری ئەم ئایەتە لە تەفسیری سوورەتی نیساء دا رابورد). (ش/ت — (خودایان لێ رازی بێ)).

٤٠١٤- ← (ب/٣ ز/٨١ ل/٢٠٦ ف/١١+١٢): لەتەفسیری سوورەتی نیسائیشدا، ڕیواتێکی تری ڕابورد، ژمارەی فەرموودەکە لەوێ حەڤدەو هەژدەیە)[٣].

٤٠١٥- لەباسی تەفسیری سوورەتی نیسائدا ڕابورد، لە فەرموودەی ژمارە حەڤدەدا، لەوێ بەمە دەست پێدەکات: قال:لما نزلت التي في الفرقان: {وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا....} تادوایی[٤].

٤٠١٦- عَنْ عَبْدُ اللَّهِ (رضي الله عنه) خَمْسٌ قَدْ مَضَيْنَ: الدُّخَانُ وَالْقَمَرُ وَالرُّومُ وَالْبَطْشَةُ وَاللِّزَامُ (فَسَوْفَ يَكُونُ لِزَامًا). رواه الشيخان[٥].

← (لەتەفسیری سوورەتی یووسفا ڕابوورد، فەرموودەی چوارەم).

فورقـــان قورئانـــە، قورئـــان چـــرایە

فـــەرموودەی خـــودا نـــەک شـــوعەرایە

## ٩- سوورەتی شوعەراء

(مەککییە سەدو بیستو شەش ئایەتە)

## سورة الشعراء (مكية وهي مائة وست وعشرون آية)

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤٠١٧- ← لە ڕاڤەی سوورەتی ئەنعامدا ڕابورد، کەئەم فەرموودەیە یە: (يلقى إبراهيم أباه آزر.... تاد).

---

[٣] تقدم تخريجه برقم: ٢٢٩٧/١ مجلد الثالث تسلسل/٨١.

[٤] تقدم تخريجه برقم: ٣٨١٠/١٧ مجلد السادس تسلسل/٥.

[٥] تقدم تخريجه برقم: ٣٩٢٩/٤ مجلد السادس تسلسل/١٣.

٤٠١٨- عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ ابْنُ جُدْعَانَ كَانَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ يَصِلُ الرَّحِمَ وَيُطْعِمُ الْمِسْكِينَ فَهَلْ ذَاكَ نَافِعُهُ؟ قَالَ: «لاَ يَنْفَعُهُ إِنَّهُ لَمْ يَقُلْ يَوْمًا رَبِّ اغْفِرْ لِي خَطِيئَتِي يَوْمَ الدِّينِ» رواه مسلم في كتاب الإيمان[٢].

**عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! جاران لەسەردەمی نەزانیدا ئیبنو جەدعان پیاوێکی خزم دۆستو نانبدە بوو، ئایا ئەوە سوودی دەبێ بۆی؟ فەرمووی: نەخەیر! چونکی ڕۆژێ لەڕۆژان نەیگوتووە: خودایە! لەڕۆژی قیامەتو ڕۆژی پاداشدا لەتاوانو گوناهم خۆش بە(م).**

٤٠١٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم): حِينَ أُنْزِلَ عَلَيْهِ (وَأَنْذِرْ عَشِيرَتَكَ الأَقْرَبِينَ) قَالَ: «يَا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ اشْتَرُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ اللّٰهِ لاَ أُغْنِي عَنْكُمْ مِنَ اللّٰهِ شَيْئًا يَا بَنِي عَبْدِ مَنَاف لاَ أُغْنِي عَنْكُمْ مِنَ اللّٰهِ شَيْئًا يَا عَبَّاسَ بْنَ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ لاَ أُغْنِي عَنْكَ مِنَ اللّٰهِ شَيْئًا يَا صَفِيَّةُ عَمَّةَ رَسُولِ اللّٰهِ لاَ أُغْنِي عَنْكِ مِنَ اللّٰهِ شَيْئًا وَيَا فَاطِمَةُ بِنْتَ رَسُولِ اللّٰهِ سَلِينِي مَا شِئْتِ مِنْ مَالِي لاَ أُغْنِي عَنْكِ مِنَ اللّٰهِ شَيْئًا». رواه الشيخان والترمذي[٣]. وَلفظِه: يا معشر بني عبد المطلب أنقذوا أنفسكم من النار فإني لا أملك لكم ضراً وَلاَ نَفعاً، يا فاطمة بنت محمد أَنْقِذِي نَفْسَكِ مِنَ النار، فَإِنِي لاَ أَمْلِكُ لَكِ ضَرّاً وَلاَ نَفعاً إِنَّ لَكَ رَحماً سأبلّها ببلاها.

**ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: کاتێ خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: {وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ} (٢٦/٢١٤) واتە: مادەم تۆ لەم هەموو ڕازو نهێنییە تێگەیشتیت، هەمیشە پەیوەندی خۆت لەگەڵ خودا بەهێزکەو ئەو خزمانەت کە زۆر نزیکن و تێکەڵن لەگەڵتا، بیان ترسێنە لەسزای خودا.**

---

[٢] مسلم. إيمان. ٥١٧.

[٣] تجريد البخاري (مختصر صحيح البخاري) مجلد/٣ ل/٢٧٠ رقم/١١٤٠ = ٢٧٥٣ فتح الباري، ٣٥٢٧، ٤٧٧١.

**کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، حەزرەت** (درودی خودای لەسەربێ) **ڕۆیشت لەسەر تەپۆڵکەی صەفا ڕاوەستاو بەدەنگی بەرز فەرمووی: ئەی هۆزی قورەیش! نەفسی خۆتان لەخودای گەورە بکڕن، من لەلایەنی خوداوە هیچ سودێ بەئێوە ناگەیەنم ئەی نەوەی عەبدولمەناف! من لەلایەنی خوداوە هیچ سوودێ بەئێوە ناگەیەنم، ئەی عەبباسی کوڕی عەبدولموتەڵیب! من لەلای خودا هیچ سوودێ بەتۆ ناگەیەنم، ئەی صەفییەی پووری پێغەمبەری خودا! من لەلای خودا هیچ سوودێ بەتۆ ناگەیەنم، ئەی فاتیمەی کچی موحەممەد! ئەگەر داوای ماڵی دنیا دەکەی ئێستا بیکە، دەنا لەقیامەتدا من هیچ سوودێ بەتۆ ناگەیەنم (ش/ت).**

**گفتەی تیرمیزی: ئەی خزمانی نەوەی عەبدولموتەلیب! لە ئاگری دۆزەخ خۆتان قوتارکەن، بەوەرگرتنی ئایینی ئیسلام، ئەگینا من لە ڕۆژی قیامەتدا، نەدەسەلاتی سوودو قازانجم هەیە بۆتان و نەزیان، ئەی فاتیمەی کچی موحەممەد! خۆت ڕزگار کە، لەئاگری دۆزەخ، ئەگینا من لە ڕۆژی قیامەتدا نەدەسەلاتی سوودم هەیە بۆت نەزیان، ڕاستە کە تۆکەسی منیت، وەلێ من هەر ئەوەندەم لەدەست دێ کە لەدنیادا مافی خزمایەتی و کەسایەتی خۆتت بەپێێ تەوانا پێ بدەم و بەس!.**

**شوعەراش (نەملن) لەیەکتر دانە**

**دەدزن، دەیکەن بەگۆی گەردانە!**

## ١٠- سوورەتی نەمل

**(مەککییە نەوەدو سێ ئایەتە)**

**سورة النمل (مكية وهي بضع وتسعون آية)**

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

قال اللّٰهُ تَعَالَى: {وَإِذَا وَقَعَ الْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَابَّةً مِّنَ الْأَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ النَّاسَ كَانُوا بِآيَاتِنَا لَا يُوقِنُونَ} (٨٢/٢٧).

واتە: كاتێ فەرمانی سزادان و قاری خودا هاتە سەر ئەو كافرانە ئەوە لەوكاتەدا لەزەوی صەفادا، لەنزیكی كابەتوڵڵادا، لەشاری مەككەدا، حەیوانێ دەردەكەین، بەناوی دابیەتولئەرض كەبەفەرمانی ئێمە دێتە زمان و قسە دەكا لەگەڵ خەڵكەكەدا، كە ئادەمیزاد ئەو ڕۆژە گەیشتوونەتە رادەیەكی وا هیچ ئیمان و باوەڕێكیان نەماوە بەقسەی خوداو پێغەمەر، لەبەر ئەوە كاتی ئەوە هاتووە پەردە لابرێ و بەچاوی خۆیان حەقایق ببینن.

٤٠٢٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ «تَخْرُجُ الدَّابَّةُ مَعَهَا خَاتَمُ سُلَيْمَانَ وَعَصَا مُوسَى فَتَجْلُو وَجْهَ الْمُؤْمِنِ وَتَخْتِمُ أَنْفَ الْكَافِرِ بِالْخَاتَمِ حَتَّى إِنَّ أَهْلَ الْخِوَانِ لَيَجْتَمِعُونَ فَيَقُولُ هَاهَا يَا مُؤْمِنُ وَيُقَالُ هَاهَا يَا كَافِرُ وَيَقُولُ هَذَا يَا كَافِرُ وَهَذَا يَا مُؤْمِنُ»، رواه الترمذي بسند حسن:[1].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: دابیەتولئەرض كە دەردەچێ ئەموستیلەكەی سولەیمان و عاساكەی مووسای واپێ، بەداردەستەكە دەدا لەتەوێڵی موسوڵمان لە جێ سەجدەكەی، خاڵێكی سپی پێوە دەنی، بەرە بەرە بڵاو دەبێتەوەو ڕووی ڕووناك و گەش دەبێتەوەو لەنێوانی هەردوو چاوەكانی دەنووسرێ: موسوڵمان. وەبە ئەموستیلەكە دەدا لەسەر لووتی كافرو مۆرێكی ڕەشی پێوەدەنێ و بەرە بەرە ڕەشییەكە زۆر دەبێ و دەموچاوی گشت دادەگرێ و ڕووی ڕەش دەبێ، تەنانەت موسوڵمان و كافر وا لەیەكتری ئاشكرا دەبن، كاتێ دەستەیێ لەخەڵك لەسەر خوانێ دادەنیشن و شت دەدەنە دەستی یەكتری بەیەكتری دەڵێن: ئەوە بگرە ئەی موسوڵمان! ئەگەر كابرا ووشەی موسوڵمان لەناو چاوەنی نووسرابێ، یا دەڵێن: ئەوە بگرە ئەی كافر! ئەگەر كابرا ووشەی كافر لەناو چاوانی نووسرابێ، وەلە سەر ئەم شێوەیە، بەبێ پەروا، بانگی یەكتری دەكەن (ت–س/ح).

---

[1] حسن عند الترمذي.

نەمل و قەصەص و عەنکەبووت و رووم!

خـــودا بتانکـــا بـــە ڕوونـــاکیی رووم

## ١١- سوورەتی قەصەص

(مەکییە هەشتاو هەشت ئایەتە)

## سورة القصص (مكية، وهي بضع وثمانون آية)

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤٠٢١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ (صلى الله عليه وسلم) لِعَمِّهِ أَبِي طالب: «قُلْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ أَشْهَدُ لَكَ بِهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ». قَالَ لَوْلاَ أَنْ تُعَيِّرَنِي قُرَيْشٌ يَقُولُونَ إِنَّمَا حَمَلَهُ عَلَى ذَلِكَ الْجَزَعُ لأَقْرَرْتُ بِهَا عَيْنَكَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ (إِنَّكَ لاَ تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ). رواه الشيخان والترمذي[1].

ئـەم فەرموودەیـە ڕیوایـەتێکی تـری لەتەفـسیری سـوورەتی تەوبـەدا ڕابوورد، فەرموودەی ژمارە بیست. گێڕانەوەی ئێرە ئاوایە: ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گـوتی: ئـەبو تالیـب مامـەی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەربێ) لەسەرەمەرگا بوو، حەزرەت چوو بۆلای، پێـی فـەرموو: مامـە! بـەگوێم کـە، شـایەتمان بێنـەو بڵـێ: لا إلـه إلا الله، تـا لـەرۆژی قیامـەتا بیکـەم بەبەڵگـەو شـایەت بـۆت. گـوتی: نـەبادا هـۆزی قورەیش تـانووتم لـێ بـدەن و بڵـێن: لەترساندا شایەتمانی هێنا، ئەگینا بەگوتنی ئەم ووشەیە دڵی تۆم خۆش دەکـردو چـاوو دڵـتم ڕۆشـن دەکـردەوە! جـا بـەم بۆنەیـەوە ئەمـە هاتـە خـوارەوە: {إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّـهَ يَهْـدِي مَـن يَـشَاءُ} (٢٨/٥٦) واتە: ئەی خۆشەویست! هیدایەت، بەمـەعنا قـەبوولکردنی حـەق و گرتنـی ڕێگەی ڕاسـت، ئـەوە بەدەسـتی خودایـەو بەدەسـتی تـۆ نییـە، بۆیـە گەلـێ کەسکەهەیانە خۆشەویستی خۆتـە، تـۆ حـەز دەکـەی کـە هیدایـەتی بـدەی

[1] تجريد البخاري. ٦٥/٢ رقم: ٦٤٥ = ١٣٦٠، ٣٨٨٤، ٤٦٧٥، ٤٧٧٢، ٦٦٨١، فتح. مسلم. ايمان: ١٣١.

بەڵام چونکە خودا خواستی لەسەر هیدایەتی ئەو نییە ملی ڕێگەی ڕاست ناگرێ، دەی ئەوەی لەسەر تۆیە ئەوەیە ڕێگەی ڕاستیان پێنیشان بدەیو ڕابەرییان بکەی (ش/ت).

٤٠٢٢- عَنْ عُثْمَانَ (رضي الله عنه) عَنْ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: «مَنْ مَاتَ وَهُوَ يَعْلَمُ أَنَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ دَخَلَ الْجَنَّةَ». رواه مسلم في الإيمان[٢].

عوثمان (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەرکەسێ لەسەر باوەڕو ئیمان بمرێو یەقینو باوەڕی وابێ کەبێجگە لەخودای تاکو تەنیا خودای ترنییە ئەوە دەچێتە بەهەشت (م).

قەصەص! خوا حافیظ، عەنکەبووت! هاتی
بەخێر بێی، یادی نەشکەوتی هاتی!
سەفەر خۆی ڕێگەی هاتوو نەهاتە
بۆیە بۆ بەری نا نەو دوو زاتە!
چارەنووس تەنی زریەی تێغ نەبڕ
لە تەونەکەی تۆو لەهێلکەی کۆتر!

## ١٢- سوورەتی عەنکەبووت
(مەکییە نەوەدو نۆ ئایەتە)
### سورة العنكبوت (مكية وهي تسع وتسعون آية)
بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤٠٢٣- عَنْ مُصعب بن سعدٍ (رضي الله عنه) عَنْ أبيه قال: أنزلت في أربع آياتٍ ← (ب/٥ ز/١٢ ل/٨٧ ف/٣)[١].

ئەم فەرموودەیە لە (مناقب سعد بن أبي وقاص)دا ڕابورد.

---

[٢] مسلم. إيمان: ١٣٥.

[١] تقدم تخريجه برقم: ٣٣٢٨/٣ مجلد خامس تسلسل/١٢.

٤٠٢٤- عَنْ أُمِّ هَانِئٍ (رضي الله عنها) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فِي قَوْلِهِ تَعَالَى (وَتَأْتُونَ فِي نَادِيكُمُ الْمُنْكَرَ) قَالَ: «كَانُوا يَخْذِفُونَ أَهْلَ الأَرْضِ وَيَسْخَرُونَ مِنْهُمْ». رواه الترمذي:[٢].

لەبارەی ئەم ئایەتەوە {وَتَأْتُونَ فِي نَادِيكُمُ الْمُنكَرَ} (٢٩/٢٩) ریوایەت کراوە، لەئوممو هانییەوە، دەڵێ: دەچوون پەلەپیتکەیان دەنا بەخەڵکەوەو لاقرتیو قەشمەرییان پێدەکردن (ت-س/ح).

قال اللّٰهُ تَعَالَى: {وَلَا تُجَادِلُوا أَهْلَ الْكِتَابِ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ....} (٤٦/٢٩).

واتە: بەشێوەیەکی گەلێ جوان دەمەتەقێو گفتوگۆو دەمەقاڵێ لەگەڵ خاوەن نامەکان بکەن، وەکوو گاورو جوولەکەبێ، بەناسکیو بەنەرمونیانی مشتومڕیان لەگەڵ بکەن.

٤٠٢٥- لە تەفسیری سوورەتی بەقەرەدا ڕەت بوو، فەرموودەی چواردە کەدەفەرموێ: (کان أهل الکتاب یقروون التوراه)[٣].

نەمڵو قەصەصو عەنکەبووتو ڕۆم

دێنێتە یادم: ڕۆی خوڵخوڵەی ڕۆم!

## ١٣- سوورەتی ڕۆم

(مەکییە، شەست ئایەتە)

## سورة الروم (مكية وهي ستون آية)

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤٠٢٦- عَنْ نِيَارِ بْنِ مُكْرَمٍ الأَسْلَمِيِّ (رضي الله عنه) قَالَ لَمَّا نَزَلَتْ (الم غُلِبَتِ الرُّومُ فِي أَدْنَى الأَرْضِ وَهُمْ مِنْ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ فِي بِضْعِ سِنِينَ) فَكَانَتْ فَارِسُ يَوْمَ نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ قَاهِرِينَ لِلرُّومِ وَكَانَ الْمُسْلِمُونَ يُحِبُّونَ ظُهُورَ الرُّومِ عَلَى فَارِسَ

---

[٢] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[٣] تقدم تخریجه برقم: ٣٧٠٣/١٤ مجلد سادس تسلسل/٢.

لأَنَّهُمْ وَإِيَّاهُمْ أَهْلُ كِتَابٍ ذَلِكَ قَوْلُ اللَّهُ تَعَالَى (يَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ بِنَصْرِ اللَّهِ يَنْصُرُ مَنْ يَشَاءُ وَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ) فَكَانَتْ قُرَيْشٌ تُحِبُّ ظُهُورَ فَارِسَ لأَنَّهُمْ وَإِيَّاهُمْ لَيْسُوا بِأَهْلِ كِتَابٍ وَلاَ إِيمَان بِبَعْثٍ فَلَمَّا أَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى هَذِهِ الآيَةَ خَرَجَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ رضى الله عنه يَصِيحُ فِي نَوَاحِي مَكَّةَ (الم غُلِبَتِ الرُّومُ فِي أَدْنَى الأَرْضِ وَهُمْ مِنْ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ فِي بِضْعِ سِنِينَ) قَالَ نَاسٌ مِنْ قُرَيْشٍ لأَبِي بَكْرٍ فَذَلِكَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ زَعَمَ صَاحِبُكُمْ أَنَّ الرُّومَ سَتَغْلِبُ فَارِسًا فِي بِضْعِ سِنِينَ أَفَلاَ نُرَاهِنُكَ عَلَى ذَلِكَ؟ قَالَ: بَلَى. وَذَلِكَ قَبْلَ تَحْرِيمِ الرِّهَانِ فَارْتَهَنَ أَبُو بَكْرٍ وَالْمُشْرِكُونَ وَتَوَاضَعُوا الرِّهَانَ وَقَالُوا لأَبِي بَكْرٍ كَمْ تَجْعَلُ الْبِضْعُ ثَلاَثُ سِنِينَ إِلَى تِسْعِ سِنِينَ فَسَمِّ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ وَسَطًا تَنْتَهِي إِلَيْهِ. قَالَ فَسَمَّوْا بَيْنَهُمْ سِتَّ سِنِينَ قَالَ فَمَضَتِ السِّتُّ سِنِينَ قَبْلَ أَنْ يَظْهَرُ الروم فَأَخَذَ الْمُشْرِكُونَ رَهْنَ أَبِي بَكْرٍ فَلَمَّا دَخَلَتِ السَّنَةُ السَّابِعَةُ ظَهَرَتِ الرُّومُ عَلَى فَارِسَ فَعَابَ الْمُسْلِمُونَ عَلَى أَبِي بَكْرٍ تَسْمِيَةَ سِتِّ سِنِينَ لأَنَّ اللَّهُ تَعَالَى قَالَ (فِي بِضْعِ سِنِينَ) قَالَ وَأَسْلَمَ عِنْدَ ذَلِكَ نَاسٌ كَثِيرٌ[1].

**یەننازی کوڕی موکرەمی ئەسلەمی** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: کاتێ ئایەتی** {أَلَمْ، غُلِبَتِ الرُّومُ، فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُم مِّن بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ، فِي بِضْعِ سِنِينَ لِلَّهِ الْأَمْرُ مِن قَبْلُ وَمِن بَعْدُ وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ} (٣٠/١-٤) **واتە: سوپای ڕۆم لەبەرابەری سوپای فارسەوە شکان، لەخاکێکا ئەم شەڕە قەوما کە نزیکترین وڵاتە لەوڵاتی حیجازی ئێوەوە، کە دەکەوێتە نێوانی ئەزروعاتو بەصراوە، کە دووشارن لەوڵاتی شام، کەئەو سەردەمە نزیکترین وڵاتی دەوڵەتی ڕۆم بوون لەخاکی بەست (حەرەم)ی مەککەوە، وەلێ لەماوەی چەن ساڵێکی کەمی داهاتوودا، ڕۆمەکان لەپاش ئەم شکانەیان سەردەکەونو زاڵ دەبن بەسەر سوپای فارسدا. گوتی: کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، وەك لەئایەتەکەدا دەفەرموێ ئەو سەردەمە فارسەکان زاڵ بوو بوون بەسەر ڕۆمییەکاندا، ئەو ڕۆژگارە موسوڵمانەکانو ڕۆمەکان هەردوو لا ئەهلی**

---

[1] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

کیتـاب‌و خـاوەن نامـەی خـودایی بـوون لەبـەر ئـەوە موسـوڵمانەکان حـەزیان دەکرد کە ڕۆمەکان زاڵ ببن بەسەر فارسەکاندا، ئەمەی گوتمان خودای گەورە بەم ئایەتە باسی کردووە کەدەفەرموێ: ﴿يَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ، بِنَصْرِ اللَّهِ يَنصُرُ مَن يَشَاء وَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ﴾ (٣٩/٤-٥). واتـە: لـەورۆژەدا کـە لەسـەر فـەمانی خودا، ڕۆمەکان زاڵ دەبن بەسەر فارسەکاندا موسوڵمانەکان بەو سەرکەوتنی هاوکێشی خۆیانـەو بـەو یارمەتیدانـەی خودایـە بـۆ سـوپای ڕۆمـەکان شـادو شادمان دەبن، وە خودای گەورە خواستی لەسەر یارمەتیدانی هەرکەسێ ببێ یارمـەتی دەدا وەخـودا شـکۆمەندو میهرەبانـە. گـوتی: وەکـوو گوتمـان موسوڵمانەکان حەزیان لەمەبوو، بەڵام کافرەکانی قورەیش زۆریان پـێ خۆش بوو، کەفارسەکان زاڵ بوو بوون بەسەر ڕۆمەکانـدا، چونکی هـەردوولایان هـاو مەشرەبی یەك بوون، هەردوو لایان نەنامەی خوداییـان هـەبوو، وە نـەباوەڕیان بە ڕۆژی زیندوو بوونەوە هەبوو، جاکاتێ ئەم ئایەتە هاتـە خـوارەوە ئەبوبـەکر (خودای لێ ڕازی بێ) دەرچوو، وەبەناو کووچەو کۆڵانـەکانی مەککـەدا دەسوڕایەوەو هاواری دەکردو بەدەنگی بەرز ئەم ئایەتەی هەتا دوایـی دەخوێنـدەوە: ﴿ أَلَمْ، غُلِبَتِ الرُّومُ.....﴾. جا تاقمەیێ لەکافرەکانی قورەیش بە ئەبوبەکریان گوت: با ئەمـە لـەنێوانی ئێمـەو لـەنێوانی ئێـوەدا بمێنـێ، تـا بـزانین لەئەنجامـدا قسەی کاممان ڕاست دەردەچێ، گوایە موحەممەدی هاوڕێتـان دەڵـێ: لـەماوەی چەن ساڵێکی کەمدا دیسان ڕۆم سەر دەکەونەوەو فارس دەبەزێنن، جا ئەگەر ئەمە وایە بۆ گرەومان لەگەڵ ناکەیت لەسەر ئەمـە. گوتی: باشـە، ئەمـەیش بەرلـەوە بوو کە گرەو لەسەر قومار قەدەغە بکرێ، ئەوسـاکە ئەبوبـەکرو بتپەرسـتەکان گرەویان کردو لەسەر ماڵ‌و کاتی گرەوەکە ڕێك کەوتن، بە ئەبوبەکریان گـوت: (بضع) خۆی لەسێوەیە هەتا نۆ، جا تۆ خۆت ماوەیەکی مامناوەندی دابنێ کە هەردوولامان پێی ڕازی بین. گوتی: جا بڕیاریان دا کەماوەی گرەوەکـە شەش سـاڵ بـێ، بـەڵام شـەش سـاڵەکەهات‌و ڕۆیـشت کەچـی ڕۆم سـەرنەکەوتن، لەبەرئـەوە بتپەرسـتەکان گرەوەکـەیان بـردەوەو مـاڵی گرەوەکـەیان لەئەبوبـەکر سەند، بەڵام لەساڵی حەوتەما ڕۆم سـەرکەوتن بەسـەر فارسداو بـەم بۆنەیـەوە،

کەقسەی خواو پێغەمبەری خودا ڕاست دەرچوو لەو ڕۆژەدا خەڵکێکی زۆر موسوڵمان بوون، لەلایەکی ترەوە موسوڵمانەکان سەرکۆنەی ئەبوبەکریان لەسەر ئەوەکرد، کەبۆ ماوەی گرەوەکە شەش ساڵی دانابوو، چونکە خودای گەورە دەفەرموێ: فِي بِضْعِ سِنِينَ: لەماوەی ساڵێکەوە تا نۆ ساڵ. (ت-س/ص).

٤٠٢٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) عَنْ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: إِنَّ الْبِضْعَ مَا بَيْنَ الثَّلاَثِ إِلَى التِّسْعِ. رواهما الترمذي[٢].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بیضع لەسێوەیە تا نۆ. (ت-سند غريب).

٤٠٢٨- ← (ب/١ ز/٦ ل/٣٧ ف/٢)[٣].

ڕۆم و لوقمان و سەجدە ئەم سێیە

ناوی سێ سورەن، هەرسێ هاوسێیە!

## ١٤- سوورەتی لوقمان

(مەکییە، سیی و چوار ئایەتە)

## سورة لقمان (مكية وهي أربع وثلاثون آية)

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤٠٢٩- ← (ب/٢ ز/١٥٢ ل/٣٢٢ ف/١٩)[١].

٤٠٣٠- ← (لەتەفسیری سوورەتی ئەنعام دا ڕابوورد، حەدیپی پێنجەم کەدەفەرموێ: لما نزلت {الَّذِينَ آمَنُواْ وَلَمْ يَلْبِسُواْ إِيمَانَهُم بِظُلْمٍ}[٢].

---

[٢] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

[٣] مكرر – تقدم تخريجه برقم: ٢٨/٢ مجلد أول تسلسل/٦.

[١] تقدم تحخريجه برقم: ١٨٢٣/١٩ مجلد ثاني تسلسل/١٥٢.

[٢] تقدم تحخريجه برقم: ٣٨٥٦/٥ مجلد سادس تسلسل/٧.

٤٠٣١- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) عَنْ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: «مَفَاتِيحُ الْغَيْبِ خَمْسٌ لاَ يَعْلَمُهَا إِلاَّ اللّٰهُ لاَ يَعْلَمُ مَا فِي غَدٍ إِلاَّ اللّٰهُ، وَلاَ يَعْلَمُ مَا تَغِيضُ الأَرْحَامُ إِلاَّ اللّٰهُ وَلاَ يَعْلَمُ مَتَى يَأْتِي الْمَطَرُ أَحَدٌ إِلاَّ اللّٰهُ، وَلاَ تَدْرِى نَفْسٌ بِأَىِّ أَرْضٍ تَمُوتُ، وَلاَ يَعْلَمُ مَتَى تَقُومُ السَّاعَةُ إِلاَّ اللّٰهُ عليمٌ خبيرٌ». رواهما البخاري (ض)[٣].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کلیلی نهێنی (غەیب) ئەم پێنجەن کە خودا لەم ئایەتەدا دەفەرموێ: {إِنَّ اللّٰهَ عِندَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللّٰهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ} (٣٤/٣١) بەڕاستی بەس خودای گەورە دەزانێ (بەزانیارییەکی دامەزراو) کەی قیامەت دادێو خودا خۆی باران دەبارێنێو کاتەکەی دەزانێو دەزانێ چی لەمناڵدانا هەیە، نێرە، مێیە، چییەو چی نییە، هیچ کەسێ نازانێ سبەینێ چی دەکاو چ ئیشێکی دەبێو کەس نازانێ کەیو لەکوێ دەمرێ بەڕاستی هەر خودا زانایەو ئاگادارە (ب).

## ١٥- سوورەتی سەجدە

(مەکییە، سی ئایەتە)

## سورة السجدة (مكية، وهي ثلاثون آية)

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤٠٣٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضي الله عنه) أَنَّ هَذِهِ الآيَةَ (تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ) نَزَلَتْ فِي انْتِظَارِ هَذِهِ الصَّلاَةِ الَّتِي تُدْعَى الْعَتَمَةَ. رواه الترمذي بسند صحيح[١].

---

[٣] بخاري. تفسير: ٤٧٧٨.

[١] صحيح عند الترمذي.

← (ب/٢ ز/٢٦ ل/٧٤ ف/٧) بەڵام لێرەدا ئاوایە: ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەم ئایەتە لەمەدح و ستایشی ئەوکەسانەدا هاتۆتە خوارەوە کە چاوەنواڕی کردنی نوێژی خەوتنان دەکەن. (ت–س/ص).

٤٠٣٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم): «يَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى أَعْدَدْتُ لِعِبَادِي الصَّالِحِينَ مَا لاَ عَيْنٌ رَأَتْ، وَلاَ أُذُنٌ سَمِعَتْ، وَلاَ خَطَرَ عَلَى قَلْبِ بَشَرٍ، ذُخْرًا، بَلْهَ مَا أُطْلِعْتُمْ عَلَيْهِ». ثُمَّ قَرَأَ (فَلاَ تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ). رواه الشيخان والترمذي:[٢].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خودای گەورەو سەروەر دەفەرموێ: ئەو بەهرەو نازو نیعمەت و خۆشی و شادییە، کە خۆم ئامادەم کردووەو هەڵم گرتووە بۆ بەندەباش و خاسەکانی خۆم ئەوەندە باش و نایابن نە بەچاو بینراون و نە بەگوێ بیسراون و نەبەدڵی کەسدا هاتوون و نەبە خەیاڵیدا، ڕابووردوون، جگە لەوەیش کەخۆتان ئاگادارینی و لەقورئان و حەدیثا باس کراوە بۆتان. ئەنجا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) ئەمەی خوێندەوە: {فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّا أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاء بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ} (١٧/٣٢) ← (ب/٢ ز/٢٦ ل/٧٤ ف/٧) (ش/ت).

٤٠٣٤- عَنْ الْمُغِيرَةَ بْنَ شُعْبَةَ (رضي الله عنه) قال عَلَى الْمِنْبَرِ سمعتُ رسول الله (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ «إِنَّ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلاَمُ سَأَلَ رَبَّهُ فَقَالَ أَىْ رَبِّ أَىُّ أَهْلِ الْجَنَّةِ أَدْنَى مَنْزِلَةً؟ قَالَ رَجُلٌ يَأْتِي بَعْدَ مَا يَدْخُلُ أَهْلُ الْجَنَّةِ الْجَنَّةَ فَيُقَالُ لَهُ ادْخُلِ الْجَنَّةَ. فَيَقُولُ كَيْفَ أَدْخُلُ وَقَدْ نَزَلُوا مَنَازِلَهُمْ وَأَخَذُوا أَخَذَاتِهِمْ. قَالَ فَيُقَالُ لَهُ أَتَرْضَى أَنْ يَكُونَ لَكَ مَا كَانَ لِمَلِكٍ مِنْ مُلُوكِ الدُّنْيَا فَيَقُولُ نَعَمْ أَىْ رَبِّ قَدْ رَضِيتُ. فَيُقَالُ لَهُ فَإِنَّ لَكَ هَذَا وَمِثْلَهُ وَمِثْلَهُ وَمِثْلَهُ فَيَقُولُ رَضِيتُ أَىْ رَبِّ. فَيُقَالُ لَهُ

---

[٢] تجريد البخاري /٤ ل/٤٧١ رقم: ١٦٧٩ = ٤٧٨٠، ٣٢٤٤، ٤٧٧٩، ٧٤٩٨. مسلم جنة ونعيمها: ٧٠٦٤. ترمذي. تفسير القرآن: ٣١٩٧.

فَإِنَّ لَكَ هَذَا وَعَشْرَةَ أَمْثَالِهِ فَيَقُولُ رَضِيتُ أَىْ رَبِّ. فَيُقَالُ لَهُ فَإِنَّ لَكَ مَعَ هَـذَا مَـا اشْتَهَتْ نَفْسُكَ وَلَذَّتْ عَيْنُكَ». رواه الترمذي ومسلم في الإيمان:[٣].

موغیرەی کوڕی شوعبە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: بەگوێی خۆم گوێم لێبوو پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لەسەر دوانگە دەیفەرموو: مووسا (درودی خودای لەسەربێ) لەخودای گەورەی پرسی، فەرمووی: ئەی خوای من! کێ لە خەڵکی بەهەشت پایەی لەهەموو کەسێ نزمترە؟ فەرمووی: پیاوێکە کاتێ دێ بۆ بەهەشت، دەڕوانێ بەهەشتییەکان هەموو چوونەتە ناو بەهەشتەوە، پێی دەڵێن: تۆیش بچۆرە ناو بەهەشت، دەڵێ: چۆن چۆنی بچم، ئەوان هەموو بەجێگەو پایەی خۆیان شاد بوونو بەشو بارەو بەراتو خەلاتی خۆیان وەرگرتووە، جا پێی دەڵێن: ئایا ڕازی دەبی بەوەندە کەبەقەی پاشایێ لەپاشاکانی جیهان موڵكو دەوڵەتو سامانت پێ بدرێ لەبەهەشتا؟. دەڵێ: بەڵێ ئەی پەروەردگارم! ڕازیم جا پێی دەگوترێ: ئەوا دام بەتۆ بەقەد دەوڵەتو موڵكو سامانی پادشایێ لە پادشاکانی جیهان، وەسێ ئەوەندەیتریش لەگەڵیا، دەڵێ: خۆشنوودم ئەی پەروەردگارم! پێی دەفەرموێ: ئەوادام بە تۆ ئەوەو دەئەوەندەی تریش لەگەڵیا، دەڵێ: ئەی پەروەردگام! بەڕاستی خۆشنوود بووم، دەفەرموێ: ئەوا سەرەڕای ئەوەیش دام بە تۆ هەرچی تر کەدڵت حەزی پێدەکاو چاوت خۆشی لێ وەردەگرێ (م).

قال اللّٰهُ تَعَالَى: {وَلَنُذِيقَنَّهُمْ مِنَ الْعَذَابِ الْأَدْنَى دُونَ الْعَـذَابِ الْـأَكْبَرِ لَعَلَّهُـمْ يَرْجِعُونَ} (٢١/٣٢).

واتە: ئێمە لەم ژیانەدا بەم بێباوەڕانە جۆرەها ئێشو ئازاریان پێ دەچێژین، وەك قاتوقڕیو تاڵو سوێریو نەخۆشیو هەژاریو شتی زۆری لەم بابەتانە کە ئەمانە لەچاو سزای گەورەی ڕۆژی دوا ڕۆژدا

---

[٣] مسلم. إيمان: ٤٦٤. ترمذي. تفسير: ٣١٩٨.

سـووکەڵەو ئاسـانن، بـەهیوای ئـەوە کەئەمانــە لــەبیرو بـاوەڕی نابـارو کردەوەی ناهەمواری خۆیان بگەڕێنەوەو دەسبەردار بن.

٤٠٣٥- عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ (رضي الله عنه) فِي هذه الآية: الْعَذَابِ الأَدْنَى مَصَائِبُ الدُّنْيَا وَالرُّومُ وَالْبَطْشَةُ أَوِ الدُّخَانُ. رواه مسلم في صفة القيامة[٤].

ئەم فەرموودەیە، لەپێشەوە لە تەفسیری سوورەتی فورقانا رابورد، فـەرموودەی پێنجـەم. لەگێڕانـەوەی ئێـرەدا ئاوایە: ئوبـەیی کـوڕی کـەعب (خـودای لێ ڕازی بـێ) لـەبارەی ئـەم ئایەتـەوە گـوتی: (الْعَـذَابِ الأَدْنَــى) کەلـەم ئایەتـەدا باسـکراوە، کەبـەمانا سـزای سـووکەڵەو ئاسـانە، بریتییـە لـە ناخۆشـی و قـورت و وەی و ناکـامیی جیهـان، لەگـەڵ ئایـەتی ڕۆم و دەسـت لـێ وەشـاندنەکەی ڕۆژی غـەزای بـەدردا، کـە قورئـان پێـی دەڵـێ: (الْبَطْـشَةُ الكبرى)، لەگەڵ داستانەکەی ئایەتی دوخاندا، کە دەفەرموێ: {فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاء بِدُخَانٍ مُّبِينٍ}:

ووشـەی قورئـانی هـەموو سـەرگوڵ
وێنـەی شـاگوڵی بـەرزی سەرچـڵ!
هـەر وشـەیەکی بەحرێکـە بـۆ خـۆی
یـا باخـچەیەکە، زۆر بـەرەنگ و بـۆی
ووشـەی پـڕ واتـا، ناسـکونازادار
بوونە کەرەستەی ڕستەی خۆش لەزار
وەک سەجدەو ئەحزاب، سەبەءو فـاطیر
صـافات و صـاد و زومـەرو غـافیر!!
هـۆی چییەو بۆچی و لەبەرچی کـەوا
ئەم دوو پارچەیە، وەک کراس و کـەوا
لـەناو قورئانـا لەیـەک نـزیکن

---

[٤] تقدم تخريجه برقم = ٣٩٥٢/٢ مجلد سادس تسلسل/١٨.

یـــا بۆنـــەی چـــییە لەیـــەک تـــەریکن!

لـــەبۆ وەڵامـــی ئـــەم جـــۆرە پرســـە

مەتـــەڵی دواوە باشـــترین دەرســـە:

(یاســـین نقێمـــی قورئانـــە دادە!

پێشی فایەکـەو پاشی دوو صادە!)*

(قورئـــان خاتەمـــە لـــەبۆ نامـــە گـــەڵ

سرووش دوا چۆڕی هەڵهات لەدەم کەل!!

## ١٦- سوورەتی ئەحزاب

### (مەدەنییە، حەفتاو سێ ئایەتە)

### سورة الأحزاب (مدنية وهي ثلاث وسبعون آية)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤٠٣٦- قيلَ لابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنه) أَرَأَيْتَ قَوْلَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ (مَا جَعَلَ اللَّهُ لِرَجُلٍ مِنْ قَلْبَيْنِ فِي جَوْفِهِ) مَا عَنَى بِذَلِكَ قَالَ قَامَ نَبِيُّ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَوْمًا يُصَلِّي فَخَطَرَ خَطْرَةً فَقَالَ الْمُنَافِقُونَ الَّذِينَ يُصَلُّونَ مَعَهُ أَلاَ تَرَى أَنَّ لَهُ قَلْبَيْنِ قَلْبًا مَعَكُمْ وَقَلْبًا مَعَهُمْ. فَأَنْزَلَ اللَّهُ (مَا جَعَلَ اللَّهُ لِرَجُلٍ مِنْ قَلْبَيْنِ فِي جَوْفِهِ). رواه الترمذي بسند حسن[1].

---

* لەحەدیثا دەفەرموێ: یاسین قەلبو دڵی قورئانە، بەنقێمی ئەنگوستیلەش بەعەرەبی دەگوترێ: فوصص – یاقەلبی خاتەم، یەکەم پیتی (فاطر) کەفێیە لەگەڵ یەکەم پیتی صافاتو یەکەم پیتی صادا، کەدوو صادن ڕێك دەکاتە (فص). ئەمەیش ڕەمزە بۆ ئەوە کە یاسین قەلبی خەتمەی قورئانەو قورئانیش خاتەمی نامە ئاسمانییەکانە، دەرگای هاتنی نامەی ئاسمانی مۆرکردووە ئیتر لەپاش قورئان نامەی ئاسمانی دانابەزێ. (وەرگێڕ)

[1] حسن عند الترمذي.

عـەرزی ئیبنـو عـەبباس (خودایـان لێ ڕازی بـێ) کـرا: تـۆ چـی دەفـەرمووی لەهۆی ئەم ئایەتەوە: {مَّا جَعَلَ اللَّهُ لِرَجُلٍ مِّـن قَلْبَـيْنِ فِـي جَوْفِـهِ...} (٤/٣٣) واتــە: خــودا بڕیــاری نــەداوە بــۆهیچ پیــاوێ کــە دوو دڵــی ببــێ. ئیبنــو عـەبباس گـوتـی: ڕۆژێ حـەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) هەسـتا نوێـژی کـردو لەنوێژەکـەدا بەهەڵـەدا چـوو، جـا هەنـدێ (لـەوناپاك و مونافیقانـە کـە لەپـشتیەوە نوێـژیان دەکـرد) گوتیـان: تەماشـاکەن موحەممـەد دوو دڵـی هەیە، بەدڵێ وا لەگەڵ ئێمەداو بەدڵەکەی تری وا لەگەڵ خۆیاندا، جا بـەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە (ت–س/ح).

٤٠٣٧– عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رضي الله عنهما) أَنَّ زَيْدَ بْنَ حَارِثَةَ مَـوْلَى رَسُـولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مَا كُنَّا نَدْعُوهُ إِلاَّ زَيْدَ[٢].

← لەپێشەوە لەسەر باسی (فضل زید بن حارثة)دا ڕابورد.

٤٠٣٨– ← (ب/٢ ز/١٦٤ ل/٣٤٦ ف/٩) + (ب/٣ ز/٩ ل/٢٢ ف/٣)[٣].

٤٠٣٩– عَنْ أَنَسٍ (رضي الله عنه) أَنَّ عَمَّهُ غَابَ عَنْ قِتَالِ بَدْرٍ فَقَـالَ غِبْـتُ عَـنْ أَوَّلِ قِتَالٍ قَاتَلَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليـه وسـلم) الْمُـشْرِكِينَ لَـئِنِ اللَّـهُ أَشْـهَدَنِي قِتَـالاً لِلْمُشْرِكِينَ لَيَرَيَنَّ اللَّهُ كَيْفَ أَصْنَعُ فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ أُحُـدٍ انْكَـشَفَ الْمُـسْلِمُونَ فَقَـالَ اللَّهُمَّ إِنِّي أَبْرَأُ إِلَيْكَ مِمَّا جَاءَ بِهِ هَؤُلاَءِ. يَعْنِي الْمُشْرِكِينَ وَأَعْتَذِرُ إِلَيْكَ مِمَّـا يَـصْنَعُ هَؤُلاَءِ. يَعْنِي أَصْحَابَهُ ثُمَّ تَقَدَّمَ فَقَاتَلَ حَتَّى قُتِلَ. فَوُجِدَ فِيهِ بِضْعٌ وَثَمَانُونَ مِنْ ضَـرْبَةٍ بِسَيْفٍ وَطَعْنَةٍ بِرُمْحٍ وَرَمْيَةٍ بِسَهْمٍ فَكُنَّا نَقُولُ فِيهِ وَفِي أَصْحَابِهِ نَزَلَتْ (مِـنَ الْمـؤمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا ما عَاهَدُوا الله عليه فَمِنْهُم مَّن قَضَى نَحْبَهُ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ وَمَا بَدَّلُوا تَبْدِيلًا). رواه الترمذي والبخاري[٤].

---

[٢] تقدم برقم: ٣٣٨٧ مجلد خامس تسلسل٢٣.

[٣] تقدم برقم: ١٨٨٣/٩ مجلد ثاني ت/١٦٤.

[٤] تجريد/٣ ل/٢٨٦ ژمارە/١١٥٦ = ٢٨٠٥، ٤٠٤٨، ٤٧٨٣.

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) گوتی: مامەم ئەنەسی کوڕی نەضر ئامادەی غەزای بەدر نەبوو بوو، لەبەر ئەوە گوتی: یەکەم جەنگێ کە حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) لەگەڵ کافراندا کردی بە نصیبم نەبوو، کە هاوبەشی ئەو جەنگە پیرۆزەیە بکەم، جا ئەگەر خودا فرسەتی دام‌و حازری جەنگێ بووم، لە ئاییندەدا، لەگەڵ کافرەکاندا ئەوکاتە خودای گەورە دەم بینی کە چلۆن جەنگێ دەکەم، جا کاتێ رووداوی ئوحود هاتە پێش‌و وارێکەوت زوربەی موسوڵمانەکان شکان‌و دەوری حەزرەتیان چۆڵ کرد، مامەم گوتی: خودایە! من بەری و بەدوورم لە خزمەتی تۆو لەم کارە ناشیرین‌و نامەردییە کە ئەم کافرانە دەربارەی پێغەمبەری تۆ کردنیان، وە پۆزش خوازی دەکەم‌و عوزردەهێنمەوە بۆ تۆ لەوەیش کەئەم موسوڵمانانە کردیان‌و بەداخەوە ئەم هاوڕێ نازدارانەی من لەم جەنگە پیرۆزەدا، کە شەڕی مان‌و نەمانە تێشکان‌و هەڵهاتن!.

پاش ئەمە شێرانە هەڵمەتی بردو چووە پێشەوە بۆناو کۆڕی شەڕو دەستی کرد بەشەڕکردنێکی مەردانەو وازی نەهێنا هەتا کوژراو شەهید کرا، لەپاش تەواو بوونی شەڕەکە کە تەرمەکەیمان دۆزییەوە تەماشامان کرد هەشتا پتر برینی پێوە بوو، جێگەی دەمەشێرو دەمەتیرو پێکانی رم‌و پەیکان!

جا بۆیە ئێمە لەوباوەڕەدا بووین‌و دەمانگوت: کەئەم ئایەتە بۆ شەرحی حاڵی ئەوو وێنەی ئەو دابەزیوە کە دەفەرموێ: {مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ....} تا کۆتایی ئایەتەکە کەڕاڤەکەی لەپێشەوە لەباسی (خاتمة في جمع القرآن)دا رابورد. (ت/ب).

٤٠٤٠- ← لەپێشەوە ڕابورد، لەباسی (خاتمة في جمع القرآن)دا فەرموودەی دووهەم، لێرەدا ئەم ڕستەیەی ئاوایە: لم أجدها مع أحد إلا مع خُزَيْمَةَ الأنصاري الذي جعل رسول الله (صلى الله عليه وسلم) شهادته شهادة رجلين: واتە: ئایەتەکەم بەس لەلای خوزەیمەی ئەنصاری دەست کەوت، کەئەم

خوزەیمەیە ئەوەندە پیاوێکی هەقانیو ڕاستگۆو ڕاستاڵ بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) شایەتی ئەوی لەباتی شایەتی دوو پیاو قەبووڵ دەکرد)[٥].

٤٠٤١- عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: لَمَّا أُمِرَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بِتَخْيِيرِ أَزْوَاجِهِ بَدَأَ بِي فَقَالَ «إِنِّي ذَاكِرٌ لَكِ أَمْرًا فَلاَ عَلَيْكِ أَنْ لاَ تَعْجَلِي حَتَّى تَسْتَأْمِرِي أَبَوَيْكِ». قَالَتْ وَقَدْ عَلِمَ أَنَّ أَبَوَيَّ لَمْ يَكُونَا يَأْمُرَانِي بِفِرَاقِهِ، قَالَتْ ثُمَّ قَالَ «إِنَّ اللَّهَ جَلَّ ثَنَاؤُهُ قَالَ (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لأَزْوَاجِكَ إِنْ كُنْتُنَّ تُرِدْنَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا) إِلَى (أَجْرًا عَظِيمًا)». قَالَتْ فَقُلْتُ له فَفِي أَيِّ شَيْءٍ أَسْتَأْمِرُ أَبَوَيَّ فَإِنِّي أُرِيدُ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الآخِرَةَ، قَالَتْ ثُمَّ فَعَلَ أَزْوَاجُ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) مِثْلَ مَا فَعَلْتُ. رواه الشيخان والترمذي[٦].

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: کاتێ خودا فەرمانی بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کرد، کە هاوسەرەکانی خۆی بکا بە سەرپشك (یا بە ژنێتیی حەزرەت ڕازی بن، بەتەمای ڕەزای خوداو شادبوون بەپایەی گەورەی ڕۆژی دوایی، یا ئەگەر حەزیان لە ڕابواردنی ژیانی دنیایە ئەوا پێغەمبەر تەڵاقیان بدا) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەپێش پێشدا لەمنەوە دەستی کرد بەڕاگەیاندنی ئەم فەرمانی خودایە، فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): شتێکت بۆ باس دەکەم، حەزناکەم کە پەلە پەلی تیا بکەی، بڕیاری لەسەر مەدە هەتا پرسو ڕا بە دایكو باوکت نەکەی! عائیشە گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) خۆی دەیزانی کە باوكو دایکم حەز بەشتی وا ناکەنو ڕازی نابن کەمن لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) جیاببمەوە، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خودای گەورە (وەسپو ثەناخوانیی ئەو لەزیادیو زۆری بێ) بە من دەفەرموێ: {یَا أَيُّهَا

---

[٥] تقدم في المجلد الخامس. تسلسل/٩٤. رقم: ٣٦١٤/١.

[٦] بخاري. تفسير: ٤٧٨٥، ٤٧٨٦. مسلم. ٣٦٦٥، ٣٦٧٤. ترمذي. تفسير القرآن: ٣٢٠٤. نسائي. نكاح: ٣٢٠١، ٣٤٣٩.

النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ...} واتە: ئەی پێغەمبەری خودا! بفەرمووە بە هاوسەرەکانت: ئەگەر حەزتان وا لە سەر خۆشی و ڕابواردنی ئەم جیهانە بێ بەقایە: ئەوا شتی وا لەلای من دەست ناکەوێ کەواتە بفەرموون، وەرن هەتا لەسەر شێوەیەکی جوان، بەبێ دڵ ئێشان و ناخۆشی هەقی شەرعی خۆتان بدەمێ و تەڵاقتان بدەم هەتا بڕۆن بەرێی خۆتانەوە، ئەگەر ئەوەشتان ناوێ و حەزتان لەوەیە کە بەژنێتی و حەڵاڵ و هاوسەری حەزرەت ڕازی بن و بیکەن بەهۆی ڕەزای خوداو پێغەمبەرو بەمایەی بەشی باشی خانەی دوایی، ئەوە کارێکی زۆر جوانە، لەبەر ئەوە خودای گەورە بڕیاری داوە بۆ ئێوە کە هەمووتان ئافرەتی خاس و باش و چاکەکەرو خێرخوان پاداشتێکی گەورەی واتان بداتێ کەدنیاو چی تیادایە لەچاوی ئەوەدا بەهیچ دەچێ. حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) کە ئایەتەکەی خوێندەوەو لەمەبەستەکە حاڵی بووم، عەرزیم کرد: بۆ ئەمە پرس و ڕا بەدایك و باوکم بکەم! شتی وا پرسی پێ ناوێ چونکە من خواستم لەسەر ڕەزای خوداو ڕەزای پێغەمبەرەو لەوەیشە مەبەستم پایەی بەرزی ماڵی دواییە، عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) گوتی: ئیتر لەپاش منەوە خێزانەکانی تری پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) هەموو چاویان لەمن کردو من چیم کردبوو ئەوانیش وەك من کردیان و هەمان وەڵامیان دایەوە بە پێغەمبەر (ش/ت– ڕەزای خوایان لێ بێ).

٤٠٤٢– ← ئەم فەرموودەیە لەپێشەوە ڕابوورد، لە فەضائیل دا، لەباسی (مناقب أهل البيت)دا، فەرموودەی دووەم[7].

٤٠٤٣– عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضي الله عنه) كَانَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) يَمُرُّ بِبَابِ فَاطِمَةَ سِتَّةَ أَشْهُرٍ إِذَا خَرَجَ إِلَى صَلاَةِ الْفَجْرِ يَقُولُ «الصَّلاَةَ يَا أَهْلَ الْبَيْتِ (إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنْكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا)»[8].

---

[7] تقدم في المجلد الخامس في مناقب أهل البيت. تسلسل/١٦ رقم:٢/٣٣٤٢.

[8] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: تا ماوەی شەش مانگ، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) کاتێ خۆی دەچوو بۆ نوێژی بەیانی، بە بەردەرگای ماڵی فاتیمەی کچیدا ڕەت دەبوو، دەیفەرموو: ئەی ئەهلی بەیت! ئەی خانەنیشانی ماڵی پێغەمبەر! هەڵسن بچن بەلای نوێژەوە! ئەوجا بەشوێن ئەم فەرمایشتەدا، بۆ باش حاڵی بوون لەمەبەستەکەی ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە: {إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ} أهل البيت! (ويطهركم تطهيرا) (٣٣/٣٣). ڕاڤەی ئەم ئایەتە لەباسی (مناقب أهل البيت)دا، ڕابورد (ت-س/ح).

٤٠٤٤- عَنْ أُمِّ عُمَارَةَ الأَنْصَارِيَّةِ (رضي الله عنها) أَنَّهَا قَالَتْ: يا رسول الله مَا أَرَى كُلَّ شَيْءٍ إِلاَّ لِلرِّجَالِ وَمَا أَرَى النِّسَاءَ يُذْكَرْنَ بِشَيْءٍ فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ (إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ وَالْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ). رواهما الترمذي[٩].

ئوممو عومارەی ئەنصارییە (خودای لێ ڕازی بێ) عەرزی حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) دەکا: ئەی پێغەمبەری خودا! دەبینم بۆ هەموو شتێ ناو هەر ناوی پیاوانەو هەموو شتێ هەر دەربارەی ئەوانە، نابینم کە ئایەتێ، شتێ، دەربارەی ژنان بێتە خوارەوەو لەشتێکا، ناویان ببرێو باسیان بکرێ!

جائەم ئایەتە هاتە خوارێ، کە دەفەرموێ: {إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ وَالْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ....} (٣٥/٣٣) (ت-س/ح).

٤٠٤٥- عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ لَوْ كَانَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) كَاتِمًا شَيْئًا مِنَ الْوَحْيِ لَكَتَمَ هَذِهِ الآيَةَ (وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِي أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِ) يَعْنِي بِالإِسْلاَمِ (وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ) بِالْعِتْقِ فَأَعْتَقْتَهُ (أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَاتَّقِ اللَّهَ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَنْ تَخْشَاهُ) إِلَى قَوْلِهِ (وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ مَفْعُولاً) وَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) لَمَّا تَزَوَّجَهَا قَالُوا تَزَوَّجَ حَلِيلَةَ ابْنِهِ فَأَنْزَلَ

---

[٩] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

اللّٰهُ تَعَالَى (مَا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِنْ رِجَالِكُمْ وَلَكِنْ رَسُولَ اللّٰهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ) وَكَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم) تَبَنَّاهُ وَهُوَ صَغِيرٌ فَلَبِثَ حَتَّى صَارَ رَجُلاً يُقَالُ لَهُ زَيْدُ بْنُ مُحَمَّدٍ فَأَنْزَلَ اللّٰهُ (ادْعُوهُمْ لآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِنْدَ اللّٰهِ فَإِنْ لَمْ تَعْلَمُوا آبَاءَهُمْ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ وَمَوَالِيكُمْ) فُلاَنٌ مَوْلَى فُلاَنٍ وَفُلاَنٌ أَخُو فُلاَنٍ. رواه الترمذي والبخاري[١٠].

**عائیشە** (خودای لێ ڕازی بێ) **دەڵێ: ئەگەر خوانەخواستە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **لەوانە بوایە کەشتێ لە سرووش و وەحی حەشار بدا، یا کەتم بکا، ئەم ئایەتەی حەشاردەداو دەری نەدەخست، کە دەفەرموێ: {واذ تقول للذي أنعمت عليه} هەتا {وَكَانَ أَمْرُ اللّٰهِ مَفْعُولاً} (٧/٣٣) واتە: باسی ئەو کاتە بکە کە تۆ بە زەیدی مێردی زەینەبت دەگوت: دەست لەژنەکەت هەڵ مەگرەو ژنی خۆت تەڵاق مەدەو لەخودا بترسە لەم هۆیەوە. لەدڵی خۆشتا ئەوەت دەشاردەوە کە خودا دەری دەخا، کە بریتییە لەمارەکردنی زەینەب بۆ خۆت ئەگەر زەید تەڵاقی بدا، کەئەم زەیدە هەم خودا دەستی قەدرو ڕێزی لێ ناوەو هەم تۆ، خودا بەهرەی باوەڕی ڕاستی پێ خەڵات کردووە، تۆش بەهرەی ئازادی جەستەی و ڕزگاری گیانی، لەهەمان کاتا لەتانەو تەشەری خەڵکان دەترسای و مەترسی ئەوەت هەبوو کەئەو خەڵکە ئەم مەسەلەیە بکەن بە مەهانەو لێت بکەونە تەقەکردن، بەڵام تۆ دەبێ لەتانەو تەشەری ناڕەوای مەردوم نەترسی، بەڵکوو بۆ هەموو شتێ لەخودای خۆت بترسی، عەیب ئەوەیە کەشەرع بەعەیبی دابنێ، بێ عەیب ئەوەیە کەشەرع بەجوانی دابنێ، ئیتر قسەی ئەم و ئەو بایەخی نییە، جا کاتێ زەینەب لەلایەنی زەیدی مێردیەوە تەڵاقدراو فڕی ئەوی بەسەرەوە نەماو دڵی لێی هەڵکەوت و عیددەی شەرعیشی تەواو بوو... لەتۆمان مارەکرد، هەتا لەناو موسوڵمانانا باوو خووی ناشیرینی سەردەمی نەزانی بەهیچ جۆرێ**

---

[١٠] بخاري. تفسير. ٤٧٨٦.

بـرەوی نـەبێو برشـتی نـەمێنێ، کەیـەکێ لـەو بـێ شـەرعییانە کەخـەڵك بەعەیبو عاری دەزانن ئەوەیە: کە پیاو کۆنەژنی کوڕی جەعلی خۆی مارە بکاتەوە بۆ خۆی، وەك ئەم حاڵەتەی تۆو زەیدی کوڕی حاریثە، فەرمانی خودا ڕەتبوونەوەی نییە، کارێ کە خودا بڕیاری لەسەر دابێ دەبێ ببێ.

گوتی: کاتێکیش کە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) زەینەبی مارەکرد بۆخۆی دەیانگوت: موحەممەد ژنی کوڕی خۆیی مارەکردۆتەوە، چونکە لەپێشدا، لەسەر دەستووری کۆنی پێش هاتنی ئیسلام، لە پێش بیعثەتدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) زەیدی کوڕی حاریثەی کڕیو ئازادی کردو کردی بە کوڕی خۆی، جا خودا بۆ بەرپەرچی ئەم بوختانە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: {مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَكِن رَّسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ} (٣٣/٤٠) واتە: موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلا باوکی هیچ پیاوێ لەئێوە نییەو کوڕی وا گەورەی نییە لە پشتی خۆی کە بووبێ بە پیاوو ژنی هێنابێ، کەواتە لەسەرچی بیرو باوەڕێ ئێوە دەڵێن: کۆنە بووکی خۆی مارەکردۆتەوە، ئەوەندە هەیە ئەو زاتە ڕەوانەکراوی خودایەو دوا پێغەمبەریشە، لەبەر ئەوە لەفەرمانی خودا دەرناچێو لەهەموو شتێکا ڕەزای خودای خۆی مەبەستەو دەربەستی لاژگەلاژگیی ناحەز نایەت گوتی: لەپێشدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) زەیدی (بەمنداڵی) کردبوو بەکوڕی شێوەییو جەعلی خۆی، هەتا بوو بوو بەپیاویش هەربانگیان دەکرد: زەیدی کوڕی موحەممەد، تا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: {ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ اللَّهِ فَإِن لَّمْ تَعْلَمُوا آبَاءَهُمْ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ وَمَوَالِيكُمْ} (٣٣/٥) واتە: ئەوکەسانەی کە بەکوڕی ئێوە لەقەڵەم دراونو لەڕاستی دا کوڕی ئێوە نینو کوڕی کەسێکی ترن ئەوانە بەناوی باوکی خۆیانەوە بانگیان بکەن، ئەوە ڕێکی دەستووری لای خودایە. جا ئەگەر نەتاندەزانی کە کێ باوکیانە ئەوە برای ئاینییتاننو بەبراو برادەر بانگیان بکەنو، دۆستی ئێوەن، بەووشەی خۆشەویستمو

**شتی وا بانگیان بکەن. گوتی: ئیتر لەوە دوا دەیانگوت: فیسارەکەسی کوڕی فیسارەکەس، بەناوی باوکی ڕاستەقینەی خۆیەوە بانگیان دەکردن، بەڵام ئەگەر ناوی باوکی نەزانرایێ دەیانگوت: فیسارەکەسی سەر بە فیسارەکەس، یا فیساری برای فیسار** (ت/ب).

**٤٠٤٦- عَنْ أَنَسٍ** (رضي الله عنه) **قَالَ: نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ فِي زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ (فَلَمَّا قَضَى زَيْدٌ مِنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَاكَهَا) قَالَ فَكَانَتْ تَفْتَخِرُ عَلَى أَزْوَاجِ النَّبِيِّ** (صلى الله عليه وسلم) **تَقُولُ زَوَّجَكُنَّ أَهْلُكُنَّ وَزَوَّجَنِي اللَّهُ مِنْ فَوْقِ سَبْعِ سَمَوَاتٍ.**[١١].

**ئەنەس** (خوادی لێ ڕازی بێ) **دەڵێ: ئەم ئایەتە لەشانی زەینەبی کچی جەحشدا هاتۆتە خوارەوە، کەدەفەرموێ: {فَلَمَّا قَضَى زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَاكَهَا...} بۆیە زەینەب گەلێ جار شانازی ئەوەی دەکرد بەسەر ژنەکانی تری پێغەمبەردا** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەیگوت: ئێوە کەس و کارو هەقدارەکانتان مارەیان کردوون لە پێغەمبەر، بەڵام من خودا خۆی (لەسەرووی حەوت ئاسمانەوە) بە نەصصی ئایەت مارەی بڕیوم لێی** (ت-س/ص).

**٤٠٤٧- عَنْ أُمِّ هَانِئٍ بِنْتِ أَبِي طَالِبٍ** (رضي الله عنها) **قَالَتْ خَطَبَنِي النَّبِيُّ** (صلى الله عليه وسلم) **فَاعْتَذَرْتُ إِلَيْهِ فَعَذَرَنِي ثُمَّ أَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى (إِنَّا أَحْلَلْنَا لَكَ أَزْوَاجَكَ اللاَّتِي آتَيْتَ أُجُورَهُنَّ وَمَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ مِمَّا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَيْكَ وَبَنَاتِ عَمِّكَ وَبَنَاتِ عَمَّاتِكَ وَبَنَاتِ خَالِكَ وَبَنَاتِ خَالاَتِكَ اللاَّتِي هَاجَرْنَ مَعَكَ وَامْرَأَةً مُؤْمِنَةً إِنْ وَهَبَتْ نَفْسَهَا لِلنَّبِيِّ) الآيَةَ قَالَتْ فَلَمْ أَكُنْ أَحِلُّ لَهُ لأَنِّي لَمْ أُهَاجِرْ كُنْتُ مِنَ الطُّلَقَاءِ. رواهما الترمذي:**[١٢].

**ئوممو هانیء کچی ئەبو تالیب** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **خوازبێنیی کردم بۆ خۆی، منیش عوزرم بۆ هێنایەوە،**

---

[١١] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[١٢] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

ئـەویش عوزرەکـەی پەسـەند کـردم، جـا خـودای گـەورە ئەمـەی نـاردە خوارەوە: {يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَحْلَلْنَا لَكَ...... وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا} (٣٣/٥٠) واتـە: ئـەی پێغەمبـەری خۆشەویـست! ئێمـە حـەڵاڵمان کـردووە بۆتـۆ ئـەو ژنانەی تۆ کە بەعادەتی دەیانخوازیت‌و مارەییان دەدەیتـێ، هـەروەها ئـەو کەنیزانـەش کـە خـودا داونـی بـەتۆ لەدەسـت کـەوتی جـەنگ، کـە بـەپێی دەسـتورو بـاوی کۆمەڵایـەتی سـەردەمی خـۆت دەبـن بـە بەشـی خـۆت لـەتاڵانی جـەنگ، هـەروەها حـەڵاڵم کـردووە بۆ تـۆ، ئەگـەر بتـەوێ کەسـێ لەمانـەی باسـی دەکـەم بـۆت بەئاسـایی مـارەی بکـەی بـۆ خـۆت: کـچانی مامت، کچانی پورەکانت مەبەست کچانی خوشکی باوکە، کچانی خاڵت کـچانی میمکـەکانت، مەبەسـت کـچانی خوشـکی دایکـە، ئەوانـەیان کەلـە مەککـەوە لەگـەڵتا کۆچـیان کـردووە بـۆ مەدینـە، وە بـەموهاجیر حلێـب دەکـرێن، هـەروا حـەڵاڵم کـردووە بـۆ تـۆ هـەرژنێکی موسـوڵمان کـەخۆی ببەخشێ بەتۆ، وە داوای مارەیی‌و جیازی نـەکا، بەمـەرجێ ئـەوە کـە تـۆ بتەوێ‌و بەژنی خۆتی قەبووڵ بکەی، ئەم مەسەلەی خۆ پێبەخشینە بـەس بـۆ تـۆ دروسـتە، نـەك بـۆ هـەموو موسـوڵمانێ، تـا نـەبێ بـە تێکـەو لێکـەو هەرژن‌و پیاوێ هەڵسن‌و دەست تێکەڵکەن‌و بڵێن ئێمـە خۆمـان بەخشیوە بەیـەکتری. ئێمـە خۆمـان بـاش دەزانـین کەلـەم بارەیـەوە چـی دەسـتوورو یاسایەکمان بەپێی حاڵی خۆیـان بۆ دانـاون، چـی لـەبارەی ژنەکانیانـەوە، وە چـی لـەبارەی کـەنیزی مـاڵی خۆیانـەوە، کـەبوون بـەماڵ‌و موڵکیـان مەبەسـت لـەم بـەیانی حاڵـە بـەم دوورو درێژییـە ئەوەیـە کەلـەم لایەنـە ناسکەوە لۆمەی ناحـەزو گلـەیی دۆسـتت نەیەتـە سـەر، وە خـودای گـەروە تاوانبەخش‌و میهرەبانە.

ئوممو هانی گوتی: ئیتر بەپێی ئەم دەستوورانە والـەم ئایەتـەدا منـی پێ نەدەشیام، چونکی من کۆچم نەکردبوو، وەئەو مەرجەم تیا نەبوو، من لە بەرەڵاکراوەکان (طلقاء)ی فەتحی مەککە بووم (ت-س/ص).

٤٠٤٨- عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ كُنْتُ أَغَارُ عَلَى اللاَّتِي وَهَبْنَ أَنْفُسَهُنَّ لِرَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَأَقُولُ أَتَهَبُ الْمَرْأَةُ نَفْسَهَا فَلَمَّا أَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى (تُرْجِئُ مَنْ تَشَاءُ مِنْهُنَّ وَتُؤْوِى إِلَيْكَ مَنْ تَشَاءُ وَمَنِ ابْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكَ) قُلْتُ مَا أُرَى رَبَّكَ إِلاَّ يُسَارِعُ فِي هَوَاكَ[١٣].

**عائیشه** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: ڕقو بێزم لەوژنانە دەبۆوە کە دەچوون خۆیان دەبەخشی بە پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **دەمگوت: خۆ ئافرەت (دیاریو دەسەنەو شمەك نییە) چۆن خۆی دەبەخشێ! کاتێ ئەم ئایەتەش هاتە خوارێ: {تُرْجِي مَن تَشَاء مِنْهُنَّ وَتُؤْوِي إِلَيْكَ مَن تَشَاء وَمَنِ ابْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكَ} (٣٣/٥١) واتە: لەگەڵ ئەوەدا کەئەم ژنانەم بۆ حەلاڵ کردووی، تۆ خۆت خاترخۆبە، بەئارەزووی خۆت لەگەڵیان هەڵسوکەوت بکەو کامیان دوادەخەیو درەنگ دەچیتە لای تاوانت لەسەر نییە، وەکامیان بانگ دەکەیت بۆلای خۆتو لەنووستنی شەوانەدا پێشی دەخەی ئارەزووی خۆتە، وەئەو ژنەی کەکەلات خستووەو لێێ دوور کەوتوویتەوە گوناهت ناگا کەسەر لەنوێ لەخۆتی نزیك بخەیتەوەو دای بکەیتەوە.**

**عائیشە گوتی: کەئەمەیش هاتە خوارەوە بە پێغەمبەرم** (درودی خودای لەسەربێ) **گوت: وادەزانم خودا بەکەیفی دڵی تۆ دەجووڵێتەوەو زوو زوو هەوەسو ئارەزووت جێ بەجێ دەکا! (ش).**

٤٠٤٩- وعنها قالت: كان النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم): يَسْتَأْذِنُ فِي يَوْمِ الْمَرْأَةِ مِنَّا بَعْدَ نُزُولِ هذه الآيَةِ (تُرْجِى مَنْ تَشَاءُ مِنْهُنَّ وَتُؤْوِى إِلَيْكَ مَنْ تَشَاءُ) فَقَالَتْ لَهَا مُعَاذَةُ قُلْتُ لَهَا: فَمَا كُنْتِ تَقُولِينَ؟ قَالَتْ: كُنْتُ أَقُولُ له إِنْ كَانَ ذَاكَ إِلَيَّ فَإِنِي لا أُوثِرُ عَلَيْكَ أَحَدًا يا رسول الله. رواهما البخاري (ومسلم-العيني)[١٤].

---

[١٣] بخاري. تفسير. تجريد/٤/٤٧٢ رقم: ١٦٨٠ = ٤٧٨٨، ٥١١٣ فتح الباري. مسلم. رضاع: ٣٦١٦ – ٣٦١٧.

[١٤] بخاري. تفسير. ٤٧٨٩.

دیسان عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لەپاش هاتنی ئەم ئایەتە {تُرْجِي مَن تَشَاءُ مِنْهُنَّ} کەئەوەی تیایە پێغەمبەر خۆی خاتر خۆیەو سەرپشکە بۆ شەونووستن لەلای هەرکامێ لەژنەکانی کەخۆی بیەوێ، لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بۆ ڕاگرتنی دڵی ئێمە، لەڕۆژی سەرەی خۆماندا ئەگەر بیویستبایە بچێ بۆلای یەکێکی ترمان پرسی پێ دەکردین و ڕای وەردەگرتین موعاذە گوتی: پێم گوت: ئەی لەحاڵەتی وادا تۆ دەتگوت چی؟ گوتی: منیش پێیم دەگوت: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر شتەکە بەدەستی خۆم بێ بەش و سەرەی خۆم لە هاوڕێتی خزمەتی تۆ بەکەسی تر نادەم! (ب/م).

٤٠٥٠- ← (ز/٣ ز/٤٠ ل/٩٤ ف/٥)[١٥].

لێرەدا ئەم پترییەی هەیە: هەتا گەیشتە بەردەرگای هۆدەکەی عائیشە فەرمووی: سڵاوتان لەسەربێ ئەی خانەنشینانی پێغەمبەری خودا! لەگەڵ سۆزو میهرەبانی خودادا. ئەویش گوتی: وعليك السلام ورحمة الله، كيف وجدت أهلك؟ بارك الله لك: سڵاوو سۆزو میهری خودا لەسەر تۆیش بێ، خێزانی تازەت چۆن بوو، خودا لێتی پیرۆز بکا. ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) یەکە یەکە چوو بۆ ماڵی گشت هاوسەرەکانی تریشی، وەچی بەعائیشە فەرموو بەوانی تریشی هەروا فەرموو، وە عائیشە چی بەو گوت ژنەکانی تریشی هەروایان پێ گوت، لەپاشا گەڕایەوە بۆ ماڵەوە کەچی هێشتا سێ پیاوەکە هەر لەماڵەوە قسەیان دەکرد، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) زۆر بەشەرم و شکۆ بوو.

٤٠٥١- ← (ب/١ ز/٥٣ ل/٢١١ ف/٥)[١٦].

٤٠٥٢- ← (ب/٣ ز/٤٨ ل/١١٩ ف/١)[١٧].

---

[١٥] تقدم برقم: ٢٠٩١/٥ مجلد ثالث تسلسل/٤٠ رقم: ٢٢٣٦/٥.

[١٦] تقدم في مجلد الأول. تسلسل/٥٣ برقم: ٣٩٠/٥.

قال اللّٰهُ تَعَالَى: {إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيمًا} (٣٣/٥٦).

**واتە: خوداو فریشتەکانی خودا صەڵاوات دەدەن لەسەر پێغەمبەر، ئەی کەسانێ کە ئیمانتان هەیە بەخوداو پێغەمبەر صەڵاواتی لەسەر بدەن و سەلامی لێ بکەن.**

**٤٠٥٣- عَنْ كَعْبُ بْنُ عُجْرَةَ** (رضي الله عنه) **قيل: يا رسول الله أمَّا السَّلام عليك فقد عرفناه، فكيف الصَّلاة عليك؟ قال: «قُولُوا اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ»رواه البخاري والترمذي ولفظه: «اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، في العالمين إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ» وَالسَّلَامُ كَما علتم**[١٨].

**کەعبی کوڕی عوجرە** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: گوترا ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە دەزانین سەلام لەدیاری تۆ بدەین وەك ئەوە لەتەحیاتا دەڵێین: (السلام عليك أيها النبي ورحمة الله وبركاته) بەڵام نازانین صەڵاوات لەسەر تۆ چۆن دەدرێ؟ حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: بڵێن: (اللهم صلي على....) هەتا (...حميد مجيد) تەرجەمەکەشی لەم شوێنەدا ڕابوورد ← (ب/١ ز/٧٢ ل/٢٥٣ ف/١٣) (ب/ت). گفتەی تیرمیزی ئاوایە: (اللهم صل على محمد وعلى آل محمد كما صليت على ابراهيم وعلى آل إبراهيم، وبارك على محمد وعلى آل محمد كما باركت على إبراهيم وعلى آل إبراهيم في العالمين إنك حميد مجيد): عیبارەتی سەلام کردنیش لەمن لەسەر ئەو شێوەیە کەخۆتان دەیزانن.**

---

[١٧] تقدم في المجلد الثالث. تسلسل/٤٨ برقم: ٢١٦٦/١.

[١٨] تقدم برقم: ٤٨١/١٣. مجلد الأول. تسلسل/٧٢.

٤٠٥٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) «أَنَّ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلاَمُ كَانَ رَجُلاً حَيِيًّا سِتِّيرًا مَا يُرَى مِنْ جِلْدِهِ شَيْءٌ فَآذَاهُ مَنْ آذَاهُ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ فَقَالُوا مَا يَسْتَتِرُ هَذَا السِّتْرَ إِلاَّ مِنْ عَيْبٍ بِجِلْدِهِ إِمَّا بَرَصٌ وَإِمَّا أُدْرَةٌ وَإِمَّا آفَةٌ وَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ أَرَادَ أَنْ يُبَرِّئَهُ مِمَّا قَالُوا وَإِنَّ مُوسَى عَلَيْهِ السَّلاَمُ خَلاَ يَوْمًا وَحْدَهُ فَوَضَعَ ثِيَابَهُ عَلَى حَجَرٍ ثُمَّ اغْتَسَلَ فَلَمَّا فَرَغَ أَقْبَلَ إِلَى ثِيَابِهِ لِيَأْخُذَهَا وَإِنَّ الْحَجَرَ عَدَا بِثَوْبِهِ (أي فَرَّ بِهِ) فَأَخَذَ مُوسَى عَصَاهُ فَطَلَبَ الْحَجَرَ فَجَعَلَ يَقُولُ ثَوْبِي حَجَرُ ثَوْبِي حَجَرُ حَتَّى انْتَهَى إِلَى مَلإٍ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ فَرَأَوْهُ عُرْيَانًا أَحْسَنَ النَّاسِ خَلْقًا وَأَبْرَأَهُ مِمَّا كَانُوا يَقُولُونَ قَالَ وَقَامَ الْحَجَرُ فَأَخَذَ ثَوْبَهُ وَلَبِسَهُ وَطَفِقَ بِالْحَجَرِ ضَرْبًا بِعَصَاهُ فَوَاللَّهِ إِنَّ بِالْحَجَرِ لَنَدَبًا مِنْ أَثَرِ عَصَاهُ ثَلاَثًا أَوْ أَرْبَعًا أَوْ خَمْسًا فَذَلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَكُونُوا كَالَّذِينَ آذَوْا مُوسَى فَبَرَّأَهُ اللَّهُ مِمَّا قَالُوا وَكَانَ عِنْدَ اللَّهِ وَجِيهًا). رواه الشيخان والترمذي. والله أعلم[١٩].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: مووسا (دروودی لەسەر بێ) پیاوێکی زۆر بە شەرمو شکۆ بوو هەمیشە خۆی باش دا دەپۆشی، بەرەنگێکی وا پێستی لەشی هیچ نەدەبینرا، جا هەندێ کەس لە نەوەی ئیسرائیل بەم جۆرە قسانە ئازاری دڵی مووسایان دەداو دەیانگوت: مووسا بۆیە بەم شێوەیە خۆی دا دەپۆشی دیارە نەنگێ بەلەشیەوە هەیە، سایا بەڵەکە، یا دەبەو قۆڕە، یا دەردێکی تری هە هەیە. جا خودای گەورەو سەروەر ویستی ئەم قسەو باسەی ئەوانە بەدرۆ بخاتەوەو پاکیو بێ نەنگی مووسا دەربخات جا بۆیە ڕۆژێ مووسا (دروودی لێ بێ) بەتەنیا خۆی لەوان کلاکردو ڕۆیشت بۆ چۆڵییەك خۆی بشۆرێو جلەکانی خۆیی لەبەر داکەندو لەسەر بەردێ داینان، جا کاتێ کەخۆی شۆردو لێ بۆوە چوو بۆلای جلەکانی تاکوو لەبەریان بکاتەوە، بەڵام بە فەرمانی خودای گەورە بەردەکە جلەکەی مووسای فڕاند! مووسایش داردەستەکەی خۆی هەڵگرتو

---

[١٩] تجريد البخاري/١ ل/٢٠٤ رقم: ١٩٢ = ٢٧٨، ٣٤٠٤، ٤٧٩٩. مسلم، حيض: ٧٦٨، ٦٠٩٨.

نیشتە سەر بەردەکەو ڕایکرد بەشوێنیاو بانگی دەکرد: بەردەکە! جلەکانم دانێ، بەردەکە! جلەکانم دانێ، بەردەکەیش ڕۆیشت، مووسایش لەشوێنی ڕۆیشت، هەتا گەیشت بەکۆمەڵێ لەنەوەی ئیسرائیلو هەموو تەماشای لەشی مووسایان کرد، بەڕووتو قووتیو بەچاوی خۆیان دییان کەلەشو لار لەوە جوانترو پاکتر نابێو زۆر دوورە لەو درۆیانەی کەئەوان دەیانلێن! جا ئەوجا بەردەکە ڕەق ڕاوەستاو مووسایش جلەکانی هەڵگرتەوەو دەستی کرد بەلێدانی بەردەکەو بەگۆچانەکەی چەن کوتەکێکی باشی لێدا!! ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: سوێندم بە خودای گەورە مووسا وا بەتوندیو بەزەبرو هێزو نهێم بەعاساکەی بەردەکەی داپلۆسی بوو، سێ یا چوار، یا پێنج خاڵی لێ کردبوو، وەك جێگە برین، ئەمە ئەو داستانەیە کەخودای گەورە بەم ئایەتە ئیشارەتی بۆدەکاو دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ آذَوْا مُوسَى فَبَرَّأَهُ اللَّهُ مِمَّا قَالُوا وَكَانَ عِندَ اللَّهِ وَجِيهًا} (٦٩/٣٣) واتە: ئەی کەسانێ کەباوەڕتان هەیە بە خوداو پێغەمبەری خودا! ئێوە وەکوو ئەوانە مەبن کە ئازاری دڵی مووسایان دەدا، تا خودای گەورە پاکیو بێ نەنگی مووسای دەرخستو قسە ناهەقەکانی ئەوانی بە درۆ خستەوە، لەڕاستیدا مووسا لەلای خودای گەورە گەلێ خاوەن خاترو پایەو ڕێز بوو. (ش/ت):

لەبەر خاتری سوورەتی ئەحزاب

خودا لامان دا لەپیاوی خراپ

## ١٧- سوورەتی سەبەء

(لەسوورەتە مەکییەکانە پەنجاو چوار ئایەتە)

## سورة سبأ (مكية: وهي أربع وخمسون آية)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤٠٥٥- عَنْ فَرْوَةَ بْنِ مُسَيْكٍ الْمُرَادِيِّ (رضي الله عنه) قَالَ أَتَيْتُ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلاَ أُقَاتِلُ مَنْ أَدْبَرَ مِنْ قَوْمِي بِمَنْ أَقْبَلَ مِنْهُمْ فَأَذِنَ لِي فِي

قِتَالِهِمْ وَأَمَّرَنِي فَلَمَّا خَرَجْتُ مِنْ عِنْدِهِ سَأَلَ عَنِّي مَا فَعَلَ الْغُطَيْفِيُّ فَأُخْبِرَ أَنِّي قَدْ سِرْتُ قَالَ فَأَرْسَلَ فِي أَثَرِي فَرَدَّنِي فَأَتَيْتُهُ وَهُوَ فِي نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِهِ فَقَالَ «ادْعُ الْقَوْمَ فَمَنْ أَسْلَمَ مِنْهُمْ فَاقْبَلْ مِنْهُ وَمَنْ لَمْ يُسْلِمْ فَلاَ تَعْجَلْ حَتَّى أُحْدِثَ إِلَيْكَ». قَالَ وَأُنْزِلَ فِي سَبَإٍ مَا أُنْزِلَ فَقَالَ رَجُلٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا سَبَأٌ أَرْضٌ أَوِ امْرَأَةٌ قَالَ «لَيْسَ بِأَرْضٍ وَلاَ امْرَأَةٍ وَلَكِنَّهُ رَجُلٌ وَلَدَ عَشَرَةً مِنَ الْعَرَبِ فَتَيَامَنَ مِنْهُمْ سِتَّةٌ وَتَشَاءَمَ مِنْهُمْ أَرْبَعَةٌ فَأَمَّا الَّذِينَ تَشَاءَمُوا فَلَخْمٌ وَجُذَامٌ وَغَسَّانُ وَعَامِلَةُ وَأَمَّا الَّذِينَ تَيَامَنُوا فَالأَزْدُ وَالأَشْعَرِيُّونَ وَحِمْيَرُ وَمَذْحِجٌ وَأَنْمَارُ وَكِنْدَةُ». فَقَالَ رَجُلٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا أَنْمَارُ قَالَ «الَّذِينَ مِنْهُمْ خَثْعَمُ وَبَجِيلَةُ»رواه الترمذي وأبو داود[1].

**فەروەی موورادی** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: چووم بۆلای پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **گوتم: قوربان! ئەگەر ڕێگەم بدەی بە وانەی کەلەهۆزەکەی خۆم موسوڵمان بوون شەڕدەکەم لەگەڵ ئەوانەی کە هێشتا موسوڵمان نەبوون، فەرمووی: باشە جا کاتێ من دەرچووم، حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **پرسیاری من دەکاو دەفەرموێ: فەروەی قوتەیفی چی لێ هات؟ دەڵێن: ڕۆیشتەوە ئەویش دەنێرێ بەشوێنما، کە چوومەوە بۆ خزمەتی لەناو دەستەیێ لە یاراندا بوو، فەرمووی: کە چوویتەوە بەقسەی خۆش بانگی هۆزەکەت بکە بۆ سەر دینی ئیسلام، جا ئەوەی ئیسلام بوو ئەوا زۆر باشە، ئەوەیشی ئیسلام نەبوو پەلەی لی مەکە هەتا خۆم پەیامت بۆدەنێرم! فەروە گوتی: کاتێ ئایەت لەبارەی سەبەئەوە هاتە خوارەوە پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! سەبەء چییە؟ وڵاتە یا ئافرەتە؟ فەرمووی: نە وڵاتەو نە ئافرەتە، بەڵان ناوی پیاوێکی عەرەب بووە، دەمناڵی بووە، شەشیان لەلای ڕاستەوە لەیەمەنو چواریان لەلای چەپەوە لەشام نیشتەجێ دەبن، ئەوانەی کەلەشام نیشتەجێ بوون لەخمو جوذامو غەسسانو عامیلەن، ئەوانەیشی کە لەیەمەن نیشتەجێ بوون ئەزدو ئەشعەرییەکانو حیمیەرو موذحیجو ئەنمارو**

---

[1] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

کیندەن پیاوێ گوتی: قوربان ئەنمار کێهایە؟ فەرمووی: ئەو عێلەیە کە هۆزی خەثعەمو هۆزی بەجیلە دەچنەوە سەری! (ت-س/ح-د).

٤٠٥٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) عَنْ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ «إِذَا قَضَى اللَّهُ الأَمْرَ فِي السَّمَاءِ ضَرَبَتِ الْمَلاَئِكَةُ بِأَجْنِحَتِهَا خُضْعَانًا لِقَوْلِهِ كَأَنَّه سِلْسِلَةٌ عَلَى صَفْوَانٍ، فَإِذَا فُزِّعَ عَنْ قُلُوبِهِمْ قَالُوا: مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ؟، قَالُوا: الْحَقَّ وَهُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ، فَيَسْمَعُهَا مُسْتَرِقُو السَّمْعِ، فيُلقيها إِلَى مَنْ تَحتَهُ ثمَّ يلقيها الآخَرَ إلى من تحته حتى يلقيها على لسان السَّاحر أو الكاهن فَرُبَّمَا أَدْرَكَه الشِّهَابُ قَبْلَ أَنْ يلقيها وَرُبَّمَا ألقاها قبل أن يُدْرِكَهُ فيكذب معها مائة كذبةٍ فيقال: أليس قد قَالَ لنا يَوْمَ كَذَا وَكَذَا كَذَا وَكَذَا، فيُصدَّق بتلك الْكَلِمَةِ الَّتِي سُمِعَتْ مِنَ السَّمَاءِ». رواه البخاري والترمذي هنا وأبو داود في السنة، ولفظه: «إِذَا تَكَلَّمَ اللَّهُ تعالى بِالْوَحْيِ سَمِعَ أَهْلُ السَّمَاءِ لِلسَّمَاءِ صَلْصَلَةً كَجَرِّ السِّلْسِلَةِ عَلَى الصَّفَا فَيُصْعَقُونَ فَلاَ يَزَالُونَ كَذَلِكَ حَتَّى يَأْتِيَهُمْ جِبْرِيلُ فَإِذَا جَاءَهُمْ فُزِّعَ عَنْ قُلُوبِهِمْ فَيَقُولُونَ: يَا جِبْرِيلُ مَاذَا قَالَ رَبُّكَ؟ فَيَقُولُ: الْحَقَّ فَيَقُولُونَ: الْحَقَّ.[٢]

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کاتێ خودای گەورە لەئاسمان کارێکی بڕیارداو فەرمایشتێکی فەرموو، فریشتەکان باڵ دەدەن بەیەکاو ملکەچ دەکەن بۆ فەرمایشتەکەی خودا، دەنگی ئەو فەرمایشتە وەکوو دەنگی زڕەی زنجیری سەرتاوێر وایە ئیتر فریشتەکان لەترسی خودا دەشەڵەژێن و دەتۆقێن کاتێ تۆزێ ترسەکەیان دەنیشێتەوەو دەزانن کەئەوە نییە کەئەوان لێی دەترسان، لەناو خۆیانا، بەیەکتری دەڵێن: پەروەردگارتان چی فەرموو؟ فریشتە گەورە پایەدارەکانیش (وەك جوبرائیل و میکائیل) وەڵامیان دەدەنەوەو دەفەرموون بەوانەی کەئەم پرسیارە دەکەن: خودای پایە بەرزو پایە

---

[٢] مختصر صحيح البخاري = تجريد البخاري/٤ ل/٤٥١ رقم/١٦٦٨ = ٤٧٠١، ٤٨٠٠، ٧٤٨١ فتح الباري شرح صحيح البخاري.

گەورە وتارێکی ڕاستو دروستی فەرموو ئەمە ئەو پرسیارو وەلامەیە کە خودای گەورە لە قورئاندا لەم ئایەتەدا باسی کردووە کە دەفەرموێ: {وَلَا تَنفَعُ الشَّفَاعَةُ عِندَهُ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُ حَتَّى إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمْ قَالُوا مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ قَالُوا الْحَقَّ وَهُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ } (٣٤/٢٣) واتە: تکا کردن لای خودا سوودی نییە، بۆ کەسێ نەبێ کەخۆی ڕێگەی بدا کەیەکێ تکای بۆ بکا، وە لەوماوە دا ترسو بیم وا دایان دەگرێ، کەس سەرکەسی ناپەرژێ، هەتا تۆزێ ترسەکەیان دەڕەوێتەوە دەڵێن: خودای گەورە چی فەرموو؟ دەڵێن: خودای پایەبەرزی پایەگەورە گوتارێکی ڕاستو دروستی فەرموو. جا وا ڕێ دەکەوێ ئەو شەیتانانەی کە گوێ هەڵ دەخەنو گوێ لەقسەی فریشتەکان دەگرن ئەو وتەیە دەبیستنو دەیفڕێننو ئەم دەیگەیەنێ بەوەی ژێر خۆیو ئەو دەیگەیەنێ بەشەیتانێکی تر لەخوار خۆیەوە، ئیتر هەروا دەماو دەمی پێ دەکەنو ئەم دەیدا بەوو ئەو دەیدا بەم هەتا شەیتانێ لەهەڵو مەرجێکا دەیچپێنێ بەگوێیجادوو بازێکا، یا دەیخاتە سەر دەمی کاهینێ، ئەویش لەگیرفانی خۆیەوە سەد درۆی پێوە دەنێ، جا بۆیە خەڵك باوەڕ بەقسەی کاهینو جادوو گەر دەکەنو دەڵێن: ئەوە نەبوو لەفیسارە ڕۆژو مانگا ئەو قسەیەی بۆ کردینو قسەکەشی ڕاست دەرچوو، هۆی ئەو باوەڕ پێکردنە ئەو تاقە ووشە ڕاستەیە کە شەیتانەکان لەئاسمان لەفریشتەکانیان بیستووەو بەم شێوەیە گەیاندوویانە بە جادووگەرو کاهینو کۆڵەنانییەکان، جا گەلێ جار بەر لەوە کەشەیتانەکە ئەو ووشەیەی دەیڕفێنێ، گەلێ جاریش وادەبێ ڕەتی دەکا، ئەوسا شووڵە ئاگرو بزووتکە کە دەیگاتێ (ب/ت/د).

گفتەی (د) ئاوایە: کاتێ خودای گەورەو سەروەر ووتاری سرووش دەفەرموێ دانیشتوانی ئاسمان زڕوهوڕێ دەبیستن، لەچەشنی زڕەی زنجیرێ کەبەسەر تاشە بەردێکا ڕابکێشرێت ئاوا، ئەو زڕو هوڕەش لە ئاسمان خۆیەوە هەڵ دەستێ، ئیتر لە ترساندا هەموو لەهۆش خۆیان دەچنو هەروا بەبێ هۆشی لەشوێنی خۆیان دەمێننەوە هەتا جوبرائیل (درودی لێ بێ) دەچێ

بۆلایان، کەئەو دەچێ بۆلایان بەرەبەرە دڵیان دەحەوێتەوەو دەڵێن: ئەی جوبرائیل! ئەم زڕەیە چی بوو، پەروەردگاری تۆ چی فەرموو؟ دەفەرموێ: ووتارێکی ڕاستو دروستی فەرموو، کە ئەمەیەو ئەوەیە.

بەندە (کەوەرگێڕی ئەم نامە پیرۆزەیەم کە نوری فارس حمە خان حەسەنم پێ دەڵێن*) دەمەوێ لە گیرفانی خۆمەوە شتێکتان عەرزبکەم، کە ببێ بە کلیلی وەڵامی گەلێ پرسیارو چارەی گەلێ وەسوەسەو ڕاڕاییو دڵە ڕاوکێ، کە مرۆڤی موسوڵمان لەژیانی خۆیا بەهۆی بەراووردو تەجرەبەو ئیکتیشافاتی عیلمیو طیبیو فەلەکی تازەوە تووشی دەبێ، ئیتر چ هی خۆی بێ چ هی یەکێکی تر بێ، بۆیەش دەڵێم لە گیرفانی خۆمەوە تا کەس بەقسەکەم دەسخەڕۆ نەبێ، هەتا بەباشی هەڵی دەسەنگێنێ جا ئەگەر باش بوو لەخودا بەزیادبێ، ئەگەر هەڵەش بوو ئەوا بەخێری خۆی ڕەددی لێ بداتەوە:

١- ئێمە، کە موسوڵمانینو باوەڕمان بەخوداو پێغەمبەرو فەرمایشتی ئەوان هەیە، باوەڕەکەشمان لەسەر بوڕهانو دەلیلو بەڵگەی ڕۆشنی دامەزراوە کە گەیوەتە ڕادەی یەقینی تەواوو خۆی لەو دارەتانەدا کە خوانەخواستە گومانو شۆڕشی گومانو شەکك جێی پێ لەق بکا، وەك چۆن دەزانین ١+١=٢ ئاواش دەزانین کەهەرچی قسەی دینە ئاوا ڕاستەو هەڵەی تیانییە.

بەڵام.... بەڵام چی؟.. بەڵام گەلێ جار، لەئایەتی قورئانا، یا لەحەدیثی صەحیحی پێغەمبەردا، یا لەقسەو فەرمایشتو داستانو سەرگوروشتەی زاناو داناو پێغەمبەرو پێشەوا ئاینییەکانا گەلێ شتی سەیر سەیری وا

---

* ئەم فەرمایشتەی مامۆستا مەلا موحەممەدی کۆیی چەندە جوانو ناسكو شیرینە، کەلەکۆتایی پێشەکی تەفسیرەکەیدا دەفەرموێ: منیش کە جەلی زادە کاك حەمەدم پێ نەڵێن دەستم پێ کرد بە تەفسیری قورئانی حەکیمو ناوم لێ نا (تەفسیری کوردی لەکەلامی خوداوەندی). داخەکەم ئەم تەفسیرە زێڕینە گومە. (وەرگێڕ)

هەیە، مرۆڤ سەرسام دەکا، هەیانە لەبەرزەقی و ڕەقی وەك کێچ خەو لەچاوی دڵی ئارام دەتەقێنێ، هەیانە وەك زیخی ناو چاو بەناو مۆخی مێشکی هۆشا هەزارە دەکا، ئەمە واو ئەوە وا، ئەم جۆرە شتانەیش کە موسوڵمان (بەتایبەتی موسوڵمانی رۆشنبیری ئەم رۆژگارە) دەستەوسان دەکا، وەك: باسی یەئجووج و مەئجووج و دابەتولئەرض و کەڵەکەی شەیاتینی بۆ دزینی پەیامی ئاسمانی و سووتانیان بەسەرەبزووت و چۆڵەچراو شتی وا، وەك بوونی مانگ لەفلان ئاسمان و دووری و نزیکی ئاسمانەکان و ئاسمان سەقفی مەحفووظە، وەك پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەشەوی میعراجا ئەوەی دی لەوێ، وەك سەددی یەئجووج و مەئجووج، وەك باسی ججاڵ و هەڵهاتنی خۆرو ئاوابوونی لێرەو لەوێ، وەك هەندێ باسو خواسی تایبەتی ژیانی پێغەمبەرەکان و خواناسە گەورەکان، وەك داستانی یوسف و زلێخاو سەرگوروشتەی داوودو ئوریای حیثی و وەك باسی لەدایکبوونی عیسای کوڕی مەریەم بەبێ باب، وەك باسی مارەکردنی زەینەب لەلایەنی خوداوە لە پێغەمبەر، لەگەڵ ئەو هەموو ویرەویرکردن و گێرەگێر کردنەی کە موحەدیثین و موفەسیرین، بەگەورەو بچووکیانەوە (ڕەزای خودایان لێ بێ) بۆ ئەم مەسەلەی زەیدو زەینەبە گێڕاویانەتەوە، وەك هەراو هوریای نێوانی یارانی پێغەمبەر، یانێوانی پیاوانی شەریعەت و طەریقەت وەك گەلێ شتی تری پزیشکی و ئاسمانی و زانستی، کەلێرەو لەوێ ناو بەناو لەگەڵ بیرو باوەڕە ئایینییەکانا، بەیەکا هەڵ دەتەقێن! بەدیمەن وەك دوو دژوان کەقەت یەك نەگرن!

دەبێ ئەمە بۆ وابێ؟ ئایا خودا لەزاناکانی ئەورووپا زاناتر نییە، وەخۆی (أحکم الحاکمین) و (أعلم العالمین) نییە؟ (بلی وأنا علی ذلك من الشاهدین). گەلێ جار زاناکان دەفەرموون: ئەو پیتە لەو شوێنەدا بۆ ئەو ووشەیە زیادکراوە لەبەرئەوە، یا لەبەر ئەمە، وەك دەفەرموون: ئەلفی (سلاسلا) بۆئەوەیە کەلەگەڵ ئەلفی تونوینی (أغلالا) ڕاست ببێتەوە، یا دەفەرموون:

ژێری لامی (وأرجلكم) بۆ جیوازو هاوسایی سینی ژێرداری (برؤسكم)ە. وە گەلێ شتی لەم بابەتە ووردەکارییە، لەهەموو بابەتە دینییەکانا هەیە، بۆ نموونە: دەڵێن: ژمارەی ڕشتنی چاو تاك بێ، یا مووی لووت بەمەقەست بکرێ باشە، یا خواردنی ئەو شتەیە بۆیە خراپە چونکە دەبێ بەهۆی زەینکوێریی، باشە خودا کە ئەوەندە گرنگی بەشتێ وا بەدیمەن کەم تەئثیر لەژیانی گەلی ئیسلام دا داوە ئەدیی ئەم ئوممەتی ئیسلامەی بۆلەم هەموو موعەمماو مەتەڵو گێژاوەدا هێشتۆتەوە؟! مەبەستم لەئاڕاستەکردنی ئەم پرسیارانە ئینکارو ئیعتراض نییە، مەبەستم ڕۆشنکردنەوەی باسەکەیە. لە قورئانا ئەم جۆرە پرسیارانە زۆرە. لەپێشا پرسیار، لەپاشا وەڵام.

کەواتە برالە! بزانە گەلێ پرسیارو ڕەخنەی تری لەم بابەتە زۆرن، بەڵام هەموویان لەجێی خۆیان وەڵامیان هەیە، ئەگەر مرۆی موسوڵمان زۆر ئاگادارو هۆشیار نەبێو شارەزاییەکی باشی لە قورئانو عیلمی تەئویلو ئوصوولی حەدیثو تەفسیرو مەسائیلی کەلامو عەقائیدو باقی مەندەی عولوومەدینییەکان نەبێ، سەری لێ دەشێوێو بەسەر کوفردا دەچێ، خودا پەنامان بدا.

بەڵام زانای گەورە کە شارەزایی‌تەواویان لە عولوومی دنیاییو عولوومی دینی هەیە، وەك زەڕەنگەری دەسڕەنگین مەقاشو چەکوشو مووکێشو مەقەستی خۆیی لێ دەخاتە کارو لە کوورەی بیری تیژی خۆی پارچە زێڕی نەخشینی ڕەنگاو ڕەنگی لێ دەردەهێنێ کە بەجوانی زاخاوو میرازو چەکوشکارییو نەخشکاری کرابێ کە قابیل بێ بەوەی دابنرێ لەناو خشڵی گەنجینەی پاشایان.

دەی ئەگەر ئینصاف بدەین تێدەگەین خودا بەهۆی ئەم جۆرە شتانەوە بەهەزاران هەزار زاناو داناو پیاوی دینی خاوەن پاداش دەبنو ناودەردەکەنو لەهەردوو جیهاندا سەربەرزی لای خوداو بەندە دەبن،

دەنا ئەگەر مەسائیلی دینی هەمووی وەك ١+١=٢ بەدوو وابێ، دەبێ ئیتر زاناو ڕاڤەزان و فەرمووەدەزان و ئەمانە ئیشیان چی بێ. کەواتە ئامان سەد ئامان خۆت مەدە لەم دارەتەو مەبە بە کەڵەشێری ناوەختو لەشتێ مەکۆڵەرەوە کە کەرەستەو ئەهلییەتی ئەوەت نەبێ، وەك سۆفیلکەیێ دەفەرموێ: مـن لـەباتی ئـەوەی لەعنـەتێ لەشـەیتان بکـەم، دەڕۆم شایەتمانێ دەهێنم، صەڵاواتێ لەدیاری پێغەمبەر دەدەم، دەی تۆیش مەرد بەو مەردی خودابەو پەلاماری طاعەتێکی ڕێكو پێك بدەو شەونوێژی خۆتی لێ بکەو دەوری قورئان بکەرەوەو هاوڕێتی پیاوی باش بکەو هامشۆی مزگەوتو خانەقاو حوجرەی فەقێو شوێنە پیرۆزەکانی تر بکەو خۆت لە کۆڕی پیاوی خراپ لادە وەك گوتراوە (گوتیارەکەی خۆمم):

| | |
|---|---|
| يـا عاشـقا لحلقـة الأذكـار | أبـشر لقـد مـسكت بالأخيـار |
| جـالس وجـاور نـسمة الأبـرار | واستنـشقن رائحـة الأزهـار |
| وفـر مـن مجـالس الأشـرار | فـرار ظـبي مـن أذى الـضواري! |

کەئەمەت کردو بەحەڵاڵی خوا قنیاتت کردو لەگەڵ خوای خۆتا گونجایو لەگەڵ موسوڵمانا ڕووت خۆش بوو، وەهاوبەشیی خۆشیو ناخۆشییانت کرد، دەی تۆ ئەگەر ئەمانە بکەی لەماوەیەکی نیسبەتەن کەما، دەبینی چاوو دڵت ڕۆشن دەبێتەوە، ڕەخنەو مەخنەت نامێنێ، دەچیتە عالەمێکی ترەوە، کە پێی دەگوترێ عالەمی یەقین! کەمن نەمدیوە، بەڵام مەردی ئەو مەیدانەم بەچاوی خۆم زۆر دیوە، کەبڕوا بەقسەی دین دەکەنو هەستی خۆیان بەدرۆ دەخەنەوە!

دەنا بەخودا ئەگەر ئەمە نەکەی، ئەگەر بەپێی خۆت بچیتە سەرسەدی یەئجووجو مەئجووجو بەزمانی خۆت قسەیان لەگەڵ بکەیو بەچاوی خۆت تێر تەماشایان بکەی کەهاتیتەوە، دیسانەوە بە قسەی ئەمو ئەو گومانت بۆ پەیدا دەبێتەوە!

٢- هـەروا بزانـە: کەئـەم ڕەخنـەو پرسـیارە تازانـە وەك ڕەخنـەو پرسـیارە کۆنـەکان هـەر ئێمـەو دینەکـەی ئێمـە ناگرێتـەوە بـەڵکوو ئایینـە ئاسمانییەکانی تریش دەگرێتەوە، میللەتی مووساو میللـەتی عیسایش، وەك ئێمـە باوەڕیـان بـەم جـۆرە شـتانە هەیـەو بگـرە هەڵوێسـتو مـەوقیفی ئەوان لەهی ئێمە گەلێ گەلێ ناسکترە، چونکە ئیسلام خۆی لەسەر ئەم دووپایەیـە بەنـدە: ئـەقڵو هۆشـی ساغو زانسـتو عیلمـی ڕاسـت، وەلـە چاودینەکانی تردا دینی خۆمان تەواو تەواو دوورە لەشتی پڕو پووچو مەسەلەی وا کەلە لەگەڵ هۆشو گۆشا نەگونجێ.

٤٠٥٧- ← ئەم فەرموودەیە لە (الكهانة والخط والطرق)دا رابوورد، لەوێ ژمارەکەی سێیە[٣].

سـەبەءو فـاطـیر لـەناو قورئانـا
یاسـین دەخـوێنن بەسـەر شـارانا
دەڵـێن بـەجۆرێ تێـی دەگـا دانـا:
(تیرەکـەی سـەبەء وا لـە کـەوانا
نـەی خەڵکـە جێتـان شـارە یـا دێیـە
گـەر واز نـەهێنن لـەم ڕا لا ڕێیـە
تـۆفانی دووهـەم وا لـە سـەر پێیـە
نـەتۆم دەبـارێ لەهـەموو جێیـە
هاکـا جـاڕ درا وا جـەنگی سـێیە
بوو بە فەرتەنەو وەی کێ بە کێیە!!)

[٣] مكرر – تقدم في المجلد الرابع. تسلسل/٧٩ رقم: ٣٠٥٧/٣.

## ١٨- سوورەتی فاطیر

(مەکییە چل و پێنج ئایەتە)

سورة فاطر (مكية، وهي خمس وأربعون آية)

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤٠٥٨- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) أَنَّهُ قَالَ فِي هَذِهِ الآيَةِ {ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِ وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌ بِالْخَيْرَاتِ بِإِذْنِ اللَّهِ ذَلِكَ هُوَ الْفَضْلُ الْكَبِيرُ} قَالَ: «هَؤُلَاءِ كُلُّهُمْ بِمَنْزِلَةٍ وَاحِدَةٍ وَكُلُّهُمْ فِي الْجَنَّةِ». رواه الترمذي. نسأل الله حسن التوفيق، آمين[1].

ئەبو سەعیدی خودری (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لەبارەی ئەم ئایەتەوە {ثم أورثنا} هەتا {فضل الكبير}(٣٥/٣٢) حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەمانە (هەرچەند هەر تاقمەی بەپێی کردەوەی خۆی پلەی بەرزە یا نزمە بەڵام) هەموویان وان لەیەك پایەدا، کەپایەی شادبوونە بە بەهەشت! (ت- بەسەندێکی غەریب).

مەبەست لە ئایەتەکەش ئەمەیە: گەلی ئیسلام کە گەلی پەسەندکراوی خودایە، کە خودا قورئانی پێ خەڵات کردوون دەبن بە سێ بەشەوە: باش و مامناوەندی و خراپ، وەلێ هەرسێ بەشەکە مادام ئیسلامن ئەهلی نەجاتن.

## ١٩- سوورەتی یاسین

(لەسوورەتە مەکییەکانە، هەشتاو دوو ئایەتە)

سورة يس (مكية، وهي ثنتان وثمانون آية)

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤٠٥٩- ← (ب/١ ز/١١٤ ل/٣٤٦ ف/٢٢)[1].

---

[1] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

[1] تقدم في المجلد الأول. تسلسل/١١٤ رقم: ٦٨٦/١٢.

لێـرەدا دەفـەرموێ ئـەم ئایەتـە بـەم بۆنەیـەوە هاتـە خـوارەوە کـە دەفەرمویٰ: {إِنَّا نَحْنُ نُحْيِي الْمَوْتَى وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ} (١٢/٣٦) واتە: ئێمـە ئـەو کەسـەین، کـە هـەموو کـارێکی لـە لائاسـانە، مـردوو زینـدوو دەکەینەوە یـەك بەیـەك، وەهەرچییان کـردووە، کـەمو زۆر، بـاشو خـراپ، هەمووومان نووسیوە، شوێنەواریان لـەپاش خۆیـان بـەجێمابێ ئەویشمان نووسیوە.

٤٠٦٠- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رضي الله عنه) قَالَ كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فِي الْمَسْجِدِ عِنْدَ غُرُوبِ الشَّمْسِ فَقَالَ: «يَا أَبَا ذَرٍّ أَتَدْرِي أَيْنَ تَغْرُبُ الشَّمْسُ». قُلْتُ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: «فَإِنَّهَا تَذْهَبُ حَتَّى تَسْجُدَ تَحْتَ الْعَرْشِ، فَتَسْتَأْذِنُ فيؤذَنُ لَهَا، وَيُوشَكُ أَنْ تَسْجُدَ فَلاَ يُقْبَلُ منها، وتستأذِنَ فَلاَ يُؤذَنَ لَهَا فيقالُ لَهَـا: ارجعي مِنْ حيث جِئْتِ فتطلُعُ مِنْ مغربها فَذَلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى: (وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَهَا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ)» رواه البخاري والترمذي[٢].

ئەبو ذەڕ (خودای لێ ڕازی بێ) گـوتی: لـەکاتی ئـاوابوونی ڕۆژدا، لەمزگـەوت بووم، لەخزمـەتی حـەزەتـدا (دروودی خودای لەسەربێ) فـەرمووی: ئـەی ئـەبو ذەڕ! دەزانی کە خۆر لەکوێ ئاوا دەبێ؟ گوتم: خـوداو پێغەمبـەری خـودا بـاش دەزانن، فەرمووی: ئەم خۆرە هەروا دەڕوات، هەموو ڕۆژێ ئەمە ئیشیەتی دەچێت لەژێر عەرشا کوڕنووشو نـووچ دەبـاو داوا دەکاتـەوە لـەخودا کـە دیـسانەوە ڕێگـەی پـێ بداتـەوە تـا لەشـوێنی خۆیـەوە جـارێکی تـریش هەڵبێتـەوە، هـەر لەکڕنووشـدا دەبـێ خـودا ڕێگـەی پـێ دەداو سـەرلەنوێ، وەك جاری جاران لەشوێنی خۆیەوە هەڵ دێتەوە بەڵام هاکا ئەو ڕۆژەهات کە خۆر دەچێ وەك جاران کوڕنووش دەباو لێـی قـەبووڵ ناکرێو داوای ڕوخصەت دەکا وەك جاران لەشوێنی خۆیـەوە هـەڵ بێتـەوە خـودا ڕێگـەی ئەوەی پێ ناداو دەفـەرموێ پـێی: بەسـەر شـوێنی خۆتـا ڕێـك بگـەڕێرەوە

---

[٢] بخاري. تفسير: ٤٨٠٢.

دواوە، لەوشوێنەوە هەڵبێ کەلێی ئاوابووی! ئیتر خۆر لەخۆرئاواوە هەڵ دێ، مەبەست ئەمەیە لەو فەرموودەی خودایە کە دەفەرموێ: {وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ} (٣٦/٣٨) واتە: خۆر لەسەر ئەم یاسای هاتوچۆی خۆیە هەموو ڕۆژێ بەرێك و پێکی دێ و دەچێ و لەخۆرئاواوە هەڵ دێ و لەخۆرئاواوە ئاوا دەبێ (ب/ت). لێرەدا عەرزم ئەمەیە: مامۆستا مەلا ڕەشید (پڕ گۆڕی پیرۆزی لە نووری قورئان و نووری حەدیثی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بێ) لە ئەشراطوفیتەن، لەبەرگی سێیەمی مەجموعولبەحرینەکەیدا، بەجوانی ڕاڤەی ئەم فەرموودەیەو ئەم ئایەتەی ڕوون کردۆتەوە.

دانەری تاجیش (تاجی نووری خودای لەسەرکرێ) لێرەدا لەشەرحەکەدا دەفەرموێ: (وفي رواية: سألت رسول الله (صلى الله عليه وسلم) عن هذه الآية: فقال: مستقرها تحت العرش، هذا ماقالوه. وفي النفس منه شيء، فان الشمس في السماء الرابعة والعرش أعظم مخلوق، يعلو الملك والملكوت، ولكننا نؤمن بهذا، ونفوض امره الى الله ورسوله (صلى اللّٰهُ تَعَالَى عليه وسلم) واتە: لەگێڕانەوەیەکا: دەڵێ: لە حەزرەتم پرسی مەبەستی ئەم ئایەتە چییە؟ فەرمووی: جێگە ستاری گۆی خۆر (واتە: قورسی ڕۆژ) لەژێر عەرشدایە) (موسلیم).

دانەر ڕای خۆی (کەبۆنی ڕەخنەی لێ دێ لەم ریوایەتە) ئاوا دەردەبڕێ: ئەمەی گوترا فەرموودەی پێشینانە بۆئەم فەرمایشتە، بەڵام دڵ بەمە ئاو ناخواتەوە، چونکە گۆی خۆر لەناو ئاسمانی چوارەمدایەو عەرش و بارەگای خودا لەهەموو شتێکی دروسکراو گەورەترەو لەسەروو هەموو موڵك و مەلەکووتەوەیە، دەی چۆن خۆر لەژێر عەرشایە، لە سەروو خۆرەوە سێ ئاسمانی تر هەیە، کورسی هەیە، بەڵام هەر چۆنێ بێ ئێمە بەقسەی ئەو زاتانە باوەڕ دەکەین و کاروباری خۆمان دەسپێرین بەخوداو بەپێغەمبەری خودا. مەبەستی دانەر ئەمەیە: ئێمە بەفەرمایشتی دین پتر متمانەمان هەیە تا بەچاوو هۆشی خۆمان!.

مەبەستم ئەمەیە کە خوێنەری هێژا دڵنیا بێ، کە زاناکان شت نییە چاریان بۆ دانەنابێ، فەرمایشتەکەی کە مامۆستا مەلا ڕەشید خاڵێکی گەلێ گرنگی تیایە کە دەفەرموێ: حوکمەمای ئێستە ئینکاری ئاسمانەکان ئەکەن، ئاسمانیان لەلا نییە، چونکی تەماسیان ناکەن، ئاسمانەکانیش ئەوەندە لەطیفن لەهەوا لەطیف ترن بەچاوو دووربین نەیان بینیوە! تەماشای دووپەڕە لەمەپێش بکە:

(یاسین تەواو بوو، صافات بای باڵیان

دەدەن، ئامادەن بۆ کارو حاڵیان:

ئەی گەورە شاری هێلانەی تاوان!

مۆڵەی لێ داوی دڕەندەی کێوان!!

بەنووکی قەڵەم، بەجووڵەی لێوان

شارێ دەکەیتە خۆراکی دێوان!!

نۆرەی ئێمەیە ژێرەو ژوورتان کەین

ڕەهەعەنەی ئاخی ناو تەنوورتان کەین

بەقاوەڵتوونی ئاگری سوورتان کەین

یا بە خۆراکی مارو مووریتان کەین!!)(*)

---

(*) ئەم شیعرانە بەهۆی کیمیابارانی هەڵەبجەوە گوتراوە، رەقابەی بەغدا، مێژووەکەو چەن دێڕێکی لێ لابردووە، وەك لەجەنابی (مامۆستا شێخ محمد عەلی قەرەداغی)م بیستووە، کتێبەکانی من ئەوەی لەبەغدا چاپ دەکران، رەقابە دەیدان بە (شوکر مصطفی)و (جمیل رۆژبەیانی) بۆ تەماشاکردنیان، ئەوانیش خوا هەقە ئەوەی بۆنی دژی رژێمو بەعسی لێ بهاتبایە (حذفیان) دەکرد. سوپاس بۆخودا کەئەم تنبأە هاتە دی.

وەرگێڕ – ٢٠٠٨/١/٢٠ - سلێمانی

# ٢٠- سوورەتی صافات

## (مەكییە، سەدو هەشتاو دوو ئایەتە)

## سورة الصافات (مكية، وهي مائة واثنتان وثمانون آية)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤٠٦١- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضي الله عنه) عَنْ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قال: «مَا مِنْ دَاعٍ دَعَا إِلَى شَيْءٍ إِلاَّ كَانَ مَوْقُوفًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ لاَزِمًا لَهُ لاَ يُفَارِقُهُ وَإِنْ دَعَا رَجُلٌ رَجُلاً». ثُمَّ قَرَأَ قَوْلَ اللَّهِ تعالى: (وَقِفُوهُمْ إِنَّهُمْ مَسْئُولُونَ مَا لَكُمْ لاَ تَنَاصَرُونَ)[1].

ئەنەسی کوڕی مالیك (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر بانگکەرێ خەڵك بانگ بكا بۆ پەرستنی هەر شتێ، لەڕۆژی قیامەتدا ئەوشتە پەرستراوە ڕادەوەستێنرێو ئەو بانگکەرە دەلكێ پێیەوەو لێی جوێ نابێتەوە، تەنانەت ئەگەر پیاوێ لەدنیادا پیاوێتر بپەرستێ لەڕۆژی قیامەتدا دەلكێ پێیەوەو لێی جیانابێتەوە! ئەوجا ئەم گوتە پیرۆزەی خوای گەورەی خوێندەوە: {وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْئُولُونَ، مَا لَكُمْ لَا تَنَاصَرُونَ} (٣٧/٢٤-٢٥) واتە: جا خودا فەرمان دەدا بەفریشتەکانو دەفەرموێت: ئەو کافرە ستەمکارانە خۆیانو هاووێنەکانیان لە بتپەرستەکان گرد بکەنەوەو لەگەڵ ئەو بتانەدا کە دەیانپەرستنو گوێیان بەخودا نەدەدا، جا ڕێگەی دۆزەخیان نیشان بدەنو ڕایان بگرن، بەڕاستی ئەوانە بەر پرسیارانو پرسیاریان لێ دەکرێ. ئەوە چیتانە بۆ وەکوو جیهان پشتی یەکتری ناگرنو ئاوا سەر شۆڕو کزو داماون؟ (ت-سەنەدەکەی غەریبە).

٤٠٦٢- عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فِي قَوْلِ اللَّهِ (وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُ هُمُ الْبَاقِينَ) قَالَ «حَامٌ وَسَامٌ وَيَافِثُ». رواهما الترمذي[2].

---

[1] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

[2] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

سەمووره (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لەبارەی ئەم ئایەتەوە: {وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُ هُمْ الْبَاقِينَ} (٧٧/٣٧) واتە: تەنیا نەوەو وەچەی نووحمان لەسەر زەویدا هێشتەوە گوتی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: نەوەکەی ئەم سێ کوڕەی بوون: حامو سامو یافیث، ئیتر لەوانەوەی هەرچی مرۆڤ بوو کەوتوونەتەوە (ت-س/ح).

٤٠٦٣- لەپێشەوە ڕەت بوو، فەرموودەی ژمارە سێ، لەسەر باسی (فضل العرب والحجاز)[٣].

٤٠٦٤- ئایەتەکەو فەرموودەکە لە (كتاب النبوة)دا ڕابورد لەسەر باسی (یونس وزكريا صلى الله عليهما وسلم)دا[٤].

٤٠٦٥- قالَ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ (رضي الله عنه) سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَنْ قَوْلِ اللَّهُ تَعَالَى (وَأَرْسَلْنَاهُ إِلَى مِائَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ) قَالَ «عِشْرُونَ أَلْفًا». رواه الترمذي بسند غريب[٥].

ئوبەیی کوڕی کەعب (خودای لێ رازی بێ) گوتی: بۆئەم ئایەتە: {وَأَرْسَلْنَاهُ إِلَى مِئَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ} (١٤٧/٣٧) لە حەزرەتم پرسی: خودا دەفەرموێ یوونس پێغەمبەرم ڕەوانە کرد بۆ سەرگەلێ کە ژمارەیان سەد هەزار کەس بوونو بەڵکوو لەو ژمارەیش زیاتر بوون، ئایا ئەو زیادەیە چەند بووە؟ فەرمووی: (بیست هەزار بوو!).

صافاتو صادو زومەڕو مونمین

بوونەتە مایەی خۆشی هەردوو ژین

بۆ ئافرەتی باش، بۆ پیاوی بەدین

بۆ ئێمەش، ئەگەر خواناسو مەردین

---

[٣] تقدم في المجلد الخامس. تسلسل/٧٠ رقم: ٣/٣٥٦٠.

[٤] تقدم في المجلد الرابع تسلسل١١٨ رقم: ٢/٣٢١٥.

[٥] حديث غريب عند الترمذي.

## ٢١- سوورەتی (ص)

### (لەسوورەتە مەکەییەکانە، هەشتاو شەش یا هەشتاو هەشت ئایەتە)

### سورة (ص) (مكية وهي ست أو ثمان وثمانون آية)

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤٠٦٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) قَالَ مَرِضَ أَبُو طَالِبٍ فَجَاءَتْهُ قُرَيْشٌ وَجَاءَهُ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) وَعِنْدَ أَبِي طَالِبٍ مَجْلِسُ رَجُلٍ واحِدٍ فَقَامَ أَبُو جَهْلٍ كَيْ يَمْنَعَهُ وَشَكَوْهُ إِلَى أَبِي طَالِبٍ فَقَالَ يَا ابْنَ أَخِي مَا تُرِيدُ مِنْ قَوْمِكَ؟ قَالَ: «إِنِّي أُرِيدُ مِنْهُمْ كَلِمَةً وَاحِدَةً تَدِينُ لَهُمْ بِهَا الْعَرَبُ وَتُؤَدِّي إِلَيْهِمُ الْعَجَمُ الْجِزْيَةَ». فَقَالَ: كَلِمَةً وَاحِدَةً قَالَ: «كَلِمَةً وَاحِدَةً». فَقَالَ: كَلِمَةً وَاحِدَةً، يَا عَمِّ يَقُولُوا: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ». فَقَالُوا إِلَهًا وَاحِدًا (مَا سَمِعْنَا بِهَذَا فِي الْمِلَّةِ الآخِرَةِ إِنْ هَذَا إِلاَّ اخْتِلاَقٌ) قَالَ فَنَزَلَ فِيهِمُ الْقُرْآنُ (ص وَالْقُرْآنِ ذِي الذِّكْرِ بَلِ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي عِزَّةٍ وَشِقَاقٍ) إِلَى قَوْلِهِ (مَا سَمِعْنَا بِهَذَا فِي الْمِلَّةِ الآخِرَةِ إِنْ هَذَا إِلاَّ اخْتِلاَقٌ). رواه الترمذي[1].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەبو تاڵیب نەخۆش بوو، گەورە پیاوەکانی خێڵی قورەیش دەستە دەستە دەچوون بۆلای بۆ سەرلێدانی و هەواڵپرسی. هەروا پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) چوو بۆلای بۆ هەواڵپرسی، لەلای ئەبوتاڵیب دا جێگەی دانیشتنی تاقە زەلامێ هەبوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ویستی لەو شوێنە دا دانیشت، بەڵام ئەبو جەهل هەڵسا کە نەیهێڵێ لەوێ دابنیشێ! ئیتر کۆمەڵانی قورەیش دەستیان کرد بە سکاڵای حاڵی خۆیان، لەلای ئەبوتاڵیب، لەدەست پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە برازایەتی، ئەبو تاڵیب گوتی: ئەی برازای خۆم تۆ چیت دەوێ لەهۆزی خۆت؟ داوای چی لەم خزمانە دەکەی؟ فەرمووی: من تاقەیەك ووشەم لەوان دەوێ، کەدەبێ بەکلیلی پیرۆزیی، کەبەهۆی ئەو تاقە ووشەیەوە هەرچی عەرەب هەیە ملکەچ دەبن بۆیان و عەجەم و غەیری عەرەبیش سەرانەیان پێ دەدەن! ئەبو تاڵیب

---

[1] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

گوتی: تاقەیك ووشە ئەو تاقە ووشەیە چییە کەدەبێ بەسەرمایەی ئەم هەموو خێرو بێرە؟ فەرمووی: بەڵێ! ئەی مامی خۆم! تاقە یەك ووشەم دەوێ لێیان ئەوەیە کە بڵێن: (لا إله إلا الله) ئەوانیش گوتیان: تاقە یەك خودا!! قسەی وا شتێکی تازە قەڵاّیەو لەم چەرخە دواییەدا نەمان بیستووە، ئەمە بێ‌و نەبێ درۆو دەلەسەیەو هیچی تر، جا لەشانی ئەوانەدا ئەم ئایەتانە هاتنە خوارەوە {ص وَالْقُرْآنِ ذِي الذِّكْرِ، بَلِ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي عِزَّةٍ وَشِقَاقٍ} هەتا دەگاتە: {مَا سَمِعْنَا بِهَذَا فِي الْمِلَّةِ الْآخِرَةِ إِنْ هَذَا إِلَّا اخْتِلَاقٌ}. (ت-س/ح).

٤٠٦٧- ← (ب/١ ز/١١٨ ل/٣٦٠ ف/١٥)[٢].

٤٠٦٨- ← (ب/١ ز/٤٤ ل/١٨٨ ف/١ + ب/١ ز/١٢٢ ل/٣٧٢ ف/٦)[٣].

٤٠٦٩- قَالَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رضي الله عنه)، يَا أَيُّهَا النَّاسُ مَنْ عَلِمَ شَيْئًا فَلْيَقُلْ بِهِ، وَمَنْ لَمْ يَعْلَمْ فَلْيَقُلِ اللَّهُ أَعْلَمُ، فَإِنَّ مِنَ الْعِلْمِ أَنْ يَقُولَ لِمَا لاَ يَعْلَمُ اللَّهُ أَعْلَمُ، قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ لِنَبِيِّهِ (صلى الله عليه وسلم) (قُلْ مَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُتَكَلِّفِينَ). رواه البخاري والترمذي[٤].

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود (خودای لێ ڕازی بێ) دەیگوت: ئەی موسوڵمانینە! ئەوەی شتێ دەزانێ بابیڵێ‌و نەترسێ‌و بەپێی پلەی زانینی خۆی حوکمی پێ بکا، وە ئەوەی کەشتێ نازانێ با بڵێ: نازانم، خودا خۆی ئەمە باشتر دەزانێ، چونکە ئەگەر کەسێ شتێ نەزانێ‌و ئاوا بڵێ، ئەم قسەیەش بەشێکە لەزانین چونکە: نەزان ئەو کەسەیە کە بەغەڵەت فەتوابداو شتێ نەزانێ‌و بڵێ دەیزانم خودا لەم بارەیەوە

---

[٢] تقدم في المجلد الأول. تسلسل/١١٨ برقم: ٧٢٠/١٥.

[٣] تقدم في المجلد الأول. تسلسل/٤٤ برقم: ٣٣٧/١.

[٤] بخاري. تفسير: ٤٨٠٩.

بەپێغەمبەری خۆی دەفەرموێ: {قُلْ مَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُتَكَلِّفِينَ} (٣٨/٨٦) (ب/ت).

**خودا لە (زومەر)ی دووەمی زومەر**

**حەشربین لەگەڵ ئۆمەتی سەروەر**

## ٢٢- سوورەتی زومەر

**(حەفتاو پێنج ئایەتە)**

**سورة الزمر (مكية، الا بضع آيات وهي خمس وستون آية)**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤٠٧٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ (رضي الله عنهما) قَالَ لَمَّا نَزَلَتْ (ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عِنْدَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ) قَالَ الزُّبَيْرُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَتُكَرَّرُ عَلَيْنَا الْخُصُومَةُ بَعْدَ الَّذِي كَانَ بَيْنَنَا فِي الدُّنْيَا قَالَ «نَعَمْ». فَقَالَ إِنَّ الأَمْرَ إِذًا لَشَدِيدٌ. رواه الترمذي[1].

**کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: {ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عِندَ رَبِّكُمْ تَخْتَصِمُونَ} (٣٩/٣١). تۆوئەوان لەڕۆژی قیامەتدا لە حوزووری خودای خۆتان دەوەستن‌و دەبێ بەدەمە قاڵ‌و بەربەرکانێتان، تۆ دەڵێی من ئەرکی سەرشانی خۆمم بەجێ هێناوە ئەوانیش دەڵێن حاشا هیچی بەئێمە ڕانەگەیاندووە. عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا جارێکی تریش لەقیامەتدا ناکۆکی‌و بەربەرەکانێ ڕوو دەداتەوە لەنێوانی ئێمەو ئەواندا، لەپاش ئەمەی کە لەجیهاندا ڕووی داوە لەنێوانماندا؟ فەرمووی: بەڵێ. گوتی: وادیارە ئیشەکە گەلێ دشوارو ناهەموارو سەختە (ت-س/ح) مامۆستای مەزن، مامۆستا مەلا عەبدولکەریم، خودا پایەدار تری بکا، لەتەفسیری نامی زێڕیندا، ئەم ڕستەیەی دوایی ئاوا تەرجەمە کردووە: قال: نعم، فقال: ان الأمر اذن لشديد: ئەویش فەرمووی: کاتێ ئەوە ڕووئەدا کاری**

---

[1] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

ئادەمیزاد لەو ڕۆژەدا دشوارو ناهەموارە. جا نازانم ئەمە ڕیوایەتێکی تری ئەم حەدیثەیە، یا هەمان حەدیثەو مەقوولی هەردوو (قال)ەکەی بەفەرمایشتی حەزرەت داناوە، بەلاّم من بەبیری خۆم وا دەزانم مەقوولی (قال)ەی دووەم عەبدوڵلا بێ نەك حەزرەت. (وەرگێڕ)

٤٠٧١- ← (لەتەفسیری سوورەتی نیسادا ڕابوورد، فەرموودەی حەڤدەهەم). لەگێڕانەوەی ئێرەدا ئاوایە: ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: گەلێ لەبتپەرستەکان، خەڵکێکی زۆریان کوشتبوو، وەزیناو داوێنپیسیزۆریان کردبوو، جا بەپێی خۆیان هاتنە لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) گوتیان: ئەمەی تۆ دەیڵێیت و خەڵك بانگ دەکەی بۆی شتێکی زۆر جوان و شیرینە، بەلاّم خۆت دەزانی ئێمە حاڵەکەمان وایە، جا ئایا ئەم کردەوە خراپانە کە ئێمە کردوومانە، کەففارەت و بڕێتی و پاکبوونەوەیان بۆهەیە یانا؟ جا بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتە دابەزی: {وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ} هەروەها ئەم ئایەتەی تریش دابەزی: {قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا} (٥٣/٣٩) واتە: ئەی موحەممەد! ئەی خۆشەویست! بفەرموو بەبەندەگانی من لەسەر زمانی خۆم: ئەی بەندەیینە! ئەی ئەو کەسانەی کەستەمو تاوانێکی زۆرتان کردووەو باری دواڕۆژی خۆتان گران و دژوار کردووە، نائومێد مەبن لە ڕەحمەتی خودا، ئەگەر ئێوە بەڕاستی ڕوو لەخوداکەن و خۆتان فڕەبدەنە قاپی ئەوپاشا گەورەیە ئەویش لەهەمووتاوانەکانتان خۆش دەبێ. (بوخاری –هەزار ڕەحمەت لەگۆڕی نازداری)[٢].

٤٠٧٢- وللترمذي: قَرَأَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم): {وَلَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ}. ولا يبالي[٣].

---

[٢] تقدم برقم: ٣٧٩٥/١. مجلد سادس. تسلسل/٥.

[٣] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

تیرمیزی (خودای لێ رازی بێ) بەسەنەدێکی حەسەن دەگێڕێتەوە: جارێ حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: {لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا} هیوا بڕاو مەبن لەڕەحمەتی خودای میهرەبان، بەڕاستی خودای گەورە، ئەگەر خواستی هەبێ لەهەموو گوناهێ خۆش دەبێ. جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بەشوێن خوێندنەوەی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا فەرمووی: وەهەر باکیشی نییە! (ت-س/ح).

٤٠٧٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رضي الله عنه) قَالَ جَاءَ حَبْرٌ مِنَ الأَحْبَارِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ يَا مُحَمَّدُ، إِنَّا نَجِدُ أَنَّ اللَّهَ يَجْعَلُ السَّمَوَاتِ عَلَى إِصْبَعٍ وَالأَرَضِينَ عَلَى إِصْبَعٍ، وَالشَّجَرَ عَلَى إِصْبَعٍ، وَالْمَاءَ وَالثَّرَى عَلَى إِصْبَعٍ، وَسَائِرَ الْخَلاَئِقِ عَلَى إِصْبَعٍ، فَيَقُولُ أَنَا الْمَلِكُ. فَضَحِكَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ تَصْدِيقًا لِقَوْلِ الْحَبْرِ ثُمَّ قَرَأَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) (وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ). رواه الشيخان والترمذي[٤].

عەبدوڵڵا (خودای لێ رازی بێ) گوتی: یەکێ لەزانا گەورەکانی جوولەکە هاتە لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) گوتی: ئەی موحەممەد! لەتەوراتی ئێمەدا هەیە: کە خودا لە ڕۆژی قیامەتدا ئاسمانەکان دادەنێ لەسەر پەنجەیێ و زەوییەکان دادەنێ لەسەر پەنجەیێ و دارو درەخت دادەنێ لەسەر پەنجەیێ و ئاوو خاك دادەنێ لەسەر پەنجەیێ و هەموو دروستکراوەکانی تریش دادەنێ لەسەر پەنجەیێ واتە: بوونەوەر، سەرو خواری بەدەستی قودرەتی وەك تۆپێ دەگرێ و ئەوەجا بۆنواندنی جەبرەو شان و شکۆی خۆی و بەیانی یەکتایی خۆی و بێ نموودی پادشاو قڕاڵەکانی جیهان، دەفەرموێ: پادشا هەر خۆمم پادشاکانی سەرزەمین و ناو جیهان کوان؟ لەکوێن؟

---

[٤] بخاري. تفسير: ٤٨١١، ٧٤١٤، ٧٤١٥، ٧٤٥١، ٧٥١٣ = ١٦٨٩ تجريد ٤٨٣/٤ مسلم. صفات المنافقين: ٦٩٧٧ ترمذي. تفسير القرآن: ٣٢٣٨.

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) بۆ پشتیوانی قسەی مالوومەکە وەها پێکەنی، ددانەپێشینەکانی وەردەکەوتن، لەپاشا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) ئەمئایەتەی خوێندەوە: (وما قدروا) هەتا (عما يشركون) (ش/ت).

٤٠٧٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) قَالَ مَرَّ يَهُودِيٌّ بِالنَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) «يَا يَهُودِيُّ حَدِّثْنَا». فَقَالَ كَيْفَ تَقُولُ يَا أَبَا الْقَاسِمِ إِذَا وَضَعَ اللَّهُ السَّمَوَاتِ عَلَى ذِهِ وَالأَرَضِينَ عَلَى ذِهِ وَالْمَاءَ عَلَى ذِهِ وَالْجِبَالَ عَلَى ذِهِ وَسَائِرَ الْخَلْقِ عَلَى ذِهْ. وَأَشَارَ أَبُو جَعْفَرٍ مُحَمَّدُ بْنُ الصَّلْتِ بِخِنْصَرِهِ أَوَّلاً ثُمَّ تَابَعَ حَتَّى بَلَغَ الإِبْهَامَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تعالى: {وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ}. رواه الترمذي بسند صحيح[٥].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: پیاوێکی جوولەکە، لەلای پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) ڕابورد، فەرمووی: ئادەی ئەی جووە! قسەمان بۆ بکە. گوتی: ئەی باوکی قاسم! تۆ چی دەڵێیت بۆ ئەوکاتە کە خودا ئاسمانەکان دادەنێ لەسەر ئەم پەنجەیەو زەوی دادەنێ لەسەر ئەم پەنجەیەو ئاو دادەنێ لەسەر ئەم پەنجەیەو کێوەکان دادەنێ لەسەر ئەم پەنجەیەو دروستکراوەکانی تریش دادەنێ لەسەر ئەم پەنجەیە! موحەممەدی کوڕی صەلت لەپێشدا، لە یەکەم ئیشارەتەوە لە پەنجەتووتەی خۆیەوە دەستی کرد بەژماردنی پەنجەکانی و لەگەڵ هەر ئیشارەتێکا پەنجەیەکی خۆی بەڕیز دیاری دەکرد هەتا پەنجە کەڵەی خۆی واتە: مەبەست لەیەکەم ئیشارەت پەنجە تووتەیەو لەدووەم ئیشارەت براتووتەیەو.... تاد. جا خودای گەورە ئەمەی دابەزاند: {وما قدروا الله} هەتا {يشركون} (٦٧/٣٩) واتە: شانو شکۆی خودا گەلێ گەورەو مەزنە، ئەو کافرە دڵو چاو کوێرانە، وەك پێویست بێو شیاوی

---

[٥] صحيح عند الترمذي.

ڕێـزی بارەگـای خوداوەنـدی بـێ ئـاوا قـەدرو ڕێـزی نـازانن، دڵمـردوو چـووزانێ سـۆزو ئەشـق چییەو کـوێری زکمـاك چـووزانێ ڕەنگـی ڕەنگین چییە، میثـالـێ بۆئـەوەی ئێـوە لەگـەورەیی و دەسـتەڵاتی خـودا تـێ بگـەن ئەمەیـە: ئـەم زەوییـە هـەمووی، یـەك مـووی کـەم نـەبێ لەگـەڵ هـەموو ئاسمانـەکانا، وەك گوێـێ، هـەڵماتێ، وایـە لـەناو چـنگی خـودادا، خـودا پاكو بێ گەردو گەلـێ گەورەیەو بەدووره لەم لاژگە لاژگی بتپەرستانە، کە بڕیاری هاوەڵو کوڕو کچو هاوسەری بۆ دەدەن (ت-س/ص).

٤٠٧٤م- وللشَّيخين: «يَقْبِضُ اللَّهُ الأَرْضَ، وَيَطْوِي السَّمَوَاتِ بِيَمِينِهِ، ثُمَّ يَقُولُ أَنَا الْمَلِكُ، أَيْنَ مُلُوكُ الأَرْضِ»[٦].

ئەبو هورەیره (خودای لێ ڕازی بێ) گـوتی: لەپێغەمبەرم (درووودی خودای لەسەربێ) ژنـەوت دەیفـەرموو: خـودا، لـەڕۆژی قیامـەتا گـۆی زەوی دەکـا بـە یـەك چـنگو ئاسمانـەکان بەدەسـتی ڕاسـتی دەپێـچێتەوە ئـەوجا دەفـەرموێ: پادشای بێ هاوشان هەر خۆمم، پادشاکانی زەوی لەکوێن (ش).

٤٠٧٥- (لەباسی تەفسیری سوورەتی ئیبراهیما ڕابوورد. ف/٤)[٧].

قال اللَّهُ تَعَالَى: {وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ إِلَّا مَن شَاء اللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَى فَإِذَا هُم قِيَامٌ يَنظُرُونَ ←}.

٤٠٧٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ «بَيْنَ النَّفْخَتَيْنِ أَرْبَعُونَ». قَالُوا: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ أَرْبَعُونَ يَوْمًا؟ قَالَ: أَبَيْتُ. قَالَ: أَرْبَعُونَ سَنَةً؟ قَالَ: أَبَيْتُ. قَالَ: أَرْبَعُونَ شَهْرًا؟ قَالَك أَبَيْتُ، وَيَبْلَى كُلُّ شَيْءٍ مِنَ الإِنْسَانِ إِلاَّ عَجْبَ ذَنَبِهِ، فِيهِ يُرَكَّبُ الْخَلْقُ. رواه الشيخان[٨].

---

[٦] بخاري. رقائق: ٦٥١٩، ٧٣٨٢. مسلم. صفات المنافقين: ٦٩٨١.

[٧] تقدم برقم: ٣٩٣٦/٤ مجلد سادس تسلسل/١٥.

[٨] بخاري. تفسير: ٤٩٣٥. مسلم. فتن: ٧٣٤٠.

ئـەبو هـورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەربێ) فـەرمووی: لـەم فـوو تـا ئـەو فـوو چلە! یـاران گوتیـان: ئەی ئەبوهورەیرە! مەبەست لەماوەی بەینی دوو فووەکە کە مەشهوورن بە نەفخەتەین کەئەم فەرموودەیـە ئامـاژەی بۆدەکـا چـل ڕۆژە؟ گـوتی: نـازانم، گوتیـان: ئـەی مەبەسـت چـل سـاڵە؟ گـوتی: نـازانم، گوتیـان: ئەی مەبەسـت چـل مانگـە، گوتی: نازانم چونکە من ژمێردراوەکەم لە حەزرەت نەبیستووە کە چییە، لەخۆمـەوە نـاتوانم بڕیـار بـدەم کـە سـاڵە، ڕۆژە، مانگـە، حەفتەیـە، چییە گـوتی: حـەزرت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووشـی: لـەش و ئەنـدام و هـەموو پارچـەکانی جەسـتەی ئـادەمیزادیش هـەمووی دەڕزێ، نـووکی بێخـی جوچـکەی سمتـی نـەبێ کەبەقـەد دەنکـی خەرتەلەیـەك دەبـێ لـەوێوە فریشتەکان بەفەرمانی خودا سەرلەنوێ هەموو کەسێ وەك حاڵی ژیانی دروستـی دەکەنـەوە (ش) لەڕیوایـەتێکی شـەرحەکەدا: دەڵـێ: دەگێڕنـەوە لەئیبنوعـەبباس و حەسـەنەوە (ڕەزای خوایان لێ بێ) کـە پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفـەرموێ: بـەینی دوو فووەکـان چـل سـاڵە، بـەفووی یەکـەم بەفـەرمانی خـودا هـەموو گیانـدارێ دەمـرێ، بـەفووی دووەم بەفـەرمانی خودا هەموو مردوویێ زیندوو دەبێتەوە!.

٤٠٧٧- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رضي الله عنه) عَنْ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: «كَيْفَ أَنْعَمُ وَقَدِ الْتَقَمَ صَاحِبُ الْقَرْنِ الْقَرْنَ وَحَنَى جَبْهَتَهُ وَأَصْغَى سَمْعَهُ يَنْتَظِرُ أَنْ يُؤْمَرَ أَنْ يَنْفُخَ فَيَنْفُخَ». قَالَ الْمُسْلِمُونَ: فَكَيْفَ نَقُولُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «قُولُوا: حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ، عَلَى اللَّهِ تَوَكَّلْنَا».[٩].

ئـەبو سـەعید (خـودای لێ ڕازی بێ) گـوتی: حـەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: من چۆن خۆشـی بکەم و ڕابوێرم، لەکاتێکا کە ئیسرافیل، کە مـەئمووری نـەفخی صـوورە، کەڕەناکـەی نـاوە بـە دەمیـەوەو بەهـەر دوو لێوی گرتوویەتی و تەوێڵی دانەواندووەو گوێی هەڵخستووەو چاوەنوارە

[٩] رواه الترمذي وأبوداود بسندين صحيحين (شرحه).

کە هەردەم فەرمانی پێبکرێ گورج فووی پیا بکاو کۆتایی بەجیهان بینێ!! موسوڵمانەکانیش گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەی ئێمە چی بکەین؟ فەرمووی: بڵێن: (حسبنا الله ونعم الوكيل – على الله توكلنا) (ت/د–س/ح).

٤٠٧٨– وسُئِلَ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) عَنْ الصُّور فقال:«الصُّورُ قَرْنٌ يُنفَخُ فِيهِ». رواهما الترمذي وأبو داود[10].

پرسیار کرا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ): صوور چییە؟ فەرمووی: صوور شاخێکە وەك ئەو بۆریەی کەسەرباز فووی پیادەکەن بۆ کۆ بوونەوەو بڵاو بوونەوە لەڕۆژی قیامەتا فووی پێدا دەکرێ.(ت/د–س/ح).

(مونمین) دوونـاوە زۆر سـوورەتی تـر
هەیەتی چەن ناو لەیەکێ پتر،
بە فوویێ مردووین، بەفوویێ زیندووین
بەبای خوا دەژین گەر نەبوو مردووین
ئەم هەموو بەزمو سەیرو سەمایە
بناغەی لەسەر پڕسی هەوایە!!
سەرم دەرناچێ لەم کارە خوایە!
بوونو نەبوونم گشت بەدەست بایە!!
تازەم زانیوە کەمن شێری بام
پەپوولە پایزەی دەمی ڕەشە بام
پەپولە پایزەی دەمی رەشە با
مەر خوا بزانێ، با بۆ کوێت دەبا

---

[10] رواه الرتمذي وابو داودبسندين صحيحين (شرحه).

# ٢٣- سوورەتی موئمین

## (پێشی دەگوترێ سوورەتی غافیر - مەکییە ٨٥ ئایەتە)

## سورة المؤمن (مكية، وهي خمس وثمانون آية)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤٠٧٩- سُئِلَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو (رضي الله عنه) عَنْ أَشَدِّ مَا صَنَعَه الْمُشْرِكُونَ بِرَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فقَالَ: بَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يُصَلِّي بِفِنَاءِ الْكَعْبَةِ، إِذْ أَقْبَلَ عُقْبَةُ بْنُ أَبِي مُعَيْطٍ، فَأَخَذَ بِمَنْكِبِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَلَوَى ثَوْبَهُ فِي عُنُقِهِ فَخَنَقَهُ خَنْقًا شَدِيدًا، فَأَقْبَلَ أَبُو بَكْرٍ فَأَخَذَ بِمَنْكِبِهِ، وَدَفَعَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَقَالَ (أَتَقْتُلُونَ رَجُلاً أَنْ يَقُولَ رَبِّيَ اللَّهُ وَقَدْ جَاءَكُمْ بِالْبَيِّنَاتِ مِنْ رَبِّكُمْ). رواه البخاري[1].

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خودایان لێ ڕازی بێ) پرسیار کرا: ناخۆشترین شت کە بتپەرستەکان دەربارەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) کردیان چی بوو؟ گوتی: جارێ، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لەحەوشەی کەعبەدا نوێژی دەکرد، عوقبەی کوڕی ئەبو موعەیط پەیدا بوو، سەر شانی پێغەمبەری گرت و جلەکەی توند لوول دا لەگەردنیاو تەواو تاساندی! ئەبوبەکریش هات قۆڵێ عوتبەی گرت و لەکۆڵی پێغەمبەری کردەوەو گوتی: {أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّيَ اللَّهُ وَقَدْ جَاءَكُم بِالْبَيِّنَاتِ مِن رَّبِّكُمْ} (٣٨/٤٩). واتە: لەسەرچی ئەم پیاوە باشەیە دەکوژن؟ لەسەر ئەوە کەخودای ڕاست و دروست بەخوای خۆی دەزانێ، وە بۆ دامەزراندن و سەلماندنی داوای خۆی موعجیزەو بەڵگە گەلێکی زۆر ڕۆشن و ئاشکرای لەلایەنی خودای ئێوەوە پێ دراوە، کەبەچاوی خۆتان دەیان بینن (ب).

٤٠٨٠- عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ (رضي الله عنه) عَنْ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: «الدُّعَاءُ هُوَ الْعِبَادَةُ». ثُمَّ قَرَأَ (وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ). رواه الترمذي[2].

---

[1] بخاري. تفسير: ٤٨١٥.

[2] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

**نوعمانی کوڕی بەشیر** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: دووعاو موشتەققاتی ووشەی دووعا لە قورئاندا بەمەعنا عیبادەتو پەرستنە. جا حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **بۆ سەلماندنی ئەم مەسەلەیە، کە دووعا بە مەعنا عیبادەتە، ئەم ئایەتەی خوێندەوە: {وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ} (٤٠/٦٠) واتە: پەروەردگاری ئێوە فەرموویەتی: هاوار لەخۆم بکەن، پەنا هەر پەنای منە، پەنای تر نییە، کەواتە ئەگەر ئێوە پەنا بۆمن بێنن‌و بەندەیی ساغ بۆمن بکەن، ئەوا منیش دێم بەهاوارتانەوەو پەناتان دەدەم، وەلێ ئەو بێ هۆش‌و گۆشانەی کەلەبەر فیزو دەعیە زلی بێز لەبەندەیی من دەکەنەوە، ئەوانە زۆر بەکەساسی‌و داماوی سەری خۆیان شۆڕ دەکەن‌و دەچنە ناو گەوڕەکانی دۆزەخەوە! (ت-س/ص).**

**(فصلت) واتە: جیاجیاو سەربەخۆ**

**نەک تێکەڵ- پێکەڵ، وەکوو گەنم‌و جۆ**

**واتە: نامەیێ دانار دانارە**

**لەفظی وەک مەعنای ڕێک‌و نازارە!!**

## ٢٤- سوورەتی (فصلت)

**(مەکییە ٥٣ ئایەتە)**

**سورة فصلت (مكية، وهي ثلاث وخمسون آية)**

**بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ**

**٤٠٨١- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ** (رضي الله عنه) **قَالَ: اجْتَمَعَ عِنْدَ الْبَيْتِ قُرَشِيَّانِ وَثَقَفِيٌّ (أَوْ ثَقَفِيَّانِ وَقُرَشِيٌّ) كَثِيرَ شَحْمُ بُطُونِهِمْ قَلِيلَةٌ فِقْهُ قُلُوبِهِمْ فَقَالَ أَحَدُهُمْ: أَتُرَوْنَ أَنَّ اللّٰهَ يَسْمَعُ مَا نَقُولُ قَالَ الآخَرُ: يَسْمَعُ إِنْ جَهَرْنَا وَلاَ يَسْمَعُ إِنْ أَخْفَيْنَا. وَقَالَ الآخَرُ: إِنْ كَانَ يَسْمَعُ إِذَا جَهَرْنَا فَإِنَّهُ يَسْمَعُ إِذَا أَخْفَيْنَا فَأَنْزَلَ اللّٰهُ عَزَّ وَجَلَّ (وَمَا كُنْتُمْ**

تَـسْتَتِرُونَ أَنْ يَـشْهَدَ عَلَـيْكُمْ سَـمْعُكُمْ وَلاَ أَبْـصَارُكُمْ وَلاَ جُلُـودُكُمْ) الآيَـةَ. رواه الشيخان والترمذي:[1].

عەبـدوڵڵا (خـودای لێ ڕازی بێ) گـوتـی: لـەلای بـەیتا، دوو قورەیـشی و یـەك ثـەقـەفی، یـا دوو ثـەقـەفی و یـەك قورەیـشی كۆدەبنـەوە، بەلـەش قەبـەو قەڵەوو فیلەتـەن، بـەدڵ كـەو دەن و نـادان، یـەكێكیان دەڵـێ: ئایا ئێوە لـەو باوەڕەدەكـەن كـە خـودا گـوێی لێیـە، ئێمـە چـی دەڵـێین؟ یـەكێكی تریـان دەڵـێ: ئەگـەر بـە دەنگـی بـەرز قـسە بكـەین دەیبیـستێ، بـەڵام ئەگـەر بەپـەنهانی قسەبكەین نایژنـەوێ! ئـەوی تریـشیان دەڵـێ: ئەگـەر بـەدەنگی بـەرز قسەبكەین گـوێی لـێ بێ، بەپـەنهانیش قسەبكەین هـەر گـوێی لـێ دەبێ، جا خودای گەورەومەزن ئەمەی نـارد: {وَمَا كُنتُمْ تَـسْتَتِرُونَ أَنْ يَـشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَا أَبْصَارُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ وَلَكِن ظَنَنتُمْ أَنَّ اللَّهَ لَا يَعْلَمُ كَثِيرًا مِّمَّـا تَعْمَلُونَ } (٤١/٢٢). (ش/ت).

## ٢٥- سوورەتی شوورا

### (لەسوورەتە مەكییەكانە تەنیا چوار ئایەتی نەبێ، ٣٥ ئایەتە)

### سورة الشورى (مكية إلا أربع آيات وهي ثلاث وخمسون آية)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤٠٨٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رضي الله عنهما) قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُـولُ اللَّـهِ (صلى الله عليه وسلم) وَفِي يَدِهِ كِتَابَانِ فَقَالَ: «أَتَدْرُونَ مَا هَذَانِ الْكِتَابَـانِ». فَقُلْنَـا لاَ يَـا رَسُولَ اللَّهِ إِلاَّ أَنْ تُخْبِرَنَا. فَقَالَ لِلَّذِى فِي يَدِهِ الْيُمْنَى «هَذَا كِتَابٌ مِنْ رَبِّ الْعَالَمِينَ فِيهِ أَسْمَاءُ أَهْلِ الْجَنَّةِ وَأَسْمَاءُ آبَائِهِمْ وَقَبَائِلِهِمْ ثُمَّ أُجْمِلَ عَلَى آخِرِهِمْ فَلاَ يُزَادُ فِيهِمْ وَلاَ يُنْقَصُ مِنْهُمْ أَبَدًا». ثُمَّ قَالَ لِلَّذِى فِي شِمَالِهِ: «هَذَا كِتَابٌ مِنْ رَبِّ الْعَالَمِينَ فِيهِ أَسْمَاءُ أَهْلِ النَّارِ وَأَسْمَاءُ آبَائِهِمْ وَقَبَائِلِهِمْ ثُمَّ أُجْمِلَ عَلَى آخِرِهِمْ فَلاَ يُزَادُ فِيهِمْ وَلاَ

---

[1] بخاري. تفسير: ٤٨١٦، ٤٨١٧، ٧٥٢١. مسلم: صفات المنافقين: ٦٩٦٠. ترمذي. تفسير القرآن:٣٢٤٨.

يُنْقَصُ مِنْهُمْ أَبَدًا». فَقَالَ أَصْحَابُهُ فَفِيمَ الْعَمَلُ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنْ كَانَ أَمْرٌ قَدْ فُرِغَ مِنْهُ؟ فَقَالَ: «سَدِّدُوا وَقَارِبُوا فَإِنَّ صَاحِبَ الْجَنَّةِ يُخْتَمُ لَهُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ وَإِنْ عَمِلَ أَيَّ عَمَلٍ وَإِنَّ صَاحِبَ النَّارِ يُخْتَمُ لَهُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ وَإِنْ عَمِلَ أَيَّ عَمَلٍ». ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بِيَدَيْهِ فَنَبَذَهُمَا ثُمَّ قَالَ: «فَرَغَ رَبُّكُمْ مِنَ الْعِبَادِ فَرِيقٌ فِي الْجَنَّةِ وَفَرِيقٌ فِي السَّعِيرِ». رواه الترمذي في القدر[1].

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هات بۆ ناومان، دوو کتێبی بەدەستەوە بوو، فەرمووی: ئایا دەزانن کەئەم دوو کتێبە چین؟ گوتمان: خەیر! ئەی پێغەمبەری خودا! مەگەر خۆت پێمان بفەرموویت، ئەوجا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) بەونامەیەیان کەلە دەستی ڕاستی دابوو فەرمووی: ئەمەیان نامەیەکە لەلایەنی خودای هەموو جیهانەوە، ناوی هەموو بەهەشتییەکانی تێدایە، ناوی خۆیان و ناوی باوباپیریان و ناوی عێلو تیرەو هۆزیانی یەك بە یەك تێدایە، سەرتاپا دیاری کراون، هەتا هەتایە هەر ئەوەندە دەبن، نەکەم دەکەن و نەزۆرتر دەبن! وە بەونامەشیان کەلەدەستی چەپی دابوو فەرمووی: ئەمەی تریشیان نامەیەکە لەلایەنی خودای هەموو جیهانەوە، ناوی هەموو دۆزەخییەکانی تێدایە، ناوی خۆیان و ناوی باو باپیریان وناوی عێڵو تیرەو هۆزیانی یەك بەیەك تێدایە، سەرتاپا دیاری کراون، هەتا هەتایە هەر ئەوەندە دەبن نەکەم دەکەن و نەزۆر دەبن یارانیش عەرزیان کرد: قوربان! کەوابێ و هەر لەسەرەتاوە چارەنووسی هەموو کەسێ دیاری کرابێ کە بەهەشتییە، یا دۆزەخییە، ئیتر ئێمە بۆچی خۆمان ماندوو بکەین و کارو کردەوە لەپای چی؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): کاری پاك و پوخت بکەن و بۆ کردنی چاکە کۆتایی مەکەن و چەندەی لەدەستتان دێ هەوڵی باشە بدەن، لەڕاستی دا شتەکە خۆی ئاوایە: ئەوەی لەبنەڕەتەوە بەبەهەشتی دانرابێ

[1] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

سەرەنجام دەگەڕێتەوە سەرکاری باش‌و خوداناسی، کە نیشانەی ئەوەیە خاوەنەکەی بەهەشتییە، ئیتر گریمان لەوەو بەر هەر کارێکی کردبێ کار لەم سەرەنجامە ناکات، هەروەها ئەوەی لەسەرەتاوە بەئەهلی دۆزەخ لەقەڵەم درابێ، سەرەنجام بادە داتەوە بۆ سەرکاری خراپ‌و بێ شەرعی، ئیتر لەوەو بەر هەرکارێکی کردبێ کار لەم سەرەنجامە ناپەسەندەی ناکات.

ئەوجا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) هەردوو دەستی خۆی هەڵتەکاندو دوو کتێبەکەی هەڵ داو فەرمووی: خودای پەروەردگاری ئێوە لە مێژەوە چارەنووسی هەریەکێ لەئێوەی دیاری کردووەو لەو مەسەلەیە بۆتەوە. ئەوجا بۆ پشتیوانی‌و ڕاستی‌و دروستی فەرموودەکەی خۆی ئەم ئایەتەی‌خوێندەوە: {فَرِيقٌ فِي الْجَنَّةِ وَفَرِيقٌ فِي السَّعِيرِ} (٤٢/٧) واتە: لەو ڕۆژەدا تاقمێ وان لەبەهەشتاو، تاقمێ وان لەناو دۆزەخا! (ب-س/ص).

٤٠٨٣- ئەم فەرموودەیە لەپێشەوە ڕابورد، لەباسی (مناقب أهل البيت)دا فەموودەی یەکەم [٢].

٤٠٨٤- عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) ((سِتَّةٌ لَعَنْتُهُمْ لَعَنَهُمُ اللَّهُ وَكُلُّ نَبِيٍّ كَانَ: الزَّائِدُ فِي كِتَابِ اللَّهِ وَالْمُكَذِّبُ بِقَدَرِ اللَّهِ وَالْمُتَسَلِّطُ بِالْجَبَرُوتِ لِيُعِزَّ بِذَلِكَ مَنْ أَذَلَّ اللَّهُ وَيُذِلَّ مَنْ أَعَزَّ اللَّهُ وَالْمُسْتَحِلُّ لِحَرَمِ اللَّهِ وَالْمُسْتَحِلُّ مِنْ عِتْرَتِي مَا حَرَّمَ اللَّهُ وَالتَّارِكُ لِسُنَّتِي))[٣].

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەم شەش کەسە هەم من بەلەعنەتم کردوون‌و هەم خودا بەلەعنەتی کردوون‌و هەم هەموو پێغەمبەرێ لەپێش مندا بەلەعنەتی کردوون، یەکەم ئەوەی شتێ

---

[٢] تقدم برقم: ٣٣٤١/١ مجلد خامس تسلسل/١٦.

[٣] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

زیاد بکا، لەنامەیێ لەنامەکانی خودا، دووەم ئەوەی چارەنووسی خودایی بەدرۆ بزانیێو بڕوای پیێی نەبێ، سێیەم ئەو زەبر بەدەستەی کەبەزۆری زۆردایو بەزەبری ملهوڕی خۆی، خۆی دەسەپێنێو ئەوجا بەکەیفی خۆی ئەوەی خودا سەری ئەوی شۆڕکردووەو سووكو تڕۆی کردووە ئەو دەچێ سەری ئەوە بەرزدەکاتەوەو ڕووی دەداتێ، وە ئەوکەسەی کە خودا سەری ئەوی بەرزەوە کردووە ئەو دەچێ سەری ئەوە نەوی دەکاو ڕووی ناداتێو سووكو ترۆی دەکا!!

چوارەم ئەوکەسەی کە حەرامی خودا بەحەلاڵ دەزانێ!! پێنجەم ئەوکەسەی کەزۆرو ستەم لەئالوبەیتی من بکاو بەپێی شەریعەتی خودا ڕەفتیان وگەڵ نەکا، شەشەم ئەوکەسەی تەرکی ڕێبازی من بکا! (ت-س/ص).

٤٠٨٥- عَنْ أَبِي مُوسَى (رضي الله عنه) عَنْ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: «لاَ يُصِيبُ عَبْدًا نَكْبَةٌ فَمَا فَوْقَهَا أَوْ دُونَهَا إِلاَّ بِذَنْبٍ وَمَا يَعْفُو اللَّهُ عَنْهُ أَكْثَرُ». قَالَ وَقَرَأَ (وَمَا أَصَابَكُمْ مِنْ مُصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُو عَنْ كَثِيرٍ). رواه الترمذي[٤].

ئەبو مووسا (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر ئێشو ئازارێ (کەم تا زۆر) کە تووشی بەندەیێ دەبێ بەهۆی گوناهەوەیە، وەلێ ئەوەنەبێ کەلەسەر هەموو گوناهێ خودا بەندە ئازار بدا، بەڵکوو ئەو گوناهانەی کەخودا چاوپۆشییان لێدەکا گەلێ زۆرترن لەو گوناهانەی کە خودا خاوەنەکانیان تووشی ئێشو ئازاردەکا. گوتی: جا حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) خوێندیەوە: {وَمَا أَصَابَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُو عَن كَثِيرٍ} (٤٢/٣٠) واتە: هەر ئازارو بەڵایەکتان تووش دەبێو هەر ناخۆشییەکتان دێتە ڕێ بەهۆی کردەوەی ناباری خۆتانەوەیە، کەبەدەستی خۆتان دەیکەن، گەرچی خودا لەزۆر کردەوەی خراپیشتان چاو پۆشی دەکاو دەبووری! (ت-سند غریب).

---

[٤] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

قال اللّٰهُ تَعَالَى: {وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَاء حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِ مَا يَشَاء إِنَّهُ عَلِيٌّ حَكِيمٌ} (٥١/٤٢)←.

٤٠٨٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) عَنْ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) قال: «مَا مِنَ الأَنْبِيَاءِ نَبِيٌّ إلاّ قد أُعْطِيَ مِنَ الآيَاتِ مَا مِثْلُهُ آمَنَ عَلَيْهِ الْبَشَرُ، وَإِنَّمَا كَانَ الَّذِي أُوتِيتُ وَحْيًا أَوْحَاهُ اللَّهُ إِلَيَّ فَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَكْثَرَهُمْ تَابِعًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ». رواه مسلم في الإيمان[٥].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەموو پێغەمبەرێ لەکاتی خۆیدا، نیشانەی گەورە گەورەو موعجیزەیەکی وای پێ دراوە کە ئادەمیزادەکانی چەرخی خۆی بەهۆی ئەو نیشانەو موعجیزانەوە ئیمان و باوەڕیان پێ هێناوە، وەلێ ئەو موعجیزەیەی کە خەلآت کراوە بەمن ئەم قورئانەیە، کەخودا بەوەحی بۆی ناردووم بۆیە ئومێدم گەورەیە کەلەڕۆژی قیامەتدا من لەهەموو پێغەمبەرەکانی تر ئۆمەتم زۆر تربێ (م).

## ٢٦- سوورەتی زوخروف

### (مەکەییە ٨٩ ئایەتە)

### سورة الزخرف (مكية وهي تسع وثمانون آية)

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤٠٨٧- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: «مَا ضَلَّ قَوْمٌ بَعْدَ هُدًى كَانُوا عَلَيْهِ إِلاَّ أُوتُوا الْجَدَلَ». ثُمَّ تَلاَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) هَذِهِ الآيَةَ (مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلاَّ جَدَلاً بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ). رواه الترمذي[١].

ئەبو ئومامە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر گەلێ ڕێگەی ڕاست بزربکەن مسۆگەر تووشی دەمبازیو

---

[٥] مسلم. إيمان: ٣٨٣. بخاري. فضائل القرآن: ٤٩٨١، ٧٢٧٤ = تجريد/٤ ل/٥٢٣ رقم: ١٧٢٢.

[١] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

هاوردو بردی قسە دەبن لەپاشان دا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: {وَقَالُوا أَآلِهَتُنَا خَيْرٌ أَمْ هُوَ مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلًا بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ} (ت-س/ص).

٤٠٨٨- ئەم فەرموودەیە لەپێشەوە ڕابورد، لەتەفسیری سوورەتی ئەعراف دا، فەرموودەی سێیەم[٢].

## ٢٧- سوورەتی دوخان

### (مەکییە ٥٧ ئایەتە)

### سورة الدخان (مكية، وهي سبع وخمسون آية)

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤٠٨٩- لەپێشەوە ڕابورد، لەتەفسیری سوورەتی یووسف دا، فەرموودەی چوارەم[١].

٤٠٩٠- عَنْ أَنَسٍ (رضي الله عنه) قَالَ: «مَا مِنْ مُؤْمِنٍ إِلاَّ وَلَهُ بَابَان بَابٌ يَصْعَدُ مِنْهُ عَمَلُهُ وَبَابٌ يَنْزِلُ مِنْهُ رِزْقُهُ فَإِذَا مَاتَ بَكَيَا عَلَيْهِ فَذَلِكَ قَوْلُهُ عَزَّ وَجَلَّ (فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ السَّمَاءُ وَالأَرْضُ وَمَا كَانُوا مُنْظَرِينَ). رواه الترمذي[٢].

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەموو موسوڵمانێ دوو دەرگای هەیە، کردەوەی لەدەرگایەکیانەوە سەردەکەوێ، ڕزق و ڕۆیشی لە دەرگاکەی تریانەوە دێتە خوارەوە، کاتێ دەمرێ هەردوو دەرگاکان بۆی دەگرین، ئەمە مەعنای ئەم فەرمایشتەی خودایە کە دەفەرموێ: {فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ السَّمَاء وَالْأَرْضُ وَمَا كَانُوا مُنظَرِينَ} (٤٤/٢٩) واتە: هەرگیز ئاسمان و زەوی بۆیان

---

[٢] تقدم في المجلد السادس. تسلسل/٨ رقم: ٣٨٦٨/٣.

[١] يقدم في المجلد السادس. تسلسل/١٣ رقم: ٣٩٢٩/٤.

[٢] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

نەگریان و مۆڵەتی ئەوەیشیان نەدرا کە فەوتانیان دوا بخرێ، چونکە ئەمانە پیاوی خراپ بوون، بەڵام مرۆڤی موسوڵمان هەم ئاسمان بۆی دەگرێ و هەم زەوی. (ب–بەسەنەدێکی غەریب).

**دوخان وا لەپێش سوورەی (جاثیة)**

**(ئەحقاف) تەپەی لم وەکوو ماسییە**

## ٢٨- سوورەتی جاثییە

**(لەسوورەتە مەکییەکانە ٣٧ ئایەتە)**

**سورة الجاثية (مكية، وهي سبع وثلاثون آية)**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤٠٩١ – عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) عَنْ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قال: «قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: يُؤْذِينِي ابْنُ آدَمَ، يَسُبُّ الدَّهْرَ وَأَنَا الدَّهْرُ، بِيَدِي الأَمْرُ، أُقَلِّبُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ». رواه البخاري[1].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خودای گەورەو سەروەر دەفەرموێ: ئادەمیزاد ئازاری من دەدا، کاتێ جنێو بەچەرخ و گەردوون دەدات وەکی ئەوە کەهەست بەئازارێ دەکا دەڵێ: ئەی فەلەك واوات لێ بکرێ، یا دەڵێ: ئەی گەردوونی چەپگەرد! گەردوون، یا فەلەك، یا چەرخ هیچی بەدەست نییە، ئەوەی ئێوە نیسبەتی دەدەن لەگەردوون و دەڵێن گوایە هەموو کارو بارێ چەرخ و گەردوون هەڵی دەسووڕێنێ ئەوە وانییە، بەڵکوو من خۆم هەموو شتێ هەڵ دەسووڕێنم، گەردوون من دروستم کردووە، ئەوچی بەدەستە، هەموو کاروبارێ بەدەستی خۆمە، خۆم ئەم شەوو ڕۆژە تاو توێ دەکەم و دەیانهێنم و دەیانبەم (بوخاری. ڕەحمەت لەگۆڕی نازداری).

---

[1] بخاري. تفسير: ٤٨٢٦.

## ٢٩- سوورەتی ئەحقاف

**(مەکییە، ٣٥ ئایەتە)**

## سورة الأحقاف (مكية، وهي خمس وثلاثون آية)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

**٤٠٩٢- كان معاوية (رضي الله عنه) اسْتَعْمَلَ عَلَى الْحِجَازِ مَرْوَانُ فَخَطَبَ فَجَعَلَ يَذْكُرُ يَزِيدَ بْنَ مُعَاوِيَةَ، لِكَيْ يُبَايِعَ لَهُ بَعْدَ أَبِيهِ، فَقَالَ لَهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ شَيْئًا، فَقَالَ خُذُوهُ. فَدَخَلَ بَيْتَ عَائِشَةَ فَلَمْ يَقْدِرُوا { عَلَيْهِ } فَقَالَ مَرْوَانُ إِنَّ هَذَا الَّذِي أَنْزَلَ اللَّهُ فِيهِ (وَالَّذِي قَالَ لِوَالِدَيْهِ أُفٍّ لَكُمَا أَتَعِدَانِنِي أن أخرج) الآية، فَقَالَتْ عَائِشَةُ مِنْ وَرَاءِ الْحِجَابِ: مَا أَنْزَلَ اللَّهُ فِينَا شَيْئًا مِنَ الْقُرْآنِ إِلاَّ أَنَّ اللَّهَ أَنْزَلَ عُذْرِي. رواه البخاري[1].**

**موعاوییە مەڕوانی کردبوو بەسەرداری وڵاتی حیجاز، مەڕوان لە خوتبەدا باسی یەزیدی کوڕی موعاوییەی بۆ خەڵکەکە دەکرد، هەتا لەپاش باوکی پەیمانی خەلافەت بدرێ بەوو ئەو ببێ بە جێنشین لە جێگەی بابی!**

**عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبوبەکریش قسەیەکی لەڕووی مەرواندا کرد گوتی: بۆچی ئەمە هیرقلییەتە، کوڕ لەشوێنی بابی ببێ بە پاشا، یا پێغەمبەرایەتی و جێنشینایەتییە، ئەی ئەبوبەکرو عومەرو عوثمان ئەمەیان بۆ نەکردو لەجێگەی خۆیان مناڵی خۆیانیان دانە نا؟ مەڕوان گوتی: ئادەی بیگرن! ئەوڕەحمانیش خۆی کرد بەماڵی عائیشەی خوشکی دا، ئیتر پێیان نەوێرا، جا مەڕوان گوتی: ئەم ئایەتە دەربارەی ئەم عەبدوڕەحمانە هاتە خوارەوە کەدەفەرموێ: {وَالَّذِي قَالَ لِوَالِدَيْهِ أُفٍّ لَّكُمَا أَتَعِدَانِنِي أَنْ أُخْرَجَ وَقَدْ خَلَتْ الْقُرُونُ مِن قَبْلِي وَهُمَا يَسْتَغِيثَانِ اللَّهَ وَيْلَكَ آمِنْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ فَيَقُولُ مَا هَذَا إِلَّا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ} (٤٦/١٧) واتە: بەدبەختی**

---

[1] بخاري. تفسير: ٤٨٢٧.

وا هەیە کەدایكو باوکی تەمێی خێری دەکەنو پێی دەڵێن: خانە خراپ! باوەڕو ئیمان بێنە، بەڕاستی بەڵێنی خودا ڕاستە، کەچی ئەو لەڕوویانا هەڵدە گەڕێتەوەو دەڵێ: ئۆە! لە دەست ئێوە! ئەم قسە پڕو پووچە چییە کە ئێوە دەیکەن، کە گوایە من لە پاش مردن زیندوو دەکرێمەوەو لەگۆڕ دەرم دەکەنو دەمبەن بۆ حەشرو لێپرسینەوە، ئەمەی ئێوە دەیلێن کۆنەو قسەی ئەمڕۆ نییە، هەر ئەفسانە کۆنەکەی پێشینانەو دەیلێنەوە، ساڵەهای ساڵە ئەو خەڵکە دێنو دەمرنو گوم دەبن، ئەی کوا بۆیەکێ نەگەڕایەوە دواوە؟!!

عائیشەیش کەلەپشتی پەردەوە بوو بە مەروانی گوت درۆدەکەی خودا لەبارەی ئێمەوە کە کەسوکاری ئەبوبەکری صەدیقین هیچ شتێکی واکەبۆنی خراپیی ئێمەی لێ بێ لەقورئاندا نەیناردۆتەوە خوارەوە، بەڵکوو ئەو ئایەتانەی ناردووە کەبەیانی پاکیو مەردیو داوێنپاکیی من دەکەن (ب).

٤٠٩٣- قَالَتْ عائشة (رضي الله عنها): ما رَأَيْتُ رسول الله (ضاحكا حتى أرى منه لهواته، إنما كان يَتَبَسَّم، قالت: وَكَانَ إِذَا رَأَى غَيْمًا أَوْ رِيحًا عُرِفَ فِي وَجْهِهِ. قَالَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ النَّاسَ إِذَا رَأَوْا الْغَيْمَ فَرِحُوا، رَجَاءَ أَنْ يَكُونَ فِيهِ الْمَطَرُ، وَأَرَاكَ إِذَا رَأَيْتَهُ عُرِفَ فِي وَجْهِكَ الْكَرَاهِيَةُ. فَقَالَ «يَا عَائِشَةُ مَا يُؤْمِنِّي أَنْ يَكُونَ فِيهِ عَذَابٌ عُذِّبَ قَوْمٌ بِالرِّيحِ، وَقَدْ رَأَى قَوْمٌ الْعَذَابَ فَقَالُوا (هَذَا عَارِضٌ مُمْطِرُنَا)». رواه الأربعة[٢].

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: قەت نەم دیوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وا پێبکەنێ کە زمانە بچکۆلەی دەربکەوێو دەم دابچەقێنێو بدا لە قاقاو تریقەی پێکەنین! بەڵام بە سەلاری بەزەردەخەنە پێدەکەنی، عائیشە گوتی: کاتێ هەور یا با هەڵی دەکرد ڕەنگی دەگۆڕا، عەرزیم

(٢) بخاري. تفسير:٤٨٢٨، ٤٨٢٩، ٦٠٩٢ = تجريد/٤ ل/٤٩٠ رقم: ١٦٩٥. مسلم: صلاة أستقاء: ٢٠٨٣.

کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! خەڵك کە هەور دەبینن خۆشی دەکەن، بە ئومێدی ئەوە کەبارانی پێوەبێ، کەچی دەبینم تۆ کە هەور دەبینی خەم‌و پەژارە لەڕووت دیارە؟ فەرمووی: ئەی عائیشە! دەترسم کەئەوە هەوری مەینەت‌و سزابێ، عادی هۆزی هود (دروودی خودای لەسەربێ) کاتێ سزاکە هاتە سەریان‌و بەچاوی خۆیان شەپۆلی باو گەردەلوولەکەیان دی‌و چاویان بەبەرایی سزاکە کەوت گوتیان: {هَذَا عَارِضٌ مُّمْطِرُنَا} (٤٦/٢٤) واتە: ئەمە هەوری بارانە، بارانمان بۆ دەبارێنێ (ش/د/ت).

بەڵام خۆی وانەبوو، بەڵکوو هەوری غەضەب بووە، وەك حەزرەتی هوود (دروودی خودای لەسەربێ) وەڵامی دانەوە: {بَلْ هُوَ مَا اسْتَعْجَلْتُم بِهِ رِيحٌ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٌ} (٤٦/٢٤) واتە: نەخەیر هەور نییە، بەڵکوو ئەو سزایەیە کە ئێوە پەلەپەلتان بوو بۆهاتنی، ئەوە بایەك‌و شەپۆلە هەوایەکی ئاسمانییە سزایەکی سەختی تایە. (وەرگێڕ).

٤٠٩٤- و للشَّيخين: نُصرت بالصَّبا وأهلَكتُ عادٌ بالدَّبُور[٢].

حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خودای گەورە بەهۆی بای خۆرهەڵاتەوە کەبەعەرەبی پێی دەڵێن صەبا، لەشەڕی غەزای خەندەقا سەری خستم بەسەر دوژمندا، وەهۆزی عادیش بەبای ڕەشەبا لەناو چوون (ش).

قال اللّٰهُ تَعَالَى: {وَإِذْ صَرَفْنَا إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ الْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ الْقُرْآنَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوا أَنصِتُوا فَلَمَّا قُضِيَ وَلَّوْا إِلَى قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ} (٤٦/٢٩).

باسی ئەوکاتەیان بۆ بکە، کەلە (وادی النخلە)دا نۆ کەسمان (لە جنۆکە) نارد بۆلای تۆ، کە گەیشتنە لای تۆ لەوکاتەدا تۆ شەو نوێژت دەکردو قورئانت دەخوێند، لەناو خۆیانا گوتیان: ئابێ دەنگ بن‌و گوێ

---

[٢] بخاري. إستِسقاء: ١٠٣٥، ٣٢٠٥، ٣٣٤٣، ٤١٠٥ = تجريد/١ ل/٤٩٩ رقم: ٥٢٦. مسلم: صلاة الإستسقاء: ٢٠٨٤.

بگرن با بزانین دەفەرموێ چی، کاتێ قورئان خوێندنەکە تەواو بوو، گەڕانەوە بۆلای گەلەکەیانو دەستیان کرد بە هۆشیاری کردنەوەیان.

٤٠٩٥- عَنْ عَلْقَمَةَ (رضي الله عنه) قَالَ قُلْتُ لابْنِ مَسْعُودٍ (رضى الله عنه) هَلْ صَحِبَ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) لَيْلَةَ الْجِنِّ مِنْكُمْ أَحَدٌ؟ قَالَ: لا، وَلَكِنْ قَدِ افْتَقَدْنَاهُ ذَاتَ لَيْلَةٍ وَهُوَ بِمَكَّةَ فَقُلْنَا اغْتِيلَ أَوِ اسْتُطِيرَ فَبِتْنَا بِشَرِّ لَيْلَةٍ بَاتَ بِهَا قَوْمٌ حَتَّى إِذَا أَصْبَحْنَا إِذَا نَحْنُ بِهِ يَجِيءُ مِنْ قِبَلِ حِرَاءَ قَالَ فَذَكَرُوا لَهُ الَّذِى كَانُوا فِيهِ فَقَالَ «أَتَانِى دَاعِيَ الْجِنِّ فَأَتَيْتُهُمْ فَقَرَأْتُ عَلَيْهِمْ». فَانْطَلَقَ فَأَرَانَا آثَارَهُمْ وَآثَارَ نِيرَانِهِمْ. قَالَ الشَّعْبِيُّ وَسَأَلُوهُ الزَّادَ وَكَانُوا مِنْ جِنِّ الْجَزِيرَةِ فَقَالَ «كُلُّ عَظْمٍ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ يَقَعُ فِي أَيْدِيكُمْ أَوْفَرَ مَا كَانَ لَحْمًا وَكُلُّ بَعْرَةٍ أَوْ رَوْثَةٍ عَلَفٌ لِدَوَابِّكُمْ». فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) «فَلاَ تَسْتَنْجُوا بِهِمَا فَإِنَّهُمَا زَادُ إِخْوَانِكُمْ مِنَ الْجِنِّ». رواه الترمذي[٤].

عەقلەمە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: گوتم بە ئیبنو مەسعوود: لەوشەوەدا کە وەفدو نوێنەری جنۆکە هاتنە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئێوە لەوکاتەدا کەستان لەخزمەتیدا بوون؟ گوتی: نەء، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هێشتا لە مەککە بوو، شەوێ لێمان بزر بوو، گوتمان: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بۆیە دیار نییە یا لەناکاو کوژراوە، یا فڕێندراوە. ئیتر ئەو شەوە کەلەئێمە رۆیی قەت نەی بینینەوە، کەچی بۆبەیانی ڕوانیمان وا لەلای ئەشکەوتی حیراوە دێتەوە، کە بۆیان گێڕایەوە کەئەم شەو بەهۆی تۆوە چیمان بەسەرهاتووە، فەرمووی: نوێنەری جنۆکە هاتبوو بەشوێنمداو بانگی کردم بۆلایان، منیش چووم بۆلایانو قورئانم بۆخوێندن. ئینجا لە خزمەتی دا چووین، شوێنەوارو ئاگردانەکانیانی پێنیشان داین، لەوشەوەدا جنۆکەکان داوای خواردەمەنیو توێشووی لێ دەکەن، ئەویش دەفەرموێ: هەر ئێسکێ

---

[٤] رواه الرتمذي بسند صحيح (شرحه).

لـەکاتی سـەربڕیندا، یـا لـەکاتی کڕانـەوەدا، یـا لـەکاتی فڕەدانـدا نـاوی خـودای لێبهێنـرێ، کاتـێ دەکەوێتـە، دەسـتی ئێـوە لەهـەموو کـاتێکی تـر گۆشـتی پـتر پێـوە بـێ! وەهـەموو پـشقڵو شـیاکەو تەپاڵـەو تەرسـێکیش ئالیك بێ بۆ وڵاخەکانتان، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کەواتـە بەو دوو شتە واتە: بە ئێسقانو پەیین لـەپاش سـەراوکردن گیـانی خۆتـان پـاك مەکەنـەوە، چـونکە ئـەم دووشـتە خـۆراکی براجنۆکـەکانتانن. (ت-س/ص).

٤٠٩٦- وقِيلَ لعبد الله: مَنْ آذَنَ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) بالجنِّ ليلة اِسْتَمَعُوا القرآن؟ قال: آذنت بِهِمْ شجرةٌ:[٥].

بەعەبدوڵلا (خودای لێ رازی بێ) گـوترا: ئـەو شـەوە کـە وەفـدی جنۆکـە گـوێ لـە قورئانەکـە دەگـرن کـێ پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئاگـادار دەکاتـەوە لـەوە؟ گوتـی: درەختێ جنۆکەکان ئاشکرا دەکا لەپێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) (ب).

٤٠٩٧- و قِيلَ للنبي (صلى الله عليه وسلم): مَا بَـالُ الْعَظْـمِ وَالـرَّوْثِ لا يُـستنجى بهما؟ قَالَ «هُمَا مِنْ طَعَامِ الْجِنِّ، وَإِنَّهُ أَتَانِي وَفْدُ جِنِّ نَصِيبِينَ وَنِعْمَ الْجِنُّ، فَسَأَلُونِي الزَّادَ، فَدَعَوْتُ اللَّهَ لَهُمْ أَنْ لاَ يَمُرُّوا بِعَظْمٍ وَلاَ بِرَوْثَةٍ إِلاَّ وَجَـدُوا عَلَيْهَـا طَعَامًـا». رواهما البخاري في المناقب[٦].

عـەرزی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەربێ) دەکـرێ: بۆچـی نابـێ تـارات بـە ئێـسقانو تەپاڵـەو تەرسـەقول بگـیرێ؟ فـەرمووی: چـونکە ئـەو دووشـتە لەخۆراکی جنۆکەن، حاڵ وابوو کاتێ نوێنەری جنۆکەکانی خـەڵکی نەصـیبین لە جـەزیرەی ئیبنـو عومـەر، کـە دەکەوێتـە نـاو کوردسـتانەوە هاتنـە لام داوای خۆراکیـان لـێ کـردم، منـیش لـەخودا پاڕامـەوە بۆیـان! کەبەلای هـەر ئێسكو تەرسێکا بڕۆن لەخوداوە خۆراك بگرن بۆیانو وەك کاتی پێش خواردنیان لـێ بێتەوە، ئێسکەکە پڕ بێ لەگۆشـتو تەپاڵەکـەیش خواردنیـان لـێ ببێتـەوە بـە

---

[٥] بخاري. مناقب. ٣٨٥٩ = تجريد/٣ ل/١٩٧ رقم/١٥٠٧.

[٦] بخاري. مناقب: ٣٨٦٠ = تجريد/٣ ل/١٩٧ رقم/١٥٠٨.

دانەوێڵەکەی جاران حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) کەناوی جنۆکەکانی نەصیبینی هێنا فەرمووی: بەڕاستی ئەو جنۆکانە جنۆکەی چاك بوون* (ب).

## ٣٠- سوورەتی موحەممەد (دروودی خودای لەسەربێ)

**(لەسوورەتە مەدەنییەکانە، ٣٩ ئایەتە)**

## سورة محمد (صلى الله عليه وسلم) (مدنية، وهي تسع وثلاثون آية)

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤٠٩٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) (وَاسْتَغْفِرْ لِذَنْبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ) فَقَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) «إِنِّي لأَسْتَغْفِرُ اللَّهَ فِي الْيَوْمِ سَبْعِينَ مَرَّةً». رواه الترمذي[1].

---

* لەخودا بەزیادبێ کەئەم صەحابانە پاش ئەوەی خۆیان ئیسلام بوون گەڕانەوە بۆناو گەلەکەی خۆیان لە کوردستانو بوون بە یەکەم نوێنەری ئیسلام لەکوردستاندا. ئەمەش بەهرەیەکی گەورەیە، نیشانەی پیرۆزی ئەم خاکەیە. (وەرگێڕ)

سوورەی (محمد) علیه السلام
مژدەی (فەتح)ی دا بەگەلی ئیسلام
حوجرات فەتحی بە فووی (قاف) دەبێ
(زاریات) بۆ (طوور) بەتەناف دەبێ

یەکەم کەس کەدەرگای گۆڕی بۆ دەکرێتەوەو لەگۆڕ دەردەچێ پێغەمبەری خۆمانە، کە گۆڕەکەی وا لەناو حوجرەکەی عائیشەدا، کە یەکێکە لە (حوجرات)ی ئوممولموئمینینەکان! کلیلی کردنەوەی گۆڕەکانیش نەفخیصووری دووەمە، کەلەئایەتی بیستو یەکی سوورەتی قافدا باس کراوە پێش ئەوەیش بەپێی ئایەتەکانی سەدو دوو هەتا سەدو هەشتی سوورەتی طاها کێوەکان (کە یەکێکیان کێوی طوورە) بەهۆی ذاریاتەوە، کە بەمەعنا بای بەهێزە، پەخشو پرشو بڵاو دەبنەوەو رووی زەوی دەبێ بە گۆی بێ گرێو قۆرت وەك هێلکە. (وەرگێڕ)

[1] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

ئـەبو هـورەیرە (خـودای لێ ڕازی بـێ) گـوتی: حـەزرەت (دروودی خـودای لەسـەربێ) فەرمووی: من لە ڕۆژێکا، حەفتا جار داوای لێخۆشبوونی گوناه لە خودا دەکـەم، بۆخـۆم و بۆئێـوە، بـۆ بـەجێهێنانی فـەرمانی ئـەم ئایەتـە کـە دەفـەرموێ: {وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَـاتِ} (١٩/٤٧) واتـە: داوای تـاوان پۆشـی لـەخودا بکـە بـۆ خـۆت و بـۆ پیـاوو ژنـی موسـوڵمان (ت-س/ص).

٤٠٩٩- وَ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ «خَلَقَ اللَّهُ الْخَلْقَ، فَلَمَّا فَرَغَ مِنْهُ قَامَتِ الرَّحِمُ فَأَخَذَتْ بِحَقْوِ الرَّحْمَنِ فَقَالَ لَهَا مَهْ. قَالَتْ هَذَا مَقَامُ الْعَائِذِ بِكَ مِنَ الْقَطِيعَةِ. قَالَ أَلاَ تَرْضَيْنَ أَنْ أَصِلَ مَنْ وَصَلَكِ وَأَقْطَعَ مَنْ قَطَعَـكِ؟ قَالَـتْ: بَلَـى يَـا رَبِّ. قَالَ فَذَاكِ لَكِ». قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ اقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ (فَهَلْ عَـسَيْتُمْ إِنْ تَـوَلَّيْتُمْ أَنْ تُفْسِدُوا فِي الأَرْضِ وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ). رواه الشيخان[٢].

دیسان لەوەوە (خودای لێ ڕازی بێ) حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوکاتـەی کـە خـوا ئـەم بوونـەوەرەی دروسـت کـردو لـێ بـووەوە لێـی، خزمایـەتی (ڕەحـەم) هەڵـسا کەمـەری خـودای میهرەبـانی گـرت و گـوتی: دەسـتم دامێنـت! خـودا فـەرمووی پێـی: مەکـە بـۆ وادەکـەی داوات چییە بیڵێ؟ خزمایەتی گوتی: بۆ ئەوە هەڵساوم و لەوشوێنەدا کەمەرت دەگرم و پەنام بۆ هێناویت: کە سکاڵا دەکەم لەدەستی ئەوکەسانەی کەمافی من بەجێ ناهێنن و ڕشتەی پەیوەندی خزمایـەتی دەبڕن، خودای گەورەیش فـەرمووی: ئایـا ڕازی دەبـی بـەوە کـە هەرکەسـێ پـێ لـەتۆ نـەبڕێ و پەیوەسـتی هـەبێ لەگـەڵتا منـیش پـێ لـەو نـەبڕم و پەیوەسـتیم هـەبێ لەگـەڵیا، وە ئـەو کەسەیـشی پـێ لـەتۆ بـبڕێ و پەیوەسـتی نـەبێ لەگـەڵتا منیش پێ لەو ببڕم و پەیوەستیم نەبێ لەگەڵیا؟ خزمایەتی گوتی: بەڵێ ئەی پەروەردگارم! من بەمە ڕازیم، فەرمووی: دە ئەمە پەیمان بێ لەبەینی

---

(٢) بخاري. تفسير: ٤٨٣٠، ٤٨٣١، ٤٨٣٢، ٥٩٨٧، ٧٥٠٢، تجريد البخاري/٤ ل/٤٩١ رقم/١٦٩٦، مسلم. البرّ والصلة ٦٤٦٥.

من و تۆدا ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەگەر ئارەزوو دەکەن، بۆ پشتیوانی ئەم فەرموودەیە ئەم ئایەتە بخوێنن: {فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ} (٢٢/٤٧) واتە: چی چاوەڕوان دەکرێ لەسەر کاری بەدو لەکاربەدەستی ناموسوڵمان غەیری ئەوە کەدەس بکەن بەخراپەو بشێوە لەوڵاتاو ڕشتەی خزمایەتی بپچڕن؟ (ش).

٤١٠٠- ← لەسەر باسی (فضل فارس)دا ڕۆیشت، (ف/١ + ف/٢).

بەڵام لێرەدا بۆ ڕاڤەی ئەم ئایەتە: {وَإِن تَتَوَلَّوْا يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوا أَمْثَالَكُمْ} (٣٨/٤٧) واتە: ئەگەر پشت لەدینی خودا بکەن ئەوە خودا ئێوە بەرباد دەکاو گەلێکی تر دێنێتە رووی کارو ئەوانە فەرمانی خودا ناشکێنن و وەکوو ئێوە نابن[٣].

## ٣١- سوورەتی فەتح

(مەدینەییە، ٢٩ ئایەتە)

## سورة الفتح (مدنية، وهي تسع وعشرون آية)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤١٠١- (ب/١ ز/١٨١ ل/٤٩٣ ف/٧ + ب/١ ز١٨٥ ل٥٠٧ ف١٠)[١].

لەگێڕانەوەی ئێرەدا ئەم پترییەی هەیە: بەدانیشتنەوە نوێژی سوننەتی دەکرد، بەڵام کەدەیویست بچەمێتەوە هەڵ دەسایە سەرپێ ئەوسا ڕوکووعی دەبرد.

٤١٠٢- عَنْ أَنَسٍ (رضي الله عنه) لَمَّا نَزَلَتْ عَلَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) (لِيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ) مَرْجِعَهُ مِنَ الْحُدَيْبِيَةِ فَقَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) «لَقَدْ أُنْزِلَتْ عَلَيَّ آيَةٌ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا عَلَى الأَرْضِ ثُمَّ قَرَأَهَا النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم)

---

[٣] تقدم في المجلد الخامس. تسلسل/٧٢ برقم: ٢٥٧٢/١ و رقم: ٢٥٧٣/٢.

[١] تقدم برقم ٩٧١/٧ مجلد أول. تسلسل/١٨١.

عَلَيْهِمْ فَقَالُوا هَنِيئًا مَرِيئًا يَا نَبِيَّ اللَّهِ قَدْ بَيَّنَ اللَّهُ لَكَ مَاذَا يُفْعَلُ بِكَ فَمَاذَا يُفْعَلُ بِنَا فَنَزَلَتْ عَلَيْهِ (لِيُدْخِلَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِى مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خالِدِين فيها) حَتَّى بَلَغَ (فَوْزًا عَظِيمًا). رواه الترمذي[٢].

**ئەم فەرموودەیە لەپێشەوە ڕابورد، لەسەر باسی (فضل سورة الفتح)دا گێڕانەوەی ئێرە کە لەئەنەسەوەیە ئەمەی پترە: یاران** (خودایان لێ ڕازی بێ) **عەرزیان کرد: قوربان! نۆشی گیانت بێ، باشە ئەمە خەڵاتی خودایە بۆ تۆ، ئەی چی خەڵات دەکا بە ئێمە؟ ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە:** {لِيُدْخِلَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا} (٤٨/٥) (ت-س/ص).

**٤١٠٣- ئەم فەرموودەیە لەپێشەوە ڕابوورد، لەسەر باسی (الفصل الثالث في أخلاق النبي)دا. فەرموودەی سێیەم[٣].**

قال اللَّهُ تَعَالَى: {لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا} (٤٨/١٨).

**واتە: خودای گەورە زۆر ڕازی بوو لەو موسوڵمانانەی کە لەڕووداوی حودەیبییەدا، لەژێر دارسەمورەکەدا، پەیمانی مەشهوور بە بەیعەتولریضوانیان لەگەڵ تۆدا بەست، خودا ئاگای لەنیازی پاکی ناودڵیان بوو، بۆیە بارانی هێمنیو ڕەحمەتو دامەزراوی داباران بە سەریاندا، سەرەڕای ئەوەیشە خەڵاتێکی تری گەورەی کردن، بەگرتنێکی نزیك بۆ شارێکی پڕ لە خێرو بێر.**

**٤١٠٤-** عَنْ أَبِي وَائِلٍ (رضي الله عنه) قَالَ: كُنَّا بِصِفِّينَ فَقَالَ رجُلٌ: أَلم تَرَ إِلَى الَّذينَ يُدعون إِلى كتاب الله؟ فقال عليٌّ: نعم، فقال سَهْلُ بْنُ حُنَيْفٍ: اتَّهِمُوا أَنْفُسَكُمْ فلقد رأيتُنا يَوْمَ الْحُدَيْبِيَةِ فِي الصُّلح الَّذي كانَ بين النبيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)

---

[٢] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[٣] تقدم في المجلد الرابع برقم: ٣١١٨/٣ تسلسل/٩٠.

والمشركين ولو نرى قِتَالاً لَقَاتَلْنَا، فَجَاءَ عُمَرُ فَقَالَ: أَلَسْنَا عَلَى الْحَقِّ وَهُمْ عَلَى الْبَاطِلِ؟ أَلَيْسَ قَتْلاَنَا فِي الْجَنَّةِ وَقَتْلاَهُمْ فِي النَّارِ؟ قَالَ: «بَلَى»، قَالَ: ففيم نُعْطِي الدَّنِيَّةَ فِي دِينِنَا وَنَرْجِعُ وَلَمَّا يَحْكُمِ اللَّهُ بَيْنَنَا، فَقَالَ: يا ابْنَ الْخَطَّابِ، إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ، وَلَنْ يُضَيِّعَنِي اللَّهُ أَبَدًا، فرجع مُتغيِّظاً فلم يصبر حتَّى جاء أبو بكر، فقال: أَلَسْنَا عَلَى الْحَقِّ وَهُمْ عَلَى الْبَاطِلِ؟ قَالَ: يا ابْنَ الْخَطَّابِ، إِنَّهُ رَسُولُ اللَّهِ، وَلَنْ يُضَيِّعَهُ اللَّهُ أَبَدًا، فَنَزَلَتْ سُورَةُ الْفَتْحِ. رواه البخاري ومسلم في الحديبية[٤].

ئەبو وائیل (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لە صەففین بووین، پیاوێ گوتی: ئایا تەماشای ئەمانە ناکەی، بانگ دەکرێن بۆ حوکم کردن بەپێی نامەی خودا کە قورئانی پیرۆزە کە دەفەرموێ: {وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا} کەچی ڕازی نابن؟ عەلی (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: بەڵێ، من بەم پێشنیارەی دەستەی موعاوییە ڕازیم، کە قورئان لەبەینا بێ، چونکە ئەگەر نیاز پاك بێو مەبەست ئەوەبێ کە خوێنی موسوڵمان بەدەستی برای موسوڵمانی نەڕێژرێو کردارو ڕەفتار بەنامەی خودا بکرێ من بۆ ئەمە لەپێشەوەمو سەرم پێوەنییە، وەلێ هەندێ کەس ڕەخنەیان لە سوڵحو ڕێککەوتن دەگرت، لەبەر ئەوە سەهلی کوڕی ئەحنەف گوتی: زۆر لەڕای خۆتان ڕازی مەبنو گومان لەخۆتان بکەن، چونکە مەرج نییە کە هەرچی ئێوە بەباشی بزانن ئەوە باش بێ، لەڕۆژی ڕێکەوتنی حودەیبییەدا ئێمەش زۆر ڕازی نەبووین بەو ڕێکەوتنەی کەلە نێوانی پێغەمبەرو هاوبەشپەیدا کەرەکاندا ڕووی دا، وەحەزمان لەشەڕ بوو بەڕادەیەك عومەر چوو گوتی: باشە ئەدی ئێمە لەسەر هەق نینو ئەوان لەسەر باطیلو بۆشو هیچو پووچ نین؟ ئایا کوژراوەکانی ئێمە لە بەهەشتدانینو کوژراوەکانی ئەوان لە دۆزەخدانین؟ حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: با، چۆنی دەڵێی وایە، عومەر گوتی: کەوایە ئیتر بۆچی سووکایەتی بەسەر ئایینی خۆمان بێنینو بەرلەوە کە خودا لەنێوانی ئێمەو ئەواندا بڕانێو حوکم بکا، بگەڕێینەوەو ئەم هەموو مەرجە ناقۆڵایانەی ئەوان

---

[٤] بخاري. الجزية والموادعة: ٣١٨١، ٣١٨٢، ٤١٨٩، ٤٨٤٤، ٧٣٠٨، مسلم جهاد: ٤٦٠٩.

کە نیشانەی دەستەوسانی ئێمەیە قەبووڵ بکەین؟ حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەی کوڕی خەططاب! من پێغەمبەرو ڕەوانەکراوی خودام‌و پشت ئەستوورم لەیارمەتی خودای خۆم‌و هەرگیز خودا فەرامۆشم ناکا! جا عومەر بەتووڕەیی گەڕایەوەو ئۆقرەی نەگرت: هەتا چوو بۆلای ئەبوبەکرو پێی گوت: باشە ئێمە لەسەر هەق نین‌و ئەوان لەسەر باطیل؟! ئەویش گوتی: ئەی کوڕی خەططاب! ئەو خۆی پێغەمبەری خودایە، خودا خۆی ڕەوانەی کردووە، کەواتە قەت خودا بەگورگان خواردووی نادا! ئیتر سوورەتی فەتح هاتە خوارەوە، لەڕێگەی مەدینە، کاتی گەڕانەوەی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) لەحودەیبییە (ش).

٤١٠٥- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضي الله عنه) أَنَّ ثَمَانِينَ رَجُلاً مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ هَبَطُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَأصحابِهِ مِنْ جَبَلِ التَّنْعِيمِ عند صلاة الصُّبْحِ وَهُمْ يُرِيدُونَ قَتْلَهُ، فَأُخِذُوا أَخْذاً فَأَعْتَقَهُمْ رَسُولُ الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: {وَهُوَ الَّذِي كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ مِن بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ وَكَانَ اللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا}. رواه الترمذي ومسلم[٥].

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: جارێ، لەحودەیبییە، هەشتا کەس لەکاتی کردنی نوێژی بەیانیدا، لەچیای تەنعیمەوە دابارین بەسەر پێغەمبەرو یارانی دا، دەیانویست کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بکوژن، بەلام هەموویان بەگرتن گیران‌و بەیدەست‌و یەخسیر کران، لەپاشدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هەموویانی ئازاد کرد، جا خودا بۆ تۆمارکردنی ئەم داستانە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە {وَهُوَ الَّذِي كَفَّ أَيْدِيَهُمْ...} هەتا {.. تَعْمَلُونَ بَصِيرًا } (٢٤/٤٨) واتە: خودا ئەو خودا میهرەبانەیە، کەلەنزیکی شاری مەککەدا، دەستی کافرەکانی گرت‌و نەیهێشت کەدەست درێژی لەئێوە بکەن، وەپاش ئەوەی کەئێوەی زاڵ کرد بەسەر ئەوانا دەستی ئێوەیشی گرت‌و نەیهێشت

---

[٥] مسلم. جهاد. ٤٦٥٤، ٤٦٥٦. أبوداوود. جهاد: ٢٦٨٨. ترمذي. تفسير القرآن: ٣٢٦٤.

کەئێوەیش ئازاری ئەوان بدەن، ئەوەبوو ئازادتان کردن، وە ئەم پیاوەتییەی ئێوەیە بوو بەهەوێنی ئەو ڕێکەوتنە پیرۆزەیە، بزانن کە خودا بینایە بەهەموو کارو کردەوەیەکتان (ت/م).

٤١٠٦- عَنْ أَبِي بن كعبٍ (رضي الله عنه) عَنْ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم): وألزَمَهُم كلِمة التَّقوى قال: لا إله إلاَّ الله. رواه الترمذي[٦].

ئوبەیی کوڕی کەعب (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لەبارەی ئەم ئایەتەوە: {وَأَلْزَمَهُمْ كَلِمَةَ التَّقْوَى} (٤٨/٢٦) واتە: وەخودا بڕی بەباڵایان ووشەی لەخودا ترسیو کەلیمەی تەقوای وەك بەرگی باش‌و کاڵایەکی چاك بڕی بەبەریان گوتی: لەبارەی ئەمەوە حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: مەبەست لەم ووشەیە ووشەی پیرۆزی (لا إلـه إلا الله)یە، کە لکاوەو نووساوە بەناو دڵی هەموو خواناسێکی خاسی ساغەوە (ت).

## ٣٢- سوورەتی حوجرات

(مەدەنییە، ١٨ ئایەتە)

## سورة الحجرات (مدنية، وهي ثمان عشرة آية)

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤١٠٧- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الزُّبَيْرِ (رضي الله عنه) قال: قَدِمَ رَكْبٌ مِنْ بَنِي تَمِيمٍ عَلَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ أَمِّرِ الْقَعْقَاعَ بْنَ مَعْبَدِ بْنِ زُرَارَةَ. قَالَ عُمَرُ بَلْ أَمِّرِ الأَقْرَعَ بْنَ حَابِسٍ. قَالَ أَبُو بَكْرٍ مَا أَرَدْتَ إِلاَّ خِلاَفِي. قَالَ عُمَرُ مَا أَرَدْتُ خِلاَفَكَ. فَتَمَارَيَا حَتَّى ارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُهُمَا فَنَزَلَ فِي ذَلِكَ {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ}. رواه البخاري[١].

---

[٦] سكت عن درجته الشارح.

[١] بخاري. تفسير: ٤٨٤٧.

عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: دەستەیێ سواری بەنی تەمیمی هاتنە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئەبو بەکر عەرزی حەزرەتی کرد: کە قەعقاعی کوڕی مەعبەد بکە بە گەورەیان، عومریش عەرزی کرد: کە ئەقرەعی کوڕی حابیس بکە بە گەورەیان، ئەبوبەکر دڵگران بوو گوتی: تۆ هەر مەبەستت دژایەتی و بەربەرکانی من بوو لەم قسەیەدا! عومەریش گوتی: مەبەستم شتی وا نییە ئیتر بوو بەمشت و مڕیان و دەنگیان بەرزەوە بوو. ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ} (٤٩/١) واتە: ئەی موسوڵمانینە! هیچ کارێ خود سەر لە خۆتانەوە بەبێ فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودا مەکەن (ب).

٤١٠٨- عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ (رضي الله عنه) قَالَ كَادَ الْخَيِّرَانِ أَنْ يَهْلِكَا – أَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ (رضي الله عنهما) رَفَعَا أَصْوَاتَهُمَا عِنْدَ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) حِينَ قَدِمَ عَلَيْهِ رَكْبُ بَنِي تَمِيمٍ، فَأَشَارَ أَحَدُهُمَا بِالأَقْرَعِ بْنِ حَابِسٍ أَخِي بَنِي مُجَاشِعٍ، وَأَشَارَ الآخَرُ بِرَجُلٍ آخَرَ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ لِعُمَرَ مَا أَرَدْتَ إِلاَّ خِلاَفِي. قَالَ مَا أَرَدْتُ خِلاَفَكَ. فَارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُهُمَا فِي ذَلِكَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ) الآيَةَ. قَالَ ابْنُ الزُّبَيْرِ فَمَا كَانَ عُمَرُ يُسْمِعُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بَعْدَ هَذِهِ الآيَةِ حَتَّى يَسْتَفْهِمَهُ. رواه البخاري والترمذي (رضوان الله عليهما)[٢].

ئەبو مولەیکە (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: دوو پیاوە باشەکە، واتە: ئەبو بەکرو عومەر خەریکبوون تیا بچن! کاتێ دەستە سوارەکەی بەنی تەمیم هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەخزمەتی پێغەمبەردا دەنگیان بەرزەوە بوو، وەکردیان بەمشت و مڕ، ئەبوبەکر دەیویست کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) قەعقاعی کوڕی مەعبەد بکا بەسەر گەورەیان، عومەریش دەیویست کە ئەقرەعی کوڕی حابیس بکا بە

---

[٢] بخاري. تفسير: ٤٨٤٥.

سەرگەورەیان. جا ئەبو بەکر بە عومەری گوت: تۆ هەر مەبەستت بەر پەرچدانەوەی قسەکەی منەو هیچی تر! ئەویش گوتی: مەبەستم ئەوە نییە، جا لەسەر ئەوەبوو، بەقرە قرو دەنگەدەنگیان، جا خودا تەواوی ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ وَلَا تَجْهَرُوا لَهُ بِالْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَن تَحْبَطَ أَعْمَالُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ} (٢/٤٩) واتە: موسوڵمانینە! لەخزمەتی پێغەمبەری خوادا گاڵە گاڵو دەنگە دەنگ مەکەن، بەئەدەبو بەرێزەوە، بەهێواشیو نەرمو نیانی لەخزمەتیا بدوێن، مەیکەن بە چەقەخانەی خۆتان، دەنا تووشی بێ وێڵی دەبنو کردەوەی باشتان بەزایە دەڕوا، وە بەخۆتان نازانن. ئیبنو زوبەیر دەیگوت: ئیتر عومەر لەدوا ئەم ئایەتە لەخزمەتی حەزرەتدا بەچپە نەبوایە قسەی نەدەکرد بۆ حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) وادەبوو کە پێغەمبەر پرسیاری لێ دەکرد، کە تۆزێ دەنگ هەڵبڕە باش تێ نەگەیشتم! (ب/ت).

٤١٠٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضي الله عنه) أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) افْتَقَدَ ثَابِتَ بْنَ قَيْسٍ، فَقَالَ رَجُلٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنَا أَعْلَمُ لَكَ عِلْمَهُ. فَأَتَاهُ فَوَجَدَهُ جَالِسًا فِي بَيْتِهِ مُنَكِّسًا رَأْسَهُ، فَقَالَ له: مَا شَأْنُكَ؟ قَالَ: شَرٌّ، كَانَ يَرْفَعُ صَوْتَهُ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُ، وَهُوَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ! فَأَتَى الرَّجُلُ النبيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَأَخْبَرَهُ فَقَالَ: «اذْهَبْ إِلَيْهِ فَقُلْ لَهُ إِنَّكَ لَسْتَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، وَلَكِنَّك مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ». رواه الشيخان[٣].

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: جارێ حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) پرسیاری لە ثابیتی کوڕی قەیس کردو لەهەواڵی ئەوی پرسی. پیاوێ گوتی: قوربان! هەر ئێستە من هەواڵی ئەوت بۆ دەزانم جا ڕۆشت بە شوێنی دا، تەماشای کرد وا لەماڵەوە کزو مات سەری داخستوەو دانیشتووە، پیاوەکە

---

[٣] مسلم. إيمان: ٣١٠. بخاري: تفسير: ٤٨٤٦.

پێی دەڵێ: ئەوە چیتە بۆ وا دەکەی؟ دەڵێ: خراپم لێ قەوماوە، هەرچی کردەوەی باشم هەیە هەمووم بەفیڕۆ داناو بووم بە دۆزەخی، بێ وێڵیم لە خزمەتی حەزرەتدا کردووەو پاداشی باشم بەزایە چووە، چونکە من پیاوێکی دەنگ گەورەم‌و کەلەخزمەتی حەزرەتدا قسەدەکەم دەنگم لەدەنگی ئەو بەرز ترە، خوداش فەرموویەتی: لَا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ: دەنگتان سەر دەنگی پێغەمبەر نەکەوێ. ئەوە لەبەر ئەوەیە کەوا مات‌و داماوم!.

پیاوەکەیش هاتەوە بۆ خزمەتی حەزرەت‌و داستانەکەی قەیسی بۆ گێڕایەوە. حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بچۆرەوە بۆلای‌و مژدەی بدەرێ: کە تۆ دۆزەخی نیت، بەڵکوو تۆ بەهەشتیت! (ش).

٤١١٠- عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ (رضي الله عنه) فِي قَوْلِهِ (إِنَّ الَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِنْ وَرَاءِ الْحُجُرَاتِ أَكْثَرُهُمْ لاَ يَعْقِلُونَ) قَالَ فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ حَمْدِي زَيْنٌ وَإِنَّ ذَمِّي شَيْنٌ فَقَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) «ذَاكَ اللَّهُ»[٤].

لەبارەی هۆی دابەزینی ئەم ئایەتەوە: {إِنَّ الَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَاء الْحُجُرَاتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ} (٤٩/٤) واتە: ئەو نەفامانەی کەلە دەرەوە، دوور بە دوور دەیکەن بە بانگە بانگ‌و وەك شوان‌و گاوان بانگ بکەن ئاوا بانگی تۆ دەکەن: هۆ موحەممەد! هۆ پێغەمبەر! بەڕاستی ئەمانە لاژگ‌و بێ هۆشن، دەنا دەستوورو وێڵی ناو کۆمەڵایەتییان دەزانی‌و بەهۆهۆ گازی تۆیان نەدەکرد. لەهۆی هاتنی ئەم ئایەتەوە بەڕای کوڕی عازیب (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پیاوێ هەڵسا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من پیاوێکی وام هەرکەسێ من ستایش‌و مەدحی بکەم دەبێ بەسەربەرزی بۆی‌و هەرکەسێ من زەم‌و خوسپی بکەم دەبێ بەرووزەردی‌و سەرشۆڕی بۆی!!

حەزرەتیش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوە بەس خودا وایە خۆ تۆ خودا نیت، تۆیش بەندەیەکی قنگ هەڵپچڕاوی (ت-س/ح) یقول

---

[٤] رواه الرتمذي بسند حسن (شرحه).

المصنف (رضوان الله عليه) في هذه المناسبة: فالواجب على كل مسلم الأدب في حضرة النبي (صلى الله عليه وسلم) ولو كان يزور قبره، لأنه حي فيه، ومجلس حديث النبي (صلى الله عليه وسلم) كمجلسه.

دانەر (خودای لێ رازی بێ) لەشەرحەکەدا بەم بۆنەیەوە دەفەرموێ: ئەرکی سەرشانی گشت موسوڵمانێکە، کەلەخزمەتی حەزرەتدا سەلارو بەوێڵو بەئەدەب بێ، هەروەها لەکاتی دێنی گۆڕی پیرۆزیشی دا، وە قەدرو ڕێزی کۆڕو مەجلیسی فەرموودەی پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) وەك قەدرو ڕێزی مەجلیس و کۆڕی دانیشتنی کاتی مانی حەزرەت خۆی (دروودی خودای لەسەربێ) وایە. (وەرگێڕ)

نووری کەواتە قسەی هیچو پووچ

لەتاج مەنووسە، با نەبێ بە سووچ

٤١١١- قَرَأَ أَبُو سَعِيدٍ(وَاعْلَمُوا أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ اللَّهِ لَوْ يُطِيعُكُمْ فِي كَثِيرٍ مِنَ الأَمْرِ لَعَنِتُّمْ) قَالَ هَذَا نَبِيُّكُمْ (صلى الله عليه وسلم) يُوحَى إِلَيْهِ وَخِيَارُ أَئِمَّتِكُمْ لَوْ أَطَاعَهُمْ فِي كَثِيرٍ مِنَ الأَمْرِ لَعَنِتُوا فَكَيْفَ بِكُمُ الْيَوْمَ. رواه الترمذي[٥].

ئەبو سەعید (خودای لێ رازی بێ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە دەفەرموێ: {وَاعْلَمُوا أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ اللَّهِ لَوْ يُطِيعُكُمْ فِي كَثِيرٍ مِّنَ الْأَمْرِ لَعَنِتُّمْ} ئەی موسوڵمانەکان! بزانن پێغەمبەری خودا وا لەناوتانا ئەگەر لەگەڵێ کارا بەگوێی ئێوە بکا بە فەتارەت دەچن و تووشی رەنج و مەینەت دەبن. ئینجا گوتی: ئەمە لەکاتێکدا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) خۆی مابێ و پەیتا پەیتا سرووشی لە ئاسمانەوە بۆ بێ و پێشەوا باشەکانتان لە خزمەتیا بن هێشتا ئەمە حاڵەکە بێ کەلەم ئایەتە پیرۆزەدا دیاری کراوە، ئەی دەبێ ئەمڕۆ لەمەو دوا حاڵتان چۆن بێ! (ت-س/ص).

---

[٥] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

**٤١١٢- عَنْ أَنَس** (رضي الله عنه) **قَالَ قِيلَ لِلنَّبِيِّ** (صلى الله عليه وسلم) **لَوْ أَتَيْتَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أُبَيّ. فَانْطَلَقَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ** (صلى الله عليه وسلم) **وَرَكِبَ حِمَارًا، فَانْطَلَقَ الْمُسْلِمُونَ يَمْشُونَ مَعَهُ، وَهْيَ أَرْضٌ سَبِخَةٌ، فَلَمَّا أَتَاهُ النَّبِيُّ** (صلى الله عليه وسلم) **فَقَالَ إِلَيْكَ عَنِّي، وَاللَّهِ لَقَدْ آذَانِي نَتْنُ حِمَارِكَ. فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ مِنْهُمْ وَاللَّهِ لَحِمَارُ رَسُولِ اللَّهِ** (صلى الله عليه وسلم) **أَطْيَبُ رِيحًا مِنْكَ. فَغَضِبَ لِعَبْدِ اللَّهِ رَجُلٌ مِنْ قَوْمِهِ فَشَتَمَا، فَغَضِبَ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا أَصْحَابُهُ، فَكَانَ بَيْنَهُمَا ضَرْبٌ بِالْجَرِيدِ وَالأَيْدِي وَالنِّعَالِ، فَبَلَغَنَا أَنَّهَا أُنْزِلَتْ (وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا). رواه مسلم في الجهاد**[٦].

**ئەنەس** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: عەرزی حەزرەتیان کرد: خۆزیا دەچووی بۆلای عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلوول‌و بانگت دەکرد بۆسەر ئایینی ئیسلام، جا حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **سواری گوێدرێژێ بوو لەگەڵ چەند پیاوێ لەموسوڵمانانندا ڕۆیشت بۆلای، ڕێگەکەش سۆرەکات بوو (لەبەر ئەوە کەمێ تۆزو خۆڵی هەبوو) تۆزو خۆڵی سمی گوێدرێژەکە چوو بە سەر کۆڕی دانیشتنەکەی عەبدوڵڵادا کاتێ پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **دابەزی، عەبدوڵڵا گوتی: توخنم مەکەوەو بچۆ بەولاوە، بەخودا بینی کەرەکەت ئازارم دەدا، پیاوێکی ئەنصاری لەیاران وەڵامی عەبدوڵڵای دایەوەو گوتی: بەخودا بۆنی گوێدرێژەکەی پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **لەبۆنی تۆ خۆشترە! لەو لایشەوە پیاوێ لەکۆمەڵەی عەبدوڵڵا لەسەر عەبدوڵڵا هەڵی دایەو پیاوێ لەکۆمەڵەی ئەنصارییە کە لەسەر ئەنصارییەکە هەڵی دایەو بوو بەهەراو هەردوو لا چوون بەگژ یەکداو بەدەست‌و شەپلاخ‌و دارو لقی خورماو پێڵاو دایان بەسەرو گوێلاکی یەك دیداو تا حەزرەت خۆی** (دروودی خودای لەسەربێ) **کەوتە بەینیانەوەو خامۆشی کردنەوە، گوتی: بەئێمە گەیشتوە**

---

[٦] بخاري. صلح: ٢٦٩١. مسلم. جهاد: ٤٦٣٧.

کەئەم ئایەتە لەواندا هاتۆتە خوارەوە: {وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا} ← (م–رەزای خوای لێ بێ).

٤١١٣– قَالَ أَبُو جَبِيرَةَ بْنِ الضَّحَّاكِ: كَانَ الرَّجُلُ مِنَّا يَكُونُ لَهُ الإِسْمَانِ وَالثَّلاَثَةَ فَيُدْعَى بِبَعْضِهَا فَعَسَى أَنْ يَكْرَهَ قَالَ فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ (وَلاَ تَنَابَزُوا بِالأَلْقَابِ). رواه الترمذي وأبو داود في الأدب بلفظ. قَدَمَ عَلَيْنَا النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) وَمَا مِنَّا رجُلٌ إِلاَّ وَلَهُ إِسمان أو ثلاثَةٌ فَجَعَلَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) يَقُول يا فُلان فَيَقُول مه يا رَسُولَ الله إِنَّهُ يَغضَب مِنْ هذا الإِسم، فَنَزَلَتْ آية:[٧].

ئەبو جوبەیرەی کوڕی ضەححاك گوتی: پیاوی وامان هەبوو دووناو سێ ناوی هەبوو، وا دەبوو کەبەناوێ لەوناوانەی بانگ دەکرا پێی ناخۆش بوو (وەکوو بەهەندێ کەس دەڵێن: دێوە، گورگە، سمەشەل، شەمەکەل، خلەخێل، خولەگێلو ناوی تری وا) کە خاوەنەکەی پێی ناخۆشە. جا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: {وَلَا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ} (٤٩/١١) واتە: وە ناتۆرە بۆ یەکتری فڕەمەدەنو ناوو ناتۆرەی ناشیرین لەیەکتر مەنێن (ت–س/ص) ئەبو داودیش لە (الأدب)دا بەم گفتەیە دەیگێڕێتەوە: کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هات بۆناومان، بۆ مەدینە، پیاو نەبوو لەئێمە کە دووسێ ناوی نەبێ، جا گەلێ جار، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەناوێ لەو ناوانە بانگی لە زەلامی دەکرد، دەیانگوت: نا، وا بانگی مەکە، ئەی پێغەمبەری خودا! چونکە ئەم پیاوە بەوناوە تووڕەو قەڵس دەبێ! جا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَسْخَرْ قَومٌ مِّن قَوْمٍ عَسَى أَن يَكُونُوا خَيْرًا مِّنْهُمْ وَلَا نِسَاء مِّن نِّسَاء عَسَى أَن يَكُنَّ خَيْرًا مِّنْهُنَّ وَلَا تَلْمِزُوا أَنفُسَكُمْ وَلَا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ بِئْسَ الاِسْمُ الْفُسُوقُ بَعْدَ الْإِيمَانِ وَمَن لَّمْ يَتُبْ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ} (٤٩/١١) واتە: ئەی موسوڵمانینە! سەرمەکەنە گاڵتەو گەمەو لاقرتێو، یەکتری مەکەن بەنیشانەی تیرو تانەو توانجی

[٧] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

خۆتان، بۆ ئەمەیشە پیاوو ژن وەك یەكن، كێ دەڵێ ئەو پیاوەی یا ئەو ژنەی كە ئێوەی پیاوان، یا ئێوەی ژنان گاڵتەی پێدەكەن لەلای خودا لەئێوە باشتر نییە، زۆر ناشیرینە ناوو ناتۆرەو قسەیەك كە پێچەوانەی یاسای ئیسلام بێ دوای ئەوەی كە مرۆڤ باوەڕی بەخودا كرد، وەهەر كەس تۆبە لەم كارانە نەكا، ئەوە لەستەمكاران دەژمێردرێ.

٤١١٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنهما) قال خَطَبَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) النَّاسَ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ فَقَالَ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَذْهَبَ عَنْكُمْ عُبِّيَّةَ الْجَاهِلِيَّةِ وَتَعَاظُمَهَا بِآبَائِهَا فَالنَّاسُ رَجُلاَنِ رَجُلٌ بَرٌّ تَقِيٌّ كَرِيمٌ عَلَى اللَّهِ وَفَاجِرٌ شَقِيٌّ هَيِّنٌ عَلَى اللَّهِ وَالنَّاسُ بَنُو آدَمَ وَخَلَقَ اللَّهُ آدَمَ مِنْ تُرَابٍ». قَالَ اللَّهُ (يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ)[٨].

عەبدوڵلای كوڕی عومەر (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: لەڕۆژی ئازاد كردن و گرتنی شاری مەككەدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دوانێكی بۆ مەردومەكە دا، فەرمووی: ئەی خەڵكینە! ئەی مەردوم! بزانن كەوا خودای گەورەی ئێوە خۆپەرستی و دەعیەو فیزی لەناوتانا هەڵگرتووە، ئەم جۆرە خووە ناپەسەندانەی كەلەكاتی نەزانی پێش هاتنی ئاینی ئیسلام دا لەناوتانا باو بوو، وەك خۆبەزل زانین و كەش و فش بە باوو باپیرەوە، ئەم جۆرە شتانە لەئیسلام و سەردەمی ئیسلام دا نەماوە، ئادەمیزاد بەپێی یاسای خودا یەكێكە لەم دووكەسە: یا باشەو لەخوا ترسەو بەڕێزەو نازدارە لەلای خودا، یا بە دەو بەدكارەو بەدڕەوشت و بەدبەخت و سووك و ڕیسواو ترۆیە لەلای خودا! ئەمە بەپێی كردەوە، وەكی تریش ئادەمیزاد هەموویان نەتەوەی ئادەمن و خودایش ئادەمی لەگڵ دروست كردووە، وەك خۆی فەرموویەتی: {يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم

---

[٨] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ} ← (ت–بەسەندێكی غەریب).

٤١١٥– عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ (رضي الله عنه) عَنْ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: «الْحَسَبُ الْمَالُ وَالْكَرَمُ التَّقْوَى». رواهما الترمذي[٩].

سەموره (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەبارەی ئایەتی {إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ}ەوە فەرمووی: حانەدانی بەماڵە واتە: كەماڵت هەبوو خانەدانی، كەماڵت نەبوو سەد خانەدان بی كەس قەدرت ناگرێ ڕێزو گەورەییش لەلای خودا بەپێی تەقواو لەخودا ترسان و پارێز لەگوناهانە (ت–س/ص).

## ٣٣- سوورەتی قاف

(مەككەییە، ٤٥ ئایەتە)

## سورة ق (مكية، وهي خمس وأربعون آية)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤١١٦– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) عَنْ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: «يُقَالُ لِجَهَنَّمَ هَلِ امْتَلأْتِ وَتَقُولُ هَلْ مِنْ مَزِيدٍ فَيَضَعُ الرَّبُّ تَبَارَكَ وَتَعَالَى قَدَمَهُ عَلَيْهَا فَتَقُولُ قَطِ قَطِ». رواه الشيخان والترمذي[١].

ئەبو هورەیره (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: لەڕۆژی قیامەتا دەستە دەستە خەڵك بەرك دەدەنە ناو دۆزەخەوە بەڵام دۆزەخ لە بەرگەورەیی و پان و پۆریی خۆی هەر پڕ نابێ، جا گشت جارێ كە بە دۆزەخ دەڵێن: ئایا پڕ بووی؟یا ماوتە كە پڕ ببی؟ ئەویش دەڵێ: ئایا هی ترماوە؟ ئەگەر هی ترماوە بابێ! ئەم حاڵ و

---

[٩] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[١] بخاري. تفسير: ٤٨٤٨، ٤٨٥٠، ١٤٤٩ = تەجريد ٤٩٢/٤ رقم: ١٦٩٧. مسلم. جنة: ٧١٠٨.

پرسیارو وەڵامە هەروا بەردەوام دەبێ، هەتا خودای پیرۆزو گەورە پای خۆی دادەنێ لەسەری و دەمکوتی دەکا، ئەوجا دەڵێ: بەسمە، بەسمە (ش/ت) عەللامەی عەینی (خودای لێ ڕازی بێ) دەفەرموێ: ڕێبازگە (مەذهەب)ی زاناکان لەوێنەی ئەم فەرموودەیەدا کە ئیسباتی صیفات بۆ خودا دەکا، وەك دەست و قاچ و چاو، دەبێ بەدوو ڕارەو، یەکێکیان کە ڕێبازی دەستەی بەخوا سپێرەکان (المفوضة) ئەمەیە: باوەڕمان بەم صیفەت و نیشانانەی خودایە هەیە، بەپێی خواستی خودا خۆی لەمانە، کەواتایەکی وایان هەیە شایەنی شانی ئەو زاتەبێ، بەڵام واتا دیمەنییەکەی و مەعنا بەرووە بووەکەی مەبەست نییە.

قسەی دەستەی دووەم دوورو درێژە، بەڵام ئەگەر کەسێ دەیەوێ ئاگای لێ ی بێ ئەوا لەعەینی دا، لە تەفسیری سوورەتی قافدا نووسراوە، بەڵام بەندە کە بەووردی سەرنجی ڕای ئەهلی تەئویلم دا واهات بەیادما کە سەرەنجامی هەردوو ڕایەکە یەکە، کەئەم جۆرە ووشانە ظاهیریان مەبەست نییە، مەعنایەکی تایبەتی خۆیان هەیە، ئەهلی تەفویض دەم لەو مەعنایە ناکوتن و زانینی ئەوە هەواڵە بەعیلم و زانستی خودا دەکەن، وەلێ ئەهلی تەئویل هەوڵی ئەوە دەدەن کەمەبەستەکە بدۆزنەوە (وەرگێڕ).

٤١١٧- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: ((تَحَاجَّتِ الْجَنَّةُ وَالنَّارُ فَقَالَتِ النَّارُ أُوثِرْتُ بِالْمُتَكَبِّرِينَ وَالْمُتَجَبِّرِينَ. وَقَالَتِ الْجَنَّةُ مَا لِي لاَ يَدْخُلُنِي إِلاَّ ضُعَفَاءُ النَّاسِ وَسَقَطُهُمْ. قَالَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى لِلْجَنَّةِ أَنْتِ رَحْمَتِي أَرْحَمُ بِكِ مَنْ أَشَاءُ مِنْ عِبَادِي. وَقَالَ لِلنَّارِ إِنَّمَا أَنْتِ عَذَابِي أُعَذِّبُ بِكِ مَنْ أَشَاءُ مِنْ عِبَادِي. وَلِكُلٍّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا مِلْؤُهَا، فَأَمَّا النَّارُ فَلاَ تَمْتَلِئُ حَتَّى يَضَعَ رِجْلَهُ فَتَقُولُ قَطٍ قَطٍ قَطٍ. فَهُنَالِكَ تَمْتَلِئُ وَيُزْوَى بَعْضُهَا إِلَى بَعْضٍ، وَلاَ يَظْلِمُ اللَّهُ - عَزَّ وَجَلَّ - مِنْ خَلْقِهِ أَحَدًا، وَأَمَّا الْجَنَّةُ فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يُنْشِئُ لَهَا خَلْقًا. رواه الشيخان[٢].

---

[٢] بخاري. تفسير: ٤٨٥٠، مسلم. جنة و نعيمها: ٧١٠٤.

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بەهەشت و دۆزەخ دەبێ بەدەمەقاڵیان، دۆزەخ دەڵێ: خۆ بەزلزان و بەزەبرو زەنگەکان تەرخان کراون بۆمن، بەهەشتیش دەڵێ: ئەی من چیمە، کەوا هەر لازەبوونەکان و بێنەوایانی ئەو خەڵکەم تێ دێن و بووم بەجێگەی دوا ڕۆژی ڕەش و ڕووتەکان! ئەوجا خودای گەورەو سەروەر دەفەرموێ: ئەی بەهەشت! تۆ ڕەحمەتی منی، هەر کەسێ خۆم بمەوێ لەبەندەکانی خۆم، ڕەحمی پێ دەکەم و تۆ دەکەم بەشوێنی ڕەحمەت بۆی، وە بەدۆزەخیش دەفەرموی: تۆ هۆی سزای منی، هەرکەسێ خۆم بمەوێ، لەبەندەکانی خۆم بە تۆ سزای دەدەم و تۆ دەکەم بەجێگەی سزادانی، وە بەڵێنە لەسەرم کە هەردوو لاتان پڕبکەم، هەر کەسەتان لەئەهلی خۆی، بەڵام دۆزەخ هەر لرفەی دێ، هەر پڕنابێ، پەیتا پەیتا هەر خەڵکی تێ فڕە دەدەن و هەر دەڵێ: ئەگەر ماوە بابێ! هەتا خودا پێی عیززەتی دادەنێ لەسەری ئەودەمە وازدێنێ و دەڵێ: ئیتر بەسە، ئیتر بەسە، جێگە نەما جا ئەوجا پڕ دەبێ و دەپەچنێ بەسەریەکاو لەناو خۆیدا پەنگ دەخواتەوە! دیارە کە خودای گەورەو خاوەن شکۆ زۆرو ستەم لەکەس ناکا، لە دروستکراوانی خۆی، وەهەروەها بەهەشتیش هەر پڕ نابێ و شوێنی وای هەیە کە هەر چۆڵە، تا خودا لەنوێ خەڵکی تری بۆ دروست دەکاو بەوانە پڕی دەکا! (ش).

٤١١٨- ← (ب/١ ز/٤٤ ل/١٩٠ ف/٢)[٣].

قال اللّٰهُ تَعَالَى: {وَمِنَ اللَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَأَدْبَارَ السُّجُودِ} (٥٠/٤٠).

واتە: وەلەهەندێ لەشەویشا یا دوو تەسبیحی خودای خۆت بکەو لەپاش نوێژەکانیش.

٤١١٩- قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) أَمَرَهُ أَنْ يُسَبِّحَ فِي أَدْبَارِ الصَّلَوَاتِ كُلِّهَا. رواه البخاري[٤].

---

[٣] تقدم في المجلد الأول. تسلسل/١٤ رقم: ٣٤٧/٢.

**ئیبنو عەبباس** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: خودا لەم ئایەتەدا فەرمانی کردووە بە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **کەلە پاش هەموو نوێژی تەسبیحاتو زیکرو یادی خودا بکاو وێرد بخوێنێ (ب).**

## ٣٤- سوورەتی ذاریات

**(مەکییە، شەست ئایەتە)**

**سورة الذاريات (مكية، وهي ستون آية)**

**بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ**

**٤١٢٠- عَنْ الحارث بن يزيد البكري** (رضي الله عنه) **قَالَ قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ فَدَخَلْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ** (صلى الله عليه وسلم) **فَذَكَرْتُ عِنْدَهُ وَافِدَ عَادٍ فَقُلْتُ أَعُوذُ بِاللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِثْلَ وَافِدِ عَادٍ. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ** (صلى الله عليه وسلم) **«وَمَا وَافِدُ عَادٍ؟». قَالَ: فَقُلْتُ: عَلَى الْخَبِيرِ سَقَطْتَ إِنَّ عَادًا لَمَّا أُقْحِطَتْ بَعَثَتْ قَيْلاً فَنَزَلَ عَلَى بَكْرِ بْنِ مُعَاوِيَةَ فَسَقَاهُ الْخَمْرَ وَغَنَّتْهُ الْجَرَادَتَانِ ثُمَّ خَرَجَ يُرِيدُ جِبَالَ مَهْرَةَ فَقَالَ اللَّهُمَّ إِنِّى لَمْ آتِكَ لِمَرِيضٍ فَأُدَاوِيَهِ وَلاَ لأَسِيرٍ فَأُفَادِيَهُ فَاسْقِ عَبْدَكَ مَا كُنْتَ مُسْقِيَهُ وَاسْقِ مَعَهُ بَكْرَ بْنَ مُعَاوِيَةَ. يَشْكُرُ لَهُ الْخَمْرَ الَّذِى سَقَاهُ فَرُفِعَ لَهُ سَحَابَاتٌ فَقِيلَ لَهُ اخْتَرْ إِحْدَاهُنَّ فَاخْتَارَ السَّوْدَاءَ مِنْهُنَّ فَقِيلَ لَهُ خُذْهَا رَمَادًا رَمْدَدًا لاَ تَذَرُ مِنْ عَادٍ أَحَدًا وَقَالَ: أَنَّهُ لَمْ يُرْسَلْ عَلَيْهِمْ مِنَ الرِّيحِ إِلاَّ قَدْرُ هَذِهِ الْحَلْقَةِ يَعْنِى حَلْقَةَ الْخَاتَمِ. ثُمَّ قَرَأَ (إِذْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ الرِّيحَ الْعَقِيمَ مَا تَذَرُ مِنْ شَىْءٍ أَتَتْ عَلَيْهِ إِلاَّ جَعَلَتْهُ كَالرَّمِيمِ) الآيَةَ. رواه النسائي والترمذي. نسأل الله حسن الصناعة والرواية آمين[1].**

**حاریثی کوڕی یەزیدی ئەل-بەکری** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: چووم بۆ مەدینە، چوومە خزمەتی پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **باسی نوێنەرەکەی هۆزی عادم بۆیکرد، وە عەرزیم کرد: پەنا دەگرم بە ڕەحمەتی خودا لەوە**

---

[4] بخاري. تفسير: ٤٨٥٢.

[1] سكت عن درجته الشارح.

کەمنیش وەك ئەوم بەسەربێ، فەرمووی: بۆچی نوێنەرەکەی هۆزی عاد چی بەسەرهاتبوو؟ گوتم: بەڕاستی لەکەسێکی شارەزای ئەم باس‌و خواسەت پرسی، هۆزی عاد کە تووشی قاتوقڕی‌و نەهاتی‌و بێ بارانی بوون، قەیل ناوێکیان نارد بۆ حەرەمی مەککە، کەلەوێ لەخودا داوای بارانیان بۆبکا، قەیلیش لەپێشا چوو بوو بە میوانی بەکری کوڕی موعاوییە کەلە مەککە بوو، بەکریش هەموو ڕۆژێ مەستی دەکرد لەمەی‌و بادەو ئارەق، وە دوو گورجی دەنگخۆشیش هەموو ڕۆژێ بەزم‌و ئاهەنگیان بۆ دەگێڕا، تاماوەی مانگێ ئەمە کاری بوو لەپاشدا دەرچوو بەرەو چیاکانی خێڵی مەهەرە، لەوێ گوتی: خودایە! من نەهاتووم بۆلای تۆ لە بەر نەخۆشێ تاچاری بکەم یا لەبەر دیلێ تا سەرانەی بۆ بدەم‌و بەرەڵای بکەم، بەڵام بۆ ئەوە هاتووم کەوەك جاری جاران باران ببارێنە بۆ ئەم بەندەی خۆتەو بۆ بەکری کوڕی موعاوییەش لەگەڵ ئەودا، جا بەفەرمانی خودا چەند پەڵە هەورێ لەدوورەوە بۆی دەرکەوتن‌و لەناو هەورەکەوە دەنگێ پێی گوت: بۆخۆت پەڵەیێ لەم هەورانە هەڵبژێرە، پەڵەیەکی رەشیان تیابوو، ئەوەیانی هەڵبژارد بۆ خۆی. لە غەیبەوە پێی گوترا: ها وەری بگرە، ئەوە هەوری باران نییە بەڵکوو ئەوە خۆڵەمرێکی پڕ لە ژیلەمۆیە، کەس لەهۆزی عاد قوتار ناکا، چۆلەکە بکوژیان لێ دەبڕێ!

وە گوتی: کونی ئەوبایەی خودا ناردیە سەریان‌و تەفرو تونایانی کرد پێی بەقەی ئەم ئەڵقەیە بوو (واتە: بەقەی کونی ئەڵقەی ئەموستیلەکەی دەستی) ئینجا ئەمەی خوێندەوە: {إِذْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ الرِّيحَ الْعَقِيمَ، مَا تَذَرُ مِن شَيْءٍ أَتَتْ عَلَيْهِ إِلَّا جَعَلَتْهُ كَالرَّمِيمِ} (٥١/٤١-٤٢) واتە: وەلەگەڵ عادیشا نیشانەیەکی گەورە هەیە، بۆ موسوڵمانی هۆشیار، لەوکاتەدا کە قارمان لێ گرتن، بایەکی سەختی بێ خێرو بێرمان ناردە سەریان دەیدا لەهەرچی شتێ دەیکرد بە خۆڵەمێش (ن/ت) لەخودا داوا دەکەین بەجوانی کاری خۆمان ساز بدەین‌و کارجوان بین‌و فەرموودەی حەزرەتیش بەجوانی بگێڕینەوە. ئامین خودایە.

## ٣٥- سوورەتی طوور

(مەکەییە، چلو نۆ ئایەتە)

## سورة الطور (مكية، وهي تسع و أربعون آية)

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

**٤١٢١- قَالَ بْنِ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ** (رضي الله عنه) **سَمِعْتُ النَّبِيَّ** (صلى الله عليه وسلم) **يَقْرَأُ فِي الْمَغْرِبِ بِالطُّورِ فَلَمَّا بَلَغَ هَذِهِ الآيَةَ (أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ * أَمْ خَلَقُوا السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ بَلْ لاَ يُوقِنُونَ * أَمْ عِنْدَهُمْ خَزَائِنُ رَبِّكَ أَمْ هُمُ الْمُسَيْطِرُونَ) كَادَ قَلْبِي أَنْ يَطِيرَ.** رواه البخاري[١].

**جوبەیری کوڕی موطعیم** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: گوێم لێ بوو پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **لەنوێژی شێواندا سوورەتی طووری دەخوێند، کە گەیشتە سەر ئەم ئایەتانە {أم خلقوا...} هەتا {..المسيطرن} (٥٢/٣٥-٣٧) واتە: ئایا هۆش و بیری ساخ ڕێی ئەوە دەدا کە ئەو خەڵکەو ئەو بوونەوەرە سەیرە هەروا لەخۆیەوە بەهەوانتە، بەبێ دروستکارێکی داناو زانا پەیدا بووبێ، یا ئەم لەپەتبەربووانە خۆیان دروستکەری خۆیانن بۆیە بەندەیی بۆ خوداناکەن، یا بەئەقڵی کێ دادەچێ کەئەم هەموو ئاسمانە گەورانە، ئەم زەوییە بەرینە بەدەستی ئەو خوێڕی و لاژگانە دروست کرابن، دیارە کەئەم داوایانە هەموویان پووچن، کەوا بوو ئەم بێ باکی ئەمانە ئەوەیە کە نەزان و نەفام و بێ باوەڕن، دیارە بۆیەیش ددان نانێن بە پێغەمبەرایەتیی تۆدا چونکە خۆیان کلیل بەدەستی گەنجینەکانی خودان! یاخود خۆیان بۆ هەموو شتێ بەدەستەڵاتن و بە بێ ڕەزای ئەوان کەس ناتوانێ پەنجە بکا بە ئاوا. جوبەیر** (خودای لێ ڕازی بێ) **گوتی: کە حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **گەیشتە سەر ئەم ئایەتانە وا بەجوانی و بە تەئسیر خوێندی کاری تێ کردم و سام و شکۆیەکی وا گرتمی وەختە بوو دڵم، بفڕێ و بەندی دڵم بپچڕێ (ب) ← (ب/١ ز٨٠ ل/٢٦٧ ف/٢).**

---

[١] بخاري. تفسير: ٤٨٥٤ = تجريد البخاري/٤ ل/٤٩٥ رقم: ١٦٩٩ + ٤١٦ = ٧٦٥ فتح.

٤١٢٢- و للترمذي: «إِدْبَارُ النُّجُومِ الرَّكْعَتَانِ قَبْلَ الْفَجْرِ وَإِدْبَارُ السُّجُودِ الرَّكْعَتَانِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ». نسأل الله تمام التوفيق[٢].

تیرمیژی (خودای لێ ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: مەبەست لە تەسبیحی (أدبار النجوم) لەئایەتی {وَمِنَ اللَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَأَدْبَارَ السُّجُودِ} (٥٢/٤٠) دا دوو ڕکات نوێژی سوننەتی پێش نوێژی بەیانییەو مەبەس لەتەسبیحی (ادبار السجود) لەئایەتی {وَمِنَ اللَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَأَدْبَارَ السُّجُودِ} (٥٠/٤٠)دا دوو ڕکات نوێژی شێوانە.

لە (طور) دابەزە (نەجم) بەیادکە
بەڕەحمی (ڕەحمان) دڵی خۆت شادکە
خۆشە قڤولقەمەر نابێ نەگەر تۆ
یەک دەم بەبادەی خەمی کۆن و نۆ!!

## ٣٦- سوورەتی نەجم

(مەکەییە، شەستو دوو ئایەتە)

## سورة النجم (مكية، وهي إثنتان وستون آية)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤١٢٣- قَالَ الشَّيْبَانِيُّ (رضي الله عنه) سَأَلْتُ زِرَّ بْنَ حُبَيْشٍ عَنْ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: (فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَى، فَأَوْحَى إِلَى عَبْدِهِ مَا أَوْحَى، مَا كَذَبَ الْفُؤَادُ مَا رَأَى). قَالَ أخبَرَنا ابْنُ عبدالله أَنَّ محمَّداً (صلى الله عليه وسلم) رَأَى جِبْرِيلَ لَهُ سِتُّمِائَةِ جَنَاحٍ. رواه الشيخان والترمذي[١].

---

[٢] راجع رقم: ٤١١٩ / في تسلسل/٣٣ من هذا المجلد.

[١] بخاري. تفسير: ٤٨٥٦، ٤٨٥٧، ٣٢٣٢ = تجريد/٣ ل/٤٣٦ رقم: ١٣٠٤. مسلم. إيمان: ٤٣٢، ٤٣٣. ترمذي، تفسير القرآن: ٣٢٧٧.

**شەیبانی** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: پرسیارم لە زیڕکرد لە فەرموودەی خودا: {فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَى، فَأَوْحَى إِلَى عَبْدِهِ مَا أَوْحَى، مَا كَذَبَ الْفُؤَادُ مَا رَأَى} (٥٣/٩-١١) وەها لە پێغەمبەر نزیك بووە، كە نێوانیان بەقەد دووكەوان دەبوو، یا كەمتر، جا لەو شوێنەدا وەحیو سرووشی كرد بۆ لای بەندەی خۆشەویستی خودا، كە موحەممەدە، ئەو سرووشو وەحیە، حەقائقو تەفاصیلو ئەسرارەكەی هەر خوداو پێغەمبەر خۆیان زۆر بەجوانی دەزانن كە چییەو چی نییە، ئەوەی كە موحەممەد بەچاوی سەربینی بەچاوی دڵیش بینیو هەستو هۆش لەبۆنی رەحمەتو ڕەفعی زەحمەت مەست بوونو چاوو دڵ بۆ یەكتری بوون بەشایەتی داوای یەكتری! شەیبان گوتی: لەوەلاما زیڕ گوتی: لەم بارەیەوە عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود هەواڵی بەئێمەداوە: كە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **لەم جێگەیەدا جوبرائیلی دیوە، دروودی خودا لەسەر هەردوكیان بێ، شەش سەد باڵی بووە! (ش/ت).**

**٤١٢٤- وَقَالَ مسروقٌ لِعائِشة** (رضي الله عنها) **أينَ قَوْلَهُ تعالى: (ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّى...) إلى آخر الحديث[٢].**

**ئەم فەرموودەیە بە دوورو درێژی لە تەفسیری سوورەتی ئەنعاما ڕابورد، فەرموودەی هەشتەم.**

**٤١٢٥- وَقَالَتْ عَائِشَةَ** (رضي الله عنه) **رَأَى النَّبِيِّ جِبْرِيلَ (عليه السلام) فِي صُورَتِهِ (الأصلية) مَرَّتَيْنِ. رواه الشيخان والترمذي وزاد: مَرَّةً عِنْدَ سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى وَمَرَّةً فِي جِيَادٍ لَهُ سِتُّمِائَةِ جَنَاحٍ قَدْ سَدَّ الأُفُقَ[٣].**

**عائیشە** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **دووجار بەچاوی سەر جوبرائیلی لەسەر شێوەی ڕاستەقینەی خۆی دیوە (ش/ت)**

---

[٢] تقدم في تفسير سورة الأنعام في حديث طويل، الحديث الثامن، ل/١٥٨.

[٣] بخاري. تفسير. ٤٨٥٦، ٤٨٥٧، ٣٢٣٢ = تجريد/٣ ل/٤٣٦ رقم/١٣٠٤، مسلم. الإيمان: ٤٣٢، ٤٣٣. ترمذي. تفسير القرآن: ٣٢٧٧.

گێڕانەوەی (ت) ئەمەی پترە: جارێ لەلای شەجەرەی سیدرەتولمونتەهاداو جارێ لە جییادا، کە شوێنێکە وا لەنزیکی ئەشکەوتی حیرادا، لەو کاتەدا شەش سەد باڵی بووە، لەبەر گەورەیی خۆی رووی ئاسمانی بە تەواوی داگرتبوو.

٤١٢٦- حەدیثی (نور أنى أراه) لە تەفسیری سوورەتی ئەنعامدا رابورد (ف/٩)[٤].

٤١٢٧- ئەم فەرموودەیەش لەتەفسیری سوورەتی ئەنعاما ڕابوورد، (ف/٨). لێرە دەفەرموێ: عیکرەمە (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: موحەممەد خودای خۆی بەچاوی سەر دیوە، منیش گوتم: چۆن وادەفەرمووی، ئەدی خودا نافەرموێ: {لاَّ تُدْرِكُهُ الأَبْصَارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الأَبْصَارَ؟} گوتی: بێوەی بیت! ئەوە کاتێ وایە کە بەو نووره خۆی بنوێنێ کە نووری حەقیقی خۆیەتی. گوتی: بەڵام دووجار خودا خۆی نیشانی موحەممەد داوە (ت-س/ح)[٥].

٤١٢٨- قَالَ الشَّعْبِيُّ: لَقِيَ ابْنُ عَبَّاسٍ كَعْبًا (رضي الله عنهم) بِعَرَفَةَ فَسَأَلَهُ عَنْ شَيْءٍ فَكَبَّرَ حَتَّى جَاوَبَتْهُ الْجِبَالُ فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ إِنَّا بَنُو هَاشِمٍ. فَقَالَ كَعْبٌ: إِنَّ اللَّهَ قَسَمَ رُؤْيَتَهُ وَكَلاَمَهُ بَيْنَ مُحَمَّدٍ وَمُوسَى فَكَلَّمَ مُوسَى مَرَّتَيْنِ وَرَآهُ مُحَمَّدٌ مَرَّتَيْنِ. رواهما الترمذي[٦].

شەعبی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: لەکێوی عەرەفات ئیبنو عەبباس تووشی کەعب بوو، (ڕەزای خودایان لێ بێ)، پرسیاری شتێکی لێ کرد، کەعبیسش بەدەنگی بەرز، بەرەنگێ ئەڵڵاهوئەکبەری کرد، کێوەکان دەنگیان دایەوە! ئیبنو عەبباس گوتی: پیاوی خۆت بناسە، ئێمە نەتەوەی هاشمین (و سەرچاوەی ئاییین و زانستین، کە پرسیارێکت لێ دەکەین، خۆت لێ نەگۆڕێ

---

[٤] تقدم بالمجلد السادس. تسلسل/٧ برقم: ٩/٣٨٦٠.

[٥] تقدم بالمجلد السادس. تسلسل/٧ برقم: ٣٨٥٩/٨.

[٦] بسند لاطعن فيه (شرحه).

جا کەعب گوتی: خودا دیتنی خۆی و قسەکردنی خۆیی دابەشکردووە لەنێوانی موحەممەدو مووسادا (دروودی خودای لەسەربێ) لەسەر ئەم شێوەیە: خودا دووجار قسەی لەگەڵ مووسادا کردووە، وە موحەممەد دوو جار چاوی بەخودا کەوتووە (ت).

٤١٢٩- وَقَالَ أَنَسٌ (رضي الله عنه): رَأَى مُحَمَّدٌ رَبَّهُ. رواه ابن خزيمة، بإسنادٍ قويّ[٧].

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: موحەممەد (دروودی خودای لەسەربێ) پەروەردگاری خۆی چاو پێکەوتووە! (ئیبنو خوزەیمە بەڕشتەیەکی بەهێز ئەم فەرمایشتەی گێڕاوەتەوە).

٤١٣٠- قَالَ عَبْدِ اللَّهِ (رضي الله عنه) لَمَّا بَلَغَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) سِدْرَةَ الْمُنْتَهَى قَالَ «انْتَهَى إِلَيْهَا مَا يَعْرُجُ مِنَ الأَرْضِ وَمَا يَنْزِلُ مِنْ فَوْقَ. قَالَ فَأَعْطَاهُ اللَّهُ عِنْدَهَا ثَلاَثًا لَمْ يُعْطِهِنَّ نَبِيًّا كَانَ قَبْلَهُ فُرِضَتْ عَلَيْهِ الصَّلاَةُ خَمْسًا وَأُعْطِيَ خَوَاتِمَ سُورَةِ الْبَقَرَةِ وَغُفِرَ لأُمَّتِهِ الْمُقْحِمَاتُ مَا لَمْ يُشْرِكُوا بِاللَّهِ شَيْئًا». رواه الترمذي ومسلم[٨].

عەبدوڵڵا (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەشەوی ئیسرادا دەگاتە سیدرەتولمونتەها، لەوێ خودا سێ خەڵاتی گەورەی وای پێ بەخشی، کەلەوەو پێش خەڵاتی وا گەورەی بەهیچ پێغەمبەرێکی تر نەداوە: یەکەم خودا، شەوو ڕۆژی پێنج نوێژ لەسەر خۆی و یەك بەیەکی ئوممەتی دا دەنێ. دووەم: ئایەتەکانی کۆتایی سوورەتی بەقەرەی پێ خەڵات دەکا، سێیەم: لەگوناەو تاوانە زلەکانی ئۆمەتی خۆش دەبێ، واتە: ئەو گوناەو تاوانە زلانەی کە خاوەنەکانیان دەکەن بە قوڕداو بە ڕەو دۆزەخ دەیان بەن، بەڵام بەمەرجێ کەهیچ هاوبەش و شەریك بۆ خودا پەیدا نەکەن، واتە: لەسەر ئیمان بمرن. عەبدوڵڵا گوتی:

---

[٧] بسند قوي رواه ابن خزيمة.

[٨] مسلم. إيمان: ٤٣٠، ترمذي تفسير: ٣٢٧٦، نسائي: صلاة: ٤٥٠.

سیدرەتولمونتەها بۆیە ناونراوە سیدرەتولمونتەها بە کوردی واتە: دارمۆردی سەرەنجام، یا دارمۆردی هەرە ئەوپەڕ چونکە هەرچی لە زەوییەوە سەردەکەوێو هەرچی لەلای سەرەوە دێتە خوارەوە سەرەنجام لەوێ وەردەگیرێ (ت/م) ئیمامی نەوەوی (ڕەزای خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: مەبەست ئەوە نییە کەهەر کەسێ تاوانە گەورەکان بکا بە مەرجێ لەسەر ئیمانو باوەڕ بمرێ یەك سەر بەبێ پرسینەوەو تۆڵە لێ سەندن دەڕوا بۆ بەهەشت، بەڵکو مەبەست لەم لێ خۆشبوونە ئەوەیە کە بەئێجگاری لەدۆزەخا نابێ. (وەرگێڕ)

قال اللّٰهُ تَعَالَى: {لَقَدْ رَأَى مِنْ آيَاتِ رَبِّهِ الْكُبْرَى} (١٨/٥٣).

واتە: بێگومان لەم کاتەدا موحەممەد گەلێ نیشانەی گەورە گەورەی دی، لەو نیشانانەی کەدەبنە بەڵگەی گەورەیی و تەوانایی و دانایی خودا.

٤١٣١- قالَ عَبْدِ اللّٰهِ (رضي الله عنه): رَأَى رَفْرَفًا أَخْضَرَ قَدْ سَدَّ الأُفُقَ. رواه البخاري[٩].

عەبدوڵڵا (خودای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) لەشەوی ئیسرادا جوبرائیل دەبینێ لەسەر ڕایەخێکی گەورەی سەوز دەبێ، لەبەر گەورەیی وەك تارا ڕووی ئاسمان دادەپۆشێ (ب).

٤١٣٢- قَالَ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما): (اللاَّتَ وَالْعُزَّى) كَانَ اللاَّتُ رَجُلاً يَلُتُّ سَوِيقَ الْحَاجِّ.رواه البخاري[١٠].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) دەڵێ: لات لەم ئایەتەدا: {أَفَرَأَيْتُمُ اللاَّتَ وَالْعُزَّى} (١٩/٥٣) واتە: ناوی پیاوێ بووە ئیشی ئەوە بووە لەکاتی حەجدا قاوتو ڕۆنی بۆ حاجیان دەگرتەوەو دەرخواردی دەدان کەمرد پەیکەرێکیان لەبەرد بۆی دروست کردو دەستیان کرد بەپەرستنی (ب).

---

[٩] بخاري. تفسير: ٤٨٥٨.

[١٠] بخاري. تفسير: ٤٨٥٩.

٤١٣٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنه) (الَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَائِرَ الإِثْمِ وَالْفَوَاحِشَ إِلاَّ اللَّمَمَ) قَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) «إِنْ تَغْفِرِ اللَّهُمَّ تَغْفِرْ جَمًّا وَأَيُّ عَبْدٍ لَكَ لاَ أَلَمَّا». رواه الترمذي[١١].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) فەرمووی: لەبارەی {الَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَائِرَ الْإِثْمِ وَالْفَوَاحِشَ إِلَّا اللَّمَمَ} (٣٢/٥٣) واتە: ئەوکەسانە کەنار دەگرن لەگوناهە گەورەکانو خۆیان دەپارێزن لەکارە شەرم ئاوەرو ئابڕوو بەرەکان، با جارو باریش وورده گوناهیان لێوە ڕوو بدا، ئەم جۆرە کەسانە بەر لێخۆشبوونی بەروالای گەورەی خودای تۆ دەکەون، کە هەمیشە بەچاوی میهرو ڕەحمەت تەماشای خۆتو ئۆمەتت دەکا. گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەم بۆنەیەوە ئەم شیعرەی ئومەییەی کوڕی صەلتی خوێندەوە، کەدەڵێ:

إِنْ تَغْفِرِ اللَّهُمَّ تَغْفِرْ جَمَّا     وَأَيُّ عَبْدٍ لَكَ لاَ أَلَمَّا

واتە:

سەرجەم گوناهمان بپۆشە خوایە!   کام بەندەت هەیە کە بێگونایە؟

یا ئاوا:

بەندەی بەبێ نەنگ کوا هەیە خوایە؟   کەوایە خۆش بە لەهەموو لایە!

(ت-س/ص)

٤١٣٤- وَعَنْهُ قَالَ: سَجَدَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) بِالنَّجْمِ وَسَجَدَ مَعَهُ الْمُسْلِمُونَ وَالْمُشْرِكُونَ وَالْجِنُّ وَالإِنْسان[١٢].

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) سوورەتی نەجمی خوێندو خۆی کوڕنووشی قورئانخوێندن (سەجدەی تیلاوەت)ی برد، موسوڵمانانو

---

[١١] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[١٢] بخاري. تفسير: ٤٨٦٢.

بتپەرستان‌و جنۆکەو پەری‌و ئادەمیزاد هەرچی لەوێ ئامادە بوون لەگەڵیدا کوڕنووشیان برد! (ب).

**٤١٣٥-** وَقَالَ عَبْدِ اللَّهِ (رضي الله عنه) أَوَّلُ سُورَةٍ أُنْزِلَتْ فِيهَا سَجْدَةٌ (وَالنَّجْمِ). قَالَ فَسَجَدَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَسَجَدَ مَنْ خَلْفَهُ، إِلاَّ رَجُلاً رَأَيْتُهُ أَخَذَ كَفًّا مِنْ تُرَابٍ فَسَجَدَ عَلَيْهِ، فَرَأَيْتُهُ بَعْدَ ذَلِكَ قُتِلَ كَافِرًا. رواهما البخاري. نسأل الله التوفيق آمين[١٣].

عەبدوڵلا (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: یەکەم سوورەت کە ئایەتی سەجدە بردنی تێدابوو سوورەتی نەجم بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەدوای ئایەتی سەجدەکەوە سەجدەی برد، ئەوانەیشی کەلەوێ بوون لەدوایەوە کوڕنووشیان برد، تەنیا پیاوێ نەبێ کەچاوم لێ بوو پڕ لەپێ خۆڵی هەڵگرت‌و کوڕنووشی لەسەر برد، لەوەدوا ئەو پیاوەم دی بەکافری کوژرا، ناوی ئومەییەی کوڕی خەڵەف بوو (ب).

## ٣٧- سوورەتی قەمەر

(لەسوورەتە مەککەییەکانە، ٥٥ ئایەتە)

## سورة القمر (مكية، وهي خمس وخمسون آية)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

**٤١٣٦-** عَنْ أَنَسٍ (رضي الله عنه) قَالَ: سَأَلَ أَهْلُ مَكَّةَ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) آيَةً فَانْشَقَّ الْقَمَرُ بِمَكَّةَ مَرَّتَيْنِ فَقَالَ (اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانْشَقَّ الْقَمَرُ وَإِنْ يَرَوْا آيَةً يُعْرِضُوا وَيَقُولُوا سِحْرٌ مُسْتَمِرٌّ)[١].

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: خەڵکی مەککە داوای موعجیزەیان لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کرد وەلەناو خۆیانا، ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی موعجیزەکەیان لەمانگا دەربکەوێ، جا شەوێکیان بڕیارداو لەوشەوەدا گرد

---

[١٣] بخاري. تفسير: ٤٨٦٣.

[١] بخاري. تفسير: ٤٨٦٤، ٤٨٦٨، ٣٦٣٧، ٣٦٣٦، ٣٨٦٩، ٣٨٧١، ٤٨٦٤، ٤٨٦٥ = تجريد/٤ ل/١٣٢ رقم: ١٤٤٧. مسلم. صفات المنافقين: ٧٠٠٢-٧٠١٠. ترمذي: تفسير القرآن: ٣٢٨٥، ٣٢٨٦.

بوونەوەو حەزرەت هاتو بەپەنجەی ئیشارەتی کرد بۆ مانگو مانگ دوو لەت بوو، کوتێکیان لەسەر کێوی ئەبو قوبەیس دا بەزیو ئەوکوتەکەی تریان لەسەر کێوی قەی قەعان دابەزی، ئەم ڕوداوە لەو سەردەمەدا بوو کەهێشتا پێغەمبەر لەمەککە بوو، کۆچی نەکردبوو بۆ مەدینە، بەم بۆنەیەوە ئەمە هاتە خوارێ: {اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ، وَإِن يَرَوْا آيَةً يُعْرِضُوا وَيَقُولُوا سِحْرٌ مُّسْتَمِرٌّ} (٥٣/١-٢) واتە: هاتنی کاتی تایبەتی تێکچوونی ئەم دنیاو دەرکەوتنی جیهانێکی تازەی نەبڕاوەی هەتا هەتایی نزیکەوە بوو، وە مانگ لەت بوو لە سەرداوا کردنی پێغەمبەری ئاخر زەمان، وەلێ ئەم کافرە بێ بڕواو سەر سەختانە ئەگەر چاویان بەنیشانەو موعجیزەی خودایی بکەوێ باوەڕی پێ ناکەنو بۆ لاساریو بێ گوێیی دەڵێن: ئەم جۆرە شتانە سیحرو جادوو چاو بەستەو هەمیشە لەجیهاندا بووەو دەبێ! (ت/ش).

٤١٣٧- وَقَالَ عبد الله (رضي الله عنه): بَيْنَمَا نَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بِمِنًى فَانْشَقَّ الْقَمَرُ فِلْقَتَيْنِ فِلْقَةٌ مِنْ وَرَاءِ الْجَبَلِ وَفِلْقَةٌ دُونَهُ فَقَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) «اشْهَدُوا»رواهما الترمذي والشيخان[٢].

عەبدوڵلا (خودای لێ ڕازی بێ) دەفەرموێ: جارێ لەمینا لەخزمەتی حەزرەتدا بووین (دروودی خودای لەسەربێ) مانگ بوو بە دووکەرتەوە، کەرتێکیان کەوتە پشت کێوەکەوەو ئەوکەرتەکەی تریشیان کەوتە ئەو دیویەوە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) پێمانی فەرموو: تەماشاکەنو بەشایەت بن کەئەم موعجیزە گەورەیەتان بەچاوی خۆتان لەمن دی (ت/ش).

٤١٣٨- وللترمذي: انْشَقَّ الْقَمَرُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) حَتَّى صَارَ فِرْقَتَيْنِ عَلَى هَذَا الْجَبَلِ وَعَلَى هَذَا الْجَبَلِ فَقَالُوا سَحَرَنَا مُحَمَّدٌ فَقَالَ بَعْضُهُمْ لَئِنْ كَانَ سَحَرَنَا مَا يَسْتَطِيعُ أَنْ يَسْحَرَ النَّاسَ كُلَّهُمْ[٣].

---

[٢] بخاري. مناقب. ٣٦٣٦ (راجع الرقم السابق) مسلم. صفات المنافقين: ٧٠٠٢. ترمذي. تفسير القرآن. ٣٢٨٥، ٣٢٨٦.

[٣] سكت عنه الشارح.

تیرمیزی (خودای لێ ڕازی بێ) ڕیوایەت دەکا: کەلەزەمانی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربێ) کافرەکان داوای موعجیزەیەکی ئاسمانی لەپێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەکەن، ئیتر بەفەرمانی خودا لەسەر داواکردنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) مانگ دەبێ بەدوو پارچەوە، پارچەیەکیان دەکەوێتە سەر کێوی ئەبو قوبەیس و ئەو پارچەکەی تریشیان دەکەوێتە سەرکێوی قوعەیقیعان کەچی هێشتا کافرەکان دەیانگوت: موحەممەد چاو بەست و جادووی لێ کردین! بەڵام هەندێکیان گوتیان: ئەوا باشە جادووی لەئێمە کردووە خۆ ناتوانێ سیحرو جادوو لەم هەموو خەڵکەی تر بکا، با لە خەڵکی ئەم لاو لا بپرسین، بزانین ئەمەی ئێمە دیمان بەچاوی خۆمان ئەوانیش دیویانە یانا، کەلەکاروانی و ئەمەنەیان پرسی گوتیان: ئێمەیش دیمان.

قال اللّٰهُ تَعَالَى: {وَلَقَد تَّرَكْنَاهَا آيَةً فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ} (٥٤/١٥).

واتە: وە ئەو کەشتییەی نووحمان کرد بەیادنامەیێ و بەیادگارو نیشانەیێ، تاخاوەن هۆش و داناو زاناکان بیری لێ بکەنەوەو سوود لەم سەرگوزەشتەیە وەربگرن و پەندی پێ بگرن.

٤١٣٩- قَالَ قَتَادَةُ (رضي الله عنه) أَبْقَى اللّٰهُ سَفِينَةَ نُوحٍ حَتَّى أَدْرَكَهَا أَوَائِلُ هَذِهِ الأُمَّةِ[٤].

قەتادە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: هەتا ئەم ماوەیەیش بەفەرمانی خودا کەشتییەکەی نووح هەرمابوو، پێشینانی ئەم گەلی ئیسلامەیش فریای کەوتن (ب).

٤١٤٠- لەتەفسیری سوورەتی ئەنفالا ڕابورد، فەرموودەی سێیەم و چوارەم[٥].

٤١٤١- ← (ب/١ ز/٦ ل/٤١ ف٦)[٦].

---

[٤] رواه البخاري تعليقاً في التفسير قبل الرقم: ٤٨٦٩ مباشرة.

[٥] تقدم برقم: ٣٨٧٧/٣ مجلد سادس. تسلسل/٩ ورقم: ٣٨٧٨/٤.

[٦] تقدم برقم: ٤٢/٦ مجلد أول: تسلسل/٦.

**٤١٤٢- و عَنْهُ (أي عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ) (رضي الله عنه) قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَنَحْنُ نَتَنَازَعُ فِي الْقَدَرِ فَغَضِبَ حَتَّى احْمَرَّ وَجْهُهُ حَتَّى كَأَنَّمَا فُقِئَ فِي وَجْنَتَيْهِ الرُّمَّانُ فَقَالَ «أَبِهَذَا أُمِرْتُمْ أَمْ بِهَذَا أُرْسِلْتُ إِلَيْكُمْ إِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ حِينَ تَنَازَعُوا فِي هَذَا الأَمْرِ عَزَمْتُ عَلَيْكُمْ عَزَمْتُ عليكُمْ أَلاَّ تَتَنَازَعُوا فِيهِ». رواه الترمذي في القدر[٧].**

**ئـەبو هـورەیرە** (خـودای لێ ڕازی بـێ) **فـەرمووی: جـارێ حـەزرەت** (دروودی خـودای لەسـەربێ) **هـات بەسـەرمانا، لەوکاتـەدا ئێمـە لـەناو خۆمانـا لەسـەر چـارەنووس و قـەزاو قـەدەر دەمـەقاڵ و مـشتومڕمان بـوو، پێغەمبـەر** (دروودی خـودای لەسـەربێ) **واتووڕەبوو، ڕووی سوور داگیرسا دەتگوت هەنار تلیقاوەتەوە بەسەر گۆنایا، فەرمووی: ئەوە چیتانە بۆ وادەکەن، بۆ لەسەر شتی وا سمڕ سمڕ دەکەن، کەی خودا بەئێوەی گوتووە کەلەسەر شتی وا چەندو چوون بکەن، یاکەی من خـودا ڕەوانـەی کـردووم بۆناوتـان و کردومـی بەپێغەمبـەرتان کـەفێری ئـەم گێرەگـێڕو بگـرەو بەردەیـەتان بکـەم!؟ لەڕاسـتیدا ئەمـە کـارێکی زۆر خـراپ و دەردێکـی کوشـندەیە چـونکە میللـەت و نەتـەوەکانی پـێش ئێـوە کاتـێ سەریانکردە ئەم جۆرە باسەو لەسەر ئەم جۆرە کارە بوو بەهەراو کێشمەکێش لەناویانـدا ئـیتر بۆخۆیـان فـەوتان و تـەفرو توونـا بـوون و لـەناو چـوون، مـن جەختتان لـێ دەکەم، دیسان زۆر بە توندی بـە جـەخت و داواتـان لـێ دەکـەم و فەرمانتان پێ دەکـەم: کە جـارێکی تـر لـەم باسـە مەکۆڵنـەوەو لەسـەر شـتی وا کێشەو هەرا بەرپا مەکەن!** (ت-ڕەحمەتی خوای لێ بێ).

**ڕەحمـان بـەکوردی واتـە میهرەبـان**

**خـاوەنی ڕەحمـە لەهـەردوو جیهـان**

---

[٧] سكت عن درجته الشارح.

## ٣٨- سوورەتی ڕەحمان

(مەکییە، ٧٨ ئایەتە)

## سورة الرحمن (مكية، وهي ثمان وسبعون آية)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

**٤١٤٣- عَنْ جَابِرٍ** (رضي الله عنه) **قَالَ خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ** (صلى الله عليه وسلم) **عَلَى أَصْحَابِهِ فَقَرَأَ عَلَيْهِمْ سُورَةَ الرَّحْمَنِ مِنْ أَوَّلِهَا إِلَى آخِرِهَا فَسَكَتُوا فَقَالَ «لَقَدْ قَرَأْتُهَا عَلَى الْجِنِّ لَيْلَةَ الْجِنِّ فَكَانُوا أَحْسَنَ مَرْدُودًا مِنْكُمْ كُنْتُ كُلَّمَا أَتَيْتُ عَلَى قَوْلِهِ (فَبِأَيِّ آلاَءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ) قَالُوا لاَ بِشَيْءٍ مِنْ نِعَمِكَ رَبَّنَا نُكَذِّبُ فَلَكَ الْحَمْدُ».** رواه الترمذي والحاكم [١].

**جابیر** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: جارێ پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **لەماڵ هاتە دەرەوە هات بۆ ناویارانی و سوورەتی ئەڕەحمانی سەرتاپا بەسەریاندا خوێند، بەڵام یاران نقەیان نەکرد، جا حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: لەشەوەکەی لەیلەتولجیندا، کەلەگەڵ نوێنەرەکانی جنۆکەکاندا کۆبوومەوە ئەم سوورەتەم بەسەریاندا خوێندەوە، ئەوان لەئێوە باشتر وەڵامیان دەسەندەوە، چونکە گشت جارێ کە ئەم ئایەتەم دەخوێند {فَبِأَيِّ آلَاء رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ} جنۆکەکان بۆیان دەسەندمەوەو دەیانگوت: (لا بشيء من نعمتك ربنا نكذّب فلك الحمد) ئەی پەروەردگاری ئێمە! هیچ بەهرەو نازو نیعمەتێکی تۆ بە درۆ نازانین، سوپاس و ستایشی گەورە هەر بۆ تۆ بووەو هەر بۆ تۆ دەبێ) (ت/حاکم). مەعنای ئایەتەکە ئاوایە: دەی ئەی بەرەی ئادەمیزادو ئەی بەرەی پەری! ئیتر لەپاش ئەم بەیانی حاڵە لەلایەنی خوداوە بۆ ئێوە کام نیعمەتەکانی خودا بەدرۆ دەزانن و بەکام بەهرەو چاکەی خودا باوەڕناکەن و بەدرۆی دەخەنەوە. لەکاتی خوێندنی بازێ ئایەتدا جۆرە گوتەیەك یا دووعایەکی تایبەتی سوننەتە، وەکوو گوتنی (ئامین). لەپاش خوێندنی سوورەتی فاتیحاوە، یا گوتنی (بلى وأنا على ذلك من الشاهدين) لەپاش**

---

[١] سكت عن درجته الشارح.

خوێنـــدنی ئایـــەتی کۆتـــایی ســـوورەتی تـــین، جالـــەم فـــەرمووده پـــیرۆزەدا وادەردەکەوێ کەلەپاش خوێندنی ئەم ئایەتەیشەوە ئەم گوتەیە سوننەت بێ، وەمن هەرچەند مەلانیم (واتە: زانای ئایینی نیم با پێشم بڵێن مەلا) بەڵام وا بەباشی دەزانم کە گوتەو عیبارەتو کەلیماتی دووعاو عیبادەت هەر لەسەر ئەصڵەکەی خۆیان بمێننەوە باشترە چونکە ئەوانە هەر هیچ نەبێ لەسەر ئەو شێوەیە لەسەرزاری حەزرەتو یارانی جاری بوونو لەناو قورئانو کتێبە گەورەکانی سوننەتدا نوسراون، لەبەر ئەوە بەرەکەتو پیرۆزییەکی جیایان هەیە، دیارە تەرجەمەکەیان سوودی زۆرە چونکە تێگەیشتن لەواتا دەبێ بەهۆی بەهرە لێ وەرگرتنی تەواو (وەرگێڕ).

قال اللَّهُ تَعَالَى: {وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ جَنَّتَانِ} (٥٥/٤٦).

هەیە بۆ ئەو کەسانەی کە دەترسن لەگەورەیی و شانو شکۆی خودای خۆیانو سامو شکۆیەکی باش لەخودای خۆیان دەکەن دوو بەهەشت.

٤١٤٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ قَيْسٍ (رضي الله عنه) عَنْ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: «جَنَّتَانِ مِنْ فِضَّةٍ، آنِيَتُهُمَا وَمَا فِيهِمَا وَجَنَّتَانِ مِنْ ذَهَبٍ آنِيَتُهُمَا وَمَا فِيهِمَا، وَمَا بَيْنَ الْقَوْمِ وَبَيْنَ أَنْ يَنْظُرُوا إِلَى رَبِّهِمْ إِلاَّ رِدَاءُ الْكِبْرِ عَلَى وَجْهِهِ فِي جَنَّةِ عَدْنٍ». رواه الشيخان [٢].

عەبدوڵڵای کوڕی قەیس (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەموو خوا پێداوێ لەناو بەهەشتا دوو بەهەشتی هەیە، کە قاپو قاجاخو کەرەستەو تفاقی ناویان هەمووی لەزیون، وە دوو بەهەشتی تریشی هەیە کە قاپو قاجاخو تفاقی ناویان هەمووی لەزێڕن، بەهەشتییەکان وان لەناو بەهەشتی عەدندا، هەموو ئاواتێکیان هاتۆتە دی تەنیا ئەو ئاواتەیان ماوە کە تەماشای زاتی خودا بکەن، ئەگەر لە بەرتارای مەزناهیو پەردەی گەورەیی نەبێ کەوا لەسەر زاتی خودا ئەو ئاواتەشیان دەهاتە دیو بەچاوی سەرچاویان دەکەوت بەزاتی پەروەردگاری خۆیان (ش).

---

[٢] بخاري. تفسیر: ٤٨٧٨، ٤٨٨٠، ٧٤٤٤ = تجريد = مختصر صحيح البخاري: ١٧٠٢.

٤١٤٥- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ «إِنَّ فِي الْجَنَّةِ خَيْمَةً مِنْ لُؤْلُؤَةٍ مُجَوَّفَةٍ، عَرْضُهَا سِتُّونَ مِيلاً، فِي كُلِّ زَاوِيَةٍ مِنْهَا أَهْلٌ، مَا يَرَوْنَ الآخَرِينَ يَطُوفُ عَلَيْهِمُ الْمُؤْمِنُونَ». رواه البخاري. نسأل الله حسن الرواية، آمين[٣].

**دیسان فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لەبەهەشتا چادری واهەیە، برێتییە لەیەك دەنك مرواری هڵوڵ، پانایییەکەی شەست میلە! لەهەموو گۆشەیێ لەگۆشەکانیدا، خێزانێکی تیادایە، کەهەمیشە چاویان بڕیوەتە هاوسەرەکانی خۆیانو دڵیان لای کەسی تر نییە، ئەوانەی کەوان لەناویەکێ لەم گۆشەیانەدا چاویان لەو خێزانانەی ترنییە کەوان لەناو گۆشەکانی تری ئەم چادرەدا، ئیتر پیاوە موسوڵمانەکان بە ئارەزووی دڵی خۆیان گۆشە بەگۆشە دەسووڕێنەوە بەسەر ئەم خێزانانەی خۆیاندا (وەك خودا لە قورئاندا دەفەرموێ: {حُورٌ مَّقْصُورَاتٌ فِي الْخِيَامِ} (٥٥/٧٢) واتە: لەبەهەشتا پەری ناسكو نازداری، خۆشڕوو خۆشڕفتاری تیایە، وان لەناو دەوارو ڕشماڵو چادردا، هۆگری مێردی خۆیاننو چاویان بەس لەمێردی خۆیانە (ب).**

**واقیعە! نامان لە دەستی (حەدید)**

**بووم بە موختەبەر بۆ (بأس شدید)!**

## ٣٩- سورەتی واقیعە

**(مەککەییە، ٩٧ ئایەتە)**

## سورة الواقعة (مكية، وهي سبع وتسعون آية)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤١٤٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) عَنْ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ «إِنَّ فِي الْجَنَّةِ شَجَرَةً يَسِيرُ الرَّاكِبُ فِي ظِلِّهَا مِائَةَ عَامٍ لاَ يَقْطَعُهَا، وَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ (وَظِلٍّ مَمْدُودٍ)». رواه الشيخان والترمذي[١].

---

[٣] بخاري. تفسير: ٤٨٧٩.

دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرموویەتی لەبەهەشتدا درەختێ هەیە سوار سەد ساڵ بەسێبەرەکەیدا دەڕوا هێشتا ناگاتە ئەوپەڕی، ئەگەر حەزیش دەکەن ئەم ئایەتە بخوێننەوە کە دەفەرموێ: {وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ} (٣٠/٥٦) واتە: وەوان لەسێبەری خەستی درێژی ئاو ڕشێنکراودا! (ش/ت).

٤١٤٧- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فِي قَوْلِهِ (وَفُرُشٍ مَرْفُوعَةٍ) قَالَ «ارْتِفَاعُهَا كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ وَمَسِيرَةُ مَا بَيْنَهُمَا خَمْسُمِائَةِ عَامٍ»[٢].

ئەبو سەعید (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: لەبارەی فەرموودەی خواوە: {وَفُرُشٍ مَّرْفُوعَةٍ} (٣٤/٥٦): فەرشو ڕایەخو قاڵیو ئۆرتەی جۆر بەجۆری زۆر لەهەموولایێ ڕاخراونو بەرزەوە بوونو کەڵەکەیان کردووە لەسەریەك حەزرەت لەبارەی ئەم ئایەتەوە فەرمووی: بەقەد نێوانی ئاسمانو زەوی بەرزەوەبوون! نێوانی ئەم دوانەیش پێنج سەد ساڵە ڕێیە! (ت-سەنەدەکەی غەریبە).

٤١٤٨- عَنْ أَنَسٍ (رضي الله عنه) عَنْ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) (إِنَّا أَنْشَأْنَاهُنَّ إِنْشَاءً) قَالَ «إِنَّ مِنَ الْمُنْشَآتِ اللاَّئِي كُنَّ فِي الدُّنْيَا عَجَائِزَ عُمْشًا رُمْصًا». رواهما الترمذي[٣].

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەبارەی ئایەتی: {إِنَّا أَنشَأْنَاهُنَّ إِنشَاء} (٣٥/٥٦) کە مەعنای وایە: ئێمە ئەو پەرییە ناسكو نازەنینو نازدارانەمان سەر لەنوێ دروست کردوەتەوە فەرمووی: پیرێژنە چاو کزو کوتو کوێرو چاو ڕیپۆقاوییەکانی دنیا بەر ئەم ئایەتە دەکەونو ئەوانیش خودا لەبەهەشتا سەر لەنوێ دروستیان دەکاتەوە بەدروستکردنێکی تایبەتیو سەربەخۆو دەیانکاتەوە بەکچی ناسكو نازداری

---

[١] بخاري. تفسير: ٤٨٨١. مسلم: جنة ونعيمها: ٧٠٦٩ ترمذي. صفة الجنة:٢٥٢٣.

[٢] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

[٣] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

لاوی گەنجی شۆخ و شەنگ، عەیبی ڕۆژگاریان تیا نامێنێ. (ت-سەنەدەکەی غەریبە).

قال الله تعال: {نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ الْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ، عَلَى أَن نُّبَدِّلَ أَمْثَالَكُمْ وَنُنشِئَكُمْ فِي مَا لَا تَعْلَمُونَ} (٥٦/٦٠-٦١).

واتە: ئێمە لەناوتانا مردنمان بڕیارداوەو هۆوکات و ساتێکمان بۆ دیاری کردووەو، ئێمە بێ دەسەڵات و دەستەوسان نین کەلەباتی ئێوە هاووێنەی ئێوە لە ئینسانییەتا دروست بکەین و ئێوە دروست بکەین و داتانبمەزرێنینەوە لەناو شێوەو سیفەتێکا کە ئێستە بەبیرو خەیاڵتان دا نایێ.

٤١٤٩- قَالَ أَبُو بَكْرٍ (رضي الله عنه) يَا رَسُولَ اللَّهِ قَدْ شِبْتَ. قَالَ «شَيَّبَتْنِي هُودٌ وَالْوَاقِعَةُ وَالْمُرْسَلَاتُ وَ (عَمَّ يَتَسَاءَلُونَ) وَ (إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ)». رواه الترمذي[٤].

ئەبوبەکر (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! بەڕاستی وا پیربوویت! فەرمووی: سوورەتی هوودو سوورەتی واقیعەو سوورەتی مورسەلات و سوورەتی عەممەو سوورەتی تەکویر پیریان کردم (لەبەر ئەو هەموو داستان و باس و خواسە دڵتەزێنانەی کەوان لەم سوورەتانەدا). (ت-س/ح).

٤١٥٠- عَنْ عَلِيٍّ (رضي الله عنه) عَنْ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) «(وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ) قَالَ شُكْرُكُمْ تَقُولُونَ مُطِرْنَا بِنَوْءِ كَذَا وَكَذَا وَبِنَجْمِ كَذَا وَكَذَا». رواه الشيخان والترمذي. ولفظ مسلم: مُطِرَ النَّاسُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ «أَصْبَحَ مِنَ النَّاسِ شَاكِرٌ وَمِنْهُمْ كَافِرٌ قَالُوا هَذِهِ رَحْمَةُ اللَّهِ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ لَقَدْ صَدَقَ نَوْءُ كَذَا وَكَذَا». قَالَ فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ (فَلاَ أُقْسِمُ بِمَوَاقِعِ النُّجُومِ) حَتَّى بَلَغَ (أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ). صدق الله عظيم[٥].

---

[٤] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[٥] مسلم. إيمان: ٢١٣.

عەلی (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی لەبارەی مەبەست لەم ئایەتەوە کەدەفەرموێ: {وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ} (٨٢/٥٦) واتە: کاتێ لەسایەی بەخششی خوداوە بارانتان بۆ دەبارێ‌و دەبێ بە هۆی رزق‌و رۆژی بۆتان لەباتی ئەوەی سوپاس‌و ستایشی خودا بکەن لەسەر ئەم بەخششە گەورەیەی، کەچی دەچن بەدرۆ دەڵێن: لەفلانە بورجدا بارانمان بۆ باری. عەلی فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) ئەم ئایەتەی خوێندەوەو فەرمووی: لەجیاتی سوپاسی خودا لەسەر نیعمەتی بارینی باران کەدەبێ بەهۆی ڕزق‌و رۆژی بۆتان دەچن دەڵێن: لەفلانە بورجدا بەهۆی فلانە ئەستێرەوە بارانمان بۆ باری! (ش/ت) ←(ب/١ ز/١٧٦ ل/٤٧٩ ف/٣ + ف/٤).

## ٤٠- سوورەتی حەدید

(مەدینەییە، ٢٩ ئایەتە)

## سورة الحديد (مدنية، وهي تسع وعشرون آية)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤١٥١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ بَيْنَمَا نَبِيُّ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) جَالِسٌ وَأَصْحَابُهُ إِذْ أَتَى عَلَيْهِمْ سَحَابٌ فَقَالَ نَبِيُّ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) «هَلْ تَدْرُونَ مَا هَذَا؟». فَقَالُوا اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ «هَذَا الْعَنَانُ هَذِهِ رَوَايَا الأَرْضِ يَسُوقُهُ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى إِلَى قَوْمٍ لاَ يَشْكُرُونَهُ وَلاَ يَدْعُونَهُ». ثُمَّ قَالَ «هَلْ تَدْرُونَ مَا فَوْقَكُمْ؟». قَالُوا اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ «فَإِنَّهَا سَقْفٌ مَحْفُوظٌ وَمَوْجٌ مَكْفُوفٌ». ثُمَّ قَالَ «هَلْ تَدْرُونَ كَمْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهَا؟». قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ «بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهَا مَسِيرَةُ خَمْسِمِائَةِ سَنَةٍ». ثُمَّ قَالَ «هَلْ تَدْرُونَ مَا فَوْقَ ذَلِكَ؟». قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ «فَإِنَّ فَوْقَ ذَلِكَ سَمَاءَيْنِ وَمَا بَيْنَهُمَا مَسِيرَةُ خَمْسِمِائَةِ عَامٍ». حَتَّى عَدَّ سَبْعَ سَمَوَاتٍ مَا بَيْنَ كُلِّ سَمَاءَيْنِ كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ. ثُمَّ قَالَ «هَلْ تَدْرُونَ مَا فَوْقَ ذَلِكَ؟». قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ «فَإِنَّ فَوْقَ ذَلِكَ الْعَرْشَ وَبَيْنَهُ وَبَيْنَ السَّمَاءِ بُعْدُ مِثْلِ مَا بَيْنَ السَّمَاءَيْنِ». ثُمَّ قَالَ «هَلْ تَدْرُونَ مَا الَّذِي تَحْتَكُمْ». قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ «فَإِنَّهَا الأَرْضُ». ثُمَّ قَالَ «هَلْ

تَدْرُونَ مَا الَّذِى تَحْتَ ذَلِكَ». قَالُوا اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ «فَإِنَّ تَحْتَهَا الأَرْضَ الأُخْرَى بَيْنَهُمَا مَسِيرَةُ خَمْسِمِائَةِ سَنَةٍ». حَتَّى عَدَّ سَبْعَ أَرَضِينَ بَيْنَ كُلِّ أَرْضَيْنِ مَسِيرَةُ خَمْسِمِائَةِ سَنَةٍ ثُمَّ قَالَ «وَالَّذِى نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَوْ أَنَّكُمْ دَلَّيْتُمْ رَجُلاً بِحَبْلٍ إِلَى الأَرْضِ السُّفْلَى لَهَبَطَ عَلَى اللَّهِ». ثُمَّ قَرَأَ (هُوَ الأَوَّلُ وَالآخِرُ وَالظَّاهِرُ وَالْبَاطِنُ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ) رواه الترمذي (بسند غريب)[1].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) دەفەرموێ: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) خۆیو یارانی دانیشتبوون، لەوکاتەدا پەڵەیێ هەوری هێنا، پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئایا دەزانن ئەمە چییە؟ عەرزیان کرد: خوداو پێغەمبەری خودا باشتری دەزانن، فەرمووی: ئەمە هەورە، ئەمە ئاودێری زەوییە ئەم هەورە خودا دەیبا بۆ هۆزێ کە نەسوپاسی دەکەنو نە دەیپەرستن فەرمووی: ئەی دەزانن ئەمە چییە لەسەرووتانەوە؟ گوتیان: خوداو پێغەمبەری خودا باشتری دەزانن فەرمووی: ئەوە سەقف (بنمیچ)ێکی پارێزراوو، شەپۆلێکی پەنگخواردووە! فەرمووی: ئایا دەزانن کە لێرەوە هەتا ئەوێ چەندە؟ گوتیان خوداو پێغەمبەری خودا باشتری دەزانن، فەرمووی: لێرەوە هەتا ئەوێ پێنج سەد ساڵەرێیە فەرمووی: ئەی دەزانن لەژوور ئەوەیشەوە چییە؟ گوتیان خوداو پێغەمبەری خودا باشتری دەزان، فەرمووی: لەژوور ئەوەیشەوە دوو ئاسمانی ترن، نێوانیان پێنج سەد ساڵەرێیە جا هەتا حەوت ئاسمانی ژمارد کەنێوانی هەردوو ئاسمانێ بەقەد نێوانی ئاسمانو زەوی بێ. ئینجا فەرمووی: ئەی دەزانن لە ژووروی ئەوەیشەوە چییە؟ گوتیان خوداو پێغەمبەری خودا باشتری دەزانن، فەرمووی: لەژووری ئەوەیشەوە عەرش (تەختو بارەگا)ی خودایە، بەینی عەرشو ئاسمانی ژێری بەقەد بەینی دووئاسمان لەیەك دوورن فەرمووی: ئەی دەزانن لەژێر ئێوەوە چی هەیە؟ گوتیان خوداو پێغەمبەری خودا باشتری دەزانن، فەرمووی: زەوییەکی تر هەیە فەرمووی: ئەی دەزانن لەژێر ئەویشەوە چی ترە؟ گوتیان خوداو پێغەمبەری خودا باشتری دەزانن، فەرمووی: لەژێر ئەویشەوە

---

[1] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

زەوییەکی تره نێوانیان پێنج سەد ساڵە ڕێیە جا هەتا حەوت زەوی ژمارد، کە نێوانی ئەم زەوی تا ئەو زەوی پێنج سەد ساڵەڕێ بێ، لەپاشا فەرمووی: بەوکەسە کە گیانی موحەممەدی بەدەسە، کە خودای گەورەیە، ئەگەر گریمان ئێوە پیاوێ بە گوریسێ شۆڕبکەنەوە بۆ زەوی هەرە خواروو لەوێش هەردەچێتەوە بەردەستی خوداو خودا لەهەموو شوێنێ حازره ئەوجا خوێندیەوە {هُوَ الْأَوَّلُ وَالْآخِرُ وَالظَّاهِرُ وَالْبَاطِنُ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ} (٣/٥٧) واتە: خودا لەهەموو مەوجوودێ لە پێشترەو یەکەم مەوجوودە، وەلە هەموو مەوجوودی لەدواترەو دواهەمین مەوجوودە کە دەمێنێ، وەهەم خودایەکی ئاشکرایەو هەم خودایەکی پەنهانە، وەهەمیشە ئاگای لەوردو درشتی ئەم بوونەوەرە هەیە (تیرمیزی (خودای لێ ڕازی بێ)، بەڕشتەیەکی نابلاو (غەریب) ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە).

٤١٥٢- قَالَ عبد الله (رضي الله عنه) مَا كَانَ بَيْنَ إِسْلاَمِنَا وَبَيْنَ أَنْ عَاتَبَنَا اللَّهُ بِهَذِهِ الآيَةِ (أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَنْ تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ) إِلاَّ أَرْبَعُ سِنِينَ. رواه مسلم[٢].

عەبدوڵڵا (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: لەنێوان موسوڵمان بوونی ئێمەو گلەیی خودادا لەئێمە، کەوا ئەو گلەییە لەم ئایەتەدا باس کراوە تەنیا چوار ساڵ بوو، کە دەفەرموێ: {أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ} (١٦/٥٧) واتە:

هەتاکەی نێوەی پەیڕەوی قورئان

دڵ دانەهێنن بەیادی یەزدان! (م)

## ٤١- سوورەتی موجادەلە

(مەدینەییە، ٢٢ ئایەتە)

## سورة المجادلة (مدنية، وهي ثنتان وعشرون آية)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤١٥٣- عَنْ خُوَيْلَةَ بِنْتِ مَالِكِ بْنِ ثَعْلَبَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ ظَاهَرَ مِنِّي زَوْجِي أَوْسُ بْنُ الصَّامِتِ فَجِئْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَشْكُو إِلَيْهِ وَرَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)

---

[٢] مسلم. تفسير: ٧٤٦٦.

يُجَادِلُنِي فِيهِ وَيَقُولُ «اتَّقِي اللَّهَ فَإِنَّهُ ابْنُ عَمِّكِ». فَمَا بَرِحْتُ حَتَّى نَزَلَ الْقُرْآنُ (قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا) إِلَى الْفَرْضِ فَقَالَ «يُعْتِقُ رَقَبَةً». قَالَتْ لاَ يَجِدُ قَالَ «فَيَصُومُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ». قَالَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهُ شَيْخٌ كَبِيرٌ. قَالَ «فَلْيُطْعِمْ سِتِّينَ مِسْكِينًا». قَالَتْ مَا عِنْدَهُ مِنْ شَىْءٍ يَتَصَدَّقُ بِهِ قَالَتْ فَأُتِيَ سَاعَتَئِذٍ بِعَرَقٍ مِنْ تَمْرٍ قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَإِنِّى أُعِينُهُ بِعَرَقٍ آخَرَ. قَالَ «قَدْ أَحْسَنْتِ اذْهَبِي فَأَطْعِمِي بِهَا عَنْهُ سِتِّينَ مِسْكِينًا وَارْجِعِي إِلَى ابْنِ عَمِّكِ». رواه أصحاب السنن[1].

خەولەی کچی مالیکی کوڕی ثەعلەبە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: ئەوس کوڕی ثابیت کەمێردم بوو، ظیهاری لەگەڵ کردمو پێی گوتم: تۆ لەسەر من وەکوو پشتی دایكو خوشکم وای، منیش چوومە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ)و هاوارم بۆ بردو داستانەکەم بۆیگێڕایەوە، فەرمووی: لەم ڕووەوە هیچ سرووشێکم بۆ نەهاتووە، بەڵام تۆ لەسەر دەستووری کۆنی جاران لە مێردەکەت قەدەغە دەبیت منیش گوتم: بۆچی؟ خۆ تەڵاقی نەداووم، جالەسەر ئەمە لەگەڵ حەزرەتدا بوو بە دەمەقاڵێو گوفتو گۆمانو فەرمووی: لەخودا بترسەو لای خودا بەرمەدەو لەهیچ حاڵێکا بێگوێیی خودا مەکە، مێردەکەیشت هەرچۆن بێ خۆ ئامۆزای خۆتە. ئیتر لەجێگەی خۆم نەجووڵام تا ئەم قورئانە هاتە خوارەوە: {قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا: تا ئەوێ کە کەففارەتی ظیهار دیاری دەکاو دەفەرموێ..... وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ} (٥٨/١-٤) پالفتەی مانای ئایەتەکان (نەك دەقی ماناکەیان) ئەمەیە: خودا قسەی هەق دەبیستێ، بۆیە گوێی شل کرد بۆ سکاڵای ئەوژنە کەلەگەڵ تۆدا گوفتوگۆی بوو، وەهات بەهاواریەوەو ئەم بڕیارەی لەم لایەنەوەدا: ئەو مێردانەی کە بەژنی خۆیان دەڵێن: تۆ دایكو خوشکی منی یا وەك دایكو خوشکم وای، ئەوە بەوقسە ڕووتە بێ بەڵگەو پاڵپشتە ژنەکانیان نابن بە دایكو خوشکیان چونکە دایك لەشەرعو لەعورفا بەو ژنە دەگوترێ کە ئادەمیزادی لێ دەبێ، وەلێ دەبێ ئەوە بزانن کە قسەو گوتار نابێ بە گوترە و هەوانتە بکرێ، دەبێ ئاگاتان لەبەرو دوای قسەی

---

[1] رواه الترمذي لسلمة بن صخر بسند صحيح (شرحه).

خۆتان بێ، قسەیێ نەکەن کە دژی یاساو شەرعی خودا بێ، وەك ئەم جۆرە قسە ناشیرین‌و ناپەسەندە کە ظیهارکەر دەیڵێ، ئەمە زۆر ناشیرین‌و ناپەسەندو درۆو نابەجێیە. لەبەرئەوە کە خودا هەمیشە چاوپۆشی لە هەڵەتان دەکاو دەیەوێ بارتان بۆ ڕاست بکاتەوە ئەوا بڕیاری دا! ئەو مێردانەی کە زیهار دەکەن لەگەڵ ژنی خۆیانداو لەپاشا پاشگەز دەبنەوەو حەز دەکەن چاری قسەکەیان بکەن دەبێ لەپێش ئەوەدا کەلەگەڵ ئەو ژنەدا جووت ببن ئەم کەففارەتە بدەن. یا بەندەیێ ئازاد بکەن، یا دوومانگ لەسەر یەك بەڕۆژوو بن، یا نانی شەست هەژار بدەن. ئەوجا حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بەپێی ئەم فەرمایشتەی خودا مێردەکەت دەبێ بەندەیێ ئازاد بکا ئەوسا تۆی بۆ حەلاڵ دەبێتەوە. گوتم: نییەتی، فەرمووی: دە دەبێ دوو مانگ لەسەریەك بەرۆژوو بێ. گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! پیرێکی ئیختیارە ناتوانێ بەڕۆژوو بێ، فەرمووی: کەواتە دەبێ نانی شەست هەژار بدا. گوتم: هەر هیچ شتێکی نییە کە بیکا بەخێر. خەولە گوتی: جا لەو کاتەدا حەلانەیێ خورمایان هێنا بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: من نیوەی خورماکەی بۆ دەدەم‌و ئەم پووشە خورمایەی دەدەمێ. منیش عەرزیم کرد: دەی منیش ئەو نیوەکەی تری بۆ دەدەم فەرمووی: ئافەریم زۆر باشە، دەبچۆ لەجیاتی مێردەکەت کەفارەتەکەی بۆبدەو نانی شەست هەژاری لێ بدەو بگەڕێرەوە بۆلای ئامۆزای مێردت. (ت-س/ص/د/ن).

٤١٥٤- قَالَ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (رضي الله عنه) أَنَّ يَهُودِيًّا أَتَى عَلَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) وَأَصْحَابِهِ فَقَالَ السَّامُ عَلَيْكُمْ فَرَدَّ عَلَيْهِ الْقَوْمُ فَقَالَ نَبِيُّ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) «هَلْ تَدْرُونَ مَا قَالَ هَذَا؟». قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ سَلَّمَ يَا نَبِيَّ اللَّهِ. قَالَ «لاَ وَلَكِنَّهُ قَالَ كَذَا وَكَذَا رُدُّوهُ عَلَيَّ». فَرَدُّوهُ قَالَ «قُلْتَ السَّامُ عَلَيْكُمْ؟». قَالَ: نَعَمْ. قَالَ نَبِيُّ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عِنْدَ ذَلِكَ «إِذَا سَلَّمَ عَلَيْكُمْ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ فَقُولُوا: «عَلَيْكَ مَا قُلْتَ». قَالَ: (وَإِذَا جَاءُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ اللَّهُ)[٢].

---

[٢] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) فەرموی: جوولەکەیێ هات بۆلای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) لەناو یارانیدا بوو، جوولەکەکە لەجیاتی (السلام علیکم) گوتی: (السام علیکم) کۆمەڵەی یاران وەڵامیان دایەوە بەشێوەی وەڵامی سڵاو. جا حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: زانیتان ئەو کابرایە چی گوت؟ گوتیان: خوداو پێغەمبەری خودا بەباشی دەزانن، لەئێمە وابوو کە سڵاوی کرد، ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: نەخەیر سڵاوی نەکرد، بەڵام لەباتی سڵاو گوتی: السام علیکم. واتە: مردن بۆئێوە، ئادەی بانگیکەنەوە بۆم، کەبانگیان کردەوە بۆی، فەرمووی: کە هاتیت گوتت: السَّام علیکم؟ گوتی: بەڵێ وام گوت: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کاتێ ئەم خاوەن نامانە، کە ناسراون بەئەهلی کیتاب، سڵاویان لێ کردن لەوەڵامیاندا بڵێن: علیك ما قلت: لەوەی گوتت لەسەرت بێ. ئینجا خوێندیەوە: {وَإِذَا جَاؤُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ اللَّهُ} (٨/٥٨) واتە: کاتێ دێن بۆلات سڵاوت لێ دەکەن، بە سڵاوێکی جیا لەو سڵاوەی کە خودا دایناوە بۆ ئێوە، لەجیاتی (السلام علیکم) پێتان دەڵێن: (السَّام علیکم). (ت-س/ص).

٤١٥٥- قَالَ عَلِيٌّ (رضي الله عنه) لَمَّا نَزَلَتْ (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَاجَيْتُمُ الرَّسُولَ فَقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيْ نَجْوَاكُمْ صَدَقَةً). قَالَ لِي النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) «مَا تَرَى دِينَارًا؟». قُلْتُ: لاَ يُطِيقُونَهُ. قَالَ: «فَنِصْفُ دِينَارٍ؟». قُلْتُ: لاَ يُطِيقُونَهُ. قَالَ: «فَكَمْ؟». قُلْتُ: شَعِيرَةٌ. قَالَ: «إِنَّكَ لَزَهِيدٌ». قَالَ فَنَزَلَتْ (أَأَشْفَقْتُمْ أَنْ تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيْ نَجْوَاكُمْ صَدَقَاتٍ) الآيَةَ. قَالَ فَبِي خَفَّفَ اللَّهُ عَنْ هَذِهِ الأُمَّةِ. رواهما الترمذي[٣].

عەلی (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: کاتێ ئایەتی {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَاجَيْتُمُ الرَّسُولَ} تا کۆتایی هاتە خوارەوە، کە ئایەتی دوازدەیە لە سوورەتی پەنجاو هەشت، کە ماناکەی وایە: ئەی کەسانێ کە بڕواتان هێناوە! کاتێ دەتانەوێ

---

[٣] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

قسەی دوو بە دوو بە پەنامەکی لەگەڵ پێغەمبەردا بکەن، ئەوا لەپێش قسە کردنەکەدا خێری بکەن بە هەژاران، کاتێ ئەمە هاتە خوارەوە حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) راوێژی پێ کردمو پێی فەرمووم: ئەو خێرە چەندێ بێ؟ بەڕای تۆ لێرەیێ باشە؟ گوتم: لێرەیە زۆرە لەتاقەتیاندا نییە، فەرمووی: ئەی نیولیرە باشە؟ گوتم: ئەویش هەر زۆرە، فەرمووی: ئەی چەنێ باشە؟ گوتم: سەنگی دەنکە جۆیێ زێر بەسە. فەرمووی: بەڕاستی تۆ کەم خوازیو زۆر کەمت دانا جا ئەم ئایەتە تا دوایی هاتە خوارەوە: {أَأَشْفَقْتُمْ أَن تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيْ نَجْوَاكُمْ صَدَقَاتٍ} (١٣/٥٨) واتە: وادیارە لەوە دەترسن کەلەپێش چپەو قسە کردنی دوو بەدووی پەنامەکی لەگەڵ حەزرەتدا خێرێ بکەن، لەبەرئەوە ئەمەتان نەکرد، وە خودایش چاوپۆشی لێ کردن، دەی نوێژەکاناتان بکەنو، زەکاتی ماڵەکانتان بدەنو، پەیڕەوی فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودا بکەن، خودا ئاگای لەهەموو کارو کردەوەو گوتارو ڕەفتارێکتانە.

عەلی (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: خودا بەهۆی منەوە ئەم بارو ئەرکەی سووك کردو ئەم دیارییەی لەسەر شانی ئەم گەلی ئیسلامە لابرد (ت-س/ح).

پیاو کەسەیری ئەو هەموو شەپۆلو لافاوو گەردەلوولو هێرشی بێ دینیو خراپەو زوڵمو زۆرو بێ ڕەووشتییە دەکا کە لەهەموو لایەکەوە وورووژمی هێناوەو سەر ڕووی زەوی سەراسەر دەڵێی گۆمەو لافاوی تاوان پەنگی تیا خواردۆتەوە، پیاو کە ئەم حاڵە بەچاوی سەری خۆی دەبینێ زەندەقی دەچێ، وورە بەردەدا، دەستی سارد دەبێتەوە، خۆی بەشێت دەزانێ، خۆی بەخۆی دەڵێ: ئەرێ تۆ خەریکی چیت، وەك کابرای ئارەقخۆر گوتی: دیارە خەڵەفاویو دەتەوێ مردووی ناو گۆڕ زیندوو بکەیتەوە!

بەڵام وەك ئەهلی ئەعراف کە ئاوڕێ لە بەهەشتییەکان دەدەینەوە خێرەت دەدەینە بەرخۆمانو وورەمان بەرز دەبێتەوەو ئومێدمان بەکەرەمو بەخششو سۆزەبای میهروڕەحمەتی خودا قەوی دەبێ، وەك دەنگێ لە پشت پەردەی غەیبەوە بچپێنێ بە گوێی پیاوانی خودادا: ئێوە تەنیا نین، دڵتان سارد

نەبێتەوە، خودا لەگەڵ ئێوەیە، نەصرەتو سەرکەوتن بە دەستی خودایە، بەزۆری و بۆری سوپا نییە، فەرمایشتەکەی حەزرەتی ئیبراهیم (درودی خودای لەسەربێ) بکەن بە سەرمەشق، کەلە دەست زوڵمو زۆر، وڵاتەو وڵات، بۆ پاراستنی دینی خۆی کۆچی دەکرد تا سەرەنجام فیرعەونی میصر تەماعی کردە نامووسی و، خاتوو سارای خێزانی برد بۆ ئیشی خراپ، بەڵام ئیبراهیم وورەی بەرنەداو دەستی لەدینی خۆی هەڵنەگرتو بەیانی حاڵو بارو دۆخی ئەهلی ئیمانی سەر ڕووی زەوی زەمانی خۆیی بەم ووشەیە کردو فەرموو: واللە ان على الأرضِ مُؤْمِنٌ غيري وغيرك: سوێندم بەخودا لەسەر ڕووی زەوی خۆمو خۆت نەبێ ئەی سارە! یەك موسوڵمانی تر نییە! جا ئەوەبوو خودا نامووسی پاراستو سەری خستو سەر ڕووی زەوی پڕکرد لەئیمانو ئیسلامو بەندەگانی باشی خۆی، ئیتر قسە هەزارەو یەکی بە کارە، پەنا بە خودا، ئەوەی لەسەر ئێمەیە وەکوو کوردان دەڵێن: هەتا مردن کردن. لە خوداش داوا دەکەین کە ڕەنجەڕۆ نەبینو لەم کۆششە پیرۆزەدا کردەی ئێمەو بردەی بانەبێ. ئەمەیش حاڵی دنیایە لەم چەرخەی ئێمەدا:

گەر لەگەڵ دنیا (موجادەلە) کەین

تا (حەشر) دەبێ ڕازو گلەکەین

گوتم بەدنیا: ئەرێ بەس نییە

لەم (تێکەو لێکەو کەس بەکەس نییە)؟

گوتی: پیاوی خوا هیچ بەدەس نییە

ئیتر چی دەبێ، هیچ مەبەس نییە

بۆیە وەک دۆزەخ هەر دەڵێم: بابێ

گەدەم بەم هەموو گەندە پڕ نابێ!!

## ٤٢- سوورەتی حەشر
(مەدینەییە، ٢٤ ئایەتە)

## سورة الحشر (مدنية، وهي أربع وعشرون آية)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤١٥٦- عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ (رضي الله عنه) قُلْتُ لابْنِ عَبَّاسٍ سُورَةُ التَّوْبَةِ قَالَ التَّوْبَةُ؟ هِيَ الْفَاضِحَةُ، مَا زَالَتْ تَنْزِلُ وَمِنْهُمْ وَمِنْهُمْ، حَتَّى ظَنُّوا أَنَّهَا لَمْ تُبْقِ أَحَدًا مِنْهُمْ إِلاَّ ذُكِرَ فِيهَا. قَالَ قُلْتُ سُورَةُ الأَنْفَالِ؟ قَالَ: نَزَلَتْ فِي بَدْرٍ. قَالَ قُلْتُ: سُورَةُ الْحَشْرِ. قَالَ: نَزَلَتْ فِي بَنِي النَّضِيرِ. رواه الشيخان[١].

سەعیدی کوڕی جوبەیر (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: گوتم بە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ئامۆزای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ)و ڕەزای خوداش لەعەبدوڵڵای ئامۆزای بێ: هۆی هاتنی سوورەتی تەوبە چی بوو؟ فەرمووی: سوورەتی تەوبەی چی؟! بۆ ناڵێی سوورەتی ئابروو بردنو ریسواکردنی ناپاكو مونافقەکان! لەکاتێ خۆیدا هەموو جارێ کە ئایەتەکانی ئەم سوورەتە دەهاتنە خوارەوەو کۆمەڵ کۆمەڵ ناپاکەکانیان کەشف دەکردو دەیانفەرموو: هەندێکیان حاڵی ئەمەیەو هەندێکی تریان حاڵی ئەوەیە، ناپاکەکان زەندەقیان دەچوو، لەدڵەوە دەیانگوت: وابڕوا کەسمان لێ دەرناکا: یەك بەیەك هەموومان کەشفو ڕیسوا دەکا. گوتم: ئەی هۆی هاتنی سوورەتی ئەنفال چی بوو؟ فەرمووی: لەبارەی جەنگی بەدرەوە هاتە خوارەوە، گوتم: ئەی سوورەتی حەشر؟ فەرمووی: لەبارەی جوولەکەکانی هۆزی بەنی نەضیرەوە هاتە خوارەوە (ش).

٤١٥٧- قَالَ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنهما) حَرَّقَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) نَخْلَ بَنِي النَّضِيرِ وَقَطَعَ وَهْيَ الْبُوَيْرَةُ فَنَزَلَتْ (مَا قَطَعْتُمْ مِنْ لِينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَى أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ اللَّهِ وليُخزي الفاسقين). رواه البخاري والترمذي[٢].

---

[١] بخاري. تفسير: ٤٨٨٣، ٤٠٢٩، ٤٨٨٢، ٤٦٤٥. مسلم: تفسير: ٧٤٧٤.

[٢] بخاري. تفسير: ٤٨٨٤.

**ئیبنو عومەر** (خودایان لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: کاتێ پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **ڕەزەدار خورماکانی بەنی نەضیری سووتاندو فەرمانی دا بەبڕینیان، کەلە بووەیرە بوون، کە نزیکی دوو میل لە مەدینەوە دوورە، جوولەکەکان بەمە ئاگریان تێ بەربوو، گوتیان: ئەی موحەممەد! تۆ لە لایەکەوە دەڵێیت من پێغەمبەرم، کەچی لەلایەکی ترەوە دەچی ڕەزو باخ دا دەهێنێو داری بەریی و درەختی بەردار دەسووتێنیو دادەپاچی، ئەمە چی بەسەر چییەوەیە؟ جا خودا ئەم ئایەتەی نارد: {مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَى أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ اللَّهِ وَلِيُخْزِيَ الْفَاسِقِينَ} (٥٩/٥) واتە: هەرچی ئێوە بڕیتان لە باخەکانی بەنی نەضیر، یا هێشتانەوە بەراوەستاوی لەسەر ڕەگو ڕیشەی خۆی، هەمووی بەفەرمانی خودا بوو، هەتا کافرانی پێچاوشکێن ببنو ئەو بەدکارو فاسیق و لەپەیمان دەرچوانە ڕەنجەڕۆو ڕیسوا ببن بە فەرمانی خودا (ب/ت).**

**٤١٥٨- قَالَ عُمَرَ** (رضي الله عنه) **كَانَتْ أَمْوَالُ بَنِي النَّضِيرِ مِمَّا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ** (صلى الله عليه وسلم) **مِمَّا لَمْ يُوجِفِ الْمُسْلِمُونَ عَلَيْهِ بِخَيْلٍ وَلاَ رِكَابٍ، فَكَانَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ** (صلى الله عليه وسلم) **خَاصَّةً، وَكَانَ يُنْفِقُ منها عَلَى أَهْلِهِ نَفَقَةَ سَنَتِهِ، ثُمَّ يَجْعَلُ مَا بَقِيَ فِي السِّلاَحِ وَالْكُرَاعِ، عُدَّةً فِي سَبِيلِ اللَّهِ. رواه البخاري (بل رواه الخمسة. أنظر مبحث الفيء من كتاب الجهاد)**[٢].

**عومەر** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: ئەو ماڵو تالانییە کەدەستی پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **کەوت، لەماڵی بەنی نەضیر، خودا دەستی پێغەمبەری خستبوو، موسوڵمانان بەتاودانی ماینو ئەسپ و بەغاردانی وشترو بەجەنگ پەیدایان نەکردبوو، وە ئەوماڵو تالانییە بەر ئەم ئایەتە دەکەوێ کە دەفەرموێ: {وَمَا أَفَاء اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْهُمْ فَمَا أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ} ئەوی خودا دەست پێغەمبەری خۆی خست لەماڵی مفتی بێ ئارەقی بەنی نەضیر ئێوە (ئەی لەشکری ئیسلام!) بۆ پەیداکردنی ئەو ماڵە هیچ ئەسپ و**

---

[٢] بخاري. تفسير: ٤٨٨٥.

ووشترێکتان تاونەداوە، بەڵکوو خودا بە لوتفی خۆی ڕەخساندبووی بۆی.
عومەر فەرمووی: جا لەبەر ئەوە ئەم ماڵو سامانانە بەتایبەتی هەربوو بوون بەهی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئازووقەو مەصرەفی ساڵێکی خێزانو کەسو کاری خۆی لێ دادەناو هەرچی دەمایەوە لەوە دایدەنا بۆ ئیشو کارو پێویستی موسوڵمانانو صەرفی دەکرد بۆ ئامادەکردنی چەكو تفاقی جەنگو وولاخ، لەڕێگەی خودادا دەیکرد بەکەرەستەی جەنگ (ش/د/ت/ن).

٤١٥٩- ← (ب/٣ ز/٤٥ ل/١٤٦ ف/٣)[٤].

٤١٦٠- ← (ب/١ ز/٩ ل/٥٣ ف/٥)[٥].

٤١٦١- (ب/٥ ز/٧ ل/٣٤ ف/١)[٦].

له ئەصڵی عەرەبییەکەدا بەرگی سێ (ص/٣١٩) حەدیثی یەکەم باسی (وصية عمر والبيعة لعثمان).

٤١٦٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ جاءَ رَجُلٌ إِلى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ أَصَابَنِي الْجَهْدُ فَأَرْسَلَ إِلَى نِسَائِهِ فَلَمْ يَجِدْ عِنْدَهُنَّ شَيْئًا، فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم) «أَلاَ رَجُلٌ يُضَيِّفُ هَذِهِ اللَّيْلَةَ يَرْحَمُهُ اللّٰهُ». فَقَامَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ فَقَالَ أَنَا يَا رَسُولَ اللّٰهِ. فَذَهَبَ إِلَى أَهْلِهِ فَقَالَ لاِمْرَأَتِهِ: ضَيْفُ رَسُولِ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم) لاَ تَدَّخِرِيهِ شَيْئًا. قَالَتْ: وَاللّٰهِ مَا عِنْدِي إِلاَّ قُوتُ الصِّبْيَةِ. قَالَ: فَإِذَا أَرَادَ الصِّبْيَةُ الْعَشَاءَ فَنَوِّمِيهِمْ، وَتَعَالَيْ فَأَطْفِئِي السِّرَاجَ وَنَطْوِى بُطُونَنَا اللَّيْلَةَ. فَفَعَلَتْ ثُمَّ غَدَا الرَّجُلُ عَلَى رَسُولِ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: «لَقَدْ عَجِبَ اللّٰهُ عَزَّ وَجَلَّ - أَوْ ضَحِكَ - مِنْ فُلاَنٍ وَفُلاَنَةَ». فَأَنْزَلَ اللّٰهُ عَزَّ وَجَلَّ (وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنْفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ). رواه الشيخان والترمذي. نسأل الله التوفيق لَما يُحِبُّ وَيَرْضى[٧].

---

[٤] بخاري. تفسير: ٤٨٨٦، ٤٨٨٧، ٥٩٣١، ٥٨٣٩، ٥٩٤٣، ٥٩٤٨.

[٥] تقدم في المجلد الأول. تسلسل٩ رقم: ٦٥/٥.

[٦] تقدم في المجلد الخامس. تسلسل: ٧ = ٣٢٧١/١.

[٧] بخاري. مناقب الأنصار: ٣٧٩٨، ٤٨٨٩ = تجريد/٤ ل/١٧٤ رقم: ١٤٨٩. مسلم: أشربة: ٥٣٢٧. ترمذي. تفسير القرآن: ٣٣٠٤.

**ئەبو هورەیرە** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! لەبرسانا لاکەی سەرم دێ! ئەویش یەکە یەکە ناردی بۆ خواردن بۆلای هاوسەرەکانی خۆی،** (ڕەزای خودایان لەسەر بێ)، **بەڵام هیچی لێ هەڵنەکراندن، ئەوجا فەرمووی: ئای بۆ پیاوێ ئەم شەو داڵدەی ئەم پیاوە بداو میوانداریی پێ بکا،** (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) **پیاوێ لە یاریدەدەران (ئەنصار) هەڵسا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من میوانداریی بۆ دەکەم. جا ڕۆیشتنەوەو لەماڵەوە بەژنەکەی خۆی گوت: ئەمە میوانی پێغەمبەرە** (دروودی خودای لەسەربێ) **هیچ درێغی لەگەڵ مەکە، ژنەکەی گوتی: بەخودا بەس خۆراکی منداڵەکان گومان دەبەم، گوتی: کاتێ منداڵەکان داوای شێویان کرد گورگانە شەوێیان بۆ بکەو بیانخەوێنەو کەنانەکەت بۆ ئێمە دانا، بەبیانووی چراچاك کردنەوە خۆشت وەرەو چراکە بکوژێنەوە، ئەم شەو خۆمان بەسکی خاڵی شەو دەکەینەوە، با میوانەکەی پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **بێ خزمەت نەبێو نانەکەی بەتێرو تەسەلی بخوا، شەوێ هەر شەوێکە، هەرچۆنێ بێ دەڕوا، ژنەکەیشی وای کرد، جا بۆ بەیانی کە پیاوەکە چۆوە بۆ خزمەتی حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی** (دروودی خودای لەسەربێ): **بەڕاستی خودای باڵادەستو شکۆدار ئەم شەو سەیری هات لەکاری ئەم پیاوەو ژنەکەی یا فەرمووی: خودا پێکەنینی لەکاری شیرینو جوانیان هات ئەوەندەی پێ خۆش بوو جا خودای گەورەیش ئەمەی ناردە خوارەوە: {وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ} (٩/٥٩) واتە: هەرچەند خۆشیان نەداراو کەم دەستو دەستیان کورتە لەگەڵ ئەوەشا چاویان لەپیاوەتیو خێرکردن نەترساوە←** (ش/ت).

## ٤٣- سوورەتی مومتەحینە

**(مەدینەییە، ١٣ ئایەتە)**

**سورة الممتحنة (مدنية وهي ثلاثة عشر آية)**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤١٦٣- عَنْ عَلِيٍّ (رضي الله عنه) قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنَا وَالزُّبَيْرَ وَالْمِقْدَادَ فَقَالَ: انْطَلِقُوا حَتَّى تَأْتُوا رَوْضَةَ خَاخٍ، فَإِنَّ بِهَا ظَعِينَةً (امرأةً فِي هَوْدَجٍ اِسْمُهَا

سَارَةَ) مَعَهَا كِتَابٌ، فَخُذُوه مِنْهَا. قَالَ فَانْطَلَقْنَا تَعَادَى بِنَا خَيْلُنَا حَتَّى أَتَيْنَا الرَّوْضَةَ، فَإِذَا نَحْنُ بِالظَّعِينَةِ قُلْنَا لَهَا: أَخْرِجِي الْكِتَابَ. قَالَتْ: مَا مَعِي كِتَابٌ. فَقُلْنَا لَتُخْرِجِنَّ الْكِتَابَ أَوْ لَنُلْقِيَنَّ الثِّيَابَ، قَالَ: فَأَخْرَجَتْهُ مِنْ عِقَاصِهَا (شعرها المضفور)، فَأَتَيْنَا بِهِ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَإِذَا فِيهِ مِنْ حَاطِبِ بْنِ أَبِي بَلْتَعَةَ إِلَى نَاسٍ بِمَكَّةَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ، يُخْبِرُهُمْ بِبَعْضِ أَمْرِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) «يَا حَاطِبُ مَا هَذَا». قَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ لاَ تَعْجَلْ عَلَيَّ، إِنِّي كُنْتُ امْرَأً مُلْصَقًا فِي قُرَيْشٍ وَلَمْ أَكُنْ مِنْ أَنْفُسِهِمْ وَكَانَ مَنْ مَعَكَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ مَنْ لَهُمْ قَرَابَاتٌ، يَحْمُونَ أَهْلِيهِمْ وَأَمْوَالَهُمْ، فَأَحْبَبْتُ إِذْ فَاتَنِي ذَلِكَ مِنَ النَّسَبِ فِيهِمْ أَنْ أَتَّخِذَ عِنْدَهُمْ يَدًا يَحْمُونَ قَرَابَتِي، وَلَمْ أَفْعَلْهُ ارْتِدَادًا عَنْ دِينِي، وَلاَ رِضًا بِالْكُفْرِ بَعْدَ الإِسْلاَمِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) «أَمَا إِنَّهُ قَدْ صَدَقَكُمْ». فَقَالَ عُمَرُ يَا رَسُولَ اللَّهِ دَعْنِي أَضْرِبْ عُنُقَ هَذَا الْمُنَافِقِ. فَقَالَ «إِنَّهُ قَدْ شَهِدَ بَدْرًا، وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ اللَّهَ اطَّلَعَ عَلَى مَنْ شَهِدَ بَدْرًا قَالَ اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ». فَأَنْزَلَ اللَّهُ السُّورَةَ (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِمْ بِالْمَوَدَّةِ). رواه الأربعة[1].

**لەعەلییەوە** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **دەگێڕنەوە، دەفەموێ: کاتێ بێ بڕواکانی مەککە پەیمانەکەی حودەیبییەیان شکان پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **بڕیاری دا کەشاری مەککە بگرێ، وە فەرمانی دا بە موسوڵمانەکان کە خۆیان ئامادە بکەن بۆ جەنگ، حاطەبی کوڕی ئەبوبەلتەعە، لەژێرەوە کاغەزێ دەنووسێ بۆ دانیشتوانی مەککە، کە ئاگاتان لەخۆتان بێ، چونکە پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **لەم ڕۆژانەدا دێتە سەرتان و دەدا بەسەرتانا، وە بەدزییەوە بەژنێکی مەککەیی دا دەینێرێ بۆیان، جا حەزرەتی جوبرەئیل** (درودی خودای لەسەربێ) **دێت بۆلای حەزرەت و ئەم هەواڵەی پێ دەداو پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **من و زوبەیرو میقدادی ناردو فەرمووی: بڕۆن هەتا دەگەنە باخچەی**

---

[1] بخاري. مغازي: ٤٨٩٠، ٣٠٠٧، ٣٠٨١، ٣٩٨٣، ٤٢٧٤، ٦٢٥٩، ٦٩٣٩ = تەجرید/٤ ل/٤٩٩ ژمارە/١٧٠٤. مسلم. فضائل الصحابة: ٦٣٥١ ترمذي. تفسير القرآن: ٣٣٠٥، أبو داوود. جهاد: ٢٦٥.

خاخ لەوێدا ئافرەتێکی کەژاوەنشینی لێیە، کاغەزێکی پێیە لێی بسێنن ئەگەر کاغەزەکەی نەدانێ بیکوژن، جا بەغار ڕۆیشتین‌و ماینەکانمان تاودا هەتا چوینە باخچەکە، کە سەیرمان کرد واژنەکە لەوێیە، وەداوای کەغازەکەمان لێ کرد، حاشای کردو گوتی کاغەزم پێ نییە، جا گوتمان: یا کاغەزەکەمان دەدەیتێ یا دەبێ خۆت ڕووت‌و قووت بکەیتەوە یا دەتکوژین، ئەوجا ژنەکە کاغەزەکەی لەناو لۆی پەلکەکانی دەرهێناو ژنەکەو نامەکەمان برد بۆلای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) کەنامەکەمان خوێندەوە ئەمەی لێنووسرابوو، لە حاطەبی کوڕی ئەبوبەلتەعەوە بۆ فلان‌و فلان، کەناوی چەن کەسێ بوون لەبتپەرستەکانی مەککە، وەهەواڵی هەندێ لەکارو باری پێغەمبەری بۆ نوسیبوون کە دەیەوێ بچێ بۆ سەریان، جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) حاطەبی بانگ کردو فەرمووی: ئەی حاطەب! ئەمە چییە؟ ئەم کاغەزەت بۆ نووسیوە؟ ئەویش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! پەلەم لێ مەکە تامەسەلەکەتان بۆ ڕوون دەکەمەوە بەخوا ئەوەتی موسوڵمان بووم نەلەدین هەڵگەڕاوەمەتەوەو نەناپاکی‌و مونافقیم کردووە، بەڵام من بابەیەکی بەڕانی بووم لەناو هۆزی قوڕەیش داو لە خۆیان نەبووم‌و ژن‌و منداڵەکانم لەناو ئەواندا بەجێماون، ئەم هەموو کۆچکەرانەی کەلەگەڵ تۆدان هەموو کەسوکارو خزم‌و خوێشیان لەمەککە هەیە، کە ئاگاداری ماڵ‌و منداڵەکانیان دەکەن لەوێ، تەنیا من نەبێ، جا لەبەر ئەوەی کە بەخزمایەتی هیچم بۆناکرێ، ویستم بەم شێوەیە دەستیاوێکیان لەگەڵ دا بکەم، هەتا بەرابەربەوە ئەوانیش ئاگاداری خزمەکانم بکەن، ئەگینا نە لەبەر بێ بڕوایی‌و نەلەبەر هەڵگەڕانەوە لەئایینی خۆم ئەمەم نەکردووە.

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: قسەی ڕاستی بۆ کردن عومەر (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! لێم گەڕێ ئەمە ناپاکە با لەملی بدەم؟ فەرمووی (درودی خودای لەسەربێ): ئەمە لەیارانی بەدرە، چۆنی دەکوژیت تۆ چووزانیت؟ بەڵکوو خودای باڵادەست‌و خاوەن شکۆ ڕووی قسەی کرد بێتە یارانی بەدرو مژدەی دابێ‌و پێی فەرمووبن: بەئارەزووی خۆتان چی دەکەن

بیکەن، من هەر لەئێستاوە لێتان خۆش بووم، لەبەر ئەوەی کە بەشداری ئەم جەنگە پیرۆزەیەتان کردووە جا لەشانی ئەودا ئەم ئایەتە دابەزی: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ} (١/٦٠) واتە: ئەی کۆمەڵەی موسوڵمانان! هەرگیزاو هەرگیز کافرو بێ بڕوایان (کەهەم دوژمنی منن و هەم دوژمنی ئێوەن) مەگرن بەدۆستی خۆتان. (ش/د/ت).

قال اللّٰهُ تَعَالَى: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا جَاءَكُمُ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ فَامْتَحِنُوهُنَّ اللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِهِنَّ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَاتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ لَا هُنَّ حِلٌّ لَهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ} (١٠/٦٠) واتە:

ئەی کەسانێ کەباوەڕی ساغتان بە خوداو پێغەمبەری خودا هەیە، کاتێ ژنە خاوەن باوەڕەکان کۆچیان کردو هاتن بۆناو ئێوە، ئەوە لە پێشا تاقییان بکەنەوە، کەهەر بۆ ڕەزای خودا کۆچیان کردووەو پەنایان هێناوە بۆلای ئێوە، نەوەك لەبەر دڵداری و شتی وا، هەرچەند خودا خۆی ڕاستیی هەموو ڕووداوێ زۆر بەباشی دەزانێ و ئاگای لە باوەڕو ئیمانی ئەوانە، جا ئەگەر بۆتان دەرکەوت کەئەو ژنانە لەدەستی کوفر کۆچیان کردووەو موسوڵمانن ئیتر مەیان دەنەوە بەمێردە بێ بڕواکانیان، چونکە نە ئەمانە حەڵاڵن بۆ ئەوان و نەئەوانیش حەڵاڵن بۆ ئەمان!.

٤١٦٤- قالَتْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) إنَّ رسول الله (صلى الله عليه وسلم) كَانَ يَمْتَحِنُ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِ مِنَ الْمُؤْمِنَاتِ بِهَذِهِ الآيَةِ، بِقَوْلِ اللّٰهِ (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءَكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ) إِلَى قَوْلِهِ (غَفُورٌ رَحِيمٌ). قَالَ عُرْوَةُ قَالَتْ عَائِشَةُ فَمَنْ أَقَرَّ بِهَذَا الشَّرْطِ مِنَ الْمُؤْمِنَاتِ قَالَ لَهَا رَسُولُ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم) «قَدْ بَايَعْتُكِ». كَلاَمًا وَلاَ وَاللّٰهِ مَا مَسَّتْ يَدُهُ يَدَ امْرَأَةٍ قَطُّ فِي الْمُبَايَعَةِ، مَا يُبَايِعُهُنَّ إِلاَّ بِقَوْلِهِ «قَدْ بَايَعْتُكِ عَلَى ذَلِكَ». رواه البخاري والترمذي[٢].

---

[٢] بخاري. تفسير: ٤٨٩١.

**عائیشە** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: جاران ئەو ئافرەتانەی کە موسوڵمان دەبوون و کۆچیان دەکرد بۆلای پێغەمبەرو ماڵ و مێردی خۆیانیان بەجێ دەهێشت و دەهاتنە ناو موسوڵمانان حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **بەپێی ئەم ئایەتە تاقی دەکردنەوە: {یا أیها النبي....} تا دوایی. ئەم ئایەتە لەم شوێنە دا ڕابورد ← (ب/١ ز/٨ ل/٤٩ ف/٦) عائیشە فەرمووی: جا هەرژنێ لەو ژنانە کە موسوڵمان ببوونایە ددانی بنایە بەم شەش مەرجە دا ئیتر پێغەمبەر بەدەم پێی دەفەرموو: ئەوا پەیمانم لەگەڵ بەستیت مەندەی فەرموودەکەش لەپێشەوە لەهەمان شوێندا ڕۆیشت (ب/ت).**

## ٤٤- سوورەتی صەف

**(هەندێ دەڵێن مەکەییەو هەندێ دەڵێن مەدینەییە، چواردە ئایەتە)**

**سورة الصف (مكية أو مدينة، وهي أربع عشرة آية)**

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤١٦٥- قَالَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلَامٍ قَعَدْنَا نَفَرٌ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَتَذَاكَرْنَا فَقُلْنَا لَوْ نَعْلَمُ أَيَّ الأَعْمَالِ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ لَعَمِلْنَاهُ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى (سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لاَ تَفْعَلُونَ). رواه الترمذي[1].

**عەبدوڵڵای کوڕی سەلام** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: کۆمەڵێ لەیارانی پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **بووین، دانیشتبووین و لەناو خۆمانا گوفت و گۆمان دەکرد، گوتمان: ئەگەر بمانزانیایە چ کردەوەیێ لەلای خودا زۆر چاکەو پەسەندە دەمان کرد جا خودا ئەمەی ناردە خوارەوە: {سبح لله..} تاد. واتە: سەرو خوارو ژوور، ئاسمان و زەوی، خۆیان و هەرچی لەناویانایە خودا بەهەق دەزانن و بەپاک و بێ گەردو بێ خەوشی دادەنێن، خودا خودایەکی**

[1] سكت عن درجته الشارح.

خــاوەن دەســتەڵاتەو دانــاو زانایــە. ئــەی موســوڵمانینە! مــەنێ بپێــون کەســەربگرێ، قــسەیێ بکــەن کــەجێ و شــوێنی هــەبێ، ووتــارو کردارتــان ئاسمان و ڕێسمان نەبێ (ت).

قال اللَّهُ تَعَالَى: {وَإِذْ قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ إِنِّي رَسُولُ اللَّـهِ إِلَـيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِن بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ فَلَمَّا جَاءَهُم بِالْبَيِّنَاتِ قَالُوا هَذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ} (٦١/٦) واته:

خــودای گــەورە دەفــەرموێ: ئــەی خۆشەویــست! ئــەو داســتانە جوانــە شیرینەی عیسای کوڕی مەریەم باس بکە بۆ موسوڵمانان، کە تەبلیغی قەومی جووی کردو پێی فەرموون: ئەی نەوەی ئیسرائیل! باش بزانن یەکەم من پێغەمبەری خودام ڕەوانەیکردووم بۆسەر ئێوە دووەم باوەڕم هەیە بەتەورات کەلەپێش مندا خودا بەسرووش ناردوویەتی بۆ مووسا، نامەی خودایەو ڕاستەو دروستە سێیەم موژدە دەم بە هەموو کەسێ، کە پێغەمبەرێکی ڕاست لەپاش من دێت ناوی ئەحمەدە، جاکاتێ ئەو پێغەمبەرە کە ناوی ئەحمەدە هات بۆناویان، بەبەڵگەو نیشانەی ئاشکراوە، لەباتی باوەڕی پێ بکەن گوتیان: ئەم قورئانە جادوویەکی دیارییە!

٤١٦٦- ← لەپێشەوە ڕابوورد، لەباسی (مولد النبي (صلى الله عليه وسلم) ونسبه وأسماؤه) فەرموودەی ژمارە چوار[٢].

## ٤٥- سوورەتی جومعە

(مەدینەییە، ٢١ ئایەتە)

## سورة الجمعة (مدنية، وهي أحدى عشرة آية)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤١٦٧- لەباسی (فضل فارس)دا ڕابورد، فەرموودەی یەکەم و دووەم[١].

---

[٢] تقدم برقم: ٣٠٨٢/٤ مجلد/٤ ت/٨٢.

٤١٦٨- عَنْ جَابِرٍ (رضي الله عنه) قَالَ: أَقْبَلَتْ عِيرٌ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَنَحْنُ مَعَ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فَثَارَ النَّاسُ إِلاَّ اثْنَا عَشَرَ رَجُلاً فَأَنْزَلَ اللَّهُ (وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْوًا انْفَضُّوا إِلَيْهَا). رواه البخاري والترمذي والله أعلم[٢].

**جابیر** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: لەڕۆژی هەینی دا، لە خزمەت پێغەمبەردا بووین، خەریکبوو خوتبەی هەینی دەخوێندەوە، لەوکاتەدا لە شامەوە کاروانێ هات، دەهۆڵو زوڕنا لەپێشیەوە بوو، تا مەردووم بزانن کەوا کاروانەکە گەیشتە جێ، ئیتر خەڵکەکە ووتارەکەیان بەجێ هێشتو لەمزگەوت دەرچوونو دەرپەڕین بۆلای کاروانەکە، بۆ شت کڕین، تەنیا دوازدە کەس لەخزمەتی حەزرەتدا مانەوە (لەشەرحەکەدا: دەفەرموێ: هەندێ دەڵێن: سیازدەکەسو هەندێ دەڵێن چواردە کەسو هەندێ دەڵێن: چل کەس لەخزمەتی دا مانەوە، ئەمەیش بووە بەهۆی جیایی ڕای پێشەواکان لەبارەی ژمارەی ئەو نوێژکەرانەوە کەنوێژی هەینی یان پێ دادەمەزرێ). جا خودا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: {وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْوًا انفَضُّوا إِلَيْهَا} (١١/٥٢) واتە: ئەوانەی لەدەوری تۆ بوون، کاتی چاویان بەبازرگانیو مامەڵەو ئەوکارە بێهوودەیە کەوت، کەلەکاتی واداو لەزۆر کاتی تریش دا ئادەمیزاد خەریك دەکاو لەبەندەیی کردنی ساغ بۆ خودای مەزن دووری دەخاتەوە، ئەوانە لەم کاتەدا دەوری تۆیان چۆڵ کردو بڵاوەیان لێ کردو چوون بۆلای ئەو بەزمو ڕەزمە (ب/ت- ڕەزای خودای لێ بێ) لەشەرحەکەدا دەفەرموێ:** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **لە حەیث دا دەفەرموێ: ئەگەر هەمووتان، یەك لەدوای یەك لای منتان چۆڵ بکردایەو کەستان لەلای من نەمایەتەوە یەکسەر لێشاوی بڵێسەی ئاگر بەناو ئەم شیوەدا ڕاپێچی دەکردن!.**

---

[١] تقدم برقم: ٣٥٧٣/٢ مجلد خامس. تسلسل/٧٢.

[٢] بخاري. تفسير: ٤٨٩٩.

## ٤٦- سوورەتی مونافیقوون

(مەدینەییە، ٢١ ئایەتە)

## سورة المنافقون (مدنية، وهي أحدى عشرة آية)

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

**٤١٦٩- عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ (رضي الله عنه) قَالَ كُنْتُ مَعَ عمِّي فَسَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أُبَيّ ابن سول يَقُولُ لاَ تُنْفِقُوا عَلَى مَنْ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ حَتَّى يَنْفَضُّوا مِنْ حَوْلِهِ وقال: لئن رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الأَعَزُّ مِنْهَا الأَذَلَّ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِعَمِّي فَذَكَرَهُ لِلنَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فَأَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) إِلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُبَيّ وَأَصْحَابِهِ فَحَلَفُوا مَا قَالُوا فَكَذَّبَنِي رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَصَدَّقَهُ فَأَصَابَنِي هَمٌّ لَمْ يُصِبْنِي مِثْلُهُ قَطٌّ، فَجَلَسْتُ فِي الْبَيْتِ فَقَالَ لِي عَمِّي مَا أَرَدْتَ إِلَى أَنْ كَذَّبَكَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَمَقَتَكَ. فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى (إِذَا جَاءَكَ الْمُنَافِقُونَ) إلى قوله (هُمُ الذين يقولُونَ لاَ تنفقوا على مَنْ عند رَسُولِ اللَّهِ) إلى قوله: (ليخرجنَّ الأعَزُّ منها الأَذَلَّ) فَأَرْسَلَ إِلَيَّ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَرَأَها عَلَيَّ ثم قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ قَدْ صَدَّقَكَ يَا زَيْدُ»[1].**

**زەیدی کوڕی ئەرقەم (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: جارێ لەخزمەتی مامەمدا بووم، گوێم لێ بوو عەبدوڵڵای کوڕی سەلوول دەیگوت: ماڵی خۆتان بۆ ئەوانە خەرج مەکەن کەوان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا، هەتا بڵاوەی لێ بکەن و لێی بتەکێنەوە. وە دەیگوت: ئەگەر گەڕاینەوە بۆ شاری مەدینە، لەوێ لەئێمەو لەدەستەی موحەممەد کێمان بەدەست و بەدەسەڵات و ئازاتربێ، شاری مەدینە بە دەستەکوونی و بێ دەستەڵاتەکەی ترمان چۆڵ دەکەین! منیش ئەمەم بۆ مامەم گێڕایەوە، ئەویش بۆ حەزرەتی دەگێڕێتەوە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) ناردی بەشوێن عەبدوڵڵای کوڕی سەلوول و هاوڕێکانی داوباسەکەی بۆ باس کردن، ئەوانیش حاشایان لێکردو بە درۆ**

---

[1] بخاري. تفسير: ٤٩٠٠، ٤٩٠١، ٤٩٠٣، ٤٩٠٤، تجريد/٤ ل/٥٠٥ رقم: ١٧٠٧ مسلم. صفات المنافقين: ٦٩٥٥، ترمذي. تفسير القرآن: ٣٣١٢.

سوێندیان خوارد کە ئێمە قسەی وامان نەکردووەو حەزرەت باوەڕی پێ کردن و باوەڕی بەمن نەکرد مامەیشم پێی گوتم: چ کارێکت بەم قسەیە هەبوو کە بوو بەهۆی ئەوە پێغەمبەر باوەڕت پێنەکاو رقی لێت بێ منیش تووشی خەمێ بووم، هەرگیز تووشی خەمی وا نەبووم و لەماڵەوە دەستە ئەژنۆ بەخەم و خەفەتەوە لێی دانیشتم تا خواو ڕاسان خودای باڵا دەست و خاوەن شکۆ ئەم ئایەتانەی ناردە خوارەوە لە {إِذَا جَاءكَ الْمُنَافِقُونَ...} هەتا {... لَيُخْرِجَنَّ الْأَعَزُّ مِنْهَا الْأَذَلَّ} جا حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) ناردی بەشوێنماو ئایەتەکانی بەسەرما خوێندەوەو فەرمووی: ئەی زەید! قسەکەت ڕاست دەرچوو، چۆنت گوت وابوو، ئەوەتانێ خوا بەم ئایەتانە ڕاستیی قسەکەی تۆی دەرخست و ئەوانی بەدرۆخستەوە (ش/ت). رەحمەت لەوکەسەی گوتوویە:

دەڵێن: خاوەن مناڵە
موعجیزەی حەزرەت گشت فێڵ و فاڵە
من چۆن ڕزگاربم، خوداو پێغەمبەر
ڕزگاریان نەبووە لەتانەی بەشەر!
بەم پێو دانەبێ، دەبێ من وەک کا
وورد وورد بمکوتن، بە جەنجەڕو گا!
بەڵام زوربەی خەڵک قسە وادەکا
تاج تاجی گوڵە لەدڵی خەڵکا،
پێم دەڵێن نووری! دەزانی کاکە!
ساجی رووت پۆشی بەم تاجە چاکە!

٤١٧٠- عَنْ جَابِرَ (رضي الله عنه) قَالَ كُنَّا فِي غَزَاةٍ فَكَسَعَ رَجُلٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ فَقَالَ الأَنْصَارِيُّ يَا لَلأَنْصَارِ. وَقَالَ الْمُهَاجِرِيُّ يَا لَلْمُهَاجِرِينَ. فَسَمِعَ ذَاكَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ «مَا بَالُ دَعْوَى جَاهِلِيَّةٍ»قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ كَسَعَ رَجُلٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ. فَقَالَ «دَعُوهَا فَإِنَّهَا مُنْتِنَةٌ». فَسَمِعَ بِذَلِكَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ

أُبَيٌّ فَقَالَ فَعَلُوهَا، أَمَا وَاللَّهِ لَئِنْ رَجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الأَعَزُّ مِنْهَا الأَذَلَّ. فَبَلَغَ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَامَ عُمَرُ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ دَعْنِي أَضْرِبْ عُنُقَ هَذَا الْمُنَافِقِ. فَقَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) «دَعْهُ لاَ يَتَحَدَّثُ النَّاسُ أَنَّ مُحَمَّدًا يَقْتُلُ أَصْحَابَهُ». رواهما الشيخان والترمذي[٢].

لەجابیرەوە (خودای لێ ڕازی بێ) دەگێڕنەوە دەفەرموێ: لە غەزای تەبووك دا بووین، پیاوێ (لە کۆچکاران) شەپاڵەیەکە کێشا بە پاشەڵی پیاوێکی یاریدەدەردا، ئیتر پیاوە یاریدەدەرەکە زۆر تووڕە بوو، هاواری لێ هەڵساو بانگی کرد: ئەی یاریدەدەرینە! هاوار فریام کەون، وە کابرای کۆچکەریش هاواری لەکۆمەڵی خۆی کردو گوتی: ئەی کۆچکارینە، هاوار فریام کەون، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) گوێی لەمە بوو دەرچوو بۆناویان فەرمووی: ئەم بانگەوازو هاتوو هاواری سەردەمی نەزانیو جاهلییتە چییە؟ گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! پیاوێکی کۆچکار شەپلاخێکی لە پیاوێکی یاریدەدەر داوە، فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ) واز لەم جۆرە پیشە پیسە بێنن، چونکە بەڕاستی خوویەکی بۆگەنو گەندە، جا عەبدوڵلای کوڕی سەلوول، کەئەمەی بیستەوە گوتی: ئاوای لێ هات، ئەمەشیان کرد؟ دەسا بەو خودایە ئەگەر، گەڕاینەوە بۆ مەدینە کێمان ئازاو بەدەسەلات بێشاری مەدینە بە کونیو بێ دەسەلاتەکانمان چۆڵ دەکەین!! ئەم باسە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) جا عومەر هەڵسایە سەر پێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! لێم گەڕێ بابدەم لەگەردنی ئەم دوو ڕووی ناپاکە. فەرمووی: وازی لێبێنە با خەڵك نەڵێن: موحەممەد هاوڕێکانی خۆی دەکوژێ! (ش/ت).

٤١٧١- عَنْ قَيْسِ بْنِ عُبَادٍ (رضي الله عنه) قُلْنَا لِعَمَّارٍ أَرَأَيْتَ قِتَالَكُمْ مع عليٍّ (رضي الله عنه) لأهل الشَّام أَرَأْيًا رَأَيْتُمُوهُ فَإِنَّ الرَّأْيَ يُصِيبُ وَيُخْطِئُ أَوْ عَهْدًا عَهِدَهُ إِلَيْكُمْ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ مَا عَهِدَ إِلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) شَيْئًا لَمْ يَعْهَدْهُ إِلَى النَّاسِ

---

[٢] بخاري. تفسير: ٤٩٠٠، ٤٩٠١، ٤٩٠٢، ٤٩٠٣، ٤٩٠٤، ٤٩٠٥، ٤٩٠٧. مسلم: صفات امنافقين: ٦٩٥٧.

كَافَّةً. وَقَالَ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ «إِنَّ فِي أُمَّتِي اثْنَا عَشَرَ مُنَافِقًا لاَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ وَلاَ يَجِدُونَ رِيحَهَا حَتَّى يَلِجَ الْجَمَلُ فِي سَمِّ الْخِيَاطِ ثَمَانِيَةٌ مِنْهُمْ تَكْفِيكَهُمُ الدُّبَيْلَةُ سِرَاجٌ مِنَ النَّارِ يَظْهَرُ فِي أَكْتَافِهِمْ حَتَّى يَنْجُمَ مِنْ صُدُورِهِمْ»[٣].

قەیسی کوڕی عوببادی (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: بەعەمماریان گوت: هەواڵمان بدەرێ ئایا ئەم جەنگی ئێوەو عەلییە لەگەڵ موعاوییەو خەڵکی شامدا لەسەر بیرو باوەڕی خۆتان بوو، دیارە بیرو ڕایش گەلێ جار دەپێکێ و هەندێ جاریش بە هەڵەدادەچێ، یاخود پەیمانێ بوو لەلایەنی پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) ئەو وەصیییەتی بۆ کردبوون و بۆ ئەمە ئێوەی ڕاسپاردبوو؟ ئەویش فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پەیمان و عەهدی وای لەگەڵ ئێمەدا نەکردووە کەلەگەڵ سەراپای یارانی تری دا نەیکردبێ. وە فەرمووشی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرموویەتی: لەناو ئوممەتی مندا دوازدە ناپاك (مونافیق) هەن، نە دەچنە بەهەشتەوەو نەلە دووریشەوە بۆنی بەهەشت دەکەن، مەگەر لەفەرزی مەحاڵا وشتر بچێ بەکونی دەرزییەوە ئەوسا ئەوانیش بچنە بەهەشت هەشت کەس لەم دوازدە کەسە خەیارە (کە دوومەڵێکی گەورەیە) لەکۆڵی ئێوەیان دەکاتەوە، دوومەڵێ وەکوو چراوك لەسەر شانیان دەردێ، لە سەر سینگیانەوە سەرهەڵ دەدات و لەوێوە دەرگا دەبێ و دەیانکوژێ (م).

٤١٧٢- عَنْ جَابِرٍ (رضي الله عنه) قَالَ: قَدِمَ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مِنْ سَفَرٍ فَلَمَّا كَانَ قُرْبَ مِنَ الْمَدِينَةِ هَاجَتْ رِيحٌ شَدِيدَةٌ تَكَادُ أَنْ تَدْفِنَ الرَّاكِبَ فَزَعَمَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ «بُعِثَتْ هَذِهِ الرِّيحُ لِمَوْتِ مُنَافِقٍ». فَلَمَّا قَدِمَ الْمَدِينَةَ فَإِذَا مُنَافِقٌ عَظِيمٌ مِنَ الْمُنَافِقِينَ قَدْ مَاتَ. [٤].

---

[٣] مسلم. صفات المنافقين: ٦٩٦٦.

[٤] مسلم. صفات المنافقين: ٦٩٧٢.

**جابیر** (خودای لێ رازی بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **لەسەفەر دەگەڕایەوە، کە گەیشتە نزیکی مەدینە لەوێ بایەکی سەخت هەڵی کرد، زۆری نەمابوو کەسوار بەماینەوە ببات و لەبەرچاو وونی بکات، دەیگوت: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: ئەم بایە سەختە بە بۆنەی مردنی پیاوێکی ناپاك (دووو روو – دوو دڵ – مونافیق)ەوە خودا ناردوویەتی. گوتی: جا کاتێ حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **گەیشتەوە مەدینە تەماشامان کرد وا پیاوێکی ناپاکی گەورە لەمونافیق و ناپاکەکان مردووە (م).**

**٤١٧٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ** (رضي الله عنهما) **عَنِ النَّبِيِّ** (صلى الله عليه وسلم) **قَالَ «مَثَلُ الْمُنَافِقِ كَمَثَلِ الشَّاةِ الْعَائِرَةِ بَيْنَ الْغَنَمَيْنِ تَعِيرُ إِلَى هَذِهِ مَرَّةً وَإِلَى هَذِهِ مَرَّةً». روى الثلاثة مسلم في كتاب المنافقين[٥].**

**عەبدوڵلای کوڕی عومەر (خودایان لێ رازی بێت) فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: ناپاك وەك مەڕی ئاوەکی وایە، وێڵ و ڕاڕایە، جارێ بەم لایەدا بادەداتەوەو جارێ بەو لایەداو حول حولی دەبێ و سەری لێدەشێوێ و ڕانی خۆی ناناسێتەوە! (م).**

**٤١٧٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ** (رضي الله عنهما) **قَالَ مَنْ كَانَ لَهُ مَالٌ يُبَلِّغُهُ حَجَّ بَيْتِ رَبِّهِ أَوْ تَجِبُ عَلَيْهِ فِيهِ الزَّكَاةُ فَلَمْ يَفْعَلْ سَأَلَ الرَّجْعَةَ عِنْدَ الْمَوْتِ. فَقَالَ رَجُلٌ يَا ابْنَ عَبَّاسٍ اتَّقِ اللَّهَ إِنَّمَا يَسْأَلُ الرَّجْعَةَ الْكُفَّارُ قَالَ: سَأَتْلُو عَلَيْكَ بِذَلِكَ قُرْآنًا (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تُلْهِكُمْ أَمْوَالُكُمْ وَلاَ أَوْلاَدُكُمْ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ) (وَأَنْفِقُوا مِمَّا رَزَقْنَاكُمْ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَأْتِيَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ) إِلَى قَوْلِهِ (وَاللَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ) قَالَ فَمَا يُوجِبُ الزَّكَاةَ قَالَ إِذَا بَلَغَ الْمَالُ مِائَتَىْ دِرْهَمٍ فَصَاعِدًا. قَالَ فَمَا يُوجِبُ الْحَجَّ قَالَ الزَّادُ وَالْبَعِيرُ. رواه الترمذي. نسأل الله التوفيق[٦].**

---

[٥] مسلم صفات المنافقين: ٦٩٧٤.

[٦] سكت عن درجته الشارح.

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێت) فەرمووی: هەر کەسێ ئەوەندە دارایی هەبێ کە بتوانێ حەجی پێ بکا، وەنەیکا وە یاخود زەکاتی لێ بکەوێو زەکاتەکەی نەدا، ئەوە لەکاتی سەرەمەرگا (بۆ جەبری مانەقەص) داوای مۆڵەتو گەڕانەوە بۆ دنیا لەخودا دەکا، وە خودایش ڕێگەی ئەوەی نادات جا پیاوێ گوتی: ئەی ئیبنو عەبباس! لەخودا بترسە، ئەو کەسانە داوای گەڕانەوە بۆ دنیا دەکەن کە بەکافری دەمرن! ئەویش فەرمووی: ئێستە ئایەتی قورئانت لەسەر ڕاستیو دروستی ئەم فەرمایشتەیە بۆ دەخوێنمەوە، خودا فەرموویەتی: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُلْهِكُمْ أَمْوَالُكُمْ ...} تا کۆتایی سوورەتەکە (تەرجەمەی ئایەتەکە لەبەرگی دوو، لەلاپەڕە پەنجاو هەشت ڕابوورد) جا پیاوەکە عەرزی کرد: چی ئەندازەیێ لەماڵ زەکاتی لێدەکەوێ؟ فەرمووی: کاتێ نرخی ماڵ بگا بە دووسەد درەم یا زیاتر ئیتر زەکاتی دەکەوێ. کابرا گوتی: ئەی کەی حەج فەرز دەبێ لەسەر موسوڵمانو بەچی حەجی دەکەوێتە سەر؟ فەرمووی: خەرجی ڕێگەی هەبێو وشتری سواری هەبێ ئیتر حەجی لەسەر پێویست دەبێت (ت).

## ٤٧- سوورەتی تەغابون

(لەسوورەتە مەدینەییەکانە، هەژدە ئایەتە)

## سورة التغابن (مدنية، وهي ثمان عشرة آية)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤١٧٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) وَسَأَلَهُ رَجُلٌ عَنْ هَذِهِ الآيَةِ (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ وَأَوْلَادِكُمْ عَدُوًّا لَكُمْ فَاحْذَرُوهُمْ) قَالَ هَؤُلَاءِ رِجَالٌ أَسْلَمُوا مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ وَأَرَادُوا أَنْ يَأْتُوا النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) فَأَبَى أَزْوَاجُهُمْ وَأَوْلَادُهُمْ ذلِكَ وَمَنَعُوهُمْ أَنْ يَأْتُوا رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَلَمَّا أَتَوْا رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَرَأَوُا النَّاسَ قَدْ فَقِهُوا فِي الدِّينِ هَمُّوا أَنْ يُعَاقِبُوهُمْ فَأَنْزَلَ اللَّهُ الآيَةَ. رواه الترمذي بسند صحيح[1].

---

[1] رواه الترمذي بسند صحيح.

پیـاوێ پرسـیاری کـرد لـە ئیبنـو عـەبباس (خودایـان لـێ رازی بێـت) لەمانای ئەم ئایەتە: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُـوا إِنَّ مِـنْ أَزْوَاجِكُـمْ وَأَوْلَـادِكُمْ عَـدُوًّا لَّكُـمْ فَاحْـذَرُوهُمْ} (٦٤/١٤) واتـە: ئـەی کەسانێ کـەوا باوەڕتـان هێنـاوە! بـزانن کـە هەنـدێ لـەژن و منداڵـەکانتان دوژمنتـانن، خۆتانیـان لـێ بپـارێزن. ئـەویش فـەرمووی: ئەمانـە چـەند پیـاوێکی موسـوڵمان بـوون خـەڵکی مەککـە بـوون، ویـستیان لەمەککـەوە کـۆچ بکـەن بـۆ مەدینـە، بـۆ شـارەکەی پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەربێ) بـەڵام ژن و منداڵـەکانیان نـەیان دەهێـشت و ڕێگـەیان نـەدەدا، جـا کاتـێ خـودا بۆیـانی ڕێکخـست و کۆچیـان کـرد بـۆلای پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەربێ) تەماشـایان کـرد کـەوا خـەڵکی هـەموو رۆشـنبیرو شـارەزای یاسـای ئایین و دینـی خۆیـان بوون و ئـەمان لەولایەنـەوە دواکـەوتوون، جـا لەبـەر ئـەوە ویستیان تۆڵـەی ئـەو نەهێشتنە لـەژن و منداڵـەکانیان بستێنن، جـا خـودا ئـەم ئایەتـەی نـاردە خـوارەوە: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا.... } تاد. (ت–س/ص).

## ٤٨- سوورەتی تەلاق

(مەدەنییە، ١٢ ئایەتە)

سورة الطلاق (مدنية وهي ثنتا عشرة آية)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤١٧٦- ← (ب/٣ ز/٦٤ ل/١٥٧ ف/١)[1].

٤١٧٧- ← (ب/٣ ز/٧٩ ل/١٨٥ ف/١)[2].

---

[1] تقدم في المجلد الثالث. تسلسل/٦٤ رقم: ٢٢٣٢. بخاري. تفسير: ٤٩٠٨، ٥٢٥١، ٥٢٥٢، ٥٢٥٣، ٥٢٥٨، ٥٢٦٤، ٥٣٣٣، ٧١٦٠.

[2] تقدم في المجلد الثالث. تسلسل: ٧٩ برقم: ٢٢٧٤/١.

# ٤٩- سوورەتی تەحریم

**(لەسوورەتە مەدینەییەکانە، ١٢ ئایەتە)**

**سورة التحريم (مدنية، وهي ثنتا عشرة آية)**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤١٧٨- عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَشْرَبُ عَسَلاً عِنْدَ زَيْنَبَ ابْنَةِ جَحْشٍ وَيَمْكُثُ عِنْدَهَا فَوَاطَيْتُ أَنَا وَحَفْصَةُ عَنْ أَيَّتُنَا دَخَلَ عَلَيْهَا فَلْتَقُلْ لَهُ أَكَلْتَ مَغَافِيرَ إِنِّي أَجِدُ مِنْكَ رِيحَ مَغَافِيرَ. قَالَ «لاَ وَلَكِنِّي كُنْتُ أَشْرَبُ عَسَلاً عِنْدَ زَيْنَبَ ابْنَةِ جَحْشٍ فَلَنْ أَعُودَ لَهُ وَقَدْ حَلَفْتُ لاَ تُخْبِرِي بِذَلِكِ أَحَدًا». رواه الثلاثة[1].

**عائیشە** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: گەلێ جار کە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **لەماڵی زەینەبی کچی جەحش دەمایەوە شەربەتی هەنگوێنی دەخوارد، جا منو حەفصە قسەمان کرد بە یەكو بڕیارمان دا: هەر کاممان لە پێشدا پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **تەشریفی هات بۆلای پێی بڵێت: مەغافیرت خواردووە، من بۆنی مەغافیرت لی دەکەم، جا کاتێ ئەم قسەیەمان عەرزی حەزرەت کرد، فەرمووی: نەخەیر، بەڵام لەلای زەینەبی کچی جەحشی خێزانم شەربەتی هەنگوینم خواردۆتەوە، سوێندم خواردووە ئیتر نایخۆمەوە، ئەم قسەیە بەکەس مەڵێ (ش/د).**

**مەغافیر شیلەی دارێکە، بەعەرەبی پێی دەڵێن: (عورفوط)، تامی شیرینە، بەڵام بۆنی ناخۆشە، نازانم بەکوردی چی پێ دەڵێن. ئیمامی نەوەوی** (پڕ گوڕی لەڕەحمەتو نووری خودا بێ) **لە شەرحی صەحیحی موسلیم دا دەفەرموێ: عورفوط دارێکە لەوڵاتی حیجاز هەیە (وەرگێڕ).**

٤١٧٩- قَالَ ابْنَ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) مَكَثْتُ سَنَةً أُرِيدُ أَنْ أَسْأَلَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (رضي الله عنه) عَنْ آيَةٍ، فَمَا أَسْتَطِيعُ أَنْ أَسْأَلَهُ هَيْبَةً لَهُ، حَتَّى خَرَجَ حَاجًّا فَخَرَجْتُ مَعَهُ فَلَمَّا رَجَعْتُ وَكُنَّا بِبَعْضِ الطَّرِيقِ عَدَلَ إِلَى الأَرَاكِ لِحَاجَةٍ لَهُ – قَالَ – فَوَقَفْتُ لَهُ حَتَّى فَرَغَ

---

[1] بخاري. تفسير: ٤٩١٢، ٥٢٦٧، ٦٦٩١، تجريد: ١٧٠٩. مسلم. طلاق: ٣٦٦٣، ٣٦٦٤.

سِرْتُ مَعَهُ فَقُلْتُ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ مَنِ اللَّتَانِ تَظَاهَرَتَا عَلَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) مِنْ أَزْوَاجِهِ فَقَالَ تِلْكَ حَفْصَةُ وَعَائِشَةُ. قَالَ فَقُلْتُ وَاللَّهِ إِنْ كُنْتُ لأُرِيدُ أَنْ أَسْأَلَكَ عَنْ هَذَا مُنْذُ سَنَةٍ، فَمَا أَسْتَطِيعُ هَيْبَةً لَكَ. قَالَ فَلاَ تَفْعَلْ مَا ظَنَنْتَ أَنَّ عِنْدِي مِنْ عِلْمٍ فَاسْأَلْنِي، فَإِنْ كَانَ لِي عِلْمٌ خَبَّرْتُكَ بِهِ - قَالَ - ثُمَّ قَالَ عُمَرُ وَاللَّهِ إِنْ كُنَّا فِي الْجَاهِلِيَّةِ مَا نَعُدُّ لِلنِّسَاءِ أَمْرًا، حَتَّى أَنْزَلَ اللَّهُ فِيهِنَّ مَا أَنْزَلَ وَقَسَمَ لَهُنَّ مَا قَسَمَ - قَالَ - فَبَيْنَا أَنَا فِي أَمْرٍ أَتَأَمَّرُهُ إِذْ قَالَتِ امْرَأَتِي لَوْ صَنَعْتَ كَذَا وَكَذَا - قَالَ - فَقُلْتُ لَهَا مَالَكِ وَلِمَا هَا هُنَا فِي تَكَلُّفُكِ فِي أَمْرٍ أُرِيدُهُ. فَقَالَتْ لِي عَجَبًا لَكَ يَا ابْنَ الْخَطَّابِ مَا تُرِيدُ أَنْ تُرَاجَعَ أَنْتَ، وَإِنَّ ابْنَتَكَ لَتُرَاجِعُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حَتَّى يَظَلَّ يَوْمَهُ غَضْبَانَ. فَقَامَ عُمَرُ فَأَخَذَ رِدَاءَهُ مَكَانَهُ حَتَّى دَخَلَ عَلَى حَفْصَةَ فَقَالَ لَهَا يَا بُنَيَّةُ إِنَّكِ لَتُرَاجِعِينَ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حَتَّى يَظَلَّ يَوْمَهُ غَضْبَانَ. فَقَالَتْ حَفْصَةُ وَاللَّهِ إِنَّا لَنُرَاجِعُهُ. فَقُلْتُ. تَعْلَمِينَ أَنِّي أُحَذِّرُكِ عُقُوبَةَ اللَّهِ وَغَضَبَ رَسُولِهِ (صلى الله عليه وسلم) يَا بُنَيَّةُ لاَ يَغُرَّنَّكِ هَذِهِ الَّتِي أَعْجَبَهَا حُسْنُهَا وَحُبُّ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) إِيَّاهَا - يُرِيدُ عَائِشَةَ - قَالَ ثُمَّ خَرَجْتُ حَتَّى دَخَلْتُ عَلَى أُمِّ سَلَمَةَ لِقَرَابَتِي مِنْهَا فَكَلَّمْتُهَا. فَقَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ عَجَبًا لَكَ يَا ابْنَ الْخَطَّابِ دَخَلْتَ فِي كُلِّ شَيْءٍ، حَتَّى تَبْتَغِي أَنْ تَدْخُلَ بَيْنَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَأَزْوَاجِهِ. فَأَخَذَتْنِي وَاللَّهِ أَخْذًا كَسَرَتْنِي عَنْ بَعْضِ مَا كُنْتُ أَجِدُ، فَخَرَجْتُ مِنْ عِنْدِهَا، وَكَانَ لِي صَاحِبٌ مِنَ الأَنْصَارِ إِذَا غِبْتُ أَتَانِي بِالْخَبَرِ، وَإِذَا غَابَ كُنْتُ أَنَا آتِيهِ بِالْخَبَرِ، وَنَحْنُ نَتَخَوَّفُ مَلِكًا مِنْ مُلُوكِ غَسَّانَ، ذُكِرَ لَنَا أَنَّهُ يُرِيدُ أَنْ يَسِيرَ إِلَيْنَا، فَقَدِ امْتَلأَتْ صُدُورُنَا مِنْهُ، فَإِذَا صَاحِبِي الأَنْصَارِيُّ يَدُقُّ الْبَابَ فَقَالَ افْتَحِ افْتَحْ. فَقُلْتُ جَاءَ الْغَسَّانِيُّ فَقَالَ بَلْ أَشَدُّ مِنْ ذَلِكَ. اعْتَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَزْوَاجَهُ. فَقُلْتُ رَغَمَ أَنْفُ حَفْصَةَ وَعَائِشَةَ. فَأَخَذْتُ ثَوْبِيَ فَأَخْرُجُ حَتَّى جِئْتُ فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِي مَشْرُبَةٍ لَهُ يَرْقَى عَلَيْهَا بِعَجَلَةٍ، وَغُلاَمٌ لِرَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَسْوَدُ عَلَى رَأْسِ الدَّرَجَةِ فَقُلْتُ لَهُ قُلْ هَذَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ. فَأَذِنَ لِي - قَالَ عُمَرُ - فَقَصَصْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) هَذَا الْحَدِيثَ، فَلَمَّا بَلَغْتُ حَدِيثَ أُمِّ سَلَمَةَ تَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَإِنَّهُ لَعَلَى حَصِيرٍ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ شَيْءٌ، وَتَحْتَ رَأْسِهِ وِسَادَةٌ مِنْ أَدَمٍ حَشْوُهَا لِيفٌ، وَإِنَّ عِنْدَ رِجْلَيْهِ قَرَظًا مَصْبُوبًا، وَعِنْدَ رَأْسِهِ أَهَبٌ مُعَلَّقَةٌ فَرَأَيْتُ أَثَرَ الْحَصِيرِ فِي جَنْبِهِ فَبَكَيْتُ فَقَالَ «مَا

يُبْكِيكَ». فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ كِسْرَى وَقَيْصَرَ فِيمَا هُمَا فِيهِ وَأَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ. فَقَالَ «أَمَا تَرْضَى أَنْ تَكُونَ لَهُمُ الدُّنْيَا وَلَنَا الآخِرَةُ». رواه الشيخان والترمذي[٢].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) دەگێڕیتەوە دەفەرموێ: ماوەی ساڵێ چاوەڕێی هەل بووم، بۆ ئەوە پرسیار لە عومەری کوڕی خەتتاب بکەم لە مەعنای ئایەتێ بەڵام بۆم نەکراو لێم نەپرسی، چونکە ئەوەندە سامی هەبوو لەدڵما. هەتا چوو بۆ سەفەری حەج و منیش لەگەڵیا چووم بۆ حەج کاتێ گەڕاینەوە لەڕێگە لای دارسیواکێکدا لای دا، بۆ سەراو، منیش لەسەری وەستام هەتا لێ بۆوە، جا لەگەڵیا ڕۆیشتم و گوتم: ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان! ئەو دوو ژنە کێ بوون کەلەناو ژنەکانی پێغەمبەردا گەلەکۆمە (تەظاهور)یان لە پێغەمبەر کردبوو (وەك خودا باسی ئەم باسە دەکا لە سەرەتای سوورەتی تەحریمەوە)؟ ئەویش فەرمووی: ئەوە حەفصەی کچی من و عائیشەی کچی ئەبوبەکر بوون. منیش گوتم: بەخودا ساڵێکی ڕەبەقە دەمەوێ بۆئەمە پرسیارت لی بکەم، بەڵام لە بەر سامی تۆ پرکێشیم نەدەکرد. فەرمووی: شتی وامەکە، ئەگە بەزەینی خۆت وات دەزانی کەشتێ هەیە من دەیزانم و لەلای من هەیە پرسیارم لێ بکە شەرم مەکە، ئەگەر بیزانم پێتی دەڵێم لەپاشدا عومەر (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: بەخودا ئێمە لەسەردەمی نەزانی پێش هاتنی ئیسلامدا ئافرەتمان بەهیچ دانەدەنا و هیچ حەق و حیسابێکمان بۆ ژن نەدەکرد، هەتا خودا ئایەتی قورئانی لەبارەی ژنانەوە ناردە خوارەوەو بەش و بارەو مافی بۆدیاری کردن. عومەر فەرمووی: ئەوا جارێکیان خەریکی کارێکی خۆمم و بیری لێ دەکەمەوە، لەوکاتەدا ژنەکەم پێی گوتم: بۆ ئاوا نایکەی! پێیم گوت: تۆ حەقت چییە؟ تۆ بۆ خۆت لەکاری من هەڵدەقورتێنی؟ ئەویش گوتی پێم: ئەی عومەر! تۆ چەندە سەیریت! تۆ ناتەوێ کەکەس قسە لەقسەتا بکا کەچی کچەکەت ڕۆژ تا ئێوارێ دەمەدەمێ لەگەڵ پێغەمبەری خودادا دەکاو دەچێتەوە بەگژدەمیا، ڕۆژی واهەیە بەم

---

[٢] بخاري. تفسير: ٤٩١٣، ٤٩١٤، ٤٩١٥، ٥٢١٨،٥٨٤٣، ٧٢٥٦،٧٢٦٣. مسلم: طلاق: ٣٦٧٦ - ٣٦٧٩. ترمذي صفة القيامة: ٢٤٦١.

بۆنەیەوە تا ئێوارە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) بەزویری و قارەوە دەمێنێتەوە؟ فەرمووی: جا هەستام و پۆشاکەکەی سەرشانم هەڵگرت و چووم بۆلای حەفصەو پێیم گوت: کچم! راستە کە تۆ دەچیتەوە بەگژدەمی پێغەمبەرداو چەندو چوونی لەگەڵدا دەکەیت و رۆژی واهەیە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) تائێواریێ بەزیزی و زویری دەمێنێتەوە؟ گوتی: ئەرێ بەخودا راست وایە ویرەویری لەگەڵ دەکەین! منیش پێیم گوت: تۆ دەزانی کەمن تۆ دەترسێنم لەسزای خودا لەسەر زیز کردنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کچم! تۆ بەهۆی ئەو ژنەوە (واتە بەهۆی عائیشەوە) لەخۆت بایی مەبە، ئەو بەجوانیی خۆی دەنازێ و پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) خۆشی دەوێ، تۆ خۆت مەبەستە بەوە وە. لەپاشدا رۆیشتم، ئوممو سەلەمەیش خزمم بوو،چووم بۆ ماڵی ئەویش و لەگەڵ ئەویشدا قسەم کرد، فەرمووی: ئەی کوڕی خەتتاب! سەیرم لەتۆ دێ، لەهەموو شتێکدا هەڵ دەدەیتێ! تەنانەت دەتەوێ لەنێوانی پێغەمبەرو ژنەکانیشیا خۆت تێ هەڵبقورتێنی!

بەخودا بەڕاستی قسەکانی ئوممو سەلەمە واکاریان تێ کردم تۆزێ خاویان کردمەوە! ئینجا رۆیشتم هاوڕێیەکی ئەنصاریم هەبوو، من و ئەو بەسەرە دەچووین بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بۆ هەواڵزانین و دەنگوباسی سرووش و شتی وا، ئەگەر من نەچوومایە ئەو هەواڵ و باس و خواسی بۆم دەهێنا ئەگەر ئەویش نەچوایە من دەنگوباسم بۆ دەبرد، وە لەوسەردەمەدا مەترسیمان لەپاشایێ لەپاشاکانی غەسسان هەبوو، وامان بیستبوو کەدەیەوێ بەسوپاوە بێتە سەرمان، زۆر لێی دەترساین، لەناکاو تەماشام کرد ئەو هاوڕێ ئەنصارییەم دای لە دەگاو گوتی: بیکەرەوە بیکەرەوە! گوتم: دیارە کابرای غەسسانی هاتۆتە سەرمان! گوتی! بەڵکوو لەوە خراپتریش رووی داوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کەناری لەخێزانەکانی گرتووە!

منیش گوتم: هەی لووتی حەفصەو عائیشە بتەوسێتەوە! جا جلەکانم هەڵگرت و دەرچووم و چووم بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) تەماشام کرد حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) والە باڵەخانەیەکا بەپەیژە بۆی سەردەکەوێ،

خولامێکی ڕەشی پێغەمبەر هەبوو، ناوی ڕەباح بوو، لەسەر تەوقە سەری پەیژەکە بوو پێم گوت: عەرزی حەزرەت بکە کە عومەری کوڕی خەتتاب دەیەوێ بێ بۆ خزمەتت، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ڕێگەی دام، گوتی: کە چوومە خزمەتی، باسەکەم بۆ حەزرەت گێڕایەوە، تا گەیشتمە سەر قسەکەی ئوممو سەلەمە زەردە خەنەیەکی کرد. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەوکاتەدا لەسەر حەسیرێکی ڕووت بوو، حەسیرەکە هیچی تری بە سەرەوە نەبوو، سەرینێکی چەرمی لەژێر سەردابوو، ناواخنەکەی ڕیشاڵ (لیف)ی خورما بوو، لەپایینیەوە هەندێ بەرەدارشیلان کە کەوڵی پێ خۆشە دەکرێ هەڵڕژابوو، لەژوور سەریشیەوە چەن کەوڵێ هەڵواسرابوو، تەماشایم کرد گرێی حەسیرەکە لاقە برغەی حەزرەتی دابڕیبوو، منیش دەستم کرد بەگریان. فەرمووی: بۆچی دەگریت؟ گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! کیسراو قەیسەر وان لەو هەموو نازو خۆشییەدا کە تیایدان و خۆمان دەزانین، کەچی تۆیش پێغەبمەری خودای و ئەمە حاڵتە کە دەیبینین. فەرمووی: ئەدی تۆ بەوە ڕازی نابی کەدونیا بۆ ئەوان بێ و پاشەڕۆژیش بۆ خۆمان بێ (ش/ت).

٤١٨٠- لەباسی (ما ورد في سورة البقرة)دا ڕابورد، فەرموودەی یازدەهەم[٣].

## ٥٠- سوورەتی تەبارەك

(مەککەییە، ٣٠ ئایەتە)

## سورة تبارك (مكية، وهي ثلاثون آية)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤١٨١- تەماشای (فضل سورة الملك) بکە: (ف/١ + ف/٣) [١].

---

[٣] تقدم في امجلد اسادس. تسلسل/٣ رقم: ١١/٣٧٠٠ = مجلد أول. تسلسل: ٥٣ رقم: ٣٩٠/٥.

[١] راجع المجلد الخامس. تسلسل/٨٨.

## ٥١ سوورەتی نوون
(مەککەییە، ٥٢ ئایەتە)
## سورة ن (مكية، وهي إثنان وَخمسون آية)
بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤١٨٢- عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ (رضي الله عنه) عَنْ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: «إِنَّ أَوَّلَ مَا خَلَقَ اللّٰهُ الْقَلَمَ فَقَالَ لَهُ اكْتُبْ فَجَرَى بِمَا هُوَ كَائِنٌ إِلَى الأَبَدِ». رواه الترمذي[1].

**عوبادەی کوڕی صامیت** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: یەکەم شت کەخودا دروستی کرد (لەوحول مەحفووظ)بوو، لەپاش ئەو یەکەم شت کە خودا دروستی کرد قەڵەم بوو، جا پێی فەرموو: ئەی قەڵەم!! بنووسە، ئیتر قەڵەم هەرچی دەبێو ڕوو دەدات هەتا هەتایە گشتی تۆمار کرد! (ت-س/ح).**

٤١٨٣- عَنْ حَارِثَةَ بْنَ وَهْبٍ عَنْ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: «أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِأَهْلِ الْجَنَّةِ كُلُّ ضَعِيفٍ مُتَضَعِّفٍ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللّٰهِ لأَبَرَّهُ، أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِأَهْلِ النَّارِ كُلُّ عُتُلٍّ جَوَّاظٍ مُسْتَكْبِرٍ»[2].

**حاریثەی کوڕی وەهب** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: ئەدی با هەواڵتان بدەمێو نیشانەی پیاوی خودا پێداوی بەهەشتیتان نیشان بدەم: هەموو موسوڵمانێکی لازەبوونی بێ نموودی بێ فیزی خۆ بەکەم زانی بێ ناز بەهەشتییە، ئەو جۆرە کەسانە هەرچەند خەڵك بەبێ نموود سەیریان دەکەن بەڵام لەلای خودا ئەوەندە بەقەدرو بە ڕێزن هەموو دووعاو نزایەکیان گیرایە، ئەگەر یەکێ لەوانە سوێند بخوات لەسەر شتێ بە پشتی کەرەمی خودا، خودا دڵی ناشکێنێو سوێندەکەی بۆ دەباتە سەر. ئەدی با پێشتان بڵێم کە کێ دۆزەخییەو نیشانەی خەڵکی دۆزەخ**

---

[1] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[2] بخاري. تفسير: ٤٩١٨، ٦٠٧١، ٦٦٥٧، تجريد/٤ ل/٥٠٩ رقم: ١٧١٠. مسلم: صفة الجنة: ٧١١٦.

چییەو چۆنە: هەموو ئادەمیزادێکی چارە قوورسی مرقنی گۆشتنی فیزنی بەدەعیەو دەماری زۆر خۆر دۆزەخییە (ش/ت).

٤١٨٤- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رضي الله عنه) قالَ عَنْ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: «يَكْشِفُ رَبُّنَا عَنْ سَاقِهِ فَيَسْجُدُ لَهُ كُلُّ مُؤْمِنٍ وَمُؤْمِنَةٍ، وَيَبْقَى مَنْ كَانَ يَسْجُدُ فِي الدُّنْيَا رِئَاءً وَسُمْعَةً، فَيَذْهَبُ لِيَسْجُدَ فَيَعُودُ ظَهْرُهُ طَبَقًا وَاحِدًا». رواهما البخاري. نسأل الله حسن الرواية آمين[٣].

ئەبو سەعید (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لە ڕۆژی قیامەت دا خودای پەروەردگارمان لاقی خۆی هەڵ دەماڵێ، ئیتر هەموو موسوڵمانو بڕواداریٚ (چ پیاو چ ژن) کوڕنووشو سەجدەی بۆدەبەن، ئەوانەیش کەلەجیهاندا بۆ چاوەو رووپامایی و ناوبانگ کوڕنووشیان بردووە دەمێننەوەو لەپاش ئەوان دەچن کە کوڕنووش ببەن بۆ خودا، بەڵام لەخوداوە پشتیان ڕەق دەبێو دەبێ بە یەك پارچە تەختەو هەرچی هەوڵ دەدەن ناتوانن سەجدە ببەن، ئاوا لەبەرچاوی ئەوعەشاماتە تەریق و چاو شۆڕو ڕیسوا دەبن (بوخاری – پڕگۆڕەکەی لەنوور بێ).

تەڵاق و تەحریم، موڵك و سوورەی نوون

چوار سوورەن لەناو قورئانی خوا ڕوون!

## ٥٢- سوورەتی الحاقە

(مەککەییە، ٥٢ ئایەتە)

## سورة الحاقة (مكية، وهي ثنتان وخمسون آية)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

قال اللَّهُ تَعَالَى: {وَالْمَلَكُ عَلَى أَرْجَائِهَا وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَانِيَةٌ } (١٧/٦٩).

---

[٣] بخاري. تفسير: ٤٩١٩ = تجريد /٤ ل/٥١٠ رقم: ١٧١١ = ٢١ تجريد = ٢٢، ٤٥٨١، ٤٩١٩، ٦٥٦، ٦٥٧٤، ٧٤٣٨، ٣٤٣٩. فتح.

واتـە: کاتـێ قیامـەت ڕووی دا، شیرازەی بوونـەوەر بەتـەواوی دەپـچڕێ، زەوی دەڕوخێ بەسەر یەکا، ئاسمانەکان دەتەپێنو پارچە پارچە دەبنو وەك کـەلاوە کۆنیـان لـێ دێو وەك ئاشـی ئاوکـەوتوو لەگـەڕ دەکـەونو ئـەو فریـشتانەی کـەوان لـەناویانا بـە پەلـە پـڕووزە خۆیـان دەگەیەننـە کـەنارو قـەراخییان، وەهـەموو کۆمـەڵ کۆمـەڵ لـەم لاو لـەو لاوە دەوێـستن تـابزانن بوونـەوەر چـی بەسـەردێ، وەلـەو ڕۆژەدا هەشـت فریـشتە عـەرشو تـەختی پەروەردگاری تۆ هەڵ دەگرێ، لەژوور هەموو فریشتەکانی ترەوە.

٤١٨٥- قَالَ الْعَبَّاسِ (رضي الله عنه) كُنْتُجَالِسًا فِي الْبَطْحَاءِ فِي عِصَابَةٍ وَرَسُولُ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم) جَالِسٌ فِيهِمْ إِذْ مَرَّتْ عَلَيْهِمْ سَحَابَةٌ فَنَظَرُوا إِلَيْهَا فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم) «هَلْ تَدْرُونَ مَا اسْمُ هَذِهِ؟». قَالُوا: نَعَمْ هَذَا السَّحَابُ. فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم) «وَالْمُزْنُ». قَالُوا وَالْمُزْنُ. قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم) «وَالْعَنَانُ». قَالُوا: وَالْعَنَانُ. ثُمَّ قَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم) «هَلْ تَدْرُونَ كَمْ بُعْدُ مَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ؟». فَقَالُوا: لاَ وَاللّٰهِ مَا نَدْرِى. قَالَ: «فَإِنَّ بُعْدَ مَا بَيْنَهُمَا إِمَّا وَاحِدَةٌ وَإِمَّا اثْنَتَانِ أَوْ ثَلاَثٌ وَسَبْعُونَ سَنَةً وَالسَّمَاءُ الَّتِى فَوْقَهَا كَذَلِكَ». حَتَّى عَدَّدَهُنَّ سَبْعَ سَمَوَاتٍ كَذَلِكَ ثُمَّ قَالَ «فَوْقَ السَّمَاءِ السَّابِعَةِ بَحْرٌ بَيْنَ أَعْلاَهُ وَأَسْفَلِهِ كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ إِلَى السَّمَاءِ وَفَوْقَ ذَلِكَ ثَمَانِيَةُ أَوْعَالٍ بَيْنَ أَظْلاَفِهِنَّ وَرُكَبِهِنَّ مَا بَيْنَ سَمَاءٍ إِلَى سَمَاءٍ ثُمَّ فَوْقَ ظُهُورِهِنَّ الْعَرْشُ بَيْنَ أَسْفَلِهِ وَأَعْلاَهُ مَا بَيْنَ سَمَاءٍ إِلَى سَمَاءٍ وَاللّٰهُ فَوْقَ ذَلِكَ». رواه الترمذي وأبو داود (رضوان الله تعالى عليهما)[1].

عەبباس (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: لەو دەشتە لەگەڵ دەستەیێ لە یاراندا لەخزمـەتی حەزرەتـدا دانیـشتبووین، لەوکاتـەدا پەڵـەیێ هـەور لەسـەر سەریانەوە ڕابورد، تەماشایان کرد پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فـەرمووی: ئایا دەزانن ئەمە ناوی چییە؟ گوتیان: بەڵێ ئەمە هەورە، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: گەواڵەیشی پێ دەڵێن گوتیان بەڵێ گەواڵەیشی پـێ دەڵێن.

[1] رواه أبو داوود في السنة والترمذي هنا بسند حسن (شرحه).

فەرمووی: پەڵەهەوریشی پێ دەڵێن گوتیان: بەڵێ ئەویشی پێ دەڵێن. لەپاشا فەرمووی:: ئایا دەزانن کە ئاسمان و زەوی چەند لەیەکەوە بلاون؟ گوتیان: نەبەخوا نازانین، فەرمووی: ئاسمان و زەوی حەفتاو یەك یا فەرمووی: حەفتاو دوو یافەرمووی: حەفتاو سێ ساڵ لە یەکەوە دوورن! وە فەرمووی: دووری ئاسمانی دووەمیش لە ئاسمانی یەکەمەوە وەك دووری ئاسمانی یەکەم و زەوی وایە. جا حەوت ئاسمانی لەسەر ئەم شێوەیە ژمارد، ئینجا فەرمووی: لە ژوور ئاسمانی حەوتەمەوە دەریایەکە سەروبنی بەقەد ئەم ئاسمان تا ئەو ئاسمان لەیەکەوە دوورە واتە: ئەو دەریایە بەقەد بەینی عەرزو ئاسمان قووڵە لەژوور ئەویشەوە حەوت فریشتە هەیە لەسەر شێوەی سابرێنە کێوین، بەینی سمیان هەتا ئەژنویان بەقەد بەینی ئەم ئاسمان تا ئەو ئاسمان دەبێ، تەخت و بارەگای خودا لەسەر پشتی ئەم فریشتانەیە، بەینی لای سەرووی تەخت و بارەگا هەتا لای خوارووی بەقەد نێوانی دوو ئاسمان لەیەك دوورن، خودا خۆشی لەسەروو ئەوەوەیە!

(ت-س/ح-د) تەماشای فەرموودەکەی سوورەتی حەدیدیش بکە، دەبینی بەدیمەن کەمێ جیاوازی لەنێوانی ئەم دوو فەرموودەدا هەیە، وەك ژمارەی ساڵەکان لەوێ پێنج سەد ساڵە، لێرە حەفتا ساڵە. لەڕاستی دا ئەم جۆرە شوێنە، وەك چەند جارێ لەمەوبەر پەنجەمان بۆ درێژ کرد، دەریایەکی بێ پەیەو گەردوونێکی گەورەو ووڕاقە، بە زەڕنەقووتەیەکی بێ‌پەڕو باڵی وەك من لەناو ئەم لانەی لەشە رووخاوەدا نەپەی دەکرێ‌و نەپەیی پێ دەبرێ! تەنیا من ئەوەندەم لەسەرە کە تەرجەمەیەکی پاك‌و پوختی فەرموودەکە بکەم‌و وەری بگێڕمە سەر زمانی شیرینی کوردی، وەلێ راڤەو شەرح‌و تەئویل‌و رەخنەو وەڵامی رەخنەو شیکردنەوەی هەندێ شوێن‌و تەوفیق لە بەینی حەدیسەکانداو پێکەوە سازاندنی فەرموودەکان لەناو خۆیاندا، بابەتێکی ترەو کات‌و کۆشش‌و مەودایەکی تری گەرەکە، کە ئێستا من لەترسی بارگران کردنی ئەم کتێبە وازم لەو لایەنە هێناوە. مەگەر ناو بەناو وەك چراوگێ قسەیێ لەم بابەتە بدەم بەگوێی خوێنەری ئازیزدا، کە زۆر بە

قـووڵی پـی دانـەگریٚ لەوشـویٚنانەدا کەهەسـت بـەزەقی و ڕەق و تـەقی و گـیرو گرفت دەکا، جا بۆ ئەوەی خویٚنەری ئازیز دڵنیا بیٚ کە زانا گەورەکان لەکۆن و نۆدا ئـەم جـۆرە شـویٚنانەیان بـەجوانی ڕوون کردۆتـەوە، چەند نموونەیـەکتان لەفەرمایشتی ئەو زاتانە بۆ دەهیٚنمەوە:

١- مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی بیارە (خودا پایە بەرزتری بفەرمویٚ) لەویٚنەی ئەم شویٚنەدا دەفەرمویٚ:

لـەبۆ تـەعینی جیٚـی جەننـەت و نـار

نەصیٚکی صەریح هیچ نیـە دیـار!

چـاکوایە دەسـتی هـیچ لـیٚنەدریٚ

تەفویض بە عیلمی زاتـی حـەق کـریٚ

٢- دانـەری تـاج (ڕەزای خـودای لەسـەر بـیٚ) دەفـەرمویٚ: مەبەسـت ڕوون کردنـەوەی دووریـی نیٚوانـە، نـەك پیٚوانـەی نیٚـوان بەسـاڵ، کەواتـە جیـاوازی دژایەتی نییە لەبەینی ئەم فەرموودەیەو فەرموودەکەی سوورەتی حەدید دا.

٣- مەولەوی (خودای لیٚ ڕازی بیٚ) لەلایەنی جیٚگەو ڕیٚگەو کاتی بوونی خوداوە دەفەرمویٚ:

متـى متـى؟ حتـى أتـى عليـه مـن أيـن أيـن؟ ينتمـي اليـه

بەکوردییەکەی خۆمان لەهەمان بەحر (کەبەحری ڕەجەزە) واتە:

کـەی کـەی هـەبوو؟ هـەتا خـودا لـەویٚ بـیٚ

لەکویٚ لە کویٚ بوو؟ تـا خـودا لـەو جیٚ بـیٚ!

٤- شیٚخی بەیزاوی لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا ئاماژە بۆ جـۆرە تـەئویلیٚکی دوور دەکا، کە دەفەرموێ: هـەڵیش دەگریٚ کـە مەبەسـت لـەم ئایەتـە مەبەستە ڕواڵەتییەکەی نەبیٚ، بـەڵکوو تەمسیل و نمایـشتی حـاڵی گـەورەیی خـودا بـیٚ، بەهۆی حاڵی لەبەر چاوی پادشایانەوە گەورەیی خودا دەربکەوی.

٥- مامۆستا شێخ موحەممەدی خاڵ (ڕەزای خودای لەسەر بێ) لەڕاڤەی ئەم ئایەتەدا دەفەرموێ: مەبەست لە (عرش) گەورەیی و دەسەڵات و دەست ڕۆینە، وە ئەم ئایەتە نموونە هێنان (تمثیل)ە بۆ باسی گەورەیی و دەسەڵاتی خوا لەڕۆژی دوایی دا تا ئەوێ کە دەفەرموێ: ئەگەر ڕاستت ئەوێ ئەم ووتەو ووتارانە کە بەکوردیی، یا عەرەبی، یا بەهەر زمانێکی تر دانراون بۆ تەعبیر دانەوەیە لەمەبەسان (معاني) جیهانی، مەبەسانی ڕۆژی دوایی لەجیهانا ووتەیان بۆ دانەنراوە، کەوابوو تەعبیر دانەوە لەمەبەسانی ڕۆژی دوایی بەووتەی جیهانی، وەك باسی فەلسەفەو نهێنی سروشت (طبیعت)وایە، کە بەئامارژەی دەست و چاوو سەر بیکەیت... تاد.

وادەزانم مەبەستی مامۆستا مەلا عەبدولکەریم ئەم ڕەوشەیە بەگشتی: کەپیاو بەبەهانەی لاواز لەنەصصی صەریحی ئایەتی قورئان و حەدیثی صەحیح لانەدا، مەبەسانی جیهانی و مەبەسانی ڕۆژی دوایی بە پێی فام و تێگەیشتنی زانایان و عورف و عادەتی لوغەت و زمان و بەشەر لەسەر ظاهیری خۆیان بمێننەوە، بەڵام ئەگەر مەعنای ظاهیری پێویستی بە تەئویل بوو ئەوە دەبێ تەئویل بکرێ، پاڵفتەی شیعرەکەی مامۆستا ئەمەیە:

برا! بابەتی ئایین کە غەیب بێ

قسەیێ بکە تەواو بێ عەیب بێ

کۆڵینەوەی دین بە خەیاڵی ڕووت

گێرەی گوڵشەنە بەسمی گاجووت!

من بەش بەحاڵی خۆم لەسەر ئەم ڕایەی مامۆستا مەلا کەریمم، بەڵێ ڕاستە کە:

کات و جێگەو هەند، تەن و دەنگ و ڕەنگ

بۆ بەندە بەهرەن، لە بۆ خودا نەنگ

بەڵام گەلێ ووشەو زاراوەیش مەبەستی ئایینی تایبەتی خۆی هەیە، لەکاتی گوتنی ئەو ووشەیەدا پێشینان و پاشینان هەست بە مەبەستی تایبەتی خۆی دەکەن، بۆ نموونە کە گوتت: عەرش، واتە: تەخت و بارەگای حوکمڕانی خودا، کە گوتت: پردی صیراط، واتە: ئەو پردەی کەوا لەسەر پشتی دۆزەخ و ڕۆژی قیامەت خاس و خراپ بەسەریدا دەڕۆن، کە گوتت: خودا، واتە ئەوکەسەی کەئەم بوونەوەرەی لە نەبوون دروست کردووەو حاڵ و نیشانەو صیفەتی ئەمەو ئەوەیە کە لەقورئان و فەرموودەکانی حەزرەت دا بەیان کراون، بە کوردی و کورتی: زاراوەو ناوو وشەی ئایینی (وەك: خودا، پێغەمبەر، فریشتە، قیامەت، عەرش، کورسی قەلەم، حەشر، میزان، کێشانی‌کردار، حەج، نوێژ، زەکات و ڕۆژوو، ژنهێنان، ئاسمان، زەوی، خۆر، مانگ، ساڵ و ڕۆژ، دایك، باوك، برا، خوشك، ژن، وەك ئەم ووشانەو وێنەی ئەم ووشانە کەلەناو قورئان و حەدیسدا وارید بوون ئەمانە) هەموو مەبەستی دیاری ئاشکرای زانراوی خۆیان هەیە، هەندێکیان کەوان لەبەرچاومان ئەوە زۆر بەباشی لە حەقیقەت و کونهەکەی دەگەین، هەموو کەس وەك یەك دەزانێ خۆر کامەیە، زەوی کامەیە، ژن چییە، براو دایك و خوشك لەشەرعا مەعنای چییە، نوێژو ڕۆژوو زەکات و حەج ئەوەیە کە مامۆستاکان شەرحیان دەکەن بۆمان، بەڵام کونهو حەقیقەتی خودا کەس نازانێ چییە، وە کۆڵینەوەی شتی وا کارێکی ناشایستەیە، هەروا حەقیقەتی عەرش و فریشتەو تەرازوو کورسی و قەڵەم و ئەوشتانەی کەلەم بابەتانەن ئەوەی کەلە سەر ئێمەیە بڕوامان بە بوونی ئەم شت گەلە ببێ لەسەر ئەو شێوەیەی کەلەشەریعەتدا ڕوون کراونەتەوە، وە نەصصی صریحی ئایەت و حەدیث بە خۆڕایی و بە تەئویلی ضەعیف لەمەعنای ظاهیری موتەعارەفیان لانەدەین، دەنا ئەگەر وانەبێ و هەرکەسێ هەڵسێ و بڵێ ئەمە وانییەوئاوایە چونکە میستەر مشکە وادەڵێ، ئەوە سەردەکێشێ بۆ پاشاگەردانی و هیچ شتێکی نهێنی و غەیبی ئیسپات نابێ و بەپێی ڕۆژ وەك نرخی گەنم و جۆ، مەعناکەی دەگۆڕێ.

**ڕاستە خودا دەفەرموێ: {وَأُتُواْ بِهِ مُتَشَابِهاً} وە ئیبنو عەبباس** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: (ليس في الجنة من أطعمة الدنيا الا الأسماء: خواردەمەنیو خواردنەوەی بەهەشتو جیهان بەس ناویان یەکە، دەنا تامو چێژو خۆشیو شتی تریان هەموو جیایە!) وەلێ ئەمە مەعنای وانییە کەئێمە بەبێ بەڵگەو نیشانەی ڕۆشن قیاسی هەموو شتێکی تری ڕۆژی دوایی لەخۆراك بکەین.**

## ٥٣- سوورەتی مەعاریج

**(مەککەییە، ٤٤ ئایەتە)**

**سورة المعارج** (مكية، وهي أربع وأربعون آية)

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

**٤١٨٦- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ** (رضي الله عنه) **عَنِ النَّبِيِّ** (صلى الله عليه وسلم) **فِي قَوْلِهِ (كَالْمُهْلِ) قَالَ «كَعَكَرِ الزَّيْتِ فَإِذَا قَرَّبَهُ إِلَى وَجْهِهِ سَقَطَتْ فَرْوَةُ وَجْهِهِ فِيهِ». رواه الترمذي[1].**

**ئەبو سەعید** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **لەبارەی ووشەی (کالمهل)یەوە کەلەئایەتی: {يُغَاثُوا بِمَاء كَالْمُهْلِ يَشْوِي الْوُجُوهَ}یو ئایەتی: {يَوْمَ تَكُونُ السَّمَاء كَالْمُهْلِ} دایە فەرمووی: واتە: وەکوو خڵتەی زەیتو دۆووکی ڕۆنی داخ، کاتێ دۆزەخییەکان لەتوونیانا هاوار دەکەن بۆ ئاو، ئاوێکی وایان دەدەنێ، وەکوو خڵتەی زەیتو دۆووکی ڕۆنی داخکراو وایە، کاتێ نزیکی دەموچاویان دەکرێتەوە، هەر هاڵاوی تینەکەی دەموچاویان دادەپڵۆخێنێو چەرمی دەمو چاویان دادەماڵێتە ناوی! خودا پەنامان بدا (ت-س/غ).**

**قال الله تعال: {إِنَّ الْإِنسَانَ خُلِقَ هَلُوعًا، إِذَا مَسَّهُ الشَّرُّ جَزُوعًا، {وَإِذَا مَسَّهُ الْخَيْرُ مَنُوعًا} (٧٠/١٩-٢١)**

---

[1] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

واتـه: ئـای لـه ئـادەمیزاد کـه بـێ ئـۆقرەو بـێ هـورەو دەم بەهاوارە: نـه لـه شادی دا خۆی دەگریو نەلەشیندا، کاتـێ خـودا مـاڵو خێـرو دارایـی دەداتـێ دەسـت قووچـاوو خێرنەکـەرە، کاتـێ تووشـی زەرەرو زیـانو ناخۆشـی دەبـێ، دەم بە هاوراو بۆڵە بۆڵکەرەو بەهاتوو هاوار ئاسایش لەخۆی هەڵ دەگری.

٤١٨٧- أتي النَّبِيٌّ (صلی الله علیه وسلم) مالاً فأَعْطَى قَوْمًا وَمَنَعَ آخَرِينَ،فَبَلَغَهُ أَنَّهُمْ عَتَبُوا عَلَيْهِ فَقَالَ: «إِنِّي أُعْطِي الرَّجُلَ وَأَدَعُ الرجُلَ، والذي أَدَعُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنَ الذي أُعْطِي، أُعْطِي أَقْوَاماً لِمَا فِي قلوبهم مِنَ الجَزَعِ والهَلَعِ وَأَكِلُ أقواماً إِلى مَا جَعَلَ اللّهُ فِي قُلُوبِهِمْ مِنَ الْخَيْرِ وَالْغِنَى، مِنْهُمْ عَمْرُو بْنُ تَغْلِبَ». فَقَالَ عَمْرُو بْنُ تَغْلِبَ مَا أُحِبُّ أَنَّ لِي بِكَلِمَةِ رَسُولِ اللّهِ (صلی الله علیه وسلم) حُمْرَ النَّعَمِ. رواه البخاري في التوحيد. نسأل الله خالص التوحيد، آمين[٢].

دەگێڕنەوە: کە هەندێ ماڵ دێنن بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئەویش بەشـی بـازێکی لـێ دەداتو بەشـی بـازێکی تـری لـێ نـادات دوایـی خەبـەر دەگاتـەوە بەپێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەربێ) کەئەوانـەی بەشـی نـەداوون گلـەیی دەکەن. ئەویش بەم بۆنەیەوە دەفەرموێ: گەلـێ جار وادەبـێ مـن بـەش دەدەم بـە پیـاوێو بـەش نـادەم بـەپیاوێکی تـر، بـەلام لـە دڵیـشەوە ئـەو پیاوەیـانم خۆشتر دەوێ کەبەشیم نەداوە، دەی دەزانن ئەوە بۆ وادەکەم چونکە هەندێ کەس دەیانبینم هەڵپە دەکەنو چاوبرسینو چاو چنۆکن، بۆیە منیش بەشیان دەدەم، هەتا دڵیان ڕابگرمو بیانکەم بە دۆستی ئیسلام، وەلـێ بەشـی هەنـدێ کەسـی تـر نـادەم چـونکە پـشتە ئەسـتوورم لـەوەی کەئەوانـە بەرچـاوتێرنو خێرخـوان، ئیتر دەیـان سپێرم بـەو خودایـەی کـەئاوا بەرچـاوتێرو دڵ پـڕ لـە خێـری دروسـت کـردوون. یـەکێك لـەم خـودا پێداوانـەی کـەمن دڵنیـام لـە دڵفراوانییان عەمری کوڕی تەغلیبە! جا هـەموو جارێ عـەمر دەیفـەرموو: ئـەم ووشـە مەدحـەی پێغەمبـەر، کەلـە بـارەی منـەوە فەرموویـەتی، بەهـەموو ڕانـە

---

[٢] بخاري. توحيد: ٧٥٣٥.

وشــترە ســوورەکانی عــەرەبی نــادەم، کــەڕەنگیان دەڵێــی ڕەنگــی مــەرەزە، وەباشترین‌و نایابترین سامانی عەرەبابن (بوخاری — (ڕەزای خودای لەسەر بێ)).

(ئەلحاقــە) کــەم کــەم دێتــە پێــشەوە

وەک بــە (مــەعاریج)بــێ لەپێــشەوە

تــاوەک تۆفــانی (نــووح) لــەناکاوا

وەکــوو (جــن) لــەپڕ دەکــا بــە نــاوا

(موزەممیــل) کــەوا لــەپێش (مــودەثیر)

لــە (قیامــەت!)دا هەیانــە تــەئــثیر!

بۆ (انسان) دەبـن لـە (دەهـری) دووهـەم

جــارێ بــەنوورو جــارێ بــە مەرهــەم

مەعاریج واتە: نەردەوان‌و پەیژە، ئەلحاقە ناوی قیامەتە. (وەرگێڕ)

## ٥٤- سوورەتی نووح (درووودی خودای لەسەربێ)

(مەککەییە، ٥٩ ئایەتە)

## سورة النوح (عليه السلام) (مكية، وهي تسع وعشرون آية)

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

قال اللّٰهُ تَعَالَى: {وَقَالُوا لَا تَذَرُنَّ آلِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا} (٢٣/٧١).

واتە: وەکافرەکان لەناو خۆیانا گەورەکانیان بە بچووکەکانیان دەگوت: واز لە خوداکانی خۆتان مەهێنن، دەسبەرداری (وودد)و (سواع)و (یغوث)و (یعوق)و (نسر) مەبن، لەڕاستی دا ئەم بتانە ئادەمیزادێکی زۆریان گومڕاکرد.

٤١٨٨- قَالَ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) صَارَتِ الأَوْثَانُ الَّتِي كَانَتْ فِي قَوْمِ نُوحٍ فِي الْعَرَبِ بَعْدُ، أَمَّا وُدٌّ كَانَتْ لِكَلْبٍ بِدَوْمَةِ الْجَنْدَلِ، وَأَمَّا سُوَاعٌ كَانَتْ لِهُذَيْلٍ، وَأَمَّا يَغُوثُ

فَكَانَتْ لِمُرَادٍ ثُمَّ لِبَنِي غُطَيْفٍ بِالْجُرُفِ عِنْدَ سَبَا، وَأَمَّا يَعُوقُ فَكَانَتْ لِهَمْدَانَ، وَأَمَّا نَسْرٌ فَكَانَتْ لِحِمْيَرَ، لآلِ ذِي الْكَلاَعِ. أَسْمَاءُ رِجَالٍ صَالِحِينَ مِنْ قَوْمِ نُوحٍ، فَلَمَّا هَلَكُوا أَوْحَى الشَّيْطَانُ إِلَى قَوْمِهِمْ أَنِ انْصِبُوا إِلَى مَجَالِسِهِمُ الَّتِي كَانُوا يَجْلِسُونَ أَنْصَابًا، وَسَمُّوهَا بِأَسْمَائِهِمْ فَفَعَلُوا فَلَمْ تُعْبَدْ حَتَّى إِذَا هَلَكَ أُولَئِكَ وَتَنَسَّخَ الْعِلْمُ عُبِدَتْ. رواه البخاري. نسأل الله حسن الرواية، آمين[1].

**ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: ئەو بتانەی کەلەناو گەلی نووح دا هەبوون لەپاش ئەو بوو بوون بەهی عەرەبیش، وودديان بوو بوو بەبتی هۆزی کەلب، لەدەومەتولجەندەل بوو، لەوێ دەیانپەرست، سواعیشیان بوو بوو بەهی هۆزی هوزەیل، یەغووثیشیان بوو بوو بەهی موراد، لەپاشدا بوو بوو بەبتی بەنی غوطەیفیش، لەخاکی جەرف لەوڵاتی سەبەء، یەعووقیش بتی هەمدان بوو، نەسریش بتی حیمیەر بوو، کە خانەوادەی ذولکەلاعن وەلێ ئەم ناوانە لەپێش ئەوەدا بێن بەناوی ئەم بتانە ناوی چەن پیاو چاکێکی گەلی نووح بوون، کاتێ دەمردن شەیتان ختەختەی گەلەکەیان دەدا، کەلەجێگەی کۆڕی دانیشتنەکەیاندا کۆتەڵیان بۆ بکەن و وێنەیان بکێشن و ناوی ئەو پیاو باشانانەیان لێ بنێن، بۆ ئەوە پیرۆزباییان لێ وەربگرن، ئەوانیش وایانکرد، جا کە ئەمانە شوێنەواریان کوێر بوەوە ئەوجا نەوەی ئەوانەی کەئەو پەیکەرانەیان دروست کردبوو، وەلەوشوێنانەدا، دایان نابوون دەستیان کرد بە پەرستنی ئەو بتانە! (ب** (خودای لێ ڕازی بێ))

## ٥٥- سوورەتی جین

**(مەکەییە، ٢٨ ئایەتە)**

## سورة الجن (مكية ثمان وعشرون آية)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

**٤١٨٩**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) قَالَ انْطَلَقَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) فِي طَائِفَةٍ مِنْ أَصْحَابِهِ عَامِدِينَ إِلَى سُوقِ عُكَاظٍ، وَقَدْ حِيلَ بَيْنَ الشَّيَاطِينِ وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ،

---

[1] بخاري. تفسير: ٤٩٢٠.

وَأُرْسِلَتْ عَلَيْهِمُ الشُّهُبُ، فَرَجَعَتِ الشَّيَاطِينُ فَقَالُوا: مَا لَكُمْ؟ قَالُوا: حِيلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ، وَأُرْسِلَتْ عَلَيْنَا الشُّهُبُ. قَال: مَا حَالَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ خَبَرِ السَّمَاءِ إلاَّ مـا حَـدَثَ، فَاضْرِبُوا مَشَارِقَ الأَرْضِ وَمَغَارِبَهَا، فَانْظُرُوا مَا هَـذَا الَّـذِى حَـدَثَ، فـانطلقوا ينظـرونَ فالَّذِينَ تَوَجَّهُوا نَحْوَ تِهَامَةَ سَمِعُوا قِراءة رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَهُوَ يُصَلِّى بِأَصْحَابِهِ صَلاَةَ الْفَجْرِ بنخلة فَتسمَّعوا لَهُ ، فَقَالُوا: هَذَا الَّذِى حَـالَ بَيْـنَكُمْ وَبَـيْنَ خَبَـرِ الـسَّمَاءِ. فَرَجَعُوا إِلَى قَوْمِهِمْ فَقَالُوا: يَا قَوْمَنَا (إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا. يَهْدِى إِلَى الرُّشْـدِ فَآمَنَّـا بِـهِ وَلَنْ نُشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَدًا) وَأَنْزَلَ اللَّهُ تعالى: {قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ} وإنَّما أوحي إليه قول الجنِّ. رواه البخاري والترمذي وزاد: لَّما رأى الجنُّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) وَأَصْحَابُهُ يُصَلُّونَ بِصَلاَتِهِ فَيَسْجُدُونَ بِسُجُودِهِ فَعَجَّبُوا مِنْ طَوَاعِيَـةِ أَصْـحَابِهِ لَـهُ وَقَـالُوا لِقَوْمِهِمْ: (لَمَّا قَامَ عَبْدُ اللَّهِ يَدْعُوهُ كَادُوا يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا). نـسأل الله كمـال الطاعـة آمين[1].

**ئیبنـو عـەبباس** (خودایان لێ ڕازی بێ) **فـەرمووی: پێغەمبـەر** (درودی خودای لەسەربێ) **لەگـەڵ دەسـتەیێ لـەیارانی دا لـە مەککـەوە دەرچـوون بـۆ بـازاڕی عوکـاظ (کـە کاتی گردەوە بوونی عەرەب بوو لەو شوێنەدا) هـەتا عەرەبـەکان بـانگ بکـا بـۆ سەر ئاینی ئیسلام، ئەمە لەو کاتـەدا بـوو کـە شـەیاطین ڕێگـەی ئـەوەیان لـێ گیرابوو کە بەئاسمانـدا سـەرکەون بـۆ هـەواڵ و دەنگوبـاس، ئـەو شـەیتانانەی ئەمەیان بکردایە بڵێسەی ئاگرو برووسکەو چەخماخە بەرەنگاریان دەبوو، جا کـە بـە نائومێـدی دەگەڕانـەوە هۆزەکـەیان پێیـان دەگـوتن: ئـەوە چـیتانە؟ دەیـانگوت: دەنگوبـاس و هـەواڵی ئاسمانمـان لـێ قەدەغـەکراوەو کەدەچـین دەدرێینە بەر شووڵە ئاگرو برووسکە. جا شـەیتان دەڵـێ: دیـارە شـتێ ڕووی داوە لەدنیادا، بۆیە ڕێگەی ئاسمانتـان لـێ گیراوە، دەسا دەی کون و قوژبنی سەرزەوی چ لە ڕۆژهـەڵات و چ لـە ڕۆژئـاوا بگـەڕێن و بزانن چـی ڕووی داوە کە**

---

[1] بخاري. تفسير: ٤٩٢١.

بووە بەهۆی ئەم ئاگربارانە. جا ئەوانیش بە هەر چوارلادا بۆ ئەم مەبەستە دەردەچن و دەکەونە جم و جۆوڵ و سووسە کردن، تا ئەوانەی کە ڕووەو مەککە هاتن لە بەطنونەخلە تووشی پێغەمبەر دەبن، خەریك دەبێ بەرنوێژیی نوێژی بەیانی بۆ هاوڕێکانی دەکاو گوێ لەقورئانخوێندنەکەی دەگرن جا گوتیان: ئەم قورئانەیە کە دەبێ بەهۆی ئەوە کە نایەڵێ ئێمە بە ئاسماندا سەرکەوین و هەواڵ وەربگرین، ئەوسا دەگەڕێنەوە بۆلای گەلەکەیان و دەڵێن: ئەی گەلی ئێمە! ئێمە قورئانێکمان بیستووە، جێگەی سەر سوڕمانە ڕێگەی ڕاست نیشانی ئادەمیزادو پەری دەدا، ئێمەیش باوەڕمان پێ کردو هەرگیز کەس ناکەین بەهاوبەش و هاوڕێ بۆ خودای پەروەردگارمان. جا خودای گەورە ئەمەی ناردە خوارەوە: {قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ الْجِنِّ} ئەی ڕەهبەری خۆشەویست! تۆ بفەرموو: لەلایەنی خوداوە سرووش و وەحیم بۆهاتووە کەچەن کەسێ لەبەرەی جنۆکە گوێیان لێ ڕاگرتووم، لەکاتی قورئانخوێندندا بەڵام تەواوی قسەی جنۆکەکان بەوەحی بەیان کرابوو، بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) (ب/ت) ڕوایەتی تیرمیزی ئەمەی پترە: کاتێ جنۆکەکان دییان کە یارانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ئاوا بەو ڕەنگە بەبێ گیروگرفت پەیڕەوی حەزرەت دەکەن و نوێژ بە نوێژی ئەو دەکەن و بەشوێن سەجدەی ئەوا سەجدە دەبەن و ئەویان کردووە بەڕەهبەرو سەرمەشق و نموونەی باڵا کاتێ ئەم حاڵەیان دی زۆر بەدڵیان بوو، وە بە گەلەکەی خۆیان گوت: {وَأَنَّهُ لَمَّا قَامَ عَبْدُ اللَّهِ يَدْعُوهُ كَادُوا يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا}.

## ٥٦- سوورەتی موزەمیل (سورة المزمل)

لم يرد في الأصول حديثٌ فيها:

دانەر (پڕ گۆڕی لەنوور بێ) دەفەرموێ: لەسەرچاوەکانی تاج دا هیچ حەدیثێ لەبارەی ئەم سوورەتەوە نەهاتووە بەڵام لەتەفسیری (مواهب الرحمن)دا، لەسەرەتای ئەم سوورەتەدا دەفەرموێ:

٤١٩٠- عَنْ سَعْدِ بْنِ هِشَامٍ قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ (رضي الله عنها) أَنْبِئِينِي عَنْ قِيَامِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَتْ أَلَسْتَ تَقْرَأُ هَذِهِ السُّورَةَ (يَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ) قُلْتُ بَلَى. قَالَتْ فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ افْتَرَضَ قِيَامَ اللَّيْلِ فِي أَوَّلِ هَذِهِ السُّورَةِ فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَأَصْحَابُهُ حَوْلاً حَتَّى انْتَفَخَتْ أَقْدَامُهُمْ وَأَمْسَكَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ خَاتِمَتَهَا فِي السَّمَاءِ اثْنَيْ عَشَرَ شَهْرًا ثُمَّ أَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ التَّخْفِيفَ فِي آخِرِ هَذِهِ السُّورَةِ فَصَارَ قِيَامُ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) اللَّيْلَ تَطَوُّعاً مِنْ بَعْدِ فَرِيضَتِهِ. أخرجه مسلم وأبو داود والنسائي[1].

سەعدی کوڕی هیشام فەرمووی: گوتم بە عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ): پێم بفەرموو کەشەو نوێژی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) چۆن بوو؟ فەرمووی: دیارە کەتۆ ئەم سوورەتە دەخوێنی کەناوی (یا أیها المزمل)ە؟ گوتم: بەڵێ. فەرمووی: دەی بەپێی سەرەتای ئەم سوورەتە خودای گەورە شەو نوێژی دانا لەسەر حەزرەتو یارانی، ئیتر حەزرەت خۆیو یارانی تاماوەی ساڵێ بەپێی سەرەتای ئەم سوورەتە شەو نوێژیان دەکرد، تەنانەت پێیان پەنەما بوو، ئیتر تاماوەی ساڵێ خودای گەورە لەئاسمان کۆتایی ئەم سوورەتەی گیردا، جا لەپاشدا لەم سوورەتەدا لەئاخرەکەیەوە ئەرکی سووك کردن، ئیتر شەو نوێژ لەپاش ئەوە کەلە پێشا فەرز بوو، بوو بە سوننەت.

مامۆستا مەلا کەریم (خودای لێ ڕازی بێ) لەکۆتاییدا دەفەرموێ: موسلیمو ئەبو داوودو نەسائی ئەم حەیثە یان گێڕاوەتەوە.

---

[1] راجع: بخاري: تهجد: ١١٣٠، ٤٨٣٦، ٦٤٧١. مسلم. صفات المنافقين: ٧٠٥٥ — ٧٠٥٧. ترمذي. صلاة: ٤١٢. نسائي. قيام الليل: ١٦٤٣. ابن ماجه. إقامة الصلاة: ١٤١٩.

## ٥٧- سوورەتی موددەثیر

(مەککەییە، ٥٥ ئایەتە)

## سورة المدثر (مكية، وهي خمس وخمسون آية)

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

**٤١٩١- عَنْ يحيى قَالَ:** سألت أبا سلمة (رضي الله عنهما) **أيُّ القرآن أنزل أوَّل.** سبق هذا الحديث في كتاب النبوَّة والرسالة في مبحث (أول نزول الوحي بالنبوة والرسالة)←[1].

**٤١٩٢- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ** (رضي الله عنه) **عَنْ النَّبِيِّ** (صلى الله عليه وسلم) **قَالَ: «الصَّعُودُ جَبَلٌ مِنْ نَارٍ يُتَصَعَّدُ فِيهِ الْكَافِرُ سَبْعِينَ خَرِيفًا وَيَهْوِى فِيهِ كَذَلِكَ مِنْهُ أَبَدًا»**[2].

**ئەبوسەعید** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: صەعوود (لەئایەتی: سارهقه صعودا)دا کێوێکی ئاگرینی زۆر سەختە، کافر حەفتا ساڵ پیادا سەردەکەوێ، ئنجا بەحەفتا ساڵی تر گلۆر دەبێتەوە بەناو ئەو شاخ و داخەدا، ئیتر هەمیشە ئەمەکاریەتی هەتا هەتایە (ت- بەسەندێکی غەریب).**

**٤١٩٣- عَنْ جَابِرٍ** (رضي الله عنه) **قَالَ: قَالَ: نَاسٌ مِنَ الْيَهُودِ لأُنَاسٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ** (صلى الله عليه وسلم) **هَلْ يَعْلَمُ نَبِيُّكُمْ كَمْ عَدَدُ خَزَنَةِ جَهَنَّمَ؟ قَالُوا: لاَ نَدْرِى حَتَّى نَسْأَلَ نَبِيَّنَا. فَجَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ** (صلى الله عليه وسلم) **فَقَالَ يَا مُحَمَّدُ غُلِبَ أَصْحَابُكَ الْيَوْمَ. قَالَ «وَبِمَ غُلِبُوا؟». قَالَ: سَأَلَهُمْ يَهُودُ هَلْ يَعْلَمُ نَبِيُّكُمْ كَمْ عَدَدُ خَزَنَةِ جَهَنَّمَ قَالَ «فَمَا قَالُوا». قَالَ قَالُوا لاَ نَدْرِى حَتَّى نَسْأَلَ نَبِيَّنَا. قَالَ «أَفَغُلِبَ قَوْمٌ سُئِلُوا عَمَّا لاَ يَعْلَمُونَ فَقَالُوا لاَ نَعْلَمُ حَتَّى نَسْأَلَ نَبِيَّنَا لَكِنَّهُمْ قَدْ سَأَلُوا نَبِيَّهُمْ فَقَالُوا أَرِنَا اللَّهَ جَهْرَةً عَلَيَّ بِأَعْدَاءِ اللَّهِ إِنِّى سَائِلُهُمْ عَنْ تُرْبَةِ الْجَنَّةِ وَهِيَ الدَّرْمَكُ». فَلَمَّا جَاءُوا قَالُوا يَا أَبَا الْقَاسِمِ كَمْ عَدَدُ خَزَنَةِ جَهَنَّمَ قَالَ «هَكَذَا وَهَكَذَا». فِي مَرَّةٍ عَشْرَةٌ وَفِي مَرَّةٍ تِسْعٌ «أي عَدَدُهُمْ تِسْعَةَ عَشَرَ خازِنا». قَالُوا:**

---

[1] تقدم في المجلد الرابع. تسلسل: ٩٨ رقم: ٣١٤٩/٣.

[2] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

نَعَمْ. قَالَ لَهُمُ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) «مَا تُرْبَةُ الْجَنَّةِ؟». قَالَ فَسَكَتُوا هُنَيْهَةً ثُمَّ قَالُوا: أَخْبِرْنا يَا أَبَا الْقَاسِمِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): «الْخُبْزُ مِنَ الدَّرْمَكِ»[٣].

جابیر (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: چەن جوولەکەیێ بەچەن کەسێ لەیارانی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەڵێن: ئایا پێغەمبەرەکەی ئێوە ژمارەی کار بەدەستو دەرگاوانەکانی دۆزەخ دەزانێ؟ گوتیان: نازانین، تالێی نەپرسین. جا پیاوێ دەچێ بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەڵێ: ئەی موحەممەد! یارانی تۆ ئەمڕۆ بۆڕدران، دەفەرموێ: چۆن چۆنی بۆڕدران؟ دەڵێ: جوولەکەکان پرسیارێکیان لی کردن، کەچی گوتیان: نازانین تا لە پێغەمبەری خۆمان نەپرسین! فەرمووی: بۆڕخواردن چۆن وادەبێ، ئەگەر پرسیاری شتێ لەهۆزێ بکرێ ئەوانیش بڵێن: نازانین تا لە پێغەمبەرەکەمان نەپرسین. بەڵام ئەو جوولەکانە نەوەی ئەوانەن کەلە پێغەمبەری خۆیان دەپرسی دەیانگوت پێی: أرنا الله جهرة: بەئاشکرا خودامان پێ نیشان بدە، کە بەچاوی خۆمان، بەچاوی سەرمان چاومان پێی بکەوێ ئادەی ئەو دوشمنانی خودایەم بۆ بێنن، پرسیاری خاکی بەهەشتیان لێ دەکەم کە ئاردی بێگەردە کاتێ جوولەکەکان هاتن گوتیان: ئەی باوکی قاسم! ژمارەی پێشخزمەتەکانی دۆزەخ چەن کەسن؟ حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) بە پەنجەی دەستی ئاماژەی کرد کە نۆزدە کەسن، وەك خودای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: {عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ} (٣٠/٧٤) دۆزەخ نۆزدە فریشتە، یاخود نۆزدە چەشن فریشتە سەرپەرشتی دەکەن) گوتیان: بەڵێ وایە. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خاکی بەهەشت چییە؟ جا تۆزێ مات بوونو گوتیان: ئەی باوکی قاسم: تۆ پێمان بڵێ چییە فەرمووی: نانی ئاردی بێ گەردە (ت- سەنەد غەریب).

---

[٣] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

٤١٩٤- عَنْ أَنَسٍ (رضي الله عنه) عَنْ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) أَنَّهُ قَالَ فِي هَذِهِ الآيَةِ (هُوَ أَهْلُ التَّقْوَى وَأَهْلُ الْمَغْفِرَةِ) قَالَ «قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ أَنَا أَهْلٌ أَنْ أُتَّقَى فَمَنِ اتَّقَانِي فَلَمْ يَجْعَلْ مَعِي إِلَهًا فَأَنَا أَهْلٌ أَنْ أَغْفِرَ لَهُ». روى هذه الثلاثة الترمذي. والله أعلم[٤].

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لەبارەی ئەم ئایەتەوە کە دەفەرموێ: {وَمَا يَذْكُرُونَ إِلَّا أَن يَشَاء اللَّهُ هُوَ أَهْلُ التَّقْوَى وَأَهْلُ الْمَغْفِرَةِ} (٥٦/٧٤) خودای گەورە شایستەیە بۆ ئەوە کەهەموو کەسێ زۆر بە باشی شەرمو شکۆو سامی لێ بکاو لێی بترسێ، هەروەکوو لەشانی دا هەیە کەلە تاوانی بەندەی خۆی خۆش ببێ. فەرمووی: خودای بالادەستو شکۆمەند دەفەرموێ: من شایستەم بۆ ئەوە کە هەموو کەسێ شەرمو شکۆم لێ بکاو لێم بترسێ، جاهەر کەسێ لەمن بترسێو خودای تر لەگەڵ مندا نەکا بەخودا، ئەوە ئەویش شایەنی ئەوەیە کەمن لێی خۆش ببم! (ت-سند غريب).

## ٥٨- سوورەتی قیامەت

(مەککەییە، ٤٠ ئایەتە)

## سورة القيامة (مكية وهي أربعون آية)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤١٩٥- قَالَ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) إِذَا نَزَلَ جِبْرِيلُ بِالْوَحْيِ، وَكَانَ مِمَّا يُحَرِّكُ بِهِ لِسَانَهُ وَشَفَتَيْهِ فَيَشْتَدُّ عَلَيْهِ وَكَانَ يُعْرَفُ مِنْهُ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ (لاَ تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ* إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وَقُرْآنَهُ) قَالَ: عَلَيْنَا أَنْ نَجْمَعَهُ فِي صَدْرِكَ، وَقُرْآنَهُ (فَإِذَا قَرَأْنَاهُ فَاتَّبِعْ قُرْآنَهُ) فَإِذَا أَنْزَلْنَاهُ فَاسْتَمِعْ (ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُ) عَلَيْنَا أَنْ نُبَيِّنَهُ بِلِسَانِكَ – قَالَ – فَكَانَ إِذَا أَتَاهُ جِبْرِيلُ أَطْرَقَ، فَإِذَا ذَهَبَ قَرَأَهُ كَمَا وَعَدَهُ اللَّهُ. (أَوْلَى لَكَ فَأَوْلَى) تَوَعُّدٌ. رواه البخاري والترمذي[١].

---

[٤] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

[١] بخاري. تفسير: ٤٩٢٩.

**ئیبنو عەبباس** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **دەیفەرموو: لەپێش دا کاتێ جوبرائیل** (دروودی خودای لەسەربێ) **وەحیو سرووشی دەهێنا بۆ پێغەمبەر (دروودو صەلاّواتو سەلامی خودای گەورەی لەسەربێ) گەلێ جار زۆر پەلە پەلی دەکردو خۆش خۆش لێوو زمانی خۆی بۆ دەبزاواندو ئەم حاڵە زۆر پەرێشانی دەکرد، لەبەر ئەوە ئەم حاڵەی پێوە دیاربوو، جا خودا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە بۆی: {لَا تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ، إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وَقُرْآنَهُ} لەکاتی وەرگرتنی قورئاندا، کاتێ جوبرائیل بەوەحی دەیهێنێ بۆت، پەلە پەلی لێ مەکەو دەمت نەیەت بەیەکاو مەترسی ئەوەت نەبێ کەبۆت ڕەوان ناکرێ، چونکە ئێمە لەسەرمانە کە کۆی بکەینەوەو لەفەوتان ڕزگاری بکەینو زۆر بەجوانیش بە تۆی ڕەوان بکەین، ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ رازی بێ) **فەرمووی: واتە ئێمە لەسەرمانەو بەڵێنەو دەیدەین بەتۆ کە ئەم قورئانە بەجوانی پێت ڕەوان بکەینو لەسەر زمانت ئاسانی بکەینو بەدڵ باشباش تێی بگەیت تا تۆش گەلی خۆت فێری خوێندنو مانای قورئان بکەیت! ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ رازی بێ) **فەرمووی: ئیتر لەوە دوا کە جوبرائیل وەحیو سرووشی بۆی دەهێنا کە دەیخوێندەوە بۆی ئەومات دەبوو، گوێی دەگرتو قسەی نەدەکرد کاتێ جوبرائیل دەرۆیشت حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **قورئانەکەی بەڕەوانیو بەشینەیی دەخوێند، وەك خودا بەڵێنو مژدەی ئەوەی پێدابوو لەم ئایەتەدا.**

**ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ رازی بێ) **فەرموویشی: ئەم ئایەتەیش لەم سوورەتەدا کە دەفەرموێ: {أولى لك فأولى} (٣٤/٧٥) ئەمە ووشەی هەڕەشەیە کە لەئادەمی بێ باوەڕ کراوە. ئایەتەکە واتە: ئەی بێ بڕوای بەدبەخت! ئەی ئەو کەسەی کەلەژیانی جیهانا نەنوێژت دەکرد، نە زەکاتت دەدا، نەخێرت دەکرد، چونکە هەموویت بەدرۆ دەزانی، لەبەرئەوەی کەباوەڕت بەخودا نەبوو، وەئەمانەت گشتی پشت گوێ خستبوو، ئەی ئەوکەسەی کەئەمە ڕەوشی بەدی تۆ بوو بزانە کە ئەم سزایە کە ئێستا دەیچەژی ئەمە پڕ بە پێستتەو توڵەی ئەو کوفرو بێ باوەڕییەی خۆتە، وە ئەمە جێی گومان نییە.**

(ب/ت = بوخاریو تیرمیزی غەریقی ڕەحمەتی (خودای لێ ڕازی بێ) گەورەبن ئەم فەرموودەیەیان گێڕاوەتەوە)

٤١٩٦- عَنْ ابْنَ عُمَرَ (رضي الله عنهما) عَنْ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: «إِنَّ أَدْنَى أَهْلِ الْجَنَّةِ مَنْزِلَةً لَمَنْ يَنْظُرُ إِلَى جِنَانِهِ وَأَزْوَاجِهِ وَنَعِيمِهِ وَخَدَمِهِ وَسُرُرِهِ مَسِيرَةَ أَلْفِ سَنَةٍ وَأَكْرَمَهُمْ عَلَى اللَّهِ مَنْ يَنْظُرُ إِلَى وَجْهِهِ غُدْوَةً وَعَشِيَّةً». ثُمَّ قَرَأَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) (وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَاضِرَةٌ إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ). رواه الترمذي[٢].

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر کە بەناوبانگە بە ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لەسەر بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێو سەروماڵو منداڵ گشتی بەقوربانی گەردی سەر گۆڕی پیرۆزی بێ) فەرمووی: نزمترین پایە لەبەهەشتا پایەی ئەو کەسانەیە، کە هەزار ساڵە ڕێ هەر تەماشای باخو بێستانو ژنو کارەکەرو نۆکەرو تەختو چارپایەی خۆیان دەکەن ئەو بەهەشتییانەیشی کەزۆر بەقەدرو بەڕێزن لەلای خودا ئەوانە سبەینێو ئێوارێ وان لەخزمەتی خوداداو تەماشای زاتی پیرۆزی ئەو دەکەن، ئینجا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە، بۆ پشتیوانی ئەم فەرمایشتە: {وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ، إِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ} (٧٥/٢٢-٢٣) واتە: لەو ڕۆژەدا گەلێ لە بەهەشتییەکان وورشە وورشی ڕۆخساریان دێ، دەڵێی نووریان لێ باریوە، شادبوون بەدیداری پەروەردگاری خۆیانو بەهەردوو چاوی سەر خودای خۆیان دەبینن (ت-بەسەنەدێکی غەریب).

٤١٩٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) عَنْ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قال: «مَنْ قَرَأَ مِنْكُمْ بِالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ فَانْتَهَى إِلَى آخِرِهَا (أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَحْكَمِ الْحَاكِمِينَ) فَلْيَقُلْ: بَلَى وَأَنَا عَلَى ذَلِكَ مِنَ الشَّاهِدِينَ، وَمَنْ قَرَأَ (لاَ أُقْسِمُ بِيَوْمِ الْقِيَامَةِ) فَانْتَهَى إِلَى (أَلَيْسَ ذَلِكَ بِقَادِرٍ عَلَى أَنْ يُحْيِيَ الْمَوْتَى) فَلْيَقُلْ بَلَى، وَمَنْ قَرَأَ (وَالْمُرْسَلاَتِ) فَبَلَغَ (فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَهُ يُؤْمِنُونَ) فَلْيَقُلْ: آمَنَّا بِاللَّهِ. رواه أبو داود في الركوع والسجود والترمذي[٣].

---

[٢] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

[٣] سكت عَن درجته الشارح.

**دەگێڕنەوە لەئەبو هورەیرەوە** (خودای لێ ڕازی بێ) **لە پێغەمبەرەوە** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: هەر کەسێکتان سوورەتی (والتين والزيتون)ی خوێند کاتێ گەیشتە کۆتاییەکەی بابڵێ: بلى وأنا على ذلك من الشاهدين: بەڵێ خودا لەهەمووفەرمانداری باشترەو لەهەموو فەرمانڕەوایێ عادڵترەو فەرمانڕەواترەو لەهەموو کەسێ کار دروستترە. وەهەر کەسێ سوورەتی (لا أقسم بيوم القيامة)ی خوێندو گەیشتە دواییەکەی بابڵێ: بلى، بەڵێ ئەو خودایەی کەلە تنۆکێ ئاو، بەچەن پلەیەکی یەك لە یەك سەیرتر ئەم ئادەمیزادە بلیمەتو هۆشیارەی لەم قاڵبە ڕێکوپێكو شێوە نازدارەدا دروست کردووە، زۆر بەباشی دەتوانێ مردووەکان زیندوو بکاتەوە! وەهەر کەسێ سوورەتی: (والمرسلات)ی خوێند کە گەیشتە ئایەتی: {فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَهُ يُؤْمِنُونَ} بابڵێ: آمنا بالله: باوەڕمان بەیەزدانی پاك هەیە (د/ت = ئەبو داوودو تیرمیزی ئەم حەدیثەیان گێڕاوەتەوە):**

**(هل أتى) هەڵهات وەک بای (مورسەلات)**

**جزمی (تەبارەک) کۆتایی پێ هات**
**نۆرەی (عەممە)یە، لەبرایماوە!**
**جزمێ قورئانم هەبوو بەم ناوە!**
**مەلای لێ دەرچێ لەخەڵکی ناودێ**
**من عولەیان بووم لەپاش نەلفوبێ!**

## ٥٩- سوورەتی هەل ئەتا

**(مەدینەییە، ٣١ ئایەتە)**

**سورة هل أتى (مدنية، وهي أحدى وثلاثون آية)**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

قال اللّٰهُ تَعَالَى: {وَمَا تَشَاؤُونَ إِلَّا أَن يَشَاءَ اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا} (٧٦/٣٠).

واتە: هەتا خودا خواستی لەسەر بوونی شتێ نەبێ ئێوە لەخۆتانەوە خود سەر ناتوانن خواستی ئەوشتە بکەن، بەراستی خودا داناو زانایە.

٤١٩٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) عَنْ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) «الْمُؤْمِنُ الْقَوِيُّ خَيْرٌ وَأَحَبُّ إِلَى اللَّهِ مِنَ الْمُؤْمِنِ الضَّعِيفِ وَفِي كُلٍّ خَيْرٌ احْرِصْ عَلَى مَا يَنْفَعُكَ وَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ وَلاَ تَعْجِزْ وَإِنْ أَصَابَكَ شَيْءٌ فَلاَ تَقُلْ لَوْ أَنِّي فَعَلْتُ كَانَ كَذَا وَكَذَا. وَلَكِنْ قُلْ قَدَرُ اللَّهِ وَمَا شَاءَ فَعَلَ فَإِنَّ لَوْ تَفْتَحُ عَمَلَ الشَّيْطَانِ». رواه مسلم في القدر[1].

لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خودای لەسەر بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: موسوڵمانی تەواناو بەهێز لە موسوڵمانی ناتەواناو بێهێز باشترە، هەردوو لایش مادەم موسوڵمانن و ئەهلی ئیمانن زۆر باشن، هەرچی سوودی ڕەوای هەردوو جیهانی هەیە بۆت سوورو مجێز بە لەسەری و بۆی تێکۆشە، هەمیشە یارمەتی لەخودای گەورە داوابکەو، بە پشتی خودا دەست بدەرە کاری خێرو تەمبەڵ و تەوەزەل مەبەو خاوەخاوو سستی تیامەکە، خودا دەتگەیەنێ بەئاوات چونکە خۆی بەڵێنی ئەوەی داوەو دەفەرموێ: {وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ} ئەوەی بەڕاستی پشت بە خودای ببەستێ، خودای بەسەو کاری بەکەسی تر نییە ئەگەر تووشی شتێکیش بوویت مەڵێ: ئەگەر وام بکردایە واوا دەبوو! بەڵام بڵێ: ئەمە چارە نووسی خودا بوو، چارەنووسی خودایش ڕەتبوونەوەی نییەو خودا خواست و ویستی لەسەر هەر شتێ بێ دەیکا، چونکە ئەگەر بڵێی ئەگەر وام بکردایە وادەبوو (ئەگەر) دەرگا بۆکاری شەیتان دەکاتەوەو سەر دەکێشێ بۆ خراپە گرتن لەچارەنووس و سەرنڤیشت کەواتە: خۆت تەسلیمی ئەمری خوداکەو لەدوای چووە مەچووە (م-خ- = ئیمامی موسلیم، (ڕەزای خودای لەسەر بێ) لە صەحیحی موسلیم دا ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە).

---

[1] مسلم. قدر: ٦٧١٦.

## ٦٠- سوورەتی مورسەلات

(مەککەییە پەنجا ئایەتە)

سورة المرسلات (مكية، وهي خمسون آية)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤١٩٩– قَالَ عَبْدِ اللَّهِ (رضي الله عنه) بَيْنَمَا نَحْنُ مَعَ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فِي غَارٍ بِمِنًى، إِذْ نَزَلَ عَلَيْهِ (وَالْمُرْسَلاَتِ) وَإِنَّهُ لَيَتْلُوهَا، وَإِنِّي لأَتَلَقَّاهَا مِنْ فِيهِ، وَإِنَّ فَاهُ لَرَطْبٌ بِهَا، إِذْ وَثَبَتْ عَلَيْنَا حَيَّةٌ فَقَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) «اقْتُلُوهَا». فَابْتَدَرْنَاهَا، فَذَهَبَتْ، فَقَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) «وُقِيَتْ شَرَّكُمْ كَمَا وُقِيتُمْ شَرَّهَا». رواه الشيخان. نسأل الله السلامة آمين[1].

عەبدوڵڵا (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: جارێ لەشەوی عەرەفەدا لەخاکی مینا، لە ئەشکەوتێکا، لە خزمەتی پێغەمبەردا بووین (دروودی خودای لەسەربێ) لەوکاتەدا سوورەتی (والمرسلات)ی بۆهات، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) خۆی ئەم سوورەتەی بەقەدرو ڕێزەوە دەخوێندەوەو منیش ووشە بە ووشەو ئایەت بەئایەت لەدەمی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) وەرم دەگرت و لەبەرم دەکرد، جا لەم کاتەدا کە هێشتا سوورەتەکە بەسەرزاری پێغەمبەرەوە بوو (دروودی خودای لەسەربێ) وە دەمی پیرۆزی پێی تەڕو پاراو بوو، لەپڕ لەناکاو مارێ دەرپەڕی و پەلاماری داین! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئادەی بیکوژن. بەڵام مارەکە دەربازبوو ڕۆیشت پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەم ئەو قوتاری بوو لەچنگی ئێوەو هەم ئێوە قوتارتان بوو لەچنگی ئەو! (ش).

(عەممە)و (نازعات) لەگەڵ (عەبەسە)

بۆ بێ چاو لە جێی پاو چاوو دەسە!

بۆ بیناش بۆن و بوون و هەبوونن

لەگەڵ (تەکویر)دا چون چرای ڕونن:

---

[1] بخاري. تفسير: ٤٩٣٠، ٤٩٣١. مسلم. سلام. ٥٧٩٦-٥٧٩٩.

ڕوون دەکەنـــــــەوە ڕۆژی قیامـــــــەت
چـۆن دێو ئـەو خەڵکـە چـۆن دەبـن سـەخڵەت
لـــەتاو (انفطـــار) دڵان شـــەق شـــەق بـــوون
بـــە (مـــوطـــەففـــیفین) چـــاوان نەبڵـــەق بـــوون
کـــە (ئینـشیقاق) بـوو، (بـورووج)و (طـاریـق)
نـــامێنن، ســـوێن بـــێ بـــە(ئـــەعلا) خـــالیق،

## ٦١- سوورەتی عەممە

(مەککەییە، ٤٠ ئایەتە)

لم يرد في تفسيرها شيء.

لەسەرچاوەکانی تاجول ئوصوڵدا هیچ لەبارەی ئەم سوورەتەوە نەهاتووە.

## ٦٢- سوورەتی نازیعات

(لە سوورەتە مەککەییەکانە، چلو شەش ئایەتە)

سورة النازعات (مكية، وهي ست وأربعون آية)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤٢٠٠- عَنْ سَهْلُ بْنُ سَعْدٍ (رضي الله عنه) قَالَ رَأَيْتُ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: بِإِصْبَعَيْهِ هَكَذَا بِالْوُسْطَى وَالَّتِي تَلِي الإِبْهَامَ «بُعِثْتُ وَالسَّاعَةَ كَهَاتَيْنِ». رواه الشيخان[1].

سەهلی کوڕی سەعد (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: بەچاوی خۆم چاوم لێ بوو کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پەنجەی ناوەڕاستو پەنجەی شایەتمانی ئاوا جووت کردو ئاڕاستەی یارانی کردنو فەرمووی: منو قیامەتن وەك ئەم دوو پەنجەیە دوا بەدوای یەك هاتووینو من دواهەمینی پێغەمبەرانمو لەدوای من هەتا قیامەت هەڵ دەستێ، پێغەمبەری تر نایێ (ش).

---

[1] بخاري. تفسير: ٤٩٣٦، ٥٣٠١، ٦٥٠٣، مسلم. فتن: ٧٣٣٠، ٧٣٢٩، ٧٣٣٤، ترمذي: فتن: ٢٢١٤.

## ٦٣- سوورەتی عەبەسە

**(مەکەییە، ٤٢ ئایەتە)**

## سورة عبس (مكية، وهي إثنتان وأربعون آية)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

**٤٢٠١- عَنْ عائشة** (رضي الله عنه) **قالَت: جَاءَ ابْنِ أُمِّ مَكْتُومِ الأعمى إِلَى رَسُولِ اللَّهِ** (صلى الله عليه وسلم) **فَجَعَلَ يَقُولُ يَا رَسُولِ اللَّهِ أرشدني، وَعِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ** (صلى الله عليه وسلم) **رَجُلٌ مِنْ عُظَمَاءِ الْمُشْرِكِينَ فَجَعَلَ رَسُولِ اللَّهِ** (صلى الله عليه وسلم) **يُعْرِضُ عَنْهُ وَيُقْبِلُ عَلَى الآخَرِ وَيَقُولُ «أتَرَى بِمَا أَقُولُ بَأْسًا». فَيَقُولُ لاَ فَفِي هذا نُزِلَتْ: (عَبَسَ وَتَوَلَّى أَنْ جَاءَهُ الأَعْمَى) الآيات. رواه اترمذي[1].**

**عائیشە** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: ڕۆژێ پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **قسەی لەگەڵ پیاوێکدا دەکرد، کەیەکێك بوو لەگەورە پیاوانی بتپەرستەکانی قووڕەیش، لەوکاتەدا عەبدوڵڵای کوڕی مالیك، کە بەئیبنو ئوممی مەکتووم ناوبانگی دەرکردووە، کە پیاوێکی کوێری مجرۆ بوو هات بۆلای و عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئیرشادو ڕێنموونیم بکە، دوو سێ جار ئەم قسەیە دووبارە دەکاتەوە چونکە چاوی لێ نابێ‌و نازانێ کە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **لەگەڵ گەورەکانی قوڕەیشدا خەریکەو دەیەوێ ئیسلامیان تێ بگەیەنێ بەڵام پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **ڕوو لەعەبدوڵڵا وەر دەگێڕێ‌و وەڵامی ناداتەوەو هەر خەریکی گوفتوگۆ دەبێ لەگەڵ کابرای ترداو پێی دەفەرموێ: ئایا ئەمەی کە ئێمە دەیڵێین بەڕای تۆ قەیدی هەیە؟ کابرایش دەڵێ: نەخەیر قەیدی نییە. جا لە بارەی ئەم ڕووداوەوە بەشێوەی سەرزەنشتی حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **ئەم چەند ئایەتە دێتە خوارەوە، کە دەفەرموێ: {عَبَسَ وَتَوَلَّى، أَن جَاءهُ الْأَعْمَى،....} هەتا {كِرَامٍ بَرَرَةٍ} (ت-س/ح).**

**٤٢٠٢- وَعَنْهَا عَنْ النَّبِيِّ** (صلى الله عليه وسلم) **قَالَ: مثل الذي يقرأ القرآن وَهُوَ حافظٌ له مع (الحديث)[2].**

---

[1] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[2] تقدم في المجلد الخامس. تسلسل/٧٦، رقم: ٢/٢٥٩١، بخاري. تفسير. ٤٩٣٧.

لەسەرەتای (كتاب فضائل القرآن)دا ڕابوورد فەرموودەی یەکەمو دووەمو سێیەم. → (ب/٥ ز/٧٦ ل/٢٧١ ف/٢).

٤٢٠٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ «(تُحْشَرُونَ حُفَاةً عُرَاةً غُرْلاً)». فَقَالَتِ امْرَأَةٌ أَيُبْصِرُ بَعْضُنَا عَوْرَةَ بَعْضٍ؟ قَالَ: «(يَا فُلاَنَةُ (لِكُلِّ امْرِئٍ مِنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ))».رواه الترمذي[٣].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) دەڵێ: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئێوە لە ڕۆژی قیامەتدا بە ڕووتو قووتیو بە پێخاوسیو بە سوننەت نەکراوی حەشر دەکرێنو کۆ دەکرێنەوە بۆ لێپرسینەوە. ئافرەتێکیش عەرزی کرد: ئایا عەورەتو شەرمگای یەکتری بەچاوی خۆمان دەبینین؟ فەرمووی (درودی خودای لەسەربێ) کچێ! وەك خودا دەفەرموێ: {لِكُلِّ امْرِئٍ مِّنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ} (٣٧/٨٠) لەو ڕۆژەدا بارو دۆخو هەڵوێست وا دژوارو سەختو سەخڵەت دەبێ، کەس ناپەرژێتە سەر شتی وا، کەس سەرکەسی ناپەرژێو هەرکەسێ پلکاوە بەدەردی خۆیەوەو مشووری کاری خۆی دەخوات! (ت-س/ح).

## ٦٤- سوورەتی تەکویر

(مەککەییە، ٢٩ ئایەتە)

## سورة التكوير (مكية وهي تسع وعشرون آية)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤٢٠٤- عَنْ ابْنَ عُمَرَ (رضي الله عنهما) عَنْ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: «(مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ كَأَنَّهُ رَأْىُ عَيْنٍ فَلْيَقْرَأْ (إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ) وَ (إِذَا السَّمَاءُ انْفَطَرَتْ) وَ (إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ))». رواه الترمذي[١].

---

[٣] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[١] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

**ئیبنـو عومـەر** (خودایـان لێ ڕازی بێ) **فـەرمووی: پێغەمبـەر** (دروودی خـودای لەسـەربێ) **فەرمووی: هەر کەسێ حەز دەکا وەك بەچاوی خۆی ڕۆژی قیامەت ببینێ با ئەم سوورەتانە بخوێنێ: سوورەتی {إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ} و سوورەتی {إِذَا السَّمَاء انفَطَرَتْ} و سوورەتی {إِذَا السَّمَاء انشَقَّتْ} (ت-س/ح).**

## ٦٥- سوورەتی ئینفیطار (سورة الإنفطار)

لم يرد فيها شيء في أصولنا.

## ٦٦- سوورەتی موطەففیفین

### (سی و شەش ئایەتە)

### سورة المطففين (مدنية، وهي ست وثلاثون آية)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

**٤٢٠٥- عَنْ ابْنِ عُمَرَ** (رضي الله عنهما) **عَنْ النَّبِيِّ** (صلى الله عليه وسلم) **قَالَ «(يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ) حَتَّى يَغِيبَ أَحَدُهُمْ فِي رَشْحِهِ إِلَى أَنْصَافِ أُذُنَيْهِ». رواه البخاري والترمذي[1].**

**ئیبنـو عومـەر** (خودایـان لێ ڕازی بێ) **فـەرمووی: پێغەمبـەر** (دروودی خـودای لەسـەربێ) **فەرمووی: ئەم ئایەتە کە دەفەرموی: {يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ} (٦/٨٣) ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی گەلێ گەورەیە، ئەو خەڵکە سەرتاپا لەبەر بارەگای پەروەردگاری هەردوو جیهاندا بۆ پرسینەوەو دادپرسی دەستەو نەزەر رادەوەستن. لەکاتی ڕوودانی ڕاوەستانی ئەم ڕۆژەدا هەڵوێست وا ئاڵۆز دەبێ و ئەوەندە بەپێوە دەوەستن و ئەوەندە ماندوو شەکەت دەبن، هی وایان هەیە ئەوەندە دەوەستێ هەتا بنا گوێی لەئارەقی خۆیدا دەچەقێ (ب/ت).**

---

[1] بخاري. تفسير: ٤٩٣٨.

٤٢٠٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) عَنْ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: ((إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا أَخْطَأَ خَطِيئَةً نُكِتَتْ فِي قَلْبِهِ نُكْتَةٌ سَوْدَاءُ فَإِذَا هُوَ نَزَعَ وَاسْتَغْفَرَ وَتَابَ سُقِلَ قَلْبُهُ وَإِنْ عَادَ زِيدَ فِيهَا حَتَّى تَعْلُوَ قَلْبَهُ وَهُوَ الرَّانُ الَّذِي ذَكَرَ اللَّهُ (كَلاَّ بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِمْ مَا كَانُوا يَكْسِبُونَ))). رواه الترمذي. نسأل الله التوفيق آمين[٢].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: کاتێ بەندەیێ لە بەندەکانی خودا یەکەمجار گوناحێکی کرد، خاڵێکی ڕەش لەناو دڵیا پەیدا دەبێ، جا ئەگەر خۆی لەو گوناهە کێشایەوەو داوای لێ خۆش بوونی لە خودا کردو تۆبەی کردو پەشیمان بوەوە، ئەوا دڵی پاكو ڕووناك دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر گەڕایەوە بۆسەریو سەری تێ کرد ئەوا ئەو خاڵە بەرەبەرە زیاد دەکاو پەرە دەسێنێ: هەتا سواری دڵی دەبێو چرای دڵو دەروونی دەکوژێتەوە ئەمە ئەو (ران)ەیە کە خودا لە قورئانا باسی دەکاو دەفەرموێ: {كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ} (١٤/٨٣) حاشا شتی وا نییە، بەڵکوو ئەو تاوانو کردەوە خراپانەی کە ئەیان کەن پەردەی ڕەشی هێناوە بەسەر چاوی دڵیاناو تروسکەی باوەڕی تیا کوژاندۆتەوە (ت-س/ص).

## ٦٧- سوورەتی ئینشیقاق

(مەکەییە، ٢٥ ئایەتە)

## سورة الإنشقاق (مكية، وهي خمس وعشرون آية)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤٢٠٧- قالَتْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) سَمِعْتُ سول الله (صلى الله عليه وسلم) يقول: ((لَيْسَ أَحَدٌ يُحَاسَبُ إِلاَّ هَلَكَ)). قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ جَعَلَنِيَ اللهُ فِدَاءَكَ أَلَيْسَ اللَّهُ تعالى يقول:

[٢] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

«فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا» قَالَ: «ذَاكِ الْعَرْضُ يُعْرَضُون وَلَكِنْ مَنْ نُوقِشَ الْحِسَابَ هَلَكَ». رواه الشيخان والترمذي[1].

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم گوێم لێبوو، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: لە قیامەتدا هەر کەسێ حیسابو لێپرسینەوەی لەگەڵ دا بکرێ مسۆگەر سەری تیا دەچێ! منیش عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! خودا بمکا بە قوربانت! ئەی ئەوە نییە خودای گەورە دەفەرموێ: {فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ، فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا} (٨٤/٧-٨) واتە: هەرکەسێ بەدەستی ڕاستی نامەی کرداری خۆی وەربگرێ ئەوە بەئاسانی حیسابو لێپرسینەوەی لەگەڵ دا دەکرێ ئەویش فەرمووی (درودی خودای لەسەربێ): ئەوەی کە لێرەدا وا دەفەرموێ مەبەست دەورکردنەوەو ڕانوندێکی سەرەتاییە کە خودا لەگەڵ بەندەکەدا، دوو بە دوو چاوێ بەنامەی کرداری دا دەخشێنێو دەفەرموێ پێی: ئایا پێدەنێیت لەم گوناهانە، ئەویش عەرزی دەکا: بەڵێ، خودایش دەفەرموێ: مەترسێو مەحەپەسێ من لەجیهاندا ئەم گوناهانەم بۆ پۆشیویت، ئەوا ئەمرۆکەیش خۆش دەبم لێت لەو گوناهانە، ئەمەیش بەس بە دیمەن حیسابو لێپرسینەوەیە، ئەگینا هەر کەسێ لەحیسابو لێپرسینەوەدا لەگەڵی بکۆڵنەوە بەر باد دەبێ (ش/ت).

## ٦٨- سوورەتی بورووج

(مەککەییە، ٢٢ ئایەتە)

## سورة البروج (مكية، وهي ثنتان وعشرون آية)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤٢٠٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) عَنْ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: «الْيَوْمُ الْمَوْعُودُ يَوْمُ الْقِيَامَةِ وَالْيَوْمُ الْمَشْهُودُ يَوْمُ عَرَفَةَ وَالشَّاهِدُ يَوْمُ الْجُمُعَةِ وَمَا طَلَعَتِ الشَّمْسُ

[1] بخاري. تفسير: ٤٩٣٩، ٦٥٣٧. مسلم: جنة ونعيمها: ٧١٥٦. ترمذي. تفسير: ٣٣٣٧م.

وَلاَ غَرَبَتْ عَلَى يَوْمٍ أَفْضَلَ مِنْهُ فِيهِ سَاعَةٌ لاَ يُوَافِقُهَا عَبْدٌ مُؤْمِنٌ يَدْعُو اللَّهَ بِخَيْرٍ إِلاَّ اسْتَجَابَ اللَّهُ لَهُ وَلاَ يَسْتَعِيذُ مِنْ شَرٍّ إِلاَّ أَعَاذَهُ اللَّهُ مِنْهُ». رواه الترمذي[1].

لە گێڕانەوەی ئێرەدا ئاوایە: ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: مەبەست لەم ڕۆژانە کە خودای گەورە لەم ئایەتەدا سوێندیان پێ دەخواو دەفەرموێ: {وَالْيَوْمِ الْمَوْعُودِ، وَشَاهِدٍ وَمَشْهُودٍ} (٨٥/٢-٣) واتە: سوێندم بە ڕۆژی وادەپێدراو بۆ دانەوەی پاداشتی خێرو شەڕ، هەرکامەی بەپێی خۆی، وە سوێندم بە ڕۆژی شایەت لەسەر خێر، وە سوێندم بە ڕۆژی مەشهوود کەدێنە دیاری، فەرمووی: مەبەست لە ڕۆژی وادەپێدراو ڕۆژی قیامەتە، وە مەبەست لە ڕۆژی مەشهوود ڕۆژی عەرەفەیە، وە مەبەست لە ڕۆژی شایەت ڕۆژی هەینییە کە شایەتی دەدا لەسەر هاتن‌و نەهاتنی نوێژکەرەکان بۆ نوێژی جومعە، باقی مەندەی فەرموودەکە لەم باسەدا ڕۆیشت: (ب/١ ز/١٥٠ ف/١ + ف/٢ + ف/٣ + ف/٤).

٤٢٠٩- عَنْ صُهَيْبٍ (رضي الله عنه) عَنْ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ «كَانَ مَلِكٌ فِيمَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ وَكَانَ لَهُ سَاحِرٌ فَلَمَّا كَبِرَ قَالَ لِلْمَلِكِ إِنِّي قَدْ كَبِرْتُ فَابْعَثْ إِلَيَّ غُلاَمًا أُعَلِّمْهُ السِّحْرَ. فَبَعَثَ إِلَيْهِ غُلاَمًا يُعَلِّمُهُ فَكَانَ فِي طَرِيقِهِ إِذَا سَلَكَ رَاهِبٌ فَقَعَدَ إِلَيْهِ وَسَمِعَ كَلاَمَهُ فَأَعْجَبَهُ فَكَانَ إِذَا أَتَى السَّاحِرَ مَرَّ بِالرَّاهِبِ وَقَعَدَ إِلَيْهِ فَإِذَا أَتَى السَّاحِرَ ضَرَبَهُ فَشَكَا ذَلِكَ إِلَى الرَّاهِبِ فَقَالَ: إِذَا خَشِيتَ السَّاحِرَ فَقُلْ حَبَسَنِي أَهْلِي. وَإِذَا خَشِيتَ أَهْلَكَ فَقُلْ حَبَسَنِي السَّاحِرُ. فَبَيْنَمَا هُوَ كَذَلِكَ إِذْ أَتَى عَلَى دَابَّةٍ عَظِيمَةٍ قَدْ حَبَسَتِ النَّاسَ فَقَالَ الْيَوْمَ أَعْلَمُ آلسَّاحِرُ أَفْضَلُ أَمِ الرَّاهِبُ أَفْضَلُ فَأَخَذَ حَجَرًا فَقَالَ اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ أَمْرُ الرَّاهِبِ أَحَبَّ إِلَيْكَ مِنْ أَمْرِ السَّاحِرِ فَاقْتُلْ هَذِهِ الدَّابَّةَ حَتَّى يَمْضِيَ النَّاسُ. فَرَمَاهَا فَقَتَلَهَا وَمَضَى النَّاسُ فَأَتَى الرَّاهِبَ فَأَخْبَرَهُ فَقَالَ لَهُ الرَّاهِبُ أَىْ بُنَيَّ أَنْتَ الْيَوْمَ أَفْضَلُ مِنِّي. قَدْ بَلَغَ مِنْ أَمْرِكَ مَا أَرَى وَإِنَّكَ سَتُبْتَلَى فَإِنِ ابْتُلِيتَ فَلاَ تَدُلَّ عَلَيَّ. وَكَانَ الْغُلاَمُ يُبْرِئُ الأَكْمَهَ

[1] بسند حسن (شرحه).

وَالأَبْرَصَ وَيُدَاوِى النَّاسَ مِنْ سَائِرِ الأَدْوَاءِ فَسَمِعَ جَلِيسٌ لِلْمَلِكِ كَانَ قَدْ عَمِيَ فَأَتَاهُ بِهَدَايَا كَثِيرَةٍ فَقَالَ مَا هَا هُنَا لَكَ أَجْمَعُ إِنْ أَنْتَ شَفَيْتَنِى فَقَالَ إِنِّى لاَ أَشْفِى أَحَدًا إِنَّمَا يَشْفِى اللَّهُ فَإِنْ أَنْتَ آمَنْتَ بِاللَّهِ دَعَوْتُ اللَّهَ فَشَفَاكَ. فَآمَنَ بِاللَّهِ فَشَفَاهُ اللَّهُ فَأَتَى الْمَلِكَ فَجَلَسَ إِلَيْهِ كَمَا كَانَ يَجْلِسُ فَقَالَ لَهُ الْمَلِكُ مَنْ رَدَّ عَلَيْكَ بَصَرَكَ؟ قَالَ رَبِّى. قَالَ وَلَكَ رَبٌّ غَيْرِى؟ قَالَ رَبِّى وَرَبُّكَ اللَّهُ. فَأَخَذَهُ فَلَمْ يَزَلْ يُعَذِّبُهُ حَتَّى دَلَّ عَلَى الْغُلاَمِ فَجِىءَ بِالْغُلاَمِ فَقَالَ لَهُ الْمَلِكُ أَىْ بُنَىَّ قَدْ بَلَغَ مِنْ سِحْرِكَ مَا تُبْرِئُ الأَكْمَهَ وَالأَبْرَصَ وَتَفْعَلُ وَتَفْعَلُ. فَقَالَ إِنِّى لاَ أَشْفِى أَحَدًا إِنَّمَا يَشْفِى اللَّهُ. فَأَخَذَهُ فَلَمْ يَزَلْ يُعَذِّبُهُ حَتَّى دَلَّ عَلَى الرَّاهِبِ فَجِىءَ بِالرَّاهِبِ فَقِيلَ لَهُ ارْجِعْ عَنْ دِينِكَ. فَأَبَى فَدَعَا بِالْمِئْشَارِ فَوَضَعَ الْمِئْشَارَ فِى مَفْرِقِ رَأْسِهِ فَشَقَّهُ حَتَّى وَقَعَ شِقَّاهُ ثُمَّ جِىءَ بِجَلِيسِ الْمَلِكِ فَقِيلَ لَهُ ارْجِعْ عَنْ دِينِكَ. فَأَبَى فَوَضَعَ الْمِئْشَارَ فِى مَفْرِقِ رَأْسِهِ فَشَقَّهُ بِهِ حَتَّى وَقَعَ شِقَّاهُ ثُمَّ جِىءَ بِالْغُلاَمِ فَقِيلَ لَهُ ارْجِعْ عَنْ دِينِكَ. فَأَبَى فَدَفَعَهُ إِلَى نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِهِ فَقَالَ اذْهَبُوا بِهِ إِلَى جَبَلِ كَذَا وَكَذَا فَاصْعَدُوا بِهِ الْجَبَلَ فَإِذَا بَلَغْتُمْ ذُرْوَتَهُ فَإِنْ رَجَعَ عَنْ دِينِهِ وَإِلاَّ فَاطْرَحُوهُ فَذَهَبُوا بِهِ فَصَعِدُوا بِهِ الْجَبَلَ فَقَالَ اللَّهُمَّ اكْفِنِيهِمْ بِمَا شِئْتَ. فَرَجَفَ بِهِمُ الْجَبَلُ فَسَقَطُوا وَجَاءَ يَمْشِى إِلَى الْمَلِكِ فَقَالَ لَهُ الْمَلِكُ مَا فَعَلَ أَصْحَابُكَ؟ قَالَ كَفَانِيهِمُ اللَّهُ. فَدَفَعَهُ إِلَى نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِهِ فَقَالَ اذْهَبُوا بِهِ فَاحْمِلُوهُ فِى قُرْقُورٍ فَتَوَسَّطُوا بِهِ الْبَحْرَ فَإِنْ رَجَعَ عَنْ دِينِهِ وَإِلاَّ فَاقْذِفُوهُ. فَذَهَبُوا بِهِ فَقَالَ اللَّهُمَّ اكْفِنِيهِمْ بِمَا شِئْتَ. فَانْكَفَأَتْ بِهِمُ السَّفِينَةُ فَغَرِقُوا وَجَاءَ يَمْشِى إِلَى الْمَلِكِ فَقَالَ لَهُ الْمَلِكُ مَا فَعَلَ أَصْحَابُكَ؟ قَالَ كَفَانِيهِمُ اللَّهُ. فَقَالَ لِلْمَلِكِ إِنَّكَ لَسْتَ بِقَاتِلِى حَتَّى تَفْعَلَ مَا آمُرُكَ بِهِ. قَالَ وَمَا هُوَ قَالَ تَجْمَعُ النَّاسَ فِى صَعِيدٍ وَاحِدٍ وَتَصْلُبُنِى عَلَى جِذْعٍ ثُمَّ خُذْ سَهْمًا مِنْ كِنَانَتِى ثُمَّ ضَعِ السَّهْمَ فِى كَبِدِ الْقَوْسِ ثُمَّ قُلْ بِاسْمِ اللَّهِ رَبِّ الْغُلاَمِ. ثُمَّ ارْمِنِى فَإِنَّكَ إِذَا فَعَلْتَ ذَلِكَ قَتَلْتَنِى. فَجَمَعَ النَّاسَ فِى صَعِيدٍ وَاحِدٍ وَصَلَبَهُ عَلَى جِذْعٍ ثُمَّ أَخَذَ سَهْمًا مِنْ كِنَانَتِهِ ثُمَّ وَضَعَ السَّهْمَ فِى كَبِدِ الْقَوْسِ ثُمَّ قَالَ بِاسْمِ اللَّهِ رَبِّ الْغُلاَمِ. ثُمَّ رَمَاهُ فَوَقَعَ السَّهْمُ فِى صُدْغِهِ فَوَضَعَ يَدَهُ فِى مَوْضِعِ السَّهْمِ فَمَاتَ فَقَالَ النَّاسُ آمَنَّا بِرَبِّ الْغُلاَمِ آمَنَّا بِرَبِّ الْغُلاَمِ آمَنَّا بِرَبِّ الْغُلاَمِ. فَأُتِىَ الْمَلِكُ فَقِيلَ للملك: قد وَقَعَ ما كنت تحذر قَدْ آمَنَ الناسُ فَأَمَرَ بِالأُخْدُودِ فِى أَفْوَاهِ السِّكَكِ فَخُدَّتْ وَأَضْرَمَ النِّيرَانَ وَقَالَ: مَنْ لَمْ يَرْجِعْ عَنْ دِينِهِ فَأَحْمُوهُ فِيهَا. أَوْ قِيلَ لَهُ اقْتَحِمْ. فَفَعَلُوا حَتَّى جَاءَتِ امْرَأَةٌ

وَمَعَهَا صَبِيٌّ لَهَا فَتَقَاعَسَتْ أَنْ تَقَعَ فِيهَا فَقَالَ لَهَا الْغُلاَمُ يَا أُمَّهِ اصْبِرِى فَإِنَّكِ عَلَى الْحَقِّ». رواه مسلم والترمذي[٢].

**صوهەیب** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: پادشایەك بووە، جادووگەرێكی هەبوو، كە پیردەبێ بە پادشا دەڵێ: ئەوا من پیربووم، كوڕێكی جەهێڵ بنێرە بۆلام، هەتا بەرەبەرە فێری عیلمی سیحرو زانستی جادووگەریی بكەم، ئەویش كوڕێكی نارد بۆلای كە فێری بكا، ئەو كوڕە هەموو ڕۆژێ دەڕۆیشت بۆلای جادووگەرەكە دەرزی دەخوێند جا لەسەر ڕێگەی كوڕەكەدا خواناس (ڕاهیب)ێ هەبوو لای دەدا بۆلای و گوێی لەقسەی دەگرت و قسەكەیی زۆر بەدڵ بوو، بەڵام كە دەچوو بۆلای جادووگەرەكە لەسەر ئەوە لێی دەدا، جا سكاڵای ئەم حاڵەی لەلای خواناسەكە كرد، ئەویش تەگبیری بۆكردو پێی گوت: لەمەولا ئەگەر ترست لەجادووگەرەكە هەبوو ئەوا بڵێ لەماڵەوە دوایان خستم، وەئەگەر ترست لەماڵەوە هەبوو بڵێ: جادووگەرەكە دوای خستم، ئیتر هەتا ماوەیێ لەسەر ئەم حاڵەمایەوە، هەتا ڕۆژێ لە ڕێگەكەیدا مارێكی حەفیانیی دی ڕێی لە ڕێبوار بەستبوو، كوڕەكە گوتی: ئەمڕۆ بۆم دەردەكەوێ كەئایا جادووگەرەكە باشترە یا خواناسەكە، وە دیاری دەدا كەرێگەی كامیان دروستەو ڕاست، ئەوجا بەردێكی هەڵگرت و گوتی: خودایە! ئەگەر كاری خواناسەكەت خۆشتر دەوێ لەكاری جادووگەرەكە ئەوا بەم خڕكە ئەم مارە بكوژە هەتا ڕێگەكە بكرێتەوە بۆ ئەم خەڵكەو بڕۆن بەرێگەی خۆیاندا، وە پەڵەبەردەكەی پیاداكێشاو مارەكەی كوشت و ڕێگەكە بەربوو، خەڵكەكە ڕۆیشتن بەرێگەی خۆیانەوە. ئینجا فەقێكە چوو بۆلای سۆفیلكەی مامۆستای و باسەكەی بۆگێڕایەوە، ئەویش پێی فەرموو: ئەی كوڕی خۆم! ئەمڕۆ تۆ لەمن باشتری، ئەوەتانێ لەسایەی خوداوە گەیشتیت بەم پایە بەرزە، بەڵام بزانە كەئەمری خودا وایە لەلایەنی خوداوە دووچاری تاقیكردنەوە دەبی و گیرۆدە دەبی، جا**

[٢] مسلم. زهد: ٧٤٣٦. ترمذي: تفسير القرآن: ٣٣٤٠.

ئەگەر گیرۆدە بووی، ڕاستی لەمن مەڵێ‌و ناوی من مەهێنە. ئیتر ڕۆژ بە ڕۆژ کوڕەکە کاری گەورەتری دەکرد، هەتا وای لێهات بەڕەزای خودا کوێری سکومای چاك دەکردەوەو بەڵەکی خۆش دەکردەوەو دەرمانی هەموو دەردێکی تری دەکرد.

لەو سەردەمەدا وەزیری پاشا کوێردەبێ‌و ناوبانگی کوڕە فەقێ دەبیستێ‌و بەدیاری‌و دەسەنەیەکی زۆرەوە دێ بۆلای‌و دەڵێ: ئەمانە هەموویم بۆتۆ هێناوە، بەمەرجێ چاوم چاك بکەیتەوە ئەویش دەڵێ: من کەس چاك ناکەمەوە، هەر خودا نەخۆش چاك دەکاتەوە، بەڵام ئەوەندە هەیە، ئەگەر باوەڕ بهێنی بەخودا منیش لەوداوا دەکەم‌و دەپاڕێمەوەو خودایش چاکت دەکاتەوە•، ئەوسا وەزیر ئیمان دەهێنێ‌و خودا چاکی دەکاتەوە، ئەوجا وەك جاری جاران دەچێتەوە بۆلای پاشاو لەلای دادەنیشێ، پاشا پێی دەڵێ: کێ چاوتی چاك کردەوە؟ دەڵێ: خودا، دەڵێ: بۆ تۆ جگە لە من خودایەکی ترت هەیە؟ وەزیر دەڵێ:خودای من‌و خودای تۆ یەك کەسە کەناوی یەزدانی پاکە، تۆ کەی خودای تۆیش بەندەیەکی قنگ هەڵپچڕاوی وەکوو من! جا پاشا دەیگرێ‌و هەر سزاو ئەشکەنجەی دەدا هەتا ڕاستی لەکوڕەکە دەدا، جا کوڕە فەقێکە دێنن، پاشا پێی دەڵێ: ڕۆڵەکەم! بوویت بە جادووگەرێکی واچاك کە کوێری سکوما چاك دەکەیتەوەو بەڵەك خۆش دەکەیتەوەو ئەمە دەکەیت‌و ئەوە دەکەیت، بەڕاستی گەیشتووی بەپایەیەکی بەرز لەزانستی جادوو گەریدا، ئەویش دەڵێ: من لەخۆمەوە کەس چاك

---

•

| | |
|---|---|
| عليك بالدعاء فالدعاء | لكل دائنا هو الدواء! |
| لكل سقمنا هو الشفاء | لكل سؤلنا هو الحباء |
| وخذ من القرآن ما تشاء | لما تشاء يحصل الرجاء |
| وأعلم إذا تَأخُّرَ العطاء | أختار غيره لك القضاء |

(المترجم)

ناکەمـەوە، هـەر خـودا نـەخۆش چـاك دەکاتـەوە، ئـەوەی لەدەسـت مـن دێ ئەوەندەیە نزا لەخودا دەکەمو لێی دەپاڕێمەوە. جا پادشا ئەویش دەگرێو دەیخاتـە ژێـر ئـازارو ئەشـکەنجەوەو چـەرمە سـەرێی دەدا هـەتا ڕاسـتی لەمامۆستا خواناسەکەی دەدا، ئەوجا سۆفیلکە دێنن، پێی دەڵێن: واز لەم ئایینە بێنە، ئەویش قاییل نابێ، جا پادشا فەرمان دەدا بەشەقە مشار لەتەوقی سەریەوە دەیکەن بەدوو لەتەوە، کەرتەکانی یەکێکیان دەکەوێ بەم دیوداو ئەویتریان دەکەوێ بەودیودا!

ئینجا هاودەمەکەی پادشایشیان هێناو داوایان لەویش کرد کافر ببێتەوە، بەڵام قەبووڵی نەکرد (کە بۆ لالوێچێ خوێن دینی بفرۆشێ) جا پادشا بەدەستی خۆی مشاری دانا لەسەر تەپڵی سەریو کردی بە دوو پارچەوەو پارچەکانی ئەویش کەوتن بەم دیوو ئەو دیودا!.

ئەوجا کوڕە فەقێیان هێناو پێیان گوت: واز لە دینی خۆت بێنە، ئەویش قەبووڵی نەکرد. جا پادشا کوڕەکەی دایە دەستی چەند کەسێ لەدەستو پـای خـۆیو گـوتی: بـڕۆن بیبـەن بۆسـەر لووتکـەی ئـەو کێـوە، ئەگـەر لەئایینەکـەی خـۆی پەشـیمان بـوەوە ئـەوا باشـە، ئـەگینا لـە لووتکـەی کێوەکەوەبیخەنە خوارەوە، جا کاتێ دەیبەنو سەری دەخەنە سەر چیاکە کوڕەکە لەخودا دەپاڕێتەوەو دەڵێ: خودایە! خۆت چۆن بەباشی دەزانی ئاوا ئەمانەم لەکۆڵ بکەرەوە، ئیتر کێوەکە دەکەوێتە لەرزە لەرزو هەموویان لەماهی زەردەکە هەڵدەدێرێنو هەپروون هەپروون دەبنو دەمرنو کوڕە فەقێ بەپێ دەگەڕێتەوە بۆلای پادشا، پادشا پێی دەڵێ: ها دیمانەت بەخێر! هاوڕێکانت کوان چییان بەسەرهات؟ دەڵێ: خودا بۆخۆی چاری کردنو لەکۆڵمی خستن!

ئەمجار پادشا دەیداتە دەست دەستەیەکی تر لەیارانی خۆیو دەڵێ: لە کەشتییەکدا بیبەن هەتا دەیبەنە ناو نێرینەو ناوە ڕاستی دەریا، لەوێ ئەگەر کافر بوەوە ئەوا باشە دەنا تووڕی بدەنە ناو شەپۆلی دەریاکەوە، لەڕێ کوڕەکە دەڵێ: خودایە! خۆت چۆنی بەباش دەزانی ئاوا ئەم نامەردانەم لەکۆڵ

بخەرەوە، ئیتر کەشتییەکە هەڵ دەگەڕێتەوە هەموویان لە ئاوەکەدا دەخنکێن، تەنیا کوڕە فەقێ ڕزگاری دەبێ‌و ڕەپ‌و ڕاست‌و قیت قیت دێتەوە بۆلای پادشا، پادشایش بە قینەوە پێی دەڵێ: ئەوە هاوڕێکانت کوان؟ دەڵێ: خودا چاری کردن‌و لەکۆڵمی خستن، ئەوجا کوڕەکە بە پادشا دەڵێ: ئەگەر دەتەوێ من بکوژیت ئەوا من چیت پێ دەڵێم ئەوە بکە، دەڵێ: ئادەی بڵێ چی بکەم، دەڵێ: لە دەشتێکا هەموو خەڵکەکە گرد بکەرەوەو من بەلقی دارێکا هەڵبواسە تیرێ لە تیردانەکەی خۆم دەربێنەو لەناوماڵی کەوانەکەدا داینێ‌و بڵێ: بەناوی یەزدانی خودای ئەم کوڕە، ئینجا بیهاوێژە بۆم، کاتێ ئەمەت کرد ئەوسا من دەکوژێ، جا پادشا کوڕەکە چی پێگوت کردی، ئینجا گوتی: بەناوی یەزدانی خودای ئەم کوڕە، ئینجا تیرەکەی تێ گرت‌و تیرەکە دای لە لاجانگی‌و کوڕەکە دەستی خۆی نایە سەر شوێنی تیرەکەو مرد!.

ئیتر جەماوەرو عەشاماتەکە کاتێ ئەمەیان چاو پێکەوت گوتیان: باوەڕو ئیمانمان بەخودای ئەم کوڕە هێنا، باوەڕو ئیمانمان بەخودای ئەم کوڕە هێنا، ئەوجا بە پادشایان گوت: ئەوەی کە تۆلێی دەترسای ڕووی داوەو قەوماوە، ئەوەتا ئەو خەڵکە هەموو موسوڵمان بوون! ئیتر پادشا فەرمانی دا خەندەکیان هەڵکەند، لەچواردە ڕێ‌و دەرگای کۆڵانەکاندا خەندەقێکی زۆریان هەڵکەندو ئاگرێکی گەورەیان تیا کردنەوەو فەرمانی دا: کە هەر کەسێ نەگەڕایەوە بۆ سەر دینی پادشا بیخەنە ناو ئەو ئاگرە سوورەوە، جا وایانکرد: تا ژنێ هات منداڵێکی ساوای پێ بوو، لەقەراخ چاڵە ئاگرەکە ئیستێکی کردو گەڕایەوە دواوە نەیویست بچێە ناوی، بەڵام منداڵەکەی هاتە زمان‌و پێی گوت: دایە! بچۆرە ناوی‌و ئارام بگرە لەبەر ئەم بارەداو ددان بەخۆتدا بگرە، چونکە تۆ لە سەرهەق‌و ڕاستیت. (م/ت).

٤٢١٠- وَعَنْهُ قَال: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) إِذَا صَلَّى الْعَصْرَ هَمَسَ - فَسُئِلَ عَنْ ذلِكَ، فقَالَ: «إِنَّ نَبِيًّا مِنَ الأَنْبِيَاءِ كَانَ أُعْجِبَ بِأُمَّتِهِ فَقَالَ مَنْ يَقُومُ لِهَؤُلاَءِ

فَأَوْحَى اللَّهُ إِلَيْهِ أَنْ خَيِّرْهُمْ بَيْنَ أَنْ أَنْتَقِمَ مِنْهُمْ وَبَيْنَ أَنْ أُسَلِّطَ عَلَيْهِمْ عَدُوَّهُمْ فَاخْتَارَ النِّقْمَةَ فَسَلَّطَ عَلَيْهِمُ الْمَوْتَ فَمَاتَ مِنْهُمْ فِي يَوْمٍ سَبْعُونَ أَلْفًا». رواه الترمذي[٣].

**دیسان فەرمووی: ماوەیێ حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) کەنوێژی عەصری دەکرد، پاشا لێوەکانی خۆی دەجوولان وەکوو دووعا بخوێنێ، کە بۆ ئەمە لێیان پرسی، فەرمووی: پێغەمبەرێ (لە پێغەمبەرە پێشینەکان) دەنازێ بە گەلەکەی خۆیەوەو دەیگوت: کێ خۆی لەبەر ئەمانەدا دەگرێ! جا خودا سرووش دەنێرێ بۆی: کە خۆیان بکە بەسەر پشكو خۆیان خاتر خۆ بکە لەبەینی یەکێ لەم دووشتەدا: یا خۆم تۆڵەیان لێ دەسێنم، یا دوژمنی خۆیان زاڵ دەکەم بەسەریاندا، پێغەمبەر بەوە ڕازی بوو کەخودا خۆی تۆڵەیان لێ بسێنێ، خودا قڕیان تێ دەخا، بەتاقە ڕۆژێ حەفتا هەزار کەسیان لێ دەمرێ! (ت-س/ح).**

## ٦٩- سوورەتی طاریق

لم يرد فيها شيء.

## ٧٠- سوورەتی ئەعلا

**(مەکەییە، ٢٩ ئایەتە)**

## سورة الأعلى (مكية، وهي تسع وعشرون آية)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤٢١١- عَنْ الْبَرَاءَ (رضي الله عنه) قَالَ: أَوَّلُ مَنْ قَدِمَ عَلَيْنَا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) مُصْعَبُ بْنُ عُمَيْرٍ وَابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ، فَجَعَلاَ يُقْرِئَانِنَا القرآن ثُمَّ جَاءَ عَمَّارٌ وبلال وسعد ثُمَّ قَدِمَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ فِي عِشْرِينَ ثُمَّ جاء النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم)، فَمَا رَأَيْتُ أَهْلَ الْمَدِينَةِ فَرِحُوا بِشَيْءٍ فَرَحَهُمْ بِرَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، حَتَّى رَأَيْتُ الولائد

---

[٣] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

والصِّبْيَانَ يَقُولُونَ: هذا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَدْ جَاءَ فَمَا جَاءَ حَتَّى قَرَأْتُ (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى) فِي سُوَرٍ مِنَ مثلها. رواه البخاري[1].

بەراء (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: یەکەم کەس لەیارانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە لەمەککەوە کۆچییان کرد بۆلای ئێمە، بۆ مەدینە موصعەبی کوڕی عومەیرو ئیبنو ئوممو مەکتووم بوو، جا دەستیان کرد بە خوێندنی قورئان پێمان، ئینجا عەممارو بیلال‌و سەعدیش هاتن، لەپاشا عومەری کوڕی خەتتاب بەخۆی‌و بیست کەسەوە هات، ئینجا، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) هات، بەچاوی خۆم نەمدیوە کە خەڵکی مەدینە بەهیچ شتێ وەك هاتنی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) شادمان بێن، تەنانەت کەنیزەك‌و منداڵانیش بەچاوی خۆم دەمدین دەیانگوت: ئۆخەی پێغەمبەری خودا تەشریفی هێنا!.

جا هەر کە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) تەشریفی هێنا، ئیتر دەستم کرد بە خوێندنی قورئان هەتا لەلای سوورەتی {سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى} و چەن سوورەتێکی تری لەم چەشنەیەم لەخزمەتیدا لەبەرکرد. (ب- غەریقی ڕەحمەتی خودابێ).

## ٧١- سوورەتی غاشییە

(مەککەییە، ٢٦ ئایەتە)

سورة الغاشية (مكية، وهي ست وعشرون آية)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤٢١٢- ← (ب/٢ ز/٢ ل/١٢ ف/٤).[1]

گێڕانەوەی ئێرە تیرمیزی بەسەنەدێکی صەحیح لەجابیرەوە دەیگێڕێتەوە، لە کۆتاییەکەیدا دەفەرموێ: ئینجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: {إِنَّمَا أَنتَ مُذَكِّرٌ، لَّسْتَ عَلَيْهِم بِمُصَيْطِرٍ} (٨٨/٢١-٢٢).

---

[1] بخاري. تفسير: سورة الأعلى: ٤٩٤١.

[1] تقدم في المجلد الثاني، تسلسل/٢ رقم/٤/١١٨٥.

(غاشـیـیە)و (فـەجر)و (بەلـەد) لەگـەڵ (شـەمس)

(لـەیل)و (ضـوحا)و (شـەرح) (تـین) دەدەن بـە نـەفس

کـــە بـــە تەزکییـــەو بـــەکاری چـــاکە،

کەللـــەت لەڕەشمـــەی شـــەیتان ڕەهاکـــە!!

داد لـــەدەس نەفـــسی پیـــسی نـــەمارەم

گـــۆدو نیفلیجـــی زەهـــری نـــەومارەم!!

وەک (عەلـــەق) نـــووری نـــاودڵمی مـــژی

لەبـــەر بـــێ (قـــەدر)ی ڕووم بـــوو بـــە ڕەژیـــی

## ٧٢- سوورەتی فەجر

(مەکەییە، ٣٠ ئایەتە)

## سورة الفجر (مكية، وهي ثلاثون آية)

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤٢١٣- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رضي الله عنه) أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) سُئِلَ عَنِ الشَّفْعِ وَالْوَتْرِ فَقَالَ «هِيَ الصَّلَاةُ بَعْضُهَا شَفْعٌ وَبَعْضُهَا وَتْرٌ». رواه الترمذي (بسند غريب)[1].

لـە عیمرانـی کـوڕی حوصـەینەوە (خـودای لێ ڕازی بـێ) فـەرمووی: عـەرزی پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەربێ) کـرا: مەبەسـت لـە (الـشفع والـوتر) چـییە لـەم شوێنەدا؟ فەرمووی: مەبەست نوێژە، کەژمارەی ڕکاتەکانی هەندێکیان شەفعە واتە: جووتـەو ژمارەی ڕکاتـەکانی هەندێکی تریـان وەتـرە، واتـە: تاکـە. (ت- سەنەد غەریب).

[1] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

## ٧٣- سورة البلد

لم يرد فيها شيء.

## ٧٤- سورەتی شەمس

(مەكەييە، ١١ ئايەتە)

## سورة الشمس (مكية، وهي أحد عشر آية)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

**٤٢١٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَمْعَةَ** (رضي الله عنه) **أنه سَمِعَ النَّبِيَّ** (صلى الله عليه وسلم) **يَوْمًا يَخْطُبُ وَذَكَرَ النَّاقَةَ وَالَّذِي عَقَرَهَا فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ): **«(إِذِ انْبَعَثَ أَشْقَاهَا) انْبَعَثَ لَهَا رَجُلٌ عَارِمٌ عَزِيزٌ مَنِيعٌ فِي رَهْطِهِ مِثْلُ أَبِي زَمْعَةَ». ثُمَّ سَمِعْتُهُ يَذْكُرُ النِّسَاءَ فَقَالَ «إِلاَمَ يَعْمِدُ أَحَدُكُمْ فَيَجْلِدُ امْرَأَتَهُ جَلْدَ الْعَبْدِ وَلَعَلَّهُ أَنْ يُضَاجِعَهَا مِنْ آخِرِ يَوْمِهِ». قَالَ ثُمَّ وَعَظَهُمْ فِي ضَحِكِهِمْ مِنَ الضَّرْطَةِ فَقَالَ «إِلاَمَ يَضْحَكُ أَحَدُكُمْ مِمَّا يَفْعَلُ»**. رواه الشيخان والترمذي[1].

**عەبدوڵڵای کوڕی زەمعە** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: گوێم لێ بوو پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **خوتبەی دەخوێندەوە، لەوکاتەدا باسی ووشترەکەی ثەموودی کردو نیشانی ئەو پیاوە نەگبەتەی باس کرد، کە ووشترەکەی پەیکردو لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا کە دەفەرموێ: {إِذِ انبَعَثَ أَشْقَاهَا} فەرمووی: ئەم پیاوە چارە ڕەشە بەد بەختەی کە خودا لەم ئایەتەدا ناوی ناوە بەدترین و خراپترین پیاوی ئەو هۆزە لە خودا یاخییە، پیاوێکی بەدەسەڵاتی بەهێز بوو، خاوەن دەسەڵات و کەس و کارو خزمێکی زۆری بوو کە پشتیان دەگرت وەکوو ئەبو زەمعە چۆن لەناو هۆزی قورەیشا خاوەن دەستەڵات و کەس و کارە، ئەویش ئاوا بوو، بەڵام هەتا بڵێی بێ ڕەزاو شەڕانی بوو، بۆیە ڕۆیشتە گیان ووشترەکەی صالح پێغەمبەرو ووشترەکەی پەی کرد، وەحەزرەت باسی ژنانیشی فەرموو، فەرمووی: ئەوە چۆن کارێکە، پیاوی**

---

[1] بخاري. تفسير: ٤٩٤٢.

واتان تیا هەیە خود سەر هەڵ دەکوتێتە سەر ژنەکەی‌و وەك بەندەیەکی پیاو دارکاریی بکا ئاوا ئەو ژنە بەستە زمانە فەلاقە دەکا، دوور نییە کەهەر لەکۆتایی ئەو ڕۆژەیدا دەست بکاتە ملی‌و لەگەڵیا دروست ببێ! ئەوجا لەبارەی ئەوەوە کە بەتڕو تسی یەکتری پێدەکەنن، تەمێ‌و ئامۆژگاری کردن‌و فەرمووی: ئەمە چۆن حاڵێکە شتێ کە خۆشتان دەیکەن ئەگەر لەیەکێکی ترتان ڕوویدات، بۆ پێی پێ دەکەنن، کاری وا مەکەن (ش/ت). ڕەحمەت لەوکەسەی دەڵێ:

ژن گوڵە بۆ دڵ، نەک تۆپی پێ یە
تا ڕێزی بگری زیاتر بەجێ یە
پیاوی خراپیش ڕشک‌و ئەسپێ یە
کەی ئەوە مێردە؟ بەڵکوو هەوێ یە!

## ٧٥- سوورەتی لەیل

(مەککەییە، ٢١ ئایەتە)

## سورة الليل (مكية، وهي إحدى وعشرون آية)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤٢١٥- عَنْ عَلِيّ (رضي الله عنه) قَالَ كُنَّا مع النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) في بقيع الغَرْقَدِ فِي جَنَازَةٍ فَأَخَذَ شَيْئًا فَجَعَلَ يَنْكُتُ بِهِ الأَرْضَ فَقَالَ «مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ وَقَدْ كُتِبَ مَقْعَدُهُ مِنَ النَّارِ وَمَقْعَدُهُ مِنَ الْجَنَّةِ». قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفَلاَ نَتَّكِلُ عَلَى كِتَابِنَا وَنَدَعُ الْعَمَلَ قَالَ «اعْمَلُوا فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ، أَمَّا مَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ السَّعَادَةِ فَيُيَسَّرُ لِعَمَلِ أَهْلِ السَّعَادَةِ، وَأَمَّا مَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الشَّقَاءِ فَيُيَسَّرُ لِعَمَلِ أَهْلِ الشَّقَاوَةِ». ثُمَّ قَرَأَ (فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى * وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى) الآيَةَ. رواه الشيخان والترمذي. نسأل الله التوفيق لليسرى آمين[1].

---

[1] بخاري. جنائز. ١٣٦٢، ٤٩٤٥، ٤٩٤٥م، ٤٩٤٦، ٤٩٤٧، ٤٩٤٨، ٤٩٤٩، ٦٢١٧، ٦٦٠٥، ٧٥٥٢. مسلم. قدر: ٦٦٧٣ - ٦٦٨٠. تجريد البخاري = مختصر صحيح البخاري: ٢ ل/٦٩ رقم/٦٤٦.

**عەلی** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: جارێ لەخزمەتی حەزرەتدا** (دروودی خودای لەسەربێ) **بووین، لە گۆڕستانی بەقیعولغەرقەد، تەرمێکمان بەرێ دەکرد، پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **داردەستێکی بەدەستەوە بوو، خۆش خۆش دەیخشان لەعەردەکە، وەك کەسێ بیر لەشتێ بکاتەوە فەرمووی: یەك بە یەکتان لە ئەزەلدا جێگەی نووسراوە هەم لەبەهەشتداو هەم لەدۆزەخدا. یاران فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خودا! کەوایە بۆ بەو نووسراوەمان پشت نەبەستین و پشتی لێ نەدەینەوەو ئیتر واز لەکارو کردەوەی باش بێنین، ئێمە چی بکەین و چی نەکەین جێگەمان لەوەپێش دیاری کراوە. فەرمووی: ئێوە لەکاری چاکە سارد مەبنەوەو کارو کردەوەی خۆتان بکەن قەدەر سڕێکی خوداییە، هۆش و ئەقڵی ئێوە ئێستا دەرکی حیکمەت و دانایی ئەو نهێنییە ناکات هەرکەسێ لەئەزەلدا لەعیلمی خودادا بۆ کوێ دروست کرابێ ڕێگەی ئەو شوێنە دەگرێ و لەسەر ئەم بنیاتە بەختیار ڕێگەی چاکە دەگرێ و بەدکار ڕێگەی خراپە دەگرێ، بەم پێیە کاری باش نیشانەی بەهەشتەو کاری خراپ نیشانەی دۆزەخە، ئینجا حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **لە بۆ پشتیوانی ئەم مەسەلەیە ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە دەفەرموێ: {فَأَمَّا مَن أَعْطَى وَاتَّقَى، وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى، فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى} (٩٢/٥-٧) واتە: جا هەرکەسێ ماڵی خۆی لەڕێگەی خودادا بداو، زەکات و سەرفترەو بەشی بەشدارانی لێ بداو، لەخودا بترسێ و کۆ لەگوناەو تاوان بکاتەوە، بێ پەروا پەلاماری سەرو ماڵ و نامووسی خەڵکی نەدا، وە لەهەمان کاتدا باوەڕی وابێ کە چاکە چاکەیەو خراپە خراپەیە، ئەوە ئێمەیش کە خودای بەهەقی ئێوەین ئەوکەسە دەخەینە سەر ڕێگەی چاکەو ئامادەی دەکەین بۆ گەیشتن بە پلەی باش کە شادبوونە بە دیداری خودای مەزن و چوونە ناو بەهەشتی بەرینەوە! (ش/ت).**

# ٧٦- سوورەتی ضوحا

(مەککەییە، ١١ ئایەتە)

## سورة الضحى (مكية، وهي أحدى عشر آية)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤٢١٦- عَنْ جُنْدُبَ بْنَ سُفْيَانَ (رضي الله عنه) قَالَ اشْتَكَى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَلَمْ يَقُمْ لَيْلَتَيْنِ أَوْ ثَلاثًا، فَجَاءَتِ امْرَأَةٌ (هِيَ العَوْرَاءُ بِنْتُ حَرْبٍ أُخْتُ أَبِي سُفْيَانَ، زَوْجَةِ أَبِي لَهَبٍ) فَقَالَتْ يَا مُحَمَّدُ إِنِّي لأَرْجُو أَنْ يَكُونَ شَيْطَانُكَ قَدْ تَرَكَكَ، لَمْ أَرَهُ قَرِبَكَ مُنْذُ لَيْلَتَيْنِ أَوْ ثَلاثًا. فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ (وَالضُّحَى * وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَى * مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى). رواه الشيخان (عليهما الرحمة والرضوان)[1].

**جوندوبی کوڕی سوفیان** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (درودی خودای لەسەربێ) **تۆزێ ناساخ بوو، دوو شەو یا سێ شەو هەڵنەسا بۆ شەونوێژ، جا عەورای ژنی ئەبو لەهەبی لەعنەتی هاتە گیانی حەزرەت‌و گوتی: ئەی موحەممەد! دەنگت نییە، ئەمە دوو سێ شەوە نابینم شەیتانەکەت سەرت لێ بدا، ئومێد دەکەم کەوازی لێ هێنابیت. ئیتر خودا ئەمەی نارد: {وَالضُّحَى، وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَى، مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى} (٩٢/١-٣) سوێند بەکاتی چێشتەنگاو کە جوانترین کاتە، وە سوێند بەشەو کەتەواو دەزرنگێتەوەو بەتارای ڕەشی تاریکی خۆی هەموو شت دەپۆشێ‌و کاتی ئەوە دێ ماندوو بحەسێتەوەو هەموو شت ئارام بگرێ، ئەی موحەممەد! خودای تۆ کە تۆی پەروەردە کردووە هەمیشەو هەتا هەتایە وازت لێ نایەنێ‌و دەست بەردارت نابێ، تۆ خۆشەویستی منی، قەت لێت زیزو دڵگیر نابم چجای ئەوەی ڕقم لێت بێ (ش = بوخاری‌و موسلیم).**

---

[1] بخاري. تهجد: ١١٢٥، ٤٩٨٣، ٤٩٥٠، ١١٢٤ = تجريد/١ ل/٥٣٨، رقم: ٥٦٠ مسلم. جهاد. ٤٦٣٢، ٤٦٣٤، ترمذي: تفسير: ٣٣٤٥.

٤٢١٧- وَعَنْهُ قَالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فِي غَارٍ، فَدَمِيَتْ إِصْبَعُهُ، فَقَالَ: النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم):

هَلْ أَنْتِ إِلاَّ إِصْبَعٌ دَمِيتِ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ مَا لَقِيتِ

قَالَ: فَأَبْطَأَ عليه جبريل عليه السلام، فقال المشركون: قد وُدِّعَ محمدٌ، فأنزل الله (مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى). رواه الترمذي ومسلم[٢].

دیسان لەوەوە فەرمووی: لە خزمەتی حەزرەتدا بووم، لە غەزایەکا بووین، لەناو ئەشکەوتێکا پەنجەیەکی حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) زامار بوو، فەرمووی:

هل أنت إلاَّ إِصبعٌ دميت وفي سبيل الله ما لقيت

واتە:

ئەی پەنجە وایە پایەوو شوێنت

لە ڕای خودادا وا ڕژا خوێنت!

جوندوب دەڵێ: ماوەیێ پاش ئەوە جوبرائیل نەهات بۆ خزمەتی حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) جا هاوبەشپەیداکەرەکان گوتیان: دیارە خودا وازی لە موحەممەد هێناوە! ئیتر خودا ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: {مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى} (ت/م).

## ٧٧-سوورەتی شەرح

(مەککەییە، ٨ ئایەتە)

## سورة الشرح (مكية، وهي ثماني آيات)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤٢١٨- قَالَ إبن عباس (رضي الله عنهما) (أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ) أي للإسلام (فَإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا، إِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا) قَالَ ابْنُ عُيَيْنَةَ أَيْ مَعَ ذَلِكَ الْعُسْرِ يُسْرًا آخَرَ كَقَوْلِهِ (هَلْ تَرَبَّصُونَ بِنَا إِلاَّ إِحْدَى الْحُسْنَيَيْنِ) وَلَنْ يَغْلِبَ عُسْرٌ يُسْرَيْنِ. رواه البخاري[١].

---

[٢] بخاري. جهاد. ٢٨٠٢، ٦١٤٦ = تجريد البخاري/٣ ل/٢٨٥ رقم: ١٥٤. مسلم: جهاد: ٤٦٣٠. ترمذي: تفسير. ٣٣٤٥.

لە بارەی ئەم ئایەتەوە: {أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ} واتە: بەرەحمەت و میهرەبانی خۆمان دڵی تۆمان ڕووناك كردەوە. ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: واتە: دڵ و سینگی تۆمان والاكردەوە، بۆ وەرگرتنی ئایینی پاكی ئیسلام، كە بەسینگێكی فراوانەوە بەدڵێكی گوشادەوە قەبووڵی بكەی. لەبارەی ئەم ئایەتەی تریشەوە كە دەفەرموێ: {فَإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا، إِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا} واتە: لە ئێش و ئازاری كافران دڵت سارد نەبێتەوە، دڵنیا بە لەوە ئەگەر خودا لەبەر حیكمەتێ دەروویێ لەبەندەی خۆی بگرێ، بە ڕەحمەتی خۆی لەچەن لای ترەوە دەرووی لێ دەكاتەوە!. ئیبنو عویەینە دەفەرموی: واتە: هەموو تەنگانەیێ دوو خۆشی لەگەڵە. وەك بەپێی ئەم ئایەتە دوو چاكە بۆ موسوڵمان ساخ دەبێتەوە كە دەفەرموێ: {هَلْ تَرَبَّصُونَ بِنَا إِلاَّ إِحْدَى الْحُسْنَيَيْنِ} جا بۆیە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرموویەتی: یەك تەنگانە قەت دەرەقەتی دوو فەرحانە نایێ (بوخاری هەزار ڕەحمەتی لەگۆڕی پیرۆزی خۆی و كەس و كاری بێ).

## ٧٨- سوورەتی تین

(مەكەییە (٨) ئایەتە)

٤٢١٨م- ئەم فەرموودەیە لەتەفسیری سوورەتی قیامەدا رابورد، ئاخرەمین حدیث[1].

## ٧٩- سوورەتی عەلەق (مەككەییە، ٨ ئایەتە)

## سورة العلق (مكية، وهي تسعة عشر آية)

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤٢١٩- عَنْ ابْنُ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) قَالَ: قال أَبُو جَهْلٍ: لَئِنْ رَأَيْتُ مُحَمَّداً يُصَلِّي عِنْدَ الْكَعْبَةِ لأَطَأَنَّ عَلَى عُنُقِهِ. فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ «لَوْ فَعَلَ لأَخَذَتْهُ

---

(١) ذكره البخاري تعليقا في كتاب التفسير، في سورة (ألم نشرح) بعد الرقم: ٤٩٥١.

(١) تقدم في تفسير سورة القيامة، آخر حديث. رقم: ٤١٩٧/٣.

الْمَلاَئِكَةُ عِيَاناً». رواه الشيخان والترمذي ولفظ مسلم: قَالَ أَبُو جَهْلٍ هَلْ يُعَفِّرُ مُحَمَّدٌ وَجْهَهُ بَيْنَ أَظْهُرِكُمْ؟ قَالَ فَقِيلَ نَعَمْ. فَقَالَ وَاللاَّتِ وَالْعُزَّى لَئِنْ رَأَيْتُهُ يَفْعَلُ ذَلِكَ لأَطَأَنَّ عَلَى رَقَبَتِهِ أَوْ لأُعَفِّرَنَّ وَجْهَهُ فِي التُّرَابِ – قَالَ – فَأَتَى رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَهُوَ يُصَلِّي فَمَا فَجِئَهُمْ مِنْهُ إِلاَّ وَهُوَ يَنْكِصُ عَلَى عَقِبَيْهِ وَيَتَّقِي بِيَدَيْهِ فَقِيلَ لَهُ: مَا لَكَ؟ فَقَالَ: إِنَّ بَيْنِي وَبَيْنَهُ لَخَنْدَقًا مِنْ نَارٍ وَهَوْلاً وَأَجْنِحَةً. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) «لَوْ دَنَا مِنِّي لاَخْتَطَفَتْهُ الْمَلاَئِكَةُ عُضْوًا عُضْوًا». فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ (كَلاَّ إِنَّ الإِنْسَانَ لَيَطْغَى أَنْ رَآهُ اسْتَغْنَى إِنَّ إِلَى رَبِّكَ الرُّجْعَى أَرَأَيْتَ الَّذِي يَنْهَى عَبْدًا إِذَا صَلَّى أَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ عَلَى الْهُدَى أَوْ أَمَرَ بِالتَّقْوَى أَرَأَيْتَ إِنْ كَذَّبَ وَتَوَلَّى) (أَلَمْ يَعْلَمْ بِأَنَّ اللَّهَ يَرَى كَلاَّ لَئِنْ لَمْ يَنْتَهِ لَنَسْفَعًا بِالنَّاصِيَةِ نَاصِيَةٍ كَاذِبَةٍ خَاطِئَةٍ فَلْيَدْعُ نَادِيَهُ سَنَدْعُ الزَّبَانِيَةَ كَلاَّ لاَ تُطِعْهُ)(١).

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لەسەر بێ) فەرمووی ئەبو جەهل گوتی: ئەگەر موحەممەد ببینم لەلای کەعبەدا نوێژ بکا پێ دەنێم بەرێسی ملیا لەکاتی سەجدەدا. کەئەم قسەیە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر وابکات فریشتەی خودا بە ئاشکرا بەبێ پەردە دەیگرن (ش/ت) گفتەی موسلیم ئاوایە: ئەبو جەهل گوتی: ئەدی موحەممەد بووە بەو پیاوە کەبە بەرچاوی ئێوەوە بوێرێ بەناوی نوێژکردنەوە لنگەو تلوور بکەوێ، یا لەپەو ڕوو بکەوێو بەناوی سەجدەوە تەوێڵێ لەسەر خاكو خۆڵ دابنێ؟ گوتیان: ئا، وادەکا. گوتی: بەلاتو بە عوززا، ئەگەر ببینم شتی وا بکا بە پێوە لەناو کوڕنووش دا دەچمە سەر بۆتەقەی ملی!! جا جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نوێژی دەکرد لەوکاتەدا ئەبو جەهل چوو بۆگیانی، هەتا دەسدرێژی لێ بکات لەناو نوێژەکەدا، بەڵام خەڵکەکە هەر ئەوەندەیان زانی کە ئەبوجەهل پاشەو پاش کشایەوەو وەك کەسێ شتێ شاڵاوی بۆ هێنابێ بەهەردوو دەست پاسی خۆی دەکا. کە پێیان گوت: ئەوە چیتە بۆ وادەکەیت؟ گوتی: خەندەکێکی پڕ لەئاگرو شتگەلێکی زۆر سامناکو

(١) بخاري. تفسير: سورة العلق: ٤٩٥٨ = تجريد البخاري/٤ ل/٥١٦ رقم: ١٧١٨. مسلم. صفات المنافقين: ٦٩٩٦.

چەند باڵێ، لە غەیبەوە لەبەینی من و لەبەینی ئەودا پەیدا بوون! پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر لێم نزیك ببوایەتەوە بەر لەوەی ئەو دەسدرێژی لەمن بکا فریشتە پەل پەلیان دەکردو پارچە پارچە دەیان فڕاند، ئیتر خودای گەورە ئەمەی نارده خوارەوە: {كَلَّا إِنَّ الْإِنسَانَ لَيَطْغَى، أَن رَّآهُ اسْتَغْنَى}تا ئەوێ کە دەفەرموێ: {كَلَّا لَا تُطِعْهُ}.

٤٢٢٠- وعَنْهُ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) يُصَلِّي فَجَاءَ أَبُو جَهْلٍ فَقَالَ أَلَمْ أَنْهَكَ عَنْ هَذَا أَلَمْ أَنْهَكَ عَنْ هَذَا؟ فَزَبَرَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ أَبُو جَهْلٍ: إِنَّكَ لَتَعْلَمُ مَا بِهَا نَادٍ أَكْثَرُ مِنِّي فَأَنْزَلَ اللَّهُ (فَلْيَدْعُ نَادِيَهُ سَنَدْعُ الزَّبَانِيَةَ) فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ فَوَاللَّهِ لَوْ دَعَا نَادِيَهُ لأَخَذَتْهُ زَبَانِيَةُ اللَّهِ. رواه الترمذي وصحح[٢].

دیسان فەرمووی: جارێ حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) نوێژی دەکرد لەودەمەدا ئەبو جەهل هات گوتی: ئەوە چەن جارم پێ گوتی کە ئەمە مەکە! حەزرەتیش (درودی خودای لەسەربێ) لێی توورە دەبێ پیایدا هەڵ دەشاخێ. ئەبو جەهلیش دەڵێ: خۆت باش دەزانی کەس نییە لەم شارەدا کە دیوەخان و یانەی وەکوو من پڕبێ لە کۆمەڵ و یارو یاوەرو ئاوا خاوەن قۆناخ بێ، جا خودا ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: {فَلْيَدْعُ نَادِيَه، سَنَدْعُ الزَّبَانِيَةَ} دەی با ئەو بانگی کۆمەڵ و هاوڕیکانی خۆی بکاو گازی گوێ لەمشتەکانی خۆی بکا تا یاریدەی بدەن و بێن بە کوتەکی دەستی، ئێمەیش بانگی چەند فریشتەیەکی زەبر بەدەستی بۆ دەکەین خۆیان دەرگاوان و بەر پرسیاری دۆزەخن، جا ئەوسا خۆی دەبینێتەوە کەچەن حاڵی شڕە، کە کەسێ شەڕ لەگەل خودادا بکا شەڕی خۆتڕێن دەکا. ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) فەرمووی: سا بەو یەزدانی پاکە ئەگەر ئەو نامەردە کۆمەڵەی خۆی بانگ بکردایە فریشتە زەبر بەدەستەکانی خودا دەیان قۆستەوەو دەیانگرت و بەرەو دۆزەخ دەیان برد. (ت/ص).

---

[٢] صحيح عند الترمذي.

لە حەببانیە بووم، لە دەوروبەری ساڵی ١٩٥٩ دا حاجییەکی عەرەب کە زۆر مەردو موسوڵمانێکی باش بوو، بازرگانێکی گەورەش بوو گێڕایەوە گوتی: کوڕێکم هەیە مودەڕیسە لە ثانەوی، ئەمە سێ ساڵە نەچاوم پێی کەوتووەو نە دەمەوێ چاوم پێی بکەوێ، تا ئەو لەسەر ئەو فیکرە بێ، چونکە دەڵێ: ئەبو جەهل خۆمانەیە لەسەلمانی فارسی باشترە کە پیاوێکی بێگانەیە. گوتی: بەڵام دەسگیرۆدەیی بوو کەکەم دەکەم هەتا کوڕەزاکانم بێ خزمەت نەبن! بەڵێ جاران وابوو، موسوڵمان لەسەر برای موسوڵمانی حاشای لەکەس و کاری خۆی دەکرد. خودا بە لوطفی خۆی لەگەڵ ئەم حاجییە عەرەبەدا حەشرمان بکا، لەژێر ئالای موحەممەددا، لە خزمەت سەلمانی خۆشەویستا*. وەرگێڕ

١٩٥٩/٥/٢ م.ك.ع

## ٨٠- سوورەتی قەدر

(مەککەییە، ٥ ئایەتە)

## سورة القدر (مكية، وهي خمس آيات)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤٢٢١- عَنْ يُوسُفَ بْنِ سَعْدٍ (رضي الله عنه) قَالَ قَامَ رَجُلٌ إِلَى الْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ (رضي الله عنهما) بَعْدَ مَا بَايَعَ مُعَاوِيَةَ فَقَالَ سَوَّدْتَ وُجُوهَ الْمُؤْمِنِينَ. أَوْ يَا مُسَوِّدَ وُجُوهِ الْمُؤْمِنِينَ. فَقَالَ لاَ تُؤَنِّبْنِي رَحِمَكَ اللَّهُ فَإِنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) أُرِيَ بَنِي أُمَيَّةَ عَلَى مِنْبَرِهِ فَسَاءَهُ

---

* دیارە ئەم زەلامە بەعثی بووە، وەبەچاوی خۆمان دیمان کە حوکمی بەعث چۆن بوو، بەئاشکرا عوروبەیان کرد بوو بەخوا، وەك لاتو عوززاو هوبەل دەیانپەرست، وە بەچاوی خۆمان دیمان کە چۆن حیزبی بەعث بەرشەقی قورئان کەوتنو بوون بە پەندی زەمان، دڵنیام کە بەعثی کوردیش، کە ئێستا ئالای دژە ئیسلامیان هەڵکردووە، بەرشەقی قورئانو لەعنەتی مێژوو دەکەونو ئەم گەلی کوردەش، خوا یاربێ، رۆژ بەرۆژ، خوا زۆرترو باشتر دەرووی رەحمەتی بۆ دەکاتەوە. وەرگێڕ – ٢٠٠٨/٢/٣

ذَلِكَ فَنَزَلَتْ (إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ) يَا مُحَمَّدُ يَعْنِي نَهْرًا فِي الْجَنَّةِ وَنَزَلَتْ (إِنَّا أَنْزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ وَمَا أَدْرَاكَ مَا لَيْلَةُ الْقَدْرِ لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ شَهْرٍ) يَمْلِكُهَا بَعْدَكَ بَنُو أُمَيَّةَ يَا مُحَمَّدُ. قَالَ الْقَاسِمُ فَعَدَدْنَاهَا فَإِذَا هِيَ أَلْفُ يَوْمٍ لاَ يَزِيدُ يَوْمٌ وَلاَ يَنْقُصُ. رواه الترمذي بسند غريب[1].

**یوسفی کوڕی سەعد** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: کە حەسەنی کوڕی عەلی پەیمانی دا بەموعاوییە، پیاوێ هەڵسا بۆی پێی گوت: تۆ ڕووی موسوڵمانانت ڕەش کرد!، یا پێی گوت ئەی ڕووڕەشکەرەی موسوڵمانان! حەسەنیش** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: ڕەحمەتی خودات لێ بێ سەر کۆنەم مەکە، چونکە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **لەخەونا هۆزی بەنی ئومەییە دەبینێ لەسەر مینبەرەکەی حەزرەت خۆی** (دروودی خودای لەسەربێ) **کە خوتبەی لەسەر دەدەن و حوکم دەکەن، پێغەمبەریش** (دروودی خودای لەسەربێ) **ئەمەی زۆر پێناخۆش دەبێ، جا خودا ئەم سوورەتەی بۆ دەنێرێ: {إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ} ئێمە کەوثەرمان داوە بە تۆ واتە: ئەی موحەممەد! ئەو جۆگەو سەرچەشمەیە کەناوی کەوثەرەو وا لە بەهەشتا داومانە بەتۆ، وە ئەمەیش هاتە خوارەوە: {إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ، وَمَا أَدْرَاكَ مَا لَيْلَةُ الْقَدْرِ، لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِّنْ أَلْفِ شَهْرٍ}: بەڕاستی ئێمە قورئانمان ناردە خوارەوە لەشەوی لەیلەتول قەدردا، کە شەوێکی زۆر بەڕێزو گەورەو پیرۆزە تۆ چوزانییت کەشەوی لەیلەتول قەدر چییە، شەوی لەیلەتول قەدر چاکترو گەورەترە لە هەزار مانگ. واتە: ئەی موحەممەد! لەیلەتول قەدر کەخودا داوێتی بەتۆ لەو هەزار مانگە باشترە کە هۆزی بەنی ئومەییە حوکمی تیا دەکەن. قاسم گوتی: کاتێ موددەی دەوڵەتی ئەمەوییەکانمان ژمارد هەزار مانگی تەواو بوو بەبێ زیادو کەم. (ت- بەسەنەدێکی غەریب).**

---

[1] غريب عند الترمذي.

## ٨١- سوورەتی بینە

(مەدینەیە، هەشت ئایەتە)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

ئەم فەرموودەیە لەم باسەدا ڕۆیشت: (فضائل القرآن) باسی (ینبغي استماع القرآن بتدبر وخشوع) بەڵام لێرەدا ئاوایە: ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) بە ئوبەیی کوڕی کەعبی فەرموو: خودا فەرمانی پێ کردووم کە قورئانت لەلا بخوێنم. ئوبەیی فەرمووی: خودا بۆخۆی بەناو هێنان، ناوی منی هێنا بۆتۆ؟ فەرمووی: بەڵێ، فەرمووی: لەکەرەمی خودا بەزیاد بێ گەیشتووم بەپایەیەکی وا کە لەلای پەروەردگاری هەردوو جیهان باسم بکرێو ناوم ببرێ؟ فەرمووی: بەڵێ، جا ئوبەییش لە خۆشیاندا کە حەزرەت بەفەرمانی خودا دەرسی قورئانی لەلا دەخوێنێ ئەشك بەچاوەکانیا هاتە خوارێ! (ش).

## ٨٢- سوورەتی زەلزەلە

(مەدینەییە، هەشت ئایەتە)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤٢٢٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَرَأَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) هَذِهِ الآيَةَ: (يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا) قَالَ «أَتَدْرُونَ مَا أَخْبَارُهَا؟». قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ «فَإِنَّ أَخْبَارَهَا أَنْ تَشْهَدَ عَلَى كُلِّ عَبْدٍ أَوْ أَمَةٍ بِمَا عَمِلَ عَلَى ظَهْرِهَا أَنْ تَقُولَ: عَمِلَ كَذَا وَكَذَا يَوْمَ كَذَا وَكَذَا قَالَ فَهَذِهِ أَخْبَارُهَا». رواه الترمذي[1].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) {يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا}ی خوێندەوەو فەرمووی: دەزانن کەئەو هەواڵو دەنگوباسانەی کەزەوی دەیانگێڕێتەوە چییەو چی نییە! عەرزیان کرد:

[1] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

خوداو پێغەمبەری خودا دەزانن فەرمووی: هەواڵی زەوی ئەمەیە: كەشایەتی ئەدا لەسەر هەموو بەندەیێ (چ پیاو چ ژن) بەوەی كە لەدنیادا كردوویەتی لە سەرپشتی زەوی، دەڵێ: فیسارەكەس لە فیسارە ڕۆژدا لە فیسارە شوێندا فیسارە كردەوەی كردووە (ت-س/ص).

٤٢٢٣- ← (ب/٢ ز/٣ ل/١٦ ف/٦) سُئِلَ عَنْ الحمير فيها زكاة... الخ[٢].

## ٨٣- سوورة العاديات والقارعة

لم يرد شيء في أصولنا.

## ٨٤- سوورەتی تەكاثور

(مەككەییە، هەشت ئایەتە)

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤٢٢٤- عَنْ عبدالله بن الشِّخِّير (رضي الله عنه) أَنَّهُ انْتَهَى إِلَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) وَهُوَ يقرأُ (أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ) قَالَ «يَقُولُ ابْنُ آدَمَ مَالِي مَالِي وَهَلْ لَكَ مِنْ مَالِكَ إِلاَّ مَا تَصَدَّقْتَ فَأَمْضَيْتَ أَوْ أَكَلْتَ فَأَفْنَيْتَ أَوْ لَبِسْتَ فَأَبْلَيْتَ». رواه الترمذي هنا ومسلم في الزهد[١].

لە عەبدوڵڵای كوڕی شەخیرەوە (خودای لێ ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: چوومە خزمەتی حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) خەریك بوو سوورەتی {أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ}ی دەخوێند. فەرمووی: ئادەمیزاد هەر هەڵپەو هاواریەتی بۆ ماڵو دەڵێ: ماڵەكەم واو ماڵەكەم وا! ئایا پێم ناڵێی ئەم ماڵەی تۆ كامەی هی تۆیە، جگە لەوەی كە دەیكەی بەخێرو چاكەو لەپێش خۆتەوە دەینێری بۆ ئەو جیهان، یا دەیخۆی‌و لەناوی دەبەی لەپێش مردنتا، یا لە بەریدەكەیت تا كۆن دەبێ‌و دەدڕێ. (ت/م).

---

[٢] تقدم في المجلد الثاني. تسلسل/٦ رقم: ١٢٠٤/٦ بخاري. تفسير: ٤٩٦٣.

[١] مسلم. زهد: ٧٣٤٦، ٧٣٤٩، ترمذي: زهد: ٢٣٤٢، ٣٣٥٤، نسائي: إحباس: ٣٦١٥.

**٤٢٢٥- عَنْ عَلِيّ** (رضي الله عنـه) **قَالَ مَا زِلْنَا نَشُكُّ فِـي عَـذَابِ الْقَبْـرِ حَتَّـى نَزَلَـتْ (أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ)[٢].**

**عـەلی** (خـودای لێ ڕازی بـێ) **فـەرمووی: لـەبارەی سـزاو عـەزابی نـاو گـۆڕەوە كـە مـردوو لـەناو گـۆڕدا ئـازار دەدرێ یانـا، هەرشـك و گومانمـان هـەبوو، هـەتا سوورەتی {أَلْهَاكُمُ التَّكَـاثُرُ} هاتـە خـوارەوە ئیتر گومانمـان نـەما كەسزای گۆڕ هەیەو ڕاستە. (ت- سەنەد غەریب).**

**٤٢٢٦- عَنْ الزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ** (رضي الله عنه) **قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ (ثُمَّ لَتُسْأَلُنَّ يَوْمَئِـذٍ عَـنِ النَّعِيمِ) قَالَ الزُّبَيْرُ قلت: يَا رَسُولَ اللَّهِ فَأَيُّ النَّعِيمِ نُسْأَلُ عَنْهُ وَإِنَّمَا هُمَا الأَسْوَدَانِ التَّمْـرُ وَالْمَاءُ. قَالَ «أَمَا إِنَّهُ سَيَكُونُ»[٣].**

**زوبەیری كوڕی عەوام** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: كاتـێ {ثُـمَّ لَتُـسْأَلُنَّ يَوْمَئِـذٍ عَنِ النَّعِيمِ}: لە پاشان سوێند دەخۆم لەڕۆژی دوایی دا پرسیارتان لـێ دەكرێ لـەو بـەهرەو نـازو نیعمەتانـە كـە پێتـان دراوە. هاتـە خـوارەوە گـوتم: ئـەی پێغەمبەری خودا! كام نازو نیعمەتەمان لـێ دەپرسنەوە! خۆ ئێمـە خۆراكمـان تەنیا هەر خورماو ئاوە! فەرمووی: ئەدی ئەوە دەبێ هەر ببێ! (ت-س/ح).**

**٤٢٢٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ** (رضي الله عنه) **عَنْ النَّبِيِّ** (صلى الله عليه وسلم) **«إِنَّ أَوَّلَ مَا يُـسْأَلُ عَنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَعْنِي الْعَبْدَ مِنَ النَّعِيمِ أَنْ يُقَالَ لَهُ أَلَمْ نُصِحَّ لَـكَ جِـسْمَكَ وَنُرْوِيـكَ مِـنَ الْمَاءِ الْبَارِدِ». روى الثلاثة الترمذي[٤].**

**ئـەبو هـورەیرە** (خـودای لێ ڕازی بـێ) **فـەرمووی: پێغەمبـەر** (دروودی خـودای لەسـەربێ) **فەرمووی: لە ڕۆژی قیامەتدا یەكەم نیعمەت كە پرسیاری لەبەنـدە لـێ دەكرێ ئەوەیە پێی دەگوترێ: ئایا لەشی ساخ و تەندروستی باشمـان نـەدابوو پێـت و لە ئاوی سارد تێراومان نەكردیت؟ (ت- بەسەنەدێكی غەریب).**

---

[٢] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

[٣] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[٤] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

## ٨٥- سوورەتی عەصرو سوورەتی هومەزەو سوورەتی فیلو سوورەتی قورەیشو سوورەتی ماعوون،

لم يرد فيهن شيء في أصولنا.

## ٨٦- سوورەتی کەوثەر

(مەککەییە، ٣ ئایەتە)

## سورة الكوثر (مكية، وهي ثلاث آيات)

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤٢٢٨- عَنْ أَنَسٍ (رضي الله عنه) أن النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: لَمَّا عُرِجَ بِالنَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) إِلَى السَّمَاءِ قَالَ «أَتَيْتُ عَلَى نَهَرٍ حَافَتَاهُ قِبَابُ اللُّؤْلُؤِ مُجَوَّفًا فَقُلْتُ مَا هَذَا يَا جِبْرِيلُ؟ قَالَ: هَذَا الْكَوْثَرُ». رواه البخاري والترمذي[1].

**ئەنەس** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درووودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: کاتێ چووم بۆ میعراج بۆ ئاسمان، چوومە سەر ڕوبارێ هەردوو قەراخەکەی گومەزی مرواری هڵۆڵ بوو، جا گوتم: ئەی جوبرائیل! ئەمە چییە؟ فەرمووی: ئەمە حەوزی کەوثەرە (ب/ت).**

٤٢٢٩- وسُئِلَتْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) عَنْ قَوْلِهِ تَعَالَى (إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ) قَالَتْ نَهَرٌ أُعْطِيَهُ نَبِيُّكُمْ (صلى الله عليه وسلم) شَاطِئَاهُ عَلَيْهِ دُرٌّ مُجَوَّفٌ آنِيَتُهُ كَعَدَدِ النُّجُومِ. رواه البخاري[2].

**لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە: {إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ} لە عائیشەیان پرسی کەوثەر چییە؟ فەرمووی: کەوثەر چۆمێکە دراوە بە پێغەمبەری ئێوە** (درووودی خودای لەسەربێ) **هەردوو کەنارەکەی مرواری هولۆڵە وەك ژمارەی ئەستێرەی ئاسمان ئاوا زۆرو بێ شومار حاجەتو جامی خواردنەوەی لەسەرە! (ب) لەشەرحەکەدا دەفەرموێ: ئیمامی موسلیم لەئەنەسەوە**

---

[1] بخاري. سورة الكوثر: ٤٩٦٤.

[2] بخاري. سورة الكوثر: ٤٩٦٥.

دەگێڕێتەوە: دەفەرموێ: جارێ لەخزمەتی پێغەمبەردا بووین (دروودی خودای لەسەربێ) حەزرەت وەکوو خەو بیباتەوە ئاوا حاڵەتی سرووش گرتی، کاتێ سەری هەڵبڕی زەردەخەنەیەکی کرد، عەرزمان کرد: قوربان! خێرە وا پێدەکەنی؟ فەرمووی: سوورەتێکم بۆهات ئینجا ئەمەی خوێندەوە: {بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ، فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ، إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ الْأَبْتَرُ} لەپاشا فەرمووشی: ئایا دەزانن کەوثەر چییە؟ گوتمان: خوداو پێغەمبەری خودا خۆیان باشتر دەزانن، فەرمووی: ئەوە چۆمێکە لەبەهەشتا خودا دەیدا بەمن، خێرو بێرێکی زۆر زۆری لەسەرە.

٤٢٣٠- عَنْ أَنَسٍ (رضي الله عنه) عَنْ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: «بَيْنَا أَنَا أَسِيرُ فِي الْجَنَّةِ إِذْ عَرَضَ لِي نَهْرٌ حَافَّتَاهُ قِبَابُ اللُّؤْلُؤِ. قُلْتُ لِلْمَلَكِ مَا هَذَا؟ قَالَ: هَذَا الْكَوْثَرُ الَّذِي أَعْطَاكَهُ اللَّهُ قَالَ ثُمَّ ضَرَبَ بِيَدِهِ إِلَى طِينَةٍ فَاسْتَخْرَجَ مِسْكًا ثُمَّ رُفِعَتْ لِي سِدْرَةُ الْمُنْتَهَى فَرَأَيْتُ عِنْدَهَا نُورًا عَظِيمًا». رواه الترمذي وأبو داود[٣].

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کاتێ لە بەهەشتا دەسووڕامەوە، لەپڕ ڕووبارێکم لێ دەرکەوت ئەم بەرو بەرەکەی گومەزی مرواری بوو، بە فریشتەکەم گوت ئەمە چییە؟ فەرمووی: ئەمە ئەو کانیو سەرچاوەی کەوثەرەیە کە خودا داوێتی بەتۆ، ئینجا فریشتەکە دەستی برد بۆ قوڕولیتەی بنەکەی، لەباتی قوڕ میسکی دەرهێنا! ئینجا درەختی سیدرەتولمونتەهام نیشان درا، لەلایدا نوورو ڕووناکییەکی فرەمەزنو گەورەم بەچاوی خۆم دی!. (ت-س/ص-د).

٤٢٣١- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنهما) عَنْ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم)قَالَ: «الْكَوْثَرُ نَهْرٌ فِي الْجَنَّةِ حَافَّتَاهُ مِنْ ذَهَبٍ وَمَجْرَاهُ عَلَى الدُّرِّ وَالْيَاقُوتِ تُرْبَتُهُ أَطْيَبُ مِنَ الْمِسْكِ وَمَاؤُهُ أَحْلَى مِنَ الْعَسَلِ وَأَبْيَضُ مِنَ الثَّلْجِ». رواه الترمذي بسند صحيح[٤].

---

[٣] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[٤] حديث صحيح عند الترمذي.

**ئیبنـو عومـەر** (خودایـان لێ ڕازی بێ) **فـەرمووی: حـەزرەت** (درودی خـودای لەسـەربێ) **دەفەرموێ: کەوثەر جۆگەیەکە لە بەهەشتدا، قەراخەکەی لەهەر دوولاوە لە زێڕە، وەناو جۆگەکەو تەختی بنەکەی لەدوڕو یاقووتەو بۆنی زەوییەکەی لە بۆنی میسك خۆشترەو ئاوەکەی لەهەنگوین شیرینترەو لەبەفر سپیترە (ت-س/ص).**

## ٨٧- سوره الكافرون

**لم يرد فيها شيء.**

## ٨٨- سوورەتی نەصر

**(مەدینەییە، ٣ ئایەتە)**

**سورة النصر (مدنية، وهي ثلاث آيات)**

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

**٤٢٣٢- ← (ب/١ ز/٨٣ ل/٢٧٢ ف/٤)**[1].

**لێرەدا ئەم زیادەیەی هەیە: يتأول القرآن. زیادەکە واتە: عائیشە** (خودای لێ ڕازی بێ) **دەیفـەرموو: واتـە: پێغەمبـەر** (درودی خـودای لەسـەربێ) **کەلـەناو ڕوکـوع و سوجدەدا بە زۆری دەیفەرموو: (سبحانك اللهم ربنا وبحمدك اللهم إغفر لي) مەبەستی ئەوەبوو عەمەل و ڕەفتاری بەمەعنای ئەم ئایەتەی قورئان دەکرد کە دەفەرموێ: {فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُ كَانَ تَوَّابًا} (١١٠/٣) واتە: کاتێ بەچاوی خۆت دیت کەوا ئایینی ئیسلام سەرکەوت و نیشانەی گەورەیی ئەوەهاتەدی کە گرتنی شاری مەککەیەو ئەو خەڵکە پۆل پۆل و کۆمەڵ کۆمەڵ دێنە سەر دینی ئیسلام، کە تاقە دینی خودایە لەم چەرخەی تۆ بەدواوە، کاتێ ئەمە بوو تۆش نوێژ بۆ خودای خۆت بکەو تەسبیح و حەمدو ئیستیغفاری تیا بکە چونکە بەڕاستی خودا بەزۆری تەوبەو پەشیمانی گیرا دەکا (ش).**

---

[1] تقدم برقم: ٥٢٠/٤، مجلد أول، تسلسل/٨٣.

٤٢٣٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) قَالَ كَانَ عُمَرُ يُدْخِلُنِي مَعَ أَشْيَاخِ بَدْرٍ، فَكَأَنَّ بَعْضَهُمْ وَجَدَ فِي نَفْسِهِ فَقَالَ لِمَ تُدْخِلُ هَذَا مَعَنَا وَلَنَا أَبْنَاءٌ مِثْلُهُ فَقَالَ عُمَرُ إِنَّهُ مِنْ حَيْثُ عَلِمْتُمْ. فَدَعَا ذَاتَ يَوْمٍ - فَأَدْخَلَهُ مَعَهُمْ - فَمَا رُئِيتُ أَنَّهُ دَعَانِي يَوْمَئِذٍ إِلاَّ لِيُرِيَهُمْ. قَالَ مَا تَقُولُونَ فِي قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى (إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ) فَقَالَ بَعْضُهُمْ أُمِرْنَا نَحْمَدُ اللَّهَ وَنَسْتَغْفِرُهُ، إِذَا نُصِرْنَا وَفُتِحَ عَلَيْنَا. وَسَكَتَ بَعْضُهُمْ فَلَمْ يَقُلْ شَيْئًا فَقَالَ لِي أَكَذَاكَ تَقُولُ يَا ابْنَ عَبَّاسٍ؟ فَقُلْتُ لاَ. قَالَ فَمَا تَقُولُ قُلْتُ هُوَ أَجَلُ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَعْلَمَهُ لَهُ، قَالَ (إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ) وَذَلِكَ عَلاَمَةُ أَجَلِكَ (فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُ كَانَ تَوَّابًا). فَقَالَ عُمَرُ مَا أَعْلَمُ مِنْهَا إِلاَّ مَا تَقُولُ. رواه البخاري وأحمد وزاد (على ماهو في شرح التاج) فكيف تلومونني على حب ماترون[٢].

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئیمامی عومەر منی لەناو ڕیزی پیرانی بەدردا دادەنا، وا دیار بوو هەندێکیان لەدڵەوە لەمە زیز بوون، وەك بڵێن: ئێمە کوڕمان لە سێرەی ئەودایە، کەوایە بۆچی دێتە ناو کۆڕی ئێمەوە؟ عومەریش دەیبیستێتەوەو دەفەرموێ: ڕاستە وەکوو ئێوە دەڵێن بەساڵ منداڵەو لە سێرەی منداڵی ئێوەدایە وەلێ وەك خۆتان دەزانن زمانێکی زۆر گۆیاو دڵێکی زۆر ڕووناکو ووریای هەیە. جا ڕۆژێ عومەر بانگی کردمو لەناو کۆڕی ئەواندا دایناm، خۆم زانیم کەئەو ڕۆژە بۆ ئەوە بانگی کردووم تا پایەو لێهاتوویی منیان نیشان بدا. بۆیە فەرمووی پێیان: لەبارەی مەعناو مەبەستی ئەم ئایەتەوە ئێوە دەڵێن چی کە دەفەرموێ: {إِذَا جَاء نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ} جا هەندێکیان گوتیان: مانای وایە فەرمانمان پێ کراوە هەرکاتێ خودا یارمەتی داینو لەسایەی خۆیەوە سەری خستینو وڵاتمان گرت: سوپاسو ستایشی بکەینو داوای لێخۆشبوونی لێ بکەین، بازێکیشیان بێ دەنگ بوونو هیچ قسەیان نەکرد، ئەوجا عومەر بەمنی فەرموو: ئیبنو عەبباس! تۆ دەڵێی چی، ئایا تۆیش هەروا دەڵێی؟ منیش گوتم: نەخەیر،

---

[٢] بخاري. تفسير: سورة النصر: ٤٩٧.

فەرمووی: ئەی تۆ دەڵێی چی؟ گوتم: من دەڵێم ئەم سوورەتە باسی هاتنی ئاکامی حەزرەت دەکاو نیشانەی نزیکبوونەوەی مەرگێتیی و خودا لەسەر ئەم شێوەیە ئاگاداری کردۆتەوەو فەرموویەتی: {إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ}: کاتێ دینی خودا سەرکەوت و نیشانەی هەرەگەورەی ئەوە هاتەدی کە گرتنی شاری مەککەی پیرۆزە، ئیتر بزانە ئەی موحەممەد! کەئەوە نیشانەی هاتنی ئاکامی تۆیە، چونکە تۆیش وەکوو پێغەمبەرەکانی پێش خۆت کەئەرکی سەرشانی خۆت بە جێهێناو پەیامی خۆت بەئەنجام گەیاند ئیتر دەبێ پیاڵەی مەرگ بچێژی، کەواتە لەم ئاخرو ئۆخری تەمەنی پیرۆزەتا: {فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُ كَانَ تَوَّابًا} (٣/١١٠) تا دەتوانی سوپاس و ستایشی خودای خۆت بکەو داوای لێ خۆشبوونی لێ بکە، هەم بۆ خۆت هەم بۆ موسوڵمانان، دڵنیاش بە کەخودا لەگەڵ بەندەی گەڕاوەی خۆی، کە پەشیمان بێ لە تاوانی خۆی زۆر بەلوتف و کەرەمەو تەوبەو پەشیمانی لێ گیرا دەکا! عومەریش خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: منیش لەم قسانەی کە ئێوە کردتان بەس ئەم مەعنایەی تۆم بەدڵە ئەی ئیبنو عەبباس (ب/ت/ئە = ئیمامی بوخاری، ئیمامی تیرمیزی، ئیمامی ئەحمەد. خودا لەهەموویان ڕازی بێ و ئێمەی گوناهباریش لە خاکوپای ئەم مەردانەدا پەنا بدا).

## ٨٩- سوورەتی مەسەد

(مەککەییە، ٥ ئایەتە)

## سورة المسد (مكية، وهي خمس آيات)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤٢٣٤- قَالَ ابن عبَّاسٍ (رضي الله عنهما): لَمَّا نزلت (وأنذر عشيرتك الأقربين) ورهطك منهم المخلصين[1].

---

[1] بخاري. وصايا: ٢٧٥٣، ٤٧٧١، مسلم: إيمان: ٥٠٣.

لە سوورەتی شوعەرادا ڕابورد، فەرموودەی سێیەم، لێرەدا بەم شێوەیە یە: ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) فەرمووی: کاتێ: {وَأَنـذِرْ عَـشِيرَتَكَ الْـأَقْرَبِينَ} هاتە خوارەوە، کە ئەوکاتە بەم قیرائەتەیش دەخوێندرایەوە: وَأَنـذِرْ عَـشِيرَتَكَ الْـأَقْرَبِينَ. ورهطَكَ مـنهم المخلـصين: حـەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) ڕۆیـشت لەسـەر تەپۆڵکەی صـەفا ڕاوەسـتاو بەدەنگی بەرز فـەرمووی: هـەی هـاوار! هـەی هـاوار! فریاکـەون خەڵکەکـەش دابـارین بەسـەریاو لـەدەوری کۆبوونـەوەو گوتیـان: ئـەوە چـیتە؟ حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فـەرمووی: ئـەرێ پـێم بڵـێن ئەگـەر ئێـستا پێتـان بڵـێم کەوا لەشکری دوژمن لەداوێنی ئەم گردەوە لە کلکەی ئەم شاخەوە پەیدا دەبێو دەدا بەسەرتاندا ئایا باوەڕم پـێ دەکەن یانا؟ گوتیان: بەڵێ باوەڕت پـێ دەکەین چونکە تا ئێستا درۆمان لەتۆ نەدیوە! فەرمووی: دەسا چاوتان بکەنەوەو خاسو خراپـی خۆتـان بـزانن مـن خـودا کردوومـی بـە ترسێنەر بۆ ئێـوە، تـا ئاگادارتـان بکەمەوە ئەگەر لەفەرمانی من دەربچنو بەگوێی من نەکەن ئەوا بەزوویی لەگەڵ تۆڵەیەکی سەختو سزایەکی زۆر توندا ڕوو بەڕوو دەبنەوە، ئیتر کـەیفی خۆتانـە! ئەبو لەهەبیش کەڕووی لەبەر سووری دەتگوت سکڵی سوورە، وەخۆشـی هـەروا بـوو چـونکە ڕووی لەئـەنجاما بـوو بـە پـشکۆی سـووری نـاو دۆزەخ ئـەو نامـەردە گـوتی: تَبّـاً لـك مـا جمعتنـا الا لهـذا: هـەی لەناوچیت ئـا بـۆ ئـەم قسەیە ئێمـەت کۆکردۆتەوە، گوتمان دەبێ چی بێ!

دوای ئـەوە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەربێ) تەشـریفی هەڵـساو ڕۆیـشت ئەوجا سوورەتی {تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ} لە زەمو خوسپی ئەو سەگە پیسەدا هاتە خوارەوە (ش/ت).

٤٢٣٥- ورأى العبَّاس (رضي الله عنه) في النَّوم أبا لهبٍ بعد موته في أسوإ حال، فَقَالَ لَهُ: مَاذا لقَيتُ؟ قَالَ: لَمْ ألق بَعْدَكُمْ خيراً غَير أَلَّتِي سُقيت في هذه وأشار إلى النُّقرة الَّتِي تحت إبهامه بِإعتاق ثُويبة (الَّتِي أرضعت النَّبيَّ (صلى الله عليه وسلم)). رواه البخاري في الرضاع والنكاح[٢].

---

[٢] بخاري. نكاح: ٥١٠١، ٥١٠٦، ٥١٠٧، ٥١٢٣، ٥٣٧٢.

جـارێ عەبباسـی مامـەی پێغەمبـەر (دروودی خـودا لەسـەر پێغەمبـەرو ڕەزای خوداش لەو بێ) ئەبو لەهەبی برای: لەپاش مردنی، لەخەونـدا، لـەبارو دۆخێکی زۆر خراپـدا دەبینـێ، پێـی دەڵـێ: حاڵـت چۆن بـوو؟ دەڵـێ: ئـەوەتی لەئێوە دابڕاوم ئیتر تووشـی خێـرو خۆشـی نـەبووم، ئینجا ئیشارەت دەکا بۆ ئەو چاڵە بچکۆلەی کەوا لە نێوانی پەنجەکەڵەو پەنجەی دۆشاو مژەداو دەڵێ: وەلـێ تەنیا پڕ ئەم چاڵاییە لە ناو دۆزەخدا ئاویان داوە پێمو بەو تنۆکە ئاوە لێـوم تـەڕکردووە، ئـەویش بـەهۆی ئـەوەوە کەلەجیهانـدا ثـوویبـەی دایـەنی پێغەمبەرم ئازاد کردووە! (ب— ڕەزای خوای لێبێ).

## ٩٠- سوورەتی ئیخلاص

### (مەککەییە، چوار ئایەتە یا پێنج ئایەتە)

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤٢٣٦– عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ (رضي الله عنه) أَنَّ الْمُشْرِكِينَ قَالُوا لِرَسُول اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم) انْسُبْ لَنَا رَبَّكَ. فَأَنْزَلَ اللّٰهُ (قُلْ هُوَ اللّٰهُ أَحَدٌ اللّٰهُ الصَّمَدُ) فَالصَّمَدُ الَّذِى لَـمْ يَلِـدْ وَلَمْ يُولَدْ لأَنَّهُ لَيْسَ شَىْءٌ يُولَدُ إِلاَّ سَيَمُوتُ وَلَيْسَ شَىْءٌ يَمُوتُ إِلاَّ سَيُورَثُ وَإِنَّ اللّٰهَ عَـزَّ وَجَلَّ لاَ يَمُوتُ وَلاَ يُورَثُ (وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ) قَالَ «لَمْ يَكُـنْ لَـهُ شَـبِيهٌ وَلاَ عِـدْلٌ وَلَيْسَ كَمِثْلِهِ شَىْءٌ». رواه الترمذي بسند لاطعن فيه[1].

ئوبـەیی کـوڕی کـەعب (خـودای لێ ڕازی بـێ) فـەرمووی: هاوبەشـپەیداکەرەکان گوتیان بەحەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) ڕەسـەنو بنەچـەی خـودای خۆتمـان بۆ هەڵدە، کێیەو کێ نییەو چییەو لەچی دروست کراوە. جا خـودای مـەزن ئـەم سوورەتە پیرۆزەی ناردە خـوارەوە: {قُلْ هُوَ اللّٰهُ أَحَدٌ، اللّٰهُ الـصَّمَدُ، لَـمْ يَلِـدْ وَلَـمْ يُولَدْ، وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ} (١١٢/١–٤) واتە: ئەی پێغەمبەری نازدار! تـۆ لـە وەڵامی پرسیاری ئەو کافرانەدا بڵـێ: ئـەو زاتـە نـاوی ئەڵڵایـە، نـاوی یەزدانـە،

[1] رواه الترمذي بسند غير مطعون فيه.

خودایەکی تاكو تەنیایە، خودایەکە جێی هیواو نیازو ئومێدە، کەسی لێ نەبووەو لەکەس نەبووەو کەس هاوتای نییە. فەرمووی: صەمەد ئەوەیە کەسی لێ نەبووەو لەکەس نەبووە، نە منداڵو خێزانی هەیەو نەدایكو باوك، چونکە ئەوەی کە لەدایك دەبێ دەشێ بشمرێ، وە ئەوەیشی کە بمرێ دەبێ کەلەپوورو میراتی دابەش بکرێ بەسەر ئەمو ئەودا خودای بالادەستو شکۆمەندیش نە دەمرێو نە موڵکی بەمیراتی وەردەگیرێ. فەرمووی: {وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ} واتە: خودایەکی بێ مانەندو بێ چوونەو هاوچەشنو هاوتای نییەو هیچ شتێ لەوێنەی نییەو کەس وێنەی ئەو نیە لەخوایەتیو پەروەردگاریی دا (ت).

٤٢٣٧- ← لەپێشەوە ڕابوورد، لەسەر باسی (ماورد في سورة البقرة)دا. فەرموودەی دەیەم. هەروەها لەتەفسیری سوورەتی مەریەم دا، فەرموودەی: (قال اللّٰهُ تَعَالَى: شتمني ابن آدم)الخ[٢].

یادگارێکی منداڵیم هەیە، لەبارەی {قُلْ هُوَ اللّٰهُ} وە، کە لەبەینی منو خەڵکی دێکەمانا رووی داوە، کەوەختی خۆی بەعەرەبی لە یادداشتی خۆما، کەناوم ناوە (الذكريات صَدَى السنين الحاكى) تۆمارم کردووە، خودا یاربێ ئەم یادگارە لەپاش سوورەتی (ناس)ەوە بەبێ دەسکاری دەنووسم، بە ئومێدی دوعای خێر بۆ هەمووﻻیێ، چونکە بەڕاستی ئەم کتێبە پیرۆزە جێگەی خرۆشانی دەریای ڕەحمەتی خودایە. هەروەك داستانی ئەم یادگارە بەڵگەیەکی تری ڕۆشنە لەسەر حویبو خۆشەویستیو ئیخلاصو دڵسۆزی ئەم گەلێ کوردی موسوڵمانە بۆ قورئانی پیرۆز، خودا پەنای بدا لەپەنای دا وەکی تریش هەتا دۆستو دوژمن زۆرباش بزانن کەئەم گەلێ کوردە چەندە خودا پەرستنو قورئان دۆستنو ئەم دینی موحەممەدەیان تا چی ڕادەیێ بەدەمو دەست گرتووە، تا بۆیان ڕۆشن ببێتەوە ئەو تانەو تەشەرەو تانووتو

[٢] تقدم في مجلد أول تسلسل/٢ ل/٥١ ط/١ رقم/٥. المجلد السادس. تسلسل/٤ برقم: ٢٥٨٣/١٠.

توانجانەی کەداخ لەدڵەکان، لە کۆن و نۆدا لەدژی ئەم گەلە باشە بڵاوی دەکەنەوە، کە گوایە گەلێکی سەرکەشی چەتوونی خودا نەناسە هەمووی درۆو دەلەسەو بوختان و غەیبەتە.

## ٩١- سوورەتی فەلەق

(مەکەییە، ٥ ئایەتە)

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

٤٢٣٨- عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) نَظَرَ إِلَى الْقَمَرِ فَقَالَ «يَا عَائِشَةُ اسْتَعِيذِي بِاللَّهِ مِنْ شَرِّ هَذَا فَإِنَّ هَـذَا الْغَاسِـقُ إِذَا وَقَـبَ». رواه الترمذي بسند صحيح[1].

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) تەماشای مانگی کردو فەرمووی: ئەی عائیشە! پەنا بگرە بەخودا لەوەی و شەڕی ئەمەو بڵێ: أعوذ بالله من شر هذا: پەنا دەگرم بەخودای گەورە لەشەڕی ئەم مانگە. چونکە ئەمە ئەو (غاسق)ەیە کە خودا لەبارەیەوە دەفەرموێ: {وَمِن شَـرِّ غَاسِـقٍ إِذَا وَقَـبَ}: وەلەشەڕی تاریکە شەو کاتێ کەشەو دەزرنگێتەوە، بەتایبەتی لەشەڕی مانگ کەلەکەناری ئاسمان وون بوو. (ت-س/ص).

## ٩٢- سوورەتی ناس

لم يرد في تفسيره شيء، نسأل الله الستر الجميل والتوفيق الكامل آمين.

ئەمەش ئەو یادگارەیە کە عەرزی ئێوەی ئازیزم کرد لەبەر ئەوەی لە شەستەکانا تۆمارم کردووە بەعەرەبی، ئێستا بەبێ دەستکاری وەهەر بەعەرەبی دەینووسمەوە. لە خودا داوا دەکەم کە مەبەست لێی ڕەزای خودابێ حیکایەتەکەو حیوارو گوفتوگۆ کە بەمەعنا ریوایەت کراوە، ڕەنگ بێ

---

[1] صحيح عند الترمذي.

ئەوانـەی کـە ئاگایـان لـە ئوسـلوب و شـێوازی قورئـانی پـیرۆز فـەرموودەی حـەزرەت نـەبێ، کـە چـۆن بەڕسـتەی ڕەسـاو جوملـەی پـڕ لـە بەلاغـەت و فەصـاحەت، قـسەو گوفتوگـۆی ژن و منـاڵ و پیـاوی نەخوێنـدەوارو ئـاژەڵ و دڕندەو جانەوەرو مەل و مۆریان گێراوەتەوە، ڕەنگ بێ ئەو نەشارەزایانەی کە ئاگایـان لەمـە نییـە، خـود سـەر بڵـێن: ئـای لـەم هاشـەو هووشـەیە. بفـەرموون خـودا لـەقورئانی پـیرۆزدا، بـەچ بەلاغـەت و فەصـاحەت و جوانکـاری و ڕەوانبێژییەك قسەی مێروولەیێ دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێ: {قَالَتْ نَمْلَةٌ يَا أَيُّهَا النَّمْلُ ادْخُلُوا مَسَاكِنَكُمْ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَانُ وَجُنُودُهُ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ*} (٢٧/١٨)

---

* پـەراوێزێ لەسـەر ڕێـرەوی دێرینـی خۆمـان: شـێخی بـەیضاوی (خـودای لێ ڕازی بـێ) لێـرەدا دەفـەرموێ: (كأنها لما رأتهم متوجهين الى الوادي فرت عنهم مخافة حطمهم فتبعها غيرها، فصاحت صيحة نبهت بها ما بحضرتها من النمال فتبعها غيرها، فشبه ذلك بمخاطبة العقلاء ومناصحتهم ولذلك أجروا مجراهم، مع انه لا يمتنع أن خلق الله سبحانه وتعالى فيها العقل والنطق!). بەنـدە لەفەرمایشتەکەی شێخی گەورەم بۆنی ئەم درکاندنەی لـێ دەکەم: تەماشاکەن ئەوەی مێروولەکە کردوویەتی جووڵەو ڤیژەیێ بووە لەسەر ئەم شێوەیە، کەچی خودا چەن بە بەلیغی و فەصیحی تەعبیری لە (ما في الضمير) ئـەم مێروولەیـەی داوەتـەوە! وە کردوویـەتی بـە قسەو وەری گێڕاوەتە سەر زمانی ئـادەمیزادو کردوویـەتی بـە عـەرەبی و داینـاوە لـەناو کـەلامی قەدیمی خۆی دا! کە موسڵمان تا ڕۆژی قیامەت دەوری دەکەنەوەو نوێژی پـێ دەکـەن و دەیکـەن بە سەرمەشق و بەمایەی خێرو پیت و بەهرەو پاداشی باش!!...تاد.

ئیتر ئەو مێروولەیە نە عەرەبی زانیوەو نەزمانی هەبووەو نە ئاگای لەیاسای زمانـەوانی بـووەو نە نوونی تەوکیـدی ثـەقیلـەی بیـستووەو نـە بوختیـانی زۆرو ستـەمی بـۆ سلێمان کـردووە، وە نـەئاگای لـە عیـصمەتی پێغەمبـەران بـووە!؟ بـەڵێ کەسـێ سـەرنجی استـنباطات و اسـتخراجاتی موحـەددیثـەکانمـان بـدا، کـە چـۆن لەزەردەیـەکی حـەزرەت، یـا لەسـەر جـووڵانێکی، یـا لەنیشارەتێکی، یا لە گۆڕانی ڕەنگی، یا لە خامۆشی و بێ دەنگی ئەو، چـەندەها حـوکم و بڕیـاری شەرعیان لـێ وەرگرتووە، ئەوسا باش دەزانێ کە موفەسیرەکانمان (ڕەزای خودا لەهەموویان بێ) زۆرباش لەم لایەنەوە لە موحەددیثەکان بە جیماون، بە تایبەتی لە شێخی بوخاری و لە شێخی

هەروەها نەقڵو ڕوایەت لە پەپوو سلێمانکەوە دەکاو دەفەرموێ: {فَقَالَ أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِ وَجِئْتُكَ مِن سَبَإٍ بِنَبَإٍ يَقِينٍ} (٢٢/٢٧) هەروەها نەقڵی قسەی فیرعەون و نەمروودو ژنەکەی لووت لە قورئانی پیرزدا دەکا، لەگەڵ ئەوەی ئەمانە عەرەب نەبوون و ئەعجەمی بوون و لەوانەیە یەك ووشە عەرەبییان نەزانیبێ، کەچی خودا بە عەرەبییەکی فەصیح قسەو گوفتوگۆیان دەگێڕێتەوە. بگرە لە حەدیثدا هەیە کە پێغەمبەران قسەو گوفتوگۆیان لەگەڵ دارو بەرد کردووەو قسەی ئەو دارو بەردەش زۆر بەجوانی و بەڕێزەوە لەناو کتێبە عومدەکاندا نەقڵو ڕیوایەت کراوەو کەسیش تا ئێستا نەیگوتووە خودا بەو هەموو گەورەییەوە چۆن قسەی پیرەژنێ یا مێرووڵەیێ دەگێڕێتەوە. مەبەستم لەم قسەیە ئەوەیە کە دین بەحرەو ژیان دەریایەکی بێ پەیە، جا ئەگەر هەر کەسەمان بەپێی تەواناى خۆی لە سێبەری دین دا خزمەتی ژین بکا، وە هەروەها بە پێچەوانەوە ئەوە کارێکی گەلێ پیرۆز دەکا، وە مەرج نییە هەموو شتێکی کۆن بەپیرۆز دابنێین و هەموو شتێکی تازەیش بە فیسق و فوجوورو بەقسەی هیچ و پووچ!.

زۆر سەیرە! گەلێکمان شانازی بەوەوە دەکا کەهیندی کچی عوتبە، یا ژنەکەی لووت، یا ژنەکەی ئەبو لەهەب، لەفلانە وەختا واو وای گوتووە، وە وا دەڵێ! کەچی پێی عەیب و شوورەیيە کە قسەیەکی ژنێکی کوردی مەردی موسوڵمانی پاك بگێڕێتەوە!

گوایە ئەم جۆرە کتێبانە شوێنی قسەی ئەو جۆرە کەسانە نییە، بەڵام با من عەرزتان بکەم: مەبەست لە کتێب و ئامۆژگاری ئایینی ئەوەیە، کە وەك

---

موسلیم، وە زوربەی ڕووپەڕەی تەفسیرەکانیان بەرەددو بەدەلو گێرەو کێشەی ناو خۆیانەوە پڕ کردۆتەوە. چەند جوان و شیرینە ئەم فەرمایشتەی شێخی بەیزاوی کەلە داستانەکەی سولەیمان و پەپوو سلێمانکەدا دەفەرموێ: (و لعل في عجائب قدرة الله وما خص به خاصة عباده أشياء أعظم من ذلك يستكبرها من يعرفها ويستنكرها من ينكرها).

المترجم (نوری فارس) - ١٩٩٠/٥/٢٤

بارانێکی ڕەحمەت عەقیدەو بیرو باوەڕێکی ڕەسای ساغی ڕێك‌و پێکی جوان لە مەزرای دڵ‌و دەروونی موسولْماندا بڕوێنێ، هەتا بەرە بەرە، بەو فەرمایشتە دڵ لاوێنانە موسوڵمان دڵ دابێنێ‌و دڵی نەرم ببێ، هەم لە خودا بترسێ‌و ڕێزی شەریعەتەکەی بگرێ‌و هەم ڕەحم بە مەخلووقی خودای گەورە بکا، هەر لەبەر ئەوەیە هەتا لەنامە پیرۆزە ئاسمانییەکاندا هەندێ داستان‌و باس‌و خواسی گەورەو بچووك‌و هەمە جۆر هەیە، وەك باسی گیایێ، حاڵەتی بەردێ، ڕەگ‌و ڕیشەی دارێ، گێڕانەوەی قسەی هەنگێ، یا مێروولەیێ، یا وەصفی لانەی جاڵجاڵۆکەیێ، یا داستانی سەیر سەیری پێشینان کە تێهەڵکێش کراوە لەگەڵ بازێ کارەساتا یا لەگەڵ بازێ رووداوی تردا، کە بەدیمەن پەیوەندی بەباتەکەوە نییە جا لەم ڕوانگەوە زاناکان دەفەرموون: لە ڕیوایەتی هەقایەت‌و ڕەقائیق‌و ئەوشتانەی کەدەبن بەهۆی نەرمبوون‌و ئارامبوون‌و هێمنی دڵ‌و دەروون، دروستە کە تەساهول‌و چاوپۆشی بکرێ، وەلەتاجی پیرۆزدا کەمێ لەم ڕەقائیق‌و شتانەی تیادا ڕەچاو دەکرێ، وە ئەوەیش قەیدی نییە.

دیسان هەر لەم ڕوانگەوەیە کە بەندەیش دەمەوێ لێرەو لەوێ ناو بەناو، لەناو ئەم کتێبە پیرۆزەدا بیدەم بەگوێی خوێنەری کوردی ئازیزدا کەئەم جۆرە شتانە لەدین دا دروستە. من خۆم دەزانم مەبەستم لەبەرگری‌و دیفاع لەگەلی کوردی سەرتۆپ موسوڵمان ڕەزای خودایەو سوودو بەرژەوەندی گەلی ئیسلامە، نەك تەعەصصوب‌و ڕەگەزپەرستی، چونکە ئەم گەلی کوردە گەلێکی ستەم لێکراوە، بگرە خۆیشمان کە مەلاین‌و پێشەوای ئایینی ئەو میللەتەین هەر ناڕەوایی لێ دەکەین‌و ددانی خێری پیادا نانێین.

بۆیە بەندە ئەم قسانە عەرزی ئێوەی بەڕێزی بەرزی ئازیز دەکەم، چونکە دەزانم خەڵکەکە گلەییمان زۆر لێ دەکەن، بەتایبەت خوێندەوارەکانیان، دەڵێن: گوایە مەلاکان هەر دەڵێن: کوردە نەگبەتەکە لەبەر ئەوەی عەرەبی نازانێ، هەر چۆنێ بێ، بەهەر شرم پرمێ بووە دەبێ ئێمە دینەکەی

فێربکەین و لەمارو دوپشکی ئاگری دۆزەخ ڕزگاری بکەین، هەتا لەو دنیاش وەك ئەم دنیا لە دۆزەخ دا نەژی!.

ئیتر دەربەستی هیچی تری میللەتی کورد نین، هەرچەند ئەم قسەیە وانییە، بەڵام وەك گوتراوە (تا نەبوەد چیزێ نەگۆیەند چیزێ). بفەرموون ئەمەش یادگارەکەمە بەڵام لەبەر ئەوەی خۆی زۆر درێژە، لەوێوە دەست پێدەکەم کە مامۆستا مەلا موحەممەدی تاڵ لەپاش ماوەیێ برایماوە بەجێ دێڵێ و واز لە مەلایەتی دێنێ و دەچێتەوە بۆ بنگردی لای ئاڵیشەو دەست دەکا بە کەسابەت، ئەم مامۆستا مەلا موحەممەدی تاڵە یەکەم مامۆستام بوو، وەلەلای ئەو دەستم کردووە بە ئەلفوبێ:

عاد الشيخ الى قريته الأولى، وانصرف إلى العمل الحر والكسابة، بعد ان جرب كثيرا من إمامة القرى وبان له: (عزوف العامة عن أهل العلم، و إقبالهم المزري وتهافتهم المشين على زخارف الدنيا الزائفة وحطامها الفاني) وقال في هذا المعنى مشمئزاً:

(عندما لا يماشي العالم العوام في عاداتهم المرزولة ولا يداريهم في دنياهم على حساب دينه، يكون غريبا عنهم وهم غرباء عليه، ثم الويل كل الويل للعالم الذي لا يجاري السلطان في جوره، ولا يداري العامة في رزائلهم، فعند ئذ (أي عندما يكون سواءً العالم في العادات المرزولة والعامي) يعتبرونه مثل أحدهم، وحق لهم ذلك، ثم يستغنون عنه كلية وينفرون منه ويخشونه تقية ولا يجلونه لعلمه ولكونه إمام هديهم، حتى إذا ذكرهم بشيء من أمور الدين ذكروه، بمخالفاته هو، و عندئذ تغدو الموعظة نوعا من تبادل التنابز واللجاجة! إن المجتمع بحر متلاطم والعالم سفينة فإذا كثر الخرق فيها غرقت وابتلعتها لجة المياه).

ظلَّ الشيخ محمد التال هناك في قريته الأولى إلى ان توفّاه اللّٰهُ تَعَالَى، فألف أَلْفِ رحمةٍ وتحيةٍ وسلامٍ على روحه الطّاهرة وعلى أرواح شيوخنا ومشايخنا وأساتذتنا كلّهم أجمعين، وطُوبي لتُربٍ يُواري رفاتهم الطّاهر. ومنهم الشيخ المّلا علي إمام قرية سەرزەل، والشيخ الملاّ عبدالله إمام قرية تەنگی سەر، والشيخ الملاّ محمد سعيد إمام قرية هەرگێنە، والشيخ الملاّ محمد الكاني رۆشنایی، والملاّ صالح الكاني جناري. والشيخ الملاّ عبد القادر

العربتي، والشيخ الملاّ الشيخ عبد العزيز الپارەزانى، الرَّجل التقي الصَّالح الورع الولي، والأستاذ الشيخ الملاّ أسعد المحوي، والشيخ الملاّ عبدالله الچرستاني، والشيخ الملاّ محمد سعيد الخوَمخانه، والشيخ الملاّ عناية، والشيخ الملاّ عبدالرحيم الپرخى، والأستاذ الإمام الشيخ عبدالكريم المدرس المشهور بالبيارة، والشيخ محمد الخال، والشيخ الملاّ عبدالرحمن الكوّلْ، والشيخ محمد القرەداغى الخطيب، والشيخ الملاّ مصطفى الزلمي، والشيخ محمود الحفيد وشقيقه الشيخ عبدالقادر وابنه الشيخ لطيف، والشيخ الملاّ محمد الديّگەلّى، والشيخ الملاّ محمد القەلاّسورەيى، والشيخ المُلاّ عمر الهاشةزينى، إنَّ هؤلاءِ هم شُيُوخي (أو أغلبُهُم) قرأت عليهم قليلاً أو كثيراً، وعندما كنت صغيراً أوكبيراً (ولقد نصصت على أسمائهم الشَّريفة في هذا الكتاب المبارك الميمون وفاءً لِحَقِهم عليَّ، لأنهم علّموني وربُّوني ومهّدوا لي لهذا العمل الجليل المبارك، ألا وهو قيامي بخدمة التاج الجامع للأصول في أحاديث الرسول (صلى الله عليه وسلم)، لعلَّ المُسلمين يذكرونهم بخيرٍ ويترضُّون ويترحّمون عليهم، إنَّالتأدب بأدب القرآن العظيم، الذي هو دستور الأدب الخالد إلى أبدالآبدين، والتخلّق بِخُلُقِ النبيِّ الكريم الذي نعته ربُّه بقوله الحكيم: وإنَّك لعلى خُلُقٍ عظيمٍ إنَّ التأدب والتخلّق بهذين الأصلين الأساسين لِرشدان المسلمين إلى فقه حكمة ربِّنا في فهم مرمى ومغزى قوله الكريم: {بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ. كهيعص، ذِكْرُ رَحْمَةِ رَبِّكَ عَبْدَهُ زَكَرِيَّا} و قوله الكريم: {وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ مَرْيَمَ}).

أيَتُها الثخبة الطيبة، منكم من قضى نحبه ومنكم من ينتظر، بحق و صدق كنتم قدوة أمة الهدى وعينها وسمعها ويدها ورجلها، فجزاكم الله عنا خير الجزاء مع سائر العلماء والصالحين، رضوان اله تعالى عليكم وعليهم أجمعين:

**ذكر اكموا نور على نورٍ على نور النجوم والشموس قد علا**

ومع انتقال الشيخ التال من قرية (برايماوه) تنفس نوري الصعداء وظن: (أن الخلاص من ربقة العبودية المتمثلة في الإلتزام بآداب الدراسة الدينية، ومن الويلات التي تفرضها عليه مراسيم القراءة وعرف الطلاب، ظن أن الخلاص من كل هذا كان قاب قوسين أو أدنى!).

وحلم باستعادة حريته المغصوبة، وهمهم مع نفسه بصوت مسموع: بعد قليل سأعود إِلى صفوف زملائي من أطفال القرية، وأترك مجالس العلم وأهله، مثل بلبلٍ تمزق قفصه وعاد إِلى أحضان أسراب البلابل المرحة المغرِّدة في مروجها الخضراء وبين زهورها الزاهية، فسأخوض معهم ما يخوضونه، سألعب الكرة وأزاول الألعاب، بكلِّ حريةٍ من دون خشية ورقيب، وأطارد القطط والكلاب والفراشات وغيرها من حشراتي الجميلة حتى أعيى، وألهو وامرح وأفرح مع زملائي، ولا ريب أنّني سَأَبُزُّهُمْ جميعاً... آه! وا فرحتاه! حينئذ فقط سأنجو من تعنيف أهلي وتأديب شيخي وتأنيب ضميري وهُزءِ الناس وهمزهم ولمزهم إِلى الأبد، ما أشدَّ وقع ألسنتهم الحداد في نفسي، كأنه السُّمُّ الساري في الدم الجاري، حتى يصل إِلى سويداء القلب فيصيبه بالعوار والدوار، إنه حتى أقراني بدأوا يَلْمِزُونَ اليَّ وشرعوا يذكرونني بمركزي الدينيّ، ويدعون ان فعالي تتنافى مع أقوالي، إن كلا يحاسبونني، هذا يقول مستنكرا: (يا تالي القرآن كيف تأكل جوز الرهان؟!) وذاك يقول متهما: (إن الشيوخ لهم اليد الطولي في تحليل الحرام بالحيل!) وآخر يقول متوسلا وساخرا: (أستحلفك بكتبك أن لا تغش في اللعب والقمار! ضع كرتك في محلها الأول!) ومنهم من يقول: (مرحبا بالشيخ اللاعب أَوِ اللاهي!).

وفي نشوة هذا الحلم اللذيذ جعل يغني هذه الأغنية: عدت يا يوم حريتي! صن هذا العيد يارب من العين والحسد! بيد أن هذه الأمنية الغالية التي تحققت بغتة بعد طول انتظار قد تبخرت فجأة أيضا، وبدا كأنه أفعى أبتر في جلد سمكة او سم في الدسم وذلك حسب رأيه، لا في نفس الأمر والواقع.

فلقد دَعَاهُ وَالِدُهُ ذات يوم وأخرجه من حلبة اللعبة وأعاده إِلى يقظته المرة بالأمر الحازم التالي: أتذكر أم تتغابى أنني قد حظرت عليك اللعب إلا قليلا في أيام الجمع؟ ولا ريب أنك مخطيء جدا إذا حسبت ان كل شيء جاء مع الشيخ التال وذهب معه.

فاعلم أَنَّهُ لو صفرت الأرض من العلماء والشيوخ سأنقلك إِلى البحار، إِلى أعالي السماء، على اجنحة الريح، وسأرغمك على المواظَبَةِ على الدراسة، مَهْمَا كلف الثمن، وسوف لن أرتاح حتى أراك شيخا تعلو هامته عمامة بيضاء! فعندئذ تقر والدتك عينا في

قبرها، لقد كانت تحلم ان تسمعك من وراء التراب والثرى تقرأ سورة ياسين وَسُوَرَ القرآن الكريم على روحها في مثواها الأخير.

هذه هي خطتي، فسأقوم بتنفيذها بكل دقة مادام النفس يتردد في صدري وصدرك فهل فهمت؟

هيِّء نفسك غدا سأذهب بك إلى الشيخ علي في قرية (سەرزەل) المجاورة، فتكون طالبا عنده منذ الغَدِ. ثم قال: (يا بنيَّ! لست أروم إلاَّ مصلحتك وسوف تتأكد من ذلك). وفي الليل قال مراضيا له: تعال يا بني هات كراتك نلعب الكرة قبيل النوم، لأن الغد عطلة. فلعبا شوطا او شوطين، وغلب الإبن أباه، وسرَّهما ذلك لِأَنَّ نجاح الإبن من نجاح الأب، وضحك نوري كثيرا من جهل أبيه باللعبة وأخذ يعلمه بعضا من مباديء الدعبل وآدابها وقوانينها فقال الوالد والبهجة تملأ فؤاده:

(شكرا لك يا ولدي فهل لك أن تعلمني بدلا من ذلك حفظ آية الكرسي؟ ولكن الآن اصغ لي حتى أقرأ عليك الفاتحة، لأتأكد من صحة حفظي لها، فبدأ يقرأ بصورة صحيحة، حتى أوقفه قول نوري: (ليست –إِيَّاك نعبُد... إِيَّاك نستعين) يا أبي بل قل: (إِيَّاك نعبُد وإِيَّاك نستعين) فقبله الأب وطبع على فمه قبلة ود وشكر وضمه إلى صدره وربت على ظهره ثم قال: صحيح هو قولك ورب الكعبة، إذ صحَّح لي الشيخ التال هذه الكلمة وقبله الشيخ يوسف، تماما كما تقول. ولكني الآن (بعد ان سبق بها لساني) لحنت بها لأختبرك شكرا لك يا رب إنني أكاد أصعق من الفرح، وحق لي ذلك لأن ابني تحت توجيهي قد دخل في طور خدمة القرآن الكريم هذا الكتاب الكريم الذي يفديه كل كردي بدمه وماله. ثم خر ساجدا لله وقبل الأرض بإخلاص بعد السجدة عليها.

وأثناء هذا الكلام قد حضر العم الحاج عبدالرحيم، الذي كان آنذاك هو الحاج الوحيد في القرية، فطلب هو الآخر من نوري ان يستمع لتلاوته لسورتي الفاتحة والإخلاص وآية الكرسي، فحدثت اثناء الاستماع هذه اللطيفة المليحَةُ التالية نسجلها للطافتها اولا ولبيان اهتمام الكرد بشؤون دينهم ومدى إخلاصهم وحبهم إلى حد العشق والهيام للقرآن المجيد، أجارهم الله في جواره على الإِيمان والأمان وعلى الإسلام والسلام. آمين.

قال نوري وهو يصحح القراءة للحاج التالي في زعمه:

(ليست (ولم يكن له) يقصد بالإِدغام، يا عمي الحاج! بل قل: ولم يكن له! يقصد بإظهار النون والنطق بالنون قبل اللام).

فتعجب العم الحاج وقال مفندا: (كلا يا بني! فلقد صححت قراءتي عند كثير من الشيوخ ولم أسمع من أحدهم ما تقول ولا أدع ما أخذته من أفواه الشيوخ الكبار بقول صبي غر مثلك، ما ندري هل حفظ ام نسي!!).

وأصرَّ كل على قوله وتأيد له رأيه بأمور يعلمها، هو، ويجهلها صاحبه المنكر، فأثيرت المسألة بين المصلين في المسجد في الغد، فاجتمعت كلمة القوم كلهم على: أن ما يقوله الحاج هو الصحيح، خاصة بعد أن طمأنهم العم القادر، الذي أصبح فيما بعد هو الآخر العم الحاج قادر، والذي كان المرجع الديني الأعلى الوحيد في القرية بعد مغادرة إمامها لها، وذلك بحكم اختلاطه المستمر بالعلماء ومجالسهم ولولعه الشديد بالشؤون الدينية، رغم كونه أُمِّيّاً مثلهم، ولكن كان يتميز عنهم بالإِلْمَامِ يالأذان والإقامة وبغسل أموات القرية حسبة لله تعالى، وكان مثله الصالح المحتسب موجودا في أغلب القرى الكردية قديما.

وعارض أنور بشدة، وضحك من كل قلبه من إجماعهم على الخطأ، ثم أحضر بسرعة مصحفا كريما من مصاحف المسجد التي تمتليء بها مع مقارنها مساجد الكرد فأراهم سورة الإخلاص، حتى يثبت لهم أنه يتكلم من موقع الصدق والصواب، وقال (وهو يحسب أن العلوم الإثنتي عشرة كلها ملأ أعطافه:

(أنظروا هنا، هاهي النون أظهر من هلال رمضان وأشد تقوسا من حاجب ليلى! بل من حواجبكم التي تعلو عيونكم التي تبصرون بها، ففيم العناد إذن!).

وكان العم فارس (الذي هو الآخر أصبح العم الحاج فارس فيما بعد) يراقب الموقف بانتباه وسرور ممزوج بالقلق ها هو ابنه يجادل قومه بوحده، فكانه كان يقول في نفسه: وقى الله ابني من صدمة الفشل في معركته هذه وَأَعَاذَهُ من العين والحسد لدى التأكد من الانتصار عليهم ودعا الله ان يقي ابنه وقومه كل مكروه.

والقوم من جانبهم ضحكوا ايضا ملأ أفواههم وسخروا من تخطئة صبي غرٍّ لما تلقوه من (شيوخ أعلام) وبالطبع جهلوا كليةً علاقة (أية علامة) بين النون وبين حاجب ليلى وبينهما وبين هلال رمضان.

فاضطروا لهول الحادثة التي من جملة أخطارها الإخلال بالصلاة التي يحافظ عليها الكردي أشد من حفاظه على روحه ودمه، فيقولون في مدح احدهم:

فلان يضحي برأسه ولا يضحي بصلاته فاضطروا تحت وقعة هذا الهول أن يرسلوا وفدا مع الصبي إلى الشيخ الملا علي، إمام قرية سەرزەل المجاورة للتحكيم بينهم بعد ان تراهنوا على حفلة عشاء يقيمها الخاسر.

وعند عرض المسألة أجاب الشيخ علي: (كلا الأمرين صحيح!) ثم أضاف: (وقول المصلين أفضل) ثم طمأن الطرفين قائلا: صدق رسول الله (صلى الله تعالى عليه وسلم) إذ قال اختلاف أمتي رحمة، وهذا من هذا، يا بني أمة الرحمة!

ثم حاول تفهيم الطرفين شيئا من قواعد التجويد التي هي أساس القراءات والفارق المميز بين كلام الله وكلام عباده، حتى يستيقن المسلم ان القرآن كله بحروفه وصفاتها وكيفية النطق بها وإخراجها من مخارجها وبكلماته وحروفها مع مراعاة الوصل والوقف ورؤوس الآي، كل ذلك وحي منزل وقرآن مجيد، يخص النص العربي ولا يتعداه إلى سواه من اللغة المترجم اليها، فلذا ردد على مَسَامِعِهِمْ البيت الذي يعالج الموضوع، كمن يصف ألوان القوس والقزح السبع للأكمه، فقال وهو يجود البيت نفسه:

وادَّغمن حتماً ليرملون لاغُنَّة مع (رل) بها يمون

ولكن أنّى لهم، وهم هم، فهم هذه الأشياء الدقيقة.

ثم استفتوا: أيها الشيخ الموقر لقد تراهنّا على هذا الأمر بكفالة والد نوري لإبنه، فهل رهاننا صحيح ام لا؟ ولمن الرهان الآن؟ فأفتى: نعم، الرهان في مثل هذه الأمور الخيرية ليست من القمار في شيء ولذا يكون صحيحا، وحيث أن قول الطرفين المُتَرَاهِنَيْنِ مصيب على أحد الوجهين فَلاَ يستحق الرهان احد، وشرط الفقهاء المجوزون للرهان شروطا ليس هنا مكان لبحثها.

ثم هنَّأ انور على هذه الضجة التي أثارها، ودعا لـه بـالتوفيق وشـكر للقـوم هـذه العناية الفائقة بمثل هذه المسائل الدينية الدقيقة وقال: (قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم) خيركم من تعلم القرآن وعلّمه). وهذا من صميم تعلّم القـرآن وتعليمـه، هنيئـاً لكـم، زادكم الله حرصاً على خير دينكم).

وحيث إن العم حَارساً كان ضِمْنَ الوفد فقد قدم ابنـه أنـور للـشيخ علـي بـصفة تلميذ جديد له، فرحب الشيخ بذلك بل عده بادرة طيبة لبسط نفوذه الديني في القريـة (وأنور ابن حارس هو الاسم المستعار في القصة الاساس لنوري بن فارس، للتغطية علـى بعض الهنيهات الواردة فيها).

وذاع خبر هذه المسألة النونية وما رافقهـا مـن الجـدال والنقـاش في القريـة حتـى أرِّخت بها تلك السنة بينهم وعرفت لديهم بسنة (لم يكن له) أو سميت: بالـسنة النونيـة النورية! مثلما يؤرخ اهل القرى الأعوام بالاحداث الجسام التي تقع فيها وتواكبها.

ولوحظ على الصبـي في طريق العَوْدَة: أنه كان يزاحم رئيس الوفـد علـى تـصدر الطريق! وأنه كان يحس بزهو عظيم لم يحس بمثله إلاّ في مثل اللحظات التي قـضاها بـين يدي الشيخ محمود الحفيد، الزعيم الكردي، عندا مـر بقـريتهم فقـرأ عليـه درس يومـه وتكرر نفس الشيء مع شقيقه وابنه الحفيدين!.

قياما بمراسيم الشكر والوفاء للرسول الكريم سيدنا محمد (صلى الله عليه وسلم) وبيانـا لفضل علماء الكرد وسبقهم في خدمـة الإسـلام العظـيم، ووفـاء ودعـاء خـير لـشعبنا الكردي المسلم الذي أنجبهم، وبأمر من السيد عبـدالرحيم المولـوي القائـل: (هيمـەت طەلـەبکە لـەرۆحانییان، أي فأطلب المدد من روحانيات الأوليـاء والـصلحاء). وتفنيـدا لزعم الغافلين عن شذى الأنفاس القدسية وأريج روائح الألطاف الرحمانية. ورجما للقوى الشيطانية وعند تبييض هذا الكتاب المبارك أقول هنا:

ماذا على من زار قبر المصطفى

أن يلثم الثرى بنية الشفا

وما على الذي بجاه من صفا

لسقمه وسؤله قد اشتفى

ما مات من في الله مات بل رحل

من دارنا، لدار حقّه انتقل!

فالسَّلَفُ الصَّالح هم خير الأمل

للخلف الصَّالح، قل ذا بالمثل!

لا تسمعن دعوى من الحسود:

(من مات فات)تي من الجحود

ولا على الكرد من الحقود

ذي طعنةٌ في أمَّة السُّجُود!

فَأُمَّتي مشربُهُم محمَّدي

طوبي لهُمْ، فبهداهم اقتد،

فخري بكوني مسلماً وكُردي

بدين احمد الأمين أهتدي!

......................

تەفسیر تەواو بوو، خوا حافیزی بێ

دوشمنی، دوشمن لە پاریزی بێ!

رونیاو ئەمثال واهاتن بەخێر

هێنایان بەخێر کۆڵێ خێرو بێر!

گەر باش تێبینی دەزانی لالە!

ئەم ژینە خەوەو دینیش ئەمثالە

با بۆت بەیانکەم ئەوەی کەماوە

تا لەو پێڕستەی کە خۆم دامناوە:

لەپاش (بینە) کە حەزرەت بەدەرس

خوێندوویە لەلای نوبەییەی ئەوڕەس

ئەم سوورەتانە بەریز دێن هەتا

دەبن بە چاردەو سەد دەبن کۆتا!!

(زەلزەلە) سوورەی ئەوەدو نۆیە

(عادیــــات) ســـەدە بـــە ڕەنگـــو بۆیـــە
(قاریعــە) لــەپێش (تــەکاثــور) دەڵێــی:
خــەڵکی ئــەم (عەصــرە) دەپلیــشێن بــەپێی
(هۆمــەزە)ش دەڵــێ: خەڵکــە بەقــەد (فیــل)
گــەورەش بــن مــردن دەتــان کــا بــەدیل!
(قــورەیش)و (مــاعوون) (کــەوثــەری) حــەزرەت
واتـــە (کـــافرون) دوورن لـــە ڕەحمـــەت
(نەصــر)و (مەســەد)و (ئــیخلاص)و (فەلــەق)
دەفــەرموون بــە (نــاس) رووبکەنــە حــەق!
پێڕســـــتەکەی مــــن تـــەواو تـــەواوە
گـــەر کـــەمیی هـــەبوو دیـــارە کرتـــاوە
شـەش سـەدو شەسـتو شـەشو شـەش هـەزار
ئایەتـــە، قورئـــان لەســـەر هـــەتا خـــوار
وشەکانیـــشی حـــەفتاو شـــەش هـــەزار
ووشـەن، لەگـەڵ چـل، لەگـەڵ سـەد لەچـوار
ســێ ســەد هــەزارو بیــستو ســێ هــەزار
شـەش سـەدو حـەفتاو یـەک پیتـی ئـازار
ژمــــارەی پیتـــــی قورئـــــانی فـــەڕدار
بـەبێ زیـادو کـەم، لەسـەر هـەتا خـوار!!
سـەدو بیـست حیزبـە سـیی جزمـەی قورئـان
خەتمـــەیش خوێندنیـــە لەســـەر تـــا پایـــان
بـــەدڵ بیخوێنـــە بـــەدەنگێکی خـــۆش
لەسـەر مـردووو گـۆڕ، یـا لەسـەر نـەخۆش
یـــا خـــۆت بەتـــەنیا، یـــا لـــەناو کـــۆڕا
دەبـــێ بـــە چـــرای ڕۆشـــن لـــە گـــۆڕا!!
کاکـــە! بـــەخودا کاتێکـــت زانـــی:
کـــوتو پـــڕ لـــەناو گـــۆڕا میـــوانی!

دیارە میوانی یەکێ لە دوانی:
میوانی قورئان، یا هی شەیتانی!

کەواتە برا ڕوو لە خودا کە
دڵت لە کۆتی دنیا ڕەهاکە!

بەگەنجی مەستی، بە پیری سستی!
کەواتە خودا کەی دەپەرستی!

با بەس بێ نووری، بۆ کەسێ کەسە
ئەگەر خوا حەزکا ئەلفێکی بەسە

ئێستا کەزانیم باوکم بۆ جاران
لەپاش نوێژ دەیگوت وەک دەنکی باران:

شەش سەدو شەستو شەش و شەش هەزار
صەڵاوات لەدیار ڕەسوولی نازدار!*

بەقەد دارو بەرد، بەقەد گەڵای دار
سوپاس بۆ خودا، نەک جارێ سەدجار!

دڵێ بەتیشکی قورئان پتەوبێ
سەرتاپا نوقمی پەندو پۆرتەوبێ

خەواڵوونەبێ چاوی لەخەوبێ
خانەی سینەمان جۆڵانەی ئەوبێ!

فێنکو ڕۆشن، بۆ خێر بەدەوبێ
هەر بەهەشت وابێ نەرۆژ نەشەوبێ

---

* قازی شێخ موحەممەدی خاڵ (ڕەحمەتی خودای لەسەر بێ) لەسەرەتای تەفسیری خاڵدا لەبەرگی یەکەم دا دەفەرموێ: وە هەندێکی ئایەتو ووتەو پیتەکانیان ژمارد دووە، کە ئایەتەکانی (٦٦٦٦)ووتەکانی (٧٦٤٤٠)و پیتەکانی (٣٢٣٦٧١) دەرچووە. وەرگێڕ—نوری فارس
١٩٩٠/٥/٢٦ — م.ك.ع



# نامەی خەونو پەندو وێنە هێنانەوە

(چوار بەشو دوا ووتارێکە)

## ١) بەشی یەکەم: باسی بەشەکانی خەونو خەو بینین، کەسێ خەون دەبینێ چی بڵێ باشە:

## كتاب الرؤيا والأمثال. وفيه فصول اربعة وخاتمة

**٤٢٣٩- عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: رُؤْيَا الْمُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ. رَوَاهُ الأربعة[1]:**

**عوبادەی کوڕی صامیت (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: خەونی موسوڵمان یەك بەشە لە چلو شەش بەش لە پێغەمبەرایەتی. (ش/د/ت).**

**٤٢٤٠- عَنْ أنسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِنَّ الرِّسَالَةَ وَالنُّبُوَّةَ قَدِ انْقَطَعَتْ فَلاَ رَسُولَ بَعْدِي وَلاَ نَبِيَّ، قَالَ: فَشَقَّ ذَلِكَ عَلَى النَّاسِ، فَقَالَ: لَكِنِ الْمُبَشِّرَاتُ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا الْمُبَشِّرَاتُ؟ قَالَ: رُؤْيَا الْمُسْلِمِ وَهِيَ جُزْءٌ مِنْ أَجْزَاءِ النُّبُوَّةِ. رواه الترمذي والبخاري[2]:**

**ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: فروستادەیی و پێغەمبەرایەتی واتە: ڕیسالەتو نوبووەت تەواوبوون، ئیتر لەدوامن نە فروستادەی تر دەبێ و نە پێغەمبەری تر دێ. گوتی: بەڵام خەڵکەکە ئەمەیان لەلا ستەم بوو، حەزرەتیش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: وەڵێ مژدە دەرەکان هەر دەمێنن یاران گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! مژدە دەرەکان چین؟ فەرمووی: خەونی پیاوی موسوڵمانە، کە بەشێکە لە بەشەکانی پێغەمبەرایەتی (ت/ب).**

---

[1] بخاري. تفسير: ٧٠١٧ تعليقاً تحفة الأشراف ١٤٤٩٤. مسلم. رؤيا: ٥٨٦٦- ٥٨٧٨. ترمذي. رؤيا: ٢٢٩١. أبو داوُد. أدب: ٥٠١٨. تجريد/٥/٣٤٥ رقم: ٢٠٨٧.

[2] بخاري (تجريد): ٢٠٨٣ = ٦٩٩٠ فتح الباري: شرح صحيح البخاري.

**٤٢٤١- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ رُؤْيَا يُحِبُّهَا فَإِنَّمَا هِيَ مِنَ اللَّهِ، فَلْيَحْمَدِ اللَّهَ عَلَيْهَا، وَلْيُحَدِّثْ بِهَا، وَإِذَا رَأَى غَيْرَ ذَلِكَ مِمَّا يَكْرَهُ، فَإِنَّمَا هِيَ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَلْيَسْتَعِذْ مِنْ شَرِّهَا، وَلاَ يَذْكُرْهَا لأَحَدٍ، فَإِنَّهَا لاَ تَضُرُّهُ.** رواه البخاري[٣]:

**ئەبو سەعيد** (خوداى لىٚ رازى بىٚ) **فەرمووى: پێغەمبەر** (درووده‌ى خوداى له‌سه‌ربێ) **فەرمووى: ئەگەر يەكێكتان خەوێكى دىو خەوەكەى پىٚ خۆش بوو ئەوە لە خوداوەيە، با حەمدو سوپاسى خوداى لەسەر بكاو بيگێڕێتەوە بۆ زاناو دۆست، بەلاّم ئەگەر خەوێكى واى دى كە بەدڵى نەبوو ئەوە لە شەيتانەوەيە با پەنا بگرىٚ بە خودا لە شەڕى شەيتانو لە شەڕى ئەو خەوە، وە باسى نەكا بۆ كەس، ئيتر زيانى پىٚ ناگەيەنىٚ! (ب).**

**٤٢٤٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِذَا اقْتَرَبَ الزَّمَانُ لَمْ تَكَدْ رُؤْيَا الْمُسْلِمِ تَكْذِبُ وَأَصْدَقُكُمْ رُؤْيَا أَصْدَقُكُمْ حَدِيثًا. وَرُؤْيَا الْمُسْلِمِ جُزْءٌ مِنْ خَمْسَةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ، وَالرُّؤْيَا ثَلاَثَةٌ: فَرُؤْيَا الصَّالِحَةِ بُشْرَى مِنَ اللَّهِ، وَرُؤْيَا تَحْزِينٌ مِنَ الشَّيْطَانِ وَرُؤْيَا مِمَّا يُحَدِّثُ الْمَرْءُ نَفْسَهُ. فَإِنْ رَأَى أَحَدُكُمْ مَا يَكْرَهُ فَلْيَقُمْ فَلْيُصَلِّ وَلاَ يُحَدِّثْ بِهَا النَّاسَ، قَالَ: وَأُحِبُّ الْقَيْدَ وَأَكْرَهُ الْغُلَّ**[٤]:

**ئەبو هورەيرە** (خوداى لىٚ رازى بىٚ) **فەرمووى: پێغەمبەر** (درووده‌ى خوداى له‌سه‌ربێ) **فەرمووى: كاتىٚ شەوو رۆژ بەرانبەر بوون وەك ناوەڕاستى وەرزى پايزو ناوەڕاستى وەرزى بەهار لەو كاتەدا زۆر نزيكە كە خەونى موسوڵمان هەڵەى نەبىٚو راست دەرچىٚ. ئەو كەسەيشتان خەونى زۆر راستو دروستە كە خۆى زۆر راستگۆيە، وە خەونى موسوڵمان بەشێكە لە چلو پێنج بەش لە پێغەمبەرايەتى، خەونيش سىٚ جۆرە: خەونى باش، ئەمەيان مژدەى خۆشە**

---

[٣] بخاري (تجريد/٣٤١/٥.رقم: ٢٠٨٢ = ٦٩٨٥ فتح الباري).

[٤] تجريد البخاري/٣٤٥/٥ رقم: ٢٠٨٧ = ٧٠١٧ فتح. مسلم. رؤيا: ٥٨٦٥. أبو داود. أدب: ٥٠١٩. ترمذي. رؤيا: ٢٢٧٠ ، تحفة الأشراف:١٤٤٤٤.

لە خوداوە، هەندێ خەونی تریش خەم‌و خەفەتە، ئەمەشیان لە شەیتانەوەیە، هەندێ خەونی تریش قسە جوێنەوەو ووڕاوەی دەروونە، كەسێ خەیاڵی لای شتێ بێ دیارە خەونی پێوە دەبینێ، چونكە لەوەپێش ئەوەندە لە دڵی خۆیدا بیری لێ كردۆتەوە لە خەویشا هەر دێتەوە خەیاڵی، ئەمەشیان بایەخی پێ نییە، جا ئەگەر كەسێكتان خەونێكی وای دی كە بەدڵی نەبوو با هەڵسێ‌و نوێژ بكاو نەیگێڕێتەوە بۆ خەڵك! ئەبو هورەیرە دەڵێ: من بەش بەحاڵی خۆم دیتنی پابەندم لە خەودا پێ خۆشە چونكە نیشانەی بەندەیی خودایە بەڵام حەز لە دیتنی زنجیری مل ناكەم لە خەودا چونكە نیشانەی باش نییە ش.د/ت).

**٤٢٤٣**– عَنْ أبي قَتَادَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنْتُ أرَى الرُّؤْيَا فَتُمْرِضُنِي حَتَّى سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَقُولُ: الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ مِنَ اللَّهِ فَإِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ مَا يُحِبُّ فَلاَ يُحَدِّثْ بِهَا إِلاَّ مَنْ يُحِبُّ وَإِذَا رَأَى مَا يَكْرَهُ فَلْيَتْفِلْ عَنْ يَسَارِهِ ثَلاَثاً، وَلْيَتَعَوَّذْ بِاللَّهِ مِنْ شَرِّ الشَّيْطَانِ وَشَرِّهَا وَلاَ يُحَدِّثْ بِهَا أَحَدًا فَإِنَّهَا لَنْ تَضُرَّهُ . رواهما الأربعة. نسأل الله العلم بالتعبير أمين [٥]:

ئەبو قەتادە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: جاری وا دەبوو خەونی وام دەدی نەخۆشی دەخستم، هەتا جارێ گوێم لێ بوو لە سەروەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: خەوی باش لە خوداوەیە، جا ئەگەر یەكێكتان خەوێكی خۆشی دی با نەیگێڕێتەوە بۆ كەس، مەگەر بۆ دۆست‌و خەونزان، بەڵام ئەگەر خەونێكی ناخۆشی دی با لەلای چەپیەوە سێ تف رۆبكا، وە پەنا بگرێ بە خودا لە شەڕی شەیتان‌و لە شەڕی ئەو خەونەو ئیتر بۆ كەسی نەگێڕێتەوە، ئیتر خوا یاربێ زیانی بۆ نابێ (ش/د/ت– نوقمی دەریای میهرەبانی میهرەبان بن) لە خودای مەزن داوا دەكەین كە بە بەخششی خۆی شارەزای زانستی خەو پەرژێنمان بفەرموێ. ئامین.

---

[٥] بخاري. طب: ٥٧٤٧ ، ٦٩٨٥ ، ٦٩٩٥ ، ٧٠٠٥ ، ٧٠٠٥ ، ٧٠٤٤. أبو داود. أدب: ٥٠٢١. ترمذي. رؤيا: ٢٢٧٧. تجريد/٣٤١/٥ رقم: ٢٠٨٢. مسلم. رؤيا: ٥٨٦٤.

**٢) خەون هەركەخەون پەرژێن كرا ئیتر دیتە دی: (إذا قصت الرؤيا وقعت)**

**٤٢٤٤- عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إِذَا صَلَّى الصُّبْحَ أَقْبَلَ عَلَيْهِمْ بِوَجْهِهِ، فَقَالَ: هَلْ رَأَى أَحَدٌ مِنْكُمُ الْبَارِحَةَ رُؤْيَا؟ رواه الشيخان والترمذي وأبو داود وَزَادَ: وَيَقُولُ: إِنَّهُ لَمْ يَبْقَ بَعْدِي مِنَ النُّبُوَّةِ إِلاَّ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ[1]:**

**سەموورەی كوڕی جندوب (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) كە نوێژی بەیانی دەكرد رووی تێ دەكردینو دەیفەرموو: ئیمشەو كەستان خەونی بینیوە؟ (ش/ت/د) گێڕانەوە (ریوایەت)ی تیرمیذی ئەمەی پترە: وە دەیشی فەرموو: لەپاش من لە پێغەمبەرایەتی هیچ نەماوە جگە لە خەونی باش.**

**٤٢٤٥- عَنْ أَبِي رَزِينٍ الْعُقَيْلِيِّ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النبي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: رُؤْيَا الْمُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ أَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ، وَهِيَ عَلَى رِجْلِ طَائِرٍ مَا لَمْ يَتَحَدَّثْ بِهَا، فَإِذَا تَحَدَّثَ بِهَا سَقَطَتْ، قَالَ: وَأَحْسَبُهُ قَالَ: وَلاَ يُحَدِّثُ بِهَا إِلاَّ لَبِيبًا أَوْ حَبِيبًا. رواه الترمذي وأبو داود[2]:**

**ئەبو رەزینی عوقەیلی (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خەو بینینی پیاوی موسوڵمان چل یەكی پێغەمبەرایەتییە خەونیش بە مۆڵەق بەندە، وەك بەسەر قاچی باڵندەوەبێ وایە، چۆن شتێ بەسەر قاچی باڵندەوە بێ بە كەمترین جووڵانەوە دەكەوێ خەونیش ئاوا بە مۆڵەقی بەندە، هەتا خاوەنەكەی دەیگێڕێتەوە، جا هەر لەگەڵ گێڕایەوە ئیتر**

---

[1] بخاري. أذان: ٨٤٥. تجريد/١/ل- ٤٣٢ = ٨٤٥ ، ١١٤٣ ، ١٣٨٦ ، ٢٠٨٥ ، ٢٧٩١ ، ٣٢٣٦ ، ٣٣٥٤ ، ٤٦٧٤ ، ٦٠٦٩ ، ٧٠٤٧. مسلم. رؤيا: ٥٨٩٦. ترمذي. رؤيا: ٢٢٩٤.

[2] مسلم. رؤيا: ٥٨٦٦ – ٥٨٧٨. ترمذي. رؤيا: ٢٢٩١. تحفة الأشراف: ١٤٤٥٢. أبو داوَد. أدب: ٥٠١٨. تجريد/٥/٣٤٠ رقم: ٢٠٨١ = ٦٩٨٣ ، ٦٩٩٤ فتح الباري + رقم: ٢٠٨٧ = ٧٠١٧ فتح. قال في الفتح: اخرجه أبو داوَد والترمذي وأبن ماجة بسند حسن صححه الحاكم حديث رقم: ٧٠٤٦.

گورج بەپێی لێكدانەوەی یەكەم كەس كەبۆی دەگێڕێتەوە دێتە دی! گوتی: وا نەزانم فەرموویشی: یا بۆكەسی نەگێڕێتەوە، مەگەر بۆ كەسێكی ژیرو هۆشمەند، یا بۆ دۆستی (ت/د).

٤٢٤٦- ولأبن ماجة: اعْتَبِرُوهَا بِأَسْمَائِهَا وَكَنُّوهَا بِكُنَاهَا وَالرُّؤيَا لأَوَّلِ عَابِرٍ[3]:

دەفەرموێ: لە ناوو كەسناو (كونیە)ی شتەكەوە خەونەكە لێك بدەنەوە، یەكەم كەسیش خەونەكە چۆن خەو پەرژێن بكا ئەو خەونە وەها دێتە دی (ئیبنو ماجە).

٤٢٤٧- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ رَأَيْتُ فِي الْمَنَامِ كَأَنَّ رَأْسِي ضُرِبَ فَتَدَحْرَجَ فَاشْتَدَدْتُ عَلَى أَثَرِهِ، فَقَالَ: لاَ تُحَدِّثِ النَّاسَ بِتَلَعُّبِ الشَّيْطَانِ بِكَ فِي مَنَامِكَ. رواه مسلم. نسأل الله كمال الإسلام وقوة اليقين آمين [4]:

لە جابیرەوە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: عارەبێكی دەشتەكی هاتە لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! لە خەوما دیتم وەكو لە سەرم بدرێ‌و سەرم بپەڕێ‌و خلۆر ببێتەوە وابوو وەخۆیشم ڕامكرد بەشوێنیا! دەبێ ئەمە واتەی چی بێ؟ فەرمووی (درودی خودای لەسەربێ): ئەمە خەونی تێكەڵ‌و پێكەڵە، لەخەوتا شەیتان وازی پێ كردووی، شتی وا مەگێڕەوە بۆ خەڵك (م).

لەگرەدا دوو خاڵی گرنگ هەیە: یەكەم مەبەست لەو حەدیثانە كە دەفەرموون: خەون بەشێكە لە پێغەمبەرایەتی ئەوە نییە كە كەسێ پەیدا ببێ‌و بڵێ بە خەون وەحی‌و سرووشم بۆ دێ كەواتە من پێغەمبەرم یا بڵێ من پیاوێكی باشم‌و لە خەوما بە خزمەت خودا، یا بە خزمەت پێغەمبەر گەیشتم‌و

---

[3] بخاري. تعبير: ٧٠٤٦.

[4] مسلم. رؤيا: ٥٨٨٤ — ٥٨٨٦.

واوایان فەرموو، کەواتە من واوا دەکەم و ئێوەیش لەسەر ئەم خەونەی من ئەمە بکەن، یا ئەوە مەکەن. چونکە ئەمە سەر دەکێشێ بۆ ئاژاوە دروست کردن.

بەڵێ ئەوەندە هەیە لە حاڵەتی وادا پیاوی باش دەتوانێ ڕەفت بە خەوی خۆی بکا، بەم مەرجە: کە خەوەکەی سەر نەکێشێ بۆ تێکدانی یاسایەکی ڕەسای ئیسلام، وە لەهەمان کاتا لە یاساکانی شەریعەت دەرنەچێ، وە ئیددعای پێغەمبەرایەتی و شتی وای لەگەڵ دا نەبێ. بگرە لەم حاڵەتەدا موسوڵمانانی تریش دەتوانن بڕوای پێ بکەن و بەگوێی بکەن!

ئالەم بابەتەیە ئەو خەونەی کە نووری چاوی نووری جەنابی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی بیارە، لە تەفسیری نامی پیرۆزدا لە سەرەتای سوورەتی قافەوە دەیگێڕێتەوە و ئەو خۆی باوەڕی پێ دەکاو بۆ تەفسیری (ق) سوودی لێ وەردەگیرێ دیارە ئێمەیش باوەڕ بە فەرموودەکەی مامۆستا دەکەین مامۆستا دەفەرموێ:

بەم موناسەبەوە، لەم ڕۆژانەدا پیاوێکی موسوڵمان هاتە لام وتی: لەم شەوانەدا بە خزمەت پێغەمبەر گەیشتم و عەرزمکرد: مەعنای (ق) چییە؟ ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: علم الله الانسان كلمات، وهذه منها. جا پرسیاری لێ کردم: مەعنای ئەم فەرموودە چییە؟ منیش وتم: مەبەستی لە لەفزی (الانسان) زاتی خۆیەتی و مەبەستی ئەمەیە کە خودا چەن کەلیمەیەکی نیشانی بەندەی خۆی (کە محەممەدە)داوە (ق)یش یەکێکە لەوانە، واتە: ئەمیش ڕەمزە وەکوو ئەوانی تر!

خاڵی دووەم: لە کۆن و نۆدا گەلێ کەسی بە دیمەن باش و لە دڵەوە خراپ، بۆ عەوام هەڵفریواندن خەونیان کردووە بە سەرچاوەیەکی سەرەکی بۆ بڵاوکردنەوەی درۆو دەلەسەی خۆیان، بۆ سوودو بەرژەوەندی گڵاوی خۆیان، تەنانەت هی وا هەیە بە خەون ئایەت نەسخ دەکاتەوە، یا خەونەکەی خۆی بە حەدیث دادەنێ، جا کورت و پوخت بە کوردی پەتی عەرزی ئازیزانی خۆم بکەم: خەون چەشنە دەلالەت و بەرچاو ڕۆشن کردنەوەیەکە، پەیوەندی بە هەندێ کارو

باری نهێنی و غەیبییەوە هەیە، بەندەی باش دەتوانێ سوودو بەهرەی لێ وەربگرێ‌و بیکا بە نیشانەو بەڵگە لەسەر بوون (یا نەبوون)ی شتێ، وەك چۆن هەور نیشانەی بارانە ئاوا، بەڵام مەرج نییە كە هەور بوو ئیتر بباریّ، دیارە خەونی پێغەمبەران لە خەونی تاك تاكی ئوممەتەكانیان جیایە. (وەرگێڕ).

**٣) لە خەون گێڕانەوەدا درۆ دروست نییە: (يحرم الكذب في قص الرؤيا)**

**٤٢٤٨**- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله تَعَالَى عنهما) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله تَعَالَى عليه وسلم) قَالَ: مَنْ تَحَلَّمَ بِحُلُمٍ لَمْ يَرَهُ، كُلِّفَ أَنْ يَعْقِدَ بَيْنَ شَعِيرَتَيْنِ، وَلَنْ يَفْعَلَ، وَمَنِ اسْتَمَعَ إِلَى حَدِيثِ قَوْمٍ وَهُمْ لَهُ كَارِهُونَ أَوْ يَفِرُّونَ مِنْهُ، صُبَّ فِي أُذُنِهِ الآنُكُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ صَوَّرَ صُورَةً، عُذِّبَ وَكُلِّفَ أَنْ يَنْفُخَ فِيهَا، وَلَيْسَ بِنَافِخٍ . رواه البخاري وأبو داود والترمذي [1]:

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەركەسێ لە خۆیەوە خەونێ بە درۆ هەڵ بەستێ لە رۆژی قیامەتدا داوای لێ دەكرێ كە دوو دەنكە جۆی ئاگرین پێكەوە گرێ بدا، هەرگیز ئەوەیشی بۆ ناكرێ، واتەی وایە كە هەر لەو سزاو ئەشكەنجەیەدا دەبێ، هەر كەسەیش گوێ لە قسەی هۆزێ بگرێ كە ئەوانە پێیان ناخۆش بێ كە ئەو گوێیان لێ بگرێ، یا خۆیانی لێ دوور بخەنەوە ئەوە لە رۆژی قیامەتدا قوڕقوشمی سورەوە كراوەی تواوە دەكرێتە ناو هەردوو كونە گوێچكەیەوە، هەر كەسەیش وێنەیێ بكێشێ ئەوە ئازارو سزا دەدرێ‌و بە زۆر داوای لێ دەكرێ كە دەبێ گیان بكا بە بەریدا، دیارە كە ئەوەیشی بۆ ناكرێ. (ب/ د/ت).

**٤٢٤٩**- وللبخاري: إِنَّ مِنْ أَفْرَى الْفِرَى أَنْ يُرِيَ عَيْنَيْهِ مَا لَمْ تَرَه . نسأل الله الصدق في القول والفعل [2]:

---

[1] بخاري. تعبير: ٧٠٤٢ = تجريد/٣٤٦/٥ رقم: ٢٠٨٩ = ٧٠٤٢ فتح.

[2] بخاري. تعبير: ٧٠٤٣ = تجريد= مختصر صحيح البخاري/٥ل- ٣٤٧ رقم: ٢٠٩٠.

**ئیبنو عومەر** (خودایان لێ رازی بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **دەفەرمویٚ: هەلاتێکی فرە زلە: کەسێ بلێ: لە خەوما ئەوەم دیوە، وە لە راستیشدا هیچی نەدیبێ (ب) لە خودا داوا دەکەین کە هەمیشە قسە راستیو کار دروستیمان بە نسیب بفەرمویٚ.**

## ٤) بەشی دووەم: ئەو خەونانەی کە پێغەمبەر خۆی (درودی خودای لەسەر) دیونی

## الفصل الثاني: فيما رآه النبي ﷺ

**٤٢٥٠**- عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا صَلَّى صَلاَةً أَقْبَلَ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ فَقَالَ: مَنْ رَأَى مِنْكُمُ اللَّيْلَةَ رُؤْيَا؟؟ فَإِنْ رَأَى أَحَدٌ قَصَّهَا، فَيَقُولُ مَا شَاءَ اللَّهُ، فَسَأَلَنَا يَوْمًا، فَقَالَ: هَلْ رَأَى أَحَدٌ مِنْكُمْ رُؤْيَا؟ قُلْنَا: لاَ، قَالَ: لَكِنِّي رَأَيْتُ اللَّيْلَةَ رَجُلَيْنِ أَتَيَانِي، فَأَخَذَا بِيَدِي فَأَخْرَجَانِي إِلَى الأَرْضِ الْمُقَدَّسَةِ. فَإِذَا رَجُلٌ جَالِسٌ، وَرَجُلٌ قَائِمٌ بِيَدِهِ كَلُّوبٌ مِنْ حَدِيدٍ يُدْخِلُ فِي شِدْقِهِ حَتَّى يَبْلُغَ قَفَاهُ، ثُمَّ يَفْعَلُ بِشِدْقِهِ الآخَرِ مِثْلَ ذَلِكَ وَيَلْتَئِمُ شِدْقُهُ هَذَا فَيَعُودُ فَيَصْنَعُ مِثْلَهُ، فَقُلْتُ: مَا هَذَا؟ قَالاَ: انْطَلِقْ فَانْطَلَقْنَا حَتَّى أَتَيْنَا عَلَى رَجُلٍ مُضْطَجِعٍ عَلَى قَفَاهُ وَرَجُلٌ قَائِمٌ عَلَى رَأْسِهِ بِفِهْرٍ أَوْ صَخْرَةٍ، فَيَشْدَخُ بِهِ رَأْسَهُ فَإِذَا ضَرَبَهُ تَدَهْدَهَ الْحَجَرُ فَانْطَلَقَ إِلَيْهِ لِيَأْخُذَهُ فَلاَ يَرْجِعُ إِلَى هَذَا حَتَّى يَلْتَئِمَ رَأْسُهُ وَعَادَ رَأْسُهُ كَمَا هُوَ فَعَادَ إِلَيْهِ فَضَرَبَهُ، فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ قَالاَ: انْطَلِقْ فَانْطَلَقْنَا إِلَى ثَقْبٍ مِثْلِ التَّنُّورِ أَعْلاَهُ ضَيِّقٌ، وَأَسْفَلُهُ وَاسِعٌ يَتَوَقَّدُ تَحْتَهُ نَارًا فَإِذَا اقْتَرَبَ ارْتَفَعُوا حَتَّى كَادُوا يَخْرُجُوا. فَإِذَا خَمَدَتْ رَجَعُوا فِيهَا، وَفِيهَا رِجَالٌ وَنِسَاءٌ عُرَاةٌ، فَقُلْتُ مَنْ هَذَا؟ قَالاَ: انْطَلِقْ فَانْطَلَقْنَا حَتَّى أَتَيْنَا عَلَى نَهَرٍ مِنْ دَمٍ، فِيهِ رَجُلٌ قَائِمٌ عَلَى وَسَطِ النَّهَرِ وعلى شطّ النّهر رَجُلٌ بَيْنَ يَدَيْهِ حِجَارَةٌ فَأَقْبَلَ الرَّجُلُ الَّذِي فِي النَّهَرِ فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَخْرُجَ رَمَى الرَّجُلُ بِحَجَرٍ فِي فِيهِ فَرَدَّهُ حَيْثُ كَانَ فَجَعَلَ كُلَّمَا جَاءَ لِيَخْرُجَ رَمَى فِي فِيهِ، بِحَجَرٍ فَيَرْجِعُ كَمَا كَانَ، فَقُلْتُ: مَا هَذَا؟ قَالاَ: انْطَلِقْ فَانْطَلَقْنَا حَتَّى انْتَهَيْنَا إِلَى رَوْضَةٍ خَضْرَاءَ فِيهَا شَجَرَةٌ عَظِيمَةٌ وَفِي أَصْلِهَا شَيْخٌ وَصِبْيَانٌ وَإِذَا رَجُلٌ قَرِيبٌ مِنَ الشَّجَرَةِ بَيْنَ يَدَيْهِ نَارٌ يُوقِدُهَا فَصَعِدَا بِي فِي الشَّجَرَةِ وَأَدْخَلاَنِي دَارًا لَمْ أَرَ قَطُّ أَحْسَنَ مِنْهَا، فِيهَا رِجَالٌ شُيُوخٌ وَشَبَابٌ وَنِسَاءٌ وَصِبْيَانٌ ثُمَّ أَخْرَجَانِي مِنْهَا فَصَعِدَا بِي الشَّجَرَةَ فَأَدْخَلاَنِي دَارًا هِيَ أَحْسَنُ

وَأَفْضَلُ، فِيهَا شُيُوخٌ وَشَبَابٌ، فَقُلْتُ: طَوَّفْتُمَانِي اللَّيْلَةَ فَأَخْبِرَانِي عَمَّا رَأَيْتُ، قَالاَ: نَعَمْ. أَمَّا الَّذِي رَأَيْتَهُ يُشَقُّ شِدْقُهُ فَكَذَّابٌ يُحَدِّثُ بِالْكَذْبَةِ فَتُحْمَلُ عَنْهُ حَتَّى تَبْلُغَ الآفَاقَ فَيُصْنَعُ بِهِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَالَّذِي رَأَيْتَهُ يُشْدَخُ رَأْسُهُ فَرَجُلٌ عَلَّمَهُ اللَّهُ الْقُرْآنَ، فَنَامَ عَنْهُ بِاللَّيْلِ وَلَمْ يَعْمَلْ فِيهِ بِالنَّهَارِ يُفْعَلُ بِهِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَالَّذِي رَأَيْتَهُ فِي الثَّقْبِ فَهُمُ الزُّنَاةُ، وَالَّذِي رَأَيْتَهُ فِي النَّهَرِ آكِلُ الرِّبَا، وَالشَّيْخُ فِي أَصْلِ الشَّجَرَةِ إِبْرَاهِيمُ (عَلَيْهِ السَّلاَمُ) وَالصِّبْيَانُ حَوْلَهُ فَأَوْلاَدُ النَّاسِ، وَالَّذِي يُوقِدُ النَّارَ مَالِكٌ خَازِنُ النَّارِ، وَالدَّارُ الأُولَى الَّتِي دَخَلْتَ: الجَنَّةَ دَارُ عَامَّةِ الْمُؤْمِنِينَ، وَأَمَّا هَذِهِ الدَّارُ فَدَارُ الشُّهَدَاءِ، وَأَنَا جِبْرِيلُ، وَهَذَا مِيكَائِيلُ، فَارْفَعْ رَأْسَكَ، فَرَفَعْتُ رَأْسِي فَإِذَا فَوْقِي مِثْلُ السَّحَابِ، قَالاَ: ذَاكَ مَنْزِلُكَ، قُلْتُ: دَعَانِي أَدْخُلْ مَنْزِلِي، قَالاَ: إِنَّهُ بَقِيَ لَكَ عُمُرٌ لَمْ تَسْتَكْمِلْهُ، فَلَوِ اسْتَكْمَلْتَ أَتَيْتَ مَنْزِلَكَ. رواه البخاري[1]:

سەموورەی کوڕی جوندوب (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: گەلێ جار پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) کە نوێژی بەیانی دەکرد، رووی تێ دەکردین و دەیفەرموو: کەستان ئەم شەو خەونی نەدیوە؟ ئیتر ئەگەر کەسێ خەونێکی بدیبایە دەیگێڕایەوە بۆی و پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) ئەوەندەی خودا مەیلی لەسەر بوایە لێکی دەدایەوەو خەون پەرژێنی دەکرد، جا رۆژێ لێمانی پرسی فەرمووی: کەستان خەونی دیوە؟ عەرزمان کرد: نەخەیر فەرمووی: بەلام من ئەمشەو لەخەودا دوو پیاوم دی هاتنە لام و دەستیان گرتم و بردمیان بۆ خاکی پاك و پیرۆز، بۆ ولاتی شام، لەوێ کە تەماشام کرد وا کابرایێ دانیشتووەو پیاوێکیش قولاپێکی ئاسنینی بە دەستەوەیەو بە پێوە وەستاوە، خۆش خۆش قولاپەکە دەخاتە لالغاوەی کابراکە تا لە پشتە سەریەوە دەردەچێ، ئەوجا ئەو لالغاوەی تریشی ئاوا لێ دەکا، جا هەتا ئەم لای وا لێدەکرد، ئەولاکەی تری چاك دەبووەوەو دەنووسایەوە بەیەکدا، ئەویش دیسانەوە وەك جاری پێشووی لێ دەکردەوە! ئیتر هەر بەم دەستوورە، گوتم:

---

[1] بخاري. تعبير: ٧٠٤٧.

ئەمە چییە؟ دوو فریشتەکە گوتیان: جارێ بڕۆ، ڕۆیشتین تا چووینە لای کابرایێ تر، لەسەر گازەرەی پشت ڕاکشابوو، پیاوێکیش (خڕکێکی پێ بوو، یا تاوێرێکی پێ بوو) لەسەر سەری کابراکە ڕاوەستابوو دەیمالّی بە تەپڵی سەریدا، جا کە بەردەکەی دەکێشا بەسەری کابرادا بەردەکە هەڵ دەبەزییەوەو خلۆر دەبۆوە، پیاوەکەیش دەچوو دەیهێنایەوە، تا دەهاتەوە سەری کابرا وەك خۆی ساڕێژ دەبۆوە، جا ئەویش دیسانەوە دەیکێشایەوە پیایدا ئیتر هەروەها ئەمە کاری بوو، گوتم: ئەمە کێیە؟ گوتیان: جارێ بڕۆ! جا ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە لای شتێ وەکوو تەندوور وابوو، لەسەرەوە تەسك‌و لە بنەوە پان‌و دەلّپ بوو، تەماشام کرد پیاوو ژنی رووتی زۆری تیادا بوو ئاگر لە ژێریدا دەسووتاو بڵێسەی ئاگرەکە نێڵە نێڵی دەهات جا کە تاوی دەسەند ئاوەکە دەکوڵاو قوڵپەی دەکردو زەلامەکانی ناوی وەك دەنکی دانوولەی سەر ئاگر لەکاتی قوڵتە قوڵتەکەدا ئاوا بەرز دەبوونەوەو خەریك بوون هەڵبچن! بەلاّم کڵپەی ئاگرەکە گورج کپ دەبوو، ئیتر ئەوانیش دەکەوتنەوە بنەکەی، ئیتر هەروەها ئەمە حاڵیان بوو، گوتم: ئەمە چییە؟ گوتیان: جارێ بڕۆ، ڕۆیشتین تا گەیشتینە سەر روبارێکی خوێن، کابرایێ لە ناویا بە پێوە ڕاوەستابوو، پیاوێکیش لەسەر لێواری چۆمەکە بوو، بەردێکی زۆری لەبەر دەستدا بوو، گشت جارێ کە کابرای ناو چۆمەکە دەهات دەربچێ کە دەگەیشتە لای ئەو، بەردێکی دەکێشا بەناو دەمیاو تەسی پێ دەکردەوە بۆ شوێنی پێشووی، ئیتر هەموو جارێ تلێکی دەمالّی بە دەموو قەپۆزیاو کابرا دەگەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی گوتم: ئەی ئەمە چییە؟ گوتیان: جارێ بڕۆ، ڕۆیشتین تا گەیشتینە لای باخێکی سەوز، درەختێکی گەورەی تێدا بوو، پیرەمێردێ لە بنیدا دانیشتبوو، منداڵێکی زۆر زۆری لە دەور بوون، پیاوێکی تریش (لە نزیك درەختەکەوە) ئاگرێکی لەبەر دەمدا بوو، هەر ئاگرەکەی خۆش دەکرد، ئینجا دوو فریشتەکان بەو شێخەڵەدا سەریان خستم‌و بردمیانە ناو خانوویەکەوە قەت خانووی وا باشم نەیدوە، پڕیبوو لە پیاوی پیرو لە لاوو لە ژن‌و لە منالّ، ئینجا لەوێ هێنامیانە دەرەوەو دیسان بە شێخەڵەکەدا سەریان خستم‌و بردمیانە ناو

خانوویەكی ترەوە لەوی تر جوانترو باشتر بوو، پڕی لە پیرو لاوو بوو. ئینجا گوتم: ئەمشەو منتان سووڕانەوە، دەپێم بڵێن ئەمەی من دیم چی بوو، گوتیان: بەڵێ باشە، ئەوەی كە دیت لالغاوەیان هەڵ دەدڕی ئەوە ئەو درۆزنەیە كە درۆیێ هەڵ دەبەستێ و لە دەمی ئەوەوە بەهەر چوار لادا بڵاو دەبێتەوە جا ئەوە هەتا رۆژی قیامەت هەر وای لێ دەكرێ، ئەوەیش كەدیت سەریان دەشكاند، ئەوە ئەو پیاوەیە كە خودا فێری قورئانی كردووە، كەچی بە شەو دەخەوێ و دەوری ناكاتەوەو بە رۆژیش رەفتاری پێ ناكا، تا رۆژی قیامەت هەروای لێ دەكرێ، ئەوانەیشی كەلەناو كونەكەدا دیتن ئەوانە داوێن پیسەكان بوون، ئەوەیشی كە لەناو چۆمە خوێناوەكەدا دیت ئەوە سوو خۆر بوو، پیرەمێردەكەی بن درەختەكەیش ئیبراهیم بوو (درودی خودای لەسەربێ)، منداڵەكانی دەوریشی منداڵی خەڵكی بوون ئەو منداڵانە بوون كە لەپێش رەسید بووندا دەمرن، ئەو پیاوەیش كە لە نزیكی درەختەكەوە ئاگرەكەی خۆش دەكرد مالیكی وەردیانی دۆزەخ بوو، خانووی یەكەمیش كە چوویتە ناوی خانەی سەرتاپای موسوڵمانان بوو، ئەم خانووەیش ماڵی شەهیدانە! منیش جوبرائیلم و ئەمەیش كەلە گەڵمدایە میكائیلە، جا سەر هەڵبڕە كە سەرم هەڵبڕی لە ژوور سەرمەوە شتێكم دی وەك پەڵە هەور وابوو، فەرموویان: ئەوەیش هەوارو بارەگای تۆیە گوتم: دەڵێم گەڕێن با بچمە ناو جێگەی خۆم، فەرموویان: هێشتا تەمەنت ماویەتی، كەی تەمەنت تەواو بوو دێیتە ناوماڵی خۆت. (ب– خودای لێ رازی بێ).

**٤٢٥١–** عَنْ ابْنَ عُمَرَ (رضى الله عنهما) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: بَيْنَا أَنَا عَلَى بِئْرٍ أَنْزِعُ مِنْهَا إِذْ جَاءَ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ)، فَأَخَذَ أَبُو بَكْرٍ الدَّلْوَ فَنَزَعَ ذَنُوبًا أَوْ ذَنُوبَيْنِ وَفِي نَزْعِهِ ضَعْفٌ يُغْفَرَ اللَّهُ لَهُ. ثُمَّ أَخَذَهَا ابْنُ الْخَطَّابِ مِنْ يَدِ أَبِى بَكْرٍ، فَاسْتَحَالَتْ فِي يَدِهِ غَرْبًا فَلَمْ أَرَ عَبْقَرِيًّا مِنَ النَّاسِ يَفْرِى فَرِيَّهُ حَتَّى ضَرَبَ النَّاسُ بِعَطَنٍ . رواه الشيخان والترمذي[٢]:

---

[٢] بخاري. فضائل: ٣٦٨٢. مسلم. فضائل: ٦١٤٦.

**ئیبنو عومەر** (خودایان لێ رازی بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: جارێ لەخەوما لەسەر بیرێ بووم، ئاوم لێ هەڵ دەگۆزی لەوكاتەدا ئەبو بەكرو عومەریش پەیدابوون، ئەبو بەكر دۆڵچەكەی هەڵگرت‌و بە كزێكەوە دۆڵچەیێ یا دوو دۆڵچە ئاوی هەڵكێشا،** (خودا لێی خۆش بێ)، **ئەنجا عومەری كوڕی خەطاب لە دەستی ئەبو بەكری وەرگرت‌و دۆڵچەكە لە دەستی عومەردا بووبە سەتڵێكی گەورە كە بە قەد مەشكەیەكی گاوەس ئاو بگرێ جا كەسم نەدیوە، وەك عومەر ئاوا بلیمەت بێ‌و ئاوا بە هەڵپەو هەڵمەت‌و دەست‌و برد بێ، جا عومەر بە شێوەیەكی وا ئاوی زۆر كرد، هەتا خەڵكەكە لە دەوری ئاوەكە پەچەیان بۆ ئاژەڵەكانیان بەست بۆ حەوانەوە، لە پاش پاراو بوون. (ش/ت).**

**٤٢٥٢- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **قَالَ: أُرِيَ اللَّيْلَةَ رَجُلٌ صَالِحٌ أَنَّ أَبَا بَكْرٍ نِيطَ بِرَسُولِ اللَّهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **وَنِيطَ عُمَرُ بِأَبِي بَكْرٍ وَنِيطَ عُثْمَانُ بِعُمَرَ. قَالَ جَابِرٌ: فَلَمَّا قُمْنَا مِنْ عِنْدِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **قُلْنَا أَمَّا الرَّجُلُ الصَّالِحُ فَرَسُولُ اللَّهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم). **وَأَمَّا تَنَوُّطُ بَعْضِهِمْ بِبَعْضٍ فَهُمْ وُلاَةُ هَذَا الأَمْرِ الَّذِى بَعَثَ اللَّهُ بِهِ نَبِيَّهُ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم). **رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ فِي باب التفضيل**[3]:

**جابیر** (خودای لێ رازی بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: ئەمشەو لە خەودا نیشانی پیاوێكی باش دراوە، كەوا ئەبو بەكر، پەیوەند كراوە بە پێغەمبەرەوەو عومەریش پەیوەند كراوە بە ئەبو بەكرەوەو عوثمانیش لكاوە بە عومەرەوە! جابیر فەرمووی: كە لەكن حەزرەت هەڵساین گوتمان: پیاوە باشەكە كە ئەم خەونەی دیوە پێغەمبەر خۆیەتی** (دروودی خودای لەسەربێ) **ئەوەیشی كە پەیوەستی كراون بەیەكەوە ئەمەیە كە ئەوان خاوەن‌و سەروەرو فەرمانداری ئەم ئایینەن كە خودا بە پێغەمبەری خۆیدا ناردوویەتی. (ئەبو داوود گێڕاویەتیەوە.** مەزار رەحمەت لە گۆڕی پیرۆزی بێ).

**٤٢٥٣- ← (سوورەتی قەدر، فەرموودەی یەكەم بەرگی حەوتەم)**[4].

---

[3] سكت عَن درجته الشارح.

[4] تقدم في تفسير سورة القدر ، المجلد السابع. تسلسل/ ٨٠ رقم: ٤٢٢١/١.

## ٥) ئەو خەونانەی كە پێغەمبەر خۆی ﷺ دیونی و هەر خۆیشی خەو پەرژێنی كردوون : (ما رآه النبي ﷺ وعبره)

٤٢٥٤- ← (لە فەضائیلی عومەردا رابوورد، یەكەم فەرمووده بەرگی پێنجەم ل-٢٠) [١].

٤٢٥٥- ← (لە فەضائیلی عومەردا رابورد، دووەم فەموودە) [٢].

٤٢٥٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ رَأَيْتُ فِي يَدَيَّ سِوَارَيْنِ مِنْ ذَهَبٍ فَأَهَمَّنِي شَأْنُهُمَا فَأُوحِيَ إِلَيَّ فِي الْمَنَامِ أَنِ انْفُخْهُمَا فَنَفَخْتُهُمَا فَطَارَا فَأَوَّلْتُهُمَا كَذَّابَيْنِ يَخْرُجَانِ مِنْ بَعْدِي. فكان أَحَدُهُمَا الْعَنْسِيُّ صَاحِبُ صَنْعَاءَ وَالآخَرُ مُسَيْلِمَةُ صاحب اليمامة . رَوَى هذه الثلاثة الشيخان والترمذي [٣]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لەخەوما دیتم كەوا دوو بازنی زێرم لە دەستدابوو و زۆرم پێناخۆشە لەخەوەكەدا سرووشم بۆ هات: كە فوویان لێبكە جا كە فووم لێكردن با بردنی! جا لێكم دانەوە بەم دوو پێغەمبەرە درۆزنە كە لەپاش من دەردەكەون، كە یەكێكیان ئەسوەدی عەنەسییە كە لە صەنعایە، ئەوی تریشیان موسەیلەمەی درۆزنە كە لە یەمامەیە. (ش/ت).

٤٢٥٧- لە باسی (الفصل السابع فی الهجرة)یدا لە (كتاب النبوة)یدا رابورد. فەرموودەی دووەم. لەم گێرانەوەی ئێرەدا ئەمەی پترە: هەر لەم خەونەمدا دیتم كەوا شمشێرێ رادەوەشێنم، كەچی نووكەكەی پەڕی! تومەز ئەوە ئەوە بوو كە لە رۆژی غەزای ئوحوددا تووشی موسوڵمانان بوو، بەڵام لەپاشدا كەرام وەشاندەوە گەلێ لە جاران باشتری لێ هاتەوە، تومەز ئەوەیش

---

[١] تقدم في المجلد الخامس. تسلسل/ ٤ رقم: ٣٢٤٥/١.

[٢] تقدم في المجلد الخامس. تسلسل/٤ رقم: ٣٢٤٦/٢.

[٣] بخاري. تعبير: ٧٠٣٦ ، ٤٣٧٩. تجريد/٣٦٤/٤ رقم: ١٦٠٩ = ٤٣٧٥ ، ٤٣٧٤ فتح الباري. مسلم. رؤيا: ٥٨٩٥ ، ٥٨٩٤.

ئەو خێرو خۆشی و فەتح و یەككگرتنی موسوڵمانانە بوو كە خودا لەوەدوا رەخساندی، دیسان هەر لەوخەوەدا دیتم چەن سەرێ گایان سەربڕی، وە بەرگوێم كەوت یەكێ فەرمووی: خێر لای خودایە، تومەز ئەوە ئەو چەن موسوڵمانانە بوون كە لە جەنگی ئوحوددا شەهید كران، خێرەكەی لای خودایش ئەو خێرو بەرەكەتە بوو كە خودا لەوەدوا رەخساندی بۆمان لەگەڵ ئەو پاداشە جوانەی كە خودا لەپاش رۆژی بەدری دووەم خەڵاتی كرد پێمان لەسەر سەر راستی و دڵپاكی خۆمان (ش = شەیخان = ب + م-ئیمامی بوخاری و ئیمامی موسلیم. رەزای خوایان لێ بێ)[٤].

**٤٢٥٨- عَنْ أبن عمر (رضي الله تَعَالَى عنهما) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: رَأَيْتُ كَأَنَّ امْرَأَةً سَوْدَاءَ ثَائِرَةَ الرَّأْسِ خَرَجَتْ مِنَ الْمَدِينَةِ حَتَّى قَامَتْ بِمَهْيَعَةَ وَهْيَ الْجُحْفَةُ فَأَوَّلْتُ أَنَّ وَبَاءَ الْمَدِينَةِ نُقِلَ إِلَيْهَا . رَوَاهُ البخاري والترمذي [٥]:**

ئیبنو عومەر (رەزای خوایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لەخەوما دیتم وەكوو بڵێی ژنێكی رەشی سەر ئاڵۆسكاوی لە مەدینە دەربچێ و بچێ بۆ مەهیەعە وابوو واتە: بۆ جوحفە حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: جا من وام لێكدایەوە كە پەتاو ناسازییەكەی مەدینە دەگوێزرێتەوە بۆ مەهیەعە (ب/ت).

**٤٢٥٩- وعنه عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: أَرَانِي فِي الْمَنَامِ أَتَسَوَّكُ بِسِوَاكٍ فَجَذَبَنِي رَجُلَانِ أَحَدُهُمَا أَكْبَرُ مِنَ الآخَرِ، فَنَاوَلْتُ السِّوَاكَ الأَصْغَرَ مِنْهُمَا فَقِيلَ لِي كَبِّرْ فَدَفَعْتُهُ إِلَى الأَكْبَرِ . رَوَاهُ الشيخان [٦]:**

دیسان فەرمووی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لەخەوما دیتم كەوا بەدارسیواكێ سیواك دەكەم، دوو پیاویش (هەر كەسەیان بۆ

---

[٤] تقدم المجلد الرابع. تسلسل/ ١٠١ رقم: ٢/ ٣١٥٩.

[٥] بخاري. رؤيا (تجريد): ٢٠٨٨ = فتح: ٧٠٣٨ ، ٧٠٣٩ ، ٧٠٤٠.

[٦] بخاري. وضوء: ٢٤٦ = تجريد/ ١/ ١٩٤ رقم: ١٧٧. مسلم. رؤيا: ٥٨٩٢.

خۆی) رام دەكێشێ، یەكێكیان لەوی تریان گەورەتر بوو، منیش ویستم سیواكەكە بدەم بە پچكۆلەكەیان كەچی پێم گوترا: گەورەكەیان وەپێشخە، منیش دام بە گەورەكەیان (ش).

**٤٢٦٠-** عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: رَأَيْتُ ذَاتَ لَيْلَةٍ فِيمَا يَرَى النَّائِمُ كَأَنَّا فِي دَارِ عُقْبَةَ بْنِ رَافِعٍ فَأُتِينَا بِرُطَبٍ مِنْ رُطَبِ ابْنِ طَابٍ فَأَوَّلْتُ الرِّفْعَةَ لَنَا فِي الدُّنْيَا وَالْعَاقِبَةَ فِي الآخِرَةِ وَأَنَّ دِينَنَا قَدْ طَابَ . رَوَاهُ مسلم وأبو داود [٧]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: شەوێ لەخەوما دیتم كەوا وەكوو لەماڵی عوقبەی كوڕی رافیعدا بین ئاوابوو، تەڕە خورمای تازەیان بۆ هێناین، لەو جۆرە خورمایە كە پێی دەڵێن خورمای ئیبنو طاب! منیش ئەم خەونەم ئاوا خەو پەرژێن كرد: رافیعم لێكدایەوە بە سەربەرزیی دنیامان‌و عوقبەیشم دانا بە سەرەنجامی باشی دوا رۆژمان‌و روطابی ئیبنو طابیشم لێكدایەوە بەوە كەوا ئەم ئایینەی ئێمە خۆش‌و باش بووەو دامەزراوەو رەگی داكوتاوە! (م/د) ئەم خەونە نموونەیەكی جوانە بۆ دۆزینەوەی مانای خەون لەناوو كونیەو كەسناوەوە چونكە عوقبە بە كوردی واتە سەرەنجام، رافیع واتە سەربەرز ئیبنو طاب (كە كونیەیە، یانی كەسناوە) واتە كاكە باشە رستەكە بە كوردی ئاوای لێ دێ: شەوێ لەخەوما دیتم كەوا وەكوو لە ماڵی سەرنجامی كوڕی سەربەرزدا بووین وابوو، تەڕە خورمای تازەیان بۆ هێناین لەو جۆرە خورمایە كە پێی دەڵێن: روتابی كاكە باشە! (وەرگێڕ).

## ٦) بەشی سێیەم: ئەو خەونانەی كە پێغەمبەر درودی خودای لەسەر خۆی خەوپەرژێنی كردوون

## الفصل الثالث: في الرؤي التي عبرها النبي ﷺ

**٤٢٦١-** لە باسی گەورەیی عەبدوڵڵای كوڕی سەلامدا رابورد فەرموودەی دووەم [١].

---

[٧] مسلم. رؤيا: ٥٨٩١. أبو داود. أدب: ٥٠٢٥.

٤٢٦٢- تەماشای (كتاب الفضائل، فضل عبدالله بن عمر) حەدیثی دووەم بكە. ئەم فەرموودەیە لەوێ رابورد [٢].

٤٢٦٣- عَنْ أُمِّ الْعَلاَءِ (رَضِيِ اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَتْ: رَأَيْتُ لِعُثْمَانَ بْنُ مَظْعُونٍ فِي النَّوْمِ عَيْنًا تَجْرِى، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِرَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: ذَاكِ عَمَلُهُ يَجْرِى لَهُ. رَوَاهُ البخاري [٣]:

ئوممو عەلاء (خۆش نوودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: لە خەوما دیتم وا عثمانی كوڕی مەظعوون كانییەكی هەیە وەك كارێز، ئاوی لەبەر دەڕوا، گێڕامەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوە كردەوەكەیەتی هەر بەردەوامە بۆی! (ب- نوقمی شەپۆلی میهرەبانی خودا بێ).

٤٢٦٤- عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) أَنَّ رَجُلاً أَتَى رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: يَا رَسُولُ اللهِ إِنِّى رَأَيْتُ اللَّيْلَةَ فِي الْمَنَامِ ظُلَّةً تَنْطِفُ السَّمْنَ وَالْعَسَلَ فَأَرَى النَّاسَ يَتَكَفَّفُونَ مِنْهَا بأيديهم، فَالْمُسْتَكْثِرُ وَالْمُسْتَقِلُّ، وَأرى سَبَباً وَاصِلاً مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الأَرْضِ فَأَرَاكَ أَخَذْتَ بِهِ فَعَلَوْتَ، ثُمَّ أَخَذَ بِهِ رَجُلٌ من بعدك فَعَلاَ، ثُمَّ أَخَذَ بِهِ رَجُلٌ آخَرُ فَعَلاَ، ثُمَّ أَخَذَ بِهِ رَجُلٌ آخَرُ فَانْقَطَعَ بِهِ ثُمَّ وُصِلَ له فَعَلاَ. قَالَ أَبُو بَكْرٍ: يَا رَسُولَ اللَّهِ بِأَبِى أَنْتَ وَاللَّهِ لَتَدَعَنِّى فَأَعْبُرَهَا فَلأُ عَبرَنَّهَا. قَالَ: اعْبُرْها، قَالَ أبو بكرٍ: أَمَّا الظُّلَّةُ فَظُلَّة الإِسْلاَمُ. وَأَمَّا الَّذِى يَنطِفُ مِنَ الْعَسَلِ وَالسَّمْنِ فَالْقُرْآنُ حَلاَوَتُهُ ولينه. وَأَمَّا ما يَتَكَفَّف الناس من ذلك فَالْمُسْتَكْثِرُ مِنَ الْقُرْآن وَالْمُسْتَقِلُّ، وَأَمَّا السَّبَبُ الْوَاصِلُ مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الأَرْضِ فَالْحَقُّ الَّذِى أَنْتَ عَلَيْهِ تَأْخُذُ بِهِ فَيُعْلِيكَ اللَّهُ بِهِ ثُمَّ يَأْخُذُ بِهِ رَجُلٌ مِنْ بَعْدِكَ فَيَعْلُو بِهِ ثُمَّ يَأْخُذُ بِهِ رَجُلٌ آخَرُ فَيَعْلُو بِهِ ثُمَّ يَأْخُذُهُ رَجُلٌ آخَرُ فَيَنْقَطِعُ بِهِ ثُمَّ يُوَصَّلُ لَهُ، فَيَعْلُو بِهِ، فَأَخْبِرْنِى يَا رَسُولَ اللَّهِ بِأَبِى أَنْتَ أَصَبْتُ أَمْ أَخْطَأْتُ؟ قَالَ: أَصَبْتَ بَعْضًا وَأَخْطَأْتَ بَعْضًا،قَالَ: فَوَاللَّهِ يا رسول الله لَتُحَدِّثَنِّى ما الَّذِى أَخْطَأْتُ، قَالَ: لاَ تُقْسِمْ. رَوَاهُ الأربعة [٤]:

---

[١] تقدم في المجلد الخامس/ تسلسل/ ٦١ رقم: ٢/ ٣٥١٧.

[٢] تقدم في المجلد الخامس/ تسلسل/ ٢٧ رقم: ٣٣٩٩/٢.

[٣] بخاري. تعبير: ٧٠٠٤.

[٤] بخاري (تجريد/٥ ل/٣٤٧ رقم:٢٠٩١)=٧٠٤٦، ٧٠٠٠. مسلم.رؤيا:٥٨٨٧، أبوداود. أيمان ونذور:٣٢٦٧، ٣٢٦٩، ٤٦٣٣.

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە لای پێغەمبەر سرووودی خودای لەسەربێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمشەو لەخەومدا پەڵەیەك هەورم دیت، رۆن و هەنگوێنی لێ دەچۆڕایەوە، دیشم کە ئەو خەڵکە بە هەردوو لەپ لێیان دەگرتەوە، هەبوو زۆرو هەبوو کەمی گرتبۆوە! وە دیشم کەمەندێ لە ئاسمانەوە شۆڕ بۆتەوەو گەیشتۆتە سەر زەوی، وە تۆم دی ئەو کەمەندەت گرت و سەرکەوتیت، لەپاش تۆ پیاوێکی تر گرتی و ئەویش سەرکەوت لەپاش ئەو پیاوێکی تریش هەروا، لەپاش ئەو پیاوێکی تریش گرتی بەڵام کەمەندەکە پسا لە دەستیدا! هەتا بەستیانەوە بەیەکەوە بۆی و ئەویش سەرکەوت. ئەبو بەکریش (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! باوکم بە قوربانت بێ، بەخودا دەبێ لێم گەڕێیت، من ئەم خەوە لێك دەدەمەوە. فەرمووی: باشە خەو پەرژێنی بکە. ئەبو بەکریش فەرمووی: پەڵە هەورەکە کەپرو ساباتی ئیسلامە ئەو رۆن و هەنگوینەیش کە دەچۆڕایەوە ئەوە شیرینی و نەرم و ناسکیی قورئانە، ئەوەیش کە خەڵك بە هەردوو دەست لێیان دەگرتەوە ئەوەیە کە هەندێ کەس زۆر لە قورئان وەردەگرن و هەندێ کەس کەم. ئەو کەمەندەیش کەلە ئاسماناوە گەیشتبووە سەر زەوی ئەو هەق و راست و دروستییەیە کە تۆی لەسەریت، رێگەی هەق و راستی ئیسلامە هەر لەسەری دەڕۆیت و هەر خودا پلەو پایەت جار لەگەڵ جاردا بڵندتر دەکا، لەپاش تۆیش پیاوێ رێگەی راستی تۆ دەگرێ و پێی بڵند دەبێتەوە، پیاوێکی تریش دوای ئەو هەروەها، لەپاشدا پیاوێکی تریش دەیگرێ و لەسەری دەڕوا بەڵام لە دەستیدا دەپچڕێ و بۆی دەبەستنەوە بەیەکەوە، جا ئەویش پێی بەرز دەبێتەوە!

جا ئەی پێغەمبەری خودا! باوکم بە قوربانت بێ، پێم بفەرموو ئایا پێکاومە یا بەهەڵەدا چووم؟ فەرمووی: هەندێکیت پێکاوەو هەندێکیت هەڵە کردووە.

گوتی: دەسا بەخودا ئەی پێغەمبەری خودا! دەبێ پێم بفەرمووی کە کامەیم بە هەڵە خەو پەرژێن کردووە، فەرمووی: سوێند مەخۆ پێت ناڵێم. (ش/د/ت).

**٤٢٦٥- وَقَالَ رَجُلٌ: يا رَسُولِ اللَّهِ رَأَيْتُ كَأَنَّ مِيزَانًا نَزَلَ مِنَ السَّمَاءِ، فَوُزِنْتَ أَنْتَ وَأَبُو بَكْرٍ فَرُجِحْتَ أَنْتَ، وَوُزِنَ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ فَرُجِحَ أَبُـو بَكْـرٍ، وَوُزِنَ عُمَـرُ وَعُثْمَانُ فَرُجِحَ عُمَرُ، ثُمَّ رُفِعَ الْمِيزَانُ، قَالَ: فَرَأَيْنَا الْكَرَاهِيَةَ فِي وَجْهِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم). رَوَاهُ أبو داود والترمذي [٥]:**

**پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! لەخەوما دیتم تەرازوویێ لە ئاسمانەوە هاتە خوارەوە، تۆو ئەبو بەکر پێی کێشران، تۆ قورستر بووی، ئەبو بەکرو عومەریش پێی کێشران ئەبو بەکر قورستر بوو، عومەرو عثمانیش کێشران عومەر قورستر بوو، ئیتر تەرازووەکە هەڵگیرا. گوتی: سەرەنجماندا رووی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کرژ بوو! (د/ت-س/ص).**

**٤٢٦٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَتْ: سَأَلَتْ خَدِيجَةَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عَنْ وَرَقَةَ بْنِ نَوْفَلٍ: فَقَالَتْ: إِنَّهُ كَانَ صَدَّقَكَ وَلَكِنَّهُ مَاتَ قَبْلَ أَنْ تَظْهَرَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): أُرِيتُهُ فِي الْمَنَامِ وَعَلَيْهِ ثِيَابٌ بَيَاضٌ وَلَوْ كَانَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ لَكَانَ عَلَيْهِ لِبَاسٌ غَيْرُ ذَلِكَ . رَوَاهُ الترمذي [٦]:**

**عائیشە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: لە بارەی جێگەی وەرەقەی کوڕی نەوفەلەوە خەدیجە لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەپرسێ، دەڵێ: وەرەقە باوەڕی بەتۆ هەبوو، بەڵام ئەو حەلە تۆ هێشتا ئاشکرا نەبوو بووی کە ئەو مرد، حەزرەتیش (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: لەخەومدا وەرەقەم دی بەرگی سپی لە بەردابوو، کە بەرگی دانیشتوانی بەهەشتە، ئەگەر وەرەقە دۆزەخی بوایە رەنگێکی تری لە بەردا دەبوو! (ت).**

---

[٥] بسند صحيح (شرحه).

[٦] سكت عنه الشارح.

## ٧) دیتنی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر) بەخەو : (رؤية النبي ﷺ في النوم)

**٤٢٦٧**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَقَدْ رَآنِي، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لاَ يَتَمَثَّلُ بِي . رَوَاهُ الشيخان والتمذي [1]:

**ئەبو هورەیرە لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (درووودی خودای لەسەربێ): هەرکەسێ لە خەویدا من ببینێ، ئەوە بەڕاستی لەو خەوەدا بەخەو منی دیوەو کەسێکی تری نەدیوە، چونکە شەیتان خۆی بۆ ناکرێ بە من. واتە: ناتوانێ خۆی بگۆڕێ و خۆی بباتە شێوەی منەوە (ش/ت).**

**٤٢٦٨**- وعنه عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَسَيَرَانِي فِي الْيَقَظَةِ وَلاَ يَتَمَثَّلُ الشَّيْطَانُ بِي . رَوَاهُ الثلاثة [2]:

**دیسان فەرمووی: پێغەمبەر فەرمووی (درووودی خودای لەسەربێ): هەرکەسێ بە خەو من ببینێ ئەوە بە چاوی سەریش لە حاڵی هۆشیاریدا من دەبینێ، شەیتان قەت ناچێتە شەکڵی منەوە (ش/د).**

**٤٢٦٩**- وللشيخين: مَنْ رَآنِي فَقَدْ رَأَى الْحَقَّ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لاَ يَتَكَوَّنُنِي [3]:

**حەزرەت (درووودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەرکەسێ لە خەویدا من ببینێ ئەوە خەوێکی ڕاست و دروستی دیوە، چونکە شەیتان خۆی بۆ ناکرێ بە من و ناتوانێ بچێتە شێوەی منەوە (ش).**

---

[1] بخاري (تجريد/٥/٣٤٢ل- ٣٤٢ رقم: ٢٠٨٤ = ٦٩٩٣ ، ٦٩٩٦). مسلم. رؤيا: ٥٨٨٠ ، ٥٨٧٩. أبو داود. أدب: ٥٠٢٣.

[2] تجريد/٥/٣٤٢ رقم: ٢٠٨٤ ، ٢٠٨٥ = ٦٩٩٧ ، ٦٩٩٣ فتح.

[3] بخاري. رؤيا: ٦٩٩٧. مسلم. رؤيا: ٥٨٨٠ — ٥٨٨٣.

## ٨) بەشی چوارەم: لەبارەی دەستووری نەریت‌و دوعاو نزای نووستنەوە:
## الفصل الرابع: في آداب النوم ودعائه

**٤٢٧٠-** عَنْ الْبَرَاءُ بْنُ عَازِبٍ (رضى الله عنهما) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِذَا أَتَيْتَ مَضْجَعَكَ فَتَوَضَّأْ وَضُوءَكَ لِلصَّلاَةِ، ثُمَّ اضْطَجِعْ عَلَى شِقِّكَ الأَيْمَنِ، وَقُلِ اللَّهُمَّ أَسْلَمْتُ نَفْسِي إِلَيْكَ، وَفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ، وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ، رَهْبَةً وَرَغْبَةً إِلَيْكَ، لاَ مَلْجَأَ وَلاَ مَنْجَا مِنْكَ إِلاَّ إِلَيْكَ، آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِي أَنْزَلْتَ، وَبِنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ. فَإِنْ مُتَّ مِنْ لَيْلَتِكَ مُتَّ عَلَى الْفِطْرَةِ، فَاجْعَلْهُنَّ آخِرَ مَا تَقُولُ، فَقُلْتُ أَسْتَذْكِرُهُنَّ: وَبِرَسُولِكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ، قَالَ: لاَ وَبِنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ [1]:

**بەرای كوڕی عازیب** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی پێم: كاتێ دەتەوێ بچیتە سەر نوێنی خەوتن، لە پێشدا دەسنوێژێ بگرە، ڕێك وەك دەسنوێژی نوێژ، ئینجا لەسەر لای ڕاستت ڕابكشێ و بڵێ:**

(اللَّهُمَّ أَسْلَمْتُ نَفْسي إِلَيْكَ، وَفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ، وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ رَهْبَةً وَرَغْبَةً إِلَيْكَ، لاَ مَلْجَأَ وَلاَ مَنْجَا مِنْكَ إِلاَّ إِلَيْكَ، اللَّهُمَّ آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِي أَنْزَلْتَ، وَبِنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ):

**خودایە! خۆم دایە دەستی تۆو، كاری خۆم سپارد بە تۆو، پەنام هێناوە بۆ پەنای تۆو، پشتم بەستووە بە تۆ، هەروەك بەتەمای میهرەبانی و ڕەحمەتی تۆم مەترسیشم هەیە لە قارو سزای تۆ، هیچ پەناو پاسارێ نییە لە قارو غەزەبی تۆ، مەگەر هەر لەلای خۆت، پەنا هەر پەنای تۆیە، باوەڕم هەیە بەونامە پیرۆزەی تۆ كە خۆت ناردووتە خوارەوە، كە قورئانی گەورەیە، وە باوەڕم هەیە بەو پێغەمبەرەیش كە خۆت ڕەوانەت كردووە بۆ سەر ئادەمیزادو پەری كە حەزرەتی موحەممەدە.**

---

[1] تجريد البخاري/ ١/ ١٩٥ رقم: ١٧٨ = ٢٤٧ ، ٦٣١١ ، ٦٣١٣ ، ٦٣١٥ ، ٧٤٨٨. مسلم. ذكر ودعاء: ٦٨٢٠. أبو داوُد. أدب: ٥٠٤٦ ، ٥٠٤٧ ، ٥٠٤٨ ، ترمذي. دعوات: ٣٣٩٤. تحفة الأشراف: ١٧٦٣.

فەرمووی: جا ئەگەر لەپاش خوێندنی ئەم نزایە لەو شەوەتدا بمریت، ئەوا لەسەر ئاینی پاكی ئیسلام دەمریت، وە ئەم نزایە بكە بە دواهەمین قسەت و كە دوعاكەت خوێند ئیتر قسەی تر مەكە تا خەوت لێ دەكەوێ. بەراء فەرمووی: خەریكبووم لەبەری بكەم لە جیاتی (وَبِنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ) گوتم: (وَبِرَسُولِكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ) كەچی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: نەء، وا مەڵێ و ووشەكانی نزاكە لە خۆتەوە مەگۆڕە و وەك خۆم پێتم گوت بڵێ: (وَبِنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ). (ش/د/ت).

٤٢٧١- عَنْ حُذَيْفَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إِذَا أَخَذَ مَضْجَعَهُ مِنَ اللَّيْلِ وَضَعَ يَدَهُ تَحْتَ خَدِّهِ ثُمَّ يَقُولُ اللَّهُمَّ بِاسْمِكَ أَمُوتُ وَأَحْيَا. وَإِذَا اسْتَيْقَظَ قَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَا وَإِلَيْهِ النُّشُورُ [٢]:

حوذەیفە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەستووری وابوو، بە شەو كە دەچووە سەر نووستنگاكەی دەستی راستی لە ژێر روومەتی خۆیدا دادەناو دەیفەرموو: اللَّهُمَّ بِاسْمِكَ أَمُوتُ وَأَحْيَا: خودایە! بە پیرۆزیی ناوی تۆ دەمرم و دەژیم: بە بەركەتی ناوی تۆ دەخەوم و لە خەو هەڵ دەستم. كاتێ لە خەویش هەڵ دەستا، دەیفەرموو: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَا وَإِلَيْهِ النُّشُورُ: سوپاس و ستایش هەر بۆ ئەو خودایەیە كە لەپاش ئەوەی كە مراندینی زیندووی كردینەوە وە لە قیامەتیشا زیندوو كردنەوە هەر بە دەستی خۆیەتی. (ش/د/ت).

٤٢٧٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِذَا أَوَى أَحَدُكُمْ إِلَى فِرَاشِهِ فَلْيَنْفُضْ فِرَاشَهُ بِدَاخِلَةِ إِزَارِهِ فَإِنَّهُ لاَ يَدْرِي مَا خَلَفَهُ عَلَيْهِ ثُمَّ لْيَضْطَجِعْ عَلَى شِقِّهِ الأَيْمَنِ ثُمَّ يَقُول بِاسْمِكَ رَبِّي وَضَعْتُ جَنْبِي وَبِكَ أَرْفَعُهُ إِنْ أَمْسَكْتَ نَفْسِي فَارْحَمْهَا وَإِنْ أَرْسَلْتَهَا فَاحْفَظْهَا بِمَا تَحْفَظُ بِهِ عِبَادَكَ الصَّالِحِينَ [٣]:

---

[٢] تجريد البخاري/ ٥/ ٢٤٣ رقم: ١٩٧٩ = ٦٣١٤ ، ٦٣١٢ ، ٦٣٢٤ ، ٧٣٩٤. مسلم. ذكر ودعاء: ٦٨٢٥.

[٣] تجريد = مختصر صحيح البخاري/ ٥/ ٢٤٦ رقم: ١٩٨٢ = ٦٣٢٠ ، ٧٣٩٣.

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کاتێ یەکێ لە ئێوە دەیەوێ بچێتە ناو نوێنەکەیەوە، با بە چمکی ناوەوەی جلەکەی، یا بەهەر شتێکی تر نوێنەکەی بتەکێنێ، چونکە ئێوە نازانن کە لەپاش ئێوە نوێنەکە چی تری تێدەچێ لە وانەیە مارێ یا دووپشکێ یا ئازارێکی تری تێ چووبێ جا کە نوێنەکەی تەکان ئەوجا بڵێ:

بِاسْمِكَ رَبِّي وَضَعْتُ جَنْبِي وَبِكَ أَرْفَعُهُ، إِنْ أَمْسَكْتَ نَفْسِي فَاغْفِرْ لَهَا، وَإِنْ أَرْسَلْتَهَا فَاحْفَظْهَا بِمَا تَحْفَظُ بِهِ عِبَادَكَ الصَّالِحِينَ:

ئەی پەروەردگارم! بە پیرۆزی ناوی پیرۆزی تۆ، تەنیشتی خۆم لەسەر ئەم نوێنە دادەنێم و دەخەوم، وە بە پشتی تۆ بەرزی دەکەمەوەو هەڵ دەسم لە خەو. خودایە! ئەگەر گیانم گل دەدەیتەوەو لەم خەوەدا گیانم دەکێشی ئەوا بە ڕەحمەتی خۆت ڕەحمی پێ بکە، وە ئەگەر بەرەڵای دەکەیتەوەو لەم خەوە خەبەرم دەکەیتەوە ئەوا بیپارێزەو بەوەی کە ئاگاداریی بەندە باشەکانی خۆتی پێ دەکەی ئاگاداریی ئەویش بکە (ش/د/ت).

٤٢٧٣- ← (ب- ٣ز- ٤٨ل- ١٢٠ف- ٤) [٤].

٤٢٧٤- حديث (كان النبي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ كُلَّ لَيْلَةٍ جَمَعَ كَفَّيْهِ.. الخ) سبق في (فضل الْمُعَوِّذَتَيْنِ) [٥].

٤٢٧٥- وَقَالَ أبو هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه): كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَأْمُرُنَا إِذَا أَخَذَ أَحَدُنَا مَضْجَعَهُ أَنْ يَقُولَ: اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمَوَاتِ وَرَبَّ الأَرَضِينَ وَرَبَّ العَرْش الْعَظِيم، رَبَّنَا وَرَبَّ كُلِّ شَيْءٍ فَالِقَ الْحَبِّ وَالنَّوَى وَمُنْزِلَ التَّوْرَاةِ، وَالإِنْجِيلِ وَالْقُرْآن أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ كُلِّ شَيْءٍ أَنْتَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهِ، اللَّهُمَّ أَنْتَ الأَوَّلُ فَلَيْسَ قَبْلَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الآخِرُ فَلَيْسَ بَعْدَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الظَّاهِرُ فَلَيْسَ فَوْقَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الْبَاطِنُ فَلَيْسَ دُونَكَ شَيْءٌ اقْضِ عَنَّا الدَّيْنَ وَأَغْنِنا مِنَ الْفَقْرِ [٦]:

---

[٤] تقدم في مجلد/ ٣ تسلسل/ ٤٨ل – ١٢٠ رقم: ٢١٦٩/٤.

[٥] تقدم في المجلد الخامس. تسلسل/ ٩١ل – ٣٢١ رقم: ٢/ ٣٦٧٠.

[٦] مسلم. ذكر ودعاء: ٦٨٢٧.

**ئەبو هورەیرە** (خودای لێ رازی بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمانی پێ فەرموویین کاتێ دەچینە سەر نوێنی خەوتن بڵێین:**

**اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمَوَاتِ وَرَبَّ الأَرَضِينَ وَرَبَّ العَرْش الْعَظيم، رَبَّنَا وَرَبَّ كُلِّ شَيْءٍ وَفَالِقَ الْحَبِّ وَالنَّوَى وَمُنْزِلَ التَّوْرَاةِ، وَالإِنْجِيلِ وَالفُرْقان، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ كُلِّ شَيْءٍ أَنْتَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهِ، اللَّهُمَّ أَنْتَ الأَوَّلُ فَلَيْسَ قَبْلَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الآخِرُ فَلَيْس بَعْدَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الظَّاهِرُ فَلَيْسَ فَوْقَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الْبَاطِنُ فَلَيْس دُونَكَ شَيْءٌ اقْضِ عَنَّا الدَّيْنَ وَأَغْننا مِنَ الْفَقْرِ :**

**ئەبو هورەیرە** (خودای لێ رازی بێ) **فەمووی: پێغەمنبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمانی پێ فەرمووین، کاتێ دەچینە سەر نوێنی خەوتن بڵێن:**

**اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمَوَاتِ وَرَبَّ الأَرَضِينَ وَرَبَّ العَرْش الْعَظيم، رَبَّنَا وَرَبَّ كُلِّ شَيْءٍ وَفَالِقَ الْحَبِّ وَالنَّوَى وَمُنْزِلَ التَّوْرَاةِ، وَالإِنْجِيلِ وَالفُرْقان، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ كُلِّ شَيْءٍ أَنْتَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهِ، اللَّهُمَّ أَنْتَ الأَوَّلُ فَلَيْسَ قَبْلَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الآخِرُ فَلَيْس بَعْدَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الظَّاهِرُ فَلَيْسَ فَوْقَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الْبَاطِنُ فَلَيْس دُونَكَ شَيْءٌ اقْضِ عَنَّا الدَّيْنَ وَأَغْننا مِنَ الْفَقْرِ :**

**ئەی خوایە! ئەی پەروەردگاری ئاسمانەکان، ئەی پەروەردگاری زەوی، ئەی پەروەردگاری بارەگای یەزدانی مەزن! ئەی پەروەردگاری ئێمە، ئەی پەروەردگاری هەموو شتێ! ئەی ئەو کەسەی کە لە تۆمەی رەق و تەق و وشك و برین چووزەرەی سەوزو ناسك شین دەکەی! وە دانەوێڵەو ناو کە لەکاتی سەوزبوونا بە تەوانایی بێ سنووری خۆت لەت دەکەی! ئەی دابەزێنەری تەورات و ئینجیل و قورئان! ئەو قورئانەی کە راست و ناڕاست لەیەکتری جیادەکاتەوە، پەنا دەگرم بە تۆ لە شەڕی هەموو شتێ، کە جڵەوی بە دەستی تۆیە، ئەی خودایە! تۆ خۆت ئەوەڵ و یەکەم کەسیت و سەرەتات بۆ نییەو هیچ شتێ لە پێش تۆدا نەبووە، وە تۆ خۆت ئاخرەمینیت و دواکەسیت و لە دوای هەموو مەوجوودێ هەر دەمێنی، وە تۆ هەم ظاهیرو ئاشکرایی و هیچ شتێ باڵا دەستی تۆ نییە، وە هەم باطین و پەنهانی و غەیری**

تۆ هەمووی لە ژێر دەستی تۆدایە، پەروەردگارا! بە کەرەمی خۆت ئەو قەرزەی کە لە سەرمانە بۆمانی بدەرەوەو بە رەحمەتی خۆت بە ماڵی رەحمەت‌و بە زانستی باش‌و بە رەفتاری شیرین‌و بە گوتاری زێڕین داراو دەوڵەمەندمان بکەو لەو فەقرو هەژارییەی کە دەبێ بە مایەی کوفرو ناشوکری تۆ رزگارمان بکە (ش/د/ت).

**٤٢٧٦-** عَنْ أَنَسٍ (رضى الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) كَانَ إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ قَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِى أَطْعَمَنَا وَسَقَانَا وَكَفَانَا وَآوَانَا وَكَمْ مِمَّنْ لاَ كَافِيَ لَهُ وَلاَ مُؤْوِيَ . رَوَاهُ مسلم وأبو داود والترمذي [٧]:

ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە دەچووە ناو نوێنەوە دەیفەرموو: (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِى أَطْعَمَنَا وَسَقَانَا وَكَفَانَا وَآوَانَا فَكَمْ مِمَّنْ لاَ كَافِيَ لَهُ وَلاَ مُئْوِيَ): سوپاس‌و ستایش هەر بۆ ئەو خوایەیە کە نان‌و ئاومان دەداو بەشێ کە سەروبەر بەشمان بکا دەمانداتێ‌و جێگەو رێگەی حەسانەوەو حەوانەوەی داوە پێمان، ئەمە لە کاتێکا کە چەندەها کەسی وا هەن کە بێ کەس‌و بێ داڵدەو بێ جێگەو شوێن‌و لانەن! (م/د/ت).

**٤٢٧٧-** وَأَمَرَ إِبْنِ عُمَرَ رَجُلاً إِذَا أَخَذَ مَضْجَعَهُ قَالَ: اللَّهُمَّ خَلَقْتَ نَفْسِي وَأَنْتَ تَوَفَّاهَا، لَكَ مَمَاتُهَا وَمَحْيَاهَا، إِنْ أَحْيَيْتَهَا فَاحْفَظْهَا وَإِنْ أَمَتَّهَا فَاغْفِرْ لَهَا اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْعَافِيَةَ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: أَسَمِعْتَ هَذَا مِنْ عُمَرَ؟ قَالَ: مِنْ خَيْرٍ مِنْ عُمَرَ، مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): رَوَاهُ مسلم وأبن حبَّان [٨]:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لەسەر بێ) بە پیاوێکی دەگوت: کاتێ دەچیتە ناو نوێنەوە بڵێ:

(اللَّهُمَّ خَلَقْتَ نَفْسِي وَأَنْتَ تَوَفَّاهَا لَكَ مَمَاتُهَا وَمَحْيَاهَا إِنْ أَحْيَيْتَهَا فَاحْفَظْهَا وَإِنْ أَمَتَّهَا فَاغْفِرْ لَهَا اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْعَافِيَةَ):

---

[٧] مسلم. ذكر ودعاء: ٦٨٣٢. أبُو داوُد. أدب: ٥٠٥٣. ترمذي. دعوات: ٣٣٩٦.

[٨] مسلم. ذكر ودعاء: ٦٨٢٦.

خودایە! گیانی من تۆ خۆت دروستت کردووە، وە هەر خۆت وەری دەگریتەوەو دەیبەیتەوە بۆلای خۆت، مان و نەمانی و مردن و ژیانی بە دەستی خۆتە، دەی کەوایە ئەگەر زیندووی دەکەیتەوەو لەم خەوە خەبەری دەکەیتەوە ئەوا بە کەرەمی خۆت چاوی خێرت لێی بێ و ئاگاداری بکە، خۆ ئەگەر، دەیمرێنی ئەوا لێی خۆشبە، ئەی پەروەردگارم! ئەی یەزدانی پاك و بێ باك! داوای خۆشی و باشی و بێوەیی و لەشی ساغت لێ دەکەم. کابرایەکیش پێی گوت: باشە تۆ خۆت ئەم نزایەت لە عومەری باوکت بیستووە؟ ئیبنو عومەریش فەرمووی: بەڵکوو لە کەسێکم بیستووە کە لە عومەر گەلێ باشترە، لە حەزرەتی پێغەمبەری خودا خۆیم بیستووە (درودو صەلات و سەلامی خودا لە خۆی و کەس و کارو یارانی بێ). (م/ ئیبنو حەببان).

٤٢٧٨- عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَا مِن مُسْلِمٍ يَبِيتُ عَلَى ذِكْرٍ طَاهِرًا فَيَتَعَارُّ مِنَ اللَّيْلِ فَيَسْأَلُ اللَّهَ خَيْرًا مِنَ الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ إِلاَّ أَعْطَاهُ إِيَّاهُ [٩]:

موعاذی کوڕی جەبەل (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووددی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر کەسێ لەسەر پاکی بە دەم یادو زیکری خوداوە بخەوێ، کاتێ بە شەو لەخەو خەبەری دەبێتەوە داوای هەرچی لە خودا بکا، لە خێرو چاکەی هەردوو جیهان خودا دەیداتێ! (د/ت).

٤٢٧٩- عَنْ فَرْوَةَ بْنِ نَوْفَلٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) عَنْ أبيه أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ لَهُ (حبنما قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ عَلِّمْنِي شَيْئًا أَقُولُهُ إِذَا أَوَيْتُ إِلَى فِرَاشِي): اقْرَأْ قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ، ثُمَّ نَمْ على خاتَمَتُها فَإِنَّهَا بَرَاءَةٌ مِنَ الشِّرْكِ [١٠]:

فەروەی کوڕی نەوفەل (ڕەزای خودا لە خۆی و بابی) دەڵێ: باوکم بە حەزرەتی فەرمووی: قوربان! شتێکم فێربکە کە چوومە سەر نوێنی نووستن بیڵێم؟

---

[٩] سكت عَن درجته الشارح.

[١٠] سكت عَن درجته الشارح.

حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی پێی: سوورەتی (قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ) بە تەواوی بخوێنەو کە تەواو خوێندت بخەوە، چونکە ئەم سوورەتە حاشاکردن و یەخە هەڵتەکاندنە لە شیرك و فرەخوایی (د/ت).

٤٢٨٠- عَنْ حَفْصَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْقُدَ وَضَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى تَحْتَ خَدِّهِ وَيَقُولُ: اللَّهُمَّ قِنِي عَذَابَكَ يَوْمَ تَبْعَثُ عِبَادَكَ ثَلَاثَ مِرَاتٍ. رَوَاهُ الثلاثة أبو داود والترمذي [11]:

حەفصەی هاوسەری پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەیویست بخەوێ دەستی راستی لە ژێر روومەتیدا دادەناو سێ جار دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ قِنِي عَذَابَكَ يَوْمَ تَبْعَثُ عِبَادَكَ): ئەی خودایە! لەو رۆژەدا کە بەندەکانی خۆت زیندوو دەکەیتەوە لە سزاو عەزابی خۆت بم پارێزە (د/ت- س/ص).

٤٢٨١- عَنْ أَبِي الأَزْهَرِ الأَنْمَارِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ إِذَا أَخَذَ مَضْجَعَهُ مِنَ اللَّيْلِ قَالَ: بِسْمِ اللَّهِ وَضَعْتُ جَنْبِي اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي وَأَخْسأْ شَيْطَانِي، وَفُكَّ رِهَانِي. وَاجْعَلْنِي فِي النَّدِيِّ الأَعْلَى. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَالحاكم:[12].

ئەبو ئەزهەری ئەنماری (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بەشەو کە دەچووە سەر نوستنگاکەی دەیفەرموو: (بِسْمِ اللَّهِ وَضَعْتُ جَنْبِي اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي وَأَخْسأْ شَيْطَانِي، وَفُكَّ رِهَانِي. وَاجْعَلْنِي فِي النَّدِيِّ الأَعْلَى): بە بەرەکەتی پیرۆزی ناوی خودا تەنیشتی خۆمم داناو لەسەر ئەم نوێنە راکشام، خودایە لە گوناهم خۆش بەو شەیتانم ترۆو رەهەنە بکەو چغەی لێ کەو، گەردنم رزگار بکەو لەو هەق و مافانەی کە لە سەرمن هۆی گەردن ئازادیم بۆ فەراهەم بێنە، وە بە لوتفی خۆت شادم کە بە هاودەمیی یارانی یانەی هەرە بالا (د/حاکم).

---

[11] بسند صحيح (شرحه).

[12] سكت عن درجته الشارح.

**٤٢٨٢- عَنْ عَلِيّ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ عِنْدَ مَضْجَعِهِ: اللّٰهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِوَجْهِكَ الْكَرِيمِ وَكَلِمَاتِكَ التَّامَّاتْ مِنْ شَرِّ مَا أَنْتَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهِ، اللّٰهُمَّ أَنْتَ تَكْشِفُ الْمَغْرَمَ وَالْمَأْثَمَ، اللّٰهُمَّ لاَ يُهْزَمُ جُنْدُكَ وَلاَ يُخْلَفُ وَعْدُكَ، وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ، مِنْكَ الْجَدُّ سُبْحَانَكَ وَبِحَمْدِكَ [١٣]:**

**عەلی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەسەر خەوگاكەی دەیفەرموو: اللّٰهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِوَجْهِكَ الْكَرِيمِ وَكَلِمَاتِكَ التَّامَّات مِنْ شَرِّ مَا أَنْتَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهِ، اللّٰهُمَّ أَنْتَ تَكْشِفُ الْمَغْرَمَ وَالْمَأْثَمَ، اللّٰهُمَّ لاَ يُهْزَمُ جُنْدُكَ وَلاَ يُخْلَفُ وَعْدُكَ، وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ، سُبْحَانَكَ وَبِحَمْدِكَ:**

**ئەی خودایە! پەنا دەگرم بە زاتی نازداری تۆ، بە خۆت و بە وشە تەواوەكانت لە شەڕی ئەوەی كە جڵەوی بە دەستی خۆتە، پەروەردگارم! خۆت دەتوانی لەژێر باری قەرزاریی و گوناهباری رزگارمان بكەی، پەروەردگارا! سوپای تۆ قەت ناشكێ و گفت و بەڵێنی تۆ پاشگەز بوونەوەی بۆ نییە، ماڵ و دارایی دەوڵەمەند بە دەردی ناخوا، لەلای تۆ، چونكە ئەوەی بە دەردی دەخوا تەنیا كردەوەی باشە، ئەتۆ پاك و بێ نەنگیت و، من هەمیشە سوپاس و ستایشی زاتی تۆ دەكەم (د).**

**٤٢٨٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُمَا) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: الْحَمْدُ لِلّٰهِ الَّذِى كَفَانِي وَآوَانِي وَأَطْعَمَنِي وَسَقَانِي الحَمد لله الَّذِى مَنَّ عَلَيَّ فَأَفْضَلَ، وَالَّذِى أَعْطَانِي فَأَجْزَلَ، الْحَمْدُ لِلّٰهِ عَلَى كُلِّ حَالٍ، اللّٰهُمَّ رَبَّ كُلِّ شَيْءٍ وَمَلِيكَهُ وَإِلَهَ كُلِّ شَيْءٍ أَعُوذُ بِكَ مِنَ النَّارِ . رَوَاهُما أبو داود [١٤]:**

**ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خودا فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): (الْحَمْدُ لِلّٰهِ الَّذِى كَفَانِي وَآوَانِي وَأَطْعَمَنِي وَسَقَانِي وَالَّذِى مَنَّ عَلَيَّ فَأَفْضَلَ، وَالَّذِى أَعْطَانِي فَأَجْزَلَ، الْحَمْدُ لِلّٰهِ عَلَى كُلِّ حَالٍ، اللّٰهُمَّ رَبَّ كُلِّ**

---

[١٣] سكت عن درجته الشارح.

[١٤] سكت عن درجته الشارح.

شَىْءٍ وَمَلِيكَهُ وَإِلَهَ كُلِّ شَىْءٍ أَعُوذُ بِكَ مِنَ النَّارِ): سوپاس‌و ستایش بۆ ئەو خودایە کە بەشی باشی داومەتێ‌و، دالدەی داوم‌و نان‌و ئاوو خواردن‌و خواردنەوەی داومەتێ، سوپاس‌و ستایشی بێ پایان بۆ ئەو یەزدانی پاکە کە ئەوپەڕی گەورەیی‌و چاکەو پیاوەتی لەگەڵدا کردووم، وە بەش‌و بارەی گەورەی پێ بەخشیوم، سوپاس بۆ خودا لەسەر هەموو حاڵ‌و بارو دۆخێ، ئەی خودای من! ئەی پەروەردگارو پادشاو خوداوەندی هەموو شت! پەنا دەگرم بە پەنای تۆ لە سزاو ئێش‌و ئازاری ئاگری دۆزەخی تۆ! (ئەبو داوود. پڕ گۆڕەکەی لە نوور بێ).

**٤٢٨٤- عَنْ طِخْفَةَ بْنِ قَيْسٍ الْغِفَارِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: بَيْنَمَا أَنَا مُضْطَجِعٌ فِي الْمَسْجِدِ مِنَ السَّحَرِ (أي من مرض السَّحر وهو الرئة- شرحه) عَلَى بَطْنِي، إِذَا رَجُلٌ يُحَرِّكُنِي بِرِجْلِهِ فَقَالَ: إِنَّ هَذِهِ ضِجْعَةٌ يُبْغِضُهَا اللَّهُ، فَنَظَرْتُ فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) [١٥]:**

طەفخەی کوڕی قەیسی غیفاری (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: جارێ لە مزگەوت لەبەر ژانە سیی لەسەر سك راکشابووم، روانیم وا پیاوێ بە قاچ رام دەوەشێنێ‌و دەفەرموێ: خودا رقی لەم جۆرە پاڵکەوتنەیە. جا کە تەماشایم کرد پێغەمبەر بوو (دروودی خودای لەسەربێ). (د/ت).

**٤٢٨٥- عَنْ عَلِيِّ بْنَ شَيْبَانَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ بَاتَ عَلَى ظَهْرِ بَيْتٍ لَيْسَ لَهُ حِجَارٌ فَقَدْ بَرِئَتْ مِنْهُ الذِّمَّةُ. ولفظ الترمذي: نهي النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَنْ يَنَامَ الرَّجُلُ عَلَى سَطْحٍ لَيْسَ بِمَحْجُورٍ عَلَيْهِ [١٦]:**

عەلی کوڕی شەیبان (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەرکەسێ لەسەر بانی بێ لاوانە بخەوێ ئەوە ئۆباڵی بە ئەستۆی خۆیەتی، ئەگەر کەوتە خوارێ سووچی خۆیەتی (د/ت) گفتی (ت) ئاوایە: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) رێگەی نەدەدا کە پیاو لەسەر سەربانی بێ لاوانە بخەوێ.

---

[١٥] سكت عَنْ درجته الشارح.

[١٦] سكت عَنْ درجته الشارح.

٤٢٨٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنِ اضْطَجَعَ مَضْجَعًا لَمْ يَذْكُرِ اللَّهَ تَعَالَى فِيهِ إِلاَّ كَانَ عَلَيْهِ تِرَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَمَنْ قَعَدَ مَقْعَدًا لَمْ يَذْكُرِ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ فِيهِ إِلاَّ كَانَ عَلَيْهِ تِرَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ . رَوَاهُ الثلاثة أبو داود والترمذي [١٧]:

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (درووودو سڵاوو ڕەحمەتی خودای گەورەو مەزنی لەسەر بێ) **دەفەرموێ: کەسێ لە شوێنێکا پاڵ بکەوێ و زیکرو یادی خودای تێدا نەکا لە ڕۆژی قیامەتدا بۆی دەبێ بە داخ و خەفەت و داخی دڵ! هەروا کەسێ لە شوێنێ دابنیشێ و تا دانیشتنەکەی تەواو دەبێ، یادی خودانەکا (د/ت– خودایان لێ ڕازی بێ).**

٤٢٨٧- عَنْ شَدَّادَ بْنَ أَوْسٍ (رضى الله عنه) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَقْرَأُ عِنْدَ نومَهُ سُورَةً مِنْ كِتَابِ اللَّهِ إِلاَّ وَكَّلَ اللَّهُ بِهِ مَلَكًا فَلاَ يَقْرَبُهُ شَيْءٌ حَتَّى يَهُبَّ مَتَى هَبَّ. رَوَاهُ الترمذي بسند حسن [١٨]:

**شەددادی کوڕی ئەوس** (خۆش نوودی خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: هەر موسوڵمانێ لەکاتی نووستندا سوورەتێ قورئان بخوێنێ، خودا دەیسپێرێ بە فریشتەیێ و فریشتەیێ دەکا بە پاسەوانی ئیتر نایەڵێ هیچ شتێکی خراپ توخنی بکەوێ هەتا لەو خەوە خەبەری دەبێتەوە! (ت–س/ح).**

٤٢٨٨- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رضى الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ قَالَ حِينَ يَأْوِي إِلَى فِرَاشِهِ أَسْتَغْفِرُ اللَّهَ الْعَظِيمَ الَّذِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيَّ الْقَيُّومَ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ، ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، غَفَرَ اللَّهُ ذُنُوبَهُ وَإِنْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ، وَإِنْ كَانَتْ عَدَدَ وَرَقِ الشَّجَرِ، وَإِنْ كَانَتْ عَدَدَ رَمْلِ عَالِجٍ، وَإِنْ كَانَتْ عَدَدَ أَيَّامِ الدُّنْيَا . رَوَاهُ الترمذي (بسند حسن). نسأل الله تَعَالَى التوفيق. آمين [١٩]:

---

[١٧] سكت عَنْ درجته الشارح.

[١٨] سنده حسن عند الترمذي (شرحه).

[١٩] سنده حسن عند الترمذي (شرحه).

ئەبو سەعید (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەرکەسێ لەو کاتەدا کە دەچێتە سەر پێخەفەکەی سێ جار بڵێ: (أَسْتَغْفِرُ اللَّهَ الْعَظِيمَ الَّذِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيَّ الْقَيُّومَ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ): داوای لێبووردن لە خودای مەزن دەکەم، خۆی تاکە خودایە، خوایەکی زیندووی نەمرە، هەر بووەو هەر دەبێ، خودایەکی تەواناى وایە کە لەنگەری هەموو شتێکی ڕاگرتووە، پەشیمانم لە کردەوەی خراپی خۆم و تەوبە لەلای ئەو خودایەی خۆم دەکەم و دەگەڕێمەوە بۆ لای کەرەم و بەخششی خۆی! حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر کەسێ لەوکاتەدا سێ جار ئاوا بڵێ ئیتر خودا لە هەموو گوناهەکانی خۆش دەبێ، با بەقەد کەفی دەریاش گوناهی هەبێ، یا بەقەی گەڵای دار، یا بەقەی ژمارەی دەنکە لمی تەپۆڵکە لمەکانی زنجیرە چیاکانی عائیج، کە بۆ زۆری و بێ شوماری بەناوبانگن، یا بەقەد ژمارەی ڕۆژەکانی جیهان! (ت–س/ح).

### ٩) وشەی کاتی لەخەو هەستان : (ما يقول إذا استيقظ)

**٤٢٨٩**– عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مَنْ تَعَارَّ مِنَ اللَّيْلِ، فَقَالَ حِينَ يَسْتَيْقِظُ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ، ثُمَّ دَعَا، اسْتُجِيبَ لَهُ. فَإِنْ قَامَ فَتَوَضَّأَ ثُمَّ صَلَّى قُبِلَتْ صَلاَتُهُ . رَوَاهُ أبو داود والترمذي (بسند صحيح)[1]:

عوبادەی کوڕی صامیت (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەرکەسێ بەشەو کاتێ خەبەری دەبێتەوە بڵێ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ): هەر خودا خودایە، تاك و تەنیایە، هاوەڵ و هاوڕێ و هاوبەشی بۆ نییە، موڵك و پاشایەتی هەر قابیل بە خۆیەتی، سوپاس و ستایش هەر قابیل بە خۆیەتی، هیچی لە

---

[1] بسند صحيح (شرحه).

دەست دەرناچێ‌و دەسەلات‌و تەوانایی بەسەر هەموو شتێكدا هەیە، یەزدانێكی پاك‌و بێ گەردو بێ نەنگە، سوپاس‌و ستایش هەر قابیل بە خۆیەتی هەتا هەتایە، هەر بۆخۆی خودایەو بەس، یەزدانی مەزن لە هەموو مەزنێ مەزنترە هەموو جموجوولێ، وە هەموو هێزو تەوانایی بە دەستی خودایە، فەرمووی: ئەمجار هەر دووعایێ، یا هەر نزایێ بكا لەپاش گوتنی ئەم گوتەیە خودا نزاكەی گیرا دەكا فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): ئەگەر لەدوا ئەوە هەڵستێ‌و دەسنوێژ بگرێ‌و نوێژ بكا نوێژەكەشی قەبووڵ دەبێ (د/ت- س/ص).

٤٢٩٠- وقالت عَائِشَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنهَا) كانَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إِذَا اسْتَيْقَظَ مِنَ اللَّيْلِ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ أَسْتَغْفِرُكَ لِذَنْبِي وَأَسْأَلُكَ رَحْمَتَكَ، اللَّهُمَّ زِدْنِي عِلْمًا وَلاَ تُزِغْ قَلْبِي بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنِي، وَهَبْ لِي مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ . رَوَاهُ أبو داود [٢]:

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەشەو كاتێ لەخەو خەبەری دەبۆوە دەیفەرموو: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ أَسْتَغْفِرُكَ لِذَنْبِي وَأَسْأَلُكَ رَحْمَتَكَ، اللَّهُمَّ زِدْنِي عِلْمًا وَلاَ تُزِغْ قَلْبِي بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنِي، وَهَبْ لِي مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ): (د).

٤٢٩١- ← (ب- ١ز- ١٨١ل- ٤٩٢ف- ٥) [٣].

٤٢٩٢- ← (ب- ١ز- ١٨١ل- ٤٩٣ف- ٥) [٤].

٤٢٩٣- تەماشای ئەم جێگەیەیش بكە: (آداب النوم ودعائه) [٥].

---

[٢] سكت عن درجته الشارح.

[٢] تقدم برقم: ٩٧٧ مجلد اول. تسلسل/ ١٨١.

[٤] تقدم برقم: ٦/ ٩٧٠ مجلد اول. تسلسل/ ١٨١.

[٥] راجع تسلسل/ ٨ من هذا المجلد.

## ١٠) پاشەكی: باسی پەندو نموونەكان : (خاتمة في الأمثال)

٤٢٩٤- ← (ب- ١ز- ٩ل- ٥٤ف- ٨) [١].

٤٢٩٥- عَنِ عَبْدِاللّٰهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْعِشَاءَ، ثُمَّ أَخَذَ بِيَدِي وَخَرَجَ إِلَى بَطْحَاءِ مَكَّةَ فَأَجْلَسَنِي وَخَطَّ عَلَيَّ خَطًّا، وَقَالَ: لاَ تَبْرَحَهُ وَلا تُكَلِمُ أَحَداً، ثُمَّ ذَهَبَ وَجَاءَ في آخِرِ اللَّيْلِ فَدَخَلَ عَلَيَّ فِي خَطِّي فَتَوَسَّدَ فَخِذِي، فَرَقَدَ وَكَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا رَقَدَ نَفَخَ فَبَيْنَا أَنَا قَاعِدٌ وَهُوَ مُتَوَسِّدٌ فَخِذِي إِذَا أَنَا بِرِجَالٍ عَلَيْهِمْ ثِيَابٌ بِيضٌ اللّٰهُ أَعْلَمُ مَا بِهِمْ مِنَ الْجَمَالِ فَانْتَهَوْا إِلَيَّ، فَجَلَسَ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ عِنْدَ رَأْسِ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَطَائِفَةٌ مِنْهُمْ عِنْدَ رِجْلَيْهِ، ثُمَّ قَالُوا بَيْنَهُمْ: مَا رَأَيْنَا عَبْدًا قَطُّ أُوتِيَ مِثْلَ مَا أُوتِيَ هَذَا النَّبِيُّ، إِنَّ عَيْنَيْهِ تَنَامَانِ وَقَلْبُهُ يَقْظَانُ، اضْرِبُوا لَهُ مَثَلاً، مَثَلُ سَيِّدٍ بَنَى قَصْرًا ثُمَّ جَعَلَ مَأْدُبَةً فَدَعَا النَّاسَ إِلَى طَعَامِهِ وَشَرَابِهِ. فَمَنْ أَجَابَهُ أَكَلَ مِنْ طَعَامِهِ وَشَرِبَ مِنْ شَرَابِهِ وَمَنْ لَمْ يُجِبْهُ عَاقَبَهُ أَوْ قَالَ عَذَّبَهُ، ثُمَّ ارْتَفَعُوا وَاسْتَيْقَظَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: سَمِعْتَ مَا قَالَ هَؤُلاَءِ وَهَلْ تَدْرِي مَنْ هَؤُلاَءِ؟ قُلْتُ: اللّٰهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: هُمُ الْمَلاَئِكَةُ، فَتَدْرِي مَا الْمَثَلُ الَّذِي ضَرَبُوا؟ قُلْتُ: اللّٰهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: الْمَثَلُ الَّذِي ضَرَبُوا الرَّحْمَنُ (تَبَارَكَ وَتَعَالَى) بَنَى الْجَنَّةَ وَدَعَا إِلَيْهَا عِبَادَهُ، فَمَنْ أَجَابَهُ دَخَلَ الْجَنَّةَ، وَمَنْ لَمْ يُجِبْهُ عَاقَبَهُ أَوْ عَذَّبَهُ. رَوَاهُ الترمذي بسند صحيح[٢]:

عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) نوێژی خەوتنانی كردو، دەستی منی گرت و، دەرچوو بۆ سارای مەككە، كە ناودارە بە بەطحاء، لەوێ منی دانیشان و، هێڵێكی كێشا بە دەورما و، فەرمووی: لەم هێڵە دەرنەچیت و ئەم جەغزە بەجێ مەهێڵە و هەتا خۆم دێمەوە بۆلات قسە لەگەڵ كەس نەكەی! ئەنجا خۆی ڕۆیشت و شەوەكی هاتەوەو هاتە ناو هێڵەكەوە لەناو جەغزەكەدا سەری كردە سەر

---

[١] تقدم برقم: ٨/ ٦٨ مجلد اول. تسلسل/ ٩.

[٢] رواه الترمذي بسند صحيح.

رانی من‌و خەوت، عادەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وابوو كە دەخەوت دەیپرخاند، لەسەر ئەم حاڵە من دانیشتبووم سەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەسەر رانم بوو، پرخەی خەوی دەهات، تەماشام كرد وا دەستەیێ پیاو پەیدا بوون، هەموو جل‌و بەگی سپی چرپیان لەبەردا بوو، هەر خودا بۆ خۆی دەزانێ چەندە جوان‌و نازدار بوون، كە گەیشتنە لای من تاقمێكیان لە سەرینی پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دانیشتن‌و تاقمێكیشیان لە پایینیەوە، ئەوجا لەناو خۆیاندا فەرموویان: هەرگیزاو هەرگیز كەسمان نەدیوە (لە بەندەكانی خودا) كە وەك ئەم پێغەمبەرە نازدارە بەشی گەورەی پێ خەڵات كرابێ. چاوەكانی دەنوێ كەچی دڵی هەر وریایە، وێنەیێ، نموونەیێ بۆ ئەم پێغەمبەرە بهێننەوە بەیانی حاڵی بكا: مانەندی ئاغایێ وایە، كۆشكێ دروست بكاو نان دروست بكاو خەڵك بانگ بكا بۆ سەر نان‌و ئاو، جا ئەوەی بچێ بۆ سەر دەعوەتەكەی لەو نانە جوانە دەخوات‌و لەو خواردنەوە نایابە نۆش دەكا، ئەوەیشی نەچێ ئاغاكە تۆڵەی لێ دەسێنێ، یا فەرمووی: سزای دەدا، ئیتر پیاوەكان بەرزەوە بوون بۆ ئاسمان‌و نەمان لەبەر چاوم‌و ون بوون، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) خەبەری بۆوەو فەرمووی: گوێت لێ بوو كە ئەمانە چییان گوت، وە ئایا دەزانیت كە ئەوانە كێ بوون؟ گوتم: خوداو پێغەمبەر خۆیان باشتر دەزانن، فەرمووی: ئەوانە فریشتە بوون، ئەی دەزانی مانای قسەكەیان چییە؟ گوتم: خوداو پێغەمبەر خۆیان زۆر باش دەزانن. فەرمووی: ئەوە مەسەل‌و نموونەی خودای پیرۆزو گەورەیە، كە بەهەشتی دروست كردووەو بەندەكانی خۆی بانگ دەكا بۆ ئەوێ، جا هەركەسێ بچێ بە دەنگیەوە دەچێتە بەهەشت، هەر كەسێكیش نەچێ بە دەنگیەوە تۆڵەی لێ دەسێنێ یا سزای دەدا (ت- س/ص).

٤٢٩٦- عَنْ الْحَارِثَ الأَشْعَرِيَّ (رَضِيِ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِنَّ اللَّهَ أَمَرَ يَحْيَى بْنَ زَكَرِيَّا بِخَمْسِ كَلِمَاتٍ أَنْ يَعْمَلَ بِهَا وَيَأْمُرَ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنْ يَعْمَلُوا بِهَا، وَإِنَّهُ كَادَ أَنْ يُبْطِئَ بِهَا. فَقَالَ عِيسَى: إِنَّ اللَّهَ أَمَرَكَ بِخَمْسِ كَلِمَاتٍ لِتَعْمَلَ بِهَا وَتَأْمُرَ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنْ يَعْمَلُوا بِهَا، فَإِمَّا أَنْ تَأْمُرَهُمْ وَإِمَّا أَنَا آمُرُهُمْ، فَقَالَ يَحْيَى أَخْشَى إِنْ

سَبَقْتَنِي بِهَا أَنْ يُخْسَفَ بِي أَوْ أُعَذَّبَ، فَجَمَعَ النَّاسَ فِي بَيْتِ الْمَقْدِسِ، فَامْتَلأَ الْمَسْجِدُ وَقَعَدُوا عَلَى الشُّرَفِ فَقَالَ إِنَّ اللَّهَ أَمَرَنِي بِخَمْسِ كَلِمَاتٍ أَنْ أَعْمَلَ بِهِنَّ وَآمُرَكُمْ أَنْ تَعْمَلُوا بِهِنَّ. أَوَّلُهُنَّ أَنْ تَعْبُدُوا اللَّهَ وَلاَ تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا وَإِنَّ مَثَلَ مَنْ أَشْرَكَ بِاللَّهِ كَمَثَلِ رَجُلٍ اشْتَرَى عَبْدًا مِنْ خَالِصِ مَالِهِ بِذَهَبٍ أَوْ وَرِق، فَقَالَ هَذِهِ دَارِي وَهَذَا عَمَلِي فَاعْمَلْ وَأَدِّ إِلَيَّ، فَكَانَ يَعْمَلُ وَيُؤَدِّي إِلَى غَيْرِ سَيِّدِهِ، فَأَيُّكُمْ يَرْضَى أَنْ يَكُونَ عَبْدُهُ كَذَلِكَ، وَإِنَّ اللَّهَ أَمَرَكُمْ بِالصَّلاَةِ، فَإِذَا صَلَّيْتُمْ فَلاَ تَلْتَفِتُوا فَإِنَّ اللَّهَ يَنْصِبُ وَجْهَهُ لِوَجْهِ عَبْدِهِ فِي صَلاَتِهِ مَا لَمْ يَلْتَفِتْ، وَآمُرُكُمْ بِالصِّيَامِ فَإِنَّ مَثَلَ ذَلِكَ كَمَثَلِ رَجُلٍ فِي عِصَابَةٍ مَعَهُ صُرَّةٌ فِيهَا مِسْكٌ فَكُلُّهُمْ يُعْجِبُهُ رِيحُهَا وَإِنَّ رِيحَ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ. وَآمُرُكُمْ بِالصَّدَقَةِ فَإِنَّ مَثَلَ ذَلِكَ كَمَثَلِ رَجُلٍ أَسَرَهُ الْعَدُوُّ، فَأَوْثَقُوا يَدَهُ إِلَى عُنُقِهِ وَقَدَّمُوهُ لِيَضْرِبُوا عُنُقَهُ، فَقَالَ: أَنَا أَفْدِيهِ مِنْكُمْ بِالْقَلِيلِ وَالْكَثِيرِ، فَفَدَى نَفْسَهُ مِنْهُمْ. وَآمُرُكُمْ أَنْ تَذْكُرُوا اللَّهَ فَإِنَّ مَثَلَ ذَلِكَ كَمَثَلِ رَجُلٍ خَرَجَ الْعَدُوُّ فِي أَثَرِهِ سِرَاعًا حَتَّى إِذَا أَتَى عَلَى حِصْنٍ حَصِينٍ فَأَحْرَزَ نَفْسَهُ مِنْهُمْ، كَذَلِكَ الْعَبْدُ لاَ يُحْرِزُ نَفْسَهُ مِنَ الشَّيْطَانِ إِلاَّ بِذِكْرِ اللَّهِ تَعَالَى. قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): وَأَنَا آمُرُكُمْ بِخَمْسٍ اللَّهُ أَمَرَنِي بِهِنَّ: السَّمْعُ وَالطَّاعَةُ وَالْجِهَادُ وَالْهِجْرَةُ وَالْجَمَاعَةُ، فَإِنَّهُ مَنْ فَارَقَ الْجَمَاعَةَ قِيدَ شِبْرٍ فَقَدْ خَلَعَ رِبْقَ الإِسْلاَمِ مِنْ عُنُقِهِ إِلاَّ أَنْ يَرْجِعَ، وَمَنِ ادَّعَى دَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ فَإِنَّهُ مِنْ جُثَا جَهَنَّمَ، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَإِنْ صَلَّى وَصَامَ، قَالَ: وَإِنْ صَلَّى وَصَامَ فَادْعُوا بِدَعْوَى اللَّهِ الَّذِي سَمَّاكُمُ الْمُسْلِمِينَ الْمُؤْمِنِينَ عِبَادَ اللَّهِ. رَوَاهُ الترمذي والله أعلم. نسأل الله العلم والعمل والتوفيق. آمين[٣]:

حاریثی ئەشعەری (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خودای گەورە پێنج فەرمایشتی بە یەحیای كوڕی زەكەریا فەرموو، وە فەرمانی پێدا كە هەم خۆی ڕەفتاریان پێ بكا، هەم نەوەی ئیسرائیل، بەڵام یەحیا خەریك بوو سستییان تیا بكا، عیسایش فەرمووی پێی: تۆ خودا فەرمانی پێ كردووی كە خۆت و نەوەی یەعقووب ڕەفتار بەو پێنج فەرمایشتە بكەن، جا یا خۆت پێیان بفەرموو، یا من پێیان دەڵێم،

---

[٣] رَوَاهُ الترمذي بسند صحيح (شرحه).

فەرمانەکەی خودایان پێ رادەگەیەنم. یەحیا فەرمووی: دەترسم ئەگەر تۆ لەپێش مندا پێیان رابگەیەنی خودا من بە ناخی زەویدا رۆبچوێنێ، یاخود سزایەکی سەختم بدا جا لە بەیتولمەقدیسدا ئەوەندە خەڵکی کۆکردەوە هەتا مزگەوت پڕ بوو تەنانەت زۆرکەس لەسەر بانیژەو بالاجێ و کۆنگرەکان دانیشتبوون فەرمووی پێیان: من خودا فەرمانی پێ کردووم بەم پێنج فەرمایشتە کە هەم خۆم و هەم ئێوە رەفتاریان پێ بکەین، یەکەمیان ئەوەیە: کە تەنیا خودا بپەرستین و هیچ هاوبەشی بۆ پەیدا نەکەین، چەنکە ئەوەی هاوبەش دابنێ بۆ خودا وەك ئەو پیاوە وایە کە بە ماڵی ساغی خۆی (بە زێڕ یا بە زیوو) بەندەیێ بکرێ و پێی بڵێ: ئەمە ماڵەکەمەو ئەمەیش ئیشەکەمە، ئیش بکەو وەرە بیدەرە دەست خۆم، کەچی ئەویش بچێ ئیش بکاو بەلام نەیدا بە ئاغاکەی بەڵکوو بیدا بە کابرایەکی تر، ئایا کامتان رازی دەبێ کە بەندەی ئەو وابێ، دووەم: خودای گەورە فەرمانتان پێ دەکا بە نوێژ، کاتێ نوێژ دەکەن لەناو نوێژەکەدا ئاوڕ مەدەنەوە، چونکە لە نوێژدا خودا روو بەرووی بەندەی خۆی رادەوەستێ، بەمەرجێ لا نەکاتەوە! سێیەم: خودای مەزن فەرمانتان پێ دەکا بە رۆژوو گرتن، رۆژوو وەك ئەوە وایە پیاوێ لەناو تاقمێکا پریاسکەیێ میسکی پێ بێ، دیارە کە هەموو ئەو تاقمە بۆنی ئەو مسکەیان پێ خۆشە، جا بزانن کە بۆنی رۆژووەوان (لە لای خودای گەورەو سەروەر) لە بۆنی میسك گەلێ خۆشترە، چوارەم: خودای گەورە فەرمانتان پێ دەکا بەخێرو چاکەو زەکات، جا بزانن کە خێرو چاکە کردن وەك ئەوە وایە: کە پیاوێ دوژمن یەخسیری بکاو کۆت و زنجیری بکاو بیبات کەبدا لە گەردنی، ئەویش بڵێ: هەرچیم هەیە کەم و زۆر دەیدەم بە ئێوە لەجیاتی سەرم و سەرانەیان بداتێ و خۆی رزگار بکا لە دەستیان، پێنجەم: فەرمانیشتان پێ دەکا بە یادو زیکری خودا، یادو زیکری خودا وەك ئەوە وایە پیاوێ دوژمن نیشتبێتە سەری و بە هەڵەداوان بە شوێنیەوە بێ، بەلام خۆی بگەیەنێتە قەلایەکی قایم و لە شوێنێکی وادا خۆی قایم بکا کە دەستی ئەوانی پێ نەگا. جا بزانن بەندەیش ئاوایە بە یادو زیکری خودای گەورە

نەبێ خۆی لە شەیتان بۆ ناپارێزرێ. حەزرەت (صەلات‌و سەلام‌و دروودی خودای گەورەی لەسەر بێ) فەرمووی: منیش ئەمرتان پێ دەکەم بەم پێنج شتە کە خودا فەرمانی پێ کردووم پێیان.

یەکەم: گوێڕایەڵی فەرمانڕەوای خۆتان بن‌و فەرمانبەری بکەن.

دووەم: خەبات‌و تێکۆشان لە ڕێی خودادا قەت تەرک مەکەن.

سێیەم: کۆچ‌و هیجرەت بکەن لە مەککەوە بۆ مەدینە، تا کاتێ مەککەیش دەبێ بە وڵاتی ئیسلام.

چوارەم: هەمیشە لایەنگیری کۆمەڵەی موسوڵمانان بن قەت دوو بەرەکی‌و ناکۆکی بەرپا مەکەن، لەناو نەتەوەی ئیسلامدا چونکە ئەو کەسەی بەقەد بستێ لە کۆمەڵەی موسوڵمانان جیا ببێتەوە ئەوە بەڕاستی ڕشتەی ئیسلامەتی لە مل خۆی دادەماڵێ‌و فڕی بەسەر ئایینەوە نامێنێ هەتا دەگەڕێتەوە بۆ سەر ئیسلامەتی!

پێنجەم: هەر کەسێ منەیی داواو نەریت‌و عادەتە خراپەکانی سەردەمی نەزانی پێش هاتنی ئیسلام بکا، ئەوە لە پڵ‌و پووشی ئاگری دۆزەخە! پیاوێکیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! هەرچەند نوێژیش بکاو ڕۆژوویش بگرێ؟

فەرمووی: با نوێژیش بکاو ڕۆژوویش بگرێ. ئەدی ئێوە داواو فەرمانی ئەو خودایە برەو پێ بدەن‌و بڵاو بکەنەوە کە ئێوەی ناوناوە: میللەتی موسوڵمان، خاوەنی باوەڕو ئیمان، بەندە گەلی خودای میهرەبان (ت-س/ص).

يقول المؤلف (رضوان الله تعالى عليه): عدد أحاديث كتاب الرؤيا ستون حديثاً فقط:

دانەر (ڕەحمەتی لێ بێ) دەفەرموێ: ژمارەی فەرموودەکانی نامەی خەون تەنیا شەست فەرموودەیە.

بە بۆنەی فەرموودەی دووەمی ئەم باسەوە، کە حەزرەت (درووی خودای لەسەربێ) بە پەنجەی پیرۆزی خەتی کێشاوە، بە دەوری ئیبنو مەسعوود دا بۆ

حیفظ و پاراستنی، ئەم ڕووداوەتان عەرز دەکەم: ئەم کوردستانەی خۆمان هەروا وێرانە نەبوو، پیاوی پیاوانەی وای تیابوو شەیتان شەرمی لێ دەکردن مارو مێروو شەرم و شکۆیان لێ دەکردن و تەمەنناو سڵاوی ڕێزیان بۆ دەگرتن!

بەچاوی خۆم دیم، لە کەرکووك لە گەڕەکی ئازادی، لە بەردەم ماڵی شێخ عەبدولکەریمی کەرەبچنەدا (خودا لێی خۆش بێ) کۆڕی زیکری قادری بەسترابوو، دەروێشەکان حاڵیان لێ هاتبوو، عەشاماتێکی زۆر، لە کوردو عەرەب و تورکمان دەورەیان لێ دابوون شێخ عەبدولکەریم خۆی لەبەر قاپیەکەی خۆیا لەسە کورسییەك دانیشتبوو، بەینە بەینە بە تەئسیری سۆزی خەلیفەو دەروێشەکان فرمێسکی شادی و ڕەحمەت و شەفەقەت و دڵ پێ سووتان هۆن هۆن بە چاوەکانیدا دەهاتە خوارەوە، خەڵکەکەیش وەك ڕێچکەی مێروولە ریزیان بەستبوو، بە سەرە دەستیان ماچ دەکرد، زیکر تەواو بوو، صەڵاواتی کۆتایی لێ درا، تەپڵ و دەف کپ بوو، دەروێشێکی چڵکنەی کوڵکنەی بۆرەقنەی حاڵ لێ هاتوو، شا مارێکی بە دەستەوە بوو، بە پەنجەی لەسەر خۆڵی جێ زیکرەکە، لە ناوەڕاستی عەشاماتەکەدا، جەغزێکی گەورەی کێشاو، مارەکەی بەرەڵای ناو ئەو ئەڵقەیە کردو خۆی لەناویا وەستاو، پێی گوت: لەم خەتە دەرنەچی!

مارەکە بەناو جەغزەکەدا دەستی کرد بە خولانەوە، بە هیچ جۆرێ نەیدەتوانی لە خەتەکە دەربچێ، دەروێشەکە ناو بەناو فەمانی سەیر سەیری دەدا بە مارەکە، کە دەگەیشتە ئاستی شێخ، دەروێشەکە تێی دەخوڕی و دەیگوت: ئادەی تەمەنایێ بۆ شێخ بکە، مارەکەش بە ئاشکرا ڕادەوەستاو دوو سێ جار بەلای شێخ دا ملی خۆی لار دەکردەوەو وەك سڵاو بۆ شێخ بکا ئاوا.

خۆشەویستییەکی سەیر لە نێوانی شێخ و دەروێشەکانیدا هەبوو، شێخ خۆی لە دەروێشەکانی جیا نەدەکردەوە، بەڵام ئەوانەی کە بە چاوی ڕێز تەماشای ئەهلی تەریقەتیان نەکردایە، ئەویش زۆر بەبێ ڕێزی تەماشای

ئەوانی دەکرد، شێخ فەرمووی: موسوڵمانەکان! بە چاوی خۆتان دەبینن، لە بەرەکەتی قورئانی پیرۆزەوە، بە هیممەتی شێخ و پیرو مشایەخان، بەهۆی سۆزی دڵی ئەم دەروێشە هەژارانەوە ئەم مارو شا مارانە خودا کردوونی بە پەت و منالان وەك یارۆچکە گەمەیان پێ دەکەن. من چیم بەچاوی خۆم دیوە ئەوەم نووسیوە، زۆریشم لەسەر کەس نییە کە باوەڕ بە قسەکەم بکا، بەڵام داخەکەم هەندێکمان بە هەموو شتێکی خۆمان (ئەگەر کەراماتی ئەولیاش بێ) دەڵێن: خۆکردییەو خۆ کوردییە! بە یادی ئەو رۆژگارەوەکە ئەو وەجاخە رۆشنە لە کەرکووك بوو دەڵێم:

موسوڵمانی پاك، کوردی خانە دان

شێخی دڵ رووناك بە نووری یەزدان

لە کەرکووك مابوو، داخم نەویش رۆی

لە بەختی خۆمان، نە گوڵ ما، نە بۆی

سلێمانی/ دور الضباط

١٩٩٠/٧/٢٧ وەرگێڕ

بسم الله الرحمن الرحيم

# نامەی خەبات‌و تێکۆشان‌و غەزاکان

(ئەم نامەیە حەوت باسە)

## ١) باسی یەکەم: باسی گەورەیی خەبات‌و تێکۆشان لە رێگەی خودادا:

## كتاب الجهاد والغزوات وفيه سبعة أبواب (الباب الأول: فی فضل الجهاد)

قَالَ اللهِ تَعَالَى: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَى تِجَارَةٍ تُنجِيكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ، يَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَيُدْخِلْكُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ (٦١/١٠-١٢)}:

واتە: ئەی کەسانێ کە باوەڕتان بە خوداو بە پێغەمبەری خودا کردووە، ئایا حەزدەکەن شارەزاتان بکەم بۆ تیجارەت‌و بازرگانییەك کە لە سزای سەختی پاشە رۆژ رزگارتان بکا، ئەوە ئەوەیە باوەڕتان بە خوداو بە پێغەمبەری خۆتان پتەوو دامەزراو بکەن‌و لەگەڵ ئەوەدا بە سەرو بە ماڵ لە رێگەی خودای گەورەدا تێکۆشن‌و خەبات بگێڕن‌و بجەنگن لەگەڵ دوشمنانی ئایینی خودادا، بەهەر شێوەیێ بۆتان بلوێ، ئەگەر بزانن ئەمەتان زۆر چاکترو باشترە بۆ پاشە رۆژو بۆ جیهانیشتان ئەگەر ئاوا بکەن خودا تاوانتان دەبەخشێ‌و دەتانخاتە ناو بەهەشتێکی واوە کە جۆبار لە ژێر دارەکانیەوە، رەوان دەبێ‌و هەروەها چەن کۆشك‌و خانوو ماڵی جوان جوانتان دەداتێ، کەوان لەناو بەهەشتانی عەدندا کە بەڕاستی جێگەی دانیشتن‌و رابواردن‌و حەوانەوەو حەسانەوەن، ئەمەیش بەڕاستی بەهرەیەکی ئێجگار گەورەو پیرۆزەو گەیشتنە بە پایەی پیرۆزی‌و سەرکەوتنی گەورە.

٤٢٩٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَبِرَسُولِهِ وَأَقَامَ الصَّلَاةَ وَصَامَ رَمَضَانَ كَانَ حَقًّا عَلَى اللَّهِ أَنْ يُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ، جَاهَدَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، أَوْ جَلَسَ فِي أَرْضِهِ الَّتِي وُلِدَ فِيهَا، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفَلَا نُبَشِّرُ النَّاسَ؟ قَالَ: إِنَّ فِي الْجَنَّةِ مِائَةَ دَرَجَةٍ أَعَدَّهَا اللَّهُ لِلْمُجَاهِدِينَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ مَا بَيْنَ

الدَّرَجَتَيْنِ كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ، فَإِذَا سَأَلْتُمُ اللَّهَ فَاسْأَلُوهُ الْفِرْدَوْسَ، فَإِنَّهُ أَوْسَطُ الْجَنَّةِ وَأَعْلَى الْجَنَّةِ، أُرَاهُ، قَالَ: فَوْقَهُ عَرْشُ الرَّحْمَنِ، وَمِنْهُ تَفَجَّرُ أَنْهَارُ الْجَنَّةِ. رَوَاهُ البخاري هنا والترمذي في الْجَنَّة [1]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر كەسێ باوەڕ بە خوداو پێغەمبەری خودا بكاو، نوێژ بكاو رۆژووی رەمەزان بگرێ، دەبێ بە ماڵ لەسەر خودا كە بیباتە ناو بەهەشتەوە، ئیتر چی لە ماڵی خۆیدا دابنیشێ، لەو ولاتەی كە لەوێ لە دایك بووە، یا بڕوا بۆ خەبات و كۆشش لە رێگەی خودادا. یارانی حەزرەتیش (درودی خودای لەسەربێ): گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! با ئەم مژدە خۆشە بدەین بە هەموو كەسێ. فەرمووی: ئاخر بزانن كە سەد پایەی بەرزو بەڕێز هەیە لە بەهەشتا خودا ئامادەی كردوون بۆ ئەو كەسانە كە خەبات دەگێڕن و كۆشش دەكەن لە رێگەی خودادا، نێوانی ئەم پایە هەتا ئەو پایە بەقەی نێوانی عەردو ئاسمان لەیەك دوورن، جا كاتێ لە خودا داواتان كرد داوای فیردەوسی لێ بكەن چونكە هەم نایابترین و... وا دەزانم فەرموویشی: هەم بڵندترینی شوێنی بەهەشتە فەرمووی: لە ژوور ئەویشەوە تەخت و بارەگای خودای میهرەبانە، لەوێوە رووبارەكانی بەهەشت هەڵدەقوڵێن (ب/ت).

٤٢٩٨- وعَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: تَضَمَّنَ اللَّهُ لِمَنْ خَرَجَ فِي سَبِيلِهِ لاَ يُخْرِجُهُ إِلاَّ جِهَادًا فِي سَبِيلِي وَإِيمَانًا بِي وَتَصْدِيقًا بِرُسُلِي فَهُوَ عَلَيَّ ضَامِنٌ أَنْ أُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ أَوْ أَرْجِعَهُ إِلَى مَسْكَنِهِ الَّذِى خَرَجَ مِنْهُ نَائِلاً مَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ أَوْ غَنِيمَةٍ وَالَّذِى نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ مَا مِنْ كَلْمٍ يُكْلَمُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ إِلاَّ جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَهَيْئَتِهِ حِينَ كُلِمَ، لَوْنُهُ لَوْنُ دَمٍ وَرِيحُهُ مِسْكٌ وَالَّذِى نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَوْلاَ أَنْ يَشُقَّ عَلَى الْمُسْلِمِينَ مَا قَعَدْتُ خِلاَفَ سَرِيَّةٍ تَغْزُو فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَبَدًا وَلَكِنْ لاَ أَجِدُ سَعَةً فَأَحْمِلَهُمْ وَلاَ يَجِدُونَ سَعَةً وَيَشُقُّ عَلَيْهِمْ أَنْ يَتَخَلَّفُوا عَنِّى وَالَّذِى نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَوَدِدْتُ أَنِّى أَغْزُو فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَأُقْتَلُ

---

[1] بخاري. جهاد: ٢٧٩٠ ، ٧٤٢٣.

ثُمَّ أَغْزُو فَأُقْتَلُ ثُمَّ أَغْزُو فَأُقْتَلُ . رَوَاهُ مسلم والبخاري ولفظه: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوَدِدْتُ أَنِّي أُقْتَلُ فِي سَبِيلِ اللّٰهِ فَأَحْيَا ثُمَّ أُقْتَلُ فَأَحْيَا ثُمَّ أُقْتَلُ فَأَحْيَا ثُمَّ أُقْتَلُ [٢]:

دیسان ئەو (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: کەسێ بڕوا بۆ خەبات و غەزاو تێکۆشان لەرێی خودادا خودا بۆ خۆی دەبێ بە دەستەبەر (زامن)ی و، دەفەرموێ: خۆم کەفیلی ئەوم کە یەکێ لەم دوو خەڵاتە گەورەیەی پێ بدەم: یا بیبەمە ناو بەهەشت، یا بیبەمەوە بۆ شوێنی خۆی لەگەڵ ئەو هەموو پاداشی گەورەو تالانییە زۆرەی کە دەستی دەکەوێ! بەمەرجێ ئەو تێکۆشەرە کە دەچێ بۆ ئەو غەزاو کۆششە مەبەستی تەنیا رەزامەندی خودابێ و باوەڕو ئیمانی بە من و پێغەمبەرانی من هەبێ، بەو کەسە کە گیانی موحەممەدی بەدەستە، دیارە کە یەزدانی پاکە، هەر کەسێ لە رێی خودادا زامار بکرێ لە رۆژی قیامەتا کە دێ بۆ دیوانی خودا زامەکەی تازەو نوێیە وەکوو تازە ئەو دەمە زامار کرابێ ئاوایە، لەسەر هەمان شێوەیە، رەنگەکەی سووری تلیقییە، وەکوو خوێنی ئاسایی، بەڵام بۆنەکەی بۆنی میسکە.

بەو کەسە گیانی موحەممەدی بە دەستە (دروودی خودای لەسەربێ) دەترسم کە موسوڵمانان تووشی رەنج و سەخڵەتی ببن ئەگینا ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە ئەوا لەگەڵ هەموو تاقمە موسوڵمانێکا کە دەچن بۆ غەزاو خەبات خۆشم لەگەڵیانا دەچووم، بەڵام ئەمە ناکرێ: چونکە نە خۆم ئەو تواناییەم هەیە کە وولاخی سواری بۆ هەموویان پەیدا بکەم و، نە خۆشیان ئەو دەستەیان دەڕوا، لەهەمان کاتدا زۆریش بە زەحمەتی دەزانن و لە شانیان گرانە ئەگەر من بچم بۆ غەزاو ئەوان نەیەن! بەو خودایە کە گیانی موحەممەدی لە دەستدایە، بە حەزی دڵ پڕ بە دڵ حەزدەکەم کە لە رێگەی خودادا بچم بۆ غەزاو لەو غەزایەدا بکوژرێم، دیسان زیندوو ببمەوەو بچمەوە بۆ غەزاو هەمدیسان بکوژرێمەوە،

---

[٢] تجرید/ ١/ ٥٥ رقم: ٣٤ - ٣٦ ، ٢٧٨٧ ، ٢٧٩٧ ، ٢٩٧٢ ، ٣١٢٣ ، ٧٢٢٦ ، ٧٢٢٧ ، ٧٤٦٣ ، ٧٤٥٤. مسلم. جهاد: ٤٨٣٦ — ٤٨٣٨.

هەمدیسان زیندوو ببمەوەو بچمەوە بۆ غەزاو هەمدیسان بکوژرێمەوە! (ش) گفتەی (لفظ)ی بوخاری ئاوایە: بەو کەسە کە گیانی موحەممەدی وا لەدەستا، پڕ بە دڵ حەزدەکەم کە لە ڕێگەی خودادا بکوژرێم‌و لەپاشا زیندوو ببمەوەو دیسان بکوژرێمەوەو، هەمدیس زیندوو ببمەوەو هەمدیس بکوژرێمەوە، هەمدیسان زیندوو ببمەوەو هەمدیسانەوە جارێکی تریش بکوژرێمەوە!

٤٢٩٩- وَعَنْهُ قِيلَ: يا رسول الله مَا يَعْدِلُ الْجِهَادَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ؟ قَالَ: لاَ تَسْتَطِيعُونَهُ، فَأَعَادُوا عَلَيْهِ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا كُلُّ ذَلِكَ يَقُولُ لاَ تَسْتَطِيعُونَهُ، وَقَالَ فِي الثَّالِثَةِ: مَثَلُ الْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ كَمَثَلِ الصَّائِمِ الْقَائِمِ الْقَانِتِ بِآيَاتِ اللَّهِ لاَ يَفْتُرُ مِنْ صَلاَةٍ وَلاَ صِيَامٍ حَتَّى يَرْجِعَ الْمُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ تَعَالَى [٣]:

دیسان ئەو (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا! چی هاوتای خەبات‌و تێکۆشان لە ڕێگای خودای گەورەدا دەکا؟ فەرمووی: ئەوە بە ئێوە ناکرێ دووجار یا سێ جار ئەم پرسیارەیان لێکردەوە، هەر دەیفەرموو: ئەوە بە ئێوە ناکرێ لە جاری سێیەما فەرمووی: وێنەی کەسێ لە ڕێگەی خودادا بچێ بۆ خەبات‌و کۆشش‌و ببێ بە تێکۆشەر لە ڕێگەی خودادا وەك وێنەی ئەو کەسە وایە کە هەتا ئەو دەگەڕێتەوە بۆ جێگەی خۆی ئەویش سەرو مڕ هەر نوێژ بکاو هەمیشە بەڕۆژوو بێ‌و یەك دەم چییە لە نوێژو ڕۆژوو سارد نەبێتەوە، وە ڕەفتاریش بە ئایەتەکانی قورئان بکا (ش/ت/ن).

٤٣٠٠- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لَقَابُ قَوْسٍ فِي الْجَنَّةِ خَيْرٌ مِمَّا تَطْلُعُ عَلَيْهِ الشَّمْسُ وَتَغْرُبُ. وَقَالَ: لَغَدْوَةٌ أَوْ رَوْحَةٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ خَيْرٌ مِمَّا تَطْلُعُ عَلَيْهِ الشَّمْسُ وَتَغْرُبُ. رَوَاهُما الخمسة إلاّ أبا داود [٤]:

---

[٣] تجريد/ ٣/ ٢٧٩ رقم: ١١٤٦ = ٢٧٨٥ + ١١٤٨ = ٢٧٨٧ فتح الباري شرح صحيح البخاري. مسلم. جهاد: ٤٨٤٦. ترمذي. جهاد: ١٦١٩ تحفة الأشراف: ١٢٧٩١.

[٤] تجريد/ ٣/ ٢٨٢ رقم/ ١١٥٠ = ٢٧٩٢ ، ٢٧٩٦ ، ٦٧٦٨. مسلم. جهاد: ٤٨٥٤ ، ٤٨٥٠ — ٤٨٥٥. نسائي. جهاد: ٣١١٨ ، ٣١١٩٩.

دیسان فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بەقەی جێ کەوانێ لە بەهەشتدا لە هەموو جیهان باشترە. وە فەرموویشی (دروودی خودای لەسەربێ): تاقێ کۆشش‌و تێکۆشان لە ڕێگەی خودادا (چی تاقی بەیانی بێ‌و چی تاقی ئێواری بێ) لەهەموو سامان‌و موڵکی جیهان چاکترە! (ش/ت/ن).

٤٣٠١- وَللبخاري والترمذي: وَلَوْ أَنَّ امْرَأَةً مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ اطَّلَعَتْ إِلَى أَهْلِ الأَرْضِ لأَضَاءَتْ مَا بَيْنَهُمَا وَلَمَلأَتْهُ رِيحًا، وَلَنَصِيفُهَا عَلَى رَأْسِهَا خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا[٥]:

حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەگەر بێتوو ئافرەتێ (لە دانیشتوانی بەهەشت) خۆی نیشانی دانیشتوانی سەر زەوی بدا لەبەر شەوقی ئەو نێوانی بەهەشت‌و زەوی هەمووی ڕۆشن دەبێتەوەو پڕی دەبێ لە بۆن‌و بەرامەی خۆش! سەرپۆشی سەری ژنی بەهەشتی باشترە لە جیهان‌و هەرچی لە جیهاندا هەیە (ب/ت).

٤٣٠٢- وَسُئِلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَيُّ النَّاسِ أَفْضَلُ؟ فَقَالَ: مُؤْمِنٌ يُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِمَالِهِ وَنَفْسِهِ، قَالُوا: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: مُؤْمِنٌ فِي شِعْبٍ مِنَ الشِّعَابِ يَتَّقِي اللَّهَ وَيَدَعُ النَّاسَ مِنْ شَرِّهِ. رَوَاهُ الخمسة (رَضوان الله تَعَالَى عَلَيْهِم وعلى المؤلف) [٦]:

پرسیار کرا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ): چاکترین کەس کێیە؟ فەرمووی: ئەو موسوڵمانەی کە بە گیان‌و سامان، بە سەرو بە ماڵ لە ڕێگەی خودادا تێ دەکۆشێ گوتیان: ئەی دوای ئەو کێ چاکترینە؟ فەرمووی: ئەو موسوڵمانەی کە لە پەنایەکا خودای خۆی بە جوانی دەپەرستێ، وە لە خودای گەورە دەترسێ‌و ئازاری کەس نادا. (ش/د/ت/ن- ڕەزای خوایان لێ بێ).

---

[٥] تجريد = مختصر صحيح البخاري/ ٣/ ٢٨٣ رقم: ١١٥٢ = ٢٧٩٦ فتح الباري شرح صحيح البخاري.

[٦] تجريد/ ٣/ ٢٨٠ رقم: ١١٤٧ = ٢٧٨٦ ، ٦٤٩٤ = فتح الباري. مسلم. جهاد: ٤٨٦٣ — ٤٨٦٨. أبو داود. جهاد: ٢٤٨٥. ترمذي: جهاد: ١٦٦٠. نسائي. جهاد: ٣١٠٥. ابن ماجة. فتن: ٣٩٧٨.

٤٣٠٣- وَللشيخين: يَضْحَكُ اللَّهُ إِلَى رَجُلَيْنِ يَقْتُلُ أَحَدُهُمَا الآخَرَ يَدْخُلاَنِ الْجَنَّةَ، يُقَاتِلُ هَذَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَيُقْتَلُ، ثُمَّ يَتُوبُ اللَّهُ عَلَى الْقَاتِلِ فَيُسْتَشْهَدُ [٧]:

حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: کاری ئەم دوو پیاوە ئەوەندە سەیرو عەنتیکەیە خودای گەورە بۆ خۆی پێکەنینی پێیان دێ، ئەوەندە کەیفی بە کارەکەیان دێ، یەکێکیان ئەوی تریان دەکوژێ، کەچی هەردووکیشیان دەچنە بەهەشت! لە پێشا یەکەمیان لە ڕێگەی خودادا دەجەنگێ هەتا بە دەستی ئەویتریان دەکوژرێ، لەپاشا بکوژەکەش تەوبە دەکاو خودا پەشیمانی لێ گیرا دەکاو ئەویش شەهید دەکرێ‌و لە ئەنجامدا کوژراوی یەکەم‌و بکوژەکەی (کە ئەویش شەهید دەکرێ‌و) هەردوو لا پێکەوە دەچنە بەهەشت! (ش).

٤٣٠٤- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ له: يَا أَبَا سَعِيدٍ مَنْ رَضِيَ بِاللَّهِ رَبًّا وَبِالإِسْلاَمِ دِينًا وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيًّا وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ، فَعَجِبَ لَهَا أَبُو سَعِيدٍ فَقَالَ: أَعِدْهَا عَلَيَّ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَفَعَلَ، ثُمَّ قَالَ: وَأُخْرَى يُرْفَعُ بِهَا الْعَبْدُ مِائَةَ دَرَجَةٍ فِي الْجَنَّةِ مَا بَيْنَ كُلِّ دَرَجَتَيْنِ كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ، قَالَ: وَمَا هِيَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ . رَوَاهُ مسلم والنسائي [٨]:

ئەبو سەعیدی خوردی (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی پێم: ئەی ئەبو سەعید! ئەوەی خودا بە خودای خۆی بزانێ‌و ئیسلام بە ئایینی خۆی دابنێ‌و موحەممەد بە پێغەمبەری خۆی قەبووڵ بکا ئیتر بەهەشت بۆ خۆی مسۆگەر دەکا! گوتی: منیش ئەم فەرمایشتەم زۆر بەلاوە خۆش‌و دڵگیر بوو، عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆم دووبارە بکەرەوە، ئەویش دووبارەی کردەوە بۆم، ئەنجا فەرمووی: بەڵام پایەیەکی تریش هەیە، بەندە لە بەهەشتا سەد پلە پێی بەرز دەبێتەوە کە نێوانی هەموو

[٧] بخاري. جهاد (تجريد / ٣/ ٢٩٣ رقم: ١١٦٢ = ٢٨٢٦. مسلم. جهاد: ٤٨٧١).

[٨] مسلم. جهاد: ٤٨٥٦. نسائي. جهاد: ٣١٣١ تحفة الأشراف: ٤١١٢.

دوو پلەیەکی بە قەد نێوانی ئاسمان‌و زەوی دەبێ! گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە چییە؟ فەرمووی: ئەوە کۆشش‌و تێکۆشان‌و خەبات گێڕانە لە ڕێگەی خودادا، دوو جار ئەم وشە پیرۆزەی دووبارە کردەوە (م/ن).

٤٣٠٥- ولأبي داود: ثَلاَثَةٌ كُلُّهُمْ ضَامِنٌ عَلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ: رَجُلٌ خَرَجَ غَازِيًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَهُوَ ضَامِنٌ عَلَى اللَّهِ حَتَّى يَتَوَفَّاهُ فَيُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ أَوْ يَرُدَّهُ بِمَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ وَغَنِيمَةٍ، وَرَجُلٌ رَاحَ إِلَى الْمَسْجِدِ فَهُوَ ضَامِنٌ عَلَى اللَّهِ حَتَّى يَتَوَفَّاهُ فَيُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ أَوْ يَرُدَّهُ بِمَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ وَغَنِيمَةٍ، وَرَجُلٌ دَخَلَ بَيْتَهُ بِسَلاَمٍ فَهُوَ ضَامِنٌ عَلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ[٩].

حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەم سێ کەسە خودای گەورەو سەروەر بۆ خۆی زامنیانە: یەکەم: ئەو پیاوەی دەچێ بۆ غەزا بۆ ڕەزای خودا، ئەوە خودا دەبێ بە کەفیل‌و دەستەبەری: یا گیانی وەردەگرێ‌و دەیباتەوە بۆلای خۆی‌و دەیباتە بەهەشت، یا بە پاداش‌و بەش‌و بارەو تالانێکی باشەوە دەیباتەوە بۆ جێگەی خۆی، دووەم: ئەو پیاوەی کە هاموشۆی مزگەوت دەکا، بۆ خوا پەرستی، یا بۆ دەرس خوێندن‌و دەرس گوتنەوە ئەوە ئەویش خودا دەبێ بە کەفیل‌و زامن‌و دەستەبەری: یا گیانی وەردەگرێ‌و دەیباتەوە بۆ لای خۆی‌و دەیباتە بەهەشت یا بە پاداش‌و بەش‌و بارەو تالانێکی باشەوە دەیباتەوە بۆ جێگەی خۆی، سێیەم: ئەو پیاوەی کە بەبێ وەی‌و بەبێ وەزن‌و ئازار بچێتەوە ماڵی خۆی ئەوە خودا دەستەبەریی ئەویش دەکاو ئەویش لە ئامانی خودادایە. (د- سند صالح).

٤٣٠٦- و لمسلم وأبي داود والنسائي: مَا مِنْ غَازِيَةٍ أَوْ سَرِيَّةٍ تَغْزُو فَتَغْنَمُ وَتَسْلَمُ إِلاَّ كَانُوا قَدْ تَعَجَّلُوا ثُلُثَيْ أُجُورِهِمْ. وَمَا مِنْ غَازِيَةٍ أَوْ سَرِيَّةٍ تُخْفِقُ وَتُصَابُ إِلاَّ تَمَّ أُجُورُهُمْ[١٠].

---

[٩] رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ بسند صالح. (شرحه)

[١٠] مسلم. جهاد: ٤٩٠٢ ، ٤٩٠٣ ، أبُو دَاوُدَ. جهاد: ٢٤٩٧. نسائي. جهاد: ٣١٢٥. إبن ماجة ، جهاد: ٢٧٨٥ تحفة الأشراف: ٨٨٤٧.

حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر کۆمەڵە موسوڵمانێ (کەم بن یا زۆر) بچن بۆ غەزایێ‌و، لەو غەزایەدا تالأنیان دەست بکەوێ، بەلأم بەبێ زیان، بە سەلامەتی بگەڕێنەوە ئەوە پێشەکی دوو سێیەکی پاداشی خۆیان وەرگرتووە، خۆ ئەگەر ئەو کۆمەڵە سەرنەکەوتن‌و پێکران‌و لێدران ئەوە پاداشی تەواویان بۆ حلێب دەکرێ (م/د/ن).

٤٣٠٧- و للبخاري والنسائي والترمذي: مَا اغْبَرَّتْ قَدَمَا عَبْدٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَتَمَسَّهُ النَّارُ [١١]:

حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەو بەندەیەی بۆ ڕەزای خودا قاچەکانی خۆڵاوی ببن (وەك ئەوە بچێ بۆ نوێژی هەینی‌و لە ڕێ تەپو تۆز لە پێی یا لە خۆی بنیشێ، یا وەك ئەوە بچێ بۆ غەزاو پێی تۆزاوی ببێ) ئیتر ئاگری دۆزەخ چەشکەی ناکا (ب/ن).

٤٣٠٨- وللترمذي: لاَ يَلِجُ النَّارَ رَجُلٌ بَكَى مِنْ خَشْيَةِ اللَّهِ حَتَّى يَعُودَ اللَّبَنُ فِي الضَّرْعِ، وَلاَ يَجْتَمِعُ غُبَارٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَدُخَانُ جَهَنَّمَ [١٢]:

حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەوکەسەی ترسی خودای لە دڵدا بێ‌و دڵی گەرم ببێ‌و لە ترسی خودا بگری ناچێتە ناو دۆزەخ، وەك چۆن شیرێ کە دۆشرا ناچێتەوە ناو گوانی ئاژەڵەکە ئاوا، هەروەها گەردی ڕێگەی خوداو چڕو دووکەڵی دۆزەخیش قەت یەك ناگرن واتە: ئەوەی تۆزی ڕێگەوبانی خەبات‌و غەزای لێ بنیشێ، دووکەڵی دۆزەخ ناچێ بەسەریدا(ت).

٤٣٠٩- لە تەفسیری سوورەتی مومتەحینەدا ڕۆیشت فەرموودەی یەکەم، حەدیثەکەی ئیمامی عەلی‌و نامەکەی حاطب [١٣].

٤٣١٠- وللشيخين والترمذي: وَاعْلَمُوا أَنَّ الْجَنَّةَ تَحْتَ ظِلاَلِ السُّيُوفِ [١٤]:

---

[١١] بخاري. جهاد: ٢٨١١.

[١٢] سكت عَن درجته الشارح.

[١٣] تقدم برقم: ١/ ٤١٦٣. مجلد سابع. تسلسل/ ٤٣.

حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: بزانن کەوا بەهەشت وا لە سای شمشێردا (ش/ت).

٤٣١١- ولمسلم وأبي داود والنسائي: مَنْ مَاتَ وَلَمْ يَغْزُ وَلَمْ يُحَدِّثْ بِهِ نَفْسَهُ مَاتَ عَلَى شُعْبَةٍ مِنْ نِفَاقٍ [١٥].

حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەوەی بمرێ‌و غەزای نەکردبێ‌و لە دڵیشیەوە لە ژیانیدا بەتەمای غەزا نەبووبێ ئەوە کە دەمرێ رەگێکی مونافیقی تیایە! (م/د/ن).

٤٣١٢- ولمسلم وأبي داود: لاَ يَجْتَمِعُ كَافِرٌ وَقَاتِلُهُ فِي النَّارِ أَبَدًا[*][١٦].

٤٣١٣- عَنْ أُمِّ حَرَامٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهَا) قَالَتْ: أَتَانَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَوْمًا فَقَالَ عِنْدَنَا فَاسْتَيْقَظَ وَهُوَ يَضْحَكُ، فَقُلْتُ: مَا يُضْحِكُكَ يَا رَسُولَ اللّٰهِ بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي؟ قَالَ: أُرِيتُ قَوْمًا مِنْ أُمَّتِي يَرْكَبُونَ ظَهْرَ الْبَحْرِ كَالْمُلُوكِ عَلَى الأَسِرَّةِ، فَقُلْتُ: ادْعُ اللّٰهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، قَالَ: فَإِنَّكِ مِنْهُمْ، ثُمَّ نَامَ فَاسْتَيْقَظَ أَيْضًا وَهُوَ يَضْحَكُ فَسَأَلْتُهُ فَقَالَ مِثْلَ مَقَالَتِهِ، فَقُلْتُ: ادْعُ اللّٰهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، قَالَ: أَنْتِ مِنَ الأَوَّلِينَ، قَالَ: فَتَزَوَّجَهَا عُبَادَةُ بْنُ الصَّامِتِ بَعْدُ فَغَزَا بِهَا فِي الْبَحْرِ فَحَمَلَهَا مَعَهُ فَلَمَّا أَنْ جَاءَتْ قُرِّبَتْ لَهَا بَغْلَةٌ فَرَكِبَتْهَا فَصَرَعَتْهَا فَمَاتَتْ. رَوَاهُ الخمسة [١٧].

ئوممو حەرام (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: رۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هات بۆماڵمان، وە لە ماڵی ئێمە سەر خەوی نیوەڕۆی شکان، کاتێ خەبەری بۆوە پێ دەکەنی. گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! باوک‌و دایکم

---

[١٤] مسلم. جهاد: ٤٨٩٣. ترمذي. جهاد: ١٦٥٩.

[١٥] مسلم. جهاد: ٤٩٠٨. أبو داوُد. جهاد. ٢٥٠٢. نسائي. جهاد: ٣٠٩٧ تحفة/ ١٢٥٦٧.

[*] پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: (خودا نەناس‌و ئەوەی دەیکوژێ ئەم دوو کەسە قەت لە دۆزەخدا کۆ نابنەوە).

[١٦] مسلم. جهاد: ٤٨٧٢ ، ٤٨٧٣. أبو داوُد. جهاد: ٢٤٩٥.

[١٧] بخاري. جهاد: ٢٧٨٨ ، ٢٧٨٩ ، ٦٢٨٢ ، ٦٢٨٣ ، ٧٠٠١. مسلم. جهاد: ٤٩١١. أبو داوُد. جهاد: ٢٤٩١. ترمذي. جهاد: ٢٤٩١. نسائي. جهاد: ١٦٤٥.

بەقوربانت بن بۆچی پێ دەکەنی؟ فەرمووی: لەخەوما کۆمەڵێ لە گەلی خۆمم دی، سواری پشتی ئەم دەریایە دەبن، شوێن و جێگەیان ئەوەندە باش و خۆش و ئاوەدانە دەڵێی پاشان لەسەر تەخت و قەنەفەی شاهانە دانیشتوون. منیش گوتم: لە خودا داوا بکە کە بمکا بە یەکێ لەم چینەی ئۆمەتت، فەرمووی: تۆ لەوانیت! جا دیسان حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) سەری نایەوەو خەوتەوە کە هەڵسایەوە دیسان پێ دەکەنی، کە پرسیارم لێ کردەوە هەمان وەڵامی پێشووی دامەوە، گوتم: لە خودا بپارێرەوە کە بمکا بە یەکێ لەوانە فەرمووی: تۆ لە دەستەی یەکەمیت!. قسە گێرەرەوە دەڵێ: لە پاشا عوبادەی کوری صامیت ئوممو حەرام مارە دەکاو لە دەریاوە بردی بۆ غەزا، کاتێ هاتەوەو گەرایەوە هێسترە ماچەیەکیان بۆیبر کە سواری هێسترەکە بوو هێسترەکە گلاندی و کەوتە خوارەوەو مردو بە پێی دووعاکەی پێغەمبەر کە بۆیی کرد شەهید بوو (ش/د/ت/ن).

٤٣١٤- وَعَنْها عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: الْمَائِدُ فِي الْبَحْرِ الَّذِي يُصِيبُهُ الْقَيْءُ لَهُ أَجْرُ شَهِيدٍ وَالْغَرِقُ لَهُ أَجْرُ شَهِيدَيْنِ : رَوَاهُ أبو داود [١٨]:

دیسان فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەو کەسەی لە دەریادا تووشی سەرە خولێ دەبێ و دەرشێتەوە پاداشی شەهیدێکی بۆ هەیە، وە ئەو کەسەی لە ئاودا دەخنکێ پاداشی دوو شەهیدی بۆ هەیە (د- س/صالح).

٤٣١٥- وللترمذي والنسائي: مَنْ قَاتَلَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ مِنْ رَجُلٍ مُسْلِمٍ فُوَاقَ نَاقَةٍ وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ [١٩]:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر پیاوێکی موسوڵمان ئەوەندەی وشتر دۆشینێ جەنگ بکا بۆ رەزای خودا بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێ! (ت/ن:س/ح).

---

[١٨] رَوَاهُ أبُو دَاوُدَ بسند صالح (شرحه).

[١٩] ترمذي والنسائي بسند حسن (شرحه).

**٤٣١٦- وهما أيضاً: وَمَنْ شَابَ شَيْبَةً فِي سَبِيلِ اللّٰهِ كَانَتْ لَهُ نُورًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ[٢٠]:**

**حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: هەر کەسێ لە ڕێگەی خودادا چەند تەڵێ لە مووی سەرو ڕیشی سپی ببێ لە ڕۆژی قیامەتدا بۆی دەبێ بە نوور! (ت/ن–س/ص).**

**٤٣١٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) عَنْ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **قَالَ: أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِخَيْرِ النَّاسِ؟ رَجُلٌ مُمْسِكٌ بِعِنَانِ فَرَسِهِ فِي سَبِيلِ اللّٰهِ؟ أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِالَّذِي يَتْلُوهُ؟ رَجُلٌ مُعْتَزِلٌ فِي غُنَيْمَةٍ لَهُ يُؤَدِّي حَقَّ اللّٰهِ فِيهَا أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِشَرِّ النَّاسِ؟ رَجُلٌ يُسْأَلُ بِاللّٰهِ وَلاَ يُعْطِي بِهِ . رَوَاهُ الترمذي ومسلم[٢١]:**

**ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: ئەدی با پێتان بڵێم کە باشترین کەس کێیە؟ ئەو پیاوەیە کە هەمیشە جڵەوی ماینەکەی بە دەستیەوەیەو هەموو کاتێ ئامادەیە بۆ تێکۆشان لە ڕێگەی خودادا، ئەدی با پێشتان بڵێم لە دوای ئەو کێی تر باشە؟ ئەو پیاوەیە کە لە پەنایەکا ڕانۆچکەیەکی هەیە، واتە: چەن سەرێ بزن‌و مەڕی هەیە، مافی خودایان لێ دەداو هەقی خودایان لەسەر ناچوێنێ! ئەدی با پێشتان بڵێم کە بەدترین کەسیش کێیە؟ ئەو کەسەیە کە بە خاتری خودا داوای شتی لێ دەکەن‌و ئەو شتەشی هەیەو خاتری خودا ناگرێ‌و شتەکە نادات! (ت/م).**

**٤٣١٨- وَمَا قَالَتْ نفس رجُلٍ إِلى العُزلة فسأل النَّبِيَّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **عَنْهَا، فَقَالَ: لاَ تَفْعَلْ فَإِنَّ مَقَامَ أَحَدِكُمْ فِي سَبِيلِ اللّٰهِ أَفْضَلُ مِنْ صَلاَتِهِ فِي بَيْتِهِ سَبْعِينَ عَامًا. أَلاَ تُحِبُّونَ أَنْ يَغْفِرَ اللّٰهُ لَكُمْ وَيُدْخِلَكُمُ الْجَنَّةَ؟ اغْزُوا فِي سَبِيلِ اللّٰهِ، مَنْ قَاتَلَ فِي سَبِيلِ اللّٰهِ فُوَاقَ نَاقَةٍ وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ . رَوَاهُ الترمذي[٢٢]:**

---

[٢٠] **ترمذي والنسائي بسند حسن (شرحه).**

[٢١] **مسلم. جهاد: ٤٨٦٣ – ٤٨٦٨.**

[٢٢] **بسند حسن (شرحه).**

دەگێڕنەوە: پیاوێ دەبێ، حەزی لە گۆشە گیری دەبێ، لەو بارەوە لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەپرسێ، دەفەرموێ: نەکەی! چونکە تاقە یەك هەڵوێستی ئێوە لە ڕێی خودادا لە حەفتا ساڵ نوێژی ماڵەوەتان خێری زیاترە. ئەدی ئێوە حەزناکەن کە خودا لێتان خۆش بێ‌و بتانخاتە بەهەشتەوە؟ دەی کە حەز لەوە دەکەن لە ڕێی خودادا غەزا بکەن! ئەوەی بەقەی حوشترێ بدۆشرێ، لە ڕێی خودادا جەنگ بکا بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێ (ت-س/ح).

**ڕوون کردنەوەیێ:**

١- زاناکان دەفەرموون: وشەی (فِي سَبِيلِ اللَّهِ) جگە لە غەزاو خەباتگێڕان بۆ ڕەزای خودا زۆر شتی تری باش دەگرێتەوە، وەك ڕۆژوو، خێرکردن، چوون بۆ نوێژی هەینی، وێڵبوون بە شوێن زانستا. هەروا دەڵێن: وشەی (اغبرت قدماه) یا (فِي شِعْبٍ مِنَ الشِّعَابِ)و ئەمانە بۆ نموونەو میثالە بۆ مەرج‌و قەید نییە.

٢- زۆرکەس لە ناحەزانی ئیسلام‌و پێ هەڵخەڵەتاوەکانیان دەڵێن: گوایە ئیسلام شەڕ پەرستەو حەزی لە جەنگ‌و هەرایەو ئیسلام بە زەبری تیرو شیر بڵاو بۆتەوە نەك بە هێزی فیکرو بیر!

ئەمە قسەیەکی زەهراوییەو درۆیەکی پەتییە. چونکە وەك خودا لە قورئانا بە حەزرەت دەفەرموێ:

{قُلْ مَا كُنتُ بِدْعًا مِّنْ الرُّسُلِ} (٩/٤٦).

واتە ئەی موحەممەد! بفەرموو بە وانەی کە داوای موعجیزەی نا شایستەت لێ دەکەن، یا دەڵێن دینەکەی تۆ ئەمەی وایەو ئەوەی وایە لە وەڵامی ئەوانەدا بفەرموو: من یەکەم پێغەمبەر نیم لەسەر ڕووی زەوی کە لە خۆمەوە شتی نابەجا دابهێنم، ڕەوشت‌و ڕەفتارو کردارو حاڵم وەك هی پێغەمبەرەکانی پێش خۆمە. کەسێ بە وردی تەماشای تەورات بکا کە بەلای

گاورو جوولەکەوە نامەیەکی پیرۆزەو فەرمایشت و سرووشی خودایە، دڵی دەوەستێ، مووی لەشی قەف رادەوەستێ، کە دەبینێ چۆن چۆنی تەورات بەو پەڕی دڵ رەقی و بێ باکییەوە فەرمان دەدا بە جەنگاوەرەکان کە ئەو دێ و شارو وڵاتەی دەیگرن دارو بەردو خانوو ماڵ و گیاندارو بێ گیان و مرۆڤ و وەڵسی هەموو بەسەر یەکا بسووتێنن و رەحمیان پێ نەکەن. لە زەمینەی واقیعیشدا (نەك لە زەمینەی خەیاڵ پلاودا) با تەماشای شەڕ فرۆشی و بێ رەحمی و بێ ویژدانی گاورەکان بکەین، دەبێ پەیڕەوانی چی ئاینێکی تر بە قەد پەیڕەوانی عیسا خوێنی ناهەقیان لەسەر رووی زەوی رژاندبێ، ماڵی خەڵکی بێ تاوانیان لە خۆیان و لە خەڵکی تریش وێران کردبێ، بە بەرچاوی ئەم چینەی ئێمەوە دوو جەنگی هەرە گەورەیان بەرپا کردووە، بە سەدان جەنگی بچکۆلەو گەورەی تریان لە هەموو لایێ هەڵگیرساندووە، لە جەزائیر، لە میصر، لە ئەرتیریا، لە ئەفغانستان، لە یەمەن، لە کۆریا، لە ڤێتنام، لە هەموو لایێ، گۆی زەوی بەهۆی ئەوانەوە بووە بە کونە مشکی قانگدراو، لە هەموو لایێ خۆیان و نۆکەرە ئەڵقە بە گوێکانیان شەڕو هەرا دروست دەکەن بە هەزاران گوندو شارو وڵاتی تیا سووتاو تیا دەسووتێ، بە ملیۆنەها مرۆڤی بێ تاوان و ژن و منداڵ و پیرو زیندەوەریان کوشت و سووتاندو برژاند بە هەزاران مزگەوت و خانەی خودایان رمان و سووتاند، ئایا ئەمەی کە ئەم گاورانە دەیکەن تەنفیزی ئایەتەکەی ئینجیلە کە دەڵێ: (من ضربك على خدك الايمن فادر له خدك الايسر) یا خۆیان مەشمووڵ نین بە مەفعووڵ و حوکمی ئەم ئایەتەو ئەم ئایەتەیان کردووە بە دەرزی زەهرو دەیدەن لە مێشك و دڵی ئەو گەل و کەسانەی کە دەیانەوێ مەردانە دیفاع و بەرگری لە سەرو ماڵ و ناموس و نیشتمانی خۆیان بکەن و سەر بۆ زوڵم و زۆری ئەوان شۆڕ نەکەن. هەزار رەحمەت لە گۆڕی مامۆستا مەلا حەمە سەعیدی خومخانە کە دەیفەرموو: ئەگەر منداڵی دوانە لەناو سکی دایکیانا شەر بکەن بە دەسیسەو پیلانی کافرانە.

وەرگێڕ

## ١٢) باسی دووەم: باسی شەهیدو گەورەیی و پایەو پلەی شەهید
## الباب الثاني: في الشهداء وفضلهم

قَالَ الله تعالى: {وَلاَ تَحْسَبَنَّ الَّـذِينَ قُتِلُـواْ...} الآيـة. ئـەم ئايەتـە پـيرۆزە لـە تەفسيری سوورەتی ئالی عيمراندا رابوورد، فەرموودەی سێهەم.

٤٣١٩- ← (ب- ١ز- ١٣١ل- ٣٩٣ف- ١) [1].

٤٣٢٠- وَعَنْهُ (أي عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ) (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ)، عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ مَا تَعُدُّونَ الشَّهِيدَ فِيكُمْ؟ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَـنْ قُتِـلَ فِـي سَـبِيلِ اللَّـهِ، قَـالَ: إِنَّ شُهَدَاءَ أُمَّتِي إِذًا لَقَلِيلٌ، قَالُوا: فَمَنْ هُمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: مَنْ قُتِلَ فِي سَبِيلِ اللَّـهِ فَهُـوَ شَهِيدٌ، وَمَنْ مَاتَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَهُوَ شَهِيدٌ، وَمَنْ مَاتَ فِي الطَّاعُونِ فَهُـوَ شَـهِيدٌ، وَمَـنْ مَاتَ فِي الْبَطْنِ فَهُوَ شَـهِيدٌ، وَالْغَرِيـقُ شَـهِيدٌ . رَوَاهُ مـسلم والنـسائي، وفي روايـةٍ لـه: يَخْتَصِمُ الشُّهَدَاءُ وَالْمُتَوَفَّوْنَ عَلَى فُرُشِهِمْ إِلَى رَبِّنَـا عَـزَّ وَجَـلَّ فِـي الَّـذِينَ يُتَوَفَّـوْنَ مِـنَ الطَّاعُونِ فَيَقُولُ الشُّهَدَاءُ إِخْوَانُنَا قُتِلُوا كَمَا قُتِلْنَا، وَيَقُولُ الْمُتَوَفَّوْنَ عَلَى فُرُشِهِمْ: إِخْوَانُنَا مَاتُوا عَلَى فُرُشِهِمْ كَمَا مُتْنَا عَلَى فُرُشِنَا فَيَقُولُ رَبُّنَا: عَزَّ وَجَلَّ انْظُرُوا إِلَى جِـرَاحِهِمْ فَـإِنْ أَشْبَهَتْ جِرَاحُهُمْ جِرَاحَ الْمَقْتُـولِينَ فَـإِنَّهُمْ مِـنْهُمْ وَمَعَهُـمْ، فَـإِذَا جِـرَاحُهُمْ قَـدْ أَشْـبَهَتْ جِرَاحَهُمْ [2]:

دیسان ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) فـەرمووی: حـەزرەت (دروودو سڵاوی خودای گـەورەی لێ بێ) فـەرمووی: ئێـوە لـەناو خۆتانـدا کـێ بـە شـەهید دادەنـێن؟ گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە ئەو کەسە بە شەهید دادەنێین کە لە خـەباتی ڕێگـەی خـودادا بکـوژرێ، فـەرمووی: ئەگـەر وەك ئێـوە دەڵـێن وابـێ شـەهیدانی ئۆمـەتی من زۆر کـەمن گوتیـان: ئـەی پێغەمبـەری خودا! ئـەی کـێ شەهیدە؟ فەرمووی: ئەوەی لە خەباتی ڕێگەی خودادا بکوژرێ ئەوە شەهیدە،

---

[1] تقدم في المجلد الأول. تسلسل/ ١٣١ رقم: ١/ ٧٨٣.

[2] مسلم. جهاد: ٤٩١٩، ٤٩١٨.

وە ئەوەی لە ڕێگەی خودادا بمرێ شەهیدە، وە ئەوەی بە دەردی ناوسك بمرێ شەهیدە، وە ئەوەی بە ئاو بخنکێ شەهیدە! (م/ن).

لە گێڕانەوەیەکی نەسائیدا: شەهیدان و ئەوانەی بە دەردی خودا لەسەر نوێنی خۆیان دەمرن، لە خزمەتی خودادا دەبێ بە مشتو مڕو دەمە قاڵیان لەسەر ئەوانەی کە بە تاعوون دەمرن: شەهیدەکان دەڵێن: خودایە! ئەمانە برای ئێمەن و وەك ئێمە کوژراون و کەوابێ ئەوەی بە تاعوون مردووە دەبێ شەهید بێ وەك ئێمە! ئەوانەشی کە بە دەردی خودا مردوون دەڵێن: خودایە! ئەمانە برای ئێمەن و لە دەستەی ئێمەن و شەهید نین، چونکوو وەك ئێمە بە دەردی خودا مردوون! خودای پەروەردگاری هەموومان دەفەرموێ: تەماشای زامەکانیان بکەن، ئەگەر لە زامی کوژراوان بچێ ئەوا ئەوانیش لەوانن و لەگەڵ ئەوانیشدا دەبن، جا کاتێ کە سەیر دەکەن وا برینەکانیان لە برینی ئەوان دەچێ.

٤٣٢١- عَنْ عُمَرَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: الشُّهَدَاءُ أَرْبَعَةٌ: رَجُلٌ مُؤْمِنٌ جَيِّدُ الإِيمَانِ لَقِيَ الْعَدُوَّ فَصَدَقَ اللّٰهَ حَتَّى قُتِلَ فَذَلِكَ الَّذِي يَرْفَعُ النَّاسُ إِلَيْهِ أَعْيُنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ هَكَذَا، وَرَفَعَ رَأْسَهُ حَتَّى وَقَعَتْ قَلَنْسُوَتُهُ، قَالَ: فَمَا أَدْرِي أَقَلَنْسُوَةَ عُمَرَ أَرَادَ أَمْ قَلَنْسُوَةَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَرَجُلٌ مُؤْمِنٌ جَيِّدُ الإِيمَانِ لَقِيَ الْعَدُوَّ فَكَأَنَّمَا ضُرِبَ جِلْدُهُ بِشَوْكِ طَلْحٍ مِنَ الْجُبْنِ أَتَاهُ سَهْمٌ غَرْبٌ فَقَتَلَهُ فَهُوَ فِي الدَّرَجَةِ الثَّانِيَةِ، وَرَجُلٌ مُؤْمِنٌ خَلَطَ عَمَلاً صَالِحًا وَآخَرَ سَيِّئًا لَقِيَ الْعَدُوَّ فَصَدَقَ اللّٰهَ حَتَّى قُتِلَ فَذَلِكَ فِي الدَّرَجَةِ الثَّالِثَةِ، وَرَجُلٌ مُؤْمِنٌ أَسْرَفَ عَلَى نَفْسِهِ لَقِيَ الْعَدُوَّ فَصَدَقَ اللّٰهَ حَتَّى قُتِلَ فَذَلِكَ فِي الدَّرَجَةِ الرَّابِعَةِ . رَوَاهُ الترمذي [٣]:

عومەر (خودای لێ ڕازی بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ: شەهیدان چوار دەستەن:

---

[٣] رَوَاهُ الترمذي بسند حسن (شرحه).

دەستەی یەکەم: ئەو پیاوە موسوڵمانە باوەڕ جوانانەن کە دەگەن بە دوشمن، لەگەڵ خودادا راست دەردەچن‌و لە پێناوی رەزای ئەودا دەجەنگن تا دەکوژرێن، ئا ئەمانەن کە لە رۆژی قیامەتا پایەیان ئەوەندە بڵندە خەڵك ئاوا چاویان بۆ هەڵ دەبڕن گوتی: کە تەماشای ئاسمانی کرد، بۆ بەیانی بڵندیی پایەی ئەم دەستەیە ئەوەندە سەری بەرزکردەوە کڵاوبۆرگەکەی لەسەری کەوتە خوارەوە، قسە بەر دەڵێ: نازانم راوی پێش من مەبەستی کڵاوی پێغەمبەر بوو، یا مەبەستی کڵاوی عومەر بوو، فەرمووی (درودی خودای لەسەربێ):

دەستەی دووەم: ئەو پیاوە موسوڵمانە باوەڕ جوانانەن کە دەگەن بە دوشمن لەبەر ترسنۆکی وەك پۆستیان بە دڕکەزی بئاژنرێ وان، تا لە لابەلاوە تیرێکی وێڵیان بۆ رێ دەکەوێ‌و دەیانکوژێ، ئا ئەمانە وان لە پلەی دووەمدا.

دەستەی سێیەم: ئەو پیاوە موسوڵمانانەن کە هەم کاری باش‌و هەم کاری خراپ تێکەڵ دەکەن‌و باشیش دەکەن‌و خراپیش دەکەن، وەلێ کاتێ بەرەنگاری دوشمن دەبن‌و لەگەڵی دێن بە شەڕدا لەگەڵ خودای گەورە راست دەردەچن‌و پیاوانە جەنگ دەکەن هەتا دەکوژرێن! ئا ئەمانەیش لە پلەی سێیەم دان.

دەستەی چوارەم: ئەو پیاوە موسوڵمانانەی کە لە رادەبەدەر خراپەیان کردووەو زۆرو ستەمیان لە خودی خۆیان کردووە، بەڵام کاتێ تووشی دوشمن دەبن لەگەڵ خودای خۆیان راست دەردەچن‌و مەردانە جەنگ دەکەن هەتا شەهید دەکرێن، ئا ئەمانەیش لە پلەی چوارەم دان (ت-س/ح).

٤٣٢٢- عَنْ أَنَسَ (رضى الله عنه) عَنِ النَّبِىِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَا مِنْ عَبْدٍ يَمُوتُ لَهُ عِنْدَ اللَّهِ خَيْرٌ، يَسُرُّهُ أَنْ يَرْجِعَ إِلَى الدُّنْيَا، وَأَنَّ لَهُ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا، إِلاَّ الشَّهِيدَ لِمَا يَرَى مِنْ فَضْلِ الشَّهَادَةِ، فَإِنَّهُ يَسُرُّهُ أَنْ يَرْجِعَ إِلَى الدُّنْيَا فَيُقْتَلَ مَرَّةً أُخْرَى . رَوَاهُ الخمسة. وفِي رَوَايةٍ: مَا مِنْ أَحَدٍ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ يُحِبُّ أَنْ يَرْجِعَ إِلَى الدُّنْيَا وَأَنَّ لَهُ مَا عَلَى

الأَرْضِ مِنْ شَيْءٍ غَيْرُ الشَّهِيدِ فَإِنَّهُ يَتَمَنَّى أَنْ يَرْجِعَ فَيُقْتَلَ عَشْرَ مَرَّاتٍ لِمَا يَرَى مِنَ الْكَرَامَةِ [٤]:

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوەی دەمرێ ئەگەر لەلای خودا جێگەی باش بێ ئیتر ئەگەر ئەم جیهانەو هەرچی لەم جیهانەدایە بیدەنێ بۆ خۆی حەزناکات بگەڕێتەوە بۆ جیهان، بێجگە لە شەهید، بەڵام شەهید (لەبەر گەورەیی پایەی شەهیدیی) حەزدەکا کە بگەڕێتەوە بۆ دونیاو جارێکی تر بکوژرێتەوە (ش/د/ت/ن) لە گێڕانەوەیەکا: ئەوەی چووە ناو بەهەشت حەزناکا کە بگەڕێتەوە بۆ دنیا ئەگەر هەرچی لەسەر رووی زەوی هەیە بیدەن پێی ناگەڕێتەوە، مەگەر شەهید، بەڵام ئەو حەزدەکا کە بگەڕێتەوە بۆ دونیاو دەجاری تریش بکوژرێتەوە! چونکە بە چاوی خۆی دەبینێ کە شەهید چەندە بە قەدرو بە رێزو قورس و گرانە!

٤٣٢٤- وللنسائي: يُؤْتَى بِالرَّجُلِ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَيَقُولُ اللَّهُ: عَزَّ وَجَلَّ يَا ابْنَ آدَمَ كَيْفَ وَجَدْتَ مَنْزِلَكَ؟ فَيَقُولُ: يا رَبِّ خَيْرَ مَنْزِلٍ، فَيَقُولُ: سَلْ وَتَمَنَّ فَيَقُولُ: أَسْأَلُكَ أَنْ تَرُدَّنِي إِلَى الدُّنْيَا فَأُقْتَلَ فِي سَبِيلِكَ عَشْرَ مَرَّاتٍ لِمَا يَرَى مِنْ فَضْلِ الشَّهَادَةِ[٥]:

دەفەرموێ (درودی خودای لەسەربێ): پیاوی بەهەشتی وا هەیە کە دەیهێنن خودای مەزن پێی دەفەرموێ: ئەی رۆڵەی ئادەم! جێگەکەت چۆنە بەلاتەوە؟ دەڵێ: ئەی پەروەردگارم! جێگەم زۆر چاکە، دەفەرموێ: داواو ئاواتت چییە بیڵێ، دەڵێ: لە تۆ داوا دەکەم کە بمگێڕیتەوە بۆ جیهان تا لەوێ لە پێناوی رەزای تۆدا دەجاری تر بکوژرێمەوە، چونکە بە چاوی خۆی دەبینێ کە بەهرەی شەهید بوون چەندە نازدارو بەرێزو گەورەیە. (ن/ رەزای خوای لێ بێ).

---

[٤] بخاري. جهاد: ٢٨١٧. مسلم. جهاد: ٤٨٤٥. ترمذي. فضائل الجهاد: ١٦٦٢.

[٥] سكت عَن درجته الشارح.

**٤٣٢٥- وَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْتَ إِنْ قُتِلْتُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، أَتُكَفَّرُ عَنِّي خَطَايَايَ؟ فَقَالَ: نَعَمْ وَأَنْتَ مُحْتَسِبٌ مُقْبِلٌ غَيْرُ مُدْبِرٍ إِلاَّ الدَّيْنَ، فَإِنَّ جِبْرِيلَ (عَلَيْهِ السَّلاَمُ) قَالَ لِي ذَلِكَ . رَوَاهُ مسلم والترمذي والنسائي [٦]:**

**جارێ حەزرەت** (درودی خودای لەسەربێ) **باسی گەورەیی خەباتی دەكرد بۆ یارانی، پیاوێ هەڵسا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! هەواڵم بدەرێ و پێم بفەرموو ئەگەر من لە پێناوی رەزای خودادا بكوژرێم ئایا بەمە لە گوناه پاك دەبمەوە؟ فەرمووی: بەڵێ بە مەرجێ ددان بە خۆتدا بگریت و خۆ رابگریت و پاداشی خۆت بەس لە خودا داوا بكەیت و روو بە رووی دوشمن بیت و پشتی تێ نەكەیت و پشت هەڵنەكەی تەنیا قەرز نەبێ، قەرز بە شەهید بوونیش پاك نابێتەوە، چونكە جوبرائیل** (سەلامی خوای لەسەر بێ) **ئاوای بە من فەرموو (م/ت/ن).**

**٤٣٢٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **قَالَ: مَا يَجِدُ الشَّهِيدُ مِنْ مَسِّ الْقَتْلِ إِلاَّ كَمَا يَجِدُ أَحَدُكُمْ مِنْ مَسِّ الْقَرْصَةِ . رَوَاهُ الترمذي والنسائي [٧].**

**ئەبو هورەیرە** (خودای لێ رازی بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: ئێوە بە قورنچكێ چەندێ ئێشتان پێ دەگا شەهیدیش بە كوشتن ئەوەندە ئێشی پێ دەگا (ت/ن-س/ص).**

**٤٣٢٧- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **قَالَ: عُرِضَ عَلَيَّ أَوَّلُ ثَلاَثَةٍ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ: شَهِيدٌ وَعَفِيفٌ مُتَعَفِّفٌ، وَعَبْدٌ أَحْسَنَ عِبَادَةَ اللَّهِ وَنَصَحَ لِمَوَالِيهِ . رَوَاهُ الترمذي [٨]:**

**دیسان فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: ئەو سێ كەسانەم پێ نیشان دران كە لەپێش پێشدا دەچنە بەهەشت، ئەم كەسانە**

---

[٦] مسلم. جهاد: ٤٨٥٧ — ٤٨٦١. ترمذي. جهاد: ١٧١٢. نسائي. جهاد: ٣١٥٨.

[٧] بسند صحيح (شرحه).

[٨] بسند حسن (شرحه).

بوون: شەهیدو مرۆڤی دەست‌و دڵ‌و داوێنپاکی دوور لە حەرام‌و بەندەیێ کە بەجوانی خودای خۆی دەپەرستێ‌و دڵسۆزیشە بۆ ئاغاکانی. (ت-س/ح).

٤٣٢٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: عَجِبَ رَبُّنَا عَزَّ وَجَلَّ مِنْ رَجُلٍ غَزَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَانْهَزَمَ أَصْحَابُهُ فَعَلِمَ مَا عَلَيْهِ فَرَجَعَ حَتَّى أُهَرِيقَ دَمُهُ فَيَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ لِمَلَائِكَتِهِ: انْظُرُوا إِلَى عَبْدِي رَجَعَ رَغْبَةً فِيمَا عِنْدِي وَشَفَقَةً مِمَّا عِنْدِي حَتَّى أُهَرِيقَ دَمُهُ . رَوَاهُ أبو داود [٩]:

عەبدوڵلا لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ: بەندەیێ دەڕوا بۆ غەزا لە ڕێی خودادا، هاوڕێکانی دەشکێن‌و هەڵدێن، بەلاّم ئەو بە ئەرکی سەر شانی خۆی هەڵدەسێ‌و دەگەڕێتەوە بۆ ناو کۆڕی شەڕو شەڕ دەکا هەتا خوێنی دەڕێژرێ، خودای گەورەو سەروەرمان (کاتێ ئەم شێوە پیاوە مەردانە دەبینێ) بە فریشتەکانی خۆی دەفەرموێ: تەماشای ئەم بەندەیەی من بکەن، چۆن بای دایەوە بۆ ناو کۆڕی شەڕ هەتا خوێنی ڕژا، بەتەمای ئەو بەش‌و بارە باشەی کە لەلای من هەیەو لە ترسی ئەو سزاو تۆڵەیەی کە لەلای من هەیە وە خودای گەورەو سەروەرمان کاری ئەم جۆرە پیاوە مەردانەی زۆر بەلاوە پەسەندو نایابە (د- سند صالح).

٤٣٢٩- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لَيْسَ شَيْءٌ أَحَبَّ إِلَى اللَّهِ مِنْ قَطْرَتَيْنِ وَأَثَرَيْنِ: قَطْرَةٌ مِنْ دُمُوعٍ فِي خَشْيَةِ اللَّهِ وَقَطْرَةُ دَمٍ تُهَرَاقُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ. وَأَمَّا الأَثَرَانِ فَأَثَرٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَأَثَرٌ فِي فَرِيضَةٍ مِنْ فَرَائِضِ اللَّهِ . رَوَاهُ الترمذي [١٠]:

ئەبو ئومامە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: لەلای خودا هیچ شتێ وەك ئەم دوو دڵۆپەو ئەم دوو شوێن پایە خۆشەویست نییە: یەکەم دڵۆپێ فرمێسك کە لەبەر ترسی خودا بێ‌و دڵۆپێ

---

[٩] بسند صالح (شرحه).

[١٠] بسند حسن (شرحه).

خوێن کە لەبەر ڕەزای خودا ڕژابێ، دووەم هەنگاوێ کە لەبەر ڕەزای خودابێ و لە پێناوی ئەوا بێ وەك چوون بۆ غەزا، هەروا هەنگاوێ کە بۆ جێبەجێ کردنی فەرزێ لە فەرزەکانی خودا بێ! (ت- س/ح).

٤٣٣٠- ولمسلم والنسائي قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيْنَ أَنَا إِنْ قُتِلْتُ؟ قَالَ: فِي الْجَنَّةِ. فَأَلْقَى تَمَرَاتٍ كُنَّ فِي يَدِهِ ثُمَّ قَاتَلَ حَتَّى قُتِلَ [11]:

پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر لە پێناوی ئایینی تۆدا بکوژرێم شوێنم کوێیە؟ فەرمووی: جێگەت بەهەشتە پیاوەکە چەند دەنکێ خورما لەناو لەپیدا بوو، تووڕی دان و دەستی کرد بە شەڕکردن هەتا کوژرا (م/ن).

٤٣٣١- عَنِ الْبَرَاءِ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي النَّبِيتِ، فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّكَ عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، ثُمَّ تَقَدَّمَ فَقَاتَلَ حَتَّى قُتِلَ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عَمِلَ هَذَا يَسِيرًا وَأُجِرَ كَثِيرًا [12]:

بەراء (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پیاوێکی بەنی نەبیتی هات گوتی: شایەتی دەدەم لە یەزدانی پاك بەولاوە خودای تر نییە، وە تۆیش ئەی موحەممەد! بەندەو پێغەمبەری ئەویت! ئەمجار چووە پێشەوەو خۆی کرد بە کۆڕی شەڕداو جەنگی کرد هەتا کوژرا، جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەم پیاوە بە کار کارێکی زۆر کەمی کرد، وەلێ بۆ پاداش پاداشێکی گەلێ گەورەی برد (ش- ڕەزای خودای لێ بێ).

٤٣٣٢- ← (ب- ٥ز- ٥١ل- ١٨٢ف- ١) [13].

٤٣٣٣- وَسُئِلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مَنْ فِي الجَنَّةِ؟ قَالَ: النَّبِيُّ فِي الْجَنَّةِ، وَالشَّهِيدُ فِي الْجَنَّةِ، وَالْمَوْلُود فِي الجَنَّة، وَالْوَئِيْد فِي الجَنَّة. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ [14]:

---

[11] مسلم. جهاد: ٤٨٩٠. بخاري. مغازي: ٤٠٤٦ = تجريد/ ٤/ ٢٨١رقم: ١٥٤٢. نسائي. جهاد: ٣١٥٤.

[12] مسلم. جهاد: ٤٨٩١.

[13] تقدم في مجلد خامس. تسلسل/ ٥١ رقم: ١/ ٣٤٨٢.

پرسیار کرا لە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) کێ بەبێ گومان بەهەشتییە؟ فەرمووی: پێغەمبەران بەهەشتین، شەهیدان بەهەشتین، منداڵانی نەبالق بەهەشتین، زیندە بەچاڵان بەهەشتین (د- سند صالح).

## ١٣) شەهید بۆ خەڵکێکی زۆر تکا دەکا : (الشهيد يشفع في خلق كثير)

٤٣٣٤- عَنْ أبي الدَّرْدَاءِ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: يُشَفَّعُ الشَّهِيدُ فِي سَبْعِينَ مِنْ أَهْلِ بَيْتِهِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي، ولفظهُ: لِلشَّهِيدِ عِنْدَ اللّٰهِ سِتُّ خِصَالٍ، يُغْفَرُ لَهُ فِي أَوَّلِ دَفْعَةٍ وَيَرَى مَقْعَدَهُ مِنَ الْجَنَّةِ وَيُجَارُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَيَأْمَنُ مِنَ الْفَزَعِ الأَكْبَرِ، وَيُوضَعُ عَلَى رَأْسِهِ تَاجُ الْوَقَارِ الْيَاقُوتَةُ مِنْهَا خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا، وَيُزَوَّجُ اثْنَتَيْنِ وَسَبْعِينَ زَوْجَةً مِنَ الْحُورِ وَيُشَفَّعُ فِي سَبْعِينَ مِنْ أَقَارِبِهِ[١]:

ئەبو دەرداء (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: تکای شەهید بۆ حەفتا کەس لە کەس و کاری خۆی گیرا دەبێ (د/ت-س/ص) گفتەی (ت) شەهیدان شەش بەخشیشیان لەلای خودا هەیە: لەگەڵ یەکەم دەستەدا خودا لێیان خۆش دەبێ و شوێنی خۆیان لە بەهەشتدا دەبینن، وە لە سزاو ئێش و ئازاری گۆڕ رزگاریان دەبێ، وە لە ترس و تۆقانێ کە لە هەموو ترس و تۆقانێ گەورەترە دڵنیا دەبن، وە تاجی سەلارو سەنگینییان لەسەر دەنێن، کە هەرەیەك یاقووتی ئەو تاجە، لە هەموو جیهان باشترە، وە حەفتاو دوو پەری (لە پەرییەکانی بەهەشت) دەدرێ بە هەموو شەهیدێ وە تکای گیرا دەبێ بۆ حەفتا کەس لە خزم و خوێشانی!

٤٣٣٥- ولابن ماجة: يَشْفَعُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ثَلاثَةٌ الأَنْبِيَاءُ ثُمَّ الْعُلَمَاءُ ثُمَّ الشُّهَدَاءُ . نسأل الله أن نكون منهم[٢]:

---

[١٤] رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ بسند صالح (شرحه).

[١] بسند صحيح (شرحه).

[٢] سكت عَن درجته الشارح.

دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): لە رۆژی قیامەتدا ئەم سێ تاقمەیە تکاو شەفاعەت دەکەن: لە پێشدا پێغەمبەرەکان، لە دوا ئەوان زاناکان، لە دوا ئەوانیش شەهیدەکان (ئیبنو ماجە) لە خودا داوا دەکەین کە لەم کۆمەڵە پیرۆزە بین.

## ١٤) بەهرەی پاسەوانەکانی سەر سنوورو پاسدارانی ڕێگەی خودا:
## فضل المرابط والحارس في سبيل الله

٤٣٣٦- عَنْ سَهْلٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: رِبَاطُ يَوْمٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا عَلَيْها . رَوَاهُ البخاري والترمذي [1]:

سەهل لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): کەسێ یەك رۆژ لەسەر سنووری بەینی کافران و موسوڵمانانا بمێنێتەوە بە نیازی پاراستن و ئێشك گرتنی وڵاتی ئیسلام، لەبەر رەزای خودا ئەوە لە هەموو جیهان باشترە (ب/ت).

٤٣٣٧- وله (أي للترمذي) وللنسائي: رِبَاطُ يَوْمٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَفْضَلُ أو خَيْرٌ مِنْ صِيَامِ شَهْرٍ وَقِيَامِهِ وَمَنْ مَاتَ فِيهِ وُقِيَ فِتْنَةَ الْقَبْرِ وَنُمِّيَ لَهُ عَمَلُهُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ [2]:

دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): یەك رۆژ پاسەوانی سەر سنوور لەبەر رەزای خودا گەورەترو خێر ترە لە رۆژوو وشەو نوێژی یەك مانگ، وە ئەوەی لەم رێیەدا بمرێ گرفتاری تاقی کردنەوەی ناو گۆڕ نابێ، وە ئەو کردەوە باشەشی هەتا رۆژی قیامەت هەر لە زیادبوونەو هەر نەشونما دەکا بۆی! (ت/ن).

٤٣٣٨- ولهما: رِبَاطُ يَوْمٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ يَوْمٍ فِيمَا سِوَاهُ مِنَ الْمَنَازِلِ [3]:

---

[1] بخاري. جهاد: ٢٨٩٢.

[2] سكت عن درجته الشارح.

دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): یەك ڕۆژ ئێشك گرتنی سەر سنووری ئیسلام لەبەر ڕەزای خودا خێرترە لە هەزار ڕۆژ خێرکردن لە مەڵبەندەکانی تری خێردا (ت/ن- س/ص).

٤٣٣٩- عَنْ فَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ (رَضِيِ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: كُلُّ الْمَيِّتِ يُخْتَمُ عَلَى عَمَلِهِ إِلاَّ الْمُرَابِطَ فَإِنَّهُ يَنْمُو لَهُ عَمَلُهُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَيُؤَمَّنُ مِنْ فَتَّانِ الْقَبْرِ . رَوَاهُ أبو داود والترمذي [٤]:

لە فوضالەوە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەموو کەسێ کاتێ دەمرێ ئیتر کردەوەکەی مۆر دەکرێو زیادو کەم ناکا، پاسەوانی سەر سنوور نەبێ، بەڵام کردەوەی ئەم هەر لە زیادبوونەو هەتا ڕۆژی قیامەت هەر نەشونما دەکا بۆی، وە لە تاقی کردنەوەو پرسیاری نەکیرو مونکەریش لە قەبردا ترسی نابیو دڵنیا دەبێ ← (ب- ١ز- ١٩ل- ٩٥ف- ٢+٣) (د/ت- س/ص).

٤٣٤٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله تَعَالَى عنهما) عَنْ النبيي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: عَيْنَانِ لاَ تَمَسُّهُمَا النَّارُ: عَيْنٌ بَكَتْ مِنْ خَشْيَةِ اللَّهِ وَعَيْنٌ بَاتَتْ تَحْرُسُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ . رَوَاهُ الترمذي والنسائي. والله أعلم [٥]:

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەم دوو چاوانە بەر ئاگری دۆزەخ ناکەون:

یەکەم: چاوێ کە لە ترسی خودا بگری.

دووەم: چاوێ کە بۆ ڕەزای خودا ببێ بە پاسەوانو پاسی وڵاتی ئیسلام بکا (ت/ن- س/ح).

---

[٣] رَوَاهُ الترمذي والنسائي بسند صحيح (شرحه).

[٤] بسند صحيح (شرحه) (راجع: ج/١ ز — ١٩ رقم / ٢ ، ١٣٤ و ٣ / ١٣٥).

[٥] بسند حسن (شرحه).

## ١٥) گەورەیی دارایی بەخت کردن لە ڕێگەی خودای گەورەدا:
## فضل الانفاق في سبيل الله تعالى

قَالَ الله تعالى: {مَّثَلُ الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنبُلَةٍ مِّئَةُ حَبَّةٍ وَاللّهُ يُضَاعِفُ لِمَن يَشَاء وَاللّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ} (٢/٢٦١):

واتە: داستانی ئەو کەسانە کە ماڵی خۆیان لە ڕێگەی خودادا بەخت دەکەن وەك داستانی کەسێ وایە یەك دەنك تۆو بڕوێنێ و ئەو دانە شین ببێ و حەوت گوڵ بڕوێنێ و لەهەر گوڵێکا سەد دانەی تیابێ، سەرەڕای ئەوەیش ئەگەر خودا خواستی هەبێ چەند قاتی ئەمەیش دەدا بە کەسێ کە خۆی بیەوێ، وە خوای گەورە ڕەحمەت و بەرەکەتی زۆرەو خەزینەی خودا هەتا بڵێی گەورەو پڕەو خۆی زانایە بە حاڵی هەموو کەسێ، کە شانی چی هەڵدەگرێ و چی هەڵ ناگرێ.

٤٣٤١- ← (ب- ٢ز- ١ل- ٧ف- ٥) [1].

٤٣٤٢- وَجَاءَ رَجُلٌ بِنَاقَةٍ مَخْطُومَةٍ فَقَالَ: هَذِهِ فِى سَبِيلِ اللَّهِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): لَكَ بِهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ سَبْعُمِائَةِ نَاقَةٍ كُلُّهَا مَخْطُومَةٌ . رَوَاهُ مسلم والنسائي[2]:

پیاوێ وشترە مێنگەیەکی ڕەشمەکراوی هێنا، گوتی: ئەمەم هێناوەو دەیدەم لە ڕێگەی خودادا، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لە ڕۆژی قیامەتدا لە باتی ئەمە حەوت سەد وشترە مێچکەی هەوسار کراوت پێ دەدرێ (م/ن).

٤٣٤٣- ولأبي داود والنسائي: الْغَزْوُ غَزْوَانِ فَأَمَّا مَنِ ابْتَغَى وَجْهَ اللَّهِ وَأَطَاعَ الإِمَامَ وَأَنْفَقَ الْكَرِيمَةَ وَيَاسَرَ الشَّرِيكَ وَاجْتَنَبَ الْفَسَادَ فَإِنَّ نَوْمَهُ وَنَبْهَهُ أَجْرٌ كُلُّهُ، وَأَمَّا مَنْ غَزَا فَخْرًا وَرِيَاءً وَسُمْعَةً وَعَصَى الإِمَامَ وَأَفْسَدَ فِى الأَرْضِ فَإِنَّهُ لَمْ يَرْجِعْ بِالْكَفَافِ[3]:

---

[1] تقدم في مجلد ثاني. تسلسل/ ١ل — ٧ برقم: ٥/ ١١٧٩.

[2] مسلم. جهاد: ٤٨٧٤. نسائي. جهاد: ٣١٨٧ تحفة الأشراف: ١٣٢.

دەفەرموێ: غەزا دوو غەزایە: ئەوەی مەبەستی ڕەزامەندی خودا بێ و بە گوێی پێشەوای ئیسلام بکاو فەرمانی بەجێ بێنێ و سامانی نایاب بەخت بکاو، ڕەفتاری خۆش بێ لەگەڵ هاوڕێداو لە خراپە بتەکێتەوەو تەریزی لێ بکا، ئەوە چ بخەوێ و چ بە خەبەر بێ بە خێرو پاداش دادەنرێ بۆی! بەڵام ئەوەی کە بۆ شانازی و ڕووپامایی و ناوو شۆرەت دەچێ بۆ غەزاو، بێ گوێی پێشەوای ئیسلام دەکاو ئاژاوە دەگێڕێ لە وڵاتداو فەرتەنە بەرپا دەکا ئەوە نەك بە سەرمایەکەی خۆیەوە دەگەڕێتەوە، بەڵکوو کۆڵێ تاوانیش لەگەڵ خۆی دێنێتەوە (د/ن – ڕەزای خودایان لێ بێ).

٤٣٤٤- وللترمذي والنسائي: مَنْ أَنْفَقَ نَفَقَةً فِي سَبِيلِ اللَّهِ كُتِبَتْ لَهُ بِسَبْعِمِائَةِ ضِعْفٍ[٤]:

دەفەرموێ (درودی خودای لەسەربێ): هەر کەسێ هەر خێرێ بکاو ماڵ و دارایی بەخت بکات بۆ ڕەزای خودا بە حەوت سەد قات بۆی دەنووسرێ. (ت–س/ح–ن).

٤٣٤٥- وللترمذي: أَفْضَلُ الصَّدَقَاتِ ظِلُّ فُسْطَاطٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَمَنِيحَةُ خَادِمٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَوْ طَرُوقَةُ فَحْلٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ . نسأل الله التوفيق لما يحبه ويرضاه. آمين[٥]:

دەفەرموێ (درودی خودای لەسەربێ): گەورەترین خێرو خێرات خێری سێبەری ئەو دەوارەیە کە بۆ ڕەزای خودا بدرێ بە تێکۆشەرانی ڕێگەی خودا، یا خێری ئەو نۆکەرەیە کە بۆ ڕەزای خودا بدرێ بە تێکۆشەرانی ڕێگەی خودا کە بەر دەستییان بکاو خزمەتیان بکا، یا خێری ئەو وڵاخەیە کە بۆ سواری، یا بۆ خزمەت پێش کەش بکرێ بە تێکۆشەران بۆ ڕەزای خودا. (ت–س/ص).

---

[٣] سكت عَن درجته الشارح.

[٤] رَوَاهُ الترمذي بسند حَسَنٍ (شرحه).

[٥] رَوَاهُ الترمذي بسند صحيح (شرحه).

## ١٦) خێری یارمەتی دانی غەزاکەر: (فضل إعانة الغازي)

٤٣٤٦- عَنْ زَيْدُ بْنُ خَالِدٍ (رضى الله عنه) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ جَهَّزَ غَازِيًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَقَدْ غَزَا، وَمَنْ خَلَفَ غَازِيًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِخَيْرٍ فَقَدْ غَزَا . رَوَاهُ الشيخان والترمذي [1]:

زەیدی کوڕی خالید (خودای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەوەی لەبەر رەزای خودا خەباتگێڕێ تەدارەك بكاو چەك و تفاقی پێ بدا ئەوە وەك ئەوە وایە كە خۆی بچێ بۆ غەزا، وە ئەوەی بە باشە سەرپەرشتی خێزانی تێكۆشەرێ بكا كە بۆ رەزای خودا چووبێ بۆ غەزا وەك ئەوە وایە كە خۆی بچێ بۆ غەزا (ش/ت).

٤٣٤٧- ← (ب- ١ز- ١٥ل- ٨٧ف- ٨) [2].

٤٣٤٨- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بَعَثَ رَجُلاً إِلَى بَنِي لَحْيَانَ لِيَخْرُجْ مِنْ كُلِّ رَجُلَيْنِ رَجُلٌ، ثُمَّ قَالَ لِلْقَاعِدِ: أَيُّكُمْ خَلَفَ الْخَارِجَ فِي أَهْلِهِ وَمَالِهِ بِخَيْرٍ كَانَ لَهُ مِثْلُ نِصْفِ أَجْرِ الْخَارِجِ. رَوَاهُ مسلم وأبو داود [3]:

ئەبو سەعید (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) زەلامێكی نارد بۆ ناو هۆزی بەنی لەحیان و فەرمووی: با لە هەردوو پیاوێ پیاوێكیان بڕوا بۆ غەزا. وە فەرمووی بەوەیان كە لە ماڵەوە دەمێنێتەوە: هەر كامتان بە چاكە لە جیاتی ئەوەی دەرچووە بۆ غەزا سەرەوكاری ماڵ و منداڵەكەی بكا بە قەد نیوەی ئەو خێرو پاداشتی بۆ هەیە (م/د).

٤٣٤٩- عَنْ بُرَيْدَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: حُرْمَةُ نِسَاءِ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ كَحُرْمَةِ أُمَّهَاتِهِمْ، وَمَا مِنْ رَجُلٍ مِنَ الْقَاعِدِينَ يَخْلُفُ رَجُلاً مِنَ الْمُجَاهِدِينَ فِي أَهْلِهِ فَيَخُونُهُ فِيهِمْ إِلاَّ وُقِفَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيَأْخُذُ مِنْ عَمَلِهِ مَا شَاءَ فَمَا ظَنُّكُمْ . رَوَاهُ مسلم وأبو داود والنسائي [4]:

---

[1] تجريد البخاري/ ٣/ ٣٠٢ رقم: ١١٧١ = ٢٨٤٣. مسلم. جهاد: ٤٨٧٩.

[2] تقدم فى مجلد أول. تسلسل/ ١٥ رقم: ٨/ ١١٧.

[3] مسلم. جهاد: ٤٨٨٤.

[4] مسلم. جهاد: ٤٨٨٥. أبو داود. جهاد: ٢٤٩٦.

بورەیدە (خودای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): حورمەت‌و رێزو قەدری ژنی پیاوانی تێکۆشەر لەسەر ئەو پیاوانەی لە ماڵەوە دەمێننەوە وەکوو حورمەت‌و رێزو قەدری دایکی خۆیان وایە! هەر پیاوێکی نیشتەجێی ماڵەوە سەرەوکاریی کەسوکاری پیاوێکی تێکۆشەر بکا، بەڵام لەهەمان کاتدا گزیو ناپاکییان لەگەڵدا بکا ئەوە لە رۆژی قیامەتدا ئەو گزیکارە رادەگرن بۆ ئەو غەزاکەرە بە ئارەزووی خۆی کێشە لە خێرو خێراتی دەکاو دەیانبا بۆ خۆی! جا ئایا بە بیری ئێوە ئەو تێکۆشەرە لەو رۆژەدا هیچی بۆ دەهێڵێتەوە یا هەموو خێرەکانی دەبا بۆ خۆی؟ (م/د/ن).

## ۱۷) باسی سێیەم: نیازی پاك‌و قەستی خێرومەبەستی رەوا لە غەزادا مەرجە، حوکمی غەزا چییە، فەرزە یا سوننەتە، یا چییە؟

## الباب الثالث: في نية الجهاد وحكمه

**٤٣٥٠-** عَنْ أَبِي مُوسَى (رضى الله عنه) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: الرَّجُلُ يُقَاتِلُ لِلْمَغْنَمِ، وَالرَّجُلُ يُقَاتِلُ لِلذِّكْرِ، وَالرَّجُلُ يُقَاتِلُ لِيُرَى مَكَانُهُ. فَمَنْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ؟ قَالَ: مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللَّهِ هِيَ الْعُلْيَا فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ . رواه الخمسة [1]:

ئەبو موسا (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) گوتی: پیاوی وا هەیە بۆ تاڵان شەڕ دەکا، پیاوی وا هەیە بۆ ناوو شۆرەت شەڕ دەکا پیاوی وا هەیە تا شوێنی دیاربێ‌و بڵێن ئازایە لەبەرئەوە شەڕ دەکا، ئەمانە کامەیان لەبەر رەزای خودایە؟ فەرمووی: هەر کەسێ شەڕ بکا هەتا شەریعەتی خودا سەربکەوێ ئەوە لەبەر رەزای خودایە (ش/د/ت/ن).

---

[1] تجريد البخاريم ٣/ ٢٩٢ رقم: ١١٦٠ = ٢٨١٠ ، ٣١٢٦ ، ٧٤٥٨. مسلم. جهاد: ٤٨٩٦. أبو داوُد. جهاد: ٢٥١٧ ، ٢٥١٨. ترمذي. فضائل الجهاد: ١٦٤٦. نسائي. جهاد: ٣١٣٦. ابن ماجة. جهاد: ٢٧٨٣.

**٤٣٥١-** عَنْ سَهْلَ بْنَ حُنَيْفٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ سَأَلَ اللَّهَ الشَّهَادَةَ بِصِدْقٍ بَلَّغَهُ اللَّهُ مَنَازِلَ الشُّهَدَاءِ وَإِنْ مَاتَ عَلَى فِرَاشِهِ . رَوَاهُ الخمسة إلاَّ البخاري [٢]:

**سەهلی کوڕی حونەیف** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: ئەوەی لەکانی دڵیەوە بە ڕاستی داوای شەهید بوون لە خودا بکا خودا پایەی شەهیدی دەداتێ، ئەگەر چی لەناو نوێنی خۆشیا لە ماڵەوەی بە دەردی خودا بمرێ و لە مەیدانی شەڕدا جوانە مەرگ نەبێ (م/د/ت/ن).**

**٤٣٥٢-** وَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْتَ رَجُلاً غَزَا يَلْتَمِسُ الأَجْرَ وَالذِّكْرَ مَا لَهُ؟ فَقَالَ: لاَ شَيْءَ لَهُ. فَأَعَادَهَا ثَلاَثَ مَرَّاتٍ فَقَالَ: لاَ شَيْءَ لَهُ. إِنَّ اللَّهَ لاَ يَقْبَلُ مِنَ الْعَمَلِ إِلاَّ مَا كَانَ لَهُ خَالِصًا وَابْتُغِيَ بِهِ وَجْهُهُ. رَوَاهُ النسائي وأبو داود [٣]:

**پیاوێکیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! پێم بفەرموو ئەگەر پیاوێ بچێ بۆ غەزاو مەبەستی هەم پاداش و هەم ناوو شۆرەتی باش بێ چی پێ دەبڕێ؟ فەرمووی: هیچی پێ نابڕێ پیاوەکە سێ جار ئەمەی دووبارە کردەوە، ئەویش فەرمووی: هیچی پێ نابڕێ چونکە هەر کارێ ساخ و ساف بۆ ڕەزای خودا بێ خودا وەری دەگرێ و پەسەندی دەکا ئەگینا نایەوێ! (ن/د).**

## ١٨) ئەوەی بە کرێ بچێ بۆ خەبات واتە: (کرێ گرتە) پاداشی بۆ نییە: لا ثواب للأجير على الجهاد

**٤٣٥٣-** عَنْ أَبِي أَيُّوبَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: سَتُفْتَحُ عَلَيْكُمُ الأَمْصَارُ وَسَتَكُونُ جُنُودٌ مُجَنَّدَةٌ تُقْطَعُ عَلَيْكُمْ فِيهَا بُعُوثٌ فَيَكْرَهُ الرَّجُلُ مِنْكُمُ

---

[٢] مسلم. جهاد: ٤٩٠٧. أبو داود. صلاة: ١٥٢٠. ترمذي. فضائل الجهاد: ١٦٥٣. نسائي. جهاد: ٣١٦٢. ابن ماجة. جهاد: ٢٧٩٧.

[٣] سكت عن درجته الشارح.

الْبَعْثَ فِيهَا فَيَتَخَلَّصُ مِنْ قَوْمِهِ، ثُمَّ يَتَصَفَّحُ الْقَبَائِلَ يَعْرِضُ نَفْسَهُ عَلَيْهِمْ يَقُولُ: مَنْ أَكْفِيهِ بَعْثَ كَذَا، مَنْ أَكْفِيهِ بَعْثَ كَذَا، وَذَلِكَ الأَجِيرُ إِلَى آخِرِ قَطْرَةٍ مِنْ دَمِهِ [1]:

**ئەبو ئەییوب (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئێوە لەمەولا شارو ولاتی زۆر دەگرن فەرمانڕەواکانیش بۆ پاراستن‌و کارگێڕیی ئەو شوێنانە ناچار دەبن کە سوپای گەورە پێکەوە نێن‌و سەربازی دەبێ بە بێگاریی (ئیجباریی) جا هەر ولاتەی بە پێی سەر ژمارەیەکی دیاری کراوتان لە سەرباز لەسەر دادەنرێ، جا پیاوی وا دەبی حەز ناکا ئاوا بەخۆڕایی بچێ بۆ غەزا، دەچی خۆی لە هۆزەکەی دەدزێتەوەو دەڕوا بەسەر خێڵ‌و تیرەکانی تردا،، دەسووڕێتەوەو خۆی دەخاتە سەر سەواو دەڵێ: کێ دەیەوێ کە من لەباتی ئەو بەکری بچم بۆ ئەم سەربازییە، یا لە جیاتی ئەو بچم بۆ ئەم نێردەیە! ئا ئەمەیە کە تا دوا دڵۆپی خوێنی بەکری گیراوە! (د- س/ص).**

٤٣٥٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رضي الله عَنْهُما) عَنْ النَّبِيِّ (صلى الله تَعَالَى عليه وسلم) قَالَ: لِلْغَازِي أَجْرُهُ وَلِلْجَاعِلِ أَجْرُهُ وَأَجْرُ الْغَازِي . رَوَاهُما أبو داود [2]:

**عەبدوڵڵای کوڕی عەمر لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (درودی خودای لەسەربێ): غەزاکەر کە بە کرێ بچێ بۆ غەزا، یەك خێری بۆ هەیە، بەڵام غەزا سازکەر دوو خێری بۆ هەیە، هەم خێری خۆی‌و هەم خێری ئەو غەزاکەرەی کە تفاقی غەزای بۆ ساز دەکاو دەبێ بەهۆی چوونی بۆ غەزا (د- سند صالح).**

٤٣٥٥- وَقَالَ الْحَسَنُ وَابْنُ سِيرِينَ (رضي الله تَعَالَى عَنْهُما): يُقْسَمُ لِلأَجِيرِ مِنَ الْمَغْنَمِ، وَأَخَذَ عَطِيَّةُ بْنُ قَيْسٍ فَرَسًا عَلَى النِّصْفِ، فَبَلَغَ سَهْمُ الْفَرَسِ أَرْبَعَمِائَةِ دِينَارٍ، فَأَخَذَ مِائَتَيْنِ وَأَعْطَى صَاحِبَهُ مِائَتَيْنِ. رَوَاهُ البخاري في الأجير[3]:

---

[1] رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ بسند صالح (شرحه).

[2] رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ بسند صالح (شرحه).

[3] رَوَاهُ البخاري تعليقاً في باب الأجير كتاب الجهاد ، قبل رقم: ٢٩٧٣.

**حەسەن و ئیبنو سیرین** (ڕەزای خودایان لێ بێ) **فەموویانە: کرێ گرتە بەشی** **بۆ دادەنرێ لە تالان، عەطییەی کوڕی قەیسیش ئەسپێکی وەرگرت بە** **نیوەیی و سواری بوو چوو بۆ غەزا، لەو غەزایەدا پشکی ئەسپەکە چوار سەد** **دینار دەرچوو، جا عەطییە دوو سەدی بۆ خۆی هەڵگرت و دوو سەدیشی دا** **بە خاوەن ئەسپەکە! (ب).**

## ١٩) تێکۆشان (غەزاکردن) فەرزی کیفایەیە : (الجهاد فرض كفاية)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {انْفِرُواْ خِفَافًا وَثِقَالاً وَجَاهِدُواْ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ} (٩-٤١).

**واتە: ئەی موسوڵمانینە! بەگشتی دەرچن بۆ غەزاو تێکۆشان لە ڕێگەی خوادا، خوا لەشتان سووك بێ یا قورس،، سەرتان سووك بێ یا سەرتان جەنجاڵ بێ، خێزان و ماڵ و منداڵتان کەم بێ یا زۆر، دەوڵەمەند بن یا هەژار، بە سەرو بە ماڵ و بە گیان و بە سامان، کۆشش و جیهاد بکەن لەبەر ڕەزای خودا لە پێناوی یارمەتی ئیسلامدا، ئەم کۆشش و تێکۆشان و غەزاکردنە گەلێ چاکترە بۆ ئێوە بۆ دین و دنیاتان ئەگەر بزانن.**

٤٣٥٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله تبارك وتعالى عنهما) قَالَ: (إِلاَّ تَنْفِرُوا يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا) وَ (مَا كَانَ لأَهْلِ الْمَدِينَةِ وَمَنْ حَوْلَهُمْ مِنَ الأَعْرَابِ أَنْ يَتَخَلَّفُوا عَنْ رَسُولِ اللَّهِ) نَسَخَتْهَا الآيَةُ الَّتِي بَعْدَهَا: (وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنْفِرُوا كَافَّةً). رَوَاهُ أبو داود [1]:

**ئیبنو عەبباس** (ڕەزای خودایان لێ بێ) **دەفەرموێ: ئایەتی:**

{إِلاَّ تَنفِرُواْ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا - ٩/٣٩}.

**ئەگەر کاتێ فەرمانڕەوا داوای لێ کردن کە ئێڵجارییی لێ بکەن و ئێوە نەچن بە دەنگیەوە ئەوە خودا سزایەکی بە سوێتان دەداو ئایەتی:**

---

[1] رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ بسند صالح (شرحه).

{مَا كَانَ لِأَهْلِ الْمَدِينَةِ وَمَنْ حَوْلَهُم مِّنَ الأَعْرَابِ أَن يَتَخَلَّفُواْ عَن رَّسُولِ اللّهِ – ١٢٠/٦}.

دەفەرموێ: ئەم دوو ئایەتە نەسخ بوو نەتەوە بەم ئایەتە کەوا لەدوا ئەوانەوە کە دەفەرموێ:

{وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُواْ كَآفَّةً – ١٢٢/٩}.

واتە: هەر وەکوو رەوا نییە بۆ موسوڵمانان کە پاش بکەون لە سەفەری غەزادا لە حەزرەت هەروەها رەوایش نییە کە هەموویان سەرجەم دەربچن بۆ غەزاو دەوری حەزرەت چۆڵ بکەن! (د- سند صالح).

٤٣٥٧- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَنَّه قَالَ يَوْمَ الْفَتْحِ لاَ هِجْرَةَ بَعْدَ الْفَتْحِ وَلَكِنْ جِهَادٌ وَنِيَّةٌ، وَإِذَا اسْتُنْفِرْتُمْ فَانْفِرُوا. رَوَاهُ الخمسة [٢]:

دیسان فەرمووی: رۆژی گرتنی شاری مەککە، کە ناوو بانگی دەرکردووە بە فەتحی مەککە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لەپاش گرتنی شاری مەککەو ئیسلام بوونی خەڵکەکەی ئیتر کۆچ کردن لە مەککەوە بۆ مەدینە نەما، چونکە مەککەیش وەك مەدینە بوو بە خاك و وڵاتی ئیسلام و لە ژێر رکێفی کافران دەرچوو،، بەڵام کۆشش و تێکۆشان و جیهادو نیازی پاك هەرماون و هەر دەمێنن و هەتا هەتایە دەبن بەهۆی سەربەرزی هەردوو جیهان و مایەی روو سووری لەلای خودای گەورە، جا هەر کاتێ داواتان لێ کرا کە دەربچن بۆ غەزا دەرچن و بڕۆن بۆی. (ش/د/ت/ن- خودایان لێ رازی بێ).

٤٣٥٨- ← (ب- ١ز- ٢١٦ل- ٥٦٥ف- ٢) + (ب- ١ز- ١٢٨ل- ٣٨٨ف- ٦) [٣].

---

[٢] تجريد/ ٢/ ٢٤٢ رقم: ٨٤٣ = ١٨٣٤ ، ١٣٤٩ تعليقا ، ١٥٨٣ ، ١٨٣٤ ، ٢٧٨٣ ، ٢٨٢٥ ، ٣٠٧٧ ، ٣١٨٩ ، مسلم. حج: ٣٢٨٩ ، ٤٨٠٦. أبو داوُد. مناسك: ٣٠١٨ ، ٢٤٨٠. ترمذي. سيرة: ١٥٩٠. نسائي: مناسك. الحج: ٢٨٧٤ ، ٢٨٧٥.

[٣] تقدم في مجلد أول. تسلسل/ ٢١٦ برقم: ٢/ ١١١٢. وتسلسل/ ١٢٨ رقم/ ٦/ ٧٧٢.

**٤٣٥٩-** عَنْ جَابِرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لاَ تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي يُقَاتِلُونَ عَلَى الْحَقِّ ظَاهِرِينَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ. رَوَاهُ مسلم والترمذي وأبو داود، وزاد: ظَاهِرِينَ عَلَى مَنْ نَاوَأَهُمْ حَتَّى يُقَاتِلَ آخِرُهُمُ الْمَسِيحَ الدَّجَّالَ [٤]:

جابیر لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ: کۆمەڵێ لە ئۆمەتم هە خەبات دەگێڕن و بە ئاشکراو بەبێ پەروا لە پێناوی هەق و راستیدا هەر جەنگ دەکەن و خوداش هەر سەریان دەخا بەسەر دوشمنی خۆیاندا، تا نزیکی رۆژی قیامەت (م/ت/د) ئەبو داوود (رەحمەتی خودای لێ بێ) ئەمەی پتر کردووە: هەر زاڵ دەبن بەسەر ئەوانەدا کە شەڕیان پێ دەفرۆشن، هەتا چینی دواوەیان دەچن بەگژ ججاڵە کوێرەی هەلاتبازدا.

**٤٣٦٠-** ولمسلم: لَنْ يَبْرَحَ هَذَا الدِّينُ قَائِمًا يُقَاتِلُ عَلَيْهِ عِصَابَةٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ [٥]:

دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): ئەم ئایینی ئیسلامە هەر پایەدار دەبێ، بەبێ وچان و بەردەوام کۆمەڵ کۆمەڵ، چین لەدوا چین موسوڵمانان خەبات دەگێڕن و جەنگ دەکەن لە پێناویدا، هەتا نزیکی رۆژی قیامەت (م).

## ٢٠) خاوەن عوزرو بەهانەی رەوا ئەگەر نەشچێ بۆ غەزا گوناهی لەسەر نییە: (لا حرج على المعذور)

قَالَ الله تعالى: {لَّيْسَ عَلَى الضُّعَفَاء وَلاَ عَلَى الْمَرْضَى وَلاَ عَلَى الَّذِينَ لاَ يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُواْ لِلّهِ وَرَسُولِهِ} (٩/٩١).

واتە: ئەوانەی کە لازەبوون و بێ هێزن، وەکوو پیرو منداڵ، یا ئەوانەی کە نەخۆشن یا ئەوانەی کە دارای ماڵ نین تا سەرفی بکەن لە چاکەدا ئەمانە ئەگەر بەشداری نەکەن لە غەزا کردندا، هەر کەسی بە پێی بەهانەی رەوای

[٤] مسلم. جهاد: ٤٩٢٧. ترمذي. فتن: ٢٢٢٩.

[٥] مسلم. جهاد: ٤٩٣٠

خۆی ئەوە گوناهیان لەسەر نییە، بەڵام بەم مەرجە کە لەگەڵ خوداو پێغەمبەری خودادا ساخ بن و بۆ دینی ئیسلام دڵسۆز بن و بە پێی تەوانای خۆیان لە یاریدەی ئیسلام کۆتایی نەکەن.

**٤٣٦١-** حديث زيد بن ثابت: أملى عليَّ رَسُولِ اللّٰهِ.. الحديث، سبق في مبحث (سورة النساء) في كتاب التفسير، الحديث العشرون [1].

**٤٣٦٢-** عَنْ أَنَسٍ (رضي الله عنه) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) كَانَ فِي غَزَاةٍ فَقَالَ: إِنَّ أَقْوَامًا بِالْمَدِينَةِ خَلْفَنَا، مَا سَلَكْنَا شِعْبًا وَلاَ وَادِيًا إِلاَّ وَهُمْ مَعَنَا فِيهِ، حَبَسَهُمُ الْعُذْرُ . رَوَاهُ الثلاثة [2]:

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) لە غەزایەکا فەرمووی: لە شاری مەدینە، پیاوانێ لە خۆمان، لە ئێمە بەجێماون و نەهاتوون بۆ ئەم غەزایە، بەلام بە دڵ و بە گیان لەگەڵ ئێمەن لەبەر ئەوەی کە بەهانەی رەوایان هەیەو نیازی پاکیان هەیە ئێمە لەهەر رێچکەو لاپێ و شیوو دۆڵێکەوە بڕۆین ئەوانیش لە پاداشت و خێردا لە گەڵمانن، چونکە بەهانەی رەوا لەوێ گلی داونەتەوە (ش/د).

**٤٣٦٣-** وَجَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَسْتَأْذِنُهُ فِي الْجِهَادِ، فَقَالَ: أَلَكَ وَالِدَانِ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَفِيهِمَا فَجَاهِدْ. رَوَاهُ الخمسة [3]:

پیاوێکیش هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) پرسی پێ کرد کە لە خزمەتی دا بچێ بۆ غەزا، فەرمووی: باوك و دایکت هەیە؟ گوتی: بەڵی هەمە، فەرمووی: دەی کەواتە بۆ خزمەتی ئەوان تێکۆشە (ش/د/ت/ن).

---

[1] تقدم في المجلد السادس. تسلسل/ ٥ل ١١٠ برقم: ٣٨١٣/٢٠.

[2] مسلم. جهاد: ٤٩٠٩. ابن ماجه. جهاد/ ٢٧٦٥. تحفة الأشراف: ٢٣٠٤.

[3] تجريد البخاري/ ٣/ ٣٥٣ رقم: ١٢٢٩ = ٣٠٠٤ ، ٥٩٧٢ فتح الباري. مسلم. بروصلة: ٦٤٥١. أبو داود. جهاد: ٢٥٢٩. ترمذي. جهاد: ١٦٧١. نسائي. جهاد: ٣١٠٣.

٤٣٦٤- وَجَاءَ رَجُلٌ مِنَ الْيَمَنِ لِيُجاهِدْ مع النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: هَلْ لَكَ أَحَدٌ بِالْيَمَنِ؟ قَالَ: أَبَوَايَ، قَالَ: أَذِنَا لَكَ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: ارْجِعْ إِلَيْهِمَا فَاسْتَأْذِنْهُمَا، فَإِنْ أَذِنَا لَكَ فَجَاهِدْ وَإِلاَّ فَبِرَّهُمَا . رَوَاهُ أبو داود. نسأل الله حسن الرواية. آمين [٤]:

پیاوێکیش (لە یەمەنەوە) هات، تاکوو لە خزمەتی پێغەمبەردا خەبات بکا، فەرمووی پێی: کەست هەیە لە یەمەن؟ گوتی: باوك و دایکم لەوێن، فەرمووی: ئایا رەزایان لە سەرەو رێگەیان داوی کە هاتووی بۆ لای من بۆ غەزا؟ گوتی: نەء، فەرمووی: دەبچۆرەوە بۆ لایان و پرس و رایان پێ بکە، جا ئەگەر رەزایان لەسەر بوو ئەوا تێکۆشەو وەرە بۆ غەزا، ئەگینا دڵی باوك و دایکت راگرەو باش بە بۆیان (د).

٢١) پەیمان بەستن لەسەر غەزاکردن : (المبایعة علی الجهاد)

٤٣٦٥- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمْ نُبَايِعْ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عَلَى الْمَوْتِ إِنَّمَا بَايَعْنَاهُ عَلَى أَنْ لاَ نَفِرَّ [١]:

جابیر (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: لەسەر مردن پەیمانمان بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نەدەدا بەڵام لەسەر ئەوە پەیمانمان دەدایە کە لەکاتی شەرکردندا لەبەر دوژمن رانەکەین (ش/ت).

٤٣٦٦- وَسُئِلَ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): عَلَى أَيِّ شَيْءٍ بَايَعْتُمْ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَوْمَ الْحُدَيْبِيَةِ؟ قَالَ عَلَى الْمَوْتِ. رَوَاهُما الشيخان والترمذي [٢]:

لە سەلەمەی کوڕی ئەکوەعیان پرسی: لە رۆژی رووداوی حودەیبییەدا لەسەر چی لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربێ) پەیمانتان بەست؟ فەرمووی: لەسەر ئەوە پەیمانمان دایە کە ئەگەر بشکوژرێین لە فەرمانی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەرنەچین (ش/ت).

---

[٤] سكت عن درجته الشارح.

[١] مسلم. مغازي: ٤٧٨٥. ترمذي. سير: ١٥٩٤. نسائي. بيعة: ٤١٦٩. تحفة الأشراف: ٢٧٦٣.

[٢] تجريد البخاري/ ٣/ ٣٣٩ رقم: ١٢١٤ = ٢٩٦٠ ، ٤١٦٩ ، ٧٢٠٦ ، ٧٢٠٨. مسلم: مغازي: ٤٧٩٩. ترمذي. سير: ١٥٩٢. نسائي. بيعة: ٤١٧٠.

٤٣٦٧- ← (ب- ٣ز- ٤ ١٠ل- ٢٧٣ف- ١) [٣].

**٢٢) ئافرەتانیش لەگەڵ پیاواندا دەچن بۆ غەزا : (تغزو النساء مع الرجال)**

**٤٣٦٨- عَنْ أَنَسٍ (رضى الله عنه) قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ أُحُدٍ انْهَزَمَ النَّاسُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَلَقَدْ رَأَيْتُ عَائِشَةَ بِنْتَ أَبِي بَكْرٍ وَأُمَّ سُلَيْمٍ وَإِنَّهُمَا لَمُشَمِّرَتَان أَرَى خَدَمَ سُوقِهِمَا تَنْقُزَانِ الْقِرَبَ عَلَى مُتُونِهِمَا ثُمَّ تُفْرِغَانِهِ فِي أَفْوَاهِ الْقَوْمِ، ثُمَّ تَرْجِعَانِ فَتَمْلآنِهَا، ثُمَّ تَجِيئَانِ فَتُفْرِغَانِهَا فِي أَفْوَاهِ الْقَوْمِ. رَوَاهُ الشيخان [١]:**

**ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) دەفەرموێ: رۆژی رووداوەکەی چیای ئوحود، خەڵکەکە لە دەوری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هەڵهاتن، عائیشەی کچی ئەبو بەکرو ئوممو سولەمم دی، زۆر زۆر خێراو بە دەستو برد بوون، بە کۆڵ بە کوندە ئاویان دەهێناو قولیان هەڵکردبوو، خرخاڵو پاوانەکانیان لە قولە پێیاندا دیار بوو، بە هەڕاکردن دەهاتنو دەچوونو لەناو کۆڕی شەڕەکەدا، لە جەنگەی شەڕەکەدا ئاوەکەیان دەگێڕا بەسەر جەنگاوەرەکاندا، بە هەنگڵی کوندەکان ئاوەکەیان دەکرد بە دەمی پیاوە غەزاکەرەکانەوە، هەر لەگەڵ کوندەو جەوەندەکان خاڵی دەبوونەوە بەبێ وچان دیسانەوە بە قەڵەمبازو بە گومەتە دەگەڕانەوەو پڕیان دەکردنەوە لە ئاوو، دەهاتنەوە بۆ شەڕگاکەو ئاوەکەیان دەکردەوە بە دەمی پیاوەکانەوە، هەتا دووبارە خاڵی دەبوونەوە، وە هەروەها (ش) ← (ب- ٥ز- ٤٩ل- ١٧٩ف- ١). برقم/٣٤٣٨/١.**

**٤٣٦٩- وعَنْهُ قَالَ: كانَّ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَغْزُو بِأُمِّ سُلَيْمٍ وَنِسْوَةٍ مِنَ الأَنْصَارِ مَعَهُ إِذَا غَزَا فَيَسْقِينَ الْمَاءَ وَيُدَاوِينَ الْجَرْحَى. رَوَاهُ مسلم وأبو داود والترمذي[٢]:**

---

[٣] تقدم في مجلد ثالث. تسلسل/ ١٠٤ برقم ١/ ٢٤١١.

[١] بخاري. جهاد: ٢٨٨٠ ، ٢٩٠٢ ، ٢٨١١ ، ٤٠٦٤. مسلم. مغازى: ٤٦٦٠.

[٢] مسلم. مغازى: ٤٦٥٩. ابُو داوُد. جهاد: ٢٥٣. ترمذي. سير: ١٥٧٥.

دیسان فەرمووی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئوممو سولەیم‌و چەند ژنێكی ئەنصاری تری لەگەڵ خۆیدا دەبرد بۆ غەزا، ئیشیان ئەوەبوو ئاویان دەگێڕاو تیماری زامدارەكانیان دەكرد (م/د/ت).

٤٣٧٠- وَقَالَتْ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذٍ (رضي الله تَعَالَى عَنْهَا): كُنَّا نَغْزُو مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَنَسْقِي الْقَوْمَ وَنَخْدُمُهُمْ وَنَرُدُّ الْجَرْحَى وَالْقَتْلَى إِلَى الْمَدِينَةِ. رَوَاهُ البخاري [٣]:

روبەییعی كچی موعەوویز (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: جاران ئێمەی ژنانن لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربێ) دەچووین بۆ غەزا، كارمان ئەوەبوو ئاومان دەدا بە خەباتگێڕەكان‌و خزمەتمان دەكردن‌و زامارمان دەگواستەوەو كوژراومان دەبردەوە بۆ مەدینە! (ب).

٤٣٧١- وَقَالَتْ أُمُّ عَطِيَّةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) غَزَوْتُ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) سَبْعَ غَزَوَاتٍ أَخْلُفُهُمْ فِي رِحَالِهِمْ فَأَصْنَعُ لَهُمُ الطَّعَامَ وَأُدَاوِي الْجَرْحَى وَأَقُومُ عَلَى الْمَرْضَى. رَوَاهُ مسلم والله أعلم [٤]:

ئوممو عەطییەش (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: بۆ خۆم حەوت غەزام لە خزمەتی حەزرەتدا كردووە، لە بنەو بارەگاكانیان دەمامەوە نانم بۆ دروست دەكردن‌و تیماری زامارەكانم دەكردو سەرپەرشتی نەخۆشەكانم دەكرد (م).

## ٢٣) هیجرەت‌و رەوكردن بۆ وڵاتی ئیسلام سوننەتە
## الهجرة إلى بلاد الإسلام مستحبة

قال الله تعالى: {وَمَن يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ يَجِدْ فِي الأَرْضِ مُرَاغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً وَمَن يَخْرُجْ مِن بَيْتِهِ مُهَاجِرًا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ يُدْرِكْهُ الْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا} (٤/١٠٠).

---

[٣] بخاري. جهاد: ٢٨٨٣ ، ٢٨٨٢ ، ٢٨٤٣ ، ٥٦٧٩.

[٤] مسلم. مغازي: ٤٦٦٧.

**واتە: هەر کەسێ کۆچ‌و رەو بکا لە ولاتی خۆیەوە بۆ ولاتی ئیسلام لەبەر رەزای خودا، ئەوە تووشی خێرو خۆشی دەبێ‌و لە جێگەیەکی باشا، لە ولاتێکی دوور لە ئاشووب‌و ئاژاوە دادەگیرسێتەوە‌و دەحەسێتەوە‌و خوداش رزق‌و رۆژی پتر دەکا وە کەسێ لە ماڵی خۆی دەربچێ‌و مەبەستی هیجرەت‌و کۆچ کردن بێ بۆ لای خوداو پێغەمبەری خودا، جا لە رێگەی مردن یەخەی پی بگرێ‌و ئەمری خودا بکاو فەرمانی هەق بەجێ بێنێ ئەوە بەبێ شك‌و شوبهە پاداشی باشی دەبی بە مزو ماڵ لەسەر خودای گەورە، وە خودای مەزن تاوانپۆش‌و میهرەبانە.**

**٤٣٧٢- ← (ب- ١ز- ١١ل- ٦٥ف- ١)** [1].

**٤٣٧٣- عَنْ مُعَاوِيَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لاَ تَنْقَطِعُ الْهِجْرَةُ حَتَّى تَنْقَطِعَ التَّوْبَةُ وَلاَ تَنْقَطِعُ التَّوْبَةُ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا** [2]:

**موعاوییە لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): تا دەرگای تەوبە دادەخری کاتی هیجرەت‌و کۆچ کردن دەمێنێ، هەتا خۆریش لە رۆژئاواوە هەڵنەیێ دەرگای تەوبە داناخرێ! (د- سند صالح).**

**٤٣٧٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رضي الله عنهما) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: سَتَكُونُ هِجْرَةٌ بَعْدَ هِجْرَةٍ، فَخِيَارُ أَهْلِ الأَرْضِ أَلْزَمُهُمْ مُهَاجَرَ إِبْرَاهِيمَ، وَيَبْقَى فِي الأَرْضِ شِرَارُ أَهْلِهَا تَلْفِظُهُمْ أَرَضُوهُمْ تَقْذَرُهُمْ نَفْسُ اللَّهِ وَتَحْشُرُهُمُ النَّارُ مَعَ الْقِرَدَةِ وَالْخَنَازِيرِ . رَوَاهُما أبو داود** [3]:

**عەبدوڵلای کوڕی عەمر (خودایان لێ رازی بی) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کۆچێکی تریش لەپاش ئەم کۆچە دەبێ! وە چاکترینی خەڵك ئەوانەن کە رەوگە (مەهجەر)ی ئیبراهیم کە لە قودسە بەرنادەن، وای لێ**

---

[1] تقدم في مجلد أول: تسلسل/ ١١ برقم: ١/ ٨٣.

[2] رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ بسند صالح (شرحه).

[3] رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ بسند صالح (شرحه).

دێ تەنیا بەدکارو گەندەکان دەمێننەوە لە وڵاتدا، زەوی نایان گرێتە خۆی و خودا پڕ بەدڵ قێزیان لێ دەکاتەوە، وە ئاگرێ لەگەڵ جانەوەرو مەیموون و بەرازدا خڕیان دەکاتەوەو مۆڵیان دەدات! (د- سند صالح).

٤٣٧٥- وَجَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: يا رَسُولَ اللَّهِ جِئْتُ أُبَايِعُكَ عَلَى الْهِجْرَةِ وَتَرَكْتُ أَبَوَيَّ يَبْكِيَانِ، قَالَ: ارْجِعْ عَلَيْهِمَا فَأَضْحِكْهُمَا كَمَا أَبْكَيْتَهُمَا . رَوَاهُ أبو داود والنسائي [٤]:

پیاوێ هاتە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! هاتووم بۆ خزمەتی تۆ هەتا پەیمانت بدەمێ لەسەر ئەوە لە وڵاتی خۆمەوە کۆچ بکەم بۆ خزمەتی تۆ، بەڵام کە هاتم باوك و دایکم دەگریان بە دوامدا، فەرمووی: بچۆرەوە بۆ لایان چۆن کردوویانتە گریان ئاوەهایش بیانهێنەرە پێکەنین (د/ن).

٤٣٧٦- وَ لأبي دَاوُدَ: مَنْ جَامَعَ الْمُشْرِكَ وَسَكَنَ مَعَهُ فَإِنَّهُ مِثْلُهُ [٥]:

دەفەرموێ: کەسێ تێکەڵی بتپەرست بکاو لە گەڵیدا دانیشێ و هەڵسی، ئەوە ئەویش وەك ئەو وایە (د).

٤٣٧٧- وللنسائي: لاَ تَنْقَطِعُ الْهِجْرَةُ مَا قُوتِلَ الْكُفَّارُ وَبَعَثَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) سَرِيَّةً إِلَى خَثْعَمٍ، فَاعْتَصَمَ نَاسٌ مِنْهُمْ بِالسُّجُودِ، فَأَسْرَعَ فِيهِمُ الْقَتْلُ، فَبَلَغَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَأَمَرَ لَهُمْ بِنِصْفِ الْعَقْلِ، وَقَالَ: أَنَا بَرِىءٌ مِنْ كُلِّ مُسْلِمٍ يُقِيمُ بَيْنَ أَظْهُرِ الْمُشْرِكِينَ. رَوَاهُ الترمذي وأَبُو دَاوُدَ [٦]:

دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): کۆچ کردن هەر دەمێنێ تا شەڕ لەگەڵ کافراندا بمێنێ. جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لقێ سوپای نارد بۆ سەر هۆزی خەثعەم چەن کەسێ پەلاماری سەجدە بردنیان داو کوڕنووشیان برد،

---

[٤] سكت عَن درجته الشارح.

[٥] رَوَاهُ أبُو دَاوُدَ فى أخر كتاب الجهاد (شرحه).

[٦] سكت عَن درجته الشارح.

هەتا لەشکری ئیسلام نەیانکوژێ‌و بیان ناسێ کە ئەمانە موسوڵمانن بەڵام لە پەلەپەلی دا کوژران، جا کە ئەم باسە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) پێغەمبەر نیوە خوێنی دا بە خاوەن خوێنەکان‌و فەرمووی: من بەریم لەو موسوڵمانانەی کە لەناو هاوبەشپەیداکەرانا دادەنیشن! (ت/د).

٤٣٧٨- وَجَاءَ عَبْدٌ فَبَايَعَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عَلَى الْهِجْرَةِ وَلاَ يَشْعُرُ بِهِ، فَجَاءَ سَيِّدُهُ فَطَلَبُهُ فَاشْتَرَاهُ منه النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بِعَبْدَيْنِ أَسْوَدَيْنِ وَلَمْ يُبَايِعْ أَحَدًا بَعْدُ حَتَّى يَسْأَلَهُ أَعَبْدٌ هُوَ. رَوَاهُ الترمذي في السير [٧]:

بەندەیێ هاتە خزمەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) پەیمانی لەگەڵی دا بەست لەسەر کۆچکردن، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) نەیزانی کە ئەوە عەبدە، واتە: بەندەی زەرخرپیدەیە، لەپاشا خاوەنەکەی هات داوایکردەوە پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) بە دوو بەندەی رەش لێی کری، لەوەدوا حەزرەت پەیمانی لەکەس وەرنەدەگرت تا لێی نەپرسیبایە: تۆ بەندەی یانا؟ (ت).

٤٣٧٩- وَ دَخَلَ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَلَى الْحَجَّاجِ فَقَالَ: يَا ابْنَ الأَكْوَعِ ارْتَدَدْتَ عَلَى عَقِبَيْكَ تَعَرَّبْتَ، قَالَ: لاَ وَلَكِنْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَذِنَ لِي فِي الْبَدْوِ رَوَاهُ مسلم [٨]:

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع (خودای لێ رازی بێ) چوو بۆ لای حەججاج، گوتی: ئەی کوڕی ئەکوەع! پاشگەز بوویتەتەوەو وازت لە هیجرەت هێناوەو بوویتەتەوە بە دەشتەکی! سەلەمەیش فەرمووی: نەخەیر، ئەوە لە منەوە زۆر دوورە، من لەسەر دین‌و ئایینی خۆم ماوم، بۆ ئەمەیش کە ئێستا لە دەشت، دا دەنیشم لەکاتی خۆی دا پێغەمبەر خۆی (درودی خودای لەسەربێ) رێگەی ئەوەی داوم (م).

---

[٧] سكت عن درجته الشارح.

[٨] رواه مسلم. إمارة: ٤٨٠٢. تجريد/ ٥ ل — ٣٥٧ رقم: ٢٠٩٨ = (٧٠٨٧) ٧٠٨٨ فتح الباري.

## ٢٤) باسی چوارەم: باسی سەفەرو وڵاخ و کەرەستەو تفاقی تێکۆشان لە ڕێگەی خودادا:

## الباب الرابع: في السفر والدواب وآلات الجهاد

**٤٣٨٠-** عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) خَرَجَ يَوْمَ الْخَمِيسِ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ وَكَانَ يُحِبُّ أَنْ يَخْرُجَ يَوْمَ الْخَمِيسِ. رَوَاهُ البخاري وأبو داود والنسائي [(١)]:

**کەعبی کوڕی مالیك** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **لە ڕۆژی پێنج شەممەدا لە ماڵ دەرچوو، ڕۆیشت بۆ غەزای تەبووك، هەمیشەیش حەزی دەکرد کە لە ڕۆژی پێنج شەممەدا دەرچێ بۆ سەفەر** (ب/د/ن– پڕ گۆڕەکانیان لە نوور بێ).

**٤٣٨١-** عَنْ صَخْرٍ الْغَامِدِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: اللَّهُمَّ بَارِكْ لأُمَّتِي فِي بُكُورِهَا، وَكَانَ إِذَا بَعَثَ سَرِيَّةً أَوْ جَيْشًا بَعَثَهُمْ مِنْ أَوَّلَ النَّهَارِ وَكَانَ صَخْرٌ رَجُلاً تَاجِرًا وَكَانَ يَبْعَثُ تِجَارَتَهُ مِنْ أَوَّلَ النَّهَارِ فَأَثْرَى وَكَثُرَ مَالُهُ. رَوَاهُ أصحاب السنن [(٢)]:

**صەخری غامیدی** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: خودایە! ئیش و کاری سەر لە بەیانیانی ئۆمەتم پیرۆز کە! فەرمووی: دەستووری حەزرەتیش وابوو ئەگەر پەلێ سوپا، یا لەشکرێکی بناردایە بۆ غەزا لەسەرەتای ڕۆژەوە دەیناردن، صەخر خۆی پیاوێکی بازرگان بوو، خۆشی دەستووری وابوو لە سەرەتای ڕۆژەوە بازرگانیەکەی دەخستە ڕێ، لەبەرئەوە تەواو داراو دەوڵەمەند بوو بوو، وە ماڵ و سامانی زۆر بوو بوو** (د/ت/ن–س/ح).

---

(١) تجريد البخاري: ١٢٠٨ = ٢٩٤٩ ، ٢٩٤٧ ، ٢٩٤٨ ، ٢٩٥٠ ، ٣٠٨٨ ، ٣٥٥٦ ، ٣٨٨٩ ، ٣٩٥١ ، ٤٤١٨ ، ٤٦٧٣ ، ٤٦٧٦ ، ٤٦٧٧ ، ٤٦٧٨ ، ٦٢٥٥ ، ٦٦٩٠ ، ٧٢٢٥.

(٢) رَوَاهُ أصحاب السنن بسند حسن (شرحه).

**٤٣٨٢- وَلأبي داود: عَلَيْكُمْ بِالدُّلْجَةِ فَإِنَّ الأَرْضَ تُطْوَى بِاللَّيْلِ [٣]:**

**دەفەرموێ (درودی خودای لەسەربێ): بۆ سەفەر كردن شەو بگرن بە دەمەوەو شەو لەناو لە بەرەبەیانا بكەونە ڕێ، چونكە بەشەو تەنگی زەوی دەكێشرێ! (د- سند صالح).**

**٤٣٨٣- عَنْ إبْنِ عُمَرَ (رضي الله تبارك وتعالى عنهما) عَنْ النَّبِيِّ (صلى الله تَعَالَى عليه وسلم) قَالَ: لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ ما فِي الْوَحْدَةِ مَا أَعْلَمُ مَا سَارَ رَاكِبٌ بِلَيْلٍ وَحْدَهُ رَوَاهُ البخاري والترمذي [٤]:**

**ئیبنو عومەر (خودایان لێ ڕازی بێ) لە حەزرەتەوە (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەوەی من دەیزانم لە بارەی تەنیاییەوە، ئەگەر خەڵكیش وەك من بیزانن، هیچ سوارێ بە شەو بە تەنها بەبێ هاوڕێ نە دەڕۆیشت (ب/ت).**

**٤٣٨٤- وَلأبي داود والترمذي: الرَّاكِبُ شَيْطَانٌ وَالرَّاكِبَانِ شَيْطَانَانِ وَالثَّلاثَةُ رَكْبٌ [٥]:**

**دەفەرموێ (درودی خودای لەسەربێ): تاقە سوارێ تاقە شەیتانێكە، دوو سوار دوو شەیتانە، كە بوون بە سێ سوار دەبن بە دەستە سوار! (د/ت- س/ص) مەبەست ئەوەیە پیاو تا بۆی دەكرێ بە تەنیا سەفەری دوور نەكا.**

**(وەرگێڕ)**

**٤٣٨٥- وَعَنْهُ ( أي عَنْ أبْنِ عُمَرَ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) نَهَى أَنْ يُسَافَرَ بِالْقُرْآنِ إِلَى أَرْضِ الْعَدُوِّ. وفِي روايةٍ: لاَ تُسَافِرُوا بِالْقُرْآنِ فَإِنِّي لاَ آمَنُ أَنْ يَنَالَهُ الْعَدُوُّ. رَوَاهُ الثلاثة [٦]:**

---

[٣] بسند صالح (شرحه).

[٤] تجريد البخاري/ ٣/ ٣٥٢ رقم: ١٢٢٨ = ٢٩٩٨ فتح الباري شرح صحيح البخاري.

[٥] بسند صحيح (شرحه).

[٦] تجريد البخاري: ١٢٢٤ = ٢٩٩٠ ، ٢٦١٠ = فتح الباري. مسلم. إمارة: ٤٨١٦ — ٤٨١٩. أبُو داوُد. جهاد: ٢٦١٠. إبن ماجة. جهاد: ٢٨٧٩.

**دیسان ئیبنو عومەر** (رەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **رێگەی نەدەدا کە قورئان ببری بۆ وڵاتی دوشمن. لە گێڕانەوەیەکدا: حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: قورئان مەبەن بۆ سەفەر، چونکە دەترسم کە بکەوێتە بەر چنگی دوژمن! (ش/د).**

**٤٣٨٦- وَقَالَ (رضى الله عنه): كُنَّا إِذَا صَعِدْنَا كَبَّرْنَا، وَإِذَا نَزَلْنَا سَبَّحْنَا. رَوَاهُ البخاري وأبو داود [٧]:**

**جابیر** (خودای لێ رازی بێ) **فەرمووی: لەکاتی رارەوی (سەفەر)دا کە سەر دەکەوتینە سەر بەرزایی ئەڵڵاهو ئەکبەرمان دەکرد، کە سەر بەرەو خواریش دەبووینەوە سوبحانەڵڵامان دەکرد (ب/د).**

**٤٣٨٧- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) عَنْ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) **قَالَ: السَّفَرُ قِطْعَةٌ مِنَ الْعَذَابِ، يَمْنَعُ أَحَدَكُمْ نَوْمَهُ وَطَعَامَهُ وَشَرَابَهُ، فَإِذَا قَضَى أَحَدُكُمْ نَهْمَتَهُ فَلْيُعَجِّلْ إِلَى أَهْلِهِ . رَوَاهُ الشيخان [٨]:**

**ئەبو هورەیرە** (خودای لێ رازی بێ) **فەرمووی: لە حەزرەتەوە** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: سەفەر پارچەیەکە لە ئێش و ئازار، خەوو خۆراک و خواردنەوەتان لێ هەراسان دەکا، جا لەبەرئەوە هەر کە فرمانی خۆتان بە ئەنجام گەیاند ئیتر خێرا بڕۆنەوە بۆ لای کەسو کارتان! (ش).**

**٤٣٨٨- ← (ب- ٣ز- ٤٧ل- ١١٨ف- ٥+٦+٧+٨) [٩].**

---

[٧] بخاري. جهاد: ٢٩٩٣.

[٨] تجريد البخاري/ ٢/ ٢٣٤ رقم: ٨٣٣ = ١٨٠٤ ، ٣٠٠١ ، ٥٤٢٩. (رياض الصالحين/ ٣/ ٣٦ رقم: ١/ ٩٨٤ متفق عليه: ١٨٠٤ بخاري ١٩٢٧ مسلم).

[٩] تقدم فى مجلد ثالث. تسلسل/ ٤٧ رقم: ٥/ ٢١٦٢ + ٦/ ٢١٦٣ + ٧/ ٢١٦٤.

## ٢٥) بەڕێکردن‌و پێشوازی خەباتگێڕان : (توديع الغزاة وإستقبالهم)

**٤٣٨٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ الْخَطْمِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إِذَا أَرَادَ أَنْ يَسْتَوْدِعَ الْجَيْشَ قَالَ: أَسْتَوْدِعُ اللَّهَ دِينَكُمْ وَأَمَانَتَكُمْ وَخَوَاتِيمَ أَعْمَالِكُمْ . رَوَاهُ أصحاب السنن [(١)]:**

**عەبدوڵڵای خەطمی (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کاتێ لەشکری بەڕێ دەکرد دەیفەرموو: أَسْتَوْدِعُ اللَّهَ دِينَكُمْ وَأَمَانَتَكُمْ وَخَوَاتِيمَ أَعْمَالِكُمْ : دیین‌و ئایین‌و ماڵ‌و منداڵ‌و کەس‌و کارو سەر ئەنجامی کاروبارتانم هەموو سپارد بە خودا بە رەحمەتی خۆی ئاگای لێتان بێ. (د/ت/ن- س/ص).**

**٤٣٩٠- وَقَالَ ابْنُ الزُّبَيْرِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) لِابْنِ جَعْفَرٍ: أَتَذْكُرُ إِذْ تَلَقَّيْنَا النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَنَا وَأَنْتَ وَابْنُ عَبَّاسٍ، قَالَ: نَعَمْ، فَحَمَلَنَا وَتَرَكَكَ. رَوَاهُ الشيخان [(٢)]:**

**ئیبنو زوبەیر بە ئیبنو جەعفەری گوت: ئایا لە یادتە کە من‌و تۆو ئیبنو عەبباس چووین بە پیری پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ)؟ فەرمووی: بەڵێ لە بیرمە، ئەوەبوو ئێمەی هەڵگرت‌و تۆی هەڵنەگرتن چونکە یەکێکمانی خستە پاشکۆی‌و یەکێکمانی خستە بەردەمی (ش).**

**٤٣٩١- وَقَالَ السَّائِبُ بْنُ يَزِيدَ (رضى الله عنه): ذَهَبْنَا نَتَلَقَّى النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مَعَ الصِّبْيَانِ إِلَى ثَنِيَّةِ الْوَدَاعِ. رَوَاهُ البخاري [(٣)]:**

**سائیبی کوڕی یەزید (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: هەتا ثەنییەتولوەداع لەگەڵ منداڵاندا چووین بە پیری پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ). (بوخاری رەحمەت لە خۆی‌و کەس‌و کاری).**

---

[(١)] رواه اصحاب السنن بسند صحيح (شرحه).

[(٢)] تجريد /٣/ ٣٧٤ رقم: ١٢٥٤ = ٣٠٨٢.

[(٣)] تجريد/٣/ ٣٧٤ رقم: ١٢٥٥ = ٣٠٨٣ ، ٤٤٢٦ ، ٤٤٢٧.

## ٢٦) باشی و نیشانەی رەسەنیی ولاخی بەرزە : (فضل الخيل وصفاتها)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدْوَّ اللّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَآخَرِينَ مِن دُونِهِمْ لاَ تَعْلَمُونَهُمُ اللّهُ يَعْلَمُهُمْ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيْءٍ فِي سَبِيلِ اللّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لاَ تُظْلَمُونَ} (٨/ ٦٠) [١].

واتە: ئەی موسوڵمانەکان! هەمیشە خۆتان ئامادە بکەن، بۆ چاری دوژمنەکانتان، ئەوەی کە دەتوانن لە هێزی جەنگ، لە فێربوونی هونەرەکانی، لە چەك و تفاق، لە ئەسپ و هێسترو ماینی مەشق دیدەی قاڵ و چوار ناڵ ئامادەی بکەن، هەتا بە باشی دوژمنی خوداو دوژمنی خۆتان بەوە بتۆقێنن.

٤٣٩٢- عَنْ عروة البارقيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: الْخَيْلُ مَعْقُودٌ فِي نَوَاصِيهَا الْخَيْرُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ الأجر والمغنم. رَوَاهُ الخمسة [١]:

عوروەی باریقی (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لە کاکۆڵ و یاڵی ماین و ئەسپ خێرو خۆشی گرێدراوە: کە بریتییە هەم لە پاداشتی باش و هەم لە ماڵی تالانی حەلاڵ، ئەمە بەردەوامە هەتا رۆژی قیامەت (ش/د/ت/ن).

٤٣٩٣- عَنْ أبي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مَنِ احْتَبَسَ فَرَسًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ إِيمَانًا بِاللَّهِ وَتَصْدِيقًا بِوَعْدِهِ، فَإِنَّ شِبَعَهُ وَرِيَّهُ وَرَوْثَهُ وَبَوْلَهُ فِي مِيزَانِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ . رَوَاهُ البخاري والنسائي [٢]:

---

[١] تجريد/٣/ ٣٠٥ رقم/ ١١٧٥ = ٢٧٥٠ ، ٢٨٥٢ ، ٣١١٩ ، ٣٦٤٣. مسلم. مغازي: ٤٨٢٢ — ٤٨٢٦. نسائي. خيل: ٣٥٧٥ ، ٣٥٧٤ ، ٣٥٧٦. ترمذي. جهاد: ١٦٩٤ ، ٣٥٧٦ ، ٣٥٧٧ ، ٣٥٧٨ ، ٣٥٧٩.

[٢] تجريد/ ٣/ ٣٠٦ رقم: ١١٧٧ = ٢٨٥٣ فتح.

ئـەبو هـورەیرە (خـودای لێ ڕازی بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (درووددو سـڵاوو میهرەبانی و پیرۆزیی خودای گەورەو مەزنی لەسەر بێ و سەرو ماڵ و منـاڵ بـە قوربـانی گـەردی سـەر گـۆڕی پیرۆزیـی بـێ) فـەرمووی: هـەر کەسـێ وڵاخێکـی بەرزە لە ڕێگەی خودادا ڕابگرێ بۆ خـۆی و ساخ لەبەر ڕەزای خـودا تـەرخانی بکـا بـۆ غـەزا، دیـارە بۆیـە ئەمـە دەکـا چونکە بـاوەڕی هەیـە بـە خـوداو ئـەو بەڵێنـەی لـەم بارەیـەوە داویـەتی بـە خـەباتگێڕەکان بـە ڕاسـتی دەزانـێ، هـەر کەسی ئاوا بکا ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا خواردن و خواردنەوەو تەرس و گمێزی ئـەو وڵاخـە هـەمووی لـە تـای خێـری تـەرازووی خاوەنەکـەی دا دادەنـرێ (بوخاری و نەسائی – خودایان لێ ڕازی بێ).

٤٣٩٤- وعَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: الْخَيْلُ ثَلاَثَةٌ: هِيَ لِرَجُلٍ وِزْرٌ وَهِيَ لِرَجُلٍ أَجْرٌ وَهِيَ لِرَجُلٍ سِتْرٌ فَأَمَّا الَّتِي هِيَ لَهُ وِزْرٌ، فَرَجُلٌ رَبَطَهَا رِيَاءً وَفَخْرًا وَنِوَاءً عَلَـى أَهْلِ الإِسْلاَمِ فَهِيَ لَهُ وِزْرٌ، وَأَمَّا الَّتِي هِيَ لَهُ سِتْرٌ فَرَجُلٌ رَبَطَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ ثُمَّ لَمْ يَـنْسَ حَقَّ اللَّهِ فِي ظُهُورِهَا وَلاَ رِقَابِهَا فَهِيَ لَهُ سِتْرٌ، وَأَمَّا الَّتِي هِيَ لَهُ أَجْرٌ، فَرَجُـلٌ رَبَطَهَـا فِـي سَبِيلِ اللَّهِ لأَهْلِ الإِسْلاَمِ فِي مَرْجٍ أَوْ رَوْضَةٍ، فَمَا أَكَلَتْ مِنْ ذَلِكَ الْمَرْجِ وَالرَّوْضَـةِ مِـنْ شَيْءٍ إِلاَّ كُتِبَ لَهُ عَدَدَ مَا أَكَلَتْ حَسَنَاتٍ وَكُتِبَ لَهُ عَدَدَ أَرْوَاثِهَا وَأَبْوَالِهَا حَسَنَاتٍ، وَلاَ تَقْطَعُ طِوَلَهَا فَاسْتَنَّتْ شَرَفًا أَوْ شَرَفَيْنِ إِلاَّ كَتَبَ اللَّهُ لَهُ عَدَدَ آثَارِهَا وَأَبْوَالِهَا حَسَنَاتٍ وَلاَ مَرَّ بِهَا صَاحِبُهَا عَلَى نَهْرٍ فَشَرِبَتْ مِنْهُ وَلاَ يُرِيدُ أَنْ يَسْقِيَهَا إِلاَّ كَتَبَ اللَّـهُ لَـهُ عَـدَدَ مَـا شَرِبَتْ حَسَنَاتٍ. رَوَاهُ الخمسة إِلاَّ أبا داود [٣]:

دیـسان فـەرمووی: حـەزرەت (درووددی خـودای لەسـەربێ) دەفـەرموێ: وڵاخـی بەرزە (بە پێی نیازی خاوەنەکەی) سێ جۆرە: بۆ هەندێ پیـاو مایـەی شـەڕە، بۆ هەندێ پیاو پەردەو داپۆشەرە، بۆ هەندێ پیاو مایـەی پاداشـت و خێرە، مایـەی تاوان و شەڕە بۆ ئەوکەسەی کە ڕایدەگری بۆ چاوەو ڕووپامایی و خۆ نواندن و

---

[٣] تجريـد بخـاري/ ٣/ ١٣٥ رقـم: ١٠٤٣ = ٢٣٧٥ ، ٢٣٧١ ، ٢٨٦٠ ، ٣٦٤٦ ، ٤٩٦٢ ، ٤٩٦٣ ، ٧٣٥٦. مـسلم. زكاة: ٢٢٨٧. نسائي. خيل: ٣٥٦٥. إبن ماجة: جهاد: ٢٧٨٨.

شانازیو بۆ دوژمنایەتی لە دژی موسوڵمانان! پەردەو داپۆشەریشە بۆ ئەو کەسەی کە لە رێگەی خودادا رایدەگریو بۆ روو سووریو هەردوو جیهان کەسابەتی پێوە دەکاو ئەو مافەی کە خودا لەسەر ئەو ولاخەی داناوە فەرامۆشی ناکا، وەك ئەوە ئەگەر بازرگانی پێوەکرد زەکاتەکەی بدا، هەروەها مافی ولاخەکە خۆشی فەرامۆش نەکا، ئالیکی ئاسایی بداتی، شتی قورسی پێ هەڵ نەگرێ، مایەی پاداشت و خێریشە بۆ ئەو کەسەی کە رایدەگرێ بۆ خەبات و تێکۆشان ساخ لەبەر رەزای خودا، بۆ بەرژەوەندو سوودی گەلی ئیسلام، لە مێرگێکا یا لە مێرغوزارێکا دەیبەستێتەوە، ئیتر ئەو ولاخە هەرچی بخوا لەو مێرگ و مێرغوزارە بە ژمارەی ئەوە چاکە بۆ خاوەنەکەی دەنووسرێ، وە بە ژمارەی تەرس و میزەکەیشی چاکەو خێرو خێرات بۆ خاوەنەکەی دەنووسرێ، تەنانەت ئەگەر مەڕ بەندەکەی بپسێنێ، یاخود گوریسەکەی بپچڕێنێ، وە سەرێ دوو سەر غار بکاو بای باڵی خۆی بداو یاری بکاو بەبێ سوارەکەی بە پشتی خاڵی رمبازیو تەراتێن بکا، خودا بە ژمارەی شوێن سم و تەرسەکەی چاکەو خێری بۆ دەنووسێ، هەتا ئەگەر خاوەنەکەی بەسەر ئاوێکا بردی، بە نیازی ئەوەیش نا کە بیبا ئاوی بدا، بەڵام ولاخەکە لە خۆیەوە لێی خواردەوە، ئەوە بەقەد ژمارەی ئەو ئاوەی کە دەیخواتەوە چاکەی بۆ دەنووسرێ، دیارە ئەگەر سوارەکە خۆی مەشقی پی بکا، یا بچێ ئاوی بدا، یا لە غەزادا سواری بی ئەوە پاداشتەکەی چەند قاتە (ش/ت/ن) قەڵغان و رم و شیرو تیرو ماین و زین و ئەمانە نموونە و میثالن بۆ هەموو جۆرە چەك و تفاقێکی جەنگی کۆن، هەروەها رمبازیو ئالیك خواردن و گمێزو تەرس و لەوەڕو مێرگ و پێوەندو رەشمەو لفاوو ئەمانەیش نموونەن بۆ شوێن و شوێنەوارو ئیش و کارو تفاقی جەنگن کەواتە: نیازو مەبەست و کردەوە هەر دەمێنن بەڵام ئامێرو تفاق و کەرەستە بە پێی رۆژ دەگۆڕێن و هەتا دێ کۆنەکان کۆنتر دەبن و رۆژ بە رۆژ چەکی تازەترو لەبارترو چاکتر دێتە کایەوە.

دەی بەم پێیە بی لەم رۆژگارەی ئێمەدا تفەنگ و شەستیرو تۆپ لە جێی شیرو تیری کۆنە و خێرو پاداشی ئەوانی (لەکاتی خۆیاندا) هەیە، تانك و

فرۆك‌و فڕۆكە خانەو بەنزین‌و رۆن‌و گازو جەرو بورغوو شۆفێرو تۆپچی‌و فڕۆكەوان‌و كەشتییەوان‌و ئەمانەیش لەجێی ماین‌و هێسترو حوشترو تەویلەو ئاوو ئالیك‌و مێرگی كۆنن، تەنانەت دەتوانین بڵێین دووكەڵ‌و رۆنی مەكینەی كۆن‌و ئەم وردە بابەتانەیش وەك گمێزو تەرسی ولاخ وان، لە رۆژی قیامەتا دادەنرێن لە تای تەرازووی خێری خاوەنەكەیاندا، ئیتر هەروا بەم پێو دانە.

وەلێ ئەوەی كە جێی گومان نییە ئەم دوو خاڵە سەرەكییەیە: یەكەم نابی ئێمە ئەمڕۆ، وەكوو كۆن بە شیرو تیرەوە بچین بۆ شەڕو غەزاكردن گوایە ئەوە سوننەتی پێغەمبەرەو خێری گەورەترە، بەڕاستی شتی وا شەڕی خۆترێنە، خودا فەرمانمان پی دەكا كە بە پێی رۆژوو چەرخ خۆمان ئامادە بكەین‌و چەكی نوێ پەیدا بكەین‌و مایەی بەهێزبوونمان مسۆگەر بكەین، ئەوەتا دەفەرموێ:

(وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ) (٨/ ٦٠).

دووەم شیرو تیرو ماین‌و ئەمانەیش لە قورئان‌و حەدیسدا وەسف كراون‌و كراون بە نیشانەی خێرو خۆشی هەردوو جیهانمان، كەواتە دروست نییە كە بە چاوی سووك تەماشا بكرێن. بگرە تا ئێستایش لە شەڕا رۆڵی خۆیان دەبینن‌و بە پێی حاڵ دەوری باش دەبینن، دەی لەسەر ئەم بنیاتە، لە شەڕی ئەمڕۆشدا شیرو تیرو سوارو ماین‌و ئەمانە بەپێی پێویستی رۆژ، وەكوو كۆن خێرو پاداشتی گەورەیان هەیە، چونكە یاساو دەستوورێكی سەرەكییە: لە دینی ئیسلامدا هەرچی شتێكی رەوا سوودی گشتی هەبی بۆ ئیسلام دروستەو بەجێیە. (وەرگێڕ)

٤٣٩٥- وَعَنْهُ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صلى الله تَعَالَى عليه وسلم) يَكْرَهُ الشِّكَالَ مِنَ الْخَيْلِ. رَوَاهُ الخمسة إِلاَّ البخاري [٤]:

---

[٤] مسلم. مغازی: ٤٨٣٣. ابو داود. جهاد: ٢٥٤٧. ترمذي. جهاد: ١٦٩٨. نسائي. خيل: ٣٥٦٩. إبن ماجة: جهاد: ٢٧٩٠. تحفة الأشراف: ١٤٨٩٠.

دیسان فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) حەزی لە ولاخی بەرزەی راست و چەپ سپی نەبوو (م/د/ت/ن).

٤٣٩٦- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله تَعَالَى عنهما) عَنْ النَّبِيِّ (صلى الله تَعَالَى عليه وسلم) قَالَ: يُمْنُ الْخَيْلِ فِي شُقْرِهَا . رَوَاهُ أبو داود والترمذي [٥]:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خودای گەورەو مەزنی لەسەربێ) دەفەرموێ: ماین و ئەسپی شێ پیرۆزن (د/ت- س/ح).

٤٣٩٧- عَنْ أَبِي وَهْبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: عَلَيْكُمْ بِكُلِّ كُمَيْتٍ أَغَرَّ مُحَجَّلٍ أَوْ أَشْقَرَ أَغَرَّ مُحَجَّلٍ، أَوْ أَدْهَمَ أَغَرَّ مُحَجَّلٍ . رَوَاهُ أبو داود والنسائي [٦]:

ئەبو وەهب (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ولاخی بەرزەی کوێتی مارۆی چوار پەل سپی رابگرن، یاخود شێی مارۆی چوار پەل سپی، یاخود رەشتاڵەی مارۆی چوار پەل سپی (د/ن).

٤٣٩٨- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: خَيْرُ الْخَيْلِ الأَدْهَمُ الأَقْرَحُ الأَرْثَمُ، ثُمَّ الأَقْرَحُ الْمُحَجَّلُ طَلْقُ الْيَمِينِ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ أَدْهَمَ فَكُمَيْتٌ عَلَى هَذِهِ الشِّيَةِ . رَوَاهُ الترمذي [٧]:

ئەبو قەتادە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: باشترین ولاخی بەرزە ئەو ولاخەیە کە خۆی رەشتاڵە بی و ناوچەوانی قەش بێ و سەر لووتی سپیواش بێ، دوا ئەو ئەوەیە کە خۆی رەشتاڵە بێ و ناوچەوانی قەش بێ و هەرچوار پەلی سپی بێ، دەستی

---

[٥] بسند حسن (شرحه).

[٦] سكت عن درجته الشارح.

[٧] بسند صحيح (شرحه).

راستی نەبێ، جا ئەگەر رەشتاڵە نەبوو با کوێت بێ و لەسەر هەمان نیشانەی باسکراو بێ (ت- س/ص).

٤٣٩٩- وَللنسائي: مَا مِنْ فَرَسٍ عَرَبِيٍّ إِلاَّ يُؤْذَنُ لَهُ عِنْدَ كُلِّ سَحَرٍ بِدَعْوَتَيْنِ: اللَّهُمَّ خَوَّلْتَنِي مَنْ خَوَّلْتَنِي مِنْ بَنِي آدَمَ وَجَعَلْتَنِي لَهُ، فَاجْعَلْنِي أَحَبَّ أَهْلِهِ وَمَالِهِ إِلَيْهِ، أَوْ مِنْ أَحَبِّ مَالِهِ وَأَهْلِهِ إِلَيْهِ . نسأل الله التوفيق لما يحب ويرضي[٨]:

دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): گشت بەرە بەیانێ هەموو ماین و ئەسپێکی عەرەبی رێگای ئەم دوو نزایەی پی دەدرێ: یەکەم دەڵێ:

اللَّهُمَّ خَوَّلْتَنِي مَنْ خَوَّلْتَنِي مِنْ بَنِي آدَمَ وَجَعَلْتَنِي لَهُ فَاجْعَلْنِي أَحَبَّ أَهْلِهِ وَمَالِهِ إِلَيْهِ أَوْ مِنْ أَحَبِّ مَالِهِ وَأَهْلِهِ إِلَيْهِ:

ئەی خودایە! تۆ منت داوە بەو کەسەی کە خۆت ویستووتە منی پێ بدەیت و منت کردووە بە ماڵی ئەو، دووەم دەڵێ: کەواتە بمکە بە خۆشەویستترین کەس و خۆشەویستترین ماڵی لە کنی! (ن).

## ٢٧) نابێ ماین لەکەر چاك بكرێ: (لا تحمل الحمر على الخيل)

٤٤٠٠- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: أُهْدِيَتْ للنبيّ (صَلّى الله عَلَيْهِ وَسَلّم) بَغْلَةٌ فَرَكِبَهَا. فَقَالَ عَلِيٌّ: لَوْ حَمَلْنَا الْحَمِيرَ عَلَى الْخَيْلِ فَكَانَتْ لَنَا مِثْلُ هَذِهِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلّى الله عَلَيْهِ وَسَلّم) إِنَّمَا يَفْعَلُ ذَلِكَ الَّذِينَ لاَ يَعْلَمُونَ. رَوَاهُ أصحاب السنن [١]:

عەلی (رەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: جارێ قاترێکیان بە دیاری هێنا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێغەمبەر خۆی سواری بوو، منیش عەرزیم کرد: ئێمەیش ئەگەر کەر بنێین لە ماین شتی ئاوامان دەست دەکەوێ. فەرمووی: ئەوە کاری پیاوی تێنەگەیشتووە! (د/ت/ن).

---

[٨] سكت عن درجته الشارح.

[١] رواه الترمذي بلفظ آخر بسند صحيح (شرحه).

## ٢٨) بە شەڕدانی ئاژەڵ (وەك شەڕە كەڵەشێرو شەڕە كەوو شەڕە بەران و شتی وا) ناڕەوایە، هەروەها حەرامە لە دەموو چاوی چوار پێ بدرێ، یاخود لەعنەت و نەفرینی لێ بكرێ:

## التحريش بين البهائم وضربها في وجهها ولعنها حرام

٤٤٠١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله تَعَالَى عنهما) قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عَنِ التَّحْرِيشِ بَيْنَ الْبَهَائِمِ. رَوَاهُ أبو داود والترمذي[1]:

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەشەڕدانی گیانلەبەرانی قەدەغە كردووەو شەڕە كەڵەشێرو شەڕە سەگ و شەڕە بەران و ئەم شتانەی حەرام كردووە! (د- سند صالح- ت).

٤٤٠٢- ← (ب- ٤ز- ٤٨ل- ١٥٣ف- ٢)[2].

٤٤٠٣- وَ كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فِي سَفَرٍ فَسَمِعَ لَعْنَةً فَقَالَ: مَا هَذِهِ؟ قَالُوا: هَذِهِ فُلاَنَةُ لَعَنَتْ رَاحِلَتَهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): ضَعُوا عَنْهَا، فَإِنَّهَا مَلْعُونَةٌ، فَوَضَعُوا عَنْهَا. قَالَ عِمْرَانُ بن حُصين (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): فَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهَا نَاقَةً وَرْقَاءَ. رَوَاهُ أبو داود ومسلم. ولفظه: فَكَأَنِّي أَرَاهَا تَمْشِي فِي النَّاسِ مَا يَعْرِضُ لَهَا أَحَدٌ[3]:

لە سەفەرێكا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نەفرین (لەعنەت)ێكی بەر گوێ كەوت، فەرمووی: ئەوە چی بوو؟ عەرزیان كرد: ئەو ژنە بوو نەفرینی لە وڵاخەكەی كرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: كۆپانەكەی لێ بگرنەوە بەرەڵڵای بكەن و كەس سواری نەبێ، چونكە ئەو وشترە بەر لەعنەت كەوتووە ئیتر ئەوانیش كورتانەكەیان لێ گرتەوە. عیمرانی كوڕی حوصەین دەیگوت: ئێستاكەیش ئەو وشترەم هەر لەبەر چاوە، وشترە مێنگەیەكی بۆر

---

[1] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

[2] تقدم في مجلد رابع. تسلسل/ ٤٨ برقم: ٢/٢٨٩٨.

[3] (رياض الصالحين. رقم: ١٥٥٧/٧. مسلم/٢٥٩٥). مسلم. أدب: ٦٥٤٧. أبو داود. جهاد: ٢٥٦١. تحفة الأشراف: ١٠٨٨٣.

بوو (د/م) گفتەی (م): دەیگوت: دەڵێی هەر لەبەر چاومە، بەناو عەشاماتەکەدا دەسوڕایەوە کەس هەقی نەبوو بە سەریەوە.

٤٤٠٤- ← (ب- ٤ز- ٤٨ل- ١٥٢ف- ١+ف-٢)[٤].

## ٢٩) دروست نییە ژێی کەوان و زەنگ بکرێنە ملی ئاژەڵ و وڵاخ: لا يجوز الوتر والجرس

٤٤٠٥- عَنْ أبي بَشِيرٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا مع النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ فَأَرْسَلَ رَسُولاً إِلَى النَّاسِ وَهُمْ فِي مَقِيلِهِمْ لاَ تَبْقَيَنَّ فِي رَقَبَةِ بَعِيرٍ قِلاَدَةٌ مِنْ وَتَرٍ أَوْ قِلاَدَةٌ إِلاَّ قُطِعَتْ. رَوَاهُ الثلاثة[١]:

ئەبو بەشیر (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: لە سەفەرێکا لەگەڵ پێغەمبەردا بووین (دروودی خودای لەسەربێ) خەڵکەکە شوێنی شەویان گرتبوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) رابەرێکی نارد بۆ لایان کە پێیان رابگەیەنێ: کە هەر وشترێ ملیوانکەی ژێی کەوانی لە ملدایە، یاخود هەر ملیوانکەیەکی دیکەی لە مل دایە بیپچڕێننەوەو لەملی دابکەنن! (ش/د).

٤٤٠٦- ← (ب- ٤ز- ٤٦ل- ١٤٩ف- ٢+١+٣+٤)[٢].

## ٣٠) دروستە وڵاخ ناو بنرێ: (يجوز تسمية الدواب)

٤٤٠٧- عَنْ سَهْلٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فِي حَائِطِنَا فَرَسٌ يُقَالُ لَهُ اللُّحَيْفُ. رَوَاهُ البخاري[١]:

---

[٤] راجع المجلد الرابع. تسلسل/ ٤٨ رقم: ٢٨٩٧/١ ورقم: ٢٨٩٨/٢. بخاري. جهاد: ٣٠٠٥.

[١] تجريد البخاري = مختصر صحيح البخاري: ١٢٣٠ = ٣٠٠٥ فتح الباري. مسلم. لباس: ٥٥١٥. ترمذي. جهاد: ١٧٠٣.

[٢] سبق في مجلد رابع. تسلسل/ ٤٦ رقم: ٢٨٨٨/٢ و ٢٨٨٧/١ و ٢٨٨٩/٣ و ٢٨٥٣/٤.

[١] تجريد/ ٣/ ٣٠٦ رقم: ١١٧٨ = ٢٨٥٥ فتح الباري شرح صحيح الباري.

سەهل (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئەسپێکی هەبوو، ناوی لوحەیف بوو، لەناو حەساری باخەکەی ئێمەدا بوو (ب).

٤٤٠٨- وَقَالَ مُعَاذٍ (رضى الله عنه): كُنْتُ رِدْفَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عَلَى حِمَارٍ يُقَالُ لَهُ عُفَيْرٌ. رَوَاهُ البخاري وأبو داود[٢]:

موعاذ (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: لە پاشکۆی پێغەمبەرەوە سواری گوێدرێژێ بووم ناوی عوفەیر بوو! (ب/د).

٤٤٠٩- ← (ب- ٤ز- ٩٠ل- ٢٧٠ف- ٧)[٣].

لێرەدا ئەم پترییەی هەیە: ئەسپەکە ناوی مەندووب بوو، کە حەزرەت گەڕایەوە فەرمووی: مەشڵەژێن، هیچ نییە، بەڕاستی ئەم ئەسپەیش کە ئێوە دەڵێن: تەڕاڵە زۆر خێراو بە گوڕو خۆشڕۆ بوو! (ب/ت).

٤٤١٠- وَقَدْ كَانَتْ للنبي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) نَاقَةٌ يُقَالُ لَهَا الْعَضْبَاءُ. رَوَاهُ البخاري والنسائي[٤]:

گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وشترە مێنگەیەکی هەبوو ناوی عەضباء بوو (ب/ن).

٤٤١١- وَلأبي داود: كَانَ النَّبِي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) تُسَمَّى الأُنْثَى مِنَ الْخَيْلِ فَرَسًا[٥]:

گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەمای وڵاخی بەرزەی دەفەرموو: ماین(د).

## ٣١) ئاگاداری‌و چاوێری وڵاخ پێویستە : (تجب مراعاة الدواب)

قَالَ اللهُ تعالى: {وَالْخَيْلَ وَالْبِغَالَ وَالْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَا وَزِينَةً وَيَخْلُقُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ} (١٦/٨):

---

[٢] بخاري. جهاد: ٢٨٥٦.

[٣] تقدم في مجلد رابع. تسلسل/ ٩٠ برقم: ٣١٢٢/٧. بخاري: ٢٨٥٧.

[٤] بخاري. جهاد: ٢٨٧٢. تجريد / ٣/ ٣١٢ رقم: ١١٨٤ = ٢٨٧٢، ٢٨٧١ ، ٦٥٠١ فتح الباري.

[٥] سكت عن درجته الشارح.

واتە: وە خودای گەورە دروستی کردووە بۆ ئێوە چارەواو هێسترو کەر، بۆئەوەی کە هەم سوارییان پێ بکەن و هەم بیانکەن بەهۆی جوانی بۆ خۆتان، وە هەروەها گەلێ شتی تریش دروست دەکا بۆ خۆشی و خۆشگوزەرانی ئێوە، کە ئێوە ئێستا نایانزانن، وەکوو فڕۆکەو کەشتی و ئوتومبێل و شتی وا.

٤٤١٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِذَا سَافَرْتُمْ فِي الْخِصْبِ فَأَعْطُوا الإِبِلَ حَظَّهَا مِنَ الأَرْضِ وَإِذَا سَافَرْتُمْ فِي السَّنَةِ فَأَسْرِعُوا عَلَيْهَا السَّيْرَ، وَإِذَا عَرَّسْتُمْ بِاللَّيْلِ فَاجْتَنِبُوا الطَّرِيقَ فَإِنَّهَا مَأْوَى الْهَوَامِّ بِاللَّيْلِ . رَوَاهُ مسلم وأبو داود والترمذي[1]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (درووودی خودای لەسەربێ): ئەگەر لەکاتی لەوەڕدا سەفەرتان کرد، ماوەی وشتر بدەن کە بەشی خۆی لەو لەوەڕە بلەوەڕی، خۆ ئەگەر وشکە ساڵیش بوون لەوەڕ نەبوو، خێرا لێخوڕن (هەتا زوو بگەنەماڵەوەو ولاخەکان لەڕێ ئەوەندەی تر لەڕو لاواز نەبن). ئەگەر دنیا بوو بە شەویش لاتان دا بۆ وچان، یا بۆ سەر خەو شکاندن، لە ڕێگەکە تۆزێ دوور بکەونەوەو لەسەر چەقی ڕێگەکە وچان مەگرن، چونکە بە شەو ڕێگە دەبێ بە جێگەو ڕێگەی جڕو جانەوەرو مارو مێروو (م/د/ت).

٤٤١٣- وَمَرَّ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) على بَعِيرٍ قَدْ لَحِقَ ظَهْرُهُ بِبَطْنِهِ. قَالَ: اتَّقُوا اللَّهَ فِي هَذِهِ الْبَهَائِمِ الْمُعْجَمَةِ فَارْكَبُوهَاصَالِحَةً وَكُلُوهَا صَالِحَةً [2]:

پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەربێ) وشترێکی لەڕێ دی، لەبەر لاوازی سکی نووسابوو بە پشتییەوە، فەرمووی: لەبارەی ئەم ئاژەڵە بێ زمانانەوە لە خودا بترسن و زۆرو ناهەقییان لێ مەکەن و برسی و تووننییان مەکەن، بەم ڕەنگە کاتێ

---

[1] مسلم. جهاد: ٤٩٣٦. ترمذي. استئذان: ٢٨٥٨.

[2] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

گۆشتییان بخۆن کە گۆشتەکەیان بە کەڵکی خواردن بێ، وەکاتێ سوارییان پێ بکەن کە بە کەڵکی سواریی بێن (د- سند صالح).

٤٤١٤- وَدَخَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) حَائِطًا لِرَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ، فَإِذَا جَمَلٌ فَلَمَّا رَأَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) حَنَّ وَذَرَفَتْ عَيْنَاهُ، فَأَتَاهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَمَسَحَ ذِفْرَاهُ فَسَكَتَ، فَقَالَ: مَنْ رَبُّ هَذَا الْجَمَلِ، لِمَنْ هَذَا الْجَمَلُ؟ فَجَاءَ فَتًى مِنَ الأَنْصَارِ فَقَالَ: لِي يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: أَفَلاَ تَتَّقِي اللَّهَ فِي هَذِهِ الْبَهِيمَةِ الَّتِي مَلَّكَكَ اللَّهُ إِيَّاهَا فَإِنَّهُ شَكَا إِلَيَّ أَنَّكَ تُجِيعُهُ وَتُدْئِبُهُ. رَوَاهُما أبو داود[٣]:

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) جارێ رۆیشتە ناو حەساری باخە خورمای پیاوێکی ئەنصاری، وشترێکی لێ بوو، وشترەکە کە حەزرەتی دی غوربەتی هەڵساو کورکاندی و فرمێسك بە هەردوو چاوەکانیدا هاتە خوارەوە! جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) چوو بۆلای و دەستی هێنا بە بناگوێیدا، ئیتر وشترەکە کولی نیشتەوە، ئەوجا حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خاوەنی ئەم وشترە کێیە؟ ئەم وشترە هی کێیە؟ لەولاوە جەهێڵێ لە یاریدەدەران هات، گوتی: قوربان! هی منە، فەرمووی: ئەوە بۆچی لە خودا ناترسیت و ناهەقی لەم ئاژەڵە بەسەرزمانە دەکەی، کە خودا تۆی کردووە بە خاوەنی، ئەوەتانێ لەلای من سکاڵات لێ دەکاو دادو بێ دادو هاواریەتی لە دەستت و دەڵێ: کە تۆ هەم برسی دەکەیت و هەم وچانی نادەیت! (د- سند صالح).

٤٤١٥- ← (ب- ٢ز- ١٧٧ل- ٣٦٨ف- ٣)[٤].

لێرەدا ئاوایە: رۆژێ زۆر گەرم دەبێ، ژنێکی سەلیتە (واتە: داوێنپیس) سەگێ دەبینێ بە دەوری بیرێکدا دەخولێتەوەو لە تونیاندا هەناسکە هەناسکیەتی و زمانی دەرکێشاوە، ژنەکەش بەزەیی پیادا دێتەوەو پڕ بە کاڵەکەی پێی خۆی ئاوی لە بیرەکە بۆ هەڵ دەکێشێ و دەیداتێ، خودا بەوە لێی خۆش دەبێ! (م).

---

[٣] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

[٤] بخاري. أحاديث الأنبياء: ٣٤٦٧. مسلم. حيوارن: ٥٨٢٢ تقدم في مجلد / ٢ تسلسل/ ١٧٧ برقم: ٣/ ١٩٣٠.

## ٣٢) دەستوورەکانی سواریی: (آداب الركوب)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {لِتَسْتَوُوا عَلَى ظُهُورِهِ ثُمَّ تَذْكُرُوا نِعْمَةَ رَبِّكُمْ إِذَا اسْتَوَيْتُمْ عَلَيْهِ وَتَقُولُوا سُبْحَانَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ، وَإِنَّا إِلَى رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ} (١٣/٤٣):

واتە: ئەمەیشم بۆیە کردووە هەتا ئێوە سواری سەرپشتیان ببن و بیری نازو نیعمەت و بەخششی خودا بکەنەوە، کاتێ کە لە سەر پشتیان جێگیر بوون و بە تەواوی دامەزران یەکەم زیکری خودا کە دەیکەن بڵێن: {سُبْحَانَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ وَإِنَّا إِلَى رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ}.

٤٤١٦- عَنْ بُرَيْدَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: بَيْنَمَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَمْشِي جَاءَ رَجُلٌ وَمَعَهُ حِمَارٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ارْكَبْ وَتَأَخَّرَ الرَّجُلُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): لاَ. أَنْتَ أَحَقُّ بِصَدْرِ دَابَّتِكَ مِنِّي إِلاَّ أَنْ تَجْعَلَهُ لِي قَالَ: فَإِنِّي قَدْ جَعَلْتُهُ لَكَ فَرَكِبَ. رَوَاهُ أبو داود والترمذي[١]:

بورەیدە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بەپێ دەڕۆیشت پیاوێکیش هات گوێ درێژێکی پێ بوو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! فەموو سواربە لە گەڵما، ئینجا پیاوەکە خۆی چووە دواوە، هەتا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لە بەردەمەوە سوار بێ، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: نابێ، تۆ خۆت لەبەرتریت بە بەردەمی پشتی وڵاخەکەت هەتا من، مەگەر خۆت بیبەخشی بە من. ئەویش گوتی: ئەوا بەخشیم بە تۆ، ئەوجا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لە پێشەوە سوار بوو، پیاوەکەیش لە پاشکۆیەوە (د/ت- س/ح).

٤٤١٧- ← (ب- ٤ز- ٣ل- ١٤ف- ٨)[٢].

---

[١] بسند حسن (شرحه).

[٢] تقدم في مجلد/ ٤ تسلسل/ ٣ رقم: ٨/ ٢٥٧١.

٤٤١٨- عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ جَعْفَرٍ (رضي الله تَعَالَى عنهما) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إِذَا اسْتُقْبِلَ مِنْ سَفَرٍ اسْتُقْبِلَ بِنَا، فَأَيُّنَا اسْتُقْبِلَ أَوَّلاً جَعَلَهُ أَمَامَهُ، فَاسْتُقْبِلَ بِي فَحَمَلَنِي أَمَامَهُ، ثُمَّ اسْتُقْبِلَ بِحَسَنٍ أَوْ حُسَيْنٍ فَجَعَلَهُ خَلْفَهُ، فَدَخَلْنَا الْمَدِينَةَ وَإِنَّا لَكَذَلِكَ. رَوَاهُ أبو داود ومسلم[٣]:

عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە لە سەفەر دەگەڕایەوە، کە دەچوون بۆ پێشوازیی، لە پێشا ئێمە (کە منداڵانی کەس و کارەکەی بووین) دەیانبردین بە پیرییەوە، جا هەر کامێکمان لە پێش پێشەوە ببرایانایە بە پیریەوە ئەوەمانی دەخستە بەردەمی خۆی، جارێ من یەکەم کەس بووم کە بردمیان بە پیریەوە، منی نایە بەردەمی خۆی لەپاش من حەسەن یا حوسەینیشیان هێنا بە پیریەوە ئەویشی خستە پاشکۆی خۆی، ئیتر لەسەر ئەم شێوەیە یەکێکمان لە بەردەمیاو یەکێکمان لە پاشکۆی دا چووینە ناو شاری مەدینە (د/م) ← (ب-٥ز- ٢٢ل- ١٢٢ف- ١). برقم/١/٣٣٤٩.

٤٤١٩- عَنْ أنسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: رَكِبَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) حِمَارًا عَلَى إِكَافٍ عَلَيْهِ قَطِيفَةٌ فَدَكِيَّةٌ وَأَرْدَفَ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ وَرَاءَهُ[٤]:

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەسەر کورتانێکەوە سواری گوێدرێژێ بوو، سەر جلەکەی قەیفەی فەدەکی بوو ئوسامەشی خستە پاشکۆی خۆی! (ب).

٤٤٢٠- وَعَنْهُ قَالَ: أَقْبَلْنَا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مِنْ خَيْبَرَ، وَإِنِّي لَرَدِيفُ أَبِي طَلْحَةَ وَبَعْضُ نِسَاءِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) رَدِيفُ لَهُ فَعَثَرَتِ النَّاقَةُ فَقُلْتُ: الْمَرْأَةَ، فَقَالَ

---

[٣] مسلم. فضائل: ٦٢١٨ ، ٦٢١٩. أبو داود. جهاد: ٢٥٦٦. إبن ماجة: أدب: ٣٧٧٣.

[٤] تجريد/ ٣/ ٣٤٧ رقم: ١٢٢٢ = ٢٩٨٧ ، ٤٥٦٦ ، ٥٦٦٣ ،٥٩٦٤، ٦٢٠٧. اخرجه مسلم في الجهاد. باب في دعاء النبي (صلى عليه وسلم) وَصبره على اذى. رقم/ ١٧٩٨ (هامش التجريد/ ٣ل- ٣٤٧).

(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): إِنَّهَا أُمُّكُمْ فَنَزَلْتُ فَشَدَدْتُ الرَّحْلَ وَرَكِبَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَلَمَّا رَأَى الْمَدِينَةَ قَالَ: آيِبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ لِرَبِّنَا حَامِدُونَ. رَوَاهُما البخاري:

دیسان ئەو (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: لە خزمەتی حەزرەتدا (درودی خودای لەسەربێ) لە خەیبەر دەگەڕاینەوە، من بە پاشکۆی ئەبو طەلحەوە بووم، یەکێ لە ژنەکانی پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) لە پاشکۆی خۆی دا بوو، وشترەکەیان سەر سمێکی داو گلا، پێغەمبەرو ژنەکەی بەربوونەوە. منیش گوتم: فریای ئافرەتەکە کەون. پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوە دایکتانە قەدری بگرن منیش دابەزیم و کۆپانەکەم توند کردەوە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) سوار بۆوە، جا کاتێ مەدینەی لێوە دەرکەوت فەرمووی: (آيِبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ سَاجِدُونَ لِرَبِّنَا حَامِدُونَ) ئەوا گەڕاینەوە بۆلای خودای خۆمان، پەشیمانین لە هەموو کارێکی خراپی خۆمان، خودای خۆمان دەپەرستین و بە کوڵی دڵ سوپاس و ستایشی دەکەین! (ب).

٤٤٢١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِيَّاىَ أَنْ تَتَّخِذُوا ظُهُورَ دَوَابِّكُمْ مَنَابِرَ، فَإِنَّ اللَّهَ إِنَّمَا سَخَّرَهَا لَكُمْ لِتُبَلِّغَكُمْ إِلَى بَلَدٍ لَمْ تَكُونُوا بَالِغِيهِ إِلاَّ بِشِقِّ الأَنْفُسِ وَجَعَلَ لَكُمُ الأَرْضَ فَعَلَيْهَا فَاقْضُوا حَاجَاتِكُمْ [٦]:

ئەبو هورەیرە لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: نەکەن سەرپشتی وڵاخەکانتان بکەن بە دوانگەو مینبەر، چونکە خودا کە ئەم وڵاخانەی بۆ ئێوە رامهێناوە تەنیا بۆ بار سووکی و ئاسانی هاتووچۆی ئێوەیە، کە لە شوێنێکەوە دەچن بۆ شوێنێ، تا تووشی سەختەتی و چەرمەسەری نەبن، لە هەمان کاتدا ئەوەتا خودا ئەم زەوییەیشی بۆتان دروست کردووە، چی پێویستی ترتان هەیە (وەك خوتبەی درێژو شەو نوێژو شتی تر) ئەوا لەسەر پشتی زەوی جێبەجێی بکەن نەوەك لەسەر پشتی وڵاخەکانتان (د- س/ص).

---

[٦] رواه ابو داود بسند صالح (شرحه).

٤٤٢٢- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: تَكُونُ إِبِلٌ لِلشَّيَاطِينِ وَبُيُوتٌ لِلشَّيَاطِينِ: فَأَمَّا إِبِلُ الشَّيَاطِينِ فَقَدْ رَأَيْتُهَا يَخْرُجُ أَحَدُكُمْ بِجَنِيبَاتٍ مَعَهُ قَدْ أَسْمَنَهَا فَلاَ يَعْلُو بَعِيرًا مِنْهَا وَيَمُرُّ بِأَخِيهِ قَدِ انْقَطَعَ بِهِ فَلاَ يَحْمِلُهُ، وَأَمَّا بُيُوتُ الشَّيَاطِينِ فَلَمْ أَرَهَا. كَانَ سَعِيدٌ يَقُولُ: لاَ أُرَاهَا إِلاَّ هَذِهِ الأَقْفَاصَ الَّتِي يَسْتُرُ النَّاسُ بِالدِّيبَاجِ. رَوَاهُما أبو داود[٧]:

دیسان ئەو لە حەزرەتەوە فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): وشتری وا هەیە هی شەیتانە، وە شوێنی وایش هەیە هینی شەیتانە! هەر چێكوو وشتری شەیتانە من خۆم دیومە: ئەو وڵاخانەیە كە هەندێكتان قەڵەویان دەكەن و لە تەك خۆیانا بۆ فیزو دەعیە بە كێشیان دەكەن، نە خۆیان سواریان دەبن و نە برادەرێكی پەككەوتەشیان سوار دەكەن، بەڵان شوێن و لانەی شەیتانم نەدیوە، چونكە لە سەردەمی مندا پەیدا نەبوون سەعیدی كوڕی ئەبو هیند دەیگوت: وا دەزانم كە شوێن و لانەی شەیتانیش ئەم كەژاوانەیە كە پەردەی ئاوریشم و دیباجیان بۆ دەكەن! (د- سند صالح) لە باوەڕی بەندەیشدا لەم چەرخەی ئێمەشدا:

لۆچی سینەما، مەیخانەی یانە
سەماگاو شانۆی وێنەی ئەمانە
لانەو لۆقنتەو خانەی شەیتانە
لە هەر شوێنێ بوون ئاگر بارانە

## ٣٣) پێشبڕكێ بە وڵاخ لەسەر ماڵ: (المسابقة على الدواب)

٤٤٢٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) قَالَ: سَابَقَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بَيْنَ الْخَيْلِ الَّتِي قَدْ أُضْمِرَتْ فَأَرْسَلَهَا مِنَ الْحَفْيَاءِ، وَكَانَ أَمَدُهَا ثَنِيَّةَ الْوَدَاعِ، فَقُلْتُ لِمُوسَى: فَكَمْ كَانَ بَيْنَ ذَلِكَ؟ قَالَ: سِتَّةُ أَمْيَالٍ أَوْ سَبْعَةٌ وَسَابَقَ بَيْنَ الْخَيْلِ الَّتِي لَمْ تُضَمَّرْ، فَأَرْسَلَهَا

---

[٧] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

مِنْ ثَنِيَّةِ الْوَدَاعِ وَكَانَ أَمَدُهَا مَسْجِدَ بَنِي زُرَيْقٍ، قُلْتُ: فَكَمْ بَيْنَ ذَلِكَ؟ قَالَ: مِيلٌ أَوْ نَحْوُهُ، وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ مِمَّنْ سَابَقَ فِيهَا. رَوَاهُ الخمسة[1]:

**ئیبنو عومەر** (خودایان لێ رازی بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **پێشبڕکەیەکی سازدا بە وڵاخی بەرزە، ئەو ماین و ئەسپانەی کە قاڵ بوون و پەروەردەکرا بوون، بۆ قوشمە پێکردن، لە حەفیائەوە بەری دان، ئەو سەریان ثەنییەتول وەداع بوو، فەرموو دەگێڕەوە (راوی) دەڵێ: گوتم بە مووسا: مەودای چەند دەبوو؟ گوتی: شەش حەوت میل دەبوو، وە ئەو ماین و ئەسپانەی کە تەڕاڵ بوون و قاڵ نەکرابوون بۆ قۆشمە لە ثەنییەتول وەداعەوە بەری دەدان، ئەو سەریان مزگەوتەکەی بەنی زورەیق بوو، گوتم: ئەو ماوەیە چەند دەبێ؟ گوتی: میلێ (یا شتێکی وا) دەبێ، ئیبنو عومەر خۆی یەکێك بووە کە لەم قۆچ و قۆشمەو تەڕات و تەڕاتێنەدا بەشداری کردووە (ش/د/ت/ن).**

**٤٤٢٤-** عَنْ أَنَسٍ (رضى الله عنه) قَالَ: كَانَ لِلنَّبِيِّ (صلى الله تَعَالَى عليه وسلم) نَاقَةٌ تُسَمَّى الْعَضْبَاءَ لاَ تُسْبَقُ، فَجَاءَ أَعْرَابِيٌّ عَلَى قَعُودٍ فَسَبَقَهَا فَشَقَّ ذَلِكَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ حَتَّى عَرَفَهُ فَقَالَ: حَقٌّ عَلَى اللَّهِ أَلاَّ يَرْتَفِعَ شَيْءٌ مِنَ الدُّنْيَا إِلاَّ وَضَعَهُ. رَوَاهُ البخاري والنسائي[2]:

**ئەنەس** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **وشترە مێنگەیەکی هەبوو، ناوی عەضباء بوو، بەرایی بەهیچ نەدەداو وڵاخ نەبوو کە پێشی بکەوێ، رۆژێ عەرەبێکی دەشتەکی بە سواری وشترێکی تۆڕی بەربار لەولاوە هات وە پێشی عەضباء کەوت، موسوڵمانانیش ئەمەیان لەبەر گران بوو،**

---

[1] تجرید/ ١/ ٢٦٩ رقم: ٢٦٠ = ٤٢٠ ، ٢٨٦٨ ، ٢٨٦٩ ، ٢٨٧٠ ، ٧٣٣٦. نسائي. خیل: ٣٥٨٦. مسلم. مغازی: ٤٨٢٠ — ٤٨٢١.

[2] بخاري. جهاد: ٢٨٧٢. راجع الحدیث الرابع من تسلسل/ ٢٨ من هذا المجلد = التحریش بین البهائم...إلخ.

كاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هەستی بەوە كرد فەرمووی: ڕەوایەو بەڵێنە لەسەر خودا كە هەر شتێ لەم دنیا بێ بەقایە لووتی بەرزەوە بوو، سەری بەرزەوە كرد، خودا بدا لە لووتی و لە ئەنجامدا سەری نەوی بكاتەوە! (ب/ن).

٤٤٢٥- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَتْ كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فِي سَفَرٍ فَسَابَقْتُهُ فَسَبَقْتُهُ عَلَى رِجْلَيَّ، فَلَمَّا حَمَلْتُ اللَّحْمَ سَابَقْتُهُ فَسَبَقَنِي فَقَالَ: هَذِهِ بِتِلْكَ السَّبْقَةِ. رَوَاهُ أبو داود[٣]:

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: لە سەفەرێكا لە خزمەتی حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەربێ) بووم، بە پێ نەك بە سواریی پێشبڕكێم لەگەڵیدا كرد پێشی كەوتم! بەڵام كە گۆشتن بووم لەوە دوا پێشبڕكێم لەگەڵیدا كردەوە ئەو لە منی بردەوە، فەرمووی: ئەمە لە باتی بردنەوەكەی ئەوجارە! (د-س/صالح).

٤٤٢٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لاَ سَبَقَ إِلاَّ فِي خُفٍّ أَوْ حَافِرٍ أَوْ نعلٍ[٤]:

ئەبو هورەیرە لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خودای مەزنی لەسەر بێ): دروست نییە پێشبڕكێ لەسەر ماڵ بكرێ، مەگەر بە وشترو وڵاخ و بەرمو پەیكان و شتی وا بكرێ! (د/ت/ن- س/ح).

٤٤٢٧- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: لاَ جَلَبَ وَلاَ جَنَبَ فِي الرِّهَانِ . رَوَاهُمَا أصحاب السنن. نسأل الله الهدى لأقوم طريق[٥]:

عیمرانی كوڕی حوصەین (خودای لێ ڕازی بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: لە گرەوی قوشمەدانەلێخوڕ دروستەو نە یەدەك، واتە:

---

[٣] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

[٤] رواه أصحاب السنن بسند حسن (شرحه).

[٥] رواه أصحاب السنن بسند صحيح (شرحه).

دروست نییە کە کەسێکی تر لە دواوە ولاخەکەی بۆ لێ خوڕێ، یا مێینەک و یەدەك لەگەڵ خۆی بەرێ لە کوێ ولاخەکەی ژێری سستەوە بوو سواری یەدەکەکە بێ! (د/ت/ن- س/ص).

## ٣٤) تیر ئەندازی: (الرمی بالسهام)

٤٤٢٨- عَنْ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ يَقُولُ: (وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ) أَلاَ إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ أَلاَ إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ أَلاَ إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ . رَوَاهُ مسلم وأبو داود[1]:

عوقبەی کوڕی عامیر (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: گوێم لێ بوو حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) لەسەر دوانگە دەیفەرموو: مەبەست لە (قوة) بۆ ئەمڕۆ لەم ئایەتەدا کە دەفەرموێ: {وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ} مەبەست لەم (قُوَّةٍ)یە تیر ئەندازی و تیر هاویشتنە، وەسێ جار ئەم وشەیەی دووبارە کردەوە (م/د).

٤٤٢٩- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: سَتُفْتَحُ عَلَيْكُمْ أَرَضُونَ وَيَكْفِيكُمُ اللَّهُ فَلاَ يَعْجِزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَلْهُوَ بِأَسْهُمِهِ [2]:

دیسان فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: خودا ولاتێکی زۆر لەسەر دەستی ئێوەدا فەتح دەکا، وەلێ ئێوە پشتتان سارد نەبێتەوە و بەهەر حاڵ خاوەمەبنەوە و واز لە تیربازی و مەشق کردن بەڕم و تیر مەهێنن! (م) تەماشای (سوورەتی ئەنفال) فەرموودەی (١٣) بکە←.

٤٤٣٠- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ عَلِمَ الرَّمْيَ ثُمَّ تَرَكَهُ فَلَيْسَ مِنَّا أَوْ قَدْ عَصَى . رَوَاهُما مسلم[3]:

---

[1] مسلم. جهاد: ٤٩٢٣. أبو داود. جهاد: ٢٥١٤.

[2] مسلم. جهاد: ٤٩٢٤.

[3] مسلم. جهاد: ٤٩٢٦.

دیسان لەوەوە لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەوەی فێری رمبازی‌و تیرئەندازی ببێ، بەڵام لە پاشان وازی لێ بێنی ئەوە لە ئێمە نییە یا فەرمووی: ئەوە یاخی بووە! (م- خودای لێ رازی بێ).

٤٤٣١- عَنْ سَلَمَةَ بْنَ الأَكْوَعِ (رضي الله عنه) قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى نَفَرٍ مِنْ أَسْلَمَ يَنْتَضِلُونَ فَقَالَ: ارْمُوا بَنِي إِسْمَاعِيلَ فَإِنَّ أَبَاكُمْ كَانَ رَامِيًا ارْمُوا وَأَنَا مَعَ بَنِي فُلاَنٍ فَأَمْسَكَ أَحَدُ الْفَرِيقَيْنِ بِأَيْدِيهِمْ، فَقَالَ: مَا لَكُمْ لاَ تَرْمُونَ؟ قَالُوا: كَيْفَ نَرْمِي وَأَنْتَ مَعَهُمْ، قَالَ: ارْمُوا فَأَنَا مَعَكُمْ كُلِّكُمْ [٤]:

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لە کن دەستەیەکی ئەسلەمییەوە رابورد، نیشانیان نابۆوە، فەرمووی: ئەی نەوەی ئیسماعیل پێغەمبەر! تیر بهاوێژن‌و مەشق بە تیرو رم‌و چەك بکەن، چونکە لەکاتی خۆیدا بابە گەورەیشتان تیر ئەنداز بوو! دەی بهاوێژن‌و رەفتاری باو باپیرتان پشت گوێ مەخەن، دەی تێگرن، من لەسەر ئەم تیپەم! ئیتر تیپەکەی تر دەستیان کێشایەوە،، حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوە چیتانە بۆ تێناگرن؟ گوتیان: چۆن تێ بگرین کە تۆ لەسەر ئەوان بیت! فەرمووی: تێگرن من لەسەر هەمووتانم! (ب- رەحمەت لە خۆی، لە کەسوکاری).

٤٤٣٢- وَفِي يَوْمَ بَدْرٍ حِينَ أَصَطَفُّوا لِقِتَالْ قُرَيْشٍ قَالَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): إِذَا أَكْثَبُوكُمْ فَعَلَيْكُمْ بِالرمي . رَوَاهُما البخاري[٥]:

لە رۆژی غەزای بەدردا کاتێ ریزیان بەست بۆ جەنگ کردن لەگەڵ بێ بڕواکانی قورەیشدا، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کاتێ نزیکەوە بوون لێتان‌و نیشانیان دا ئەو حەلە تیربارانیان کەن! (ب- رەحمەت لە گۆڕی نازداری).

---

[٤] بخاري. جهاد: ٢٨٩٩ ، ٣٣٧٣ ، ٣٥٠٧.

[٥] بخاري. جهاد: ٢٩٠٠ ، ٣٩٨٤ ، ٣٩٨٥.

٤٤٣٣- ولأصحاب السُّنن: إِنَّ اللَّهَ لَيُدْخِلُ بِالسَّهْمِ الْوَاحِدِ ثَلاَثَةً الْجَنَّةَ: صَانِعَهُ يَحْتَسِبُ فِي صَنْعَتِهِ الْخَيْرَ، وَالرَّامِيَ بِهِ، وَالْمُمِدَّ بِهِ. وَقَالَ: ارْمُوا وَارْكَبُوا وَلأَنْ تَرْمُوا أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ تَرْكَبُوا[٦]:

**دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): بەهۆی تاقە تیرێکەوە خودای گەورە سێ کەس دەخاتە بەهەشتەوە: یەکەم ئەوەی کە دروستی دەکا، لەبەر ڕەزای خوداو مەبەستی لە دروست کردنەکەی خێری ئیسلامە، دووەم ئەوەی دەیتەقێنێ، سێیەم ئەوەی دەیداتە دەستی. فەرموویشی: هەم مەشقی تیر بازیو هەم مەشقی سواری بکەن، بەڵام مەشقی تیر ئەندازی بکەن پێم خۆشترە لە مەشقی سواری (د/ت/ن) دیاری کردنی تیر بۆ نموونەیە، چونکە لە سەردەمی حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەربێ) باشترین چەك بووە. دەنا تەقەمەنی هەمووی وایە، چەك تا چاتر بێ خێری پترە. (وەرگێڕ)**

٤٤٣٤- وَللترمذي: مَنْ رَمَى بِسَهْمٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَهُوَ لَهُ عَدْلُ مُحَرَّرٍ . نسأل الله تمام العبودية[٧]:

**لەسەر گێڕانەوەی تیرمیذی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەوەی لەبەر ڕەزای خودای گەورە تیرێ بتەقێنێ پاداش و خێری ئازادکردنی بەندەیەکی بۆ هەیە.**

## ٣٥) داوای سەرکەوتن لە خودا بە خاتری زەبوونەکان : (الإستنصار بالضعفاء)

٤٤٣٥- ← (ب- ١ز- ١٧٨ل- ٤٨٣ف- ٢)[١].

٤٤٣٦- عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَقُولُ: ابْغُونِي الضُّعَفَاءَ فَإِنَّمَا تُرْزَقُونَ وَتُنْصَرُونَ بِضُعَفَائِكُمْ. رَوَاهُ أصحاب السنن[٢]:

---

[٦] سكت عن درجته الشارح.

[٧] سكت عن درجته الشارح.

[١] تقدم في مجلد أول. تسلسل/ ١٧٨ رقم: ٢/ ٩٥٠.

ئەبو دەرداء (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: ژنەوتم لە حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: هەژاروو لازەبوون و بێ نەواکانم بۆ بێنن هەتا بیانکەم بە دەست کەلا لەلای خودا، چونکە لە ڕاستیدا ئێوە کە خواوەند ڕۆژیتان دەدا، وە یا سەرتان دەخا بەسەر دوژمندا لەبەر خاتری ئەوانە! (د/ت/ن- س/ص).

٤٤٣٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: رُبَّ أَشْعَثَ مَدْفُوعٍ بِالأَبْوَابِ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّهِ لأَبَرَّهُ . رَوَاهُ مسلم والإمام أحمد (رضي الله تَعَالَى عنهما) وحشرنا في زمرتهم آمين[٣]:

ئەبو هورەیرە (خۆشنوودی خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: گەلێ کەسی وا هەیە بە دیمەن کوڵکن و چڵکنە، لەم دەرگاو لەو دەرگا پاڵی پێوە دەنێن و قەدری نازانن و دەری دەکەن، وەلێ لەلای خودا ئەوەندە ئازیزو نازدارە ئەگەر سوێند لە خودا بخوا لەسەر هەرشتێ کە بۆی بکا، خودا دڵی ناشکێنێ و ئیشەکەی بۆ دەکاو سوێندەکەی ناخات (م/ئە).

## ٣٦) داوای کۆمەکی لە بتپەرست ناکرێ : (لا يستعان بالمشرك)

٤٤٣٨- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: خَرَجَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قِبَلَ بَدْرٍ فَلَمَّا كَانَ بِحَرَّةِ الْوَبَرَةِ أَدْرَكَهُ رَجُلٌ يُذْكَرُ بالجُرْأَةِ وَالنَجْدَةِ فَفَرِحَ بِهِ الأَصْحَابُ فَقَالَ للنبي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): جِئْتُ لأَتَّبِعَكَ وَأُصِيبَ مَعَكَ فَقَالَ: تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: فَارْجِعْ فَلَنْ أَسْتَعِينَ بِمُشْرِكٍ، ثُمَّ مَضَى حَتَّى إِذَا كُنَّا بِالشَّجَرَةِ أَدْرَكَهُ الرَّجُلُ فَقَالَ لَهُ كَمَا قَالَ أَوَّلَ مَرَّةٍ فَرُدَّ عليه النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) كَالْمَرَّةِ الأُولى، ثُمَّ رَجَعَ فَأَدْرَكَنا بِالْبَيْدَاءِ فَقَالَ كَالأَوَّلَ فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ؟ قَالَ: نَعَمْ، فَقَالَ لَهُ: انْطَلِقْ . رَوَاهُ مسلم وأبو داود والترمذي[١]:

---

[٢] رواه أصحاب السنن بسند صحيح (شرحه).

[٣] مسلم. أدب: ٦٦٢٥.

[١] مسلم. مغازي: ٤٦٧٧. أبو داود. جهاد: ٢٧٣٢. ترمذي. سير: ١٥٥٨.

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) کاتێ دەرچوو بۆ بەدر، کە گەیشتە حەرەتول وەبەرە لەوێ پیاوێ هاتە خزمەتی، ئەو پیاوە بۆ ئازایەتی و مەردایەتی بەناو بانگ بوو، لەبەرئەوە یاران بە هاتنی گەلێ دڵشاد بوون، کابرا کە بە پێغەمبەری گوت: هاتووم لە گەڵتا دێم بۆ ئەم جەنگە، یاریدەی ئێوەش دەدەم و خۆشم لە تالان شتێکم دەست دەکەوێ! ئەویش فەرمووی: باوەڕت هەیە بە خوداو بە پێغەمبەری خودا؟ گوتی: نەء، فەرمووی: دە بگەڕێرەوە دواوە، چونکە من یارمەتی لە خودا نەناس ناخوازم! ئینجا حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) ڕۆیشت گەیشتە لای درەختەکە، لەوێ پیاوەکە هاتەوە بۆلای و پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) جاری پێشوو چی پێی فەرموو ئەم جارەیش هەر ئەوەی پێی فەرمووەوە، پیاوەکەش وەك جاری پێشوو وەڵامی دایەوە، دیسان پیاوەکە گەڕایەوە، هەتا لە بەیداء حەزرەتی گرتەوە و قسەکەی یەکەم جاری دووبارەکردەوە بۆ پێغەمبەر، ئەویش فەرمووی پێی: باوەڕ بە خوداو پێغەمبەری دەکەی؟ گوتی: بەڵێ، فەرمووی: دە وەرە لەگەڵمان! (م/د/ت).

## ٣٧) ئامێرو چەك و تفاقی جەنگ: (آلات الحرب)

٤٤٣٩- ← (ب- ٣ز- ١٠ل- ٢٤ف- ١)[1].

## ٣٨) زریە و ڕم: (الدرع والرمح)

٤٤٤٠- ← (ب- ٦ز- ٩). تەفسیری سوورەتی ئەنفال، فەرموودەی سێیەم، لێرەدا لەپاش ڕستەی: (ئیتر بەستە ئەی پێغەمبەری خودا!) ئەمەی پترە: بەڕاستی زۆر پاڕایتەوە لە خودای خۆت، گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لەوکاتەدا زریەی لەبەردا بوو. هەتا کۆتایی فەرموودەکە[1].

---

[1] تقدم في مجلد/ ٣ تسلسل/ ١٠ رقم: ١/ ١٩٩٥.

[1] تقدم في مجلد / ٦ تسلسل/ ٩ رقم: ٣٨٧٧/٣.

٤٤٤١- وَلأبي داود والترمذي: ظَاهَرَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَوْمَ أُحُدٍ بَيْنَ دِرْعَيْنِ أَوْ لَبِسَ دِرْعَيْنِ[٢]:

ئەبو داوودو تیرمیذی (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەگێڕنەوە: لە ڕۆژی ئوحوددا پێغەمبەر (درودو سڵاوو میهرەبانی خودای گەورەو مەزنی لەسەر بێ) دوو زریەی لەسەر یەك لەبەردا بوو یا گوتی: دوو زریەی لەسەر یەك لەبەر كردبوو.

٤٤٤٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ تَعَالَى عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: جُعِلَ رِزْقِي تَحْتَ ظِلِّ رُمْحِي، وَجُعِلَ الذِّلَّةُ وَالصَّغَارُ عَلَى مَنْ خَالَفَ أَمْرِي. رَوَاهُ البخاري والإمام أحمد[٣]:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: رزق و ڕۆژی من وا لە ژێر سای سێبەری رمەكەمدا، سەر شۆڕی و سووكی و ریسواییش بۆ ئەو كەسەیە كە لە فەرمانی من دەردەچێ! (بوخاری/ ئیمامی ئەحمەد).

## ٣٩) شمشێر: (السيف)

٤٤٤٣- قَالَ جَابِر (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): غَزَوْنَا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَأَدْرَكَتْنَا الْقَائِلَةُ فِي وَادٍ كَثِيرِ الْعِضَاهِ فَتَفَرَّقَ النَّاسُ فِي الشَّجَرِ يَسْتَظِلُّونَ، وَنَزَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) تَحْتَ شَجَرَةٍ فَعَلَّقَ بِهَا سَيْفَهُ ثُمَّ نَامَ، فَاسْتَيْقَظَ وَعِنْدَهُ رَجُلٌ وَهُوَ لاَ يَشْعُرُ بِهِ. فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): إِنَّ هَذَا اخْتَرَطَ سَيْفِي. فَقَالَ: مَنْ يَمْنَعُكَ؟ قُلْتُ: اللَّهُ. فَشَامَ السَّيْفَ فَهَا هُوَ ذَا جَالِسٌ ثُمَّ لَمْ يُعَاقِبْهُ. رَوَاهُ البخاري[١]:

جابیر (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: لە غەزایەكدا، لە خزمەتی پێغەمبەردا بووین (درودی خودای لەسەربێ) لە قرچەی نیوەڕۆدا لە شیوێكی زیاویدا بۆ

---

[٢] بسند حسن (شرحه).

[٣] بخاري. جهاد: رواه تعليقا في باب: ما قيل في الرماح بين الرقمين: ٢٩١٣ و ٢٩١٤.

[١] بخاري. جهاد: ٢٩١٣.

سەرخەو شکاندن لاماندا، خەڵکەکە بەناو شیوەکەدا بڵاو بوونەوەو چوونە سێبەری دارەکانەوە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) لەبن دارێکا دابەزی‌و شمشێرەکەی پیادا هەڵواسی‌و خەوت، کاتێ خەبەری دەبێتەوە دەڕوانێ وا پیاوێ لە لایەتی، کە هاتووە حەزرەت هەستی پی نەکردووە. جا فەرمووی: ئەم پیاوە شمشێرەکەی منی هەڵکێشابوو، بە رووتی گرتبووی بە دەستیەوە دەیگوت پێم: کێ رزگارت دەکات لە دەستم؟ منیش گوتم: خودا، جا شمشێرەکەی نایەوە ناو کێلانەکەی، وا ئەوەتانی بۆ خۆی دانیشتووە! ئیتر پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) تۆڵەی لە پیاوەکە نەسەندو هیچی لێی نەکرد (ب).

٤٤٤٤- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيِ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَتْ قَبِيعَةُ سَيْفِ رَسُولِ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فِضَّةً. رَوَاهُ أصحاب السنن[٢]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: مشتووی شمشێرەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) زیوی تێ گیرابوو (د/ت/ن- س/ح).

## ٤٠) خوودەی ئاسن‌و کڵاوزرێ: (البيضة والمغفر)

٤٤٤٥- ← (ب – ٤ ز – ٧٠ ل – ٢١١ ف – )[١].

٤٤٤٦- ← (ب – ٢ ز – ١٣١ ل – ٢٦٥ – ١)[٢].

## ٤١) ئاڵاو بەیداخ: (اللواء والراية)

٤٤٤٧- سُئِل الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ (رَضِيِ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ رَايَةِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: كَانَتْ سَوْدَاءَ مُرَبَّعَةً مِنْ نَمِرَةٍ[١]:

---

[٢] بسند حسن (شرحه).

[١] تقدم في مجلد رابع. تسلسل/ ٧٠ رقم: ١/ ٣٠١٣.

[٢] تقدم في مجلد ثاني. تسلسل/ ١٣١ رقم: ١/ ١٧٠٧.

لەبارەی ئاڵاکەی پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) لە بەڕای کوڕی عازیب پرسیار کرا، گوتی: پارچە شاڵێکی رەشبازووی چوار گۆشە بوو. (د/ت- س/ح).

٤٤٤٨- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: دَخَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مَكَّةَ وَلِوَاؤُهُ أَبْيَضُ. رَوَاهُما أبو داود والترمذي[٢]:

جابیر (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە هاتە ناو شاری مەککەوەو مەککەی ئازاد کرد ئاڵاکەی سپی بوو (د/ت- س/غ).

٤٤٤٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله تَعَالَى عنهما) قَالَ: كَانَتْ رَايَةُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) سَوْدَاءَ وَلِوَاؤُهُ أَبْيَضَ. رَوَاهُ الترمذي والنسائي[٣]:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ئاڵاکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) رەش بوو، بەڵام بەیداخەکەی سپی بوو. (ت/ن- س/ح).

## ٤٢) باسی پێنجەم: باسی مەبەستی سەرەکی لە تێکۆشان و خەبات، سەر رشتەی کاری خەباتگێڕان، بانگ کردنی پادشایان بۆ ئیسلامەتی

## الباب الخامس: في ملاك الجهاد دعوة الملوك إلى الاسلام

٤٤٥٠- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) كَتَبَ إِلَى كِسْرَى وَإِلَى قَيْصَرَ وَإِلَى النَّجَاشِيِّ وَإِلَى كُلِّ جَبَّارٍ يَدْعُوهُمْ إِلَى اللَّهِ تَعَالَى وَلَيْسَ بِالنَّجَاشِيِّ الَّذِي صَلَّى عَلَيْهِ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم). رَوَاهُ مسلم[١]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نامەی نووسی بۆ لای کیسراو بۆلای قەیصەرو بۆ لای نەجاشی و بۆ لای گشت

---

[١] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[٢] بسند غريب (شرحه).

[٣] بسند حسن (شرحه).

[١] مسلم. مغازي: ٤٥٨٥. ترمذي. استئذان: ٢٧١٦.

زۆردارو زەبرداریێ، بانگی دەکردن بۆسەر ئیسلام کە ئایینی خودای گەورەیە، هەتا دەست هەڵبگرن لە زۆرو ستەمو بێنە سەر ڕێگەی ڕاستی خودا وەلێ ئەم نەجاشییە ئەو نەجاشییە نییە کە کاتێ لە حەبەشە مرد پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) نوێژی مردووی نادیار (صلوة الغائب)ی لەسەر کرد (م).

**٤٤٥١**- عَنْ إبْنَ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) قَالَ: بَعَثَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بِكِتَابِهِ رَجُلاً إِلَى عَظِيمِ الْبَحْرَيْنِ لِيَدْفَعَهُ إِلَىكِسْرَى فَلَمَّا قَرَأَهُ كِسْرَى مَزَّقَهُ فَدَعَا عَلَيْهِمْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَنْ يُمَزَّقُوا كُلَّ مُمَزَّقٍ. رَوَاهُ البخاري[٢]:

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) نامەیەکی نارد بۆ سەر گەورەی بەحرەین، هەتا ئەو بیگەیەنێ بە کیسرای شای ئێرانی ئەو کاتە، جا کاتێ کیسرا کاغەزەکەی حەزرەت دەخوێنێتەوە دەیدڕێ! پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) نزای لێ کردن: کە شەق و پەق کرێن؟ ئیتر نزاکەی پێغەمبەری لێ گیرا بوو، لەوەدوا خودا کوڕەکەی کیسرا (کە ناوی شێرۆ بوو) زاڵی کرد بە سەریدا، بە خەنجەر سکی دڕی و کوشتی! (ب).

**٤٤٥٢**- عَنْ أَنَسٍ (رضى الله عنه) قَالَ: لَمَّا أَرَادَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَنْ يَكْتُبَ إِلَى الرُّومِ قِيلَ لَهُ إِنَّهُمْ لاَ يَقْرَءُونَ كِتَابًا إِلاَّ أَنْ يَكُونَ مَخْتُومًا، فَاتَّخَذَ خَاتَمًا مِنْ فِضَّةٍ وَنَقَشَ فِيهِ: مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ. ← (ب- ٤ز- ٣٥ل- ١١٧ف- ٤)[٣]:

## ٤٣) خەبات و غەزا دەبێ لە بنەڕەتدا لە پێناوی ئایین دابێ:
## أصل الجهاد للدين

ئایەتەکە لەم شوێنەدا ڕابوورد: بەرگی شەشەم زنجیرەی سێیەم، سوورەتی بەقەرە، ئایەتی: (وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ) الآية.

---

[٢] بخاري. جهاد: ٢٩٣٩.

[٣] مسلم. لباس: ٥٤٤٧. تقدم في مجلد رابع. تسلسل/ ٣٥ برقم: ٤/ ٢٨١٢. بخاري. جهاد: ٢٩٣٨.

٤٤٥٣- ← (ب- ٢ز- ٢ل- ١٢ف- ٤)[١].

٤٤٥٤- ← (ب/١ ز/٥٣ ل/٢١٠ ف/١) + (ب/٢ ز/٢ ل/١٢ ف/٤)[٢].

٤٤٥٥- عَنْ أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) قَالَ: بَعَثَنَا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) سَرِيَّةً إِلَى الْحُرَقَاتِ، فَنَذِرُوا بِنَا، فَهَرَبُوا فَأَدْرَكْنَا رَجُلاً فَلَمَّا غَشَيْنَاهُ قَالَ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللّٰهُ فَضَرَبْنَاهُ حَتَّى قَتَلْنَاهُ فَذَكَرْتُهُ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: مَنْ لَكَ بِلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ إِنَّمَا قَالَهَا مَخَافَةَ السِّلاَحِ، قَالَ: أَفَلاَ شَقَقْتَ عَنْ قَلْبِهِ حَتَّى تَعْلَمَ مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ قَالَهَا أَمْ لاَ! مَنْ لَكَ بِلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ فَمَا زَالَ يَقُولُهَا حَتَّى وَدِدْتُ أَنِّي لَمْ أُسْلِمْ إِلاَّ يَوْمَئِذٍ. رَوَاهُ أبو داود ومسلم[٣]:

ئوسامەی کوڕی زەید (خودا لە خۆی و باوکی خۆش بێ) فەرمووی: لقێ سوپا بووین، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ناردمانی بۆ سەر چەند خێڵێ لە هۆزی جوهەینە کە پێیان دەگوتن: حورەقات، کە هەستیان بە ئێمە کرد هەڵهاتن، نیشتینە سەر پیاوێ و گەمارۆمان داو گرتمانە ناو، لەوکاتەدا گوتی: (لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللّٰـهُ) بەڵام ئێمە دەرفەتمان نەداو دامان گرت و دامان پلۆسی هەتا کوشتمان! لە پاشدا کە چووینەوە خزمەتی حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) ئەمەم بۆی گێڕایەوە، فەرمووی: ڕۆژی قیامەت کێ قوتارت دەکا لە چنگی وشەی پیرۆزی (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ) عەرزیم کرد: قوربان! خۆ ئەو بەڕاستی نەبوو بەڵکوو لە ترسی گیانی وای گوت هەتا نەیکوژن! فەرمووی: جا کەوا دەزانی بۆچی دڵت هەڵ نەدڕی هەتا بزانی کە لەبەرئەوە وای گوتووە یانا! ڕۆژی قیامەت کێ لە چنگی وشەی (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ) قوتارت دەکا! ئیتر حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) خۆش خۆش ئەم وشەیەی دووبارە دەکردەوە بۆ دووپاتی. تەنانەت ئەوەندە پەشیمانیم حاصڵ کرد ئاواتم خواست کە هەتا ئەو ڕۆژە موسوڵمان نەبوومایە تاکوو تووشی ئەم تاوانە نەبوومایە (د/م).

---

[١] تقدم في مجلد ثاني. تسلسل/ ٢ برقم: ٤/ ١١٨٥.

[٢] تقدم في مجلد أول. تسلسل/ ٥٣ برقم: ٣٨٦/١ + مجلد الثاني. تسلسل/ ٢ رقم: ٤/ ١١٨٥.

[٣] مسلم. إيمان: ٢٧٣ — ٢٧٥. بخاري. مغازي: ٤٠٢١. أبو داود. جهاد: ٢٦٤٣.

٤٤٥٦- عَنِ الْمِقْدَادِ بْنِ الأَسْوَدِ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قُلْت: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْتَ إِنْ لَقِيتُ رَجُلاً مِنَ الْكُفَّارِ فَقَاتَلَنِي فَضَرَبَ إِحْدَى يَدَيَّ بِالسَّيْفِ فَقَطَعَهَا، ثُمَّ لاَذَ مِنِّي بِشَجَرَةٍ فَقَالَ أَسْلَمْتُ لِلَّهِ، أَفَأَقْتُلُهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ بَعْدَ أَنْ قَالَهَا؟ قَالَ: لاَ تَقْتُلْهُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهُ قَدْ قَطَعَ يَدِي، قَالَ: لاَ تَقْتُلْهُ فَإِنْ قَتَلْتَهُ فَإِنَّهُ بِمَنْزِلَتِكَ قَبْلَ أَنْ تَقْتُلَهُ وَأَنْتَ بِمَنْزِلَتِهِ قَبْلَ أَنْ يَقُولَ كَلِمَتَهُ الَّتِي قَالَ. رَوَاهُ الثلاثة[٤]:

میقدادی کوڕی ئەسوەد (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! پێم بفەرموو ئەگەر تووشی کابرایەکی خودا نەناس (کافر) بووم و چووین بە گژ یەکدیداو بە شمشێر دای لە دەستێکم و دەستی پەڕندم و ئینجا خۆی لێم دایە پاڵ درەختێك و گوتی: موسوڵمان بووم و ئەوا باوەڕم هێنا بە خودا، جا ئایا لە پاش گوتنی ئەم قسەیە لە هەل و مەرجێکی واواییدا بیکوژم یانا؟ فەرمووی: مەیکوژە. خۆ ئەگەر بیکوژی ئەوە ئەو دەچێتە پایەی تۆ بەرلەوەی کە ئەو بکوژیت و وەك ئەوکاتەی تۆ ڕشتنی خوێنی حەرام و نارەوایە وە تۆش دەچیتە پایەی ئەو بەرلەوەی کە موسوڵمان ببێ و وەك ئەوکاتەی ئەو ڕشتنی خوێنت حەڵاڵە بەڵام لەبەر شلۆقی هەڵوەست بەهانەت هەیە و تۆڵەت لێ ناسێنرێ (ش/د).

## ٤٤) بانگەوازی پێش دەست پێکردنی شەڕ پێویستە : (الدعوة قبل القتال)

٤٤٥٧- عَنْ بُرَيْدَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إِذَا أَمَّرَ أَمِيرًا عَلَى جَيْشٍ أَوْ سَرِيَّةٍ أَوْصَاهُ فِي خَاصَّتِهِ بِتَقْوَى اللَّهِ وَمَنْ مَعَهُ مِنَ الْمُسْلِمِينَ خَيْرًا ثُمَّ قَالَ: اغْزُوا بِاسْمِ اللَّهِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، قَاتِلُوا مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ اغْزُوا وَ لاَ تَغُلُّوا وَلاَ تَغْدِرُوا وَلاَ تَمْثُلُوا وَلاَ تَقْتُلُوا وَلِيدًا وَإِذَا لَقِيتَ عَدُوَّكَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ فَادْعُهُمْ إِلَى ثَلاَثِ خِصَالٍ فَأَيَّتُهُنَّ مَا أَجَابُوكَ فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ، ادْعُهُمْ إِلَى الإِسْلاَمِ فَإِنْ أَجَابُوكَ فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ، ثُمَّ ادْعُهُمْ إِلَى التَّحَوُّلِ مِنْ دَارِهِمْ إِلَى دَارِ الْمُهَاجِرِينَ وَأَخْبِرْهُمْ أَنَّهُمْ إِنْ فَعَلُوا ذَلِكَ فَلَهُمْ مَا لِلْمُهَاجِرِينَ، وَعَلَيْهِمْ مَا عَلَى الْمُهَاجِرِينَ فَإِنْ أَبَوْا أَنْ يَتَحَوَّلُوا،

---

[٤] تقدم تخريجه بمثل الحديث الذي قبله رقم: ٣/ ٤٤٥٥.

فَأَخْبِرْهُمْ أَنَّهُمْ يَكُونُونَ كَأَعْرَابِ الْمُسْلِمِينَ يَجْرِي عَلَيْهِمْ حُكْمُ اللَّهِ الَّذِي يَجْرِي عَلَى الْمُؤْمِنِينَ وَلاَ يَكُونُ لَهُمْ فِي الْغَنِيمَةِ وَالْفَيْءِ شَيْءٌ إِلاَّ أَنْ يُجَاهِدُوا مَعَ الْمُسْلِمِينَ، فَإِنْ هُمْ أَبَوْا فَسَلْهُمُ الْجِزْيَةَ، فَإِنْ هُمْ أَجَابُوكَ فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ فَإِنْ هُمْ أَبَوْا فَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ وَقَاتِلْهُمْ. وَإِذَا حَاصَرْتَ أَهْلَ حِصْنٍ فَأَرَادُوكَ أَنْ تَجْعَلَ لَهُمْ ذِمَّةَ اللَّهِ وَذِمَّةَ نَبِيِّهِ فَلاَ تَجْعَلْ لَهُمْ ذلك وَلَكِنِ اجْعَلْ لَهُمْ ذِمَّتَكَ وَذِمَّةَ أَصْحَابِكَ فَإِنَّكُمْ أَنْ تُخْفِرُوا ذِمَمَكُمْ وَذِمَمَ أَصْحَابِكُمْ أَهْوَنُ مِنْ أَنْ تُخْفِرُوا ذِمَّةَ اللَّهِ وَذِمَّةَ رَسُولِهِ. وَإِذَا حَاصَرْتَ أَهْلَ حِصْنٍ فَأَرَادُوكَ أَنْ تُنْزِلَهُمْ عَلَى حُكْمِ اللَّهِ فَلاَ تقبل مِنْهُمْ وَلَكِنْ أَنْزِلْهُمْ عَلَى حُكْمِكَ فَإِنَّكَ لاَ تَدْرِي أَتُصِيبُ حُكْمَ اللَّهِ فِيهِمْ أَمْ لاَ . رَوَاهُ الخمسة إِلاَّ البخاري[1]:

بورەیدە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) وابوو کە یەکێکی دەکرد بە فەرمانداری سوپا، یا دەیکرد بەسەر لەشکر لە پێشا ئامۆژگاری دەکرد کە بۆ خۆی بە تایبەت لە تەقوای خودا درێغی نەکاو بۆ ئەو موسوڵمانانەشی کە لە تەکی دان باش بێ، ئینجا دەیفەرموو: بە پیرۆزی ناوی خودا، غەزا بکەن لە پێناوی خودادا، جەنگ بکەن لەگەڵ ئەوانەدا کە باوەڕ بە خودا ناکەن، غەزا بکەن و گزی و دزی مەکەن و لە تالانی و ماڵی دەست کەوتی شەڕی کافران ناخونەك مەدەن و پەیمان مەشکێنن و کوژراوەکان ئەتك مەکەن و لچ و لێویان مەکەن و منداڵ مەکوژن، کاتێکیش بەرەنگاری دوژمنی خۆت بووی بانگیان بکە بۆ سەر یەکێ لەم سێ شتە: جا بۆ هەرکامێ لەم سێ شتە بە گوێیان کردی پێی رازی بەو وازیان لێ بێنە،

یەکەم: داوایان لێ بکە کە موسوڵمان ببن جا ئەگەر رازی بوون ئەوا زۆر باشەو ئیتر وازیان لێ بێنە.

دووەم: دوا ئەوە داوایان لێ بکە کە لە شوێنی خۆیانەوە بگوێزنەوە بۆ وڵاتی کۆچکاران (کە مەدینەی پڕ لە نوورە) وە پێیان بڵێ: ئەگەر کۆچ بکەن بۆ ئەوێ ئیتر مافی ئەوانیش وەك مافی کۆچکەرانی تر وایەو ئەرکی سەر

---

[1] مسلم. مغازی: ٤٤٩٧. أبو داود. جهاد: ٢٦١٢ ، ٢٦١٣. ترمذي. سير: ١٦١٧ ، ١٦١٧م.

شانیشیان وەك ئەرکی سەر شانی کۆچکەرانی تر وایە! بەڵام ئەگەر قاییل نەبوون کە بگوێزنەوە ئەوا پێیان بڵێ: کە حاڵی ئەوانیش وەك حاڵی عەرەبە دەشتەکییە موسوڵمانەکان دەبێ، وەچی فەرمانێکی خودا بەسەر ئەواندا جێبەجێ بکرێ بەسەر ئەمانیشدا جێبەجێ دەکرێ، وە لە تالانی جەنگ و مفتە ماڵ (فیيء)دا بەشیان بۆ دانانرێ، مەگەر بە مەرجی ئەوە کە لەناو ریزی موسوڵماناندا خەبات بگێڕن.

سێیەم: خۆ ئەگەر ملیان نەدا کە ئیسلام ببن ئەوا داوای سەرانەیان لێ بکە، جا ئەگەر بە قسەیان کردی ئەوا تۆیش قاییل ببەو شەڕیان لەگەڵ دا مەکە، ئەگینا بە پشتی خودا جەنگ بکە لە گەڵیاندا. لەکاتی قەومانی شەڕدا، کاتێ دەوری قەڵایێ دەگریت ئەگەر خەڵکی قەڵاکە داوایان لێ کردی کە بەرابەر بەوە کە خۆیان بدەن بە دەستەوە پەیمانی خوداو پێغەمبەری خودایان بدەیتێ، شتی وا مەکە، مەگەر بە باشی بزانی، بەڵام بە ناوی خۆت و هاوڕێکانتەوە پەیمانیان بدەرێ، چونکە ئێوە ئەگەر پەیمانی خۆتان و هاوڕێکانتان بشکێنن ئاسانترە لەوە کە پەیمانی خوداو پێغەمبەری خودا بشکێنن، وە هەروەها ئەگەر گەمارۆی خەڵکی قەڵایەکتداو داوایان لێ کردیت کە لەسەر فەرمان (حوکم)ی خودا خۆیان بدەن بە دەستەوە شتی وایان لێ قەبووڵ مەکە، بەڵام با لەسەر فەرمانی خۆت خۆ بدەن بە دەستەوە، چونکە تۆ نازانیت ئایا فەرمانی خودا لە بارەی ئەوانەوە دەپێکیت یانا (م/د/ت/ن).

## ٤٥) راسپێری (وەصیەت)ی پێغەمبەر درودی خودای لەسەر بۆ سەرکردەکانی سوپاکان:

## وصية النبي ﷺ إلى أمراء الجيش

٤٤٥٨- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إِذَا بَعَثَ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِهِ فِي بَعْضِ أَمْرِهِ قَالَ بَشِّرُوا وَلاَ تُنَفِّرُوا وَيَسِّرُوا وَلاَ تُعَسِّرُوا[1]:

[1] مسلم. مغازي: ٤٥٠٠. أبو داود. أدب: ٤٨٣٥.

ئەبو مووسا (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە یەکێ لە هاوڕێکانی خۆی دەنارد بۆ فرمانێکی خۆی، دەیفەرموو: مزگێنی بدەن بە خەڵك‌و خەڵك مەتەکێننەوە، وە لەناو خۆشتانا ئیش‌و کار بۆ یەکتری ئاسان بکەن‌و کارگران مەکەن‌و باری مەردوم گران مەکەن (ش).

٤٤٥٩- ← (ب- ٣ز- ١٠٧ل- ٢٩٢ف- ٤)[٢].

٤٤٦٠- عَنْ أَنَسُ (رَضِيِ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: انْطَلِقُوا بِاسْمِ اللّٰهِ وَبِاللّٰهِ وَعَلَى مِلَّةِ رَسُولِ اللّٰهِ وَلاَ تَقْتُلُوا شَيْخًا فَانِيًا وَلاَ طِفْلاً وَلاَ صَغِيرًا وَلاَ امْرَأَةً وَلاَ تَغُلُّوا وَضُمُّوا غَنَائِمَكُمْ وَأَصْلِحُوا وَأَحْسِنُوا إِنَّ اللّٰهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ . رَوَاهُ أبو داود[٣]:

ئەنەس (ڕەزای یەزدانی مەزنی لەسەر بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی یەزدانی گەورەی لێ بێ) فەرمووی: بە پیرۆزی ناوی خودا بکەونە ڕێ، هەروەها بە پشتی یاریدەی خودا، وە لەسەر یاسا و دەستووری ئایینی پێغەمبەری خودا، لە غەزادا پیرەمێردی ئیفتادەی کەفتەکار مەکوژن، وە منالی ساوا مەکوژن، وە ژن مەکوژن، وە گزی‌و دەست پیسی لە دەستکەوتی جەنگ مەکەن، وە تالانی خۆتان بە ڕێك‌و پێکی کۆکەنەوە، وە چاکە بکەن بە پیشەی خۆتان وە با کارو فرمانتان جوان بێ {وَأَحْسِنُوٓاْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ} (٢/١٩٥) (د- س/ص).

٤٤٦١- تەماشای فەرموودەی یەکەم لە باسی (الدعوة قبل القتال) بکە. ئەویش لەم بابەتەیە[٤].

---

[٢] تقدم في مجلد ثالث. تسلسل/ ١٠٧ رقم: ٤/ ٢٤٤٥.

[٣] بسند صالح (شرحه).

[٤] راجع التسلسل/ ٤٤ (الحديث الأوّل).

## ٤٦) لەپاش بانگ کردنی بێ بڕوایان بۆسەر فەرمانی ئیسلام ئەگەر قەبووڵیان نەکرد دروستە بدرێ بە سەریاندا:
## تجوز الاغارة على الكفار بعد دعوتهم

**٤٤٦٢**- عَنْ ابْنُ عَوْنٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَتَبْتُ إِلَى نَافِعٍ أَسْأَلُهُ عَنْ الدَّعْوَةُ قَبْلَ الْقِتَال قَالَ فَكَتَبَ إِلَيَّ، إِنَّما كَانَ ذلك فِي أَوَّلِ الإِسْلاَمِ وَقَدْ أَغَارَ رَسُول اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عَلَى بَنِي الْمُصْطَلِقِ وَهُمْ غَارُّونَ وَأَنْعَامُهُمْ تُسْقَى عَلَى الْمَاءِ فَقَتَلَ مُقَاتِلَتَهُمْ وَسَبَى سَبْيَهُمْ وَأَصَابَ يَوْمَئِذٍ جُوَيْرِيَةَ بْنت الْحَارِثِ. رَوَاهُ الثلاثة[1]:

ئیبنو عەون (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: نامەیەکم بۆ نافیع نووسی، لەبارەی بانگەوازی پێش دەست پێکردنی جەنگەوە پرسیارم لێی کرد، ئەویش نامەی بۆ من نووسییەوە: کە ئەمە لەسەرەتای ئیسلامەتییەوە وابوو هەتا بانگیان نەکرد نایە بۆ سەر ئیسلام و لەپاش مل نەدان ئاگاداریان نەکردنایەتەوە کە خۆیان ئامادە بکەن بۆ شەڕ پەلاماریان نەدەدان بەڵام لەوە پاش پێغەمبەر خۆی (درودی خودای لەسەربێ) لە ناکاو پەلاماری بەنی موصطەلەقی داو ئاگاشیان لە خۆیان نەبوو، لەو کاتەدا ئاژەڵەکانیان لەسەر ئاو بوو، خەریك بوون ئاویان دەدان! جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لەو شەڕەدا،، پیاوە جەنگاوەرەکانی کوشتن و خێزانی بە تاڵانی بردن، وە هەر لەو رۆژەدا بوو کە جووەیرییەی کچی حاریثی سەر کۆماری ئەو خێڵەی دەست کەوت و مارەی کرد بۆ خۆی (ش/د).

**٤٤٦٣**- عَنْ أَنَسٍ (رضى الله عنه) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) خَرَجَ إِلَى خَيْبَرَ فَجَاءَهَا لَيْلاً، وَكَانَ إِذَا جَاءَ قَوْمًا بِلَيْلٍ لاَ يُغِيرُ عَلَيْهِمْ حَتَّى يُصْبِحَ. فَلَمَّا أَصْبَحَ، خَرَجَتْ يَهُودُ بِمَسَاحِيهِمْ وَمَكَاتِلِهِمْ فَلَمَّا رَأَوْهُ قَالُوا: مُحَمَّدٌ وَاللَّهِ مُحَمَّدٌ وَالْخَمِيسُ، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): اللَّهُ أَكْبَرُ، خَرِبَتْ خَيْبَرُ، إِنَّا إِذَا نَزَلْنَا بِسَاحَةِ قَوْمٍ فَسَاءَ صَبَاحُ الْمُنْذَرِينَ. وَفِي رِوايةٍ: كَانَ إِذَا غَزَا قَوْمًا لَمْ يُغِرْ حَتَّى يُصْبِحَ فَإِنْ سَمِعَ أَذَانًا أَمْسَكَ، وَإِلاَّ أَغَارَ بَعْدَ

---

[1] تجريد البخاري: ٣/ ١٨٠ رقم: ١٠٨٩ = ٢٥٤١ فتح. مسلم. جهاد: ٤٤٩٤. أبو داود. جهاد: ٢٦٣٣.

يُصْبِحُ. رَوَاهُ الأربعة وزاد الترمذي في روايةٍ: فَسَمِعَ رَجُلاً يَقُولُ: اللَّهُ أَكْبَرُ.فَقَالَ: عَلَى الْفِطْرَةِ، فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، فَقَالَ: خَرَجْتَ مِنَ النَّارِ. نسأل الله السلامة. آمين[٢]:

**ئەنەس** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **لە ماڵ دەرچوو، چوو بۆ خەیبەر، کە گەیشتە ئەوێ شەو بوو، بەڵام دەستووری وابوو کە بە شەو بگەیشتایەتە سەر هۆزێ بەو شەوە نەیدەدا بەسەریاندا، چاوەنواڕی دەکرد تا بەیانی دەدا، جا بەیانی زوو جوولەکەکان (وەك ئاسایی بە بێڵ‌و خاکەناز‌و زەمبیلەو تفاقی کەشتوکاڵەوە) وە دەرکەوتن‌و دەڕۆیشتن بۆ سەر ئیش‌و کاریان، لەناو دێبەرو مەزراکانیان، لەپڕ چاویان بە پێغەمبەرو سوپاکەی کەوت‌و گوتیان: ئای! خۆ بە خودا ئەمە موحەممەدو لەشکرەکەیەتی!**

**پێغەمبەریش** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: ئەڵلاهو ئەکبەر، وا وێران بوو خەیبەر! ئێمە کاتێ پەلاماری هۆزێ بدەین‌و بۆیان بچینە مەیدان‌و بەر دەرگایان پێ بگرین‌و گەمارۆیان بدەین ئیتر ئەو ترسێنراوو تۆقیوانە بەیانی رۆژی رەشیانە! پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **بەم بۆنەیەوە ئیستیشهادی بەم ئایەتە پیرۆزە کردووە کە دەفەرموێ:**

**{فَإِذَا نَزَلَ بِسَاحَتِهِمْ فَسَاء صَبَاحُ الْمُنذَرِينَ} (١٧٧/٣٧).**

**واتە: کاتێ ئەو سزایە بەر دەرگایان پێ دەگرێ‌و گەمارۆیان دەدا ئیتر ئەو ترسێنراوو تۆقیوانە بەیانی رۆژی رەشیانە (وەرگێڕ) لە گێڕانەوەیەکا:**

---

[٢] تجريد البخاري = مختصر صحيح البخاري بالكوردي: ٢٣٥ = ٣٧١ ، ٦١٠ ، ٩٤٧ ، ٢٢٢٨ ، ٢٢٣٥ ، ٢٨٨٩ ، ٢٨٩٣ ، ٢٩٤٣ ، ٢٩٤٤ ، ٢٩٤٥ ، ٢٩٩١ ، ٣٠٨٥ ، ٣٠٨٦ ، ٣٣٦٧ ، ٣٦٤٧، ٤٠٨٣ ، ٤٠٨٤ ، ٤١٩٧ ، ٤١٩٨ ، ٤١٩٩ ، ٤٢٠٠ ، ٤٢٠١ ، ٤٢١١ ، ٤٢١٢ ، ٤٢١٣ ، ٥٠٨٥ ، ٥١٥٩ ، ٥١٦٩ ، ٥٣٨٧ ، ٥٤٢٥ ، ٥٥٢٨ ، ٥٩٦٨ ، ٦١٨٥ ، ٦٣٦٣ ، ٦٣٦٩ ، ٧٣٣٣. مسلم. نكاح: ٣٤٨٢ ، ٤٦٤١. أبو داود. خراج: ٣٠٠٩. نسائي. نكاح: ٣٣٨٠ تحفة الأشراف: ٩٩٠.

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) یاسای وابوو کە دەڕۆیشت بۆ غەزا بۆ سەر هۆزێ، هەتا بەیانەکی نەدایە نەیدەدا بە سەریاندا، جا ئەگەر لەکاتی بەیانیدا گوێی لە دەنگی بانگ بوایە ئەوا وازی لێ دەهێنان، ئەگینا لەپاش بەیان هێرشی دەبردە سەریان و پەلاماری دەدان (ش/د/ت) گێڕانەوەی تیرمیذی ئەمەی پترە: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) گوێی لێ بوو کە پیاوێ دەیگوت: ئەڵڵاهو ئەکبەر، فەرمووی: لەسەر ئایینی خودا کردی پیاوەکەش گوتی: (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خۆت دەربازکرد لە ئاگری دۆزەخ! لە خودا داوا دەکەین کە لە ئاگری دۆزەخ بمانپارێزێ. گیرایکەی خودایە.

## ٤٧) کات و دەمی شەڕ خۆش بوون! : (الساعة التي يطلب فيها القتال)

٤٤٦٤- عَنْ النُّعْمَانَ (رضي الله تَعَالَى عنه) قَالَ: شَهِدْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله تَعَالَى عليه وسلم) إِذَا لَمْ يُقَاتِلْ مِنْ أَوَّلِ النَّهَارِ أَخَّرَ الْقِتَالَ حَتَّى تَزُولَ الشَّمْسُ وَتَهُبَّ الرِّيَاحُ وَيَنْزِلَ النَّصْرُ. رَوَاهُ أبو داود والبخاري والترمذي ولفظه: غَزَوْتُ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَكَانَ إِذَا طَلَعَ الْفَجْرُ أَمْسَكَ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، فَإِذَا طَلَعَتْ قَاتَلَ، فَإِذَا انْتَصَفَ النَّهَارُ أَمْسَكَ حَتَّى تَزُولَ الشَّمْسُ، فَإِذَا زَالَتِ قَاتَلَ حَتَّى الْعَصْرِ ثُمَّ أَمْسَكَ حَتَّى يُصَلِّيَ الْعَصْرَ ثُمَّ يُقَاتِلُ، وَيُقَالُ عِنْدَ ذَلِكَ تَهِيجُ رِيَاحُ النَّصْرِ وَيَدْعُو الْمُؤْمِنُونَ لِجُيُوشِهِمْ فِي صَلاَتِهِمْ[1]:

نوعمان (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: بۆ خۆم لەگەڵ پێغەمبەردا بووم (درودی خودای لەسەربێ) ئەگەر سەر لە بەیانی دەستی نەکردایە بە جەنگ کردن، ئیتر شەڕ دەستپێکردنی دوا دەخست، هەتا دەبوو بە نیوەڕۆ وە با هەڵی دەکرد، وە نەصرو سەرکەوتن و پیرۆزی دادەبەزی (د/ب/ت) گفتەی (ت): بۆخۆم لە خزمەتی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەربێ) غەزام کردووە، دەستووری وابوو

---

[1] تجريد البخاري = مختصر صحيح البخاري: ١٢٧٨ = ٣١٦٠.

کاتێ بەیانی دەدا دەستی هەل دەگرت‌و دەستی دەگرتەوە هەتا خۆر گزنگی دەدا، جا کە خۆر هەڵ دەهات شەڕی دەکرد تا ڕۆژ دوو کوت دەبوو، ئەوجا وازی دەهێنا تا خۆر لای دەدا، ئەوجا شەڕی دەکردەوە تا عەصر، ئەوجا دەستی هەڵ دەگرتەوە تا نوێژی عەصری دەکرد، ئینجا جەنگی دەکردەوە، دەڵێن: لەم دەمەدایە کە بای سەرکەوتن دەوەزێ، وە موسوڵمانان لە نوێژدا بۆ سوپای خۆیان دەپاڕێنەوەو نزای سەرکەوتن‌و زاڵبوونیان بۆ دەکەن.

**٤٤٦٥-** وللبخاري وأبي داود: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا ظَهَرَ عَلَى قَوْمٍ أَقَامَ بِالْعَرْصَةِ ثَلاَثَ لَيَالٍ[٢]:

دەفەرموێ: جاران کاتێ کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) زاڵ دەبوو بەسەر هۆزێکا سێ شەو لەلا ماڵانەکەیان لە دیاریان دەمایەوە، هەتا خۆیان پشوویێ بدەن‌و دوژمنیش تەواو چاو ترسێن ببێ (ب/د).

## ٤٨) لە دەمەدەمی گەرمەی جەنگدا پارانەوە پەسەندە:
## الدعاء عند القتال مطلوب

**٤٤٦٦-** عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي أَوْفَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فِي بَعْضِ أَيَّامِهِ الَّتِي لَقِيَ فِيهَا الْعَدُوَّ يَنْتَظِرُ حَتَّى مَالَتِ الشَّمْسُ ثُمَّ قَامَ فِي النَّاسْ، فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ لاَ تَتَمَنَّوْا لِقَاءَ الْعَدُوِّ وَاسْأَلُوا اللَّهَ الْعَافِيَةَ، فَإِذَا لَقِيتُمُوهُمْ فَاصْبِرُوا، وَاعْلَمُوا أَنَّ الْجَنَّةَ تَحْتَ ظِلاَلِ السُّيُوفِ، ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ مُنْزِلَ الْكِتَابِ وَمُجْرِيَ السَّحَابِ وَهَازِمَ الأَحْزَابِ اهْزِمْهُمْ وَانْصُرْنَا عَلَيْهِمْ. رَوَاهُ الثلاثة[١]:

---

[٢] تجريد البخاري = مختصر صحيح البخاري بالكوردى: ١٢٤٨ = ٣٠٦٥ ، ٢٩٧٦ فتح الباري شرح صحيح البخاري. أشار العسقلاني والعيني أنَّ مسلماً أخرج متابعة عبد الأعلى لهذا الحديث (فتح الباري حديث رقم/٣٠٦٥).

[١] بخاري. جهاد: ٣٠٢٦. مسلم. مغازي: ٤٥١٦ ، ٤٥١٧، ٢٥١٦ = تجريد/ ٣/ ٣٤٢ رقم: ١٢١٧ = ٢٩٦٥ = ١٢٠٤ = ٢٩٣٣ فتح الباري أبو داود. جهاد: ٢٦٣١.

عەبدوڵڵای كوڕی ئەبو ئەوفا (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: ڕۆژێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) تووشی دوژمن بوو، چاوەڕوانی كرد هەتا خۆر لاربۆوە، ئەوسا هەڵسا خوتبەیەكی داو بە خەڵكەكەی فەرموو: ئەی مەردووم! ئاوات مەخوازن بۆ گەیشتن بە دوژمن، وە لە خودا داوای خۆشی‌و باشی لەش‌و گیان‌و دین‌و دونیا بكەن، كاتێكیش تووشی دوژمن بوون خۆڕاگرن‌و بە پشوو بن، وە بزانن كە بەهەشت وا لەسای سێبەری شیردا، ئینجا فەرمووی: اللَّهُمَّ مُنْزِلَ الْكِتَابِ وَمُجْرِيَ السَّحَابِ وَهَازِمَ الأَحْزَابِ، اهْزِمْهُمْ وَانْصُرْنَا عَلَيْهِمْ : خودایە! ئەی ئەو كەسەی كە قورئانت بە خەڵات ناردووە بۆ موحەممەد! ئەی ئەو كەسەی كە بە تەوانایی خۆت با هەڵ دەكەیت‌و بەهەموو لایەكا دەیخەیتە ڕێ! ئەی ئەو كەسەی كە بە تەنیا خۆت گەلە كۆمەی كۆمەڵەی دوژمنانی ئیسلامت تێ شكاند! لەم غەزایەشدا بیانشكێنەو سەرمان بخە بە سەریاندا (ش/د).

٤٤٦٧- وَفِي يَوْمِ الأَحْزَابِ دَعَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: اللَّهُمَّ مُنْزِلَ الْكِتَابِ سَرِيعَ الْحِسَابِ اهْزِمِ الأَحْزَابَ اللَّهُمَّ اهْزِمْهُمْ وَزَلْزِلْهُمْ. رَوَاهُ الشيخان والترمذي[٢]:

لە ڕۆژی غەزای خەندەقدا كە ناو دەبرێ بە جەنگی ئەحزابیش پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) زۆر پاڕایەوەو فەرمووی: اللَّهُمَّ مُنْزِلَ الْكِتَابِ! سَرِيعَ الْحِسَابِ! اللَّهُمَّ اهْزِمِ الأَحْزَابَ، اللَّهُمَّ اهْزِمْهُمْ وَزَلْزِلْهُمْ : ئەی خودایە! ئەی ئەو كەسەی كە قورئانت بە خەڵات ناردووە بۆ موحەممەد! ئەی ئەو كەسەی كە لێپرسینەوەت لە هەموو كەسێ خێراترە! ئەم كۆمەڵەی لەشكری كوفرە كە لە دژی ئیسلام گەلە كۆمەیان كردووە تێك شكێنەو بیان بەزێنەو بیان شڵەژێنەو بیان شڵەقێنە (ش/ت).

---

[٢] تجريد / ٣/ ٣٢٧ رقم: ١٢٠٤ = ٢٩٣٣ ، ٢٩٦٥ ، ٣٠٢٥ ، ٤١١٥ ، ٦٣٩٢ ، ٧٤٨٩. مسلم. مغازي: ٤٥١٨. ترمذي. جهاد: ١٦٧٨.

٤٤٦٨- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا غَـزَا قَـالَ: اللَّهُمَّ أَنْتَ عَضُدِي وَنَصِيرِي، بِكَ أَحُولُ وَبِكَ أَصُولُ وَبِكَ أُقَاتِلُ . رَوَاهُ أصحاب السنن[٣]:

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کاتێ کە دەچوو بۆ غەزا دەیفەرموو: اللَّهُمَّ أَنْتَ عَضُدِي وَنَصِيرِي بِـكَ أَحُـولُ وَبِـكَ أَصُـولُ وَبِكَ أُقَاتِلُ: خودایە! هەر تۆ پەناو پشتی منی، هەر تۆ یارو یاوەری منـی، بە پشتێ تۆ پیلان دادەنێم بۆ خستنی دوژمن، بە پشتی تۆ هەڵمەت دەبەم، بە پشتی تۆ جەنگ دەکەم (د/ت/ن- س/ح).

٤٤٦٩- وَلأَبِي داود: ثِنْتَانِ لاَ تُرَدَّانِ أَوْ قَلَّمَا تُرَدَّانِ، الدُّعَاءُ عِنْدَ النِّـدَاءِ وَعِنْـدَ الْبَأْسِ حِينَ يُلْحِمُ بَعْضُهُمْ بَعْضًا[٤]:

لەسەر گێڕانـەوەی ئـەبو داوود (خـودای لێ ڕازی بـێ) حـەزرەت (دروودی خـودای لەسەربێ) دەفەرموێ: دوو نزا ڕەتبوونەوەیان بۆ نییـە: یەکـەم: پاڕانـەوە لـەکاتی بانگدا، دووەم: نزاو پاڕانەوەی کاتی گەرم بوونی جەنگ، لەو دەمەدا کە شـەڕ گەرم دەبێ‌و دەبێ بە تێك ڕژان‌و تێکبەربوون.

## ٤٩) خۆڕاگرتن‌و ورەبەرزی‌و نەبەزین لەکاتی ڕوودانی شەڕدا پێویستە (واتە: واجیبە) : (الثبات عند القتال واجب)

٤٤٧٠- قِيلَ لِلْبَرَاءِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): أَكُنْتُمْ فَرَرْتُمْ يَا أَبَا عُمَارَةَ يَوْمَ حُنَيْنٍ؟ قَالَ: لاَ وَاللَّهِ مَا وَلَّى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَلَكِنَّـهُ خَـرَجَ شُـبَّانُ أَصْـحَابِهِ، وَأَخِفَّـاؤُهُمْ حُسَّرًا لَيْسَ بِسِلاَحٍ، فَأَتَوْا قَوْمًا رُمَاةً جَمْعَ هَوَازِنَ وَبَنِي نَصْرٍ مَا يَكَادُ يَسْقُطُ لَهُـمْ سَـهْمٌ فَرَشَقُوهُمْ رَشْقًا مَا يَكَادُونَ يُخْطِئُونَ فَأَقْبَلُوا هُنَالِكَ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ عَلَـى بَغْلَتِهِ الْبَيْضَاءِ وَابْنُ عَمِّهِ أَبُو سُفْيَانَ بْنُ الْحَارِثِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ يَقُودُ بِهِ فَنَزَلَ وَاسْتَنْصَرَ ثُمَّ قَالَ:

---

[٣] بسند حسن (شرحه).

[٤] سكت عن درجته الشارح.

أَنَا النَّبِيُّ لاَ كَذِبْ أَنَا ابْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبْ

ثُمَّ صَفَّ أَصْحَابَهُ رَوَاهُ الشيخان والترمذي[1]:

گوترا بە بەراء (خودای لێ رازی بێ) : ئەی ئەبو عومارە! ئایا راستە کە ئێوە لە رۆژی غەزای حونەیندا هەڵهاتن؟ فەرمووی: ئەگەر ئێمە هەموو هەڵهاتبین دیارە پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) لە گەڵمان بووە! نە بەخودا شتی وا نەبووە، نە پێغەمبەر هەڵهات و نە ئێمە هەڵهاتین بەڵام مەسەلەکە ئاوابوو: جەهێڵ و هەرزەکارە بزێوەکان {لە یارانی حەزرەت (درودی خودا لە حەزرەت و رەزای خودا لە یارانی بێ)} بە دەستی رووتی بەبێ چەك هاتبوون بۆ ئەو شەڕە، جا لە ناکاو لووتیان تەقی بە لووتی کۆمەڵەی لەشکری هەوازین و بەنی نەصرەوە ئەوانیش هۆزێکی تیر ئەندازی چاك بوون، مەگەر بە دەگمەن تیریان نیشانی نەپێکایە، دەنا تیریان لە زەوی نەدەدا، ئیتر لەپڕ تیر بارانێکی وایان کردن مەگەر چۆنها، ئەگینا تیریان بە هەڵە نەدەچوو {ئیتر ئەمە بوو بەهۆی ئەوە کە لە سەرەتای شەڕەکەوە لەشکرەکەی پێغەمبەر (درودی خودا لەسەر خۆی و رەزای خودا لە لەشکرەکەی بێ) شکست بێنن، بەڵام پێغەمبەرو بەشێ لە یارانی خۆیان راگرت و نەبەزین و حەزرەت فەرمانی کرد بە عەبباسی مامەی بانگی یاران بکاتەوە بۆلای پێغەمبەر} ئەوجا یاران و موسوڵمانان بەرەو پێغەمبەر گەڕانەوە و لە دەوری کۆبوونەوە، لەوکاتەدا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بە سواری هێسترە ماچە سپییەکەی خۆی بوو هەر باکی لە کافران نەبوو، وە ئەبو سوفیانی کوڕی حاریثی کوڕی عەبدولموطەلیب کە ئامۆزای خۆی بوو، ولاخەکەی بۆ رادەکێشا، جا حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) دابەزی و پاڕایەوە و داوای پیرۆزی و سەرکەوتنی لە خودا کردو فەرمووی:

أَنَا النَّبِيُّ لاَ كَذِبْ أَنَا ابْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبْ

---

[1] بخاري. مغازي: ٢٩٣٠. مسلم. مغازي: ٤٥٩١. تحفة الأشراف: ١٨٣٨ = تجريد: ٣ / ٣١٠ رقم: ١١٨٣ = ٢٨٦٤ ، ٢٨٧٤ ، ٢٩٣٠ ، ٣٠٤٢ ، ٤٣١٥ ، ٤٣١٦ ، ٤٣١٧.

واتە:

پێغەمبەرم من نەوەک درۆزن

عەبدولموگگهلیبە بابە گەورەی من!

فەرمووی: ئینجا هاوڕێکانی خۆی ریزکردەوەو سەر لەنوێ هەڵمەتی شێرانەیان بردەوەو دوژمنیان شکاند (ش/ت).

٤٤٧١- وَ للبخاري: إِنَّ اللّٰهَ لَيُؤَيِّدُ هَذَا الدِّينَ بِالرَّجُلِ الْفَاجِرِ[٢]:

دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): لە راستیدا گەلێ جارانیش خودای گەورەو مەزن بە پیاوی بەدکارو فاسقیش پشتیوانی ئەم ئایینی ئیسلامە دەکا. {بوخاری (خودای لێ رازی بێ)}.

٤٤٧٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: شَرُّ مَا فِي الرَّجُلِ شُحٌّ هَالِعٌ وَجُبْنٌ خَالِعٌ [٣]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): بەدترین رەفتار بۆ پیاو ئەوەیە کە ئەوەندە رژدو پیسکە بێ بە خێرکردن خورپەی لێ کەوێ، ئەوەندەیش ترسنۆك بێ هەمیشە بتۆقێ! (د):

نەوەن چرووکە گەر بەخەو خێرێ

بکا تا مردن لە خەو دەتۆرێ!

٤٤٧٣- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَتِيكٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ نَبِيَّ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) كَانَ يَقُولُ: مِنَ الْغَيْرَةِ مَا يُحِبُّ اللّٰهُ وَمِنْهَا مَا يُبْغِضُ اللّٰهُ، فَأَمَّا الَّتِي يُحِبُّهَا اللّٰهُ فَالْغَيْرَةُ فِي الرِّيبَةِ، وَأَمَّا الْغَيْرَةُ الَّتِي يُبْغِضُهَا اللّٰهُ فَالْغَيْرَةُ فِي غَيْرِ رِيبَةٍ. وَإِنَّ مِنَ الْخُيَلاَءِ مَا يُبْغِضُ اللّٰهُ وَمِنْهَا مَا يُحِبُّ اللّٰهُ: فَأَمَّا الْخُيَلاَءُ الَّتِي يُحِبُّ اللّٰهُ فَاخْتِيَالُ الرَّجُلِ عِنْدَ اللقاء وَاخْتِيَالُهُ

---

[٢] تعليق ترجم به الباب الرقم/ ١٨٢ من كتاب الجهاد. قبل الرقم: ٣٠٦٢.

[٣] سكت عن درجته الشارح.

عِنْدَ الصَّدَقَةِ، وَأَمَّا الَّتِي يُبْغِضُ اللَّهُ عزَّ وَجَلَّ فَاخْتِيَالُهُ فِي الْبَغْيِ وَالْفَخْرِ. رَوَاهُمَا أبو داود[٤]:

**جابیری کوڕی عەتیك** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: پێغەمبەری خودا** (درودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: غیرەت‌و بەتەنگەوە بوون دوو جۆری هەیە، جۆرێکیان خودای گەورەو مەزن پێی خۆشەو خۆشی دەوێ ئەویش ئەوەیە کە لەسەر شتێ بێ، بۆنی گومانی خراپی لێ بکرێ، جۆرەکەی تریان کە خودا رقی لێیەتی ئەوەیە کە لەسەر شتێ بێ بۆنی گومانی خراپی لێ نەکرێ! وە هەروەها خۆنواندن‌و خۆهەڵکێشانیش ئەم دوو جۆرەی هەیە، ئەو دەعیەو خۆ هەڵکێشانەی کە خودا پێی خۆشە ئەوەیە کە پیاوی ئازا لەکاتی جەنگیندا کەشوفش‌و فیزو دەمارو دەعیە بکا، یا لەکاتی خێرکردندا خۆی بنوێنێ، هەتا کەسانی تریش چاو لەو بکەن، جۆری دووەم کە خودا رقی لێیەتی: کە فیزو دەعیە بەکردنی زوڵم‌و زۆرەوە بکاو شانازی بەسەر هەژاراندا بکا. (د).**

## ٥٠) شوێنە گومکێ لە شەڕدا پەسەندەو شەڕ بە فێڵ دەبڕێتەوە: التورية والحرب خدعة

٤٤٧٤- عَنْ كَعْبَ بْنَ مَالِكٍ (رضی الله عنه) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَلَّمَا يُرِيدُ غَزْوَةً يَغْزُوهَا إِلاَّ وَرَّى بِغَيْرِهَا. رَوَاهُ البخاري وأبو داود[١]:

**کەعبی کوڕی مالیك** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: جاران دەستووری پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **وابوو، کە دەیویست بچێ بۆ غەزایێ شوێنە گومکێی دەکردو لەبەر چاوی خەڵك وای نیشان دەدا کە بۆ جێگەیەکی تر دەچێ نەوەك بۆ ئەوێ (ب/د).**

---

[٤] سکت عن درجته الشارح.

[١] بخاري. جهاد: ٢٩٤٧.

٤٤٧٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: الْحَرْبَ خُدْعَةً. رَوَاهُ الخمسة[٢]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) دەفەرموێ: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: شەڕ بەفرِوفێڵ دەبرێتەوە! (ش/د/ت/ن- رەزای خودای لێ بێ).

## ٥١) نیشانەو دروشمی یەكتر ناسینەوە لە جەنگدا : (الشعار في الحرب)

٤٤٧٦- عَنْ الْمُهَلَّبِ بْنِ أَبِي صُفْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: أَخْبَرَنِي مَنْ سَمِعَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَقُولُ: إِنْ بَيَّتُّمْ فَلْيَكُنْ شِعَارُكُمْ حَم لاَ يُنْصَرُونَ . رَوَاهُ أصحاب السنن[١]:

موهەللەبی كوڕی ئەبو صوفرە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: كەسێ ئەم فەرموودەیەی بۆ من باس كردووە كە بە خودی خۆی لە پێغەمبەری ژنەوتووە فەرموویەتی: ئەگەر دنیابوو بە شەو دایان بەسەرتانداو دوژمن شەبەیخون بەسەریدا دان، با لەناو خۆتانا دروشمتان وشەی (حم = حامیم)بێ ئیتر خوا یار بێ دوژمن سەر ناكەوێ. (د/ت/ن- سند صالح).

٤٤٧٧- عَنْ إِيَاسِ بْنِ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنْ أَبِيهِ قَالَ: غَزَوْنَا مَعَ أَبِي بَكْرِ (رضي الله عنه) زَمَنَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَكَانَ شِعَارُنَا أَمِتْ أَمِتْ[٢]:

ئییاسی كوڕی سەلەمە (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: باوكم فەرمووی: لە سەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خودای مەزنی لەسەربێ) لەگەڵ ئەبو بەكردا ڕۆیشتین بۆ غەزا، دروشمی ئێمە لەكاتی شەڕدا وشەی (أَمِتْ أَمِتْ) بوو (أَمِتْ أَمِتْ واتە: بیمرێنە بیمرێنە) (د- سند صالح).

---

[٢] تجريد/ ٣/ ٣٦٠ رقم: بلا رقم = ٣٠٢٩ ، ٣٠٢٨ فتح الباري. مسلم. مغازي: ٤٥١٥. تحفة الأشراف: ١٤٦٧٦. أبو داود. جهاد: ٢٦٣٦. ترمذي. جهاد: ١٦٧٥.

[١] بسند صالح (شرحه).

[٢] بسند صالح (شرحه).

٤٤٧٨- وَعَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ (رضي الله تَعَالَى عنه) قَالَ: كَانَ شِعَارُ الْمُهَاجِرِينَ عَبْدُ اللَّهِ وَشِعَارُ الأَنْصَارِ عَبْدُ الرَّحْمَنِ. رَوَاهُما أبو داود[٣]:

سەمووره (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: دروشمی کۆچکاران عەبدوڵلا بوو وە دروشمی یاریدەدەران عەبدول رەحمان بوو (د- سند صالح).

## ٥٢) ژن و منداڵ و پیرەمێردو بەندە ناکوژرێن

### لا تقتل النساء والصبيان (وكذا الشيخ الهرم والارقاء- شرحه)

٤٤٧٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) قَالَ: وُجِدَتِ امْرَأَةٌ مَقْتُولَةً فِي بَعْضِ مَغَازِي النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَنَهَى عَنْ قَتْلِ النِّسَاءِ وَالصِّبْيَانِ[١]:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لە غەزایێ لە غەزاکانی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربێ) لاشەی ژنێکی کوژراو دۆزرایەوە، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کوشتنی ژن و منداڵی قەدەغە کرد (ش/د/ت).

٤٤٨٠- وَسُئِلَ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عَنْ أَهْلِ الدَّارِ يُبَيَّتُونَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ، فَيُصَابُ مِنْ نِسَائِهِمْ وَذَرَارِيِّهِمْ قَالَ: هُمْ مِنْهُمْ. رَوَاهُما الأربعة[٢]:

لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پرسیارکرا لە بارەی خێزانی ماڵی ئەو هاوبەشپەیداکەرانەوە کە لە شەودا بەسەریاندا دەدرێ و لە شەبەیخووندا ژن و منداڵیان بەردەکەون ئایا بە کوشتن یا بە زامار بوون ئایا حوکمی ئەو ژن و منداڵانە چییە؟ فەرمووی: ئەوانیش لەوانن و لەبەر ناچاری حوکمی کوشتنی ژن و منداڵ و شەڕکەریان لە حاڵی وادا کە ستەمە جیا بکرێنەوە چوون یەکە (ش/د/ت).

٤٤٨١- ← (ب- ٣ز- ١٥ل- ٣٢ف- ٣)[٣].

---

[٣] بسند صالح (شرحه).

[١] تجريد/ ٣/ ٣٥٦ رقم: ١٢٣٤ = ٣٠١٤ ، ٣٠١٥.

[٢] تجريد/ ٣/ ٣٥٥ رقم: ١٢٣٣ = ٣٠١٢ ، ٢٣٧٠ فتح = ١٠٤١ تجريد.

## ٥٣) ئازاردان بە ئاگر بەس بۆ خودا دروستە : (لا يعذب بالنار إلا الله)

٤٤٨٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضی الله عنه) قَالَ: بَعَثَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فِي بَعْثٍ فَقَالَ: إِنْ وَجَدْتُمْ فُلاَنًا وَفُلاَنًا فَأَحْرِقُوهُمَا بِالنَّارِ فَلَمَّا أَرَدْنَا الْخُرُوجَ قَالَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): إِنِّي أَمَرْتُكُمْ أَنْ تُحْرِقُوا فُلاَنًا وَفُلاَنًا وَإِنَّ النَّارَ لاَ يُعَذِّبُ بِهَا إِلاَّ اللَّهُ، فَإِنْ وَجَدْتُمُوهُمَا فَاقْتُلُوهُمَا. رَوَاهُ البخاري وأبو داود والترمذي[1]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پەلێ بووین، پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەربێ) ناردینی بۆ غەزا، فەرمووی: ئەگەر دنیا بوو فیسارو فیسارتان بەرهەوێڵ کەوت بە ئاگر بیان سووتێنن جا کاتێ ویستمان بکەوینە ڕێ، فەرمووی: ئەوە بوو من دەستوورم پێدان کە فیسارە کەس‌و فیسارە کەس بسووتێنن، بەلام هەر بۆ خودا خۆی دروستە کە بە ئاگر سزای دروسکراوانی خۆی بدا دەی ئەگەر تووشیان بوون بە ئاگر مەیان سووتێنن، بەلام بە کوشتن بیانکوژن! (ب/د/ت).

٤٤٨٣- ← (ب- ٤ز- ٤ل- ١٥ف- ١)[٢].

## ٥٤) لچ‌و لێو کردن‌و ئەتك كردنی کوژراو ناڕەوایە : (المثلة حرام)

٤٤٨٤- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ زَيدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: نَهَي النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عَنِ النُّهْبَى وَالْمُثْلَةِ. رَوَاهُ البخاري في الصيد[1]:

عەبدوڵلای کوڕی زەید (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەربێ) تالان‌و بڕۆو لچ‌و لێو کردن‌و ئەتك کردنی هەموو گیانداریێکی قەدەغە کردووە. (ب= بوخاری).

---

[٢] تقدم في مجلد ثالث. تسلسل/ ١٥. رقم/ ٣/ ٢٠٠٨.

[1] تجريد/ ٣/ ٣٥٧ رقم: ١٢٣٥ = ٣٠١٧ ، ٦٩٢٢.

[٢] تقدم في مجلد رابع. تسلسل/ ٤ رقم: ١/ ٢٥٧٤.

[1] بخاری. ذبائح وصيد: ٥٥١٦.

**٤٤٨٥- وَ قَالَ عِمْرَانَ بْنَ حُصَيْنٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ): كَانَ النَّبِيُّ (صَلّٰى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَحُثُّنَا عَلَى الصَّدَقَةِ وَيَنْهَانَا عَنِ الْمُثْلَةِ. رَوَاهُ أبو داود والنسائي[٢]:**

**عیمرانی كوڕی حوصەین (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هەمیشە هانی ئێمەی دەدا كە خێرو خێرات بكەین وەنەهی لێ دەكردین لەوە كە كوژراو ئەتك بكەین (د/ن).**

## ٥٥) پەیمان شكاندن‌و بێ پەیمانی زۆر ناڕەوایە : (الغدر حرام)

**٤٤٨٦- ← (ب- ٣ز- ١٠٤ل- ٢٧٥ف- ٧)[١].**

**٤٤٨٧- وَكَانَ بَيْنَ مُعَاوِيَةَ وَبَيْنَ أَهْلِ الرُّومِ عَهْدٌ وَكَانَ يَسِيرُ فِي بِلاَدِهِمْ فَلَمَّا انْقَضَى الْعَهْدُ أَغَارَ عَلَيْهِمْ فَإِذَا رَجُلٌ عَلَى فَرَسٍ وَهُوَ يَقُولُ: اللّٰهُ أَكْبَرُ وَفَاءٌ لاَ غَدْرٌ وَإِذَا هُوَ عَمْرُو بْنُ عَبَسَةَ فَسَأَلَهُ مُعَاوِيَةُ فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّٰى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَقُولُ: مَنْ كَانَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ قَوْمٍ عَهْدٌ فَلاَ يَحُلَّنَّ عَهْدًا وَلاَ يَشُدَّنَّهُ حَتَّى يَمْضِيَ أَمَدُهُ أَوْ يَنْبِذَ إِلَيْهِمْ عَلَى سَوَاءٍ قَالَ: فَرَجَعَ مُعَاوِيَةُ بِالنَّاسِ. رَوَاهُ الترمذي وأبو داود ولفظ الأخير: مَنْ كَانَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ قَوْمٍ عَهْدٌ فَلاَ يَشُدُّ عُقْدَةً وَلاَ يَحُلُّهَا حَتَّى يَنْقَضِيَ أَمَدُهَا أَوْ يَنْبِذَ إِلَيْهِمْ عَلَى سَوَاءٍ[٢]:**

**جارێ لە نێوانی موعاوییەو خەڵكی ڕۆمدا پەیمانێ هەبوو، بە پێی ئەو پەیمانە موعاوییە حەقی هەبوو كە لەناو وڵاتی ئەواندا،، هاموشۆ بكا، جا كە ماوەی پەیمانەكە بەسەر چوو، موعاوییە بەبێ هۆشیار كردنەوە ویستی پەلاماریان بداو هێرشی برد بۆ سەریان. لەپڕ ئەسپ سوارێ پەیدا بوو، دەیفەرموو ئەڵڵاهو ئەكبەر! پەیمان بەجێهێنان‌و پەیمان بردنە سەر سوننەتی پێغەمبەری خودایە، نەوەك پەیمان شكاندن، كە تەماشایان كرد وا پیاوەكە عەمری كوڕی عەبەسەیە. موعاوییە پرسیاری لێ كرد: مەبەستت**

---

[٢] سكت عن درجته الشارح.

[١] تقدم في مجلد ثالث. تسلسل/ ١٠٤ رقم: ٧/ ٢٤١٧.

[٢] سكت عن درجته الشارح.

چییە؟ فەرمووی: بیستوومە لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: هەر کەسێ لەگەڵ کۆمەڵێکا پەیمانێکی بەست نابێ نە هەڵی وەشێنێتەوە نە مەحکەمتری بکا تا ماوەی ناوبراوی ئەو پەیمانە تێپەڕ دەکا، وە هەتا ئەوانیش ئاگادار دەکاتەوە بۆ جەنگ! گوتی: جا موعاوییە لە هێرشەکە دەستی هەڵگرت‌و خەڵکەکەی گێڕایەوە (ت/د) گفتەی (د): ئەوەی پەیمانێکی هەبوو لەگەڵ هۆزێکدا، نابێ گرێی ئەو پەیمانە تووند بکاتەوە، یا شلی بکاتەوە هەتا ماوەکەی بەسەر دەچێ، جا ئەوسا دەتوانێ کە ئاگاداریان بکاتەوە کە ئامادە بن بۆ شەڕ.

٤٤٨٨- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ حَمَلَ عَلَيْنَا السِّلاَحَ فَلَيْسَ مِنَّا . رَوَاهُ الشيخان[٣]:

دیسان فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوەی چەکمان لێ هەڵبگری لە ئێمە نییە (ش).

## ٥٦) باسی شەشەم: باسی دەست کەوتی جەنگ (تالانی)و باسی چۆنێتی دابەش کردنی:

## الباب السادس: في الغنائم والقسمة

قَالَ الله تعالى: {وَاعْلَمُواْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ إِن كُنتُمْ آمَنتُمْ بِاللّهِ وَمَا أَنزَلْنَا عَلَى عَبْدِنَا يَوْمَ الْفُرْقَانِ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ وَاللّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ} (٨/٤١):

واتە: بزانن ئەوەی بە زەبری شیرو تیرو بە زۆری گوللە وەری بگرن لە کافران ئەوە دەبێ پێنج یەکی ئەو تالانییە لەسەر ئەم یاسایە دابەش بکرێ: ئەو پێنج یەکە دەکرێ بە پێنج بەشی یەکسانەوە، بەشێکی بۆ خوداو پێغەمبەرە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەسەر فەرمانی خودا چۆنی بە باش

---

[٣] بخاري. فتن: ٦٦٦٠. مسلم. إيمان: ٢٧٦ — ٢٧٩. ترمذي. حدود: ١٤٥٩ تحفة الأشراف: ٩٠٤٢.

بزانێ ئەم بەشە دابەش دەکا، بەشێکی تری بۆ خزمەکانی پێغەمبەرە، بەو دەستوورەی کەخۆی فەرموویەتی، بەشێکی تری بۆ هەتیوان‌و هەژاران‌و رێبوارانە. ئەو چوار بەشەکەی تریش لەو تالانییە کە ماون دەدرێ بە جەنگاوەرەکان ئەمە دەستووری دابەش کردنی مالی تالانی غەزایە، ئەگەر بەڕاستی ئێوە موسولمانی تەواون‌و باوەڕتان هەیە بەو شتانەی کە لە رۆژی غەزای بەدردا ئێمە ناردمانن بۆ بەندەی خۆشەویستی خۆمان کە موحەممەدە، ئەو رۆژە پیرۆزەی کەبوو بەهۆی جیاوە بوونی راستی لە ناڕاستی، کە موسولمانان‌و نا موسولمانەکان تیا بەرەنگاری یەك بوون، لەسەر یاریدەی خودا لەشکری ئیسلام سەرکەوت‌و لەشکری بی ئایینی ژێر کەوت.

٤٤٨٩- عَنْ أبي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: غَزَا نَبِيٌّ مِنَ الأَنْبِيَاءِ فَقَالَ لِقَوْمِهِ: لاَ يَتْبَعْنِي رَجُلٌ قَدْ مَلَكَ بُضْعَ امْرَأَةٍ وَهُوَ يُرِيدُ أَنْ يَبْنِيَ بِهَا وَلَمَّا يَبْنِ، وَلاَ آخَرُ قَدْ بَنَى بُنْيَانًا وَلَمَّا يَرْفَعْ سُقُفَهَا، وَلاَ آخَرُ قَدِ اشْتَرَى غَنَمًا أَوْ خَلِفَاتٍ وَهُوَ مُنْتَظِرٌ وِلاَدَهَا، قَالَ: فَغَزَا فَأَدْنَى لِلْقَرْيَةِ حِينَ صَلاَةِ الْعَصْرِ أَوْ قَرِيبًا مِنْ ذَلِكَ فَقَالَ لِلشَّمْسِ: أَنْتِ مَأْمُورَةٌ وَأَنَا مَأْمُورٌ" اللَّهُمَّ احْبِسْهَا عَلَيْنَا فَحُبِسَتْ عَلَيْهِ حَتَّى فَتَحَ اللَّهُ عَلَيْهِ قَالَ: فَجَمَعُوا مَا غَنِمُوا فَأَقْبَلَتِ النَّارُ لِتَأْكُلَهُ فَأَبَتْ أَنْ تَطْعَمَهُ فَقَالَ: فِيكُمْ غُلُولٌ فَلْيُبَايِعْنِي مِنْ كُلِّ قَبِيلَةٍ رَجُلٌ فَبَايَعُوهُ فَلَصِقَتْ يَدُ رَجُلٍ بِيَدِهِ فَقَالَ: فِيكُمُ الْغُلُولُ فَلْتُبَايِعْنِي قَبِيلَتُكَ فَبَايَعَتْهُ فَلَصِقَتْ بِيَدِ رَجُلَيْنِ أَوْ ثَلاثَةٍ فَقَالَ: فِيكُمُ الْغُلُولُ فَأَخْرَجُوا لَهُ مِثْلَ رَأْسِ البَقَرَةِ مِنْ ذَهَبٍ فَوَضَعُوهُ فِي الْمَالِ وَهُوَ بِالصَّعِيدِ فَأَقْبَلَتِ النَّارُ فَأَكَلَتْهُ فَلَمْ تَحِلَّ الْغَنَائِمُ لأَحَدٍ مِنْ قَبْلِنَا، ذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى رَأَى ضَعْفَنَا وَعَجْزَنَا فَطَيَّبَهَا لَنَا . رَوَاهُ الشيخان[1].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: پێغەمبەرێ، لە پێغەمبەران، ویستی بچێ بۆ غەزایێ، بە گەلەکەی خۆی فەرموو: ئەو پیاوەی کە ژنی مارە بڕیوەو دەیەوێ کە بیگوێزێتەوەو

---

[1] تجريد بالكوردي/ ٣/ ٣٨٩ رقم: ١٢٦٥ = ٣١٢٤ ، ٥١٥٧. مسلم. مغازي: ٤٥٣٠. تحفة الأشراف: ١٤٦٧٧ ، ١٤٧٨٠.

هێشتا نەیگوێزاوەتەوە با ئەوە لە گەڵما نەیەت بۆ ئەم غەزایە، هەروەها ئەو کەسەیش کە خانوویەکی دروست کردووەو هێشتا سەری نەگرتووە، هەروەها ئەو کەسەیش کە بزن‌و مەڕوماڵیاتی ئاوسی لەسەر گوانی کڕیوەو چاوەڕوانی زاینیان دەکا. فەرمووی: ئەوجا چوو بۆ غەزاکەو دەمی نوێژی عەصر (یا نزیکی دەمی نوێژی عەصر) لە دێکە نزیکەوە بوو پێغەمبەرەکە بە خۆری فەرموو: تۆیش فەرمانبەری‌و منیش فەرمانبەرم، خوایە! ئەم خۆرە رابگرە بۆمان‌و مەیەڵە ئاوا ببێ هەتا فەرمانی خۆمان ئەنجام دەدەین ئیتر خودا خۆرەکەی راگرت بۆی‌و خۆرەکە ئاوا نەبوو هەتا خودا شارەکەی فەتح کرد بۆی فەرمووی: ئینجا هەرچی تاڵانییان گرتبوو کۆیان کردەوەو لەسەر دەستوورو یاسای پێشینەی پێغەمبەران لە شوێنێکی بەرزی بەرچاو دا خڕیان کردەوەو دایان نا هەتا ئاگر لە ئاسمانەوە بە فەرمانی خودا بێت بیخوا، کەچی ئاگرەکە کە هات چەشکەی نەکرد! ئیتر پێغەمبەرەکە زانی کە گزی‌و دەسپیسی کراوە لە تاڵانییەکە بۆیە فەرمووی: دزیتان لە تاڵانییەکە کردووە بۆیە ئاگرەکە نایخوا! کە وایە با لەهەر خێڵێ پیاوێ پەیمانم بداتێ، جا لەکاتی پەیمان کردنەکەدا دەستی پیاوێ لەسەر خێڵەکان نووسا بە دەستی پێغەمبەرەکەوە، فەرمووی: دزییەکە لەناو ئێوە دایە، با خێڵەکەی تۆ هەموویان بێن یەکە یەکە پەیمانم بدەنێ، کاتێ ئەو خێڵە پەیمانیان دا پێی، دەستی پیاوێ یا دوو پیاو لکا بە دەستی پێغەمبەرەکەوەو دزەکان دۆزرانەوەو فەرمووی: دزییەکە ئێوە کردووتانە، ئەوجا پارچەیێ زێڕیان هێنا بۆ پێغەمبەرەکە، لەسەر شێوەی سەرەگا وابوو ئەویشیان لەسەر ماڵی تاڵانییەکە دانا، کە لەسەر زەوییەکە دانرابوو، ئەوجا ئاگرەکە لە ئاسمانەوە هات‌و هەمووی خوارد! حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لە پێش ئێمەدا خواردنی تاڵانی بۆ کەسی تر حەلاڵ نەبووە، بەلام لە پاشدا خودای پیرۆزو گەورە کەدی حاڵمان کرزەو بی هێزو زەبوونین بەزەوی پیاماندا هاتەوەو بۆی حەلاڵ کردین (ش).

٤٤٩٠- ← (ب- ١ز- ١٤ل- ٧٧ف- ١)[٢].

٤٤٩١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَا أُعْطِيكُمْ وَلاَ أَمْنَعُكُمْ، أَنَا قَاسِمٌ أَضَعُ حَيْثُ أُمِرْتُ . رَوَاهُ البخاري وأبو داود[٣]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بەخشین‌و نەبەخشین بە دەستی من نییە واتە: بەخشینی شتێ بەکەسێ‌و نە بەخشینی ئەو شتە بە کەسێکی تر ئەوە بە دەست من نییەو هەر بە دەست خودا خۆیەتی‌و بەس بەڵام من بەپێی فەرمانەکەی خودا کە بە منی دەکا شتەکەتان لێ دابەش دەکەم‌و بەس! (ب/د).

٤٤٩٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله عنهما) قَالَ: بَعَثَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) سَرِيَّةً إِلَى نَجْدٍ فَخَرَجْتُ فِيهَا فَأَصَبْنَا إِبِلاً وَغَنَمًا فَبَلَغَتْ سُهْمَانُنَا اثْنَيْ عَشَرَ بَعِيرًا اثْنَيْ عَشَرَ بَعِيرًا، وَنُفِّلْنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بَعِيرًا بَعِيرًا. رَوَاهُ الثلاثة[٤]:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودا لە خۆی‌و بابی) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) پەلێکی نارد بەرەو نەجد بۆ غەزا، من خۆم لە ناویاندا بووم، ڕانە وشترو گەلەیەکی زۆرمان بە تاڵان گرت، گشتمان هەریەکی سەرو دوازدە وشتر پشکمان بەرکەوت، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) هەریەکی سەرو وشتری (بە زیادە) داینێ (ش/د).

٤٤٩٣- وَعَنْهُ قَالَ: بَعَثَنَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فِي جَيْشٍ قِبَلَ نَجْدٍ وَانْبَعَثَتْ سَرِيَّةٌ مِنَ الْجَيْشِ فَكَانَ سُهْمَانُ الْجَيْشِ اثْنَيْ عَشَرَ بَعِيرًا، وَنَفَّلَ أَهْلَ السَّرِيَّةِ بَعِيرًا بَعِيرًا فَكَانَ لِكُلٍ مِنْهُمْ ثَلاَثَةَ عَشَرَ. رَوَاهُ أبو داود والبخاري[٥]:

---

[٢] تقدم برقم: ١/ ٩٨ مجلد أول. تسلسل/ ١٤.

[٣] تجريد البخاريم ٣/ ٣٨٨ رقم: ١٢٦٣ = ٣١١٧ فتح الباري.

[٤] بخاري. فرض الخمس: ٣١٣١ ، ٣١٣٢. مسلم. مغازي: ٤٥٣٣ — ٤٥٣٧. أبو داود. جهاد: ٢٧٤٤.

[٥] مسلم. مغازي: ٤٥٣٤. أبو داود. جهاد: ٢٧٤٤. بخاري. فرض الخمس: ٣١٣١.

دیسان ئەو (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەشکرێکی بەرەو نەجد نارد بۆ غەزا، خۆمیان تیادا بووم، پەلێ لە لەشکرەکە جوێ بوونەوەو چوون بۆ غەزاو تالانێکی زۆریان دەست کەوت کاتێ بەش بەشیان کرد لەناو خۆیاندا پشکی هەریەکێ لە لەشکرەکە دوازدە وشتر بوو، وە تاقمەی پەلەکەیش پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) یەکی سەرو وشتری تری زیادە داپێیان، جا ئەوان یەکی سیازدە وشتریان پێ برا (د/ب).

٤٤٩٤- وَعَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَسَمَ فِي النَّفَلِ لِلْفَرَسِ سَهْمَيْنِ وَلِلرَّجُلِ سَهْمًا. رَوَاهُ الأربعة[٦]:

دیسان فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) جارێ دەست کەوتی جەنگی دابەش کرد لەسەر ئەم شێوەیە: دوو پشکی دانا بۆ چارەواو یەك پشکی بۆ پیاو (ش/د/ت) لە گێڕانەوەیەکا: (لەسەر فەرمایشتی راڤەکە) سێ پشکی دانا بۆ سوارە، پشکێ بۆ خۆی‌و دوو پشك بۆ ماینەکەی! واتە: پیادە یەك پشکی دەکەوێ.

## ٥٧) نەفل (واتە: ماڵی تالانی کە لە ناموسوڵمانان وە دەست دەکەوێ): النَّفَلِ

٤٤٩٥- لە بەرگی شەشدا لە سوورەتی (ئەنفال)دا رابورد، یەکەم فەرمووده[١].

٤٤٩٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) قَالَ أَنَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ يَوْمَ بَدْرٍ: مَنْ فَعَلَ كَذَا وَكَذَا فَلَهُ مِنَ النَّفْلِ كَذَا وَكَذَا، فَتَقَدَّمَ الْفِتْيَانُ وَلَزِمَ الْمَشْيَخَةُ الرَّايَاتِ فَلَمْ يَبْرَحُوهَا فَلَمَّا فَتَحَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ قَالَتِ الْمَشْيَخَةُ: كُنَّا رِدْءًا لَكُمْ لَوِ انْهَزَمْتُمْ

---

[٦] مسلم. مغازي: ٤٥٦١. ترمذي. سير: ١٥٥٤.

[١] سبق في مجلد سادس. سورة الأنفال. تسلسل/ ٩ رقم: ١/ ٣٨٧٥. مسلم. مغازي: ٤٥٣١ ، ٦١٨٨ ، ٦١٨٩. أبو داود. جهاد: ٢٧٤٠. ترمذي. تفسير: ٣٠٧٩.

لَفِئْتُمْ إِلَيْنَا، فَلاَ تَذْهَبُوا بِالْمَغْنَمِ وَنَبْقَى، فَأَبَى الْفِتْيَانُ وَقَالُوا: جَعَلَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) لَنَا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: يَسْأَلُونَكَ عَنِ الأَنْفَالِ قُلِ الأَنْفَالُ لِلَّـهِ والرسـول. رَوَاهُ أبـو داود والحاكم[٢]:

ئیبنـو عـەبباس (خودایان لێ رازی بێ) فـەرمووی: لـە رۆژی غـەزای بـەدردا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوەی واوا بکا ئەوەندەو ئەوەندەی زیادە بەش لە تالآن دەدرێتی! ئیتر کوڕە گەنجەکان کەوتنە خۆیـان و رۆیشتنە پێشەوەو چوونە نـاو کۆڕی جەنگـەوەو، پیرەکـان لـە دەوری ئالاکـان مانـەوەو لـەوێ نـەبزووتن! کاتـێ کـە خـودا زاڵـی کـردن بەسـەر کافرەکانـدا، لاوەکـان گوتیـان: ئێمـە جـەنگمان کـردووە، تالآنەکـە هـی ئێمەیـە، پیرەکـانیش گوتیـان: ئێمە پشتی ئێوەمان گرتبوو، ئەگەر خوانەخواستە ئێوە بشکانایە دەهاتنـەوە بۆ لای ئێمە، جا کەوابێ نابی هەموو تالآنەکە ببەن بۆ خۆتان و ئێمەیش بـەبێ بەش بمێنینەوە!

بـەڵام گەنجـەکان قاییـل نـەبوون و گوتیـان: پێغەمبـەر خـۆی (دروودی خودای لەسەربێ) داوێتی بە ئێمە. جا لەپاش ئەم بگرەو بەردەیـە خـودای گـەورەو مـەزن ئەمەی نـاردە خـوارەوە: {يَسْأَلُونَكَ عَنِ الأَنفَالِ قُلِ الأَنفَالُ لِلّهِ وَالرَّسُولِ} (تەفسیری ئەم ئایەتە لە سوورەتی ئەنفالدا رابوورد) (د/حاكم).

٤٤٩٧- وَقَالَ ابْنِ عُمَرَ (رضى الله تَعَالَى عنهما كَانَ النَّبِيِّ (صلى الله تَعَالَى عليه وسلم) يُنَفِّلُ بَعْضَ مَنْ يَبْعَثُ مِنَ السَّرَايَا لأَنْفُسِهِمْ خَاصَّةً سِوَى قِسْمِ عَامَّةِ الْجَيْشِ. رَوَاهُ الثلاثة[٣]:

ئیبنـو عوەر (رەزای خودایان لێ بێ) فـەرمووی: جـاران پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەربێ) زیادە بەشی تایبەتی دەدا، بەهەندێ لەو پەل و لقانەی کە دەیناردن بۆ غەزا، سەرەڕای ئەو بەشەیش کە دەیدا بە گشت کەسێ لە سوپاکە (ش/د).

---

[٢] سكت عن درجته الشارح.

[٣] بخاري. فرض الخمس: ٣١٣٥. مسلم. مغازي: ٤٥٤٠. أبو داود. جهاد: ٢٧٤٦.

## ٥٨) سەربەش دەبێ لەپاش جیاکردنەوەی پێنج یەك بێ:
## التنفيل بعد التخميس

٤٤٩٨- عَنْ حَبِيبِ بْنِ مَسْلَمَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يُنَفِّلُ الرُّبُعَ بَعْدَ الْخُمُسِ وَالثُّلُثَ بَعْدَ الْخُمُسِ إِذَا قَفَلَ. رَوَاهُ أبو داود والترمذي[1]:

حەبیبی کوڕی مسلمە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) کاتێ لە غەزا دەگەڕایەوە، لە پێشدا پێنج یەکی جیا دەکردەوە لە تالانەکە بۆ پێنج تاقمەکە بەپێی ئایەتی: (وَاعْلَمُواْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ) تا کۆتایی، گەلێ جاریش شەڕ کەرەکە چەندی پشك بەر دەکەوت، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) چوار یەکی ئەوەیشی، یا سێیەکی ئەوەیشی، بەسەر بەش دەدا پێی! (د- سند صالح- ت) سەر بەش: زیادە بەش، لە کوردیدا دەڵێین: ماڵەکەی سەر بەشی مالان بێ. (وەرگێڕ).

## ٥٩) پێشەوا (سەرۆکی موسوڵمانان) خۆی سەرەوکاری دابەش کردنی پێنج یەکی ماڵی تالانی دەکاو ئەندازەی بەشی ئەم پێنج تاقمە هەواڵەی بیروڕای ئەو دەکرێ: (الأمام يتولى خمس الغنيمة)

٤٤٩٩- عَنْ عَمْرِو بْنَ عَبَسَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إِلَى بَعِيرٍ مِنَ الْمَغْنَمِ فَلَمَّا سَلَّمَ أَخَذَ وَبَرَةً مِنْ جَنْبِ الْبَعِيرِ ثُمَّ قَالَ: وَلاَ يَحِلُّ لِي مِنْ غَنَائِمِكُمْ مِثْلُ هَذَا إِلاَّ الْخُمُسَ وَالْخُمُسُ مَرْدُودٌ فِيكُمْ. رَوَاهُ أبو داود والنسائي[1]:

عەمری کوڕی عەبەسە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لەلای وشترێکا (لە ماڵی تالانییەکە) نوێژی بۆ کردین، کە سڵاوی دایەوە تەڵێ تووکی لە تەنیشتی وشترەکە هەڵگرت فەرمووی: پێنج یەکی لێ دەرچێ ئا ئەم تەڵە مووە چییە، لە دەست کەوتی ماڵی تالانی ئێوە بە من

---

[1] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

[1] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

حەڵاڵ نییە، لە هەمان کاتا ئەو پێنج یەکەیش دیسان هەر دەگەڕێتەوە بۆ خۆتان (د- سند صالح- ن).

٤٥٠٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ تَعَالَى عَنْهُمَا) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ لِوَفْدِ عَبْدِ الْقَيْسِ: آمُرُكُمْ أَنْ تُؤَدُّوا خُمُسَ مَا غَنِمْتُمْ . رَوَاهُ الترمذي والبخاري طويلاً[٢]:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بە نوێنەرەکان (وفد)ی خێڵی عەبدولقەیسی فەرموو: فەرمانتان پێ دەکەم کە پێنج یەکی ئەو تالانییەی کە بەشەڕ وەری دەگرن لە نا موسوڵمانەکان بیدەن بە سەرۆکی موسوڵمانان، هەتا ئەو بەپێی ئایەتەکەی پێشەوە دابەشی بکا بەسەر ئەو پێنج تاقمە دا (ت/ب).

٤٥٠١- عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: مَشَيْتُ أَنَا وَعُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَعْطَيْتَ بَنِي الْمُطَّلِبِ وَتَرَكْتَنَا وَنَحْنُ وَهُمْ مِنْكَ بِمَنْزِلَةٍ وَاحِدَةٍ فَقَالَ: إِنَّمَا بَنُو الْمُطَّلِبِ وَبَنُو هَاشِمٍ شَيْءٌ وَاحِدٌ[٣]:

جوبەیری کوڕی موطعیم (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: من‌و عوثمانی کوڕی عەففان چووینە لای حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) عەرزیمان کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! لە پێنج یەکی پێنج یەك (خمسولخومس) بۆچی بەشی بەرەبابی بەنیلموطلیب دەدەی کەچی بەشی ئێمە نادەی، وەلحاڵ ئێمەو ئەوان هەرسێ لامان بۆ تۆ وەك یەکین‌و بۆ خزمایەتی لە یەك پایە داین؟ فەرمووی (درودی خودای لەسەربێ): ئاخر بەرەبابی بەنیلموطەلیب‌و بەرە بابی بەنی هاشم یەك شتن لەبەرئەوەی کە لە سەردەمی پێش هاتنی ئیسلام‌و لەدوا هاتنی ئیسلامەوە پشتی یەکیان گرتووەو پشتی یەکیان بەرنەداوەو هەمیشە لە خۆشی‌و ناخۆشیدا وەك یەك بوون‌و هاوبەشی

---

[٢] بخاري. فرض الخمس: ٣٠٩٥.

[٣] بخاري. فرض الخمس: ٣١٤٠ ، ٣٥٠٢ ، ٤٢٢٩.

خۆشی‌و ترشی یەك بوون (ب/د) هاشم‌و موطلیب‌و عەبدوشەمس‌و نەوفل چوار برا بوون، باوکیان عەبدو مەنافە، پێغەمبەر خۆی لە بەرەبابی هاشمە، عوثمان لە بەرەبابی عەبدوشەمسە، جوبەیر لە بەرەبابی نەوفەلە. (وەرگێڕ).

٤٥٠٢- وَعَنْهُ قَالَ: لَمْ يَقْسِمِ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِبَنِي عَبْدِ شَمْسٍ وَلاَ لِبَنِي نَوْفَلٍ[٤]:

دیسان جوبەیر (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) نەبۆ بەرەبابی عەبدو شەمس‌و نەبۆ بەرەبابی نەوفەل لە پێنج یەکی پێنج یەك بەشی دانەدەنا (ب/د).

٤٥٠٣- قَالَ ابْنُ إِسْحَاقَ: وَعَبْدُ شَمْسٍ وَهَاشِمٌ وَالْمُطَّلِبُ إِخْوَةٌ لأُمٍّ وَأُمُّهُمْ عَاتِكَةُ بِنْتُ مُرَّةَ وَكَانَ نَوْفَلٌ أَخَاهُمْ لأَبِيهِمْ. رَوَاهُما البخاري وأبو داود[٥]:

موحەممەدی کوڕی ئیسحاق (مەشهوور بە ئیبنو ئیسحاق، خاوەنی پەڕتووکی ئەلمەغازی) دەڵێ: عەبدو شەمس‌و هاشم‌و موطلیب برای باوك‌و دایکی بوون دایکیان ناوی عاتیکەی کچی موڕە بووە، باوکیان عەبدو مەناف بووە، کە باپیری سێیەمی پێغەمبەر بووە، نەوفەلیش لە باوکەوە برایان بووە ئەمیش کوڕی عەبدومەنافە وەڵێ دایکی جیایە، ناوی واقیدەی کچی عەمرە (ب/د).

لە صەحیحی بوخاریدا: فەرموودەی (٣) و (٤) لە (کیتابی مەغازی)دا بە موسنەدو بە یەك سەنەد ریوایەت کراون، واتە: هەردوکیان لەوێ یەك حەدیثن. بەڵام لە (کیتابی خومس)دا فەرموودەی (٤) بە تەعلیق،، ریوایەت کراوە، هەروا فەرموودەی ژمارە پێنجیش بە تەعلیق ریوایەت کراوە. جا لەبەرئەوەی فەرموودەی (٣) و (٤) لە راستیدا یەك حەدیثن دانەر (بە رەحمەت بێ) لەگەڵ فەرموودەی (٥)دا داینـاون بە دوو فەرموودە وەڵێ من سێ ژمارەم بۆ دانان، چونکە دانەر سێیەم‌و چوارەمی بە دیمەن بە دوو فەرموودە داناوە(١).

---

[٤] راجع الرقم السابق = ٣١٤٠.

[٥] راجع الرقم السابق = ٣١٤٠ ، ٣٥٠٢ ، ٤٧٢٩.

(١) **تێبینییەک:**

**گەلێ هەوڵم داوە کە ئەم کتێبە پیرۆزە بەهۆی تەرجەمەکەی منەوە هەڵەی تێ نەکەوێ، بگرە بەتەمای ئەوە بووم کە ئەم تەرجەمەی من بۆ کەسێ‌ا عەرەبی بزانێ لە جیاتی شەرحێکی کورتی پوخت بێ لە شێوەی (جەلالەین) بۆ تەفسیری قورئانی پیرۆز، هەرچەند لە خودا بەزیاد بێ و لە لوتف و کەرەمی کەم نەبی ئەمە تا رادەیی وایە، بەلام داخەکەم بەهۆی هەڵەی چاپەوە کەمتابیێژێ هەڵەی تیا پەیدا بوو. بە تایبەتی لە خاڵبەندیدا وەك لابردنی کەوانەکان و هەڵەی زۆر لە ژمارەی زنجیرەو لاپەڕەو بەرگی فەرموودە دووبارەوەکاندا. هەر فەرموودەیێ ژمارەی زنجیرەکەی نووسرابێ، ئەگەر لە شوێنی ناوبراوی خۆیا هەڵە بوو ئەوا بە جەمع و طەرح دەدۆزرێتەوە، بۆ نموونە ← (ب- ٢ز- ١٩١ل- ف- ١) هەڵەیە، کە سەیری بەرگی دوو دەکەین دوا زنجیرەی (١٨٥)ە. جا ئاوا دەیدۆزینەوە: ٢٢٩+ ١٨٥+ ١٣٥+ ١٢٠+ ٩٤+ ١٨+ ٩٢+ ١٠٥= ٩٨= سەرجەمی ژمارەکانی زنجیرەکانی بەرگی یەك و سێ و چوارو پێنج و شەش و حەوت و هەشت. دەڵێین: بەرگی دوو لەیەکەوە تیایەتی هەتا (١٨٥) کەواتە ١٩١-١٨٥= ٦. کەواتە: بەرگی دوو شەش زنجیرەی زیادە، لە زنجیرە (١٨٦)ەوە هەتا (١٩١)وە ئەم شەشە زنجیرە دەکەونە سەرەتای بەرگی سێیەمەوە، کەواتە زنجیرەی ئەم فەرموودەیە لە سەرەتای بەرگی سێیەمدایە، وە لەوێ زنجیرە (٦)ە لەبەرئەوەی ژمارەی فەرموودەکە ناگۆڕێ، کە زنجیرەکەمان دۆزییەوە فەرموودەکەش دەدۆزینەوە کە فەرموودەکەشمان زانی ژمارەی لاپەڕەکەیشی دەزانین. کەواتە ئەم رەمزە کەوا لە بەرگی سێیەم، لاپەڕە (٢٢٠)دا کە ئاوایەو هەڵەیە ← (ب- ٢ز- ١٩١ل- ف- ١) ئەمە راستەکەیەتی: ← (ب- ٣ز- ٦ل- ١٥ف- ١) ئیتر هەروا. سوپاس بۆ خودا لەم چاپە نوێیەدا ئەم هەلانەم بەسەر گرتۆتەوەو هەمووم راست کردۆتەوە. جا خودا بکا ئەمجارە لە هەڵەی چاپ رزگار ياربێ. (وەرگێڕ).**

## ٦٠) فەیا (فییء: واتە: مفتە ماڵ): (الفَيْء)

قَالَ الله تعالى: {مَّا أَفَاء اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْ أَهْلِ الْقُرَى فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ - صدق الله العظيم - ٧/٥٩}:

واتە: ئەو مفتە ماڵەی کە خودای گەورە بەبێ ئارەق ڕەخساندی بۆ پێغەمبەری خۆی، لە تاڵانی دێهاتی دەورو بەری مەدینەی پیرۆز، وەکوو ماڵی تاڵانی وڵاتی جوولەکەکانی بەنی نەزیر، ئەوە ئەوەو وێنەی ئەوە هەمووی ساخ بۆ خوداو پێغەمبەری خوداو خزمانی پێغەمبەرو هەتیوان‌و هەژاران‌و ڕێبواری بێ خەرجی‌و بێ دەرەتانە.

٤٥٠٤- ← (سوورەتی حەشر. بەرگی حەوتەم فەرموودەی سێیەم)[1].

٤٥٠٥- عَنْ أبي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: أَيُّمَا قَرْيَةٍ أَتَيْتُمُوهَا وَأَقَمْتُمْ فِيهَا فَسَهْمُكُمْ فِيهَا، وَأَيُّمَا قَرْيَةٍ عَصَتِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَخُمُسَهَا لِلَّهِ وَلِرَسُولِهِ ثُمَّ هِيَ لَكُمْ . رَوَاهُ مسلم وأبو داود[2]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر گوندێ بەبێ شەڕو شۆڕ گرتتان‌و چوونە ناوی، ئەوەی کە لەو گوندە دەستتان دەکەوێ دادەنرێ بە مفتەماڵ‌و بە پێی یاسای مفتەماڵ لێتان دابەش دەکرێ، بەڵام هەر گوندێ لە خوداو پێغەمبەری خودا یاخی بوو، تا لە ئەنجامدا بە شەڕ دەیگرن ئەوە پێنج یەکی تاڵانییەکەی بۆ خوداو پێغەمبەری خودایە، ئەوجا چی لە پێنج یەك مایەوە بۆ ئێوەیە (م/د).

٤٥٠٦- وَقَالَ عُمَرُ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ): مَا أَنَا أَحَقُّ بِهَذَا الْفَيْءِ مِنْكُمْ وَمَا أَحَدٌ مِنَّا بِأَحَقَّ بِهِ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ أَنَّا عَلَى مَنَازِلِنَا مِنْ كِتَابِ اللَّهِ تَعَالَى وَقَسْمِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَالرَّجُلُ وَقَدَمُهُ وَالرَّجُلُ وَبَلاَؤُهُ وَالرَّجُلُ وَعِيَالُهُ وَالرَّجُلُ وَحَاجَتُهُ[3]:

---

[1] تقدم في مجلد سابع. تفسير سورة الحشر. برقم: ٤١٥٨/٣.

[2] مسلم. مغازي: ٤٥٤٩. أبو داود. خراج: ٣٠٣٦ تحفة الأشراف: ١٤٧٢٠.

[3] واه أبو داود في الخراج بسند صالح (شرحه).

عومەر (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: ئەم مفتەماڵە بۆ من‌و بۆ ئێوە چون یەکە من کە پێشەوای موسوڵمانانم بەقەد یەکێ لە ئێوە بەشم دەکەوێ لەم ماڵە، بەڵام ئەوەندە هەیە هەر کەسێ لە ئێمە لەسەر بەشی خۆیەتی بە پێی نامەی خودای گەورە، واتە: ئەو بەشەی دەدرێتێ کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بۆی داناوە بە پێی پایەو پلەی خۆی، ئیتر هەموو پیاوێ بە پێی پایەو شانی خۆی ڕێزی دەگیرێ‌و پشکی بۆ دادەنرێ، وەك ئەوە پیاو هەیە لە مێژەوە ئیسلام بووەو پێش دەستی لە موسوڵمانەتی‌دا هەیە، پیاو هەیە زەحمەتی کێشاوەو ئازاری دیوە، پیاو هەیە خێزانداره، هەیە سەڵتە، هەیە ئاسوودەیە، هەیە هەیەتی هەیە نییەتی‌و ئاتاجەو لێقەوماوە، دەبێ هەر کەسەیان بە پێی پێداویستی خۆی پشکی بۆ دابنرێ (د- سند صالح).

٤٥٠٧- وَدَخَلَ أبْن عمر عَلَى مُعَاوِيَةَ فَقَالَ: حَاجَتُكَ يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ فَقَالَ: عَطَاءُ الْمُحَرَّرِينَ، فَإِنِّي رَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَوَّلَ مَا جَاءَهُ شَيْءٌ بَدَأَ بِهِمْ[٤]:

ئیبنو عومەر (خۆشنوودی خودای لەسەر) لە دیوە خان چوو بۆلای موعاوییە، پێی گوت: ئەی باوکی ئەورەحمان! بفەرموو بۆچی هاتووی پێویستیت چییە بیڵێ. فەرمووی: تکام وایە کە بەرات‌و بەخششی بەندە ئازادکراوەکان بدەی، چونکە من خۆم دیومە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە شتێکی بۆ دەهات لە پێش هەموو شتێکا بەشی ئەوانی دەدا (د- سند صالح).

٤٥٠٨- وَقَالَ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ (رضي الله تَعَالَى عنه): كَانَ النَّبِيُّ (صلى الله تَعَالَى عليه وسلم) إِذَا أَتَاهُ الْفَيْءُ قَسَمَهُ فِي يَوْمِهِ فَأَعْطَى الآهِلَ حَظَّيْنِ وَأَعْطَى الْعَزَبَ حَظًّا. رَوَاهُ الثلاثة أبو داود في الخراج[٥]:

---

[٤] رواه أبو داود في الخراج بسند صالح (شرحه).

[٥] رواه أبو داود في الخراج بسند صالح (شرحه).

عەوفی كوڕی مالیك (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) كە مفتە ماڵی بۆ دەهات هەر ئەو ڕۆژە دابەشی دەكرد، دوو بەشی دەدا بە خێزاندارو یەك بەشی دەدا بە سەڵت (د- سند صالح).

## ٦١) سەرگوڵی تالانی هی پێغەمبەرە (دروودی خودای لەسەر) باسی ئەو ماڵەی لەپاش پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر) بەجێماوە

## صفايا النَّبِيِّ ﷺ وما تركه

٤٥٠٩- عَنْ عُمَرُ (رضي الله عنه) قَالَ: كَانَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثَلاَثُ صَفَايَا: بَنُو النَّضِيرِ وَخَيْبَرُ وَفَدَكُ: فَأَمَّا بَنُو النَّضِيرِ فَكَانَتْ حُبْسًا لِنَوَائِبِهِ وَأَمَّا فَدَكُ فَكَانَتْ حُبْسًا لأَبْنَاءِ السَّبِيلِ وَأَمَّا خَيْبَرُ فَجَزَّأَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثَلاَثَةَ أَجْزَاءٍ، جُزْءَيْنِ بَيْنَ الْمُسْلِمِينَ وَجُزْءًا نَفَقَةً أَهْلِهِ فَمَا فَضَلَ مِنْهُم جَعَلَهُ بَيْنَ فُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ. رَوَاهُ أبو داود[1]:

عومەر (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: حەزرەت خۆی (دروودی خودای لەسەربێ) سێ پشكی هەڵبژاردەی هەبوو: بەنی نەضیرو خەیبەرو فەدەك بوون، دەسكەوتی وڵاتی بەنی نەضیر تەرخان كرابوو بۆ دیوەخان‌و میوان‌و چەك‌و تفاق‌و وڵاخ‌و دەسگیرۆدەیی ئەم‌و ئەو، فەدەكیش تەرخان كرابوو (واتە: وەقف كرابوو) بۆ كۆمەكی ڕێبواران، دەستكەوتی خەیبەریش پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەربێ) دەیكرد بەم سێ بەشەوە: دوو بەشی دەبەخشییەوە بە ناو موسوڵمانانداو لەو بەشەكەیشی ژێوارو ئازوخەی خێزانەكەی لێ دەدا، وەچی لەوان دەمایەوە لەم بەشە دەیدا بە هەژارانی كۆچكاران (د- سند صالح).

٤٥١٠- ← (ب- ٣ز- ١٠ل- ٢٤ف- ٢)[2].

---

[1] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

[2] تقدم في مجلد ثالث. تسلسل/١٠/ برقم: ٢/ ١٩٩٦.

لێرەدا جیاوازییەکی هەیە بەم جۆرەیە: ئەوجا ئەبو بەکر فەرمووی: هەرچیش پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) رەفتاری پێکرد بێ چاو لەو دەکەم و واز لە هیچی ناهێنم، چونکە دەترسم ئەگەر خوا نەکەران پەیرەوی تەواوی ئەو نەکەم لە رێگەی راست لادەم و لاڕێ بگرم. فاتیمە (خودای لێ رازی بێ) داوای بەشی خۆی لە میراتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەکرد، لەهی ئەو خێرو صەدەقەیەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە لە مەدینە بوو (کە برێتی بوو لە بەرو بوومەکانی بەنی نەضیر) وە لەهی خەیبەرو فەدەکیش، خێرەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە لە مەدینە بوو، عومەر (لەکاتی جێنشینی خۆیدا) دایەوە بە عەلی و عەبباس، وەلێ عەلی لە عەبباسی داگیر کرد بۆ خۆی! بەڵام عومەر خەیبەرو فەدەکی هێشتەوە بە دەست خۆیەوە و فەرمووی: ئەم دوانە خێرو صەدەقەی پێغەمبەر خۆی بوون، داینابوون بۆ مەسرەف و ژێواری خێزان و میوانی و دەست گیرۆدەیی رێبوارو لێقەوماوان و داماوانی پێ دەکردن. لەبەر ئەوە سەرەو کاری ئەم دوانە بە دەستی ئەو کەسەیە کە دەبێ بە فەرمانڕەوای موسوڵمانان. گوتی: ئێستایش ئەم دوو شوێنە هەتا ئەمڕۆکەیش هەر بەم جۆرە ماون (ش/د/ت).

٤٥١١- ← (ب- ٣ز- ١٠ل- ٢٤ف- ٢)[٣].

٤٥١٢- وَ قَالَتْ عَائِشَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهَا): تُوُفِّيَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَمَا فِي بَيْتِي مِنْ شَيْءٍ يَأْكُلُهُ ذُو كَبِدٍ إِلاَّ شَطْرُ شَعِيرٍ فِي رَفٍّ لِي فَأَكَلْتُ مِنْهُ حَتَّى طَالَ عَلَيَّ فَكِلْتُهُ فَفَنِيَ. رَوَاهُ البخاري[٤]:

عائیشە (رەزای خودای گەورەو مەزنی لەسەر بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودو سڵاوو میهرەبانی خودای گەورەی لێ بێ) کاتێ کۆچی دوایی کرد، ئەوەی گیاندار پێی بژی لە

---

[٣] تقدم في مجلد ثالث. تسلسل/١٠/ برقم: ٢/ ١٩٩٦.

[٤] بخاري. فرض الخمس: ٣٠٩٧ ، ٦٤٥١.

ماڵما نەبوو، تەنیا هەنێ جۆ نەبێ کە لە رەفەیەکی خۆمابوو، هەتا ماوەیەکی زۆر زۆر هەرلێم دەخواردو هەر تەواو نەدەبوو، تا چووم پێوام ئیتر تەواو بوو.

→ (ب-٣ ز-١٠ ل-٢٤ ف-١ + ٢ + ز-١١ ل-٢٥ ف-٢) + (ب-٤ ز-١٠٦ ل-٣٤٤ ف-٤). راجع مجلد/٤ تسلسل/١٠٦ رقم٤/٣١٧٩ ومجلد/٣ تسلسل/١٠ رقم/١٩٩٥/١ ورقم/١٩٩٦/٢ وتسلسل/١١ رقم/١٩٩٨/٢.

## ٦٢) کەسێ لە غەزادا ناموسوڵمانێ بکوژێ تفاق‌و کەلوپەلەکەی رووت دەکاتەوەو دەیبا بۆ خۆی : (مَنْ قَتَلَ قَتِيلاً فَلَهُ سَلَبُهُ)

٤٥١٣- عَنْ أَبِى قَتَادَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِىِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عَامَ حُنَيْنٍ فَلَمَّا الْتَقَيْنَا كَانَتْ لِلْمُسْلِمِينَ جَوْلَةٌ فَرَأَيْتُ رَجُلاً مِنَ الْمُشْرِكِينَ قَدْ عَلاَ رَجُلاً مِنَ الْمُسْلِمِينَ، فَاسْتَدَرْتُ حَتَّى أَتَيْتُهُ مِنْ وَرَائِهِ فَضَرَبْتُهُ بِالسَّيْفِ عَلَى حَبْلِ عَاتِقِهِ فَأَقْبَلَ عَلَيَّ فَضَمَّنِى ضَمَّةً وَجَدْتُ مِنْهَا رِيحَ الْمَوْتِ ثُمَّ أَدْرَكَهُ الْمَوْتُ فَأَرْسَلَنِى فَلَحِقْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ فَقَالَ: مَا لِلنَّاسِ (لِمَ إِنْهَزَمَ النَّاسُ)؟ فَقُلْتُ: أَمْرُ اللَّهِ (قضاء الله النافذ). ثُمَّ إِنَّ النَّاسَ رَجَعُوا وَجَلَسَ النَّبِىُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: مَنْ قَتَلَ قَتِيلاً لَهُ عَلَيْهِ بَيِّنَةٌ فَلَهُ سَلَبُهُ، فَقُمْتُ فَقُلْتُ مَنْ يَشْهَدُ لِى ثُمَّ جَلَسْتُ فَقَالَ مَنْ قَتَلَ قَتِيلاً لَهُ عَلَيْهِ بَيِّنَةٌ فَلَهُ سَلَبُهُ، فَقُمْتُ فَقُلْتُ: مَنْ يَشْهَدُ لِى ثُمَّ جَلَسْتُ ثُمَّ قَالَ تِلْكَ الْمقالَةَ فَقَالَ رَجُلٌ. صَدَقَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَسَلَبُهُ عِنْدِى فَأَرْضِهِ عَنِّى فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ (رضى الله عنه): لاَهَا اللَّهِ إِذًا يَعْمِدُ إِلَى أَسَدٍ مِنْ أُسْدِ اللَّهِ يُقَاتِلُ عَنِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ يُعْطِيكَ سَلَبَهُ فَقَالَ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): صَدَقَ فَأَعْطَاهُ إِيَّاه. قَالَ فَأَعْطَانِي، فَبِعْتُ الدِّرْعَ فَابْتَعْتُ بِهِ مَخْرِفًا فِى بَنِى سَلِمَةَ فَإِنَّهُ لأَوَّلُ مَالٍ تَأَثَّلْتُهُ فِى الإِسْلاَمِ. رَوَاهُ الأربعة[1]:

ئەبو قەتادە (خۆشنوودی خودای گەورەی لەسەر بێ) فەرمووی: لەساڵی غەزای حونەیندا، کە لەگەڵ حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەربێ) دەرچووین، کاتێ

[1] بخاري. بيوع: ٢١٠٠ ، ٣١٤٢ ، ٤٣٢١ ، ٧١٧٠. مسلم. مغازى: ٤٥٤٣. ترمذي. سير: ١٥٦٢.

بەرەنگاری ناموسوڵمانەکان بووین لە سەرەتاوە موسوڵمانەکان زاڵ بوون و سەریێ دوان سەرکەوتن، پیاوێکم دی (لە بتپەرستەکان) پیاوێکی موسوڵمانی دابوو بە زەویداو لەسەری دانیشتبوو، دەیویست بیکوژێ، منیش سووڕێکم بۆ خواردو لە پشتیەوە بۆی چووم و شمشێرێکم مالی بەسەر نەڕەی شانیدا گەیاندمە سەر جێگەی کاریگەری، لەگەڵ ئەوەیشا پەلاماری دام و باوەشی پیاما کردو بە گوشینێکی وا گوشیمی مردنم بە چاوی خۆم دی، بەڵام ئیتر کەوتە گیانەڵاو تلیسایەوەو منی بەردا. بەرەبەرە سوپای ئیسلام شکستیان تێ کەوت منیش رام کرد، لەڕێ گەیشتم بە عومەری کوڕی خەططاب (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: ئەوە ئەو خەڵکە چییانە بۆ وا شکان؟ گوتم: فەرمانی خودا وابوو، چارەنووسی خودایی رەتبوونەوەی نییە! لەپاشدا خەڵکەکە گەڕانەوەو شێرانەو مەردانە تێ هەڵچوونەوەو لە دەوری حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) وەك شوورای پۆڵایین ئاخڵەیان داو گۆی سەرکەوتنیان لە مەیدانا (بە هەڵمەتی پاڵەوانەیان) بە دوژمن بەجێ هێشت و، ئاڵای هەمیشە سەربەرزو سەرکەوتووی موحەممەدیان دیسانەوە لە مەیدان شەکانەوە جا لەپاش سەرکەوتن حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دانیشت و فەرمووی: کەسێ لە غەزادا ناموسوڵمانێ بکوژێ و بەڵگەی هەبێ لەسەر ئەوە کە ئەو کوشتوویەتی ئەوە رووتی بکاتەوە بۆ خۆی و کەلوپەل و تفاقەکەی هی خۆیەتی! گوتی: منیش هەڵسام گوتم: کێ شایەتیم بۆ دەدا کە من پاڵەوانێکی واوام کوشتووە، هەتا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) تفاقەکەیم بداتێ؟ ئیتر دانیشتمەوە، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) سێ جار ناو بەناو ئەم فەرمایشتەی فەرموو، هەموو جارێ منیش هەڵ دەسام و دەمگوت کێ شایەتییەکی واوام بۆ دەدا هەتا پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەبو قەتادە راست دەکا، کەلوپەلەکەیشی لەلای منە، دەی تۆ بفەرموو ئەو لە من رازی بکە. ئەبو بەکریش هەڵی دایەو فەرمووی: نەبەخوا شتی وا نییە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) شتی وا ناکا بچێ پەلاماری دەسکەوتی شێرێ لە شێرانی خودا بداو

لەوی بستێنێ و بیدات بە تۆ، ئەمە لە كاتێكدا كە ئەو شێرە لە پێناوی خوداو پێغەمبەری خودادا جەنگ دەكاو دەست بە قوڕگی شێردا دەكا!

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەبو بەكر راست دەكا و قسەكەی دروستە، كەوابوو كەلوپەلەكە بدەرەوە بە ئەبو قەتادە گوتی: كابراكەیش كەلوپەلەكەی دایەوە بە من، زریەكەیم فرۆشت و بە پارەكەی لە ناوچەی بەنی سەلیمە باخێكم پێی كڕی، وە ئەو باخە بوو بە بناخەی ماڵداری كردنی سەردەمی ئیسلامەتیم (ش/د/ت).

٤٥١٤- وَلأبي داود: قَضَي النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بِالسَّلَبِ لِلْقَاتِلِ وَلَمْ يُخَمِّسه[٢]:

ئەبو داوود (رەزای خودای لێ بێ) دەگێڕێتەوە: كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دایناوە كە كەلوپەل و تفاقێ كەرووت دەكرێتەوە لە كوژراو لە غەزادا هەمووی بۆ بكوژەكەیەتی، پێنج یەكیشی لێ جیا ناكرێتەوە!

## ٦٣) ناموسوڵمانی جەنگی نابێ بە خاوەنی ماڵی موسوڵمان:
## الحربي لا يملك مال المسلم

٤٥١٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: ذَهَبَ فَرَسٌ لَهُ فَأَخَذَهَا الْعَدُوُّ فَظَهَرَ عَلَيْهِمُ الْمُسْلِمُونَ فَرُدَّ عَلَيْهِ فِي زَمَنِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَأَبَقَ عَبْدٌ لَهُ فَلَحِقَ بِأَرْضِ الرُّومِ فَظَهَرَ عَلَيْهِمُ الْمُسْلِمُونَ فَرَدَّهُ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ بَعْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم). رَوَاهُ أبو داود والبخاري[١]:

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) فەرمووی: ئەسپێكم هەبوو تەرابوو، دوژمن گرتیان بۆ خۆیان، لەپاشدا كە سوپای موسوڵمانان سەركەوتن بەسەریاندا، ئەسپەكەیان دایەوە بە خۆم، ئەمەیش بە سەرینی پێغەمبەر

---

[٢] سكت عن درجته الشارح.

[١] بخاري. جهاد: ٣٠٦٧ ، ٣٠٦٨ ، ٣٠٦٩.

خۆی بوو، لەسەر فەرمانی خۆشی بوو، لەپاش مەرگی پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) بەندەیەکی هەڵهاتووی من رایکردە ناو وڵاتی رۆمەوە کاتێ کە موسوڵمانان سەرکەوتن بەسەریاندا خالیدی کوڕی وەلید کە سەرکردەی سوپای ئیسلام بوو لەو سەرکەوتنەدا بەندەکەی دایەوە بە خۆم (د/ب).

**٦٤) ژن و بەندە لە تاڵانی چکێکیان دەدرێتێ : (یرضخ للمرأة والعبد)**

**٤٥١٦**- عَنْ يَزِيدَ بْنِ هُرْمُزَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ نَجْدَةَ الحروري كَتَبَ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله تَعَالَى عنهما) يَسْأَلُهُ عَنْ خَمْسٍ خِلاَلٍ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: لَوْلاَ أَنْ أَكْتُمَ عِلْمًا مَا كَتَبْتُ إِلَيْهِ. كَتَبَ نَجْدَةُ إِلَيْهِ: أَمَّا بَعْدُ فَأَخْبِرْنِي هَلْ كَانَ النَّبِيُّ (صلى الله تَعَالَى عليه وسلم) يَغْزُو بِالنِّسَاءِ؟ وَهَلْ كَانَ يَضْرِبُ لَهُنَّ بِسَهْمٍ؟ وَهَلْ كَانَ يَقْتُلُ الصِّبْيَانَ؟ وَمَتَى يَنْقَضِي يُتْمُ الْيَتِيمِ؟ وَعَنِ الْخُمْسِ لِمَنْ هُوَ؟ فَكَتَبَ إِلَيْهِ ابْنُ عَبَّاسٍ: كَتَبْتَ تَسْأَلُنِي هَلْ كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَغْزُو بِالنِّسَاءِ وَقَدْ كَانَ يَغْزُو بِهِنَّ فَيُدَاوِينَ الْجَرْحَى وَيُحْذَيْنَ مِنَ الْغَنِيمَةِ وَأَمَّا بِسَهْمٍ فَلا وَلَمْ يَكُنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَقْتُلُ الصِّبْيَانَ وَأَنْتَ لا تَقْتُلِهم وَكَتَبْتَ تَسْأَلُنِي مَتَى يَنْقَضِي يُتْمُ الْيَتِيمِ فَلَعَمْرِي إِنَّ الرَّجُلَ لَتَنْبُتُ لِحْيَتُهُ وَإِنَّهُ لَضَعِيفُ الأَخْذِ لِنَفْسِهِ ضَعِيفُ الْعَطَاءِ مِنْهَا فَإِذَا أَخَذَ لِنَفْسِهِ مِنْ صَالِحِ مَا يَأْخُذُ النَّاسُ فَقَدْ ذَهَبَ عَنْهُ الْيُتْمُ، وَكَتَبْتَ تَسْأَلُنِي عَنِ الْخُمْسِ لِمَنْ هُوَ وَإِنَّا كُنَّا نَقُولُ هُوَ لَنَا فَأَبَى عَلَيْنَا قَوْمُنَا ذَاكَ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ البخاري. وَفِي روايةٍ لمسلم: كَتَبَ لَهُ يَسْأَلُهُ عَنِ الْعَبْدِ وَالْمَرْأَةِ يَحْضُرَانِ الْمَغْنَمَ هَلْ يُقْسَمُ لَهُمَا؟ فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: لَوْلاَ أَنْ يَقَعَ فِي أُحْمُوقَةٍ مَا كَتَبْتُ إِلَيْهِ، ثُمَّ كَتَبَ لَهُ: لَيْسَ لَهُمَا شَيْءٌ إِلاَّ أَنْ يُحْذَيَا، وَقَالَ لَهُ فِي الْوِلْدَانِ: لاَ تَقْتُلْهُمْ إِلاَّ أَنْ تَعْلَمَ مِنْهُمْ مَا عَلِمَ صَاحِبُ مُوسَى مِنَ الْغُلاَمِ الَّذِي قَتَلَهُ[1]:

یەزیدی کوڕی هورموز (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: نەجدەی حەرووری نامەی نووسی بۆ ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) پرسیاری ئەم پێنج شتەی

---

[1] مسلم. مغازي: ٤٦٦١ – ٤٦٦٦. أبو داود. جهاد: ٢٧٢٧ ، ٢٧٢٨ ، ٢٩٨٢. ترمذي. سير: ١٥٥٦. تحفة الأشراف: ٦٥٥٧.

لێـی کـرد. ئیبنــو عــەبباس (خودایـان لیٚ رازی بـیٚ) فــەرمووی: دەترسـم ببـیٚ بـە شـاردنەوەی زانـست‌و کـەتمی عـیلم ئـەگینا وەڵامـم بـۆی نـە دەنووسـییەوە. نەجدە ئەمـەی بۆی نووسـیبوو: لـەپاش سـوپاس‌و سـتایش، پـێم بڵـیٚ: ئایـا پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەربیٚ) ئـافرەتی دەبـرد بـۆ غـەزا؟ وە ئایـا پـشکی بـۆی دادەنـا لـە حاڵـەتی بردنیـدا؟ وە ئایـا لـەکاتی جـەنگ‌و غـەزا کردنـدا حـەزرەت (درودی خودای لەسەربیٚ) منداڵانی دەکوشت؟ وەکەی هەتیو لـە هـەتیوی دەردەچـیٚ؟ وە پێنج یـەك بـۆ کێیـە؟ ئیبنـو عەبباسیش (خودایان لیٚ رازی بیٚ) ئـەم وەڵامـەیان بـۆ نووسییەوە: نامەت بۆ من نووسیوە پرسیارم لیٚ دەکەی: ئایا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربیٚ) غـەزای بـە ژن دەکـرد یانـا، بـەڵیٚ پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەربیٚ) ژنانی دەبرد بۆ غەزا، ئەرکیان ئەوە بوو تیمارو دەرمانی زامارەکانیان دەکرد، لـە تـاڵانیش بەخشیـشی دەدانـیٚ، بـەڵام وەك پیـاوان پـشکیان بـۆ دانـەدەنرا،، پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەربیٚ) منـداڵی نەدەکوشـت، وە تـۆیش مـەیکوژە، وە نامەیشت نووسیوە بۆ من دەپرسیت لێم: کـەی هـەتیو لـە هـەتیوی دەردەچـیٚ بەگیانی خۆم پیاو هەیە ریشیشی دەردیٚ کەچی هێشتا چاك‌و خراپـی خـۆی نافامیٚ، جا هەر کاتیٚ وەك ئەو خەڵکەی تر چاك‌و خراپی خـۆی زانـی ئـەوا لـە هـەتیوی دەردەچـیٚ، نووسیویشتە بـۆم دەپرسیت لـێم: پێنج یـەك هـی کێیـە، ئێمە رامان وابوو کە پێنج یـەك هـی ئێمەیـە کـە کەسوکاری پێغەمبـەرین بـەڵام هۆزەکەمان لەمەدا ملیان نەدا پێمان‌و بەوە رازی نەبوون (د/ت/ن).

لـە گێڕانەوەیـەکی موسـولیمدا: نەجـدە نامــەی نووسـی بـۆ ئیبنـو عـەبباس، پرسـیاری لێکـرد ئەگـەر بەنـدەو ژن حـازری سـەر تـاڵانی بـوون ئایـا بەشیان بۆ دادەنریٚ؟ ئیبنو عەبباس فەرمووی: مەبادا تووشـی گـەوجی ببـیٚ‌و خـۆی گـەوج بکـا دەنـا وەڵامـم نەدەدایـەوە، ئینجـا بـۆی نووسـی: بەشـیان بـۆ دانانریٚ‌و هیچیان ناکەویٚ، مەکەر وەك بەخشیش بەخشیشیان پـیٚ بدریٚ، لـە بارەی کوشتنی منداڵانیشەوە پێـی گـوت: منـداڵ مـە کوژە مەگـەر تـۆیش وەك خدری زیندەی هاوڕێکەی مووسا بزانی کـە ئـەو منداڵـە شـایانی کوشـتنە، وەك ئەو منداڵە کە ئەو کوشتی، تـۆیش قـەت ئـەوە نـازانی، کەواتـە قـەت لـە شـەڕدا منداڵ مەکوژە.

## ٦٥) خەلات کردنی نۆ موسوڵمان : (اعطاء المؤلفة قلوبهم)

**٤٥١٧-** عَنْ أَنَاسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ نَاساً مِنَ الأَنْصَارِ، قَالُوا يَوْمَ حُنَيْنٍ حِينَ أَفَاءَ اللّٰهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْ أَمْوَالِ هَوَازِنَ مَا أَفَاءَ، فَطَفِقَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يُعْطِي رِجَالاً مِنْ قُرَيْشٍ الْمِائَةَ مِنَ الإِبِلِ، فَقَالُوا: يَغْفِرُ اللّٰهُ لِرَسُولِ اللّٰهِ يُعْطِي قُرَيْشًا وَيَتْرُكُنَا وَسُيُوفُنَا تَقْطُرُ مِنْ دِمَائِهِمْ، فَسَمِعَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مِنْ قَوْلِهِمْ فَأَرْسَلَ إِلَى الأَنْصَارِ فَجَمَعَهُمْ فِي قُبَّةٍ مِنْ أَدَمٍ فَلَمَّا اجْتَمَعُوا جَاءَهُمْ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: مَا حَدِيثٌ بَلَغَنِي عَنْكُمْ؟ فَقَالَ لَهُ فُقَهَاءُ الأَنْصَارِ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ أَمَّا ذَوُو رَأْيِنَا فَلَمْ يَقُولُوا شَيْئًا وَأَمَّا أُنَاسٌ مِنَّا حَدِيثَةٌ أَسْنَانُهُمْ قَالُوا يَغْفِرُ اللّٰهُ لِرَسُولِهِ يُعْطِي قُرَيْشًا وَيَتْرُكُنَا وَسُيُوفُنَا تَقْطُرُ مِنْ دِمَائِهِمْ فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): فَإِنِّي أُعْطِي رِجَالاً حَدِيثِي عَهْدٍ بِكُفْرٍ أَتَأَلَّفُهُمْ أَفَلاَ تَرْضَوْنَ أَنْ يَذْهَبَ النَّاسُ بِالأَمْوَالِ وَتَرْجِعُونَ إِلَى رِحَالِكُمْ بِرَسُولِ اللّٰهِ فَوَاللّٰهِ لَمَا تَنْقَلِبُونَ بِهِ خَيْرٌ مِمَّا يَنْقَلِبُونَ بِهِ، فَقَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللّٰهِ قَدْ رَضِينَا قَالَ: فَإِنَّكُمْ سَتَجِدُونَ بَعْدِي أَثَرَةً شَدِيدَةً، فَاصْبِرُوا حَتَّى تَلْقَوُا اللّٰهَ وَرَسُولَهُ فَإِنِّي عَلَى الْحَوْضِ، قَالُوا: سَنَصْبِرُ[1].

**ئەنەس** (خودای لێ رازی بێ) **فەرمووی: رۆژی غەزای حونەین، کە خودا ماڵێکی بێ ئارەقی مفتی رەخساند بۆ پێغەمبەر** (دروودی خودای گەورەی لەسەربێ) **لەو ماڵەی کە بە تالانی لە هۆزی هەوازین گیرا، پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەستی کرد بە بەخشین لێی، وە چەند پیاوێ لە قورەیش یەکی سەرو سەد وشتری داپێیان، جا چەند کەسێ لە یاریدەدەران گوتیان: خودا لە پێغەمبەر خۆش بێ، دەچێ بەشی قورەیشییەکان دەدات کە هەتا دوێنێ بێ باوەڕ بوون‌و بەرهەڵستی ئیسلامیان دەکرد کەچی بەشی ئێمە نادات کە هێشتا خوێنیان لە شمشێرەکانمان دەتکێ‌و ئەوان لەچاو ئێمەدا دوێنێ موسوڵمان بوون، ئیتر بۆ بەشی ئەوان دەداو بەشی ئێمە نادات، پێغەمبەریش** (دروودی

[1] تجريد/ ٥/ ٣١٨ رقم: ٢٠٦١ = ٦٧٦٢ ، ٣١٤٦ ، ٤٣٣٤ ، ٦٧٦١. مسلم. زكاة: ٢٤٣٦ ، ٢٤٣٣ — ٢٤٣٧. ترمذي. مناقب: ٣٩٠١. نسائي. زكاة: ٢٦١٠.

خودای لەسەربێ) قسەکەیانی بەر گوێ کەوتەوەو ناردی بەشوێن یاریدەدەرانداو لە خێوەتێکی چەرمیندا کۆیکردنەوەو کە کۆبوونەوە خۆیشی چوو بۆ لایان و فەرمووی: ئەو قسەیە چییە لە ئێوەوە پێم گەیشتۆتەوە؟!. پیاوە زاناو وریاکانی یاریدەدەران گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! پیاو ماقولان و خاوەن هۆش و گۆشەکانمان هیچیان نەگوتووە کە دڵی تۆ گەردی پێ بگرێ ئەوەندە هەیە چەند کەسێکی مێرد منداڵمان، لە هەرزە کارەکانمان لە رووی نازەوە گلەییان کردووەو گوتوویانە: خودا لە پێغەمبەر خۆش بێ، دەچێ بەشی نۆ موسوڵمانەکان لە تاڵان دەدا، کەچی بەشی ئێمە نادات، وەلحاڵ ئەوان لەم رۆژانەدا بە زەبری شمشێری ئێمە موسوڵمان بوون! پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بەڵێ ئەمە وایەو وا دەبێ کە من خەڵاتی هەندێ پیاو دەکەم، لەبەرئەوەی کە نۆ موسوڵمانن و تازە لە کوفرو بێ باوەڕی دابڕاون، چونکە دەمەوێ دڵیان رابگرم و دڵنەواییان بکەم و هۆگری ئیسلامیان بکەم و بە باشی بیانکەمە خۆم، بەڵام خۆ ئەمە مەعنای وا نییە کە من باوی ئەوانم داوە بەسەر ئێوەدا، دەی باشە ئایا ئێوە بەشی خۆتان دەگۆڕنەوە بە بەشی ئەو خەڵکە، دەی پێم بڵێن ئایا ئێوە بەو بەشە رازی نابن کە خەڵکی ماڵ و پڕو پیتی دنیا لەگەڵ خۆیان ببەنەوە بەڵام ئێوە لە جیاتی ئەوە پێغەمبەری خودا ببەنەوە لەگەڵ خۆتان بۆ ماڵەوەتان، سا بەو خودا گەورەیە ئەم بەشەی ئێوە کە دەیبەنەوە، کە بریتییە لە خۆشەویست و لێڕازیبوونی خوداو پێغەمبەری خودا گەلێ گەلێ باشترو گەورەترە لەو بەشەی کە ئەو خەڵکەی تر دەیبەنەوە کە بریتییە لە پڕو پیتی جیهان!. گوتیان: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خودا! رازی دەبین و پتریش. فەرمووی: دەی بزانن کە ئێوە لەپاش من تووشی خۆ خۆییەکی سەخت دەبن، هەندێ کەس و فەرمانڕەوای وا پەیدا دەبن کە هەر بەلای خۆیاندا رایدەکێشن و کەسی تریان لەبیر نییە، بەڵام ئێوە خۆتان رابگرن و بە هیچ جۆرێ لایەنی هەق و ئیسلام بەرمەدەن، هەتا دەمرن و لەو دنیا دەچنەوە بەر دیوانی خودا،، وە من خۆم لەسەر حەوزی کەوسەر چاوەڕوانتان دەکەم و ئەوانەی کە ئارام دەگرن و لەبەر هیچ

مەهانەو بیانوویەك لە خەتی ئیسلام لا نادەن خەڵات و پاداشی باش و گەورە وەردەگرن. یاریدەدەرانیش فەرموویان: ئێمەیش بەڵێنەو دەیدەین صەبرو ئارام دەگرین (ش).

**٤٥١٨**- وَعَنْهُ قَالَ جَمَعَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) الأَنْصَارَ فَقَالَ: أَفِيكُمْ أَحَدٌ مِنْ غَيْرِكُمْ؟ فَقَالُوا: لاَ إِلاَّ ابْنُ أُخْتٍ لَنَا فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): إِنَّ ابْنَ أُخْتِ الْقَوْمِ مِنْهُمْ فَقَالَ: إِنَّ قُرَيْشًا حَدِيثُ عَهْدٍ بِجَاهِلِيَّةٍ وَمُصِيبَةٍ، وَإِنِّي أَرَدْتُ أَنْ أَجْبُرَهُمْ وَأَتَأَلَّفَهُمْ أَمَا تَرْضَوْنَ أَنْ يَرْجِعَ النَّاسُ بِالدُّنْيَا وَتَرْجِعُونَ بِرَسُولِ اللَّهِ إِلَى بُيُوتِكُمْ، لَوْ سَلَكَ النَّاسُ وَادِيًا وَسَلَكَ الأَنْصَارُ شِعْبًا لَسَلَكْتُ شِعْبَ الأَنْصَارِ [٢]:

دیسان ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودو سڵاوی خوای لەسەر بێ) دەستەی یاریدەدەرانی کۆ کردەوەو فەرمووی: کەسێکی واتان تێدایە کە لە خۆتان نەبێ؟ گوتیان: نەخەیر مەگەر خوشکەزای خۆمانمان لەناو دابێ، فەرمووی: خوشکەزای عەشرەت یەکێکە لە خۆیان ئەوجا فەرمووی: هەموو دەزانین کە هۆزی قورەیش هەم نۆ موسوڵمانن و هەم تازە کۆست کەوتوون، جا بۆیە منیش دەمەوێ تۆڵەیان بۆ بکەمەوەو دڵنەواییان بکەم، باشە ئەدی ئێوە بەوە رازی نابن کە خەڵکی تر دینارو مەڕو ماڵات ببنەوە لەگەڵ خۆیان، کە ئەمانە مایەی خۆشی ئەم جیهانە بێ بەقایەن بەڵام ئێوە لەباتی پڕوپیتی دنیا پێغەمبەری خودا لەگەڵ خۆتان ببەنەوە بۆ ماڵەوەتان و ئەو لە خۆتان رازی بکەن کە رەزای ئەو مایەی بەختەوەری هەردوو ژیانە! بزانن ئەگەر خەڵکی تر هەموویان لە شارێوە بڕۆن بەڵام یاریدەدەران لە باریکە رێوە بڕۆن، من لە باریکە رێکەی ئەوانەوە لەگەڵ ئەواندا دەڕۆم و ئەوەندەم خۆش دەوێن لەوان جیانابمەوە (ش).

---

[٢] بخاري. مناقب: ٣٥٢٨ ، ٦٧٦٢ ، ٣١٤٦ ، ٤٣٣٤ ، ٦٧٦١. مسلم. زكاة: ٢٤٣٦. ترمذي. مناقب: ٣٩٠١. نسائي. زكاة: ٦٢١٠.

٤٥١٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ حُنَيْنٍ آثَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) نَاسًا فِي الْقِسْمَةِ، فَأَعْطَى الأَقْرَعَ بْنَ حَابِسٍ مِائَةً مِنَ الإِبِلِ وَأَعْطَى عُيَيْنَةَ مِثْلَ ذَلِكَ وَأَعْطَى أُنَاسًا مِنْ أَشْرَافِ الْعَرَبِ وَآثَرَهُمْ يَوْمَئِذٍ فِي الْقِسْمَةِ. فَقَالَ رَجُلٌ: وَاللَّهِ إِنَّ هَذِهِ لَقِسْمَةٌ مَا عُدِلَ فِيهَا وَمَا أُرِيدَ فِيهَا وَجْهُ اللَّهِ. قَالَ: فَقُلْتُ: وَاللَّهِ لأُخْبِرَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَأَتَيْتُهُ فَأَخْبَرْتُهُ بِمَا قَالَ، فَتَغَيَّرَ وَجْهُهُ حَتَّى كَانَ كَالصِّرْفِ، ثُمَّ قَالَ: فَمَنْ يَعْدِلُ إِنْ لَمْ يَعْدِلِ اللَّهُ وَرَسُولُهُ! ثُمَّ قَالَ: يَرْحَمُ اللَّهُ مُوسَى قَدْ أُوذِيَ بِأَكْثَرَ مِنْ هَذَا فَصَبَرَ، فَقُلْتُ: لاَ جَرَمَ لاَ أَرْفَعُ إِلَيْهِ بَعْدَهَا حَدِيثًا. رَوَاهُ هذه الثلاثة مسلم في الزكاة والبخاري هنا[٣]:

عەبدوڵڵا (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: کە ڕۆژی غەزای حونەین رووی دا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە ماڵی تالانی جەنگ بەشی چەند کەسێکی زیاتردا، سەد وشتری دا بە ئەقرەعی کوڕی حابیس و سەدیشی دا بە عویەینەو بەشی چەند کەسێکی تریشی لە خانەدانەکانی عەرەبدا، لەو ڕۆژەدا ئەوانەی لەبەش پێدانندا جیاکردەوەو بەشی زۆر باشی پێدان. پیاوێکیش گوتی: بەو خودایە ئەم بەشکردنە نە بە هەق و عەداڵەت بوو، وە نە بۆ ڕەزای خودا بوو، گوتی: منیش گوتم: بەخودا دەبێ بیگێڕمەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) جا چووم بۆ خزمەتی و قسەکەی کابرام گێڕایەوە بۆی، ڕەنگی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) وەك خوێن سوور داگیرسا، لەپاشا فەرمووی: ئەگەر خوداو پێغەمبەری خودا شت بە هەق و دادگەریی نەکەن ئەی کێ دەیکا! دوایی فەرمووی: ڕەحمەتی خودا لە مووسا، لە مەیش زیاتر ئازاری درا بەڵام ددانی بەخۆیدا گرت منیش گوتم: وای لێ هات! ئیتر هەتا هەتایە دوای ئەمە هیچ قسەیەکی خراپی بۆ ناگێڕمەوە! (ش).

٤٥٢٠- عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: أَعْطَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَبَا سُفْيَانَ بْنَ حَرْبٍ وَصَفْوَانَ بْنَ أُمَيَّةَ وَعُيَيْنَةَ بْنَ حِصْنٍ، وَالأَقْرَعَ ابْنَ حَابِسٍ كُلَّ إِنْسَانٍ مِنْهُمْ مِائَةً مِنَ الإِبِلِ، وَأَعْطَى عَبَّاسَ بْنَ مِرْدَاسٍ دُونَ ذَلِكَ فَقَالَ عَبَّاسُ بْنُ مِرْدَاسٍ:

---

[٣] بخاري. فرض الخمس: ٣١٥٠، ٣٤٠٥، ٤٣٣٥، ٤٣٣٦، ٤٣٣٧، ٦٠٥٩، ٦١٠٠، ٦١٩١، ٦٣٣٦. مسلم. زكاة: ٢٤٤٤.

أَتَجْعَلُ نَهْبِي وَنَهْبَ الْعُبَيْدِ بَـيْـنَ عُيَيْنَـةَ وَالأَقْـرَعِ

فَمَا كَانَ بَدْرٌ وَلاَ حَابِسٌ يَفُوقَانِ مِرْدَاسَ فِي الْمَجْمَعِ

وَمَا كُنْتُ دُونَ امْرِئٍ مِنْهُمَا وَمَنْ تَخْفِضِ الْيَوْمَ لاَ يُرْفَعِ

قَالَ فَأَتَمَّ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مِائَةً. رَوَاهُ مسلم[٤]:

**رافیعی كوڕی خەدیج (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای گەورەی لەسەربێ) هەریەكی سەد وشتری دا بەم زاتانە: بە ئەبو سوفیانی كوڕی حەرب و بە صەفوانی كوڕی ئومەییەو بە عویەینەی كوڕی حیصن و بە ئەقرەعی كوڕی حابیس، بەڵام لە سەد وشتر كەمتری دا بە عەبباسی كوڕی میرداس، جا بەم بۆنەیەوە عەبباسی كوڕی میرداس گوتی:**

أَتَـجْعَـلُ نَهْبِـي وَنَهْبَ الْعُبَيْدِ بَيْنَ عُيَيْنَةَ وَالأَقْـرَعِ

فَمَا كَانَ بَدْرٌ وَلاَ حَابِسٌ يَفُوقَانِ مِرْدَاسَ فِي الْمَجْمَعِ

وَمَا كُنْتُ دُونَ امْرِئٍ مِنْهُمَا وَمَنْ تَخْفِضِ الْيَوْمَ لاَ يُرْفَعِ

**بە شیعر لە بەحرەكەی خۆی كە بەحری موتەقاربە واتە:**

**لەبەرچی لە تاڵان خەڵاتیی منت وەك"**

**عویەینەوو ئەقرەع بە یەكسان نەداوە**

**نەخۆیان لە خۆم و نە بابیان لە بابم"**

**لەكن خەڵكی ڕێزیان پتر لێ گیراوە"**

**ئەوەی تۆ كە ئەمڕۆ پەسەندی نەكەی قەت**

**بەسەر بەرزی ناژی هەتا وەكوو ماوە**

**فەرمووی: ئیتر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بۆ ئەویشی كرد بە سەد وشتری تەواو. (موسلیم، ڕەزای خودای لێ بێ)[١].**

---

[٤] مسلم. زكاة: ٢٤٤٠. تحفة الأشراف/ ٣٥٦٣.

---

(١) پیاوە باشەکە مامۆستا مەلا رەشید بەگی بابان (رەزای خودای گەورەی لێ بێ) لە بەرگی هەشتەمی (مجمع البحرین)ەکەیدا لە دامێنی لاپەڕە (١٦٧)دا ئەم شەش شیعرە ناسکەی فەرمووە ، کە لە بەحری وافیرە، کە کودەکانی خۆمان پێی دەڵێن هەزەجی مەحزووف، بەڵام تاقە چوار هەڵەیان بەهۆی گۆڕینی ڕێنووسەوە تێکەوتووە.

داخەکەم زوربەی شیعری کوردی کۆن لەلایەن نووسەرانەوە پڕ بووە لە هەڵەی عەرووزی. وەك چۆن کەسێ عیلمی نەحوو صەرف نەزانێ ، کە عیبارەتێکی بێ سەرو بۆری عەرەبی دەخوێنێتەوە دەیان ساتمەو هەڵەی تیادەکا ، وەك زەمانەی بێ باکی چەپگەرد سەدان مەخفووض دەکا بە مەرفووعو هەزاران مەرفووع دەکا بە مەخفووض ، ئەوەشی شیعری کۆنی کوردی بنووسێو ئاگادارییەکی باشی لە عەرووزی عەرەبیو کوردی نەبێ هەروەها. عەروز زان وەك نەحوزان هەست بەهەڵەکە دەکا. لەم بابەتی عەرووزی کوردییەوە خۆم گەلێ خەریك کردووە، سوپاس بۆ خودا بەرگی یەکەمی چاپ بوو، بەرگی دووەمیشی خوا یاربێ لە هەڵێکا بڵاوی دەکەمەوە مامۆستا دەفەرموێ:

خوا عەفوم بکەو رەحمەت ببێ پێم
لە ژێری سێبەری خۆتا بکەی جێم
لە رۆژێکا کە غەیری سێبەری تۆ
پەنا نابێ لە گەرمیی ئاگری تۆ!
حەسەین و من لەژێریا دابنیشین
لە فەزڵی تۆوە هیچ زەحمەت نەکێشین
لەیەکتر نێستە هەرچەندەکە دووریین
بەسەر پردی سیراتا رابووریین
وەکوو عەککاشە لەو حەفتا هەزارە
بچین داخڵ ببین بەو مێرغوزارە!
قەبووڵ کەی لێم خوایە ئەم دوعایە
بە فەزڵو رەحمەتت لەم دوو برایە

## ٦٦) سەرانە (جزیە): (الْجِزْيَةَ)

قَالَ الله تعالى: {قَاتِلُواْ الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَلاَ بِالْيَوْمِ الآخِرِ وَلاَ يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللّهُ وَرَسُولُهُ وَلاَ يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ حَتَّى يُعْطُواْ الْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ - صَدَقَ اللهُ العَظِيم - ٢٩/٩}.

واتە: یەزدانی مەزن دەفەرموێ: جەنگ بکەن لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە ئیمان و باوەڕی ساخیان بە خوداو بە ڕۆژی دوایی نییە، چونکە ئەوەی کە خوداو پێغەمبەری خودا قەدەغەیان کردووەو بە حەرامی دادەنێن ئەوان ئەوە بە حەڵاڵ دادەنێن و بە حەرامی نازانن و ڕەفتار ناکەن بە ڕەفتارێکی وا کەڕێکی یاسای خودایی بێ، ئەو کەسانەیش وەك ئەو جوولەکەو گاورانە کە نامەی ئاسمانیان بۆ هاتوە، بەڵام گۆڕیویانە دەی جەنگ بکەن لەگەڵ ئەمانەدا هەتا بە ملکەچی بە دەستی خۆیان سەرانەتان دەدەنێ.

**٤٥٢١**- عَنْ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) أَخَذَ الجَزْيَةَ مِنْ مَجُوسِ هَجَرٍ. رَوَاهُ البخاري وأبو داود والترمذي[1]:

ئەورەحمانی کوڕی عەوف (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەربێ) سەرانەی لە ئاگر پەرستەکانی وڵاتی هەجەر وەردەگرت (ب/د/ت).

**٤٥٢٢**- وَأَخَذَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) الْجِزْيَةَ مِنْ مَجُوسِ الْبَحْرَيْنِ، وَأَخَذَهَا عُمَرُ مِنْ فَارِسَ وَأَخَذَهَا عُثْمَانُ مِنَ الْفُرْسِ أو البربر. رَوَاهُ الترمذي[2]:

---

ئەم وشانە ئاوا بە هەڵە نووسرابوون ، ڕاستم کردنەوە ، ئەمەیش بەڵگەیەکی تری بلیمەتی ئەو زاتەیە ، کە ئاگایەکی باشی لە چۆنێتیی عەرووزی کوردی هەبووە: (هەرچەند ، عەکاشە ، داخڵ بین ، دۆعایە) خودا دەست بە تەمەنی مامۆستا محمد علی قەرەداغی بگرێ کە ئەم سامانە بەنرخە دەخاتە بەردەستمان. وەرگێڕ - ١٩٩٠/٩/٢٢ سلێمانی

[1] بخاري. جزية: ٣١٥٧.

[2] سكت عن درجته الشارح.

پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەربێ) لە ئاگر پەرستەکانی بەحرەین سەرانەی وەردەگرت، عومەریش لە خەڵکی وڵاتی فارسی وەردەگرت" عوثمانیش لە فارسەکان و بەربەرەکانی وەردەگرت (ت).

٤٥٢٣- عَنْ عَمْرَو بْنَ عَوْفٍ الأَنْصَارِيَّ البدريَّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بَعَثَ أَبَا عُبَيْدَةَ بْنَ الْجَرَّاحِ إِلَى الْبَحْرَيْنِ يَأْتِي بِجِزْيَتِهَا وَكَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) صَالَحَ أَهْلَ الْبَحْرَيْنِ وَأَمَّرَ عَلَيْهِمُ الْعَلاَءَ بْنَ الْحَضْرَمِيِّ، فَقَدِمَ أَبُو عُبَيْدَةَ بِمَالٍ مِنَ الْبَحْرَيْنِ فَسَمِعَتِ الأَنْصَارُ بِقُدُومِ فَوَافَتْ صَلاَةَ الصُّبْحِ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَلَمَّا صَلَّى بِهِمِ الصَرَفَ فَتَعَرَّضُوا لَهُ فَتَبَسَّمَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) حِينَ رَآهُمْ وَقَالَ: أَظُنُّكُمْ قَدْ سَمِعْتُمْ أَنَّ أَبَا عُبَيْدَةَ قَدْ جَاءَ بِشَيْءٍ قَالُوا: أَجَلْ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: فَأَبْشِرُوا وَأَمِّلُوا مَا يَسُرُّكُمْ فَوَاللَّهِ لاَ الْفَقْرَ أَخْشَى عَلَيْكُمْ وَلَكِنْ أَخْشَى عَلَيْكُمْ أَنْ تُبْسَطَ عَلَيْكُمُ الدُّنْيَا كَمَا بُسِطَتْ عَلَى مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ فَتَنَافَسُوهَا كَمَا تَنَافَسُوهَا، وَتُهْلِكَكُمْ كَمَا أَهْلَكَتْهُمْ[٣].

عەمری کوڕی عەوفی ئەنصاری بەدری (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحی نارد بۆ بەحرەین، کە سەرانەی وڵاتی بەحرەین بێنێ، چونکە لەوەبەر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەگەڵ خەڵکی بەحرەیندا رێك کەوتبوو، عەلائی کوڕی حەضرەمیی کردبوو بە سەرداریان، کە ئەبو عوبەیدە هاتەوە ماڵێکی زۆری لە بەحرەینەوە هێنابوو، یاریدەدەرانیش بیستیانەوە کە ئەبو عوبەیدە هاتۆتەوە، ئیتر بۆ نوێژی بەیانی هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئەویش نوێژی بۆ کردن و گەڕایەوە، جا یاریدەدەران لەو کاتەدا داوای بەشیان لێکرد، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) کە بینینی بزەیەك گرتی و فەرمووی: وا دەزانم کە ژنەوتووتانە کە ئەبو عوبەیدە شتێکی هێناوە! عەرزیان کرد: بەڵێ وایە ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: دە لە ئێوە مژدەبێ و خۆشیتان لێ بێ، دەسا بە زاتی خودا لە هەژاری لێتان ناترسم بەڵام

[٣] تجريد/ ٣/ ٤٠٢ رقم: ١٢٧٧ = ٣١٥٨ ، ٤٠١٥ ، ٦٤٢٥. مسلم. زهد: ٧٣٥١. ترمذي. زهد: ٢٤٦٢.

بە پێچەوانەوە مەترسی ئەوەم هەیە کە ئێوەش وەك نەتەوەکانی پێش ئێوە خۆشی دنیا رووتان تێ بکاو ئێوەیش وەك ئەوان بە دەست و دەم پەلاماری دنیا بدەن و باوەشی پیابکەن و تێی ورووکێن! جا ئەوکاتە وەك چۆن ئەوانی لەناو برد ئاوا ئێوەش لەناو ببات (ب).

٤٥٢٤- عَنْ جُبَيْرِ بْنِ حَيَّةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: بَعَثَ عُمَرُ النَّاسَ فِي أَفْنَاءِ الأَمْصَارِ، يُقَاتِلُونَ الْمُشْرِكِينَ، فَأَسْلَمَ الْهُرْمُزَانُ فَقَالَ: إِنِّي مُسْتَشِيرُكَ فِي مَغَازِيَّ هَذِهِ، قَالَ: نَعَمْ، مَثَلُهَا وَمَثَلُ مَنْ فِيهَا مِنَ النَّاسِ مِنْ عَدُوِّ الْمُسْلِمِينَ مَثَلُ طَائِرٍ لَهُ رَأْسٌ وَجَنَاحَانِ وَرِجْلاَنِ، فَإِنْ كُسِرَ أَحَدُ الْجَنَاحَيْنِ نَهَضَتِ الرِّجْلاَنِ بِجَنَاحٍ وَالرَّأْسُ، فَإِنْ كُسِرَ الْجَنَاحُ الآخَرُ نَهَضَتِ الرِّجْلاَنِ وَالرَّأْسُ، وَإِنْ شُدِخَ الرَّأْسُ ذَهَبَتِ الرِّجْلاَنِ وَالْجَنَاحَانِ وَالرَّأْسُ، فَالرَّأْسُ كِسْرَى وَالْجَنَاحُ قَيْصَرُ وَالْجَنَاحُ الآخَرُ فَارِسُ، فَمُرِ الْمُسْلِمِينَ فَلْيَنْفِرُوا إِلَى كِسْرَى. قَالَ: فَنَدَبَنَا عُمَرُ وَأَمَّرَ عَلَيْنَا النُّعْمَانَ بْنَ مُقَرِّنٍ حَتَّى إِذَا كُنَّا بِأَرْضِ الْعَدُوِّ خَرَجَ عَلَيْنَا عَامِلُ كِسْرَى فِي أَرْبَعِينَ أَلْفًا فَقَامَ تُرْجُمَانٌ فَقَالَ: لِيُكَلِّمْنِي رَجُلٌ مِنْكُمْ فَقَالَ الْمُغِيرَةُ: سَلْ عَمَّا شِئْتَ قَالَ: مَا أَنْتُمْ؟ قَالَ: نَحْنُ أُنَاسٌ مِنَ الْعَرَبِ كُنَّا فِي شَقَاءٍ شَدِيدٍ وَبَلاَءٍ شَدِيدٍ، نَمَصُّ الْجِلْدَ وَالنَّوَى مِنَ الْجُوعِ وَنَلْبَسُ الْوَبَرَ وَالشَّعَرَ وَنَعْبُدُ الشَّجَرَ وَالْحَجَرَ فَبَيْنَا نَحْنُ كَذَلِكَ إِذْ بَعَثَ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَرَبُّ الأَرَضِينَ تَعَالَى ذِكْرُهُ وَجَلَّتْ عَظَمَتُهُ إِلَيْنَا نَبِيًّا مِنْ أَنْفُسِنَا نَعْرِفُ أَبَاهُ وَأُمَّهُ، فَأَمَرَنَا نَبِيُّنَا رَسُولُ رَبِّنَا أَنْ نُقَاتِلَكُمْ حَتَّى تَعْبُدُوا اللَّهَ وَحْدَهُ أَوْ تُؤَدُّوا الْجِزْيَةَ وَأَخْبَرَنَا نَبِيُّنَا (صلى الله عليه وسلم) عَنْ رِسَالَةِ رَبِّنَا أَنَّهُ مَنْ قُتِلَ مِنَّا صَارَ إِلَى الْجَنَّةِ فِي نَعِيمٍ لَمْ يَرَ مِثْلَهَا قَطُّ وَمَنْ بَقِيَ مِنَّا مَلَكَ رِقَابَكُمْ. رَوَاهُمَا البخاري[٤]:

جوبەیری کوڕی حەییە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: عومەر (خودای لێ رازی بێ) خەڵکی دەنارد لەناو گەورە شارەکانا کوشتاری بتپەرستانیان دەکرد لەوماوەیەدا هورموزان (کە سەرکردەی یەکێ لە سوپاکانی وڵاتی فارس بوو، وەناوی رۆستەم بوو) موسوڵمان بوو، جا عومەر پێی گوت: من لەم

---

[٤] تجريد/ ٣/ ٤٠٤ رقم: ١٢٧٨ = ٣١٥٩ ، ٧٥٣٠ ، ٣١٦٠.

غەزەواتانەمدا پرس‌و راو راوێژت پێ دەکەم، رای تۆ چۆنە پێم بڵێ؟ ئەویش گوتی: بەڵێ باشە خەڵکی ئەم وڵاتانە کە ئێستا دوژمنی موسوڵمانن، وەك باڵندەیەك وان، کە سەرێك‌و دوو باڵ‌و دوو قاچی هەیە، باڵندەکە ئەگەر باڵێکی بشکێ هەردوو قاچەکەی لەگەڵ ئەو باڵەکەی تریدا بە زەبری سەرەکەی هەڵ دەسنەوە، ئەگەر باڵەکەی تریشی بشکێ هەردوو قاچەکەی‌و سەرەکەی هەڵ دەسنەوە، بەڵام ئەگەر سەرەکەی بشکێ ئیتر هەم باڵ‌و هەم قاچ‌و هەم سەری هەموو تیا دەچن! لەم پەندەدا مەبەست لە سەرەکە کیسرای شای ئێرانە، مەبەست لە باڵێکیان قەیسەرە، مەبەست لە باڵەکەی تریان فارسە جا ئەی خەلیفە! فەرمان بدە بە موسوڵمانان کە عیلجاڕی لێ بکەن‌و دەرچن بۆسەر کیسرا. گوتی: ئیتر عومەریش بەڕێی کردین‌و نوعمانی کوڕی موقەڕینی کرد بە سەرکردەمان، رۆیشتین تا چووینە خاکی دوژمن، لەوێ سەرکاری کیسرا (بە چل هەزار کەسەوە) پێشی لێ گرتین، زمانزانەکەیان هات گوتی: با پیاوێکتان بێ قسەم لەگەڵ بکا، موغیرەیش پێی گوت: چی حەزدەکەی بپرسە. گوتی: ئێوە چین؟ فەرمووی: ئێمە کەسانێکین، لە عەرەب، لەمە پێش لە بەدبەختییەکی ناهەموارو گرفتارییەکی دژواردا بووین، حاڵمان زۆر خراپ بوو، لە برسانا پێستەمان دەخواردو ناوکە خورمامان دەمژی‌و کوڵك‌و مووماان لەبەردەکرد دارو بەردمان دەپەرست، هەتا خودای هەموو ئاسمانەکان‌و هەموو زەمینەکان (هەمیشە ناوو یادی پایەدار بێ‌و گەورەیی‌و شکۆمەندیی بەرقەرار بێ) لەناکاو پێغەمبەرێکی لە خۆمان بۆ ناردین، کە دەزانین باوك‌و دایکی کێن‌و کێ نین‌و زۆر باش رەسەنی دەناسین (کە هەتا بڵێی خانەدانەو ناکەس بەچە نییە)جا ئەم پێغەمبەرەی ئێمە، کە پێغەمبەری راست‌و دروستی‌خودا خۆیەتی، فەرمانی پێ کردووین کە جەنگتان لەگەڵ بکەین هەتا بە یەکێ لەم دوو شتە رازی دەبن: یا وەکی ئێمە ئیسلام دەبن‌و خودای تاك‌و تەنیا خۆی دەپەرستن، یا ئەگەر بەمە رازی نابن دەبێ سەرانەمان بدەنێ، ئەم پێغەمبەرە نازدارەمان (لەسەر راسپێری پەروەردگارمان‌و لە زمانی ئەوەوە) هەواڵی بە ئێمە داوە: کە ئەوەی لە ئێمە

دەکوژرێ دەچێتە بەهەشت‌و دەکەوێ بەسەر نازو خۆشیداو دەکەویتە نازو نیعمەتێکی واوە کە هەرگیز شتی وای نەدیبێ، ئەوەیشی لە ئێمە ماو نەکوژرا ئەوا زاڵ دەبێ بەسەر ئێوەداو دەبێ بە ئاغاتان (ب).

**٤٥٢٥-** عَنْ أَنَسٍ (رضي الله تَعَالَى عنه) قَالَ: بَعَثَ النَّبِيُّ (صلى الله تَعَالَى عليه وسلم) خَالِدَ بْنَ الْوَلِيدِ إِلَى أُكَيْدِرِ دُومَةَ فَجَاءَوا بِهِ إِلى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَحَقَنَ دَمَهُ وَصَالَحَهُ عَلَى الْجِزْيَةِ[٥]:

**ئەنەس** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **خالیدی کوڕی وەلیدی نارد بۆ سەر شای دوومە، لەشکرەکەی خالید شای دوومەیان بەدیل گرت‌و هێنایان بۆ خزمەتی پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **حەزرەت** (درودی خودای لەسەربێ) **ئامانی دایەو پێك هات لەسەر ئەوە کە سەرانە بداو لەسەر وڵاتی خۆی بمێنێتەوە (د- سند صالح).**

**٤٥٢٦-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) قَالَ: صَالَحَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَهْلَ نَجْرَانَ عَلَى أَلْفَيْ حُلَّةٍ نِصْفُهَا فِي صَفَرٍ وَنِّصْفُها ألآخر فِي رَجَبٍ يُؤَدُّونَهَا إِلَى الْمُسْلِمِينَ وَعَارِيَةِ ثَلاثِينَ دِرْعًا وَثَلاثِينَ فَرَسًا وَثَلاثِينَ بَعِيرًا مِنْ كُلِّ صِنْفٍ مِنْ أَصْنَافِ السِّلاَحِ يَغْزُوَ بِهَا الْمُسْلِمُونَ وَهُمْ ضَامِنُونَ لَهَا حَتَّى يَرُدُّوهَا لَهُمْ إِنْ كَانَ بِالْيَمَنِ كَيْدٌ أَوْ غَدْرٌ، عَلَى ألاَّ تُهْدَمَ لَهُمْ بَيْعَةٌ وَلاَ يُخْرَجُ لَهُمْ قَسٌّ وَلاَ يُفْتَنُوا عَنْ دِينِهِمْ مَا لَمْ يُحْدِثُوا حَدَثًا أَوْ يَأْكُلُوا الرِّبَا. رَوَاهُمَا أبو داود[٦]:

**ئیبنو عەبباس** (خۆشنوودی خوایان لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **لەگەڵ خەڵکی نەجراندا لەسەر ئەم دوو شتە پێك هات:**

**یەکەم: دوو هەزار دەست جل‌و بەرگ بدەن بە موسوڵمانان، نیوەی لە مانگی سەفەردا بدەن‌و ئەو نیوەکەی تریشی لە مانگی ڕەجەبدا بدەن.**

---

[٥] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

[٦] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

دووەم: ئەگەر لە وڵاتی یەمەن شەڕو هەرای وا بەرپا بوو کە ببێ بەهۆی پەیمان شکاندن‌و فێڵ‌و گزی دەبێ خەڵکی نەجران بە خواستەمەنی واتە: بە (عاریە) ئەم شتانەی تریش بدەن بە موسوڵمانان: سیی زریەو سیی ماین‌و سیی وشترو لەهەموو جۆرێکی چەکیش سیی سیی موسوڵمانان بەم شتانە غەزا دەکەن‌و دەبن بە زامنیان هەتا کاتێ دەیاندەنەوە پێیان، ئەمە بەمەرجێ کە کڵێسەکانیان نەرووخێت‌و قەشەکانیان دەرنەکرێت‌و لەسەر ئایینی خۆیان بەگیریان نەهێنن‌و ئازار نەدرێن، وە ئەوانیش نابێ ئاژاوە بەرپا بکەن یا سوود بخۆن! (د- سند صالح).

٤٥٢٧- عَنْ مُعَاذٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لَمَّا وَجَّهَهُ إِلَى الْيَمَنِ أَمَرَهُ أَنْ يَأْخُذَ مِنَ كُلِّ حَالِمٍ دِينَارًا أَوْ عِدْلَهُ مِنَ الْمَعَافِرِ. رَوَاهُ أصحاب السُّنن[٧]:

موعاذ (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کاتێ منی نارد بۆسەر وڵاتی یەمەن فەرمانی پێ کردم: کە ئەوەی رەسیدە بووە دینارێ سەرانەی لێ وەرگرم یا بایی دینارێ جل‌و بەرگی مەعافیری لێ وەربگرم (د/ت/ن- س/ح).

٤٥٢٨- بە موجاهید (خودای لێ رازی بێ) گوترا: لەبەر چی خەڵکی شام چوار دینار سەرانەیان لەسەر دانراوە، کەچی خەڵکی یەمەن یەك دینار سەرانەیان لەسەر دانراوە؟ فەرمووی: ئەوە لەبەر دەوڵەمەندی‌و هەژاری وادانراوە (ب)[٨].

## ٦٧) سەندنی دەیەك: (عُشُور)

٤٥٢٩- عَنْ حَرْبِ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ جَدِّهِ أَبِي أُمِّهِ، عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِنَّمَا الْعُشُورُ عَلَى الْيَهُودِ وَالنَّصَارَى وَلَيْسَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ عُشُورٌ. رَوَاهُ أبو داود[١]:

---

[٧] رواه أصحاب السنن بسند حسن (شرحه).

[٨] رواه البخاري. جزية. تعليق قبل الرقم: ٣١٥٦.

حەربی کوڕی عەبدوڵلا فەرمووی: باپیرم (باوکی دایکم) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: دەیەك بەس لە جوولەکەو گاور وەردەگیرێ، موسوڵمان دەیەك (عُشُورٌ)ی لەسەر نییە! {ئەبو داوود (خودای لێ رازی بێ) بە سەنەدێکی باش گێڕاویەتەوە}.

**٦٨) دەستپیسی‌و گزی‌و دزی‌و فزی لە تالآنی ناڕەوایە: (الغلول حرام)**

قَالَ الله تعالى: {وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ثُمَّ تُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ}. تەماشای ئەم شوێنانە بکە: تەفسیری سوورەتی ئالی عمران، فەرموودەی ژمارە (٢٩). (ب- ٣ز- ١٠٩ل- ٢٩٨ف- ٣). برقم / ٣ / ٢٤٢٠.

٤٥٣٠- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِي اللّٰهُ تَعَالَى عَنْهُ) قَالَ: كَانَ عَلَى ثَقَلِ النَّبِيِّ (صلى الله تَعَالَى عليه وسلم) رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ كِرْكِرَةُ فَمَاتَ، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): هُوَ فِي النَّارِ فَذَهَبُوا يَنْظُرُونَ إِلَيْهِ فَوَجَدُوا عَبَاءَةً قَدْ غَلَّهَا. رَوَاهُ البخاري[١]:

عەبدوڵلای کوڕی عەمر (خودایان لێ رازی بێ) فەرمووی: پیاوێ بوو ناوی کەرکەرە بوو، بارگەچی پێغەمبەر بوو (دروودی خودای لەسەربێ) کاتێ مرد پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کەرکەرە لە ئاگری دۆزەخدایە کە چوون تەماشایان کرد بالاّ پۆشێکیان دۆزییەوە، کە کەرکەرە (خوا رەحم بە حالی بکا) لە تالآنی دزیبووی بۆ خۆی! (ب).

٤٥٣١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عام خَيْبَرَ فَلَمْ نَغْنَمْ ذَهَبًا وَلاَ وَرِقًا إِلاَّ الثِّيَابَ وَالْمَتَاعَ وَالأموال فَتَوَجَّه رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) نَحْوَ وَادِي الْقَرِي وَقَدْ أهدي لَهُ عَبْدُ أَسْوَد يُسَمَّي مِدْعَمًا، فَبَيْنَمَا هُوَ يَحُطُّ رَحْلَ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أصابه سَهْمٌ فَقَتَلَهُ فَقَالَ النَّاسُ: هَنِيئًا لَهُ الْجَنَّة فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى

---

[١] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

[١] بخاري. جهاد: ٣٠٧٤.

اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم). كَلاَّ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّ الشَّمْلَةَ الَّتِي أَخَذَهَا يَوْمَ خَيْبَرَ مِنَ الْمَغَانِمِ لَمْ تُصِبْهَا الْمَقَاسِمُ لَتَشْتَعِلُ عَلَيْهِ نَارًا، فَلَمَّا سَمِعُوا ذَلِكَ جَاءَ الرَّجُلُ بِشِرَاكٍ أَوْ شِرَاكَيْنِ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: شِرَاكٌ أَوْ شِرَاكَانِ مِنْ نَارٍ. رَوَاهُ الثلاثة[٢]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: ساڵی غەزای خەیبەر لە خزمەتی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەربێ) دەرچووین بۆ خەیبەر، لەوێ جل‌و بەرگ‌و شتومەك‌و ماڵاتمان بە تالانی گرت، بەلاَم زێڕو زیومان دەست نەکەوت، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بەرەو وادیلقورا کەوتەڕێ، خوڵامێکی رەشی هەبوو ناوی میدعەم بوو، بە دیاری درابوو پێی خەریك بوو بارگەکەی پێغەمبەری دادەگرت لەوحەلەدا تیرێ هات بە رێکەوت کوشتی، خەڵکەکەیش گوتیان: بەهەشتی پیرۆز بێ‌و نۆشی گیانی بێ، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: نەخێر وانییە، بەوکەسە کە گیانی منی وا لەدەسا، میدعەم وا لەناو ئەو باڵا پێچەدا کە لە تالانییەکەی رۆژی خەیبەر بردبووی بۆ خۆی، بەرلەوەی دابەش بکرێ، باڵا پۆشەکە لەبەریا گڕ گڕ دەسووتێ! خەڵکەکەیش کە گوێیان لەم قسەیەی حەزرەت بوو، زۆر ترسان‌و زەندەقیان چوو، پیاوێ چوو قەیتانێ یا دوو قەیتانی پێڵاوی هێنا بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمەم لە رۆژی خەیبەردا دەست کەوتووە، فەرمووی (درودی خودای لەسەربێ): قەیتانێکە یا فەرمووی: دوو قەیتانن لە ئاگر (ش/د).

**٤٥٣٢**- وَمات رجلٌ يَوْمَ خَيْبَرَ مِنْ الأَصْحَابِ فَبَلَغَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: صَلُّوا عَلَى صَاحِبِكُمْ فَتَغَيَّرَتْ وُجُوهُ النَّاسِ فَقَالَ: إِنَّ صَاحِبَكُمْ غَلَّ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، فَفَتَّشُوا مَتَاعَهُ فَوَجَدُوا خَرَزًا مِنْ خَرَزِ يَهُودَ لاَ يُسَاوِي دِرْهَمَيْنِ[٣]:

---

[٢] بخاري. مغازي: ٣٩٩٣ ، ٦٣٢٩. مسلم. إيمان: ٣٠٦. أبو داود. جهاد: ٢٧١١.

[٣] رواه ابو داود بسند صالح (شرحه).

لەرۆژی خەیبەردا پیاوێ لە یارانی پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر خۆی و رەزای خودا لە یارانی) دەمرێ، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئاگادار دەکەن، دەفەرموێ: خۆتان لەسەر هاورێکەتان نوێژ بکەن! ئیتر مەردومەکە رەنگیان تێکچوو" ئەویش هۆی ئەوەی بۆیان روونکردەوەو فەرمووی: چونکە ئەم هاورێیەی ئێوە دەس پیسی و ناپاکی لە ماڵی تالانی غەزاکردووە! کاتێ ناو کەل و پەل و شمەکەکەی دەپشکنن و لە شتە دزراوەکە دەگەڕێن، ملوانکەیەکی مووروو (لەو ملوانکانەی کە جوولەکەکانی خەیبەر لە ملیان دەکرد) دەدۆزنەوە، کە دوو درەمی نەدەهێنا! (د- س/صالح).

٤٥٣٣- ← (ب- ٣ز- ١٠٩ل- ٢٩٥ف- ١+ ف- ٢+ف- ٣)[٤]:

لێرەدا ئاوایە: ئەبو مەسعوود (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) منی کرد بە زەکاتکۆکەرەوەو ناردمی و فەرمووی: ئەی باوکی مەسعوود! بکەوەرە رێ و بڕۆ، بەلآم ئامان ئاگات لەخۆت بێ و دەسپیسی نەکەی، با لە رۆژی قیامەتدا نەتبینمەوە وشترێکی زەکاتت بە کۆڵەوە بێ، لە زەکاتەکە دزیبێتت، وشترەکە بە کۆڵتەوە بقوڕێنێ، منیش گوتم: کەوایە منیش ناچم، فەرمووی: دەی منیش بە زۆر ناتنێرم. (د- س/صالح).

٤٥٣٤- قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ فُلاَنًا قَدِ اسْتُشْهِدَ قَالَ: كَلاَّ قَدْ رَأَيْتُهُ فِي النَّارِ بِعَبَاءَةٍ قَدْ غَلَّهَا، ثُمَّ قَالَ: قُمْ يَا عُمَر فَنَادِ إِنَّهُ لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ إِلاَّ الْمُؤْمِنُونَ ثَلاَثًا. رَوَاهُ الترمذي ومسلم[٥]:

عەرزی حەزرەت (دروودی خودای گەورەی لەسەربێ) کرا: ئەی پێغەمبەری خودا! فیسارە کەس شەهید بوو، فەرمووی: نەخێر وانییە، من ئەوم دی، لەناو ئاگری دۆزەخدا بوو، لەسەر ئەو بالآ پۆشە کە لەماڵی تالانییەکە قولی دابوو

---

[٤] راجع مجلد ثالث. تسلسل/ ١٠٩ رقم: ١/ ٢٤٥٥ و ٢/ ٢٤٥٦ و ٣/ ٢٤٥٧.

[٥] مسلم. إيمان: ٣٠٥. ترمذي. سير: ١٥٧٤.

بۆ خۆی! لە دواییدا فەرمووی: ئەی عومەر! هەڵسە بڕۆ سێ جار بانگەواز بکە: کە ئەوەی موسوڵمان نەبێ و باوەڕدار نەبێ ناچێتە بەهەشت! (ت/م- نوقمی لێشاوی میهرەبانی خودا بن).

## ٦٩) سزای کەسێ دزی لە ماڵی تالانی بکا : (عقوبة الغَالّ)

٤٥٣٥- عَنْ عُمَرَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى الله عَلَيْهِ وَسَلّم) قَالَ: إِذَا وَجَدْتُمُ الرَّجُلَ قَدْ غَلَّ فَأَحْرِقُوا مَتَاعَهُ وَاضْرِبُوهُ قَالَ: فَوَجَدْنَا فِي مَتَاعِهِ مُصْحَفًا فَسَأَلْنا سَالِمًا عَنْهُ، فَقَالَ: بِعْهُ وَتَصَدَّقْ بِثَمَنِهِ. رَوَاهُ أبو داود والترمذي[1]:

عومەر (خودای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەگەر دیتان پیاوێ دزی لە ماڵی تالانی کردووە، کەلوپەلەکەی بسووتێنن و لێشی بدەن. گوتی: جارێ کابرایێ لە ماڵی تالانی دزی کردبوو قورئانێکمان لەناو شتومەکەکەیدا دۆزییەوە، کە ویستمان شتەکانی بسووتێنین بۆ قورئانەکە لە سالم پرسیارمان کرد، فەرمووی: بیفرۆشەو بەهاکەی بکە بە خێر. (د/ت- سند غریب).

٤٥٣٦- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ (رضي الله تَعَالَى عنهم) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلّٰى اللّٰهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ حَرَّقُوا مَتَاعَ الْغَالِّ وَضَرَبُوهُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ[2]:

عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکیەوە لە باپیریەوە (خودایان لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) و ئەبو بەکرو عومەر شتومەکی ئەو کەسەیان دەسووتاند، کە لە ماڵی تالانی دزی دەکرد، وە سەرەڕای ئەوە لێشیان دەدا (د).

---

[1] بسند غريب (شرحه).

[2] سكت عن درجته الشارح.

## ٧٠) باسی دیل: (الأسرى)

قال الله تعالى: {يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّمَن فِي أَيْدِيكُم مِّنَ الأَسْرَى إِن يَعْلَمِ اللّهُ فِي قُلُوبِكُمْ خَيْرًا يُؤْتِكُمْ خَيْرًا مِّمَّا أُخِذَ مِنكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَاللّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ} (٨/٧٠) واته:

ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! بفەرموو بەو دیلانەی وان لەبەر دەستانا: ئەگەر ئێوە دڵتان خێری تێدابێ، دەربارەی ئیسلام‌و موسوڵمانان‌و زانستی خودا بەوە وە تەعەللوق ببەستێ خودا زۆرترو چاکتر لەو ماڵەی وەرگیراوە لێتان دەداتەوە پێتان‌و بە زیادەوە هەقتان بۆ دەکاتەوەو لە تاوانەکانی لەمەو بەریشتان خۆش دەبێ، خودا تاوان پۆشەو بەندە بەخشەو بە بەزەیی‌و میهرەبانە.

٤٥٣٧-← (ب- ٦ز- ٤ل- ٨١ف- ١٩)[1].

لێرەدا دەفەرموێ: خودا تەعەججوب دەکاو سەیری دێ لە هۆزێ کە بە زنجیرو کۆتەوە دەچنە بەهەشتەوە. (ب/د- رەزای خودایان لێ بێ).

٤٥٣٨- وَعَنْهُ قَالَ: بَعَثَ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّٰى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) خَيْلاً قِبَلَ نَجْدٍ فَجَاءَتْ بِرَجُلٍ مِنْ بَنِى حَنِيفَةَ يُقَالُ لَهُ ثُمَامَةُ بْنُ أُثَالٍ سَيد أَهْلِ اليَمَّامَة فَرَبَطُوهُ بِسَارِيَةٍ مِنْ سَوَارِى الْمَسْجِدِ فَخَرَجَ إِلَيْهِ النَّبِىُّ (صَلّٰى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: مَاذا عِنْدَكَ يَا ثُمَامَةُ؟ فَقَالَ: عِنْدِى خَيْرٌ يَا مُحَمَّدُ إِنْ تَقْتُلْ تَقْتُلْ ذَا دَمٍ وَإِنْ تُنْعِمْ تُنْعِمْ عَلَى شَاكِرٍ، وَإِنْ كُنْتَ تُرِيدُ الْمَالَ فَسَلْ تُعْطَ مِنْهُ مَا شِئْتَ، فَتَرَكَهُ النَّبِيِّ (صَلّٰى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) حَتَّى كَانَ بَعْدَ الْغَدُ فَقَالَ: مَا عِنْدَكَ يَا ثُمَامَةُ؟ قَالَ: مَا قُلْتُ لَكَ فَتَرَكَهُ رَسُول اللّٰهِ (صَلّٰى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) حَتَّى كَانَ مِنْ الْغَدُ فَقَالَ: مَاذا عِنْدَكَ يَا ثُمَامَةُ؟ فَقَالَ: عِنْدِى مَا قُلْتُ لَكَ إِنْ تُنْعِمْ تُنْعِمْ عَلَى شَاكِرٍ، إِنْ تَقْتُلْ تَقْتُلْ ذَا دَمٍ وَإِنْ كُنْتَ تُرِيدُ الْمَالَ فَسَلْ تُعْطَ مِنْهُ مَا شِئْتَ فَقَالَ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّٰى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): أَطْلِقُوا ثُمَامَةَ فَذَهَبَ إِلَى نَخْلٍ قَرِيبٍ مِنَ الْمَسْجِدِ فَاغْتَسَلَ ثُمَّ دَخَلَ الْمَسْجِدَ فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدَهُ وَرَسُولَهُ. يَا مُحَمَّدُ وَاللّٰهِ مَا كَانَ عَلَى الأَرْضِ وَجْهٌ أَبْغَضَ إِلَيَّ مِنْ وَجْهِكَ فَقَدْ أَصْبَحَ وَجْهُكَ أَحَبَّ الْوُجُوهِ كُلِّهَا إِلَيَّ. وَاللّٰهِ مَا

---

[1] بخاري. جهاد: ٣٠١٠ ، ٤٥٥٧. تقدم في مجلد سادس. تسلسل/ ٤ رقم: ٣٧٧٢/١٩.

كَانَ مِنْ دِينٍ أَبْغَضَ إِلَيَّ مِنْ دِينِكَ فَأَصْبَحَ دِينُكَ أَحَبَّ الدِّينِ كُلِّهِ إِلَيَّ. وَاللّٰهِ مَا كَانَ مِنْ بَلَدٍ أَبْغَضُ إِلَيَّ مِنْ بَلَدِكَ فَأَصْبَحَ بَلَدُكَ أَحَبَّ الْبِلاَدِ كُلِّها إِلَيَّ، وَإِنَّ خَيْلَكَ أَخَذَتْنِي وَأَنَا أُرِيدُ الْعُمْرَةَ فَمَاذَا تَرَى؟ فَبَشَّرَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَأَمَرَهُ أَنْ يَعْتَمِرَ، فَلَمَّا قَدِمَ مَكَّةَ قَالَ لَهُ قَائِلٌ: أَصَبَوْتَ؟ قَالَ: لاَ، وَلَكِنْ أَسْلَمْتُ مَعَ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَلاَ وَاللّٰهِ لاَ يَأْتِيكُمْ مِنَ الْيَمَامَةِ حَبَّةُ حِنْطَةٍ حَتَّى يَأْذَنَ فِيهَا رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم). رَوَاهُ الثلاثة[٢]:

**دیسان ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خودای گەورەی لێ بێ و خودا بکا لە خاکوپای پیرۆزی ئەم زاتە موبارەکەدا حەشرو نەشر بکرێن) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودو سڵاوی خودای گەورەی لەسەربێ) **بڕکەیێ سواری بەرەو نەجد نارد، کە هاتنەوە پیاوێکی بەنی حەنیفەییان دیل کردبوو، لەگەڵ خۆیان هێنابوویان، ناوی ثومامەی کوڕی ئوثال بوو، سەر گەورەی خەڵکی یەمامە بوو، جا لەبەرئەوەی لەسەر دەمی حەزرەتدا بەندیخانەیان نەبوو (چونکە حوکمیان تا بڵێی سادەو پڕ دادو عەدالەت بوو، پێویستیان بە پۆلیس و کەلەپچەو زیندان نەبوو، لەبەرئەوە پیاوەکەیان بە کۆڵەکەیێ لە کۆڵەکەکانی مزگەوتەوە بەستەوە)، پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **چوو بۆ لای و فەرمووی: ئەی ثومامە! لات وایە چیت لێ دەکەم؟؟ ئەویش گوتی: ئەی موحەممەد! ئومێدی خێرت لێ دەکەم: چونکە تۆ پیاوێکی هەققانی، لەبەرئەوە ئەوەی تۆ بیکوژی شایانی کوشتنە، وە ئەوەی تۆ پیاوەتی دەربارەبکەی مایەی سوپاس و شانازییە بۆی، خۆ ئەگەر پارەو ماڵیشت دەوێ چەندە حەز دەکەی داوا بکە دەتدەمێ، جا پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **وازی لێ هێنا و بۆ دوو سبەی فەرموویەوە: ئەی ثومامە! لات وایە کە چیت لێ دەکەم؟ ئەویش گوتی: هەر ئەوەیە کە پێم گوتووی! پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **ئەو ڕۆژەیش وازی لێ هێنایەوەو بۆ سبەینێ فەرموویەوە: ئەی ثومامە! لات وایە چیت لێ دەکەم؟ گوتی: هەر ئەوەیە کە ئەو ڕۆژە پێم گوتووی: ئومێدی خێرت لێ دەکەم: چونکە ئەوەی تۆ دەیکوژی شایانی کوشتنە وە ئەوەی تۆ پیاوەتی لەگەڵ دەکەی مایەی سوپاس کردنە، کەواتە**

---

[٢] تجريد البخاري/ ٤/ ٣٦٠ رقم: ١٦٠٧ = ٤٣٧٢ ، ٤٦٢٠ ، ٤٦٩ ، ٢٤٢٢ ، ٢٤٢٣. مسلم. مغازي: ٤٥٦٤.

بۆ منیش چ بمکوژیت و چ پیاوەتیم لەگەڵ بکەی جێگەی خۆیەتی، خۆ ئەگەر دەتەوێ بە پارەو ماڵیش بەرم بدەی چەندەت دەوێ داوابکە دەیدەم پێت، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ثومامە بەردەن ثومامە رۆیشت لەناو باخە خورمایەکا، کە لە نزیکی مزگەوتەوە بوو لەوێ خۆی شۆردو هاتەوە بۆ مزگەوت و گوتی:

أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدَهُ وَرَسُولَهُ:

شایەتی دەدەم کە هەر خودا خودایەو هیچ خودایەکی تر نییە، موحەممەدیش بەندەو پێغەمبەری خودایە. ئەی موحەممەد! بە زاتی خودا لەمەو پێش کەس نەبوو لەسەر رووی زەوی کە بەقەد تۆ رقم لێی بێ، بەلام ئێستاکە کەس نییە کە بەقەد تۆ خۆشم بوێ، هەروەها ئایینەکەت و ولاتەکەیشت، بەزاتێ کە زاتی خودایە، دین نەبووە کە بەقەد دینەکەی تۆ رقم لێی بێ، بەلام ئێستاکە دینەکەی تۆم لەهەموو دینێکی تر خۆشتر دەوێ، بە زاتێ کە زاتی خودایە ولات نەبووە کە بەقەد ولاتەکەی تۆ رقم لێی بێ، بەلام ئێستا ولاتەکەی تۆ خۆشەویستترین ولاتە لەلام، من لەوکاتەدا کە سوارەکانی تۆ گرتمیان دەمویست عەمرە بکەم، بۆ ئەمە چی دەفەرمووی؟ پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) مزگێنی دایەو فەرمانی پێکرد کە عەمرەکەی بکا، جا کە دەچێ بۆ مەککە یەکێ پێی دەڵێ: ئەوە لە دینی خۆت وەرگەڕاویت و بوویت بە صوببی؟ گوتی: نەخێر نەبووم بە صوببی، بەلام موسوڵمان بووم و دینی پێغەمبەری خودام وەرگرتووە دەسا بەزاتی خودا یەك دەنك گەنمتان لە یەمامەوە بۆ نایەت تا رەزای پێغەمبەری لەسەر نەبێ! (ش/د).

٤٥٣٩- → (ب- ٣ز- ٣٩ل- ٩٠ف- ٢)[٣].

٤٥٤٠- عَنْ عَلِيّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّهُ فَرَّقَ بَيْنَ جَارِيَةٍ وَوَلَدِهَا، فَنَهَاهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عَنْ ذَلِكَ وَرَدَّ الْبَيْعَ. رَوَاهُما أَبُو دَاوُدَ والترمذي (بسند حسن) وَلَفْظُهُ (على

---

[٣] تقدم في مجلد ثالث. تسلسل/ ٣٩ رقم: ٢/ ٢١١٥.

ما جاء في الشرح): مَنْ فَرَّقَ بَيْنَ الْوَالِدَةِ وَوَلَدِهَا فَرَّقَ اللَّهُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ أَحِبَّتِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ[٤]:

عەلی (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: کەنیزەکێکم هەبوو، منداڵێکی هەبوو" منداڵەکەیم فرۆشت و لەیەکم دابڕین، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) کە بەمەی زانی نەیهێشت و فرۆشتنەکەی هەڵوەشاندەوە (د/ت– س/ح) گفتەی (ت): هەر کەسێ دایکە و بەچکە لەیەکتری بکا و لە یەکیان دابڕێ، خودا لە ڕۆژی قیامەتدا ئەویش لە دۆست و یارانی خۆی دابڕ دەکا.

## ٧١) فەرمانڕەوا بۆی هەیە کە دیل بە پیاوەتی ئازادبکا، یا سەرانی لێ وەربگرێ، یا بیکوژێ : (للأمير المن والفداء والقتل)

قَالَ الله تعالى: {فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاء حَتَّى تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا} (٤/٤٧):

واتە: جا دوا ئەوە یا بە منەت و پیاوەتی بە خۆڕایی بەرەڵایان بکەن، یا بیانگۆڕنەوە لەگەڵ دیلەکانی خۆتانا کە لەلای دوژمنن، یا لە تۆڵەی خۆیاندا ئەندازەیێ ماڵیان لێ وەربگرن، تا باری قورسی جەنگ لادەچێ و جەنگ تەواو دەبێ!

٤٥٤١- عَنْ عَلِيّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِنَّ جِبْرَائِيلَ هَبَطَ عَلَيْهِ فَقَالَ لَهُ: خَيِّرْ أَصْحَابَكَ فِي أُسَارَى بَدْرٍ: الْقَتْلَ أَوِ الْفِدَاءَ، عَلَى أَنْ يُقْتَلَ مِنْهُمْ قَابِلَ مِثْلُهُمْ قَالُوا: الْفِدَاءَ وَيُقْتَلَ مِنَّا[١]:

عەلی (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: جوبرائیل هاتە لام فەرمووی پێم: یارانی خۆت بکە بە سەرپشك لەبارەی دیلەکانی غەزای بەدرەوە: یا دەبێ بیانکوژن، یا ئەگەر بێتو بە سەرانە

---

[٤] بسند حسن (شرحه).

[١] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

بەرەڵایان بکەن دەبێ لە ساڵی ئایندەدا بەقەد ئەوانیان لێ بکوژرێ گوتی: یاران گوتیان: سەرانەمان دەوێ بالێمان بکوژرێ! (ت- س/ح).

٤٥٤٢- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَدَى رَجُلَيْنِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ بِرَجُلٍ مِنَ الْمُشْرِكِينَ. رَوَاهُما الترمذي[٢]:

عیمرانی کوڕی حوصەین (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە تۆڵەی دوو پیاوی موسوڵماندا کە دیل بوون لەلای کافران پیاوێکی کافری بەردا (ت- س/ص).

٤٥٤٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) جَعَلَ فِدَاءَ أَهْلِ الْجَاهِلِيَّةِ يَوْمَ بَدْرٍ أَرْبَعَمِائَةٍ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي[٣]:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودای گەورەیان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بڕیاریدا کە سەرانەی هەریەکێ لە دیلە بێ بڕواکانی غەزای بەدر چوار سەد درەم بێ کە دەکاتە هەزارو دوو سەد قیرشی میصری (د/ن- سند موثق).

٤٥٤٤- عَنْ مَرْوَانَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ وَفْدُ هَوَازِنَ مُسْلِمِينَ إِلى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَسَأَلُوهُ أَنْ يَرُدَّ إِلَيْهِمْ أَمْوَالَهُمْ وَسَبْيَهُمْ فَقَالَ لَهُمْ: أَحَبُّ الْحَدِيثِ إِلَيَّ أَصْدَقُهُ فَاخْتَارُوا إِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ إِمَّا السَّبْيَ وَإِمَّا الْمَالَ وَقَدْ كُنْتُ اسْتَأْنَيْتُ بِهِمْ فَكَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) انْتَظَرَ آخرهُمْ بِضْعَ عَشْرَةَ لَيْلَةً حِينَ قَفَلَ مِنَ الطَّائِفِ قَالُوا: إِنَّا نَخْتَارُ سَبْيَنَا فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فِي الْمُسْلِمِينَ فَأَثْنَى عَلَى اللَّهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ ثُمَّ قَالَ: أَمَّا بَعْدُ فَإِنَّ إِخْوَانَكُمْ هَؤُلاَءِ قَدْ جَاءُونَا تَائِبِينَ وَإِنِّي رَأَيْتُ أَنْ أَرُدَّ إِلَيْهِمْ سَبْيَهُمْ مَنْ أَحَبَّ أَنْ يُطَيِّبَ فَلْيَفْعَلْ، وَمَنْ أَحَبَّ مِنْكُمْ أَنْ يَكُونَ عَلَى حَظِّهِ حَتَّى نُعْطِيَهُ إِيَّاهُ مِنْ أَوَّلِ مَا يُفِيءُ اللَّهُ عَلَيْنَا فَلْيَفْعَلْ فَقَالَ النَّاسُ: قَدْ طَيَّبْنَا ذَلِكَ لَهُمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): إِنَّا لاَ نَدْرِي مَنْ أَذِنَ مِنْكُمْ فِي ذَلِكَ مِمَّنْ لَمْ يَأْذَنْ فَارْجِعُوا

---

[٢] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[٣] رواه أبو داود والنسائي بسند موثق (شرحه).

حَتَّى يَرْفَعُوا إِلَيْنَا عُرَفَاؤُكُمْ أَمْرَكُمْ فَرَجَعَ النَّاسُ فَكَلَّمَهُمْ عُرَفَاؤُهُمْ، ثُمَّ رَجَعُوا إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَأَخْبَرُوهُ أَنَّهُمْ قَدْ طَيَّبُوا وَأَذِنُوا. رَوَاهُ البخاري و أَبُو دَاوُدَ[٤]:

مەڕوان (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: هۆزی هەوازین، لەپاش تەواو بوونی غەزای حونەین ئیسلام بوون‌و دەستەیەکیان هاتن بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) داوایان لێی کرد کە ماڵ‌و ژن‌و خێزانە بەدیلگیراوەکانیان پێ بداتەوە، ئەویش پێی فەرموون: من بەش بەحاڵی خۆم حەزم لە قسەی راستە، قسەو گوفتوگۆ هەتا راستتر بێ خۆشەویستترە لەلای من. کەوابوو یەکێ لەم دوو شتە هەڵبژێرن: یا دیلەکانتان پێ دەدەمەوە، یا ماڵەکانتان. من گەلێکیش چاوەڕوانیم کردن، سا بەشکوو ئێوە ئیسلام بن‌و بێن، هەتا شتەکانتان بدەمەوە بەڵام ئێوە هەر نەهاتن بۆیە منیش شتەکانم دابەش کرد، بەسەر جەنگاوەرەکانا. ئەوەبوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە لە طائیف گەڕایەوە دە شەو پتر چاوەنواڕی ئەوانی کرد، سا بەڵکوو بچن بۆلای، وەفدەکەیش گوتیان: دیلەکانمان دەوێتەوە. ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هەڵسایەوە لەناو موسوڵمانەکاندا وتارێکی داو سوپاس‌و ستایشێکی جوانی خودای گەورەی کردو فەرمووی: لەپاش سوپاس‌و ستایشی خودا ئەم برادەرانە کە برای دینی ئێوەن کە نوێنەری هەوازینن پەشیمان بوونەتەوە لە کاری ناشیرینی خۆیان‌و ئیسلام بوون‌و هاتوون بۆلامان، منیش لەبەرئەوە بڕیارم داوە کە ژن‌و منالە بەدیل گیراوەکانیان پێ بدەمەوە، بەڵام ئێوە بە کەیفی خۆتان یەکێ لەم دوو رێگەیە هەڵبژێرن: یەکەم هەرکامێکتان پێی خۆشە کە بە پیاوەتی بەشی خۆی رەت بکاتەوەو بیداتەوە پێیان ئەوە زۆر باشە، دووەم هەرکامێکتان پێی خۆشە کە لەسەر بەشی خۆی بمێنێ با بمێنێ، بەڵام ئێستا رەتی بکاتەوە، تا لە یەکەم تالانی کە خودا دەیرەخسێنێ بۆمان تۆڵەی ئەوەی بۆ دەکەینەوە مەردومەکەش عەرزیان کرد: قوربان! لەبەر خاتری تۆ هەمووومان حەز دەکەین بە پیاوەتی، بەبی وەجەڵ بیان دەینەوە،

---

[٤] بخاري. فرض الخمس: ٣١٣١ ، ٣١٣٢.

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرموی: ئێمە نازانین بۆ ئەم مەسەلەیە کێ ڕازی بووەو کێ ڕازی نەبووە، بڕۆنەوەو لە دواییدا سەرکارو چاوەشەکانتان وەڵامەکانی ئێوەمان بە بوون و نەبوون بۆ بێننەوە خەڵکەکەش ڕۆیشتنەوە سەر کارەکانیان یەکە یەکە قسەیان لەگەڵ کردن هاتنەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەرو عەرزیان کرد: کە خەڵکەکە بە خۆشنوودی و ڕەزامەندیی خۆیان دەیاندەنەوە پێیان (ب/د).

## ٧٢) هەرکاتێ بەندەیێ ئیسلام بوو، وە هاتە ناو موسوڵمانانەوە ئیتر نادرێتەوە بە خاوەنی : (إذا أسلم الرقيق لا يرد)

٤٥٤٦- ← (ب- ٥ز- ٩ل- ٦٧ف- ١٠)[١].

لێرەدا لە کۆتایی فەرموودەکەدا دەڵێ: ئیتر نەیدانەوە پێیان و فەرمووی (درودی خودای لەسەربێ): ئەوانە ئازادکراوی خودای گەورەو مەزنن.

## ٧٣) خواردنی شتی خواردەمەنی لەپێش دابەش کردنا لەخاکی دوژمندا بۆ هەموو شەڕکەرێ ڕەوایە : (إباحة الطعام في أرض العدو)

٤٥٤٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: أَصَبْتُ جِرَابًا مِنْ شَحْمٍ يَوْمَ خَيْبَرَ فَالْتَزَمْتُهُ فَقُلْتُ: لاَ أُعْطِي الْيَوْمَ أَحَدًا مِنْ هَذَا شَيْئًا قَالَ، فَالْتَفَتُّ فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ مُتَبَسِّمًا. رَوَاهُ الثلاثة[١]:

عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: لە ڕۆژی غەزای خەیبەردا هەمانەیێ پیوم چنگ کەوت، هەڵم گرت بۆ خۆم و گوتم: ئەمە ئەمڕۆ بۆ خۆم و بەشی کەسی تری لێ نادەم، گوتی: کە ئاوڕم دایەوە سەیرم کرد وا

---

[١] تقدم في مجلد خامس. تسلسل / ٩ رقم: ١٠/ ٣٢٩٧.

[١] بخاري. فرض الخمس: ٣١٥٣ ، ٤٢١٤ ، ٥٥٠٨. مسلم. مغازي: ٤٥٨٠. أبو داود. جهاد: ٢٧٠٢. نسائي. ضحايا: ٤٤٤٧.

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لەوێ بوو گوێی لە قسەکەم بوو پێ دەکەنی (ش/د).

٤٥٤٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضى الله تَعَالَى عنهما) قَالَ: كُنَّا نُصِيبُ فِي مَغَازِينَا الْعَسَلَ وَالْعِنَبَ فَنَأْكُلُهُ وَلاَ نَرْفَعُهُ. رَوَاهُ البخاري[٢]:

ئیبنو عومەر (خۆشنوودی خودایان لێ بێ) فەرمووی: جاران لە غەزادا هەنگوین و ترێ و میوەو شتی وامان دەست دەکەوت، بۆ خۆمان دەمان خواردو نەمان دەبردە خزمەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ). (ب- جێگەی بەهەشتی بالاّ بێ).

٤٥٤٩- وَعَنْهُ أَنَّ جَيْشًا غَنِمُوا فِي زَمَانِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) طَعَامًا وَعَسَلاً فَلَمْ يُؤْخَذْ مِنْهُمُ الْخُمُسُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ[٣]:

دیسان فەرمووی: لە سەردەمی پێغەمبەر خۆیدا (درودی خودای لەسەربێ) لەشکرێ هەندێ خواردەمەنی و هەنگوینیان بە تالاّنی گرتبوو، وەلێ هیچ پێنج یەکیان لێ نەسەندن! (د- بە رشتەیەکی باش).

٤٥٥٠- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا نَمُرُّ بِقَوْمٍ فَلاَ هُمْ يُضَيِّفُونَا وَلاَ هُمْ يُؤَدُّونَ مَا لَنَا عَلَيْهِمْ مِنَ الْحَقِّ وَلاَ نَأْخُذُ مِنْهُمْ فَقَالَ: النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): إِنْ أَبَوْا إِلاَّ أَنْ تَأْخُذُوا كَرْهًا فَخُذُوا. رَوَاهُ الترمذي[٤]:

عوقبەی کوڕی عامیر (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: گوتم: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! جاری وا رێ دەکەوێ ئێمە لە شوێنێکەوە تێ دەپەڕین، نە خەڵکەکە میوانداریمان پێ دەکەن، واتە هەقی خۆمان کە بەهۆی میوانەتییەوە لە سەریانە نامان دەنێ، وە نە خۆشمان هیچیان لێ دەسەنین، بە پارە یا بە خۆڕایی، لەبارو دۆخی ئاوەهاییدا ئێمە چی بکەین؟ فەرمووی:

---

[٢] بخاري. فرض الخمس: ٣١٥٤.

[٣] بسند صالح (شرحه).

[٤] بسند حسن (شرحه).

ئەگەر هەرملیان نەدا مەگەر بەزۆر ئەوا لەکاتی ناچاریدا بە زۆر شتیان لێ بستێنن بە ئەندازەی پێویستیی خۆتان‌و بەس (ت- س/ح).

## ٧٤) دیاری لە فرەخوا وەرناگیرێ: (هدیة المشرك مردودة)

٤٥٥١- عَنْ عَلِيّ (رضي الله تَعَالَى عنه) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَبلَ هَدِيَة كِسْرَى وَأَنَّ الْمُلُوكَ أَهْدَوْا إِلَيْهِ فَقَبِلَ مِنهُمْ. رَوَاهُ الترمذي بسند صحيح[1]:

عەلی (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دیاریی لە کیسرا وەرگرت، چەند پادشایێ دیارییان پێشکەشی پێغەمبەر دەکرد، ئەویش لێی وەردەگرتن. (ت- س/ص- د).

٤٥٥٢- عَنْ عِيَاضِ بْنِ حِمَارٍ أَنَّهُ أَهْدَى لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) هَدِيَّةً أَوْ نَاقَةً، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَسْلَمْتَ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: فَإِنِّي نُهِيتُ عَنْ زَبْدِ الْمُشْرِكِينَ. رَوَاهُ الترمذي وَأَبُو دَاوُدَ[2]:

عییاضی کوڕی حیمار گوتی: دیارییەکەم برد بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) یا گوتی: وشترە مێنگەیەکم بە دیاری برد بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئایا ئیسلام بووی؟ گوتی گوتم: نەء، فەرمووی: دەمن دەسەنەی هاوبەشپەیداکەرانم لێ قەدەغەکراوە (ت- س/ص- د).

## ٧٥) لە ناودانی ماڵی کافران دروستە : (يجوز إتلاف مال الكفار)

٤٥٥٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضي الله تَعَالَى عنهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَطَعَ نَخْلَ بَنِي النَّضِيرِ وَحَرَّقَ وَلَهَا يَقُولُ حَسَّانُ[1]:

وَهَانَ عَلَى سَرَاةِ بَنِي لُؤَيّ ... حَرِيقٌ بِالْبُوَيْرَةِ مُسْتَطِيرُ

---

[1] سنده صحيح عند الترمذي.

[2] سنده صحيح عند الترمذي (شرحه).

[1] بخاري. جهاد: ٣٠٢١. مسلم. مغازي: ٤٥٢٨.

وَفِها نَزَلَتْ (مَا قَطَعْتُمْ مِنْ لِينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَى أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ الله وَلِيَخْزِيَ الفَاسِقِينَ). روَهُ الْشَّيخان وَالترمذي.

ئەم فەرموودەیە لە بەرگی حەوتدا لە سوورەتی حەشردا رابوورد، وەلێ لێرە ئەمەی پترە: بەم بوونەوە حەسسان (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی:

وَهَانَ عَلَى سَرَاةِ بَنِي لُؤَيّ ... حَرِيقٌ بِالْبُوَيْرَةِ مُسْتَطِيرُ

واته:

بلێسەی ئاگرێ لە بووەیرە بەرزە ... سەرۆكی قورەیشی پێ كەوتۆتە لەرزە!

سەبارەت بەم بابەتە ئەم ئایەتە هاتە خوارێ: {مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَى أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ اللَّهِ وَلِيُخْزِيَ الْفَاسِقِينَ}، لە تەفسیری سوورەتی حەشردا رابورد بڕوانە (بەرگی٧/ زنجیرە/٤٢ رقم:٢/٤١٢٢).

## ٧٦) رێكەوتن و پێكهاتن (صولح و هودنە: شەڕ راگرتن: شەڕ راوەستان): الصلح والهدنة

٤٥٥٤- عَنِ الْبَرَاءِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمَّا أُحْصِرَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عِنْدَ الْبَيْتِ صَالَحَهُ أَهْلُ مَكَّةَ عَلَى أَنْ يَدْخُلَهَا فَيُقِيمَ بِهَا ثَلاثًا وَلاَ يَدْخُلَهَا إِلاَّ بِجُلُبَّانِ السِّلاَحِ السَّيْفِ وَقِرَابِهِ وَلاَ يَخْرُجَ بِأَحَدٍ مَعَهُ مِنْ أَهْلِهَا وَلاَ يَمْنَعَ أَحَدًا يَمْكُثُ بِهَا مِمَّنْ كَانَ مَعَهُ قَالَ لِعَلِيّ: اكْتُبِ الشَّرْطَ بَيْنَنَا بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ هَذَا مَا قَاضَى عَلَيْهِ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ فَقَالَ لَهُ الْمُشْرِكُونَ: لَوْ نَعْلَمُ أَنَّكَ رَسُولُ اللَّهِ تَابَعْنَاكَ وَلَكِنِ اكْتُبْ مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، فَأَمَرَ عَلِيًّا أَنْ يَمْحَاهَا فَقَالَ: لاَ وَاللَّهِ لاَ أَمْحَاهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): أَرِنِي مَكَانَهَا فَأَرَاهُ مَكَانَهَا، فَمَحَاهَا، وَكَتَبَ ابْنُ عَبْدِ اللَّهِ، فَأَقَامَ بِهَا ثَلاثَةَ أَيَّام فَلَمَّا أَنْ كَانَ الْيَوْمُ الثَّالِثِ قَالُوا لِعَلِيّ: هَذَا آخِرُ يَوْمٍ مِنْ شَرْطِ صَاحِبِكَ فَأْمُرْهُ فَلْيَخْرُجْ فَأَخْبَرَهُ بِذَلِكَ فَقَالَ: نَعَمْ فَخَرَجَ. رَوَاهُ الثَلاثَة[1]:

---

[1] تجریدی بوخاري/ ٣/ ٢٣٣ رقم: ١١٢٨ = ٢٦٩٩. مسلم. مغازی: ٤٦٠٥. أبو داود. مناسك: ١٨٣٢. تحفة الأشراف: ١٨٧١.

بەراء (ڕەزای خودای مەزنی لێ بێ) دەفەرمویێ: ساڵی ڕێکەوتنی حودەیبییە کە ناموسوڵمانەکان ڕێگەی پێغەمبەرو یارانیان نەدا کە بچن بۆ کردنی عەمرە، لە ئەنجامـدا خـەڵکی مەککـە لەگـەڵ پێغەمبـەردا (دروودی خـودای لەسـەربێ) ڕێکـەوتن لەسـەر ئەمـە: کـە پێغەمبـەرو یـارانی بـچنە نـاو مەککـەوەو سـی ڕۆژ لـەوێ بمێننـەوە، بـەو مەرجـە کـە چـەك‌و شمـشێرەکانیان لـەناو کێلانـدا بـێ، وە کەسیش لـە خـەڵکی مەککە لەگەڵ خۆیـدا نـەبا، وە ئەگـەر کەسـێ لـە یـارانی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەربێ) ویـستی لـە مەککـە بمێنێتـەوە ڕێگـەی بـدا. حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) بە عەلی فەرموو: مەرجەکە لە نێوانمانا لەسەر ئەم شێوەیە بنووسە: بەناوی یەزدانی بەخشندەی میهرەبان ئەمە ئەو ڕێکەوتن نامەیەیـە کـە موحەممـەدی پێغەمبـەری خـودا ڕێکـەوتووە لەسـەری.. فـرە خوداکان گوتیان: ئیمە ئەگەر بزانین کە تۆ پێغەمبەری خودای ئیسلام دەبین‌و پەیڕەویت دەکەین، کەواتە شتی وانابی، بەڵام بنووسە: موحەممەدی کوڕی عەبـدوڵلا، حـەزرەت (دروودی خـودای لەسـەربێ) فـەرمووی بـە عـەلی کـە وشـەی (پێغەمبەری خودا) بکوژێنێتەوەو لە شوێنی ئەوە وشەی (کوڕی عەبدوڵلا) بنووسـێ. بـەڵام عـەلی (خـودای لێ ڕازی بـێ) فـەرمووی: نـا، بـەخودا نایـسڕمەوە، فـەرمووی (دروودی خـودای لەسـەربێ): جێگەکـەیم پێنیـشان بـدە، مـن خـۆم دەیکوژێنمەوە ئەویش پێی نیشاندا، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وشـەی (پێغەمبـەری خـودا)ی کوژانـەوەو فـەرمانی بـە عـەلی فـەرموو نووسـی: ئەمـە ئەوەیـە کـە موحەممـەدی کـوڕی عەبـدوڵلا لەگـەڵ قوڕەیـشدا لـە سـەری ڕێکەوتوون. لەساڵی ئاییندەدا بە پێی بەندەکانی ئەم ڕێکەوتنە پێغەمبەرو هاوڕێیانی هاتنەوەو عەمرەیان بەجێ هێناو سێ ڕۆژ لەناو مەککەدا مانەوە، لەسـەری ڕۆژی سـێیەمدا خەڵکەکـە بـە عـەلییان گـوت: بـە پێـی مەرجەکـە هاوڕێکـەت ئـەمڕۆ دوا ڕۆژیـەتی، دەی پێـی بڵـێ با بڕوا، عـەلیش پێـی گـوت، ئـەویش فـەرمووی: بـەڵێ باشـە! ئینجـا پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەشـار دەرچوو (ش/د).

٤٥٥٥- عَنِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّهُمُ اصْطَلَحُوا عَلَى وَضْعِ الْحَرْبِ عَشْرَ سِنِينَ يَأْمَنُ فِيهِنَّ النَّاسُ وَعَلَى أَنَّ بَيْنَنَا عَيْبَةً مَكْفُوفَةً وَأَنَّهُ لاَ إِسْلاَلَ وَلاَ إِغْلاَلَ[٢]:

میسوەری کوڕی مەخرەمە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: هەردوو لا لە رێکەوتننامەکەی رێکەوتنی حودەیبیەدا لەسەر ئەمە رێك کەوتن: کە هەتا دە ساڵ جەنگ و شەڕو هەرا نەمێنێ هەتا لەو ماوەیەدا هەموو کەسێ هێمن ببێتەوە و لە ماڵ و حاڵ و گیانی خۆیان ئەمین بن و هەردوولا لە ئاستی یەك دڵیان ساف بێ و سینەیان بێ کینەبێ و گزی و دزی و پیسی و دەسپیسی لەگەڵ یەکتری نەکەن! (د- سند صالح).

٤٥٥٦- قَالَ جُبَيْرِ بْنِ نُفَيْرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): أَنْطَلِقْنا إِلَى ذِي مِخْبَرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) فَسَأَلْنَاهُ عَنِ الْهُدْنَةِ فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَقُولُ: سَتُصَالِحُونَ الرُّومَ صُلْحًا آمِنًا وَتَغْزُونَ أَنْتُمْ وَهُمْ عَدُوًّا مِنْ وَرَائِكُمْ. رَوَاهُما أَبُو دَاوُدَ[٣]:

جوبەیری کوڕی نوفەیر (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: رۆیشتین بۆ لای ذی میخبەر (خودای لێ رازی بێ) لە بارەی پێکهاتن (هودنە)کەوە پرسیارمان لێ کرد، فەرمووی: بە گوێی خۆم ژنەوتم لە پێغەمبەری خودا، دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەربێ): رۆژێ دێ ئێوەو رۆم لەناو خۆتانا رێك کەوتنێ سازدەدەن، رێك کەوتنێکی هێمنی بی ترس، هەردوولا لە یەکتری دڵنیا دەبن، ئەوجا هەردوو لاتان ئێوەو ئەوان لەگەڵ دوژمنێکی خۆتاندا شەڕ دەکەن و هێرش دەبەنە سەری (د- سند صالح= ئەبو داوود گێڕاویەتەوە بە رشتەیەکی باش).

[٢] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

[٣] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

## ٧٧) هەموو موسوڵمانێ بۆی هەیە ئامان بدا بەکێ خۆی ئارەزوو دەکا: المسلم يؤمن من يشاء

٤٥٥٧- عَنْ أُمِّ هَانِئٍ بِنْتِ أَبِي طَالِبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ زَعَمَ ابْنُ أُمِّي عَلِيٌّ أَنَّهُ قَاتِلٌ رَجُلاً قَدْ أَجَرْتُهُ فُلاَنَ بْنَ هُبَيْرَةَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): قَدْ أَجَرْنَا مَنْ أَجَرْتِ يَا أُمَّ هَانِئٍ. رَوَاهُ البخاري وَ أَبُو دَاوُدَ والترمذي لفظه: أَجَرْتُ رَجُلَيْنِ مِنْ أَحْمَائِي، فَقَالَ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): قَدْ أَمَّنَّا مَنْ أَمَّنْتِ[1]:

**ئوممو هانی کچی ئەبو طالیب (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: عەرزی حەزرەتم کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! عەلی برام، کە برای دایکی‌و باوکیمە دەیەوێ ئەو پیاوە بکوژێ، منیش پەنای ئەوم داوە، پیاوەکە جەعدەی کوڕی هوبەیرەیە، کە هەنەزای منە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەی دایکی هانی! پەنای ئەو کەسەمان دا کە تۆ پەنایت داوە! (ب/د/ت) گفتەی (ت): دوو پیاوی خزمی شووەکەم پەنایان هێنابوو بۆ من، منیش پەنایانمدا، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوەی تۆ ئەمانی پێ بدەی ئێمەیش ئەمانی پێ دەدەین!**

٤٥٥٨- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِـيَ اللَّـهُ عَنْـهُ) عَـنِ النَّبِـيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: ذِمَّةُ الْمُسْلِمِينَ وَاحِدَةٌ يَسْعَى بِهَا أَدْنَاهُمْ. رَوَاهُ الترمذي والبخاري[2]:

**عەلی (رەزای خودای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەماندان‌و پەیمانی موسوڵمانان یەکە، هەرە بچووکی موسوڵمانان دەتوانێ ئامان‌و پەیمان بدا بەکێ خۆی ئارەزوو دەکا (ت/ب).**

٤٥٥٩- وَللإمام أحمد (على ما جاء في الشرح) الْمُسْلِمُونَ تَتَكَافَأُ دِمَاؤُهُمْ وَهُمْ يَدٌ عَلَى مَنْ سِوَاهُمْ يَسْعَى بِذِمَّتِهِمْ أَدْنَاهُمْ[3]:

---

[1] بخاري. جزية: ٣١٧١.

[2] تعليق ترجم به البخاري الباب الرقم/ ١٠ من كتاب الجزية والموادعة قبل رقم: ٣١٧٢.

[3] سكت عن درجته الشارح.

ئیمامی ئەحمەد (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەگێڕێتەوە، لەسەر فەمایشتی شەرحەکەی تاج، دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرموویەتی: موسوڵمانان لەناو خۆیانا کەسیان لە کەسیان زیاتر نییەو خوێن‌و سەریان هاوتای یەکترە، دەبێ ئەوان لەناو خۆیانا یەك دڵ‌و یەك دەست بن‌و دەشێ پشتی یەکتری بگرن‌و یاریدەی یەکتری بدەن‌و لە دژی ئەوانەی کە لە میللەتی خۆیان نین یەك بگرن!

لە هەمان کاتا: خوارینترینیان، مافی ئەوەی هەیە کە ئامان‌و پەیمان بدا بەکێ کە خۆی ئارەزوو بکا.

## ٧٨) نوێنەر (رەسووڵ: فرستادە) ناکوژرێ : (الرسل لا تقتل)

٤٥٦٠- عَنْ نُعَيْمِ بْنِ مَسْعُودٍ الأَشْجَعِيِّ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَقُولُ لِرَسولي مُسَيْلِمَةَ حِينَ قَرَآ كِتَابَه: مَا تَقُولاَنِ أَنْتُمَا؟ قَالاَ: نَقُولُ كَمَا قَالَ، قَالَ: أَمَا وَاللَّهِ لَوْلاَ أَنَّ الرُّسُلَ لاَ تُقْتَلُ لَضَرَبْتُ أَعْنَاقَكُمَا. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والإمام أحمد (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ)[1]:

نوعەیمی کوڕی مەسعوودی ئەشجەعی (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: کاتێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) نامەکەی موسەیلەمەی کەذذابی درۆزنی خوێندەوە، بۆ خۆم گوێم لێ بوو بە دوو فرستادەکەی موسەیلەمەی فەرموو: ئەی ئێوە دەڵێن چی؟ گوتیان: ئەو چی دەڵێ ئێمەیش هەروا دەڵێین‌و باوەڕمان بە داواکەی هەیە!

فەرمووی (درودی خودای لەسەربێ): ئەدی بە خودا رابەرو فرستادە ناکوژرێ ئەگینا لە گەردنی هەردوکتانم دەدا (د/ئە- رەزای خودایان لێ بێ).

---

[1] سکت عن درجته الشارح.

## ٧٩) سیخوڕو خەفیێ دەکوژرێ: (الجاسوس يقتل)

**٤٥٦١-** عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عَيْنٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ وَهْوَ فِي سَفَرٍ، فَجَلَسَ مَعَ أَصْحَابِهِ يَتَحَدَّثُ ثُمَّ انْفَتَلَ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): اطْلُبُوهُ فَاقْتُلُوهُ قَالَ: فَقَتَلَهُ فَنَفَّلَنِي سَلَبَهُ. رَوَاهُ البخاري و أَبُو دَاوُدَ[1]:

**سەلەمەی کوڕی ئەکوەع (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: لە سەفەرێکا سیخوڕێکی بتپەرستەکان بۆ خەفیێەتی هاتە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ)و لەگەڵ یارانیا دانیشت و دەمووی دووی تاقی کردنەوەو لە ناکاوێکا خۆی دزییەوەو فرتەی لێ کرد! حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئادەی بگەڕێن بۆی و بیکوژن سەلەمە فەرمووی: من خۆم دۆزیمەوەو کوشتم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کەلوپەلەکەی جاسووسەکەی بە بەخشیش دا بەخۆم (ب/د).**

**٤٥٦٢-** عَنْ فُرَاتِ بْنِ حَيَّانَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَمَرَ بِقَتْلِهِ (وَكَانَ عندئذٍ ذمّياً لم يُسلم بعد– المترجم) وَكَانَ عَيْنًا لأَبِي سُفْيَانَ، وَكَانَ حَلِيفًا لِرَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ فَمَرَّ بِحَلْقَةٍ مِنَ الأَنْصَارِ فَقَالَ: إِنِّي مُسْلِمٌ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهُ يَقُولُ إِنِّي مُسْلِمٌ، فَقَالَ: إِنَّ مِنْكُمْ رِجَالاً لاَنَكِلُهُمْ إِلَى إِيمَانِهِمْ مِنْهُمْ فُرَاتُ بْنُ حَيَّانَ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وأحمد[2]:

**فوراتی کوڕی حەییان (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: هێشتا پەیماندار بووم، ئیسلام نەبووبووم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمانی دەرکرد بۆ کوشتنم، فورات لەوەوبەر خەفیەی ئەبو سوفیان دەبێ، سوێند خواری پیاوێکیش دەبێ لە یاریدەدەران (ئەنصار)، گوتی: جا لەکن کۆڕێکی یاریدەدەرانەوە ڕەت بووم گوتم: من موسوڵمانم ئیتر بۆ دەمکوژن، پیاوێکی**

---

[1] بخاري. جهاد: ٣٠٥١. تجريد/ ٣ / ٣٦٧ رقم: ١٢٤٤ = ٣٠٥١ = مسلم جهاد وسير: استحقاق القاتل سلب القتيل/ ١٧٥٤ (هامش).

[2] سكت عن درجته الشارح.

یاریدەدەریش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! دەڵێ: من موسوڵمانم، فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ) هەندێ پیاوتان لەناودا هەیە هەواڵەی دینی خۆیانیان ناکەین‌و هەر بەوەندە کە بەدەم بڵێ من موسوڵمانم بڕوای پێ ناکەین، مەگەر شایەت‌و بەڵگەی هەبێ، یەکێ لەوانە ئەم فوراتی کوڕی حەییانەیە! (د/ئەحمەد) حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) وازی لێ هێنا لەدواییدا فورات موسوڵمانێکی زۆر جوانی لێ دەرچوو.

## ٨٠) خەفێ ناردن پەسەندە: (بعث العيون مطلوب)

٤٥٦٣- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُمَا) قَالَ: بَعَثَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بُسَيْسَةَ عَيْناً يَنْظُرُ مَا فَعَلَتْ عِيرُ أَبِي سُفْيَانَ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ[1]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بوسەیسەی (بە خەفێتی) نارد، تا هەواڵی کاروانەکەی ئەبو سوفیانی بۆ بزانێ. (د- سند صالح).

٤٥٦٤- ← (ب- ٥ز- ١٠ل- ٧٩ف- ١+٢)[2].

## ٨١) دەرکردنی ناموسوڵمانان لە دوورگەی عەرەب
## إخراج الكفار من جزيرة العرب

٤٥٦٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضى الله تَعَالَى عنهما) قَالَ: يَوْمُ الْخَمِيسِ وَمَا يَوْمُ الْخَمِيسِ، ثُمَّ بَكَى حَتَّى خَضَبَ دَمْعُهُ الْحَصْبَاءَ، فَقَالَ: اشْتَدَّ بِرَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَجَعُهُ يَوْمَ الْخَمِيسِ، فَقَالَ: ائْتُونِي بِكِتَابٍ أَكْتُبْ لَكُمْ كِتَابًا لَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُ أَبَدًا، فَتَنَازَعُوا وَلاَ يَنْبَغِي عِنْدَ نَبِيٍّ تَنَازُعٌ، فَقَالُوا: هَجَرَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: دَعُونِي فَالَّذِي أَنَا فِيهِ خَيْرٌ مِمَّا تَدْعُونِي إِلَيْهِ، وَأَوْصَى عِنْدَ مَوْتِهِ بِثَلاَثٍ: أَخْرِجُوا الْمُشْرِكِينَ مِنْ جَزِيرَةِ الْعَرَبِ، وَأَجِيزُوا الْوَفْدَ بِنَحْوِ مَا كُنْتُ أُجِيزُهُمْ، وَنَسِيتُ الثَّالِثَةَ. رَوَاهُ الثَّلاثَة[1]:

---

[1] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

[2] تقدم في مجلد خامس. تسلسل/ ١٠ رقم: ١/ ٣٣١٢ و رقم: ٢/ ٣٣١٣.

[1] بخاري. جزية: ٣١٦٨.

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) فەرمووی: ئای لەو رۆژی پێنج شەممەیە چی رۆژێ بوو! قسە گێڕەوە گوتی: ئیبنو عەبباس زۆرگریا هەتا بە فرمێسك زیخ و چەوی تەڕکرد، ئەوجا فەرمووی: لە رۆژی پێنج شەممەدا نەخۆشینەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) تەواو کەشەنگ بوو، فەرمووی: نامەیەکم بۆ بێنن، هەتا نامەیەکتان بۆ بنووسم، ئیتر لەپاش ئەو نامەیە هەتا هەتایەرێگەی راست وون ناکەن و سەرتان لێ ناشێوێ! بەڵام یاران لەناو خۆیانا بوو بەهەرایان، خزمەتی پێغەمبەرانیش شوێنی مشتومڕو بگرەو بەردەو هەراو هوریا نییەو شتی وا نابێ لە خزمەتی ئەواندا روو بدا، ئەوەبوو هەندێ کەس گوتیان: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەبڕسکێنێ! حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کەوای لێ هات لێم گەڕێن با خەریکی حاڵی خۆم بم و خۆم ئامادە بکەم بۆ شادبوون بە خزمەتی پەروەردگارم ئەم حاڵەی خۆم گەلێ باشترو چاکترە لەمەی کە ئێوە لە منتان دەوێ! فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) لەکاتی مردنیدا سێ راسپێری موسوڵمانانی کرد: فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): فرە خواکان لە دوورگەی عەرەب دەرکەن و وەك خۆم بەجوانی نوێنەر بەڕێ بکەن.. گوتی: راسپێری سێهەمیانم لەیاد نەماوە (ش/د) ← (ب- ٥ز- ٧٠ل- ٢٤٩ف- ٦).

**٤٥٦٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ فِي الْمَسْجِدِ خَرَجَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: انْطَلِقُوا إِلَى يَهُودَ فَخَرَجْنَا حَتَّى جِئْنَا بَيْتَ الْمِدْرَاسِ فَقَالَ: أَسْلِمُوا تَسْلَمُوا وَاعْلَمُوا أَنَّ الأَرْضَ لِلَّهِ وَرَسُولِهِ وَإِنِّي أُرِيدُ أَنْ أُجْلِيَكُمْ مِنْ هَذِهِ الأَرْضِ فَمَنْ يَجِدْ مِنْكُمْ بِمَالِهِ شَيْئًا فَلْيَبِعْهُ، وَإِلاَّ فَاعْلَمُوا أَنَّ الأَرْضَ لِلَّهِ وَرَسُولِهِ. رَوَاهُ البخاري ومسلم و أَبُو دَاوُدَ[٢]:**

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: جارێ لە مزگەوت بووین" حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) هات بۆ ناومان و فەرمووی: ئادەی با بڕۆین بۆلای جوولەکەکان جا لە خزمەتیا رۆیشتین و چووینە ماڵی مالوومەکەیان،

---

[٢] بخاري. جزية: ٣١٦٨. مسلم. مغازي: ٤٥٦٦. أبو داود. خراج: ٣٠٠٣.

حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەی کۆمەڵەی جوولەکە موسوڵمان بن سەر ئاسوودەو سەلامەت دەبن، بشزانن کە ئەم خاکە هی خوداو پێغەمبەری ئەوەو مافی ئێوەی پێوە نییە من دەمەوێ ئەم وڵاتەتان پێ چۆڵ بکەم، لەبەرئەوە ئەگەر ماڵێ، شتێکتان هەیە ساخی بکەنەوەو بیفرۆشن و بە خۆشی برۆن و ئێرە چۆڵ کەن و سەری خۆتان بە لایەکا دەرکەن! ئەگینا باش باش لێتان روون بێ کە ئەم وڵاتە خاکی خوداو پێغەمبەری خودایەو فری ئێوەی بە سەرەوە نییەو ئەگەر بە خۆشی خۆتان نەڕۆن بە زەبری شیرو تیر پێتان چۆڵ دەکەم و ئەوسا تەواو حاڵتان شڕ دەبێ (ب/م/د).

٤٥٦٧- ← (ب- ٥ز- ٧٠ل- ٢٤٩ف- ٦+ ٧ +٨)[1][3].

---

[1] کاتی نووسینی ئەم فەرموودانە:

حیجاز جەمی دێ لەم نامەردانە
فەرتەنەیێ وا سەگ خاوەنی خۆی
نەناسێ هاکا سەری هەڵدا بۆی
لەعنەتی خوداو فریشتەو خۆمان
لەو کەسانە بێ هێنایان بۆمان ،
پاشای خۆپەرست زانای چاو لە دەست
بۆ دوژمن بوونە کوتەک و داردەست
قەبری پێغەمبەر کەعبەیی نازدار
دەفرۆشن لەبۆ نارەق و قومار
گەلی ئیسلامیش بەیدەس کراوە
بە دەستی دۆستی پابەس کراوە ،
تەسلیم بە دەستی ناکەس کراوە
هیچ کارو باری بە دەس نەماوە
وەک کەو لە ناخی قەفەس کراوە
رێگەی بای باڵی بەربەس کراوە

٤/١٠/١٩٩٠ سلیمانی/مامۆستایان - وەرگێڕ

## ٨٢) ئازاردان‌و چەوساندنەوەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لەلایەنی ناموسوڵمانەکانەوە

### اضطهاد المشركين للنبي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)

**٤٥٦٨- عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: بَيْنَمَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يُصَلِّي عِنْدَ الْكَعْبَةِ وَأَبُو جَهْلٍ وَأَصْحَابٌ لَهُ جُلُوسٌ وَقَدْ نُحِرَتْ جَزُورٌ بِالأَمْسِ فَقَالَ أَبُو جَهْلٍ: أَيُّكُمْ يَقُومُ إِلَى سَلاَ جَزُورِ بَنِي فُلاَنٍ فَيَأْخُذُهُ فَيَضَعُهُ فِي كَتِفَيْ مُحَمَّدٍ إِذَا سَجَدَ فَانْبَعَثَ أَشْقَى الْقَوْمِ فَأَخَذَهُ فَلَمَّا سَجَدَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَضَعَهُ بَيْنَ كَتِفَيْهِ، قَالَ: فَاسْتَضْحَكُوا وَجَعَلَ بَعْضُهُمْ يَمِيلُ عَلَى بَعْضٍ وَأَنَا قَائِمٌ أَنْظُرُ لَوْ كَانَتْ لِي مَنَعَةٌ لِطَرَحْتُهُ عَنْ ظَهْرِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَهُوَ سَاجِدٌ مَا يَرْفَعُ رَأْسَهُ، انْطَلَقَ إِنْسَانٌ فَأَخْبَرَ فَاطِمَةَ فَجَاءَتْ وَهِيَ جُوَيْرِيَةٌ فَطَرَحَتْهُ عَنْهُ ثُمَّ أَقْبَلَتْ عَلَيْهِمْ تَشْتِمُهُمْ، فَلَمَّا قَضَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) صَلاَتَهُ رَفَعَ صَوْتَهُ، ثُمَّ دَعَا عَلَيْهِمْ، وَكَانَ إِذَا دَعَا دَعَا ثَلاَثًا وَإِذَا سَأَلَ سَأَلَ ثَلاَثًا، ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ عَلَيْكَ بِأَبِي جَهْلِ بْنِ هِشَامٍ وَعُتْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ وَشَيْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ وَالْوَلِيدِ بْنِ عُقْبَةَ وَأُمَيَّةَ بْنِ خَلَفٍ وَعُقْبَةَ بْنِ أَبِي مُعَيْطٍ، وَذَكَرَ السَّابِعَ وَلَمْ أَحْفَظْهُ فَوَالَّذِي بَعَثَ مُحَمَّدًا (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِالْحَقِّ لَقَدْ رَأَيْتُ الَّذِينَ سَمَّاهُمْ صَرْعَى يَوْمَ بَدْرٍ، ثُمَّ سُحِبُوا إِلَى الْقَلِيبِ قَلِيبِ بَدْرٍ. رَوَاهُ الشَّيْخَانِ[1]:**

**ئیبنو مەسعوود (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) جارێ لەلای کەعبە نوێژی دەکرد، ئەبو جەهل‌و چەند هاوڕێیەکی لەوێ دانیشتبوون، ڕۆژی پێشوو تریش وشترێ سەربڕا بوو ئەبو جەهل گوتی: کامتان دەچێ پرزانگی ئەو وشترە سەربڕاوە کە دوێنێ ئەو ماڵە سەریان بڕیوە، کاتێ کە موحەممەد سەر دادەنێ لە کوڕنووشدا ئەو پرزانگە لەسەر بۆتەقەی ملی دابنێ، بەدترین کەسی کۆمەڵەکە دەرپەڕی‌و چوو پرزانگەکەی هێنا و کاتێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) کوڕنووشی برد لەناو**

---

[٢] تقدم في مجلد خامس. تسلسل/ ٧٠ رقم: ٦/ ٣٥٦٣ ورقم: ٧/ ٣٥٦٤ ورقم: ٨/ ٣٥٦٥.

[١] تجريد البخاري/ ١/ ١٩٠ رقم: ١٧٢ = ٢٤٠ ، ٢٩٣٤ ، ٥٢٠ ، ٣١٨٥ ، ٣٦٦٠ ، ٣٨٥٤ ، ٣٩٦٠. مسلم. مغازي: ٤٦٢٥ ، ٤٦٢٦. نسائي. جهاد: ٣٠٦.

شانیدا داینا گوتی: ئیتر کردیان بە فشەو پێکەنین‌و لاڵ‌و پاڵ کەوتن بەسەر یەکتردا! منیش هەر سەیرم دەکردو دەسەلاتی هیچیشم نەبوو ئەگینا پرزانگەکەم لەسەر پشتی فڕە دەدا، حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) لەسەر ئەو حاڵە لە سەجدەدا مایەوەو سەری هەڵ نەبڕی، تا مرۆڤێ چوو بە فاتیمەی گوت، فاتیمە ئەوکاتە مناڵکار بوو، کە هات فڕێی داو دەستی کرد بە جنێودان پێیان، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) کاتێ نوێژەکەی تەواو کرد دەنگی هەڵبڕی‌و نزای شەڕی لێ کردن، دەستووری حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) وابوو کە نزایەکی دەکرد سێ جار نزاکەی دووبارە دەکردەوە، کەشتێکیشی لە خودا داوا دەکرد سێ جار داوا کردنەکەی دووبارە دەکردەوە. جا حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) سێ جار لەسەر یەك بە دەنگی بەرز فەرمووی: خودایە! قوڕەیشم حەواڵەی قین‌و قاری تۆ کرد! ئەوانیش کە گوێیان لەمە بوو لە پێکەنین کەوتن‌و زۆر لە نزاو سکاڵاکەی ترسان، دوا ئەوە فەرمووی: خودایە! ئەم زەلامانەم هەواڵە بەخشم‌و قاری تۆکرد: ئەبو جەهلی کوڕی هیشام‌و عوتبەی کوڕی رەبیعەو شەیبەی کوڕی رەبیعەو وەلیدی کوڕی عوقبەو ئومەییەی کوڕی خەڵەف‌و عوقبەی کوڕی ئەبو موعەیط.. فەرمووی: ئەو حەوتەمیشی ژمارد بەڵام من ناوی حەوتەمیانم لەبەر نەماوە حەوتەم عەمارەی کوڕی وەلید بوو دەی بەو خودایەی کە بەحەق پێغەمبەری رەوانە کردووە ئەو بەدبەختانەی کە پێغەمبەر یەکە یەکە ناوی هێنان‌و ئەو نزای شەڕەی لێ کردن بە چاوی خۆم چاوم پێیان کەوت لە رۆژی بەدردا کوژرابوون، لە ئەنجاما کە لاکەکانیان بە کێش کردن‌و تووڕیان دانە ناو بیرەکەی بەدرەوە! (ش).

٤٥٦٩- ← ئەم فەرموودەیە لە سەرەتای سوورەتی موئمینەوە رابوورد: یەکەم فەرموودەکە دەفەرموێ: (بَيْنَمَا رَسُولُ اللَّهِ يُصَلِّي بِفِنَاءِ الْكَعْبَةِ)[٢].

---

[٢] تقدم في بداية سورة المؤمن. الحديث الرقم: ١. مجلد سابع.

**٤٥٧٠- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: يا رَسُولِ اللَّهِ هَلْ أَتَى عَلَيْكَ يَوْمٌ أَشَدَّ مِنْ يَوْمِ أُحُدٍ فَقَالَ: لَقَدْ لَقِيتُ مِنْ قَوْمِكِ وَكَانَ أَشَدُّ مَا لَقِيتُ مِنْهُمْ يَوْمَ الْعَقَبَةِ إِذْ عَرَضْتُ نَفْسِي عَلَى ابْنِ عَبْدِ يَالِيلَ بْنِ عَبْدِ كُلاَلٍ فَلَمْ يُجِبْنِي إِلَى مَا أَرَدْتُ فَانْطَلَقْتُ وَأَنَا مَهْمُومٌ عَلَى وَجْهِي فَلَمْ أَسْتَفِقْ إِلاَّ وَأَنَا بِقَرْنِ الثَّعَالِبِ فَرَفَعْتُ رَأْسِي فَإِذَا أَنَا بِسَحَابَةٍ قَدْ أَظَلَّتْنِي فَنَظَرْتُ فَإِذَا فِيهَا جِبْرِيلُ فَنَادَانِي فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ قَدْ سَمِعَ قَوْلَ قَوْمِكَ لَكَ وَمَا رَدُّوا عَلَيْكَ، وَقَدْ بَعَثَ إِلَيْكَ مَلَكَ الْجِبَالِ لِتَأْمُرَهُ بِمَا شِئْتَ فِيهِمْ، قَالَ: فَنَادَانِي مَلَكُ الْجِبَالِ وَسَلَّمَ عَلَيَّ ثُمَّ قَالَ: يَا مُحَمَّدُ إِنَّ اللَّهَ قَدْ سَمِعَ قَوْلَ قَوْمِكَ لَكَ وَأَنَا مَلَكُ الْجِبَالِ وَقَدْ بَعَثَنِي رَبُّكَ إِلَيْكَ لِتَأْمُرَنِي بِأَمْرِكَ فَمَا شِئْتَ إِنْ شِئْتَ أَنْ أُطْبِقَ عَلَيْهِمُ الأَخْشَبَيْنِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): بَلْ أَرْجُو أَنْ يُخْرِجَ اللَّهُ مِنْ أَصْلاَبِهِمْ مَنْ يَعْبُدُ اللَّهَ وَحْدَهُ لاَ يُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا. رَوَاهُ الشيخان[٣]:**

**عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: عەرزی حەزرەتم كرد: ئەی پێغەمبەری خودا! هیچ ڕۆژێكت بەسەردا هاتووە كە لە ڕۆژی ئوحود سەختتر بێ؟ فەرمووی: لەم هۆزەی تۆوە" تووشی دەردی سەری و ئێش و ئازارێكی ئێجگار زۆر بووم، بە تایبەتی لە ڕۆژەكەی عەقەبەدا تەواو سەخڵەتیان كردم، مەبەستم ئەو ڕۆژەیە كە لە عەقەبەی میندادا خۆم پێش كەشی عەبدویالیلی برای عەبدوكولال كردو لەپاشا چووم بۆ لایان بۆ طائیف، لەوێش دیسان داوام لە خۆی و لە هۆزی ثەقیف كرد كە ئیسلام بێن و ببن بە پشت و پەنای ئیسلام بەڵام مرازمیان نەدا[١] ئیتر منیش (بە خەمباری) كەوتمە ڕێ و بەبێ ئاگا ڕێگەم گرتە بەرو ڕۆیشتم، كاتێ هۆشم هاتەوەو بە ئاگا هاتمەوە تەماشام كرد وام لە قەرنولثەعالیب، كە سەرم هەڵبڕی تەماشام كرد وا پەڵەیێ هەور بەڕا سەرمەوە وەستاوە بووەبە سێبەر بۆم، كە سەرنجم دا جوبرائیلم لە**

---

[٣] تجريد البخاري=مختصر صحيح البخاري/٣/٤٣٤ رقم: ١٣٠٣ =٣٢٣١، ٧٣٨٩. مسلم. مغازي: ٤٦٢٩.

[١] لە فۆلكلۆری كوردیدا دەڵێ:

(خوا مرازم بدا) باخم بەڕبێنێ

خۆت شووبكەی بەخۆم، براكەت ژن بێنێ　(وەرگێڕ)

ناویا بینی، جوبرائیل بانگی کردم‌و فەرمووی: یەزدانی هێژاو سەروەر ئاگای لێ بوو کە هۆزەکەت چییان پێ گوتیت‌و چۆنیان وەڵام دایتەوە، ئەوا فریشتەی کێوانی بۆ ناردوویت، چی فەرمانێکت هەیە پێی بفەرموو، چۆن تۆ حەزدەکەی ئاوایان لێ دەکا، جا فریشتەی کێوانیش بانگی کردم‌و سڵاوی لێ کردم‌و فەرمووی: ئەی موحەممەد! خوا گوێی لێ بوو کە هۆزەکەت چۆن بە ناشیرینی وەڵامیان دایتەوە، ئەوە من فریشتەی سەرکاری سەر چیاکانم‌و هەموو کێوو چیاکان بە دەستی منە، ئەگەر ئارەزوو دەکەی هەردوو کێوەکە تەبخ دەکەم بە سەریاندا، کێوی ئەبو قوبەیس‌و کێوی قەیقوعان کەشاری مەککە دەکەوێتە نێوانیانەوە دەدەم بە یەکا! حەزرەت دەفەرموێ: خەیر! چونکە من ئومێد دەکەم کە خوا لە پشتی ئەمانە نەوەیێ بخاتەوە کە ئەوان خودا بپەرستن‌و بە تاک‌و تەنیای بزانن‌و هیچ هاوبەشی بۆ دانەنێن! (ش).

٤٥٧١- تەماشای یەکەم فەرموودەی سوورەتی موئمین بکە[٤].

## ٨٣) باسی حەوتەم: باسی غەزەوات

## الباب السابع: في الغزوات

٤٥٧٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: خَيْرُ الصَّحَابَةِ أَرْبَعَةٌ وَخَيْرُ السَّرَايَا أَرْبَعُمِائَةٍ، وَخَيْرُ الْجُيُوشِ أَرْبَعَةُ آلاَفٍ وَلَنْ يُغْلَبَ اثْنَا عَشَرَ أَلْفًا مِنْ قِلَّةٍ . رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي[١]:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خودا فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): باشترین دەستە هاوڕێ ئەوەیە کە چوار کەس بن، باشترین لق (سەرییە) ئەوەیە کە چوار سەد کەس بن، باشترین سوپا ئەوەیە کە چوار

---

[٤] راجع الحديث الأول من سورة المؤمن. مجلد سابع.

[١] بسند حسن (شرحه).

هەزار کەس بن، ژمارەی سوپاش کە گەیشتە دوازدە هەزار ئیتر لەبەر کەمی نابەزێن ئەگەر بەزین لەبەر کەمی نییە لەبەر شتێکی ترە (د/ت– س/ح).

**٤٥٧٣**- عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ: لَقِيتُ زَيْدَ بْنَ أَرْقَمَ (رضي الله تَعَالَى عنهما) فَقُلْتُ لَهُ: كَمْ غَزَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ قَالَ: تِسْعَ عَشْرَةَ، فَقُلْتُ: كَمْ غَزَوْتَ مَعَهُ؟ قَالَ: سَبْعَ عَشْرَةَ، فَقُلْتُ: فَمَا أَوَّلُ غَزْوَةٍ غَزَاهَا؟ قَالَ: ذَاتُ الْعُسَيْرِ أَوِ الْعُشَيْرِ. رَوَاهُ مسلم والبخاري والترمذي[٢]:

ئەبو ئیسحاق فەرمووی: تووشی زەیدی کوڕی ئەرقەم بووم (خودای لێ ڕازی بێ) عەرزم کرد: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) چەند غەزای کردووە؟ فەرمووی: نۆزدە غەزا، گوتم: لە چەند غەزایانا تۆ لەگەڵیا بووی؟ فەرمووی: لە حەڤدە غەزایاندا گوتم: کامەیان یەکەم غەزای بوو؟ فەرمووی: غەزای ذاتولعوسەیر، یا فەرمووی: غەزای ذاتولعوشەیر (ش/ت).

**٤٥٧٤**- وَقَالَ بُرَيْدَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ): غَزَا رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) تِسْعَ عَشْرَةَ غَزْوَةً قَاتَلَ فِي ثَمَانٍ مِنْهُنَّ. رَوَاهُ مسلم[٣]:

بورەیدە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) نۆزدە غەزای کردووە" بەڵام لە هەشت غەزایانا جەنگی کردووە (م).

## ٨٤) غەزای بەدر: (غزوة بدر)

قَالَ الله تعالى: {وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ اللّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ فَاتَّقُواْ اللّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ} (١٢٣/٣).

واتە: بیربکەنەوە لەوە کە بەڕاستی خودای گەورە نەصرەت‌و یارمەتی ئێوەی دا لە جەنگی بەدردا وەلحاڵ ئەوکاتە ئێوە کۆمەڵێکی کزو بێ نموودو بێ ژمارەو بێ مایەو کەم چەك بوون، دەی کەواتە ئێستا ئێوە لە خودا

---

[٢] بخاري. استسقاء: ١٠٢٣ مسلم. مغازي: ٤٦٦٩.

[٣] مسلم. مغازي: ٤٦٧٢ ، ٤٦٧٣.

بترسن و هەر لە خودا بترسن و هەر لە خودا بپاڕێنەوە، سا بەشکوو خودای گەورە لە کۆمەڵی سوپاسگوزارتان بژمێرێ.

٤٥٧٥- → (ب- ٦ز- ٩ل- ١٨٢ف- ٤)[١].

٤٥٧٦- عَنْ ابْنَ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: شَهِدْتُ مِنَ الْمِقْدَادِ بْنِ الأَسْوَدِ مَشْهَدًا لأَنْ أَكُونَ صَاحِبَهُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا عُدِلَ بِهِ، أَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَهُوَ يَدْعُو عَلَى الْمُشْرِكِينَ فَقَالَ: لاَ نَقُولُ كَمَا قَالَ قَوْمُ مُوسَى اذْهَبْ أَنْتَ وَرَبُّكَ فَقَاتِلاَ، وَلَكِنَّا نُقَاتِلُ عَنْ يَمِينِكَ وَعَنْ شِمَالِكَ وَبَيْنَ يَدَيْكَ وَخَلْفَكَ، فَرَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَشْرَقَ وَجْهُهُ وَسَرَّهُ قَوْلَهُ. رَوَاهُ البخاري[٢]:

ئیبنو مەسعوود (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: هەڵوەستێکی مەردانەم لە میقدادی کوڕی ئەسوەد دیوە، حەز دەکەم کە من خاوەنی ئەو هەڵوەستە پیاوانە بوومایە، بە هەرچی شتێ کە بە بەها گران بێ و بە کێش سووک بێ، جارێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) خەریک بوو نزای شەڕی لە فرەخواکان دەکرد، میقداد هات بەسەردا، عەرزی کرد: قوربان! ئێمە وەك گەلی مووسا ناکەین، کە بە مووسایان گوت:

{فَاذْهَبْ أَنْتَ وَرَبُّكَ فَقَاتِلاَ إِنَّا هَا هُنَا قَاعِدُونَ – ٥/٢٤}.

واتە: ئەی مووسا! ئێمە بەهیچ جۆرێ ناچین بۆ غەزا بۆ سەر ئەم هۆزە ملهوڕە زەبەللاحانە کەوان لە خاکی پیرۆزی بەیتولمەقدیسدا، هەتا ئەوان لەوێ بن ئێمە سەری پیاناکەین، ئەوە بۆ خۆت و خواکەت دوو بەدوو ناچن بۆ ئەم شەڕەی کە خۆت دەڵێی، ئێمەیش ئا لێرەدا بۆ خۆمان دادەنیشین، دەی فەرموون بڕۆن ئێمەیش والێرەدا چاوەنوارتان دەکەین! عەرزی کرد: قوربان! حاشا ئێمە هەڵەی وا گەورە ناکەین، بەڵام ئێمە لەهەر چوار لاتەوە بۆت دەبین بە شووورای پۆڵایین، لە ڕاستەوە، لە چەپتەوە، لەبەر دەمتەوە، لە پشتتەوە

---

[١] تقدم في مجلد سادس. تسلسل/ ٩ رقم: ٤ / ٣٨٧٨.

[٢] تجريد البخاري / ٤/ ٢٤٩ رقم: ١٥٢٤ = ٣٩٥٢ ، ٤٦٠٩.

**جەنگ دەكەین‌و بەری هێرشی دوژمن دەگرین، كە ئەو وای فەرموو تەماشام كرد رووی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لەم قسانەی ئەم وەك گوڵ گەشایەوەو ئەوەی زۆر پێ خۆش بوو! (ب).**

**٤٥٧٧- لەسەر باسی (اضطهاد المشركین للنبی)دا رابورد فەرموودەی یەكەم. لێرەدا ئەمەی پترە: سوێندم بە یەزدانی پاك لاشەی ئەمانەم لە رۆژی بەدردا بە چاوی خۆم دی لەو ناوەدا لاڵ‌و پاڵ كەوتبوون، لەبەرئەوەی گەلێ گەرم بوو تاوی هەتاوەكە گەناندبوونی‌و بۆگەنیان كردبوو (ش)[٣].**

**٤٥٧٨- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) شَاوَرَ حِينَ بَلَغَهُ إِقْبَالُ أَبِى سُفْيَانَ فَتَكَلَّمَ أَبُو بَكْرٍ فَأَعْرَضَ عَنْهُ ثُمَّ تَكَلَّمَ عُمَرُ فَأَعْرَضَ عَنْهُ فَقَامَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ فَقَالَ: إِيَّانَا تُرِيدُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَالَّذِى نَفْسِى بِيَدِهِ لَوْ أَمَرْتَنَا أَنْ نُخِيضَهَا الْبَحْرَ لأَخَضْنَاهَا وَلَوْ أَمَرْتَنَا أَنْ نَضْرِبَ أَكْبَادَهَا إِلَى بَرْكِ الْغِمَادِ لَفَعَلْنَا فَنَدَبَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) النَّاسَ فَانْطَلَقُوا حَتَّى نَزَلُوا بَدْرًا وَوَرَدَتْ عَلَيْهِمْ رَوَايَا قُرَيْشٍ وَفِيهِمْ غُلاَمٌ أَسْوَدُ لِبَنِى الْحَجَّاجِ فَأَخَذُوهُ فَكَانَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَسْأَلُونَهُ عَنْ أَبِى سُفْيَانَ وَأَصْحَابِهِ فَيَقُولُ: مَا لِى عِلْمٌ بِأَبِى سُفْيَانَ وَلَكِنْ هَذَا أَبُو جَهْلٍ وَعُتْبَةُ وَشَيْبَةُ وَأُمَيَّةُ بْنُ خَلَفٍ فَإِذَا قَالَ ذَلِكَ ضَرَبُوهُ، فَقَالَ: نَعَمْ أَنَا أُخْبِرُكُمْ هَذَا أَبُو سُفْيَانَ. فَإِذَا تَرَكُوهُ فَسَأَلُوهُ قَالَ: مَا لِى عِلْمٌ بِهِ وَلَكِنْ هَذَا أَبُو جَهْلٍ وَعُتْبَةُ وَأُمَيَّةُ فِى النَّاسِ فَإِذَا قَالَ هَذَا أَيْضًا ضَرَبُوهُ، وَرَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَائِمٌ يُصَلِّى فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ انْصَرَفَ قَالَ: وَالَّذِى نَفْسِى بِيَدِهِ لَتَضْرِبُوهُ إِذَا صَدَقَكُمْ وَتَتْرُكُوهُ إِذَا كَذَبَكُمْ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): هَذَا مَصْرَعُ فُلاَنٍ وَيَضَعُ يَدَهُ عَلَى الأَرْضِ هَا هُنَا وَهَا هُنَا، قَالَ: فَمَا مَاطَ أَحَدُهُمْ عَنْ مَوْضِعِ يَدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)[٤]:**

**ئەنەس (خۆشنوودی خودای لێ بێ) فەرمووی: كاتێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ژنەوتی كەوا ئەبو سوفیان، بە زەوارێكی گەورەی بازرگانییەوە لە**

---

[٣] تقدم في بحث اضطهاد المشركين للنبيّ (صلى عليه وسلم) الحديث الأول.

[٤] مسلم. مغازي: ٤٥٩٧.

شامەوە دەگەڕێتەوە بۆ مەککە، پرس‌و راوێژی بە یارانی کرد، ئایا بڕۆین بۆیان یانا، لە پێشدا ئەبو بەکر قسەی فەرموو، وەلێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بە قسەکەی ئەو قنیاتی نەکرد، دوائەو عومەر قسەی فەرموو، دیسان بە قسەی ئەویش فەرامۆشی بۆ نەهات، جا سەعدی کوڕی عوبادە هەڵسایەوە فەرمووی: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! دیارە" رووی دەمت لە ئێمەیەو لەم راوێژە مەبەستت ئەوەیە دەموودووی ئێمە تاقی بکەیتەوە، دەی بەوکەسە کە گیانی منی وا لەدەسا ئەگەر تۆ بفەرمووی کە بەوڵاخەکانمانەوە تاو بدەینە ناو نێرینەی ئاوی دەریا بەبێ چەندو چوون تاو دەدەینە ناوی‌و مادام فەرمانی تۆی لەسەر بێ کۆ لە هیچ ناکەینەوە، یا ئەگەر تۆ بفەرمووی کە هەتا بنعێز، یا هەتا بنی دنیا ماین‌و ئەسپ‌و وڵاخەکانمان بە دوای دوژمندا غاربدەین، ئەوا بەبێ سێ‌و دووکردن بە چوارناڵە تا ئەوێ غاریان دەدەین‌و بەبێ پەروا دوژمن لەهەر کوێ بێ دەچینە وێزەی، بزانە ئێمە سەرمان لە رێتایە! ئەی پێغەمبەری خودا! ئەی خۆشەویست! دڵ لە دڵ نەدەی، لەتۆ فەرمان‌و لە ئێمە بەجێهێنان! گوتی: ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) تیژی کردینەوەو تێزی کردین، هەتا کەوتینە رێ‌و رۆیشتین هەتا لەشکرەکەمان گەیشتە بەدرو لەوێ لایاندا، لەوێ ئاو کێشەکانی قوڕەیش هاتن بۆ ئاو بردن، خولامێکی رەشیان تیابوو هی خێڵی بەنی حەججاج بوو، هاورێکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) گرتیان‌و پرسیاری ئەبو سوفیان‌و کاروانەکەیان لێ کرد، گوتی: ئاگام لە ئەبو سوفیان نییە، بەڵام ئا ئەوە ئەبو جەهل‌و عوتبەو شەیبەو ئومەییەی کوڕی خەڵەفە لەگەڵ خەڵکێکی زۆردا هاتوون بۆ جەنگ لە گەڵتانا، کەوای دەگوت، لەوان وابوو کە دەیەوێ چەواشەیان بکا، لەبەرئەوە دەستیان کرد بە لێدانی، ئەویش لەتاواندا دەیگوت: باشە راستتان پێ دەڵێم ئەوە ئەبو سوفیانە، بەڵام کە وازیان لێ هێناو لێیان دەپرسییەوە هەمان قسەی پێشووی خۆی دووبارە دەکردەوە، ئیتر هەروەها، لەو کاتەدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) راوەستابوو نوێژی دەکرد، کە چاوی بەم حاڵە کەوت سڵاوی نوێژەکەی دایەوەو فەرمووی: بەو کەسە کە گیانی منی بەدەسە، کە

یەزدانی مەزنە، ئەم خولامە کە قسەی راستتان بۆدەکا، ئێوە لێی دەدەن‌و کە درۆیشتان بۆ دەکا وازی لێ دێنن لەپاشا فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): ئەمە شوێنی کوشتنی فیسارە کەسیانەو ئەوەیش شوێنی ئەوەو ئەوەی تریانە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) بە دەستی لەسەر رووی عەردەکە لێرەو لەوێ جێگەی تۆپینی یەك بەیەکی ئەو تۆپیوانەی دیاری کرد، ئەنەس فەرمووی: هیچ کامێکیان لەو شوێنەی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەستی لەسەر داناو دیاری کرد بۆ جێی کوژرانیان هەڵیان نەبواردو هەرکەسەیان لە جێگەی دیاری کراوی خۆیدا کوژرا! (م).

**٤٥٧٩**- عَنْ ابْنُ عَبَّاسٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُمَا) قَالَ: بَيْنَمَا رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ يَوْمَئِذٍ يَشْتَدُّ فِي أَثَرِ رَجُلٍ مِنَ الْمُشْرِكِينَ أَمَامَهُ إِذْ سَمِعَ ضَرْبَةً بِالسَّوْطِ فَوْقَهُ وَصَوْتَ الْفَارِسِ يَقُولُ: أَقْدِمْ حَيْزُومُ، فَنَظَرَ إِلَى الْمُشْرِكِ فَخَرَّ مُسْتَلْقِيًا فَنَظَرَ إِلَيْهِ فَإِذَا هُوَ قَدْ خُطِمَ أَنْفُهُ وَشُقَّ وَجْهُهُ كَضَرْبَةِ السَّوْطِ فَاخْضَرَّ ذَلِكَ أَجْمَعُ، فَجَاءَ الأَنْصَارِيُّ، فَحَدَّثَ بِذَلِكَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: صَدَقْتَ، ذَلِكَ مِنْ مَدَدِ السَّمَاءِ الثَّالِثَةِ، فَقَتَلُوا يَوْمَئِذٍ سَبْعِينَ وَأَسَرُوا سَبْعِينَ. رَوَاهُما مسلم[٥]:

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس، کە بەناو بانگە بە ئیبنو عەبباس، کە هەق ئامۆزای پێغەمبەرە (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەوان بێ) دەفەرموێ: لە رۆژی بەدردا پیاوێکی موسوڵمان دەنیشێتە سەر پیاوێکی فرەخوا، لەوکاتەدا کەوا خەریکە راوی دەنێ، لەپڕ لە ژوور سەریەوە لەلای ئاسمانەوە شەققەی قەمچی‌و دەنگی تێخوڕینی سوارێ دەبیستێ کە لە ماینەکەی ژێری دەخوڕێ کە ناوی حەیزووم دەبێ‌و یای لێ دەکا‌و تێی دەخوڕێ: ئەی حەیزووم! پێشکەوە. موسوڵمانەکە تەماشا دەکا وا کابرای بتپەرست بەبێ ئەوەی ئەم هیچی لێ بکا لە خۆیەوە بە پشتا دەکەوێ‌و لەسەر گازەرەی پشت دەتلیسێتەوە‌و دەمرێ‌و سارد دەبێتەوە، کە سەرنجی دەدا دەڕوانێ وا لووتی

---

[٥] مسلم. مغازي: ٤٥٦٣. أبو داود. جهاد: ٢٦٩٠. ترمذي. تفسير القرآن: ٣١٨١.

کابرا دابڕاوەو ڕوومەتی بە قەد جێگەی قەمچی فریشتەکە شەق بووەو جێگەی قەمچییەکە بە لووت و ڕوومەتیەوە وەك خەتێ خوێنی تێزاوەو شین هەڵگەڕاوە. پیاوە موسوڵمانەکە ئەنصاری بوو هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) و ئەم داستانەی عەرزی کرد، فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): ڕاست دەکەی! ئەو فریشتەیە لەو هێزەیە کە لە ئاسمانی سێیەمەوە هاتوون بۆ یارمەتیی ئێوە! ئەو ڕۆژە موسوڵمانەکان حەفتا کەسیان لە ناموسوڵمانەکان کوشت و حەفتا کەسیشیان لێ یەخسیر کردن (م).

٤٥٨٠- عَنْ أَبِي طَلْحَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَمَرَ يَوْمَ بَدْرٍ بِأَرْبَعَةٍ وَعِشْرِينَ رَجُلاً مِنْ صَنَادِيدِ قُرَيْشٍ فَقُذِفُوا فِي طَوِيٍّ مِنْ أَطْوَاءِ بَدْرٍ خَبِيثٍ مُخْبِثٍ إِذَا ظَهَرَ عَلَى قَوْمٍ أَقَامَ بِالْعَرْصَةِ ثَلاَثَ لَيَالٍ فَلَمَّا كَانَ بِبَدْرٍ الْيَوْمَ الثَّالِثَ أَمَرَ بِرَاحِلَتِهِ فَشُدَّ عَلَيْهَا رَحْلُهَا ثُمَّ مَشَى وَاتَّبَعَهُ أَصْحَابُهُ وَقَالُوا: مَا يَنْطَلِقُ إِلاَّ لِبَعْضِ حَاجَتِهِ حَتَّى قَامَ عَلَى شَفَةِ الرَّكِيِّ فَجَعَلَ يُنَادِيهِمْ بِأَسْمَائِهِمْ وَأَسْمَاءِ آبَائِهِمْ يَا فُلاَنُ بْنَ فُلاَنٍ، وَيَا فُلاَنُ بْنَ فُلاَنٍ أَيَسُرُّكُمْ أَنَّكُمْ أَطَعْتُمُ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَإِنَّا قَدْ وَجَدْنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقًّا فَهَلْ وَجَدْتُمْ مَا وَعَدَكُمْ رَبُّكُمْ حَقًّا فَقَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا تُكَلِّمُ مِنْ أَجْسَادٍ لاَ أَرْوَاحَ لَهَا، فَقَالَ: وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ مَا أَنْتُمْ بِأَسْمَعَ لِمَا أَقُولُ مِنْهُمْ. رَوَاهُ البخاري وأحمد[٦]:

ئەبو طەلحە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە ڕۆژی بەدردا، فەرمانی فەرموو لاشەی بیست و چوارکەسیان لە گەورە پیاوانی قوڕەیش بەردایە ناو بیرێ لە بیرەکانی بەدرەوە کە بە بەرد هەڵچنرابوو، بە ڕاستی تا بڵێی بیرێکی پیس وچەپەڵ بوو" پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەستووری وابوو کە خودا سەری دەخست بەسەر هۆزێکا سێ شەو لەومەیدانەدا، لە دەشتایی بەر ماڵاندا دەمایەوە لە غەزای بەدریشدا لە ڕۆژی سێیەمی زاڵبوونیدا فەرمانی فەرموو وشترەکەیان بۆ کۆپان کرد،

---

[٦] بخاري. مغازي: ٣٩٧٦.

ئەوسا سواربوو ڕۆیشت و یارانی شوێنی کەوتن و گوتیان: ببی و نەبێ بۆ کارێکی تایبەتی خۆی دەچێ، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) ڕۆیشت تاچووە سەر لێواری بیرەکەو لەوێ ڕاوەستا و دەستی کرد بە بانگ کردنی کافرە کوژراوەکانی ناو بیرەکەو یەکە یەکە بەناوی خۆیان و بەناوی باوکیانەوە بانگی دەکردن و دەیفەرموو: ئەی فیساری کوڕی فیسار! ئەی ئەوەو ئەی ئەوە! ئایا پەشیمانیتان حاسڵ کردو ئێستا خۆزگە دەخوازن کە ئەم پەندەتان بە خۆتان نەدایەو لە دنیادا موسوڵمان ببوونایەو لە فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودا دەرنەچوونایەو ئەم ڕۆژی ڕەشەتان بەسەر خۆتانا نەهێنایە، دەی بزانن ئەوا ئێمە لە سایەی خوداوە بە ئاواتی خۆمان گەیشتین و ئەو مژدەو بەڵێنەی کە خودای خۆمان وادەی پێ دابووین دەستمان کەوت و بەچاوی خۆمان دیمان، دیارە ئێوەیش بە تۆڵەی سەختی کاری بەدی خۆتان گەیشتوون و ئەو هەڕەشەو ئێش و ئازارەی کە خودا وادەی ئەوەی پێدابوون بە چاوی خۆتان دیتان، عومەر (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: قوربان! قسەی چی لەگەڵ بێ گیاندا دەکەی فەرمووی: سوێند بەوکەسە کە ڕەوانی منی وا لەدەسا ئەوانیش وەك ئێوە ئاوا گوێیان لەم قسانەی منە، وەلێ ئەوەندە هەیە ئەوان ناتوانن وەڵام بدەنەوە. (ب/ ئەحمەد).

٤٥٨١- تەماشای فەرموودەی بیست و شەشەمی سوورەتی ئالی عیمران بکە. لێرەدا دەفەرموێ: لەم غەزایەدا ناموسوڵمانەکان زیانی حەفتا کەسیان لە ئێمەدا، لە ڕۆژی غەزای بەدردا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) و یارانی زیانی سەدو چل کەسیان لەوان دابوو، حەفتایان دیل و حەفتایان کوژراو بوو. ئەبو سوفیان بانگی کرد لە دوورەوە گوتی: ئەمڕۆژە لەجیاتی ڕۆژەکەی بەدر، جەنگیش دوو بەختییەو هاتو نەهاتەو سەرکەوتن و ژێرکەوتن لە شەڕدا وەك سەتڵی سەر بیر وایە هەرساتەی بەدەست کەسێکەوەیە[٧].

---

[٧] راجع الحديث الرقم (٢٦) من تفسير سوة آل عمران من مجلد سادس.

## ٨٥) گەورەیی یارانی غەزای بەدرو ژمارەیان چەند کەس بووە:
## فضل أهل بدر وعددهم

٤٥٨٢- عَنْ رِفَاعَةَ الزُّرَقِيِّ (رضي الله تَعَالَى عَنْه) وَكَانَ مِمَّنْ شَهِدَ بَدْراً قَالَ: جَاءَ جِبْرِيلُ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: مَا تَعُدُّونَ أَهْلَ بَدْرٍ فِيكُمْ؟ قَالَ: مِنْ أَفْضَلِ الْمُسْلِمِينَ أَوْ كَلِمَةً نَحْوَهَا، قَالَ: وَكَذَلِكَ مَنْ شَهِدَ بَدْرًا مِنَ الْمَلَائِكَةِ. رَوَاهُ البخاري[1]:

ریفاعەی زورەقی (خودای لێ رازی بێ) کە خۆی یەکێك بوو لەوانەی کە بەشداری غەزای بەدر بوو بوون فەرمووی: جوبرائیل (درودی خودای لەسەر بێ) هاتە لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: ئێوە لەناو خۆتانا ئەوانەی کە لە غەزای بەدردا بەشدارییان کردووە چی پایەیەکیان بۆ دادەنێن؟ فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): لە ریزی هەرە باشی موسوڵمانانیان حلێب دەکەین یا حەزرەت فەرمایشتێکی وای فەرموو. جوبرائیلیش فەرمووی: هەروەها ئێمەیش لەناو خۆماندا ئەو فریشتەیەی بەشداری کردبێ لەم جەنگەدا لە ریزی فریشتە هەرەباشەکانی دادەنێین! (ب).

حەدیث و فەرمایشتی حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) وەکوو ئایەتی قورئان وایە، ئەگەر موسوڵمانێ روانی وا هەڵەیەکی تێکەوتووە، یا خوا نەخواستە تووشی بێ رێزییەك بووە، وەك ئەوە کەوتۆتە ژێر پێ، دەبێ (بەپێی تەوانا) ئەو هەڵەیە راست بکاتەوە، یا ئەو بێ رێزییە چارەسەر بکا.

لەبەرگی چوارەمی (اقتران النيرين)ەکەی مامۆستا مەلا رەشید بەگی بابانـدا لە لاپەرە (٣٤٠)دا، دەفەرموێ: ریفاعەی کوڕی رافیع لە باوکیەوە (رضي الله تَعَالَى عنه) ریوایەت دەکا، باوکی لە ئەهلی بەدر بوو... قسەکەی مامۆستا رەشید (رەزای خودای لێ بێ) تەواو، بەلام هەڵەیەکی تیادایە وا بەپێی عەینی (خودای لێ رازی بێ) راستی دەکەمەوە، لە عەینیدا لە باسی (بَابَ شُهُودُ الْمَلَائِكَةِ بَدْرًا)دا دەفەرموێ: قَوْلُهُ (وَكَانَ أَبُوهُ) أي أَبُو مُعَاذٍ هُوَ رِفَاعَةُ مِنْ أَهْلِ بَدْرٍ.

---

[1] بخاري. مغازي: ٣٩٩٢ ، ٣٩٩٤ تجريد/ ٤/ ٢٥٣ رقم: ١٥٢٨.

هەر لەم باسەدا لە صەحیحی بوخاری شەریفدا دەفەرموێ: (حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ حَرْبٍ حَدَّثَنَا حَمَّادٌ عَنْ يَحْيَى عَنْ مُعَاذِ بْنِ رِفَاعَةَ بْنِ رَافِعٍ، وَكَانَ رِفَاعَةُ مِنْ أَهْلِ بَدْرٍ، وَكَانَ رَافِعٌ مِنْ أَهْلِ الْعَقَبَةِ، فَكَانَ يَقُولُ لِابْنِهِ: مَا يَسُرُّنِي أَنِّي شَهِدْتُ بَدْرًا بِالْعَقَبَةِ، قَالَ سَأَلَ جِبْرِيلُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بِهَذَا).

واتە: شێخی بوخاری (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: سولەیمانی کوڕی حەرب ئەم فەرمایشتەی پێمان فەرموو، لە حەممادەوە، لە یەحیاوە، لە موعاذی کوڕی ریفاعەی کوڕی رافیعەوە، ریفاعە لە یارانی غەزای بەدر بوو، لەو غەزا پیرۆزەدا بەشداری کردبوو، بەڵام رافیعی باوکی لە یارانی بەیتولعەقەبە بوو، لەو بەیعەتە فەرمانەدا بەشداریی کردبوو، گەلێ جار بە ریفاعەی کوڕی خۆی دەفەرموو: گەرچی ئەم پرسیارو وەڵامەی کە بۆتۆم گێڕایەوە لەبارەی گەورەیی غەزای بەدرەوە، لەنێوانی پێغەمبەرو جوبرائیلدا رووی داوە، وەلێ من بەش بەحاڵی خۆم، لە دڵ‌و باوەڕی خۆما خێرو گەورەیی ئەم پەیمانی لەیلەتولعەقەبەیە ناگۆڕمەوە بە فەزڵی حازربوونی غەزای بەدر. کەواتە: ریفاعە خۆی بەدری بووە، نەك باوکی، بەڵکوو باوکی عەقەبەیی بووە، لەسەر قسەی خۆی، و لەسەر فەرمایشتی عەللامەی عەینی (خودای لێ رازی بێ) کە هەر لەو شوێنەدا دەفەرموێ: ریفاعە خۆی بەبێ خیلاف بەدری بووە، بەڵام رافیعی باوکی یەکێ بووە لە دوانزە نەقیبەکانی شەوەکەی پەیمانی عەقەبەی یەکەم‌و لە پەیمانی عەقەبەی دووەمیشدا کە حەفتا کەس بوون دیسان ئامادە بووە، وە بەشداری لە غەزای بەدردا نەکردووە گەرچی لەوەدا کە رافیع بەدرییە یانا فەرایشتی زاناکان یەك نییە.

لێرەدا بەندە قسەیەکم هەیە وا بۆ ئەهلی ئیختصاص‌و پسپۆڕانی خۆی تۆماری دەکەم، چونکە ئومێد دەکەم لە قاپی رەحمەتی خودا کە ئەم دینی موحەممەدە (درودی خودای لێ بێ‌و سەرو ماڵ‌و منداڵ‌و هەست‌و نەست بەقوربانی گەردی بەر ئاستانەی گۆڕی پیرۆزی بێ) هەروا بێ نازو بێ رێز نەبێ‌و بە زوویی، وەك جاری جاران ببێتەوە بە هەوێنی ژین‌و بە گیانی ژیانی هەردوو جیهانمان“ جا

ئەوسا بەخێرو خۆشی ڕۆژی ئەم بابەتانەی ئێمەیش دێتەوە، قسەکەشم ئەمەیە: داخەکەم ئێستاکە ئەم جۆرە کتێبانە کە بە کوردی دەنووسرێن ئەم دوو کۆسپە گەورەیان لەڕێ دایە، یەکەم ماموستا ئایینییەکانمان هەتا عەرەبی وەستا بێ بەلای کوردیدا کەمتر دەچن، جارێ ماموستا مەلا عەلی فەتوحوڵلا لە کەرکووك، مەدحی تەرجەمە کوردییەکەی تاجول ئوصولی کرد، لەسەر قسەی مەلا عەبدوڵڵا ناوێ، منیش عەرزیم کرد: قوربان! چەند بەرگێکی چاپ کراوە با بۆت بێنم، فەرمووی: نەء، مەیهێنە، بەخوا من حەزم لە عەرەبییەکە پترە، ئەمەی من عەرزتانی دەکەم دەقی قسەی مەلایەکی کوردی مەردی موسوڵمانی چاکی پاکە، دەبێ بەم پێیە بێ زۆڵە کوردێکی نامەردی بەناو موسوڵمان چی بڵێ!

بۆیە دەڵێم بۆ ئەهلی ئیختیصاص، چونکە ماموستا مەلا عەبدول کەریمی بیارە، کە دین و عیلم و فەضل و هونەرو خزمەتی بۆ ئیسلام و بۆ کورد لە عالم دیارە، کە لە حەزرەتی شێخ عەبدولقادر (خودای لێ ڕازی بێ) چوومە خزمەتی گلەیی لێ کردم و فەرمووی: بێ مەعنا بۆچی تاجت بۆ من نەناردووە، خۆم زەلامێکم ناردووە بەرگی یەکەمی بە پێنج دینار بۆ کڕیوم، منیش عەرزیم کرد خوا یاربێ بەزوویی بۆتی دەنێرم، پێش ئەوەی تاجەکە بە دەستی ماموستا بگا، بۆ تەئکید ئەم نامەیەی لە پشتی (أرشاد الانام) (کە دانراوی خۆیەتی و بە دیاری بۆ ئەم فەقی بێ مەعناو بێ وەفایەی خۆی ناردبوو) نووسیبوو:

چاوەکەم نووری گیان سەلامت لێ ئەکەم جواب بنێرە بۆ کاك محمود لە تەرجەمەی تاجەکەت بێ بەشمان نەکا. تاجی اصول شرفی وصولی نەبەخشی. برات عبدالکریم مدرس. ١٩٩٠/٧/٢٥– ٢ محرم ١٤١١.

دەمێ بوو گرێ بوو لە دڵما کە بچمە خزمەتی ماموستاو بۆ موبارەکی ئیجازە نامەیەکی مەلایەتی لێ وەربگرم، ئەوا خوداو ڕاسان خودا لە بەرەکەتی

تاجەوە رەخساندی و وەك حەزرەتی رافیع (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی منیش دەڵێم: ما یسرنی انی اخذت الاجازة العلمیة بهذه الرسالة المبارکة.

دووەم کۆسپ لەبەردەم ئەم جۆرە کتێبانەدا زوربەی ئەوانەی کە دەیان خوێننەوە ئەوەندە دەربەستی ئەم ووردەکارییە نین و بگرە تێشی ناگەن، ئەوە کەمتەرخەمی و گیرو گرفت و کێشەی چاپکردنی کتێبی کوردی لەوێ بوەستێ، من بەش بەحاڵی خۆم لە دەقە عەرەبییەکەی تاجدا، لەهەر پێنج بەرگەکەیدا باوەڕناکەم پێنج هەڵەی چاپم دیبێ! وەلێ لەوەرگەڕاوە کوردییەکەیدا کەم حەدیث هەیە هەڵەیی دوانی تیا نەبێ ئەوەیش (خودا شایەتە) خەتای منی تیادا نییە، من بەهیچ جۆرێ، بەکەم و زۆر هەقم بەسەر لایەنی چاپکردنەوە نییە، چونکە کتێب هەروا بە ئاسانی چاپ ناکرێ، ئەرکی گەرەکە، پارەی گەرەکە، هاموشۆی دائیرەو چاپخانەی دەوێ، کاغەز پەیداکردنی دەوێ، ساخکردنەوەی کتێبەکەی لە بازاڕدا گەرەکە، وەلحاصڵ گێرەو کێشەی زۆرە ئەوە بەمن ناکرێ، خودا کاری مامۆستا مەحموود ئەحمەد محمد راست بکا، کە بەخێری خۆی ئەو لایەنانەی هەموو لە کۆڵ بەندە کردۆتەوە، خودا لەهەردوو جیهاندا چاکەی چاکی بداتەوەو بەهۆی ئەم کتێبە پیرۆزەوە خێرو بێری زۆری هەردوو دنیای بڕژێ بەسەرداو تووشی زیانی سامانی و گیانی نەبێ.. ئامین.

٤٥٨٣- عَنِ الْبَرَاءِ (رضی الله عنه) قَالَ: كُنَّا نَتَحَدَّثُ أَنَّ أَصْحَابَ بَدْرٍ الْحَدِيْث ← (ب- ٦ز- ٩ل- ١٨١ف- ٢)[٢]:

لێرەدا ئەمەی پترە: رواه البخاری والترمذی ولفظه ثلاثمائة وثلاثة عَشر رجلا: بوخاری و تیرمیذی ریوایەتیان کردووە، گفتەی (ت) ئاوایە: سێ سەدو سیازدە پیاو بوون.

---

[٢] تقدم في مجلد سادس. تسلسل/ ٩ رقم: ٢/ ٣٨٧٦.

٤٥٨٤- وَعَنْهُ قَالَ: اسْتُصْغِرْتُ أَنَا وَابْنُ عُمَرَ يَوْمَ بَدْرٍ وَكَانَ الْمُهَاجِرُونَ يَوْمَ بَدْرٍ نَيِّفًا عَلَى سِتِّينَ وَالأَنْصَارُ نَيِّفًا وَأَرْبَعِينَ وَمِائَتَيْنِ. رَوَاهُ البخاري[٣]:

**دیسان بەراء** (رەزای خودای لێ بێ) **دەفەرموێ: ڕۆژی بەدر من‌و عەبدوڵڵای کوڕی عومەر خۆمان هەڵخلان کە بچین بۆ غەزا بەڵام بەگچکە دانراین‌و پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **کە تەماشای کردین بە گەندی نەکردین‌و ئایەخی کردین. ژمارەی کۆچکارانیش (لە ڕۆژی بەدردا) لە نێوانی شەست‌و حەفتادا بوون، ژمارەی یاریدەدەرانیش لە نێوانی دوو سەدو چل‌و دوو سەدو پەنجادا بوون (ب).**

**٤٥٨٥- ← تەماشای سوورەتی مەمتەحینە، فەرموودەی یەکەم بکە، کە دەفەرموێ: {لعل الله (عز وجل) اطلع على أهل بدر فقال أعلموا ما شئتم فقد غفرت لكم}. ئەمە لە شەرحەکە وەرگیراوە[٤]. (وەرگێڕ)**

## ٨٦) کوشتنی ئەبو جەهل: (قتل أبي جهل)

٤٥٨٦- عَنْ أَنَسُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ يَنْظُرُ لَنَا مَا صَنَعَ أَبُو جَهْلٍ، فَانْطَلَقَ ابْنُ مَسْعُودٍ فَوَجَدَهُ قَدْ ضَرَبَهُ ابْنَا عَفْرَاءَ حَتَّى بَرَدَ، فَأَخَذَ بِلِحْيَتِهِ فَقَالَ: آنْتَ أَبُو جَهْلٍ؟ فَقَالَ: وَهَلْ فَوْقَ رَجُلٍ قَتَلْتُمُوهُ أَوْ قَالَ قَتَلَهُ قَوْمُهُ، فَلَوْ غَيْرُ أَكَّارٍ قَتَلَنِي. رَوَاهُ الشيخان: نَسْأَلَ الله التَوفيقَ وَكامِلَ اليقين. آمين[١]:

**ئەنەس** (خودای لێ ڕازی بێ) **دەفەرموێ: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: کێ دەچێ بزانێ کە ئەبو جەهل ماوە یا کوژراوە؟ ئیبنو مەسعوود دەچێ، تەماشا دەکا وا دوو کوڕەکەی عەفرا کە ناویان مەعاذو موعەوویذ بوو لێیان داوەو لە پەل‌و پۆیان خستووەو خەریکە سارد دەبێتەوەو دەمرێ،**

---

[٣] بخاري. مغازي: ٣٩٥٥.

[٤] راجع تفسير سورة الممتحنة في المجلد السابع الحديث الأول.

[١] تجريد البخاري/ ٤/ ٣٥١ رقم: ١٥٢٦ = ٣٩٦٢ ، ٣٩٦٣ ، ٤٠٢٠. مسلم. مغازي: ٤٦٣٨.

جا ئیبنو مەسعوود (خودای لێ رازی بێ) ریشی دەگرێ‌و دەڵێ: تۆ ئەبو جەهلیت؟ دەڵێ: بەڵێ ئەوم، جا چی تیایە، پیاوێ ئێوە بیکوژن نەبۆ ئەو شوورەیی‌یەو نە بۆ ئێوە شانازییە، یا دەڵێ: چی تیادایە پیاو هۆزی خۆی بیکوژێ، بەڵام خۆزیا (پیاوێکی پیاوانە بیکوشتمایەو) بە دەستی وەرزێرو سەپان نەکوژرامایە بە ئیبنو مەسعوود دەڵێ (لەوکاتەدا کە پێ دەنێتە سەر بۆ تەقەی لاملی تا سەری لەلاشەی بکاتەوە): ئەی شوانە بچکۆلەی ران! ئەی بەرخەلەوان! چوویتە سەر جێگەیەکی بەرزی سەخت: دواتر ئیبنو مەسعوود هەندێ قسەی تری لەگەڵ دەکا‌و ئەوجا بە تەواوی دەیکوژێ‌و بە دۆزەخی شاد دەکا‌و سەرەکەی لێ دەکاتەوەو دەیهێنێ بۆ خزمەتی حەزرەت (ش).

## ٨٧) غەزای ئوحود: (غزوة أحد)

قَالَ الله تعالى: {وَإِذْ غَدَوْتَ مِنْ أَهْلِكَ تُبَوِّئُ الْمُؤْمِنِينَ مَقَاعِدَ لِلْقِتَالِ وَاللّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ إِذْ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمْ أَن تَفْشَلاَ وَاللّهُ وَلِيُّهُمَا وَعَلَى اللّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ} (١٢١/٣) (١٢٢).

واتە: ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! باسی ئەوکاتە بکە کە دەرچوویت لەلای خێزانی خۆت بۆ مەیدانی جەنگ لە نزیکی ئوحودداو موسوڵمانەکانت دادەمەزراند لە شوێنی خۆیاندا بۆ جەنگ کردن لەگەڵ ناموسوڵمانەکاندا خودای گەورە وتاری ئێوەی دەبیست‌و زانابوو بە نیازی دڵتان.. باقی مەندەی تەفسیرەکە لەم شوێنەدا رابوورد ← (ب- ٦ز- ٤ل- ٨٢ف- برقم/ ٢١/ ٣١٧٤).

٤٥٨٧- عَنِ الْبَرَاءِ (رضى الله عنه) قَالَ: لَقِينَا الْمُشْرِكِينَ يَوْمَ أُحُدٍ وَأَجْلَسَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) جَيْشًا عَلَى الرُّمَاةِ وَأَمَّرَ عَلَيْهِمْ عَبْدَ اللهِ بْنَ جُبَيْرٍ وَقَالَ: لاَ تَبْرَحُوا إِنْ رَأَيْتُمُونَا ظَهَرْنَا عَلَيْهِمْ فَلاَ تَبْرَحُوا وَإِنْ رَأَيْتُمُوهُمْ ظَهَرُوا عَلَيْنَا فَلاَ تُعِينُونَا، فَلَمَّا لَقِينَاهُمْ هَرَبُوا حَتَّى رَأَيْتُ النِّسَاءَ يَشْتَدِدْنَ فِي الْجَبَلِ، يَرفَعْنَ عَنْ سُوقِهِنَّ قَدْ بَدَتْ خَلاَخِلُهُنَّ فَأَخَذُوا يَقُولُونَ الْغَنِيمَةَ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بِنُ جُبَيْرٍ.عَهِدَ إِلَيَّ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَلاَّ

تَبْرَحُوا فَأَبَوْا فَلَمَّا أَبَوْا صُرِفَ وُجُوهُهُمْ فَأُصِيبَ سَبْعُونَ قَتِيلاً وَأَشْرَفَ أَبُو سُفْيَانَ فَقَالَ: أَفِي الْقَوْمِ مُحَمَّدٌ؟ فَقَالَ: لاَ تُجِيبُوهُ فَقَالَ: أَفِي الْقَوْمِ ابْنُ أَبِي قُحَافَةَ؟ قَالَ: لاَ تُجِيبُوهُ، فَقَالَ: أَفِي الْقَوْمِ ابْنُ الْخَطَّابِ؟ فَقَالَ: إِنَّ هَؤُلاَءِ قُتِلُوا فَلَوْ كَانُوا أَحْيَاءً لأَجَابُوا فَلَمْ يَمْلِكْ عُمَرُ نَفْسَهُ فَقَالَ: كَذَبْتَ يَا عَدُوَّ اللَّهِ أَبْقَى اللَّهُ عَلَيْكَ مَا يُخْزِيكَ فَقَالَ أَبُو سُفْيَانَ: أُعْلُ هُبَلْ. فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): أَجِيبُوهُ، قَالُوا: مَا نَقُولُ؟ قَالَ: قُولُوا اللَّهُ أَعْلَى وَأَجَلُّ، قَالَ أَبُو سُفْيَانَ: لَنَا الْعُزَّى وَلاَ عُزَّى لَكُمْ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): أَجِيبُوهُ، قَالُوا: مَا نَقُولُ؟ قَالَ: قُولُوا اللَّهُ مَوْلاَنَا وَلاَ مَوْلَى لَكُمْ. قَالَ أَبُو سُفْيَانَ: يَوْمٌ بِيَوْمِ بَدْرٍ وَالْحَرْبُ سِجَالٌ وَسَتَجِدُونَ مُثْلَةً لَمْ آمُرْ بِهَا وَلَمْ تَسُؤْنِي[1]:

**← (ب- ٦٦ز- ٤ل- ٨٥ف- ٢٦) لێرەدا دەفەرموێ: بەرائی کوڕی عازیب (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: لە ڕۆژی ڕووداوی ئوحوددا لە پێش ئەوەدا کە تووشی ناموسوڵمانەکان ببین، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) عەبدوڵڵای کوڕی جوبەیری کرد بە سەرکردەی پیادەکان کە پەنجا پیاوی تیرهاوێژ بوون، پێی فەرموون: ئەگەر دیتان وا ئێمە زاڵبووین بەسەریاندا ئێوە لە جێی خۆتان مەبزوێن هەروەها ئەگەر بە چاوی خۆتان ئێمەتان دی لەو ناوەدا کوژراوین و لاشەمان کەوتووەو مەڵو مۆرو جانەوەر دەمان خۆن ئێوە لەم شوێنەی خۆتان مەجووڵێن و بەناوی یاریدەدانی ئێمەوە پشتمان چۆڵ مەکەن، بەڵام جەنگاوەرە پیادەکان فەرمانەکەی پێغەمبەریان شکاند، لەسەرەتای شەڕەکەوە کە دییان ئەوا لەشکری ئیسلام سەرکەوتن شوێنەکەی خۆیانیان بەجێ هێشت و چوون بۆ تالانی کۆکردنەوە، لەسەرەتای پێکهەڵپرژانەکەوە بێ بڕواکان واشکان نەبێتەوە تەنانەت وا شکان بەچاوی خۆم دیم ژنەکانیان قولیان هەڵماڵی بوو پاوانەکانیان دەرکەوتبوو، بە کێوەکەدا بەپەلە پرووزە هەڕایان دەکرد هەتا خۆیان دەرباز بکەن! ئەم ژنانە لەپێشدا وا سوور بوون لەسەر شەڕکردن بە دەفلێدان و بە سروود خوێندنەوە هانی مێردەکانیان دەدا لەسەر شەڕو دەیانگوت:**

---

[1] تقدم في مجلد سادس. تسلسل/ ٤ رقم: ٢٦/ ٣٧٧٩.

نحن بنات طارق نمشي على النمارق

ان تقبلوا نعانق و تـدبـروا نفـارق

فراق غير وامق

واتە:

کچی ئەستێرەی سوورین پەروەردەی سەر مافوورین

عاشق بە شێرو شوورین لە پیاوی کوونی دوورین!

یاری لاوی جەسوورین

بـەم شـێوەیەش تەرجەمـە دەکـرێ، کـە لـە گیـانی هەڵبەسـتەکان و داستانەکەوە نزیکترە:

کچی ئەستێرەو مانگین بەنازو شۆخ و شەنگین

ئاشق بە شێری جەنگین ئەو گوڵە و ئێمە هەنگین

لە هەڵهاتوو دڵتەنگین[1]!

جا هاوڕێکانی عەبدوڵڵا کە دییان وا دوژمن شکان، بانگی یەکترییان دەکرد: خزمینە! فریاکەون، ئادەی تالانە تالان! هەرچەند عەبدوڵڵا (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: شتی وا مەکەن، چونکە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کردووە بەمن کە ئێوە لێرە نەجووڵێن، بەڵام بەگوێیان نەکردو چوون بۆ تالان کۆکردنەوە (بەس عەبدوڵڵاو چەن کەسێ لەوی مانەوە، ئەوانیش شەهید بوون) ئیتر بۆیە لەدوایدا خۆشییان لێ بوو بە ناخۆشی، ئەوەبوو حەفتاکەس لە ئێمە کوژران. ئەبو سوفیان کردیە سەر بەرزاییەك و بانگی کرد: ئایا موحەممەد ماوە یا کوژراوە؟ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: وەڵامی مەدەنەوە دیسان

---

[1] شوور: شیری برندە (ف. خاڵ) واتە: شەیدای پاڵەوانی ئازاین ، کە هەمیشە وەك شێری نەڕ بە شمشێرەوە لە مەیدانا وەستابێ ، ئەمەش وا دەخوێنرێتەوە (کچی ئەستێرەو مەنگین).

(وەرگێڕ)

گوتی: ئەی ئەبو بەکر ماوە یا کوژراوە؟ فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): وەرامی مەدەنەوە ئینجا گوتی: ئەی عومەری کوڕی خەططاب ماوە یا ئەویش کوژراوە؟ جا کە روانی کەس وەڵامی ناداتەوە گوتی: دیارە کە ئەمانە هەموویان کوژراون، ئەگینا ئەگەر زیندوو بوونایە وەڵامیان دەدایەوە، عومەریش خۆی پێ نەگیرا فەرمووی: درۆت کرد، ئەی دوژمنی خودا! خودا مایەی خەم و خەفەتی بۆ تۆ هێشتووەتەوە کە پێی بتەقی! (لە سایەی خوداوە ئەم سێ کۆڵەکەی ئیسلامە ماون، خوا حەزکا بە زوویی شاییت لێ دەکەن بەشین)، دواتر ئەبو سوفیان گوتی: ئەی هوبەل! بژی بەسەر بەرزی. پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئادەی وەڵامی بدەنەوە عەرزیان کرد: بڵێین چی؟ فەرمووی: بڵێن: گەورەیی و سەر بەرزی هەر بۆ دینی خودایە، کەوایان گوت، ئەبو سوفیان گوتی: ئێمە خودایەکی تریشمان هەیە کە ناوی عوززایە و ئێوە خودای عوززا ناوتان نییە! پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئادەی وەڵامی بدەنەوە گوتیان: چی بڵێین؟ فەرمووی: بڵێن: ئێمە خودای گەورەو سەروەر گەورەو سەروەرمانە، ئێوە گەورەو سەروەرتان نییە. ئەبو سوفیان گوتی: ئەمرۆژە بە رۆژەکەی بەدر، بزانن شەڕیش بە نۆرەو سەرەیە، هەر جارەی کەسێ دەیباتەوە، لەناو کوژراوەکانتاندا دەبینین کە هەندێکیان ئەتك کراون و لچ و لێو کراون و لووت و گوێ کراون، ئەوە هەرچەند بە فەرمانی من نەبووە، بەڵام پێشم ناخۆش نییە! (ب).

٤٥٨٨- عَنْ أَنَسٍ (رضي الله عنه) أَنَّ عَمَّهُ غَابَ عَنْ بَدْرٍ فَقَالَ: غِبْتُ عَنْ أَوَّلِ قِتَالِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لَئِنْ أَشْهَدَنِي اللَّهُ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لَيَرَيَنَّ اللَّهُ مَا أُجِدُّ. فَجَاهَدَ يَوْمَ أُحُدٍ فَهُزِمَ النَّاسُ فَقَالَ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعْتَذِرُ إِلَيْكَ مِمَّا صَنَعَ الْمُسْلِمِينَ وَأَبْرَأُ إِلَيْكَ مِمَّا جَاءَ بِهِ الْمُشْرِكُونَ فَتَقَدَّمَ بِسَيْفِهِ فَلَقِيَ سَعْدَ بْنَ مُعَاذٍ فَقَالَ: أَيْنَ يَا سَعْدُ إِنِّي أَجِدُ رِيحَ الْجَنَّةِ دُونَ أُحُدٍ فَمَضَى فَقُتِلَ فَمَا عُرِفَ حَتَّى عَرَفَتْهُ أُخْتُهُ بِشَامَةٍ أَوْ بِبَنَانِهِ وَبِهِ بِضْعٌ وَثَمَانُونَ مِنْ طَعْنَةٍ وَضَرْبَةٍ وَرَمْيَةٍ بِسَهْمٍ. رَوَاهُما البخاري[٢]:

---

[٢] راجع سورة الأحزاب في المجلد السابع.

ئەنەس (ڕەزای خودای گەورەی لێ بێ) فەرمووی: دەقی ئەم فەرموودەیە لە سوورەتی ئەحزابدا رابوورد.

٤٥٨٩- وَعَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أُفْرِدَ يَوْمَ أُحُدٍ فِي سَبْعَةٍ مِنَ الأَنْصَارِ وَرَجُلَيْنِ مِنْ قُرَيْشٍ فَلَمَّا رَهِقُوهُ قَالَ: مَنْ يَرُدُّهُمْ عَنَّا وَلَهُ الْجَنَّةُ أَوْ هُوَ رَفِيقِي فِي الْجَنَّةِ فَتَقَدَّمَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ فَقَاتَلَ حَتَّى قُتِلَ فَلَمْ يَزَلْ كَذَلِكَ حَتَّى قُتِلَ السَّبْعَةُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) لِصَاحِبَيْهِ مَا أَنْصَفْنَا أَصْحَابَنَا. رَوَاهُ مسلم[٣]:

دیسان فەرمووی: لە ڕۆژی ئوحوددا ناموسوڵمانەکان پێغەمبەرو حەوت کەس لە یاریدەدەران و دوو کەس لە کۆچکاران لە کۆمەڵ دابڕدەکەن و ئابڵوقەیان دەدەن، کە تەنگیان پێ هەڵدەچنن پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەوەی بەریان بگرێ بەهەشت بۆ ئەو، یا دەفەرموێ: هاوڕێی خۆم دەبێ لە بەهەشتدا پیاوێ لە یاریدەدەرەکان بۆیان دەچێتە، پێشەوەو لەگەڵیانا شەڕ دەکا هەتا یاریدەدەرەکان هەر حەوتیان سەر پاك دەکوژرێن پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بە دوو هاوڕی کۆچکارەکانی خۆی دەفەرموێ: بێ ویژدانیانمان لەگەڵ ئەم هاوڕێ یانەماندا کرد! (م).

٤٥٩٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله تَعَالَى عنهما) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ يَوْمَ أُحُدٍ (صَوَابه يوم بَدْرٍ- شرحَهُ): هَذَا جِبْرِيلُ آخِذٌ بِرَأْسِ فَرَسِهِ عَلَيْهِ أَدَاةُ الْحَرْبِ. رَوَاهُ البخاري[٤]:

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) دەفەرموێ: ڕۆژی ئوحود حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەوە جوبرائیلە، جڵەوی ئەسپەکەی خۆی گرتووەو تفاقی جەنگی پۆشیوە (ب) دانەر (ڕەزای خودای لێ بێ) لە شەرحەکەدا دەفەرموێ: ڕۆژی ئوحود هەڵەیە، ڕاستەکەی ڕۆژی بەدرە، شێخی عەینیش (خودای لێ ڕازی بێ) هەروا دەفەرموێ، لە شەرحەکەو لە عەینیدا دەفەرموێ: ئیبنو

---

[٣] مسلم. مغازي: ٤٦١٧.

[٤] بخاري. مغازي: ٣٩٩٥ ، ٤٠٤١.

عـەبباس (خودایـان لێ رازی بـێ) لـە ئـەبو بـەکرەوە (خـودای لێ رازی بـێ) دەگێڕێتـەوە دەفـەرموێ: لـە رۆژی بـەدردا حـەزرەت (درودی خـودای لەسـەر بێ) وەنـەوزێ دەداو خەبـەری دەبێتـەوەو دەفـەرموێ: ئـەی ئـەبو بـەکر! مـوژدەت لێ بـێ، ئـەوە جوبرائیل بوو، (درودی لەسەر بێ)، جڵەوی ئەسپەکەی خۆی گرتووەو بە کێشی دەکا، قەپۆزو چوار پەلی لەبەر تەپ‌و تۆز دیارنین!

٤٥٩١- عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ (رضى الله تَعَالَى عنه) قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَوْمَ أُحُدٍ وَمَعَهُ رَجُلَانِ يُقَاتِلاَنِ عَنْهُ عَلَيْهِمَا ثِيَابٌ بِيضٌ كَأَشَدِّ الْقِتَالِ مَا رَأَيْتُهُمَا قَبْلُ وَلاَ بَعْدُ. رَوَاهُ الشيخان[٥]:

سەعدی کوڕی ئەبو وەققاس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: رۆژی غەزای ئوحود دوو پیاوی بەرگ سپیم دی، لەلای راست‌و لای چەپی پێغەمبەرەوە بوون، شەڕێکی زۆر گەرمیان بە دەوری حەزرەتدا دەکردو ئاگادارییان دەکرد، نە لەوەپێش ئەوانەم دیبوو، نە لەوەپاش دیمنەوە، ئەو دوو پیاوە حەزرەتی جوبرائیل‌و میکائیل بوون (ش).

٤٥٩٢- وَعَنْهُ قَالَ: نثل لي النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) كِنَانَتَهُ يَوم أحدٍ فَقَالَ: ارْمِ فِدَاكَ أَبِي وَأُمِّي: ← (ب- ٥ز- ١٢ل- ٨٦ف- ١)[٦]:

لێرەدا دەفەرموێ: رۆژی غەزای ئوحود پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) تیردانەکەی خۆی بۆ هەڵڕشتم‌و فەرمووی: تێگرەو تیر بهاوێژە، باوك‌و دایکم بەسەر گەردانت بن (ب).

٤٥٩٣- ← (ب- ٥ز- ٤٩ل- ١٧٩ف- ١)[٧].

٤٥٩٤- ← (ب- ٤ز- ٧٠ل- ٢١١ف- ١) + (ب- ٦ز- ٤ل- ٨٤ ف- ٢٤)[٨].

---

[٥] تجريد/ ٤/ ٢٨١ رقم/ ١٥٤٣ = ٤٠٥٤ مسلم: ٥٩٦٠ تجريد/ ٤/ ٢٨١ رقم: ١٥٤٣ = ٤٠٥٤.

[٦] تقدم في مجلد خامس. تسلسل/ ١٢ رقم: ١/ ٣٣٢٦.

[٧] تقدم في مجلد خامس. تسلسل/ ٤٩ رقم: ١/ ٣٤٧٨.

٤٥٩٥- ← (ب- ٦ز- ٤ل- ٨٤ف- ٢٤)[٩].

٤٥٩٦- قَالَ عَبْدُ اللّٰهِ (رَضِيِ اللّٰهُ عَنْهُ): كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَحْكِي نَبِيًّا مِنَ الأَنْبِيَاءِ ضَرَبَهُ قَوْمُهُ وَهُوَ يَمْسَحُ الدَّمَ عَنْ وَجْهِهِ، وَيَقُولُ: رَبَّ اغْفِرْ لِقَوْمِي فَإِنَّهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ[١٠]:

عەبدوڵلا (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: دەڵێی ئێستایە، هەروا لە بەرچاوم کە چۆن پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لاسایی یەکێ لە پێغەمبەرەکانی دەکردەوە کە گەلەکەی لێیان دابوو، سەریان شکاند بوو، خوێنەکە بەدەم‌و چاویا هاتبۆ خوارەوە، پێغەمبەرەکە لەوکاتەدا کە خوێنەکەی لە ریشی دەسڕی دەیفەرموو: پەروەردگاری من! ئەی خودایە! لێیان مەگرەو لەم گەلەی من خۆش بە چونکە ئەمانە نەفامن‌و نازانن (م) ئیمامی نەوەوی (پڕ گۆڕی پیرۆزی لەنوور بێ) لە شەرحی صەحیحی موسلیمدا لەباسی غەزای ئوحوددا، لە راڤەی ئەم فەرموودەیەدا دەفەرموێ: لە رۆژی غەزای ئوحوددا وێنەی ئەم داستانەو ئەم حەوسەڵەو پاڕانەوەیە لە پێغەمبەری خۆشمانەوە (درودی خودای لەسەر بێ) رووی داوە.

٤٥٩٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: اشْتَدَّ غَضَبُ اللّٰهِ عَلَى رَجُلٍ يَقْتُلُهُ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)[١١]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: کوورەی رق‌و قین‌و قاری خودا جۆش دەسەنێت لە ئاستی ئەو پیاوەی کە پێغەمبەرێ لە پێغەمبەرانی خودا لە غەزادا، لە پێناوی یارمەتی ئایینی خودادا بە دەستی خۆی بیکوژێ (ش) ئوبەییەی کوڕی خەڵەف لە

---

[٨] تقدم في مجلد رابع. تسلسل/ ٧٠ رقم: ١/ ٣٠١٣.

[٩] تقدم في مجلد سادس. تسلسل ٤ رقم: ٢٤/ ٣٧٧٧.

[١٠] مسلم. مغازي: ٤٦٢٢. تجريد/ ٤/ ٧٤ رقم: ١٣٨٧ = ٣٤٧٧ ، ٦٩٢٩.

[١١] تجريد/ ٤/ ٢٨٨ رقم: ١٥٤٨ = ٤٠٧٣ فتحز مسلم. مغازي: ٤٦٢٤.

غەزای ئوحوددا پەلاماری پێغەمبەری دا کە بیکوژێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نێزەیەکی لێداو کوشتی، جا حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) بەم بۆنەیەوە ئەمەی فەرموو. (وەرگێڕ)

٤٥٩٨- تەماشای فەرموودەی دووەمی سوورەتی (ضوحا) بکە[١٢].

٤٥٩٩- ← (ب- ٤ز- ١١٣ل- ٣٦٨ف- ١)[١٣].

٤٦٠٠- ← (ب- ٦ز- ٤ل- ٨٣ف- ٢٢+ ٢٧+ ٢٨+ ٣٠+ ٣٢)[١٤].

## ٨٨) غەزای خەندەق: (غزوة الخندق)

قَالَ الله تعالى: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَاءَتْكُمْ جُنُودٌ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا وَجُنُودًا لَمْ تَرَوْهَا وَكَانَ اللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا} (٩/٣٣).

خودای گەورە فەرموویەتی: ئەی کەسانێ کە خاوەنی باوەڕن! باسی ئەو بەهرە گەورەی خودای گەورە بکەن کە لە غەزای خەندەقا خودا رژاندی بەسەرتانا، بە تایبەتی هینی ئەوکاتە کە سوپای دوژمنەکان گەلەکۆمەیان لێ کردن‌و هاتن بۆ سەرتان، بە نیازی ئەوەی کە بەیەکجار ریشەکەنتان بکەن ئەوەبوو ئێمە سوپای بای سەخت‌و ساردمان بۆ ناردن، چراو ئاگرەکانی کوژاندنەوەو چادرو دەوارەکانی شڕو وڕ کردن، هەروەها سوپایەکی تریشمان لە فریشتەی ئاسمان نارد بۆ سەریان کە ئێوە نەتان دەبینین، خودا خۆی ئاگای لە حاڵ‌و کارو کردەوەتانە.

٤٦٠١-← (ب- ١ز- ٥١ل- ٢٠٧ف- ٢)[١].

٤٦٠٢-← (ب- ٥ز- ٤٤ل- ١٧٢ف- ١٧)[٢].

---

[١٢] راجع الحديث الثاني من سورة الضحي.

[١٣] تقدم في مجلد رابع. تسلسل/ ١١٣ رقم: ١/ ٣١٩٤.

[١٤] تقدم في مجلد سادس. تسلسل/ ٤ رقم: ٢٢/ ٣٧٧٥ + ٣٧٨٠/٢٧ + ٣٧٨١/٢٨ + ٣٧٨٣/٣٠ + ٣٧٨٥/٣٢.

[١] تقدم في مجلد الأول. تسلسل/ ٥١ رقم: ٢/ ٣٧٩.

٤٦٠٣- عَنْ الْبَرَاءَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْـهُ) قَـالَ: كَـانَ النَّبِـيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) يَـوْمَ الأَحْزَابِ يَنْقُلُ مَعَنَا التُّرَابَ وَلَقَدْ وَارَى التُّرَابُ بَيَاضَ بَطْنِهِ وَهُوَ يَقُولُ:

وَاللَّـهِ لَـوْلاَ اللهُ مَـا اهْتَـدَيْنَا

وَلاَ تَـصَدَّقْنَا وَلاَ صَلَّيْنَـا"

فَـأَنْزِلَنْ سَكِينَـةً عَلَيْنَـا

وَثَبِّـتِ الأَقْـدَامَ إِنْ لاَقَيْنَـا

إِنَّ الأُلَـى قَـدْ بَغَـوْا عَلَيْنَـا

وَإِنْ أَرَادُوا فِتْنَـةً أَبَيْنَـا

وَيَرْفَـعُ بِهَـا صَـوْتَهُ أَبْينـا أبينـا

رَوَاهُما الشيخان[٣]:

بەراء (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: لە ڕۆژی غەزای خەندەقا، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) خۆشی لەگەڵ ئێمەدا بە کۆڵ خۆڵی دەگواستەوە، خۆڵ‌و تەپ‌و تۆز سپیایی سك‌و سەر سینگی داپۆشیبوو، لەو حاڵەدا حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) بە سۆزەوە دەیفەرموو:

وَاللَّـهِ لَـوْلاَ أَنْـتَ مَـا اهْتَـدَيْنَا

وَلاَ تَـصَدَّقْنَا وَلاَ صَـلَّيْنَا"

فَـأَنْزِلَنْ سَـكِينَةً عَلَيْنَـا

وَثَبِّـتِ الأَقْـدَامَ إِنْ لاَقَيْنَـا

إِنَّ الأُلَى (هُمْ) قَدْ بَغَـوْا عَلَيْنَـا

إِذ أَرَادُوا فِتْنَـةً أَبَيْنَـا

---

[٢] تقدم في مجلد الخامس. تسلسل/ ٤٤ رقم: ١٧/ ٣٤٦٤.

[٣] تجريد/ ٣/ ٣٦٤ رقم: ١٢٤٠ = ٣٠٤١ ، ٤١٩٤. مسلم. مغازي: ٤٦٥٣ ، ٤٦٥٤.

به شیعر له بەحرەکەی خۆی کە رەجەزە واتە:

خـودا بـەتۆ قەسـەم لـە فـەزڵی تۆیـە وا

نێـژو زەکـات و خێـر دەکـەین وڕێـی ڕەوا

دەگرینە بەر، کە بوو بەشەڕ ناسایـشت

بکەینە بەر، وەکوو سوپەر، یـا سەرکەوا

قەت نایـەڵین، قـین لـە دڵـی نـاژاوەگێڕ

دووبـەرەکـی بـەرپا بکـا لـە نـاوا!

بەراء (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەنگی لەم رستەیە بەرز دەکردەوە و خۆش خۆش دەیفەرموو: أبینا.. أبینا: قەت نایەڵین.. قەت نایەڵین.. (ش).

٤٦٠٤- عَنْ جَابِرًا (رضى الله عنه) قَالَ: إِنَّا يَوْمَ الْخَنْدَقِ نَحْفِرُ فَعَرَضَتْ كُدْيَةٌ شَـدِيدَةٌ فَجَاءُوا النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالُوا: هَذِهِ كُدْيَةٌ عَرَضَتْ فِي الْخَنْدَقِ فَقَالَ أَنَا نَازِلٌ، ثُـمَّ قَامَ وَبَطْنُهُ مَعْصُوبٌ بِحَجَرٍ وَلَبِثْنَا ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ لاَ نَذُوقُ ذَوَاقًا، فَتَنَاوَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) الْمِعْوَلَ فَضَرَبَ، فَعَادَ كَثِيبًا أَهْيَلَ أَوْ أَهْيَمَ. رَوَاهُ البخاري[٤]:

جـابیر (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: ڕۆژی غـەزای خەنـەك كـە خەندەكەكەمان هەڵ دەكەن، تەمتـەمێ هاتـە ڕێـی، چوونە لای حـەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) گوتیان: قوربان خەندەكەكە تەمتـەمێکی هاتۆتـە بـەر، فەرمووی: واخۆم دەچمە خوارەوە بۆی حەزرەت كە هەڵسا لەبەر برسێتی سکی خۆی بە بـەردێ جەڕانـدبوو! چـونکە سـێ ڕۆژ بـوو ئـەوەی پێـی بگـوترێ نـان و ئـاو چەشكەمان نـەکردبوو، پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەسـتی دایـە پاچـەكەو

[٤] تجريد/ ٤/ ٢٩٠ رقم: ١٥٥٠ = ٤١٠١. {رياض الصالحين/ ٢/ ٨٧ رقم: ٣٠/ ٥٢٠ = بوخاري: ٤١٠١ و مسلم: ٢٠٣٩}.

مـاڵی بـە تاوێرەکـەدا ئـیتر گابەردەکـە وردو خـاش بـوو بـوو بـە خـاك‌و خـۆڵ (بوخاری، رەحمەت لە خۆی‌و کەسوکاری).

**٤٦٠٥- ← (لە سوورەتی ئەحقافدا رابوورد، فەرموودەی سێیەم)[٥].**

**٤٦٠٦- عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: لَقَدْ رَأَيْتُنَا مَعَ النبـيّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) لَيْلَةَ الأَحْزَابِ وَأَخَذَتْنَا رِيحٌ شَدِيدَةٌ وَقُرٌّ، فَقَالَ رَسُولُ اللّـهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّم): أَلاَ رَجُـلٌ يَأْتِينِي بِخَبَرِ الْقَوْمِ جَعَلَهُ اللَّهُ مَعِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَلَمْ يُجِبْهُ مِنَّا أَحَدٌ ثُـمَّ قَالَهَـا ثَلاَثـاً وَنَحْـنُ نُسْكُتُ ثُمَّ قَالَ: قُمْ يَا حُذَيْفَةُ فَأْتِنَا بِخَبَرِ الْقَوْمِ فَلَمَّا دَعَانِي بِاسْمِي لَمْ أَجِدْ بُدًّا إِذْ دَعَانِي بِاسْمِي أَنْ أَقُومَ فَقُمْتَ، قَالَ: اذْهَبْ فَأْتِنِي بِخَبَرِ الْقَوْمِ وَلاَ تَذْعَرْهُمْ عَلَيَّ فَلَمَّا وَلَّيْتُ مِـنْ عِنْدِهِ كَأَنَّمَا أَمْشِي فِي حَمَّامٍ حَتَّى أَتَيْتُهُمْ فَرَأَيْتُ أَبَا سُفْيَانَ يَصْلِي ظَهْرَهُ بِالنَّـارِ فَوَضَـعْتُ سَهْمًا فِي كَبِدِ الْقَوْسِ فَأَرَدْتُ أَنْ أَرْمِيَهُ فَذَكَرْتُ قَوْلَ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) لاَ تَـذْعَرْهُمْ، وَلَوْ رَمَيْتُهُ لأَصَبْتُهُ فَرَجَعْتُ وَأَنَا أَمْشِي فِي مِثْلِ الْحَمَّامِ فَلَمَّا أَتَيْتُـهُ فَأَخْبَرْتُـهُ بِخَبَـرِ الْقَـوْمِ قُرِرْتُ، فَأَلْبَسَنِي النَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) مِنْ فَضْلِ عَبَاءَةٍ كَانَتْ عَلَيْهِ يُصَلِّي فِيهَا فَلَـمْ أَزَلْ نَائِمًا حَتَّى أَصْبَحْتُ فَقَالَ: قُمْ يَا نَوْمَانُ. رَوَاهُ مسلم[٦]:**

**حوزەیفـە (خودای لێ رازی بێ) فـەرمووی: لەشـەوی ئەحزابـدا، لـە خزمـەتی حەزرەتـدا بـووین، کـردی بـەباو تۆفـێ مەپرسـە، پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئای بـۆ پیـاوی هـەواڵی دوژمنم بـۆ بێنـێ، لـە رۆژی قیامەتـدا خـودا لەگـەڵ منـدا لـە بەهەشـتا دایـدەنێ گـوتی: یـاران هـەموو بـی دەنـگ بـوون‌و کەسمان وەڵامیمان نەدایەوە، هەتا سی جار وایفەرموو، بۆیە بەمنی فەرموو: ئەی حوزەیفە! تۆ هەڵسە بڕۆ دەنگ‌و باسی لەشکری ئەو هـۆزی گەلەکۆمەیـەم بۆ بێنە، جا لەبەرئەوەی کە بەناوی خۆم بانگی کردم‌و منی دیاری کرد بۆ ئەم ئەرکـە ئـیتر چـارم نـەما‌و هەسـتام بـڕۆم، فـەرمووی: دەی بـڕۆ هـەواڵێکی ئـەو هـۆزی ناحـەزەم بـۆ بێنـەرەوە بـەڵام مـەیان ئاڵۆزێنـە لـێم کـە لـەلای ئـەو پـشتم**

---

[٥] تقدم في مجلد السابع في تفسير سورة الأحقاف.

[٦] مسلم. مغازي: ٤٦١٦.

هەڵکرد، ئیتر هیچ هەستم بەسەرما نەکرد، دەتگوت بەناو گەرماودا ری دەکەم، تا چوومە ئەوێ، روانیم وا ئەبو سوفیان پشتی خۆی بەئاگر سوور دەکاتەوە، جا تیرێکم خستە ناو عەماری کەوانەکەوەو ویستم تێی بگرم، بەڵام یادی فەرموودەکەی پێغەمبەرم کەوتەوە کە فەرمووی: مەیان ئاڵۆزێنە لێم ئیتر تێیم نەرگت، ئەگەر تێم بگرتایە دەیم پێکا، ئەوجا گەڕامەوە، لە گەڕانەوەشدا هەر دەتگوت بەناو گەرماودا دەڕۆم تا چوومەوە خزمەتی پێغەمبەرو هەواڵی ئەو هۆزە ناحەزەم بۆ بردەوە، کەچی دیسان سەرمام بۆوە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) عابایەکی لەبەردا بوو، نوێژی پێوە دەکرد، بەو عابایە داپۆشیم، ئیتر تا بەیانی خەوتم، حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: هەستە ئەی خەواڵوو! (م).

### ٨٩) غەزای بەنی نەضیرو بەنی قورەیزە : (غزوة بني النضير وقريضة)

٤٦٠٧- ← (ب- ٥ز- ٤٥ل- ١٧٥ف- ٤)[1]:

لێرەدا ئاوایە: عائیشە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: لە غەزای خەندەکا، سەعدی کوڕی موعاذ زامار بوو، ئیبنولعەرەقە ناوێ، لە قورەیش، تیرێکی دابوو لە شادەماری باڵی، کە بە عەرەبی پێی دەڵێن (أكحل: عرق الحياة) بە کوردیش پێی دەڵێن: رەگی حەیات، یا رەگی ژیان، حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) لەناو نوێژگاکەدا چاتۆڵێکی بۆ هەڵدابوو، لە پەناوە زوو زوو سەری لێ دەدا کاتێ حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) لە خەندەق گەڕایەوە بۆ ناو شاری مەدینە، چەکی دانا و خۆی شۆرد، کەچی جوبرائیل (درودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی هاتە خزمەتی تەپو تۆزی لەسەرو چاوی خۆی دەتەکان، فەرمووی: دیارە تۆ چەکت داناوە، دەی بەخودا ئێمە کە کۆمەڵەی فریشتەین هێشتا چەکمان دانەناوە، زووبە بڕۆ بۆ سەریان حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ)

---

[1] تقدم في مجلد خامس. تسلسل/ ٤٥ رقم: ٤/ ٣٤٦٩.

دەفەرموێ: بچم بۆسەر كێ؟ ئەویش بەنی قورەیضەی پێ نیشان دەداو دەفەرموێ بچۆ بۆسەر ئەم بی پەیمانانە، جا حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) بە خۆی و لەشكرەكەیەوە دەچێ دەوریان دەگرێ.. تاد.

٤٦٠٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ يَوْمَ الأَحْزَابِ: لاَ يُصَلِّيَنَّ أَحَدٌ الْعَصْرَ إِلاَّ فِي بَنِي قُرَيْظَةَ فَأَدْرَكَ بَعْضُهُمُ الْعَصْرَ فِي الطَّرِيقِ فَقَالَ بَعْضُهُمْ: لاَ نُصَلِّي حَتَّى نَأْتِيَهَا، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: بَلْ نُصَلِّي لَمْ يُرَدْ مِنَّا ذَلِكَ، فَذُكِرَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَلَمْ يُعَنِّفْ وَاحِدًا مِنْهُمْ. رَوَاهُما الشيخان[٢]:

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) دەفەرموێ: لە رۆژی غەزای خەندەكا، كاتێ ناموسوڵمانەكان بە نائومێدی گەڕانەوەو حەزرەت و یارانی گەڕانەوە بۆ ماڵەوە، فەرمووی: خۆ دیتان ئەم جوولەكە نامەردانەی هۆزی نەوەی قوڕەیزە چی نامەردییەكیان لەگەڵ كردین و چۆن لەم كاتە ناسكەدا دەستیان خستە ناو دەستی دوژمنی سەرو ماڵ و دینی ئێمەوەو پەیمانی نێوانی ئێمەو خۆیان شكاند، كەواتە كەس نوێژی عەصر نەكا هەتا نەچینە خاكی بەنی قوڕەیزەو نەدەین بەسەریاندا. دەستەیێ لە یاران، لەرێ نوێژیان لێ دەبێ، دەبن بە دوو دەستەوە، لایەكیان دەڵێن: ئێمە نوێژ ناكەین تا نەچینە ئەوێ، لاكەی تر دەڵێن: ئێمە نوێژی خۆمان دەكەین، چونكە مەبەستی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەو قسەیە ئەمە نەبوو كە نوێژ نەكەین تا نەچینە ئەوێ بەڵكوو مەبەستی ئەوەبوو كە دەست و برد كەین و زوو بڕۆین بۆ سەریان جا كاتێ كە ئەمەیان بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) گێڕایەوە سەرزەنشتی كەسیانی نەكرد (ش).

٤٦٠٩- وَعَنْهُ قَالَ: حَارَبَتِ النَّضِيرُ وَقُرَيْظَةُ فَأَجْلَى بَنِي النَّضِيرِ وَأَقَرَّ قُرَيْظَةَ وَمَنَّ عَلَيْهِمْ حَتَّى حَارَبَتْ قُرَيْظَةُ، فَقَتَلَ رِجَالَهُمْ وَقَسَمَ نِسَاءَهُمْ وَأَوْلاَدَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ بَيْنَ الْمُسْلِمِينَ إِلاَّ بَعْضَهُمْ لَحِقُوا بِالنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَآمَنَهُمْ وَأَسْلَمُوا وَأَجْلَى يَهُودَ الْمَدِينَةِ

---

[٢] تجريد البخاري/ ١/ ٤٧٤ رقم: ٤٩٧ = ٩٤٦ ، ٤١١٩ فتح الباري. مسلم. مغازي: ٤٥٧٧.

كُلَّهُمْ بَنِي قَيْنُقَاعَ وَيَهُودَ بَنِي حَارِثَةَ وَكُلَّ يَهُودِ الْمَدِينَةِ. (رَوَاهُ البخاري ومسلم- المترجم)[٣]:

**دیسان لەوەوە فەرمووی: هۆزی نەوەی نەضیرو هۆزی نەوەی قورەیظە لە دژی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) شەڕیان دەکرد، لە ئەنجاما پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) مەدینەی بەنەوەی نەضیر چۆڵ کردو نەوەی قورەیظەی لەشوێنی خۆیان لەوێ هێشتەوەو هیچی لێ نەسەندن و کردی بە پیاوەتی بەسەریانەوە، بەڵام دووبارە بەنی قوڕەیزە دەستیان کردەوە بە شەڕو پەیمانەکەیانیان شکان، بۆیە پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) لەسەر ئەوە پیاوە جەنگاوەرەکانی کوشتن و ژن و منداڵ و ماڵیشیانی بەسەر موسوڵماناندا دابەش کرد، وەلێ هۆزەکەی عەبدوڵڵای کوڕی سەلام هاتنە لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئەویش ئامانیدان و ئەوانیش موسوڵمان بوون، دواتر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) مەدینەی چۆڵ کرد، بەهەموو جوولەکەیێ، وەك بەنی قەینوقاع و بەنی حاریثەو جوولەکەکانی تری مەدینە (ب+ م).**

**٤٦١٠- ← (ب- ٥ز- ٤٥ل- ١٧٥ف- ٤)[٤]:**

**لێرەدا دەڵێ: گفتەی (ت) ئاوایە: لە رۆژی غەزای خەندەکا تیرێ دای لە باڵی سەعدی کوڕی موعاذ، رەگی حەیاتی بڕی، یا گوتی: شا دەماری باڵی پچڕی، ئەو رەگەش کە خوێنی بەربوو ناوەستێتەوە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) زامی رەگەکەی بە ئاگر داخ کرد، کەچی دەستی پەنەما، ئیتر وازی لێ هێنا، دووبارە خوێنی باڵی بەربۆوەوەو دیسان دەمی زامەکەی بە ئاگر داخ کردەوەو دیسانەوە دەستی ئاوسایەوە جا سەعدیش کەدی وایە فەرمووی: خودایە! گیانم نەکێشی هەتا داخی دڵی خۆم بە بەنی قوڕەیزە دەڕێژم، ئیتر**

---

[٣] تجريد البخاري/ ٤/ ٢٧٢ رقم: ١٥٣٧ = ٤٠٢٨ فتح الباري ، شرح صحيح البخاري. مسلم. مغازي: ٤٥٦٧.

[٤] تقدم في مجلد خامس. تسلسل/ ٤٥. رقم: ٣٤٦٩/٤.

ڕەگەکەی باڵی خوێنی گیرسایەوەو یەك دڵۆپ خوێنی تری لێ نەهات هەتا هۆزی بەنی قورەیزە خۆیان دا بەدەستەوە، لەسەر ئەوە سەعد حەکەم‌و فەرانڕەوابێ‌و هەر بڕیارێ بدا لە بارەی ئەوانەوە هەردوولا پێی رازی بن (بۆیەش بە بڕیاری سەعد رازی بوون، چونکە لەسەردەمی پێش ئیسلامدا ئەوان هاوسوێندی هۆزی ئەوس بوون، کە سەعد ئاغای ئەوان بوو) جا سەعد بڕیاری دا: کە پیاوەکانیان بکوژرێن‌و ماڵ‌و ژن‌و منداڵیان بمێنن‌و دابەش بکرێن بەسەر موسوڵمانەکاندا. پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەم بڕیارە تۆ رێکی فەرمان (حوکم)ی خودای گەورەبوو لەبارەی ئەم نامەردوو پەیمان شکێنانەوە پیاوە شەڕکەرەکانیان چوارسەد کەس بوون، کاتێ لە کوشتنیان بوونەوە" دەمارەکەی باڵی سەعد دیسان پچڕایەوە، ئیتر مردو بە رەحمەتی خودا چوو!

### ٩٠) غەزای خەیبەر: (غزوة خيبر)

٤٦١١- ← (ب- ٥ز- ٩ل- ٥٩ف- ١+ ف- ٢+ ف-٣)[1]:

لێرەدا ئەم گێڕانەوەیەی پترە: کاتێ گەیشتنە خەیبەر مەرحەبی پادشایان هاتە مەیدان‌و بازی بە شمشێرەکەی دەکردو بەخۆی دەنازی‌و بە کەش‌و فشێکەوە دەیگوت:

قد علمت خيبر أني مرحب شاكي السلاح بطل مجرب

اذا الحروب أقبلت تلهب

واتە:

خەیبەر! باشی بزانە

مەرحەب شێری مەیدانە

---

[1] تقدم في مجلد الخامس. تسلسل/ ٩ رقم: ١/ ٣٢٨٨ + ٣٢٨٩/٢ + ٣٢٩٠/٣.

پــــڕ چـــەکو پاڵەوانـــە

بـــۆ شـــەڕ بـــەوری بەیانـــە !

عەلیش بۆی چووە مەیدان‌و بەم شیعرانە وەڵامی دایەوە:

أنا الذی سمتنی أمی حیدر کلیث غابات کریه المنظره

أو فیهمو بالصاع کیل السندره

واتە:

دایکم نـاوی نـاوم شـێرکۆ شێری بێشەم بـە سـام‌و ســـۆ

بــێ ڕەزایــە دیمـــەنی شــێر کـە دەپێوێ کوشتن بۆ مێر!

گوتی: جا عەلی شێرێکی ماڵی بە کەللەی مەرحەبداو کوشتی!

ئیتر لەسەر دەستی عەلیدا فەتحی خەیبەر کراو سوپای ئیسلام قەڵای خەیبەریان گرت (م). شیعرەکەی مەرحەب بە پەخشان واتە: هـەموو خەیبـەر زۆر بـاش دەزانـن کـە مـن شـامەرحەبم‌و بـەناو بـانگم‌و پیـاوێکی پـڕ چـەك‌و پاڵـەوانێکی لێهـاتووم، بەتایبـەت کاتـێ کـە شـەڕ گـەرم دەبـێ، شـیعرەکەی ئیمامی عەلی (ڕەزای خودای لێ بێ) واتە: من هەر لەکاتی لەدایك بوونمدا، دایکم بە فیراسـەت‌و بـۆ نوقلانـەی بـاش نـاوی نـاوم حەیـدەر، یـا نـاوی نـاوم ئەسـەد، حەیدەرو ئەسەد بەواتای شێرن، وەك شێری بێشەلانم، لە شێری شەرزەیش بە سام‌و بێ ڕەزاترم، لە جەنگەی جەنگا بە بارو بەتا، بەربەو بە تـەغار مـەرگ دەپێوم بۆ دوژمن‌و قڕیان تێ دەخەم (وەرگێڕ) مێر: پیاوی ئازا (ف. خاڵ).

٤٦١٢- تەماشـای (تجـوز الأغـارة علـی الکفـار بعـد دعـوتهم) بکـە، فەرموودەی دووەم. کە خەیبەر دەگرن[٢].

---

[٢] تقدم في مبحث (تجوز الإغـارة علی الکفار بعد دعـوتهم ، الحديث الثـاني) مـن هـذا المجلد. تسلسل/ ٤٦.

٤٦١٣- تەماشای هەمان شوێنی پێشوو لە (تجوز الاغارة) بکە لێرەدا دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لە نزیکی خەیبەردا بە تاریکولێڵە کە نوێژی بەیانی کرد، ئەوجا فەرمووی: اللّٰهُ أَكْبَرُ خَرِبَتْ خَيْبَرُ، إِنَّا إِذَا نَزَلْنَا بِسَاحَةِ قَوْمٍ فَسَاءَ صَبَاحُ الْمُنْذَرِينَ جا جوولەکەکانی خەیبەر وەدەرکەوتن، بەناو کۆڵان و کووچەکاندا غاریان دەدا، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) جەنگاوەرەکانی کوشتن و خاوو خێزانی یەخسیر کردن و دابەشی کردن بەسەر موسوڵمانەکاندا، صەفییەی هاوسەری پێغەمبەریش (درودی خودا لە پێغەمبەرو رەزای خودا لەو بێ) یەکێك بوو لەو یەخسیرانە، کاتێ ژنە تاڵانییەکان دابەش دەکرێن صەفییە بەر دەحیەی کەلبی دەکەوێ، بەڵام لەپاشا دەبێ بەهی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئازادی کردو مارەی کرد بۆ خۆی و لەباتی مارەییەکەی ئازادی کرد (ب) ← (ب- ٣ز- ٣٤ل- ٨٢ف- ٢. راجع مجلد/ ٣ رقم / ٢ / ٢٠٦٥ تسلسل / ٣٤).[٣].

٤٦١٤- قَالَ يَزِيدُ بْنُ أَبِي عُبَيْدٍ (رضي الله عنهما): رَأَيْتُ أَثَرَ ضَرْبَةٍ فِي سَاقِ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ فَقُلْتُ: يَا أَبَا مُسْلِمٍ مَا هَذِهِ الضَّرْبَةُ؟ فَقَالَ: هَذِهِ ضَرْبَةٌ أَصَابَتْنِي يَوْمَ خَيْبَرَ، فَقَالَ النَّاسُ أُصِيبَ سَلَمَةُ، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَنَفَثَ فِيهِ ثَلاَثَ نَفَثَاتٍ فَمَا اشْتَكَيْتُهَا حَتَّى السَّاعَةِ. رَوَاهُما البخاري:

یەزیدی کوڕی عوبەید (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: شوێن زامێکم بەلاقی سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە دی گوتم: ئەی ئەبو موسلیم! ئەم کۆنە زامە هی کەیە؟ فەرمووی: هینی رۆژی خەیبەرە، جێ دەمی شیری ئەوکاتەیە، خەڵك گوتیان: سەلەمە پێکرا، چوومە خزمەت حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) سێ پفی بەتەڕایی دەمی لێ کرد، ئیتر یەکسەر چاك بۆوە هەتا ئێستا ئێشم لێ نەبینیوە! (ب).

[٣] راجع تسلسل/ ٤٦ من هذا المجلد. الحديث الثاني أيضاً.

## ٩١) غەزای ذاتوورریقاع: (غزوة ذات الرقاع)

٤٦١٥- عَنْ أَبِي مُوسَى (رضى الله عنه) قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فِي غَزَاةٍ وَنَحْنُ سِتَّةُ نَفَرٍ بَيْنَنَا بَعِيرٌ نَعْتَقِبُهُ قَالَ: فَنَقِبَتْ أَقْدَامُنَا، فَنَقِبَتْ قَدَمَايَ: وَسَقَطَتْ أَظْفَارِي فَكُنَّا نَلُفُّ عَلَى أَقْدَامِنَا الْخِرَقَ فَسُمِّيَتْ غَزْوَةَ ذَاتِ الرِّقَاعِ لِمَا كُنَّا نَعْصِبُ عَلَى أَرْجُلِنَا مِنْ الْخِرَقِ. رَوَاهُ الشَّيْخَانِ[1]:

**ئەبو مووسا** (خودای لێ رازی بێ) **فەرمووی: لە خزمەتی حەزرەتدا** (درودی خودای لەسەر بێ) **چووین بۆ غەزایێ، تاقمەکەی من شەش کەس بووین، تاقە وشترێکمان بەرکەوتبوو، هەر شەشمان بەسەرە بەرو دوا سواری دەبووین، گوتی: ئەوەندە بەپێ رێگەمان بڕی بە پێی پەتی پێمان کوتراو توێخی بەردا، منیش قاچەکانم توێکیان بەرداو نینۆکەکانم کەوتن، لە تاواندا لەبەر بێ پێڵاوی و لەبەر گەرما پەڕۆمان بە قاچمانەوە دەپێچا، بۆیە ئەو غەزایە ناونرا غەزای ذاتوورریقاع (واتە: غەزا پەڕۆینە) چونکە لەبەر پێخاوسی پەڕۆو پاڵمان دەئالان لە قاچمانەوە (ش).**

٤٦١٦- ← (ب- ١ز- ١٥٣ل- ٤٤٣ف- ٢)[2].

## ٩٢) غەزای بنی موصطەلیق: (غزوة بنى المصطلق)

٤٦١٧- ← (ب- ٣ز- ٤٣ل- ١٠٠ف- ٨)[1].

٤٦١٨- ← لەسەر باسی (تجوز الاغارة على الكفار)دا رابوورد، فەرموودەی یەکەم، کە دەفەرموێ: (كتبت إلى نافع...) الحديث[2].

---

[1] تجريد البخاري/ ٤/ ٢٩٤ رقم: ١٥٥٥ = ٤١٢٨ فتح. مسلم. مغازي: ٤٦٧٦.

[2] تقدم في مجلد أوّل. تسلسل/ ١٥٣ رقم: ٢/ ٨٨٥.

[1] تقدم في مجلد ثالث. تسلسل/ ٤٣ رقم: ٨/ ٢١٣٧.

[2] تقدم في: (تجوز الإغارة. تسلسل/ ٤٦ حديث الأول. رقم: ٤٤٦٢ من هذا المجلد).

## ٩٣) غەزای ئەنمار: (غزوة أنمار)

٤٦١٩-→ (ب- ١ز- ٥٤ل- ٢١٤ف- ١+٢+٣)[1]:

لێرەدا دەفەرموێ: جابیر (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: لە غەزای ئەنماردا پێغەمبەرم دی، بەسواری وڵاخەکەی دەرۆیشت و بەرەو خۆر هەڵات نوێژی سوننەتی دەکرد (ب).

## ٩٤) غەزای حودەیبییە: (غزوة الحديبية)

ئایەتی سەرەتای ئەم باسە لەم جێگەیەدا رابوورد، سوورەتی فەتح، حەدیثی چوارەم، ئایەتی: {لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ...} تا کۆتایی ئایەت.

٤٦٢٠- → (ب- ٤ز- ١٠٥ل- ٣٣٦ف- ١)[1]:

لێرەدا ئەمەی پێرە: (تعدون أنتم الفتح فتح مكة وقد كان فتح مكة فتحا، ونحن نعد الفتح بيعة الرضوان يوم الحديبية): ئێوە هەر فەتحی مەککە دادەنێن بە فەتح، بەڵێ بەپێی ئایەتی: {إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُبِينًا} ئەمە وایەو بەڕاستی فەتحی مەککە دادەنری بە فەتح، بەلام ئێمە بەیعەتولڕیضوان (پەیمانی خۆشنوودی)ش دادەنێن بە فەتحێکی گەورە، چونکە ئەو بووبە ڕێخۆشکەرەی گرتنی مەککەو هۆی خۆشنوودیی خودا.

٤٦٢١- عَنْ جَابِرَ (رَضِيِ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ لَنَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَوْمَ الْحُدَيْبِيَةِ: أَنْتُمْ خَيْرُ أَهْلِ الأَرْضِ وَكُنَّا أَلْفًا وَأَرْبَعَمِائَةِ، وَلَوْ كُنْتُ أُبْصِرُ الْيَوْمَ لأَرَيْتُكُمْ مَكَانَ الشَّجَرَةِ. رَوَاهُما الشَّيخان[2]:

جابیر (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: رۆژی حودەیبییە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرمووین: ئێستا ئێوە چاترینی هەموو خەڵکی سەر رووی

---

[1] تقدم في مجلد اول. تسلسل/ ٥٤ رقم: ١/ ٣٩٣ و ٢/ ٣٩٤ و ٣/ ٣٩٥.

[1] تقدم في مجلد رابع. تسلسل/ ١٠٥ رقم: ١/ ل: ٣١٧٤.

[2] تقدم في مبحث الصلح ، كما تقدم في تفسير سورة الفتح المجلد السابع.

سەرزەمینن فەرمووی: ئەو حەلە لەو غەزایەدا هەزارو چوار سەد کەس بووین، ئەگەر ئەمێستا چاوم ببینایە جێگەی درەختی پەیمانی خۆشنوودیم پێ نیشان دەدان، کە بەیعەتولریضوانی لەژێردا کرا (ش).

٤٦٢٢- بۆ باسی ئەم غەزایە تەماشای ئەم جێگایانەیش بکە: (الصلح والهدنة) فەرموودەی یەکەم و دووەم. سوورەتی فەتح، فەرموودەی دووەم و چوارەم. ← (ب – ٢ ز – ١٠٩ ل – ٢١٤ ف ١ / ١٦٠٣) + (ز – ١١٨ ل – ٢٤٢ ف – ١/ ١٦٣٨) + (ز – ١١٩ ل – ٢٤٣ ف – ١/ ١٦٣٩ + ف ٥ / ١٦٣٤) + (ز– ١٢٣ ل– ٢٥١ ف – ١/ ١٦٥٤) + (ز – ١٢٥ ل – ٢٥٣ ف – ١/١٦٥٦) + (ز – ١٢٧ ل – ٢٥٧ ف – ٣ / ١٦٥٩)[٢].

## ٩٥) غەزای فەتحی مەککە: (غزوة الفتح)

بۆ ئایەتەکە تەماشای فەرموودەی یەکەم و دووەمی سوورەتی نەصر بکە.

٤٦٢٣- ← (ب– ٢ز– ٤٦ل– ١٠٧ف– ١)[١]:

لە گێڕانەوەی ئێرەدا ئەم دوو زیادە مەعلوماتەی تیادایە: لەپاش هەشت ساڵ و نیو لەپاش کۆچکردنی بۆ مەدینە چوون بۆ ئەم فەتحە، ژمارەی سوپاکەی دەهەزار کەس بووە.

٤٦٢٤- عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ (رضي الله تَعَالَى عنهما) قَالَ: لَمَّا سَارَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عَامَ الْفَتْحِ فَبَلَغَ قُرَيْشًا خَرَجَ أَبُو سُفْيَانَ بْنُ حَرْبٍ وَحَكِيمُ بْنُ حِزَامٍ وَبُدَيْلُ بْنُ وَرْقَاءَ يَلْتَمِسُونَ الخَبَرَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَأَقْبَلُوا يَسِيرُونَ حَتَّى أَتَوْا مَرَّ الظَّهْرَانِ فَإِذَا هُمْ بِنِيرَانٍ كَأَنَّهَا نِيرَانُ عَرَفَةَ، فَقَالَ أَبُو سُفْيَانَ: مَا هَذِهِ لَكَأَنَّهَا نِيرَانُ عَرَفَةَ، فَقَالَ بُدَيْلُ بْنُ وَرْقَاءَ: نِيرَانُ بَنِي عَمْرٍو فَقَالَ أَبُو سُفْيَانَ: عَمْرٌو أَقَلُّ مِنْ ذَلِكَ فَرَآهُمْ نَاسٌ مِنْ حَرَسِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَأَدْرَكُوهُمْ فَأَخَذُوهُمْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ

---

[٢] تقدم جملة من الأحاديث حول هذه الغزوة ، في مبحث (الصلح والهدنة) وفي تفسير (سورة الفتح).

[١] تقدم في مجلد ثاني. تسلسل/ ٤٦ رقم: ١/ ١٣٧٤.

(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَأَسْلَمَ أَبُو سُفْيَانَ فَلَمَّا سَارَ قَالَ لِلْعَبَّاسِ: احْبِسْ أَبَا سُفْيَانَ عِنْدَ حَطْمِ الْخَيْلِ حَتَّى يَنْظُرَ إِلَى الْمُسْلِمِينَ فَحَبَسَهُ الْعَبَّاسُ فَجَعَلَتِ الْقَبَائِلُ تَمُرُّ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) كَتِيبَةً كَتِيبَةً عَلَى أَبِي سُفْيَانَ فَمَرَّتْ كَتِيبَةٌ فَقَالَ: يَا عَبَّاسُ مَنْ هَذِهِ؟ قَالَ: هَذِهِ غِفَارُ، قَالَ: مَا لِي وَلِغَفَارَ. ثُمَّ مَرَّتْ جُهَيْنَةُ فَقَالَ مِثْلَ ذَلِكَ ثُمَّ مَرَّتْ سَعْدُ بْنُ هُذَيْمٍ فَقَالَ مِثْلَ ذَلِكَ وَمَرَّتْ سُلَيْمٌ فَقَالَ مِثْلَ ذَلِكَ حَتَّى أَقْبَلَتْ كَتِيبَةٌ لَمْ يَرَ مِثْلَهَا قَالَ: مَنْ هَذِهِ؟ قَالَ: هَؤُلَاءِ الأَنْصَارُ عَلَيْهِمْ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ مَعَهُ الرَّايَةُ فَقَالَ سَعْدُ يَا أَبَا سُفْيَانَ الْيَوْمُ يَوْمُ الْمَلْحَمَةِ الْيَوْمُ تُسْتَحَلُّ الْكَعْبَةُ فَقَالَ أَبُو سُفْيَانَ: يَا عَبَّاسُ حَبَّذَا يَوْمُ الذِّمَارِ، ثُمَّ جَاءَتْ كَتِيبَةٌ وَهِيَ أَقَلُّ الْكَتَائِبِ فِيهِمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَأَصْحَابُهُ وَرَايَةُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مَعَ الزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ فَلَمَّا مَرَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بِأَبِي سُفْيَانَ قَالَ: أَلَمْ تَعْلَمْ مَا قَالَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ؟ قَالَ: مَا قَالَ؟ قَالَ: كَذَا وَكَذَا فَقَالَ: كَذَبَ سَعْدٌ وَلَكِنْ هَذَا يَوْمٌ يُعَظِّمُ اللَّهُ فِيهِ الْكَعْبَةَ وَيَوْمٌ تُكْسَى فِيهِ الْكَعْبَةُ قَالَ: وَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَنْ تُرْكَزَ رَايَتُهُ بِالْحَجُونِ. وَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَوْمَئِذٍ خَالِدَ بْنَ الْوَلِيدِ أَنْ يَدْخُلَ مِنْ أَعْلَى مَكَّةَ مِنْ كَدَاءٍ وَدَخَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مِنْ كُدًا، فَقُتِلَ مِنْ خَيْلِ خَالِدٍ يَوْمَئِذٍ رَجُلَانِ: حُبَيْشُ بْنُ الأَشْعَرِ وَكُرْزُ بْنُ جَابِرٍ الْفِهْرِيُّ[٢]:

عوروەی کوڕی زوبەیر (خودایان لێ ڕازی بێ) دەفەرموێ: ساڵی گرتنی مەککە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کەوتە ڕێ بەرەو مەککە، کاتێ بێ بڕواکانی قوڕەیش بەمە دەزانن ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب‌و حەکیمی کوڕی حیزام‌و بودەیلی کوڕی وەرقاء لە مەککە دەردەچن‌و دێن بەرەو ئەوان هەتا سووسەی هەواڵی حەزرەت بکەن، ملی ڕێ دەگرن تا دەگەنە مەڕو ظەهران لەوێ دەڕوانن وا ریزە ئاگرێکی زۆر زۆر، وەك ئاگری شەوی عەرەفە ئاوا زۆر دەگرێ‌و دیارەو دەڵێی چراخانە، ئەبو سوفیان دەڵێ: ئەم هەمکە ئاگرە چییە، دەڵێی چراخانی شەوی عەرەفەیە، بودەیل دەڵێ: ئاگری بەنی عەمرە، ئەبو سوفیان دەڵێ: لەکوێ بەنی عەمر ئەوەندە دەبن، چەند کەسێ لە

[٢] تجريد/ ٤/ ٣٢٥ رقم: ١٥٨٥ = ٤٢٨٠ + رقم: ١٢١٨ = بەرگی/ ٣ل — ٣٤٣.

پاسەوانانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ئەم زەلامانە دەبینن و دەچن بۆیان و دەیانگرن و دەیانبەن بۆلای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەوێ ئەبو سوفیان موسوڵمان دەبێ، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کە دەکەوێتە رێ بە عەبباس دەفەرموێ: لەکوێدا رێگەکە تەنگبەر دەبێتەوە و سوارەکان کەڵەکە دەبەستن ئا لەوێدا ئەبو سوفیان رابگرە هەتا بەچاوی خۆی بەباشی سوپای ئیسلام ببینێ و بزانێ کە لەوزەی ئەودا نییە و ئیتر خەیاڵی بەرابەر وەستانی لەشکری ئیسلام لە کەللەی خۆی دەرکا، عەبباس لەوێدا رایدەگرێ، هۆزەکان پۆل پۆل لە خزمەتی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) ریزبوون و دەستیان کرد بە رۆیشتن و پۆل لەدوا پۆل بەسەر ئەبو سوفیاندا تێ دەپەڕن، دەستە سوارێ لەلایەوە رەت بوون، گوتی: عەبباس! ئەمانە کێن؟ فەرمووی: لەشکری هۆزی غیفارن، گوتی: من لەمانەم چی کەی ئەمانە ناحەزی من بوون (وا ئێستا هاتوون بۆ سەرم)؟ ئەمجا هۆزی جوهەینە رابووردن، هەروا هۆزی سەعدی کوڕی هوزەیم و هۆزی سولەیم، یەکە یەکە ئەبو سوفیان دەیپرسی و عەبباس وەڵامی دەدایەوە و ئەویش وای دەگوتەوە، تا دەستە سوارێ دێن، وێنەی ئەوانی نەدیبوو، گوتی: عەبباس! ئەمانە کێن؟ فەرمووی: لەشکری یاریدەدەرانن، سەعدی کوڕی عوبادە سەرکردەیانە، ئاڵاکە بەو بوو، سەعد گوتی: ئەی ئەبو سوفیان! ئەمڕۆ رۆژی کوشت و کوشتارە، ئەمڕۆ کوشت و کوشتار لەناو بەست و حەرەم و کابەدا حەڵاڵ دەبێ و قڕ دەخرێتە ناو ناموسوڵمانەکانی مەککە، بە تایبەتی گەورە پیاوەکانیان، وەك ئەبو سوفیان، ئەبو سوفیان گوتی: ئەی عەبباس! خۆزگەم بە مردن ئای بۆ کەڵەمێردێکی مەرد پەنای بداینایە! لەپاشا دەستە سوارێکی تر هاتن (بە ژمارە لەهەموو دەستە سوارەکانی تر کەمتر بوون) ئەوانە پۆلی پێغەمبەر و یارانی بوون، ئاڵاکەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بە زوبەیری کوڕی عەووام دەبێ، کاتێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەلای ئەبو سوفیانەوە رادەبووری عەرزی دەکا: قوربان! دەزانیت کە سەعدی کوڕی عوبادە چی دەڵێ؟ فەرمووی: دەڵێ چی؟ گوتی واوا دەڵێ ئەمڕۆ کوشت و کوشتار لەناو کەعبەدا رەوا دەبینرێ!

فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): سەعد درۆ دەکات، لەخۆیەوە قسەی وا دەکات، بەڵکوو بە پێچەوانەوە ئەمڕۆ ئەو ڕۆژەیە کە کەعبە پۆشتەو پەرداخ دەکرێتەوە! گوتی: حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) فەمانیدا کە ئاڵاکەی خۆی لە حەجوون هەڵبکرێ، ئەو ڕۆژەیش فەرمانی کرد بە خالیدی کوڕی وەلید کە لەلای سەرووی مەککەوە لە کەدائەوە بچێتە ناو شاری مەککەوە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) خۆی لەکوداوە، لە دامێنی شارەوە ڕۆیشتە ناو شارەوە. ئەو ڕۆژە لە سوارەی خالید دوو کەس کوژران: حوبەیشی کوڕی ئەشعەرو، کورزی کوڕی جابیری فیهری. (ب–خ).

٤٦٢٥- ← (ب- ٣ز- ٢ل- ٤ف- ١)[٣]:

لێرەدا ئاوایە: ئوسامەی کوڕی زەید (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەکاتی گرتنی مەککەدا گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! سبەینێ لەکوێ دادەبەزی (ئایا بارگەکەت لە خانووەکەی مەککەتا) دەخەیت و ئەوێ دەکەی بە بارەگای خۆت؟ فەرمووی: جا بۆچی عەقیل هیچ خانوو بەرەی بۆ ئێمە هێشتۆتەوە؟ ئەوجا فەرمووی: نە موسوڵمان کەلەپوور لە ناموسوڵمان وەردەگرێ، وە نە ناموسوڵمان کەلەپوور لە موسوڵمان وەردەگرێ، هیچیان کەلەپوور لەهیچ کامیان وەرناگرن بە زوهرییان گوت: ئەی کێ کەلەپوورو میراتەکەی ئەبو طالیبی برد بۆ خۆی؟ فەرمووی: عەقیل و طالیب بردیان و بوو بەمیراتی ئەوان (ب).

٤٦٢٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَوْمَ الْفَتْحِ فَجَعَلَ خَالِدَ بْنَ الْوَلِيدِ عَلَى الْمُجَنِّبَةِ الْيُمْنَى وَجَعَلَ الزُّبَيْرَ عَلَى الْمُجَنِّبَةِ الْيُسْرَى وَجَعَلَ أَبَا عُبَيْدَةَ عَلَى الْبَيَاذِقَةِ وَبَطْنِ الْوَادِي فَقَالَ: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ ادْعُ لِي الأَنْصَارَ فَدَعَوْتُهُمْ فَجَاءُوا يُهَرْوِلُونَ فَقَالَ: يَا مَعْشَرَ الأَنْصَارِ هَلْ تَرَوْنَ أَوْبَاشَ قُرَيْشٍ؟ قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: انْظُرُوا إِذَا لَقِيتُمُوهُمْ غَدًا أَنْ تَحْصِدُوهُمْ حَصْدًا وَأَخْفَى بِيَدِهِ وَوَضَعَ يَمِينَهُ عَلَى

---

[٣] تقدم في مجلد ثالث. تسلسل/ ٢ رقم: ١/ ١٩٦٠.

شِمَالِهِ وَقَالَ: مَوْعِدُكُمُ الصَّفَا قَالَ: فَمَا أَشْرَفَ لَهُمْ أَحَدٌ يَوْمَئِذٍ إِلاَّ أَنَامُوهُ، وَصَعِدَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) الصَّفَا فَجَاءَتِ الأَنْصَارُ فَأَطَافُوا بِالصَّفَا، فَجَاءَ أَبُو سُفْيَانَ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أُبِيدَتْ خَضْرَاءُ قُرَيْشٍ لاَ قُرَيْشَ بَعْدَ الْيَوْمِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): مَنْ دَخَلَ دَارَ أَبِي سُفْيَانَ فَهُوَ آمِنٌ، وَمَنْ أَلْقَى السِّلاَحَ فَهُوَ آمِنٌ، وَمَنْ أَغْلَقَ بَابَهُ فَهُوَ آمِنٌ، فَقَالَتِ الأَنْصَارُ: أَمَّا الرَّجُلُ فَقَدْ أَخَذَتْهُ رَأْفَةٌ بِعَشِيرَتِهِ وَرَغْبَةٌ فِي قَرْيَتِهِ وَنَزَلَ الْوَحْيُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: قُلْتُمْ أَمَّا الرَّجُلُ فَقَدْ أَخَذَتْهُ رَأْفَةٌ بِعَشِيرَتِهِ وَرَغْبَةٌ فِي قَرْيَتِهِ أَلاَ فَمَا اسْمِي إِذًا أَنَا مُحَمَّدٌ عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ، هَاجَرْتُ إِلَى اللَّهِ وَإِلَيْكُمْ فَالْمَحْيَا مَحْيَاكُمْ وَالْمَمَاتُ مَمَاتُكُمْ، قَالُوا: وَاللَّهِ مَا قُلْنَا ذَالِكَ إِلاَّ ضِنًّا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ قَالَ: فَإِنَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ يُصَدِّقَانِكُمْ وَيَعْذِرَانِكُمْ»[٤].

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای گەورەی لێ بێ) فەرمووی: لە رۆژی گرتنی شاری مەککەدا، لە خزمەتی پێغەمبەردا بووین (درودی خودای لەسەر بێ) بۆ ئەم فەتحە خالیدی کوڕی وەلیدی کرد بەسەرکردەی لای راستی لەشکرەکەو زوبەیریشی کرد بەسەرکردەی دەستە چەپی و ئەبو عوبەیدەیشی کرد بەسەرکردەی پیادەو بێ زریەکان کە لەناو شیوەکەدا بوون و لە کەوانەی دۆڵی مەککەوە بوون، خۆیشی لەناو دەستەیەکا بوو فەرمووی: ئەبو هورەیرە! یاریدەدەرەکانم بۆ بانگ بکە منیش چووم بانگم کردن، بەهەڕاکردن هاتن، فەرمووی: ئەی کۆمەڵەی یاریدەدەران! ئەی گەلی براینە! خۆ ئەم هەرچی و پەرچی و لەشکرە تێکەڵ و پێکەڵ و بێ سەرو پایەی قوڕەیش دەبینن کە بەخەیاڵی خاوی خۆیان بۆ بەرامبەریکردنی ئێمە کۆیان کردوونەتەوە؟ گوتیان: بەڵێ، چۆن دەفەرمووی وایە، فەرمووی: بتان بینم، سبەینێ کە تووشیان دەبن، چۆن وەك بەری درەو پاکۆیان دەدەن! دەستی راستیشی لەسەر دەستی چەپی خۆی داناو بەهێما تێی گەیاندن کە ئاوا متیان بکەن و قەلاچۆیان تێ بخەن. فەرمووشی: وادەمان سەرکێوی صەفا بێ و لەشکرەکان لەوێ یەك دەگرینەوە. گوتی: ئیتر ئەو رۆژە ئەوەی لەوان

---

[٤] مسلم. مغازي: ٤٦٠٠ ، ٤٥٩٨.

سـەری بـەرزکردەوەو لاملـی کـردو بەرهـەوێڵمان کـەوت لـە ملیـان داو لاڵ‌و پاڵمان خست، لەدوا سەرکەوتن لە ڕۆژی دواییدا حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) لەسەر بەڵێنەکەی خۆی سەرکەوتە سەر گردی صەفاو یاریدەدەرانیش وەك خەرمانەی مانگ بەگردی صەفادا ئاخڵەیان لێدا[1]. جا ئەبو سوفیان هاتە خزمـەتی عـەرزی کـرد: قوربـان! ئـەی پێغەمبـەری خـودا! زەردو سـووری قـوڕەیش بـەرباد کـراو یـافتی قوڕەیـشیان بـڕی، خـۆ ئەگـەر وابڕوا قـوڕەیش نامێنی تا سبەینێ! حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: جاڕبدەن: ئـەوەی بچێتە ماڵی ئەبو سوفیان لەخۆی ئەمین بێ‌و ترسی نەبێ، ئەوەی چەك فڕێ بداو شەڕ نەکا لەخۆی ئەمین بێ ترسی نەبێ. یاریدەدەران لەناو خۆیاندا دەڵێن: وا دیارە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دڵی دەسووتێ بە هۆزو خزمانی خۆی‌و مـەیلی تازەبۆتـەوە بـۆ شـارو نیـشتمانەکەی خـۆی ئـیتر ڕەنـگ بـێ بگەڕێتەوە بۆ ئێرەو ناو ئێمە بەجێ بهێڵی جا سرووش هات بۆ پێغەمبەرو خـودا خەبـەری داپێـی کـە یاریـدەدەران واوا دەڵـێن، فـەرمووی: ئێـوە دەڵـێن: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دڵـی دەسـووتێ بەهۆزو خزمـانی خۆی‌و مەیلی تازە بۆتەوە بۆ شارەکەی خۆی ئیتر ڕەنگ بێ بگەڕێتەوە بۆ مەککەو مەدینە بەجێ بهێڵێ، ڕاستە کەمن دڵم دەسووتێ بە خزمانی خۆم‌و هەمیشە دڵم لێ دەدا بۆ مەککەی پیرۆز، کە زێدمەو جێگەی خرۆشانی میهرەبانی خودایەو کابەی نازداری لەناودایە، ئەمە ڕاستەو وایەو زیادی هەیەو کەمی نییە، بەڵام ئەوەی کە گوتووتانە دەگەڕێمەوە بۆ ئێرەو ئێوە بەجێ دەهێڵم شتی وا نییەو

---

(١)

خۆرە یا مانگە خەرمانەی داوە

یا صەفا بەبای صەفا نەخشاوە

ڕەحمەت بارانە لەهەر شەش لاوە

فریشتەو پەری دەوری لێ داوە!

(وەرگێڕ)

ئەمەیان لەمنەوە دوورە بۆچی من ناوم چییەو من کێم پێ دەڵێن، من ناوی خۆم بەخۆمەوەیە سێ جار وایفەرموو، ئەوجا فەرمووی: من ناوم موحەممەدە (بەپێی ناوەکەم دەبێ کارێ نەکەم کەببێ بەهۆی ئەوە شایستەی ئەو ناوە نەبم، کە بە مەعنا پەسەندو ستایش کراوە)، کەواتە: ئەگەر دڵم بە کەسوکاری خۆم بسووتێ جێی خۆیەتی، وەلێ ئەگەر ئێوە بەجێ بهێڵم ئەوەیان لە رەفتاری منەوە دوورە، چونکە وەك گوتم: من ناوم موحەممەدەو بەندەو پێغەمبەری خودام و ئەوەی دەیڵێم راستەو ئەوەی دەیکەم دروستەو هەقەو درۆو چاوڕاوو بێ ئەمەکی و بی وەفایی لەمنەوە دوورە زۆر زۆر، چ لەگەڵ ئێوەدا، چ لەگەڵ خزمان و هۆزی خۆمدا، من یەکجار گوتوومەو دەیڵێم کۆچەو کردوومە بۆلای خوداو بۆلای ئێوەی خۆشەویست لەبەر رەزای خودا وە هەرگیز لە بڕیاری خۆم پەشیمان نابمەوە. ئیتر من ژیانم ژیانی ئێوەیەو مردنم مردنی ئێوەیە ژیان و مردنم لەگەڵ ژیان و مردنی ئێوەیە! یاریدەدەرانیش بە گریانەوە گوتیان: قوربان! بەخودا ئێمە بۆیە ئەمەمان گوتووە چونکە حەزناکەین لە رەحمەتی خوداو لە فەیزو بەرەکەتی ووجوودی تۆ بە دووربین و حەزدەکەین هەمیشە لە خزمەتتا بین، ئێمە خەمی ئەمەمانە. فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): راست دەکەن و خوداو پێغەمبەری خودا بۆ ئەم قسەیەتان باوەڕتان پێ دەکەن و عوزرو بەهانەتان قەبووڵ دەکەن! (م).

**٤٦٢٧**- عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مُطِيعٍ (رضي الله تَعَالَى عنهما) عَنْ أَبِيهِ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَقُولُ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ لاَ يُقْتَلُ قُرَشِيٌّ صَبْرًا بَعْدَ هَذَا الْيَوْمِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ. رَوَاهُما مسلم[٥]:

عەبدوڵڵای کوڕی موطیع (رەزای خودایان لێ بێ) لە بابیەوە دەفەرموێ: رۆژی گرتنی شاری مەککە گوێم لێ بوو پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: لەمڕۆ بەدواوە هەتا رۆژی قیامەت ئیتر قوڕەیشی بەکۆت و زنجیرەوە حەپس

---

[٥] مسلم. مغازي: ٤٦٠٣.

ناکرێ بۆ کوشتن لەسەر ئەوەی کە لەدین وەربگەڕێتەوە بەڵام لەسەر تۆڵەسەندن‌و شتی وا ئەوە جیایە (م).

٤٦٢٨- ← (ب- ٦ز- ١٨ل- ٢٧٥ف- ١٨)[٦].

٤٦٢٩- ← (ب- ٢ز- ١٣٥ل- ٢٧١ف- ١)[٧].

٤٦٣٠- ← (ب- ٢ز- ١٣٥ل- ٢٧٢ف- ٢)[٨].

لەگرەدا دەفەرموێ: ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لە ڕۆژی گرتنی مەککەدا، لە کەوانەی مەککەوە بە سواری ولاخ هاتە ناو شارەوە ئوسامەی بە پاشکۆوە بوو، بیلال‌و عوثمانی کوڕی طەلحەی لە خزمەتدا بوون عوثمان خۆی لە کلیلدارەکانی کابە بوو، حەزرەت ڕۆیشت هەتا چوو لەناو مزگەوتەکەدا ووشترەکەی ییخدا، فەرمانی کرد بە عوثمان کلیلەکەی هێناو دەرگاکەی کردەوەو پێغەمبەرو ئوسامەو بیلال‌و عوثمان چوونە ناومالی کەعبەوەو دنیا ڕۆژ بوو، تاوێکی باش لەناویدا مانەوە" ئەوجا حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) هاتە دەرەوە، خەڵکەکە هەرکەسەی دەیویست خۆی زووتر بچێتە ژوورەوە، ئیبنو عومەر یەکەم کەس دەبێ کە دەچێتە ژوورەوە، دەڕوانێ هێشتا بیلال وا لە ژوورەوە ڕاوەستاوە، لەپشت دەرگاکەوە، لێی دەپرسێ: ئایا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەکوێدا نوێژی کرد؟ ئەویش ئەو جێگەیەی پێ نیشاندەدا کە حەزرەت نوێژی تیادا کردبوو، ئیبنو عومەر فەرمووی: بەڵام لەبیرم نەبوو لە بیلال بپرسم کە حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) چەند ڕکات نوێژی کرد (ش/د/ت/ن).

٤٦٣١- ← (ت- ١ز- ١٥٥ل- ٤٤٧ف- ٢)[٩].

---

[٦] تقدم في مجلد سادس. تسلسل/ ١٨ رقم: ١٨/ ٣٩٦٨.

[٧] تقدم في مجلد ثاني. تسلسل/ ٢٧ رقم: ١/ ١٣٠٦.

[٨] تقدم في مجلد ثاني. تسلسل/ ١٣٥ رقم: ٢/ ١٧١٧.

[٩] تقدم في مجلد أول. تسلسل/ ١٥٥ رقم: ٢/ ٨٩٠.

٤٦٣٢- ← (ت- ١ز- ١٥٥ل- ٤٤٧ف- ٣)[١٠].

٤٦٣٣- عَنِ الْحَارِثِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَقُولُ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ: لاَ تُغْزَى هَذِهِ بَعْدَ الْيَوْمِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ. رَوَاهُ الترمذي بسند صحيح[١١]:

حاریثی کوڕی مالیك (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: ڕۆژی گرتنی شاری مەککە گوێم لێبوو پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: ئیتر لەمڕۆ بەدواوە هەتا ڕۆژی قیامەت جارێکی تر ئەم شارە غەزا ناکرێ‌و هەتا ئیسلام بمێنێ خەڵکی ئەم شارە ئیسلام دەبن، کەواتە لەسەر ناموسوڵمانەتی غەزا ناکرێ (ت- س/ص= ئیمامی تیرمیذی (خودای لێ ڕازی بێ) لە کتێبی جامع التیرمیذیدا، بە سەنەدێکی صەحیح ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە).

## ٩٦) غەزای حونەین: (غَزْوَةَ حُنَيْنٍ)

قَالَ الله تعالى: {وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْئًا وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ ثُمَّ أَنزَلَ اللّهُ سَكِينَتَهُ عَلَى رَسُولِهِ وَعَلَى الْمُؤْمِنِينَ وَأَنزَلَ جُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا وَعذَّبَ الَّذِينَ كَفَرُواْ وَذَلِكَ جَزَاء الْكَافِرِينَ (صدق الله العظيم)} (٩/٢٥):

واتە: ئەی گەلی ئیسلام! دەشێ فەرمانی خودا بەجێ بێنن‌و هەموو کاتێ سوپاسی زۆری بکەن لەسەر نیعمەتی ئیسلام‌و لەسەر ئەوە کە لەگەڵ کاتاو لە چەن ڕەزمگای ئاگریندا دەستی ئێوەی گرت‌و زاڵی کردن بەسەر دوژمندا بە تایبەتی لەڕۆژی ڕووداوی حونەیندا، لەوکاتە سەخت‌و دیژوارەدا یارمەتی دان، لەوکاتەدا کە زۆری ژمارەی سەرو زۆری ماڵ بەکاری هیچ نەهات‌و ئێوەی بێ نیاز نەکرد بەهیچ جۆرێ‌و گۆی زەوی‌و سەر زەمین بەو

---

[١٠] تقدم في مجلد أول. تسلسل/ ١٥٥ رقم: ٣/ ٨٩١.

[١١] رواه الترمذي بسند صحيح.

حەمکە پان و بەرفراوانییەی خۆی لێتان بوو بوو بە چنگێك و سەری دنیاتان لێ هاتەوە یەك، ئەوەبوو سەرەنجام شکان و هەڵهاتن و راتان کرد، هەتا لەپاشا خودا بە بەخششی خۆی و بە بەرەکەتی ووجودی پێغەمبەری خۆی فەرامۆشی دان و ئاسایشی داباران بەسەرتانا و دڵی ئەستوور کردن و سەکینە و ئارامی دڵی لە لایەی خۆیەوە ناردە خوارەوە بۆسەر پێغەمبەرو موسوڵمانەکان و سوپایەکی فریشتەی لە غەیبەوە بۆ پشتیوانی ئێوە نارد، کە ئەوکاتە ئێوە نەتانبینین، ئەوەبوو خودا بۆخۆی سزایەکی چاکی ناموسوڵمانەکانیدا، کە بەڕاستی سزایێ لە خوداوە بێ و بۆسەر ناموسوڵمان بێ هەروا دەبێ.

٤٦٣٤- عَنْ الْعَبَّاسِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: شَهِدْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَوْمَ حُنَيْنٍ فَلَزِمْتُ أَنَا وَأَبُو سُفْيَانَ ابْنُ الْحَارِثِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَلَمْ نُفَارِقْهُ وَهُوَ عَلَى بَغْلَةٍ لَهُ بَيْضَاءَ أَهْدَاهَا لَهُ فَرْوَةُ بْنُ نُعَامَةَ الْجُذَامِيُّ فَلَمَّا الْتَقَى الْمُسْلِمُونَ وَالْكُفَّارُ وَلَّى الْمُسْلِمُونَ مُدْبِرِينَ فَطَفِقَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَرْكُضُ بَغْلَتَهُ قِبَلَ الْكُفَّارِ وَأَنَا آخِذٌ بِلِجَامِهَا أَكُفُّهَا لئلاَّ تُسْرِعَ وَأَبُو سُفْيَانَ آخِذٌ بركابه فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَي عَبَّاسُ نَادِ أَصْحَابَ السَّمُرَةِ. قَالَ: فَوَاللَّهِ لَكَأَنَّ عَطْفَتَهُمْ حِينَ سَمِعُوا صَوْتِي عَطْفَةُ الْبَقَرِ عَلَى أَوْلاَدِهَا، فَقَالُوا: يَا لَبَّيْكَ يَا لَبَّيْكَ يَا لَبَّيْكَ فَاقْتَتَلُوا وَالْكُفَّارُ وَالدَّعْوَةُ فِي فَنَادَتِ الأَنْصَارُ يَقُولُونَ يَا مَعْشَرَ الأَنْصَارِ يَا مَعْشَرَ الأَنْصَارِ، ثُمَّ قَصُرَتِ الدَّعْوَةُ عَلَى بَنِي الْحَارِثِ بْنِ الْخَزْرَجِ يَا بَنِي الْحَارِثِ يَا بَنِي الْحَارِثِ، يَابَنِي الحَارِثِ فَنَظَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إِلَى قِتَالِهِمْ وَهُوَ عَلَى بَغْلَتِهِ وَقَالَ: هَذَا حِينَ حَمِيَ الْوَطِيسُ، ثُمَّ أَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) حَصَيَاتٍ فَرَمَى بِهِنَّ وُجُوهَ الْكُفَّارِ ثُمَّ قَالَ: انْهَزَمُوا وَرَبِّ مُحَمَّدٍ قَالَ: فَذَهَبْتُ أَنْظُرُ فَإِذَا الْقِتَالُ عَلَى هَيْئَتِهِ فِيمَا أَرَى قَالَ: فَوَاللَّهِ مَا هُوَ إِلاَّ أَنْ رَمَاهُمْ بِحَصَيَاتِهِ فَمَا زِلْتُ أَرَى حَدَّهُمْ كَلِيلاً وَأَمْرَهُمْ مُدْبِراً. وَفِي روايةٍ: رماهم بِقَبْضَةٍ مِنَ التُّراب وَقَالَ: شَاهَتِ الْوُجُوهُ فَمَا بَقِيَ مِنْهُمْ إِنْسَانٌ إِلاَّ امْتَلأَتْ عَيْنَاهُ فَوَلَّوْا مُدْبِرِينَ وَانْهَزَمُوا وَقُسِمَتْ غَنَائِمُهُمْ بَيْنَ الْمُسْلِمِينَ. ولفظ البخاري: لَمَّا كَانَ يَوْمَ حُنَيْنٍ الْتَقَى هَوَازِنُ وَمَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عَشَرَةُ آلاَفٍ وَالطُّلَقَاءُ، فَأَدْبَرُوا قَالَ:

يَا مَعْشَرَ الأَنْصَارِ قَالُوا: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللّٰهِ وَسَعْدَيْكَ، لَبَّيْكَ نَحْنُ بَيْنَ يَدَيْكَ، فَنَزَلَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى الله عَلَيْهِ وَسَلّم) وَقَالَ: أَنَا عَبْدُ اللّٰهِ وَرَسُولُهُ فَانْهَزَمَ الْمُشْرِكُونَ، فَأَعْطَى الطُّلَقَاءَ وَالْمُهَاجِرِينَ وَلَمْ يُعْطِ الأَنْصَارَ شَيْئًا، فَقَالُوا فِي ذَالِكْ، فَدَعَاهُمْ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى الله عَلَيْهِ وَسَلّم) فَأَدْخَلَهُمْ فِي قُبَّةٍ فَقَالَ: أَمَا تَرْضَوْنَ أَنْ يَذْهَبَ النَّاسُ بِالشَّاةِ وَالْبَعِيرِ وَتَذْهَبُونَ بِرَسُولِ اللّٰهِ (صَلّى الله عَلَيْهِ وَسَلّم) لَوْ سَلَكَ النَّاسُ وَادِيًا وَسَلَكَتِ الأَنْصَارُ شِعْبًا لاَخْتَرْتُ الأَنْصَارِ. زاد فِي روايةٍ: قَالَ: كُنَّا إِذَا احْمَرَّ الْبَأْسُ نَتَّقِي بِرَسُولِ الله (صَلّى الله عَلَيْهِ وَسَلّم) وَإِنَّ الشُّجَاعَ مِنَّا لَلَّذِي يُحَاذِيه. رَوَاهُ هذه الثلاثة الشيخان[1]:

**عەبباس** (خۆشنوودی خودای لێ بێ) **دەفەرموێ: لە خزمەتی پێغەمبەردا** (درودی خودای لەسەر بێ) **ئامادەی غەزای حونەین بووم، من و ئەبو سوفیانی کوڕی حاریثی کوڕی عەبدولموطەلیب لەخزمەتی دابووین و لێی جوێ نەدەبووینەوە، پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **بەسواری ئەو هێسترە سپییەی خۆی بوو کە فەروەی کوڕی نوفاثەی جوذامی بەدیاری بۆی هێنابوو، جا کاتێ موسوڵمانان و ناموسوڵمانان دایان بەیەکا موسوڵمانەکان لەسەرەتاوە شکان و بەرەودوا هەڵهاتن، بەڵام پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **ئێسترەکەی خۆی غاردەدا کە بەرەو کافرەکان هەڵمەت بەرێ، منیش لغاوی هێسترەکەم توند گرتبوو، نەم دەهێشت خێرا بڕوا، ئەبو سوفیانیش ئاوزەنگییەکەی پێغەمبەری گرتبوو، پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: ئەی عەبباس! بانگ کە ئەی دەستەی بەیعەتولڕیضوان! ئەی ئەو کۆمەڵەی کە لەڕۆژی حودەیبییەدا لەژێر دار مۆزەکەدا لەگەڵ پێغەمبەری خودادا پەیمانتان بەست لەسەر ئەوە کە لەبەر کافر هەڵنەیەن. جا منیش بەهەموو دەنگی خۆم، بەو دەنگە گەورەی خۆم هەتا هێزم تیادا بوو بانگم کرد: پیاوان و یارانی بەیعەتولڕیضوان لەکوێن کە خودای گەورە لە شانیاندا فەرموویەتی:**

{لَقَدْ رَضِيَ اللّٰهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ} (١٨/٤٨)؟

---

[1] مسلم. مغازی: ٤٥٨٨. بخاري. جهاد: ٢٩٣٠.

بەوخودایە هەرئەوەندە کە گوێیان لەدەنگی من بوو هەموو بەپەلە بۆلای حەزرەت بایان دایەوە، وەك چۆن گاگەلێ بەچکەی لێ جێمابێ کە گوێی لەدەنگی بێ بەهەڕاکردن دەگەڕێتەوە بۆسەری ئاوا، لەهەر چوار لاوە بەیەك دەنگ دەیانگوت: بەسەر سەر، بەسەر سەر، واهاتین، واهاتین، ئیتر لەگەڵ ناموسوڵمانەکاندا پێك هەڵپڕژان، خۆش خۆش بانگەواز هەر بەردەوام بوو، لەسەرەتاوە بانگی یاریدەدەران دەکراو دەیانگوت: ئەی کۆمەڵەی یاریدەدەران! ئەی کۆمەڵەی یاریدەدەران! ئەی مەردینە! رۆژێکەو ئەمڕۆ، لەدەستی نەدەن! ئینجا بانگەواز بەتایبەت لەنەوەی حاریثی کوڕی خەزرەج دەکراو دەیانگوت: ئەی نەوەی حاریث! ئەی نەوەی حاریث! حەزرەت (درودی خودای گەورەو مەزنی لێ بێ) بەسەر پشتی هێسترەکەی خۆیەوە سەرەنجێکی شەڕو کوشتارەکەی داو فەرمووی: وا تەندوور تاوی سەند، بەڕاستی شەڕ گەرمبوون ئاوا دەبێ! ئەوجا حەزرەت (درودو سڵاوو سەڵات و سەلامی خودای گەورەو مەزن لە خۆی و کەسوکارو یارانی بێ) مشتێ چەوی هەڵگرت و وەشاندی بەڕووی ناموسوڵمانەکانداو فەرمووی: بەخودای موحەممەد واشکان! منیش چووم تەماشام کرد، بەڵام لەبەرچاوی من هێشتا کوشتار وەك خۆی گەرم بوو. گوتی: کەچی هەرئەوەندە بوو کە چنگە چەوەکەی فڕەدا بۆیان، ئیتر چاوم لێ بوو بەرەبەرە ناموسوڵمانەکان کول دەبوون و گولۆلەیان دەکەوتە لێژی. لە گێڕانەوەیەکا: مشتێ خاك و خۆڵی بۆ فڕەدان و فەرمووی: شاهت الوجوە: روویان داوەشێ و چاویان کوێرو مزمەعیل بێ، ئیتر بەفەرمانی خودا هەموویان، یەك بەیەك پڕچاویان بوو لە خۆڵ و بەرەودوا هەڵیان تیزان و شکان ئیتر ئەوەبوو ماڵ و منداڵ و خاوو خێزان و سامانیان بە تاڵانی گیراو دابەش کرا بەسەر سوپای ئیسلامدا (ش) گفتەی (ب) ئاوایە: کە رۆژی حونەین روویدا لەشکری هۆزی هەوازین و سوپای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بەرامبەری یەکتری راوەستان، سوپاکەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) (بێجگە لەو نۆ موسوڵمانانەی کە لەکاتی گرتنی مەککەدا ئیسلام بوو بوون) دەهەزار کەس بوون، جا لەسەرەتاوە لەشکرەکەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر

بێ) شکستیان هێنا وەك لەسەر باسی خۆڕاگرتن‌و ورەبەرزی‌و نەبەزین لەکاتی ڕوودانی شەڕدا پێویستە لە فەرموودەی یەکەمدا ئەم باسە ڕابوورد. پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بانگی یاریدەدەرانی کردوو فەرمووی: ئەی کۆمەڵەی یاریدەدەران! ئەوانیش (ڕەزای خودایان لێ بێ) یەکسەر هۆشیان هاتەوەو کەوتنەوە خۆیان‌و عەرزیان کرد. ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمەتاین واین لەخزمەتتا، فەرموو بفەرموو سەرمان لە ڕێتایە! ئەوکاتە حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) لە وڵاخەکەی دابەزی، کەناوی دوڵدوڵ بوو، فەرمووی: من بەندەو پێغەمبەری خودام‌و درۆزن‌و جادوو بازنیم‌و قسەی من ڕاست‌و دروستەو سەرکەوتن هەر بۆ ئێمەیە ئیتر بۆ وورە بەردەدەن‌و نوشوست دەهێنن. ئیتر لەشکری ناموسوڵمانەکان شکاو هەڵیان تۆڕاند. پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) تاڵانییەکەی ئەوانی دابەش کرد بەسەر ئازادکراوەکانی فەتحی مەککەداو بەسەر کۆچکارەکاندا، هیچ بەشی یاریدەدەرانی لێ نەدا، ئەوەبوو یاریدەدەرانیش لەسەر ئەمە گلەییان لێکرد جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ)... تاد. باقی مەندەی فەرموودەکە لەباسی: (أعطاء المؤلفة قلوبهم)دا ڕۆیشت، فەرموودەی یەکەم‌و دووەم‌و سێیەم‌و چوارەم.

٤٦٣٥- ← (بۆ ئەم باسە تەماشای ئەم باسانەیش بکە: من قتل قتيلا فله سلبه ف- ١) + (فەرمانڕەوا بۆی هەیە کە دیل بە پیاوەتی ئازاد بکا...) + (ب- ٥ز- ٦٣ل- ٢٢٥ف- ٢)[٢].

## ٩٧) غەزای ئەوتاس: (غزوة أوطاس)

٤٦٣٦- ← (ب- ٥ز- ٦٣ل- ٢٢٥ف- ٢)[١]:

---

[٢] راجع مبحث (من قتل قتيلا فله سلبه).

[١] تقدم في مجلد خامس. تسلسل/ ٦٣ رقم: ٢/ ٣٥٢٨.

لێرەدا ئەم پترییەی هەیە: لە شەڕەکەدا کابرایەکی بەنی جەشەمی تیرێکی لە کەشکە ئەژنۆی ئەبو عامیردا، کە چوومە سەری پێم گوت: مامە کێ بوو ئەم تیرەی لێدای؟ ئەویش بەهێما نیشانی دام ئا ئەوەیە کە کوشتمی و تیرەکەی پێوەنام، منیش نیشتمە سەری و گرتمەوە، کەمنی بینی واگەیمە سەری هەڵهات، منیش شوێنی کەوتم و تانەم لێداو دەمگوت: ئەوە شەرم ناکەی رادەکەی! ئەگەر مەردی خۆت بگرە بۆم: ئەویش راوەستا، سەرو شمشێرمان بۆیەکتر داوەشان من ئەوم کوشت ئەوسا گەڕامەوە بۆلای ئەبو عامیر... تاد.

## ٩٨) غەزای طائیف: (غزوة الطائف)

٤٦٣٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رضي الله تَعَالَى عنهما) قَالَ: حَاصَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَهْلَ الطَّائِفِ فَلَمْ يَنَلْ مِنْهُمْ شَيْئًا فَقَالَ: إِنَّا قَافِلُونَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ، قَالَ أَصْحَابُهُ: نَرْجِعُ وَلَمْ نَفْتَتِحْهُ فَقَالَ لَهُمْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) اغْدُوا عَلَى الْقِتَالِ فَغَدَوْا عَلَيْهِ فَأَصَابَهُمْ جِرَاحٌ فَقَالَ لَهُمْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): إِنَّا قَافِلُونَ غَدًا قَالَ: فَأَعْجَبَهُمْ ذَلِكَ فَضَحِكَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم). رَوَاهُ الشَّيخان[1].

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خودا لێیان رازی بێ) دەفەرموێ: لەپاش غەزای حونەین و ئەوتاس پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەورەی خەڵکی قەڵای تائیفی دا، بەڵام زەبەری پێ نەبردن، فەرمووی: خودا حەزکا دەگەڕێینەوە یارانیش (رەزای خودایان لێ بێ) لەبەریان گران بوو، فەرموویان: چۆن دەگەڕێینەوە خۆتۆ هێشتا قەڵاکەت نەگرتووە؟ فەرمووی: دەسبەینێ سەر لەبەیانەکی بڕۆن بۆ شەڕ لەگەڵیان جا بۆ سبەینێ کە چوون بۆ شەڕ لەسەر لێواری شوورەکەوە بە دوورەتیر هەندێکیان لێ زامار بوو، وە هیچیشیان پێ نەکردن، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموون: سبەینێ دەگەڕێینەوە! گوتی: کەچی ئەمجا

[1] تجريد البخاري/ ٤/ ٣٣٨ رقم: ١٥٩٢ = ٤٣٢٥ ، ٦٠٨٦ ، ٧٤٨٠. مسلم. مغازي: ٤٥٩٦.

گەڕانەوەیان بەدڵ بوو، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کەدی وارایان گۆڕی و ئەوانیش لەپاش تاقیکردنەوە هاتنە سەر قسەکەی ئەو، ئەویش پێکەنی (ش- خودایان لێ رازی بێ).

## ٩٩) غەزای تەبووك: (غزوة تبوك)

٤٦٣٨- ← (ب- ٥ز- ٩ل- ٢٦٢ف- ٤)[١].

٤٦٣٩- ← (ب- ٦ز- ١٠ل- ٢١٦ف- ٢٤)[٢].

## ١٠٠) غەزای مۆتە لە وولاتی شام

٤٦٤٠- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) قَالَ: أَمَّرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فِي غَزْوَةِ مُوتَةَ زَيْدَ بْنَ حَارِثَةَ ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): إِنْ قُتِلَ زَيْدٌ فَجَعْفَرٌ وَإِنْ قُتِلَ جَعْفَرٌ فَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ رَوَاحَةَ، قَالَ ابْنِ عُمَرَ: فَالْتَمَسْنَا جَعْفَرَ بْنَ أَبِي طَالِبٍ فَوَجَدْنَاهُ فِي الْقَتْلَى وَوَجَدْنَا فِي جَسَدِهِ بِضْعًا وَتِسْعِينَ مِنْ طَعْنَةٍ وَرَمْيَةٍ[١]:

ئیبنو عومەر (رەزای خودا لەخۆی و بابی) فەرمووی: لە غەزای مۆتەدا حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) زەیدی کوڕی حاریسی کرد بەسەرکردەی سوپاکە، لەپاشا فەرمووی: ئەگەر زەید کوژرا ئەوا جەعفەر لەشوێنی ئەو سەرکردەیە، ئەگەر جەعفەریش کوژرا عەبدوڵڵای کوڕی رەواحە سەرکردەیە. ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) فەرمووی: کە گەڕان بۆ تەرمەکەی جەعفەری کوڕی ئەبو طالیب کاتێ کە دۆزیمانەوە، لەناو کوژراوەکاندا، زیاتر لە نەوەت سەرە ڕم و دەمەشیرو تیری پێوە بوو (ب).

---

[١] تقدم في مجلد خامس. تسلسل/ ٩ رقم: ٤/ ٣٢٩١.

[٢] تقدم في مجلد سادس. تسلسل/ ١٠ = ٢٤/ ٣٩١٥.

[١] بخاري. مغازي: ٤٢٦٢.

**٤٦٤١- ← (ب- ٥ز- ٢٢ل- ٣١٤٣ف- ١) + (ب- ١ز- ١٩٧ل- ٥٣٠ف- ٣)[٢].**

**٤٦٤٢- عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ الأَنْصَارِيِّ (رضى الله عنهما) قَالَ: أُغْمِيَ عَلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ رَوَاحَةَ، فَجَعَلَتْ أُخْتُهُ عَمْرَةُ تَبْكِي وَاجَبَلاَهْ وَاكَذَا وَاكَذَا تُعَدِّدُ عَلَيْهِ فَقَالَ حِينَ أَفَاقَ: مَا قُلْتِ شَيْئًا إِلاَّ قِيلَ لِي آنْتَ كَذَلِكَ. رَوَاهُ هذه الثلاثة البخاري[٣]:**

**نوعمانی کوڕی بەشیری ئەنصاری (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: جارێ عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە زۆر نەخۆش دەبێ، کەشەنگ دەبێ، لەهۆش خۆی دەچێ، عەمرەی خوشکیشی دەست دەکا بە شین‌و شەپۆڕو دەیلاوێنێتەوەو دەڵێ: ئای کێوەکەم ڕۆ، ئەمەم ڕۆ ئەوەم ڕۆ، جا کاتێ عەبدوڵلا دێتەوە سەرهۆش دەڵێ: هەموو جارێ کەتۆ منت دەلاواندەوەو بەسەر مندا هەڵت دەدا دەگوترا پێم: ئەرێ ڕاستە تۆ وایت وەك عەمرەی خوشکت دەڵێ؟ (ب) لەشەرحەکەدا دەفەرموێ: لەم نەخۆشینەدا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەچێ بۆ سەردانی، دەڕوانێ کفتەو بووراوەتەوە دەفەرموێ: (أللهم أن كان أجله قد حضر فيسر عليه وألا فأشفه): پەروەردگاری من! ئەگەر ئاکامی هاتووە ئەوا کاری سەرەمەرگی بۆ ئاسان بفەرموو، دەنا چاری بفەرموو). دەڵێ: جا خودا تۆزێ باری لەشی سووك دەکاو هۆشی دێتەوەو دەفەرموێ: وەك بڵێی فریشتەیێ گورزێکی ئاسنین ڕاست بکاتەوە لێم‌و بڵێ: جا ئەمە ڕاستە تۆ ئاوایت؟ ئەگەر بمگوتبایە: ئا، بەوە دایدەپڵۆستم.**

---

[٢] تقدم في مجلد خامس. تسلسل/ ٢٣ رقم: ١/ ٣٣٨٦.

[٣] راجع مجلد أول. تسلسل/ ١٩٦ رقم: ٤/ ١٠٣٤.

## ١٠١) دواگوتە لەم باسەدا، باسی ناردنی نێردەکان (البعوث) ناردنی عاصیم و خوبەیب و برادەرەکانیان:

## خاتمة في البعوث: بعث عاصم وحبيب وأصحابهما

٤٦٤٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: بَعَثَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) سَرِيَّةً عَيْناً وَأَمَّرَ عَلَيْهِمْ عَاصِمَ بْنَ ثَابِتٍ، فَانْطَلَقُوا حَتَّى إِذَا كَانُوا بَيْنَ عُسْفَانَ وَمَكَّةَ ذُكِرُوا لِحَيِّ مِنْ هُذَيْلٍ يُقَالُ لَهُمْ بَنُو لِحْيَانَ فَتَبِعُوهُمْ بِقَرِيبٍ مِنْ مِائَةِ رَامٍ، فَاتَّبَعُوا آثَارَهُمْ حَتَّى أَتوا مَنْزِلاً نَزَلُوا فَوَجَدُوا فِيهِ نَوَى تَمْرٍ تَزَوَّدُوهُ مِنْ تَمْرِ الْمَدِينَةِ فَقَالُوا: هَذَا تَمْرُ يَثْرِبَ فَتَبِعُوا آثَارَهُمْ حَتَّى لَحِقُوهُمْ فَلَجَأُوا عَاصِمُ وَأَصْحَابُهُ إِلَى فَدْفَدٍ فَأَحَاطَ بِهِمْ الْقَوْمُ وَقَالُوا: لَكُمُ الْعَهْدُ وَالْمِيثَاقُ إِنْ نَزَلْتُمْ إِلاَّ نَقْتُلَ مِنْكُمْ رَجُلاً فَقَالَ عَاصِمُ: أَمَّا أَنَا فَلاَ أَنْزِلُ فِي ذِمَّةِ كَافِرٍ، اللَّهُمَّ أَخْبِرْ عَنَّا رَسُولَكَ فَرَمَوْهُمْ حَتَى قَتَلُوا عَاصِماً فِي سَبْعَةِ نَفَرٍ بِالنَّبْلِ وَبَقِيَ خُبَيْبُ وَزَيْدُ وَرَجُلٌ آخَرُ فَأَعْطَوْهُمُ الْعَهْدَ وَالْمِيثَاقَ فَنَزَلُوا إِلَيْهِمْ فَلَمَّا اسْتَمْكَنُوا مِنْهُمْ حَلُّوا أَوْتَارَ قِسِيِّهِمْ فَرَبَطُوهُمْ بِهَا، فَقَالَ الرَّجُلُ الثَّالِثُ: هَذَا أَوَّلُ الْغَدْرِ فَأَبَى أَنْ يَصْحَبَهُمْ فَجَرُّوهُ وَعَالَجوه فَلَمْ يَمْتَثِل فَقَتَلوه وَانْطَلَقُوا بِخُبَيْبٍ وَزَيْدٍ حَتَّى بَاعُوهُمَا لأَهْلَ مَكَّةَ. رَوَاهُ البخاري (قَالَ في الشرح: بقية الحديث: وَكَانَ خُبَيْبٌ قَتَلَ الْحَارِثِ بْنِ عَامِرِ بْنِ نَوْفَلٍ يَوْمَ بَدْرٍ فَاشْتَرَاه بَنُو الْحَارِثْ فَمَكَثَ عِنْدَهُمْ زَمَنًا أَسِيرًا فَكَانَتْ بِنته تَقُولُ: مَا رَأَيْتُ أَسِيرًا قَطُّ خَيْرًا مِنْ خُبَيْبٍ، لَقَدْ رَأَيْتُهُ يَأْكُلُ مِنْ قِطْفِ عِنَبٍ وَهُوَ مُوثَقٌ فِي الْحَدِيدِ وَلَيْسَ بِمَكَّة يَوْمَئِذٍ ثَمْرَةٌ، فَمَّا كَانَ إِلاَّ رِزْقٌ رَزَقَهُ اللَّهُ تَعَالَى، فَلَمَّا أَجْمَعُوا عَلَى قَتْلِهِ خَرَجُوا بِهِ مِنَ الْحَرَمِ لِيَقْتُلُوهُ خَارِجَهُ فَقَالَ: دَعُونِي أُصَلِّ رَكْعَتَيْنِ فَصَلَّى ثُمَّ قَالَ لَهُمْ: لَوْلاَ أَنْ تَرَوْا مَا بِي جَزَعٌ مِنَ الْمَوْتِ لَزِدْتُ فِي عِبَادة رَبِّي، فَكَانَ هُوَ أَوَّلُ مَنْ سَنَّ الرَّكْعَتَيْنِ عِنْدَ الْقَتْلِ، ثُمَّ قَالَ اللَّهُمَّ أَحْصِهِمْ عَدَداً. ثُمَّ قَالَ:

وَلَسْتُ أُبَالِي حِينَ أُقْتَلُ مُسْلِماً
عَلَى أَيِّ شِقٍّ كَانَ فِي اللَّهِ مَصْرَعِي
وَذَلِكَ فِي ذَاتِ الإِلَهِ وَإِنْ يَشَأْ
يُبَارِكْ عَلَى أَوْصَالِ شِلْوٍ مُمَزَّعِ[1]:

---

[1] بخاري. جهاد: ٣٠٤٥ ، ٣٩٨٩ ، ٤٠٨٦ ، ٧٤٠٢.

ئەبو هورەیرە (خودای لێ خۆشنوود بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لقێکی نارد، دەکەس بوون، بۆ سووسەکردن‌و چاو گێڕان‌و دزینی هەواڵی دوژمن، عاصیمی کوڕی ثابیتی کرد بەسەرپەلیان، دەڕۆن تا دەگەنە هەدئە، کە جێگەیەکە لەنێوانی عوسفان‌و مەککەدا، لەوێ خێڵی بەنی لەحیان (کە دەچنەوە سەر هۆزی هوزەیل) هەستیان پێ دەکەن، جا نزیکەی سەد پیاوی تیرەنداز شوێنیان دەکەون‌و شوێنەوارو شوێن پێیان هەڵ دەگرن، تا دەچنە سەر شوێن هەوارێ، دەڕوانن وا ناوکە خورمای لێ کەوتووە، کە موسوڵمانەکان لەباتی تێشوو لە مەدینەوە لەگەڵ خۆیان هێنابوویانن دەڵێن: ببێ‌و نەبێ ئەمە خورمای مەدینەیە، ئیتر شوێنیان هەڵ دەگرن هەتا دەیان گرنەوە. جا عاصیم‌و هاوڕێکانی خۆیان دەگەیەننە گردێ‌و لەوێ خۆیان قایم دەکەن، ناموسوڵمانەکان ئابلۆقەیان دەدەن‌و دەڵێن: ئامان‌و پەیمانتان دەدەینێ ئەگەر خۆتان بەدەستەوە بدەن کەستان ناکوژین، عاصیم دەفەرموێ: من بەش بەحاڵی خۆم بە ئامان‌و پەیمانی کافر تەفرە ناخۆم‌و خۆم نادەم بەدەستەوە! ئەی خودایە! هەواڵی ئێمە بگەیەنە بە پێغەمبەری خۆت ئینجا کافرەکان دەسرێژیان لێ دەکەن‌و بە تیرەباران دایان دەگرن‌و بە عاصیمەوە حەوت کەسیان لێ دەکوژن. خوبەیب‌و زەیدو پیاوێکی تریان دەمێننەوەو دیسان بەڵێن‌و پەیمانیان دەدەنێ‌و ئەوانیش خۆیان دەدەن بەدەستەوە، جا کە چنگیان لێیان گیردەبێ‌و دەکەونە بەر هەوێڵیان گورج ژێی کەوانەکانیان دەکەنەوەو بەژێی کەوانەکانی خۆیان توند دەیان بەستنەوە، پیاوەکەی سێیەم کەناوی عەبدوڵڵای کوڕی طاریق دەبی دەفەرموێ: ئەمە نیشانەی بێ پەیمانی‌و نیشانەی ئەوەیە کە گزی‌و ناپاکیمان لەگەڵ دەکەن، ئەگینا بۆوامان لێ دەکەن بەخودا من لەگەڵتان نایەم، من لەو حەوت هاوڕێیانە زیاتر نیم، کە شەهیدکران جا هەر هەوڵ دەدەن کە لەگەڵیان بڕوات ناڕوات‌و گەلێ خەریك دەبن کە بە کێشی بکەن‌و ئازاری بدەن بەڵام ئەو بەگوێیان ناکا‌و ملیان ناداتێ، ئیتر دەیکوژن خوبەیب‌و زەیدیش دیل دەکەن‌و دەیانبەن‌و دەیانفرۆشن بە کافرەکانی خەڵکی مەککە تا لەباتی کەسوکاری خۆیان کە لە

بەدردا بەدەستی ئەو دوو کەسە کوژرا بوون بیان کوژنەوە! (ب) باقی مەندەی ئەم فەرموودەیە بەپێی شەرحەکە ئاوایە: خوبەیب (ڕەزای خودای لێ بێ) لە ڕۆژی بەدردا حاریثی کوڕی عامیری کوڕی نەوفەلی کوشتبوو، لەبەرئەوە کوڕەکانی حاریث بکوژەکەی باوکیان دەکڕنەوە، دیلی دەکەن‌و ماوەیەکی کەم لەلایان دەمێنێتەوە کە مانگە بەرێزەکان (ئەشهورو الحوروم) رابوردن بڕیاریاندا کە بیکوژن، خوبەیب (خودای لێ رازی بێ) داوای گوێزانێکی لە زەینەبی کچی حاریث کرد، کە بەری خۆیی پێ بتاشێ، زەینەب گوێزانەکەی دەداتێ. زەینەب دەڵێ: ئاگام لەخۆم نەبوو، کوڕێکی منالّم هەبوو چووبوو بۆ لای، خوبەیب گوێزانە رووتەکەی بەدەستەوە بوو، کوڕەکەمی لەسەر رانی خۆی دانابوو منیش راچەنیم‌و رەنگم بڕسکا، خوبەیب فەرمووی: مەترسە لەتۆ وایە کوڕەکەت دەکوژم، من شتی وا ناڕەوا ناکەم زەینەب (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: بەزاتێ کە زاتی خودایە قەت یەخسیری وەك خوبەیبم ئاوا باش نەدیوە، من بەچاوی خۆم کەرامەتم لێ دەدی، رۆژێ چاوم لێ بوو بۆڵێ ترێی بەدەستەوە بوو دەیخوارد، توند بە زنجیر شەتەك درابوو، لەوکاتەدا ئەوەی پێی بگوترێ میوە لە مەککەدا نەبوو، چونکە کاتی بەسەرچوو بوو، دیاربوو ئەوە کەرامەت بوو، رزق‌و رۆژییەك بوو خودای گەورە خۆی بۆی رەخساندبوو لەو بابەتە بوو کە خودا لە قورئاندا لەسەر ئەم شێوەیە باسی دەفەرموێ:

{كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا الْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقاً، قَالَ يَا مَرْيَمُ أَنَّى لَكِ هَذَا؟ قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ اللّهِ إنَّ اللّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَاء بِغَيْرِ حِسَابٍ} (٣/٣٧).

هەموو جارێ حەزرەتی زەکەرییا کەدەچوو بۆ سەردانی حەزرەتی مەریەم رۆژیی نایابی لەلابوو، وەك میوەی زستانە لە هاوینا‌و میوەی هاوینە لە زستانا، پێی فەرموو: ئەی مەریەم! تۆ لەنا‌و ئەم خەڵوە خانەدایت‌و نەکەس دێ بۆلات‌و نە دەچی بۆلای کەس‌و دەرگا لەسەر دەرگا لەسەت داخراوە، کەواتە ئەم نان‌و ئاوە جوانانە‌و ئەم میوەی ناوەختەت لەکوێ بوو؟

مەریەم فەرمووی: ئەمە لە گەنجینەی غەیبی خوداوەیە، پەیوەندی بەهۆو کات و شوێنەوە نییە، کەواتە بە دووری مەزانەو بۆ خودا چی تێ دەچێ، خودا ئەگەر مەیلی لەسەر بێ بەبێ شومار رزق و رۆژی دەدا بەهەر کەسێ کە خۆی مەیلی لەسەری هەبێ. حەدیث دەفەرموێ: کە لەخاکی بەست (حەرەم)ی مەککە خوبەیبییان بردە دەرەوە، تا لەخاکی نابەست (ئەرزی حیلل)دا شەهیدی بکەن، فەرمووی: مۆڵەتم بدەن دوو رکات نوێژی سوننەت بەم بۆنەیەوە بکەم، مۆڵەتیان دا تەنیا دوو رکاتی کرد، کە سلاوی دایەوە فەرمووی: لەبەرئەوە نەبێ کەئێوەی دنیا پەرست و بێ ئاگا لە ژیانی لای خودا، وا بزانن کە بۆیە نوێژی پتر دەکەم چونکە لە مردن دەترسم، دەنا حەزم دەکرد کە لەم حاڵەمدا بەندەیی و عیبادەتێکی زۆر بۆ خودای خۆم بکەم، لە دواییدا فەرمووی: خودایە! تاقیان لێ ببڕە، دەفەرموێ: خوبەیب یەکەم کەس بوو لە ئیسلامدا کە ئەم دوورەکاتە نوێژی صەلاتوصەبرەی کرد بە سوننەت، وەبوو بەسەر مەشق بۆ ئەو موسوڵمانانەی کە لە بەندییدا چاوەڕوانی کوشتنی خۆیان دەکەن، دوو رکات نوێژی سوننەتی سەرەمەرگ بکەن، لەپاشدا فەرمووی:

وَلَسْتُ أُبَالِي حِينَ أُقْتَلُ مُسْلِماً

عَلَى أَيِّ شِقٍّ كَانَ فِي اللَّهِ مَصْرَعِي

وَذَلِكَ فِي ذَاتِ الإِلَهِ وَإِنْ يَشَأْ

يُبَارِكْ عَلَى أَوْصَالِ شِلْوٍ مُمَزَّعِ[1]:

وەك لە عەینیدا دەفەرموێ، ئەم دوو شیعرە لەم چامەیەیە کە دەفەرموێ:

لقد جمع الاحزاب حولي وألبوا

قبائلهم وأستجمعوا كل مجمع

---

[1] بخاري. جهاد: ٣٠٤٥ ، ٣٩٨٩ ، ٤٠٨٦ ، ٧٤٠٢.

وقـــد قربـــوا أبنـــاءهم ونـــساءهم

وقربـــت مـــن جـــزع طويـــل ممنـــع

وكلـــهمو يبـــدي العـــداوة جاهـــدا

علـــى لأنـــي فـــي وثـــاق بمـــضيع"

إلى الله أشـــكو غربتـــي بعـــد كربتـــي

ومـــا جمـــع الأحـــزاب عنـــد مـــصرعي،

يـــذا العـــرش صـــبرني علـــى مـــا أصـــابني

وقـــد بـــضعوا لحمـــي وقـــد قـــل مطمـــع

وذلـــك فـــي ذات الإلـــه وان يـــشأ

يبـــارك علـــى أوصـــال شـــلو ممـــزع

وقـــد عرضـــوا بـــالكفر والمـــوت دونـــه

وقـــد ذرفـــت عينـــاي مـــن غـــير مـــدمع

ومـــا بـــي حـــذار المـــوت أنـــي لميـــت

ولكـــن حـــذاري حـــر نـــار تلفـــع!

فلـــست بمبـــد للعـــدو تخـــشعا

ولا جزعـــا أنـــي إلى الله مرجـــع"

ولـــست أبـــالي حـــين أقتـــل مـــسلما

علـــى أي شـــق كـــان لله مـــضجعي!!

واتە:

دەســـتو پـــام بـــەکوت لـــە لەشـــم بـــارە

بـــۆم هـــەڵخراوە پـــەتی ســـێدارە!

دوژمـــن لـــە دەورم بـــەبێ شـــومارە

لێوە کرۆژەی چون فیشکەی مارە

خاوو خێزانی ئەو گورگە هارە

هاتوون بۆ سەیری منی بێچارە!

کەسی بێ کەسان خۆی ئاگادارە

لەحاڵی دڵم چەندە زامارە،

بۆ خۆم غەریبم لەم دوورە شارە

ئەڵهام بینینی ڕۆخساری یارە!

هەمیشە دڵم لای کەسوکارە

دڵم لە زۆری زۆردار بێزارە!!

وەلێ ئەباتم لەزارا ژارە

لەجێی رووی ئازیز چارەی بەدکارە!

سکاڵام لەلای خوای کردگارە

تۆڵەم بسێنێ لەچی زۆر دارە

عەرشی تۆ خودا قیبلەی هەژارە

تاقە روانگەی بەندەی بێچارە!

بێچارەیی من لە عالەم دیارە

جەستەم پڕ لەخار دڵ پڕجەخارە

تەمام ئەماوە بەم ژینە تارە

صەبرو ئارامم بدە ئەمجارە

ئەوەی ئاوی تۆی لەناوی زارە

لەسەرە مەرگا شادو ڕزگارە

بۆ ڕەزای تۆیە وائەم ئازارە

دەکێشم، باکم نیە لەم بارە!

ئەگەر مەیلت بێ گوڵکو گوڵزارە

کەلاوە کۆنیش کوشکو تەلارە!

دەڵێن: کافر بە، سەرت قوتارە
گەروابێ مردن دەکڕم بەپارە
چاوم بەوێنەی هەوری بەهارە
خونچەی گوڵ بەدەم شەونم لە زارە [١]
لەمەرگ سڵ ناکەم مردن یەکجارە
ترسم لە ئاگری سووری گڕدارە
گەر دوژمن جەرگم کا پارە پارە
سەرم شۆڕناکەم بۆ ئەو خوێنخوارە!
مادەم بۆ ئیسلام دەمدەن لەم دارە
بەپێی خۆم دەچمە بەرپێی قەپارە!

**بە پەخشانیش واتە:**

گەلی دوژمن لە دەورم گەلەکۆمەیان کردووە، خاوو خێزانی خۆی هێناوە بۆ تەماشای لە دەردانی من. داری سێدارەکەم وا بەبەرچاومەوە، دارێکی درێژی بێ ڕەزایە، خێڵی دوژمن دەوری داوم هەموو لێوە کرۆژەم لێ دەکەن، دەست و پێم بە کۆت شەتەك دراوە، ئومێدی مانم نەماوە، هاوار بۆکێ بەرم کە هەق و تۆڵەم لەم نامەردانە بستێنێ جگە لە خودا، ئەی خودای خاوەنی عەرش! تۆ دەزانی لەسەر ئەم غەریبی و ئاوەرەییەدا، تووشی ئەم کۆستە گەورەیەیش بووم، سەرەڕای ئەم دووبارە گەورەیەیش پێخۆشبوون و لێوە کرۆژەی دوژمنیش لەوێ بوەستێ،لەم سەرەمەرگەیشدا لەباتی رووی ئازیزان چارەی بێ ڕەزای ناحەزی بەدکار وەك چقڵ لەناو چاوم هەڵ

---

[١] واتە: چاوم ئەوەندە ئەشکی زۆری سوێری هەڵڕژاندووە ، فرمێسکی پێ نەماوە ، کالانەی چاوم سووتاوەتەوە لەبەر گریان ، بۆڕی فرمێسکی کوێر بۆتەوە ، دەق دەڵێی خونچەیەکی سوورە کە خەریك بێ دەم بکاتەوەو قەترەیێ شەونمی لە دەما بێ ، ئەمیش ئاوەها دوا دڵۆپ ئەشکی سوورو سوێری لەناوا قەتیس ماوە. (وەرگێڕ)

دەچەقێ، بەدەستی دوژمن گشت لەشم بەبارە، گۆشت و پۆستمی بە نەشتەر پارە پارە کردووە، ئەی خاوەنی عەرش! قاپی تۆ دەرووی ئومێدی بێچارەو هەژارانە، رۆژێکەو ئەمڕۆ، تەمام بەمان نەماوە، رووزەردی بارەگای خۆتم مەکە، بە دادو فوغان و بێ ئارامی پاداش و مزم بەتاڵ مەکەرەوە، صەبرو ئارامم بدەری، با روو زەردی سەرە مەرگ نەبم و بمکە بە پێشەنگ و سەرمەشق بۆ شەهیدانی دوای خۆم. ئەمەیشی کە بەسەرم هاتووە (لە سایەی خوداوە) هەمووی لەبەر رەزای خودایە، خودا بۆ خۆی تەوانایە، ئەگەر ئارەزوو بکا ئەم جەستە پەل پەلەی من دەکا بەمایەی خێرو خۆشی و سەرکەوتن بۆ گەلی ئیسلام!

دوژمن لەم کاتی گیانەڵایەدا دەیەوێ بە بەرتیل کافرم بکا، پێشنیار دەکا و دەڵێ: ئەگەر لە ئیسلام وەرگەڕێیت و بێیتەوە سەردینی خۆمان ئازادت دەکەین، بەڵام مردن گەلێ خۆشترە لە کوفر، یا ئیسلام یا نەمان! یا مردن یا قورئان!!

ئەوەندە گریاوم لەبەر کوڵۆڵی و کەساسی و بێ کەسی خۆم و لەترسی ئاگری سووری بڵێسەداری دۆزەخ، چاوم وەك گۆمی خوێنی لێهاتووە، فرمێسکم وشك بووە، چاوەکانم پڕوشاوی بووە، بەڵام لەترسی مردن ناگریم، مردن هەقەو یەکجارە هەر دەبی ببێ، بەڵێ باکم نییە لەمردن، چونکە دەزانم دەچمەوە بەردەستی خودا، مردن هەرچۆنێ بێ، لەسەر رووی خاك بێ، یا لەسەر تەختی پادشایی بێ، لەسەر ئەم لابێ یا لەسەر ئەولابێ، مادەم بۆ رەزای خودابێ و لەسەر ئیمان و ئیسلام بێ خۆم دەچم بە پیریەوەو هیچ باکم نییە لێی کێ بێ شەهیدبوونی پێ خۆش نەبێ [١]!!؟ (وەرگێڕ).

---

(١)

## ١٠٢) هەناردنی حەفتا کەسە قورئان خوێنەکان : (بعث القُرَّاءِ السبعين)

٤٦٤٤- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ رِعْلاً وَذَكْوَانَ وَعُصَيَّةَ اسْتَمَدُّوا رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) عَلَى عَدُوِّهِمْ فَأَمَدَّهُمْ بِسَبْعِينَ مِنَ الْقُرَّاءِ كُنَّا نُسَمِّيهِمُ الْقُرَّاءَ فِي زَمَانِهِمْ كَانُوا يَحْتَطِبُونَ بِالنَّهَارِ وَيُصَلُّونَ حَتَّى كَانُوا بِبِئْرِ مَعُونَةَ غَدَرُوا بِهِمْ وَقَتَلُوهُمْ فَبَلَغَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَنَتَ شَهْرًا يَدْعُو فِي الصُّبْحِ عَلَى أَحْيَاءٍ مِنْ أَحْيَاءِ الْعَرَبِ عَلَى رِعْلٍ وَذَكْوَانَ وَعُصَيَّةَ وَبَنِي لَحْيَانَ. قَالَ أَنَسٌ: فَقَرَأْنَا فِيهِمْ قُرْآنًا ثُمَّ رُفِعَ بَلِّغُوا عَنَّا قَوْمَنَا أَنَّا لَقِينَا رَبَّنَا فَرَضِيَ عَنَّا وَأَرْضَانَا. رَوَاهُ الثَّلاثَةُ[1]:

ئەنەس (ڕەزای خودای گەورەی لێ بێ) دەفەرموێ: ئەم خێڵانە کە ناویان بەنی ریعل‌و بەنی زەکوان‌و بەنی عوصەییە بوو، داوای یارمەتییان لە پێغەمبەر کرد (درودی خودای گەورەی لەسەر بێ) کە یارمەتییان بدا بەسەر دوژمنی خۆیاندا، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) حەفتا قورئان خوێنی چاکی بە کۆمەکی بۆ ناردن، کە ئەوسایش لەکاتی ژیانی خۆیاندا هەر پێمان دەگوتن قورئان خوێنەکان‌و ناویان بە قورئان خوێنەکان دەرکردبوو، ئەمانە کاریان ئەوەبوو بە رۆژ داریان دەکردو بە کوڵ کۆیان دەکردەوەو بەشەو هەر شەو نوێژیان دەکرد، جا پێکەوە دەکەونە ڕێ‌و دەڕۆن تا دەگەنە بیری مەعوونە لەوێ بە نامەردی دەیانکوژن، جا کاتێ ئەم هەواڵە دڵتەزێنە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (درودی خودای گەورەی لەسەر بێ) تا ماوەی مانگێکی رەبەق لە نوێژی بەیانی‌دا نزای قونوتی دەخوێندو نەفرین‌و دوعای شەڕی لەم خێڵە عەرەبانە دەکرد: لە خێڵی بەنی ریعل‌و خێڵی بەنی زکوان‌و خێڵی بەنی عوصەییە. ئەنەس (خودای

---

دەڕژێ لە دەیدەم وەک تاوی بەهار

لەبۆ کەساسیی خوبەیبی نازار!

[1] مسلم. صلاة: ١٥٤٣. تجریدی بوخاري بالكوردی/ ١/ ٤٨٨ رقم: ٥١٥/ آ = ١٠٠١ ، ١٠٠٢ ، ١٠٠٣ ، ١٣٠٠ ، ٢٨٠١، ٢٨١٤، ٣٠٦٤، ٣١٧٠، ٤٠٨٨، ٤٠٨٩، ٤٠٩٠، ٤٠٩١، ٤٠٩٢، ٤٠٩٤، ٤٠٩٥ ، ٤٠٩٦ ، ٦٣٩٤ ، ٧٣٤١.

لیّ رازی بێ) فەرمووی: لەشانی داستانی ئەم قورئان خوێنانەدا ئەمە لە قورئاندا هاتە خوارەوە، تا ماوەیەك لەناو قورئاندا دەمانخوێند، بەڵام لەپاشدا نەما و نەسخەوە بوو، دەیفەرموو: بلغوا عنا قومنا أنا لقينا ربنا فرضي عنا وأرضانا: لەباتی ئێمە بڵێن بەگەلی ئێمە کە گەلی ئیسلامە، کەوا ئێمە بەدیداری خودای خۆمان شادبووین، ئەو لە ئێمە رازی بوو، ئێمەیشی لەخۆی رازی کرد. {ش/د= بوخاری و موسلیم و تیرمیذی. (رەزای خودایان لیّ بێ)}.

٤٦٤٥- وَعَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بَعَثَ خَالَهُ حَرَامٌ بـنْ مَلحـان فِي سَـبْعِينَ رَاكِبًا إِلَى بَنِي عَامِرُ، وَكَانَ رَئِيسَهُمْ قَبْلَ هذا (وَهُوَ عَامِرُ بْنُ الطُّفَيْلِي) خَيَّرَ النَّبِـيَّ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَيْنَ ثَلاَثِ خِصَالٍ فَقَالَ: يَكُونُ لَكَ أَهْلُ السَّهْلِ وَلِي أَهْلُ الْمَدَرِ، أَوْ أَكُونُ خَلِيفَتَكَ أَوْ أَغْزُوكَ بِأَهْلِ غَطَفَانَ بِأَلْفٍ وَأَلْفٍ، فَأَبي النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَقَالَ: اللهُمَّ أكْفِنِي عَامِراً، فَانْطَلَقَ إِلَيْهُمْ حَرَامٌ وَمَعَهُ رَجُلان أَحَدُهُما أَعْرَجُ فَقَالَ حَرَامٌ لِصاحِبيه لَمَّا دَنُوا مِنْهُمْ: كُونَا قَرِيبًا مَعِي حَتَّى آتِيَهُمْ فَإِنْ آمَنُونِي كُنْتُمْ قَرِيباً مِنْي وَإِنْ قَتَلُونِي أَتَيْتُمْ أَصْحَابَكُمْ فَذَهَبَ لَهُمْ حَرَامٌ فَقَالَ: أَتُؤْمِنُونِي أُبَلِّغْ رِسَالَةَ رَسُـولِ اللّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّم) فَجَعَلَ يُحَدِّثُهُمْ وَأَوْمَئُوا إِلَى رَجُلٍ فَأَتَاهُ مِنْ خَلْفِهِ فَطَعَنَهُ، قَالَ حَـرَامْ: اللّـهُ أَكْبَـرُ، فُـزْتُ وَرَبِّ الْكَعْبَةِ ثُمَّ لَحِقَوا بِمَنْ كَانُوا مَعَهُ فَقتِلُوهُمْ إِلاَّ رَجُلاً أَعْرَجِ كَانَ فِي رَأْسِ جَبَلٍ، ثُـمَّ أَنْزَلَ اللَّهُ عَلَيْنَا ثُمَّ كَانَ مِنَ الْمَنْسُوخِ: إِنَّـا قَـدْ لَقِينَـا رَبَّنَـا فَرَضِـيَ عَنَّـا وَأَرْضَـانَا. رَوَاهُ البخاري[٢]:

دیسان ئەو (خودای لیّ رازی بێ) فەرمووی: عامیری کوڕی توفەیل (کە سەرۆکی هۆزی بەنی عامیر بوو) هاتە لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بە پێغەمبەری گوت: خۆت سەرپشك بە لەنێوانی یەکێ لەم سێیەدا: یا دەشتەکییەکان بۆ تۆو شارییەکان بۆ من، یا ئەگەر بەمە قاییل نابیت، لەپاش خۆت من دەبم بەجێ نشینت، یا بەدوو هەزار سواری شی و کوێتەوە، لەهۆزی غەتەفان دێم بۆ سەرت بۆ جەنگ. پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هەی دێی لیّ

---

[٢] بخاري. غازي: ٤٠٩٠ ← ٤٠٩٢.

کردو فەرمووی: خودایە! بۆ خۆت چۆنی بەباش دەزانی ئاوا عامیرم بۆ چاربکەو لە کۆڵمی بخەرەوە! لەوەدوا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) حەرامی کوڕی میلحانی خاڵۆمی بەحەفتا سوارەوە نارد بۆ لایان لەگەڵ نامەیەکدا، بۆ عامیری سەرۆکیان کاتێ نێزیك دەبنەوە لێیان خاڵۆم دوو پیاو لەگەڵ خۆی دەبا، کە یەکێکیان شەل دەبێ، وەبەم دوو هاوڕێیەی خۆی دەفەرموێ: ئێوە لە نزیکەوە بن وامن دەچم بۆلایان، جا ئەگەر ئامانیان دامێ ئەوە ئێوە لە نزیکمەوە دەبن و ئەگەر دنیا بوو منیان کوشت ئەوا ئێوە بڕۆنەوە بۆلای هاوڕێکانتان، ئەوجا حەرام خۆی دەچێ بۆلایان و دەڵێ: ئایا ئامانم دەدەنێ تا پەیامی پێغەمبەری خواتان پی رابگەیەنم، وە دەست دەکا بە فەرمایشت فەرموون بۆ یان! ئەوانیش بەدزییەوە ووشت لە پیاوێ لەخۆیان دەکەن، کابراکە لە پشتەوە بۆی دەچێ و رمێکی لێ دەداو دەیکوژێ حەرام لە خۆشیانا دەفەرموێ: ئەڵلاهو ئەکبەر! گەورەیی هەر بۆ خودایە، بەخاوەنی کەعبە، بە خودای مەزن شاد بووم بەشەهید بوون و گەیشتم بە ئاواتی خۆم و پیرۆز بووم. ئەوجا هۆزی بەنی عامیر دەنیشنە سەر تاقمەکەی حەرام و هەر حەفتایان دەکوژن، تەنیا پیاوێکی شەلیان نەبێ کە بە لووتکەی کێوەکەوە دەبێ، بەم بۆنەیەوە خودا ئەمەی ناردە خوارەوە کە دەفەرموێ: (إِنَّا قَدْ لَقِينَا رَبَّنَا فَرَضِيَ عَنَّا وَأَرْضَانَا) بەڵام لەدواییدا ئەم فەرمایشتەسڕایەوەو نەسخ بۆوە، بەڵام مەعناکەی جێی خۆی گرت (ب).

## ١٠٣) ناردنی خالیدی کوڕی وەلید بۆسەر بەنی جەذیمە
## بعث خالد بن الوليد إلى بني جذيمة

**٤٦٤٦**- عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بِنْ عُمَرٌ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: بَعَثَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) خَالِدَ بْنَ الْوَلِيدِ إِلَى بَنِى جَذِيمَةَ فَدَعَاهُمْ إِلَى الإِسْلاَمِ فَلَمْ يُحْسِنُوا أَنْ يَقُولُوا أَسْلَمْنَا فَجَعَلُوا يَقُولُونَ صَبَأْنَا صَبَأْنَا فَجَعَلَ خَالِدٌ يَقْتُلُ مِنْهُمْ وَيَأْسِرُ وَدَفَعَ إِلَى كُلِّ رَجُلٍ مِنَّا أَسِيرَهُ حَتَّى إِذَا كَانَ يَوْمٌ أَمَرَ خَالِدٌ أَنْ يَقْتُلَ كُلُّ رَجُلٍ مِنَّا أَسِيرَهُ فَقُلْتُ: وَاللَّهِ لاَ أَقْتُلُ أَسِيرِى وَلاَ

يَقْتُلُ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِي أَسِيرَهُ حَتَّى قَدِمْنَا عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَأخبرناه فَرَفَعَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يَدَهُ فَقَالَ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَبْرَأُ إِلَيْكَ مِمَّا صَنَعَ خَالِدٌ مَرَّتَيْنِ. رَوَاهُ البخاري[1]:

**عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودا لەخۆی‌و بابی) دەفەرمویٚ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خالیدی کوڕی وەلیدی کرد بەسەرکردەو لەگەڵ سوپایەکا ناردی بۆسەر هۆزی بەنی جەذیمە خالید بانگیاندەکا بۆسەر ئیسلامەتی‌و دەڵێ: وەرن موسوڵمان ببن، ئەوانیش لەبەرئەوەی نازانن بەجوانی‌و بە ڕێك‌و پێکی بڵێن: باشە وا ئیسلام بووین، لەباتی ئەوە دەڵێن: باشە وا وەرگەڕاین واتە: لە بتپەرستییەوە بۆسەر ئیسلامەتی‌و بووین بە صابیئی چونکە لەسەرەتای بڵاوبوونەوەی ئیسلامەوە کەسێ کە ئیسلام دەبوو پێیان دەگوت صابیئی، واتە: لەدینی باوباپیری وەرگەڕاوەو چووەتە سەر دینێکی تازە خالیدیش وا دەزانێ کە ئەمانە نایانەوێ ئیسلام ببن‌و دەست دەکا بە کوشتارو بەدیل کردن لێیان، لەدواییدا کە شەڕ تەواو بوو، هەر پیاوێ لە ئێمە خالید دیلی خۆی دایە دەستی، هەتا ڕۆژێ خالید فەرمانی داو فەرمووی: هەر کەسەی دیلی خۆی بکوژێ، منیش گوتم: بەخودا نەخۆم دیلی خۆم دەکوژم‌و نە دەشهێڵم کە کەس لە هاوڕێیانی من دیلی خۆی بکوژێ، کاتێ چووینەوە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم باسەمان بۆیگێڕایەوە، ئەویش هەردوو دەستی خۆی بەرزکردەوەو دوو جار فەرمووی: خودایە! من بەریم لەمە کە خالید کردوویەتی‌و من لەشتی وا بەدوورم بە شایەتی تۆ! (بوخاری، رەحمەت لەخۆی‌و کەسوکاری).**

---

[1] بخاري. جزية. ذكره تعليق بين الرقمين: ٣١٧٢، ٣١٧٣ + مغازي: ٤٣٣٩.

## ١٠٤) هەناردنی ئەبو مووساو موعاذ (ڕەزای خودایان لێ بێ) بۆسەر وڵاتی یەمەن
## بعث أبي موسى ومعاذ إلى اليمن (رضي الله عنهما)

**٤٦٤٧**- عَنْ أَبِي بُرْدَةَ (رضي الله تَعَالَى عنه) قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَبَا مُوسَى وَمُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ إِلَى الْيَمَنِ وَبَعَثَ كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا عَلَى مِخْلاَفٍ ثُمَّ قَالَ: يَسِّرَا وَلاَ تُعَسِّرَا وَبَشِّرَا وَلاَ تُنَفِّرَا، فَانْطَلَقَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا إِلَى عَمَلِهِ وَكَانَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا إِذَا سَارَ فِي أَرْضِهِ كَانَ قَرِيبًا مِنْ صَاحِبِهِ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ فَسَارَ مُعَاذٌ فِي أَرْضِهِ قَرِيبًا مِنْ صَاحِبِهِ أَبِي مُوسَى فَجَاءَ يَسِيرُ عَلَى بَغْلَتِهِ حَتَّى انْتَهَى إِلَيْهِ فَإِذَا هُوَ جَالِسٌ وَقَدِ اجْتَمَعَ إِلَيْهِ النَّاسُ وَإِذَا رَجُلٌ عِنْدَهُ قَدْ جُمِعَتْ يَدَاهُ إِلَى عُنُقِهِ فَقَالَ مُعَاذٌ: يَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ قَيْسٍ أَيَّمَ هَذَا؟ قَالَ: هَذَا رَجُلٌ كَفَرَ بَعْدَ إِسْلاَمِهِ قَالَ: لاَ أَنْزِلُ حَتَّى يُقْتَلَ قَالَ: إِنَّمَا جِيءَ بِهِ لِذَلِكَ فَانْزِلْ قَالَ: مَا أَنْزِلُ حَتَّى يُقْتَلَ فَأَمَرَ بِهِ فَقُتِلَ ثُمَّ نَزَلَ فَقَالَ: يَا عَبْدَ اللَّهِ كَيْفَ تَقْرَأُ الْقُرْآنَ؟ قَالَ: أَتَفَوَّقُهُ تَفَوُّقًا، فَقَالَ: فَكَيْفَ تَقْرَأُ أَنْتَ يَا مُعَاذُ؟ قَالَ: أَنَامُ أَوَّلَ اللَّيْلِ فَأَقُومُ وَقَدْ قَضَيْتُ جُزْئِي مِنَ النَّوْمِ فَأَقْرَأُ مَا كَتَبَ اللَّهُ لِي فَأَحْتَسِبُ نَوْمَتِي كَمَا أَحْتَسِبُ قَوْمَتِي. رَوَاهُ البخاري[1]:

**ئەبو بوردە** (خۆشنوودیی خودای گەورەی لەسەر بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای گەورەی لەسەر بێ) **ئەبو مووسای باوکم و موعاذی کوڕی جەبەل دەنێرێ بۆ وڵاتی یەمەن، هەریەکێ لەم دوو کەسە دەکا بە سەرۆکی ناوچەیێ لەدوو ناوچەکەی سەروو خوارووی یەمەنن پێیان دەفەرموێ: تا دەتوانن کار بۆ خەڵك ئاسان بکەن و باریان گران مەکەن، هەمیشە دەمتان خێر بێنێ و مژدەی خۆش بە مەردوم بدەن و بە هەڕەشەو گوڕەشەی زۆر خەڵك لەخۆتان و لەدین تەرامەکەن! ئینجا هەردووکیان ڕۆیشتن بەلای کاری خۆیانەوە، دەستووریشیان وادەبێ ئەگەر یەکێکیان سەری لەقەڵەمڕەوەکەی خۆی بدایەو لە هاوڕێکەیەوە نزیك ببوایەتەوە دەچوو بۆلای و سلاوی لێ دەکردو هەواڵی دەپرسی. جا جارێ موعاذ بەقەڵەمڕەوی خۆیدا دەسووڕێتەوە کە**

---

[1] بخاري. مغازي. ٤٣٤١، ٤٣٤٢، ٤٣٤٥،

لەئـەبو مووسـای هـاوڕێی نزیـك دەبێتـەوە بەسـواری قـاترێ دەچـی بـۆلای، دەڕوانێ وا ئەبو مووسا دانیشتووەو خەڵك دەورەیـان لێ داوەو پیـاوێکیش وا لەلایدا، هەردوو دەستی بەکۆت‌و زنجیر شـەتەك دراوەو کراوەتـە ملـی. موعـاذ دەڵـێ: ئـەی عەبـدوڵڵای کـوڕی قـەیس! ئـەم پیـاوە چییە بـۆوا کـۆت‌و زنجیر کـراوە؟ دەڵـێ: ئـەوە لـەدینی ئیـسلام هەڵگەڕاوەتـەوەو موسـوڵمان بـووەو کافربۆتەوە، موعاذ دەفەرموێ: دانابەزم هـەتا نـەکوژرێ، دەڵـێ: دەتـۆ دابـەزە، خۆشمان بۆ ئەوەمان هێناوە کە بیکوژین، دەڵێ: خەیر، دانابـەزم تـا نـەکوژرێ جا ئەبو مووسا فـەرمان دەداو پیاوەکـە دەکـوژرێ، ئـەوجا موعـاذ دادەبـەزێ‌و دەفـەرموێ: ئـەی عەبـدوڵڵا! لەسەرچـی شـێوەیێ دەوری قورئـان دەکەیتـەوەو چـۆن چـۆنی قورئـان دەخـوێنی؟ فـەرمووی: وەك وشـترێ ژەم لـەدوا ژەم بیدۆشیت، ئـاوا بـەرودوا هـەرجارەی بـەپێی تـەوانا چـەندەم بۆلـوا ئەوەنـدە دەوردەکەمەوە، گوتی: ئەی تۆ چۆنی دەوردەکەیتـەوە؟ موعـاذ فـەرمووی: مـن لەسەرەتای شەوەوە بەشی خۆم دەخەوم ئەوجا هـەڵ دەسـتم، چـەندەی خـودا بـۆی نووسـیبم ئەوەنـدە دەوردەکەمـەوە، ئـیتر بەتـەمای ئـەوەم کـەخودا ئـەو خەوتنەیـشم (وەك شـەو نوێـژو قورئـان خوێندنەکـەم کـە لەخـەو هـەڵ دەسـتم بـۆی) ئەوەیـشم ئـاوا بـە طـاعـەت‌و بەنـدەیی بـۆم حلیـب دەکـا. بوخـاری گێڕاویەتەوە، (ڕەزای خودای لێ بێ).

## ١٠٥) ناردنی عەلی‌و خالیدی کوڕی وەلید بۆ وڵاتی یەمەن (ڕەزای خودایان لێ بێ)
## بعث علي وخالد بن الوليد (رضى اله عنهما) إلى اليمن

٤٦٤٨- عَنْ الْبَرَاءَ (رضى الله عنه) قَالَ: بَعَثَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) مَـعَ خَالِدِ بْنِ الْوَلِيدِ إِلَى الْيَمَنِ، قَالَ: ثُمَّ بَعَثَ عَلِيًّا بَعْدَ ذَلِكَ مَكَانَهُ فَقَالَ (صَـلَّى اللَّـهُ تَعَـالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِعَلِيٍّ: مُرْ أَصْحَابَ خَالِدٍ مَنْ شَاءَ مِنْهُمْ أَنْ يُعَقِّبَ مَعَكَ فَلْيُعَقِّبْ، وَمَنْ شَـاءَ فَلْيُقْبِلْ فَكُنْتُ فِيمَنْ عَقَّبَ مَعَهُ فَغَنِمْتُ أَوَاقٍ ذَوَاتِ عَدَدٍ[1]:

---

[1] بخاري. مغازي. ٤٣٤٩.

بەراء (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرموی: پێغەمبەر (درودو سڵاوو سەلام و صەلات و ڕەحمەت و بەرەکەتی خودای گەورەو مەزنی لەسەر بێ و سەو ماڵ و منداڵ و ڕۆح و گیان هەمووی بە قوربانی گەردی سەر گۆڕی پیرۆزی بێ) لەگەڵ خالیدی کوڕی وەلیددا ناردینی بۆ یەمەن. فەرمووی: بەڵام لەدواییدا عەلی نارد لەشوێنی خالید، وە بەعەلی دەفەرموێ: بە هاوڕێکانی خالید بڵێ: ئەوەی حەزدەکا لەگەڵ خالیددا بگەڕێتەوە ئەوە کەیفی خۆیەتی، ئەوەیشی کە حەزدەکا لەگەڵ تۆدا بمێنێتەوەو لەپاشدا لەگەڵ تۆدا بێتەوە ئەویش هەر کەیفی خۆیەتی من خۆم یەکێك بووم لەوانەی کە لەگەڵ عەلیدا گەڕاینەوە بۆ یەمەن و لەگەڵیا ماینەوە لەوێ، جا ئەندازەیەکی باش پارەو پوولم، لەتالان دەست کەوت! (بوخاری: ڕەزای خودای گەورەی لێ بێ).

٤٦٤٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ (رضي الله تَعَالَى عنه) قَالَ: بَعَثَ عَلِيٌّ (رضي الله تَعَالَى عنه) مِنَ الْيَمَنِ بِذُهَيْبَةٍ فِي أَدِيمٍ مَقْرُوظٍ لَمْ تُحَصَّلْ مِنْ تُرَابِهَا فَقَسَمَهَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَيْنَ أَرْبَعَةِ نَفَرٍ بَيْنَ عُيَيْنَةَ بْنِ بَدْرٍ وَأَقْرَعَ بْنِ حَابِسٍ وَزَيْدِ الْخَيْلِ، وَالرَّابِعُ إِمَّا عَلْقَمَةُ بِنْ عُلاَثَةَ وَإِمَّا عَامِرُ بْنُ الطُّفَيْلِ فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِهِ: كُنَّا نَحْنُ أَحَقَّ بِهَذَا مِنْ هَؤُلاَءِ فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّم) فَقَالَ: أَلاَ تَأْمَنُونِي وَأَنَا أَمِينُ مَنْ فِي السَّمَاءِ يَأْتِينِي خَبَرُ السَّمَاءِ صَبَاحًا وَمَسَاءً قَالَ: فَقَامَ رَجُلٌ غَائِرُ الْعَيْنَيْنِ مُشْرِفُ الْوَجْنَتَيْنِ نَاشِزُ الْجَبْهَةِ كَثُّ اللِّحْيَةِ مَحْلُوقُ الرَّأْسِ مُشَمَّرُ الإِزَارِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ اتَّقِ اللَّهَ قَالَ: وَيْلَكَ أَوَلَسْتُ أَحَقَّ أَهْلِ الأَرْضِ أَنْ يَتَّقِيَ اللَّهَ، قَالَ: ثُمَّ وَلَّى الرَّجُلُ قَالَ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلاَ أَضْرِبُ عُنُقَهُ، قَالَ: لاَ لَعَلَّهُ أَنْ يَكُونَ يُصَلِّي، قَالَ خَالِدٌ: وَكَمْ مِنْ مُصَلٍّ يَقُولُ بِلِسَانِهِ مَا لَيْسَ فِي قَلْبِهِ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): إِنِّي لَمْ أُمَرْ أَنْ أَنْقُبَ عَنْ قُلُوبَ النَّاسِ وَلاَ أَشُقَّ بُطُونَهُمْ قَالَ: ثُمَّ نَظَرَ إِلَيْهِ وَهُوَ مُقَفٍّ فَقَالَ: إِنَّهُ يَخْرُجُ مِنْ ضِئْضِئِ هَذَا قَوْمٌ يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ رَطْبًا لاَ يُجَاوِزُ حَنَاجِرَهُمْ يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ وَأَظُنُّهُ قَالَ: لَئِنْ أَدْرَكْتُهُمْ لأَقْتُلَنَّهُمْ قَتْلَ ثَمُودَ. رَوَاهُ البخاري. نسأل الله السلامة والتوفيق لما يحبه ويرضاه آمين[٢]:

---

[٢] بخاري. مغازي. ٤٣٥١.

ئەبو سەعیدی كوڕی خودری (ڕەزای خودای گەورەی لێ بێ) فەرمووی: عەلی، لەیەمەنەوە پارچۆڵەیێ زێڕی پوختە نەكراوی لەماڵی تالآنی نارد بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای مەزنی لەسەر بێ) زێڕەكەی لە پارچە قایشێكا بوو بەگڵاسەلەم (قورظ) خۆشە كرابوو، هێشتا خاك و خۆڵی ناوكانەكەی پێوە بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دابەشی كرد بەسەر ئەم چوار كەسەدا: بەسەر عوبەینەی كوڕی بەدرو ئەقرەعی كوڕی حابیس و زەیدی خەیل و چوارەمیشیان یا عەلقەمەی كوڕی عولاسەبوو یا عامیری كوڕی طوفەیل بوو، پیاێكیش لەیارانی گوتی: ئێمە شایستە تر بووین بەم سامانە كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دای بەمانە! ئەم قسەیە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: من كە ئەمینداری خودای ئەرزو ئاسمانم و ئێوارەو بەیانی لە ئاسمانەوە وەحی و سرووشم بۆ دێ، كەچی هێشتا ئێوە متمانەم پێ ناكەن و ئەوەتانێ هەندێكتان بەقای پێم نییە و ڕەخنەم لێ دەگرێ!. فەرمووی: جا كابرایەكی چاو بەقوولا چووی، سەركولم دەرپەڕیوی، گونازەقی، ناوچاوان قۆقزی، ریش پڕی، سەرتاشراوی، چاك بەلادا كردوو، پیاوێكی لەم حاڵەو لەم ڕەنگە هەڵسا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! لەخودا بترسەو شەرم و شكۆیێ لەخودا بكە!! حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: بەدبەخت خۆت! ئەی ماڵ وێران! بۆ كەس هەیە لەسەر رووی زەوی كە ئاوا وەك من لەخودا بترسێ و ئەوەندەی من شەرم و شكۆ لەخودا بكا!. گوتی: ئەوجا كابراكە رۆیشت، خالیدی كوڕی وەلیدیش فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆ نەدەم لەگەردنی؟ فەرمووی: نا، شتی وا مەكە بەشكم نوێژكەر بێ خالید فەرمووی: زۆر نوێژكەری واهەیە زمان و دڵی یەك نین و سەری زمانی شیرینە و بنی زمانی ژەهرینە پێغەمبەریش (دروودو صەلات و سەلام و ڕەحمەت و بەرەكەتی خودای گەورەو مەزنی لەسەر بێ) فەرمووی: من خودا نەیفەرمووە پێم كەناو دڵی خەڵك بپشكنم، یا ناوسكیان هەڵ بدڕم. گوتی: كە كاتێ پیاوەكە پشتی هەڵكرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەرنجی داو فەرمووی: لەنەوەی ئەمە هۆزێ دەكەونەوە، بەزمانی پاراو نامەی خودا قورئانی پیرۆز دەوردەكەنەوە، بەڵام لە گەروویان

رەت نابێ و ناچێتە ناو دڵیانەوە، ئەوانە وا لە ئایین بەلەسە دەبن و وا لە ئایینی ئیسلام بەپەلە دەردەچن وەك چۆن تیرێ كەبدا لە نێچیری خێرا گورج دەیسمێ و لێی دەردەپەڕێ ئەوانیش ئاوا فەرموودە گێڕەوە واتە: (راوی) دەفەرموێ: وا دەزانم حەزرەت (درودو سڵاوو صەلات و رەحمەت و بەرەكەتی خودای گەورەو مەزنی لەسەر بێ) فەرمووشی: ئەگەر خۆم فریای ئەو هۆزو وەچەیە بكەوم و لە چەرخی مندا كەسێ لەوانە پەیدا ببێ وەك چۆن خودا یافتی هۆزی سەموودی بڕییەوە منیش ئاوا یافتی ئەوان دەبڕمەوەو هەموویان دەكوژم!. {بوخاری (پرگۆڕی پیرۆزی لە نوورو رەحمەتی خودا بێ) ئەم فەرموودە پیرۆزەیەی لە كتێبی صەحیحی بوخاریدا (كە دانراوی خۆیەتی) گێڕاوەتەوە}.

يقول المؤلف (رضوان الله تَعَالَى عليه): تمَّ بتوفيق الله تَعَالَى الجزء الرابع من كتاب التَّاج وعدد أحاديثه ألفٌ وخمسٌ وسبعون حديثاً. نسأل الله أن تكون خالصةً لوجهه الكريم آمين. ويليه (إن شاء الله تَعَالَى) الجزء الخامس وأوَّله كتاب الأخلاق. نسأل الله التوفيق لإتمامة:

جەنابی مامۆستا مەلا مەنصوور عەلی ناصیف كە دانەری ئەم تاجە پیرۆزەیە، (پرگۆڕی پیرۆزی لە نووری خودا بێ) لێرەدا دەفەرموێ: لەسایەی خودای گەورەوە بەرگی چوارەمی تاج تەواوبوو، ژمارەی فەرموودەكانی ئەم بەرگە تەنیا هەزارو حەفتا و پێنج فەرموودەن و بەس، لە خودا داوا دەكەم كە ئەم هەوڵەی من مەحز بۆ رەزای خودابێ، خوا یاربێ بەدوای ئەم بەرگەدا بەرگی پێنجەمیش تەشریفی دێ و شەرەفی قودووم دەبەخشێ. سەرەتاكەی نامەی رەووشتە (كتاب الاخلاق). داوا لەخودا دەكەم یارمەتیمان بدا بۆ تەواوكردنی و بەئەنجام گەیاندنی. ئامین خودایە، نزامان گیراكەی.

بەندەی دوعاگۆی ئێوەی خۆشەویست و نازدار، لێرەدا عەرزتان دەكەم:

لەسایەی خوداوە تەرجەمەی ئەم بەرگەم بە ئەنجام گەیاندو كردم بە كوردی لە كاژێر دەونیوی سەر لەبەیانی رۆژی ١٩٧٧/٨/٣١دا، رێكەوتی

١٦ی رەمەزانی ساڵی ١٣٩٧ی کۆچی، لەهۆدەکەی خۆمدا لە نەخۆشخانەی سەربازیی کەرکووك، لە شاری کەرکووکی خۆشەویست و نازدار، خودا پێمانی بهێڵێ. ئومێد دەکەم لەخودای گەورەو میهرەبان کە فرصەتم بدا ئەم نامە پیرۆزو بەنرخە (بەهەموو بەرگەکانیەوە) بەشێوەیەکی جوان و شیرین، بە کوردییەکی پەتی، بە زمانە شیرینەکەی خۆمان پیشکەش بکەم بەگەلی کوردی خۆم بەڕاستی کاری وا گەورەو پیرۆز (ئەگەر ساخ بۆ رەزای خودا بێ) مایەی سەربەرزیو شانازی هەردوو جیهانە، خودا بە رەحمەتی خۆی بەنصیبمان بکا، هەروەها لەهەمان هۆدەو هەمان شوێندا لەپاکنووسی ئەم بەرگە بوومەوە لە ١٩٨٦/١/٢٩دا بەراوردی جیمادولئولای ساڵی ١٤٠٦ی کۆچی. ژمارەی حەدیثەکان لەسەرەتای تاجەوە تائێرە (٤٩٧٥) حەدیثە، بگرە بتریش، چونکە هی شەرحەکەشی تیادایە. ئێستاکەیش کە بەدەستی خۆم لە نووسینی جاری سێیەمی ئەم بەرگە دەبمەوە، کە ئەمجارەیان دەقی مەتنی حەدیثەکانیشم بە عەرەبی لەپێش تەرجەمە کوردییەکەوە نووسیوەتەوە، لێرانەدا عەرزی ئێوەی ئازیزی بەرزی بەرێز دەکەم:

ئەم کتێبە پیرۆزەیە مانەندی مەجلیسی رەسولەڵڵایە" لەبەرئەوە هیچ گومانی تیادا نییە کە جێگەی خورۆشانی رەحمەتی خودایە، ئومێد دەکەم بۆ هەموومان ببی بە باشترین سەرمایەو دەسمایە، خوا یاربێ لە هەرماڵێکا بێ وەك باخی بەهەشت وایە خوا حەزکا بۆ هەر موسوڵمانێ کە هەیبی رۆشنی دین و دنیایە سوێندم بەخودا ئەم دنیا تەنگ و تاریکەم بۆیە پی خۆشە چونکە خزمەتی ئەم تاجەی بۆ من تیایە، هەر لەم روانگەیەوە کەجارو بار بۆ پیرۆزی ناوی ناودارانی خۆمان دەنووسم لە رووپەڕەی ئەم کتێبە پیرۆزەیە، مەبەستم ئەوانەیانە کە خزمەتێکی گەورەی دین و دنیای ئەم گەلی کوردی مەردی موسوڵمانی پاکی چاکەیان کردووە، بە ئومێدی ئەوەی کە موسوڵمانان دوعایەکی خێریان بۆ بکەن، یا رەحمەتێ، یا فاتیحایێکیان بۆ بنێرن، بۆ ئەمەیش بەڵگەی ئایەت و حەدیث زۆرە، خودا دەفەرموێ: {ذِكْرُ رَحْمَةِ رَبِّكَ عَبْدَهُ زَكَرِيَّا} یا دەفەرموێ: {وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ مَرْيَمَ}. کیتابی

فەضائیلیش باسێکی سەربەخۆیە، لە گەڵ لە کتێبە ئایینییەکاندا هەیە. جا بەنیازی پیرۆز بوون بە بەرەکەتی ئەم کتێبە دەڵێم: بەیارمەتی خودا ئەم بەرگەم ئەمجارە تەواوکرد لە رۆژی ۲۳/۱۰/۱۹۹۰ بەرێکەوتی ٤ربیع الثانی (١٤١١)ی کۆچی لەماڵی خۆمان، لە گەڕەکی ماممۆستایان، لە سلێمانی، لەشاری دین‌و دونیا لەشارە سەربەرزو سەرفرازەکەی کوردستان، لە وڵاتی عێراقی خۆشەویست، لەشارە ناودارەکەی حاجی کاکە ئەحمەدی شێخ‌و شێخ مارفی نۆدێیی‌و شێخ عومەری ئیبنو لقەرەداغی‌و مەلا عەبدوڕەحمانی پێنجوێنی‌و مەولانا خالیدو مەولەوی‌و مەحوی‌و نالی‌و پیرەمێردو قانیع‌و گۆران‌و کامەران موکری‌و کاکەی فەلاح‌و هەردی‌و زێوەرو بێخود. لەشارە نەشمیلەکەی شێخ مەحموودی حەفیدو شێخ حەسەنی گڵەزەردەو حەپسەخانی نەقیب‌و پێتەختی بەبەکانی بابان، لەشارە جوانەکەی شێخ موحەممەدی خاڵ کەچاوی رۆشنی هەر دوو جیهانی میللەتی کورد بوو، لەشاری مەڵبەندی فەقێیەتی عەلائەددین سەججادی، لەشاری ساداتی بەرزنجەو کەسنەزان‌و کەرەبچنەو گڵە زەردەو شێخانی بیارەو تەوێڵەو عەبابەیلێ‌و هەورامان، لەشاری گردی سەیوان‌و گردی شێخ محی الدین‌و گردی مامەیارەو گردی شەهیدان، بەڕاستی شاری وا پیرۆزو موبارەك، پڕ لەئەولیاو شێخ‌و مشایەخ‌و مەلاو صوفی‌و دەروێش‌و مزگەوت‌و منارەو تەکیەو خانەقاو پیت‌و بەرەکەتی دین‌و دونیا لەم وڵاتەی خۆماندا بەپێی زانستی من مەگەر بەغداو نەجەف‌و کەربەلاو کەرکووك‌و هەولێر وابێ، خودا بەرەحمەتی خۆی هەموو لایێ بپارێزێ، وە هەتا رۆژی قیامەت ئەم کوردستانەی خۆمان گوند بە گوندو شار بەشارو بست بەبستی لەپەنای قورئانی پیرۆزدا پەنابداو خۆشی‌و خۆشبەختی‌و خۆشگوزەرانی‌و ئەمن‌و ئاسایش باڵ بکێشێ بەسەر هەموو کون‌و قوژبنێکیا، خوایە! هەرچی بارێکمان لێ دەنێیت، لە ئێش‌و ئازاری دنیا لەسەر سەرو چاوو رۆح‌و دڵمانە، مادەم باربای تۆیەو ئێمەیش بەندەی تۆین بەکەم‌و بەزۆر لەل ناکەین، بەڵام خودایە! هەتا دنیا دنیایە کوردستان لە نووری قورئان، لە حوکمی سەرۆکی

عادڵی بەداد بێ بەش نەکەی، خودایە! بە تەوانایی خۆت دەستی زۆرداری لێ کۆتاکەی، رەحمێ بەحاڵی دانیشتوانی بکەی، لەگەڵ هەموو شوێنێکی تری خاکی ئیسلامدا.

وەك عەرزم کردن، خوا یاربێ، ئەم کتێبە پیرۆزانە جێی خرۆشانی رەحمەتی خودایە، بەوێنەی ئەم کتێبانەو بە فەرموودەو ئامۆژگاری مامۆستا ئایینییەکان وڵات ئاوەدان دەبی و کوفرو بێ دینی (کە وڵاتیان پێ وێران دەبێ) تەفرو توونا دەبن! براینە! بزانن لەسایەی خوداوە دین هێشتا پەیڕەوانی زۆر زۆرماوە، لەهەرلا سەرنج دەدەی موسوڵمانان دەستی یارمەتی درێژ دەکەن بۆ برای موسوڵمانی لێقەوماوی فەلەسطینی لە سەرانسەری وڵاتی ئیسلامدا لەهەر کوێ بێ وەك نیشتمانی خۆی وایە، شارە دێرینەکەی کوردەواری خۆشمان، هەولێری خۆشەویست و موسوڵمان لەم ساڵانەی دواییدا، موسوڵمانانەو مەردانە چەرخی سەردەمی هیجرەتیان زیندوو کردەوەو ئیلهامیان لە رەوشی جوانی موهاجیرین و ئەنصار وەرگرت و رەفتاری شیرینی ئەو زاتانەیان کرد بەسەر مەشق و، دەستی یارمەتی و کۆمەکییان درێژ کرد بۆ ئەو لێقەوماوو هەژارو داماوو رەوکەرانەی کە لەبەر بێ دەرەتانی روویان کردبووە شارەکەیان، بەڕاستی بەم کارە شیرینەیان تەفسیرێکی عەمەلییان بەکردەوە نەك بە قسەی رووت بۆ ئەم ئایەتە پیرۆزەیە کرد کە دەفەرموێ:

{وَالَّذِينَ تَبَوَّؤُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ. وَالَّذِينَ جَاؤُوا مِن بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ} ←
بەڵێ موسوڵمانە مەردەکانی شاری هەولێر بەکردەوە چەسپاندیان کەدین لەدنیا بەهێزترە، کە لە سایەی خوداوە دەماری مەردایەتی و برایەتی و موسوڵمانەتی لەدڵی ئۆمەتی موحەممەددا (درووودی خودای لەسەر بێ) هەرماوەو

